رۆمان

# گۆڕستانی غەریبان

## ئیبراهیمی یونسی

وەرگێڕانی لە فارسییەوە بۆ کوردی

غەریب پشدەری

کوردستان - هەولێر

٢٠٠٦



**ناوی کتێب: ( رۆمان ) گۆڕستانی غەریبان**

– نووسینی: ئیبراهیمی یونسی

– وەرگێڕانی لە فارسییەوە: غەریب پشدەری

– نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی

– بەرگ: هۆگر سدیق

– پیتچنین: سۆزان عزەددین

– سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات

– ژمارەی سپاردن: ٢٣٣

– تیراژ: ١٠٠٠ دانە

– چاپی یەکەم ٢٠٠٦

– نرخ: ٨٠٠٠ دینار

– چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب –٥٨– (١٦١)

ناونیشان

دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی

پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@ maktoob.com

ژمارەی تەلەفۆن : 2260311

www.mukiryani.com

بۆ/ چاوەگەشە ئەلیزاییەکانی خاتو ((شەرا))ی لە دلَّن ئازیزم... دیارییە

-غەریب-

## (١)

حەشیمەتەکە ڕاوەستاوە و بەپێی پێویست و بە گوێرەی بارودۆخی کاتەکە دروشمی بژی و بمری دەلێنەوە. ((هاوڕێی حیزبی)) لە پێشەوەی ڕیزێ ڕاوەستاوە، ئێستاش هەوای ڕابەرییەی هەر دە کەللەیدایە، جا قەیدی چییە لەو سەرەوەی نا لەم سەری، گرژییە جارانی هەر بە هەنیایەوەیە، هەر بەو دەموچاو و ڕوخسارە پانەی جاران و ئەو دوو لۆچەی کە لە کۆتایی هەردوو ئێسکی لا ڕوومەتەکانیەوە دەگەنە کۆتاییە لێوەکانی و ڕوومەتی بەدوو بەشی یەکسانەوە دابەش دەکەن. بە جووتە چاوێکی تەم گرتووی زەردباو و قژێکی نەرم و زەردی کارەباییەوە و بەدوو شانی داتەکیوەوە، وایان پێشاندەدا کە ئەمە هەمووی لەسەرەنجامی سەرپێداگرتن و خۆ خواردنەوە و ڕامانی لە حاڵ و باڵی میللەتەوە بێ...

ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە، هەر کەسەو لە جێی خۆیەوە، خۆی لەو کۆمەڵ و لایەنانە بکێشێتەوە کە تا دوێنێ شانازی بە بوونە ئەندامیەتی خۆی تێدا دەکردن، ئێستا ئیدی لە ڕووداوان و شەرم و شکۆ هەڵگیراوە، هاوڕێیان یەکتریان دەستنیشانکردووە. ئەوەندانەی دیش کە دەو نێوەیدا دڵەڕاوکێ و ئەو سەرە و سەریانە ئەوانیش هەروا بەو زووانە ئاراستەی یەکجارەکی ژیانی خۆیان دیاری دەکەن. زیندان ئاواتەخوازە و ((ئاوالأن))یش چاوەڕێ.

شەوانە هەندێکان دەبینی کە دە ژووری زیندانێدا یان لە حەساری — ئەگەر هاتنەدەر ئازاد بێت- ئەوا لێك خڕبوونەتەوە و بە ((دزی))یەوە خەریکی خواردنەوێن — خواردنەوەی هەر دە زیندانێدا دەکرن. دەخۆنەوە، بەڵام فەرمووی کەس ناکەن. جاری واشە ئاوڕێکی دەدەنەوەو زەردێکیان دێتێ. خۆ ئەگەر لە پەژێوانبووەکان بن ئەوە بە دەنگێکی بڵندی ئەوتۆ کە هەموو زیندانیەکان کە گوێیان لێبێ پلاران داوێنە دەمارگیر و توندڕەوەکان. جۆری پلارەکانیش ئەوە دیارە — کە بە خراپە و بێ خاتر و خوایشت باسی مووشەکەکانی یەکیەتی شۆڕەوی دەکەن!

دۆستایەتیش ئەوە هەر هیچ، باری کردووە، دیارە کە بێ غەشیە بوونیشی دەرێکخراوێکیدا مانای دۆستایەتییە نادات و ئەو بۆنەی هەر لێنایە. خۆ ئەگەر دۆستایەتی هەبایە ئەوە هەرباش بوو، بەڵام نەبوو، وێڵداشییەکی بێ بنەما و پێشەکی: کتوپڕ دەبوویە هاوڕێ — یانی چەند هەنگاوێك لەپێش دۆستایەتییەوە — دە گەڵ ئەوەشدا کە کەمترین هەنگاوێکت دەمەیدانی دۆستایەتییەدا نەهاوێشتبوو! دەنا کوا تا ئێستا کام دۆستێك لەپێناو



دۆستایەتییەدا چۆتە بەردەمی سێدارەی؟ دۆستایەتی، دۆستایەتیش ئەو دەمەی خۆشە دوو سەرە بێت، دۆستایەتییەك دوو سەرە نەبێت هیچە... ڕۆژێك دوو ڕۆژ هەروا دەبێ گەندی کارەکە دەردەکەوێ و دۆستایەتییەکە نەمێنێ... حیزب و هەموو ئەوانیدی ڕۆیون — هەموو ڕۆیون، تەنیا خاو و خێزانەکان نەبن- هەر ئەوانی — ژن و ژاڵ- و دایکەکانن کە ماونەوە... پەنا بەخوا، بوونەوەرانێکی سەیرن! لە سەرەتای هەفتەوە بە هیوای سێ دەقیقە چاوپێکەوتن ئەو هەموو سوکایەتی و شەرمەزارییەی پشکنینی سەربازان و چاو حیزیە سەیرکردنێ ئەفسەران قبووڵ دەکەن و ئاوا کۆتایی بەسەردانێ هەفتانەی دێنن، ئەوجا بە هەر شێوەیەك بووە، میوە و خۆراکێکی ئامادە دەکەن و دەستی منداڵەکان دەگرن و دەیانهێننەماڵێ بابەی! منداڵەکان لە نەدیتەوە دەزانن ئێمە چ بوو وین، و چمان کردووە و چمان گوتووە. هەر جارێکی، ڕۆژانی جەژنێ، یان بەهەر هۆیەکەوە، کە ڕێی ناو ژووری زیندانێیان بدریتێ، ئەوا لە دەم و زارە بچکۆلە و زمانە شیرنەکانیانەوە گوێمان لە چیرۆك و بەسەرهاتە تاڵ و شیرنەکانیانەوە دەبێت — جا چ خۆش و چ ناخۆش! ناخۆش لەم لایەنەوە کە دایکەکە هەروا بە هەڕەمەکی پەی بەوە بردووە کە منداڵ هەست بە پێویستییە بوونێ بابی دەکات، و دەیەوێ بەهەر شێوەیەك بووە ئەو حەزەی دامرێنێتەوە. بۆیە دادەنیشێ و ئەوەی دە دڵ و دەروونیدایە هەڵیدەرێژێ و بە یادی بابیەوە منداڵەکەی دەخافڵێنێ. ئەو کەساسە چ بکا... لە کوێڕا دەست پێ بکا — لە چیرۆك و سەربوردەی بێ خان و مانییە بەولاوە، چ یاد و بیرەوەرییەکی نووسراو و نەنووسراوەی دیکەی نییە. بۆیە هەر دەبێ ژاراوی ئەو سەربوردە تاڵ و ژارانە بگرێت و بە جۆرێك لە جۆرەکان دەزاری منداڵەکەیانەوە بتکێنێ و دەرخواردی بدات. شتی ئەوتۆ لەو دەموزارە پاك و بچکۆلانەی ئەو منداڵانەوە دەبیسی کە ماوەیەکی زۆرە هەر لە بیریشت چۆتەوە، کەچی لە دەمی وانەوە هەر دەڵێی ئەو شتانە دوێنێ ڕوویانداوە، هێندە تازەن! لەو لایەنەشەوە خۆشە، کەوا دەزانی هێشتا ئەوە هەر لە ماڵێی و دانیشتووی — ئەو ماڵ و خێزانەی کە دە حیزبایەتیەتدا بزر کردبوو؛ سەیر دەکەی جێ و ڕێیەکت هەیە. ژنەکەم هەروەك دوێنێ بێ پارەی لێ وەرگرتبم و چووبێتە بازاڕی و مانتۆکەی بەدڵی خۆمی بۆ کڕیبم، هەرچەند جارێکیان لەو دیوی میلە ئاسنەکانی زیندانێوە یەخەی مانتۆکەی هەڵدەداتەوە، بەڵام من لێی بێ ئاگام و ناچمەوە سەری- ئاخر سێ دەقیقە دیدار چییە تا من لە جلەکانی خورد ببمەوە، تا سەرەنجام خۆی پێ ڕاناگیرێ؛ شاقەلی مانتۆکەی بەلاوە دەنێتەوە، و دەڵێ ((ڕەنگەکەیت بەدڵە؟ ئاخر تۆ

هەمیشە حەزت لە رەنگی فستەقییە- دوێنێم کڕیوە!)) دەیەوێ دووبارە لە خۆشەویستییەکەیم دڵنیا بێتەوە.

تازە دێمەوە سەرخۆ. هەروا لە خۆوە قسەکەم لەزاری دەردەپەڕێ: ((دەك پیرۆزت بێ.. بەه بەه، زۆرجوانە؛ زۆریشت لێدێ!)) ئەوە دە حاڵێکیشدا کە هەر زەینم لەوی نییە — دەگەڵ ئەو هەموو خۆشحاڵی پێشاندانەشیدا هەستدەکەم ئەویش دەبن کەلاوەی ئەو بەڵاو بەسەرهاتانەدا تێك و پێك شکاوە و ورد و خاش بووە. بەچاو و بەدەم، و مووی قژە سەری و تەنانەت بە هەموو بوونی خۆیەوە پێدەکەنێ — بەڕاستی جوانە. هەمیشە دەخەیاڵ و رۆماناندا ژنان بەو شێوەیە دەبینم: جوان، پاکیزە، بێگەرد و سادە و ساکار. رەنگە نەبوونی ئازادییە بێت کەوا بەو رەنگەیان دەردەخات — چونکە دەستی پیاوی بە ژنانی نێو رۆمان و خەیاڵ و ئەندێشان راناگات، لەراستیدا شتی پڕ و پوچ و سواو ژن و مێردان ریشەکێش دەکات و بەڵای جوانییەشە — ژن دە دوو توێی خەیاڵ و دەدەمی زیندانییە و کاتی سەفەرێدا چەند جوانن!... ئەودەمی تازە دە قۆناغ و سەرەتاییەکانی پێشڤەچوونێدا بووین، ژیانی کۆمەڵایەتی تازە دەهات فراژوو و پێڕۆچکە دەبوو، هۆکار و کەرەستەکانی کاریێ هێشتا، دە قۆناغە سەرەتاییەکانی پێگەیشتنێدا بوون، دەو دەمیدا هێشتا شێوازی ((نوێ)) بۆ سەلماندنی پەشێمانییە نەدۆزرا بۆوە، هەرچەندە دەمانادا ئەوەش هیچی لەویدی کەمتر نەبوو- لەواتادا هەر هەمان شت بوو: کوشتنی هاوڕێیان بوو، بەهۆی خودی هاوڕێیانەوە: هاندان و ناچار بەخۆ کوشتن کردنێ.

((هاوڕێی حیزبی)) لە پێشەوەی ریزەکەوە بە وریاییەوە وێستاوە. تەواوی هۆش و گۆش و هەست و نەستی بەلای قسەکەرەکەوەیە، کە ژمارەکان یەك بەدوای یەکدا ریزدەکات.... بیست ملیۆن.. پەنجا ملیۆن... دڵخۆشکەرە؛ پەنجا ملیۆن زیندانی لە کوێ، و هەزار نەفەر لە کوێ!

لە پەنایەکی حەساریێ پەتوێکم راخستووە؛ دانیشتووم ئینگلیزییە دەخوێنمەوە. دووکۆنە سەرهەنگ دەربارەی ئایندە دەمە تەقێیانە. هەروا کە چەند هەنگاوێکیان دەمێنێ بگەنە من بە باشیم گوێ لێیانە. کە دووریش دەکەونەوە دیسانەوە تا چەند هەنگاوێکان بەولاترەوە، هەر بە دوا قسەکانیانەوەم: ((... بەڵێ... ئەڵبەتە... باشە، ئەگەر...)) و پیشێ دەخۆمەوە. سەرهەنگە پیرترەکە، تەزبێحی بەدەستەوەیە؛ سەری رووتاوەتەوە و مووی لاجانگ و پەنا گوێیەکانیشی سپی بوون، دەموچاویشی پیرەڵەیە- ئەویدیکەیان قیت و قۆزە، و هێشتا جل و



بەرگی سەربازی ئەمەریکایی دەبەردایە؛ شاقەلی پاڵتۆکەی بەسەر پانتۆڵەکەیدا بەرداوەتەوەو قۆپچەکانی داخستوون. هەر تەنیا بۆینباغ و نیشانەکانی لە جاران کەمترە. لە دوورەوە وا پێدەچێ کە چاوەڕێی شەیپوری ئێوارێیە، تا بچێتە مەشق و رێپێوانی... ((باشە، ئەگەر رۆژێك شتێك بقەومێ دیسانەوە هەر ئێمەین کە دەبێ قۆڵی لێ هەڵماڵینەوە...)) هەروەك تا هێشتا هیچیان نەکردبێ! ((بەڵێ... ئێمە... هەر ئەو ئاغایانەی کە نارەزاییان پێشان دابوو... و... ئەوەتا ئێستا هاوکارییە دەکەن... باشە ئیدی، ئەوە مرۆیە جاری وایە لاواز و بێ دەسەڵات و دەست و پێ سپییە، و جاری واشە قارەمانێکە نەبێتەوە...)).

سەرهەنگەکەی دی بەکاوەخۆی دەنکە تەزبیحەکە داویشتن- ئەویش هەر لەو بڕوایە دایە- کە بەڵێ، کەسی دی و رێیەکی دیکە نییە- دیسانەوە هەر ئەوان- دیسانەوە هەر ئێمە! دەرگەزی وەك فڕفڕۆکەی بە دەوری حەسارێدا دەسوڕێتەوە، ئەو سەرە و سەری ئەو دەستەسڕەی بەدەستیەوەیتی هەر یەکەی بەلایەکیدا بادەدا، و هەر کە دەستەسڕەکە بە تەواوی بای خوارد و گشت بۆوە، هەر بەو ئالۆزی و راشکاوییەیەوە کارەکەی دووبارە بەپێچەوانەی یەکەمجارەوە دووبارە دەکاتەوە — هەروەك ئەرکێکی زۆر پێویستی پێ سپێردرابێ، دووبارە بایدەدا و بایدەداتەوە- هەروەك دەستووریێ.

دوو سێ سەران دەسووڕێتەوە؛ تا لە پڕ دەوەستێ؛ چەند هەنگاوێکیان دێتەوە دوایە و بە توڕەییەوە دەڵێ: ((سلاو لە منەوەیە)). و بێ ئەوەی چاوەڕێی هیچ وەلامێك بێت دەڵێتەوە: ((لە سایەی سەری ئێوەوە، زۆر باشم — سوپاس)). بەخۆو بەدەستەسڕەوە بەڕێی خۆیدا دەڕوات. یەك دوو چەرخان دەدا؛ دیسانەوە دەگاتەوە هەمان ئەوەی هەوەڵێ و دەڵێ: ((شادمانم بەوەی کە دەفەرموون باشم)) لە کاتێکدا کە بەرامبەرەکەی هیچی نەگوتووە. ((منیش زۆر باشم)) و هەردوو کەڵەپەنجەکانی هەردوو دەستی بەرز دەکاتەوە، یانی لە ((چاکی))دا بێ هاوتاییە... گوایە ئەوە نیشانەی فرۆکەوانەکانە؛ یانی کە هەردوو مەکینەکان بە باشی کاردەکەن. دەنگ و پێستی دەموچاوی دەلەرنەوە، چاوەکانی ئالۆزن؛ شێوەی روخساری وەك ئەو کەسانە وایە کە تووشی شێوە شەپڕێوییەکی سووکەڵەی دەموچاوان دەبن: کەمە لەرەیەکی هەیە. هەموو دەمێ هەروایە. پیاوێکی کەڵەگەتە، ئاغر و دەمارگیرە، چاکییەکەشی هەر ئەوەیە. دەگاتە بەردەمم؛ تێدەپەڕێ، چەند هەنگاوێکان دوور دەکەوێتەوە؛ دەگەڕێتەوە. دەڵێ:

((چاکم گویٚ لێبوو!؟ فەرمایشتێکتان بەمنە؟ هەر فەرمانێکی هەتانە فەرموون.. گرنگ نییە... داوای لێبوردن دەکەم... وەك بلێی کاتم گرتبێ... من زۆر باشم، دویٚ شەو چاك نوستم... هە، هە! ... گرنگ نییە!))... و دەڕوا...

سەید کازم دە دالأنەکێدا ئاگری کردۆتەوە. ئاوپڕژێنەکەی دەبن هەنگڵێ ناوە و چاوی نوقاندوون و بەهەوای دومبگەکەی برۆ و سمێلان —پێکەوە- هەڵدەتەکێنێ و خۆی هەڵداویٚ و گۆرانییان دەڵێ:

آورماغی آچتدلار

قزی گوتروب قاچدلار؛

آورماغین دالینده

قزن اوزن آچتدلار

هی بالاجا بالاجا بالاجا

هی بالاجا بالاجا بالاجا****

هەڵتەکاندنیٚ برۆ و سمێلان و دەنگ و زرمەی دومبگیٚ زیاتر دەبیٚ...

گلیر سوراغن سنین

اجازە وەر بیرمنە اولوم گوناغون سنین...

پابدا مابدا بیلمرم        ماسکاویچا مین مرم؛

ماسکاویچ مینان        اوغلانا

من قزیمی ورمرم



هی بالاجا بالاجا بالاجا...[1]

سەید کازم بەو سمێڵە بابڕانە و ئەو چەکمە بەلەك نەرمانەیەوە کە لە یەکیەتی شۆرەوییەوە راهاتوون، ملەستور و کەڵەگایە کە بۆ خۆی، بەگرێبەند فەرمانبەری پاککردنەوێ زیندانێیە- پارەی وەردەگریٚ و خاوێنییە رادەگریٚ، بەلأم سلأو لە کەس ناکا. پێی وایە کە فەعلە یانی کرێکار، کە ئەو دەڵێ ((فەحلە))- نابیٚ سلأو لە کەس بکات. ئەگەر جارجارە تریاکی وەگیرکەویٚ ئەوە دە ئاو دەستێیدا دەکێشێ. وێنەی ستالینی لەسەر قۆڵی چەپەی و وێنە پەرییەکیشی لەسەر قۆڵی راستەی کوتاوە. کەڵەگەت و بەلە باریکە، دەموچاو رەقەڵەیەکی زەردەڵە و —کەچەڵ- کلأوێکی کەپی سەردەمی شۆڕش لەسەر- شۆڕشی شۆرەوی. ئەو ئاورماغییەی کە هەمیشە بەستایشتەوەی ناو دێنیٚ و یادی دەکاتەوە ئاورماغی باکوتە، یا بە واتای خۆی ((پاکی))یە کە کاك سەید سەردەمی هەلأتن و ئاوارەیی پەناهیندەگییە خۆی لەویٚ بەسەر بردووە.

سەباحی دە ریزیٚ و ریٚ و رەسماندا- و لە هەموو جێیەکی سێبەرگران و ئێسك قورسێکی ناقۆلأبوو. هەروەك خووی پێوە گرتبوو، هەمیشە و لە هەموو جێیەکی جنێوی دەدان ئەژداد و ئابادی رابەرە حیزبییەکانی دەردێنا. کاتیٚ کە لە حەساریٚ یا لە راڕەوەکەدا تووشیان دەبیٚ لووتیان لیٚ هەڵدەکا و جا بیانبینیٚ نەیانبینیٚ و تێوەرێخیان بۆ لەبنا گوێیانیان وەردێنیٚ؛ و بۆ ئەو مەبەستەش هەمیشە لەسەر پێیە و بەشی وانیشی هەر پێیە- سەباحی لە پێشدا کرێکاری کارگەی چیت سازییە بووە؛ لەساڵی سی و دوو (١٩٥٣ز) پێش ئاشبەتاڵی حیزب لە کاتی دروشم نووسینێدا دەگیریٚ؛ فەرماندەری سەربازی داوای پاکانە و نوسینیٚ نەفرەتنامە و پەشێمانییەی لێدەکا؛ ئەو داوا لە ((حیزب دەکا رێی پاکانەی پێبدەن، بەلأم)) هاوڕێیان قایل نابن. چەند منداڵێکی سەلك و بنکە، ژنێکی لەکارکەوتەی دەست و پیٚ سپی هەیە، و هیچشیان نییە. ئێستا ئەوەتا هەم پەشێمانیشە و هەم دەمارگیر: دەمارگیریە ئەوەی کە نەهێڵێ لێرەش —دە زیندانێدا- رابەرەکان هەر رابەر بن، و لەپێشەوەی ریزیٚ راوەستن و زوو تێیتەقێنن.

[1] فرۆشگایان کردەوە، کچەیان فراند و هەلأتن، لەودیوی فرۆشگایە رووی کچەیان کردەوە... بچکۆلە“ بچکۆلە... بە شوێن تۆدا دێت، رێم بدە بە میوانت بم. من پابدا و مابدای نازانم، سواری مۆسکۆڤیچیش نابم، کچەکەشم نادەمە کوڕێکی سواری مۆسکۆڤیچی بێت...

هەر ئەوان جارێك بلێن بژی، ئەو سەد جارانی دەلێتەوە و هێندەشی بە توندی دەلێ، نەك هەردەنگی خۆیان، ئی باب و باپیرانیشیان و شەشەی لە دوو نەکات و تۆزی نەشکێنن... ((باشە، ئەوەبۆ ئەو سەردەمەی مە، پاکانە و نەفرەتنامە و پەژێوانی نووسین کفر بوو، کەچی کە سەرەی خۆیان هات بووە بەشێك لە ئەرك و پێویستییەکانی حیزبی!؟)) و بای دە بەرغەبابەی خۆی دەکرد، و بەلاقرتێ و گاڵتە جاڕییەوە دەیگوت: ((بەڵێ، هاوڕێ، مرۆڤ دەبێ جێ و رێ ناسبێت! هەبوونێ مە بۆ نیشتمان پێویستە!)) و ملی وەك کەڵەبابی درێژ دەکرد و چونکە کورتە بنەش بوو خۆی داویشتە سەر پەنجە پێیانی و خۆی هەڵدێنا. ((هەبوونێ گەندوگوی ئاوەڵانیش بۆ وڵات و مەملەکەتی هەر پێویستە!)) و ئەوجا دەمی بۆ جنێوی تەڕ و بڕ و ئاودار دەبۆوە و گەزارەی دەردەکێشا. ئیدی کاری بەسەرکەسی دییەوە نەبوو. ئێستاش ئەوە بە تەك هاوڕێ حیزبییەکەوە راوەستاوەو لە بن گوێیانیەوە، با بژی و با بمرێیەکی ئەوتۆی وا، دەڵێت، وشترەلۆکێ مەست دەکا: ((بابمرێ رابەرانی خاینی حیزبی توودە!)) و جگە لەو دروشمانەی نێو ژووری زیندانێش، لەبن لێوانیشیەوەی دای و باب دەرەقاندنەوە، بەلاَم خۆ ((هاوڕێ حیزبی)) تەڕنابێت و ئەو دارەش نییە بەو ((با)) یانە بلە رێ. ئەم هاوڕێیە و هاوڕێیانی بانەوەش هێشتا هەروەك جاران کە بازنەی خەرمانەیەکیان بەدەوری ناوەندی خۆیان و تیشکی وڵاتیدا کێشابوو، دە زیندانێشدا بازنەی ئەو خەرمانەیەیان هەر بە دەوری مەڵبەندی تیشکی خۆیاندا کێشابۆوە: هەر لە خۆیانیانەوە دەستپێکردبۆوە و هەر لە خۆشیانەوە بە کۆتا دەهاتەوە، و جگە لە خۆیان، چیان بەسەر سەباحی و ئەوانیدییەوە نەبوو و هەر ئاگاشیان لێنەمابوو، و لە خۆیان بەولاوە بیریان لە کەسی دی نەدەکردەوە- دەبازنەی بووندا هەرگیز وەیلان نین: حیسابی کەمترین شتی خۆیانیان لایە- هەر لە بچووکترین پرتەقاڵێکەوە بیگرە کە رۆژی سەردان و دیدەنییە بۆیان دێنان تا دەگاتە کەمترین ئامین و نەرموشلترین بابمرێ و با بژییەك، یا کورتترین وتارێکی کە بۆ ((پەند و ئامۆژگاری)) دەینوسن. ئەندازیاری ئەلیکترۆمیکانیکە، جاران بزوێنەری ماشێنی کۆمەڵگا رابەرێکی زانا و دانای ئەوتۆ بوو کە گەلی دەگەیاندە مەنزڵگای بەختەوەری و دەیویست بەزووترین کات رەوڕەوەی سەردەم و قۆناغی بنیاتنان و پێشکەوتن وەگەڕ کەوێت و بەزوویی بەرەو پێشەوە بڕوا.

دەو سەردەمانەشدا پێشڤەچوون بەر لە راگەیاندنێ دەستی پێدەکرد — راستیش بوو؛ دەبوو بۆ گەیشتن بە دەروازەی شارستانیەت بنیاتنان و پێشڤەچوون لە پێشدابایە، - و ئەودەمی دە تۆ



پێت هەڵدابایە بۆ ناو دەروازەی گۆڵێ و — گۆ ۆۆڵ! ئەودەمی شۆڕش، شۆڕشێکی سپی بوو، بەلاَم بۆ بنیاتنانێ وولاَتی دەبووایە وانەی سازەندەگیەت شان بەشانی هونەر و سازو ئاواز (مۆسیقا) بخوێنی هەر بە نامە بەشی رێگاو بیناسازی دەخوێند، دیارە کە ژیان بە لە باری دەبینێت ((دیاردەکان)) هەر دەنێو ((ژینگە)) و دەوروبەردا تاوتوێ دەکات.... ((ژیان جوانە...))، ((ژیان دەرکەوتنی بوونی خودایە...))؛ ژیان دەبێ بپەرسترێ. بەلاَم لەپێشدا دەبێ ژیان دروستبکرێت ئەوجا بپەرسترێ. کەواتە ژیان دروستکردن بەسەر هێڵی رێ و بانی بنیاتناندا تێدەپەڕێت و دەڕوات. ئەوجا دوایی- بۆچوونە ناو ژیانەوە، دەبێ لە زیندانێ هەڵێی: زیندان زیندوو خانەیەکە، زیندانییەکانی بە کەڵکی ژیان نایەن، بە مانای ووشە، مردوون...

هاوڕێی حیزبی دوور بوو لەوەی پێشبینی قەومانی رووداوەکان بکات و هەست بە ئاریشەکان بکات، خۆ دوای قەومانێش چ کاریگەرییەکی ئەوتۆشی بەسەر ئاریشە و قەوماوەکانەوە نەبووە، ئەو هەستەی هەر تێدا نەبووە. دیارە لە رابوردووش تووشی هیچ ئازار و دەردە سەرییەك نەهاتووە تا بە لە بیرخۆبردنەوەی شادو شەنگوڵ بێت — ئاییندە هەموو شتێك بوو. سەید حەسەن بۆ رق هەستاندنێ دامودەزگا و پەشێمان بووەکان، خۆی رووت و قوت کردۆتەوە. میلە ئاسنەکانی بە لێواری حەوزەکەوە هەڵپەساردوون، دە هەوای خۆیدایە. تێیڕا هەڵداوەتە ئاوازە تایبەتییەکانی جاران. قۆڵە شکاوەکەی وەك پاڵەوانان بە پارچە قایشێکی پێچاوە، لەسەر پێیە باریکەڵە لاوازەکانی هەڵدەقۆزێتەوە. لەلای چەپی حەوزەکەوە و دوو سێ هەنگاو بەرەو خوارتر — وەك پاڵەوانی زۆر خانان بەرەو لای ئاغای شەمساییەوە- دێت- باڵی فشکردوونەوە و خۆی وێك هێناوەتەوە و پشتی کووڕ کردۆتەوە. پێتوایە هەر ئێستا نا ئێستا بەرامبەرەکەی دەهاڕێ. دووای یەك دوو هەنگاوی دی کە دێتە پێشێ دیسانەوە وەك دە چاڵێدا بێت، وەك چاڵەوانان سوڕێکی بە دەوری دوو ئانیشکە فشەکانی خۆیدا دەداتەوە و بەرەو لای میلەکان دێتەوە. هەر ئەو سەید حەسەنە، شوفێر و تەتەرەکەی کۆمیتەی ناوەندییە، کە ماوەیەك بە هیوای ئەوەوە کە ((هاوڕێیان)) جێی چاپخانە نهێنییەکان دەگۆڕن و دەیانگوێزنەوە، تێهەڵدانی خوارد و زوڕنای لێدا- کاتێك کە کوتەك تڕێنیان کردو دەستی شکا، دڵنیابوو لەوەی کە بەهەر حیسابێکان بێت ئەگەر ویستبێتیان چاپخانەکان بە پشتی حوشترێش لە وڵاتی وەدەرنێن، بەوەندە ماوەیە گەیونەتە مەراکیش. ئەوجا دوای هەژدە... بیست رۆژێکان

ددانی پێدانا. و بە حەپەساویەوە دیتی کە جیٚ و بانێکی وشك و برینگ و قاقڕەو زارۆکیش لە ماڵیٚ دەشیرین خەوێدا بەدەم پێکەنینێوە چاوەڕێیە...

حوسێن ڕەزایی لەو سەری ریزێیە. خۆشی و شادی لە رووان بڕاوە و قیت و قۆزییەکەی جارانی نەماوە، دیارە ئەو قیت و قۆزییەی چیدی پێویست ناکا. ئەوان رۆژانە ئیدی سەرنجەکانی هەر یەکجاری ونن! لە هەموو جێیەکی ورد دەبێتەوە، و سەرنجەکانیشی لە چ جێیەکی راناوەستن و جێگیر نابن، وەك بەدوای خۆیدا بگەڕیٚ! کە دە چاوەکانی رادەمێنم، کلاّو رۆژنەی دنیایەکیان تێدا دەبینم نوقمی پرسە و ماتەمە، حوسێنی پرسەداری ئەم دنیایە- هەر دەڵێی لە پرسە و ماتەمی خۆیدا دانیشتووە...

یەك دوو جاری هەڵە کردوون؛ کاتێك ئەو جارەی کە مامۆستا شەمسایی گەییە دوا دێڕی راپۆرتەکە و بیٚ چەند و چوون گوتی: ((سی و حەوت ملیۆن کەس)) هەر بەو خەیاڵەوە کە ((ئێوارە)) و ((بەیانی))یە و دوعای بۆ والا حەزرەتی دەکەن گوتوویەتی: ((ئامین!)) و کوڕەکان هەموو لە فلّقەی پێکەنینێیان داوە تا لاوازی و خۆ بەدەستەوە دان و پەشێمانییە وی زیاتر بسەلمێنن و ئاشکرای کەن. هاوڕێی حیزبی کە کەمتر وابوو پێبکەنیٚ، ئەمجارەیان لە پڕمەی پێکەنینێیدا، و سەباحی ئەو هەلەی قوستەوە و چەند دروشمێك و یەك ریزی وشەی نابەجیٚ حەواڵە کرد. حوسێن دەستە پاچە بوو، سورو مۆر هەڵگەڕا، ئارەقەی دەردا- و تێما. دیارە کەس بەسەرخۆی نەهێنا: زیندان تەنانەت بۆ دڵ گەرمییە دۆستانیش چییە، یەکێکی نەنارد چاوەدێرییە ریٚ و رەسمەکە بکات- بۆ خۆیان دەحەسارێدا ریٚ و رەسمی چوارەمی ئابانێکی[٢] دیکەیان هەبوو — چوارەمی ئابانی خزمەتکاران. بەلاّم ویژدانی ((هاوڕێیان)) چاووگوێی زیندانیٚ بوو، و زیندانیش بیٚ هیچ گومانێك و بەدوور و درێژی و بیٚ دواکەوتن راپۆرتی ڕووداوەکەی وەك خۆی، چۆن بوو، ئاوا پێدەگەیی، و حوسێنیش ئەمەی زۆر چاك دەزانی... هەر بەوجۆرەی کە کوڕەکان دەیانگوت کاتیٚ کە گرتوویانە، بەو منداڵیەشیەوە خۆی لەگێلیەداوە و خۆی شێت کردووە. شتی سەیر و سەمەرەی کردووە: ماوەیەك هەروا خۆی بەداری سەر دەرکی ژووری زیندانێوە هەڵواسیوە؛ دە ژووری زیندانێدا بۆ ئەوەی یەکێك جێی خۆی لە تەنیشت ئاواڵەکەیەوە بکاتەوە، بە قسەی کوڕەکان (زیندانییەکان) پێویستی بە پاژنە هەڵکێشێك

---

[٢] ئابان: دووەمین مانگی پایزیٚ — وەرگێڕ.



دەبوو، کەچی ئەو هاتبوو، شووتییەکی دە ئامێزیٚ نابوو ((رێوی بۆ خۆی دە کونێوە نەدەچوو، گەڵێشکیش بەدواوە))؛ شەوانە هەر کە بانگی داوە گریاوە؛ لە خۆوە تریقاوەتەوە و پێکەنیوە، بەرۆژوو بووە و گریاوە... بۆ، هەروا؟ کام زیندانییەك هەیە نەگریابێت و دە دڵی خۆیدا شیوەنی نەگێڕابێت؟ ئەوە هیچ کە گریان عەیب نییە تازە ئەو پێکەنین و خەنینەوانەش هەموو هەر گریانە. نەك هەر حوسێن، بەڵکە هەموو کەسێك هەقیەتی بۆ سادەیی و ساوێلکەیی و خۆش باوەڕییە خۆی بگریەت.

ئاخر هەموو دەپاڕاینەوە دلّۆپە ئاوێك باینایە و دە دوڕ عەردیدا چووباینە خواریٚ و دەگەڵ دلّۆپەکانی دی یەکمان گرتبایە و بەشێوەی سەرچاوەی کانیاوێکی روون و پاك و بێگەرد لەسەر رێی رێبوارانی بەر قرچەی هەتاوێکی گەرم هەڵقولاّباینەوە و تینووەکانمان تێراو و پاراوکردبان. لەسەرەتاوە خۆزگە و حەزەکانی حوسێن و هەموو ئەوانیدیش هەر ئەوەبوو، بەلاّم بەداخەوە، یا خاکەکەی هەو نەبوو، یا کاریز هەڵکەنەکەی وەستا نەبوو. ئێمەیان دە زەلکاویٚ کرد... باشە چ لەوەی ناخۆش و نا لەبارترە کە تۆ بێیت و ماوەیەکی دوور و درێژ شان و قۆلاّن بکوتی و رەنج بدەیت و ئارەقەی بڕێژی و بە ئاواتی ئەوەی بگەیە بیرە ئاوێکی سارد و فێنك و پاك و بێگەرد، کەچی لە پڕ لە بیرێکی پیساییە ماڵە هاوسێیەکەت سەر وەدەرنێی!...

((هاوڕیٚ حیزبیش)) دە قولاّییە ناخی خۆیدا کەوتۆتە گەڕانیٚ... ئەویش هەر ((بیر))ی لێدەدا... دە گۆشەیەکی زەین و لێکدانەوەی خۆیدا وەك وێنەیەکی نادیاری لیٚ دۆزیبێتەوە. دەگەڕانیٚ دەوروبەری خۆیدا قولاّغێکی ئەو وێنەیەی دیبۆوە و سەرە گلّۆلە بەنێکی وەچنگ کەوتبوو. ئاخر بار تا قورستربێت، کە داتنا سوکترە. بە واتای نووسەرێکی، مرۆڤ هەرچەندە گوناهبارتر بێت دوای تۆ بە کردنێی پیرۆزترە: گوناهبارێکی فەرمەسۆن کە تۆبەی دەکات کارەکەی زۆر لەو پیاوچاکە، گەورە و بە نرخترە کە هەرگیز دەستنوێژی نەشکاوە. ئەو تامی گوناهێی کردووە و پێی راهاتووە، ئەوجا هاتووە بەبیر و باوەڕ و سۆزێکی پتەوەوەو رووبەڕووی گوناهەکان بۆتەوەو لێیان پاشگەز و پەشێمان بۆتەوە و وازی لەو تام و چێژ و خۆشییەی ئەوان گوناهانە هێناوە، لە کاتێکدا کە ئەویدی (پیاوچاکەکە) ئەو تام و چێژەی گوناهانی نەچێشتووە و چ کارێکی بەرامبەر کارێکی دی ئەنجام نەداوە. و سروشتیشە کە پاداشتی ئەو دووانە وەك یەك نییە و ناشبیٚ... بەڵیٚ بەو جۆرە تا بار قورستر بێت دوای دانانی سوکترە: تا راپۆڕت و

زانیارییان زیاتر بدەیت هێندە زیاتر لەبەر هەڵدابوون و ئازادییە نزیکتری. هەموو گرانبارییەك خۆشی و فەرامۆشییەکی بەدواوەیە، و ئەوە ئێستاش ((هاوڕێ)) بە خێراخۆی، دەیەوێ خۆی سووکە بارکا! ((تۆ ئەوە نیت کە دەگەڵ کوڕی فلاٚن خاندا...)) حوسێنیش خۆی لێ گرژ کردبۆوە و گوتبووی: ((جا باشە، مەبەستت چییە!)) و ئەوەی بەشێوازێکی وا گوتبوو کە هێشتاش هەر لەسەر زمانان و دەبیر و هۆشاندا هەرمابوو. و ((هاوڕێی حیزبی)) وەك هەموو لاوێکی و... وەك حیزبیش- کە سەردەمی لاوەتی تێپەڕاندبوو ئیدی لەسەر سۆز و مەرج و بەڵێنە خۆش و شیرنەکانی جاران نەمابوو، وەك کیژۆڵەکی کە لە سەردەمی منداڵییەیدا بەڵێن دەداتە کوڕێژگە وێڵداشەکەی گەمانی، کە تامابێ هەرخۆشی دەوێ، کەچی کە گەورە دەبێ هەر لووتیشی پێدا ناهێنێ وەك هەر نەبای دیبێ و نەباران ناشیناسێت! ئەویش هەر ئەو جارەی وا دۆستانە خۆپێشاندابوو ئەویش بەو مەبەستە... کە بە قسەی حوسێنی تا ((کەسایەتییە)) خۆی لەلای سەرۆکی زیندانێ بەهەند پێشانبدات.

دەنگی گرووبان یوسفیم هاتە گوێی، کە حوسێن رەزایی بانگ کرد... ((حوسێن رەزایی، بۆ دەفتەرێ!)) ئەوەی لەوناوە بوو بە دەم پێکەنینێوە وەك وی گوتیانەوە ((حوسێن مەبەست، دەفتەر!)).

جا وەرە ئەو کەرەی لەو قوڕەی دەرێنە، کە ((بۆ لە خۆڕاو بێ جێ گوتووتە ئامین؛ دەتویست قەشمەریان بکەی، توندڕەو و دەمارگیرەکان رایان سپاردبووی و هانیان دابووی!...)) دوور نییە بیبەنە ژووری ئینفیرادی، کێ دەڵێ نایبەنە زیندانی زرەهی —یا قزل قەلعە- تا بە قسەی سەرۆکی زیندانێ، ببێتە پیاو. کوڕەکان هەموو، دانیشتوو و بەپێوە، شاد و دڵگیر و مات، چاویان لە دوویەتی و بە تێڕامانێوەی بەڕێ دەکەن. حوسێن سەری بەرداوەتەوە و رەنگی رووی پەڕیوە... نا هەقیشی نییە. من یان حوسێن فەیلەسووف نەبووین تا بزانین ترسی مردنێ، لە ترسی دوای مردنێیە، یا ئەوەی بزانین کە مادامەکی هەین و زیندووین ئەوە مردن نییە و کە مردنیش هات ئیدی ئەوە ئێمەش نین و نامێنین، یا بزانین هیچ ناخۆشییەك تاسەر نییە، و خۆ ئەگەر وابێ ئیدی ئەوە ناخۆشی هەرنییە. یان هەمدیس خۆ فەیلەسوف نەبووین کە هەر ئەوەندە ژیانە ئاساییەمان بەس بێت. بەڵکە وەك هەموو نەفامان ئێمەش هەر نەفامێك بووین



کە نەماندەزانی دەگەڵ هەرمان و نەمریدا چ بکەین... و خۆمان دەوگێژاوەی هاریشتبوو- زیندانیش نا هەقی نییە. هاوڕێیان راپۆڕتی لە سەرۆك زیندانێش دەدەن...

رێ و رەسمەکە کۆتایی هاتبوو. پەتوو و کتێبەکانم کۆ دەکەمەوە و دەچمەوە ژوورێ. دە دالاٚنەکێدا تووشی دەرگەزی دەبم، هەروەك فەرمایشتێکم هەبێ... نا... ئێستا زۆر لەسەرخۆیەتی، پێدەچێ حاڵی زۆر باش بێت... بەرەو لای حەسارێوە دەگەڕێتەوە. دوایین کەسە کە لە حەسارێڕا دێتەوە ژووری زیندانێ، و ئەویش بە تێوە خوڕینێیەوە- ئاخر ئەوەش جۆرە بەرخودانێك و سەر بزێوی و مل نەدان و سەرپێچییەکە، کە پیاو تەندروستی باش بێت و تێر نوستبێت، دوایین کەسیش بێتەوە ژوورێ و گرووبان یوسفیش هەروا دەستە کلیلان راوەشێنێ و بەو سەر و پۆتەلاٚکە گەمژانەیەوەو بە قەرائەتەوە و بەشێوە زمانێکی ئێسك گرانانەوە، بە پیاوی بڵێ کە خۆ هەڵخستنێ بەر تاوێ ((تاواووو!))یانی تەواو و کۆتایی هات.

هێشتا نەگەیبووینەوە ژوورێ سەر و سەکوتی پەیدابوو- گورووبان یوسفی دەڵێم: (( ئاغای سلێمانی- سەرەدان)).

سەردان! خێربێ! هیچ کاتێ وانەبووە ئەو دەمانە سەردان بکرێت... خۆ من کەسم نییە بێتە دیدەنیەم، جا مەگەر منداڵەکان بە سەفەر هاتبن.

دەپرسم: ((سەردان یان دەفتەر؟)) زەینم لە حوسێنی هەرنەمانەوە- دەڵێتەوە: ((سەرەدان)).

خۆم دەپێچمەوە. کوڕەکان بە گومانەوەم سەیر دەکەن. تازە ئیدی متمانەکان بە تەواوی شل و شۆق و لەرزۆك بوون: ئەگەر تاك و تەرایەك مابن و هێشتا متمانە پێکتر بکەن دەنا هیچ- پێیان وایە شتیان لێدەشارمەوە، و ئاگام لە شتانە و پێیان نالێم- چالاکی و جموجۆل بۆ ئازاد بوونێ توندتر بووە- یانی چڕتر و خەستتربۆتەوە- و سەردان بوونەتە مانای ((ئاگادار بوونەوە لە رووداوان))، دکتۆر پەناهی سەرسامییەکەمی لە چاوانڕا دەخوێندمەوە- زیاتر ئۆگری ویم. شارەزای کار و کاردانەوەکانی یەکتری هەین؛ دەزانێ ئەگەر هیچ هەبێ و شتێکم بیستبێ بەوی هەر دەڵێم. دەڕۆم. دەرگەزیم بەلادا رەت دەبێ، بەبێ هیچ هەڵوەستە و راوەستانێك... گرنگ نییە... راستییەکەشی بەو سەردانە چوومەتە لیستی پەشێمانبووەکانەوە — گوایە دەچم راپۆرتی بدەم.

دەچمە بەر دەرکی ژووری زیندانیّ؛ پاسەوانەکە دەرکەی دەکاتەوە؛ دەچمە هەیوانیّ. کەس دیارنییە. چونکە بیّ مۆڵەت چوونە ژووری سەردانیّ باو نییە، سەرێکم دە ژووری سەرۆك زیندانیّ هەڵکرد. سەرگورد (رائد) حاجی کازمی دانیشتووە؛ سەلامیّ دەکەم؛ یەکاندەردوو، دەڵیّ: ((فەرموو، سەردان — هەوڵدە زۆر نەخایەنیّ)). لە کۆنە پۆلیسەکانی پۆلیسخانەیە. پیاوێکی میهرەبانە، بەتایبەتی دەگەڵ خاو و خێزاناندا. دیارە سارد و گەرمی رۆژگاری زۆر دیوە، باوکانە دەگەڵ خەڵکیدا دەدویّ —زۆریش دەڵیّ- دەشترسیّ: دەترسیّ راپۆرتی لێدەین. دەڵیّ من تەیمورتاشم بەوەزیریی دەربار دیوە، و هەروەها دیتوشمە ئا ئەلێرەشدا زیندانی بووە، و هەر دێرەشدا مرد... تێیدەگەیاندی کە ئیدی ژیانی زیندانیی سیاسی گێژەن و ئالۆزە: لەوانەیە کەشتییەکە بگاتە جیّ، لەوانەشە دەنیوەی رێیەدا خۆ لە کەپکە شاخێکی دات و نقوم بێت، و ئەوەشی دەزانی کە ئەو ولاّتە جارجارە تووشی ئالۆزی و بلۆزییە دەبێت و واچاکترە پیاو دۆست و ناسیاوێك و ئاشنا و رۆشنایەکی هەر هەبێت بۆ رۆژی لێقەومانیّ، باشترە. بەلاّم لاوەکان — خوێندەوارەکان... ئاە ئەوانە هەموو، خوا نەناس بوون: هەموو بیّ شەرم، لوت بەرز، و خۆپەرست: لەسەر لوتکەی شاخێڕا قسەیان دە گەڵ خەڵکی دەکرد، کەچی لە لایەکی دییەوە حیزب داد و بڕۆی بوو لە دەست ئەو پیرو پاتاڵ و کە نەفتانە و لە حەژمەتانیان هاواریان لیّ هەستابوو: هاواریان بوو لە دەست سەرهەنگ باستی و نموونەکانی، کە رابەرانی حیزبی یەکسەر بە دوو ساڵ زیندانی دەکرد و ئەو یەك دووانەی دیشی کە بە دەستوری رەزمارا بە لە سێدارەدان تاوانبار دەکرد، هەر کە فەرمانی خنکانیان دەردەچوو دەستبەجیّ مەڕێکی بۆ لە خۆ دەگرتن لە سێدارە نەدرێن، و هەر کە لە سێدارەش نەدەدران ئەمە مەڕەکەی سەردەبڕی و بەڕاستیش دەیکردە قوربانی و دەیبەشییەوە.

سەردانی ئەمڕۆش دیاری و بەخششی یەکێك لەو پیرەمێردانەی کە حیزب دەیگوت مێشك رزیوانە بوو. دەچمە دیوی پێشخانی ژووری سەردانیّ. ئیدیشی لێن، ئەوانیش بۆ سەردانیّ هاتوون... ئاە، دیارە حوسێنیشیان هەر بۆ چاوپێکەوتنیّ داواکردبوو.

دەرفەتی بیرکردنەوێم نییە: هەر کە چوومە ژووریّ، مامە مەشەدی خەریکی ئیکلام بۆ کردنێم بوو و پوورە گوڵبەهاریش کە لەبەر لاوازی و بیّ تاقەتیان لەبەردەمی میلە ئاسنەکان دانیشتبوو وتینی دەخۆی دەکرد و هەوڵی هەستانێی دەدا. چەندەم هەوڵ دەگەڵ دا هەڵنەستیّ



کەڵکی نەبوو، و هەر هەستا. هەموویان جلوبەرگی کوردییان دەبەردایە. چاك و چۆنیە دەکەین- بە فارسی، مامە مەشەدی کە تا بناگوێیانی زار داپچڕیوە دەڵیّ: ((ئاغا بە زمانی خۆمان بدوێن و قسان بکەن)). مەبەستی زمانی کوردییە. وەستا فەیزوڵلاّ هەر بەو پاکی و رووە خۆشەکەیەوە دە نێوان پوورە گوڵبەهار و مامە مەشەدیدا راوەستاوە، منداڵێکی حەوت هەشت ساڵانەی بە باوە شێوەیە، دادە مەلیحەی خێزانیشی لە تەنیشتێوە، پارچە کچۆڵەیەکی شەیتان و مەکرۆکەی ژیکەڵەشی لە تەکە. چەند جوانە جوان! چاوەکانی دەڵێی چاوی مامزێن. لێوەکانی وەك لێوی منداڵێکی گریا و هەڵقرچاون- لچ و لێوی تۆزێك پفن و هەڵاّمساون. کەڵەگە تۆکە، قشتیلە؛ بەقسەی پوورە فریشتەی هەروەك تۆپە گوڵیّ! بەشەرم و شکۆیەکەوە چاکوچۆنیە دەکا؛ سوردەبێتەوە، رەنگێکی دێنیّ و رەنگێکی دەبا، بەجلی کوردییەوە، کراسی گوڵباتمان، و پشتێندی گوڵدار، و کوڵەجەی مەخمەری مۆر، هەر مەپرسە چەند جوانن. مامە مەشەدی لەبارەی بابەیەوە دەدویّ، کە سوپاس بۆ خوای، باشە، و ئوتومبێلی کڕیوە و... ئەوجا بە ئاماژە بەو کوڕیژگەی کە بە ئامێزیّ وەستا فەیزوڵلاّوەیە و قامکی خۆی دەمژیّ، و بە واقی وڕەوە سەیری میل و پاسەوانەکەی نێوان دوومیلەکان دەکات، دەڵیّ: ((حەمە عەلی، سلاّوت لە خاڵەی کرد؟ سلاّویّ لە خاڵەی کە، دەی ئافەرین کوڕی باش!)) و دووبارە شەویلاکەی لەبەر زار داپچڕینیّ دەچنەوە بناگوێیان و ئەو چەند ددانە بەڵغ گرتووانەی وە دەردەکەون. حەمە عەلی هێندەی دی قامکان دەزارییەوە رۆدەبات و هەروا بە حەپەساوییەوە سەرقاڵی قامك مژینێیە. مامە مەشەدی دەستی دەگریّ و دەڵیّ: ((گوتم سلاّویّ لە خاڵەی کە... بڵیّ خاڵەگیان سلاّو!)).

دەڵێم: ((محەممەد عەلی خان سلاّو! چۆنی، چاکی؟ ماشەڵلاّ ماشەڵلاّ پیاوێکی بۆ خۆت- ماشەڵلاّ؛)) دەونێوەیدا پوورە گوڵبەهار ئەو سیغارەی پێچابوویەوە بە مۆدنە گڵێنەکەیەوە کرد و هەروەك ژنە کوردان قوتووە جگەرەکەشی دەبەر پشتێندیّ نایەوە. پووریلە هەروا بەدەم چەسپ لە سیغاردانێوە دەڵیّ: ((ئاغا، وای تێمەگەن، ماشەڵلاّ چاوی ماری دەردێنیّ... نازانی چەند شەیتانە!)) و ئاوڕ دەداتەوە و بە کوڕیژگەکە دەڵیّ: ((ئاخری سلاّوت لە خاڵە گیانی کرد؟)) و بە سۆزێکی دایکانەوە کە پڕی میهرەبانییە دەڵیّ: ((دەستت لە زارت دەرێنە!)) و ئەوجا ((بڵیّ، بڵیّ خاڵە گیان سلاّو!)) منداڵە هەروا بە حەپەساوی و شەرمەوە دەڵیّ: ((خاڵە گیان سلاّو!)) و سەری بەردەداتەوە، و سەری بە سینگی فەیزوڵلاّیەوە دەنوسێنێتەوە. کیژۆڵە

شەیتانۆکەکەش کە گوێی لەوە دەبێ، بەچاوە زیتەڵەکانی و پرچە کورتەکانییەوە یەکاندەر دوو دەڵێ: ((خاڵە گیان، خۆ منیش سڵاوم کرد!)).

مامە مەشەدی دەڵێ: ((وەی بە قوربانی بولبولەکەی خۆم بم... بەڵێ ئاغا، کچەکەی منیش سڵاوی کرد... عالیە گیانم سڵاوی کرد!)) مەلیحە پێدەکەنێ و سوور هەڵدەگەڕێ. کیژۆڵەکە بە روویەکی گەش و پڕ لە شەیتانییەوە سەری بەردەداتەوە. لە ژێرەوە دەڕوانێ و لاقان رادەوەشێنێ؛ وەستا فەیزوڵلا جێ بەخۆی ناگرێ لە خۆشیان و خەنی دەبێ، و مامە مەشەدیش دەبێتە یەکپارچە شادی و شەنگوڵی: ((ئاغا، باوەڕ بفەرموون یەك دەقیقە بەبێ ئەوانە ناژیم)).

دەڵێم: ((خوا لێیان نەستێنێ... خوا بیانپارێزێ)).

پوورە گوڵبەهار دەڵێ: ((خوا دەست بە باڵی ئێوە و حوسێن گیانیشەوە بگرێ... خودا لەو بەند و زیندانەتان رزگار کات ئینشاڵلا —هەر هەمووتان، بۆ خاتری هەرچی پیاوچاك و ئەولیایە!)). ئەمە نزاو پاڕانەوەیەکی کوردییە؛ هاواری پێنج ئیمام و دوازدە ئیمامان نییە، ئەوە باسی پیاو چاك و دۆستانی خودایە: ((ئینشاڵلا هەرچی زووترە بەرهەڵدا دەبن، و ئەو دەمی قۆڵ و باسکانی لێ هەڵکەن و ژنێکی بۆ حوسێن گیانی بێنن — ئیدی ئەوە پیر بووین، نەوە و رەچەڵەکمان دەوێن، حەزمان لێیە گەمانیان دەگەڵ کەین...)) دەڵێم: ((جا ئەوە حوسێناغا بە کچەکانی مە قایل نەبوو- دەبێ لەوانەی لای خۆتانی...)) مامە مەشەدی دەڵێ: ((قسەی وا مەفەرموو... ئێمە لە کوردستانەکەی بەولاوە چ جێیەکی دیمان نییە، هەمانە و نیمانە هەر کوردستانە، بەگیانی ئێوە و بەگیانی ئەم دووانە کچی وامان هەن ماشەڵلا هەر دەڵێی سوورە گوڵن...)) و بەدەست و بەسەر ئاماژە بۆ کوڕێژگەکە و کچۆڵە بچکۆلانەکە دەکا: ((بەگیانی ئێوە، و بەگیانی ئا ئەمانە ئەگەر بووکمان لەوان کچانەی کوردستانی خۆمان نەبێ، دەشاییەکەشیاندا هەڵناپەڕم — پێیان دە ماڵێ نانێم!)) پێدەکەنێ: ((ئەوە لە ئێستا را لە خزمەت وەدا- ئێوە بە شایەد بن- هەر دە خزمەت وەدا دەگەڵی دەبڕێنمەوە)). دەستی بۆ لای وەستا فەیزوڵلای درێژ دەکات: ((ئەو منداڵەی وە من دە، ماندوو بووی)). کوڕێژگەی تاین باوەشێ دەگرێتەوە و خۆی بە سینگی بابە گەورەیەوە دەنوسێنێ.

پوورە گوڵبەهار دەڵێ: ((ئاغا، چاوت لێیە، ئەکبەر اغا ئاگری چەند گەرمە!؟ ئای ئاغا، ئەگەر یەکێك ئازا بێت و بڵێ پشتی چاوی کوردان برۆیە، چۆن خۆی پێ دەگۆڕێتەوە. ئاغا ئێمە لە



ماڵێش هەر بە کوردی دە ئاخڤین... خودا هەمووان سەلامەت کا- خوا ئەو مەرز و بوومەش هەر ئاوەدان کات... هەرچی زووتریشە خوا ئێوە لەو بەلایەی رزگار کات!)) و دەستە پاچە فرمێسکی لەچاوان دادەبارن ((ئاغا، تو گیانی خۆت، و گیانی ئاغا، و ئێوە و ئەمانەتییە حوسێنی... حوسێنی بەخواو بەوە دەسپێرم...)) گریانی دە ئەوکێدا دەمێنێ و فرمێسکی دینەوە خوارێ.

دەڵێم: ((پوورە گوڵبەهار، تۆ دەبێ ئێمە بە حوسێنی بسپێری! لێرە ئەو گەورە و سەروەری مەیە... ماشەڵلا هەر بۆ خۆی حیسابە...)) و بە زەردەیەکەوە لێی زیاد دەکەم ((ئینشاڵلا هەر بەو زووانەش بەردەبێت... ئیدی ئەوەش هەر بەسەردەچێت... تائێرەش خراپ نییە هەروا دەبێ... ئێمە هەر لە غەمێ وەداین، دەنا ئێمە چ ناخۆشیەکمان نییە لێرە. هەر لە سبەینێوە تا ئێوارێ جەفەنگان لێدەدەین... دڵتان بەمەوە نەبێت!)).

مامە مەشەدی هەروا دەخەنێتەوە؛ لە خۆشیان نێو چەوانی ئارەقەی دەرداوە؛ ئارەقەی هەنیای بە قولینچکی مێزەرەکەی دەسڕێتەوە. مێژوو بێ بەزەییانە چرچ و لۆچە ئاڵۆزەکانی خۆی لەسەر روخساری ئەو ژن و مێردە نەخشاندووە و مووی سەریانی کە چرۆی سەوزی هەزاران تاریکە شەوی ئەنگوستە چاوبووە، و بە مەرەکەبی سپی رەنگ کردووە. مێژوو هەر بۆ خۆی پێکهاتەی کەوتن و تێکشکان و چرچ و لۆچی مرۆڤانە... روخساریان هەرچی نیشانەی تۆف و زریان و پێکداهاتنەکانە هەمووی تێڕا دیارە، و تا ئێستاش سایە و سێبەری ئەو بەلایانەیان هەروا بەسەردا هەڵدەکشێ. هەوا هێشتاش هەر روون نەبۆتەوە. بە سپایی بە حوسێنی دەڵێم: ((تۆ کە دەتزانی هەر نەبایە ئاگادارت کردبامەوە نوقڵێك نەباتێکم بۆ ئەو منداڵانە هێنابایە...)).

کیژۆڵەکە گوێی سووکن: ((خاڵە گیان، نوقڵت دەوێن؟ ها؟ و لە گیرفانۆکەکەی خۆی نۆقڵێکی دەردێنێ و چەچە بچکۆلانەکەی دە میلەکانی دەرکەی زیندانێڕا را دەدێرێ —هەموو لە هەموو پێدەکەنن... پاسەوان کۆتایی کاتەکەی راگەیاند. من دەبوو زووتر رۆیشتبامایەوە تا هەر نەبایە ئەوان زیاتریان پێکەوە دەمەتەقێ و دەردە دڵ کردبایە. هەر دەگەڵ یەکەم راگەیاندنێ پاسەوانی من خواحافیزیم کرد. مەشەدی خانم هەروا زیاتری پێ دادەگرت: ((تۆ بیت و خودا، تۆ گیانی ئاغا... جلە چڵکنەکانت بدە بە حوسێنی تا لێرەین بیانشۆین... ئەوە منم و

مەلیحەش هەر لێرەیە- ئێوە لە جێی محەممەد عەلین، خودایە چەند گڵ لەسەر گۆڕەکەی وییە هێندەتان عومر بێت- من وەك دایکتانم رۆڵە)). وەستا فەیزوڵڵا و دادە مەلیحەش زۆریان پەلەکرد. دەگەڵ وەستا فەیزوڵڵای بە خزمایەتییەکی دوور، لە داکێڕا دەگەینەوە یەك —ئیدی هەرچۆنێك بوو، خزم و خۆیش بووین. دەشارۆچکەکی چکۆڵەدا هەموو و هەریەکەی بە لایەکدا دەگەنەوە یەك و خزم و قەوم و قیلەن. ((تو گیانی خۆت ئەگەر شەرمێ بکەی، کوڕە دوایە لە کن پوورە فاتمێت شکایەت لێدەکەم- بە خودای ئەو هەقی بەسەر هەمووانەوە هەیە...)).

مامە مەشەدیش شتێکی دەربارەی پوورە فاتمێ —نەنکم- هەر باسکرد. سوپاسم کردن. خواحافیزیم لێکردن؛ کیژۆڵە شەیتانۆکە کە بە هاندانێ داکی بە دەنگێکی بەرزەوە خواحافیزی لێکردم و بەرێی کردم: ((خاڵە گیان بەخێرچی!)) ئاوڕێکم دایەوە بێ ئیختیار ماچێکم بۆ وی- و بۆ هەمووان هەڵدا... و بە دەنگێکی بەرزەوە: هەر دەڵێی گوڵەباغە، کیژەکەم... ئەو شەوە مێشکم سەیر جەنجاڵ بوو. بە پێچەوانەی جارانەوە هاتمە ڕاڕەوەکە- و ملم لە راوێچکان نا. دەرگەزی یەك دوو هەڵوێستەی کردن و گوتی کە حاڵی زۆر باشە و دوێ شەوێ چاك نوستووە، و ... گرنگ نییە... و من دەروخسارییەوە رامام. ماوەیەکی دەجێیدا هەر جینگڵم دان- خەوم لێنەدەکەوت: مامە مەشەدی، و پوورە گوڵبەهار، و عالیە و محەممەد عەلی و حوسێنم، بە بەردەوامی بە مێشکیدا دەهاتن و دەچوون. خەوم زڕا... هەمدیس هاتمەوە دەرێ. کوڕەکان دە ڕاڕەوەکێدا نوستبوون- جێیەکە بەر تەسك بوو، بۆیە هەندێکیان دە ڕاڕەوەکەیدا دەنوستن. حوسێن لە بارێ بەرەوەی ڕاڕەوەکەدا نوستووە، سەری بەسەرلایەکی سەرینەکەیدا لار بۆتەوە، زەردەیەکی تەنکی بەسەر لالێوانەوەیە. خەونێ دەبینێ؟ چ خەونێکی خۆشە، وا زەردەی دێنێتە سەرلێوان؟... پاسەوانی نێو ژووری بەندیخانەکەش لەسەر قەرەوێلەکی تەنیشت ئاو دەستێوە، دانیشتووە و وێژینگان دەدات؛ پاسەوانەکەی سەربانی دەگەڵ ئەویدیکەی نێو تاوەری پاسەوانییەدا قساندەکات، دەنگیان لە پەنجەرە بچکۆلەکەی ژووری ئاو دەستێڕا دەگاتە گوێ: ((هێشتا پارەی زێدەکارییەکەی ئەم مانگەیان نەداوە...)) پڕۆژێکتەرەکە دەگەڵ هەر سوڕانەوێکیدا پەنجەرەی ئاودەستەکە کەف ماڵ دەکاتەوە.

مش مەمەد بێدارە؛ هەروا چەنەی لێدەدا، و لەولاولای سەرینەکەش لە جگەرەی دەگەڕێ... مش مەمەد کرمانجە (لادێییە) —حاڵی شڕە- چاك و چۆنییە دەکات. قوتووی جگەرەکەم



دەردێنم و فەرمووی لێدەکەم. بە تاسەوە جگەرەیەك هەڵدەگرێ؛ شخارتەکە لێدەدەم؛ جگەرەکەی بەسەر و بنی دادەگیرێنێ، لە قونچکێوە: لەو جێیەی کە تاجەکەی پێوەیە. ئەوەشیان جۆرە خەباتێکە. دوایە هەروا سەرەو بن دە گۆلمێی دەگرێ، هەروەك جوچکە چوێلەکێکی دە مشتی گرتبێ، بە هەردوو دەستانی دەگرێت، تا ڕووناکییەکەی دیار نەبێ — هەر دیار بێت ئینگلیزەکان پێدەزانن!

قسە ناکرێن؛ کوڕەکان نوستوون، و منیش کەوتوومەتە خەیاڵان. بەراستی ژیانێکی سەختە. لەوەی ناخۆشتر هەیە کە بارودۆخێك بێتە پێشێ پیاوی دەگەڵ نزمترین و سوك و چرووکترین کەسی هیچ و پووچدا ڕاگرن و هەر ئەوانەش بە تێکڕای دەنگ: بە باشتر و پیاو چاکتر دەستنیشان بکرێت؟ بۆ نموونە هەر ئەو موحەقیق زادەیەی بێنن و دەگەڵ ئەو مەئمور و ئەو سەرۆك روکنیدا بەراورد بکەن، و خەڵکی بەوەی دەمکوت کەن کە گوایە خەڵك و کۆمەڵگا هونەر ناس نین، بێن چارەسەری کێشە و ئاریشەکان و دادوەرییە بە ملی مێژوو و ئایندەدا بێنن و لە ئەستۆی وانی گرێدەن! ژانەکان دەستۆی مێژوو ناخرێن. ژانەکان ژانی منن؛ ئەوە منم دۆڕاوم، و دەدۆڕێم؛ منم کە ئابڕووم چووە. مێژوو گاڵتەی ئەوەم پێدەکا، کە نەمزانیوە و ئەقڵی خۆمم دە دەست کەسانێکی بێ ئاگا، یا بە ئاگا ناوە و داویانمەتە دەست داوەرێکی؛ کە نەمزانیوە چوومەتە ژێر رکێف و فەرمانی کەسانێکی ئەوتۆوە کە کەس نەیدەزانی کێن و کوڕی کێن و نەیاندەزانی دەر و ژووریان چییە و چ نییە، یا ئەگەر زانیبیشیان بەمنیان نەگوتووە، و وەك ئامێرێکیان دەکار هێناوم و سوودیان لێوەرگرتووم... ئایندە هەر هێندە دەتوانێ بڵێ کە کارەکان ڕاست نەبوو ون، کە هەڵەبوو ون، و دەبێ پەندیان لێوەرگیرێ و نەهێڵرێ هەڵەکان دووبارە ببنەوە! بەڵام من چی؟ ئاخر ئاییندە هەر ئایندەیە، هەڵەی ئایندە تایبەتە بە ئایندەوە. دەبێ پەندی لێوەرگری! پەند لە من، یا لەو کەسەی کە ئێمەی دووچاری ئەم بەڵایەکرد؟ - بەڕووواڵەت پەند وەرگرتن لە من، چونکە من ئێستا و دەو هەلومەرجانەدا، و دەو قۆناغەیدا، ئیدی بوونەوەرێکی هۆشمەندم- دەبوو هەر زووتر بیربکەمەوە! لەبەرئەوەی وەك دەڵێن تەرازوو دوو لاتای هەیە جاری وایە جۆی پێدەکێشن و جاری واشە زێڕ- گوایە ئێستا نۆرەی زێڕەکەیە. ((جەنابی ئەجەل، ئەو کارەی کە تۆ دەیکەی ترسناکە- بەو جۆرە، کۆ کوژییە)). ئەوە قسەی بابەی بوو کە هەرگیز نەدەچووە گوێم، ئەگەر گوێشم دابایە ئەوە لە گاڵتە پێکردنێ بەولاوە چ وەڵامێکی دیم نەبوو ((ئێوە وەك گەڵایەك وان بە دەستی خۆتان، خۆتان لە دارێ دەکەنەوە. ئەو

گەلاێەی لەدارێش بێتەوە ئەوە مردووە؛ جارێکی دی بە هەزار کە تیرە و چەسپ و سرێشان ناتوانی پێوەی خەیتەوەو بیلکێنێتەوە- پێشیەوە بلکێنێتەوە هەر بێسوودە- دارەکە هەروا زیندووە و گەلاکە مردوو!)) سەیرکە... هەر لە ئێستاوە پیربوون... باشە، من لە حوسێنێکی بەولاوەترەوە ناناسم. کێ دەڵێ هەموویان یان زۆربەیان بەسەرهاتی لە ئی ویش تاڵ و سوێرتریان بەسەرنەهاتووە و نیانە؟ هەریەکە بۆخۆی دەریایەکە، لێواو لێو چیرۆك و سەرگوزەشتە و داستانن... کوڕەکان هەموو پیرببوون؛ پیریەکی وا کە جارجارە تروسکەی لاوەتیەیان بێدە سەلاتانە لە چاوان سەری دەکرد و دەهاتە دەرێ. ئیدی ئەولاوە نەبوون کە ناوە ناوە غەم دایانگرێ و دەخۆیانەوە پێچێ و رەشەبایەکیان لە کەلێن و قوژبنێکی مێشکییەوە هەڵکات و تۆز و خۆڵ و گەردی پیرییە بێنێ و بۆ ماوەیەکی، بوونیان، دەخۆیەوە لول دات... تازە ئیدی پیربوو ون، خەریکن دەڕزن. بیر و ئەندێشەش هەروا لە خۆوە هەست بە زیندانییە خۆی دەکات. چ بکەن لەلایەکەوە ئەوە زیندان بوو بەخۆو بەو بمرە و بژی و ئامین، و دیدەنی و سەردانی سێ دەقیقەیی، و تاوەری چاوەدێری، ولێك خڕبوونەوەی هەیوانێ و ووتار و ئامۆژگاری ((باوکانە))ی بەرپرسانییەوە... لەلایەکی دیکەشەوە دەری زیندانێ، کە زیندان و بەندیخانەیەکی هەراوتر بوو- بەندیخانەی رەهای خاو و خێزانان. بۆیە بیروبۆچوون لێکدانەوە نەزۆك دەبوو، و سەرنجەکان پەرت و بلاو، سەرپێچ و یاخی- مێشك دەستووری نەدابوونێ و رێڕەوی بۆ دیاریی نەکردبوون: مێشك ببووە جێی تارمایی و شتە نادیارەکان و دەبن دەستی واندابوو، و سەرنجەکانیش، هەتیو و بێکەس و بێدەر؛ تا ئەو دەمەی سەرەنجام دەنگێك، وتەیەك ئەو تارماییانەیان لەو وەلامەی ژووری مێشکدا راونابایە و تیڕوانینەکان هاتبانایەوە سەرباری ئاسایی و رێ بە دییان کردباییە... لەخۆوە پێدەکەنم: دیسانەوە یەك لەو چیرۆکانەی بابەم وەبیر دێتەوە: دەیگوت پیاوێك مەسەلەیەکی کۆنی دەگێڕایەوە: لە بارەی خۆخاڵی کردنێ و دەست بە ئاو گەیاندنێوە. دەنێو مەجلیسەکەشدا شوانێکیشی لێبوو... پیاوە کە دەیگوت لەسەر پێشاوێ نابێ بەرەو قیبلە دانیشی، نابێ روو لە بارێ سەرەوەش کەی چونکە پشتت لە قیبلەیە؛ خۆ بەرەو خۆرئاواش هەرنابێ، چونکە روو لە قودسە؛ بەرەو خۆرهەلاتیش ئەوە هەرکاری کردنێ نییە، چونکە پشت لە قودسە... دەو دەمەیدا بانگی شوانەکەیان کرد و گوێی لە کۆتایی چیرۆکەکە نەبوو. بۆ سبەینێ لە دەشتێ میزی دێت. رووی دە قیبلەی کرد، سوڕایەوە؛ رووی دەبارێ سەرەوە کرد دووبارە سوڕایەوە تێما، ئەوجا کیری بەدەستەوە گرت و بەهەر چوارلایاندا سووڕا هەربۆی نەکرا. تا وا



تەنگاو بوو چاری نەما و خۆی رانەگرت و بەدەم سوڕانەوێوە پەلامیزەی بەهەرچوار دەوری خۆیدا هەڵدا، و گوتی: ((خوا سەر لەو کەسەی بشێوێنێ، سەری لێ شێواندین!)) راستیەکەشی هەر ئەوەیە، خوا سەر لەو کەسانە بشێوێنێ کە ئاوایان سەر لێ شێواندین... دێمەوە ژووری؛ درێژ دەبمەوە... سەرەنجام خەوم لێدەکەوێ. خەونان دەبینم- خەونی ئالۆز و تێکەڵ و پێکەڵ. شێخ زەینول عابید دەخەوێدا دەبینم، کە هەرگیز نەهاتۆتە خەونێم، بەلام دەشزانم کە ئەوە شێخ زەینول عابیدینە- بەخۆ و بەمێزەرێکی زلەوە، هێندەی هێلانە حاجی لەك لەکێکی؛ سوور و ملەستوور، چاوزیت و ئالۆش، و دەنگ گڕ، و ورگن... شێخ زەینول عابیدینە و شێخ زەینول عابیدینیش نییە- مەلا حەسەنە، بەخۆ و بە لووتە باریکەلانەکەی و رەنگە زەرد و چاوە برسی و ترسنۆکەکانیەوە... تازە لە نەخۆشییە هەستاوەتەوە. بەراستی مەلا حەسەن زەحمەتی کێشاوە: بەودەمی پیرۆزی وی بووە کە خودا دووبارە منی بەداپیرەی بەخشیوەتەوە، بۆیە دایەگەورە واپشتی بەوی قایمە... باسی عەرش و قوڕشی دەکات —بە پشتیوانییە خودای نوشتویێکی بکات هەر دوای یەك حەوتووان بەرهەڵدا بن... دواییش کتوپڕ تێکەلاوبوون و بوونە مەلا حەسەن قازی عەسکەر و شێخ زەینول عابیدینی دەرباری- زیاتریش بەلای شێخ زەینول عابیدینیدا بوو- گوتی بێ زەحمەت بچم بپرسم داخوا سەعات چەندە، نوێژی عەسرێ بووە؟ چووم، هەرکە گەیمە بەر دەرکێ، هەروا لە خۆوە ئاوڕێکم دایەوە: خەریك بوو قەندی نێو قەندانەکەی دە بەرکی خۆی دەکرد. هەر کە چاوی بە من کەوتەوە قەندانەکەی بەنیوەییەوە دانایەوە؛ گەرووی پاك کردەوە، و سوبحانەڵلایەکی پێدادا، دوایە بۆ داپۆشینێ کارەکەی کلۆقەندێکی دەزاری هاویشت...وەی، چ سەیرێکی کردم! لەو سەیرکردنانەی کە دە ئەفسانانیاندا دەگێڕنەوە! دایکی پۆلازرێ خۆی کردۆتە فەروخ لیقا، بەلام لەپڕ تەلیسمەکەی دەشکێ و پەردەی لەسەر روو لادەچێ و روخسارە پڕ چرچ و لۆچ، و لێوە ئەستوورەکانی لە بن پەردەی رووە جوانەکەی فەروخ لیقاوە دەردەکەوێتەوە. بە دینێ روخساری دێوەی دەموچاوی شەعبانیم وەبیر هاتەوە- جەللادی بەندیخانەی زرەهی: چ دەموچاوێکی دزێو و کرێت و ترش و تاڵ، و چەند بێ ئابڕوو... لە خەوێ راپەریم. وە سەر ئارەقەی گەڕابووم. قۆڵی موختاریم لەسەر دەوی بوو و هەناسەی لێ بڕیبووم. هەوڵمدا ئەو خەونەی لێك دەمەوە! باشە خۆ من جگە لەو دیدەنییە دوای نیوەڕۆیە چ شتێك و بەرژەوەندییەکی نەبوو. بلێی ئەو خەونەم پەیامێك و ئاماژەیەك بووبێ بۆ ئایندە؟ نازانم...

**(٢)**

پێرێ شەوێ کتوپڕ بە ماڵێ وەربوون. شەو درەنگان بوو- شەو درەنگانی شارۆچکەیەك. دایی تازەی پیاڵە و قۆری و ژێرپیاڵەی چای خڕکردبوونەوە، هەروەك جاران پێش جێ و بان راخستن و گاڵەدانێ دەرکی حەسارێ، هەروەك خووی هەموو دەمێی دەستی دە ئەژنۆیان وەرێنابوو و دە دنیای خۆیدا، ئەو دنیایەی کە من هەرگیز سەرە دەریم لێ نەدەکرد و پەیم پێنەدەبرد، رامابوو و خۆی رادەژاند.

دەو جۆرەکاتانەشدا، جارجارە وەك لە بن لێوانەوە گۆرانییان بڵێ، ورتە ورتێکی دەهات بەلاواندنەوە و سەر دولکەی ژنان نەدەچوو، زیاتر کۆنە غەم بوون بە بایەدان. دەیگوت:

((فەلەك تێکتدا بنە و ئەساسم

خماویت کردن دەرپێ و کراسم

ئەگەر دەشتەوێ، گیانم دەربێرە

با بسرێتەوە، هەواڵ و باسم))

ئەوجا هەناسێکی ساردی هەڵدەکێشا و فرمێسکی دادە باراندانەوە و دەستی پێدەکردەوە:

((من کە شەو و رۆژ روو لە بیابانم

وشك نابنەوە، ئەشکی چاوانم

نەتام گرتووە و نەهیچ جێم دێشێ

هێندەی دەزانم، دەم بە ناڵانم)).



سەیرەکەش ئەوەیە کە منیش هەر دەزانم، نەتای لێیە و نە چ جێشی دێشێ، کەچی ئەو هەموو ناڵە ناڵ و نرکە نرکەی لەچی و بۆچییە.

مانگی محەڕڕەمێیە؛ کوڕەکەی گیراوە- وەك دایی دەڵێ، لە هەمەدانێیە. و دواییش بە وەخت و ناوەختان، بەهۆ و بەبێ هۆ، هەر هەلێکی بۆ بڕەخسێ ئیدی ئەوە بۆی تێرا هەڵدەکاتەوە گریانێ، زیاتریش ئەو دەمانەی کە ((باب)) لە ماڵێ نییە. چونکە هەر چاوی تەربان باب لە پێستی خۆی دەهاتە دەرێ و کافر دەبوو و لە بن لێوانەوە دەستی پێدەکرد و خۆ ئەگەر داییش نەیبڕیبایەوە ئیدی بە تورکی تێبەر دەبوو، لە دەمو دووی قسەکانیڕا وێدەچوو کە مەبەستی دڵدانەوە و لاواندنەوە نییە- بەڵکە گلەیی و گازاندە و تانە و تەشەرن. بەلاّم تانە و تەشەر بۆ- نەمدەزانی. مەلیحەش هەر نەیدەزانی.

دایی و باب خەڵکی دەوروبەری (ساوە)ن و بە منداڵی لە هەمەدانێ ژیاون. وەك زۆرجاران لە مەلیحەی دەبیسم ئێمەش هەر لە (هەمەدان)ێ لە دایك بووین- بەلاّم من ئەوەم وەك تارماییەکی دێتەوە یاد- هەروەك فلیمێکی لێڵ و پێڵ دە خەوێکی ئالۆز و دێریندا؛ فلیمێکی ئەوتۆ کە بەشی زۆری سڕابێتەوە، و خەونێك کە زۆربەی زۆری لە بیرچووبێتەوە، هەروەك نووسینێکی رەش کرابێتەوە، و شوێنەوارەکەی مابێ و هەمدیس بەسەریدا هاتبنەوە و شتی دیکەیان لەسەر نووسیبێتەوە. جێ نووسینەکەی پێشوو رەشکردنەوەکەی هەموو هەست دەکەم، و دەزانم کە وەختێ خۆی نووسین بووە، بەلاّم نووسینەکە چ بووە- ئەوەی نازانم، هەرچەندە بە یارمەتی ئەو قسانەی بەرێکەوت لەزاری مەلیحەی دەردەپەڕین، توانیم چەند سەرەپەتێکان لەبارەی ئەو شتانەوە هەڵکەمەوە، کە بە هیچ جۆرێکیش ناتوانم پشتیان پێ ببەستم و بەراستیان بزانم، چونکە هیچ کاتێ دایی و بابە نەیانویستووە ئەو لێکۆڵەرەوە لاوە، یانی من، دەربارەی ئەو لێکۆڵینەوانە یارمەتی بدەن، و تەنانەت وەك هەستیشی پێدەکەم هەوڵدەدەن ئەو نووسین و یادداشت و بیرەوەرییانە زیاتر بسڕنەوە و زیاتری تاریك و لێڵترکەن، مەلیحەش وەك گەورە کچی هەر ماڵێکی سرتوڕی دەگەڵ دایکیدا یەکە، و هەستی لێنایە... چۆن هاتین، چ قەوما هەتا بێین، بۆ کوێ دەچووین، بۆ هاتین، ئەوەش بەواتەی داییم بۆ ئەو پەری دنیایە، و بۆ ئەو پەناپەسیوە چەپەکە —بەڕاستی لێشم روون نییە و هەرگیز پێشم وانییە رۆژێك لە رۆژان پەردە لەسەر ئەو نهێنییە لاچێت و ئەو تارماییە روون ببێتەوە- جا مەگەر وەك زۆر شتی دی

رۆژێك لەكەلێن و قوژبن و پەنا و پەسیوێکەوە ((بەڵگەیەك)) کە هەرگیز بە خەیاڵی کەسدا نەهاتبێ و چاوەڕوان نەکراو بێت- کە هەر واشە- لە پڕ سەر وەدەرنێت و سەرەپەتێك بداتە دەست، تا ((مێژووناس))ێکی وەکو من بتوانێ بەهۆی ئەو سەرە پەتەوە سەرلەنوێ رابردوو هەڵنێتەوە و نهێنیەکانی روون کاتەوە و کەلێنە شاراوەکانی بداتە بەر روناکی سەرنج و تێڕامان- ئەڵبەتە ئەوەش وەك دیارە هیچ راستییەکی تێدانییە، چونکە مێژووناس و لێکۆڵەرەوە هەرنەبێ لەسەرەتاوە شتێکیان دەربارەی کارەکانیان دەبەرچاو گرتووە و نەخشە و پیلانێکیان داڕشتووە... ئەوەی کە منیش دەیزانم هەر هێندەیە کە هەر کاتێك ئەو باسە دێتە گۆڕێ، یا ئاماژەی پێدەکرێ، دایی بێ یەك و دوو، و بێ راوەستان لە ناخی دڵ و دەروونییەوە هەناسێکی ساردی قووڵ هەڵدەکێشێ. هەروەك دەبدەبەیەکی منداڵانەیان دەجێیەکیدا شاردبێتەوە و هەمیشە لەسەر پێ بێ و من هەمیشە بەوەخت و ناوەختان —و هەمیشەش بە ناوەختان- پێیەکی پێدابنێم، و هەر کە تینی گەیشتێ لاستیکی تاین ((فس)) لە جێی خۆیەوە فش بێتەوە. بەڵێ هەر بە بچووکترین ئاماژەیەك ئەو هەناسە بەرەڵڵا دەبێ. جاری واشە ئەو باسە هەر لە گۆڕێشدا نییە کەچی وەك بە ئامێرێکی کۆنترۆڵەوە بێ، هەر دورا و دور ئەو لاستێکە خۆی ئامادە دەکات و هەناسەی ((دایی)) بەرهەڵدا دەبێت و سەردەکا. هەر بە دوای ئەو هەناسەشدا ((خودا زەلیلیان کات ئینشاڵڵا))یەکی بەدەمدا دێت... وەك نەفرینی پێ لە من بکات کە پێم بە دەبدەبەکەدا ناوە و هەواکەیم بەتاڵ کردۆتەوە! و فرمێسکی لە چاواندا قەتیس دەمێنێ — وەك بڵێی لە داخی من...

هەر ئەوەندەم لە بیرە کە من و مەلیحە —زیاتر من- بەوە دڵخۆش بووین کە ماڵمان گواستبایەوە و چووباینە جێیەکی تازە و ئاواڵی تازەمان پەیدا کردبان- لەناو لۆرییە لەسەرباری جێی خۆمان خۆش کردبوو- و ئەوە ئوتومبێلەش تا دێ تینێ تێدەکا. هاوارمان دەکرد و دەتریقاینەوە. بە پێچەوانەی دایی و بابەی کە زۆر ناراحەت بوون. دایی دەگریا و بەردەوام چمکی سەرپۆشەکەی بە گۆشەی چاوەکانیدا دێنا و بەریدەدایەوە- جاری واش بوو بەدەم رێوەچمکی سەرپۆشەکەی — بە بەرلووتییەوە- دەنا. باوەگیان نەدەگریا- باوەگیان هیچ کاتێك ناگریەت. بەڵام تێکچوو بوو: شین و مۆر ببۆوە و زەرد هەڵگەڕابوو. چاوەکانی نەدەسرەوتن، سەروریشی هاتبوو. دڵنیابووم ئەگەر ئەو ریشەی لە روومەتم سوببایە دەموچاوم هەمووی دەبووە خوێن: وەك ئەو جارانەی کە کەیفی ساز دەبوو و ریش و چەناگە چاڵەکەی لە دەموچاوم



هەڵدەسوی و ختووکەی دەدام. دایی و بابەگیان وەك بە فەرمانی دەوڵەتێ بچنە سەفەرێ؛ پەلەی گەیشتنە جێیەیان نەبوو. بەڵام ئێمەی منداڵ، وەك هەر منداڵێکی دی پەلەی گەیشتنە ئایندەمان بوو- ئاینده، جا هەر ئایندەیەك.

لە چایخانەیەکی سەر رێیە نان و پەنیرێکمان خوارد، و نوستین، و بەیانییەکەی هەمدیس دایی و باوەگیان و مەلیحە هەریەکە پت و بزگوڕێکیان تاودایە- یەك لە بن هەنگڵێ و یەك لەسەردەستی و یەك لەسەر سەری و بەکۆڵێ- کەوتینە رێیە بەپێیان، تا لە شاری وەدوورکەوین، بۆوەی کە ئوتومبێل هات ئێمە لەسەر جادەی بین. ئێستا تێدەگەم، کە ئەگەر هاتبایە لەناو شاری یا لە چایخانەکە سواربووباین پارەی زیاتریان دەستاند. بەدەم رێوە شوفێر پێیوایە دەتەوێ بە پێیان بڕۆی، و خەریکی رۆینێی- و زۆر پێداناگرێ بۆ کرێی، دایی بەدەستێکی دەستی من و بەدەستەکەی دیکەی سەماوەری پێ گرتبوو، و منیش جار جارە وەدوای قانگەلاشکان دەکەوتم، کە (با) بێرەو بەوێی دادەدان و بەردم تێدەگرتن، یا بەردم هەڵدەگرتنەوە و هەرچیم دیتبایە و نەدیتبایە بەردێکم داویشتێ؛ داویەش شل و شەپڕێو و ماندوو، وەك سەی بەرمەڕی، کە دێتەوە پەنا شوانی، دەهاتمەوە نێوەوان...

رۆژێکی تا بەرە بەری نیوەڕۆیە لە کەناری جادەی ماینەوە، ئوتومبێل باسێکی نەبوو. بەناچاری لەسەرگیای قەراغێ رایەخمان راخست، و چامان لێنا، و نان و پەنیرێکمان خوارد- ئای کە خۆش بوو! نوستبووم کە مەلیحە رایتەکاندم: ((هەستە ئوتومبێل هات!))، ئوتومبێل هەروا دەهات، و تەپوتۆزی لە دوورەوەڕا دیاربوو. بەپێچەوانەی جارانەوە، هەر کە گوتی ئەوە ئوتومبێل هات وەك فیشەکە شێتەی دەرپەڕیم و بەرەو لای ئوتومبێلەکە کەوتمە غاردانێ. باوەگیان تووڕە بوو. گەڕامەوە؛ باشە ئاخر نەدەبایە واپێشاندەین کە چاوەڕێی ئوتومبێلین.. گەیشتینە بیجاڕ- هێشتاش شتێکمان مابوو بگەینێ- هەر لەو گەراجەی کە ئوتومبێلەکەی لێ راوەستا- ژوورێکمان بەکرێ گرت. نەمانزانی شەوەکە چۆن رابورد. هەمووومان شەکەت و ماندوو بووین؛ کەس هیچی نە دەگوت: نان و پەنیر و چایەکمان خوارد، و نوستین. وەبیرم دێ- رێك نازانم، بەڵام وەك ئێستام لە پێش چاوانە- کە دایی هەر لەو ژوورەی گەراجەکەدا، وا لەبن سەماوەرێ دانیشتبوو، دەتگوت ئەوە نەك هەر ئێستا، بەڵکە سەد ساڵە دانیشتووە. هەروەك جاران شوشەی لامپاکەی وا جوان سڕیبۆوە- پەڵەی پێوە نەبوو...

گەردی بەیانی باوەگیان دامودەزگایەکەی تاودابوویە و ڕۆیبوو: سندوقێك بە چەند قوتووە بۆیاغێکەوە دوو سێ فڵچە و چەند پارچە و پووچە پەڕۆیەکی خاوێن کردنەوەی کەوشانەوە، وە دەرکەوتبوو. کۆڵان بە کۆڵان گەڕابوو و پێڵاوی بۆیاغ کردبوون: دوو فڵچەی بە بزمارییەوە بە سندوقەکەیدا شۆڕکردبوونەوە، تا خەڵکی ببینن و بزانن ئەوە بۆیاغچییە و پێڵاوان بۆیاغ دەکات...

نیوەڕۆیە هاتەوە... من لە حەساری ((گەراج))ەکەی یاریم دەکرد: وەك پیرە پیاوان دەچوومە دەستشۆری (ئاودەست) و بەدەنگێکی گڕو ناقولاوە دەمگوت: ((ئەهە)) و کاتێ کە دەنگەکە لەناو ئاودەستەکەیڕا دەهاتەوە و وەڵامی دەدایەوە: ((ئەهە)) کەم هێندەم پێ خۆشبوو، زۆری نەدەما لە خۆشییان لەخۆچم. بەردەستی پەنچەرچی شوفێرەکان بووم. دامودەزگای پەنچەرچییەتییە ئەودەمی وەك ئی ئێستا نەبوو. ئوتومبێلیش کەم بوو: تا ئەو سێ چوار ڕۆژانەی لە بیجاڕی بووین لە ئوتومبێلێکی بەولاوە زیاتر نەهات. ئەودەمی کاکی شوفێر ((چووپ))ەکەی دەردێنا و دەئاوێی هەڵدەکێشا تا پەنجەرەکەی دەدیتەوە و ئەو چووپەکەی وشك دەکردەوە؛ جێ پەنجەریەکەی بە سمارتە (سمپارە)ی دەڕنی، ئەوجا پارچە لاستیکێکی ڕەش یا سوری دێنا و بە قەدەرجێ پەنچەریەکە بەشێوەیەکی خڕ یا درێژ لاکێشی دەبڕی، دوایی تیوپە چەسپێکی دێناو کە سەرەکەی دەکردەوە بۆنێکی خۆشی لێوە دەهات و لاستیکە بڕاوەکەی بەو چەسپە دەکرد و لەسەرجێ پەنچەریەکەی دادەنا و بە مەنگەنەیەك دەیجەڕاند تا بە تەواوی دەیگرت. ئەوجا شخارتەی دێنا و ئاگری بەجێ پەنچەرییەکە و دەرمانەکەوە دەنا و ئەویش کڵپەی دەکرد و دەیگرت- کاکی شوفێر گوایە هەر بۆ گەنجەفان ئەو ئاگرەی پێوە دەنا، کە دەشبووە ڕاستی و ئاگرەکە تینی دێنا ئەو دەکەوتە حەولان، پفەپف چۆنی وەمرێنێ. منیش هەر دەکەوتمە یارییە دانێ کوژاندنەوێ- چام بۆ کاکی شوفێر بانگ دەکرد، و لە بری هەموو ئەمانەش بەراتەکەم ئەوە بوو بچمە نێو ئوتومبێلەکەوەو لەپشت فەرمانەکەی دانیشم و وەك شوفێرەکەی لێخورم: گیانمی... بڕۆ دەی بڕۆ! پێم لێدەنا و گازم دەدایە، بەڵام چۆن، ئەوە هەرلەجێی خۆمەوە گوایە لێدەخورم، بەڵام چۆن لێخوڕینێك؛ وەك بای سەرسەرێ داژۆم، هەروەك شوفێرانیش، لەکاتی خێرا لێخوڕینێدا خۆم بەولاولایدا دەدا و خۆم داویشتە سەر سوکانێ، یانی بە قورسایی خۆم ئوتومبێلەکەم بێرو بەوێدا دەبرد!...



لە دەمودووی دایی و باوەگیانیڕا دیاربوو کە کاروبارەکەی باوەگیانی ناسوڕێ و چ ڕەونەقێکی وای نییە و دووبارە باوەگیان بە نیازە بارگە و بنەی تێك نێتەوە و وەڕێ کەوێتەوە. بۆ کوێ؟ بە واتای ئەوڕۆ بەرەو ((کەسنەزانێ))و بەگفتی باوەگیانێش بەرەو ((قیسمەت ئاوا))یە. من ئەودەمی پێم وابوو قیسمەت ئاواش شارێکە، وەك (بیجاڕ)ی، و بەڵکە لەویش چاکتر. دایی دەیویست وەمێنین.

دەیگوت: ((باشە چەندی دی!؟)) یانی دەبێ چەندی دی لە هەمەدانێ-و بێگومان لە کوڕەکەی- دوورتر کەوێتەوە: کوڕەکەی لە زیندانێدابوو. ئەوا ئێستا دەزانم- ئەو شتانەم هەموو بەو جۆرە وەسەریەك خستنەوە. بەڵام باوەگیان دەیگوت کە ئیدی- ئەم ئیدییەی بەگرژی و مۆنیەکی وا سەیرەوە دەگوت- کە ئیدی نایەوێ لەنێو ئەو کۆمەڵە خەڵکەدا بژی (بیجاڕییەکانیش هەموو کورد بوون- بەڵام کوردی شیعە) و هەر بۆیەش دەڕوا تا لەناو ئەوانیدیدا بژی. بۆیەش! هەروەك لە خودا و هەرچی ئیمامەکانە لالووت بووبێ، تاکو بەو لالووتی و ڕوو وەرگێڕانەی و بە کوێری چاوی ئەم خەڵکی خوایانەی ئێرە دەڕوات و تا هەتایە نەفرین و بەدبەختی بۆ خۆی و منداڵەکانی بکڕێ و بچێ لەناو سوننیان بژیەت! وەك ئەوەی بڵێی دەچم و لەناو هۆزە ئادەمخۆرەکاندا دەژیم، لێگەڕێ با بمانخۆن و ئاسودەبم! دایی دەیگوت: ((باشە ئەوە تۆ وا ڕقت لە خۆت هەستاوە، ئەم منداڵە بێگوناهانە چ بکەن...)) باوەگیان دەیگوت: ((جام، کە پڕ بوو لێی دەڕژێ... کە هەر بڕیاربێ پیاو بچتە دۆزەخێوە، دەتوخوا با (١٠) دە پلە بەرەو خوارتربێ)).

من دەو قسانە نە دەگەیشتم و قسەی تەمەنی من نەبوون، و نەمدەزانی کام جام و کام ئاو، یا بۆ دەچینە دۆزەخێوە... دایی هەروا هەناسەی ساردی هەڵدەکێشان و مات و مەلول و بێدەنگ هەستی لە خۆ بڕیبوو. ئەو جۆرە ئاهو هەناسانە، سارد و سۆڵە و غەمی تەواوی پایزی سەدەکان و گەردە لول و تۆف و زریانە بەستەڵەکەکانی تێدا کۆببوونەوە. بەهەر هەناسێکی لەو هەناسانە هەزاران گەڵا دەوەرینە سەر زەویی دڵی و هەزاران باسریشکی بەسەر پانتاییە دەشتەخەزان لێکەوتەکەی گیانیدا تێدەپەڕی و سەوزایی و مێرگەپان و پۆڕەکەی گیانی سیس و ژاکاو دەکرد... ئەوانەش هەموو ئێستا دەزانم.

سەرلەنوێ بارگە و بنەمان تێکنایەوە و کەوتینەوە ڕێ- هەروەك جاران؛ تەنیا هێندە نەبێ پێش ئەوەی بگەینە نێو شاری لە ئوتومبێلێ هاتینە خوارێ؛ شەوێ لە چایخانێکی ماینەوە، و سبەی بەیانی زوو، دەستوبرد وەڕێ کەوتینەوە: بە چوار دەوری شاریدا سوڕاینەوە- چ سوڕانەوەیەك، بە جۆرێك دایی هێندەی دەشارییەوە هەڵڕوانیبوو و هێندەی چاو پێداگێڕابوو ملی خوار ببوو. چوینە وسێناوایە- دیسانەوە بۆ چایخانێ... و سەرلەنوێ ڕێ کردن- ئێستا ئەوە لێرەین: لە شارۆچکەی بانە...

ئەوە لێرە دەژین. ژیانی ئێرە تابلێی ژیانێکی سادە و ساکارە- یانی ئەوە دەبینی ئیمامی مزگەوتی شاری بێکارە و لە سەربانی ئاشی بەرماڵێ خۆیان دێت و دەچێت، جارجارە لەسەرخۆ و هێندێ جارانیش خێراخێرا راوێچکان دەکات- بە گوێرەی ڕۆژ؛ و وەك ئاشی، هەندێ جاران زۆر خێرا و زۆربەی وەختانیش هێواش و نەرم و لەسەرخۆ؛ و نێوانی ئیمام و شێخی شاریش هەروەك هەمیشەی خودای- هەتا ڕۆژی قیامەتێ- هەروا سەی تێڕیاوە، و شێخیش هەر بێکارەیە و هەروا لەبەردەمی مزگەوتێ قسان بۆ خەڵکی دەکات و پاشەملەش تیر و توانجان بە ئاشکراو بەنهێنی داوێتە ناحەزێی- ئەو زۆر بە ئەدەبانە- زۆر جارانیش قوندە قسەکانی بۆ ئەو خەڵکە ڕەشوڕووتانە پێویست بە ڕوونکردنەوێ دەکەن. ئەو جارانەش کە تەلاق مەلاقیك دەکەون بارودۆخەکە بەلای مەلایدا دەشکێتەوە و بارەکە ڕاست دەکاتەوە. لەو لاشەوە ئەوە لێپرسراوانن خەریکی سەرۆکایەتی و قۆستنەوەی چەپ و ڕاستی خۆیانن. ئەوە قایمقامە، لە لایەکەوە کە خودای شارۆچکەکەیە، ئەوەش جەنابی سەروان موجتەبایییە کە زوو زوو سەر دەماڵێ جەنابی قایمقامی هەڵدەکا، و خزمەتکارەکەی جەنابی قایمقامیش ئەوە هەر هیچ کە بە بچووکترین خزمەتێکی خانمێ پاداشتی خۆی وەردەگرێ؛ جەنابی قایمقامیش بۆ خۆی لوتفی دەگەڵ ماڵ و خێزانی سەفوەتیدا هەیە؛ ئەوە حەزرەتی (ئەجەل)یشە کە لە بنکەی لەشکری قەراری گرتووە و پەیدەرپەی جاسوس و چڵکاو خۆران ڕادەگرێ! و ئیسماعیل خانیش ئەوە هیچ کە دەستوری پێیە ((بە کوڵك و پێستەوە)) هەربێنێ. حاجییەکانیش کاریان تەواوە، و لە سایەی پڕشنگ و لەبەر ڕۆشناییە ((ئەمنییە)) و دڵنیاییە، تا دێن قەڵەو و تەنگەستوورتر دەبن. تا ئەستوورتریش دەبن زیاتر بەسەروەختی شێخ و مەلایان ڕادەگەن. ئەو چەند بێگانانەی گەڕەکێش کە هەن، ئەوانیش هەروەتر ((ئەرکی)) سەرشانی خۆیان بەجێ دێنن و بەشی خۆیان دەنێرن، ناوە ناوەش هەواڵ و دەنگوباس لە شاریەوەڕا دێن کە گوایە هەر بەو زووانە ڕەزا شا لە



تەخت و بەختی خۆی دەکەوێت و چارەی وندەبێ؛ بەڵام ئەوەیان دیارنییە کە بەدەستی کێ ئەوە دەکرێ، و ڕەزاشاش ئەوا هەروا لەسەر تەخت و بەختی خۆی پاڵی داوەتەوە و مێشیشی میوان نییە.

ڕێچکەی ژیان سادە و ساکارە؛ شتێکە وەك ژیانی دوای تاقیکردنەوێ؛ تەنیا ئەو جیاوازییە نەبێ کە کەس ئامادە نییە خۆی بە لێپرسراو بزانێ و ئامادەبێ ئەنجامەکان ڕاگەیەنێ و کەسیش ئامادە نییە ئەنجام وەرگرێتەوە. هەر دەڵێی سەردەم، سەردەمی چاخە زێڕینەکانی مێژووی کۆنی بەر لە ئێستایە، وەك دەگێڕنەوە- کە ئەودەمی گورگ و مەڕ پێکەوەیان ئاو خواردۆتەوە، هەموو پێکەوە وەك پوورە هەنگێ دەکاردان- تەنانەت ئەوانەی ئەرکی سەرشانی خۆشیان بەجێ دێنن و لەناردنێ کەمتەرخەمییە ناکەن و خۆ ناگنخێنن، ئەمە دەگەڵ ئەوەشدا کە ئەوانە ژمارەیان لە پەنجەی دەستان تێپەڕناکات.

بەڵام نا، بە پێچەوانەوەش، ڕێچکەی ژیان هێندەش هەروا سادە و ساکارنییە، و هیچ کاتێکیش هەر وانەبووە. بگرە و بەردە و بەرگری و بەرخودان هەمیشە هەر هەبووە، و هەشە- هەمیشە جۆرە شتانێك هەن کە پێشاندەدەن نەك هەر بە ڕەزاشا بەڵکە بە هیچ زۆردارێك ڕێ نادرێ چەوتە چەوتێ بکا. لەپڕ دەبینی یەك لەولاڕا ڕاست دەبێتەوە و تاو دەداتە چەك و لە مەیدانێ رادەوەستێ: چەند ڕۆژێکان پێش ئێستا زیرغامییان ناردبوو. زیرغامی فەرمانبەری باج بوو. لە توند و تیژییەدا بەناوبانگە و ئافەتە. پێشمەرگە لووت و گوێ و لچ و لێویان بڕیبوو و بەنیوەگیانییەوە هێنا بوویانە بەردەمی دەرکی ماڵە پوورە فاتمێ و لەوێیان فڕێدابوو، هەر ڕاست بەرامبەر ماڵێ مە- تا بەو دەمولێوە جوان و نازدارەیەوە، بەسەر و ریشی ئەو بارودۆخەی کە هەیە پێبکەنێ... بابەگیان دوکانێکی پاکوخاوێن و ژیکەڵەی پێکەوەنا. هەروەك گوتم پینەدۆزە، بەڵام لە هەموو پینەدۆزەکانی دی جیایە: پێڵاوی بە دەزووی غەڕغەڕە دەدروەوە، و هەموو جۆرە پێڵاوێکیشی نەدەگێڕایەوە. ئەمەش لەبەر هێندێ نا کە نایەوێ، نا، بەڵکە ئەو کارەی کە ئەو دەیکرد بۆ هەموو کەسێکی نەبوو و خەڵکی سادە و ساوێلکە نەیانبوو ئەوکارەی پێبکەن. ئەفسەر و سەرۆك فەرمانگە و پاسەوانەکان و ئەوجۆرە بابەتە خەڵکانەی مشتەری وی بوون. دام و دەزگای بۆیاغچییەتییەشی دانا، و کە ڕەوێتەیەکی بڵندی دوو نەفەرە و چەند جووتە نەعلێکیش. هەرکە مشتەری دەهات، ڕاوی دەکرد و دەستوبرد

پێڵاوەکانیم بە فڵچەو سابونێ پاك و نەرم دەکردنەوە و ئامادەم دەکردن تا ئەوجا باوەگیان بۆیاغیان کات. دوکانێ مە دوو دوکان هەورازتری دوکانێ سۆفی عەزیزی پینەدۆزە، دوکانێکی پیس و پۆخل. قایشی پێش بە رۆکێی و ئەو چڵکاوەی ئاوێ کەوشانی کە بە هەفتەی جارێکیشی نەدەگۆڕی، جاش کەوشی بن لاستیکی بۆ کرمانجان دادەکوتا. کەچی دوکانێ باوەگیانی هەر دەتگوت تۆپەگوڵە. رووی دە قیبلەیە- بەرامبەر دەرکی مزگەوتی گەورە. کەرەوێتەی بۆیاغکردنێی لە گۆشەی لای راستێوەیە. کە چەند فڵچەیەکی گەورەمان پێوە هەڵواسیوە. بابەگیان لەبەری لای چەپێوە بەرامبەر کەرەوێتەکە بەخۆ و بەروانکە و دوو سەردەستەی شین — و ریشی تاشراوەوە دادەنیشێ. لەسەرەتاوە کە تازە هاتبووین، زۆربەی رۆژان منداڵە کورد لەبەر دوکانێ و بەواقی وڕەوە چەند تاوێکان دە بەروانکە و سەردەستەی شین و دە دەستەکانی بابەگیانەوە رادەمان کە وەك فڕفڕۆکە بە فڵچە بەسەر کەوشاندا دەهات و دەچوو و بۆیاغی دەکردن...

لەپڕ پێوەربوون- سەرۆکی ئەمنییە و چوار پاسەوان —((پۆلیس)) دوویان لەبەر دەرکێ و دووشیان دەگەڵ جەناب سەرۆکی- بێ ئەوەی لە دەرکێ دەن و یا مۆڵەت لە کەس بخوازن- هاتنە ژوورێ. لێرە کەس دەرکی حەسارێی دانەدەخست- چونکە باو نەبوو: دەرگا بۆ میوانی هەمیشە لەسەرپشتێ بوو. زۆربەی خانووەکان هەروەك سەردەمەکانی مێژووی کۆن هێشتا دیواری حەسارییان بۆنەکرابوو: مێژوو هێشتا فێرە فێڵ و تەڵەکەبازییان نەببوو؛ خەڵکی ئاگایان لە دڵ کرمێیە یەکتری نەبوو، دیواریان دەنێوانێدا نەبوو- هەموو لە هەموو خۆشەویستی یەکتری بوون. لەوانەش بوو تا هێشتا یەکتریان نەدیبێتەوە و شارەزای ناخی یەکتری نەبووبن- دە دڵی خۆمدا گوتم، ئەوە رەنگە بابەگیان پێڵاوەکانی جەنابی سەرۆکی چاك نەدرووبێتەوە، یا چاکی بۆ بۆیاغ نەکردبێ، ئەویش توورە بووە، بۆیە وا بەو نیوەشەوە ناوەختە هاتووە! هەر کە دەنگی تەپە تەپی پێیانیش لە دالانەکێڕا هات، دایی رەنگی پێنەما و هەناوی بەربۆوە و سپی هەڵگەڕا- مەلیحەش هەروەتر- بەڵام وەك دایی نا؛ و منیش بەماتی و واقی وڕەوە دەسەرۆکییەوە رامابووم.

یەك لە پاسەوانەکان دە دالانەکێدا مابۆوە؛ یەکی دیشیان لە خوار ژوورێوە راوەستابوو، و جەنابی سەرۆکیش بە کەوشەوە هاتبووە بەر پەنجەرێ — چاوێکی بەسەرتاپای ژوورەکە و دایی و



مەلیحە و سەماوەرەکەدا گێڕا- دوایی پشت لە سۆپاکەوە راوەستا، سەیرێکی دەرگای پاشخانەکەی کرد. پاسەوانەکە بەدوای ئەو سەیرکردنەدا چوو دەرگای پاشخانەکەی کردەوە. نەمزانی باوەگیان کەی هاتبۆوە- چووبوو دەرکی حەسارێ گاڵەدا- کەچی ئەوەتا لە خوار ژوورێ لە تەك پاسەوانەکەوە راوەستاوە. ئەویش رەنگی پەڕیبوو. پاشخانەکە تاریك بوو؛ پاسەوان —سەر پاسەوان ناسرخان- کابرایەکی لولاك خواربوو، هەروەك پۆلیسی سوارە گەلاوگەڵ دەڕۆیی، بێ مۆڵەتی جەنابی سەرۆك هات و لامپایەکەی تاودایە، و چووە پاشخانەکێوە. دەنگێکیش لەسەربانییەوە هات. هەموو تەماشای بن میچیمان کرد. جەنابی سەرۆك لە وەڵامی تەماشاکردنەکانی ئێمەدا گوتی: ((پاسەوانەکانن)). لەسەربانین!.

کە جەنابی سەرۆك تەنگەتاوی و بێ ئارامی و ناراحەتی دایی ئاوا دیت گوتی: ((ناراحەت مەبن خانم- هیچ نییە؛ هەروا وردە شتێکە... کە ئومێدەوارم لەوەی تێنەپەڕێ... ئینشاڵلا ئەوەش بەسەردەچێ... هەروا چەند پرسیارێکانی لێدەکەین و دێتەوە — ناراحەت مەبن)).

بەڵام هەراسانییە دایی رەگ و ریشەی لەوەی قوولتربوون بەو جۆرە گفتانە هێور ببێتەوە- و لە پڕمەی گریانێیدا. هەروا بەو دەمولێوە لە رزۆکانەیەوە گوتی: ((برا لە، بیکە بە خاتری ئیمامی ئەبولفەزل و خاتری روحیانەتی ئیمام رەزا- بەزەییتان پێماندا بێتەوە... غەریبین... بێکەس و بێدەرین..)) و ئیدی نەیتوانی بەردەوام بێ، و وەك فەنەری وێك هاتەوە و کەوتە سەریەك و دانیشتە گریانێ. مەلیحەش وەك هەموو جەلان کەوتەوە کۆمەك و دڵدانەوێی و ئەوەی پێیکرا درێغی نەکرد- و دەستی گەیاندە کلکەی سەرپۆشەکەی جەنابی سەرۆك کە ئەوەی دیت وەك دڵگیر بووبێ. بابەگیان لێوی لە لێوی نەترازاند. جەناب سەرۆك زۆر بە میهرەبانیەوە بەڵام سەرۆکانە، گوتی: ((خانم، گوتم ناراحەت مەبن- من بەلێنتان دەدەمێ- چەند پرسیارێکیان لێدەکەین و دێنەوە... من گفتی شەرەفتان دەدەمێ!)) و دەگەڵ قسەکەیدا پەنجەی بۆ سەرسینگی خۆی راداشت، یانی کەمن — خودی من، پیاوی گەمان نیم. و وەڕێ کەوت. لە کاتێکدا کە دایی وەك قەوانی درزاوی هەر دەیگوت و دەیگوتەوە: ((خوا سێبەری ئێوەمان لەسەری کەم نەکا! خوداوەند دەست بە باڵتانەوە بگرێ!... خوداوەند... خوداوەند...)).

ئەوان رۆیشتن و ئێمە ماینەوە... دەگەڵ یەك دنیا پەرت و پەرێشانی و مەینەتیدا. غەم هات و خەوی لە ماڵێ راونا. من منداڵبووم، غەمم بەلاوە شتێکی تازەبوو؛ هیواو ئومێدم هێشتا باڵیان نەگرتبوو کە لە سنوری رۆژ و هەفتانی تێپەڕێنێ — هەیهو، هەیهو لەم هاوینەوە تا هاوینێکی دی تەمەنە رێیەك بوو! تێگەیشتم هەر هێندە بوو کە رووداو و بەسەر هاتەکان وەك خۆیان زۆر بە وردی و —بێ ئیختیار- دەمێشکمدا بچەسپێنم و تۆماریان بکەم و هیچی دی، تا دوایە بێم و دەوروبەرەکانیان بەسەرکەمەوە و بیانبینم و ئەوجا چیم دەدڵ و بیرومێشکیدایە بێم و بەچاوێکی دییەوە و بەشێوەیەکی دی دەریان بێڕمەوە؛ بەلاّم کە دایی دەستی دەکرد بە گریانێ ئەمن بە دەستەخۆم نەبوو غەمبار و کزو مات و مەلوول دەبووم.

شار نوستووە؛ کە چرا دەکوژایەوە، دنیا بێ هەست و چڕپە و خامۆش دەبوو. چرای کۆلاّنان هەردە کولەکەی تەڕیشدا نەبوو. دنیایەکەی مە ئێرە بوو، ئێرەش تاریك بوو، ئاگامان نە لە ئەستێرەکانی دی و نە لە پایتەختێ و نە لە شارە گەورەکانی دی نەبوو. هەر کە چرای ماڵە بچکۆلەکەمان دەکوژایەوە، ئیدی ئەو ماڵ و حاڵە دەبووە (لۆتکە)یەکی نێو دەریاییەکی هارو هاج و رێبوارانی بەرەو سەفەرێکی بێ تام و چێژ و تفت و تاڵ دەبرد. بەلاّم ئەمشەو هەرچەندە هەموو شارو هەموو چرایەکانیش کوژابوونەوە و بێ هەست و چرپە بوون، کەچی دنیای ماڵێ مە هەروا دانیشتبوون و شەوارەیان بوو و شەوخوونیان دەکێشا: دایی هەروا دەنووزایەوە، مەلیحەش بە دەنگی کچانەیەوەی دەگریا و لشمەلشمی بوو، و من هەرچەندە هەستی خەتەرێکی وام نەدەکرد و بەگوێرەی تەمەنەکەم هەست و نەست و سۆزم هێندە قووڵ نەدەبوونەوە دەوشتانەوە گلێم، بەلاّم دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کە گوێم لە دەنگی ناڵە و گریان و لاوانەوەی دایی بوو ئیدی خۆم پێ رانەگیراو لە بانگی گریانێمدا. و سەیرەکەش لەوەیدا بوو هەر کە من تێم هەڵدەکرد گریانێ دایی گورج ژێر دەبۆوە و لەگریان دەکەوت، هەروەك سەرەتای دەست پێکردنی گریانی من کۆتایی نەواری گریانی وی بێت — دایی چووە حەسارێ و هێندێکی ئاو بەسەر و چاواندا کرد. دوای تاوێك دووبارە هاتەوە... کاتژمێرێکی تەواو بەسەر رۆینێ باوەگیانیدا نەڕۆیبوو کە دەنگی تەپە تەپی پێیان — ئەمجارەیان بە لەسەرەخۆییەوە- لە پەنجەرەیڕا هاتە بەرگوێ... مەلیحە هاواری کرد: ((بابەگیان هاتەوە!...)) دایی بەرەولای دەرکێی هەلینگدان... بابەگیان و کاکە سەلیم دالاندار بوون... کاکە سەلیم ببووە کەفیلی، وەك ئەو دنیایەیان دابنێ!... هەر لە چایخانێوە پاسەوانێك کاکە سەلیمی بانگ کردبوو بۆ



کەفیلییە بابەگیانی. دایی بە زۆری کاکە سەلیمی دانا و سەماوەری هەڵکردەوە- و کەوتینەوە چا خواردنەوێ...

کە کاکە سەلیم رۆیی، دایی پرسی: ((ئەکبەراغا، بۆ هاتبوون؟ ماڵەکەیان بۆ پشکنی؟ چیان پرسی؟)). باوەگیان گوتی: ((وەڵلاّ بڵێم چی! بۆ خۆشم نەمزانی...)) رەنگ و رووی وای پێشاندەدا کە هێندە پەرت و پەشێوە، سەرەدەرییە لە هیچ ناکات ((بۆ خۆشم بە چاکی تێنەگەیشتم... پرسیاری زۆر شاردراوە و نادیاریان دەکردن: چەند منداڵت هەیە؟ - ئەوەندە... ئەوەیانت لە کەنگێوە نەدیوە؟ - لە فلاّنە وەختەوە... هەرگیز؟ - هەرگیز... ئەو چەند رۆژانە کەستان هاتۆتە ماڵێ؟ چ پەیامێکی هێنابوو... کەی دەنوون... چ کارەی... چ جۆرە میوانێکتان دێن... بەو زووانە نامەتان لە شاریەوە بۆ هاتووە- و ئەو جۆرە قسە پڕ و پووچ و بێ مانایانە- تێنەگەیشتم... بۆ خۆیشم هەر مات و بێدەنگ بووم... هەردەبێ یەکێك لەو سیخوڕانە شتێکیان بۆ تێچاندبێن-)) و بەسەر و رووی گرژ و دیمەنی چاوەکانیڕا واپێدەچوو دەمێشکی خۆیدا بە دوای سەرەپەتێکیدا وێڵە، دووبارەی کردەوە: ((چاك تێنەگەیشتم!... نازانم داخوا بە تەمان چمان بۆ دەکەوڵی کەن...)) و دەبیر و خەیالاّنەوە چۆوە- دایش لەروودا دەو دنیایەیدا دەڕۆنی و بیروخەیاڵی ویش وەك پێدەچوو هەر بەدوای ئەو کەوڵەوە بوو...

❊ ❊ ❊

## (٣)

منداڵە وردکە دەورەی پوورە خورشیدیان دابوو، و ئەویش هەروا سەرقاڵی ئیشی خۆی بوو، و هەڕەشە و گوڕەشە هەمیشەییەکانی دووبارە دەکردنەوە: ((باشە، گوێ مەدەنێ! ئەوە ئەمن پێم گوتن، ئەگەر ئازان گوێ نادەنێ، هەرکاتێ ئێوەش لە دنیایە لەو زووخاوەتان خواردەوە ئەودەمی تێیدەگەن... ئەوەی لە سەرمەیە هەر گوتنە!...))

بەڵام هەر بەوەندە قسانەشەوە رانەدەوەستا. ئەو سەردەمانە هەموو کەسێك هەروا هەڕەمەکی دەیزانی کە هەر ئامۆژگاری و چاوسوورکردنەوەیەك ئەگەر یەك دوو تەوقاتی مزریشی دەگەڵ نەبێ بڕ ناکا. هەروا بەو جۆرە چەند جارێکانی شالاو بۆ دێنایین- و ئێمەش هەڵدەهاتین، و ئەویش دەچۆوە سەرکارەکەی خۆی.

کیژۆڵەکەی لەسەر لادەرکێکی وەك تەختەی مردوو شۆری دانابوو و فۆتەیەکیشی قەدکردبوو و بەجێی شەرمێیەوە نابوو، و لیفکەی لەو لەش و لارە ناسکۆڵەی دەخشاند- هەروەك دەگەرماوێدابێ دەستی درێژ دەکرد و جامە ئاوی لە تەنکاوی رووبارێ پڕ دەکرد و وەسەر و لەشی کچۆڵەی دەگێڕا: ئاو و خوێناو بە لەشی کچۆڵەیدا- بەرەو ژێر دەهاتنەوە خوارێ؛ هەموو ئەو خوێناوەی بەسەر لایەکی سینگیدا دەهاتەوە خوارێ و تا کەمەری خەتێکی مەیلە و سورباوی دەکێشاو ئەوجا بەلایەکی لا دەرکەکەیدا شوڕەی دەکرد. کیژەکە کونێکی خڕی لە لاجانگێ بوو و هەر خوێناوی لێدەهات، و تا ئەو خوێناوەش رادەوەستا، پوورە خورشید وازی لێنەدەهێنا و هەر خێراخێرا ئاوی پێدا دەکرد، تا بەتەواوی پاك بێتەوەو وسڵی شوشتنێی لێدەرچێ...



دەر و دەشت ئارام و ئاسوودە بوون؛ سەوزەجات خۆیان لەبەر هەتاوێ وشك دەکردەوە؛ شل و پلی دە هیچ شتێکیدا نەبوو- خەوی شەوانە، هەموو لایەکی توندو تۆڵ و تەڕو تازە کردبوونەوە. ناساغییە سروشتی دەمێك بوو پەڕیبوو: سروشت ئارەقەی کردبۆوە، و دەنکە ئارەقەی بەسەرڕووی گوڵ و گوڵ غونچە و سەوزە گیایانەوە لە لەشی دەردا بوو- کێوی پیرسولەیمان[1] نوقمی گوڵاڵ بوو.

بەهار بوو، درەنگانە بەهارێك، دەگەڵ هاوینێیان تێك کردبۆوە: ((پیرە زستان بەهاری لەخەو کردبوو و تازە سەرەتای خوردادێ بوو، وەرزی گوڵاڵ، بەڵام تەنیا گوڵێك چییە دەشاریدا نەبوو- گوایە باو نییە و نابێ گوڵ دەشاریدا بێ- لە کوچە و کۆڵاڵ و بازاڕیشدا هەرنەبوو- تەنانەت بەکڕینیش- بەڵام لە دەر و دەشت و کێوان هەر مەپرسە، هەمووی هەر خەرمەنی گوڵاڵ بوو.

ئەو درەنگە بەهارەی کە دەگەل هاوینێیان تێك کردبۆوە وەك پەری و شازادەی میهرەبانی پەرییان، هەموو لایەکی کردبووە شادی و خۆشی و تریقانەوە- کتوپڕ هەموو لایەك دەگەڵ یەکتریدا میهرەبان و رووخۆش ببوون؛ ساردییە زستانێ، و بەفر و سەهۆڵبەندان، تێپەڕیبوون، و هەموو شاد و شەنگوڵ ببوونەوە. گەرم داهاتبوونەوە، تەنانەت دار و درەخت و کێو و تاشەبەردەکانیش هەموو هەر دەخەنینەوە.

نەرمە بایەك دەستی بەسەر و پرچی سەوزەگیایدا دێنا، و لق و پۆپی درەختانی ئاڵۆز دەکرد- پرچ و کەزییە درێژەکانی پوورە خورشیدێش هەروەتر؛ بەڵام سەر و پرچی کچۆڵەکەی تەڕبوون و ترسی وەی هەبوو کە گەرماوی ئەودەمە و بەیانییە زووەی نەخۆشی کات. رووبار هەناسەی دەدا، هەروا دەفەی سینگی بوو هەڵدەستا و دەنیشتەوە، و دەگەڵ نیشتنەوەی سینگیشیدا، زەردە و خەنینەوەی لە رووان دەنیشت. ئاوی تەنکاوێ دەستی بە لەش و لارو لاڕانی کەنارێدا دێنا؛ ئاو چاوی قرژاڵێ بوو، هەروەك باریکەیەك بێت و لە ئاسمانێ جودا بووبێتەوە و کەوتبێتە

---

[1] ناوی کێوەکە لە بنچینەدا سولەیمان بەگە (خەڵکی ناوچەکەش هەروای پێدەڵێن)، بەڵام من بە بەڵگە و پشتیوانەی ئەم دێڕانە پیرسولەیمانم پێ راستترە: دڵم راناوەستێ لەبەر ئەوی غەمێ لەبەرئەوی ژانێ، بانگێکم وەبەر خوڵای ئەویدیکەم وەبەر پێغەمبەری ئاخری زەمانێ، بانگی دیم وە بەرچاکی گەرمێن و کوێستانێ، بانگی دیکەم وەبەر پیرسولەیمانی لە بانێ.. (لە قەڵای دورمەوە وەرگیراوە).

خواریٚ- و زۆریش بەو جودابوونەوەی شادبێت. دەگەڵ ورشەبای شەماڵی ڕەنگەکەی مۆرمۆری دەنواند، هەروەك رووی دڵدارێکی کە گراوییەکەی دەست بەڕانیدا دێنی و دەیشیلێت.

پردەکە بەسەر رووبارێدا چەمابۆوە، و راز و نیازی دەگەڵدا دەکرد و خۆی لە ئاوێنەی چاوەکانیدا دەدیت. وردەچە و دەموچاویان دەئاوێدا دەشوشت. خۆر چرای رووی خۆی زێدەتر هەڵکێشابوو تا دەموچاوی خۆی دە ئاوێدا جوانتر ببینیٚ. کێوەکانیش وەك داپیران پاڵیان وە ناز بالیفی هەورانەوە دابوو و گرژ و گەش، دەگاڵتە و گەمەی نەوە و تۆرەمەکانیانەوە رامابوون.

چەند گوێدرێژێکی بەرەڵلاٚ، لەولاترەوە، دوور لە قسە و قسەڵۆکان، بیٚ غەم و پەژارە، دەمیان دەلەوەڕیٚ نابوو؛ چەند قەلەڕەشێکی زۆر لەمەش دوور نا. هەڵنیشتبوون: جارجارە سەرێکیان بەم لاولادا خوار دەکردەوە و باڵە فڕەیەکیان دەکرد و بەگاڵتەوە سەریان دە دووی یەکتری دەنا و یەکدییان وەبەردندووکان دەدا. جاری واش بوو هەر بەڕاستی پێك هەڵدەپڕژان.

نیشانەی گەمە و شەڕی راستییان، هەر لە دندووك کردنەویٚ و شیوەی بزاوتی سەروکەللە و چاوەکانیانەوە و ئەو شالاٚو و خۆ گیڤ کردنەوەیانڕا وەدەردەکەوت و دیاربوو. کلکیان دەگەڵ نەرمەبای خوار دەبوونەوە. هەڵدە بەزنەوە و خولێکی دەدەن، و دیسانەوە دێنەوە جێیەکەی خۆیان: هیچ دڵێك دەنێو سروشتدا غەمیٚ نانوێنیٚ: خوڕەی ئاویٚ هەردەڵێی لایلایەیە، بەلاٚم سروشت بۆخۆی وەك منداڵی بەناز پەروەردە گڕووی گرتووەو ناسرەویٚ و چاوان لێك نانیٚ- کچەش هەرواخەو دەیباتەوە.

پوورە خورشید هەروا سەرقاڵی کارەکەیەتی. ژنێکی توند و تۆڵ و بەزیبك و زاکونە، قەیرە ژنە، بەلاٚم پیر دەنوێنیٚ؛ بەپێستێکی وشکەلاٚتوو و پڕ چرچ و لۆچ و لووتێکی زۆر باریکەڵەوە، هەر راست دەڵێی لووتی رێوییەکی توولەکە، دەنگێکی گڕو پیاوانە. چاوی دەقولکەی چاوەکانیدا هەروا پرتە پرتیانە، هەردەڵێی گیانی زیندانی کراون کە لەگەڵ هەر چاوگێڕانێکیدا پێت وایە ئێستا نائێستا لە قولکێیان دێنەدەریٚ و دەردەپەڕن.

وەك ئەوەی کە ئەو قسەی بۆدەکا، کەڕبیٚ، یا دەگەڵ گوێگرەکەی شەڕی بیٚ، هەرکاتێك کە قسانی بۆدەکا یەك بەخۆی دەشیڕینیٚ... سینگە وشکەلاٚتووەکەی هەر لە یەخەو بەرۆکە والاٚکەیڕا دیارە- هەمیشە بۆ کازمی دەژیە- کوڕە تاقانەکەی- هەموو ئیشێکی لەپێناوی ویدا



دەکات. گیاوگۆڵی کوێستانیٚ لە کێویڕا دێنیٚ: لووشە و قارچك و کەنگر و رێواس و گیابرژیوەو مەندۆك. و تەنانەت دارانیش دێنیٚ. ئاوکێشیە ماڵاٚن دەکا، مردووان دەشوا، هەرچی بڵێی لەپێناوی کازمی کوڕیدا درێغییە ناکا. تەنانەت تریاکیش بۆ عوسمانی مێردی، کە تاکە تریاك کێشی ئەو شارۆچکەیە، دەکڕیٚ بۆ خۆشی دەڵیٚ ((تلیاك)).

پوورە خورشید دەلینگ و قۆڵی لیٚ هەڵکردوون و هەروا لیفکەکارییە دەکات و ئاویٚ دەڕێژیٚ- و کارتەواو نابیٚ- کچە لابرۆیەکی بە باری سەرسوڕمان، و نازەوە- یا بۆ قەشمەرییە رەهەوا خستووە. گاڵتە بەکیٚ دەکا- بەوچاوە کەلا شووشەییانەوەی- بە ئێمە یان بە ژیان؟ هیچ نیشانەیەکی بە ئانقەستیشی پێوە دیار نییە و سادە و بیٚ ئارایشتە... کیژۆڵەیەکی زۆر ساکار و لەبەرچاو و دلاٚن. سینگ و بەرۆکێکی رێك و پێك. و لاکەلەکە و کەمەری تا سەر سمت و کەفەلی بەشێوەیەکی رێك و جوان و بەخەتێکی گونجاو هاتوونە خواریٚ و دەگەڵ هەرجووڵەیەکی ئەو کەفەڵ و رانەی هەتا سەر کڕکڕەی ئەژنۆیانی وەك جیوەی دەلەرنەوە- هەر دەڵێی ماسیین دەخزن. تاقباز نوستووە. دڵۆپە ئاوەکانی بەلەشیدا دێنەخواریٚ و لەبەر تیشکی رۆژیٚ باق و بریقیانە و رەنگیٚ دەگۆڕن. لەسەر پشتیٚ راکشاوە. شانەکانی جوان و رێك و گونجاو و لەبار. دەموچاوێکی خڕیلە و چەناگەیەکی تۆزێك درێژکۆلە. لێوەکانی نەزۆر گۆشتن و نەزۆریش تەنك، و بە دووهێڵی باریك کۆتاییان دێت. گەندەمووی سەرلێوەکانی هێشتا هەڵنەگیراون. لووتێکی قەڵەمی، بەلاٚم نەختێك کورت؛ ئێسکی روومەتەکانی کەمۆکەك دیارن- ناوچەوانێکی پان و سفت و لوس و قژ رەش. قۆڵ و بازووەکانی هێشتا مووی هەرزەکاریەیان هەر پێوە ماوەو خەپەتۆرەییە پشتە دەستەکانی سەردەمی منداڵییەی هەرپێوە دیارە. لە روخساریڕا نیشانەی تازە هەڵدان و پێگەیشتن و لاوەتییەی تێڕا دیارو تێکەڵە. ئەوانەن دەبنەمایەی نەگبەتی و بەدبەختییە نەوە و رەچەڵەکی خۆیان: موژدەهێنی خۆشبەختی و شادی و خۆشحالی یەکێك و ماڵوێرانی و سەرگەردانی سەدانی دی. هەر تەنیا یەك ئاماژە بەسە تا دەداویٚ کەوی و دووچاری نێو تانۆپۆی شێتییە ببی. ئیدی تازە تێچووی، ئیدی سەرتاپا- یا دەیبەیەوە یا دەیدۆڕێنی. ژن یا کچ هەر ناوێکی لێی دەنێی، زۆر بە ئاسانی دەتوانی کۆمەڵێکیان لیٚ بێنی و بیانکڕی و تا دڵت دێنیٚ دەگەڵیدا بدوێی و پێبکەنی و رابوێری و ئەگەر لێشیان وەڕەز بووی ئەوە روویان لێوەردەگێڕی و لە خۆتیان دوور دەخەیتەوە، بیٚ ئەوەی هیچ گویٚ بدەیە ژیان و

خۆشەویستی و ئەوین و سۆزی دەروون و غەم و تێمان و کەساسی و کلۆڵیان، تا وایان لێدێ بۆ نانی شەوێ دەکەونە سواڵێ و ناچار دەبن ملکەچی خۆفرۆشتنێ بن و...

نا! ئەوە تەنیا بۆچوونی تۆیە و بەس کە لە مێشکی خۆتتدا کۆکردۆتەوە کە دەتوانی دەریکەی و هەندێ پارەی دەمستی نێی و بەو خەیاڵەوە، کەلێی وەڕەز بووی، یالێی تێربوویت و دڵت نایهەوێت! نەخێر، نا هەروا سادە و ساکار و ئاسان نییە، بتوانی ئەو چاوە بەڕواڵەت پاکانە، بەو پڕشنگانەی لێیانەوە دەپژێ و ئاگر و کلێپەی ئەو دلانەی بلێسەیان دێت وازیان لێبێنی و بەچلکی پارە ملکەچ و ئالوودە و خەفەتبار و شەرمەزاریان کەی.

ئەمڕۆ بەیانی —سەر لەزوو– کاتێ کەدایی هەروەك هەموو جەلان حەساری دەماشت و ئاوڕشێنی دەکرد ئەمن لە ماڵێ هاتبوومە دەرێ... ئەمڕۆ دایی بەپێچەوانەی خووی ڕۆژانی دیکەی کە کون و قوژبن و کەلێن و کەلەبەری هەموو دەپشکنی و دەماشت و ئاوڕشێنی دەکرد، زۆر بێ وازبوو و بەبێ تاقەتییەوە گەسکی دەدا. ئاوڕشێنیشی نەکردبوو؛ تەپو تۆزێکی وای نابۆوە هەرمەپرسە. رامکرد، چووم مەسینە ئاوێکم هێناو دەستمکرد بە ئاوڕشێنێ. بەبێ ئەوەی هیچ گوێ بداتە من، هەر راست وەك (مرادسپۆر)ی کە هەر کاتێ لادێییەکی وەچنگ نەکەوتبا ئەمرانی بەسەردا بکا و بۆ خۆشی رۆڵی (جەناب سەرۆك)ی بەسەردا بگێڕێ، بەگژ حەسارێدا دەچوو. هەر گەسکی دەدا و دەگریا... بە جووڵە و بزاوتی ئەو ڕۆژەی دەستی دایی، جووڵە و بزاوتی دەست و پەنجەی (ماشەڵڵا خان)م وەبیرهاتەوە. ماشەڵڵاخان سەرتاشی زیندانێ بوو، کەتە پیاوێك، رووگرژ و مۆن و بەد فەساڵ و لێو ئەستوور و خڕۆیلکاوی (ئاولاوی)و ددان گڕو چاو زەرد– وەك کەمتیاری بریندار. مەکینەی تراشی بە توندی لەڕەگی مووی سەران گێر دەکرد و بێڕەو بەوێی سەرانی دادێنا و هەڵەت و پەڵەتی لەسەری قوربانییە بێ دەرەتانەکانی بەردەستیدا دروست دەکردن، وەك بڵدۆزەریان لەسەری درابێ، دەهات تەپەی ماهوری لەسەری زەلامەکاندا دروستدەکرد. مووەکانی هەڵدەکەندن و دەڕۆیی، و بەردەوام ئەوە باس هەر باسی سەردار ئەسعەدی بوو، کە هەر جارێکی سەری چاکردبا ئیدی ئەوە بەخشششێکی چاکی دەدا و ماشەڵڵاش نەبایە سەری نەدەخستە بەردەستی کەس و هەربەوی سەر چاك دەکردو... بەهێمایەکی شاعیرانەوە لە قوربانییەکەی بەردەستی دەگەیاند کە ئەویش وەك سەرداری بکات و دەستخۆشانەکی چاك بداتە ماشەڵڵای و ئافەرینی بکات!



لە ماڵێ وەڕەز ببووم، هاتبوومە تەماشایە... ئەو گەمە و یارییانەش وەك هەموو گەمە و یارییەکانی دی ئەگەر تەماشاچیان نەبێ زوو بێ بازاڕ دەبن و رەونەقیان نامێنێ. شەڕیش هەروەتر– شەڕی بێ تەماشاچی بێ لوتفە... هەر تەماشاچین کارەکان خراپ دەکەن.

پوورە خورشید دووبارە بەجێگەیاندنەوەی بڕیارەکانی خستەوە گەڕ و شالاوی هێنایەوە، و ئێمەش تێمان تەقاندەوە و هەلاتین. هەروا چەند هەنگاوێکان هەلاتین و وەك کەروێشکی تاژی لە دوو بامانداییەوە و هاتینەوە جێی جاران، و راوەستاینەوە. ئەوچوو بۆوە سەرکارەکەی خۆی، چەند هەنگاوێك بەولاترەوە راوەستاین، ئەوجا وردە وردە بازنەی راوەستانەکەمان تەنگتر کردەوە و هاتینەوە سەر نوختەی دووبارە دەست پێکردنەوێ... دوو هەفتە پێشتر هەر هەمان ئەو یارییەمان کرد: چەند رێگرێکیان کوشتبوون؛ ئەمنییە هێنابوونیە ئێرە؛ یەکێکیان لەسەرتاتە شۆرێ فڕێدابوو دەیانشوشت– قولی، خزمەتکاری ((کەلایی رەجەب)) یان هێنابوو بیشوا. تەرمەکەیان نەدابۆوە کەس. لاوێکی بالابەرزەی رەشتاڵە، و دەموچاو رەقەڵە. تازەخەتی سمێڵێی دەدا. ئەمنییەکان راوەستابوون، قولیش جلەکانی لەبەر دادەکەند، شەرواڵ و مرادخانییەکەی لەبەردانا...سەیرە! پشتێندی لە برینەکەیەوە پێچابوو! گوللەکەی بەلای راستی زگی کەوتبوو و لەپشتییەوە هاتبووە دەرێ. پشتێندەکەی بەسەرویدا هێنابوو، تا خوێنەکەی راوەستێ. کوڕێکی باریکەڵە... چەند جارێکانی پشتێند لەسەر گۆشتی رووت بەسەر زگیدا هێنابۆوە، شوێنەواری خوێنی لەوە زیاتر پێوە نەبوو کە بە کەمەریەوە مەیی بوو... ((سەیری؟ ناکەسە چ دڵێکی هەبووە!)) ئەوە قسەی ئەمنییەکە بوو ((سەیری گوللەی وەکوێ کەوتوە!؟ دەگەڵ ئەوەشدا پشتێندەکەی لەسەر برینەکەی پێچاوە... هیچ پێ نەدەچوو بە گوللەی ئەنگوابێ، ئەمنییەکە گۆرانی دەگوت —ئای کە مرۆڤ گیان سەختە!)) و پێکەنی... و پێکەنین و... ئێمەش پێکەنین...

وەك کیژۆڵەیەکی خەواڵوو کە دایك بیەوێ پێش نوستنێی جلەکانی لەبەرداکەنێ و بیگۆڕێ، تەواوی ئەندامەکانی لەشی ئەو کچۆڵەیەش دە ژێر فەرمانی پەنجەکانی پوورە خورشیدێدا ملکەچ بوون– نوستبوو. پوورە خورشید دەستی لەسەر دڵی دادەنا– دەستە هەر لەوێ بوو؛ دیسانەوە بەرزی دەکردەوە– هەروا بەم جۆرە، جووڵە نەبوو... روخساری تورە دیاربوو... خەوی دەهات، بۆ لێدەگەڕان چاوان گەرم کا! چاوەڕێ بووی ئەو کیژۆڵەیەی هەروا بەدرۆ خۆی لەخەو

کردووە کتوپڕ راپەڕێ و هەستێتەوە لەسەر لادەرکەکە دانیشێ، و بەواقی وڕەوە هێلکۆکەی چاوەکانی بێرو بەوێدا بگێڕێ، و هاوارکات و بلقان بە کەفی سابونێ دروستکات، و بیانتەقێنێتەوە و بە خۆشحالییەوە راکات و بلێ: ((مندالێنە وەرن!)) و شلپ خۆی هەلداتە ناو ئاوێ...

باش... ئەوە ئاوا، ئەمیش وا... کوردێك کوژرابوو، پەیوەندی بە کەسەوە نەبوو- وەك هەمیشە. ئەمنییەکان شانازییان دەکرد و خۆیان بادەدا، کەس نەیدەزانی رێکەوت بە ماناراستەقینەکەی، رێکەوتە و کەس هیچی بەدەستەخۆی نییە، و و نازانێ کە رێگری قاچاغچیەتی دەو ناوچانەدا کار و کاسبییە، هۆی ژیان و پەیداکردنی بژێوییە... ئیدی ئەوە ئەو مردبوو هەربۆیەش جێی گومانبوو. بەلام خراپی کارەکە ئەوەیە، کە ئەوانەی دی زیندوون، و کۆتایی نایەت و وازناهێنن- پوورە خورشید هەر جامە ئاوان پڕ دەکات، و لە بن لێوانەوە خەریکی ویرد و نزا خوێندنێیە و ئاوێ بەسەری کچۆلەکەیدا دەکات. ئێمەش لە ((بیسمیلا))ی زیاتر هیچی دیکە نابیسین... من راست و راست بەرامبەری کچەکەم... بەلام وەك لە من تۆرابێ... ئەوە چییە؟ وەك شتێکی دیارو نادیار، جارجارە هەلبن و بکوژێنەوە... هەر بەو شێوە روخسارەوە... شتێکی سەیرە! ساتەکانی سەردەمی مندالی شوێنەوارێك دەمێشك و هزر و بیردا جێدێلێ کە دەگەل تەمەندا لەناو گیان و لەشی مرۆڤدا دەژی و دەمێنێ. راستە کە دەگەل فراژوو بوون و گەورە بوونماندا رەنگ و بۆیان کەم و کەمتر دەبێتەوە، بەلام زۆرجاران کە وەبیردێنەوە بەزەردەخەنەیەکی بێ بڕوایانەوە بەرەو روویان دەبینەوە، کەچی هەر هەشن و هەر دەشبن...

وەك ئەوەی لەو دیوی شووشەیەکی نیوە روونڈا، شتێکی دەناو تەمومژی ژووری گەرماوێکیدا ببینم... دەبینم... وەك ئەوەی مەلیحەش لەوێبێ- ها؟ بەلێ... روخسارەکان هەموو پێکدادێن و دەچن- کچە خێراخێرا دەروا و تێدەپەڕێ... سەیرە، پرچی مەلیحەی دەهۆنێتەوە. وەك ئەوەی دایی نیسکێ بېژێرێ... ئەوە چ بوو... کاکە پێدەکەنێ- جا من کاکەم دیوە؟... مات و بێدەنگ راوەستام. هەوت بووم. نازانم دەمم بەش بۆتەوە یان نا، بەلام هێندەی دەزانم کە ماوەیەکە لەنێو تەماشاچییەکاندا نەماوم و نیم. پوورە خورشید دوایین شالاوی خۆی دێنێ. رادەچلەکم، و بەخۆ دێمەوە. وەك هەموو تراژیدیاییەکانی دی سەیرکەریان هێندە نییە. لە



تراژیدیاییەکاندا ئەکتەری تراژیدیك هەلبژاردەیە و بەدوای ئامانجێکی گەورەدا وێلە. باشە ئەی ئەو ژنە، ئەو رێگرە یان ئەو قاچاغچییە دەبێ ئامانجە گەورەکانیان چ بێ؟ دەبێ چ دەرد و ئازارێکی گەورەیان هەبێ کە بەدوایدا وێلن و کەوتنەکانیشیان بەقەدەر ئەو دەرد و ئازارانە هێندە گەورە بێت —باشە ئەوانە سۆزانی بووینە، رێگر بووینە... لە جیهانی بچکۆلەی ئێمەدا گەورەیی کەسانێك بەگوێرەی گەورەیی کیسەی پارە، یا پانوپۆڕی و هەراوی زەوی و زار پێوانە دەکرێ. سۆزانییەك یا قاچاغچییەك کە سەرپێی سێ چوار کیلۆ چا یا پێنج شەش مەترە قوماش بە قاچاغی دێنن و دەفرۆشنەوە دەبێ ئێش و دەردەکانیان چەند و تا چ ئەندازەیەك گەورەبن؟ خۆ ئەگەریش گەورەیی و پلە و پایە هەر بۆ سۆزانیی سیاسی و ئەشراف، یا قاچاغچیانی نێو دەولەتی بێ، ئەوە ئەوانەی ئێمە ئەوانە نین؛ کەلایی رەجەبی ئەوان، کەلایی رەجەبی شارۆچکەکەی ئێمە نییە، و تەماشاچییانی شێوەی ژیانی ئەوان، کەسانی دیکەن. تەماشاچییانی ئەم تراژیدیانە ئێمە بووین کە بەرهەم هێنەکانیان بۆ دلدانەوێمان، ئێمەیان بە خوێناوێ- ئەویش لەو دنیای دی- بانگهێشت و میوانداری دەکرد.

کارەکە تەواو ببوو؛ کەلایی رەجەب و —قولی- خزمەتکاری و تورکی عارەبانچییەکەی لە کرێ بارییە هاتبۆوە، هەموو ئامادەبوون. پوورە خورشید دوایین کاری خۆی دەستپێکردبوو. هەر کە دوورکەوتینەوە فۆتەکە (پەشتەمالەکە)ی لەجێ شەرمی کچەکە کردەوە، و دەگەل ئەو هەموو ناخۆشیە هەژارانەشیدا، بە سۆزێکی زۆر دایکانەوە وەك چۆن دایکێك مندالەکەی بەرێتە نێوجێی، قۆلی دە کەمەرێی وەرێنا... سەری کچۆلەکەی کەوتە سەر سینگێ. قولی خەلاتەکەی لەسەر لادەرکەکێ بلاوکرد و پوورە خورشید کچۆلەکەی لەسەر درێژ کرد. کەلایی تابلێی دلگیر و زویر بوو، بەو رەنگ و رووە هەلامساو و پەڕیوەی بە دوکەلی تریاکێ، و بەخۆو بەو کەللە زل و ناوچەوانە دەر پەڕیوەیەوە، هەروەك سەرما بردەلان، رەنگی پێنەمابوو. پوورە خورشید سەروخواری خەلاتەکەی بەست و قولی و عارەبانچییە توورکەکەش یەکی سەرێکی لادەرکەکەیان گرت و بەرەو —گۆڕستانی غەریبان- وەڕێکەوتن.

رێیەکە بە بەر دەرکێ مەدا تێدەپەڕی. ژنانی گەڕەکێ لەبەردەرکی مالێ پوورە فاتمێ — بەرامبەر مالێ مە- خڕ ببوونەوە و هەریەکە شتێکیان دەربارەی کوژراوەکە دەگوت. بەلام هەمووشیان بۆ بێکەسی و چارە رەشییە ئەو سۆزانییەی دەگریان، و هەروا لەچك و دامەنی

کراسەکانیان بوون بە گۆشەی چاوەکانیاندا دێنان. لەلای منداڵەکانیشەوە، نەکا کەسێك ببینێ، بەدزییەوە چاوێکم بە ژنەکان و بەنێو ماڵێدا خشاند- دایی دەنێو ژنەکاندا نەبوو، پەنجەرەی ماڵێش داخرابوو.

وەرە و بڕۆیەك دەکاردا نەبوو —سۆزانی نوێژی مردوو و تەلقین و زۆر شتی دیکەی نەبوون. هەرچەندە بەگوێرەی پێویست و بە —فتوای مەلای شاری- جارجارە دەبوایە بکرێن. زۆربەی زۆری دوکاندارەکان لەبەردەمی دوکانێ راوەستابوون و لێویان دەجووڵاندن، بابەگیان دانیشتبوو و درێوشەکاری دەکرد...

* * *



**(٤)**

کاك سەلیم رۆیشتبوو، بەڵام مەشەدی ئەکبەراغا هەروا وەك خۆی چۆن بوو هەروا دانشتبوو: سەری بەردابۆوە و وەك لەسەرلێواری چاڵێکی قووڵەوە سەیری قوولاییە بنەوەی چاڵەکەی کا، قوولاییی چاڵی ژیانی خۆی. دە تاریکییەدا دەهەوای رامابوو. چی دەدیت؟ داخوا چاوی سەرنجی دە ئایندەیەکی سارد و سڕ بڕیبوو؟ یان دە ژوورێکی تاریکی زیندانێکی وا بڕیبوو کەسایە و سێبەری بەسەرتاپای ژیانیدا کێشابوو؟ ئایا لە سەیرکردنەکانیدا ئەو ئەڵقەیەی ناو ئەو زنجیرە کۆمەلایەتییەی نێو دنیای بایۆکیمیا (ئەتەمە زیندووەکان)ی دەدیت کە لە سەرەنجامی جێ گۆرکێی خۆیدا رێچکەی تەواوی ژیانی ئەو و سەرتاپای منداڵەکانیشی گۆڕیبوو؟ نا، هەرگیز، هەرچەندە ئەو ئەڵقەیە ون و نادیاریش نەبوو، بەڵام ئەو بڕای بڕای نە لە دوور و نە لە نزیکەوەی نەدیت و نەدیت...

لە پشت مێزێوە دانیشتبووم سەیری ئەو پەیکەرۆکەیە (ساتیر))ە دەکەم کە دۆستێکم بۆی ناردووم و بێ ئاگا دەکەومە یادی ئەڵقە نەدیتووەکەی مەشەدی ئەکبەراغاوە. پەیکەرۆکەکە: دێوی خودای جەنگەڵە: هەر لە ناوەکەیڕا دیارە کە خودای جەنگەڵە. جا چونکە خودای جەنگەڵیشە بێگومان لایەنی دڕندایەتی و خووە جانەوەرییەکەی دیاری دەدا کە لە هەموو گیانلەبەرانی دی بەهێز و بەتواناترە. دیسانەوە لەبەروەی کە خودای جەنگەڵە لە قەڵەمڕەوی خۆیدا لەسەرووی هەموو یاساکانی جەنگەڵەوەیە: ئێ ئیدی هەم دێوە و هەم...

لای یۆنانییەکان ئەو شتە بەسەر و لەشی ئادەمی و کلك و گوێی ئەسپ وێنە دەکەن؛ لای رۆمییەکان بەکلك و گوێ و چوارپەلی بزن و سەر و لەشی ئادەمییەوە وێنەکراوە. من وێنە و بۆچوونی رۆمییەکانم لا پەسەندترە، و پەیکەرۆکەکەی کە من هەمە، هەرچەندە ئێرانیشە، زیاتری تایبەتمەندی و شێوە رۆمییەکە پێوەیە... ئەوا ئەوم لەبەردەمدایە: بەسەر و کەللەیەکی پاك تاشراوەوە، کە گەلێك تایبەتمەندی سەروکەللەی لە کاسە سەری خۆیدا هەڵگرتووە. هەروەك

گندۆرەیەکی کە لە دوولاوە گوشرا بێ، لە هەردوو سەرەوە، باریکایی و قۆقزییەکی لێ پەیدا کردبێ، بەدوو گوێی تیژی بزنەییەوەی، سەر و روویەکی لاواز و درێژکۆلە، لووتێکی باریکەڵەی چرچ، دوو برۆی پڕ، دووچاوی بەقوڵداچوو و پێڵووی هەڵامساو و کەوتوو و ناوچەوانێکی خوار و خێچ و روومەتی قوپاو دوولێوی تەنك و تێك ترنجاو، هێندە کە هەردوو لێوەکانی وەك کەتیبەی سەردەرکە و پەنجەران، لە دەموچاوی جودا بوونەتەوە و سێبەریان لە چەناگەی کردووە، هەردەڵێی ئەوە بە قووڵی دە دەریای بیر و لێکدانەواندا رۆچووە و پاڵەپەستۆی بیر و لێکدانەوە و هزرەکان ئەو دوو لێوانەیان لەجێی خۆیان لەق کردوون. چەناگە درێژ، بەدەسکەنە ریشێکەوە کە دەڵێی شێوە ئەندازەیەکی سێ گۆشەی دوو لا یەکسانە و لە پەنا لێوەکانییەوە گیربووە. گەردەن بڵند و ملەستوور و سینگ دەرپەڕیو، بەڵام پان و پۆر، نا. دەرپەڕیوەزگی راست لە قوڵکەی بەر گەردنییەوە دەستپێدەکا، زگ و سینگی هەر هێندە لێك دەکرێنەوە. کە سینگی دەگاتە سەرزگی ئیدی لەوێڕا نشێو دەبێتەوە بەرەو ناوکی و لەسەر ناوکییەوە بەرزاییەکی پەیدا دەکات و لە پڕ دەپووکێتەوە —گەدە و گیپاڵی- هێندە داکەوتووە بە جۆرێك کە ئەڵقەی ناوکی، رێك گەیوەتەوە سەرکلاوەی ئەژنۆیانی و خەریکە بگاتەوە عەردی: ترسی ئەوەی لێدەکرێ کە لە هەر ئان و ساتێکدا زگی بتەقێ. ناوکی وا شۆڕبۆتەوە هەر راست دەڵێی پۆرگی کیرەگایە، بۆیە شتێکی سروشتییە کە ران و کەفەڵەکانی لەدواوە دەرپەڕن — و دەریش پەڕیون. قۆڵ و بازووەکانی لاواز و باریکەڵەن و دەگەڵ لا کەلەکەکانی کە ئێسکی پەراسووانی تێڕا دیارە نێوانێکیان هەیە. شانەکانی دەگەڵ یەك نایەنەوە؛ نشیویە ملی سەری زیاتر بەرەوپێشەوە پێ داهێناوە، وەك ئەوەی شتێکی بە باشی نەبیستبێ و بەسەر سوڕمانێکەوە سەرو سەکوتی هێنابێتە پێشەوە. لاق و لەتەری، پل و پای بزنێن — و بزنیش هێمای ئاڵۆشی و هەوەسبازییەیە...

بە دیتنێ ئەو پەیکەرۆکەی سەربەخۆ فاڵچییەکەی گەڕەکێمانم وەبیرهاتەوە، کە بە مندالی دیتبووم- توونچی حەمامێ بوو. دواییش هەر دیتمەوە: بەسەر ژنێکیانەوە گرتبوو، کە گوایە نزای منداڵبوونێی بۆ لەسەر زگی دەنوسێ. خەڵکی هێنابوویان و رووتیان کردبۆوە و بە کۆڵانانیاندا دەگێڕا، و لێشیان دەدا. دەگەڵ ئەو پەیکەرۆکەی موویان بەنێوانێوە نەدەچوو هێندە پێکدەچوون: بەخۆ و بەو دەرپێ درێژە پڕ لەکەو چڵك و پیسییەیەوە، ئەو لەشە داتەپیوەی و ئەو گەد و گیپاڵە دەرپەڕیوەیەوە، و ئەو ناوکە خڕەی و ئەو لاق و لەتەرە باریکە



قامیشیانەیەوە، و بە خۆ و بەو ران و لولاکە شل و پلانەیەوە کە نە رۆژێك بێڵ کاریەك و نە جارێکی پێ چۆتە شوانییە دەر و دەشت و کێو و بەندەنان- ئەدی ئەو دەست و پل و شانە داچەکاوانەی...

مەندیلەکەی خۆیان دەملی ئالاندبوو و خێشەخێش رایاندەکێشا... جا تۆ وەرە بیری لێبکەوە داخوا شێوەی ئەو روخسارو قەلافەتە دەنا و هەموو گیانلەبەرانی ماڵی و دڕندەی کێوانیشدا هەیە؟ بۆ نموونە سامی شێر، چوست و چالاکی و کەللەرەقییە بزنێ، و نەرمی و جووڵە و هێز و توانای ئەسپ، یا دەمارگیری و تووڕەیی گا؟ ئەوەگا، کاتێ پەڵە خوێنێکی رژاوی بەسەر زەوییەوە دیت، ئیدی ئەوە یەکاندەردوو رادەسێ و بۆنی پێوە دەکات و دەکەوێتە سمکۆلان و پێ لە زەویدانێ، بۆڕەی لێ بڵند دەبێ و لە گابۆڕێ دەدات، و بانگی گایەکانیدی دەکا، هەر راست وەك ئازیز مردووان- جا گابێ یان مانگا. هەر گاگەل گوێیان لە بۆڕەی بوو، وەك دایکانی گەڕەکێ، کاتی بیستنی هەواڵی مەرگی ئازیز مردەییەکی هاوسێیان بەهەڵەداوان دێن و لەدەوری ئەو پەڵەخوێنە ئاپۆڕەی دەبەستن و سەریان لێك نزیك دەکەنەوەو دەست دەکەن بە سمکۆلان و کلکان رادەوەشێنن، و دەستدەکەن بە گابۆڕێ. دەو دەمەیدا، وەك دەڵێن، هەموو شتێکی بە سووری خوێنێ دەبینن. دەوکات و ساتانەدا لێ نزیکبوونەوەیان ترسناکە، چونکە خوێنیان دیوە، خوێن بەری چاوی گرتوون، تەنانەت دەمارە سورەکانی چاویشیان دیارە- و ئەو خوێنەی رژاویشە، خوێنی هەرچی بێ، ئادەمیزاد یا گیانلەبەرێکی دی، هیچ جیاوازییەکی نییە...

کاتێ ئەو رۆژە هاتمەوە ماڵێ و بەسەرهاتی کابرای فاڵچیم بۆ دادەخانێ باسکرد، لە حەژمەتان وشك بوو- هیبارێکی بەدەستەوە بوو، دەچوو لە حەساریێ ترشیاتێ بێنێ، گوتی: ((وای، زەلیل مردە)) و پەنجەی شادەی هەروەك جاران کە سەرسام دەما، بۆ لا لێوی برد و زۆر میهرەبانانە چاوی لە مۆلەق وەستان: ((پەنا بەخوا، لەدەست ئەو ملهوڕە مفتەخۆرانە!)) و دوای تاوێك، گێژ و وێژ و تاسا و ئەوەندەشی گوت: ((زەلیل مردانە، هاربووینە، هار...)) بابە گەورەش هاتبوو- و ئەویش دیبووی. دادەخان نەیدەزانی چ بکا. تێما بوو. گوتی: ((جا توخودا ئەمن چ بڵێم! وەك دەڵێن ئەوەیە ئاخری زەمان!)). دوایی هەروەك چۆن خۆی دەیگوت، دیاربوو کە ئاخرزەمان زۆر لەوەو پێشترەوە هاتووە. سەرگوزەشتەی سەردەمی لاوەتییەی ئەوەی پێشاندەدا

که ئەم جۆرە رووداوانە یەکەم جار نین و لە پێش ئەوەشدا زۆرشتی تری لەو بابەتانە قەوماون و روویانداوە. گێڕایەوە کە جارێکیان بزنەکەیان وندەبێت و دایکی دەینێرێ بەدوایدا بگەڕێ و بیدۆزێتەوە. بە پرسیارانی سەر لەدوو دەنێ تا قولاغی لە دەرکێ ماڵە کاك یەعقوبی دەبینێتەوە —چەندماڵێکی سەرووی ماڵێ خۆیان- دادەخان بە ناباوەڕیەوە سەردە دەرکێ دەنێ، هەر ئەو دەگاتە دەرکێ ژنێ کابراش لەبەردەمی قوت دەبێتەوە. هەر کە دادەخان دەیەوێ دەم لێك کاتەوە، ژنە هەڵدەچێ و دەڵێ: ((بزن!)) وەك ئەو گیانلەبەرە لە جیاتی کلکێك و دوو شاخان هەزاران کلك و شاخی لێ رووابن. بەڵام ئەو دەمەتەقێ و چەنەدانەکاری خۆی دەکا: بزنە لە ژوورێوە، دەنگی دادەخانێ دەبیسێ و هەروەك هاواری تێبەستێ، بارەی لی ّهەڵدەستێ: ((مە ئە ئە ئە!)) ئیشەکە قوڕ دەبێ... کاکە رەجەب عەلی کوڕە نازدارەکەشیان هەرخێرا بزنەی بەستەزمان دەباتە دیوی ژوورێ و توند دەمی دەبەستێ ((زەلیل مردە!)). دادەخان سەری پەنجەی خستە سەر روومەتە چرچ و لۆچاوییەکانی: ((بەڵێ کوڕی خۆم! هەر لەو دەمییەوە ئاخر زەمانە...)).

ئوتومبێلی حەزرەتی ئەجەل کتوپڕ لەسەری مەیدانی ئەبوعەلی دەکوژێتەوە. ئیسماعیل خان کە لەلای دەستە راستی شوفێرێوە بوو، خۆی فڕێدەدا، حەزرەتی ئەجەل سەرو رووی تێك دەترشێ: ((کوڕە هەی دە بەنگ، ئەوە کەی ئاگا لە ئوتومبێل بوونە؟)) دوای تۆزێك بیرو مێشك هێنان و بردن: ((پیاوی قوڕمساغ!)) ئەوەی گوێی لە شێوەی گوتنی ئەو وشەیە ببوو کە لە گەرووی موبارەکییەوە دەرپەڕیبوو لایان وادەبێ کەجێی هاتنەخوارێ شوفێری لە دەوروبەری کێوی قافێوەیە. شوفێرەکە گوتبووی: ((حەزرەتی ئەجەل، ئیدی ئەوە کوژاوەتەوە؛ گوناهی منیش نییە. مەکینەکەی خنکاوە)). و حەزرەتی ئەجەل پڕیشکان داوێ و شوفێرەی بەستەزمان وەبەر قامچییە کلکەگایەکەی دەدا و هەموو شان و قۆڵ و پشت و پشتەملی دەکوتێتەوەو هەناسەی لێدەبڕێ. لە ئازایەتییە مەکینەکەی توڕە نەببوو کە توانیبووی بەبێ مۆڵەت و بە ئارەزووی خۆی کوژابۆوە — مەکینە، ئەو بەندەی خودا، چ تێدەگا؛ بەڵکە لەوە توڕە ببوو کە ئەو خەڵکە رەش و رووتە بێن و روخساری موبارەکی ببینن و ئەو سامە ئەفسانەییەی رەنگی کاڵ بێتەوە و ئەو رەشە خەڵکە سامیان لێی بشکێ. هەروا بە تاقیکردنەوە بۆی دەرکەوتبوو کە ناسیاوەتی ئەگەر بێ رێزیشی بەدواوە نەبێ، کەمتەرخەمی بەدواوەیە. هەرنەبێ گەدەو گیپاڵ و ماسوولکە شل و پل و روخسار و پێلۆوە هەلامساوەکانی پیاوی لە نزیکەوە دەبینن. شوفێرەکە



لە ئوتومبێلەکە دابەزیبوو، هەروەك دەو جۆرەکاتانەدا دەبێ بکرێ، بەدەستی راستی کەوەی فەرمانەکە (سوکان)ی گرتبوو و بەشانی راست و دەستی چەپیشی لایەکی پەنجەرەی ئوتومبێلەکەی پاڵدەدا، و ئیسماعیل خانیش بەو هەموو شڕو شالاّت و چەکمە و جلوبەرگەیەوە دەگەڵ پاسەوانی سەری مەیدانێ کەوتبوونە پاڵنانێ، تا بەسەرەو خوارکەیەکیدا شۆڕکەنەوە. خۆر تازە دەهات لە بڵندایيەکانی ئەلوەندەوە ئاوا دەبوو. دالاّنە هەورەکان دە بەرابەر سەرکەلی ئاوا بوونێدا پان رابببوون و هەر دەتگوت دەمادەمی سەر لە بەیانییەکی زووە... تاریکی تا دەهات بەسەر شار و ((سەنگ شێر)) و کەلاوەی تەلاری سولّتانی مادەکاندا و بەسەر گۆڕە بێ نازەکەی بابەتاهیر و زنجەکەی بوعەلیدا دەکشا. ئەوانە هیچیان نەمابوون، بەلاّم رۆژەکە هەروەك خۆی مابوو و هەرئاوا دەبوو و هەڵدەهاتەوە و ئەو چاوشارکێیەی دەگەڵ شارو خەڵکەکەی هەرگیز بە کۆتا نەدەهات؛ سەرداران، و قەشە و زۆردارانی بە کۆڵێك نەفرینەوەو پیاوچاکانی بە توێشەبەرەی پڕی بەختیاریەوە بەرێ دەکردن. دەگەڵ ئەوەشدا کە بەسەر هەردووی ئەو لایەنانەدا، وەك یەك و بە یەکسانیان لێ هەڵدەهات! بەلاّم بەلای حەزرەتی ئەجەل و شاقەل شۆڕەکانەوە کە ئەوی (ئەجەلی) پێ لە بن شاقەلی خۆیان دەشاردنەوە و جوببە و مەندیلی نوێوە خۆبادەدەن چ جای ئەوەی کە یەکسان نییە، بەڵکە گومراییشە. بەڕاستی نەدەبوو خۆر لە هەموو کەس وەکو یەك هەڵبێ، باشە ئەگەر وەکو یەکیان لێ هەڵبێ کەواتە جیاوازی نێوان ئەوان و ئەو رەشە خەڵکە چییە.

راستت دەوێ، دەبوایە دووخۆر هەبووایە. هەقی وابوو ئەو خان و بەگلەرەی چلەی زستانێ ئاوی تەزیو دەخواتەوە بیگوتبایە ((ئەفسوس بۆ ئەو ئاوە ساردەی رەش و رووت دەیخۆنەوە!)) هاتنی شەوێ و کشانی سێبەرێش هەروا بەخۆڕایی نەبوو... دیاربوو هەربۆیە بوو وجودی موبارەکیان لەچاو نەچن: یەکێك لەو رەشەخەڵکە ناماقوولّییە دیتنێیان بکات، ئەدی نەیانگوتووە کرمانج هەموو رەشە ولاّغن... ئیدی خۆکاری رەشە ولاّغانیش دیارە. کێ دەزانێ داخوا ئێستر پەیزەنە یان نا. گا قۆچان داوێ یان نا، سەگ دەگەزێ یان نا. کاتێکی بەخۆت دەزانی کار لەکار ترازاوە.

شەقام و مەیدانی بوعەلی هەروا مۆنجەی دەهات لە قوتابیانی قوتابخانە و کتێب بەبن هەنگڵێوە، کە لە گۆڕەپانی فوتبۆڵێنێوە بەرەو ماڵ دەبوونەوە. هەردوو جۆگەلە ئاوی

کەنارەکانی شەقامەکەش کە خۆیان لە بەفرەکەی چیای ئەلۆەند دزیبۆوە، و دەگەڵ هەرزەکارەکاندا سروودی ئازادییان دەچڕی و دەچوون خۆیان تێکەلاوی پیسایی شاری کەن. هەروا بەرێوەش گۆرانییان بۆ دار و درەخت و سەوزە و کێڵگەکانی سەرە رێیانیان دەچڕی و مژدەی هاتنی خۆیانیان دەدانێ و هەر کە دەشگەیشتنەجێ ئیدی ئەو سەرلەنوێ تەڕ و تازەو پاراو دەبوونەوە... هەموو جێیەك هەر هەراو بەزمە. گۆرانییە شادەکان دەنگە کپ و بێ ئاوازەکانیان زیندوو کردبوونەوە. منداڵان هەروا دەستە دەستە دێن، و هەر کۆمەڵەی وەك ئەسپی پێش قەتارێ تریقە و قاقای پێکەنینی لاوەتیان دەهەوایدا دەزرنگێتەوە...

لەپڕ دەنگ و بەنگ نامێنێ... ((وسس، حەزرەتی ئەجەلە... حەزرەتی ئەجەل!)) و سرتە سرت و چرپەچرپی ترسانێ سەرهەڵدەدات و وەکو هەموو بانگەشەیەکی دی، دەستوبرد هەموو لایەکی دەگرێتەوەو بلاو دەبێتەوە.

حەزرەتی ئەجەل دەشاریدا دانانیشێ —شار یەکێکە لە زۆربەی زۆری قەڵەمڕەوەکانی ژێر دەسەلاتی وی. زۆربەی کاتەکانی لە پادگانێ لەشکریدا بەسەردەبا؛ لێرەش سەراپەردەو دامودەزگا و- زیندانی- هەیە، جا لە کوێی نییە؟ سەر و ماڵ و ئابڕوو و نامووسی هەموانی لە بن دەستییە. ئەدی ((تاران)) هێمنی و ئاسایشی ئەم ناوچەیەی هەموو لەوی دەوێ؛ بۆیە لێپرساوە، و بۆ ئەنجامدانی ئەو بەرپرسیاریەتەشی دەبێ ئازاد و بالا دەست بێ- و دیارە لەم لایەنە شەوە، کەمایەسی نییە، بەڵکە زیادیشی هەیە، هەروەها پارۆیکی نیوە جوراویشی لەمە بە ئیسماعیل خان بەخشیوە. بەلام بە پێچەوانەی قسانەوە کە دەگوترێن، چونکە بەرپرسیارە دیارە دەبێ چارەنووسێکی زۆر دەردناکی هەبێ، یان دەیبێ. بەلام هەرگیز نەشیبووەو ناشیبێ بۆ خۆشی ئەوەی چاك دەزانێ، ئەوە پەنجا سالێشە هەروایە. یاسا؟ - یاساش هەر خۆیەتی: هەرچی بیەوێ، چۆن ئارەزوو بکا. چاو و گوێی لە هەموو جێیەکی هەن- تایبەتی و گشتی. ماوەیەك لەمەوپێش جووتە برایەکی مانگێك دە زیندانێ توندکردن، بە بیانووی ئەوەی گوایە لە کۆڕی مەی خۆراندا چاوی هەوەسبازییەیان دە پەیکەری فەوزییەی شاژنەوە بڕیوە، و گوایە زەردەخەنەی ((مانادار))یشیان هاتوونێ. دیارە حەزرەتی ئەجەلیش لەمەدا بێ مەبەست نەبووینە، چونکە ئەو دوو لاوە بەگوێرەی ئەو هەوالانەی گەیشتوون لەوانەن کە حەزرەتی ئەجەل مەبەستیانە: زەوی و زاری چاکیان هەیە، بێ ژن و ماڵ و حاڵن، چۆن دەبێ وا دەست بلاوبن. لە



کاتێکا کە دامودەزگای حەزرەتی ئەجەل ئەو هەموو خەرجییەی هەیە. هەر ئەو مانگەی پێشووش دکتۆر یۆناتانیشی گرت. جوولەکە... جاسوسی بۆ رووسان دەکرد: نانی شاهەنشا دەخواو دروودی جوولەکانەی بۆ ستالینی دەنێری! دوو منداڵی چاو و برۆ جوانیشی هەبوون. حەزرەتی ئەجەل لەو باوەرەدا بوو کە ئەوەش هەر بێ مەبەست نییە: بۆیە چاو و برۆیان جوانە تا چاکتر جاسوسییە بکەن و خەڵکیش تێنەگەن کە جاسوسییە بۆ رووسان دەکەن، و دەنا رووسییەکی لادێیی و چاو و برۆی واجوان! نا... دەبێ ئەوەی یەك لاکەمەوە! و حەزرەتی ئەجەل بەشی دووەمی کارەکەی، ئەوەی راستیبێ، وەك کارێکی لێکۆڵینەوە و پشکنین و داهێنان، سەر دە دوونا و کەوتە شوێنی. ئەو دوو هەرزەکارە ماوەیەکی زۆر بۆ بەردانێ بابیان وێکەوتن- تا سەرەنجام ((تاوانباری))یەکەی لەسەر لابرا. بەلام لێکۆڵینەوە و پشکنین و بەدواداچوونەکانی حەزرەتی ئەجەل دەگەڵ ئەو هەرزەکارانەدا، بوو بنێشتە خۆشەکەی سەر زمانی هەرچی کارەکەر و خزمەتکار و بەردەست و قەرەواشانە. دەیانگوت: حەزرەت ئیسماعیل خانی راسپاردووە، ئەم جارەیان کامیان زۆر لووس و پووس و خاوێنترە، ئەویان بێنێ؛ کەچی حەزرەتی ئەجەل پڕ دەداتە ئیسماعیل خانی و لێی تووڕە دەبێ کە ((گوێلکە پیاو ئەدی ئەمن نەمگوت؟...)) ئیسماعیل خان عەرزی دەکا، قوربان سوێندەکە بە سەری موبارەکتان هەر دەلێی ئاوێنەیە هێندە لووسە؛ ئەو تەنکە سێبەرەی کە وەبەر دیدەتان هاتووە ئەوە ئەگەر قبووڵ بفەرموون وێنەی سێبەری ریشی حەزرەتی ئەجەلە... خەڵکەکە هاتبوونە هاریکارییە. **محەممەد عەلی** رەزایشیان دەنێو دابوو. لاوێك بوو تازە دەگەیشتێ، شازدە هەڤدە سالانە. کتێبەکانی دەبن هەنگڵێ راستییەوە نابوون و بە دەستەکەی دیکەشی پاڵی بە ئوتومبێلەکەوە دەنا. راست ببۆوە و هەڵچوبوو —لە مەیدانی فوتبۆڵێوە دەهاتەوە. حەزرەتی ئەجەل لەوپەڕی تووڕەیی و لووت بەرزییەوەیڕا، کە لەسەر کوشنی دواوەی ئوتومبێلەکە پاڵی دابۆوە، بە تیلەی چاوی دیتی. هەرکە چاویشی پێیکەوت کتوپڕ روخساری موبارەکی وەك وێنەی پۆلارۆیدی کامێرا گۆڕا: هەر بەوجۆرە بەلام زۆر لەوە خێراتر، تاریکییە سەر روخساری رەوییەوە و زەردەخەنێکی کە شێوە و شوێنەواری لە هیچ جێیەکی نەبوو وەدیارکەوت، و بلاوبۆوە و تا دەهاتیش رەنگ و تینی گەرمییەی زیاتر دەبوو.

**محەممەد** عەلی غیرەتی وەبەر خۆی نابوو و هاتبووە ئەولایەی کە حەزرەتی ئەجەلی لێ دانیشتبوو... دەیویست بە یەك سەرنجی خێرا روخساری حەزرەتی ئەجەل، و تاج و

ئەستێرەکانی سەرشانی و گەڵا خورماییەکەی دەوری کڵاوەکەی و ئەو دوو قیراجە رەشەی تەنیشتەکانی پانتۆڵەکەی دەنێو ئوتومبێلەکەیدا ببینێ و بۆ برادەر و ماڵەوەیانی باس بکات.

((ئیسماعیل خان!))

((بەندەی حەزرەتی ئەجەل!))

یەك تیلە چاوی بەسە. حەزرەتی ئەجەل رووی لە ئیسماعیل خانی وەردەگێڕێ و سەیرێکی محەممەد عەلی دەکا. محەممەد عەلیش کە هەر ئاوا بەم شێوەیە بەبێ بانگ کردن. بانگ کراوە ئیدی پاڵ بە ئوتومبێلەکەوە نانێ، حەزرەتی ئەجەلیش لەو دوورکەوتنەوەی ئوتومبیلێی رازی نەبوو- دەیویست هەر دەناو ئاپۆرەی خەڵکەکەدا بێت! بەڵام تازە ئوتومبێلەکە دوور کەوتۆتەوە، ئیسماعیل خان دە ئاماژەکە گەییوە، شوفێرەکە خۆ داوێتەوە پشت فەرمانەکە و سویچەکە دەخاتەوە ئوتومبێلەکەوە و گێڕەکە (دەندە) دەگۆڕێ. ئوتومبێل وە پرتە پرت دەکەوێتەوە. خەڵکەکە بڵاوەیان لێکردووە، هەر تەنیا محەممەد عەلی نەبێ کە کەوتۆتە بەر دڵ و دیدەی حەزرەتەوە، ماوە.

((قوتا بیت؟))

((بەڵێ قوربان)).

لە قسە دەگەڵ کردنی گەوراندا (قوربان)مان نەخوێندووە و هەروا فێری بووین.

((پۆلی چەندەمی؟))

((پێنجەمی دواناوەندی قوربان)).

ئەوە شوفێرەکەش ئاگای لێیە — ئوتومبێل هەروا پرتە پرتیەتی.

قوربان دەفەرمووێ: ((ئافەرین! باوکت چ کارەیە؟)) بە تیلە چاوێکەوە دەگەڵ ئیسماعیل خانی.

محەممەد عەلی دڵشاد و شاد و شەنگوڵ، رەنگێکی دێنێ و رەنگێکی دەبا: لوتفێکی کەم نییە- دوور نییە بۆ تەواوکردنی خوێندنی، بینێرێتە تارانێ- گەورە پیاوان ئەم جۆرە لوتفانەیان زۆر کردوون.



ناو و ناوبانگ و کاروپیشەی باوکی پێدەڵێ، بەڵام لەجیاتی ((بۆیاغچی)) کەوش درووی پێدەڵێ و بەسەر ئاماژە بۆ لایەکی مەیدانێ دەکا، و شوێن کارەکەی باوکی پێشاندەدا. بەو رەنگ هێنان و بردنەشی، جوانییە منداڵانییەکەی دوو چەندانی دیکە بۆوە. بەو دەموچاوە خڕو خەپان و سپییە بەرچاوەی و ئەو دوو چاوە رەش و لووتە قەڵەمییەیەوە ئیدی... هێشتا تاڵ و سوێری و خۆشی و ناخۆشییە ژیانی نەچێشتووە، قەڵەمی بیر و خەیاڵ و لێکدانەوە خەتی دەنێوچەوانێ نەکردووە...

((بڕۆ!))

دە شوفێرەوە خوڕینە... و ئوتومبێل دوور دەکەوێتەوە و حەزرەتی ئەجەل دیسانەوە دەچێتەوە قەپێلك و دۆخی پڕ ترس و سامی خۆیەوە، بەشێوەیەك لێ نزیك بوونەوە نەکرێ هێشتا لە گێڕانەوەی چاوپێك کەوتنی خۆی و حەزرەتی ئەجەل نەبۆوە کە سەرباز و پاسەوان بەماڵێ وەردەبن و دەیبەن —((باوەگیان))یان لەپێشدا برد- باشە بۆ؟ هیچ دیارنییە.

محەممەد عەلی بۆخۆی هیچ نیگەرانییەك و دڵەڕاوکەیەکی نییە؛ لەوە دڵنیایە کە حەزرەتی ئەجەل دەیەوێ هەر لە ئێستاوە بینێرێتە تارانێ- دەستوپێوەندەکان فەرمانەکە بەپێچەوانەوە تێگەیشتوون! بەڵام... بەڵام سەرەنجامی کارەکە دەردەکەوێ کە هەردووکیان هەواڵچنیان بۆ رووسان کردووە، هەردووکیان زیندانییە کونەرەشێن، هەردووکیان هەڵدەواسن و لە داریان دەدەن. باجی گوڵبەهار و دوو زەعیفە و کوڕیژگەیەك مانەوە. هەرچی بیر و لێکدانەوە و خەیاڵی دایی بوو هەمووی فت، تێکڕای هیواو ئاوات و ئومێد و حەزەکانی بە باچوون. هەروا هەفتەیەك پێش ئێستا بوو کە مەنجەڵ و قابلەمەی بۆ- جیازی عالیەی کڕین. عالیە کچێکە تازە دەگاتێ، بەڵام بە تەواوی مانا جوان، هیچ جێیەکی نییە جێ پەنجەی نەخش و نیگاری خودای پێوە نەبێ، کەڵەگەت، سەروکەزییە رەش، لێوەکانی لێوی خوای عیشق و جوانی و دەم غونچەگوڵ، بەتایبەتی ئەو جوانییەشی هەموو دە روخساریدا بەرجەستە بووە و کۆبۆتەوە. کراسەکەی، هەرچەندە کاڵیش بۆتەوە، بەڵام دەبەرویدا هەر دەڵێی منداڵی شیرە خۆرەیە و بەسینگ و بەرۆکی دایکییەوە نووساوە. دامەنی تابلێی کورت، چونکە دایکە بێنەوایەکەی — وەك منداڵی بەناز پەروەردە- زۆر لەسەرخۆ، بەڵام بە شادمانی و روویەکی خۆشەوە دەیلاواندەوە. کەچی کچۆڵەکە تا خوا حەزکا سەر زیندوو و زیتەڵە —هەروەك لاخەدار بەڕووی

شلك و تەڕی پێگەیشتووی خەڵفی ساڵێ. دەنگی تازە دەهات درزی سەردەمی لاوەتییەی تێ ببێ و دەگەڵ هەر وشەیەکیدا هەزارەها درز و تەڕاوکەی دەگیانت دەکرد. چاوەکانی هەردەمە ڕەنگێك بوون، دەگەڵ هەر ڕەنگێکیدا هەزاران ڕەنگی جۆراوجۆری لێدەکەوتەوە، کە هەریەکەیان زمانی داستانێکە بۆخۆی، و هەرچی بوونە هەمووی لە یەك جێگا، و بەیەك دەنگ، و یەك سیمفۆنیا دەگوترا، بەڵام ئەرکی هەرە گەورەی ئەو سیمفۆنیایە چاوەکانی لێ بەرپرسیاربوون کە نەخش و جێ گوتنەکەی دەناو نۆتەی مۆسیقادا دیاری بکا: خاوبوونەوە و جەختکردن و گرژبوونەوە، و بەرزی و نزمی دابینکردنی بەردەوامی پارچە مۆسیقاکە: کە ئەوان وەك وتاربێژی زەبردەست دەسات و کاتی خۆیدا مەحشەرێکی بەرپا دەکات و ئارامی و دڵنیایی بۆ بینەر و گوێگر دەکاتە دیاری و هێوری دەکاتەوە. بێ ئیختیار چاوت دەچاوی هەڵدەنگوێ و سەرنجت لە پەنایەکی ئەو چاوانەی ویدا بۆ پەنایەك دەگەڕێ: ئەو هەموو گەرمی و نەرمی و ئەو هەموو ڕەنگانەی کە یەك بەدوای یەکدا لێك دەئاڵێن و گێژت دەکەن... و ئەو هەموو پاکییە تێکەڵاوەی بە شتێکی دیکە بچوێنی، کە ئەویش سەرەنجام هەر پاکییە کە تەنیا دەتوانی ناوبنێی نازو نوز. بەڵام نازو نوزیش نییە، چونکە بەدەست خۆی نییە- هەروا لەخۆوە شتێکی سروشتییە؛ هەربۆیەشە پاکە، و وەك تیشکی خۆرە تاوێ خۆیت تێهەڵدەسوێ و تۆ خاوبوونەوێکی سەیر دەخۆتدا هەستدەکەیت و پێت خۆشە هەروا بەم جۆرە چەندین کاتژمێر و چەندین ساڵان دەو پەنایەیدابی و نەیەیتەوە دەرێ و دەگەڵیدا ئاوێتە بی. بەڵام کێ دەڵێ پێت ڕازییە. بەتایبەتی ئەگەر نیازێکیشت دە دڵی دابێت و لە چاوەکانتەوە سەرکات. دەوبارەیدا بروسکەیەکی بەرەو دوا، سەرنجێکی سارد و سڕ، کە گڕی خۆزگەکانت دامرکێنێتەوە. هەر بە پەیبردنی بەو حەز و ئارەزووانە، پرۆژەکتەرێکی کە لەو دیوی ڕەشێنەی چاویەوە داناوەو شووشەی ئاوێزەکە ڕووناك دەکاتەوە، کتوپڕ دەکوژێتەوە و ئەو پێڵووانەی مەستییان پێوە دیارە بەسەریەکدا دەکەونەوە.

هەر کە ((باوەگیان)) لە ئیشێ دەهاتەوە ئەو خێرا مەسینە و دەستشۆری دێنایە بەردەمی، تا بابە دەستێکی بەسەر و ڕووی خۆیدا بێنێ و ماندووی وەحەسێ. مەسینە و دەستشۆری ئامادەکردوون و لە خوار ژووریێ چاوەڕێی بابیەتی و گوێشی بۆ چیرۆکی ((کاکە))ی هەڵخستووە کە سەربازو پاسەوانەکان بە ماڵێ وەردەبن... حوسێن منداڵە، هەر سێ چوار ساڵانە دەبێ- مەلیحەش هەر منداڵە...



بابی هەمموو دەمان بوو. لە ماڵێش بایە کەس هەستی پێنەدەکرد... هەمیشە هەروایە، هەمیشەش هەروا بێ هەست و خوست بوو. هەرگیز ئێواران بەدەستی بەتاڵەوە نەدەهاتەوە، شتێکی هەر پێبوو: شووتی، کاڵەك (گندۆرە)، ترێ... بەڵام ئێستا؟ ئێستا نە ئەو و نە کوڕی گەورەی ماڵێ هیچیان نین...

هەرچی خەون و خەیاڵەکانی دایکیش بوون هەمووی ڕەوینەوە، هەروا هەفتەیەك لەمەوپێش بوو تاکە گۆرەوی و چمکە لەچك و قۆرییە شکاوی هەموو هەڵڕشتن و چوو مەنجەڵ و قابلەمەی بۆ جیازی عالیەی کڕین.

وردە وردەش چاوی بەکچە دراوسێ و کچانی چەند ماڵ بەولاوەترەوەی ماڵە خۆیاندا دەگێڕا و بەچاوی مشتەرییەوە لێی دەڕوانین. ئەدی ئەوە محەممەدیش وردە وردە قوتابخانەی تەواو دەکات و لە ((فەرمانگا))یەك دادەمەزرێ. ئێ خۆ ژنیشی دەوێ؛ ئەوە نەگومان و نەخەیاڵیش بوو. ماشەڵڵا بەلا دوور. هەر دەتگوت درەختی شمشادە هەڵچووە. دەست لەسەر هەر کچێکی دانێ، قونێی بۆ لە عەردی دەخشێنێ...

ئەوە ئێستاش ئەو هەموو خەون و خەیالانە، ئەوەتا بە یەك مشتەکوڵەی لەبەریەك چوون! وەك بەنێو تارماییاندا بێت و بچێت.

ئەوشەوە دەگەڵ عالیەی چوونە پۆلیسخانەی. پاسەوانەکان، و ئەفسەری ئێشکگر... هەموو عالیەیان پڕ بەچاوی دیت، هەر بەچاوان ڕووتیان کردەوە، هەموو لەشیان بەسەرنجان ماڵی — بەڵام هیچیان لەزاری نەهاتەدەرێ. با بەگێلی خۆیان نەخەنە ناو ئەو گێژاوەوە: ((منداڵتان وردە، خوا هەڵناگرێ، خۆتان و منداڵەکانتان بەدبەخت کەن!)).

بەیانی ئیسماعیل خان پەیدابوو، نەیگوت چ بووە و چ نەبووە و چۆنی زانیوە و ماڵێی چۆن دیوەتەوە... خوا ڕاوەستاوی کات. خوا بەپێی خۆی ناردبووی. بەئاشکرا نەیگوت چییە، بەڵام دیاربوو شتێکە. ئەوانەی کە دەبوو بزانن دەیانزانی- دەیانزانی کە لە بنەچەدا ئیستواری سوپایە، بەڵام ڕاستییەکەی دەستی زۆر دەڕۆیشت و بە هەموو شتێکی ڕادەگەیشت. لەبەر ئەوەی خزمی حەزرەتی ئەجەلە، هەروەك بۆ خۆی دەیگوت لەداکێوە. سەرەڕای ئەوەش ئەسکۆیی دیزەی حەزرەتی ئەجەلیشە. ناوە ناوە جلوبەرگی ئەفسەرانە و ئیستوارانە دە

بەردەکات: چەکمەی لە پێدەکا، دەمانچەی دەبەستێ؛ سلاّوێ بۆ ئەفسەران ناکا. ئەگەر سلاّویان بۆ بکات ملکەچی و کەمایەسییە. لەسەفەر و پێشوازیاندا، دەگەڵ دەگەڵە، لە پێشەوەی ئوتومبێلێ بە تەنیشت شوفێرییەوە دادەنیشێ. بۆئەوەی تا ئەگەر خوانە خواستە بەلاّیەکی زەوی یا ئاسمانی بۆ حەزرەتی ئەجەل رێککەوت ئەو ببێتە قەلغان و سوپەر و پێشمەرگەی وی. بەلاّم راستییەکەی هەر ئەوەیە، کە دەگەڵ حەزرەتی ئەجەل ببینیدرێ، تا هەموو لایەك بزانن چاو و گوێ و رازگری وییە و هەرکاتێ چووە جێیەکی خەڵکەکە، بەقسە و گفتی پێشینان ئەوە ئەو بە کوڵك و پێستییەوە حەزرەتی ئەجەلە بۆ خۆی. روخسارێکی رەقەڵە و درێژکۆلەی هەیە، وەك ئەسپی سەرو کەللە درێژ؛ گوایە ئیستیواری سوارە بووە: بە لولاکی خوار و ئەوزمانە لالّەیەوە، واپێدەچێ بیەوێ لە هەڵس و کەوت و پیاوانی سوپایی نزیك بێتەوە. خەفیە هەن دەنگوباس و هەوالاّن دێنن، و ئەوە هەر ئەویشە کە هەمووان تەتەڵە و ساغ دەکاتەوە، دە شاری گچکەدا —تەنانەت ناوەندی سوپاشدا- لولێنەی خان ئاوێ زۆر دەبا، هەتا تێیکەی دەیگرێ. ئەوە سەلام و ئیکلام بەجێی خۆی. لەهەر ماڵێکیش —گەورە مالاّن-دا ئەوە دەزگای تریاکەکەی ئەگەر بفەرمووێ حازر و ئامادەیە. خۆ ئەگەر بێ بانگهێشتیش بچتە مالاّن ئەوە دیارە ((کاری)) هەیە؛ کارەکەش هەر دیارە، کاری حەزرەتی ئەجەلە.

خۆشبەختانە بازنەی ئارەزوو و داواکانی حەزرەتی ئەجەل دیارە: نەغد و نەغدینە جا هەرچییەك بێت- هەر لە ئەسپی چاکەوە تا پارە و پولێکی کاش و قالّی و قالیچەی باش؛ و سێکس- تەنیا نێرینە. بەلاّم ئیسماعیل خان سەری پێوە نییە بۆ مێینەی و لە بەینی خۆماندا بێ، ئاوی تێدا دەخواتەوە. خۆ هەر ئەوەندە یەکێکیشی هەڵنا ئیدی ئەوە سەری دە دوو دەنێ و وەبەر پەسەندی گەورە پیاوان کەوتووە — بۆی دەخشێ و فەرمایشتان دەدا کەوا چاکە- بۆ سەلماندنی شا دۆستی و ولاّت پەرستییە- ئەوەندە پارەیە پێشکەشی حەزرەتی ئەجەل بکرێ... هەر بۆ ناوی بەرێزانتان باشە... واچاکە فلاّن چەند رۆژێکیان لە ماڵێ حەزرەتی ئەجەلی خزمەتێ بکات و هێندێك کاران ئەنجامبدات و ماوەیە لەوێ وەمێنێ (هەرچەندە ئەو راسپاردەیە ئێستا، بە شێوەیەکی دیکە گۆڕاوە). ((حەزرەتی ئەجەل ئەو جوانووە ئەسپەیان زۆر لا پەسەندە)) سەروچاوی وا دەگەیەنێ کە خۆزگە بە خۆتان کە جوانووە ئەسپەکەتانیان لە لاپەسەندە، ئەو بەخت و شانسە روو لە هەموو کەسێکی ناکا... حەزرەتی ئەجەل بەو زووانە تەشریف دەبەنەوە



تارانێ؛ فلاّن شازادە ئەسپی وا و وای داوا کردووە.... کە بەرێکەوت هەموو ئەو تایبەتمەندییانەن کە لە جوانووە ئەسپە پەسەندکراوەکەی ئێوەدایە.

زۆر خۆمانە و بەڕوویەکی زۆر خۆش و گەشەوە هات لەسەر بەستەکە نوێنەکانی نوستنێ دانیشت و گوێی حوسێنی راکێشا و گفتی دایە کە رۆژێکی دەیبات و سواری ئەسپی دەکا. وای کە پیاوێکی چاکە! عالیەشی دیت و وەبەر سەرنجانیدا؛ چاوەکانی دەمانگی سینگ و بەرۆکیدا وێڵ بوون و بێ ئیختیاریش کەوتە بەر تیشکی پرۆژێکتەرەکانی چاوی- بەلاّم ئەو هەڵەی بۆ نەڕەخسا ئارامیان تێدا بگرێت. هەر بۆ دڵنیاکردنەوە و رێنماییە، بە دەنگ و رەنگی کەسێکی کە زۆر دەمێك بێ ئەو جۆرە کێشانەی بە نووکی پەنجەکانی تێك و لێك کردبنەوە، بە دەنگێکی وا کە وێنە و شێوەی ئەو دەنگانە هەر لە مەزاتخانەی ماڵ فرۆشاندا هەبێ و بیبیسی، گوتی: ((ئای بابە... هێندە ناراحەت مەبن مە! روو وەرگێڕانی ئەو پیاوە سادە و ساکارە شتێکی وانییە!)) ئەو پیاوە سادە و ساکارەش حەزرەتی ئەجەل بوو.

((باوەڕتان بێ، ئەو برایە... ئێوە نایناسن...)) باجی گوڵبەهار بێ ئیتختیار بە دەنگێکی کەساسانەوە گوتی: ((دەی کاکە، خێرا!)) ئیسماعیل خان گوتی: ((بەڵێ... خەریك بووم ئەوەم دەگوت... روو وەرگێڕانی ئەو پیاوەی هەر هیچ نییە. هەروا بە یەك دوو وشەی لووس و پووس، و زمانێکی شیرن- دەبێ ببوورن- دەتوانن بیکەنە ئەڵقە و لە پەنجە تووتەی خۆتانی کەن!)) بە سەرو روویەکی واوە وەك هیچی نەهێشتێتەوە و سەودایەکەی یەك لا کردبێتەوە و بڵێ: ((دەی سەڵەواتێکی لێدەن و خێری لێ ببینن)) باجی گوڵبەهار چاوی لە مۆلەق وەستابوون و بێ ئیختیار گوتی: ((ئاوا!)) ئیسماعیل خان گوتی: ((باااڵێ! خواوەندیش هەر بۆیەی زمان داوەتە بنیادەمی بەندەی خۆی تاکەسانی دیکەی پێ هێڕکا... وانییە؟ یەك پاکی و سادەیی لە چاوان دەباری. باجی گوڵبەهار کە لەبەری ئەوبەرێوە زۆر شەرمێونانە، تۆزێك لە خوارترەوە دانیشتبوو لایەکی سەرپۆشەکەی بە ددانی گرتبوو گوتی: (( وەڵلاّهی بڵێم چی، ئێوە چاتر دەزانن)) ئیسماعیل خان گوتی: ((بەڵێ ئیدی، هەر هێندە بەسە... بۆ نموونە ئەو کچە خاتوونە...)) ئاماژەی بۆ عالیە کرد... ((راستییەکەی نەتان فەرموو ئەو کچە خاتوونە ناوی چ بوو..؟)) دایی گوتی: ((عالیەی قەرەواشتان)) ئیسماعیل خان گوتی: ((خوا بیهێڵێ، خوشکێ مەیە... بەڵێ، هەر هێندە بەسە ئەو عالیە خاتونە دوو سێ رۆژان بچتە مەتبەخێیان و کارێ بکەن، و

وەك دەشبینم کچۆڵەیەکی بە زیبك و چاپووك و دەست ڕەنگینیش بێت. چونکە وامدێتە بەرچاوان کیژێکی خاو و خلیچك و دەست و پێ سپی و ناو لەپ خەناویتان بار نەهێنابێ. هەرواشە. چونکە کچی ئێمەی هەژار و نەدار هەردەبێ گورج و گۆڵ و چوست و بەکاربن. تا هەر نەبێ بتوانن بەرەی خۆیان لە ئاوێ دەرێنن)) باجی گوڵبەهار گوتی: ((کاکە وای تێمەگەن- لە هەر پەنجەیەکییەوە سەد هونەر دەبارێ...)) و عالیە لەڕووی خۆ بەکەم گرتنییەوە لایەکی لەچکەکەی بەدەمیەوە گرت و زەردەیەکی هاتێ. ئیسماعیل خان گوتی: ((دەزانم، دیارە... بەڵێ، هێندە بەسە کە کیژە خان... ڕاستییەکەی هەمدیس ناوەکەیم لە بیرچۆوە...)) دایی گوتی: ((عالیەی قەرەواشتان)) ئیسماعیل خان دە درێژەی قسەکانیدا گوتی: ((هێندە بەسە عالیە خان دوو سێ ڕۆژان بچنە مەتبەخی ماڵە حەزرەتی ئەجەلی کارێ بکەن... ئەڵبەتە داوای لێبوردن دەکەم، پەرژین بێ، چێشتکەر و کارەکەر و چاپەز و قەرەواشی هێندە لێن هەر مەپرسە، بەلاّم وایە ئیدی، ئەوانەش دڵیان بەوەی خۆشە کە ئەدی... شازادەن... دەڵێی چی دڵیان بەوەی خۆشە کە یەکێك بچێت و پەرژین بێ لێتان و بڵێ ئەرێ کەرتان بە چەندی؟... یا ئەو کوڕێژگەتان... ڕاستی لە بیرم چۆوە، کوڕێژگەکە ناوی چ بوو؟ دایی بە بۆچوونی خۆی کە کوڕێژگەکە ئەوەی لەوێیە دەڵێ: ((حوسێنی خزمەتکارتان)). ئیسماعیل خان دەڵێ: ((کام حوسێنکە...)) عالیە پێکەنینی بە سادە و ساکارییە دایی دێ- و پێدەکەنێ، هەرچەندە دەنگی پێکەنینەکەشی قووت دایەوە، بەلاّم تەواوی ژێیە ناسکەکانی سەرتاپای ئیسماعیل خانی هەژاند، کە تا ئێستا بۆخۆی پەی بە هەبوونیان نەبردبوو. بەلاّم هەستیکرد گۆڕا... مەلیحە دەڵێ: ((ناوی محەممەد عەلییە، حوسێن ناوی ئەو بچکۆلەیەیە)). دایە شڵەژاوە؛ چ بکا؛ ئیدی خۆ هەر بەبیستنی ناوی محەممەد عەلی ئەو خۆی لێ وندەبێ، ((ئاه)) هەناسێکی هەڵدەکێشێ. ئیسماعیل خان هەر بەدوای قسەکاندا درێژەی دەداتێ: ((یا ئەوەی حەمە عەلی خان چەند ڕۆژێکان بچن و سینییە قاوەڵتییەیان لە بەردەمی دانێن، یا چەکمەکانی بۆ پاککەنەوە —ئیدی ئەوە دەتوانن!؟)) باجی گوڵبەهار دەڵێ: ((بەڵێ کاکە، ئاغاش فێری کردووە!)) ئیسماعیل خان دەڵێ: ((باشە، ئیدی ئەوە چاتریش... باوەڕتان بێ لە خۆی سادەتر هەرنییە- ئەو گەورانە دەڵێم...)).

دوایی وەك ئەوەی ئەو ڕێنماییە جۆرە زیادە ڕۆییەکی لە مافی ئەو خێزانەدا هێنابێتەکایە، بەدەنگێکی نیوە فەرمییەوە درێژەی دەداتێ: ((دیارە بۆ خۆشتان باشتر دەزانن- وەك دەڵێن،



هەرکەسە بۆخۆی ئیشی خۆی چاتر دەزانێ- من هیچ مەبەستێکی تایبەتیم نییە... بێرەدا تێدەپەڕیم. گوتیان پێشهاتێکی وای لێ ڕوودا‌ون، گوتم بابچم و هێندێکیان دڵ دەمەوە. ئیدی پیاویش چەندی لە دەست بێت هەرچاکە)). دایی بەدەنگێکی پڕ لەتکاوە دەڵێ: ((خوا دەست بە تەمەنتانەوە گرێ؛ خوا سێبەری ئێوەمان لەسەری کەم نەکا، خوا منداڵەکانتان پێ بێڵێ)).

ئیسماعیل خان زۆر خۆمانە پێدەکەنێ، و دەڵێ: ((زۆر سوپاس، خانم، بەلاّم هێشتا هەر ڕەبەنم، هێشتا ژنم نەهێناوە... ئای هەی، ئێمە و ژن هێنان... هەرچەندە وەك ئێستا فەرمووتان گۆڕاوم... وەك بڵێی وردە وردە خەریکم پیر دەبم، بەبێ ئەوەی بەخۆم بزانم. ئینشاڵلاّ ڕۆژێکی دێ بۆ خۆتان قۆڵی لێهەڵکەن و قەیرەکچێکی گوێ ڕایەڵم بۆ وەبینن)). و سەیرێکی عالیەی دەکاتەوە و پێدەکەنێ. منداڵەکانیش هەموو هەر پێدەکەنن. ((...بەڵێ لە گاڵتەش دەرچێ، دەمەوێ ئەوەتان عەرزکەم کە وەك ئەوەی من بیستوومە تۆمەتەکەشیان زۆر قورسە- نابێ پشتگوێی خەن... ڕاستییەکەی، چۆنە پرس و ڕایەکیش بەڕێزدار زەینول عابیدین بکەین؟ -هەم پیاوی خودایە و هەم حەزرەتی ئەجەلیش باوەڕ و متمانەیان پێیانە. بۆ خۆم زۆر جارم لەلای وی دیوە؛ بۆی بپاڕێتەوە و نزای بۆ بکا... ئەگەر بە چاکی زانی ئەوان ئەو کارەش بکەن.

دەبوون ها، من ئەوەتان بەبرایانە عەرز دەکەم...)) باجی گوڵبەهار دەڵێ: ((خوا لە برایەتییەتان کەم نەکا... بۆ خاتری هەر پێنج ئیمامان!)) هەر دەوشێلە و بێلەیدا ئیسماعیل خان حوسێنی تاو دەداتێ و لەسەر ئەژنۆیەکانی خۆی دادەنێ؛ دە شاییەکی نوێی دەدەستی دەنێ، تا بەستەنی مۆتەی پێبکڕێ. ئێی، ئەوە پارەیەکی زۆرە!...

دیارە سەودای گیان بەس نەبوو نۆرەی سەودای لەشیشە... دەمێك بوو هاتبوو، باجی گوڵبەهار هۆشی لێنەبوو- زۆر لەمەوپێش... لەسەردەمانێکی دێرینەوە... لە کۆنەوە... بە کۆنی گیان و هەموو تەنتەنە و بەنبەنەکانیەوە... تێپەڕین. عالیەش چووە مەتبەخی ماڵە حەزرەتی ئەجەلی؛ ئەکبەراغا بەربوو، بەلاّم حەمە عەلی سووسەیەکی نەبوو. وەك دەیانگوت جاسوسی ڕاستەقینە هەر ئەو بووەو بابیشی تێوەرداوە... بەڵێ، ئەدی منداڵی بنێرییە قوتابخانەی لەوەی چانزی لێدەرناچێ... ئامادەیی — ئمم! ئەوە بۆچوونی حاجی ئەحمەد ریش بابایە. نا... ڕووداوەکانیش هەروا سادە و ساکار نین! ئیسماعیل خان دوو سێ جارانی لە زیندانی ئینفیرادی تاریکدا دیبوو؛ وەك ئەوەی زۆر شتی دیکەی پێوە زیاد کردبوون. دیسانەوە هەزار ڕەحمەت لە

بابی کە گوتبووی گەورەم چ گوناهێکی نییە. بۆ ئەوە راستەوخۆ لەژێر چاوەدێری حەزرەتی ئەجەل خۆیدا بێت، گواستویەتییەوە قەراوڵخانە تایبەتییەکەی خۆی. عالیە دەڵێ دەیبینێ- بەڵام لە دوورەوە. هەرباشە، سوپاس بۆ خوا، چاك نییە ماوە، شوکرانەی خوای دەوێ.

عالیە هەفتەی یەك دوو شەوێکان دێتەوە ماڵێ؛ روخساری گرژ دیارە، بەڵام هیچیش ناڵێ، هێندە نەبێ کە ئومێدەوارە: یانی هەر بەڵێنەکانی ئیسماعیل خان و چێشتکەرەکە دووپات دەکاتەوە...

ماڵەکە سارد و سڕە، وەك ئاشی ئاو لێبڕاوە، ئەکبەراغا ناچێتە چایخانە- هەر ناچێتە چ جێیان. پێشووتر شەوانە دەچووە لای ئاشنا و رۆشنا و برادەرەکانی و یەك دوو دەستی دۆمینە دەکرد، و هەر کە دەشهاتەوە ئیدی ئەوە باس هەر باسی ئەوەی بوو کە چۆن هەردوو سەرە سێیەکانی قفڵ کردووە و حەسەن قەسابی چۆن وەگیر هێناوە و چا و قلیانەکەی لێبردۆتەوە- و قاقا پێدەکەنی. ئێستا دەوروبەر هەمووی ساردە: ساردییە پەراوێزەکانی دەوروبەرێ، ساردییە دەرێی زۆر زیاتر کردووە: کێ ئامادەیە دەگەڵ یەکێکی تۆمەتبار بە جاسوسییە رووسان، کە تاهێشتاش کوڕەکەی هەروا لە قەراوڵخانەی تایبەتیدا بەندە، هەستێ و دانیشێ و دەگەڵی تێکەڵ بێت؟ باشە بۆچی دەگەڵ تێکەڵ بێ؟ تا چ لە سبەینێ زووتر نییە ئەمنیە بێت و بیگرێ؟ نا، ئەوە گێلییە، خۆکوژییە. باشە پێکەوە چ بڵێین؟ خۆ لەپێشداش چیان نەبووە بیڵێین؛ رەنگە بڵێی دراوسێیە، و مافی دراوسێتییەیە. باشە خەڵکی چوزانن کە خۆی و هەموو خێزانەکەیان جاسوسییە دەکەن و وڵاتی بە بێگانان دەفرۆشن! ئەڵبەتە زۆر نەبوو بیستبوویان کە بابیشی- بابی ئەکبەراغا- دوای شۆڕشی بەلشەویکی گێلان گیراوە و هەر دە زیندانیشدا مردووە... بەڵام ئەوەدەمی وەك ئێستا نەبوو بێن و بپرسن داخوا وڵاتی بە چەندی داوە و بەکێی فرۆشتووە. وایان زانیوە کە هەر ویستوویەتی کەرەوێتەیەکی بۆ بۆیاغچیەتیەی بکڕێ- لەو کەرەوێتە بڵندە پێچکە دارانە: لەپڕ زنجیرەی ژیانی ئاسوودە و رێکوپێکی لەبەریەك دەترازێ و دەپسێ. ئەو خۆشییەی جارانی- بەسەردەچێ، وەك ئەو رابوردووە خۆشانەی هەر نەدیتبن و تازە سەرەتای کاریێ بێ- هەرچەندە ئەو رابوردووەش هەروەك خۆی، هەر لەبەرچاوان بوو —بەڵام ببووە خەون و خەیاڵ و تازە زنجیرەکە پسابوو و خێزانەکەی کردبووە کەوی برابرایە- هەردەگەڵ محەممەد



عەلیدا، کە لە جێیەکی دوور و دەناو تۆڕی زیندانێدا بوو دەژیا. ژیانەکە وای لێهاتەوە کە تازە بەتازە سەرەتای دەست پێکردنەوێی بێتەوە...

دوای ماوەیەك هەواڵ هات کە هەردووکیان بردوونە ناوەندی پارێزگا... زۆری نەبرد سەر و سەکوتی ئیسماعیل خانی پەیدابۆوە: ئەمجارەیان بەکۆڵێك گلەیی و گازاندە و تانە و تەشەرانەوە و بە کۆڵێك منەت و ستایشی پیاو چاکانەی حەزرەتی ئەجەلەوە، ئەوکچە چاو لە دەرونمەك بەحەرامە بێ لەبەرچاوگرتنی ئەو هەموو شتانە، چووە بەقسەی سەرهەنگێکی کە بۆ هێندێك کاروباری ئازەربایجان دەچێ، هەڵخەڵەتاوە و رەدووی کەوتووە! زۆر بە لاقرتێیەکەوەو بەدەنگێکی زۆر تووڕەوە بەڵام زۆر شێواوەوە ((ئەمم! چووە تا جەناب سەرهەنگ- ئەویش ئەو جەناب سەرهەنگە- راسپاردە لەلای سەر لەشکری ئازەربایجانەوە بۆ حەزرەتی ئەجەل بێنێ- بۆکێش، بۆ ئەو کەسەی کە لە زەمانی ستارخانەوە سەر لەشکری ئازەربایجان بووە. کاتێ کە ئەو حەزرەتە بێ مەتارە ئاو مەشقی دەکرد... بەڵێ، چووە راسپاردە بۆ بەردانی برای بێنێ!)).

وشەی برای بەشێوەیەکی هێندە قێزەونانەوە بەسەر زماندا هێنا کە باجی گوڵبەهار لە تاوان ریسواییە عالیەی هەر لەبیرچۆوە و تێکڕابوو و روخساری ئەکبەراغاش وە لەرزە هات، دەتگوت پێستی مریشکێیە و پەڕت لێ هەڵکێشاون وا گرژ و سوورو شین هەڵگەڕابوو.

چاوەڕێبوو قۆڵیان هەڵکەن و بچن کچە چاو لە دەرەکەیان لە ئازەربایجانێڕا بێننەوە- مەزاختیشی گرنگ نییە- چونکە ئەوە کارێکی نابەجێ و ناشایستەیە کە مرۆڤ سکاڵای خۆی لە دەست حەزرەتی ئەجەلی خۆی، بۆ حەزرەتی ئەجەلێکی دی ببات؛ مرۆڤ لەوەی خۆی هەڵێ و بچێ بە یەکێکی دییەوە نووسێ! ئەوە راست نییە کە...!

❊ ❊ ❊

## (٥)

ئەکبەراغا هەرگیز بە خەونیش گیران و ئەمنیە و پۆلیسخانە و ئەو شتانەی بە خەیاڵدا نەهاتبوو. راستە جاری واهەبوو دەشاریدا دەبووە دەنگۆ کە فلانە کەسیان گرتووە یا فیسارە کەسیان دەزیندانێدا کوشتووە یا فلانە گەورە لە پەنجەرەی پۆلیسخانەیڕا خۆی هەڵداشتووە و هەلاتووە. بەلاّم ئەوانە شتێك بوون کە بە هیچ جۆرێك پەیوەندی بەو و بەوانی وەك ویەوە نەبوو. ئەو هەر تەنیا نان و ئاوێکی وەگیر کەوتبا بەسی بوو. بەوی چی فلانەکەس گیراوە یا نەگیراوە. با وایان نەکردبایە بگیرێن؛ گوی وشك بە قونێ کەسەوە نانوسێ- تا شتێکت لێ روونەدا خۆ ((دەوڵەت)) لە خۆڕا شێت نەبووە. پیاو دەبێ بۆ خۆی شێت نەبێ و دەوڵەتی شێت نەکا. یا کێ دەڵێ زۆر جاران هەر پڕ و پاگەندە نییە- خۆ خەڵکی خوا سەلامەتیان کا. دەنکە نیسکێکی دەکەنە کێوێك... ئەو (ئەکبەراغا) هەرگیز نەدەچووە ناو ئەو گۆنگەلانەوە؛ تا ئێستا کەسێك بە دووربینیش لەو جێیانەیدا نەدیوە... ئەکبەراغا گوناهی نەبوو. ئەو دەرد و پەتایە گشتی و ئیقلیم گیربوو. هەرکەسە و بۆخۆی دەیتوانی رووداوەکان تاقیکاتەوە- کە ئەوەش لە توانای هیچ تاکە کەسێکدانییە. ئەگەر بڕیارە هەر کەسە و بۆخۆی هەموو رووداوەکان تاقیکاتەوە، ئەوە مێژوو لە جێگای خۆی دەچەقێ و رادەوەستێ. بەلاّم تاقیکردنەوەی گرووپیش هەروەتر، وەك دەڵێن هەر درەختێك بۆخۆی دەبێ خۆشی بەهار و تەزووی پایز و رۆژانی باوبۆران و گەردەلوولان تاقیکاتەوە، و هەرکانییەك دەبێ بۆخۆی بەناو چینەکانی زەویدا تێپەڕێ و رێ و رێچکەیەکی تایبەتی ببڕێ تا ببێتە سەرچاوە. ئەوە بەخت و ناوچەوان و ئیقبالّی زۆردارانە کە چاکە و خراپە و جوانی و کرێتی پێکەوە دەستیان دە دەستی یەکتری ناوە. دەوناوەیدا تەنیا چەند کەسێکن کە دەوڵەتیان لە پشتەو دەبنە پیاوی رۆژێ، ئەوانەش ئەو کەسانەن کە هەر بۆ خۆیان هەلیان قۆستۆتەوە و بە ناو تاقیکردنەواندا تێپەڕیون. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە زۆر جاران دەوڵەت تووشی نوشوستی و چورتمان دەبێ، هەندێ کەس وەك کوارگی ناوەختە لە عەردی هەڵدەتۆقن و سەری جڵەوێ دەگرن و خەڵکی بەدوای خۆیاندا لارێ دەکەن و چۆنیان بوێ وادەڕۆن، و خۆ نەبوونی فەرهەنگی سیاسی و کۆمەلاّیەتی و نەبوونی



خوو و خدەو نەریت و ئەزموونەکانی ژیانیش سەد هێندەی دی کارەکان خراپتر دەکەن و کۆمەڵ بەقوڕێدا دەبەن.

روخسارە خڕوپڕ هەڵچووەکەی **محەممەد** عەلیشی تا هێشتا هەر لەبەرچاوان بوو، ئەوجارەی کە گرتیان پێش ئەوەی بگاتەوە ماڵێ ئەوان بە ماڵێ وەردەبن و دەیبەن، ئەو رۆژەش گوتیان شتێکی وانییە... هێندێك پرسیارانی لێدەکەن و دێتەوە. شێوەی هاتن و بردنەکەی ئەم جارەشیان دەگەڵ ئەوەی جاری هەوەڵێ چەند پێکدەچوون: ئەکبەراغا پێی وانەبوو شتێکی ئەوتۆیە، بۆیە هیچ خەتورەیەکی بەدڵیدا نەهات، تەنانەت داوای ئەوەشی نەکرد کە رێی بدەن بچێتەوە ماڵێ و ئاگاداریان کاتەوە. باشە بچێتەوە بلێ چی؟ بۆخۆی دێتەوە؛ کە بەریشبوو و هاتەوە لەجیاتی ئەوەی بچێتەوە چایخانەو لەوێ دەگەڵ برادەرەکانیدا بکەوێتەوە گەنجەفان یەکسەر دێتەوە ماڵێ...

کاتێ کە وەڕێکەوتن کابرایەکی ورگنەش شان بەشانی پاسەوانەکان کەوتە رێیە. بەلاّم ئەو وەکو ئاگای لە هیچ نەبێ؛ هەر تەنیا رێبوارێکە و کەوتۆتە ناوە وان و هەروا رەگەڵ کەوتووە. جارجارە دەگەڵە وی —ئەکبەراغا- جەفەنگیشی لێدەدان، و ئەویش —ورگنەکە- بێ ئاگایانە زەردەیەکی بۆ دەکرد... بەلاّم وێشدەچوو ((کارەکە)) هەروا ئاسان و چوکەڵە نەبێ — چونکە پاسەوانەکان بەشێوەیەکی دیکەیان دەنێوەخۆ گرتبوو: پاسەوانێك لەپشتەوە، کە هەر پێوەی نوسابوو و دەگەڵی دەڕۆیی. ئەوەی پێشەوەش بەردەوام ئاوڕی لێدەدایەوە.

کابرای ورگنە جگەرەیەکی راداشتێ. ئەکبەراغا گوتی: ((زۆر سوپاس... دەکاریان ناهێنم)). کابرای ورگنە گوتی: ((ئارەزووی خۆتە- فەرمایشێکی دیکە، تۆ دەکاریان ناهێنی بەندە دەکاریان دێنم، هە هە!)) ئەوەی بەگاڵتەیەکەوە گوت، بەلاّم زۆر تاڵ، وەك کۆلێکیان مەتەڵەك تێگرتبێ. ئەکبەراغا زەردەیەکی بۆ کرد. مەتەڵەکەکەی —ئەگەر مەتەڵەك بووبێ- بەسەرخۆی نەهێنا... پیاوێکی خۆش روو بوو: لەوانەشە هەر بە خەیاڵیشیدا نەهاتبێ مەتەڵەکان باوێ. زەردەخەنەی هەر بەلێوانەوە بوو، وەك ئەوەی بلێ ((هەی قوماربـاز!)) پیاوێکی ورگنەبوو، دەموچاوێکی پانکەڵە، زەردباو. چاو گەورە و مات، وەك چاوی ماسییە، سمێڵ بابڕ، لووت گەورە و مووی سەری ماش و برنج، کە بۆ دواوەی داهێنابوو. نێوچەوانی وەك نێوچەوانی بەرگدرووە پیرە بە ساڵداچووەکان، پڕ چرچ و لۆچ و خەت خەتاوی. دەنگی وەك لە بنی زگیڕا

بێت. دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا زۆر قۆشمەبوو- رەگی ملی شۆڕببوونەوە. بێ ئیختیار گوتی: ((نەخێر بەگیانی ئێوە! دەکاریان ناهێنم... ئەگەر وابام دەمگوت- خۆ عەیب نییە)).

پیاوە ورگنەکە گوتی: ((دەزانم. دەزانم!)) هەروا بەدەم خەنینەوە، و بەدەنگێکی مانادارەوە، کە پڕی بێ باوەڕی بوو؛ وەك ئەوەی بڵێ: ((بۆ خۆت کەری!)).

ئەکبەراغاش بێ ئیختیار زەردەیەکی کرد. تووشی چ ناسیاوێکان نەبوو، هەرچەندە یەك دوو کەسیش ئاوڕیان دایەوە و هەروا سەرپێیی سەرنجێکیان دانێ. هەرجارێك ئەگەر کەسێك ئاوڕی لیدابانەوە و سەرنجێکی دابانایە ئەوا کابرای ورگنە تۆزێکی خۆ دوورتر دەگرت و سەری بەردەدایەوە، یا وای خۆپێشاندەدا کە ئەو دەگەڵ ئەو کۆمەڵ و گرووپەدا نییە و خۆی لەگێلییە دەدا. گەیشتنە پۆلیسخانەی- رێیەکە زۆر لە بەراییە مەیدانێوە نەبوو. پاسەوانی بەردەرکێ ئیکلامی کێشاو دەرگای کردەوە. لەپڕ رەنگ و رواژا و روخساری کابرای ورگنە گۆڕا، و سەرۆکانە دەرکەوت. بە دالانەکێدا رۆیشتن. گڵۆپی دالانەکێ داییسا. هەرکە گەیشتنێ پیاوە ورگنە لە دوو پاسەوانەکانی راخوڕی و گوتی: ((هەرلێرە دەبێ، دەگەڵ کەس نادوێ- تێگەیشتن؟)).

پاسەوانەکان جووتە پێیان لێکدان و گوتیان: ((بەسەرچاو، جەناب رەییس)) و ئەکبەراغا تۆزێکی خۆ توند و تۆڵ کردەوە. ویستی شتێك بڵێ، بەلاّم نەیتوانی. چ بڵێ؟ هیچ کاتێ بیری گرتنێی بەمێشیکیدا نەهاتبوو تا هەر نەبێ بەلای کەمەوە کاتێ کە دەگیرێ چ بڵێ یا چ بکات یا بیر لەوە بکاتەوە داخوا خەیاڵ و راستەقینە تا چەند دەگەڵ یەکدا تێکدەکەنەوە، دەبێ وەك ئەو بیری لێکردۆتەوە هێندە ترسناك بێ! هێشتاش نەیدەزانی کە بەراستی گیراوە- ئێ باشە لەبەرچی؟ بۆ؟ خۆ هیچی نەکردووە... ها؟ محەممەد عەلی؟... تۆ بڵێی بێ رێزی بەرامبەر حەزرەتی ئەجەل نواندبێ؟... نا، ئەگەر وابایە هەر ئەودەمی لە پاڵدانی ئوتومبێلەکەوە نەدەهاتەوە ماڵێ. بیری بۆ هیچ نەدەچوو، وەك خەونێ ببینێ، کە ئە ئاوا روو بە پیاوی لە دیواری کەن و دوو کەس ئەم لاولای بگرن... نەوەك بقەومێ؟ دەگەڵ ئەوانەشدا دەمولێوی وشك ببوون، وردە وردە هەستیدەکرد ناتوانێ چیدی روو بە دیوارییەوە راوەستێ و خۆڕاگرێ. بە تیلە چاوێکی سەیرێکی دالانەکەی کرد. کەسی لێنەبوو؛ پاسەوانەکەی بەر دەرکێ لایەکی دەرکەکەی پێوە دابوو و زۆر بە خاو و خلیچکی و ماندووەتییەوە راوەستابوو؛ ئانیشکی



لەسەرجێی فانۆسەکە دادابوو و تفەنگەکەشی بە دەستەکەی دییەوە گرتبوو. لە ژووری تەنیشتێوە دەنگە دەنگێك دەهاتە گوێ- دەنگێکی ماندوو. رەنگی دەرگاکە شینێکی کاڵ بوو؛ سەرتاپای پەڵە پەڵە و گەڕببوو. لە دالانەکەی سەرێڕا تەپەی پێ دەهات. کۆتایی دالانەکە پلیکانەی بە کەرپووچان بوو، کەرپووچی سواو و رووشاو و قۆڵتاوی، و چرایەك بە تەلێکی باریکەڵەوە هەڵواسرابوو.

پیاوە ورگنەکە بانگی کرد: ((بیهێنە ژووری!)).

چوو، ژوورێك و مێزێکی تەختەی سپی سادە بوو، پەڵە پەلاّوی و پیس، بە تەنیشت پەنجەرەیەکی روو بە خۆر هەلاّتێوە....

((چت دە گیرفانێدایە دەریان بێنە!)).

بێ ئیختیار دەستە کلیلێك و چوار پێنج قران خوردەی دەرێنان و دەبنی بەرکێی نانەوە. پاسەوانەکە هات و گیرفانی کراس و شەرواڵەکەی پشکنین. دوو قۆپچە و دەستەسڕێکی پیسیشی دە بەرکێدا بوون. پاسەوانە هەمووی هەڵڕشتنە سەرمێزێ. پیاوە ورگنەکە گوتی: ((مامە تۆ کەڕی یا خۆت کەڕ دەکەی؟)) ئەکبەراغا تێنەگەیی. ((کاتێ پێت دەڵێن چت پێیە دەریبێنە مانای ئەوەیە وەك پیاوان دەریبێنە!)) پێلاّو و گۆرەوییەکانیشی هەموو گەڕان. تازە بۆی دەرکەوتبوو کە نابێ بپرسێ بۆ وا دەکەن، یا چی کردووە، یا نارەزاییە پێشان بدا... رەنگە ناوی نارەزاییەی هەر نەشبیستبێ. زەردەخەنەیەکی تاڵی هاتێ. پیاوە ورگنەکە چاوێلکەکەی وەك زانایانی هەڵگرت و دەچاوی کرد. قەڵەمەکەی تاودایە، نووکی قەڵەمەکەی دە شووشەی مەرەکەبێ هەڵکێشا، و بێ چەند و چوون پرسی:

((ناوت؟)).

ئەکبەراغا سەیرێکی کرد؛ پێی وابوو کابرا دەگەڵە خۆی دەڵێ.

((دەگەڵە تۆمە، مامە! ناوت؟)).

ئەکبەراغا بەچاوێکی سوورهەڵگەڕاوەوە، بە ئاستەمێکی خۆ بەرەو پێشێ نوشتاندەوە و دەو دەمەیدا کە بەهەرچوار قامکی دەستە راستێی ئاماژەی بۆ سەرسینگی خۆی دەکرد گوتی: ((ناوی من؟)).

پیاوە ورگنەکە گوتی: ((مامە، تۆ بۆ خۆت گێل دەکەی؟ باشە لە تۆ زیاتر کەسی دی لە ژوورێیە؟)).

ئەکبەراغا هەروا ئاوڕێکی دواوەی دایەوە — پاسەوانەکە رۆیبوو.

((گوتم ناوت؟)).

((ئەکبەری نۆکەرتان)).

پیاوە ورگنەکە نووسی: ((ئەکبەر))و زۆر بەکاوە خۆشەوە دەگەڵ نوسینەکەدا سەری بەلایەکیدا لار کردەوە و وەك منداڵێکی ئیملای بکا دووبارەی کردەوە ((ئە — ك- بەر!)).

((ناوی باوکت؟)).

((کەربەلایی مەحموود)).

پیاوە ورگنەکە قەڵەمەکەی دە شووشەی مەرەکەبەکە هەڵکێشایەوە و نووسی: ((مەح — موو- د)و دووبارەی کردەوە و ئەو مووەی بەنوکی قەڵەمەکەوە نووسابوو لێی کردەوە.

((ناوی خێزانیتان؟)).

((رەزایی)).

پیاوە ورگنەکە نووسی ((رە- زا- یی)) و دوایەش ((ژمارەی ناسنامەتان؟)).

((وەڵلاهی...)).

پیاوە ورگنەکە نووسی، و دووبارەشی کردەوە: ((نا- زا- نیێ!)).

((شوێنی لە دایکبوون؟)).

((ساوە)).



((سا- و- ە)).

((مێژووی لە دایکبوون؟)).

((وەڵلاهی...)).

((نا- زا- نیێ)).

((شوێنی دانیشتن؟)).

ئەکبەراغا ئەویشی گوت و جەناب رەییس هەروەکو نووسینەکانی خۆی بەهەمان شێوەی نووسی.

((ژنت هەیە یا رەبەنی؟)).

((...!)).

پیاوە ورگنەکە ئەبڵەق ما: ((ئەو گاڵتە بازییەت لەچییە... ژن و منداڵت هەس یان نا... هەس بێژە هەس...

((هەیسمان)).

((هەی- سیا- ن)) و ئینجا: ((باشە — ناوی منداڵەکان؟)).

((محەممەد عەلی نۆکەرتان...)).

((بەسە)) و نووسی ((محە- ممە- د- عە- لی)) و دیسانەوە.

((کارتان؟)).

((پینەدۆز)).

((پیـ- نە- دۆ- ز)).

((سەوادتان هەس)).

((کوێرە سەوادێك)).

((سه- ره- تا- یی)).

((زمانی بێگانان دەزانی؟)).

ئەکبەراغا بێ ئیختیار، و بێ باوەڕانە، پێکەنی. بەلاّم گرژ و مۆنی جەناب رەییس پێکەنینەکەی رەواندەوە. پیاوە ورگنەکە بە مرچ و مۆنییەوە گوتی: ((لەگەڵ تۆمە مامە! ئا یان نا؟)).

((وەڵلا بڵێم چی!)).

((هەرچی هەیە بیڵێ. دەزانی بڵێ دەزانم. نازانی بڵێ نازانم)).

ئەکبەراغا گوتی: ((نازانم)).

((ئەوەش هەیە. ئەگەر بزانی و بڵێی نازانم ئەوە خوێنی خۆت لەسەری خۆت؛ و ئۆ باڵی خۆت بە ملی خۆت...)).

((وەڵلا جەناب رەییس... باشە لە کوێ بزانم؟... تازە بە کەڵکی چی من دێت؟)).

((ئێستا دەزانی یان نازانی؟)).

((عەرزم کرد نازانم)).

پیاوە ورگنەکە قەڵەمەکەی دە مەرەکەبێ نایەوە و نووسی: ((نازانێ)) و دووبارەی کردەوە ((نا- زا- نێ)). و هەندێ پرسیاری دیکەی وەك دەگەڵەکێی ((پەیوەندی)) هەیە، و هاموشۆی دەگەڵ کێیە، و لەو جۆرە پرسیارانەی کرد. دوایە بانگیکرد ((حوسێن زادە!)). پاسەوانەکەی هەوەڵێ هات، و جووتە پێی توند لە عەردی دان. جەناب رەییس بێ ئەوەی سەیری کات. نووسینەکەی دایە دەستی و گوتی ((ژمارە -٣ سێ- بەبێ چاوپێکەوتن)) و حوسێن زادە گوتی: ((پێشم کەوە، مامە!)).

مامە کەوتەرێیە. لە ژوورەکە هاتنە دەرێ. هەر لەجێی یەکەم جارێیان راگرتەوە- هەمدیس روو لە دیواری. پاسەوانەکەی دی رۆیی. و دوای چەند دەقیقێکان دەگەڵ سەرپاسەوانێکی هاتەوە کە تابلۆیەکی نیوە کەوانەی بە زنجیرێکەوە دەملیدا بوو. پێیان دەگوت سەرپاسەوان



قاسمی. هەرسێکیان پێکەوە کەوتنە هەلینگدانێ. و بەلای پلیکانەکاندا چوونە حەسارێ پشتەوە. ئێرە ساختمانێکی یەك نهۆمەی چوکەڵەی سێ دەرگا بوو: یانی سێ ژوور. سەر پاسەوان قاسمی ماوەیەك بە قفلاّنەوە خەریك بوو تا یەکێکی لەو دەرگایانەی ژمارە (٣) سێی بەسەرەوە بوو کردەوە. دەرگاکەی والاکرد، گلۆپەکەی هەڵکرد و بە ئەکبەراغای گوت: ((بچۆ تێ! هەرکاتێکیش ئیشی سەراوێت بوو لە دەرکێ دە)). دوایە بەبێ دەنگ و بەنگ دەرگاکەی داخستەوە و کلۆمیدا، و رۆیی... پاسەوانێکی لەبەر دەرکێ بەجێهێشتبوو.

ژوورێکی گڵ و خۆلاّوی دەگەڵ مافورێکی پیس و پۆخل و دوو پەتوی سەربازی. ئەکبەراغا هەروەك فێربوو پێلاّوەکانی داکەندن، و لەسەرچۆکان لەسەر مافوورەکەی دانیشت. تازەی وەبیر هاتبۆوە کە دەبوایە بی پرسیبایە و بیکردبایەتە گێرمە و کێشە و هەراو هۆریا. ئاخر... ئەو رەفتارە دەگەڵ ئاژەلاّنیشدا واناکرێ. بەلاّم وەك ئەوەی مێشکی کارێ نەکا، وەك ئەوەی هێزێك هاتبێ و دەسەلاّت و ئیختیاری لێ زەوت کردبێ. هەستی بە خەتەرو بە ترس نەدەکرد. شتێکی سروشتییە کە مرۆڤ لەپێشدا خەتەر و رێ و شوێنی خەتەر بزانێ و دوایی بەرگرییە بکا. کاتێ کە خەتەر دیار نییە و شوێنەواریشی ونە، مێشك تێدەمێنێ؛ ترس کاتێکی وەخۆ دەکەوێ... کە شوێنەوارێکی دیار بێ جا ئەودەمی چارەی ئاسانە. بەلاّم کاتێك کە ئەوانە نادیارن شتێکی زۆر سروشتییە کە مێشك بە هەموو لایەکیدا پەرت و پەرێشان و ئالۆز دەبێ و وەك مێشەکەرانەی نێو ژوورێکی هەر خۆ بێرە و بەوێدا دەدا... لە بێ ئیشیان ماندووببوو. هەر بۆ رەزایەتییە دڵی خۆی لە دەرکێیدا. پاسەوانەکە پەلکەی سەرکونی دەرگاکەی لادا و گوتی: ((چییە؟)).

((سەرئاو...)).

ئەوەی باش بوو، پاسەوانەکەی دەناسی. هەرنەبێ دە جارێکان — بەڵکە زیاتریش- پۆتین و چەکمە و زەنگاڵی قایشی بۆ بۆیاغ کردووە. پاسەوانەکە بێ گوێدانە وی پەلکەی سەرکونی دەرگاکەی پێوەدایەوە و فیتوێکی لێدا- دوای چەند دەقیقێکان سەرپاسەوان قاسمی هات. دیسانەوە ماوەیەك دەگەڵ قفڵەکان خەریك بۆوە. و سەرەنجام دەرگاکەی کردەوە، گوتی: ((چییە مامە، دەڵێی چێشتی هەڵوچکەت خواردووە؟)) لەو قسەیڕا وەبیری هاتەوە کە (پیاو نابێ

بەچێشتیٚ هەڵوچکەی باوەڕکات و خۆ شل کات) ئەکبەراغا زەردەیەکی هاتیٚ لە دەنگی سەر پاسەوانەکەشڕا دیاربوو، کە هیچ مەبەستێکی لەو قسەیەدا نییە.

ئاودەستەکە لەلایەکی حەسارێوە بوو: مەسینەیەکی بیٚ ئاو وشکا و. مەسینەکەی لە جۆگەلەکەی تەنیشت ئاودەستێوە پڕکرد... کەمێکی دە پاسەوانە کێوە ڕووانی، بەو نیازەی ئاوڕێکی ناسیاوەتییەی لیٚ بەدی بکا، بەلاٚم نەبوو. هەرچەندە بۆ خۆشی زۆری هەوڵدا کەچی کابرا هەر بەسەرخۆی نەهێنا: وای سەیر دەکرد کە گوایە هەر نایناسیٚ. شەوێش دوو جاری لە دەرکەیدا و دوو جاران چووە سەراویٚ و هەردوو جارانی گویٚ لێبوو کە ((خواردنی چێشتی هەڵوچکەی، جێی متمانەی نییە!)).

قامکی هەردوو دەستەکانی دەپشتە سەرییەوە وەرێنابوون و پاڵی وە دیوارییەوە دابوو و چاوەکانی بڕیبوونە قولاٚیی بیر و خەیاڵە پەرتەکانی ئەوپەڕی ژوورە تاریکەکەیەوە. هەرواشە، کاتیٚ کە مرۆڤ بەلاٚیەکی بەسەردیٚ بیەویٚ و نەیەویٚ دەبیر و خەیالاٚن رادەچیٚ؛ دەیەویٚ سەرە پەتێکی ئەو بەلاٚیەی وە دەستکەویٚ: چ بووە، و چ روویداوە، بۆ روویدا؟ بەسەر هاتەکانی پێش ئەو بەلاٚیە تاوتوویٚ دەکات و تا لەرێی ئەوانەوە سەرەپەتێکی ون هەڵکاتەوە؛ بەلاٚم بەلای وییەوە هەموو ئەو شتانەی کە سروشت و ژیان بە مرۆڤیان بەخشیبوو تا دەو جۆرەکاتانە، دە هانای بێن بەلای وییەوە (ئەکبەراغا) شتێکی وانەبوون، و هەرچەندیشی دەکرد هیچی وای وەدەست نەدەکەوت. ((هەستە با جێیەکەت بۆ راخەم)) ئەوە دەنگی باجی گوڵبەهاریٚ خێزانی بوو کە ئەوی لەو چاڵەوە هێنایەوە نێو ژووری ماڵێوە و وە ئاگای هێنایەوە. هەناسێکی هەڵکێشا (ئاه ﻫ) لە لێواری چاڵی بیرەوەرییەکانی دوورکەوتەوە- مردە خەندەیەکی بەسەر لێوانەوە مەیی بوو؛ دەنگی چێشتی هەڵوچکەی نەخواردووی دەگوێیدا هەروا وەك خۆی بوو. هەستا. و ساڵدانە ساڵدانە چووە حەساریٚ.

* * *



(٦)

((ئاگات لیٚ نییە ((کەلایی)) چ خانمە هەمەدانییەکی هێناوە، پیاو هەر حەزدەکا دانیشیٚ و تێیڕامێنیٚ — لە تەماشا کردنێی تێر نابیٚ!)) ئەوە قسەی عەبە ورچەیە کە دەگەڵ کوڕی پورە حەنیف و برای پوورەکەویٚ پێك هەڵوەستابوون و باسیان دەکرد و پێدەکەنین. ئەوە منیش لە قەراغ رووباریٚ، لەسەرگیا و گۆڵیٚ دانیشتووم و کرمە سوورەی بە قولاپە چوکەڵەکەمەوە دەکەم و خەریکی ماسی گرتنێم. ((ئەوە تەختی دەموچاویەتی، هەر دەڵێی مانگە... ناویشی قەمەرە گچکەیە هەر کە چاوت وێیدەکەویٚ ئاوت بە لالغاواندا دێتە خواریٚ!)) و دووبارە پڕ بەدەمی هاوار دەکاتەوە ((... دوکانیٚ هەمووانی تەخت کردووە... ئای کە بەدمەزەبە مشتەریی زۆرە! دوێنێم سیٚ کاتژمێری تەواو سەرەگرت. ئەوەی چووە پاڵی هاتنە دەرەوەی نییە... خۆ خوانە خواستە پارەشی پیٚ بیٚ ئیدی واوەیلا- ئەوە هەردەبیٚ چاوەڕوان بی و تفیٚ قووتدەیەوە)) عەبە ورچە کوڕێکی بەخۆوە بوو، بەقەد پیاوێك — پیاوێکی کەتە. دەیانگۆ دایکی بە منداڵی بە بەزی ورچێی هێلکە و رۆن بۆ کردووە بۆیە وا پانوپۆڕ بووە! هەربۆیەش بوو پێیان دەگوت عەبە ورچە.

دێوێك بوو بۆ خۆی. کە دەگەڵ —حەمەبلە-ی بابی بەڕێیەدا دەڕۆیشت سیٚ چوار قولانج لەوی بڵندتر و سیٚ چوار بست لەوی پانکەڵەتر بوو. بابی لەچاو ویدا دەتگوت جوجەڵەیە. کە پێکەوە دەبوون کوڕ و بابت لیٚ تێکدەچوون. پۆلی چوارەم بوو. هەموو کەس دەیزانی کە هاموشۆی خانمەکانی لای کەلایی دەکات. دەیانگوت سوزەنەکیشیەتی؛ بۆ خۆشی شانازی بەوەوە دەکرد کە سوزەنەکی گرتووە و هەربۆیەش گەلاٚوگەڵ دەڕۆیی تا خەڵکی بزانن سوزەنەکیەتی.

ئەو ژنەی کە دەیگوت کەلایی تازەی هێناوە —بیست رۆژ مانگێك پێش ئێستا؛ بە سواری فوردێك هاتووە. هاتنی ((فۆرد))ێکی بۆ شارۆچکەکەی مە رووداوێك نەبوو هەروا زوو لە

بیرکریێ: کێو و گەردەنەی خان، هەر راست دەتگوت دیوارە و لووتی بە ئاسمانێوە ناوە و هەڵچووە، خۆ جادە و ریێ و بانێکیش نەبوو، ئەوەی هەشبوو هەر ئەو رێیە بوو کە رووسەکان لە شەڕی جیهانیدا رایانکێشابوو. سەرەڕای ئەوەش ئوتومبێلەکە یاتاغی —کە ئێمە نەماندەزانی چییە- سووتابوو. هەرچەندە ئێمە چ ئاسەوارێکی سوتانێمان پێوە نەدەدیت. کەچی شوفێرەکەی کەلایی وەك دایك مردان هۆڕە هۆڕ دەگریا، تا چوون قالە دەم خواریان هێنا. هەر لەسەر قسەی ویش حەمە گیزەش هات. دە تەواوی ئەو کات و ساتانەشدا ئێمەی منداڵ —تەنانەت گەورەکانیش- بستێك لە فۆردەی وە دوورنەدەکەوتینەوە و بەجێمان نەدەهێشت. قالە دەم خوار دەیگوت گوایە چەند وەختان لە فرۆکەخانەی بەغدایە ((فیتەر)) بووە، حەمەگیزە تەنەکەچی گەڕەکێ بوو. ئیدی هەرچۆنێك بوو دوای دوو سێ رۆژان دەناو ئەوپەڕی خۆشی و شادی ئێمەی منداڵاندا ئوتومبێلەیان وەگەڕخستەوە. ئاخر ئێمەشی لێ سوودمەندبووین: رامانسدەکرد و لە دواوە خۆمان پێ هەڵدەواسی و سوار دەبووین- قالە دەم خوار بەخۆی و شەویلاکی خوار و چەوریەوە تابلێی شتێکی عاجباتی بوو! بە لە خۆ رازیبوون و پۆزلێدانێکەوە لە تەنیشت شوفێریەوە پاڵی بە کوشنەکەدا — هەروەك بۆخۆی ئوتومبێلەکەی دروستکردبێ! ئەدی حەمە گیزە بەخۆو ئەو دەرلینگ و شەرواڵە کون کونە و ئەو لاقە شەلەیەوە چۆن سواربوو، هەر مەپرسە...

ئەو شەوە کاتێ قسەکانی عەبە ورچەم گێڕانەوە و گوتم یەك لەو خانمانەی کە کەربەلایی تازەی هێناون هەمەدانییە، دایی لچ و لێوی پێکدادان. هەرکاتێ بیری ئەولای کردبایەوە لچ و لێوی تێك دەنان. ئەو شەوەش هەروەك خووی جارانی شەکری شکاندەوە: ((باشە چ دەبێ ئەگەر نامەیەکی بۆ مەشەدی کەریمی بنووسی؟ هەردوو وشە... ئەوە خوایە، بەڵکە ئێ هەواڵ و باسێکی لابێ... بەڵکە ئەوە خوایە بۆ خاتری ئەبا عەبدوڵلا و بەرەکەتی وی بەرهەڵدا بووبێ... لەوان یەکیش...)).

بەلام چاو سوورکردنەوەی بابەگیانی زمانی لە کلیلەوە برد. بەلام خۆ داییش لەوی کەمتر نەبوو؛ بیهێنابایە ناخۆشییە کەسی دەروەست نەدەهات. گوتی: ((هەروا یەك دوو وشە خراپی چییە، نەعەیبە و نەشوورەیی... تەنیا هەردوو وشە! هەرنەبێ خزم و کەسە، پینەی شانییە.



ئەتۆ بینووسە، بەڵکە خوا و راستان وەلامێکی بێتەوە... ئاخر دیقم کرد، جەرگم بوو بە خوێن- تاکەی؟)).

بابەگیان لە دین دەرچوو. گوتی: ((ژنەکە، من ئەوە چەند جاران بە تۆ بڵێم —چەند جار!؟ چەند جاران بڵێم من بۆیەم خۆ ون و گۆڕ بەگۆڕ کردووە تا بۆ مەشەدی کەریمی نەنووسم- بنووسم چی؟ بنووسم کچەکەم... لا ئیلاهە ئیللەڵلا... شەیتان بە لەعنەت بێ! بەسە ژنەکە، وازبێنە با هێندەی دی کافر نەبم! ئەگەر ئەولیاو پیاوچاك پیت و فەڕێکیان هەبایە هەر ئەودەمی کارێکیان دەکرد. تازە پیت و فەڕیان بە چ کەڵکی من دێ- ئەو پیت و فەڕە با هەر پیرۆزی خۆیان بێ... بەسە با چیدی کفران نەکەم... با هێندەی دی لە دین دەرنەچم! ئەستەغفیروڵلا، خودایە تۆبە!)).

ئەوە چەندەمین جاربوو. دایی وەك خووی هەموو جارێکی روو گرژ بکات و دەستبکاتەوە بە فینگەفینگی گریان و روو وەرگێڕانێ لە بابەگیانی، و ئێمەش دەو نێوەیدا وەك دوو بێچووە کۆتری سلێ و کێوی دەستمان کردەوە بە دزە روانینێ- لە بابەگیانەوە بۆ دایی و لە داییەوەڕا بۆ باوەگیان- لە نیشانێکی نیشتنەوەی ئەو گەردەلوول و تۆف و زریانەی دەگەڕاین؛ و جارجارەش بە ئانیشکان وەردەگەڕاینە یەك —زیاتر من- و ئەوجا ورتە ورت و فسکە فسك و دوایەش نووستن...

((خانمەکان))یش وەك سەرۆك فەرمانگە و ئەفسەرەکان، پێلاوەکانیان دەهێنانە لای بابەگیان. بابەگیان دەستوبرد کارەکانی دەکردن و ساف و لووس پارەکەی وەردەگرت و جاری واشبوو دوو سێ قسەشی دەگەڵدا دەکردن؛ هەرگیز سەریشی نەوی نەدەکرد. وەك حاجی سەعدوڵلا و ئەوانیدی نەبوو. حاجی سەعدوڵلا قەتی تەماشای خانمەکان نەدەکرد. هەرکاتێ پەیدابان ئەو ((وان یکاد))ەی دە چوارچێوەی گرتبوو بەپێش چاوی خۆیەوە دەگرت. جاری وابوو خانمەکان سەریان دەکردە سەرێ: دەچوون و ((وان یکاد))ەکەیان لە پێش لادەبرد، و قاقا پێدەکەنین.

رۆژێکیان حاجی عەولای دەبباغ هەر راست دوای رۆینێ خانمەکان گەیشتە بەردوکانێ. هەر دەودەمەیدا بابەگیان دەستی دەگیرفانێ راکرد و قڕانێکی دەرێنا و دایە من و گوتی بچم نان و ماستی بکڕم و بیبەمەوە ماڵێ. حاجی عەولا کە ریشە تۆپنەکەی دەخەنە دەگرت و یەکپارچە دەستەکانی سووربوون- گوتی: ((مەشەدی...)) هەر لەو رۆژەوە کە هاتبووین بابەگیانیان هەر

بە مەشەدی بانگ دەکرد. لێرە شیعەکانیان هەر بە مەشەدی و کەربەلایی بانگ دەهێشتن- جا هەر وشەیەکی دیکەیان بەزاری خۆشبایە، یا ئی وا هەبوو بۆ خۆی دەیگوت چۆنی بانگ کەن؛ خۆشبەختانە هەر لە رۆژی هەوەڵێوە بابەگیانیان بە مەشەدی بانگ کرد. ((... ئەریّ مەشەدی، ئەتۆ پارەی حەلاڵ نەکردە خەرج دەکەی؟ دیارە ئەو پارەی دەشیدەی بەمە هەرلەوەیە!؟)).

بابەگیان دەستی لە درێوشەکارییە راگرت و بەواقێکی ورەوە تەماشایەکی کردیّ. هەر بەو واقە ورەوە گوتی: ((حەلاڵ!؟ حاجیاغا، لە شیری بەر مەمکی داکێش حەلاڵترە. ئەدی ئەوە بەچاوی خۆتانی نابینن هەر لە سبەینیّ زووەوە تا شەویّ درێوشەکارییە دەکەم و مشتەی لێدەدەم؟)).

حاجی عەولاّ گوتی: بەڵیّ... وایە راست دەفەرمووی، بەلاّم هەردەبایە حەلاڵیشیکەیەوە)) و کە سەرسامییە بابەگیانیشی ئاوادیت درێژەی دایە ((شتێکی وانییە، هەرتمەنەی قڕانێکی لێدەدەی و بەو جوولەکانەی دەگۆڕیەوە)).

بابەگیان گوتی: ((کاکە حاجی، بۆ من چەندم وەگیر دەکەویّ تا هەرتمەنەی قڕانێکی لیّ داشکێنم- تا بەگفت و فەرمایشتی ئێوە حەلاڵ بێت؟ باشە، کیّ دەڵیّ ئەوجووە هەرهەمان ئەو پارەیەی بۆ دراوسێیەکەمی حەلاڵ کردووە لەویم ناداتیّ... خۆکەس دەستی بەکلکێوە نەگرتوون.

حاجی عەولاّ گوتی: ((من بارە شەرعییەکەی دەڵێم. ئەگەر جووەش کارێکی وابکا، خۆ ئۆباڵەکەی بەملی تۆ نابیّ- تۆ ئەرکی شەرعی خۆتت بەجیّ هێناوە و ئۆباڵەکەی بەملی وییە)).

بابەگیان سەرێکی بادا- بە قسەی خۆی هەر راست وەك زەینەل عابیدینی. بەلاّم لەوە بەدواوە هەرکاتیّ ئەگەر سەر و سەودا و حیسابێکی دەگەڵ حاجی عەولاّی هەبایە کە پارە و پولێکی بداتیّ لە ((گیرفانەکەی دیکەی)) دەردێنا، و دەیدایە و بەوە ئۆباڵەکەی دەشوشتەوە!...

((بانە)) شوێنێك بوو هەر راست دەتگوت لەجێیەکی زۆر دوورە دەستی مێژووەوە بەجێماوە و مێژوو رۆیوە و جا بەهەر هۆیەکەوە بووە ئەو ماوەتەوە، یا ئاگای لە رۆینیّ کاروانی مێژوویّ نەبووە، یا ئەگەر ئاگاشی لێبووبیّ پێی رانەگەیوە و دەگەڵی دەرنەچووە و هەروا وردە وردە



لەنگەری رۆینیّ خۆی تێکنەداوە. یا هەر نەرۆیشتووە. هەروەك خۆی لەسەر کەلتوور و داب و دەستور و خدە و نەرێتی باب و باپیران مابۆوە. دوایین نەتەوەکانی ئاریایی نەژاد کاتیّ- وەك دەڵێن- لە باشووری روسیاوە هاتن هەریەکە بەگوێرەی خولق و خوو و حەز و ئارەزووەکانی خۆی، لێرە و لەویّ بارگە و بنەیان خست: هەندێکیان کانیاوی داوێن چیاکانیان کەوتە بەر دڵی و لەویّ مانەوە، هەندێکیان تا ئەو سەری دنیایە رۆیشتن، تا رۆژئاوایە، خاکە بەپیت و فەڕو زەنوێر و سەوز و هەوا سازگارەکان، و هەندێکیشیان وەك رەسەنی باب و باپیرانی مە لە نزیك خوێیەلێنەکان نەبزووتن...

ژیان راوەستا بوو، بیّ هەست و چرپە و بیّ جموجۆڵ بوو- بەلاّم نەمردبوو. دەگەڵ ئەو هەموو گوشار و کوڵ و بارەگرانانەی سەرشانیشی هەر رایدەکێشا و غەمی نەبوو. ئەڵبەتە کەسانێکیش هەبوون غەمبار و غەمخۆر- کەمیش نەبوون- بەلاّم هەموو لە هەمووش نا. کوڕەلا و هەبوون، و بە هەبوونیّ وانیش زەردەخەنە و قاقای پێکەنینیّ هەرگیز نەدەبڕا...

لەلای سەرەوەی خۆرهەلاّتی شاری، کۆنە قەلاّتێکی میری، لەسەر تەپۆلکێکی، شاری کردبووە دووبەش و لێکی جوداکردبۆوە، میری بەبیّ لێك ترازانی خەڵکی ناتوانیّ میرایەتی و دەوڵەتمەداریی بکات. قەلاّتەکە ئێستا ببووە سەربازخانە. پەنجا هەنگاو لەچۆمیەوە ئەوە سنووری لای سەرەوەی شاربوو، هەروەکو دوو فەرمانڕەوا —دوو رابەر- پێکەوە، لە نێوان کۆمەڵێك گوناهباری پەشیمان و تاوانبارکراو بە مەرگ کەوتبوونە ریّ. یەکێکیان راست روو بە باشوور، ئەویدی بەلای باشووری خۆرهەلاّتدا، لەسەر لێوی تەپۆلکەکەی- تاوانبارەکان کشابوونەوە دوایە و رێیان چۆڵ کردبوو. فەرمانڕەوای دووەمیّ مالیّ مەی بەلای بەشی خۆرئاوای تەپۆلکەکەوە نوساندبوو و بەشی سەرەوە بوو، کوچە و کۆلاّنەی لێژ و پڕ چاڵ و چۆڵی پڕ لە پاشەرۆکی مالاّتی کە هەموو رۆژێی هەر لیّ زیاد دەبوو و بەردەوامیش دووکەڵی سوتانێی لیّ هەڵدەستا، دەستی پێدەکرد و بە مالیّ مەلا حوسێنی دوایی دەهات کە کۆتایی بەشی باشووری خۆرهەلاّتی تەپۆلکەکە بوو.

سەرگوفکەکە دەسپێکی رێی چوونە مالیّ کەلایی رەجەبی بوو، کە لە بەشی سەرەوەی رۆژهەلاّتی قەلاّتێوە بوو. بەتاقی تەنیّ، چەند بنەدارێك و باریکە جۆیەکی ئاویّ. پاشماوەی گەڕەکی سەعادەت ئاوایە بوو. مالیّ مە لە داوێنی خۆرئاوای تەپۆلکەکەوە لە پەنایەکی

سەرگوفكێوە بوو. شەپۆل و زەمانێك نەبوو كە خەڵكی بتوانن دەگەڵی دەرچن یا وەدواكەون- هەر دەتگوت زەمانە لەپێش مێژووەوە لەجێی خۆی چەقیوە و راوەستاوە. تەنیا شەپۆلی گۆڕانێ نەبێ، كە زەمانێك بوو هەركەسێك لەولاڕا دەهاتەوە جلوبەرگێكی سەیر و سەمەرە و پێڵاوێكی عەنتیكەی دەگەڵە خۆی دێنایەوە. ئەوە نیشانەی ئەوەبوو كە لە شوێنێكی دیكەی سەر ئەم گۆی زەوییە ((مۆدە))یەك داكەوتووە، كە هێشتا نەگەیوەتە ئێرە- و هەركاتێ كە شتێكی وا دەبوو ئەودەمی هەستیاندەكرد و بەوەیان دەزانی كە بێجگە لە خۆشیان مرۆڤی دیكەش هەن. بەلاّم كە ئەو شتانەیان بۆ روون دەبۆوە دەیانزانی، ئەودەمی غەم دایدەگرتن و هەراسان دەبوون- وەك ئەوەی تەنیاییان لا باشتر و پەسەندتر بێ. جارێكیان كوڕی پەخشداری دوو چەرخەیەكی هێنا كە خەڵكی پێیان دەگوت ئەسپە ئاسنینە، هەموو سست بوون، لەوەی كە ئاوا بەو شێوەیە لەسەر دوو پێچكان دەڕوا و ناشكەوێ، و لەوەش سەرسام بوون كە خەڵكی لە شوێنانی دی چەند بێكار و بێ ئیشن- ئیدی ئەوشتانە لەسەرسامی و سەرسوڕهێنان و تێرامان بەولاوە هیچی دیكەیان بەدواوە نەبوو... كۆلاّنەكان هەر ئەو كۆلاّنە كۆنە دێرینانەبوون- كۆلاّنیش نەبوون؛ هەروا سەربەرەو خوار كە یەك بوون و هیچی دی. ئەوەی لەولاڕا دەهات زنجێكی قوت دەكردەوە. جاری وا هەبوو ئەو زنجانە سەرچەقی رێیەیان دەگرت و جاری واشبوو دوور لە رێیە خۆیان بەسینگی تەپۆلكەكێوە دەنوساند و لەوێیان دروستدەكردن. لای خۆرهەلاّتی تەپۆلكەكەوە ((كۆنە بانە)) بوو كە گەڕەكی سەرەوەی شاری بوو و دەكەوتە خوار تەپۆلكەكەوە. تەپۆلكەكەش بۆخۆی ئەوە گۆڕستان بوو؛ ئەوە شەقام هیچ كە هەر نەبوو، هەموو شوێنێك هەر خۆڵە پەتە و قوڕ و چڵپاو بوو، تا رۆژێكیان كتوپڕ سەرباز پێوەربوون، و ئەو كۆختە و زنجانەیان هەموو تێك و پێكدا. وەك ((زەمانە)) وەختی هاتبێ... بەلاّم نا، هێشتا دوور بوو؛ چونكە هێشتاش تا چێشتەنگاوێ خەڵكی هەر دەخەوێدا بوون و تازە دەهات مێزەرەكانیان بەسەر دەموچاوی خۆیاندا هەڵدەكێشا و چێشتە خەویان دەكردنەوە — دەیانگوت سوننەتە- بەو شێوەیە زەمان بەدەست سوننەتێوەی پەلە قاژەبوو.

رووی ماڵێ مە، رێك بەرامبەر دەروازەی دامو دەزگای كەلایی رەجەبی بوو، هەركاتێ خانمەكان هاتبانایە شاری بە بەردەمی دەركێ مەدا تێدەپەڕین: ملی كۆلاّنێیان دەگرت و دەچوون تا دەگەیشتنە پەنا ماڵێ مەلا حەسەنی و لەوێوە، بە كۆلاّنە تەنگەبەرەكاندا، لە بەرامبەر مزگەوتی گەورەوە سەریان دەردێنایەوە، كە دوكانەكەی بابەگیانیش رێك بەرامبەر بەوێ بوو.



جگە لەو خانمانە هیچ ئافرەتێك بەجلی مۆدە و پێڵاوی بەرزەوە نەدەهاتە دەر و بازاران. خانمەكان بە سفوری و سەروپرچی كورت و رووتەوە دەهاتنەدەرێ و دەگەڕان. ئەڵبەتە پرچی هەمووانیش هەر كورت نەبوو. بەراست پرچی كورت چۆن بوو؟ هەروا بەدەم رێوەش؛ دەدوان، و پێدەكەنین، و بەم جۆرەش زۆرجاران دەكەوتنە بەر پلار و قێزوبێز و تانە و تەشەری تێكڕای رەشە خەڵكەكە. رۆژی دوای قسەكانی عەبە ورچە بوو كە ئەو (خانم)ەم دیت: دەمی نوێژی عەسرێ- لێرە دەمی نوێژان نەبوایە، كەس نەیدەزانی كات چ وەختە. مەگەر كاك صالح یا حاجی سەعدوڵلاّت دیبایە، یا هەر بەتایبەتی چووبای و قیرۆسیات لە خۆت كردبایە و لێت پرسیبان سەعات چەندە. لە ترسی ئەوەی نا كە پێت نەڵێن، زۆریشیان پێخۆش بوو، بەقسەی ئێمەی منداڵان، بۆ خۆیان بەدوای مشتەرییاندا دەگەڕان. بەلاّم بۆ چیت پرسیبایە؟ هەر تەنیا بۆ گەنجەفان، دەنا هیچی دی و ئێمەش ئەو جەفەنگانەمان دەكردن: كاك سالح یا حاجی سەعدوڵلاّ كە یەكی دوو كلیلەی چوكەڵەیان بە زنجیری سەعاتەكانەوە هاتبوونە خوارێ، زنجیرەكەیان دەگرت و سەعاتەكەیان رادەكێشا و لەبەر باخەڵییان دێنایە دەرێ. سەعاتی ((ئەبو داغمە)) بوو. سێ قەپاغ، هەر بۆ زیاتر پاراستنیش قایشێكیان بۆ كردبووە كیف و بەرگێكی مەخمەری سەوزیشیان بۆ درووبوو... كاك سالح یا حاجی سەعدوڵلاّ سەعاتەكەی لە كیفێ دەردێنا، زۆر لەسەرخۆ؛ بە قامكێ گەورەی دەستە راستێی قوڕمیشەكەی پاڵ پێوەدەنا تا، سەر قەپاغەكەی بڵند دەبوو. ئەودەمی سەعاتەكەی بە گوێیەوە دەنا و دەیگوت: ((دوو سەعاتی ماوە بۆ سەر دەستەی)) یا ((سێ سەعات چارەك كەمی لەسەر دەستەی لاداوە)) كە ئەوە بۆ ئێمەی منداڵان و تەنانەت بۆ گەورەكانیش مەتەڵێك بوو، هەرچەندە وامان خۆ پێشان دەدا كە هەر ئەوەمان دەوێ و هەر ئەوەی كە ((یەك چارەك كەم)) لەسەر دەستەوە زۆرباشە و لەوەش باشتر نابێ و دەستمان دەكرد بە پێكەنینێ. یا راستە و راست دەیگوت: ((قوڕمیشم نەكردووە و نوستووە)) و دیسانەوە سەعاتەكەی بەگوێییەوە دەنایەوە، رایدەوەشاند، ئینجا قەپاغەكەی پشتەوەی بەسەرە نینۆكێ دەكردەوە و بە یەكێك لە كلیلە چوكەڵەكان سەعاتەكەی كۆك (قوڕمیش) دەكردەوە و هەڵی دەستاندەوە و ئەوجا سەیرێكی ئاسمان و خۆرە تاوێی دەكرد- ئەگەر خۆر بە دەرەوە بایە- دەنا هەر سەیركردنی دەوروبەرێی بەس بوو- و بەكلیلەكەی دی و هەر لە پشتەوە سەعاتەكەی جووت (میقات) دەكردەوە...

لەلای بابەگیانەوە لەسەر کەرەوێتەکە دانیشتبووم، و سەیری دوکانەکانی ئەوبەرێم دەکرد، گەمەم بە کەڵلاشوشەکانی نێو گیرفانێم دەکرد. ڕۆژانەکەمم هەر سەر لە بەیانی وەرگرتبوو، هاتبووم بای باڵی خۆم بدەم، یا ئەگەر شتێك هەبێ بیبەمەوە ماڵێ- کە کتوپڕ خانمەکان پەیدابوون. هەر کە هاتن بابەگیان سەری بڵند کرد... چواربوون، خانمە تازەکەشیان دەگەڵ بوو: لە پێشەوەی هەمووان بوو. دووی دیشی لەپشتەوە بوون؛ یەکیان خەریکی دەزووی غەرغەرە کڕینێ بوو لە کوڕی حاجی سەعدوڵڵای- دیاربوو بەسەر جامخانەی شتەکاندا چەمابۆوە و سەریشی کردبووە سەر کوڕی حاجی. تازەکەیان بەرەو لای دوکانێ بابەگیانییەوە خشی- جووتە پێلاوێکی بە دەستەوە بوو.

هەر کە باوەگیان گوێی لە تەق و تۆقی پێلاوەکانی بوو سەری بڵند کرد و سەرنجەکانیان گەینە یەك، دیتم وەك جندووکەیان بە دەموچاویدا هەڵپڕژیبێ ڕەنگیان تێکچوو، و هەردووکیان لەجێی خۆیان وشك بوون و سپی هەڵگەڕان.

... بابەگیان هەروا وەك خۆی بوو... خانمی تازە هەروەك ڕێی لێ گۆڕابێ یان هەڵەیەکی زۆر گەورەی کردبێ، لەسەرپاژنەی پێی سوڕایەوە و بە شڵەژاویەوە وە دوورکەوتەوە... خانمەکانی دی لە پڕمەی پێکەنینێیاندا، و کردیانە هەرا.

((هەی خاکی دنیامان بەسەری! مەشەدی خۆ کچەت نیوەگیان کرد!.. چاومان روون، هەر تۆ مابووی، تۆش!؟... قەمەر... قەمەر...!)) ناوی خانمێ تازە قەمەر بوو ((قەمەر، وەرە، وەرە مەترسە، مەشەدی سەودا سەرت بووە، مەترسە، ناتگەزێ!)) باوەگیان ناراحەت بوو؛ چاوی سور هەڵگەڕان، ڕەنگی ڕەش داگەڕا، ئاخر لە پێش دەر و داروسێیان جوان نەبوو ئاوای ببینن. کاتێ خانمەکان بابەگیانیان ئاوا دیت لێیاندا و ڕۆیشتن. قەمەر خانم لەبەر دوکانێ کوڕی حاجی سەعدوڵڵای پشت لە دوکانێ بابەگیانییەوە راوەستابوو من دەو دەمەیدا هاتبوومە بەر دوکانێ. یەکێك لە خانمەکان بەدەم پێکەنینێوە وەدووی کەوت. گوێم لێبوو زۆر بە سپایی گوتی: ((نا... پێلاوێکی دیم هێناوە... کارەکەم لێ هەڵوەشایەوە... دەبێ سەرلەنوێ ئەو هەموو ڕێیەی بکوتمەوە!)) و دە قوچەکە و دەزووی غەرغەرەکانەوە راما. جوان بوون... بابەگیان هەموو دەستی خوێن بوو؛ درێوشە قامکی هەڵدڕیبوو؛ دەنکە ئارەقەی سەرهەنیای، کە تازە دەهات



هەڵوەرن، دانیشتبوو؛ گەردەنی سوورو پڕ چرچ و لۆچ و ماندووشی شەلاڵی ئارەقەی ببوو... هەواش گەرم بوو.

لەو ڕۆژەوە ئیدی نەمدیتەوە دەگەڵ خانمەکاندا بێتەوە بازاڕی، یا بێ پەچە و چارشێو بێت: هەروەك فەرەنگ خانمێ بەتەنێ دەهات، و چارشێویشی دەگرتەوە... زۆر بەکەمیش دەهات... تا ئەوەندەی وەبیرم بێ لە یەك دوو جاران بەولاوەتر نەهاتەوە. بە پێچەوانەی خانمەکانی دیکەوە کە بە بەردەرکێ مەدا تێدەپەڕین، ئەو ڕێیەکەی دەگۆڕی و بە بەردەمی ماڵێ پوورە فاتمێدا دەڕۆیی ئێمە چوو بووینە سەرجێی، من و مەلیحە و دایی پێکەوە دەنوستین. بابەگیان ئەو ڕۆژە درەنگتر هاتەوە؛ هەر لە ئێوارێوە لچ و لێوی پێکدادا بوون و گرژ و مۆن بوو، دایی دەیزانی لەسەرپێیە و هەر دەستی بدەیەی دەتەقێ، هەربۆیە هیچی نەگوت. بەپێچەوانەوە دەو جۆرە سات و وەختانەدا کە بابەگیان غەم دایدەگرت ئەو زۆر میهرەبان و هێور و ئارامتر دەبوو دەگەڵیدا. من تا ئێستاش سەرم لەکارەکانی دایی هەر دەرنەکرد: بۆ خۆی هەر هەلی لێ هەڵکەوتبایە ئەوە گریانەکەی لە بن بڕۆیان بوو و فرمێسکی دەهاتنە خوارێ، بەلاّم هەرکاتێ من یا مەلیحە — زیاتر من- بگریەین ئەو خێرا ژیر دەبێتەوە، و فرمێسکەکانی رادەوەستن. هەرکاتێ بابەگیانیش غەم و گیروگرفت و تێگیراوییەکی هەبایە هێندەی بە گەرمی و خۆشەویستی و میهرەبانییەوە دەدواند هەر مەپرسە... بەردەوام دەور و خولی دەدا- بەو لەشە داتەپیوەشیەوە. ئەو شەوە بابەگیان دەمی لە هیچ نەدا. گوتی سەری دێشێ. داییش لە یەك دوو پاروانی زیاتر نەچووە سەرزاری.

مەلیحە نوستبوو خەونی حەوت پاشایانی دەدیت؛ من هەروەك خووی هەموو دەمێم، پەتووم دەخۆوە پێچابوو و چاوەڕێی هاتنی دایی بووم، کە بابەگیان گوتی: ((واچاکە وردە وردە خۆمان خڕکەینەوەو... وەڕێ کەوینەوە!)) و هەناسێکی سارد و قووڵی هەڵکێشا. ڕەنگی پەڕیوی ڕوخساری و ساردییە هەناسەکەیم دەبن پەتووێدا دیت و هەستپێکرد.

دایی بەدەنگێکی نەرم و نیان و چاوەڕێوە، گوتی: ((بڕۆین... بچینە کوێ؟)) ڕوخسار و سەرنج و چاوە نیگەران و دەموچاوە داچەکیوەکەی ویشم دەدیت... (( بچینەوە لای خۆمان؟)) دەنگ و ئاوازی قسەکانی لەلایەکی پڕ لە غەم و حەسرەت و لەلایەکی دیشەوە پڕی حەز و ئارەزووی گەڕانەوێ بوو. بۆ مەگەر چ بووە... شتێك ڕوویداوە؟... باشە، خۆ تۆ هەر بۆخۆت پێش چەند

ڕۆژێکان چاکە و پیاوەتییە ئێرەت باس دەکردو- داگژابوویـە سـەر و پۆتـەلاکی شـێخ زەینـول عابیدینی و دەتگوت ئەو لەخوا نەترسەی کە پاشەملە زمان لەو خەڵکە باشانە دەکوتیێ و دەڵێ وادەکەن تاوابچیێ و پیاوی دەخۆن و گوایە دەگەڵە مە کێرد و پەنیرن... هەر بـۆ خۆشـت بـووی دەتگوت کە ئەو خەڵکانە سەگەکەیان سەد شێخ زەینول عابیدین و شێخ عەلی و مەلا ڕەجـەب عەلی دێنیێ- ها وانەبوو؟)).

بابەگیان دیسانەوە بە زمانێکی زۆر غەمبار و ئـاوازی دەنگێکـی یـەکجار شـێواوە وە گـوتی: ((با)). پێدەچوو دەبیر و خەیاڵانەوە ڕاچووبێ، چونکە خوو و خدەی خۆیبوو هەرکاتێکی وابایـە ریشی دەخوراند. ((با... خوا هەڵناگرێ خەڵکەکـەی زۆر چـاکن. بـەڵام... بـەڵام هەرچـەندی سەری خۆم دێنم و دەبەم ئێرە بە کەڵکی ئێمە نایە. لێرە ئیشێکی وانییە... قوتابخانەیەکی وای لێ نییە... ئەوەی کە هەشە هەر قوتابخانە نییە... هەرنەبێ خۆ پێویستیت بە یەکێکە دەگەڵی هەستی و دانیشی و هاموشۆی بکـەی و هاموشـۆت بکـا... ئـەوە هـەر بـۆ خـۆت یەکـسەر زیندانییەکی تەواوی... هەموو شتێك سنورێکی هەیە)).

دوای تاوێك ((سەرەڕای ئەوەش، ئەوکچەش ئەوە گـەورە بـووە... هەرنـەبێ لەبـەر منداڵـەکان دەبێ لێرە بڕۆین. پشت بەخوا هەروا پارەی ئەو کەرەوێتەم بۆ جوربێ وەڕێ دەکەوین- نامـەوێ چاو بەرەژێری وەستا عەلی بم و بە قەرزداری بڕۆم- هەرچـی هەمانـە هـەمووی لەوانەوەیـە)). وەستا عەلی دارتاشی دەگوت، کە ئازەربایجانی بوو. ((وردە شتێکیش بە حاجی عەولای دەبباغ و وەستا فەیزوڵلای قەردارم... بەهەرحاڵ دەبن باری قەرزاندام، ناتوانم هـەروا بـڕۆم و بـەجێیان بێڵم- خوا هەڵناگرێ، پیاوەتییان کردووە... بەڵام هەر کە ئەو قەرز و قۆڵانەم سەرو بەرکردن و پارەی ڕێیەم دابین کرد، پشت بەخودا وەڕێ دەکەوین، تا بزانین خودا چی بڕیوەتەوە!)).

دایی هەناسێکی هەڵکێشا و گوتی: ((خوا ماڵیان وێرانکا ئینشاڵلا کـە ئێمـەیان وا دەربـەدەر کرد!...)) بە دەنگێکی کزەڵەوە کە چاوەڕێی هـەواڵێکی گـرنگ بـوو، ئیـدی خـۆ دایـی خـوا سەلامەتی کا لە هەزار ئاوازی دەخوێند. گۆشەیەکی پەتووەکەی لەسەر لادام تا بزانێ بە ئاگام یا نوستووم —پێدەچوو مێشك و بیری پەرت بـن- نـازانم چ ئاماژەیـەکی بابـەگیانی کـرد، یـا سەرنجی بابەگیانی چی تێدابوو کەوا لەپڕ بارەکەی گۆڕی و کەوتە سەر تورکی گـوتنێ. زۆر بـە دەگمەنیان قسە بە تورکی دەکرد، مەگـەر کـاتی وابایـە کـە نەیانویـستبایە ئێمـە تێبگـەین،



هەرچەندە لە دوایە، جا درەنگ یازوو شتێك هەر تێدەگەیشتین. هەروا لەبن جێوە گـوێم قـولاغ کردبوون تا بەڵکە ئیێ سەرەپەتێکم دەستگیربێ. گوتی: ((بو گون بیزم سلیطە خـانم گـوردوم... ها، بوردادی!))[1] ڕستەی دووەمی قسەکانی بە وەڵامـی سـەرنج و ڕوخـساری دایـی دەچـوو. کەمن چاوم لێی نەبوو. درێژەی دایە ((پەتیارەخان!)) کە ئەو قسەیەی یەك دنیا نەفرەتی لێـوە دادەباری... بەڵام نەفرەتیکی پڕ بەزەییانە.

دایی قریشکەیەکی کزەڵەی لێوە هەستا، و بە تونـدی چـەپۆکێکی لـە سـەرو ڕوو و گـەردەنی خۆیدا... دیاربوو زۆر ئاڵۆز و شێواوە و پشووی سوارە. ئیدی بابەگیان هیچی دی نەگوت. دایی وەك سەر لیێ شێواوان، بە دەنگێکی لەرزۆك و گەرووی پڕ گریانەوە گوتی: ((اکبر آقـا، سن اللە، ممدن جانی، دوز دیرسن یا باش باشە گویورسن!))[2] ئاوازی قسەکانی پاڕانەوەیان تێدابوو.

بابەگیان گوتی: ((هوم! باش باشە!))[3] دنیایەك نائومێدی و تێمـان و سـووکایەتی دە ئـاوازی قسەکانیدا دەنگیان دەدایەوە. ((خیر، گوردوم... چخ گوزل داگوردوم... اوزگوز و مـنن!))[4] و وەك ((هێڵنج)) بدا- وام هاتە بەرگوێ. بـەڵام نـەموێرا سـەرم لـەبن پەتووەکـە بێنمـە دەرێ، هەرچەندە هەموو لەشیشم وەسەر ئارەقەی گـەڕابوو. دە کاتێکیـدا کـەجێی بـاوەڕێش نـەبوو، بابەگیان هەرگیز نەدەگریا. دایی بێدەنگ بوو- ئەو لە پڕمەی گریانێیدا... ئیدی دەرکەوت کە قسەکانی هیچ گومانێکیان تێدانییە و دایـی چ قـسەی نـەمان. بابـەگیانیش هیـچی دیکـەی نەگوت... دایی لە هەیوانێ ڕاوەستاوە و بەواقی وڕەوە دە ترۆپکێ دارەبییەکەیەوە ڕاماوە. من لە جاڵجاڵۆکەیەکی یەکجار زۆر وردیلەی ناو تاڵی تەونـە نادیارەکانیـەوە ڕامـاوم، کـە هـەروا بەردەوام خۆ بێرەو بەوێدا دەدا. قەلێك چڵەدارێکی بەدەندوکێوە گرتووە، خەریکە لە نێوان ئـەو دوو لکەی دادەنێ کە لەپێشدا وەك پێوابیەتی. هێنـدێکی بەدەنـدوکێ جـێ گـۆڕکێ پێـدەکا؛ فرتەی دەکاتە سەر لقەکەی تەنیشتێوە، لە دوورەوەیـڕا تەماشـا دەکـات و سـەرنجانی لێـدەدا، دوایی دێتەوە بەسەریدا دێت و دەچیێ- لەدرێژییەوە- یڕا بەتاقیدەکاتەوە داخوا نیشتووەو جێـی

[1] ئەوڕۆ دەم هەراش خانم دیت... بەڵێ، لێرەیە.

[2] ئەکبەراغا، تووبی و خودا، توگیانی مەمەدی (محەممەد عەلی) بەراستیتە، یـا هـەر دەتـەوێ سـەرم بکەیـە سەرێ.

[3] ئمم! سەرکردنە سەر.

[4] نەخێر، بۆخۆم دیتم، چاکیشم دیت، هەر ڕاست بەو دووچاوانەی خۆم.

خۆی گرتووە یان نا؛ پێدەچێ دڵنیا بێت. بەڵام نا، هێشتا ماویەتی. دوایە بە باری درێژییەیدا دەپێوێ و ئەوجا بەسەر ئەو دوو لکەی پێشاندا کە چڵەدارەکەی لەسەر داناوە ڕێ دەکا... ئێ... بەرواڵەت چ کەموکەسرییەکی نییە. ئەو تاقیکردنەوەکانی خۆی تەواو کردووە، و دەو دەمیدا نێرە قەلەکەش چیلکەدارێك بەدەندوکێوە دەگاتەوە جێ. هەر کە ئەو دەگاتەوە قەلەداکانەکە خۆی گیڤ دەکاتەوە و دەڕوا. نێرە قەلیش تاقیکردنەوەکان دووبارە دەکاتەوە ((ئای لەو ژنەگێلەی- خۆ ئەوە جێیەکەی لەقە!)) ئەوەشی لەخۆ گیڤ کردنەوێ و پەڕو باڵ داچۆڕان و چاوە خڕەکانی و سەرقیت کردنە وێڕا دیارە.

((قاڕ))ێکی کە لە کاتی گەڕانەوەی مێیەکەیدا لێ هەڵدەستێ، ئەویش هەر ئەومانایە دەدا. دایی هەروا کز و مات ڕاوەستاوە- دیارە کە دە دەریای بیر و لێکدانەوە و ئەندیشەی قووڵدا خەریکی پەلە قاژەیە: ئەوانە، ئەوا تازە خەریکی ماڵ و هێلانە دانانێن، کەچی ئەو دەبێ ئەوەی کە پێکییەوە ناوە هەڵیوەشێنێتەوە و کاولی کاو لێدا بڕوا... بۆ کوێ؟ -دیسانەوە بۆ قیسمەت ئاوایە! ئەگەر قیسمەتەکە ئەوەبێ، واوەیلا بۆ ئاواییەکەی. ئەوانەش دیارە هەروەك مە ئاوارەن، دەنا ئێستا کوا کات و سەردەمی هێلانە دروست کردنییە- هەڵۆیەك (کۆللارە) ڕاست بەسەر حەسارێ مەیدا خول دەدان؛ چاوم لێیەتی هەروا سەری بەم لاولادا بادەدا و چاوان دەگێڕێ. دوێنێ یەك لە جوجکەکانی فڕاند؛ هەرچەندە مریشکەکە ماوەیەکی وە دووکەوت و خۆی لێ گیڤ کردەوە و بەسەریدا قیقاند و بە دەندوکانی وەرگەڕایە، بەڵام هەر بێ سوود بوو، فڕاندی هەر فڕاندی- و ئەوە ئێستاش هاتۆتەوە. بەردێکی هەڵدەگرمەوە و بەهەرچی هێزی قۆڵ و بازووم هەیە دەیهاوێمێ. کە ئێمە دە حەسارێدا دەبینێ دوور دەکەوێتەوە، بەڵام وا دیارە هەر سووربێ لەسەر ئەوەی بە جوجکەکان ڕابگا. مریشکە، بێ ئاگا لە هەڵۆیە، خۆی دەخۆڵێ گرتووە و هەروا پێپڕکەیەتی؛ لە دوو جوجکانی زیاتریش لەبەر نەماون. یەك لە جوجکەکانی لەسەر پشتێ هەڵنیشتووە، ئەویدیشی لە تەنیشتێوە نوستووە. جوجکەکان تازە فێرە ((پێپڕکە)) بووینە. لە شێوەی جووڵانی پێ و خێراییە جووڵانەوەیانڕا دیارە کە لاسایی هەڕەمەکیانەیان بەسەردا زاڵە و ئەو کارانەش زۆر بەراشکاوانە وەك گەورە و بەساڵداچووان ئەنجام دەدەن؛ وریایی و زیتەڵەییەکەیان جێی سەرنج و تێرامانە: وەك پارچە کچۆڵەکی کە پێڵاوە گەورەکانی دایکی لە پێ دەکات و خۆی وەك گەوران دەنوێنێ، تا بڵێن: ((سەیری، چەند گەورە بوویمە؛ بۆ خۆم خەریکم چینە دەکەم!)) جاری وایە واخۆ پێشاندەدەن کە ماندوو بووینە، و وەك گەوران سەر و ملیان قیت دەکەنەوە و



بەولاولایدا دەگێڕن، باڵەکانیان شۆڕ دەکەنەوە و بن باڵ و پەڕەکانیان بە دەندوکێ دەخورێنن، یانی کە خۆیان دەدۆزن و لە غەم ڕەخسیون، دوایە خۆ ڕادەوەشێنن؛ پەڕی لاملێیان گرژ دەکەنەوە و دەست دەکەن بە جووکە و جیکەجیکێ- هەروەك پەلەوەری گەورە. ڕێ دەکەن و سەریان بێرو بەوێدا بادەدەن و دەجوکێنن، بێ ئەوەی دەنکە دانێك چییە هەڵیگرنەوە، هەروەك گەوران- بێ گوێدانە دایکیان- و هەر کە داییش دانی بۆ ڕۆکردن، ئیدی ئەوە باڵان لێك دەدەن، وخۆ پێکتر دادەدەن و پاڵان پێکەوە دەنێن... دایی دە بارودۆخێکی سەیر دایە: هەمیشە هەر لەبەر پەنجەرێیە. لایەکی سەرپۆشەکەی بە ددانی دەگرێ و دادەنیشێ- وەك چاو لە ڕێی کەسێك. هەر کە یەکێك لەلای سەرگوفکەکەوە دەرکەوت ئیدی ئەوە ئەو بە دووچاوی نیگەران و بە قوڵداچوویەوەی، وەك دوو چاوی ڕووناکی دووربینێ چاوەکانی تێدەبڕێ، و هەرکە ڕێبوارەکەشی بۆ ڕوون بۆوە، ئیدی ئەوە لەسەرەخۆ دەکشێتەوەو خۆی پەنا دەداتەوە.

ڕۆژێکیان خانمی تازە هاتووی هەمەدانی لە کەناری تەپۆلکەکەوە بەخۆو بە چارشێوی سەریەوە وە دەرکەوت، و ڕێچکەی ڕۆینێی بەرە و لای ماڵێ پوورە فاتمێی گرتەبەر. دایی کە لەبەر پەنجەرەکەوە دانیشتبوو بە گورجی کشیەوە؛ دووبارە هاتەوە پێشێ- وەك یەکێکی زۆر حەسرەتە و مەندی برسی کە دوای ماوەیەکی زۆر خواردنێکی خۆش و بەتامی لەبەر دەمی خۆیەوە دیبێ و ڕێی دەست بۆ بردنێی نەبێ: هەموو قورساییە لەشی خۆی بردبووە پێشێ؛ کە هێندەی نەمابوو بەسەر سەردا بکەوێتە هەیوانێوە، دەتگوت دەیەوێ لە پەنجەرەکەیڕا بفڕێتە دەرێ. ئاگای لە ماسوولکەکانی دەموچاوی بڕابوو: دەمی بەش ببۆوە، دەموچاوی داچۆڕاوتر و چاوەکانی لە جاران قووڵتر و کراوەتر و بێ ئارامتر دیاربوون؛ سەرنجی تیژی چاوەکانی وەك دوو درێوشەی تیژ چارشێوی ئەو سۆزانییەیان کون کردبوو و بەناو لەشولاریدا دەگەڕان و نەرمونۆڵی ئەو لەشولارەی ئەو تازە نەمامە شلکەیان دەکێڵا. هەر کە ئەو لەپێچی داوێنی لای خواری ماڵێ پورە فاتمێدا تێپەڕی دایی بێ ئیختیار بە پشتداکەوت، و سەری بە تەپەیەکی ترسناکەوە، وە دیواری کەوت. مەلیحە زریکاندی و بەرەو لای وی غاردا. بە شڵەژاوییەوە، سەری هاویشتە سەرکۆشی خۆی. ڕەنگی روخساری دایی وەك مردووی سەرتاتە شۆڕێی لێهاتبوو و؛ لێوەکانی وشك هەڵاتبوون، و دەماری ملی خێراخێرا لێیدەدا. مەلیحە، هەروا بەشڵەژاوییەوە، بەگریانەوە هاواری کرد ((حوسێن... حوسێن!)) ڕامکرد ((حوسێن — ئاو... خێراکە، دەبجوڵێوە داوەشێی!)).

ئاوەکەم برد؛ مەلیحە هەر لەوێ، لە ژووری، ئاوەکەی دە دەستی خۆی کرد و بە پەنجەی بەسەروچاوی دایێدا پژاند؛ ئینجا بەچمکی لەچکەکەی سەر و دەموچاو و سینگ و بەرۆکی دایی وشك کردەوە، و هێندێکیشی ئاو بە دەمیداکرد.

چەند رۆژێك لەمەوبەر، بەرە بەری ئێواری، ژن و ژاڵ لەبەر دەرکی ماڵێ پوورە فاتمێ دانیشتبوون: ئەوێ جێ ئاپۆرەی ژن و کچانی گەڕەکێ بوو- هەر گەڕەکە بۆخۆی کەزی سپییەکی هەبوو، و پوورە فاتمیش سەرسپی گەڕەکێ مەبوو، کە گەڕەکی خوارێ بوو. پیر و جوان دەهاتن، کچان لە گەڕانەوێ سەراو و سەرکانییە لەوێیان لادەدا، و ماندوویەتییە خۆیانیان دەحەساندەوە- و هەموو لە هەموو رازی دڵی خۆیان بۆ یەکتری هەڵدەڕشت و هەواڵ و دەنگوباسیان پێك رادەگەیاندن و دەڕۆیشتنەوە.

کاك سولەیمانی —زاوای پوورە فاتمێ- کە لە پیاوە دیارەکانی گەرەکێ و سەرۆکی فەرمانگەش بوو، ئێواران بۆ ئارەق خواردنەوێ دەچووە دەم چۆمی. سینیان بۆ دەرازاندەوە و بۆیان دەبرد- هەموو دەماندیت. جاری وا هەبوو بەدوای یەکێك لەو خانمانەیدا دەنارد بچێت و گۆرانییانی بۆ بڵێت- ئەوە هەموو ئەوانەمان دەزانی و ئاگامان لێبوو- ئەو رۆژەش، لەسەرچۆمی، لە دوور ڕا دیاربوون- سێ چوار کەسێك بوون. هەر کە دەنگی ئاوازی خانمێ بەرزبۆوە کتوپر لەشی دایی وەك پێستی هێندێك جانەوەران کە شەپۆلی تایبەتی لە دوور ڕا هەست دەکەن، گرژبوو- گوێی هەڵخست و کتوپڕ تێکڕابوو. هەموو ژنەکان هەستیان پێکرد، و هەموویان بێ گوێدانە پوورە فاتمێ، بەدەنگ و ئاوازێکی دایکانەوە گوتیان: ((دەك خێرێ لە خۆتان نەبینن ئینشاڵڵا!...)).

لەو رۆژەوە بابەگیان رێی خۆی گۆڕی. لەپێشدا بۆ ئەوەی بەرێیەکی خۆش و دڵگیرو بەرفراوانتردا هێندێك پیاسە بکات، بە بەردەمی ماڵێ پوورە فاتمێدا دەچووە دوکانێ بۆ ئیشێ، کە بەکاروانسەرای (خان) حەسەن خانی دوایی دەهات. و بە کورتە هەورازێکیدا تێدەپەڕی و دەچۆوە بەرامبەر مزگەوتێ. بەڵام ئێستا بۆ ئەوەی تووشی کەس نەبێ و تووشی چاك و چۆنی و هەواڵ پرسییە کەس نەبێ سبەینان زوو، پێش تاو کەوتنێ لەماڵێوە راست، بەشان و شەپیلکێکی داچەکاو و رووپەکی گرژ و مۆنەوە دەچتە دوکانێ. لە دوکانێش بە دەگمەن نەبێ سەر بڵند ناکات؛ دەدەمی کار کردنێشدا زۆر بەدەگمەن بیرو هۆش و سەرنج و دەستەکانی تێك دەکەنەوە و پێکەوە کارەکان ئەنجام دەدەن: جاری وایە ئیشێکی چەند بارە دەکاتەوە: هەر دەدروێ و دەدروێ،



و دوای تاوێکی ئەوەی درویویەتی، هەڵدەوەشێنێتەوە، و لەبەر خۆیەوە دەست دەکا بە جنێودانێ ئەو هەست و هۆش و پەرت و بڵاوییەی خۆی. جاری وایە ماوەیەك تاکە پێڵاوێکی سەرکۆشێی لەبیر دەچێتەوە، و هەر لەخۆڕا هەناسان هەڵدەکێشێ. زۆرجاران وەڵامی پرسیاران دەبەزێنێ و وەڵامی بێ جێ دەداتەوە... تێکشکاوە، هەموو دەمێ لێوەکانی وشك، و سەرو لاملی شەلاڵی ئارەقەن! بۆ ئەوەی زۆر نەچێتە مزگەوتێ بۆ سەراوێ ئاوێ کەمتر دەخواتەوە. بۆ دەستنوێژی عەسرانیش، کە کۆڵان و بازاڕ چۆلن، دێتەوە ماڵێ. ئێوارانیش بە درەنگانێکەوە دێتەوە ماڵێ- بەتایبەتی ئەو دەمانەی کە خەڵکی هەموو چوونەتە مزگەوتێ بۆ نوێژی ئێوارێ: ئەو کاتانە ئیدی ترسی تێك هەڵەنگوتنێ مشتەرییەکانی کەلایی رەجەبیش نامێنێ.

ئای کە تێپەڕبوونی مشتەرییەکانی کەلایی رەجەب بە بەر پەنجەرەی ماڵێ مەدا، بەخۆ و بە شووشە ئارەق و ئەو گۆرانییە سەرخۆش و مەستانەیانەوە چ ئازارێکی گەورە و ژان و دەرد و رەنجێکی کوشندە بوون بۆ دایی! ئەوە ئێستا تێیدەگەم.

جاران دەمە دەمی خۆراوایە، سەروەختی هاتنەوەی بابەگیانی، مەلیحە هەیوانی ئاوڕشێن دەکرد و گەسکی لێدەدا و قاڵی و بەڕەی رادەخستن و سەماوەری تێداویشت و قۆری و پیاڵەی لە دەور دادەنان- و دایی لەبەر سەماوەرێ دادەنیشت، تا باوەگیان دەهاتەوە. ماڵێ مە رووی بەرەو خۆراوا و بەرامبەر بەچیای پیر سولەیمان بوو، بەراستی زەردە پەڕجوان بوو، بابەگیان زۆرجاران، شووتی، کاڵەك (گندۆرە) یا ترێی دەگەڵە خۆیدا دێنایەوە. هەموو لە هەموو دادەنیشتینە دەمەتەقێ و چا خواردنەوێ. نانی ئێوارێشمان هەرلەوێ دەخوارد. خەڵکی ئەو شارۆچکەی مە ئەگەر هەیوانیان هەبایە، لە هەیوانێ و ئەوەی نەشیبایە لەسەربانی و دەنا لە حەسارێ نان و چای ئێوارانیان دەخوارد. بەڵام دوێنێ بابەگیان فەرمووی کە ئیدی چیدیکەی وازی دانیشتنێ حەسارێ نەماوە؛ و ئەوە ئێستا هاتووینەوە ژوورێ و سەیرەکەش لەوەدایە کە ئەم جارەیان دایی جیا لە جارەکانی دی کە هەمیشە بەرپەرچی قسەکانی بابەگیانی دەدایەوە، و بە پاڵپشتییەمەوە شتێکی هەر دەگوت، ئەم جارەیان هیچ گوێی نەدایە ئەو هەموو تەماشاکردنە پڕ پاڕانەوەی من و مەلیحە و متتەقی لێوە نەهات- ئێستاش مەگەر بە دەگمەن سەرێکی هەڵبێنن و قسێکی بکەن.

* * *

## (٧)

هێندێك بەسەر نێوەڕۆیەدا رابردبوو کە لەسەرقەبرانڕا هاتمەوە ماڵێ. پەنجەرەکە لەسەر پشتێ بوو و دەنگی گریانێ دایی کۆلانی پڕکردبوو. کۆلانەکان هەموو هەتاوبوون. و هەوا تا دەهات گەرمتر دەبوو. یا رەنگە من لەبەر ماندوو بوونێم وا گەرما بێ. بەلاّم دالانی نێو ماڵێ فێنك بوو، و ژوورەکەش هێندە گەرم نەبوو. هێشتا پێلاّوەکانم دانابوون و دانەنابوون، هەر بەسەرپێوە کەوتمە چاوگێڕان بەدوای خواردنێدا. دایی دەگەرمەی گریانێدا هەستی کرد و مەلیحەش کە دانیشتبوو و دەگەڵەواندا دەگریا هەڵیستاند تا شتێکم بۆ بێنێ بیخۆم... گوێچکە نانێکم تاودایە. ئێستا ئیدی وەختی گەمان نەبوو؛ دەرێش گەرم بوو. بۆیە هەروا بەدەم نان جوینێوە کەوتمە گوێ هەڵخستنی مۆسیقای شیوەنێ. کۆتایی مانگی موحەڕڕەمێ بوو و خوا بۆدایی دابوو، بەهەر بیانوویێکەوە بایە ئیدی ئەوە گریانەکەی لەسەر پێ بوو. گریانەکەشی لەبەر وەیبوو کە کەس نییە بۆی بلاوێنێتەوە تا ئەویش ((چاوێك تەڕکا)) ئەوە هیچ کە شەو و رۆژی خوای چەندن ئەو چاوی هەر تەڕبوون. بەلاّم ژنانی گەڕەکێ بە هەستی ژنانەی خۆیان و رەمەکییە دایکایەتییە بۆنێکیان کردبوو. پوورە گوڵەندام منداڵ بە باوەشێوە دەگەڵ پوورە ناسکە و پوورە فاتمێدا هاتبوون. دایی دەگریا و غەم و کەسەری نێو دڵ و دەروونی خۆی بە تورکی دەردەبڕین- خەڵکی ئێرە فارسییە چاك دەزانن و باشیشی تێدەگەن، بەلاّم سەریان هیچ لە تورکی دەرناچێ. داییش ئەوەی دەزانی — و عالییەی بەزۆر ناوان وەك: گەورە و مەزلۆوم و ئاوارە و بێکەس و بێدەر و بێ پشت و پەنا، دەلاوەندەوە. من ئێستا دەزانم، کە دایی دەیزانی کچەکەی گریان و شیوەن و فرمێسکی کەسە زیندووەکانی خۆی دەوێ، تا لە گۆڕیشدا بزانێ کە کەسوکارێکی هەیە بۆی دەگرین و بۆی دەلاوێننەوە، و سەرو پرچ و رووی خۆیانی بۆ دەرننەوە و سینگ و بەرۆکی بۆ دەکوتن. دایی دەیزانی- هەموو دایکانیش دەیزانن...



غەمی ئەوەی کە مردووە و (تەلقین) نەدراوە و کەسی بۆ نەگریاوە و کەسی بۆ نەچۆتە ژێر دارەبازەکەی و تەرمەکەی کەسی دەگەڵ نەبووە بۆ سەرقەبران و کەسێك نەبووە فرمێسکێکی بەسەر گۆڕەکەیدا هەڵوەڕێنێ... هەموو ئەمانە ئەو دایکەی شێت و وەیلان کردووە. ئێستا تێدەگەم... ئێستاش هەر بەچاکی نا.

باشە چۆن دەتوانرێ هەست و نەست و خەیاڵی دیوی ناوەوەی مێشکی مرۆڤ وەسف بکرێ کە هەر جووڵەیەکی ((بیرۆکە))یەکی لێ پەیدا دەبێ کە دەتوانێ دنیایەك هەستی دی دەخۆ بگرێ؟ ئەو هەموو هەستە بە چ تەرازوویێك دەپێورێ و دەگەڵ چ پێوەرێکدا دێتەوە؟ نازانم- سەرو بنی دیارنییە؟ تا ئەوپەڕی غەم، تا ئەوپەڕی رەنج و مەینەتی! بەلێ هەموو ئەمانە یا بەشێك لەوانە کە من دە لاواندنەوەکان و ئاوازەکاندا گوێم لێدە بوون کۆتایی و سنورێکیان نەبوو، کە دەیگوت:

((بەشی کەس نەبێ دەردی دڵی من
هێند زۆرە غەمی بێ حاصڵی من
یەکێك دەزانێ چیم لە دڵدایە...
دڵی پڕ غەم بێ وەکو دڵی من))

... بەو دواییانە ئەمانەی هەمیشە لەسەر زاری بوو... و جاری واشبوو لەپڕ بە حەسارێدا وەك وە دووی کارێکی زۆر گرنگ کەوێ، دەهاتەوە سەرێ — تاوێکی چاو بەولاولای ژوورەکەدا دەگێڕا- دوایی دادەنیشت و پەنجەکانی تێك دە ئاڵقاندن، یان بەرەو قیبلە لەسەر ئەژنۆیان دادەنیشت و ئەو سینگ و بەرۆکە رەق و تەق و ئەو لاڕانە شل و داچەکیوانەی دەکوتا، کە ماندووش دەبوو، وەك دەسکەوانێ، لەسەرەوە تا کەمەری ئیدی ئەوە بۆ پاش و پێشەوە دەهەژاو خۆی رادەژاند... لەپڕ هەڵدەستایەوە و دەرگای کۆمەدینەکەی بەو کلیلەی هەمیشە بە بەرۆکێیدا شۆڕببۆوە، دەکردەوە؛ مقەبایەکی لێ دەردێنا و توند بەسینگی خۆیەوە دەنوساند: ((ئۆهـ، رۆڵەکەم، وای رۆڵەکەم! وای کۆڕپە بێکەس و بێچارەکەم ئوهـ- هـ- هـ)) لە ئاوازی ئەو ((ئۆ))یە درێژەوە لوورەی هەزاران گورگی بریندار دەهات. ماڵەکەی لێ ببووە جێی ئازار و شکەنجە دانێ: دەگەڵ هەر پارچە جلوبەرگێکی، کراسێکی کورە دڵبەندەکەی، بە سەیرکردنی هەر پیاڵە و قاپ و کەوچکێکی کە رۆژێك لە رۆژان ئەو خۆشی ویستوون، بە یادی هەر

پەیوەندییەکی کە دەگەڵ شتێکیاندا بووبێ، لافاوی دەرد و ئازار و غەمی، سەریان دەکرد و تاماوەیەکی زۆر نەدەنیشتنەوە. هات و هاوار و ناڵە و لەخۆدانێ مەلیحەش ئەوەش سەربارو بن بار.

دایی وای هەستدەکرد کە ئیدی ژیان بۆ وی نەماوە و خەرمانی تەمەن و خۆشی و جوانییەی هەمووی بەرباد بووە. ئێستا هەموو شتێکی لە بوونی عالیەیدا کۆ کردبۆوە، ئینجا کاکە... عالیە رابردووبوو، و ئێستاکە نەش مابوو بەڵام هەر هەموو شتێك بوو: دەست و پەنجەی رەنگینی، کار و کردار و ئاکاری، شەرموشکۆی، مێشك و هۆشی)). وای! ئاگرت تێبەربێ ئەمیری سوپای! ماڵ و منداڵت بە کۆی زوخاڵ بن!)) عالیە ئەو عالیەی جاران نەبوو کە دە خەیاڵ و بیری مندا بناسرێتەوە، زۆری بەسەردا تێپەڕیبوو- لەهەر مەیدانێکی و لە هیچ مەیدانێکیدا مەلیحە تۆزی نەدەشکاند. دەبوایە زەحمەتێکی زۆر و هەوڵێکی زۆر بدرابایە تا ئێ، ئەوە خوایە شتێکی لەوی بچێ. خۆ هەر کاتێکیش بە یادی جارانەوە بێ ئاگایانە ناوەکەیم بەسەر زمانیدا هاتبایە ئەوە دایی خێرا چاوێکی لێ مۆڕ دەکردمەوە و وەك دەموچاوم بە تەنی مەنجەڵێ رەش کردبێ! و بە تووڕەییەوە دەیگوت: ((بیسمیللا، خەونت دیوە!)) و بابەگیانیش نێو چاوانی تێك دەنا. زۆرجارانیش —دایی- هەر بۆخۆی مەلیحەی بە عالیە بانگکردبوو- ئیدی دەردەکەی بێ دەرمان بوو و نە دەشاردرایەوە- هەروا لەخۆڕا وە دەرکەوت- و بابەگیان چاوی لێ سووردەکاتەوەو دایی دەڵێ: ((ئۆه، لەو هۆش و گۆشەی کە من هەمە، خوا بیبڕێ! بۆخۆشم نازانم دەڵێم چی... تێکچوویمە!...)) و ئەوجا داخی دڵی خۆی بە مەلیحەیدا دەڕێژێ، بەسەریدا دەقڕیشکێنێ: ((کچێ لەگەڵ تۆمە... ئەوە لالی، بۆ وەڵام نادەیەوە!)).

بابەگیان تا شەوێ نەدەهاتەوە، دایی سەربەست بوو، چەندی گریابا- زۆری سوود لەو هەلە دەبینی. بە ئاوازێکی زۆر بەسۆزەوە دەیلاواندەوە:

((عەزیزانم لە دەست دەردی جودایی

لە چاوانم نەماوە، رۆشنایی

گرفتارم بەداوی دەرد و غوربەت

نەیار و هاودەمێ، نە ئاشنایی))



ئەوانەی هەموو بە فارسی دەگوتن، و ژنەکان دەیانزانی کە غەریبەیە، و دڵی بۆ زێدی خۆی دەسوتێ، و کوڕەکەشی حەپسە — و((غەم))ی هەیە. ئیدی ئەوە نهێنییەك نەبوو شاراوە. ئەوانیش درێغیان دەگەڵدا نەدەکرد بە گریانێ...

پوورە گوڵەندام دەگەڵ ژنەکانی دی دانیشتبوو و بەدەنگێکی نەرم سەر دوولکەی دەگێڕانەوە. دەگەڵ ئەوانەشدا جارجارە بە خۆشەویستییەکی دایکانەوە ئەو کۆرپەیەی باوەشی کە پەنجەی گەورەی پێی خۆی گرتبوو، دەکۆشێیدا خۆی دەسینگ و مەمکی پڕ شیری هەڵداویشت و چاوشارکێی دەگەڵ داکیدا دەکرد، تەماشای دەکرد و بەدەم گریانێوە وەڵامی چاوەگەشەکانی منداڵەکەی دەدایەوە: ئای لە گەورەیی دایك، کاتێ کە بۆ دڵی خۆی دەگری و بۆ خاتری دڵی منداڵەکەشی بە چاوی تەڕەوە پێدەکەنێ. منداڵەکە وەك بزانێ بارودۆخەکە ئاسایی نییە دەستە بچکۆلە خەپەتۆرەکانی بەسەر و رووی داکیدا دێنا و پێستی دەموچاوی هێندەی دی دادەچەکاند، و سەروپرچی دەڕنییەوە و دە روخساری داکییەوە رادەما و هەناسێکی کورتیلەی هەڵدەکێشا. ئینجا قامکێ گەورەی پێی بەردەدا، و رووی ترش و تاڵ دەکرد. دایکەش هەروا ناوە ناوە لەنێوان گریان و فرمێسك هەڵڕشتنێوە، چاوە سوورهەڵگەڕاوەکانی دەگێڕان و سەرنجێکی پڕ حەسرەتی کۆرپەکەی دەدا، و هەرچەند جارێکیش کەوا دەکات هەناسێکی ناکام —بەڵام پڕ مانا- کە نیشانەی دەرد و مەینەتییەکی زۆر بوون، کە زۆربەشیان هەروا بە خۆڕایی و لەخۆوە بووینە- لە سینەیەوە سەرهەڵدەدا.

ئەو هەناسەیە بۆ چییە؛ بیر لەچی دەکاتەوە؟ بۆ تاڵ و شیرینی و خۆشی و ناخۆشییە دایکایەتییەیە؟ بۆ پەلەقاژە و بێ غەمییە منداڵەکەیە؟ بۆ زۆرداری و زەبر و زەنگییە گەورەکانە، یا بۆ جەور و جەفای رۆژگارە؟ کێ چوزانێ... نە گەورە و نە گەورە تریش، کەس تێناگا! چ دەگەڵ منداڵێکی بچکۆلانەی بێ ئاگادا دەکەی؟ ئیدی، منداڵە، دەگەڵ منداڵێکی کە بەدەم گەمانەوە دەنکە شخارتێکی لێدەداو ماڵێ ئاگر تێبەر دەدا چ دەکەی؟ ((هەر دەیکوژم! ئەتۆ بابیگرم... وە بەردەستانم بێ... هەر دەیخنکێنم! ئابڕوو بەرەیە! دەیکوژم!)) بەڵێ، ئەوە مایەی ریسوایی و ئابڕوو چوونێیە، بەڵام کوشتنیشی هەروا ئاسان نییە. ئەوە دایك دەیزانێ، بابیش هەردەیزانێ... ((وەرە، وەرە هەی بەلاگیر! لە خوێنێ خۆت گەوزی!)) و پالێکی پێوەدەنێ، تا بچێ بنوێ؛ دەگەڵ پاڵ پێوەنانەکەشیدا رایدەکێشێتەوە بەرەوخۆی نەکا

بکەویٚ، تومەز پاڵەکە تۆزێك لە سنوری خۆی زیاتر بووە... دەگەڵ ئەوەشدا هەر بۆخۆی دەیەویٚ نەکەویٚ و ئازاری پێنەگا، و لە دەستی بابی دوور بیٚ، چونکە هەرچۆنێکی بیٚ بابی پیاوە، دەستی قورسە... بەو بیانوەوە کە ((دیسانەوە دەتەویٚ بچییە کویٚ، بچی ئاگرێکی دی بکەیەوە)). لە بابەی بە دوور دەگریٚ تا دەستی نەیگاتیٚ.

دەنگی تەپە تەپێکی پێی هات. دایی بیٚ ئیختیار، بە روخسارێکی نیگەرانەوە، لە گریان وەستا. خودایە بۆ خۆت رەحمێکی بکەی!... نا، دیاربوو چ پاسەوان و رەبیسێك لە گۆڕیٚ نەبوون. سوارێك لەسەر ماینێوە بە بەردەرکی ماڵێدا تێدەپەڕی. ماینەکە زۆر بەکاوەخۆ و بەدڵگرانییەوە هەنگاوی داویشتن و ڕێی دەکرد، و سوارەش ئاوزەنگی لێدەدا، و ماینەش نەك هەر هەنگاوی خێراتر نەکردن بەڵکە لەجێی خۆی چەقی و ئاوڕی دابۆوە و دەیحیلاند. دایی، و ژنەکان، هەموو بیٚ ئیختیار سەریان لە پەنجەرێوە هێنابووە دەریٚ و ئەو دیمەنەیان تەماشا دەکرد. سوارەکە دەستەسڕێکی بۆری چڵکنی وەبن چەناگەیەوە هەڵبەستبوو هەردوو سەری دەستەسڕەکەشی لەسەر کلاۆوە کوردییەکەیەوە گریٚ دابوو، پێدەچوو ئەو خاوە خاوەی رۆینی ماینەکەی هێندەی دی ئازاری ددانەکەی زیادکا و خێراخێرا ئاوزەنگی دە خالیگەی دەکوتا، و جنێوی دەدان. دەو دەمیدا جوانووە ماینێکی قەشان و چوار پەل قەڵەمی، کە دیاربوو، زۆر نەبوو ببوو، بەکلکی قیتەوە بەغار نزیك بۆوە؛ چوار ناڵەیەکی نەرم و جوانکیلەی بە دەوری داکیدا کرد، ئەوجا راوەستا و بەکلکی قیت و گوێی موچ و سەروکەللەی سەرسام و ساختە و قوماربازییەوە تەماشایەکی پشتەوەی خۆی کرد. سوارە دەگەڵ ناراحەتیەشیدا زەردەیەکی هاتیٚ، و گوتی: ((هەی دەم هەراشی پەتیارە! بڵیٚ چوێلەکە خۆت چی و گۆشتاوت چی- هەی ناکەس!)) ماینەکە لەسەرەخۆ کەوتەوە ریٚ، بەلاٚم جوانووەی شەیتان هەروا سەرسام راوەستابوو و تەماشای جێیەکی دەکرد کە نەسوارە و نە ئێمە هیچمان نەماندەدیت، و ئەو جێیەش هەر دە خەیاڵی خۆیدا بوو کوێیە. هێشتا زوو بوو تابیەویٚ هێز و توانای فرێودانیٚ خۆی بۆ راکێشانیٚ دلاٚن بە تاقیکاتەوە- یا خەریکی مەشق کردنێی بیٚ- هەرچی هەبوو، ئێمە نەماندەدیت. هەر کە سەر و کەللەی دایکیشی لیٚ ونبوو، بیٚ ئەوەی سەیری دایکی یا سەیری سوارەکە بکا زۆر وشیارانە، بەغاردانەوە بەرەو لای خۆراوایەی تیٚ تەقاند. واش دەرپەڕی کە دەتگوت هەر ئێستا نا ئێستا کوێرانە خۆ بە دیواری ماڵیٚ میرزا شەریفی قەپانچیدا دەدا، کە دیوارەکەی تا نزیکی ماڵیٚ پوورە فاتمێوە هاتبوو و بەجۆرێکی وا کە مێشکی بپژیٚ. سوار و ماینەکە زۆر



بەنیگەرانییەوە ئاوڕیان لێدایەوە- هەروەکو مە، کە چاومان تێبڕیبوو و متتەقمان نەدەکرد. ماینەکە هەر دەیحیلاند، و جوانووە قوماربازەکەش کە ڕێك بە دیوارییەوە لەجێی خۆی چەقیبوو هاتەوە و حیلەیەکی ناسك و کچانەی کرد، هەروەکو بڵیٚ: ((لێرە-م، دایە!)) و بەغاردان هاتەوە لای دایکی. ماینەکە هەروا بۆنێکی پێوەکرد و جانووەکە زۆر سادە و ساکارانە هات و خۆی دەداکی هەڵسوی، سەری بردە بن زگ و نێوان هەردوو پاشووی دایکییەوە و سەرەگوانی، گوانەکانی گرت و یەك دوو مژی لێدا...

هەر بە دیتنی ئەو دیمەنە سەر لەنویٚ شیوەن و لەخۆدان گەییەوە پەڕپەڕۆچکەی ئاسمانیٚ و ژنەکانیش بەدوایدا.

تەواوی غەم و دەرد و ناسۆری دنیایەت دە لوورەلووری دایی و ئەو ژنانەدا دەبیست- تەواوی ناکامی، تاڵی و سوێری، و هەرچی نائومێدییەك هەیە: ئەو نائومێدیانەی کە هەر لە بەرزو نزمی دابوون. و وەك شەپۆلەکانی هەڵمی بەر هەتاویٚ بێر و بەوێدا بلاٚو دەبوونەوە. پاڕانەوە و گلەیی بوون، ناکامی بوون. لە خودا پاڕانەوە بوو کە لە بیری نەکات، گلەیی بوو لێی کە ئەوی لە بیرچۆتەوە و ناکامیش بوو لەوەی کە ناتوانریٚ پشت بە کردارەکانی ببەستریٚ.

((ئۆۆۆ و- وەی)) لوورەی گورگی بریندار بوو، گورگی برسی، گورگی تازە زاو؛ کە برسییە و بێچووەکەشی هەروەتر و ناشتوانیٚ بەجێی بێڵیٚ، چونکە دەزانیٚ راوچی هەن، مرۆڤی دوو پیٚ هەن- لە ترسیٚ کۆرپەکەی، کە لەوانەیە لە دەستی بچیٚ و هەرگیز نەیبینێتەوە، سەرەڕای ئەو غەمەی، کە من ئەوا تازە پەی بە بناوانەکەی دەبەم و هێشتاش تەواوی لیٚ دڵنیا نیم، تازە خەریکە بۆم روون دەبێتەوە... کۆرپەکەی لە زیندانێیە... ئەی خودای ئاسمانان، دە کارێکی بکە!... واای، باشە ئاخر ئەو سینگ و بەرۆکە رەق و تەقە چەندی غەم تێدا جیٚ دەبێتەوە خودایە؟

تەواوی ئەو نووزە و لاواندنەوانەی داییم هەموو وەك دەنگدانەوەی دەنگێك، کە دەمێکە کپ بۆتەوە، دەهاتنەوە بەرگویٚ و دەلایەکی مێشکمدا هەڵمگرتوون. دیاربوو کە رەگ و ریشەی غەم و خۆشەویستییە هەروەك خۆیان مابوونەوە و هەروەك خۆشیان ڕێك و پێك و بەردەوام بەدەستێکی دایکانە لە ناخی دڵ و دەرووندا ئاودەدران، و چرۆیان دەرکردبۆوە و پێگەیبوونەوە و دەمی گوڵ کردنێیان بوو. دیاربوو کە ئەوە ئی ئێستا نییە و من هەر بە تاقیکردنەوەی خۆم

را دەمزانی. چونکە کۆنە غەم هەر بە دەنگ و ئاواز و نارە نارەکەیڕا دیارە: ژەنگی لێداوە و بەڵغی گرتووە، بەلاّم هەروەك خۆی تیژ و جەرگ بڕە. ئەو کۆنە غەمەی داییش وەك هەر شتێکی تایبەتییە هەر کەسێکی، ئەویش تایبەت بەخودی خۆی بوو. کە ناگوێزرێتەوە و نادرێ بە کەسی دی و تەنیا دەتوانرێ باس بکرێ و بە پێوانەی هەست و نەستی خودی ئەو غەمەی وەسفکەی. دایی دەگەڵ بناوانێ غەمان ببووە یەك، و یاد و یادگاری لەوەی خۆشتریشی نەبوو...

ماوەیەکیان هەروا لاواندەوە، تا وای لێهات شل و کوت و شەکەت و ماندوو بوون، و پوورە فاتمە بۆ دلّدانەوێ چەند سەربردەیەکی گێڕانەوە: هەر لەو رووداوانەی دوێنێ و پێرێ روویاندا بوو. گوتی: ((بە قودرەتێ خودای...)) هەمیشە سەرەتای قسەکانی وا دەست پێدەکرد. ((بە قودرەتێ خودای، ئەو دێڵەسەیەی پشت ماڵێ پوورە حەنیفەی شەش دانە تولّەی بووە- تولّەی وردیلە وردیلە، هەروەك تۆپەڵە خورییان، هێندە جوانن لە تەماشاکردنێیان تێر نابی... زێنەبێ کچێ پوورە حەنیفێ دەیگۆ حەوت دانەی تەواون- ئەو جارجارە، وردە نان و شتی وایان بۆ رۆ دەکا- دەیگوت حەوت دانەبوون؛ گوایە یەکێکیان کەم ئەندام بووە — جا یان دەستی یا پاشووی، نازانم- ئێسترەکانی تۆپخانەی پێیان لێناوە. دێڵەکە کە دەزانێ مندالّەکەی کەم ئەندام بووە بە قودرەتی خودای دەیکوژێ و دەیخوا!)).

دەنگی لوورەی دایی گەییەوە ئاسمانێ... مندالّەکەی پوورە گوڵەندامێش دەناو ئەو هەموو هات و هاوار و گریە و زەنایەی دەکۆشی داکیدا خەوی لێکەوتبوو!

بابەگیان شەوێ هاتەوە؛ هیچ حەوسەڵەیەکی نەبوو و کە داییشی ئاوادیت بە یەکجاری قۆڵی لە کراسی دەرێنا. دانیشت و هەروەك جاران دەو دەمانەدا بۆ ئەوەی کەمتری ببینێ و چاوی وەچاوی نەکەوێ، و زیاتر ناراحەت نەبێ، هات پاڵی وەلاشیپانێ پەنجەرەکەیدا: هەردوو ئەژنۆی بەزگیەوە نوساندن و پشتی سەریشی دەناو هەردوو لەپی خۆی گرت و پاڵی وە دیواریەوەدا، و لە دیواری ئەو بەرێ و لە پاشخان و دە ئاسمانێوە راما. هەر ناوە ناوە لە هاوارێ دایی رادەچەنی و چەندی دەکرد و دەکراند، دلّۆپە فرمێسکێکی بۆ لە چاوان هەڵقەنێ و بەڕوومەتانیدا بێتەخوارێ و کەمێك ئازارەکانی سوکترکا، نەبوو و نەبوو. ماوەیەك هەروا مایەوە چی دەدیت؟ دەتگوت دوو وێنەی دەمێشکیدا دەستە و یەخەن و بگرە و بەردەیانە:



یەکیان بە دووچاوی میهرەبان و سەر و روویەکی جوان و گەش، و هەڵسوکەوت و بزاوتێکی خۆشەوە: ئەو وێنەیەی کە هەرچەند جارێکان دەهاتەوە ماڵێ خێرا رایدەکرد و دەچوو تەشت و مەسینە ئاوی گەرمی دێناو بەدەستی دادەکرد. دواییش کە ئەو دادەنیشتە سەرنانخورادنێ، ئەو وێنەیەی، لەبەر سەماوەرێ، یا دەکاتی هیبار شوشتنێ، یا بۆ تیك و درووماندێ دادەنیشت و پڕ بە چاوی سۆز و خۆشەویستییەوە تێیدەڕوانی. جاری واش دەبوو هەر ئەو وێنەیە جلّەوی لە دەست بەردەدا و هەڵدەستا، دەچوو هەردوو دەستی دەگەردەنێ وەردێنا و دەیگوت: ((بابەگیان!)) ئەو وێنەیەی هەر بەو شێوە و رەنگەوە دەدیتەوە، وەك بڵێی هەر هەمان مندالّە سێ چوار سالّەکەیە کە هەمیشە لەسەر ئەژنۆیەکانی دادەنیشت و وەك ئەوجێیەی تاپۆکردبێ. ئەگەر شەیتانییەکیشی کردبا، ئیدی ئەوە بابی لە پشت بوو: ((کەس خۆ لەکچی من نەگەیەنێ- بلّێ چاکم کرد!)) ئەو قسانەش پارسەنگی ئەو هەڕەشە و تانە و تەشەرانە بوون کە کاکە یان دایی لێیان دەکرد، ئەویش سکالاّی خۆی بۆ بابی دەبرد: ((بابەگیان، کاکە لێوم لێ بادەدا!... کاکە قژی راکێشام!)) و لێوەکانی هەڵدەقرچاندن. یا ئەو دەمانەی کە بەگریانەوە دەچوو شکایەتی لە دایی دەکرد و هاواری دەبابیەوە دەبەست. ئەوە بابەش زۆر بە نەرمی و سۆز و میهرەبانییەوە وەك بێچووە چوێلەکێکی دەنێو دەستان گرتبێ، هەردوو دەستی دە ملە باریکە گچکەلانەکەی وەردێنا، و دەیگوت: ((قوربانی ئەو کچە جوانەی خۆم بم!)) و دەستێکی بەسەریدا دێنا و دەیلاواندەوە، بەسۆزێکی واوە کە هەر لەباوکان بوەشێتەوە؛ و هەر بەو وشە ناسك و پڕ نەوازشانە کوورەی دەروونی کچە دەنیشتەوە و زەردەخەنەی دەچاوەکان دەزانەوە، و دەستی دەکردەوە بە شەیتانییە: ((بابەگیان، دایە لێی دام...)) بابە دەیگوت: ((نا! کەی؟)) بە دەنگێکی رەنجیدەوە دەیگوت: ((هەر ئێستا- لێرەی دام!)) لێوەکانی وێك دێنانەوە و قۆڵی هەڵدەکرد و پێشانی دەدا- هەروا بە درۆوە دەیویست بلّێ کە قۆڵی شین بۆتەوە؛ و بابەش هەر دەستوبرد ((ئەوێی)) ماچ دەکرد، و هەر ئەو دەمی جێیەکەی چاك دەبۆوە و ئاسوودە دەبوو: لەسەروچاویەوەڕا دیاربوو؛ لە رەنگ و رواژای بابەشەوە هەر دیاربوو کە لەو ((دەرمانە))ی کە ماچەکە بوو وپێی چاك بۆتەوە و رازییە. ((... بابەگیان بزانم دەزانی بە رۆژانەکەی داتمێ چم کڕیوە!)) دەگەڵ تاکە تاکەی وشەی قسەکانیشیدا سەری دێنا و دەبرد و بەچاوە خڕە بچکۆلاّنەکانیشی دە بابەیەوە رادەما، بابە خۆی بەسەر سامییەکەوە پێشاندەدا، و هەروا کە دەستی دە کەلەکێ نابوو پڕ بە دنیایەك سۆز و میهرەبانی خۆشەویستییەوە دەچاوەکانی

رادەما، و وەك كێشەیەكی زۆر گەورەی وای هاتبێتەڕێ و حەلكردنی بەحسی سەربێ دەیگوت: ((نا! چت كڕیوە؟ سنجوو؟)) كچە زیكەیەكی چكۆڵەی دەكرد، دوایە بەناز و نووزەوە دەیگوت: ((نا، ئەگەر زانیت!؟)) و چاوەكانی زیاتر زەق دەكردنەوە. بابە وای دەنواند كە وەك دەقوولاێیی و ناخی ناوەوەی خۆی رامابێ، لەپڕ وەخۆ دەهاتەوە و بە روخسارێكی پڕ ئومێد و پرسەوە دەیگوت: ((بنێشت!؟)) كچە بەخۆشییەوە دەردەپەڕی و لەپە چكۆلانەكانی لێكدەدان و دەیگوت: ((نەء!)) و قاقا پێدەكەنی. ((باشە، ئەوە خۆ نەتزانی، بۆ خۆم دەیڵێم: ئاوی نە- با- تم- ك- ڕ- ی!)) و لێوەكانی وێك دێنانەوە و بۆ ئەوەش تا بزانێ بابە چ دەكا كەمێكی لێ وە دوور دەكەوتەوە. بابە بە تەواوی شاد و شەنگوڵ و خۆشحاڵ دەبوو، و بەسەر و روویەكی واوە كە گوایە هەرگیزاو هەرگیز ئەوشتەی هەر بەبیردا نەهاتووە دەیگوت: ((ئەی فیڵاۆی! ناقۆلا، هەر بە خەیاڵیشمدا نەدەهات)) و لەولاوەش دایی هەڵیدەدایەوە و دەیگوت: ((دەباشە دەی، بەسە ئیدی ورچێ، با نانەكەی بخوا! تۆش هێندەت رووداوەتە ئەو ورچەی هەر بەجارێكی بووە و منەتی كەس نازانێ. جا مەگەر خوا بۆ خۆی بزانێ رۆژ و رۆژگاری بەچی دەگا!)) بەلاّم كچە بە گفت و لفت و شێوەی قسەكانی دایی ئاشنابوو و دەیزانی ئەو قسانەی تا هیچ كوییەك بڕ ناكەن و كەس پشتیان ناگرێ. كاكی بەدزییەوە قامكی لێ رادەوەشاند و هەڕەشەی لێدەكرد، هەر بابەش بوو دیسانەوە هەڵیدەدایەوە: ((كچی منە- دەبەری دەمرم)) و دەستێكی بەسەر و سینگ و بەرۆكیدا دێنا. ئەو سەردەمی هەموو جارێ كە بابەگیان دەهاتەوە، ئەو دەچوو خۆی دەشاردەوە تا بابەگیان دادەنیشت ئەوجا بە سپایی دەهات و لە پشتەوە را بە چەچە بچكۆلانەكانی هەردووچاوی دەگرت- بابەگیان تەنانەت جارێكیشی ئاگا لە هاتنێی نەبوو! —و بەپێكەنینەوە سەری بە گوێیەوە دەناو دەیگوت: ((ئەگەر ئازای كێیە؟)) بابەگیان بە دەنگێكی رەنجاوەوە دەیگوت: ((گوڵبەهار وامەكە- دەزانم تۆی!)) و كچە لەخۆ دەبوٚوە بەپێكەنینێ... ((ئیێ یێ یێ، تێگەیشتم- مەمەدە!)) و ئینجا كچە دەیگوت: ((های بابە، چەند گێلی!)) و لە پڕمەی پێكەنینێی دەدا، و بابەگیان هەروا بەگاڵتەوە دەستی درێژ دەكرد و دەیگرت و لەسەر ئەژنۆیانی دادەنا، و ریشە زبرەكەی لەو دەموچاوە نەرمونۆڵ و شلەی هەڵدەسوی...

هەر دەگەڵ ئەم وێنەیەدا وێنەیەكی دی هەبوو، كە سەرەتاتكێی دەگەڵ وێنەكەی دیدا دەكرد و خۆی بەرەنگێكی دی دێنایە پێشێ و ئەویدیكەی دەشاردەوە و خۆی دەنواند. ئەم جارەیان وێنەكە رووبەڕوو دەهات، نەك لە دواوە: كچێكی تا بڵێی شۆخ و قەد و بالاّ رێك، گۆرەوی



نایلۆن و پێلاّوی پانییە بەرزی لەپێ. نەرم و شل و خەرامان- هەر بەو شێوەیەی كە ئەو رۆژە دیتی و هەر بەو جۆرەش كە سڵەمیەوە و رایكرد و دووركەوتەوە. وێنەی رەنگدانەوەی ئەم وێنەیەی لە تەواوی شتەكانی دەوروبەری خۆیدا دەدیت. وێنەیەكی ئەوتۆ نەبوو شتێك روونی كاتەوە، یاخود یارمەتی روونكردنەوەیەك بدات- ئەوەی كە هەبوو تاریك و نوتەك بوو. ئەو تاریكییەی كە پەردەی بەسەر تەواوی گیانیدا كێشابوو و تا دەشهات تاریكتری دەكرد. هەركە وێنەی یەكەمی لەمێشكیدا وە دەركەوتبایەوە دووەم سەری بەرز دەكردەوە، و دەستوبرد ئەویدیكەی بەلاوە دەنایەوە، و هەرچی رووناكییەكیش بایە، هەر بەهاتنێی دەبووە تاریكە شەوێكی ئەنگوستەچاو. زۆرجاران لە كاتی درێوشەكارییەدا كە پینەیەكی دەكرد سەرنجەكانی دە دنیای تاریكییەدا وێڵ دەبوون و ئەو دوو وێنانەی پێكەوە دەهاتنەوە بەر دیدەی خەیاڵ و لێی تێكەڵ دەبوون و هەردووكی پێكەوە لێك دەدروون؛ بەلاّم هەركە وە ئاگا دەهاتەوە، وێنەی یەكەمیان شوێنەوارێكی نەدەما و وندەبوو، ئەوەی دەمایەوە هەر تەنیا وێنەی دووەم بوو... ناچار سەرلەنوێ ئەوەی درووبووی هەڵیدەوەشاندەوە. دایی دەیویست بزانێ لە كوێ بووم و چیم دەكرد. هەرچەندە بۆ خۆشی دەیزانی، و چاكیشی دەزانی، چونكە چۆم هەروا پەنجا شەست هەنگاوێك لە ماڵێمەوە دوور بوو و لە پەنجەرێوە بە جوانی دیاربوو. دەگەڵ ئەو هەموو پێداگرتن و سووربوونەشیدا، چاوێكی هەر لە دەركێوە بوو، وەك چاوەڕێی یەكێكی بكا- دەغەم و ناسۆری خۆیدا ون ببوو. سەرنجەكانی بڕیبوونە نوختەیەكی زۆر دوورتر لە خۆی، بەلاّم لێوەی دیاربوو كە ئاگای لە خودی خۆی و ناخی دەروونی خۆیەتی، وەك بڵێی ((خود))ەكەی دیكەی لە خۆی جیاكردبێتەوە و لە بەرامبەری خۆی دانابێ- چرچ و لۆچی دەنێو چاوانێدا نەمابوون. هەندێ جاران راست دەبۆوە و تا كونی ژوورێ و تا پاشخانێ دەچوو —و دەگەڕایەوە و دەینالاّند. لە راستیدا قاچەكانی هۆیەك بوون مردووێكی بێ گیانیان بەرەو گۆڕێكی كە گۆڕی دایكانی هەموو دنیایە بوو رادەكێشا.

هەر گوتی و گوتییەوە، لە كوێ بووم و چیم دەكرد، هەرچەندە هەست و هۆشیشی بەلای منەوە نەبوو، بەلاّم هەر دەیپرسی؛ و منیش ساف و لوس، بە زمانی مندالاّنەی خۆم، و بەبێ ئەوەی گوێ بدەمە هیچ هەروەك چۆن راست و رەوان فێرببووم، بەبێ ئەوەی هیچ گوێ بدەمە، هەست و نەست و سۆز و حاڵ و باڵی كەس، چۆنیەتییە شوشتنێ سۆزانییە و چاوەخشت و لاجانگە

کونەکەی و قسەکانی پوورە خورشید و بردن و ناشتنیم- سەر لەبەر هەموو گێڕایەوە. دایی بەلادا هات- ماوەیەك درێژبوو تا هاتەوە سەرخۆ.

ماندوو بووم، پشت بە دیوارییەوە، خەوم لێکەوتبوو... ئەو شەوە تا ڕۆژ بۆوە هەر خەونم دیتن- خەونی شوشتنێ سۆزانییە، هەرجارەی بە جۆرێك: جاری وابوو لەسەر لادەرکەی درێژ ببوو و پوورە خورشید بوو دەیگوت: ((بڕۆن، بڕۆن، دەنا ئەو فۆتەتان بەدەموچاویدا دەدەم!)) و بێ ئەوەی سەر بڵندکا هەروا خەریکی لیفکە کێشانێ خۆی بوو... جاری وابوو خوێناوی لە لا جانگێوە فیچقەی دەکرد. یا لە سینگییەوە، ڕاست لەسەر مەمکییەوە دەهاتە دەرێ و سەری دەکرد... گوللەکەی ڕاست وەمەمکی چەپێ کەوتبوو... بەڵێ پوورە خورشید لە چەند لایەکیڕا پشتی خۆی بەستبوو و نارە ناری بوو... دوایی لە پڕ لەسەر لا دەرکەکەی هەستا و وە دوو منداڵان کەوت... ئەوە هەڵدێم بەڵام چۆن! هەموو لەشم دەلەرزێ لە ترسان و... مردووەکە لورەی دێ. دەخەوێشدا زانیم ئەو دەنگە دەنگی داییە. دەنگی دایی!؟... نەمزانی لە کوێڕا- بابەگیان خێرا پەیدابوو. گوتی: ((چت لە گیانی منداڵەکەم دەوێ؟...)) هەر سۆزانییەکە گوێی لەوەی بوو دیسانەوە چۆوە سەر لادەرکەکە و درێژ بۆوە، و دایی گوتی: ((خودا زەلیلیان کا ئینشاڵڵا، خودا زەلیلیان کا!...)) منداڵەکان کردیانەوە هەراو هۆریا... پوورە خورشید شێتگیربوو، فۆتەکەی ((پەشتەماڵ)) لەسەر لەشی سۆزانییەکەی هەڵگرت و بە هەموو توانای خۆیەوە بەسەر و چاویدادام... زریکاندم و لەخەوەکە ڕاپەڕیم... دایی لەسەرجێی دەستە و ئەژنۆ دانیشتبوو؛ و خۆی ڕادەژاند... ئارەقەم دەردابوو، دەموچاوم هەر تەڕبوو. هەر کە لە خەوەکەی ڕاپەڕیم وەك هەموو جەلان گوتی: ((بیسمیللا)) و دەستێکی دایکانەی بەنێوچەوانێدا هێنام و تەنیشتی گۆڕیم. داوێنی کراسەکەی تەڕبوو وە سەروچاوم کەوت- دۆشەگەکەش هەر تەڕبوو... دەنگی نووزەی سۆزانییە کۆتایی نە دەهات! دەستی بە برینەکەیەوە نابوو، و دەگریا، و پوورە خورشیدیش دەستی دە پرچەکانی نابوو و سابوونی لێدەخشاند و سۆزانیش وەك منداڵی نێو گەرماوێ زریکەی بوو... دایی لەولاترەوە، دەستە و ئەژنۆ دانیشتبوو و هەر خۆی ڕادەژاند... منداڵە وردتکە پڕمە پڕمی پێکەنینێیان بوو... قولی، خزمەتکاری کەلایی ڕەجەب خەریك بوو پشتێندەکەی دەکردەوە، و ئەمنییەکان بەترسەوە سەیریان دەکرد: ((چاوت لێیە وەکوێی کەوتووە... !)) هەر ئەوەیان گوت و نەگوت خوێناوەکەی کە ڕاوەستا بوو فیچقەی کردەوە؛ پوورە خورشید تورە بوو... لە حەژمەتان بەسەر و سینگ و بەرۆکی خۆیدا دەکێشا،



بەڵام چۆن!... پیاوە لادێییەکە کەرەکەی جل دەکرد و دەگریا، ژنێك کە بەلای کەرەکەدا تێدەپەڕی گوتی: ((دەك خوا زەلیلیان کا ئینشاڵڵا ئاگریان دەماڵ و منداڵی بەربێ خوایە...)) بەڵام ئەوەیان هەر بەدەنگی دایی دەچوو! هەر داییش بوو، دەوخەوەیدا کە سواری کەرێ ببوو و دەچووە سەرقەبران!

* * *

## (٨)

بولێڵی دەمەو ئێوارێی، لای بەری خۆرهەڵاتیێ، کوچە و کۆڵاّن و سەربان و بن بانی شارۆچکەکەی تێکڕا دەخۆوە پێچابوو. کێوی ((ئاربابا)) بەخۆ و بەدوو لوتکە قیتەکانی و لا پاڵە پان و پۆڕەکەیەوە دەڕەنگێکی مۆردا مەلەمەلی بوو، هەر وندەبوو و وەدەردەکەوتەوە، تا وردە وردە وای لێهات تاریکی باڵی بەسەر هەموو جێیەکیدا کێشا، و روناکایی لە ئاسۆی جوان و رازاوەی کێوی پیرسولەیمانەوە تا دەهات هەڵدەکشا و ئەو لوتکە و قەدپاڵە پاك و بێگەردانەی کە هەر دەتگوت بە شامپۆی شۆراون و بسمیل کراونەوە دە تاریکییەدا رۆدەچوون و نقووم دەبوون —و شەو دادەهات. ئەوا ئێستا شەوە و هەرچی دەر و دەشت و چیاو چۆڵ و شارو ئاوەدانییە هەمووی دەخۆوە پێچاوە و چاو بەهەرلایەکیدا دەگێڕی و دە هەر گۆشەیەك دەڕوانی، شتەکانت لێدەبنە دێو و درنج و داو و تەڵەی چنراو و زراوی مرۆڤ دەبەن.

دەگەڵ دایی لە هەیوانێ راوەستابووین، و زۆر بەگومانەوەمان لە دەوروبەری خۆمان دەڕوانی و وەك هەست بە خەتەرێکی —نەمدەزانی خەتەری چی- بکەین. دایی بە بێدەنگی و بێ هات و هاوار دەگریا و هەناسەی هەڵدەکێشان- دەوچەند رۆژانەدا هەر یەکجاری ببوو. چاوەکانی هەر دەتگوت کەندە دڵۆپن و ئاوێ دەدەڵێنن، هەمیشە هەر تەڕبوون. بەلاّم دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا تا بیتوانیبایە هەوڵی دەدا- لەبەرمە- ئارام و لەسەرخۆ و بێدەنگتر بێت.

هاتبووینەوە ژوورێ، و تازە زۆر نەبوو لە نانخواردنی ئێوارێ ببووینەوە... دوای نوێژێ خەوتنان بوو... کە لەپڕ دەنگی تەقەی چەند گوللەیەك گۆمی داوەستاوی شەوی شڵەقاند، بابە تێکڕابوو، سەر و پشتی لە شیپانەی پەنجەرەکە تەکاندنەوە و بە هەست راگرتنێکەوە، بەرە و لای دەری پەنجەرەکەوە، لەجێی خۆی چەقی. گوتی: ((پێم وایە سێ گوللە بوو!)) و دوای ماوەیەکی دی: ((دەنگی تەقەی دەمانچە بوو...)) لە دوای تەقەکان، دنیا کپ و خامۆش و بێدەنگتربوو، هەر راست وەك ئەو دەمانەی کە لەرێ پێوانانـدا یەکێك راست دەبێتەوە و لە



پێشەنگێوە دەست دەکا بە قسان و لەولاوە پۆلیس یەك دوو تەقان بە ئاسمانێدا دەکا و دەنگ و بەنگ نامێنێ و بێدەنگییەکی کش و ماتی وەك گۆڕستانێ باڵ بەسەر ئەو ناوەدا دەکێشێ.

من گوتم: ((لە ماڵێ کەلایی رەجەبی بوو...)).

دیسانەوە هەروەك ساتەکانی دوای تەقەی رێ پێوانێ، لە پڕ بێدەنگییەکە شکا. دایی کە بەبیستنی دەنگی تەقەکان شەپۆلەکانی دەروونی دەسینگیدا پەنگی خواردبۆوە، بەشڵەژاوییەوە لەجێی خۆی راپەڕێ و بەو حاڵەوە بەرەو دەرکێوەچوو، هەروەك خۆشەویستترین کەسێکی رووبەڕووی خەتەرێکی گەورە بوویێتەوە و دەهەر ساتێکیدا چاوەڕێی ئەو خەتەرە بێت- بێ لەچك و سەرپۆش! بەتایبەتیش بەو شەوەی! منیش بەبێ چاوەڕانی و بێ هیچ هۆیەك، لە جێ دەرپەڕیم. بەلاّم چاوسوورکردنەوەی بابەی لەجێی خۆمی داکوتامەوە. بابە ناراحەت بوو، لە ناراحەتیان هەر لەجێی خۆیەوە پشتی بەدیوارییەوە دابوو. گوتی: ((پشت بەخوا ئەوەندە ئابڕووی ماویشمانە، ئەویش دەبا!)) و دە مەلیحەیەوە راخوڕی گوتی: ((ئەوە بۆ وا دانیشتووی و زەق زەقم تەماشا دەکەی!))... بڕۆ بیهێنەوە ژوورێ، مەهێڵە لەوەی زیاتر ریسوابین!...))
من دەگەڵ مەلیحەیدا بەدوو پەیسەری ئەو فەرمانەیەوە چووم. ئەودەمی هێشتا دایی نەگەیبووە دەرکێ کە هات و هاواری خانمەکان بلّند بوو... دەنگی هاوار و زریکەی نا دیاریشیان هەر بێدەنگی و خامۆشی شەوەکەیان شکاندەوە و وردە وردە تا دەهات زریکە و هات و هاوارەکە روونتر دەبۆوە: ((کوشتیان، کوشتیان! بگەنێ... بگەنێ... هەی هاوار بگەنێ...!)) و ئیدی هات و هاوار و قیژە و زریکە و لەخۆدان... گەیشتبووینە داوێنی سەرگوفکەکەی، و لەوێ راوەستاین. روناکی شەوقی ئەو فانۆسەی لە ماڵێ کەلاییەوە بەرەو سەربازخانەی دەچوو، دیاربوو؛ دەنگەکان واپێدەچوون، ئەو تاریك و روونەی لە شەوقی چرایەکەوە دەهات و دەچوو، ئەوەی دەسەلّماند کە ئەو کۆمەڵ و حەشیمەتەی بەرەو سەربازخانەوە دەچن کەم نین، دەچوونە وێ، تا بە هاوارێیانەوە بێن!.

چەند رۆژێك لەمەو بەر راوچی، یەکانە بەرازێکی هەڵدەبڕن و بەرەو شاری دەڕەتێنن. یەکانە هەردەگاتێ نانەوایەکی لەبەر تەندوورێ بەشفرەی دەنگێوێ. سەربازێکیش لەبەر دەرکی قەلاّتێ لێدەدا، بەلاّم هەرچەندە سەربازەکە تفەنگیشی پێدەبێ، مۆڵەتی تەقەی پێنابێ- مۆڵەتی تەقەی دەبایە لە جەناب سەرهەنگییەوە بدرێ، کە ئەودەمی ئەو دەخەوی دوای نیوەڕۆیەیدا

پرخە دەهات- هەندێکیش دەیانگوت سەربازەکە هەر فیشەکیشی پێنەبووە- تا سەرەنجام کەریمەکاڵ لە باغی سوڵتانی- هەر ئەو حەسارەی کە دیوار بەدیواری ماڵیٚ مە و دەزگاکەی کەلاییەوە بوو- دەگەڵ یەکانەی تێك دەئاڵێن و ئاوقایە یەك دەبن: سەردەستەی ((پاڵتۆ))یەکەی لە دەستییەوە دەپێچیٚ و دەستی دە زاری یەکانەی دەنیٚ- و هەناسەی لێدەبریٚ. ماوەیەکی زۆر دەستی هەر بریندار بوو. و ئەوە خانمەکانیش دەچنە سەربازخانەی و هاواریان دەویٚ بەستووە بیانگەنیٚ! باشە ئەوە ویستیشیان بە هانایانەوە بچن و بیانگەنیٚ، تازە چیان پێدەکریٚ؟ ئەوەی لێیدابوو خۆ هەر لەویٚ رانەوەستاوە، رۆیوە و دەجەرگەی تاریکە شەوێدا خۆی دەقامیشەلێنیٚ ئەولاوەتری ماڵیٚ کەلاییەوە پەناداوە؛ خۆ سەرباز و ئەمنییەش ئەوە هەر هیچ کە پیاوی شەویٚ و بەرەنگارییە شەوانەی هەرنین... دەو نێوەیدا دایی بیٚ ئیختیار بەو سینگ و بەرۆکە رەق و تەقەی خۆیدا کێشا: ((وای، کچەکەم، وای کوڕەکەم! یا ئەبولفەزڵ، یا فاتیمە! خودایە بەرەحمی خۆت رەحمێکی بکەی!)) ئەوانەی هەموو بەدەنگێکی بەرزەوە دەگوتن، هەروەك مافی ئەوەی نەبیٚ، بۆ مردووی خۆی بگریا و بەناوی خۆیانیانەوە بانگ کات و ناچاربیٚ تەواوی شەپۆلەکانی دەروونی بەناوی یا حوسێن و یا فاتیمەوە هەڵڕێژیٚ. بەلاّم کیٚ گویٚ بداتیٚ، کوا گوێی بیستنیٚ! میرزا رەشیدی، دوو دەرگا ئەولاتری ماڵیٚ مەوە، لە مزگەوتێڕا دەهاتەوە، ئەوەی هەر بۆ دەنگوباسانیش هاتبوو هەر دەیویست سەرەپەتێکی دەستکەویٚ و شتێکی هەڵکڕێنیٚ. داییش بەپێچەوانەی خووی خۆیەوە، چونکە غەریبە بوو، دەگەڵ خەڵکی گەڕەکیٚ زۆر تێکەڵ نەدەبوو، هەروا بیٚ ئیختیار کە دەستی بەسینگییەوە نابوو بە هەناسە بڕکێوە پرسی: ((میرزا رەشید کامەیانە؟)).

میرزا رەشید ئاگای لە هیچ نەبوو و چی نەدەزانی- لە مزگەوتێڕا دەهاتەوە. هەروا کتوپڕ لە کوێڕا بزانیٚ کامەیانە! مەلیحە هەروا خۆی بەقۆڵیەوە- قۆلی دایکی- هەڵواسیبوو و رایدەکێشا، بەلاّم دەروەستی نەدەهات. دەونێوەیدا ناسرخانی پاسەوان دەگەڵ دوو سەربازاندا لە سەری کۆلاّنی ماڵیٚ پوورە فاتمێوە وەدەرکەوتن: دەو تاریکییەیدا هەر بەشێوەی رۆیشتنەکەیڕا دیاربوو کە هەوە. من بیٚ ئیختیار قیژاندم: ((پاسەوان هاتن!)).

بابە کە تا ئەودەمی ددانی بەخۆیدا گرتبوو هاتە بەردەرکیٚ، دەو تاریکییەیدا چاوێکی لە دایی مۆڕکردەوە، و و لەژێر لێوانەوە هێندیٚ شتی بە تورکی گوتن کە بێژەی ((ئابڕوو))یان لە هەموو



وشەکانی دی زەقتر تێدا دیاربوو. کۆمەڵە ژن و پیاوێك لەبەر دەرکیٚ ماڵە پوورە فاتمیٚ خڕببوونەوە، و دەمەتەقێیان بوو. سەرەنجام دایی وەدوو کێشەکێشیٚ دەستی مەلیحەی کەوت و هاتەوە ماڵیٚ.

ناسرخان و دوو پاسەوانەکەی بەخۆ و بەدەمانچەی رووتەوە بە بەردەرکیٚ مەدا رابردن و دوای سەعاتێك ریٚ و ریٚ بەکوێدا چووبوون هەربەوێدا هاتنەوە. دیاربوو پەروەندەیان ئامادەکردبوو و وردە تریاکێکیش کێشرابوو. پێم وابوو ئەگەر دایی لە ترسیٚ تانە و تەشەر و گازاندەی بابەی نەترسابا هەڵدەستا دەچوو و لە ناسرخانی دەپرسی داخوا کێهەیانە- هەروەك ئەوەی هەموو خانمەکان بە بنەچەکەوە بناسیٚ!

دیاربوو غەمەکان وردە وردە کۆن دەبوون. ئیدی تا کوتەك توندتر بێت لەبەراییدا ئازاری کەمترە. چونکە دەو دەمەیدا هەموو لەشی خۆی ئامادەی ئەو لێدانەی دەکات و ئەندامەکانی هەموو وێکڕا بە هانای ئەوجێیەوە دەچن کە لێدانەکەی وێدەکەویٚ و هەموو ئەو ئێش و ئازارانە دەگەڵ ئەو جێیەیدا بەشدەکەن کە لێدانەکەی وێکەوتووە و تەواوی لەش وا گەرم دادیٚ هەست بە ئازارەکە ناکریٚ، هەربۆیەیە برین لە سەرەتاوە نایەشیٚ و دەڵێن گەرما و گەرمە، بەلاّم با ساردبێتەوە، و هەموو ئەندامەکانی لەش بچنەوە سەر ئەنجامدانی کاروبارەکانی خۆیان و ئەوجێیە بە تەنیا جیٚ بێڵن، جا دەبینی کە ئازارەکە چەندە بە ئێش و کوشندەیە، و ئەو برینە چۆن دەستدەکا بە بروسکان و هەرچی ئازار هەیە دەبیٚ بەتەنیٚ بیکێشیٚ. داییش بەوجۆرە بوو. ئازارەکەی هێشتا دە قۆناغێکیدا نەبوو. هەموو ئەندامەکانی لەشی پێی راهاتبن تا هەریەکەیان بەتایبەتمەندی خۆی و لەلای خۆیەوە خۆڕاگرتربیٚ بەرامبەر بە ئازارەکان و ببێتە مایەی دڵدانەوە و کلاّو رۆژنەیەکی ئومێدی ئەوتۆ کە بە قوولاّیی و ناخی گیان و دەروونیدا رۆبچیٚ و ئومێدان ببۆژێنێتەوە. کانی ئازار و غەمەکانی لەنویٚ وەبنیان دابۆوە و لێواولێو بوون، گریە و زاری دایی بۆ مایەی لە دەست چووی بوو نەك لەتاوی سوودوقازانجیٚ... ژنانی گەڕەکیٚ هەمدیس هاتنەوە، و بیٚ پرس و را کەوتنەوە کۆمەك و یاریدەدانی دەرهێنانەویٚ دایی دەبنی ئەو کان و بیرەیدا.

تا دەهات ژنی دەدیش زیاتر دەبوون... ((خودایە مەرگی خۆشەویستانیان نەبینن! خودایە زگ سوتاو نەبن!)) ئەوە هەمووی نزاو پاڕانەوێ دایی بوون، ئەوە ئەو نزایانە بوون کە ژنە کورد بۆ ئەوانەیان دەکردن کە بۆ دلّدانەوێ بە هاوارێیانەوە دەهاتن.

بەلّێ غەم ئاوایە، ئەوە سروشتەکەیەتی. ئەمانە —دایی و ئەوان- هیچ کاتێك دانوویان هێندە پێکەوە نەدەکولاّ. جا بۆ ((گەورەکان)) دەیانهێشت؟ ئیدی ئەو فارس، و عەجەم، و شیعە، و ئەوان کوردی سوننی، بەلاّم ئەوێستا دایی ببووە یەکپارچە هەست و نەست: چاکەی ئەو هەموو مەردایەتی و مرۆڤایەتییەیان چۆن بداتەوە؟ بەگۆڕی بابی ئەو کەسەی کە دەلّێ سوننی سەری خەلّکی دەبڕن، ژن و منداڵ و داك و فرزەندیە نازانن، و دەگەلّماندا هەلّناکەن!

ئێوارە وەختەی رۆژی سێهەم یا چوارەم بوو- سێهەم و چوارەمی مردنێ سۆزانییە... راستییەکەی شەوبوو. بابە هەروەك جاران ئەژنۆی بەزگییەوە نوساندبوون و سەری بە هەردوو دەستانەوە بەلاشیپانێ پەنجەرەکەیەوە دابوو و سەرنجی چاوەکانیشی کە دەوچەند رۆژانەدا زیاتریان خوێن تێزابوو و سوورهەلّگەڕابوون، دە دەرکی پاشخانێ بڕیبوون و بێ ئاگایانە زاری بەش ببۆوە... کە دایی بە مەلیحەی گوت فانۆسەکە هەلّکا. ئەوە خێرە... دیاربوو بۆ وەلاّمی ئەم پرسیارە کە لە روخساری بابەیڕا خوێندبۆوە و من چاوم لێی نەبوو، بۆ زیاتر روونکردنەوێ گوتی: ((دەمەوێ سبەینێ ئەگەر حەوسەلّەم ببێ شامی کەبابێکی لێنێیم. قیمەمان نییە؛ ئێستاش درەنگە، خۆ مەلیحە بەتەنێ نانێرم- هەرچی هەبێ، هەر کچە- دەلّێم هەروا بۆ خۆم شەقاوێکی باوێم و دەگەلّ حوسێنیدا تا مالّێ پوورە گولّەندامێ بچم و هێندێك قیمە بێنم... ئەوڕۆم پێگوتووە)). بابە هیچی نەگوت. نەیگوت بۆ بەو شەوەی، سبەینێ بچۆ بیهێنە، یا شامی کەبابمان بۆچییە، یا فلاّن و فیسار- هیچی هەر نەگوت- روخساری هاواری دەکرد: ((برۆ، خۆ هەرنەبێ تاوێکم گوێ لە دەنگت دەبڕێ!)).

هاتینە حەسارێ، دیتم دایی مەسینەیەکی پڕ ئاوکرد، و گەسکی تاودایە. لە وەلاّمی واقە وڕەکەی مندا گوتی: ((ئێستا ئەوە هەر هاتووین دەچین هێندێکیش گولّی ((زمانەگا))ی بۆ دووسبەی نیوەڕۆیەش دەکەین...)) رۆیشتن —من مەسینەکەم هەلّگرت، ئەویش گەسکەکە- دەستی منیشی گرتبوو. ئەودەمی هەرگیز ئەوەم بە خەیالّدا نەدەهات و نەمدەزانی کە گولّی زمانەگایە بە شەوێ ناکرێ، و ئەگەر بشکرێ خۆ بە گەسك و مەسینە ئاوێ ناکرێ- چووزانم.



رۆیشتبین، بەلاّم لەجیاتی ئەوەی بەرەو لای قەلاّتێ میرییەوە بچین —کە دەیانگوت گولّی زمانەگای زۆر لێیە- هاتین و بە بەردەمی مالّێ پوورە فاتمێدا بەرەو مالّێ ئیمامیمان کوتا، کە دەکەوتە بەری رۆژاوای مزگەوتی گەورەوە. بەلای ئاشی و پردێدا رەتبووین و بە هەورازی تەنیشت مالّێ شێخیدا وە سەرکەوتین... ئاه، ئەودەمیم زانی- دەچینە گۆڕستانی غەریبان! دە دلّی خۆمدا گوتم رەنگە ئەوێ گولّی زمانەگای زۆرتربێ. گوتم: ((خۆ ئەوە گۆڕستانی غەریبانە)) —ئەوە قسەی خەلّکی گەڕەکێ بوو. دایی گوتی: ((دەزانم، دەزانم! لە کوێڕا دەزانی؟ ئیدی من هیچی دیم نەگوت. نەگەیبووینە گۆڕستانێ دایی فانۆسەکەی کوژاندەوە. گوتی: ((واچاکترە... کەس نەمانبینێ)).

گەیشتینە نێو گۆڕستانێ. نازانم لە کوێڕا دەزانی، یەکسەرچووە سەرگۆڕە تازەکە... خۆی بەگۆڕەکەی دادا، سینگ و بەرۆکی تێهەلّسوی، و گۆڕەکەی دە باوەشێ وەرێنا: ((عالیە گیان! هەستەوە، هەستە راستبەوە کچەکەم! ئەوە دایکت، دایکە بەدبەخت و بێ نەوایەکەت هاتووە!... دایکە چارە رەشەکەت... هەستە راستبەوە، دە هەستەوە کچەکەم! دایکە بەدبەختەکەت دەگەلّ... حوسێنی... حوسێن گیانی هاتووە! و دەبەر هەرتکانو مرم، بە قوربانی کاکەی بم... دەهەستەوە کچەکەم!)) کاری سەیر و سەمەرەی دەکردن: دادەهاتەوە، خاکی گۆڕەکەی ماچ دەکرد، کۆشی هەلّدەکرد و سینگە رووتەکەی لە عەردییەوە دەخشاند؛ دەستی دە (کێلی) گۆڕەکەی وەردێنا- بەگوێی کێلی گۆڕەکەیدا دەچرپاند. سەرەنجام خۆم پێ نەگیرا، بێ ئیختیار لەتەکیەوە دانیشتم؛ دەستم بە گریانێ کرد، و ئەویش بەلاواندنەوێ: ((هەستەپێ، هەستەپێوە کچەکەم! بابە پشتی شکاوە، بابەکەت پیر و کەنەفت بووە، دەهەستە پێ... ئەوا مەلیحەش چاوی لەڕێتە، چاوەڕوانتە کەزییەکانی بۆ بهۆنییەوە... دەك رووی ئەم دایکەت رەشبێ... هەستەوە، و تفێ لەڕووی ئەو دایکە بەدبەختەت کە، کە تۆی وا بەو جۆرە تووشی ئەم زەلکاوە کرد- هەستەوە هەستەوە، ئازیزی دایە!... وای، وای چم کرد، چم کرد!... کچەکەم ئەوە بوکێنیتە؟ دەك پیرۆزت بێ... پیرۆزت بێ... خوایە کۆرپەکانت ببینم!... کچەکەم، گەردەنم ئازادکە، گەردەنی دایکە روو رەشەکەت... کە نەیتوانی بەخانەی بەختت بسپێرێ، کە نەیتوانی لە دوای تەرمەکەتەوە سینگ و بەرۆکیت بۆ بکوتێتەوەو ئاوا بەختی رەش کردی. کە نەیتوانی لەسەر گۆڕەکەت شینت بۆ بکاو گەرمەشینت بۆ بگێڕێ... کە نەیتوانی لە شایی و زەماوەندەکەتدا هەلّسوڕێ... عالیە گیان، گەردەنم ئازاد کەو ببەخشە-

به قوربانی چاوەگەشە جوانەکانت بم- ببورە کە درەنگ هاتم... نەمزانی هەروا زوو دەچییە سەفەرێ... نەمتوانی بەڕێت کەم، نەمتوانی توێشەبەرەی ڕێیەت بۆ تێك نێم! عالیە گیان... کچێ عالیە گیان... دەهەستە ئەوە حوسێن گیان هاتووە... دە هەستەدەی بەسە کچەکەم! بڵێ... بڵێ برالە گیان بەخێرهاتییە ماڵێ خوشکەکەت!... حوسێن گیان، تۆش بڵێ... بڵێ خوشکێ... خوشکێ ماڵی تازەت پیرۆز بێ... بڵێ- دە بڵێ!...)).

ئای چم چێشت! هەرچەندە منداڵ بووم و هێشتا وەك پێویست هەستم بە غەم و ئێش و ئازاران نەدەکرد، بەو قسانەی هەر ئاورم تێبەربوو...

سەرەنجام دوای ساتەوەختێکی تەواو —کە بۆمن سەدەیەکی تەواو بوو- هەردوولای گۆڕەکەی ئاوڕشێن کرد و گەسکی دان بەدەم گەسك دان و ماڵینێشەوە هەر دەپاڕایەوە بیبەخشێ لەوەی کە درەنگ هاتووە و نەیتوانیوە لەسەر وەختدابێت و تۆوی گوڵان بە گۆڕەکەیدا بکات و بیچێنێ- دەك رووی رەش بێت... ئاگری قودرەتێیان دەگیانی کەوێ، ئەوانەی تۆیان بەو رۆژە گەیاند ((دە هەستەوە، دە هەستەوە کچەکەم، ئەوە برا بچکۆڵەکەت دەگریە... هەستەوە! هەستەوە پێی بڵێ، برا گچکەکەم مەگریە!)) و هەردەو دەمەیدا ئاوڕی دایەوە و پێی گوتم: ((مەگریە کوڕەکەم، مەگریە رۆڵە، تۆ هەقی منت نەبێ... کاکە، وای کاکە... ئاخ کاکە!)) دەگەڵ هەر وشەیەك لەو وشانەشدا لە سینگ و رانی خۆی دەدا: (( عالیە گیان، بۆ کاکەی بپاڕێوە... ئاخر تۆ پاکی... بە خودای بێگوناهی، پاکی، بێ گوناهی، بە پێغەمبەر پاکی، بەخودای هەرچی لەکەیە بەداوێنتەوە نییە، لە گوڵێ پاکتری!)) ئەوانەی هەموو بەدەنگێکی نووساو و ئاوازێکی هێدییەوە دەگوتن و سینگ و بەرۆکیشی لە عەردی دەسوی، و دەچەمییەوە و خاکەکەی ماچ دەکرد: ((لە خودای بپاڕێوە... ئەتۆ نزاکانت گیرا دەبن... تۆ هێشتا بۆنی شیری خاوت لە زاری دەهات... تۆ وەك پەڕەی گوڵێ بووی... پاك و خاوێن و بێ لەکە... بڵێ... بڵێ خوایە لە تۆم دەوێتەوە! ئاخر تۆ بۆیە چووی ئەوی رزگارکەی! کچە غەریبەکەم.

نازانم چۆن هاتینەوە ماڵێ. هەر ئەوەندەی دەزانم، کە لە هاتنەوێماندا نە ئەو هیچی گوت و نەمن. تووشی کەسیش نەبووین. هیچیشمان بە بابەی نەگوت. بەلاّم دایی پێدەچوو هێورتر بێ. ئەو شەوە باش نوست؛ پرخە پرخی ژوورەکەی پڕکرد بوو...



بەرە بەری نیوەڕۆیە بوو؛ لەکن بابەیەوە دانیشتبووم کە ئەبولفەتح خان هات. خەڵکی دەوروبەری هەمەدانێ بوو، خەفیەی ئەمنیەی بوو- هەموو کەس دەیزانی. گوایە ئەو و ئاغای زەمینی سەرۆکی ئەمنییەی دەگەڵ بابەگیانیدا هەرسێکیان خەڵکی ناوچێکن. کورتە بنەیەکی دەموچاو قلقلانەی چوکەڵە و سیسەڵە. هەر راست وەك هەنجیری چرچەڵە. سەری لەچاو دەموچاویدا گەورەتر بوو، نێوچەوانێکی بڵندی چرچ و لۆچاوی و چین چینی قوڵ، دەتگوت ئەوە وەستای گۆزەکەر دەدەمی دروستکردنێیدا کە هێشتا قوڕەکەی هەر نەرم بووە، بە نوکی قەڵەمبڕێ یا بە سەرەمیلێکی ئەوچاڵ و چینانەی تێ کردووە و ئەوجا دەکوورەیدا سووری کردۆتەوە. رەنگی روخساری بەلای سەوزێکی تێریدا دەنواند؛ چاوەکانی بە قوڵداچوو بوون، دەمارەکانی چاوی سوورهەڵگەڕابوون، خۆ ئەودەمەی مژە تریاکێکیشی لێدابا ئەوە هێندەی دیکە دەبوو. یەکپارچە سوور و دەموچاویشی سوورهەڵدەگەڕا- سوورێکی تێر- و ئەو دەمی چرچ و لۆچەکانی روخساری دەکرانەوە و چاوەکانی وایان لێدەهات واتدەزانی ئەوە لەجێیەکی دەمەو ڕوو درێژبووە و یەکێکی دیکەی زۆر قورس هاتووە و خۆی بەسەرداداوە و وەك بۆقێ کە دەمێرگێکیدا پێی لێدەنێی و هێندەی نامێنێ چاوەکانی دەرپەڕن، ئاوای چاو دەرپۆقیبوون. لەشی لەناو قەدێوە شل و پل بوو و وەك منداڵی تازە پێگرتوو دارەدارەی دەکرد و دەڕۆیی- بە قۆڵی فش و ناولەپی دەستەبەرەو دواوەکانی. واپێدەچوو شتێکی بۆ دواوە پاڵ پێوەنێ. دەستەکانی کردبوونە لەنگەری سەر و لەشی. دەگەڵ ئەوانەشدا سینگی بۆ پێشەوە و سەری بەرەو دواوەچوو بوو: هەر راست وەك بزنێکی هەستێتە سەرپاشوان و بڕوا. قژی سەری پڕو ماش و برنج ببوو و بەرەو دواوەشی دادێنا. بەزۆری کلاّو شاپۆی لەسەری دەنا.

دیاربوو هیچ کارێکی نییە. بابەگیان فەرمووی دانیشتنێی کرد تا پێلاّوەکانی بۆ بۆیاغ کا. بەلاّم ئەو گوتی نا، کاری هەیە. هەرهێندەی کە دانیشت بابەگیان بەپێچەوانەی جارانیەوە پێی گوتم، گۆزەکەی بەرم و بچم لە حەسارێ مزگەوتێ کەمێك ئاوبێنم. گۆزەکەم تاودایەوە و رۆیشتم. هەروا بەڕێوە و بەبێ هیچ مەبەستێك ئاوڕێکم دایەوە. بابەگیان و ئەبولفەتح خان سەریان پێکەوە نابوو و وەك بە نهێنی قسان بکەن وابوو. دوایی تێگەیشتم- زۆر دواتر- کە بە بابەگیانی گوتبوو ماڵێ مە لەژێر چاودێری دایە و کاکەش لە زیندانێ هەلاّتووە — ئەمەشیان لە ناوەندی ئوستانێڕا نوسیووە. کاتێ کە هاتمەوە ئەبولفەتح خان رۆیبوو، بەلاّم بابەگیان زۆر سەرقاڵ بوو. بەپێچەوانەی جارانەوە کە جاری وادەبوو لینگە پێلاّوی لەسەرکۆشی لەبیر دەچۆوە

و تێبڕا دەما، ئێستا بێ ئارام و زۆر بەپەلە، خێراخێرای دە دروی و دەڕۆیی- پێستی سەری سوورهەڵگەڕابوو.

شەوێش هەروا هەڵچوو و بێ ئارام بوو. تەنانەت یەك دووجارانیش قیت بۆوە و چووە هەیوانێ، و ماوەیەك بە سەر و رووی گرژ و خەیاڵاوییەوە کەوتە راوێچکان. دایی شێوابوو: ناکا لە کەللەی دابێ! جا ئەو پیاوە بێچارەیە چ بکا چاکە، ئاخر هەرچی غەم و تاڵی و سوێری دنیایەیە هەمووی هەر داوێتەوە هەناوی خۆی و لێوان لێك ناکاتەوە. کێوێکی غەم لەسەرشانی بوو؛ هەناوی گڕکانێك بوو کە هێشتا سەری هەڵنەدابوو؛ جەرگی هەموو تیکەتیکە ببوو؛ هەر لە ئێستاوە پشتی کووڕ ببۆوە؛ و لە لووتی درابۆوە و ناڵە و هات و هاواری داییشی هاتبووە سەرێ: وەك بوومەلەرزەیەك روویدا بێ و کێوێکی هاویشتبێتە سەرکێوێکی دی! راستە ناڵە ناڵ و بێ ئارامییە دایی وردە وردە تا دەهات کەمتر دەبۆوە —خاك، ساردە، مەیل بڕە — بەلاّم دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، هەر فرمێسك و هەناسەی سارد هەڵکێشان بوو و ئەو هەناسە و فرمێسکانەی ئێستاش زیاتر لە ڕێی کاکەیدا هەڵدەڕشتن... بەلاّم ئەو بێ ئارامییەی بابەگیانی هێندەی نەخایاند. چەند شەوێك دوای ئەمەبوو... هەموومان دانیشتبووین؛ دایی، ئارام و لەسەرخۆ سەردولکەی دەگوتن و ئێمە و مەلیحەش بەدوایدا دەمان ستاندەوە، کە تەپەی پێیەکی ئاشنا بڵندبوو... و دیسانەوە جەناب رەییس و پاسەوانەکان هاتنەوە.

ئەودەمی ((زانست و شارستانیەت)) هەموو جێیەکی نەگرتبوو: جگە لە کەسانی کەللە زل و ئۆپۆزیسیۆنی سیاسی رەزاشا بەولاوە، دەنا ئەو کەسانە زۆر کەم بوون کە بەدڵەڕاوکێو چاوەڕوانی دەستگیرکردنی شەوانە و هاتنە ماڵانی کتوپڕی مەئموورانەوە بچنە بن لێفێ. کە هیواو ئومێد بڕا، دڵەڕاوکێش نامێنێ، کەس غەمی لە دەست چوونی هیچی نەبوو... بەلاّم ماڵێ مە دەو شارە چکۆڵەیدا لە هەموو ئەو یاسا و رێسایانە جیاواز و بەدەرتر بوو. بابەگیان وەك فەنەری لەجێی خۆی راپەڕی — من و دایی و مەلیحەش هەروەتر... دەرگامان کردەوە، و دایی بۆ ئەوەی فرمێسکەکانی دیار نەبن سەرپۆشەکەی تانیوەی دەموچاوی هێنایە خوارێ... دیسانەوە، ماڵەکەیان پشکنییەوە، یان چاوێکیان بەسەر و بنی ماڵەکە داگێڕاو لامپایەکەیان تاودایە و داڵان و پاشخانەکەیان بە وردی پشکنی، و هەمدیس دەنگی ترپەی پێیەکی لەسەربانییەوە ڕاهات. جەناب رەییس لەلاشیپانێ پەنجەرەکەی ئەوجێیەی بابەگیان پشتی



وێدەدا لەوێ، دانیشت. ماوەیەك سەرتاسەری ژوورەکەی بەچاوان کێلاّ... دوایە لەپڕ چاوی بە باوڵێکی کەوت. گوتی: ((ئەو باوڵەی بکەنەوە!)) ژوورێ، پاسەوانی لێنەبوو، بابەگیان سەیرێکی دایی کرد، دایی بە ناچاری و بەدڵگرانییەوە، سنجاقی یەخەی کراسەکەی کردەوە و کلیلەکەی بەرۆکێی دایە دەست بابەگیانی، بابە باوڵەکەی لە تاقێ هێنایە خوارێ و لەبەرپێی جەناب رەییسی دانا، و قفڵەکەی کردەوە و سەری باوڵەکەی هەڵدایەوە —و بۆ خۆی کشایەوە. جەناب رەییس باوڵەکەی سوڕاند و ئەوەی تێیدابوو هەڵیڕشت و بە ژوورێی وەرکرد. هەمووی وردە شڕوشالاّتی ژنانەبوو. ((کۆنە)) مقەبایەك سەرنجی راکێشا- ئەوەی کە هەموو جارێ دایی دەیهێنا و بەسینگی خۆیەوە دەنا. مقەبایەکەی هەڵگرتەوە. هەر کە هەڵیگرتەوە دایی دوو باڵی لێکدان و هوویەکی کێشا و لە هۆش چوو. بەلاّم ئەوەندە ساتەوەختە دەهیچ مێژوویەکیدا نەنوسرا.

مەلیحە سەرقاڵی دایی بوو و منیش دەستەپاچە تێمابووم- لەوەندەی زیاتر کە جامی بەر سەماوەرەکەم پڕکرد لە ئاو و دامە مەلیحەی. وێنە بوو- مقەبایەکەی دەڵێم- وێنەی خێزانیی. جەناب رەییس ماوەیەکی دەوێنەکەیەوە راما، و دەبیر و خەیالاّنەوەچوو. و لەبەرخۆیەوە گوتی: ((ئممم)) و سەرێکی بادا —زۆر زانایانە. بەسەرو روخساریدا دیاربوو شتێکی یەکجار زۆر گرنگی دۆزیبێتەوە. دیسانەوە کەوتەوە بیرکردنەوێ، و هەروا کە وێنەکەی بەدوو ئەنگوستان گرتبوو و لەسەرئەژنۆی ئەودیو و ئەودیوی پێدەکرد دەئاسمانێوە راما. کاتێ کە وێنەکەی هەڵگرت، سەرەتا بابەگیان سپی هەڵگەڕا و دوایەش رەش داگەڕا و وای لێهات رەش و شین بۆوە و چەناگەی وەلەرزینێ کەوت و لالێوەکانی داچۆڕان و چاوەکانی سووڕان. زۆر ترسام. ئەو حاڵەتەی هەر ئەو کاتانە بەسەردا دەهات کە زۆر تووڕە دەبوو و لە پێستی خۆی دەهاتەدەرێ. دە دڵی خۆمدا گوتم، نەکا پڕداتە ئەوکێ جەناب رەییسی و هەناسەی لێ ببڕێ! گەندی کارەکەش ئەوەبوو کە ژوورەکە چ پاسەوانێکی لێنەبوو. لە دوای پشکنینی پاشخانێ پاسەوانەکەی ژوورێی ناردبووە دەرێ. دیاربوو لە راڕەوەکەیە... بەلاّم بە پێچەوانەی چاوەڕوانییە من و —مەلیحە-ش کتوپڕ چاوە سوڕاوەکانی بابەگیان پڕبوون لە فرمێسك، لێوە لەرزەی چەناگەی زیاتر بوو و دەستیکرد بە گریانێ. بە تورکی گوتی: ((تو گیانی منداڵەکانت جەناب رەییس- بۆ خاتری ئەو خودایەی. ئابڕووی خاو و خێزانمان لەم ولاّتی غەریبایەتییەیدا بپارێزە — بیکە بەخاتری هاوزێدییە خۆمان...)) و زۆر شتی دیکەی بێ سەروبەر.

فرمێسکی بابەگیانی بەپێچەوانەی فرمێسکی گەورە پیاوانەوە، دە هیچ مێژوویەکیدا نەنووسرایەوە. های، ئەوە من لە کوێم، سەرا و مێژوو کوجا مەرحەبا؟ کوتەك بوو، زەنگاڵ بوو، کلاّوی دووفاقە بوو، ئەمیری لەشکری خۆرئاوابوو، رەزاشا بوو... ئەوانە ئەگەرچی بەلای خۆیانەوە دەربڕی مێژوو بوون بەلاّم جێی نوسین و تۆمارکردن و هەڵگرتنی ئەم جۆرە رووداوانە نەبوون.

نەمزانی ئەم فرمێسك و سوکایەتییەی بابەگیانی چ کارێکیان کردە سەر مەلیحەی، بەلاّم وەك کوتکێکی هەزار تەنیم بەسەریدادەن گیان و دەروونم تێك شکان- لە خودی بابەگیانم خراپتر بەسەرهات، کاتێ کە دیتم لەژێر باری ئەو باری لێدانەگرانە دوو لاهاتەوە. تا ئەودەمی هیچم دەربارەی ((مرۆڤی رووخاو و سووکایەتی پێکراو و مرۆڤی لە کەسایەتی داماڵدراو و مرۆڤێکی گریا و بەسەرکەلاوەی کەسایەتی خۆیدا)) نەبیستبوو، و دەربارەی ((پشتی جەماوەری ژێرباری ستەم و روخساری شۆراو بە فرمێسکی شوورەیی و فرمێسکی گەرموگوڕی کەلاوەی گیان دەردی سەلماندنی حکوومەتی نەزان بەزانا، و تاڵی و سوێری و سووکایەتی و کێشانی هێڵی راست و چەپ بەسەر بیر و باوەڕو بۆچوونی راستەقینەدا لەپێناو شتی پڕو پوچ و نەزانیدا)) هیچم نەخوێندبۆوە.

بەلاّم هەر بەوەندە تێکشکان و سووکایەتی پێکردن و ئەوەندە فرمێسکانەی بابەگیانی مێژووی هەزاران دەرد و ئێش و ئازار و غەمی جەرگ بڕم تاقیکردنەوە. هەرئەوەندە فرمێسك و سەرنجە پڕ لە سووکایەتییەو ئەوەندە پاڕانەوەی بابەگیانی دەریایەك تاڵی و سوێری و نەفرەتیان دە دڵ و دەرونیدا خرۆشاندم. ئێستاش بەڕوونی، نازانم هەستی چیم کرد، ئەوەندە نەبێ کە بەراستی هەستێکی سەیری ئەوتۆ بوو، کە ناتوانم چ ناوێکی لێ بنێم، ئاخر ئەو بابەی کە لەبەرچاوی من لە پیاوی هەموو دنیایە ئازاو بە جەرگ و بەتواناتر بوو، رووخاو تێکشکاوم دەبینی: پشتی پاڵەوانەکەم لە عەردی درابوو.

نازانم چ بوو کە رەنگی روخساری جەناب رەییسیش گۆڕا: پەڵەیەکی سپی بەسەر روومەتەکانیدا هات و بلاّوبۆوە- سوکە هەناسێکی لە سەرخۆی لە سینەی هاتەدەرێ. وێنەکەی بەرامبەر بەخۆی راگرت و ماوەیەك تێیڕاما. دوایە سەیرێکی دایی کرد کە بێهۆش و گۆش لەوێ کەوتبوو. وەلاّمی بابەگیانی نەدایەوە. ماوەیەك هەروا بە روخسارێکی غەماوییەوە دە دایی‌ەوەی روانی، ئەوجا گوتی: ((خانم... خانم... بەخۆڕایی خۆتان ناراحەت مەکەن... هیچ ناراحەت مەبن... هەستە



دانیشە، کوڕەکەتان بەرهەڵدابووە... بەو زووانە دێتەوە..!)) هەر کە ئەوەی گوت دایی جوولاّ؛ لەسەرئەژنۆیان دانیشت. بێ ئەوەی پاژنە پێیان وەبن خۆ داتەوە. دەستەکانی لەپێشەوە پان راکردن و بردنیە پێشێ، بە واقێکی وڕەوە، هەروەك ئەوەی بە خەیاڵ، هاتنەوەی کوڕەکەی ببینێ و بیەوێ دە ئامێزێی گرێ.

جەناب رەییس گوتی: ((بۆ نەتزانیوە کوڕەکەت بەرهەڵدابووە؟ من پێم وابوو ئێستا هاتۆتەوەش!)) دایی وەك لە دنیای خەیاڵەوە بەخۆ بێتەوە. دەستی دە کەلەکێ نا، گێژو وێژ، هەروەك چۆن دانیشتبوو گوتی: ((راستدەکەی! بە قوربانی دەمت بم! خودا لەزارت بڕوانێ! خودایە بە گەردی پێت بم... خوا منداڵەکانت لێنەستێنێ! خودایە مژدەی بووك و زاوایەتییەیان ببیەی!)) و هەستایە سەرچیچکان و دانیشت. جەناب رەییس، بەسەر قاڵییەکەوە، بەلاّم کەمتەرخەمانە، وێنەکەی فرێدایەوە سەر شڕ و شالاّتەکان، و بە پۆزێکەوە، وەك دەگەڵە خۆی بێ، زۆر بەسپاییەوە گوتی: ((ئیدی ئەمەی نەبینمەوە!)) و هەستا، و رۆیی. ئێمە هەموو کز و مات و مەلوول لەجێیخۆمان نەبزووتین و کەسی دەگەڵ نەچوو بەڕێیکا. ئەو شەوە بابەگیانی نەبرد؛ هەموو شاد و خۆشحاڵ بووین، وەك دنیایان دابینێ... بەلاّم نا... دیسانەوە لە دەرکێیان دایەوە. پاسەوان بوو!... هەموو شڵەژاین... بەلاّم هەمدیس نا، پاسەوانەکە گوتی جەناب رەییس دەفەرموون سبەینێ سەرێکی لە دایەرەی بدا- یانی بابەگیان — و بیبینێ، یانی جەناب رەییس بیبینێ. ئای بەچاوان... دایی دوای رۆیشتنێ جەناب رەییسیش وێنەکەی بە ئێمە هەر پێشان نەدا. چوو لە جێیەکی دیکەی شاردەوە و تاماوەیەکی زۆریش هەر نەمدیتەوە.

بەیانی دەگەڵ بابەگیانیدا چووم. کەس رێگر نەبوو. بۆیە چووم تا ئەگەر خوا نەخواستە پێشهاتێك بۆ بابەگیانی هاتە پێشێ، من بێمەوە و هەواڵیان دەمێ، تادایی دڵەخوتەی نەمێنێ- یاخوا نەکردە توشی دڵەڕاوکێ بێ. لە پلیکانان وەسەرکەوتین و چووینە بەر دەرکی ژوورێ رەییسی. پاسەوانی بەردەرکێ هەواڵی دایە جەناب رەییسی. رێیاندایین. بابەگیان بەدەم چوونە ژوورێیەوە، دەستێکی بۆ دواوە هەڵتەکاند، یانی تۆ مەیە؛ و بۆ خۆی چووە ژوورێ. لایەکی دەرکەکەی کرابۆوە. ئیکلامی کێشا. قسەکانم پچڕ پچڕ دەبیستن: باسی کاکەی بوو: کەی دیویەتی؟ لەکەیەوە نەیدیوە؟ -بابەگیان سوێند و قورئانی دەخوارد، دەگریا — کە هەر نەیدیوە و هیچ کاتێ لەوەتەی گیراوە نەیدیوەتەوە. سەر و رووی جەناب رەییسی گرژ و مۆن بوو. هێندێ شتی دیکەی گوتن کە

پاسەوانەکە ڕێی بیستنێی نەدەدا- نە لەبەرئەوەی پاسەوانە بە ئەنقەست نەیەڵێ، من هەر بۆ خۆم دەترسام لە دەرکێ وەنێزیك کەوم ((... ئەویان لەم دەوروبەرانە دیوە... هەواڵیان داوە... خانمەکانیش گوتوویانە کە یەکتریان ناسیوە... دواییش ئەم وێنەیە...)) بابەگیان هەر خەریکی سوێند خواردنێ خۆی بوو، بە قورئان و بە جوققەی عالی حەزرەت، و بەسەری جەناب رەییس و بە ئیمام حوسێن، کە نەیدیوە و تا ئێستا ئەو خانمەشی هەرنەدیوە، و ئامادەشە روو بە قیبلە سوێندێ بخوا.

جەناب رەییس گوتی: ((دەڵێن ژنەکەتیان لە گۆڕستانی غەریباندا دیوە...)) بابەگیان گوتی: ((جەناب رەییس ئەوەی بۆ خۆتان دەزانن کە لە وڵاتیدا هەروا باوە کە ژنان هەفتەی جارێك دەچنە سەرقەبران و سەر و فاتیحایەکی بۆ مردووەکانیان دەخوێنن و دەڵێن خێرە...)) جەناب رەییس گوتی: ((شەوێ دوای کوشتنێ ئەو خانمەی ئەویان لە قەراغ چۆمیدا دیوە... هەواڵیان داوە... کە هەر لەو جێیەشیان دیوە کە تەرمەکەیان لێ شوشتووە)).

دەوەرە دەی، تۆمەلێ... ئەوشەوە بۆیە دەلینگ و داو و تەژگەلێ دایی وا تەڕبوون! تومەز بەرەبەری بەیانی چۆتە دەرێ و لە رووبارێیداوە- و چووە جێ شوشتنێ تەرمی کچەکەی ببینێ! وای لەدەست ئەو دایکەی، چ هەستێکی هەیە!... هاتینەوە ماڵێ — نەچووینە دوکانێ. بابەگیان بەو یەك دوو رۆژانە وەك سەرنجم لێدەدا و ئێستا دەزانم پشتی کوورِ ببۆوە: چاکەتەکەی بەری پێوەی هەراش ببۆوە؛ شانەکانی داچەکیبوون، هەروەك کوتەکێکی توندیان لەسەری دابێ؛ گەڵاوگەڵ دەڕۆیی — پیربوو. بەدەم ڕێوە بە دەنگێکی زۆر نەرم و نیان و میهرەبانەوە، بەڵام تاڵ و غەمناکەوە، گوتی: ((حوسێن، تۆ ئیدی، بەداخەوە، گەورە بووی؛ ئەوەی کە نەدەبوو بیزانی بەداخەوە دەیزانی... من نامەوێ لەوەی زیاترت پێ بڵێم کە بۆ خۆت بیستووتە و دیتووتە — بەڵام هەوڵدە، ئەگەر هەر شتێکی دیکەشت زانی، یا دوایە بۆت دەرکەوت و زانیت، هەوڵدە ئەو نهێنیانەی ماڵێ لەلای هیچ کەسێکی نەدرکێنی)). ئەوەی بە جۆرێکی واگوتن، خۆ ئەگەر سەری براویشی هێنابایەوە ماڵێ، و ئەنجن ئەنجنیشیان کردبام شتێکم لەدەمی نەدەترازا و لە زمانم نەدەهاتەدەرێ، خۆ ئەوەشی نەگوتبایە هەر وابووم و نهێنی ماڵێم قەت نەدەدرکاند. ئێستا بە پێچەوانەی سەردەمی منداڵیەوە بوو، کە هەمووی هەر دڵ ساغی و خۆشی و سادە و ساکارییە و هیچ شتێکی شاراوەی تێدانییە، ژیانی ئێمە تائێستا هەمووی هەر نهێنی و نهێنکاری بوو-



بەلانی کەمەوە، ئەوەم هەست کردبوو، و هەڵسوکەوتی بابەگیان و دایی و مەلیحەی، بەبێ ئەوەی هەست پێبکەم، ئەو هەستانەیان دە دڵ و مێشك و بیر و هۆشمدا ئاخنیبوو و جێی خۆیان گرتبوو. غەمەکە هەر تەنیا ئەوەنەبوو — کە هیچ نەدرکێنم، بەڵکە دەبوو دەگەڵ دەوروبەرەکەدا بڕۆم و هەنگاو بنێم: حاڵ و باڵی منداڵانی هاو ساڵ و تەمەنی من زۆر لە ئی من خراپتر بوو. ئەوان جانەوەرێك بوون هەمیشە چاوەڕێی تەلەزگە و مەترسییان بوون...

بەو قسانەی بابەگیان، و ئەو هەموو پێشهاتانە، هەر ئەوەندەم بەخۆزانی گەورە بووم... هەروا بەو جۆرە! بەدبەختییەکەش لەوەدا بوو کە جاران مەسەلەکانم بەدزییەوە دەزانین و تێیدەگەیشتم و بۆ ئەو مەسەلانەشم زیاتر پشت بە گومانەکانی خۆم و هەست و نەستەکانی دایی دەبەست- ئاخر کاتێ کە دایی خەیاڵ دەیبردەوە دەیتوانی کچ یا کوڕە مردووە سەد ساڵەکەی لە گۆڕێدا ببینێ و لە هەر کوژراو و مردوێکی دیکەڕا کوشتە و مردووی خۆی زیندووکاتەوە و بە هەموانیشی بسەلمێنێ. هەموو هەوڵەکانی من هەر ئەوەبوون —و لە خودام دەویست، بە جۆرێکی وا بشکێتەوە و بارودۆخێکی وا بێتە پێشێ و سەرهەڵدا، کە پێچەوانەی هەموو ئەو گومان و خەیاڵاتانە لە خەڵکی دیکە ببیەمەوە... ئەوە ئێستا ئاوا! ئێستا نەختێك شارەزای پەیوەندییەکانم، ئەو بەسەرهاتانە هەر تەنیا بیریان جەنجاڵ نەکردبووم — بەڵکە مەسەلەکان لە دەوروبەر و لە پشتەوە و لەبەردەمم و لە هەموو جێیەکی دیکەدا هەر هەبوون: لە هەر کوێیەکی بام، یا نەبام. ئیدی ئەوە لەبەرچاوان و لەهەر سەرنج و بەسەر هەموو دەموزارانەوە و دەهەر فسکەفسکێکیدا — و دە هەر وتەیەکی کرچ و کاڵدا هەر ئەو باسە بوو. تیلەچاوی منداڵان خەنجەرێك بوو دە دڵیان رادەکردم؛ سەرنجەکانیان درێوشەیەك بوو دەمێشکیان دەچەقاندم، و قسە و وتەکانیان کوتکێك بوون لەسەریان دەدام؛ هەواڵپرسینێ ژنان لە دایی شیشەیەکی سوورەوە کراو بوو دە چاویان رادەکردم. رووم لە هەرلایەکی کردبایە، ئەوە بە دوامەوە بوو، لە دوامەوە بوو... تەنانەت منداڵێکیان گوتی کە خوشکم... واای، ئیدی لە ماڵێ نایەمە دەرێ... هەرچەندە ئوتومبێلی بارییش هاتبوو چونکە کوڕەکەی کاك سلێمانی تێدا بوو لە ماڵێ نەهاتمە دەرێ.

❊ ❊ ❊

## (٩)

خۆرەتاو لەسەرەخۆ بڵند ببوو و شەوی لە شارۆچکەی رەتاندبوو؛ سەرێکی لە گۆڕستانی غەریبانیش خوارکردبۆوە و تەپەی ((کۆنەبانە))شی روناك کردبۆوە: شار لە خەوێ هەستابوو. روبار بە خوڕەوە زەمانەی بەڕێدەکردو زەمانەش هەروا دەڕۆیی و نەدەگەڕایەوە، و حەسرەتەکانی بەشێوەی شنەبایەکی نەرم کە دەگەڵ هەموو حەزو ئارەزوو و حەسرەتە بەهێزەکانی دیکەدا شان بەشان دەهاتەوە، پفێکی بەسەروچاوی خۆردا دەکرد و هەموو ئەو دەنکە شەونمانەی سەر رووی گژوگیای دەسڕینەوە کە ئێوارێ لەتاو ئاوابوونی خۆری دەمەو ئێوارە هەڵوەریبوون. خۆر تا دەهات وردە وردە ناڵە و هات و هاواری روبارێی کپ دەکردەوە و مووی لەشی ولاغە بەرزە بێ خاوەنەکانی خاو دەکردەوە کە لە شەوێوە لەسەرمان گرژ ببوو و خەوی سبەینەی لەلاخۆش دەکردنەوە. هەر لە بەیانی زووەوە باڵندەکان هێلانەکانیان بەجێ هێشتبوو و جرِ و جانەوەرەکانیش روویان دەکون و کە لەبەران کردبۆوە و خڕببوونەوە پەناو پەسیوان. سەرنجەکانی ئاسمانێ راوەستانیان نەبوو؛ ئیدی ئەو خۆرەتاوە چ جێیەك نەمابوو دەخۆیەوە نەپێچێ.

هەر کە چاوم هەڵێنا کێوی ئاربابا، هەروەك خۆی بە هەردوو لوتکەی جوان و ناوچەوانێکی پانکەڵەوە بەروومدا خەنییەوە و وەك هەمیشە پێشوازی کردم. پەنجەرەی ژوورەکەم رێك بەرامبەر کێوەکەیە، من لەو کێوەوە هەموو دنیا دەبینم. دەگەڵ نەخشەی سروشتی ئێرانێدا زۆر وێکدەچن: نێوان هەردوو لوتکەکانی دەریای خەزەرە —ئاسمانە- و خودی کێوەکە هەر راست دەڵێی پشیلەی خۆ گرمۆڵە کردووە، بەخۆ و پێستی سەوز باوی خۆڵەمێشی رەنگییەوە، هەموو ئەو دەمارە تێر رەنگە سەوزانەیەوە —کە هەمووی رەزە ترێیە: لە چەپ و راستیشیەوە ئەوە هەردوو کێوی پابۆس و پیر سلێمانە- کە یەکیان گوڵستان و ئەویدیان کوێستانە. دوو تاکە



درەختی نێوان هەردوو گوێی پشیلێش —کە من بە لوتکەم ناو هێناون- کە هەر لەو کاتەوەی من وەبیرم دێ و چەندین ساڵ پێشتریش وەك نیشانەی سەرکەوتنێ ئەو کێوەی خۆیان بە خەڵکی پێشانداوە، چونکە هەڵکەوتی کێوەکە یەك بن و دوو لوتکەیە و بۆتە نیشانەی سەرکەوتنێ، کە ئەو دوو لوتکەیەش رێك هەردەڵێی دوو گوڵێنگەن و کیژی شەیتانی سروشت بۆ گاڵتە و بۆ قوماربازییە بە سەری پشیلەکێیەوە کردوون.

دوێنێ ئێوارێ گەیمەوە جێ؛ هەر کە تاقیکردنەوە تەواو بوو، لەسەر ئەنجامەکان رانەوەستام، هاتمەوە دیارە سەرقافڵەچی کاروانی زانین و زانستی شارۆچکەکەمانم. لە نێوەندی ئوستانێدا دەخوێنم. بەلاّم وەك زۆر شتی دیکەی دەگمەنی، لەبەرچاوی هاوشاریاندا، چ کایە و مایەیەکم نییە. چونکە لە رواڵەتدا وەك ئەندامێکی کە لە لەشی شاری دابڕابێ و لەجێیەکی دی نشونما بکات وابووم: شار بەردەوامی ژیانی تایبەتی خۆیەتی و من رێیەکی دیکەم گرتۆتە بەر. دوێنێ هەر ئەوەندەم پێکرا سەرێکی لە نەنکم هەڵێنم و هەواڵێکی بپرسم، و ئەوجا وەحەسێم. چونکە لە پێرێوە بەڕێوەم و ئەو دە (١٠) فرسەخ رێیەی دوایيم بە یازدە (١١) سەعاتان بڕیوە و هاتوومەوە!

داپیرە زۆر بە کەیف نەبوو. هەرچەندە کە چاوی بە من کەوت هەموو غەمێکی لە بیرچۆوە، دەگەڵ ئەوەشدا هەرمات دیار بوو. هەروەك جاران نەك لە بەرخۆی بەڵکە لەبەر خەڵکی دی، هەموو هیوا و ئاوات و خۆزگەی لە خودای ئەوەبوو کە من زوو ژنێ بێنم و منداڵەکانم بە چاوی خۆی ببینێ و ئەودەمی خودا رەحمی پێبکا و لەبن دوو تاشە بەردانی وەشێرن. بۆخۆی دەژیا و غەمی ئیدیکەی دەخوارد. هەندێ خانووی بەرامبەر ماڵەکەی خۆی پێشاندام. کە بە پەنا گردەکەی قەلاّی میرییەوە نوسابوون، کە دەکەوتنە قەراغ رێیە و دەزگای کەلایی رەجەب بوو. تازە لەوێرا هاتبۆوە: و هێندێك شتی دەربارەی کوشتنێ سۆزانییەکی باسکرد کە چەند شەو لەمەوپێش لەوێ کوژرابوو. هەر بەو روخسار و دەنگ و ئاوازەی کە هەمیشە هاوغەمی و هاودەمی لێوەوە دیاربوو گوتی: ((پیاوە پینەدۆزە... عەجەمە... خەڵکی ئەولای هەمەدانێیە)) و هەروا بەسەری ئاماژەی ((ئەولا))ی کرد کە گوایا لە جوگرافیای مێشکی ویدا ((ئەولای هەمەدانێ)) دەکەوێتە ئەوجێیەی ئەو ئاماژەی بۆ دەکا.

((... ئیدی نازانم چۆن بوو... ئەوە خودا بۆ خۆی دەزانێ- نەکەی ئەوەی بە کەس بڵێی، ئابڕووم ببەی ها!)). لەو دەمییەوە کە منداڵبووم و تا ئێستا ئەو ئامۆژگاری و راسپاردانەی هەر لەبیرەو لە بیریشی نەچۆتەوە کە: بە کەس نەڵێم، و ئابڕووی نەبەم؛ دەگەڵ ئەوەشدا کە هێشتا هیچی نەگوتووە کە پێی بڵێن قسە. کە دەزانێ سەرسامم و پێدەکەنم دەڵێ: ((ئەی رووڕەش، هەروەك منداڵییەت — خەریکی گاڵتە بازاڕییەی... باشە... باوابێ، گاڵتەت لێبێ... خودا سەلامەتت کا. راستدەکەی تازە ئیدی ئێمەش پیر بووینە)). تاوێك راوەستا و دوایە هەر بەدەم قسانەوە گوتی: ((بەڵێ، خەریکبووم بڵێم...)) و ئەوە هەروا بە تاسەوەش تێم هەڵدەڕوانێتەوە و دەڵێ: ((ماشەڵڵا زۆرت هەڵداوە... ماشەڵڵا ماشەڵڵا! هەر راست وەك دایکە بێنەوایەکەت — چەند خاك لەسەر گۆڕەکەی ویە هێندە تەمەنی تۆ بێ ئینشاڵڵا)). هەرچەندە وەك دەبیسمەوە، هێندە بەدایکم ناچمەوە.

وەبیرم هێنایەوە: ((نەنە، خەریك بووی بڵێی...)).

داپیرە گوتی: ((بەڵێ، خەریك بووم بڵێم. بەڵێ خوا بۆخۆی دەزانێ — پاربوو پێرار بوو هاتنە ئێرە —ماڵێکی تا بڵێی باش و بێەوەی و بە حەیا و نامووسن... ئەوە پێت دەڵێم لەکن کەس قسان نەکەی ها!)).

ماوەیەك چاوەڕێمام؛ دیاربوو ئەو ئامۆژگاری و راسپاردانەی ئەو دەیکردن بێ جێ دیاربوون، چونکە ئەو قسانەم لەهەرجێیەك و لەلای هەر کەسێك کردبان چ زیانێکیان نەبوو و نەنگ و شوورەییش نەبوون، بێ وەیی و بە حەیا و ناموسی، نەك هەر نەنگ و شوورەیی نین، بەڵکە زۆر چاکیشن. گوتم: ((نەنە، گوتت بە کەس نەڵێم- باشە، چ بەکەس نەڵێم؟)).

گوتی: ((ئا، وەبیرم هاتەوە، دەمویست بڵێم، لەبیرم چۆوە... ئیدی پیر بوویمە، چ هۆش و گۆش و ئاگایەکی وام لەخۆ نەماوە- خۆ ئەتۆش ماشەڵڵا ئێستاش هەروەك منداڵییە گاڵتەت بەشتان دێ- بۆ دەهێڵی!؟)).

دوای تاوێك سەرنجە لێلێ و پێڵە ئالۆزەکانی رەشێنە و سپێنەی چاوە خۆڵەمێشییە زەردباوەکانی دەسەر و چاوی بڕیمەوە. ئینجا گوتی: ((بەڵێ... خەریکبووم چ بڵێم؟)).

گوتم: ((دەتویست شتێکی دەربارەی پینەدۆزی بەرامبەرتانەوە بڵێی)).



گوتی: ((ئا... بەڵێ؛ بەڵێ وەبیرم هاتەوە... کچەیان کەوتە دوای دەزگای ئەو کەلاییە و چەند شەوێك لەمەوپێش —کوشتیان- دیارە بۆ خۆیان وانالێن... بەلاّم ئیدی، ئەوەی هەیە وا دەڵێ... دەشڵێن برایەکەی خۆی بووە، هاتووەو کوشتوویەتی... لەگریە و هات و هاواری دایکەکەش را هەروا پێدەچێ... دیارە بۆ خۆشی هەروا نالێ، بەلاّم بەو گریان و لە خۆدانەیڕا دیارە، کە شیوەنی کەربەلاش وانییە. تائێستا چەند جارێکیشیان ماڵ پشکنیون. پیاوەکەیانیان دوو سێ جاران بردۆتە دایەرەی سەرایە —کاکە سەلیم بۆتە کەفیلی.. لەکن کەس قسان نەکەی ها- گوناهن- خاوەن ئابڕوون... تازە خوا بۆخۆی دەزانێ- خەڵکی هەموو شتێکی دەڵێن... خوا هەڵناگرێ، کچی عازەبیان هەیە...)).

لە قسەکانی داپیرەیڕا دیاربوو سۆزانییەك کوژراوە و گوایە بە رێکەوت ماڵ و خێزانەکەشیان هەموو لێرەن... قامووسە ئینگلیزیەکەی دەبن هەنگڵێ دەنێم و دێمە بازاڕی — بۆ خۆ بادانێ، بەرواڵەتێکی واوە دێم گوایە بێ ئەو قامووسەی چم پێناکرێ. هەر راست وەك دەروێش مستەفای کە بەبێ ئەو گۆسکە شەربەتەی بە پەتێکییەوە بەملی خۆیدا دەکرد. لە دوکانی کوتاڵ فرۆشییە مێردی پوورەکەم دادەنیشم، هەرتاوە نا تاوێك قامووسەکەی لێك دەکەمەوەو چەند لاپەرێکان بێرەو بەوێدا هەڵدەدەمەوەو بەرێکەوت جێیەکی دەبینمەوە و زۆر بەوردی دەیروانمێ. دەو دەمانەشدا بەدزییەوە، ئاگام لەسەرنجە حەسرەتە و مەندەکانیشە.

هەر راست وەك ئەو ژنە مازوو فرۆشانەی کە چارۆکە مازووەکانیان لەبەردەمی خۆیاندا لێك بلاّو دەکەنەوە و جارجارە هەڵگێڕو داگێڕیان دەکەن و کاڵ و کرچیان لێ هەڵداوێرن و لەکن کڕیارانیان خۆشەویست دەکەن. بەلاّم بەپێچەوانەی وانەوە کەلوپەلەکەی من بێ کڕیارە...

بەقسەی سەردەمی خۆمان بێ، هێڵی ئاسن و تۆڕی رێگەوبانی پان و پۆڕی مێشك و ژیانی خەڵکی هێشتا وەدی نەهاتوون و وەك دیاریشە هیچ کاتێکیش وەدی نایە. تەنانەت گۆڕانی سەرخانی خەڵکەکەش هیچی دیارنییە و هەستێکی پێناکرێ: دەتوانی هەمیشە ئەو خەڵکەی لە یەك بارودۆخی راوەستاو و وەك خۆیدا بێنییە بەرچاوان، وەك قەل و بزن، و رێویان؛ ساڵێ رەبەق لە دەستە جلێکی بەولاوەتریان دەبەردا نییە و ساڵێ دوازدەی مانگێ هەرئەوەیە. ئەگەر پاڵتۆبێ، ئەوە زستان و هاوینی بۆ نییە و بەرگی شین و شاییانیشە. هەموو دە چڵکێدا رەق هەلاّتوون، سەرو ریش هاتوو دەڵێی دەروێشن، و وەك پارەی کۆن، هەموو سواونەوە. هێشتا

هەوڵ و تەقەلا و ماندووبوون و بگرەو بەردەی ژیانی ڕۆژانە بیرو هۆش و هەست و نەستی نەتەنیون. جاڵجاڵۆکەی شارستانیەت هێشتا بەرێوەیە. نەك خۆی، بەڵکە ئێ ڕۆژێك لە ڕۆژان نیشانەکانی بگەنە جێ و خەڵکی دەتانوپۆیە باریکەکانی خۆیەوە بپێچێ. شەوانی ژیان و شەوانی خۆشییان هێشتا هەروەکو خۆی لەسەر شینگ و تاقەتە و وەك خۆیان ماونەوە. لێرە بەپێچەوانەی شوێنانی دیکەوە، خەڵکی هەر بەلاوەتی لەبەر ناسکیەیان سیس دەبن و دەژاکێن، و بە پێچەوانەی ئەو درەختە شلکانەوەی کە لەبەر چڕوپڕیە دارستانێ و نەبوونی روناکییە و جێ تەنگییە وشکەڵ دەبن. بەڵام ئەو خەڵکە دەگەڵ لێك دووری و ئەو هوو نێوانەی نێوانیشیاندا، هەمیشە هەردەگەڵ یەکن: لە پرسە و سەرەخۆشییە و مەرگ و ژینێدا، لە نوێژێ، و لە نەبوونی و قات و قڕی و پەتاو نەخۆشیاندا. لە ڕۆژانی لێقەومانێدا ئەو تانوپۆیە نادیارانە هەموو سەرهەڵدەدەنەوە و وێکڕا خۆ لێك دەبەستنەوە و پاڵ وێك دەدەنەوە. بەڵام دەگەڵ ئەو هەموو رشتە و تانوپۆی پەیوەندییە هاوبەشە نادیارانەشدا، لە بن هەرکون و کەلەبەرێکی بێدەنگ و ئارامدا، چەندین سوپای چکۆڵە و نادیار و ون بەردەوام دەبگرەو بەردە و شەڕێدان: پینەدۆز، دەگەڵ پینەدۆزی هاوسێی، بە قەقاڵ دەگەڵ بەقەاڵی تەنیشتی، و کوتاڵ فرۆش دەگەڵ کوتاڵ فرۆشێکی دیدا، جولەکە دەگەڵ هەمووان و هەمووش دەگەڵ جولەکاندا، و سەرەنجام دەوڵەت بەبێ جیاوازی دەگەڵ هەمووانی شەڕە. هەرپێیان وایە کە بەتایبەتی بۆ ئەوە دروستبوون کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ورگی یەکتری بدڕن. هەموو پێکەوە دەهەرایەکی نادیاردان. لەراستیشدا ماڵ و خێزان بنکەیەکی حەسانەوەی چەند ساتێکن کە تێیاندا بێنەوە سەرخۆ و ئەوجا سەرلەنوێ بێنەوە مەیدانێ تا بکوژن و بشکوژرێنەوە. بەڵام ئەم زۆرانبازییە هێشتا لاوازترین شێوەی زۆرانبازی بوو؛ هێشتا ژیانی نێو دارستانێ گورگان هێندە برسی نەببوو وای لێبێ هەر یەکێکیان ساتێکی بکا و یا وەنەوزێکی بدا هەمووی بگەنە سەرێ و پەلاماری دەن و ونجڕونجڕی کەن. تەنیا گورگێك کە خۆی لە بۆسە داوە دەوڵەتە، کە هێندە دڕندەیە بەزەیی بەکەسدا نایەتەوە. هەموو لە هەموو لەو گورگەی تۆقیون و هەر راست وەك ئەو مەڕانەی دەدەمی هێرشی گورگاندا سەر دە دووی یەك دەنێن و خڕ دەبنەوە سەریەك و هەر کە چاویان وێکەوتن نەترەیان دەچێ و چاوانیان لێ دەنوقێنن تا سەرو قەپۆزی ئەودێوی مەرگانە نەبینن. نەك لە چاوانیانەوە ئەو نهێنییانەی دەروونیان بۆ ئەو گورگانە ئاشکرا بن.



نابێ دە چاوەکانی توغرول و پەخشدارییەوە رامێنن، نەکا پڕیشکە ئاگرێکیان لێوە بپەڕێ و چەند ئاواڵێکان بکاتە قەرەبرووت. هەر کە چاویان بەسەرهەنگی دەکەوێ، دە دەرفەتێکی زۆر خێرادا، خۆ پەنا دەدەن و خۆ دەشێرنەوە، نەکا بە قامچییە رەشێ دەستی، شان و ملیان داغان کا. هەر کە قایمقامیش دەبینن هەروەتر، یا ڕێیەکان دەگۆڕن، یا سەریان بەر دەدەنەوە و فیزماڵکی دەدەنێ، تا نەبینرێن- بەکورتی یانی ((دەوڵەت)) نەیانبینێ و دەوڵەت نەبینن...

ئەوە ژیانەکەیە، هەر واشبووە، و هەر واشدەبێ، تەنیا ئەوەندە نەبێ کە ناوەکان و هەوراز و نشێو و راست و چەوتی سەرسمدانەکان و ئینجا کەوتن و هەستانەوەکان نەبن کە دەگۆڕێن دەنا هیچی دی، ئەم جۆرە ژیانە، یانی هەر لە بەیانییەوە هەستان و وە دووی کاری تۆ پیادە و ئەو سوارکەوتن و لە هەموو خۆشییەکی دنیایە دوور و لەبەرچاوان ون، ئیدی مرۆڤ بە هەموو شتێکی رادێ، هەروەك دەشڵێن هەموو کەس ئافەریدەی خوو و خدەی خۆی و کەسانی دییە. هەر بەو جۆرە وەك مرۆڤ بەسەرهاتەکانی ڕۆژانە هیچ و هیچ شتێکیان نەبینێ و نەبیسێ و تێنەگا — دەگەڵ ئەوەشدا کە هەم دەبینێ و هەم دەبیسێ، و هەم تێشدەگا. کەچی هەموو شتێك هەر بەهەمان شێوەی دوێنێ و پێرێ دەبیسێ و دەبینێتەوە- و هەر بەهەمان شێوەی پێشووشی تێدەگاتەوە... و ئەو شتانەش هەمووی لە سەرەنجامی دووبارە بوونەوەی وێنەکانەوە دەبنە خدەو خوو و عادەت. ئەبولفەتح خان بە بازاڕیدا دێتەخوارێ؛ گۆشتی دەکڕێ، پارەی نادا، چای دەکڕێ، هەمدیس هەر پارەی نادا؛ جگەرەی دەکڕێ... بەستەنییە دەخوا... لە راستیدا هیچ شتێکی ناکڕێ بەڵام هەموو شتێکیش دەخوا. ئیدی ئەوە بۆتە شتێکی بەڵگەنەویست، چ بۆ خۆی و چ بۆ خاوەن شتەکان.

ئەگەر بڕیاربایە پارەی بدا نەدەبووە مەئمووری ئەمنییە... قابیلیەتی. دەنا ئەگەر وانەبێ، ئەوە ئەویش راپۆرتەکەی خۆی بەناوی تەواوی هەموو ئەو کەسانەی کە لە عێراقێوە شتی دێنن، دەداتەوە ((دایەرە))ی.

لە حاجی و وردەواڵە فرۆشانیش ئەوە هەر کەسێکیان چووبایە سەفەرێ، جا بە واسیتە یان بێ واسیتە دەبایە مۆڵەت لە جەناب سەرهەنگ وەرگیرابایە و لە ڕێی ویشەوە سەرێك لە خانمێ سەرهەنگی درابایە داخوا چ دەفەرموون و حەزیان بە چییە- خۆ نەدەکرا وشەی ((پێویستی)) لەڕووی ویدا گوترابایە چونکە ئەوان پێویستیان بە کەس نەبوو. ئیدی ئەوە ببووە ئەرکی

سەرشانی هەموو کەسێك، لالێکردنەوە و لوتفێکی گەورەبوو، ئەو شەرەفە هەروا بە ئاسانی بە هەموو کەسێك نەدەدرا، کە ئەوان ئیشێکیان بە کەسێك ببێ. ئەوەی جوانووە ئەسپێکی جوانی هەبووایە، ئیدی ئەوە شتێکی سروشتی بوو کە دەبوایە دەخزمەت جەنابی حەزرەتی ئەجەلدا بایە، یا قاچاغچییەك پارچە و پووچەی جوان و دلگری ژنانەی هێنابایە ئیدی ئەوە دەخزمەت خانمێ سەرهەنگیدا دەبوو- ئیدی هەروا بەم شێوەیە، ئەوشتانە هەموو ببوونە عادەت. خۆ ئەگەر دیاردە و شتە سروشتییەکانی سەردەمی منداڵییە نەبانایە کە هێشتاش دەدڵ و دەروون و مێشکاندا زیندوون و تین و تەوژمێك و ئەوین و خۆشەویستییەك دەناخ و هەناواندا بە ئێمە دەبەخشن ((دیتن و دووبارە بوونەوەی ئەو دیاردە و ئەوشتانە لەبەریەکیان دەبردین)). بەتایبەتی ئەو خەڵکە.

ئینجا دەوڵەتیش هێندێك خدەو خووی تایبەت بەخۆی هەن و بەسوود وەرگرتن لەو خدەو خوو و نەرێتانە هێندەی دی خەڵکەکەی بە قوڕێدا دەباتە خوارێ: بەردەوام هێز و توانای خۆی بە چاوی خەڵکیدا دەداتەوە و سەربازان بەخۆ و بەتفەنگی بڕنۆوە بەدەر و بازاڕاندا دەگێڕێ، ئەفسەران بەدەستکێشی سپی و چەکمەی جوان و بریقەدار و شمشێری سپی بەلاکە لەکێوە دەگەڵ تیپی مۆسیقای سەربازیدا چەند جوان و ڕێك قۆڵ و بازووان رادەوەشێنن. هەموو کەس پێیوایە ئەو شمشێر و دەستکێش و تفەنگ و تەپڵ و مۆسیقا و کەڕەنا و شەیپوورە رەزاشا لە پارەی گیرفانی خۆی کڕیونی! دەناو هەموو ئەو باق و بریق و هەراو زەنایەیدا کەس ئاوڕێك لەو هەموو شڕو وڕی و خانووە قوڕەتێك تەپیوانە و ئەو هەموو نەبوونی و نەدارییەی خۆی ناداتەوە و ڕۆژێك لە ڕۆژان بیرێکیان لێناکاتەوە. کاتێکیش کە ئەو سەربازانە بە بازاڕیدا تێدەپەڕن؛ منداڵان بە سەرنجی پڕ حەسرەت و حەز و خۆزگەی بێ پایانەوە تێیانەوە رادەمێنن و پیرەمێردەکانیش لەژێر لێوەوە ورتە ورتیانە: ((ئای، بۆ دوولاوی چاپووك و بەزیبك و ئازا، هەمووان خڕکەنەوە سەریەك!)). ئەوانە خڕکەنەوە سەریەك!؟ بۆ خڕیانکەنەوە؟ ئەو هەموو تفەنگ و نێزانە؟ جا دەکرێ!؟ منداڵەکان واقیان وڕدەمێنێ و سەرسام دەبن. بەڵام ئەوەش لەجێی خۆیدا راستییەکی تێدایە: خوویەك هەیە تائێستاش ئەو خووە هەرماوە. هەروا چەند ڕۆژێك پێشتر بوو گوردانێك دەگەڵ چەند یاخییەکی پێخواست بەرەنگاری یەکتری دەبن، نزیکەی شەست حەفتا کوشتەی دەدەن، و دەست لە ئەژنۆیان درێژتر دێنەوە... ئەدی... ئێرە شارە. دەمەو ئێواران گوندییەکان وەك لە جندۆکەی هەڵاتبن، بەخۆ و بەکۆڵەباری پشتێوە لە شاری هەڵدێن و رادەکەنەوە و شار



تا بەیانی دەخۆیدا وندەبێ- تا دیسانەوە بەیانی زوو سەر لەنوێ وەخۆی بێتەوە و هەمدیس گوندییەکان بەخۆ و ولاغەکانیانەوە و یا هەر بە پێیانەوە، کۆڵەبار بە پشت یا بەدەستەوە، کەلوپەل و شتومەکەکانیان بە پەلە بگەیەننەوە شاری: ئەوکاتی هەموو بە پەلەن، پەلەی بەرەو شاربوونەوە، بەخۆ و کلاوێکی پێش بە مقەبای بە جیرە لاستیکێکەوە بەستراو، نەك خوانە خواستە گرووبان عەبباس قولی، یا ناسرخانی سەر پاسەوانیان بگاتێ و بە تاوانی سەرقۆتییە و لەسەرنەنانی کلاو شاپۆی پەهلەوی سزایان بدەن! منداڵان کە یەکەمجار دێنە شاری سڵ و سرك و شەرمێونن و ترسی شاریان لێدەنیشێ. هەر دەڵێی خۆیان لەوە چکۆڵەتریش دێنە بەرچاوان کە هەن. جا بۆ ئەوەی هەستی کات و شوێن لەدەست نەدەن پەنا دەبەنە بەر ولاغەکان یا هەر بە بابیانەوە یا ئەوانەی دەگەڵیانن، دەنوسێن و لێیان جودا نابنەوە و غافلیان ناکەن. دەگەڵ منداڵە شاریاندا تێکەڵ نابن- ئەوان لە ئێستا را پیاون. راسپێردراون دەگەڵیان تێکەڵ نەبن، منداڵە شاری جێی متمانە و پشت پێبەستنێ نین: هەر کە بابیان یا ئەوانەی دەگەڵیانن لێیان دووردەکەونەوە، وەك سەیان کە سەیەکی لاوەکی وەگیر دێنن، ئاوا دەورەیان دەدەن، و جاشولکەی کەرێیان لێ دەتارێنن و هەڵی دەبڕن، گاڵتەیان پێدەکەن و لێیان دەدەن. بۆ؟ - نازانن... بەڵام نا دەزانن، هەر لەبەر هێندێ کە ئەوان خەڵکی شارین، شار گەورەیە، پاسەوانی هەن، هەر لەبەر هێندێ کە ئەوان پێیان لەسەر زەوییە خۆیان نییە و بەقەد بالا و روخساری کێو و بەندەنان ئاشناو شارەزانین کە لە دڵیان دەرنەچێ. شار مشتێك قوڕ و خشتەیە، کە بەسەر و چاوێکی گرژ و مۆنەوە تێیان دەڕوانن... لە خوو و خدەو نەرێتێ دابڕاون و دوورکەوتوونەتەوە. ناسرخان و سەرهەنگ و ئەوانی دیش چ تەفسیرێکیان نییە- ئەوانیش وا راهاتوون- خەڵکی وایان لێکردوون؛ لە زیادە بەدەریان رێز لێدەنێن... راهاتوون. جاری وایە داکێکە و دەگەڵ منداڵەکەیدا هاتۆتە شاری —بە پاژنەی قلیشاوی پێی ناوجاش کەوشێوە کە بەگوێرەی وەرزی ساڵێ، یا پڕ لە خۆڵەپەتە، یان دەقوڕێدا وندەبوو- یان بەکراسێکی شڕو دڕ لەبەر و لەچکێکی چڵکن بەسەرەوە. کوڕێژگەکە پیاویماڵییە، نێرینەیە. هەرچەندە کیژۆڵەش نەقیزە بەدەستەوە بەدوای ولاغاندا دێنە شاری. بەڵام تا کوڕ لەوێبێ، ئەوە ئیشی کیژ و کالان نییە. هەروەك پێشینان دەڵێن ((بەرخی نێر بۆ سەر بڕینە)): دەبێ چاو لە داکی کاو فێر ببێ کە چۆن بۆ پەیداکردنێ هەر شاهییەکی چۆنا و چۆن دەگەڵ چەرچی و جامباز و کڕیاراندا چەنەی لێدەدات و دەگەڵ دوکانداری بێ ویژداندا چەنگە چڕییەتی و بەرگرییە دەکات. جاری

وایە لەنێو ئەو داك و کچانەدا ئی وا هەن کە بۆ کڕین و فرۆشتنیٚ دێنە شاری گۆشتی لەشیان لە کونی کراسە دڕاوەکانیانڕا دیارە و قامکێ گەورەی پێیان لە کەلاشێڕا هاتۆتە دەرێ و هێندە ژێکەڵە و جوان و لەباریشن هەر مەپرسە. ئەوانە پیر یا جوان کە دەگەنە شاری دەپێشدا ئەو خورییەکی بەرێوە دەبیرێسن، هەڵدەوێزننەوە و دەمەچەکی خۆی دەئاڵێنن، یا دە خورجێنێی دەنێنەوە و بە کۆڵێی دادەدەنەوە، کە جاری وایە هەر ئەو خورجێنە منداڵێکیشی تێدا نوستووە. ئینجا لەبەر دوکانێکی یا بە پاڵ دیوارێکییەوە پێڵاوەکانیان دادەنێن و تاك تاکە دەیانتەکێنن و بێ ئیختیار دەستێکی بەسەر و پرچ و رووی خۆیاندا دێنن و ئەو تاڵە مووانەی لە بن لەچکێوە هاتوونە دەرێ، وە بنیان دەدەنەوە، ئەودەمی لە پەنا ((کیتەڵە))[1] ماست یا توورەکە مازوو یا کەندوولە هەنگوین یا مریشك و جوجکێکی کە دەگەڵ خۆیان هێناون بۆ فرۆشتنێ لەسەرچیچکان بە دیار هاتنێ کڕیارانەوە هەڵدەتروو کێن — ئەوەش ئەگەر جامباز دەنیوەی رێیەدا سەرە رێیان پێنەگرتبێ و شتومەکەکانیان لەچنگان دەرنەهێنا بن. ماوەیەکی کورت یا درێژ بێ گوێدانە هیچ. جاری وایە لەپڕ دەبینی ئەوە دەو بێ ئاگاییەیدا رادەچڵەکێ و تێکڕا دەبێ: ئەو دەمانەی کە ژنێك یا کیژۆڵەیەك دەبینێ ئەوە دوکانداری ئەوبەرێ چاوە حیزەکانی دەوجێیەی بڕیوە کە چمکێکی داوێنی کراسەکەیان هەڵچووە و تا سەر ئەژنۆیانیان هاتووە و کابراش لەو بەرێڕا نیشانەی لێگرتووە. هەروەك ژەنگەسورەی پێوەدابن، تێکڕا دەبن و سوور هەڵدەگەڕێن و لەشەرمان سەریان دادەخەن...

ئەوە شارە و ئەوانەش لادێیین- شار ئاواو خەڵکی لادێش ئاوا... لەسەر دوکانێ مێردی پوورێم دانیشتووم: قسەوباس دەربارەی مردنێ سۆزانییەکێیە کە چەند رۆژ لەمەوپێش کوژراوە و دوێنێش دایە گەورە بەو هەموو ئەولاولایەوە و زۆر بە پارێزەوە لێیدەدوا. ئەوەتا ئێستاش خەڵکی دەڵێن: ((هەی بترەژم، هەی بارەکەڵلا- سەد رەحمەت لەو شیرەی خواردووتە؛ بەوەی دەڵێن برا؛ هەی دەردت بە گیانم؛ دەڵێن...)) کەی، لە کوێ، لەسەرچی؟ -دیارنییە ((دەڵێن، برای بووە... وەك دەشڵێن وەجاغزادەشن، وەجاغی باپیری گرتوویەتی...)).

((چۆن!؟ بۆ عەجەمیش سەییدیان هەن!؟)).

[1] کیتەڵە: ئەو گۆزەڵە گڵە بچکۆلانە بوو کە جاران شیریان تێدا هەوێن دەکرد و هەر بە ماستەوە دەهێنرانە شاری... چونکە وەك ئێستا فافۆن زۆر نەبوو. وەرگێڕ-.



((بەڵێێ، هەیانن، بەلاّم ئیدی، وەك سەییدەکانی مە نین. ئەوان کاتێ کە ژنەکانیان لەرێی سەردانی کەربەلایە ئاوس دەبن و دێنە دنیایە، بەو منداڵانە دەڵێن سەیید. سەییدی خۆیان، ئیدی... هەندێکیشیان کە دایکیان سەییدی بەو جۆرەن تەنیا هەر سێ شەممان سەییدن!)).

((هە هە، سێ شەممان!)).

پوورە گوڵبەهاریش هەر پێکەنینی بەوەی هاتبوویە، کە گوتبوویان سوننی کلکیان هەیە. لەبەر ئەو قسانە چوو بوو پارەی دابووە ئاخوندان، کاکە رەحیمیش هەر بۆ پێکەنینێ چوو بوو پارەی دابووە شێخەکانی مە.

((بەڵێ مامۆستاش دەیگوت ئەوانە سەییدیان نین، ئەوەش لەبەروەی چونکە جنێوێ بە خولەفایان دەدەن؛ دەیگوت نیکاحیشیان هەر تەواو نییە- و منداڵەکانیان هەموو زۆڵن!)).

((نا بابە، ئەو هەروەك عەجەمیش نەبووبێ؛ ئەو سەییدی راست بوو؛ عەجەم ئەو غیرەت و پیاوەتییەیان لە کوێ بوو)).

((باشە هەی پیاوە، نامەردت نەکەن، خۆ تۆ هەر هاتووی هاتووی، نەدەبوو کارەکە یەکجاری یەکسەرەکەیەوەو دوو گوللانیش لەسەری کەلایی بەتاڵ کەی. ئەفسوس لەو دەمانچەی بەدەستە تۆوە بووە!)).

((جا چ جیاوازییەکی هەیە... ئەم کەلاییە نا یەکی دی- خۆ گەوواد قات نەبووە!؟)).

کابرای دەدووا بۆ خۆشی نەیدەزانی، بەلاّم وەك هەست و بیری کەوتبنە سەر رێیەکی، ئەوەی قبووڵ بێ کە ئێمە پێویستیمان بە داهێنان هەیە.

((چۆن، جیاوازی زۆرە. ئەودەمی کەلایی رەجەب بیری دەکردەوە، ئەوجا دەبووە کەلایی رەجەب)).

راستییەکەی دەشڵێن هەر لەو دەور و بەرانەیە؟...

((کێ؟ ئەوبرایە؟... نا بابە نا، ئێستا گەیوەتە نێو یاخی بووەکان)).

سەردەم سەردەمی وەرە و برۆ و بگر و بکوژی حەمە تاڵ و سەید عەتای بوو: هەریەکەیان چل پەنجا کەسێکی بەدووخۆی دابوو و کردبوویانە رۆژی خۆیان. لە بابم بیست کە دەیگوت ماوەیەك لە مەوپێش حەمەتاڵ لووت و گوێ و لچ و لێوی زرِغامی فەرمانبەری مالْیاتی لەسەر خەڵکی گوندی ((شوێ)) کە گوندی خۆیان بووە بڕیوە و کردوویەتییە پەند بۆ چەندانی دی و چووە لە قەراغ چۆمی شارییەوەی فڕێداوە.

((نا... یاخییەکان غەریبەی لەناوە خۆیاندا قبووڵ ناکەن. دەبێ هەر لەو دەور و بەرانە بێ)).

ئەوە ((بیروڕای گشتی))ی شارۆچکەکەمان بوو، وەکو هەر بیر و ڕایەکی گشتی دیکە، بێ هیچ یاسا و ڕێسایەك، بە هەرجۆرە شێوەیەك راست دەردەچوو. هەروەك ئەوەی دە هەموو مەیدانێکیدا هەروا بێ: جاری وایە بیر و رای گشتی دەربارەی کەسێکی، خوار دێتەوە؛ کە بەڕواڵەت سەیری دەکەی رەگە دەمارێکی بەکەوشێوە نابینی، بەڵام هێندەی نابا کتوپڕ رەگ و دەماری لە هەموو لایەکیڕا لێ پەیدا دەبن.

کتێبێك دەردەچێ. ((رەخنەگران)) بە زۆری زۆرەملێ دەیانەوێ ناوەڕۆکی ئەو کتێبەی دەمێشکی خەڵکی بئاخنن، بەڵام خەڵکەکە قبووڵیان نییە و نایکڕن و نایکڕن. پێچەوانەی ئەوەش روو دەدا: کەسانێکی خوێندەوار و باسەواد و رۆشنبیر دێن و دەیانەوێ بەرهەمێکی داپلۆسن و لەبەرچاوانی بخەن بەڵام رای گشتی نارەزایی و بەرگری پێشاندەدا و خەڵکی گرگرِ بەدوایدا دەگەڕێن و دەیکڕن، تا دوایە وردە وردە دەردەکەوێ کە بەرهەمەکە شتگەلێکی وای تێدا بووە کە وەبەرچاوی ((رەخنەگران))ی بەڕێز نەکەوتووە! ئەڵبەتە نامەوێ بڵێم کە رەخنەگر هەمیشە هەر بەجێیەکییەوە کاریگەر دەبێ و ئیلهام وەردەگرێ، نا، جاری واش هەیە کە ئەولایەنەی کە رەشە خەڵکەکە بەبۆنی سادە و ساکارە گشتییەکەی خۆیانەوە بۆی دەچن هیچ رەخنەگرێك پەی پێنابات. لەوانەشە هەر بەهۆی ئەوە شەوە بێ کە خۆی لە رووداوان جیاگرتووە و خۆی دوورە پەرێز دەگرێ.

گفتوگۆ بەردەوام بوو:



((های بابە، ئەوە تۆ لە کوێی! حەمە تاڵ و سەید عەتا سێبەری عەجەمان بە تیرێ دەنگێون... دەزانی بە چ زەحمەتێکی خۆیان لە زیندانی هەمەدانێ رزگار کردووە و هەڵاتوون... ئێستا دوای هەموو ئەو کوێرەوەرییانە بێن و عەجەم پەروەرییە بکەن!...)).

حەمە تاڵ و سەید عەتا هەردووکیان لە زیندانێ هەڵاتبوون، هەردووکیان پیشیان لە ((دەوڵەت))ێ دەخواردەوە و بەزەییان بە ئەمنییە و ئەفسەر و گروباناندا نەدەهاتەوە- هەقیان بەسەر سەربازانەوە نەبوو. عەجەمیان بە وشەی ((پلاو))ێ تاقیدەکردەوە، کورد بە ((ل)) قەڵەوەوە دەڵێ پلاو کە ئەم وشەیە گوتن و دەربڕینی بۆ عەجەمان زۆر سەخت و گران بوو و هەر دەیانگوت ((پیلاو)) دەوڵەت یانی ئەمیری لەشکری خۆراوا، بەو هەموو دامودەزگا و هەیت و هوتەی کە هەیانبوو، جەرگیان جەرگی دەخواردەوە و لەڕقان لێوی خۆیان دەکرۆشت کە هیچیان لە دەست نایە و دە بەرامبەر ئەو یاخیانەدا چیان پێناکرێ و هەنگاوێك ناچنە پێش، تا سەرەنجام و هەروەك هەمیشە، دوو سەردەستە پێکەوە کەوتنە گیانی یەك و یەکتریان قڕکرد، و دەوڵەت هەناسەیەکی ئۆخەی هەڵکێشا... دیسانەوە وەك هەمیشە، کورد بوونەوە ژەهر و تریاکی یەکتری: ((لەناوبردنی کورد بە کورد خۆی!)).

ئەو شەوە بابم لە ماڵێ سەفوەتاغای میوان بوو. سەفوەتاغا مەئمووری ئاڵوگۆڕکردنێ هەنگ (فەوج)بوو. بەڕواڵەت وەك ئەفسەران، بەڵام لە مەیدانێش بوو. باغێکی گەورەی خوار گەرماوی میرزا عەبدوڵڵای، نزیك ئەوجێیەی پێیان دەگوت خمخانە و پاشماوەی سەردەمێکی کۆنە، مانگێ بە هەژدە تمەنانی بەکرێ گرتبوو —کە راست دەیکردە مانگانەکەی خۆی و هەموو ئەو دەرماڵە و پارە زیادانەی دیکەشی کە وەریدەگرتن.

سێ ((رێ))ی هەبوون، کە بۆ باغی و بۆ ماڵێی دەچوون و دەهاتنەوە. تەلەفۆنیشیان بۆ راکێشابوو تا ئەگەر جەناب سەرهەنگ فەرمانێکیان هەبایە، یا ئەو عەرزێکی بۆ جەناب سەرهەنگی هەبایە بتوانن راستەوخۆ یەکتر بدوێنن و قسان بکەن. پیاوێکی رەشتاڵە، باڵابەرز، تۆزێك بەلە باریك و پاکو خاوێن، خاوەنی دووچاوی رەشی گەورەی لێك دوور و دەموچاوێکی هێلکەیی و بۆ ناوەوە قوپاو. لەسەر لووتییەوە جۆرێك بوو، هەر دەتگوت ئەو دەمەی هەویری دروستکردنێی هێشتا شل بووە و خۆی نەگرتووە پاڵیان پێوە ناوە و چۆتەوە ناوێ و پووچ بۆتەوەو تێك قوپاوە: چەناگە و ناوچەوانێکی دەرپەڕیو. دوو دگانی پێشەوەشی زێر بوون.

دەنگی هەر بە ویزە ویزی ژەنگەسوورەی دەچوو. چەند تاڵەموویەکی تەنکی بەسەریەوە بوو کە بەشێوەیەکی زۆر ئەندازیارانە بەسەر تەپڵە سەری خۆیدا دێنایەوە، ئەقدەس خانێ خێزانی، ژنێکی زۆر پەڕپووت و ناحەز بوو، کچێ ژن خوشکەکەی- عەزیزە خانم- کە من لەپێشدا نەمدیبوو تا بڵێی جوان و لەباربوو. بەردەستییە تریاك کێشانێ سەفوەتاغای دەکرد. خەڵکی (توێسرکان) بوون و فارسییان بەشێوەیەکی زۆر شیرین و خۆش قسە دەکرد.

ئەو شەوەی هەروەك جاران بابم منیشی دەگەڵە خۆیدا برد- من لە پلە و قۆناغی راوێژکاری فەرهەنگیدا: پۆلی هەشتەم بووم و لەجێی خۆمدا بێجگە لە ئەفسەران دەنا وێنەم نەبوو. دانیشتنە خواردنەوێ، و قسە لێرە و لەوێ کران و کەوتنە سەرتێکردنێم داخوا تەرفیعەکەی ستوان قەمشەیی ئەفسەر هاتوە یان نا، داخوا پەروەندەی دزیەتیە سەروان نەسیری گەیوەتە کوێ، داخوا ئیسماعیل خانی بەردەستی حەزرەتی ئەجەلی کەم دەبینم یا زۆر، داخوا هەر لە ناوەندییە سوپاییە یان نا- و ئەوجا قسە هاتەوە سەر جلوبەرگ و کەلوپەلی ژنان: کە داخوا ئەمساڵ چ جۆرە پێڵاو و چ شێوە کلاوێك و کام عەتری بۆنخۆش لە نێوەندی ئوستانێدا باوە؟ داخوا کراس چ رەنگێکن؛ پرچ، کورتن یا درێژ، پێڵاو پاژنە بڵندن، یا نزم، ئاغزوونەدارن یا بێ ئاغزوونە؟... منیش هەروەك خۆم، وەك تازە لە (ئاش)یڕا بێمەوە، و ئاگام لە هیچ نەبێ، بابم ناکام و شەرمەزار دەکەم، و ئەفسوس بۆ ئەو هەموو پووڵەی لەکیسی چووە و منی پێ ناردۆتە خوێندنێ کە تەنانەت نازانم ستوان قەمشەیی تەرفیعی کردووە یان نا، یا کاری پەروەندەی دزیەتە سەروان نەسیری سەرەنجامی بە کوێ گەیوە!...

لە دەم جۆیە باغی دانیشتبووین و ئەوان تاوڵەیان دەکرد و دەشیان خواردەوە- بەبێ مۆرە: رێگایەکی سەیریان بۆ تاوڵە کردنێ بێ مۆرە داهێنابوو: رەجەبیان لەسەر رێیەکی باغی بەرامبەر بەجۆیە و پشت بەخۆیان دانابوو و ئەویان کردبووە مۆرە: ئەو بەرێکەوت، و هەروا لەخۆوە بە ئارەزووی خۆی ژمارەیەکی دەگوت و ئەوان یارییان لەسەردەکرد... ((هەی، لەعنەت لە پیرە بابت! سەگبابی قوڕمساغ، ئێستا چ وەختی دوو شەشییە!)) و قاقا پێدەکەنین. رەجەبیش پێدەکەنی و دەیگوت: ((کوڕکوڕ!)) سەفوەتاغا هەمدیس شێت دەبۆوە، و دەیگوت: ((هەی سەگت دەگۆڕی بابە قوڕمساغەکەی ڕی... ئێستاکە ئەوەیان نەبوو لایەکەی دی!... دەو کونە لووتە پیسە چڵماوییانەت ڕیم...)) رەجەب لە پێستی خۆی دەچووە دەرێ: ((ئاخر جەناب



سەروان...)) — ((بێدەنگ!)) باشە ئەمن چ بڵێم بۆ تۆ باش بێت، هەرچی ئەمن دەیڵێم ئەتۆ هەر پێت ناخۆشە!)) — ((گوتم بێدەنگ بە... خەریکی کارەکەت بە!)) و رەجەب پێدا دەهاتەوەو دەستیان دەکردەوە بە پێکەنینێ و هەروا بە خۆشەویستییەوە داك و بابیان بیراز دەکردنەوە، و ((نیشتمان)) بەو ((خزمەتە))ی وی حەسابۆوە. سەرەنجام لە تاوڵەی ماندوو بوون و قسە هاتە سەر ئەو رووداوەی تازە لە شاری قەوماوە: رووداوی ئەو سۆزانییەی کوژرابوو. راستییەکەی کێ بوو؟ بۆ کوژرا؟ کێ کوشتی؟ بۆ هەر تەنیا ئەو؟ دانیشتنەکە هێشتا هەر دانیشتنێ پیاوان بوو؛ ژنەکان لە دیوی نێو ماڵێ بوون.

من دوو فاقەییە کە سایەتییە بابم زۆر لەمەو بەرەوە هەستکردبوو. جاری واهەبوو دەبووە چەند کەسایەتییەکی زیاتریش. ئێستا سەرم لەوەی سوڕدەمێنێ کە چۆن بەخۆ و بەو هەموو دڵەڕاوکێ و ئەو هەموو گۆڕانە دەروونیە خێرایانەیەوە کە هەردەمەو جۆرە مجێزێك بوو، نەببووە شاعیر، چونکە هەردەمەو ساتێك شتێکی دەگوت و هەرتاوە نا تاوێك مێشکی دەگەڵ جۆرە ئاواز و مۆسیقایەکدا دەهاتەوە. رەنگە هەر بۆیەش بووبێ کە هەرگیز قسەکانی کاریان تێنەدەکردم و رەنگە هەر ئەو بارە دەروونییە و هەر ئەو گۆڕانانەش بێ نەیەڵن خەڵکی گوێ بدەنە شاعیران و هێندەیان کاریگەری نەبێ. چونکە نیو ئەوەندەی کە بەشیعر دەیڵێن ئەگەر بە پەخشان بینوسن، بەسە بۆ ئەوەی هەڵیانواسن و لە سێدارەیاندەن کەچی دەیانبینی ئەوە بە کوڵك و پێستەوە دێن و دەچن و کەس لە گوڵیان کالتر پێنالێ و بەوەش دڵخۆشن و خۆ بادەدەن، کە قسەی خۆیان کردووە و مەبەستەکانیان دەربڕیون و دەوڵەتانیش بەوەوە شادمانن کە هیچی وایان نەگوتووە ((شتێکی)) لێپەیدابێ. ئەڵبەتە ئەوە شتێك نییە، مرۆڤ دەتوانێ چەند کەسایەتییەکیش بێ. لێرەدا شوورەییەکە ئەوەیە کە لە راستیدا ئەو دوو فاقەییەی بابم ببووە ((کەسایەتییەکەی)).

هەر کە سەفوەتاغا دەستی بە قسان دەکرد من دەکەوتمە بیری ئەو چەند و چوونەوە: لە لایەکەوە هەقی بەخۆی دەدا کە چێژ لە کوشتنێ ئەو سۆزانییەی وەرگرێ کە کوژراوە، چونکە دەو زەلکاوەی کەوتووە و لەلایەکی دیشەوە دڵی بە کوشتن و خۆ فرۆشتنێیەوە بسووتێ. هەروەك ئەو کارەساتە دوو پەروەندەی لێك جودا بن. ئەڵبەتە ئەوەش شتێکی لە عادەت بەدەرنەبوو، دیارە ئەو جۆرە شتانە لەجێی دیش نموونەیان هەن و زۆریشن و کەمیش نین. یەك

ماڵی خەڵکی دەخوا، کەچی پێشڕەو و پێشەوایە و ڕێی ڕاست بە خەڵکی پیشاندەدا؛ یەکی دی حاجیە و گزی و فزی و دزی و فێڵ لە خەڵکی دەکا و بەو پارەیەش دەچێتە زیارەتێ... دیارە کە ئەوانەش هەریەکە و حیسابی خۆی هەیە. باڵەوەی گەڕێین... زیاتر ئەوکچەیان بەناوی ((چاو و برۆجوان)) و —چاوەڕەش-ەوە بانگ دەکرد. هەروەك بۆخۆی دەیگوت ئەو کاتانەی لە دەم چۆمی بیخواردبایەوە لە دووی دەنارد بێت و چەند گۆرانییەکانی بۆ بڵێ.

بەروخسارێکی غەماوییەوە گوتی: ((ئیدی کە تێدەڕۆنی، چ گوناهێکی نییە. خۆ هەروا بە ئارەزووی خۆشی تێوە نەگلاوە... کام ئافرەتێك هەیە بە حەز و ئارەزوو و ویستی خۆی بێت و ببێتە سۆزانی و لەشی خۆی بە هەرکەس و ناکەس و هیچ و پووچێکی بفرۆشێت و خۆی هەڕاج بکا؟... نا، ئەوە ڕۆژگار هەڵیداشتۆتە ئەو چارەنوسەوە... ڕۆژێکی دڵی زۆر پڕبوو... پێم وابێ یەك دوو ڕۆژ پێش کوشتنێی بوو. زۆر گریا — زگم پێی سووتا. ناوی یا ئەو ناوەی لێیان نابوو، قەمەر بوو. ئەوشەوە هیچی نەگوت، هەرگریا. گوتم: قەمەر، ئەوە بۆ دەگری؟ چتە، بەمن بڵێ، بەڵکە بتوانم یارمەتییەکت بدەم- باوەڕکەن ئەگەر بیگوتبا دەچمەوە ماڵێ بابم، یا بە یەکێکی وەك کەلایی ڕەجەبی قەردارم و ئەوەندە پارەم پێویستە، دەمدایە... هەناسێکی هەڵکێشا، کچۆڵەی پاك و بێگوناه... ئاخر ئێوە نازانن، بە تەواوی مانا منداڵ بوو. زۆرم هەوڵدا بزانم، نەیگوت. دیاربوو خاوەن کەس و کار و کچی ماڵێیە و لاڕێ بووە. ئەورۆ، زۆر بەتایبەتی، لە زەمینی، سەرۆکی ئەمنیەم. بیست- قسەی خۆمان بێ- بیستم برایەکەی گیراوە و زیندانی بووە- ئێستاش چۆ ناو چۆن، ئەو هەر نەیگوت و منیش نەمپرسییەوە- و ئەو کچە بەدووا پەیسەری برایەکەیەوە چووە، تا وردە وردە لەخشتە چووە، یانی تۆ بڵێ لە خشتەیان بردووە...)) سەفوەتاغا زۆر سادە و ساکارانە، وەك کارتێکردن و کارلێکردنی هەر بەخەیاڵیشدانەیە و دەکولەکەی تەڕیشدا نەبن هەر بەو دەنگە زیك زیکاوییەیەوە گوتی: ((باشە، دەگەڵ ئەوانەشدا، هیچت دەگەڵ نەکرد؟ خۆ دەڵێن زۆر جوان بوو...)) ((نا- نا بەگیانی ئێوە. تۆ بۆخۆت دەزانی من لەم جۆرە کارە نابەجێیانە دەترسم. ئیدی هەرچی بووبێ، سۆزانی بوو... ڕاستە، زۆر جوان بوو- ئەوە قسەی لەسەر نییە، بەڵام دەستیم گرت، گەمەم دەگەڵ دەکرد... بەڵام بۆ مێشی لێ میوان دەبوو، بۆ تەزووێکی پێدا دەهات، یا تەنانەت هیچی لێوە دیاریدەدا. لە دەست وێکەوتنێی تێکڕا دەبوو. ئەگەر زۆریشت لێکردبایە، گوێی نەدەدایەی، و چاوە ڕەشە گەورەکانی دەبوونە دنیایەك غەم. هەر کە لێی غافڵ ببای لێت وە



دوور دەکەوتەوەو دەچوو دەستی دە ئەژنۆیانەوە وەردێنا، و هەرچەندە لێوەکانیشی لێك دەترازان و ڕیزی ددانە سپییەکانی وەدەر دەکەوتن و زەردەیەکی غەماوی بەلێوەکانییەوە دەنیشتەوە و چەناگەی لەسەر ئەژنۆیەکانی دادەنا و دە پیاوییەوە ڕادەما —هەر ڕاست وەك دایکی کۆرپە مردوو. چاوەکانی کتێبێکی گەورەی چیرۆکان بوو- چیرۆکی تاڵ. لەڕاستیدا خودی خۆی لە خودی خۆی دادەبڕی. هەروەکو ئەو خۆی نەبێ، کە دەستت دەدایە، وەك دەگەڵ یەکی دیدا دەستبازییە بکەی و ئەو تەماشاچی بێ و چ پەیوەندیەکی بەویەوە نەبێ- تا لە پڕ وەئاگا دەهاتەوە و دەکەوتەوە سەرخۆ، خۆی خڕ دەکردەوە و خۆی دادەپۆشییەوە، سەر و گەردەنە بەرز و جوان و لە بارەکەی دێنایەوە پێشێ و هەروەك منداڵان، بە دەنگێکی وەك پاڕانەوێوە دەیگوت: ((توخودا وامەکە... خێرا کارەکەت تەواوکەو وازم لێ بێنە بڕۆم... توبی ئەو خودایەی لێم گەڕێ بڕۆم!)) ئەو، بێ چاو و ڕوویی و پڕکێشی و پەلاماردان و هەڵپەی پارەی خانمەکانی دیکەی نەبوو، کە خۆیان بەناز دەکەن و چاوان دادەگرن و خۆ دێنن و دەبەن تا پارەی زیاتر پەیداکەن...)).

ئاغای سەفوەتی گوتی: ((نە بەگیانی ئێوە درۆتان عەرز ناکەم... کچێکی بە تەواوی مانا پاك و بێگوناه بوو... تا ئەوودەمی ئەوە هیچ کە فێر نەببوو. دوایەش کە وای لێهات، من ئەو دواییەی دەڵێم، ئەڵبەتە ئەویش پارەی وەردەگرت بەڵام نەك وەك ئەوانیدی کە پارەیان دەدیت چوارچاو دەبوون و وەدووی دەکەوتن و دەیانقۆستەوە. ڕەنگە بڵێی ئەوەش تەڵەیەك بووە ناویەتەوە، تا مشتەری زیاتر پێوە بن. بەڵام نا، هەر لە هەڵسوکەوتیڕا دیاربوو...)) ئاغای سەفوەتی گوتی: ((ئەدی ئەگەر ڕاستت دەکرد و زگت پێدەسووتا، خۆ تۆ فەوجێکت قەرەواش و خزمەتکار هەبوون دە ڕزگارت کردبایە)).

بابم گوتی: ((جادە و دەوروبەرەیدا!؟ ئەویش من!))و پێکەنی، و قوتووی جگەرەکەی دەرێنا و هەر بۆ سەربەندێ قسان سەرەکەی لاداو جگەرەیەکی دەرێنا و قونچکەکەی چەند جارێکان لەپشتی قوتووەکەیدا: ((جا بۆ ئەوودەمی برادەران ژیانیان پێدەهێشتم!؟ گوایە داڵدەدرام؛ هەر هێندە بەس بوو ئەو هەواڵە بگاتە گوێی مەلای کە فلاَن سۆزانییەکی بردۆتەوە ماڵە خۆی- ئەوودەمی کەرێ بێنە و باری کە. تەنانەت هەر خودی خۆتان... ئەگەر بمبردبایەوە، قسەتان دەگەڵ دەکردم و دەتان دوواندم؟ دیارە نەتاندەکرد؛ دەنا بە گیانی ئەو برایمەی بە هەموو

حەزێکەوە ئەو کارەم دەکرد. نالێم وەك کچەکانی خۆم، بەڵام بە تەواویم ئاگا لێی دەبوو. دوای ئەو هەموو قسانە، ئەدی چم وەڵامی دەوڵەتێ دابایەوە- ئەودەمی نۆرەی ئێمە و کاروباری ئیدارەی بوو... نا، ئەوە بۆ من نەدەبوو... ئەوە کاری دەوڵەتییە دەبێ ئەو بیکا...)).

بابم گوتی: ((بەڵێ... خۆ من سەمەری نیم- من خەڵکی ئێرەم، دەبێ وەك ئێرە و هەر لێرەش بژیم. سەمەری ئەفسەرە، ئەورۆ لێرەیە سبەینێ لەجێیەکی دی...)).

سەمەری ستوانێك بوو ساف و لووس، و کتوپڕ شەیدای فەرەنگ خانمێ بوو و چوو لە دەزگایەکەی کەلایی رەجەبی دەرێنا و بردییە ماڵێ ئیمامی و ((موسڵمان))ی کرد و مارەی کرد. هەواڵی ئەم رووداوە وەك بۆمبا دەو شارەچکۆڵەیدا تەقییەوە، و هەرچی سەر بە دەوڵەتێ بوون هەمووی هەژاندن. دەنگۆ داکەوت کە... سەرهەنگ، لە ریزبوونێ سەربازانی بەیانیاندا سەمەری هێناوە و لەبەردەمی ئەفسەرەکاندا چی خراپە پێی کردووە و زۆریشی جنێو پێداوە، لەسەر ئەوەی کە چووە سۆزانییەکی هێناوە و ئابڕووی سوپا و دەوڵەتی بردووە، و سەمەریش شمشێری راکێشاوە و هەڵیکوتاوەتە سەر سەرهەنگی، و گوتوویەتی خۆ خانمەکانی وانیش لەو خانمانەی دەزگای کەلایی چاتر نین، و بەڵێنیشی داوە کە ئیدی تۆبە بکات و واز لەکاری خراپە بێنێ. بەڵام خۆ خەڵکی دی تا ئێستاش ئەو بڕیارانەیان دەگەڵ ژنەکانی خۆیاندا نەداوە و بەڵێنی ئەوەیان لێوەرنەگرتوون خراپەی نەکەن.

گوایە زۆریشی لەو پەیوەندیانەی ژنێ سەرهەنگی بە خەڵکییەوە، گوتوون...

وەبیرم دێ لەشە هریوەری بیستدا کاتێ دەوری سەربازخانەیان گرت هەموو تەسلیم بوون تەنیا ئەو سەمەرییە نەبێ، کە ئەورۆ بە ناپیاو و ((ترسنۆك))ی ناو دەبەن. بەخۆ و بەشەست تیرەکەیەوە بەرگرییەکی وایکرد نەبێتەوە، و خۆشی بەدەستەوە هەرنەدا. تا هەڵات. دوایەش گوایە لە رووداوەکانی ئازربایجانی ساڵی بیست و پێنجدا (١٩٤٦ز) یەکێك بووە لەو ئەفسەرە هەڵاتووانەی گیراونەوە و گوللەبارانی کراوە. چەندین دواتر بیستمەوە کە فەرەنگ خانم- کە ئێستا قودسی خانمە- لەپێناو ئەو جوانمەردی و لەخۆ بوردەییەی، ئەو رێیە شەرافەتمەندانەیەی هەڵی بژاردبوو بەری هەرنەدا... ئەوکارە گۆڕانێکی دەمێشکی خەڵکیدا دروستکرد: هەر نەبێ ئەگەر بۆ یەك جاریش بووە ئەوەی سەلماند کە رووالەت نیشانەی ناخی ناوەوەی دڵ و دەروونان نییە، کاری چاك کاریگەرییەکەی زۆر لە خۆی بەولاوەترەوە دەچێ و زۆر شتی دیکەی دیش...



بەڵێ ئێستا دوای بەسەرچوونی ئەو هەموو ساڵانە بیر لەو قسانە دەکەمەوە —نامەوێ بڵێم کە خودی ئەو- بابم- لەسەرو بنی قسەکانیدا مەبەستێکی هەبووبێ. ئەوە ئێستاش ئەوەی پێیان دەگوت تراژیدیای ژیانی عالیەی- کە ئێستا هەموو شتێکیم لەلا روون-ە هیچ پەیوەندییەکی بە سروشتی راستەقینەی ئەوەوە نەبوو... چارەنووسی کێ بە سروشتی خاوەنەکەیەوە بەندە؟ بۆ داخوا ئەمیری لەشکری خۆراوایە بەراستی ئەمیری لەشکرە، بەراستی سەردار و سەروەرە و هەموو تایبەتمەندییەکی سەربازی و رابەرییەی تێدایە؟ یا بە قسەی ئەکبەراغا، ئاغای زەینەڵ عابیدین، بەخۆ و بەو جوببە و مێزەرو ریشەیەوە بەراستی مەلایە؟ -ئیدی خۆ عەبا و مێزەر بەشێکی دەرەوەی کەسایەتییە پیاوین: وەك قسەی ئەو نووسەرەی دەڵێ، کەسێك شەپقەی لەسەرییبێ کوا وەك ئەوەیە کە کاسکێتی لەسەرە. وەك بڵێی چارەنووس بە پێچەوانەی رێکەوتەوە ئیختیارێکە بەدەست خۆت، کەچی هیچ ئیختیارێکیش دەگۆڕێدا نییە... بەڵام چارەنووسی عالیەی تەنیا یەك شتی تێدا روون و ئاشکرایە و ئەویش ئەوەیە کە وەکو هەموو چارەنووسێکی دیکە بە مردنێی دوایی هات. خۆ ئەگەر وەك هەموو خەڵکی ئەویش پەیڕەوی لە داب و رەسمی باو کردبایە بێگومان مێردێکی دەکرد و منداڵی دەبوون و پیر و کەنەفت و دڵزار و بێزار دەبوو و سەرەنجام دەمرد، و مشتێك یاد و بیرەوەری خۆش و ناخۆشی بۆ منداڵ و نەوەکانی بەجێ دەهێشت. بەڵام ئەم ژیانە دەرفەتی نەدا تاوەك سەرەداوی گلۆڵەیەکی ونبوو بیاندۆزێتەوە: کە هەر لەسەرەتاوە تاڵە دەزووەکان پسان و ئەو ((تراژیدیا))یە هاتە پێشێ. ئەگەر ئەو تاڵە دەزووە نەپسابایە، ئەودەمی ئەو کارەساتە دڵتەزێنەش رووی نەدەدا. دەپێشدا ویست و مەبەستێك لە رێچکەی خۆی لایدا و ئەڵقەکانی زنجیرێکی دیکەی راتەکاند تا سەرەنجام مەبەستێکی دیکەی پێچەوانەی ئەو رێچکەیەی لەسەر هێڵی خۆی ترازاند و دوو مەبەستی لە دەرەوەی ئەو دوو زنجیرانەدا —یا هەردوو سەری ئەو دوو زنجیرانەدا- پێکدادا و لەو پێکدادانەشدا بوو کە ئەو تانوپۆیانە پسان. دەزووە کە بۆ خۆی پسپسۆك نەبوو، پچڕانیشی خەتای بێ مایەیی و خراپییە ماددەکەی نەبوو؛ خۆ ئەو مەبەستێکی خراپی نەبوو، ویستی کارێکی بکا برایەکەی رزگار بێ، و برایەکەشی ویستی کارێکی بکا کە پەڵەی پیسی بەداوێنی بنەماڵە و خێزانەکەیانەوە نەلکێ —و ((تراژیدیا))یانی ئەوە. وەك دەڵێن، کاری خراپ لەراستیدا هەمووی هەرچاکەیە کە لە زۆر بەولاوە رۆیشتنێدا ئەوچاکەیە وەخراپ گەڕاوە: گوایە زۆرە رۆیی لەچاکەیدا ئەو چاکەیەی دەکاتە خراپە- دەحاڵێکدا کە تراژیدیا لە خراپەوە وەدی نایە.

وادیاربوو بابم وەك زۆر لە رەخنەگرانی ئەدەب و هونەر، خۆی و هەست و نەستەكانی لە بەسەرهاتی داستانەكە جودا كردبۆوە و وەك كێشەكەی لە ((پرسپكتیۆ))دا بڕیار دابێ؛ ئاغای سەفوەتی هەست و نەستەكانی بەرەو لای قەڵەمڕەوێكی كۆمەلاّیەتی دیەوە جڵەوكێش كردبوو. بەروخسارێكی یەكجار زۆر پڕ لە داخەوە گوتی: ((زۆر خراپ بوو!...)) بابم گوتی: ((ئەدی، راستییەكەی زۆریش خراپ بوو؛ بەستەزمان زۆر لاوبوو، هیچی وای تەمەن نەبوو، هەرچەندە...)) ئاغای سەفوەتی بە نارەحەتییەوە هاتە نێو قسەكانی بابمەوە. گوتی: ((های بابە! دەو دەریای بیركردنەوەیەدا ئێمە لە كوێین و تۆ لە كوێی... تۆش دڵت خۆشە... بەگۆڕی بابی سۆزانییە! خوای دەكرد سەر بە لەشی هیچیانەوە نەدەما. من مەبەستێكی دیكەم هەیە... من دڵگیری ئەوەم كە... بۆ سەرهەنگی گران تەواو ببێ و زۆری لەسەربكەوێ... لەوانەیە حەزرەتی ئەجەل ئەم رووداوە بە حیسابی ناڕێكی و نائاسایشی ناوچەكە و خودا نەخواستە... لێنەهاتوویی جەناب سەرهەنگ لە قەڵەم بدا... و ئەودەمی...)).

دەگەڵ دەربڕینی هەریەك لەو رستانەدا چەندین جار دەچەقی و رادەوەستا. ئاغای سەفوەتی وشەكەی ((ئەودەمی)) بەوە پینەكرد، كە لە جیاتیان قوتووە جگەرە زێڕلیە جوانەكەی كردەوە و جگەرەیەكی لێدەرێنا و بەلای لێویەوە نا، و زۆر بەكاوە خۆ دایگیرساند و هەروا بەكاوە خۆشەوە چەند چەسپێكی لێدا...

دیاربوو ئەگەر كارەكە گەندبایە خودا نەخواستە جەناب سەرهەنگ دەگۆڕا، و دەگەڵ ویشدا فەرمانبەری گواستنەوەی دەگەڵدا دەگۆڕاو هەرسێ سەرچاوەكەش نەدەمان، و تەلەفۆن نەدەما و ماڵ دەگۆڕاو لەولاشەوە قوتووە جگەرەی زێڕیش تێدەچوو- و ئەودەم كۆمەڵ زیانی دەگەیشتێ! دیارە كە سوود و زیانی كۆمەڵ بەپلەو پایەی ئەو كەسانەوە بەندە. وەك ئەو پەیوەندییانە هەمیشە هەروا بووبن. ئێستاش هەر دەڵێن ئەگەر فلاّن نەبێ ئیدی ئەوە كۆمەڵ تووشی زیان دەبێ و لەبەر یەك دەچێ و كۆتایی دێ...

ژنەكان هاتن و سەری قسان گۆڕا. بابم بە دیتنێ عەزیزە خانمێ یەكڕاست سەدو هەشتا دەرەجەی كەسایەتییە خۆی گۆڕی- لەسەرهێڵی سۆزەوە یەكسەر بازیدایە سەرهێڵی هەستە رووتە ناسكەكانی. گاڵتە و پێكەنین دەستیان پێكرد. عەزیزە خانم ئەورۆ مارێكی دەباغیدا دیبوو، بەلاّم چ مارێكی ئەستوور! عەزیزە خانم بە نیشانەی پەنجەكانی هەردوو دەستی و چاوە جوان و



منداڵانەكەیەوە ئەستوورابییە مارەكەی دیاری دەكرد و پێشانی دەدا، ئاغای سەفوەتی ئەستوورابییە مارەكەی بە چاوان مەزەندە كردەوە. بابم بێ ئیختیارانە دەستی بۆلای گۆشەی چاوییەوە چوو، و سەری بەردایەوە و لاچاو و لێواری لووتی خوراند، هەروەك پووشكەی دەچاوی كەوتبێ. بەلاّم بەپێچەوانەی ئەوەی كە پووشكەی دەچێتە چاویەوە، ئەو پێكەنینی بەڕووانەوە دیاربوو و ئەو بەشەی چاویشی كە من دەمدیت، زەق زەق بوون و چ بەلاّیەكی نەبوو. چاوێكی زڕداكانەی لێداگرتم و تیلە چاوێكی دامێ- بە روخسار و دەمولێوێكی حەپەساوەوە عەزیزە خانم شین و مۆر ببۆوە، و پێكەنی، و دوو پەڵەی سووری، كە لە هەموو رەنگی دەموچاوی سوورتر بوون لە ناوەڕاستی روومەتێی وەدەركەوتن.

عەزیزە خانم بێوەژن بوو- لە پێشڕەوانی شووكردنی سەرنەكەوتوو بوو. بلووزێكی رەنگ لیمۆیی ناسك و بەدەن چەسپی لەبەردا بوو. هەروا بیست، بیست و پێنجساڵێك دەبوو. هەڵسوكەوتی كچانەیەكی تێكەڵ بە شەرم و ناز و سورو سپی هەڵگەڕان- و زۆر سەردەمانە بوو- روخسارێكی لەبارو جوانی بوو؛ دەمی لەچاو دەموچاویدا كەمێك گەورەتر دیاربوو، لێوەكانی كورت و گۆشتن بوون. بەلاّم لە هەموو جێیەكیشی جوانتر چاوەكانی بوون، رەش و گەورە، ئافرەتێكی لاو و منداڵكار، دوو ئەبرۆی كەوانی بەسەرچاواندا هاتوو كە شێوەیەكی بزۆزانە و منداڵانەی دابۆوە رەنگ و رواژای. پشتەملی و دەوروبەری گوێیە بچكۆلەكانی گەندەمووی زەردیان هەر پێوە بوو؛ دەمارەكانی گەردەنی مەیلە و شینیان دەنواند. ئاڵقەیەكی وەك پەڕە باڵندەی بەگوێیەوە بوو، و زنجیرێكی جوان و لەباری بە ((دڵێكی تیرلێدراو))ەوە گەردەنە جوانەكەی رازاندبۆوە. كە پێدەكەنی یەكپارچە دەبووە شۆڕو ناز وەك منداڵێكی كە بەدووای پەپوولاندا راكات ویا پەلكە گوڵان هەڵوەرێنێ و بە هەوایاندا بلاّوكاتەوە، خنەخنی پێكەنینەكەی هەر راست وەك خوڕەی ئەو جۆیە ئاوەی دەچوو كە بە تەكماندا تێدەپەڕی و هەرچی شووشەی ئارەق و مەزەی هەبوون دەگەڵەویدا هەم ئاواز دەبوون و دەخەنینەوە. بەلاّم دەگەرمەی پێكەنینێدا، هەروەك گەورە كچێكی دەنێو منداڵە ورتكاندا دیترابێ لەپڕ شەرم دەیگرت و تەریق دەبۆوە، رەنگی رووی سوور هەڵدەگەڕاو بێدەنگ دەبوو، و خەنینەوەی جوێباری بێدەنگییەكەی لەوە قووڵتر بوو كە دەردەكەوت. لەسەر ئەژنۆیان دانیشتبوو، هەرچەند جارێكان كەمێكی ئەولاولا دەكرد و داوێنی كراسەكەی دادەكێشایەوە، دەگەڵ هەر زەردەخەنێكیدا لێوە كورتیلەكانی زیاتر هەڵدەكشین و ددانە سپییەكانی زیاتر وە دەردەخستن...

له دوای ئێوارێوه سفرەی تریاکێیان راخست. عەزیزه خانمیش چەند چەسپێکی لێدەدان و دەودەمانەدا مایەی سەیرکردنێ بوو. ئەو دەمانه بابم دەبووە ((وەستا))و تریاکی بەدەمی ئەو و ئەقدەس خانمێوه دەکرد. دەو جۆرەساتەوەختانەدا عەزیزه خانم وەك دەمی بۆ مەمکۆڵەی شیرخواردنێ درێژکا، لێوەکانی وێك دێنانەوه و داری وافۆرەکەی بەلێوان دەگرت. تریاکی وەك جگەرەی دەکێشا. به چەسپی پچڕپچڕ — و ئینجا پێکەنین. گوێشی نەدەدایه بابم؛ لەسەر ئەژنۆیانی خۆ دەسوڕاند و وەخت و ناوەختی نەبوو هەربەبای دەکرد... و دووبارە پێدەکەنییەوه، به دەردی ئاغای سەفوەتی دەیگوت تریاکەکەی حەرام دەکرد، هەرچەندە زۆریش خەتای وی نەبوو، چونکه بابم چ ئاگای لەدامو دەزگای تریاك کێشانێ نەبوو؛ قاقای شیرین و دزه نیگاو زەردەخەنەی ((دەوروبەران))یش هێندەی دی لێکردبوو. ئاغای سەفوەتی گورزەی زیاد له قەبارەی خۆی گەورەتری بۆ ئەقدەس خانمێ دادەگرتەوه، و دەیدایه دەستی بابم، و ئەقدەس خانم هاواری له دەست ئەو گورزە سەرچوێلەکه خڕانه لێ هەڵدەستا. دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، گورزەکەی تا قونچکێ دەکێشا. ددانەکانی پێشەوەی، بەتایبەتی ئەوانەی خوارێی، هەمووی بەڵغی جگەره و تریاکێ بوو. دەیگوت: ((ئەوە دەبینی، هێندەم لەو گورزە سەرچوێلەکه خڕانه بۆ دادەگریەوه که ناچار بی کارەکەرێکی تایبەتیم بۆ راگری لەسەرجێی ئەودیوه و دیوم پێبکا و تەنیشتانم بگۆڕێ)). ئاغای سەفوەتی دەیگوت: ((قوربانی سەرت)) سەیرێکی عەزیزه خانمێی کرد که دەیگوت: ((بڕۆ بمره، تا جاو هەرزانە!)).

بابم زۆری سوپاسی خودای کرد که بەسەرهاتی مارەکه وەخێرگەڕاوه. و ((راشکاوانه)) رایسپارد که نابێ ئەو کێشەیه پشتگوێ بخرێ و هەردەبێ بەدوای سەیید موختاری مارگردا بنێرن و بێت مارەی بگرێ، و هەموو لایەکیش راسپێرن، کەس توخونی نەکەوێ و هەقیان بەسەریەوه نەبێ، نەکاجووتەی ئاشقه و ماشقان بن... زۆر ترسناکه... ئینجا هەروەك جاران وەنێو سیاسەتێ کەوتنەوه- نه هەر سیاسەتی ناوخۆ که روون و ئاشکرابوو و هیچ کەموکوڕییەکی نەبوو، بەڵکه سیاسەتی دەرەوه، که هەمیشه باس و سەرباسی دەوری مەقاڵە ئاورێ بوو و باس باسی هێتلەر و کاره له ئەقڵ بەدەرەکانی: ئینگلیز و فەرانسه و رووس له ترسێ وی خەویان لێناکەوێ؛ ئای خۆش دەبوو گۆڕی بابی ئەو رووسەی هەڵتەکاندبایه! سەرۆکی ولاتان له ترسانی هەموو خۆیان پیس کردووه. ئاغای سەفوەتی زۆر تایبەتمەندانه گوتی که دەگەڵ ئەعالی حەزرەتی خۆشماندا ئه ئاوان)) هەردوو پەنجەی شایەتمانی له ناوەڕاستێوه لێك گرێدان — ((ئه ئاوا))و بەدزییەوه نامەش بۆ یەکتری دەنێرن. دەبێ



هەر ((ئه ئاوا))ش بن، ئیدی هەردووکیان ئاریا نەژادن- هەرچی بێ ئێمه ئامۆزای گەورەین. بابم زۆر بەڕاشکاویەوه، دەستی بۆ لەملیدا. ئاغای سەفوەتی: -زۆر بەسپاییەوه- چونکه کارمەندی هەنگ ((فەوج)) بوو گوتی، هێتلەر تەنانەت پارەی تفەنگه بڕنۆیەکانیشی لێوەر نەگرتۆتەوه، و هەرچەندە ئەعالی حەزرەت هەوڵیداوه بێسوود بووه و قبووڵی نەکردووه و نەکردووه- ئەڵبەته که دیاره بەلای ئێمەوه شتێکی سەیرنییه: ئیدی، ئەوە فەرمووی کوڕە مامێکییەو له کوڕە مامێکی کراوه. ئاغای سەفوەتی هەروا بەسپاییەوه درێژەیدایه: ((تازەی گوتووەکه، تۆپ و تۆپخانه و فڕۆکەش، چەندت بوێ بۆت دەنێرم)) و ماسوولکەکانی دەموچاو و دەوروبەری لووتی و پێڵووەکانی هێنان و بردن ((بەکورتی، تا مردنێت دەگەڵم)). به ئاماژەی چاو و برۆیانی راگەیاند که ماویەتی و قسەکەی درێژەی هەیه ((مج —مج... مجیبر- مجیبر- مجیبر!)) و ئەوجا بێدەنگی، دوایه ((بوف- ف- ف! کوڕە چای تێکه... بەڵێ، خۆ قوتابخانەی فڕۆکەوانییەی هەروا به خۆڕایی دانەمەزراندووه. ... بەگیانی تۆ ((دڵێکی)) هەیه ئا ئەوەندە گەوره!)) دەستەکانی به قەدراییه گەورەیی شووتییەکی گەوره لێك کردنەوه.

ئەقدەس خانم که تازه خەریك بوو دەچووه ژێری و وەنەوزی دەدان بەدەنگێکی رەنجورانەوه گوتی: ((کەریش ((دڵی)) وا گەورەی!)) و کەوتە قاڵدوان و خەوی لێکەوت.

ئاغای سەفوەتی هەروا گورزە تریاکەکەی بەنیوەچڵی لێگەڕا.

(چەندساڵ دوای شەڕ هەڵگیرسانێ که ئەڵمانییەکان هێرشیان کرده سەر رووسەکان قسەی دەوری مەقاڵەی تریاکێ رەونەقێکی بەرچاوی پەیداکرد. دەیگوت: ((ئێستا دەزانی له کوێن؟ - ئەڵمانییەکان دەڵێم- دەڵێن خەریکن دەگەنه هەشتەرخانێ... دەزانی یانی چی؟ یانی وەکو... وەکو ئێره باکوته... ئێرەش قەوقازه... ئێرەش هەشتەرخان... ئەها، ئێرەیه!)).

شوێنی باکوت و قەوقاز و هەشتەرخانی لەسەر خۆڵەمێشه ساف کراوەکەی ناو مەقاڵەی ئاگری تریاکەکه دەست نیشان دەکرد ((دەزانی... دوو هەنگاوه رێیه... هەر تەکانێکی بدەن کار تەواوه)). چاوی بابم تروسکەیان دەهات. له دوو هەنگاوانیش کەمتر- لەوجێیەی که خەڵووزەکه نەگەشابۆوه ئەوە دەریای خەزەر بوو... چ نێزیك! دیار نەبوو بۆ هێندەیان خۆ گنخاندووە!)).

ئاغای سەفوەتی لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: وجا ئەوە ئێستا چت دیوە؛ جا ئەدی ئەگەر خەیاڵی گرتنی عیراقێشی لەسەریدا- ئەعالی حەزرەتی خۆمان دەڵێم: لەبەرئەوەی کە عێراق هەرماڵی خۆمان بووە و ئەوە قسەی لەسەر نییە- تاقی کیسرا لەمەداین ئیدی خۆ ئەوە نکوڵی لێکردنی هەر نییە، وەنا؟)).

((ئەدی)).

((بەو شێوە ئێرەش بووە ناوەندی لەشکری، یا تەنانەت سوپا...)).

بابیشم هەر پەسەندی بوو، کاتێ کە ئێرە ببێتە ناوەندی لەشکر و سوپا گومانی تێدانییە کە پلەوپایەی دایەرەکانیشی هەموو بەرزتر دەبنەوە و هەڵدەکشن...

دەو دەمەیدا تەلەفۆن زەنگێکی دوور و درێژی لێدا، و ئاغای سەفوەتی وەك کێچ لەجێی خۆیرا راپەڕی. رەنگی زۆر تێکچوو. گوتی: ((تازە، تێچووین!)) لە نیوەی رێیە دەگەڵ زەلام و تەلەفۆنێدا گەینە یەك: زەلامە تەلەفۆنەکەی بەدەستەوە گرتبوو؛ ئەقدەس خانم پرخەی دەهات، عەزیزە خانم بە حەپەساوییەوە دامەنی کراسی و لێوەکانی هەڵکشیبوونەوە، پێستی سپی لەشی و ددانە رێك و ریزەکانی وەدەرکەوتبوون- ئاغای سەفوەتی گۆشی تەلەفۆنەکەی گرت، پێیەکانی جووت کردن و گوتی: ((سلاو جابی سەرهەنگ! —هەر ئێستا بۆ خۆم دەیهێنمە خزمەتتان... هەر ئێستا- فەرمایشتە)). کەم کەمە دەگەڵ تەلەفۆن و زەلامەکەیدا هاتنەخوار بەرەکەی و ئێمەش هەموو، سەرسام و شلەژاو دانیشتبووین. ((ئەسکینناسەکان گەورە بن یا ورد... یا... سەرم لەرێیە...)) پشتەلێوی ئارەقەی دەردابوو؛ دەنگی زیکەدارتر ببوو. کە قسە هاتە سەر ئەسکینناسان هەموو هەناسێکی ئاسوودەییەیان هەڵکێشاو دەچاوەڕوانییەدا نەمان، و بارودۆخی سەرسامییە عەزیزە خانمێ کە بابمی دڵگیر و نێگەران کردبوو رەوییەوە. دەستێکی بەقژە لوولەکەی سەر نێوچەوانیدا هێناو لەسەرچیچکان جێی خۆی خۆش کرد و زەردێکی هاتێ. ئاغای سەفوەتی داوای چەکمە و قایشی پشتێ و کلاوەکەی کرد. بە پیاوەکەی گوت چرا لۆکسێکی دی هەڵکا. پۆزشی هێنایەوە، گوتی تا دەفتەری ((نووسینگە)) سەرهەنگی دەچێ، جەناب سەرهەنگ داوای پارەی کردووە- دەڕوا، دەگەڕێتەوە-و دەڕوا...



دیسانەوە قسە هاتنەوە سەر باسی سۆزانییە- ئەوەیان بابم بوو باسەکەی هەلایساندەوە. عەزیزە خانم نارەحەت بوو- نارەحەتی ئەوەی کە بۆ هەر هەموویان نەکوشتوون، کە ئەوانە تێکرا شوورەیی و لەکەی ناوچەوانی کۆمەڵن ((وال-لا!)) بەروخسارێکی تووڕەوە، کە بۆ هەموویان بەجارێکی نەکوشتوون و کۆمەڵیان لێ ئاسوودە نەکردوون ((وال- لا!)) و ئەم ((وەڵلا))یەی، بەلێو جولاندنێکی واوە دەگوت، هەر مەپرسە چەند شیرین و دڵگیربوو...

((لە هەمەدانێوە وەرێ کەوی و بێیە ئێرە، بۆ ئەوەندەی! دە توخوا وەرە!)) ئەوە دەنگی ئەقدەس خانمێ بوو کە لە خەوێ رابوۆوە: ((ئەو هەموو کێو و بەندەنانە، ئەویش ئاوا!)) ئاماژەی بە پیاوێکی دەکرد کە سۆزانییەکەی کوشتووە: ((سەگباب، تۆ کە هەر هاتووی، نەدەبایە کارێکی یەکڕاست و حیسابی ئەنجام دەی... ئەوانە هەر بە توخم و تۆ و پیس و خراپن- هەرچییەکیان لێبکەی هەرکەمە. ئاخ بۆ پیاوێکی دەستێکی دەوەشاند و هەموو ئەو ژنە بەرهەڵدایانەی هەر لەو سۆزانییانەوە تا ئەو سۆزانییانەی دەمالانیشدا هەن یەك جێ کوشتبان و ماڵ و حاڵی لێ ئاسوودە کردبان!)) و هێڵنجێکیدا. بابم واقی وڕما: هەموو هەر حەپەساین؛ عەزیزە خانمیش پەشۆکاو دیاربوو بەرگرییەکی زۆلانەی پێشاندا، زەردەخەنەیەکی مانادارى بەلای لێوەکانیەوە نیشتبۆوە. هەروەك لەو دواییانەدا گوتی لە ئەقدەس خانمێ بیستووە کە عەزیزە خانم منداڵێکی دوو مانگانەی فڕێداوە. ئەقدەس خانم بەدەم هێڵنجانەوە گوتی: ((دیسانیش سەد رەحمەت لەو کوردە پاپەتیانە... بەوەی دەڵێن غیرەت!)) هەموو بەروخسارێکی پڕ لە چاوەڕوانییەوە سەیری ئەومان کرد- ئاشکرابوو کە دراوسێیەکەی تەنیشتیان کچێکیان هەبووەو ئەفسەرێك داوای کردووە، و زۆریی بۆ داك و بابی کچەی هێناوە و ئەوانیش گوتوویانە کە کچێ نادەین بە بێگانان، لەبەروەش کە ئەفسەرە هەر وازی لێنەهێناون، هەستاون باریان کردووە و چوونەتە دیوی عێراقێ... هاتوونەوە ئەفسەرەی بکوژن لە ماڵێ نەبووە، لە باتیان خانووەکەیان ئاور تێبەرداوە و سوتاندوویانە.

بابم دیاربوو غەمێکی دیشی هەیە: لەوەی دەترسا نەکا هەر ئەورۆ و سبەیەکی عێراق بگیرێ. جا تا درەنگ نەبووە بنێرێ هێندێك بۆن و عەتر و گۆرەوییان بۆ ئەقدەس خانمێ- بۆ عەزیزە خانمێش- بێنن. دەنا لەوانەیە بقەومێ و ((خراپ)) رووبدا — و ئینجا ((لە چاوی!)) پەرداغی ئارەقێی بڵند دەکرد؛ دەگەڵ وشەی ((لەچاوی)) لە عەزیزە خانمێوە بازرەقەیەکی نیوە بازنەیی سەرنجێکی دە هەوایدا دەبەست و هەر بەلای عەزیزە خانمێشدا دەشکایەوە...

لەوەی پەست بووم. کە بابم جاری وابوو لایەنی سۆزانییە دەگرێ، و ئەو بە پاك و بێگوناه دەزانێ و دەستدەکا بەجنێوان، بەو حاڵەشەوە ئەو خلیسکان و لەڕێ دەرچوون و هەوڵدان بۆ لە خشتەبردنێ بەکارێکی خراپ نازانێ. عەزیزە خانمێ دەبینم منداڵی دوو مانگانەی لە بارچووە و کەچی نەفرەتیش لەکاری سۆزانەتییە دەکا. تێناگەم. بابم و کەسانی دی هێندەیان درۆ دەگەڵ خۆیان و ئیدیدا کردووە کە ئیدی خۆیان لێ ونبووە و خۆیان نابینن یا ئەگەر بشبینن بەو شێوەیەی کە هەن خۆیان دەبینن، و بەهەر بیانووێکەوە بێ ویژدانی خۆیان دەخەپێنن. دەگەڵ یەکیشدا هەروا دوو روون، و رووی راستیان دەونێوە نێوەیدا ونبووە- و من تێماوم. ئەگەر بابم وەك دەڵێ وابێ، ئەو بەوجۆرە پیاوێکی چاکە. خۆ ئەگەر وەك ئەوەی دەیکا، ئەوە پیاوێکی هیچ و پووچ و سووکە. خۆ ئەگەر ئەمیشە و ئەویشە، ئەوە پیاوێکی ئاڵوودە و تێوەگلاوە- پیاوێکی دوو ڕووە. شەوێ تا چەندین نزاو پاڕانەوە و ویردان نەخوێنێ ناچتە سەرجێی و نانوێ، هەر دەگەڵ ئەوەشدا ئیدی ئەوە ئارەق و تریاك و کارەکەربازیشی بەردەوامە! ئاغای سەفوەتی عەزیزە خانمی لەبن پەڕوباڵی خۆی گرتووە، و سەرپەرشتیەی دەکا- تالاڕێ نەبێ و ((خراپ)) نەبێ- بەلاّم بەم جۆرە.

ئەمیر لەشکری خۆراوا- حەزرەتی ئەجەل- هەر کە لە ئۆتومبێلی دابەزی یەکسەر، چۆن دەروێشێك بە خزمەتی شێخەکەی بگات ئاوا دەستوبردییە دەکات و هەروەك دەبیسم، و لەو دواییانەش بەدرێژی بیستمەوە، هەر کارێکی کە دەکا، تۆبەی دەکات و خۆ لە گوناهان پاك دەکاتەوە. بەڕواڵەت لەبەرئەوەی نوماییندەی دەوڵەتە ئەوە لە خزمەتی دیندایە، بەلاّم هەر لە هەمان کاتدا بە پارەی خێرێ ((زانایانی دین فرۆش)) دەکڕێ و بۆ خزمەتی خۆی و دەوڵەتییان رادەگرێ... هەمووی هەر سات و سەودا، هەمووی هەر سوود و قازانج. هەمووی هەردوو رووییە و دەکار دەبرێ. پیاوگێژ دەبێ. بەقسەی دۆستێکی ((پەیوەندی نێوان دڵ و زمانان پچڕاوە))- پیاو سەرەدەریە لە هیچ ناکا؛ کامە راستە، ئەوەی کە دەیڵێن یا ئەوەی نایڵێن و هیچ کاتێ بەسەرزماناندانایە؟ ئیدی بەهەرحاڵ، من تێناگەم، و تۆش کە ویستت تێبگەی، و تا تێدەگەی، ئەوە پێوە بوو ویت و لێ بوویتەوە...

❊ ❊ ❊



## (١٠)

بەرەبەری خۆراوایە بوو، چوومە ماڵێ پوورە فاتمێ دەسکەوانێ بێنم، تا مەلیحە زەنجەفیلی بۆ دایکم تێدا بکوتێ، چونکە دەیانگوت سەرمای بووە و دڵی ژانێ دەکا، چاوم بە بادانەوێ زەینەڵ پاسەوانی کەوت کە لە داوێنی ماڵێ پوورە حەنیفەیڕا تا بەر دەرکێ مە دەهات و دیسانەوە هەر بەو ڕێیەیدا دەگەڕایەوە کە پێیدا هاتبوو. هەردوو دەستیشی دەپشتەخۆیەوە گرتبوون و وەك سەرقاڵی شتێکی بێ، هەردەهات و دەچوو. دەمانچەی بە کەلەکێوە بوو. بە بابەگیانم گوت؛ بابەگیان گوتی ((دەزانم)) بە حەپەساوییەوە سەیرێکم کرد. گوتی: ((گوێم لێبوو؛ گوتم کە دەزانم!)).

نیو کاتژمێر دەبوو هاتبوومەوە. بابەگیان پەنجەی هەردوو دەستەکانی تێك ئاڵقاندبوون و سەری بەدەستی و بەلاشیپانی پەنجەرەکە کردبوو و هەروەك جاران دە هەوای رامابوو. دایی لە هەیوانێ بوو؛ من لەبەر پەنجەرەکە راوەستابووم سەیریم دەکرد، دایی، ئافرەتێکی خوێن شیرین بوو، بەلاّم دەردی مەرگی عالیە و دووری کاکەی دەموچاوە خڕیلەکەیان سیس و ژاکاو و پڕ چرچ و لۆچ کردبوو و ئەو سەروپرچە رەشە قەترانییەییان پڕ لە تاڵەمووی سپی هەڵگێڕابوو. حاڵی دایی هەمیشە لە دوو باران زیاتر نەبوو: ئەگەر نەگریابایە کش و مات و بێدەنگ بوو. جاری وابوو هەروا لەخۆوە دەمەلیحەی رادەما- بەسەر و روویەکی غەماوی و پڕ داخەوە، خۆی رادەژاند، هەروەك بڵێ: ((هەزار حەیف بۆ ئەو چاو و برۆیانە، حەیف بۆ ئەو بەژن و بالاّیە- حەیف- تازە بەو لەکەیەوە کێ دەتخوازێ!)) جاری واشبوو وەك مندالاّن کە چاوی لە دووی دایکی نابێتەوە، بۆ هەر جێیەکی چووبام ئەوە چاوی هەر بەدوامەوە بوو، کە دەشهاتمەوە ئیدی ئەوە هەر هەمان سەروچاو و سەرنجە کش و ماتەکانی جارانیم وەك خۆی دەدیتنەوە و هەروەك خۆشیان بوون. وەك بەدوای مندا لەو وێنە ونە کاڵ بووە وانە بگەڕێ کە ونی کردوون و بەهاتنەوەی منیش لەگەڕانێ بکەوێ. وەك بڵێی ئەو وێنە خەیاڵیانەی بە هەواوە هەڵواسرابن یا

جێ پێیان دیاربێ و دوورا و دوور بە دوایاندا بچێ. بۆ کوێ؟ -بۆ هەمەدانێ؟ -بۆ ئەبەدییەت؟- کێ دەیزانی.

هەرچی بوو چاوەکانی هێندە بەم لاولادا گێڕابوون، لێوارەکانی گلێنەی هەردوو چاوی سواو و خورا بوون، وردە وردە چووك ببوونەوە، واش پێدەچوو تا هێشتاش چاوەکانی بە دیتنی ئەو وێنانە رانەهاتبن. ناتوانم بڵێم هەرگیز لەم بارودۆخەی ئێستای خۆی کە تێیدایە، جودا بووبێتەوە، چونکە هەر ئێستای بوو کە ئەوی بەرەو رابوردوو و ئایندە راکێشابوو. بەلاّم ئەو رابوردوو و ئایندەیەش- غەمی مەرگی عالیە و دووری کاکە- هەرچی بوو- ئێستای ئەویان دەخۆوە پێچابوو.

هەروەك بە دیتنی من یا دیتنی وێنەیەك کە بوونی راستەقینەی ئێمەی وەبیر بێنێتەوە، هاتەوە سەرخۆی و دەستی لەکارکردنێ کێشایەوە، چ کارێك! جاری وا دەبوو لەگەنێکی چەند سەعاتان وەبەر شوشتنێ دەدا و هێندەی دەسووەوە و هێندەی ئاوپێدا دەکرد چ جلوبەرگی خۆشی نەدەهێشتن و هەمووی دەئاوێدا شەلاڵ دەکردن، تا مەلیحە دەچوو و ئەو لەگەنە کلۆڵەی لەبەر دەستان دەردێنا و لە سووینەوە و پەڕپووت کردنێی رزگار دەکرد.

دەستی لە ئیشێ بەردا و دە سەروچاومەوە راما. سەیرێکی روخساریم کرد، هەر ئەو سەرنجە چەسپاو و پەرتەی جاران بوو، زۆر لە سەرەخۆ، هەروەك لەشتێکی سادەی رۆژانە بدوێ پرسی: ((عالیە شێوی خوارد؟)) بەکش و ماتییەکەوە سەیرێکم کرد؛ چاوێکم بەم لاولادا گێڕا؛ مەلیحە بەسەر ئاماژەی کردمێ بڵێ ((بەڵێ)) گوتم: ((بەڵێ، هەر ئێستای خوارد))و سەرم بەردایەوە.

بابەگیان هاواری لێ هەستا- گوێی لێ ببوو. گوتی: ((ئاخری و ئاقیبەتی ئەوەندە ئابڕووەی لێرە لەو کاولە وێرانەیدا ماومانە ئەویش دەبەی!)) و دەنگی بڵندتر کرد: ((ژنێ... وەرەوە سەرخۆت... هێندە خۆت گێل و وێل مەکە! بە خودای شێتت کردووم... بەو خودایەی کارێکی وا دەکەی روو لەکێو و بیابانان کەم... بەسیەتی... بەسیەتی ئیدی، هەناسەت لێبڕیم!)).

دایی هەروەك جاران وەلاّمی نەدایەوە، و دە هەوای رامایەوە- پیاڵە و ژێرپیاڵەی دەشوشتن. ئێوارە بوو؛ بولێڵی ئێوارێ بەرەو تاریکییە شۆڕ ببۆوە؛ تەمێکی مۆر باڵی بەسەر کێڵگەکانی



نزیکی پیر سلێمان و داوێنی ئاربابا و دەشتی کەنار رێ و رووبارێدا کێشابوو و ئەو بولێڵەی خەستتر کردبوو؛ قاڕو قوڕی قەلەڕەشکانیش ئاسمانیان پڕکردبوو- دەنگی ژاوە ژاوێکی تاك و تەراش، جارجارە لەو ناوە دەهات. خەڵکی لە مزگەوتێ هاتبوونەوە یا خەریکی هاتنەوێ بوون؛ یا لەسەر سفرەی شامێ دانیشتبوون، یا خەریکی دانیشتنێ بوون؛ شاڕێیەکەی دەچۆوە کاروانسەرایەکەی کەلایی چۆڵ بوو: ئەو رۆژانە هاتوچۆی لە جاران کەمتر بەسەرەوە بوو. مەلیحە ئاوری کردبۆوە، تا هەم سەماوەری پێ تێهاوێ و هەم لە نەوتێش بگرێتەوە- دار و بار هەرزان بوو: ناوچەیەکی جەنگەڵی بوو، بڵێسەی ئاگری وە هەوا هەڵدەچوون و دادەکەوتنەوە؛ ئاگرەکە تا دەهات وردە وردە دادەمردەوە، چەند جارێکیان نەبێ وەك چاوی سەی نیوە نوستوو، لەپڕ تروسکەکی دەدا و بیرو بەوێدا بلاّو دەبۆوە و نەخشە رێڕێیەکەی بەرەو گوپی سەماوەر و لا دیوارەکەی دەبرد و رووناکی دەکردەوە، و وێنەی من و بابەگیانی، بە زەبەللاحی و خوار و خێچی بە دیواریەوە دەنەخشاند، دەنا هیچی دیکە نەبوو، و تروسکەی لێدەبڕا...

مەلیحە چوو پیاڵە و ژێرپیاڵەکانی لە کۆت و بەندی دەستی دایی رزگارکردن، و دەگەڵ داییدا پێکەوە هاتنەوە ژوورێ. بابەگیان گوتی چرایەکەی پێکەن. مەلیحە لامپایەکەی لەسەر تاقێ هێنایە خوارێ دایگیرساند. بەلاّم هێشتا شووشەی لامپایەکە گەرم دانەهاتبوو و پلێتەکەیمان هەڵنەدابوو کە تەقەی دەرکی حەسارێ هات- زۆر لەسەرخۆ، لە تەقەی دەرکە لێدانی دیکە لەسەرەخۆ و هێورتر. هەموو لەجێی خۆمان راپەڕین، و دایی لە پێش هەمووانەوە، بە روخسارێکی ئەوتۆی واوە کە چەند مانگێك بێت چاوەڕێی تەقەی ئەو لێدانە بێت. هەر لە پەنجەرێوە هاواری کرد: ((کێیە؟)) یەکێك زۆر بەسپاییەوە گوتی: ((بیکەوە، منم!)) بە بیستنی ئەو دەنگە سەرتاپای لەشی دایی وەلەرزە کەوت؛ رەنگ و رواژای تێکچوو؛ بە شڵەژاوییەوە هەستا، رایکرد- هێندەی نەمابوو سەماوەر و چرای تاین بەچمکی داو و تەژگەڵی بەسەریەکدا قلپ کاتەوە. تێوە خوڕینێ بابەگیانیشی هەردە فریانەکەوت: خۆی بە لاشیپانی دەرکی ژوورێدادا و بە رەتەلاّنەوە بە دالاّنەکێدا هەلاّت، و تا ئێمە وەخۆکەوتین ئەو چوار پلیکانەی کردنە یەك و خۆی گەیاندە دەرکی حەسارێ: دەگەڵ پیاوێکی —لاوێك- کۆڵەگیا بە کۆڵێوە و لینگە کەوشێك بەدەستەوە، رووبەڕوو بوو...

دایی وشك بوو؛ بە شڵەژاوی و واقی وڕەوە گوتی: ((کێت دەوێ؟)).

ئەو ڕۆژانە تاك و تەرا كرێكاری تورك لەو ناوەبوون. دایی بە كۆڵەگیایەكەی كۆڵیەوە وایزانی ئەمەش یەكێكە لەوانە هەر كە پیاوە —لاوە- دەنگەكەی بەرگوێ كەوت كۆڵەگیا و لینگە كەوشەكەی دانان و دایی دە ئامێز وەرێنا. دەگەڵ گەیشتنە حەسارێماندا ڕووبەڕووی ئەو دیمەنە بووینەوە. مەلیحە زریكاندی: ((كاكەیە!)) و بێ ئیختیار نیوەی دووەمی وشەكەی بە دەنگێكی زۆر نزمەوە دیزە بە دەرخۆنە كرد، و بەگریانەوە خۆی بە ملیەوە هەڵواسی، منیش بێ ئیختیار دەستم لە لاق و لەتەر و ناوقەدیەوە، وەرێنا. كاكە منی بڵند كرد و ماچیكردم- منیش ئەوم ماچكردەوە. دایی كش و مات و بێدەنگ و واق وڕما بوو، و دەلەرزی. چەند دەقیقەیەكی خایاند تا توانی خۆی دەگەڵ ئەو بارودۆخە تازەیەدا بگونجێنێ. بابەگیان لەو سەرەوە بە ددان دەچیڕەوە بردنێوە بە دەنگێكی لەرزۆكەوە گوتی: ((دە هەر نەبێ دەركێ داخەن!)).

دەركەمان داخست. دایی هەروا دە روخساری كاكەیەوە مۆلەق ببوو- ڕەنگی سپی هەڵگەڕابوو. تائێستا كەس هیچی لەزاری نەهاتبووە دەرێ، دایی بە سپایی چووە پێشێ؛ سەری بە شانی كاكەی كرد- و لە هۆش چوو كاكە تاویدایە و هێنایەوە ژووری...

دانیشتن. بە تەواوی نازانم داخوا دایی وەهۆش هاتبۆوە یان نا، كە بابەگیان بە روخسارێكی واوە كە شتێكی زۆر گرنگی وەبیر هاتبێتەوە رووی لە من كرد و گوتی: ((هەستە، راستبەوە؛ هەر خێراو دەستوبرد بچۆرە ماڵێ پوورە فاتمێ، بڵێ... شتێكی بڵێ!...)) ئەو رستەی دوایەی دەگەڵ مەلیحەی بوو. مەلیحە گوتی: ((بڵێ دەستەكە[1] نانێكمان بدەنێ)).

بە دڵگرانییەوە هەستام. بابەگیان گوتی: ((ڕاوەستە، قسەكەم تەواو نەبووە... هەروا كە دەچی، لە چوون و هاتنەوێشتدا، سەرنج دە داخوا پاسەوانەكە هەر لەوێیە یان نا... وا نەڕوانی كەست تێبگا- تێگەیشتی؟ ئیدی نەچی هەر بەولاولایاندا مل بادەی و بڕوانی... پەلەش ناكەی- ئیدی خۆ گەورەی، دە هەموو شتان دەگەی)). كاتێ نیگەرانی و دڵگرانییەكەی چوونێی دیتم گوتی: ((مەترسە، تا دێیەوە هەر لێرەیە)).

نیگەرانی ئەوەیبووم، نەكا تا من دێمەوە ئەو ڕۆیشتبێ. ((پەلەی مەكە!)).

[1] دەستەكە نانێك: سێ چوارنان.



كاكە گوتی: ((نا، بابەگیان، غەمت نەبێ، كەس لەو دەور و بەرانە نەبوو. بۆیەش هەر بەتایبەتی ئەوكاتەم هەڵبژارد، چونكە دەمزانی ئەو دەمانە خەڵك هەموو بۆ شام خواردنێ چوونەتەوە ماڵێ... سۆراغی ماڵێم لە ژنە كوردێكی كرد. رووم دەماڵێكی دی كردبوو...)).

دایی، وەك لە ترسان و لەبەر دڵەڕاوكەی خۆی زیاتر بەهۆش هاتبێتەوە و هەردوو چاو و ڕوو و تەواوی بوونی خۆی دە روخساری كاكەیەوە بڕیبوو و زۆر بە تووڕەیی و گرژییەوە دەستی بۆ لالێویەوە برد و گوتی: ((وەی، قوڕم بەسەری! مەگەر چۆن؟ -چوویە كوێ!؟)).

((ئا ئەم خانووەی ئەم لایەوە...)) بەدەست ئاماژەی بەلای شانی چەپیدا كرد. ((قەیرە كچێك وەلامی دایەوە... ئێرەی نیشاندا)).

((باشە، سوپاس بۆخوا)) دایی تاوێك هێور بۆوە. ((باشە، عەیبی نییە... زێنە بێ كچێ پوورە حەنیفەی بووە — هیچی گوت؟)).

((نا، هیچی نەگوت... دەموچاویشی چاك نەدیتم، ئەو كۆڵەبارەی پشتێم هەموو شتێكی شاردبۆوە. لینگە كەوشەكەی... گوتم كە چكارەم)).

بابەگیان گوتی: ((بەهەرحاڵ، وریایی هەر باشە زیانی نییە... جارێ لەپێشدا ئەوگیایەی بەرنە ژووری ئاودەستێ و لێرەی لابەن، با لەبەرچاوان نەبێ... نا، ئاودەست نا... بڕۆ بیهێنە... ئاگات لێبێ هیچی لێ هەڵنەوەرێ...)) مەلیحە چوو و كۆڵەگیایەكەی هێنا. و بابەگیان لە پەنجەرەی پشتخانێوە یڕا هەڵداشت و ئاودیوی دەرێی كرد... ئەوجا هاتەوە... ((وریایی هەرچاكە —بڕۆ كوڕەكەم... برۆ باش سەیركە!)). چووم، مەلیحەش هات و دەركەكەی پێوەدا، بەو جۆرە كە هەر لێرەبێ و ئاگای لە دەركێ بێ تا هەركاتێ من دێمەوە بێ ئەوەی پێویست بە لە دەركەدانێ بكا دەرگام لێبكاتەوە.

چووم، بە وردیم سەرنجی ئەولاولایدا. كەس دیار نەبوو. پوورە فاتم بە تەنیایی لە هەیوانێ دانیشتبوو. هەر كە گوتم چمدەوێ وەك هەموو خێرخوازێكی كە —تەنیا دەكتێباندا- دەیانەوێ چاكەی دەگەڵ خەڵكی بكەن و چاكەكەش بەسەر و ڕوویەكی گرژ و مۆنەوە، لەپێشدا هێندێكی ئامۆژگاری كردم كە ماشەڵلا ئیدی ئەوە گەورە بوویمە، ئیدی نابێ چیدی هێندە لاساربم، ئەوە تازە پیرەمێرد و پیرێژن تووشی داوی خۆیان هاتوون (مەبەستی دایی و بابەگیان بوو) دەبێ

زیاترم ئاگا لێبێ، لە وەختدا بچمەوە ماڵێ، و نان و ماستێك، یا هەر شتێكی دیكەی پێویستییان بۆ بكرم... ((ئەدی كوڕی خۆم)). بەرەو ناندێنێیەوە چوو، كەندووە گڵێنەیەك بوو. هەروا بەدەم دەستەكردنێ نانەكانەوە پرسی: ((گوتیان هەریەك دەستەك... زیاتریان ناوێ... رەنگە زیاتریان گوتبێ و تۆ لە بیرت نەمابێ؟ ئەگەر پێت خۆشە دوو دەستەكان بەرە؟)) گوتم نا، لە بیرم نەكردووە هەر ئەوەندەیان گوتووە. هەردەستەكەی سێ نان بوو. نانەكانی دامێ. گوتی: ((راوەستە، مەڕۆ!))و لەپشت ناندێنێیەوەش دوو هێلكەی دەرێنان. گوتی: ((ئەوانە بدەرە دایكت، بیانكاتە دەڵەمە و بیانخوا... با هێزێكی بێتەوە بەرێ)). و وەك دەگەڵە خۆیدا بڵێ درێژەی دایە: ((گیانی لێبڕاوە —ژنەی تاین هەر تواوەتەوە!)) گەڕامەوە ماڵێ؛ لە گەڕانەوێشدا سەرنجم دان —كەس لەو دەوروبەرە نەبوو. هەر كە گەیشتمەوە مەلیحە وەك هەموو جاران لەپشت دەركێوە بەلچ و لێو و نێوچەوانی گرژەوە گوتی: ((ویش!)) وامزانی دە دنیای خەیاڵاندا نقورچیان لێگرتووە، پێی وابوو رەنگە بەو تاریكانەی چووبمەتە كەلایەنێ! ئیدی ئاگای لەوەی نەبوو لەوەتەی رۆیوم ئەوا هەر گوێم بۆ هەللەق مەللەقان راگرتووە.

گوتم كە نە لە رۆیشتنێ و نە لە هاتنەوێمدا كەسێك لەو دەوروبەرانە نەبووە. بابەگیان كەمێكی خەیاڵ ئاسوودە بوو، بەڵام هێشتاش هەر دڵی ئاوی نەخواردبۆوە، كە نەوەك پاسەوانەكە چوو بێت پاسەوانێكی دیكە بانگ كات. نەدەحەجمی، بێ ئەوەی هیچ بەكەس بڵێ، هەستا و چووە پاشخانێ؛ چەند دەقیقێكانی ئەوناوە بە سەح كردەوە —نەمدەزانی لە چ دەگەڕێ. دیسانەوە بەهەمان تەنگەتاوییەوە گەڕایەوە؛ زۆر خێرا دانیشتەوە و بە كاكەی گوت: ((دەو پاشخانەكە پەنجەرەیەكی چكۆڵەی روو بەرەو باكووری تێدابوو كە بەسەرتەواوی ئەو دەشت و رێ و بان و رووبارەی دەرێیدا دەڕوانی. ئەگەر لەوێڕات خۆ هەڵدابایە- یانی هەروا تۆزێكت لەخۆ رادیتبایە- لە نشێوێنڕا با دەدایەوە و یەكسەر دەچوویە دە ((باغی سوڵتان))یەوە، كە لە راستیدا باغ نەبوو، زەوییە رەقێك بوو بەپاڵ تەپۆلكەی قەڵاتێوە و سەرێكی بە ماڵێ مەوە و سەرەكەی دیكەی بە دامودەزگای كەلایی رەجەبییەوە بوو و لەولاشەوە سنورەكەی تا دەم چۆمی بوو. چۆمەكە دەو وەرزانەی ساڵێدا زۆر بوو- هەموو جێیەكیشی تەنكاو بوو. سەردەمانێك كە بێكار دەبووم چەند سەعاتێكانم بەپێوە لەو پەنجەرەیڕا دەرێ و بان و لە تەپوتۆزی هاتنی ترومبێلێ دەڕوانی. كاكە هاتەوە، و دانیشتەوە، و بۆ روونكردنەوێ دە سەرو رووی بابەگیانییەوە راما. باوەگیان گوتی: ((هەموو ساتێك لە گوینە پێ وەربن... تائێستا



دوو سێ جاران پێ وەربووینە، و سەرتاپای ماڵێیان پشكنیوە. ئەگەر هەركاتێ هاتن، هەر لەو پەنجەرەیڕا خۆ فڕێ دەدەی و ئاودیو دەبی... ماشەڵڵا جحێڵی، هیچت لێنایە... و خۆت دە تاریكییەدا وندەكەی. هەر كە دەنگی دەركی حەسارێت بیست... جا هەر كەسێك بێت... تۆ خۆت باوێ پاشخانێ. ئەگەر كەسێكی وابوو من لە حەسارێ و دە داڵانەكێدا دەیكەمە هات و بات و شیڕەشیڕ، و ئیدی تۆش هیچ راناوەستی... باشە؟)).

كاكە گوتی: ((باشە)).

بابەگیان گوتی: ((باشە، دەی ئێستا بڵێ!)).

((چی؟)).

((هەموو شتێك. لە هەوەڵێوە... لە هەوەڵێوەمڕا بۆ باس كە، بزانم ئەو بەڵایە چ بوو، و چۆن لە ئاسمانێڕا داباری، و بۆ تەنیا بە یەخەی ئەم چەندانەی مەوە نووسا...)).

كاكە دەبیر و خەیاڵانەوە چوو؛ پەنجەكانی بەسەر لێو و چەناگەیەوە كەوتنە گەمان، و لەپڕ وەك لێوەكانی بایەكی گەرمی داغی لێدابن وشك هەڵگەڕان و سەرنجی چاوە جوانەكانیشی دەخەت خەتی بەرەكەوە بڕین. دەو دەمەیدا گنجێكی باریكەڵەی لەسەرنێوچەوانی پەیدابوو كە دەگەڵ هەر زەردەخەنە و پێكەنینێكیدا بە تەواوەتی وندەبوو و نەدەما. ئەو دەمانەش كە پێنەدەكەنی و دە بیر و خەیاڵانڕا دەچوو، ئیدی ئەوە روون و ئاشكرا پێوەی دیاربوو. بەڵام هەرچی بوو جوان بوو. شێوەی دەم و قەیتانی لێویشی هەروەتر، بابەگیان بەبێ ئارامییەوە بێدەنگیەكەی شڵەقاند، و گوتی: ((كورت و كرمانجی... هەر لە هەوەڵێوە... كە چۆن ئەو پێشهاتە روویدا... دوایەش، دەزیندانێدا... ماڵێ ئەو پیاوەی كە...)).

دایی گوتی: ((زەلیل بن، ئینشاڵڵا!)).

كاكە وەك موتاڵای كتێبێكی نادیاری تەواو كردبێ، بەسپایی سەری هەڵێنا، دەم و هەنیەی دە بارودۆخێكی تایبەتیدا بزواندن و بەسەرهاتی كوژانەوەی ئوتومبێلی حەزرەتی ئەجەل و ئەو گفتوگۆیەی نێوانیانی هەر بەو شێوەیەی كە بۆ دایی و مەلیحە و منی گێڕابووە وە- ومن هیچ شتێكی لەو بارەیەوەم لەبیر نەمابوو- بێ گوێدانە ئەو تووك و نزاو سینگ كوتانەی دایی كە لەو پیاوە و توخم و تۆرەمە و رەچەڵەك و عێل و عەشیرەتەكەی دەكردن و دە نێوان چاو

زەقکردنەوە و فیشەفیشی تووڕەیی بابەگیانەیەوەڕا، سەرلەنوێ بە کورتی دووبارەی کردەوە. نەیزانیبوو کە بابەگیانیشیان هەرگرتووە، و کاتێ زانی، زۆری سەرسوڕما، و یەکجار نارەحەت بوو. هەرگیز ((کیژە))شی لەوێ نەدیبوو. لەجیاتی عالیە بە بێژەی ((کیژە))ی ناودێنا و ئەویش زۆر بەتوڕەیی و نارەحەتییەوە. هەرکاتێ دەهاتە سەر ناو هێنانی وی تێکڕا دەبوو، وەك بۆگەنیوێکی زۆر ناخۆشی بە کونەلووتاندا هەڵاچووبێ. ((کیژە درۆی کردبوو. ئەو هەرگیز نەیدیبوو. دایی سەرتاپای سەرسامی و ئەوق و زۆر شتی دیکەبوو، کە من ناتوانم باسیان لێوە بکەم... ((کچە بێچارەکەم! هەوڵی دەداو دەیهەویست ئێمە غەمێ نەخۆین!... بێچارە!)) و دەستی بە خۆهێنان و بردنێ کرد. کاکە نارەحەت بوو.

بابەگیان گوتی: ((دەی تۆ خەریك بە، بیلێ... کارت بەو قسانەوە نەبێ... تۆ هەر خەریکی گێڕانەوێ خۆت بە... دوایی؟ لەوێ چت دەکرد، چی دەگوت... باشە خۆ ئەو پیاوە شێت نەببوو، دەبێ شێت بووبێ کە ئاوا تۆی گرت... بلێ...!)).

کاکە چاوێکی بە هەر چوارلایاندا- بەمە، بە ژووری، بە هەموو لایەکیدا- خشاند. من وەك بێچوە پشیلە خۆمم بەویەوە نوساندبوو، و سەرم دەبن باڵی نابوو. گەرمی و بۆنی ئارەقەی لەش و بن هەنگڵیم بەچاکی هەستدەکرد. سەیر ئەوەبوو نەك هەر بەو بۆنەی ناراحەت نەبووم پێشم خۆش بوو! خۆم بەسەر رانیدا دابوو، و رووم تێکردبوو و چاوم لە روخسارییەوە نە دەتروکاند، دایی وەك داوەری یاریی بۆکسێنێ یەك دوو جارانی ((هوشیار)) دابوو: ((ماندووە!))-یانی ئەوە پێت دەڵێم! بەڵام من لەوە دڵنیابووم و دەمزانی کە ئەو یارییە دەرکردنی تێدانییە- هەموو جارانیش کاکە دەیگوتێ: ((نا، دایە، وازی لێ بێنە، چۆنی پێخۆشە- ماندوو نیم)).

بابەگیان گوتی: ((بلێ- ئیدی منداڵەکانیش هەموو شتێکی دەزانن... هەموویان دەماوەی ئەو دە ساڵەیدا پیربوون... هەموو دەزانن- بلێ، گوێ مەدەیە!)).

کاکەی داڕماو، هەناسێکی هەڵکێشا: ((ئاه-ە) چرچ و لۆچی هەنیەی زیاتر وەدەرکەوتن؛ سپی بوو، زەردهەڵگەڕا، و هێڵی کۆتایی لێوی لۆچی تێکەوت. هەروا کە رووبەڕوو دەیڕوانی گوتی: ((بڵێم چی...)) راوەستا: ((دیاربوو ئازاری هەیە و نەخۆشیشە... ئەو هەموو کوێرەوەرییە گاڵتە نییە...)).



((دەگەڵ ئەوەشدا...)).

کاکە کەمێکی خۆ هێناو برد، وەك ئەوەی چیرۆکێ بۆ دەر و دیوار و دەرگای پاشخانێ بگێڕێتەوە، دە هەوای رامابوو، و بەرەنگ و رووی هەڵبزڕکاو و لێوی وشك و دەنگە لەرزۆکەکەیەوە کە کەرخی کەوتبۆیە گوتی: ((ئا-هم! ئەو دوو سێ رۆژانەی کە لە ئاسایش ((ئەمنییە)) بووم...)) بابەگیان بە دەموچاوێکی حەپەساوییەوە گوتی: ((ئاسایش بۆ؟ بۆ لەسەرایە نەبووی!؟)) ((نا؛ هەر لە هەوەڵێوە بردیانمە ئاسایش)).

دایی گوتی: ((کوێراییان دایە ئینشاڵڵا... ئێمە هەموو رۆژێ خوا دایناوە، هەر لە بولێڵی بەیانییەوە، تا دەمە دەمی خۆراوایە وەك منداڵە هەتیوان لەبەر دەرگای ئەوکاولە وێرانەی رادەوەستاین و خێرە و مەندێك نەبوو پێمان بلێ لێرە نییە... هەر دەیانگوت نابێ!...)).

خەریك بوو نەیبڕێتەوە و هەر لەدووی بدات، بەڵام بابەگیان دەرفەتی نەدا. گوتی: ((بلێ... گوتم تۆ گوێ مەدەرە ئەو قسانە)).

کاکە بە دوای قسەکانیدا گوتی: ((دوو سێ رۆژان لە دایەرەی ئاسایش بووم. هەموو رۆژێ چ بەیانیان یا دوای نیوەڕۆیان، ئەو پیاوە دەییووسە، ئەو ئیسماعیل خانە بێ شەرەفە دەهات و ئامۆژگاری دەکردن و شەکری دەشکاند!... ئاخ، ئەگەر وەبەر چنگانم دەکەوت، دەمزانی چی لێدەکەم!)) سەرنجی چاوەکانی کەوتن، و فشاری لێوەکانی زیاتر بوون.

((باشە؟)).

((دەهات ئامۆژگاری دەکردن کە: کوڕەکە گیان، بەخۆڕایی منداڵ مەبەوە... ئەوانە دڵیان بە هێندێ خۆشە کە ریزیان لێ بگیرێ، و جەگەنیان بە پاشەڵێوە هەڵواسن... باشە ئیدی، دڵیان بەوشتانە خۆشە- هەی ناپیاوی بێ شەرەف!)).

((خوا کوێری کا... بە ئێمەشی هەروا دەگوت... خودا...)).

بابەگیان دووبارە چاوی سوورکردنەوە و گوتی: ((ئیدی؟)).

کاکە هەناسێکی هەڵکێشا: ((نازانم، بە خودای... نازانم چ بڵێم... ئەوە من هەر دەڵێم: ((باشە من هەر دەمەوێ بزانم منتان بۆچی، لەسەرچی، لەبەرچی گرتووە... کەمتەرخەمیم،

گوناهم، چیم کردووە- ماڵی کەسم خواردووە، بەدیواری کێدا هەڵژناوم؟ هەر نەبێ ئەوەندەم پێ بڵێن...)) ناپیاوەی بێ شەرەفەش بەخۆی و بەو لووتەی وەك لمبۆزی ئەسپی گەڕییەوە پێدەکەنێ و ددانە شفرە بەرازییەکانی وەدەردەخات. دەڵێ: ((ئەی بابە، ماشەڵڵا خۆ ئێوە خوێندەوارن.. بۆ ئیشی گەورانیش، حیساو و کیتاو هەس! خولق و خووی گەورە پیاوان وەك هەوای بەهارییە، دەمێکی وایە و دەمێکی واتر! ناو لەپی دەستی روو بە هەواوە بەرز دەکاتەوە و روو بەزەوی دەیهێنێتەوە خوارێ: ((دەمێکی ئاوا، دەمێکی واتر! لەوانەیە خوانە خواستە کارێکی وات کردبێ پێی ناخۆش بووبێ...)) کاتێ کە منێك دەمەویست نارەزاییەك دەربڕم، هەر بەو تفنکە پیسەیەوە دەڵێ: ((بەڵکە کارێکی واشت کردبێ لێی خۆش هاتبی...)) و قاقا پێدەکەنی- هەی بێ شەرەف!.

((هەرخوا دەزانێ...)) وەك دەلاڵێکی بیەوێ مەرە لەرێکی بەمل کریارییەوە کا: ((خوا بۆخۆی دەزانێ...)) قورمساغ!... ((خودا بۆخۆی دەزانێ، لەوانەیە خودا ئاوسی کات و جمکەی پێ فرێدا!)) من و مەلیحە پێکەنین. کاکە هەر درێژەیدایە قسەکانی: ((... هەر هێندە بەسە یەك دوو رۆژان قاوەڵتیەی بۆ بەریە سەرێ، یا شەوانە، دەمی نوستنێ، یەك دوو لاپەڕە کتێبانی بۆ وەخوێنی...)) بەهەرحاڵ، چووم- یانی بەدەست خۆم نەبوو، بردیانم... دوای نیوەڕۆ بوو. بردیانمە ژووری قەراوڵخانەی تەنیشت ژوورەکەی وی. چارپایەکی لێبوو، وە سسەلام: ((زیندانی تایبەتی))... کاتژمێر نزیکی چوار بوو؛ دەنگی راکردن و هیس هیس و وەرە و بڕۆی دەوروبەری دەروازە، ئەوەی نیشان دەدا کە گووسەگ دەیانەوێ تەشریفی سەگانەیان ببەن و بڕۆن. دوای چارەکە سەعاتێك هات و هاوار بڕایەوە؛ ئەو ناپیاوە هەمدیس پەیدابۆوە —جەنابی ئیسماعیل خان! ئەفسەری ئێشکچی وەك تولەسەی بەدوایەوە بوو- هەروەك ئێستا ئەو ئەفسەر بێت و ئەمیش ئیستیوار!

دەرگای کردەوە؛ بە ئەفسەرەی گوت کە ئیدی هیچ کارێکی بەو نەماوە. بە منی گوت وە دووی کەوم. لە حەسارێ تێپەڕین. خانووەکە شەرقی و غەربی بوو- یانی هەمەلایەنە بوو لەبەرئەوەی کە پەنجەرەی روو بە خوارو ژووررووی تێدابوو. بەڵام پەیکەرەی ئەسڵی خانووەکە، شەرقی غەربی بوو. لە پلیکانان وەسەرکەوتین؛ باماندایەوە و لە پلیکانەی دەدی وەسەرکەوتینەوە، کە گەیشتینە سەرێ، خانووەکە بووە دوو بەش: لایەکیان ژوورەکانی دانیشتنێ زەلامەکەی بوو،



لایەکەی دیش ژوورەکانی نوستنێی بوون. ژوورەکانی دانیشتنێی لەبارێ بەرەوە (خوارێ) بوون... نەچووینە وێندەرێ. دەرگای ژوورێکی کردەوە. کە چووینە ژوورێ، بەرامبەرمان چرایەکی رازاوە بوو، دەگەڵ دووکەرەوێتان، لە بەشی لای باشووری خۆراوایەوە بەرامبەر چارپایەکە، و موبێلەیەك لەلای خۆر هەڵاتێوە، بە تەك سەری چارپایەکەوە، چرایەکی نوستنێ و ژێر سیغارێك و زۆر لەو جۆرەشتانە هەبوون. ژوورەکەی هەموو پێشاندام، تا ئەگەر سینییەك یا کتێبێکیان دایە دەستم بزانم کێوەی دەبەم.

شەو درەنگانێك بوو کە بەردەستی ئاشپەزخانەکە بە روویەکی گەش و دەمی بە پێکەنینەوە و بەدەنگ و ئاوازێکی مانادارەوە هاتە هەمان ئەو ژوورەی بە تەنیشت قەراوڵخانەکەوە بوو، و گوتی بچم سینی حەزرەتی ئەجەل ببەم!...

چووم. ئاشپەزو بەردەستەکەی لەژێر لێوانەوە شتێکیان پێکتر گوت، و ئاشپەزەکە زەردەیەکی هاتێ و تەماشایەکی کردم، و بەردەستەکەش سەر و ڕووی خۆی تێکنا، و سەرێکی بادا، و لەبن لێوانەوە کەوتە جنێودانێ- نەمزانی بەکێ. سینی و پەرداغیان دامە دەستێ کە نەمدەزانی سینی و پەرداغی شەربەتێن یان ئی مەی خواردنەوێن- شتێکی مەیلە و زەردبوو، هەر راست وەك ئەسکەنجەبینی بۆ گەنیوێکی لێدەهات. کەوتمە لینگدانێ. حەسار و هەموو جێیەك رووناك بوو. لە پلیکانان وەسەرکەوتم، بەنووکی پەنجەی لە دەرکێمدا. لە ژوورێوە، هەروەك بۆقێکی، بەو دەنگە ناسازە قیڕقیڕاوییەیەوە گوتی: ((وەرە ژوورێ!)) چووم- سلاوم کرد. بێجامەی دەبەردا بوو، لەسەر چارپایەکەی، خۆی لەگەز دابوو. ئێم هەڵڕوانی، زەردێکی هاتێ. گوتی بچمە پێشتر- و ئاماژەی بۆ مێزەکەی تەنیشتییەوە کرد کە چرایەکەی لەسەربوو. سینییەکەم لەوێ دانا. بەدەست ئاماژەیەکی کرد کە نەمزانی ئاماژەیە دانیشم، بەلام ئەوجێیەی کە ئەو گوتی جێی دانیشتنێ نەبوو. دوو دڵ مام. گوتی: ((دانیشە!)) گەڕامەوە تابچم لەسەر موبێلەکە دانیشم، گوتی: ((هەر لەوجێیەی کە گوتم)). دووبارە ئاماژەی سەر چارپایەکەی کردەوە... بە ترس و لەرزەوە لەسەرلێواری چارپایەکە دانیشتم. گوتی: ((چاك دانیشە)). بۆ خۆشی پێی زیاتر لێ راکێشان و لەسەرلا درێژ بوو. گوتی: ((بشێلە!)) قاچیم شێلا... دوای تۆزێك گوتی ((بەسە)) هەستایەوە و چوار مەشقی لەسەر چارپایەکە دانیشت. ((جلەکانت داکەنە!)) بە حەپەساوییەوە تێم روانی: جلەکانم داکەنم!... ژوورەکە هەرچەندە

چلچراشی تێدابوو بەڵام هەر مەیلە و تاریك بوو. لەچرای سەرمێزەکەی زیاتر هیچ چرایەکی دیکە نەدابیسا. گوتی: ((گوتم جلەکانتان داکەنن... لەبەرئەوەی ماندوو بوویت- منیش حەزم لێیە تۆزێکتان بشێلمەوە...)) کە دووبارە دوو دڵیەکەی منی، یا بە گۆتەی ئەو ناپیاوە سەرپێچی منی دیت گوتی: ((ئیسماعیل خانم راسپاردووە هەموو کاروبارێکی خوێندنێت بۆ ئامادە بکات- دەمەوێ بتنێرمە تارانێ- دەتنێرمە دانیشگای سەربازی... جلەکانت داکەنە...)).

بە کورتی، تا سەرەنجام تووڕە بوو و بۆوە هەمان حەزرەت ئەجەلی جاران؛ پەنجەی بە دوگمەیەکی سپی لێواری مێزەکەدا نا: دوگمەی زەنگ بوو. هەر دوای ساتێکی کەم دەنگی پێی هاتنێکی خێراو بە پەلەهاتە گوێ، و تەقە لە دەرکێوە هات. هەربەو مرچ و مۆنییەیەوە گوتی: ((وەرنە ژووری!)) ئەفسەری قەراوڵخانە بوو. زۆر بەرەقیەوە گوتی: ((مەگەر ئەولاوە نەگیراوە؟ چۆنە وا بەبێ مۆڵەت هاتۆتە سەری؟)) من راوەستابووم و سەیریم دەکرد. زمانم گیرابوو- لەو هەموو هیچ و پووچییە! پیاو بڵێ چی! پیرەمێردێکی تەپیو، بەو روخسارەوە، لەو درۆیەوە، لەو... چم نەبوو بیڵێم. ئەفسەرە رەنگی لەرووان پەڕیبوو؛ دەلەرزی؛ کلاوەکەی دەبن هەنگڵێ نابوو- دەتگوت پەیکەرە... گیان لە لەشیدا نەمابوو... منی برد، قفڵێکی گەورەی لە دەرگاکەمدا... تا سبەینێ نیوەڕۆیە کەس لێی نەپرسیمەوە. دیسانەوە ئەو قوڕمساغە ناپیاوە هاتەوە. زۆری خۆ بە شڵەژاوی و پەشۆکاوییەوە نیشاندا. پرسی داخوا نیوەڕۆیە چم خواردووە. گوتم نیوە رۆژەم نەخواردووە. ئەدی قاوەڵتی بەیانی؟ قاوەڵتیشم نەکردووە.

زۆر سەرسام بوو؛ زۆری پۆزش هێنانەوە. زۆریشی پێناخۆش بوو... دەییوس! لەکاتێکدا لە سیریرا تا پیازی ئاگای لە هەموو شتێکە. من ئەودەمی ئەو شتانەم نەدەزانین؛ بەڵام دوایە تێگەیشتم کە دەوخانوو و ئاپارتمانەیدا، هیچ کارێك هەرچەندە بچکۆلانەش بێت بەبێ ئاگاداری وی ناکرێ، بە تووڕەییەوە بانگی کرد: ((رەحیم عەلی!)) رەحیم عەلی شاگردی ئاشپەزخانەی بوو- هات. ((بۆ نیوەڕۆژەی کاکەتان نەداوەتێ؟)) کردییە هەراو زەنا، و تەپوتۆزێك مەپرسە. نیوەرۆژەم خوارد، دواییش هاتەوە و کەوتەوە ئامۆژگاریان و رێ پێشاندانێم! من گێژ بووم، وەك خەونێ ببینم: حەزرەتی ئەجەل ئەمیر لەشکری رۆژئاوا- بەم جۆرە!؟... ئەوەی دەیگوت باوەڕم پێی نەبوو. ئاخر... ئـ-م... گوتی کە بەڵێ، چووە و بۆی پاڕاوەتەوەو گوتوویەتی منداڵە (یانی



من) و حەزرەتی ئەجەلیش بەو مەرجەی کەمن ((رەفتارم)) بگۆڕم چاو لە هەڵە و گوناهەکانم دەپۆشێ!... بەهەرحاڵ، قفڵەکەی کردەوە، و رۆیی. ئەو بێنەو بەرانە چەند جارێکان دووپات بوونەوە- و هەموو جارێکیش ئەو دەییوسە بە پاڕانەوێ چاوپۆشی ئەو قورمساغەی دیکەی لە ((گوناهەکانم)) بۆ وەردەگرتمەوە. سەر لە نوێ گرژی، و تۆپ و تەشەر و هەڕەشە: کە ئەگەر رەفتارم نەگۆڕم دەمنێرێتە سەربازییە بۆ بەندەر عەباسی و واو و وا؛ و دیسانەوە قفڵ و دووبارە ئامۆژگاری، هەر بە هەویای وەی کە من رەفتارم بگۆڕم... تا ئەو دەمەی کە تەشریفی سەگانەیان دەبردە مەڵبەندی سوپای ئەوە حاڵم بوو- ومن دەگەڵ ئەفسەرەکانی قەراوڵخانەیدا مامەوە- و لەولاشەوە ئاشپەز و شاگرد و کارەکەر و چەند قەراوڵێکی بەر دەرکێ- چونکە ئەو زەلامە بۆخۆی لەوێ بایە یا نەبایە هیچ جیاوازییەکی نەبوو، دامو دەزگایەکەی هەر بەردەوام بوو...)).

هەناسێکی قووڵی هەڵکێشا؛ دەستێکی بەرووومەتێدا هێنام، گەرووی ساف کرد و دووبارە گوتی: ((ئەفسەرەکان لە سێ چوارێکان زیاتر نەبوون کە بەنۆرە دەهاتن، پێك ئاشنا بووین؛ خۆشیان دەویستم و زۆرجاران دادەنیشتن و دەربارەی — دانیشگا و قوتابخانەکانیان دەدوان. ئێستا ئیدی دڵنیابوونەوە. تەنانەت زۆرجاران دەچوومە ئاشپەزخانەکەش. ژنێکی لێبوو؛ ژنێکی زۆر دڵسۆز و میهرەبان بوو- ئەو ژنەی کە گوتم- بەردەوام جنێوی دەدان. ئەو بوو کە بەسەرهاتی ((کیژە))ی بەدزی ئاشپەز و شاگردی ئاشپەزخانەی بۆ گێڕامەوە.

بریارمدا هەڵێم. دە دڵی خۆمدا گوتم هەر تەنیا هەڵاتن؟ ئەوەش هەر چارە نییە!... باشە ئەدی ئەمن ئەو دوو قوڕمساغانە لە کوێ وەگیربێنم؛ چۆنیان تۆڵە لێبکەمەوە؟ ئیدی ئازارێکی کەم نەبوو- ئەوە گوزەران و بارودۆخی ((کیژە)) ئەوە ئێوە، لەلایەکی دیشەوە دواکەوتنێ خۆم لە هاوڕێ قوتابییەکان و خوێندنێم- خۆ من بەخێری ناگیانم بە تەمای دیپلۆم وەرگرتنێ بووم...)).

دەستێکی بۆ نێوچەوانێ برد، وەك ئارەقەی پەڕیبێتە چاوی- مەلیحە پیاڵە چایەکی لەبەردەمی دانا- کەس ورتەی لێنەدەهات، کاکە لەسەرخۆ چایەکەی خواردەوە، دوایە هەر بەهەمان دەنگە لەرزۆکە کەرخەکەی، کە تەنانەت چایەکەش کەرخییەکەی لانەبرد، سەری دە دووا داستانەکەی نایەوە:

((ئەو بیرەم وردە وردە دەمێشکیدا بەهێزتربوو. وای لێهات لەوەی زیاتر بیرم لە هیچ شتێکی دیکە نەکردەوە. بۆ ئەنجامدانیشی زۆر رێگای پڕ پەناوپێچم دەبەرچاوان گرتن. بەلاّم کاتێ کە رێککەوت من هەرگیز ئەوشتەم دە خەیالّی خۆمدا دانەنابوو: رۆژێك- بەر لەسێ چوار هەفتان- لە زۆر بێزارییە تەنیاییەم چوومە ژووری ئەفسەری قەراولّخانەکەی. دوای نیوەڕۆ بوو. هەوا گەرم و شێداربوو... لە پێشەوەش یەك دووجاران چوو بوومە وێ. ئەفسەرێکی چاك و لەسەرخۆ بوو، کە چووم- نوستبوو. ئەودەمانەی ئەو ناپیاوە لەوێ بایە، نەیاندەوێرا کاری وابکەن. گەورەترین کارێکی کە لە دەستیان هاتبایە بیکەن ئەوەبوو کە کراسێکی درێژ دەبەرکەن و پێوەی راکشێن. ئێستا کە ئەو لەوێ نەبوو ئەفسەرەکە جلەکانی داکەندبوون و دەمانچەکەی لەسەر جلەکانی دانابوو، و پرخە و پفەی بوو... بێ ئیختیار هەناسەم لە خۆبڕی...)).

بێ ئاگایانە ئاوازی دەنگەکەی شل بۆوە، و هەناسەکەی دەسینگیدا تاساند.

((نازانم چۆن بوو- وەك شتێك دەگوێمدا بلّێ: ((هەلّیگرە، بۆ راوەستاوی، چاوەڕێی چی؟ هەلی لەوەی چاکترت بۆ هەلّناکەوێتەوە- هەلّیگرە!)) هەناسەم لەخۆبڕی؛ وردە وردە لە مێزەکەی نزیك بوومەوە- دەلەرزیم... دەمانچەکەم تاودایە... تا هاتمەوە سەرەخۆ ئەو هێزە دەستمی بەرەو باغەلّێ رادام! نارەحەت بووم سەیرم دەکرد ئەو پیاوە چ خراپەیەکی دەگەلّەمندا نەکردووە... بەلاّم ئیدی دەستم نەدەچووە دەباغەلّێمەوە... چۆنیەتی بەکارهێنانیشی هەر بۆ خۆیان دەو ماوەیەیدا کە هەر پێکەوە بووین، یا بۆ خۆ نواندنێ یا لە رووی ئەو پەیوەندیانەی نێوانماندا پێ نیشاندا بووم. دیسانەوە هەر بە فەرمانی هەمان ئەو هێزە نادیارەوە لەسەر پاژنەی پێمرا سوڕامەوە، و وردە وردە هاتمەوە دەرێ و پێش ئەوەی پاسەوانی سەر لاتەختی بەر دەرکێ لەوەنەوز و قالّدوی خەوێ وە ئاگابێتەوە من وەك بروسکە بە بەردەمیدا رەت بووم- و بامدایەوە- و ئەوجا هەلّێ!... ((... گوێم زنگەی دەهات، وەك هەزار تۆفانم بەدواوە بێت. دەنگی پاسەوانەکەم دەبیست؛ پوور واقی لە دیتنێم وڕما. نەمگوت هەلاّتووم. پێم وابوو ئاگایان لێتانە و هەوالّتان دەزانن- هیچ هەوالّێکی راست و دروستیان لانەبوو- من بۆ خۆم لەو ئیسماعیل خانە ناپیاوەم بیستبوو، کە بەرەو کوردستانتان مل ناوە. ئەوەشی گوت کە گوایە رەدووکەوتنێ ((کیژە شتان زانیوەو هەربۆیەش رۆیون. مالّە پوورێم سەرو روویان خۆش نەبوو؛ خۆ ئەگەر سەر و رووشیان خۆشبایە لەوێ هەرنەدەمامەوە- مانەوەم کارێکی راست نەبوو.



ئەوانیش ناهەقیان نەبوو دەترسان... هەر ئەو شەوە شانم پێداکرد و بە کەناری باغەکانی دەوری شاریدا هاتمە قەراغ رێیە- رێگای کوردستان. ئەوەم بەلای خۆمەوە دانابوو کە پێیان وانییە چووبمە ئەو دەوروبەرانەی بارەگای ئەو ناپیاوەیان لێوە نزیکە، زیاتر دەوروبەری رێی تارانێ دەخەنە ژێر چاوەدێریەوە، دەمەویست بەهەر شێوەیەك بووە خۆم بگەیەنمە ناوەندی سوپا و کاری ئەو دوو قوڕمساغانە یەك سەرەو یەك لاکەمەوە. بەلاّم ئێستا نا...

((... شەوێ، درەنگانێك خۆم گەیاندە هەورازە شاخێکی. دانیشتم، تا هەم وەحەسێم و هەم ئەگەر ئوتومبێلیش هات لەو هەورازەی هێواش دەبێتەوە و خێراییەکەی نامێنێ و ئەودەمی بە ئاسانی دەتوانم سواربم- چونکە پارەم پێنەبوو... زۆری نەخایاند کە تروسکەی لایتی ئوتومبێلێم دە تاریکییەدا دیت. لەسەر رێیە وەلاکەوتم؛ لەپشت کۆمەگلێکی قەراغ رێیەم خۆ لە بۆسەدا تا ئەوەی کە ئوتومبێلەکە وردە وردە و بەنالّە نالّ، لەمنەوە رەت بوو- هەر کە تێپەڕی لەپشت کۆمەگلّەی هاتمە دەرێ و زۆر بەزەحمەت وێی هەلّزنام و چوومە سەرێ. خۆشبەختانە سەرێ کەسی لێنەبوو. بارەکەی کلّۆقەندی پاکەت بوو. سندوقێکیان شکابوو. پاکەتێکم دەرکێشا و دەستم کرد بە کرماندن و بە خواردنێی...)).

کاکە زەردێکی هاتێ؛ هەموو کەیفمان بزووت. درێژەی دایە:

((دەمە دەمی بەیانی بوو؛ هەوا تا دەهات روناکتر دەبوو. سەیرم کرد لەوانەیە ئوتومبێلەکە لەجێیەکی راوەستێ، و شوفێرەکە هەستێ بکا و ریسەکەم لێ ببێتەوە خوری. پاکەتە قەندێکم دەبن هەنگلّێ نا- پاکەتێکیشم خواردبوو- و خۆم فڕێدایە خوارێ- و کەوتمە رێیە. دە وەختی تاو کەوتنێدا گەیمە شارێکی. نەچوومە نێوشاری. بە چوار دەوری شارەکەیدا سوڕامەوە. لە شوانێکیم پرسی، گوتی ئێرە بیجاڕە...)).

دایی گوتی: ((پەنا بەخوا!)) هەموو سەرسام و واق وڕماو و حەپەسابوون؛ کاکە راوەستا.

بابەگیان گوتی: ((ئێمەش یەکەمجار چوینە بیجاڕ. هەردەلّێی چارەنووسی هەموانمان یەکە... دەی بلّێ، تۆ کارت بەو قسانە نەبێ)).

کاکە لە بەدوا داچوونی داستانەکەیدا گوتی: ((کە قەندەکە تەواو بوو ئیدی هیچی دیکەم پێنەما؛ چەند رۆژێکانم لەمەزرایە دروێنەی جۆی دەگەلّ سەپاناندا کرد. هێندەی نەمابوو بە

داسیێ ئەو قامکەم بقرتێنم)). دایی گوتی: ((دەك خوا بمکوژیێ!)) کاکە قامکەکەی پێشاندان کە هێشتاش جێی برینەکەی هەرپێوە دیاربوو. ((و بوومە هاوبەشی نان و چایان. خەڵکێکی چاك بوون؛ هیچیان نەپرسی. چەند رۆژێکانیش لای ئەوان مامەوە؛ دوایە سۆراغی رێیەم کرد. پێیان گوتم چۆن و بەکوێدا برۆم. بەلاّم من تەنانەت ماقرێکم پێنەبوو. ناچار چاکەتەکەمم بە پازدە قران فرۆشت و —کەوتمە رێیە- لە هەرجێیەکی یەك دوو رۆژان دەمامەوە، و هەرجارێکیش کە ئوتومبێل هاتبایە و بمتوانیبایە سوار دەبووم —و دەرۆیشتم... بۆ کویێ؟ - نازانم. تا دوایی شەوێکیان لەسەرباری ئوتومبێلێوە تروسکەی چرایەکم بەدی کرد- پێدەچوو چرای چایخانێکی بێ- پێش گەیشتنە وێ خۆم لە ئوتومبێلەکەی فرێدایە خواریێ و دابەزیمەوە. بەهەر دەردە سەریەکی بوو ئەو شەوەم رۆژ کردەوە: ئەوجێیەی لێی دابەزیبووم دەشت بوو، و سەرماگاڵەی دەکرد. ماوەیەکم دەولاولا رووانی.

چ ئاوەدانییەکی نزیکی لێوە نەبوو... سەرەنجام بەرەبەری نیوەڕۆیە لە برسان پەنام بردە چایخانەکە. ئەوەم لەبیرچوو بڵێم: دەو ماوەیدا مێزەرێکم پەیداکردووە و دەسەرمەوە پێچاوە، و بوومەتە یەك منداڵە کورد- ئا ئەو مێزەرەی ئێستاش هەرپێمە. پرسیم، گوتیان ئێرە ((دیواندەرە))یە. لەبەردەمی چایخانەکەی تابلۆیەك چەقێندرا بوو کەرێی چوونە سنەی پێشاندەدا. لێکمدایەوە کە ئەگەر لێرەوە بچمە سنەی دیارە لە کوردستاناتەوە دێم، ئەوە کەس گومانم لێناکات و بێ دەردەسەری دەگەمێ... بەلاّم... بەلاّم قەزاو قەدەر لووت و بزووت رووبەڕووی شانۆیەك بوومەوە...)).

راوەستا، و ئیدی هیچی دی نەگوت؛ لەژێرەوە سەیرێکی دایی کرد. دوای تۆزێك گوتی: ((دوای ماوەیەکی دی ئەوەی دیکەتان بۆ باس دەکەم)).

بابەگیان بە توندییەوە گوتی: ((گوتم خەریك بە... هەموو هەر وەك یەکین، جیاوازییەکمان دەنێوانێدانییە- ئەو ئابڕووەی کە نەدەبوو بچیێ چوو، ئیدی ئەوە هەموو دەزانن، ئەوە هەر بۆ خۆمانین کە وەك کەوی نێو بەفرێمان لیێ بەسەر هاتووە، سەردەبن بەفریێ دەنێین و پێمان وایە کەس نامانبینیێ... ه-ی-ه! هەموو دەزانن!)).



کاکە سەری بەردایەوە؛ تەپەو ترپەی دڵی دایی ئاشکرا هەستی پێدەکرا، و دەنگی هەناسەی هەمووان، تاك تاك، دە ژوورێدا دەبیسترا. منیش خۆمم بەویەوە نوساندبوو و هەروا سەیریم دەکرد.

بابەگیان گوتی: ((بڵێ، دوایە و موایەی نییە، بیگێڕەوە، تا نەهاتوون تەواویکە... هەرساتێك بێن دێن... کچیێ، دەرکەت باش داخستووە؟)).

مەلیحە گوتی کە دەرکەکەی زۆر چاك داخستووە. بابەگیان گوتی هەستە بچۆوە تەماشایەکی بکەوە و بزانە، نەوەکو چاك دانەخرابیێ. دایی بڵندبوو و چوو. و دەستوبرد گەڕایەوە- بیێ ئارام بوو.

کاکە دەستی پێکردەوە. رەنگی رووانی پەڕی. ئەویش وەك دایی دە هەواوە راما- وەك بەدوای وێنەکاندا- و ئێمەش هەموو چاومان لەزاری وی بڕیبوو و متتەقمان نەدەکرد.

((لە سووچێکی چایخانەکەی دیواندەرەیدا، دانیشتبووم و نان و چای شیرنم دەخوارد... دوو دڵی ئەوەیبووم یەکەمجار بێم ئێوە وەبینم یا بچمە سنەی و وە دووی سوراغێتان کەوم... بێجگە لەوەندە پاشماوە پارەی چاکەتەکە هیچی دیکەم پێنەبوو...)).

دایی دیسانەوە و بیێ ئیختیارانە گوتی: ((دەك خوا بمکوژیێ!)) و بابەگیان دووبارە بیێ ئیختیار چاوی سوورکردنەوە. ((...حەوت هەشت کەس زیاتر نەبوو- ناوچایخانەکە دەڵێم- هەموویان لەسەر سەکۆیەکەی دەریێ دانیشتبوون- زۆربەیان کورد بوون. دوو تانکەری نەوتکێش- لەو ((لەیلان))انە، کە تازە گەیبوونە جیێ: یەکێکیان لە سنەیرا دەهات و ئەویدیشیان دەچووە سنەی. دوو ئەفسەریش کە دیاربوو بەو دوو تانکەرە نەوتانە هاتوون لە سەرسەکۆی چایخانەکە و لەسەرمێزێك دانیشتبوون، و سەرگەرمی قسان بوون- پێدەچوو زۆر دۆست و تێکەلاّوبن. چەند پارووە نانێکم بە چای شیرنەوە خوارد. بەدەم خواردنێشەوە گوێم بۆ هەڵخستبوون. ئەفسەرەکان دەیانزانی کە ئەوەی لەوێن هەموو لادێی و کوردن و فارسییە نازانن. زۆر راشکاوانە دەدوان. منیش هەروەك گوتم بەو مێزەرەی لەسەرم ناوە کەس پێی وانەبوو هەر فارسیشم. ئەفسەرە سەرهەنگە پلە دووەکە زۆر بیێ پەروا دەدوا: لە بارەی کچێکی جوانەوە دەدوا کە حەزرەتی ئەجەل ویستوویەتی...)) چەند جارێکانی لووت دە حەوای کرد: پێدەچوو لووتی وشکەڵ بوو‌بیێ

و گیرابێ؛ ڕەنگی زیاتر گۆڕا؛ هەناسەی سوارتر بوو. بەدوو قامکان قۆپچەی کراسەکەمی بادەدا- دەستی دەلەرزین. کاکە لاوێکی جوان بوو. لە تەماشاکردنیی تێر نەدەبووم. ئێستا تێدەگەم دایی هەقی بوو کە دەیگوت: ((ماشەڵڵا قەد و باڵای هەر دەڵێی دارشمشادە)) من دارشمشادم نەدیبوو، بەلاَم دەمزانی کە مادامەکی وەك کاکەیە دارێکی جوانە... دایی هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشان. وەك بیەوێ هەموو ئەو هەوایەی کە کاکە هەناسەی تێدا دەدا هەمووی دەسینگی خۆیدا بپارێزێ. کاکە بەراسپێرییە بابەگیانی پشت لە سۆبە دانیشتبوو، تا کەس لە دەرێڕا نەیبینێ، و بابەگیانیش بە پێچەوانەی خووی جارانی خۆیەوە پشتی بەدیوارییەوە دابوو. ڕوخساری داتەپیبوو بەلاَم پیاوانە و نێرانە بوو. بەدەنگێکی دەردناك و لەسەرەخۆوە وەك شتێکی نهێنی بدرکێنێ، گوتی: ((باشە دەی، بڵێ، شەرمی ناوێ؛ دەزانم دەردناکە، بەلاَم دەمەوێ هەر بزانم- دەمەوێ هەموو بەسەرهاتە تاڵەکانی خۆمم گوێ لێبێ... ئیدی ئەوە سەرگوزەشتەکەی ئێمەیە)) کاکە هێندێکی دیکەشی یاری بە قۆپچەی کراسەکەم کردەوە- دەستی بەسەرشانمدا تێپەڕاندبوو. بەلێوە لەرزەوە گوتی: بەڵێ... ئهم... کە حەزرەتی ئەجەل... ئهم!...)).

دایی بەدەنگێکی مەزڵومانەوە گوتی: ((دەك ئاور دە ماڵ و منداڵییەوە چێ، خودایە!)) بابەگیان چاوی زەقتر و سوورترکردنەوە. کاکە کەوتەوە قسان. گوتی لەسەرهەنگی گوێ لێبووە ((حەزرەتی ئەجەل ویستوویەتی برایەکەی ڕام بکات و بیهێنێتە ژێربار...)) ددانی دە چیڕەوە بردن، پەڕەی لووتی دەلەرزین، پچڕ، پچڕ، هەناسەی هەڵدەکێشان. ((کیژە بە دوای پەیسەری کاری براکەی کەوتووە...)) و لە سنەی دەکەوێتە داوی سەرهەنگێکییەوە و سەرهەنگ دەگەڵ چوونی بۆ ئەنجامدانی ئەو فەرمانەی کە پێی سپێردراوە، ئەویش هەڵدەگرێ و دەگەڵە خۆیدا دەبا... کاکە ئارەقەی دەردا بوو. بە لەپی دەستی هەنیەی سڕیەوە. دایی هۆشداریی چوارەمیدا، بەلاَم کاکە گوێی نەدایە. گوتی ئەفسەرەکە گوتوویەتی من دڵنیام لەوەی کە ئەم کیژە ((لەوانە نییە!)) ئەو مەسەلەیە دەگەڕێتەوە بۆ پارساڵ. دێنێ ژوورێکی بۆکچەی بەکرێ دەگرێ و لەوێی دادەنێ ((لەلای پیرێژنێکی سەر ئاسنینەی لە خودا نەترس تا ئاگای لێبێ...)) تا دێتەوە. بەلاَم ناتوانێ زوو بگەڕێتەوە، یا هەر نەبێ سەرێکی لێبداتەوە. مۆڵەتی نادەنێ... ((ئەو ناپیاوەش، ئیسماعیل خان- ئەو گەوواە- دە دایەرەی خەدەماتدا مشکی ڕاودەنا- کاری نابەجێی دەکردن- دەستی دە مۆڵەتی ئەفسەرانەوە، وەردەدا و بۆخۆت دەزانی هەرچی



نابەجێ بایە دەیکرد...)) ئیدی سەرهەنگ دەکەوێتە دڵەڕاوکێ. چەند نامەی نوسیوون، وەلاَمیان نەهاتۆتەوە، پارەی تەواوی بۆ بەجێهێشتووە، بەلاَم نەك هێندە کە بەشی تەواوی ئەو ماوە دوورودرێژە بکات- کاکە هەناسە هەڵدەکێشێتەوە. بە شەرمەوە قسەکانی سەرهەنگی دووپات دەکاتەوە کە گوتبووی: ((دەمەویست بیخوازم و مارەیکەم، بەلاَم کاتێ کە چوومەوە دیتم نەکچەیە و نەپیرێژنە هەردووکیان بوونەتە دوو دڵۆپە ئاو و بەعەردیدا چوونەتە خوارێ...)) و دوایی، زۆر دەگەڕێ، و سەرەنجام بەشێوەیەکی نهێنی دەبیسێتەوە کە پیرێژن چۆتە بن کلێشەیەوە و هەڵی خەڵەتاندووەو بە گەووادێکی شاری فرۆشتووە و بۆ خۆشی خۆی ونکردووە...

(ئاه- ه!)) ئەوە ئاهی دایی بوو. دەستی لەسەر دڵی خۆی دانابوو و چاوەکانیشی هەردووك نوقاندبوون، وەك دوعاگۆیەکی کە دەگەڵ خودای خۆی تێکەڵ دەبێ ئاوا- سەر و سینەی بەلارییەوە هێنابوونە پێشێ، کاکە درێژەی بە قسەکانی دایەوە:

سەرهەنگەکە گوتی: ((ئەوکارەی چۆن کردبوو- نازانم، چونکە ئەو لەوانە نەبوو...)).

دایی گوتی: ((دایکی بمرێ خودایە... دەستی دایکی شکێ... ڕووی دایکی ڕەشبێ. وەك پەڕەی گوڵێ بوو- لەوی پاکتر هەرنەبوو...!)).

کاکە سپی هەڵگەڕا، بابەگیان زەردبوو و دوایە ڕەش داگەڕا. هەردووکیان ددانیان دەچیڕەوە بردن. بابەگیان بە پشوو سوارییەوە و بە دەنگێکی وەك پاڕانەوێوە گوتی: بڵێ! و کاکە گوتی: ناچار سەرهەنگ دەست لە ئەژنۆیان درێژتر دەگەڕێتەوە... چونکە لە دە ڕۆژانی زیاتر مۆڵەت نابێ! تەلگرافیشی کردووە، کەچی سوپا مۆڵەتەکەی بۆ درێژ ناکاتەوە... بەکورتی، هەرچی کەللەچییەکانی تەورێز و مەراغە و مەهاباد و ئەو شوێنانە هەیە- لە ڕێی ئەم و ئەوەوە- هەمووی لێکدەدا... و ئەوە ئێستاش لە سەقزێوەڕا دێتەوە... ئیدی کاتی نەماوە، دەبێ سبەینێ زوو لەسەرکار ئامادە بێت، دەنا بە قسەی خۆی تا سەردەشت و بەولاوەتریش دەچوو... لەدواییدا تکای لە ئاواڵەکەی کرد، کە وەك دۆست و ئاواڵێك، و یەك هاوپۆڵ، سەرو سۆراغێکی بۆ بکاو لەهەر کوێیەکی قولاَغێك لێپەیدا بوو دەستوبرد تەلەفۆنێکی بۆ بکات... ئاواڵەکەی؛ کە ناوی حەسەن بوو و پلەی سەرگوردی هەبوو گوتی: ((باشە تۆ پێت وایە شتێکی وا عەنتیکەش هەبێت کە وەك پاڵەوانە سەرگەردانەکان کاڵەی ئاسنی بەدوادا هەڵبەستی!)).

سەرهەنگ گوتی: ((کوڕە، ئەوە تۆ دەڵێی چی- هەتا ئێستا جوانی وات بەچاوی خۆت نەدیوە... نەمن شتێکی دەبێژم و ئەتۆش شتێکی دی دەژنەوی... ددانەکانی هەر راست یەك ریز مرواری، لێوەکانی نەکورت نە درێژ، دەموچاوێکی رێك... ئەوە چاوەکانی هەر مەپرسە- ئایەتێکی جوانی بوون- دەیاندواندی- لەهەر چرکێکیدا هەزار رەنگیان دەنواند...)).

کاکە ئەوانەی وا دەگێڕانەوە، وەك هەر لەبەری کردبن، و بەشێوەیەکی واشی دەگێڕانەوە، وەك ئاگای لە کەس نەبێ، یا وەك ئەوەی دەچوو ئەو شتانە هەموو لەسەر دەرکی پاشخانێ نوسرابنەوە و ئەو بیانخوێنێتەوە. ئاگای لەخۆی نەبوو، وەك خەوالوویێ وابوو. تەنانەت نە ئاگای لە دەستی من، کە ختوکەی رانیم دەدا، نە لەسەرم کە لەبن باڵێەوەم بە سینیگییەوە نوساندبوو، نە لەدایی کە وەك سیر و سرکەی دەکولا و خۆی رادەژاند، نە لە بابەگیانی کەوەسەر ئارەقەی گەڕابوو و سپی ببوو و زگی هەر بەرز و نزم دەبۆوەو رانەدەوەستا، نە لە مەلیحەی کە زۆر بە ئارامی دەگریا و تێوەی رامابوو... ئاگای لە هیچ شتێك هەر نەمابوو.

((کوڕە هێشتا لە کوێتە... لە تەواوی تەمەنی خۆتدا پارچەیەکی ئاوات نەدیوە... وای، چاو چ چاو یەك دنیا رەنگ و خاسە رەنگ... یەك دنیا ژیان... و لاوەتی... رەش هەروەك رەشی قەترانێ- کە بەدەمتەوە پێدەکەنن. چ بڵێم...)) کاکە ئەوانەی بەجۆرێك دەگوتن وەك لە هۆڵی تاقیکردنەوێدا بێ و بەرامبەر مامۆستای راوەستا بێ و ئەوەی خوێندوویەتی و لەبەریکردووە بیڵێتەوە و ئەو شتانەی دەربارەی فیرعەونەکانی میسرێی نەزانانە لەبەر کردبێ و بیانڵێتەوە- تا نمرەی چاك وەرگرێ. ((...هەردووکیان پێدەکەنین. دەگەڵ ئەوەشدا کە گرژ دیاربوون، و شەڕیان بە خەڵکی دەفرۆشت، بەلام بەنیەتی ئاشتی؛ کەسیان قبوولێ نەبوو، و هەردەو دەمیشدا وەك منداڵێکی بەر سینگ و بەرۆکی داکی متمانەیان دەدانێ و پشتیان پێ قایم بوون... بەلام من رێیەکەیم دیبۆوە: هەموو رۆژێ دەربارەی نزیکبوونەوەی بەردانی- ((براکەی))- درۆم بۆ هەڵدەڕشت...)) (دایی گوتی: ((کوێرایی دایە ئینشاڵلا!))).

((کاتێ کە دڵتەنگ دەبوو و غەمی دەخوارد، رەشێنەی چاوی بە جۆرێك تاریك دەبوو، لە هەموو شەوەکانی زستانێ تاریکتر- ئیدی چ بڵێم... ناوی عالیە بوو... هەر بەراستیش عالی بوو...)) دایی خۆی رانەگرت، لە پڕمەی گریانێیدا، و کاکەی رەنگ و روو هەڵبزڕکاو و دەمولێو وشکەلاتوو، و سەر و گەردەن شەلاڵی ئارەقەی، کە هەر دەتگوت تازە لەناو نوێنێ



نەخۆشییە راست بۆتەوە لەقسان راوەستا. بابەگیان دەدایییەوەی خوڕی کە درەنگ وەختە، وانەکا پاسەوانان بە ماڵێ وەرکا. بەناوهێنانی وشەی پاسەوانان، دایی هەروەك کەسێك دەستی بۆ کلیلی دەزگای هەستەکانی بردبێ ((بەسپایی)) کوژایەوە. کاکەش ئیدی هیچی تری نەگوت. باوەگیان هەر بەهەمان دەنگە ماشێنییەکەیەوە گوتی: ((ئێ؟)) کاکە گوتی: ((چ بڵێم... ئیدی لەو بابەتانەو ئەهە؟)).

((گوتم بڵێ، هەمووی بگێڕەوە! ئیدی ئەوە سەرگوزەشتەی ئێمەی خۆمانە... دەبێ سەرگوزەشتەی خۆم بە تەواوی بزانم... ئەوانە هەموو ژیانی ئێمەن... کێ دەڵێ (سبەینێ بەچاوی خۆمان دەبینین... یا هەر نەبێ بزانم... هەمووی بگێڕەوە...)) کاکە دەستە ئارەقاوییەکەی نایە سەر ئەژنۆم- ئەژنۆم گڕی گرت... ئای کە دەستی گەرم بوو؛ تفێکی کردەوە و گوتی: ((مەلیح، دەمم وشك بووە بێ زەحمەت چایەکم بۆ تێکە!)).

مەلیحە چایەکەی تێکرد، و پیاڵەکەی بردە پێشێی. کاکە دەستی لەسەر ئەژنۆی هەڵگرتم، و پیاڵەکەی تاودایە، بەلام چایەکەی نەخواردەوە... گوتی:

((ئۆتومبێلەکان وەگەڕ کەوتنەوە و ئامادەی بزوتنێ بوون؛ هەردوو ئەفسەرەکان یەکتریان ماچکرد؛ ئەوە منیش هەر دانیشتووم؛ سەرم وە دەستم کردبوو... ئیدی هیچ ئارەزوویێکم نەمابوو...)).

(دایی گوتییەوە، خوا بمکوژێ) ((... کە ئەو شتانەم هەموو بیستن دوکەڵم لە کەللەی سەری هەستا. زانیم چ ریسواییەکی گەورەیە!... سەیرم کرد چوونم بۆ سنەی و بەو بارودۆخەوە هیچ سودێکی نییە. هەر لەسەرەتاوە مەهابادم دە خەیاڵی خۆم گرتبوو بچم، چونکە پێم وابوو ئێوە چوونەتە ئەوێ. بەلام کە ئەو داستانەم بیست بڕیارەکەمم گۆڕی. سەیرم کرد بەگوێرەی قسەی ئەفسەرەکە (کیژە) لەوێ نییە- پێدەچێ هەر لەو دەور و بەرانەبێ... بەرەو سەقز رانەوەستام، هاتم... ئێوارە بوو کە گەیمە داوێنی گەردەنەی...)).

تینی دەستمم دایە رانی، گوتم: ((کاکە چایەکەت ساردبۆوە...)) کاکە زەردێکی هاتێ — زەردەیەکی بێ رەنگ و بۆ- و بەخۆیەوە گوشیم. سەیرەکەی ئەوەبوو منیش هەروەك بابەگیان شەلاڵی ئارەقەی بووم. دەستێکی بە هەنیە و سەرو چاویدا هێنا، و پیاڵەکەی بۆ لێوی برد.

بابەگیان هەروا بیٚ ئارام بوو- دابیش هەروەتر. کاکە پیاڵەکەی دانایەوە، گوتی: ((کە گەیمە داوێنی گەردەنەی شەو بوو. کاروانچییەکان بارەکانیان لەو دەشتەی خستبوو، و ئاگریان کردبۆوە. چەکەکەم چاك دەبەر باخەڵێدا جیٚ کردەوە و ئەوجا چوومە نێویان؛ و نان و پەنیر و چایەکم دەگەڵدا خواردن... بەپێچەوانەی ئەو قسانەی دەیانگوت، خەڵکێکی تابلێی سادەو ساکار و زۆریش میهرەبانن- کوردان دەڵێم. پێڵاو پێی ئەنگاوتبووم- پێم بە خوێن بوو. هێندێکیان بەز دامیٚ، گوتیان پێی چەورکە. گوتیشیان ئەگەر بە پەلەش نی ئەوشۆ وەمێنە و سبەینیٚ دەگەڵ مەلا بانگدانیٚ وەڕێکەوە- ئەو دەمەی بۆ خۆیان وەڕیٚ دەکەون. هیچیان نەپرسی، پێیان وابوو کرێکاری ریٚ و بانیم. جاجمێك و جەواڵێکیان دامیٚ؛ جەواڵەکەم وەبن سەرمدا و نووستم. نان و چای بەیانیشم هەر دەگەڵەواندا خوارد و ئەوجا کەوتمەوە ریٚ- بەلاٚم لە شاری نزیك نەبوومەوە. رۆژانە زیاتر هەر دەنوستم- دە لاپاڵ و شیو و دۆلاٚندا- تەنیا ئەو دەمانە نەبیٚ کە برسیەتی زۆریی بۆ دەهێنام، دەکەوتمە سەر و سۆراغی شوانان، و نان و شیرێکم لیٚ دەستاندن. خەڵکێکی چەند میهرەبانن!... لە تەکیانەوە دادەنیشتم، ئەوان بلوێریان لێدەدا و منیش بیرم لە چارە رەشیە خۆم دەکردەوە. هەر بە ئامۆژگارییە ئەوان ئا ئەو پەڕۆ و پەتاڵە کۆنانەشم دەلاق و لەتەرم ئالاٚندوون. شەوانە زیاتر هەر بە ئاگا بووم؛ ترسم لە جڕو جانەوەر و ئەوجۆرە شتانە نەبوو، چونکە چەکم پێبوو...)).

دایی هەروا بەخۆ راژاندنێوە لەبن لێوانڕا. گوتی: ((دایکت بمریٚ خوایە!)) و من بە هەموو چاو و گویٚ و هەموو بوونی خۆمەوە بەدوای ئەوچەکەیدا کە گوتبووی، کەوتبوومە چاوگێڕانیٚ و دەسوڕام، کەچی چەکەکە تەنیا یەك قولانجم لێوە دوورتر بوو، ئەویش کەلەکەی ئەولای بوو. دایی گوتی: ((سەد جارم گوت ماندووە، ئازاری مەدە!)) کاکە دیسانەوە گوتی: ((نا دایکە کارت پێی نەبیٚ)). و منی زیاتر بەرەو لای خۆیەوە راکێشا.

((... هەفتەیەك لەمەوپێش سەری خۆم هەڵگرت و رۆیشتم، هەر کە لەماڵیٚ ئەو پیاوەی نزیك بوومەوە- حەپەی چ سەیەکی لێوە نەدەهات پاسیٚ بکا- نزیکتر کەوتمەوە و ئەوەی روویدەدا بەچاوی خۆم دیتم...)).

دەنگی ئاخاوتنەکەی هەروا لەخۆوە تا دەهات کزتر و نهێنیانەتر دەبوو.

((و دیتم کە بەڵیٚ ((خانمیش)) تەشریفیان لەوێیە!...)).



پەڕەکانی لووتی لەرزین، و دلۆپە ئارەقەی سەرلێوەکانی کە تازە خەتیان دەدا زیاتر بوون. مووی سەرو پشتەملی هەموو راست ببوونەوە. دەموچاوی خاوێن بوو بەلاٚم لێواری نێوچەوانی و پەناگوێی هێلێکی ئارەقە و چلکیان کردبووە سنوری ئەو دوو بەشە و مووی سەریان پیٚ جودا کردبۆوە. ئەوە چۆن بوو خۆشوشتنی وەبیر نەهاتبۆوە؟ گوتم: ((کاکە خۆ ئاو زۆرە، ئەدی بۆ خۆت لە رووباریٚ نە شوشتووە. ئەمن هەموو رۆژیٚ دەچۆمیدا مەلەی دەکەم- مەلەی نازانی؟)).

کاکە دەستێکی خۆشەویستییەی بەسەریدا هێنام، زەردەخەنەیەکی ژاکاوی هاتیٚ و گوتی: ((بۆ نا، بەلاٚم باشە، ئیدی، رێك نەکەوتووە. بەرۆژ ئەوە هەر هیچ کە نەدەبوو، شەوانەش ساردبوو. چاوم لێیە هێندە دەئاویٚ کەوتووی لوتت کەچەڵە بووە- وەك ئەوەی هەمیشە دە چۆمیدا بی!)).

گوتم: ((بەڵیٚ، دەگەڵ منداڵاٚندا مەلەی دەکەم)).

دایی گوتی: ((هەستە کچیٚ، ئەو مەنجەڵە گەورەی وەسەر ئاوری نیٚ با لاق و لەتەر و لەشی خۆی وەشوا)).

مەلیحە هەستایە پیٚ. بابەگیان بەمنی گوت: ((کاتیٚ گەورە قسان دەکا- ئەوە سەد جارت پیٚ بڵێم- مەیە ناو قسەی گەورانەوە- تێگەیشتی!؟)).

تێگەیشتم، ئەوجا رووی دەمی دە کاکەی کردەوە گوتی: ((باشە؟)).

کاکە گوتی: ((ئیدی، هیچ... دوایەش ئەوەی کە بوو ئیدی...)).

((چ بوو؟ جا من ئەگەر بمزانیبایە لە تۆم نەدەپرسی: دیارە نازانم بۆیە دەپرسم!)) ئەمشەو ئاوازەی دەنگی بابەگیانی هەمووی هەر شەڕ و هەراو هەڕەشە و گوڕەشە بوو.

کاکە گوتی: ((هیچ. هەفتەی پێشتر، دەخۆراوایەدا هاتمە کەناری ئەو چۆمەی. منداڵە کوردێکم دیت؛ پرسیم ((کوڕەکە گیان دەو شارۆچکەیدا چ پینەدۆز و مینەدۆزی لیٚ نین؟)) دەمهەویست پێلاٚوەکەمی دەمیٚ بۆم ببات و بۆم چاك کاتەوە. گوتی: ((بۆ نا، ئی خۆمان هەیە؛ عەجەمێکیش هەیە- مەشەدی ئەکبەراغا... کوڕەکەشی ناوی حوسێنە)).

ویستم پرسیارێکی بکەم، چاو سوورکردنەوەی بابەگیانی لێنەگەڕا.

((وای دەتگوت کێوی ئەلوەندیان بەسەری داداوم. هەوت بووم- مێشکم دینگە دینگ و هەرای بوو، گوێم هەروا هاشەی بوو. گوتم خودایە بۆ خۆت رەحمێ بکەی... ئەوان لێرە، ئەوکچەش (کیژە) هەرلێرە! خەریك بوو شێت دەبووم. بیرم لە ئابڕووی ئێوە دەکردەوە...)) کە گرژبوونی دایی دیت خۆی لە خەتی سی و شەشدا. گوتی ((مندالّە کوردەکە گوتی ئێستا درەنگە دوکان و بازاڕ داخراون... دەنا دوکانەکەیم پێ نیشاندەدای... مالّەکەشیان هۆ لەوێیە... و بەدەست ئاماژەی ئێرەی کرد، بەلاّم چونکە لەسەرخۆم نەبووم، چاکم ئاگا لێی نەبوو. هەربۆیەش بەرێیەکی دیکەدا هاتم)).

بابەگیان گوتی: ((ئێ، دوایی؟)).

((دوایی هیچ- هەر ئەوەیە کە دەیزانن)).

کاکە دیار بوو هەر لەبەر دلّی دایی بوو نەیدەویست شتەکان لەوە زیاتر روون کاتەوە، بەلاّم خۆ بابەگیان وازهێن نەبوو. داییش دەگەلّ ئەو هەموو ناڕەحەتییەشیدا پێی ناخۆش نەبوو- رەنگە هەر لەبەر ئەوەندەشی بێ دەیویست پێچەوانەی قسەو قسەلۆکی خەلّکی کە بۆخۆی بیستبوونی لە زمانی ویەوە ببیستێ- ومن خوا خوام بوو، هەمووی بگێڕێتەوە تا بزانم چۆنی چەکەکە راکێشاوە، و چۆنی تەقە کردووە.

((هیچ... سەرەتا بڕیارم ئەمە نەبوو- دەمویست وازی لێ بێنم و بە دوای ئێوەدا بێم... بەلاّم کاتێ زانیم ئێوەش هەرلێرەن ئیدی نەمزانی دەبێ چبکەم)).

دەستی بۆ نێوچەوانی برد، و ماوەیەك وەك سەری بێشێ هەروا مایەوە.

ئەمجارەیان نۆرەی بابەگیان بوو. ئاهێکی هەلّکێشا، و گوتی: ((هێێی- هەی! بڕیاری منیش ئەوە نەبوو لێرە بمێنمەوە، دەمویست یەکسەر لەم کاولە وێرانە وەدەرکەوم و بڕۆم؛ بەلاّم خۆشەویستی خەلّکی، و دوایەش ئەو بەسەرهاتانەی هاتنە پێش هەردوو پێیان بەستم و هێشتمیانەوە! —باشە؟)).



((هیچ... چووم. وێدەچوو تازە خەریکی شام خواردنێ بن- لەسەر سفرەی بوون. بۆخۆم نازانم روخسارم چۆن بووە، هەر کە منیان دیوە هەموو بەشلّەژاوییەوە راست بوونەتەوە...)).

دایی هەناسەی لەخۆ بڕیبوو؛ سەرو رووی ئێستای بە ئاشکرا داتەپیوتر دیاربوو بەر لە تاوێك پێش ئێستا، و دەشلەرزی. ((هەر کە چەکەکەم راکێشا هەموو بەزریکانەوە هەلاّتنە دەرێ... دوو گوللەم تەقاندن هەموو هەلاّتن، تەنیا ((کیژە)) نەبێ بەشلّەژاوی و بەڕاکردنەوە بەرەو رووم هات و گوتی: ((کاکە... کاکە هەلّەمکرد!)) هەلّەتکرد! بۆ خۆشم چاك تێنەگەیشتم- نەمزانی خەریکم چ دەکەم... لوولەی دەمانچەکەم دەلاجانگێی کرد و دەستم لێ پێداهێنا...)) دایی بێ ئیختیار لە سینگی خۆیدا و بە روویەکی ئالۆزەوە کەوت و زریکاندی ((ئاخ)) دوایە بە نووزەیەکەوە گوتی: ((دەك دەستت شکێ... بێ ئینساف! چۆنت دلّ هات! ئەوخۆی بە قوربانی تۆ کرد!... بێ ئینساف- بێ ئینساف!)) و قۆلّی راوەشاند و بەلاداهات. مەلیحە کە سەرقالّی ئاور دوو و مەنجەلّێ بوو، بە پەشۆکاوییەوە رایکرد، و من رامکرد، و گۆزە ئاوێکم هێنا. کاکە سەری دایی لەسەر کۆشی خۆی دانا، و بە لەپی دەستی نێوچەوانی سڕییەوە. کاکە رەنگی بەرووانەوە نەمابوو. لەبن لێوانەوە بە دەنگێکی گریاناوییەوە دەیگوت: ((لەبەر من! من گوتبووم بچێ خۆ فرۆشییە بکا!... من گوتبووم بچێ ئابڕووی بنەمالّێکی ببات!)).

بابەگیان سەری بە دیوارییەوەدا. لەبن لێوانەوە گوتی: ((تۆ کە کارەکەت هەردەکرد دەبوو کاری ئەو ناپیاوە قوڕمساغەشت یەکسەرە کردبایەوە و بەسەر وەختییەوە چووبایەوە. خۆ تۆ تازە کارەکەت هەرکردبوو.

ئاه ئێستا دەزانم!

دایی وەهۆش هاتەوە و چووە هەیوانێ؛ بابەگیانیش هەر هاتەوە سەرەخۆ، شەو درەنگانێك بوو؛ کەس تا ئەودەمی تیکەی لەت نەکردبوو. بابەگیان دەستێکی بۆ ژێرچەناگەی برد و بەروخسارێکی بیر ئامێزەوە گوتی: ((باشە، تۆ دەناو ئەو هەموو هات و باتەدا جێیەکی لێرە چاکتر و دلّنیاترت نەدۆزییەوە ئێرە نەبێ! لێرە شەوانە لەپڕ پێ وەردەبن و سەر و بنی مالّێ دەپشکنن... هەر نەبایە بیرت لەو دوو مندالّە بەستەزمانانە بکردبایەوە... واچاکترە تازووە لێرە بڕۆی... دەنالێرە وەك بەدەستی خۆت و بەدەستی بەستراوەوە خۆت تەسلیم کەی وایە...

چاکتره بڕۆی!)) من بێ ئیختیار روخسارێکی بێ گوناهانەم بەخۆوە گرت؛ مەلیحە دەگەڵ داییدا لە هەیوانێ بوون: دەنگی فینگەفینگی گریانێ دایی دەهاتە گوێ.

کاکە تێکڕا بوو. گوتی: ((بڕۆم!؟ بچمە کوێ؟)) هەروەکو شێتانی لێهات؛ ئینجا سوورهەڵگەڕا، دوایە بووە بەفر و خوێن. بەو رەنگە پەڕیوەیەوە راست بۆوە و بەدەمولێوێکی لەرزۆك و بەگریانەوە گوتی: ((باشە، دەڕۆم... نابمە مایەی دەردە سەریتان، بابەگیان- دەڕۆم!)). بابەگیان گوتی: ((راوەستە- راوەستە هەرنەبێ شتێکت بدەنێ بیخۆی، هەرنەبێ پارەو پولێکت بدەمێ دەگەڵە خۆتی بەری... راوەستە، هێشتا قسەکانم تەواو نەبوو ون و ماویانە...)) کاکە بێ ئەوەی وەلاْمێك بداتەوە بەرەو لای شوێن پێلاْو داکەندنێوەچوو. دایی دیاربوو گوێ قولاْغ و لەسەر هەستە، هەر کە ئەوەی بیست وەك شێتان هاتەوە ژوورێ و گوتی: ((بڕوات!؟- بۆ کوێ بچێت؟)) و هەر بەو دەنگە پڕ لە سۆز و ناڵەیەوە درێژەی دایە: ((راوەستە، کوڕەکەم... یەك دەقیقە راوەستە... منیش لەگەڵ تۆدا دێم- رەنگە دایکت مردبێ! منیش دەگەڵ تۆدا دێم... خۆ من هێشتا ماوم و نەمردووم! بریا مردبام- خۆزگە تا ئێستا سەد کفنم دەڕزاند!)) ئەو قسانەی بەشێوە دەنگێکی واوە دەگوتن وەك دەگەڵ تارماییە خۆیدا بدوێ. عەبایەکەی تاودایە. من بێ ئیختیار وەگریە هاتم- مەلیحە بەگریانەوە ئاوقاییە گەردەنی کاکەی بوو- کاکەش هەروا دەگریا: بابەگیان، کە دیاربوو، زۆر نارەحەت بووە، هەروەك جارانی پشتی بەدیواریەوە دایەوە، و گوتی: ((پەنا بەخوا، لەدەست ئەو ژنەی! بەو تێکەوەدانەی ئاخری سەری ئەو کوڕەی بە فەتارەت دەدا...)).

کاکە هەر سووربوو لەسەر رۆینێ. دەیگوت: ((بابەگیان راست دەکات- راست نییە؛ نەدەبایە من هاتبامایەوە ئێرە)) دایی هەروا قوشقیانە وەڕێ کەوتبوو و هەر دەشیگوت مەگەر ئەو مردووە، بۆ دایکی مردووە؛ ئەو هێشتا نەمردووە- ئەویش دەڕوا- و ئا لەم جۆرە قسانە. من و مەلیحەش هەروا دەگریاین تا ئەوکاتەی کە دەنگ و دۆخی روخساری بابەگیانی بە ئاگای هێنایینەوە: تەماشایەکی توندی هەمووانی کرد و بەدەمولێو و چەناگەی لە رزۆك و ئەو روخسارەیەوە دەتگوت خۆڵەمیشی لێ نیشتووە، و بەو چاوانەی چرچ و لۆچیان دە تەنیشتانەوە کەوتبوو رووی دە کاکەی کرد و گوتی: ((دانیشەوە!)) دوایی بەدایی: ((تۆش هەر دانیشەوە! خۆت گێل مەکە؛ دەستی کوڕەکەی بە کوشتن مەدە!...)) بەلاْم هەموو داخی دڵی خۆی بەمن



و مەلیحەدا رشت: ((گوێتان باش بکەنەوە، سەیرکەن چ دەڵێم: یەك وشەی ئەمشەو و یەك وشەی کاکەی... یا هەر برایەکی دیکەتان... لەدەمی بێتەدەرێ و بە کەسێکی بڵێن- دەتانخنکێنم! —هەر بۆخۆم- دەخەوێدا- بەو دەستانەمتان- دەخنکێنم! —تێگەیشتن؟ گوێتان باش بکەنەوە!)) چاوەکانی دەرپەڕیبوون، سەری بردبۆوە نێو شانەکانی و هەردوو دەستی لێك گرێدابوون، حازر و ئامادە، بەدەنگە ترسناکە سامناکە لەسەرەخۆکەی دەتگوت هەر ئێستا دەیەوێ هێرش بێنێ و بڕیارەکەی بە ئەنجام بگەیەنێ و بمانخنکێنێ.

((بە کورتی، لە بیرتان نەچێ... هەرچییەکتان دیوە، یان نەدیوە... یا کاتێك رەییس مەییسێك شتێك دەپرسن، نازانم، نەمدیوە- ئاگاتان لە زاری خۆتان بێ، دەنا خودا شاهیدە —دەتان خنکێنم- و خۆم دەحەسێنمەوە!...)) هەر بەو بارە و بەو دەنگ و سەدایەوە: ((گوتم دانیشنەوە- ئای لەگەڵ تۆمە!)) دەگەڵ دایی بوو. ((واز لەو گێل بازییەی بێنە... چەند کوڕی تۆیە، هێندەش کوڕی منە... بەلاْم تۆ ئاگات لە زۆر شتان نییە... تۆ پێت وایە ((منداڵەکەت)) لە ماڵێ دەردەکەن!)) بە دەنگێکی پڕ تانە و تەشەرەوە. ((ئمم...!)) و لەسەرەخۆی سەربادا... ((نا خانم گیان، دەریناکەم- تۆ پەرتی، تۆ تێناگەی، تۆ هەر ئێستا دەبینی... بەدڵی خۆت پێت وایە خۆشت دەوێ... هێی —هەی!)) و بێ ئیختیار فرمێسکی بەچاواندا هاتنەخوارێ.

دایی گوتی: ((باشە، ئەوشۆ وەمێنە، تا سبەینێش خوا کەریمە...)).

بابەگیان بە دەنگێکی زۆر تێماو و کزەڵە و لەسەرخۆوە گوتی: ((ئمم- خوا کەریمە! خوا!... دیارە کەریمە!... بە قوربانی ئەو کەرەمەی بم ئەو بۆخۆی لەو سەرەوە لێی دانیشتووە و زەق زەقیش دەبینێ چۆنمان بەسەریدا دەدەن و کەچی... نە بای پێدادێ و نەباران!)) سەیریش ئەوەبوو دەگەڵ ئەو قسانەشیدا وەك دایی هەرخۆی دێناو دەبرد و خۆی رادەژاند.

((وەرە و مەردی خوای بە بەو شەوەی کفران مەکە- هەر لەبەر خاتری ئەم منداڵە! تۆزێك بیربکەوە- بەڵکە ئێ ئەوە خوایە کوێرە رێیەك پەیدابێت... دەك ماڵت کاول و وێران بێ وەك ماڵ و حاڵی مەت ئاوا کاول و وێرانکرد! ئاگرت دەگیانی ماڵ و منداڵی بەربێ!)) و بەرەو قیبلە تا توانی لە سینگی خۆیدا.

بابەگیان هەر بەهەمان دەنگی تێماو و کز و لاوازییەوە گوتی: ((بیبڕەوە بەسە ئیدی! شتێکی بدە ئەو بەستەزمانەی بیخوا؛ دوو سێ هەفتەیە هیچی وای نەخواردووە- دەستوبرد سفرەیان ڕاخست... لەسەر سفرەی کەس هیچی نەگوت. تەنیا هەر دایی بوو خێرا خێرا کەرەو ماست و هێلکەی ڕەپێش دەکردە بەردەمی کاکەی و زۆری لێدەکرد کە زیاتری بخوا. دوایە سفرەیان پێچایەوە و دەستیان کردەوە بەقسە و تەگبیران.

بابەگیان گوتی: ((دەی باشە، نەخشەت چییە، دەتەوێ چ بکەی؟ خۆ تا دنیا ماوە هەروا ئاوارە و دەربەدەر نابی. مانەوەشت لێرە ئەوە دیارە کە چەند خەتەر و ترسناکە... تۆ هیچ گوێ مەدە ئەو قسە ژنانانە. ژن هەروا سۆزاوین، دایکی من و دایکی تۆ هیچ جیاوازییەکیان نییە، هەموویان وەك یەکن... سەروبنی پارچە قوماشێکن)).

کاکە گوتی پێیخۆشە بچێتە ناو یاخیگەرەکان. بابەگیان سەرێکی بادا. گوتی: ((نا، بەخۆت و بەو چەکەتەوە کارێکی ڕاست نییە، هەر بۆ تەماحی چەکەکەت پاش حەوتوویەکی بێ سەرو شوێنت دەکەن- بێ چەکیش تۆ بە کەڵکی وان نایەیت، بەخۆت ناگرن... نا)) و ماوەیەك دەبیر و خەیالاْنەوە چوو. دوای تاوێك سەری هەڵێنا، و گوتی: ((ئێستا ئەو چەکەت لە کوێیە؟)) کاکە دەستی بۆ یەخەی کراسەکەی برد؛ دایی بە ترسەوە خۆی بۆ دواوە ڕانا، و بە هەراسانییەوە گوتی: ((نا، نامەوێ بیبینم!)). بابەگیان گوتی: ((باشە، منیش هەر نامەوێ بیبینم- با هەر لای خۆت بێ، من پێموایە چاکترین ڕێگا ئەوەیە، ئەگەر ببێ، هەر ئەو بەیانییە گوڵبەهار بن زمانی پوورە فاتمێ تاقیکاتەوە، داخوا دەتوانێ قاچاغچییەك یا کەسێکی وا پەیدا کات- ئەڵبەتە یەکێکی بەمتمانە- کە هەر نەبێ بتگەیەنێتە پێنجوین یا بتگەیەنێتە سەرسنوور...)).

کاکە گوتی: ((یانی ئێوە دەڵێن هەر ئاوا بەم شێوەیە وازبێنم و بڕۆم؟)).

بابەگیان بە حەپەساوییەوە گوتی: ((تێنەگەیشتم!... ئەدی دەتەوێ بمێنییەوەو بخوێنی!؟)) یەك دنیا ئێش و ژان و ئومێد و ئاواتی تێکشکاو و ناکامی دەو پرسیارەدا بوو.



کاکە گوتی: ((نا، مەبەستم ئەوەیە کە ئەو ناپیاوە قورمساغە، ئەو ئیسماعیل خانە و ئەربابەکانی لەو قوڕمساغتر لێگەڕێین هەروا بە ئارەزووی دڵی خۆیان بلەوەڕێن، و هەر کارێکی حەزیان لێبوو بیکەن؟... دیارە ئەوەیان من نایزانم، ئێوە باشتری دەزانن)).

بابەگیان گوتی: ((کوڕەکەم، ئیدی خۆ تۆ منداڵ نی. بە تەنیا یەکێکی وەك تۆ کاری مەملەکەتی ڕاست نابێتەوە... کەمێك بیر بکەرەوە- ئیسماعیل نەبێ حوسێن خان، حوسێن خان نەبێ، حەسەن خان- ئەو دەبییوسە نەبێ، ئەو قورمساغ- ئاوەکە لە سەرچاوەوە لێڵە...)).

بەلاْم کاکە هەر دەیگوت، و نەیدەزانی دەڵێ چی. بە بڕوای وی ئەوە ڕاست نییە ئەو لێدا بڕوات و لێگەڕێ ئەوانە هەروا بەبێ ئارەقە دەرچن. بابەگیان ئاوری گرتبوو. گوتی: ((مەردی حیسابی، کەمێك بیربکەرەوە- دەتەوێ بە سێ دانە فیشەکان هەموو ولاْتی بگری؟ ئەدی ئەو هەموو دەرس و تێهەڵدانەت وێکەوتووە نابێ دەرسێکی لێوەرگری؟ ئاخر هەر کارە و حیسابێکی خۆی هەیە... ئەگەر منداڵاْنەش بیر بکەیەوە، ئەوە قەیدی نییە: بە فیشەکێکی ئەو پاسەوانەی بەر دەرکێ دەکوژم، و چەك و فیشەکەکانی لێدەکەمەوە، ئەوجا یەکی دیکە، دوایەش یەکی دی- دوایەش تەواو، کارەکە مەیسەر دەبێ- هەر ڕاست وەك گاڵتەی منداڵاْن! نا، کوڕەکەم نا- ئەم بۆچوونانە ڕاست نین. نەگبەتییەکە و هاتووە، دەبێ شانی بدەینە بەرێ و نابێ هێندەی بێنین و ببەین... دەبێ باری لێ ببینینەوە بەلاْ دوورییەی لێبکەین... ئەو ڕێیەی تۆ دەتەوێ بیگرییە بەر ئەنجامەکەی کارێکی خۆ کوژییە- هەروا لە خۆوە نابێ قامکان دەکونە ماری نێی، بۆ تۆ پێت وایە ئەو هەموو کوردە، کە زۆر و کەم چەکیان پێیە، دەوڵەت پیاوی دەناوەواندا نییە؟)) کاکە دە بەرامبەر ئەو قسانەدا هەوت ببوو، هەرچەندە لە بەرامبەر قسەی داکیدا قسەی نەبوو... بەڵێ گێژ و هەوت بوو؛ ساتەوەختێك پێش، بابەگیان سەرزەنشتی کردبوو کە مادامەکی ئەو کارەی هەرکردووە بۆ ئەو قوڕمساغەشی نەکوشتووەو ئەوا ئێستاش گلەیی و گازاندەی ئەوەی لێدەکا بۆ دەیەوێ ئەو قوڕمساغەی بکوژێ. ئیدی نەیدەزانی بەکام قسانەی باوەڕ کات... ئەوجا، ئەوە پەیوەندی بەخۆیەوەیە- بە دەوروبەری ژیانی خۆیەوە- بەکچەکەیەوە: هیچ کاتێ کوڕ نابێتە کچ-کچ هەمیشە ((بەر خۆڵەی بابە))یە، جیاوازی هەیە دەگەڵ کوڕێ؛ کچ گەورەش بێت و ببێتە خاوەنی منداڵاْنیش دیسانەوە واخۆ بەملی بابییەوە هەڵدەواسێ هەر دەڵێی ئەوە منداڵێکە و تازە فێرە قسان دەبێ...

بابەگیان بەدایی و مەلیحەی گوت: ((لەپێشدا چرایەکەی کزکەن- وەخت درەنگە؛ ئەو خوانەناسانە وەك کەری شەیتانی بۆنیێ دەکەن... نەکا بە مالێ وەربن)).

دایی خێرا پلێتەکەی داکێشایە خواریێ. بابەگیان گوتی: ((هێندەش نا!... باشە... بەسە. تۆ هەر لەم بەیانییەوە- بەلاێم بەلالاێنەوە و نووزە نووزی دایە و بابەگیان و غەریبە خۆم نا- دەچی بن زمانی پوورە فاتمێ بە تاقیدەکەیەوە. دەلێی عەجەمێکە دەیەوێ لەسەربازییە هەلێ... ئەلبەتە ئەگەر ریێ و راست بچی و شتەکانی هەموو دەکۆشیێ کەی و هەمووی بۆ هەلڕێژی دەبیێ ئەوەش بزانی ئەو، ئەوکەسە نییە کارەکەمان راستەو راست دەدەستی نیێ... هەرکاتیێ یەکێکی دلنیا و بەمتمانە پەیدا بوو، ئەودەمی، دەتوانی پانەوپان چ هەیە پێی بلێی- لەوانەیە هەر پێویستیش نەکا... مەمەدیش (محەممەد) یەك دوو شەوان، یا چەند شەوێکان ئەگەر بتوانیێ ئەوە لێرە دەمێنێتەوە- بە تەمای خوای، منیش هەردە و ماوەیەیدا هەولدەدەم دەستەجلێك و هەندیێ پارەو پوولێ هەرنەبیێ بای یەك دوو مانگێکی بۆ پەیداکەم- جلەکانی دەدەمە فەیزوللاێی بۆی بدرویێ؛ خودا عەمری درێژکا کوڕێکی چاکە- ئەگەر بشتوانم پارەکەی بۆ لە حاجی عەولاێی یا لە میرزا صالحی تەنەکە ساز یا هەر لە فەیزوللاێی یا لە هەرسێکیان بۆ وەردەگرم. ئەلبەتە کاتیێ بە سەلامەتی گەییە جێی خۆی ئەودەمی دەتوانیێ چەکەکەش بناوکات، و کارێکی بۆخۆی پەیداکات و دەستێکی بجوولێنیێ... دەو نێوەیدا منیش ئەگەر توانیم، رەنگە بشتوانم. ئیێ شتێکی لە ئەبولفەتحی دەربێنم)).

کاکە دیار بوو تەسلیمی قسەکانی بابەگیانی ببوو، بەلاێم دایی هەردوو دلێ بوو. دەیگوت بچیێ لەویێ چ بکات (کیێ جلی بۆ دەشوا؛ کیێ شیوێکی بۆ لێدەنیێ؟ -نازانم، پێدەچوو ئەمانەش هەر شتێك بن و بەمێشکی دایکدا بێن و هیچی دی).

((ئەدی نالێن کێیت، بۆ هاتووی؟)).

بابەگیان بە روخسارێکی ناڕازییەوە- کە هەمیشە لە گفتوگۆی دەگەلێ داییدا هەروا بوو- گوتی: ((با بڕوا و نەیکوژن- هەر رۆژێکی هەلێکە. لەوانەیە لەویێ بشیگرن- هیچ دوور نییە. بەلاێم جحێلە، بەرگە دەگریێ- یانی ناچارە بەرگە بگریێ، چارە چییە؟... ئەگەر پرسیان با بلێ هاتوومەتە زیارەتی ئەمیرول موئمنین، دوایەش، لەویێ ئێرانی زۆر لێن، تەنیا نابیێ...)) دوایی رووی دەکاکەی کرد و درێژەی دایە: ((ئەگەر بەگوێی منیش دەکەی ئەوە تێکەلی ئەو کۆمەلەی



نابی. هەولدە تا بۆت دەکریێ لە ناوچە کوردییەکاندا بمێنییەوە، و لەویێ نەجولێی، تا بزانین دوایە خودا چ دەکا- چونکە سەرەڕای هەموو شتێك لێرەوەش نزیکە، و دەتوانی هەر ناوە ناوەش هەوالێکی بزانی و هەوالێکیش بنێری.

باشە... لە بیرت نەچیێ؟)).

ئەو قسەیان بۆ دایی بوو... ((ئێستاش هەردەو پاشخانەیدا... راوەستە با سەیرێکی کەم؛ بۆ خۆت دانیشە...)) هەستا و بەرەو پاشخانێوە چوو، و هەر دوای دەقیقێکی هاتەوە.

((هەر دەوێدا خۆ دەشۆی، هەر دەوێشدا دەنووی- پەنجەرەکەی زۆر چوکەلە نییە؛ پیاوی بە ئاسانی پێدا دیێ و دەچیێ. هەرکاتیێ یەکێکیش هات... هەموو کەسێکیش هەر نا- ئەگەر بەمالێ وەربوون ئەوا ئەمن دەیکەمە هەراو زەناو شاتەشات و تۆش لە پەنجەرەیڕا ئاودیو دەبی... هێندە بلند نییە- یەك دوو مەتر زیاتر نابیێ. بەلاێم نەچی کاری مندالاێنە بکەی و خێرا تەقەی بکەی!... ئێوەش لەبیرتان نەچیێ: دەرکی حەساریێ هەمیشە دەبیێ داخرابیێ... کرابێتەوە دەتاخنکێنم!)).

کەس هیچی نەگوت مەلیحە تەشت و ئاوی بردنە پاشخانیێ و کاکە راست بۆوە. دایی ویستی چرایەکە بەرێتە پاشخانیێ؛ بابەگیان نەیهێشت. گوتی شەوقی چرایە بەو نیوەشەوەی دە پاشخانێدا کارێکی چاك نییە... تەقە و رەقەی لە تەشت و مەنجەلاێنەوە نەهێنی... ئێوەش بڕۆن بنوون)).

دایی دەگەلێ کاکەیدا چووە پاشخانیێ. کاکە لەپێشدا نەیهێشت، بەلاێم دوایە ئەوی وەك مندالاێن خستە ناو تەشتیێ و کەوتە پشت شوشتنێی. دوای تاوێك هاتەوە و کراسێکی بابەگیانی بۆبرد. ئینجا تەشت و مەنجەلێ و جامەکەی بردنەوە دەریێ و جێی بۆ راخست.

ئەو شەوەو (شەوەکانی دواییش) خەو نەچووە چاوی دایی. ئەوەندەی من بێداربووم چەند جارێکانم ئاگالێبوو لەسەرنووکی پەنجەی چوو سەری لە پاشخانێدا: لە کەلێنی دەرکێڕا سەیری تاریکییە ژوورێی دەکرد و تێی رادەما، کە لەدەنگی هەناسەکانی دلنیا دەبۆوە دەگەڕایەوە، یا دەنا و تەختە و چیغی نوستنیێ دادەنیشت، یا لەسەرجێی جینگلی دەدان. بابەگیانیش هەر بە ئاگابوو: ناوە ناوە ئاهێکی هەلدەکێشا، بەلاێم هیچی نەدەگوت.

ئەودەمی وشەیەکم بۆ دەربڕینی هەستەکانم نەدەزانی، بەلاّم ئێستا دەزانم کە ئەو شەوە دەمێشکە ناسکەکەمدا شتێکم بەدی دەکرد، هەر راست وەك ئەستێرەی کلکداری رژاو، کە لە نێوان سینەی دایی و پاشخانێوە دەبزووت. شوێن ئاهەکانی داییم هەلّدەگرت؛ تەنانەت نەدیتەش دەمدیت کە روویان لە پاشخانێیە- یەك دنیا هەست، هەستی بێ گەڕانەوە. بە دەرگای بێدەنگی پاشخانێ دەکەوتن، و دەچڕژان و دووبارە دەهاتنەوە و دە ساردا‌وێ سینەیدا وندەبوونەوە و بە دلّەگەرمەکەی خۆیان گەرم دەکردەوە و سەرلەنوێ رێیان دەگرتەوە بەر. هەلّچوو بووم. تا ماوەیەکی هەر نەنوستم. روخساری کاکەم هەر لە پێش چاوان بوو!... تازە خەتی سمێلّی دابوو، مێشکم مژوولی ئەو سینگە پان و ئەو بالاّ بلّندەی بوو. هەر ئەو شەوەش خەونم دیت: دیسانەوە پوورە خورشید بوو سۆزانییەکەی دەشوشت، و جارجارە بایدەدایەوە سەرەمە و هێرش و شالاّوی بۆ مەی مندالاّن دێنایەوە، کاکەش راوەستا بوو؛ پڕمە پڕم پێدەکەنی. پوورە خورشید دەستی وەبن کەمەری سۆزانییەکەیدا بوو و وەری دەگێڕا... کە کاکە برینەکەی لاجانگێی دیت بڕۆی تێکنان... دوایەش نەمزانی چۆن بوو: لەپڕ، وەك هەر خەونێکی، بوومە کوڕە جحێلّەیەکی وەك کاکەی و لە قەراغ چۆمی راوەستام... ورچێکی کەتەی زەبەللاح هات، ترسام! لەپڕ —نەمزانی لە کوێڕا- کاکە هات- هەر بەو جووتە چاوانەوە کەلاوەتی و متمانە بەخۆی تێدا شەپۆل دەدات. هەر کە هات ترسم نەما. گوتی: ((چییە؟- مەترسە؛ ئێستا بۆ خۆم دەردی تیمار دەکەم!)).

وەك بییەوێ دەگەلّ ورچەی دەستەو یەخەبێ چووە پێشێ و پەنجەیان لێکدان... منی نیگەران، بە شەوق و زەوقێکەوە سەیرم دەکرد... دوایی... لەپڕ لە پشتەوەڕا تەقەیەکیان کرد: ((شتراق)) راچلّەکیم، و لەو خەوەی راپەڕیم...

هەموو لە خەوێ راپەڕیبووین. دایی و بابەگیان لەناو تەخت و چیغی خۆیاندا دانیشتبوون؛ دایی هەناسەبرکێی وێکەوتبوو، وەك گێڕبووبێ. دوای تاوێك هەموو گوێ قولاّغ بووین. مەلیحە بوو گوتی: ((تەقەی تەشتەکە بوو... رەنگە پشیلە بەریدا بێتەوە!)) راستیدەکرد پشیلە بوو ئەو تەشتەی دایی بە دیوارییەوە هەلّپەساردبوو خستبووی! دایی گوتی: ((کوێرایی دایە ئینشاللاّ!)) دیارنەبوو لەگەلّ کێی بوو. هەستاو بەلەرزە لەرزەوە، دەتاریکییەدا بەرەولای پاشخانێوە چوو- کاکەش هەروا نوستبوو. بەیانی، لەسەر قاوەلّتییە خەونەکەم گێڕایەوە. دایی



مات بوو، و دەستی بەنزاو پاڕانەوە و ویرد خوێنییەکرد. کاکە بە پێکەنینەوە گوتی: ((زۆر گەورە بوو؟)) گوتم ((بەلّێ... بەلاّم بەتۆ هەر نەدەوێرا)). کاکە پێکەنی و دایی بۆ دلّنەواییە ئاهێکی هەلّکێشا. بابەگیان گوتی: ((عەبە گولّچیرێکیش هەبوو))[٢] و هەر بۆ روونکردنەوێ کاکە درێژەیدایە: ((چەند رۆژێك لەمەوبەر ورچێك لە دەست لۆتییەکەی خاوەنی بەرهەلّدا بوو دەگەلّ خەڕەکچییەکی بەناوی عەبە گولچیر ئاوقی یەکتری بوون و پەراسووی پیاوەی هەموو شکاندن؛ ئەو بێچارەیەی گەیاندە حالّی حەلوەلایە، تا گاردی سەرسنوور هات و گەیشتێ و ورچەکەی کوشت... ئەوە هەر ئەو خەونەی دیتۆتەوە...)).

* * *

[٢] گولچیر: گولچهرە: گولّ چەهرە: گولّ روو: دە شاری بچوکدا وەك ئەو شارەی مە ئەگەر مندالّێك بەهەر شێوەیەك هەتیو بێت و دایکی بەخێوی بکات، هەر بەناوی دایکیەوەی بانگ دەکەن.

## (١١)

تەواوی ئێش و ئازار و ناخۆشییەکانی دایی دە نیگەرانییە سەلامەتییە گیانی کاکەیدا ون ببوون و شارابوونەوە. ئیدی ئەو نائارامی و شیوەن و زاری و هات و هاوارەی جاران شوێنە وارێکیان نەمابوو. پەشێوییەکەی جاران پاك لە پاك سڕابۆوە، و لەجێی ئەمانە نائاسودەییەك هاتبوو و بەردەوام نەیدەهێشت وەعەردی کەون. کەڕی بەیانی چوو بووە حەساریٚ و سەرقالٚی ئاوڕشێن و گەسکدانیٚ بوو. ئێمە هێشتا هەر دەجێیدا بووین و ئەو هەروەك خووی جارانی، هەروەك هیچ رووی نەدابیٚ، دەرکی حەسارێی کردبۆوە و حەساری ئاورشێن کردبوو، و سەری خۆی قالٚ کردبوو. دەنگی گفتوگۆیەکمان بیست. هەستمان راگرت. بابەگیان هاتەلای پەنجەرەکێوە و بۆ ئەوەی چاتریشی گویٚ لە قسەکان بێت دەستێکی بردە بەر پەناگوێیەوە. دایی بوو قسەی دەگەلٚ زەینەبیٚ پوورە حەنیفەیدا دەکرد. زەینەب وەك کچی تەواوی ئەو مالاٚنەی گاوگۆل و مەڕو بزنیان هەن- کەمتر مالٚێك هەبوون ئەوانەیان نەبن- کەڕی بەیانی ریخ و تەپالٚەی دە قەرتالٚەی کردبوو و بەکۆلٚێی دادابوو، و هێنابوویە سەرگووفکی بەردەمی دەروازەی دامودەزگای کەلایی رەجەبی، ئەو پەینە لە دەروازەی ئەو شارێیەیدا کەلٚەکە دەبوو و بەسەریەکدا دەپیشا و بەبیٚ ئاگر لە ناوەخۆیدا دەسووتا و خۆی دەخواردەوە و هەلٚمی دەکرد.

زەینەب گوتی: ((پوورە گولٚبەهار، دویٚ شەویٚ کوڕە جحێلٚەیەك سۆراغی مالٚی وەی لە مالٚیٚ مە پرسی — ئەریٚ بەڕاست ئێرەی دیتبۆوە؟)) دایی بە روخسارێکی وڕەوە گوتی: ((جحێلٚە!؟ نا... مالٚیٚ مەی دەویست؟... چی دەویست... ئەوە هەبووبیٚ و نەبووبیٚ لەو گروبانە مەستە سەرخۆشانە بووە... زەلیل مردانە!)) بابەگیان لەوەی تۆقیبوو، دایی قسان بێرو بەوێدا بێنیٚ و بەریٚ و شتێکی نابەجێی لەزاری دەرپەڕیٚ و خۆلٚیٚ دە دۆی کا، هەر لەجێی خۆیەوە جینگلٚی



دەدان و پیشی دەخواردەوە و دەگەلٚ ئەوەشدا کەدایی ئاگای لێنەبوو ئەو بەچاو و برۆ و بەدەم و لێو و لووتەوە ئاماژەی دەکردیٚ و ددانی دەچیڕەوە دەبردن.

((نا گروبان نەبوو؛ کۆلٚە گیایەکی بەسەرشانییەوە بوو؛ وەك بییەویٚ پێلاٚوەکانی چاك کاتەوە- تاکێکی پێلاٚوەکەی بەدەستەوە گرتبوو)).

دایی گوتی: ((باشە، دەبایە پێت گوتبایە ئێستا بەو شەوەی کەی وەختی پێلاٚو چاك کردنەوێیە... هەموو دەزانن کە ئەکبەراغا شەوانە کاریٚ ناکا... چاکە، ئەوڕۆ دەیباتە دوکانیٚ)).

بابەگیان لەوەی زیاتر خۆ پیٚ رانەگیرا و هەر لەو سەرەوەیڕا هاواری کرد: ((گولٚبەهار، وەرە پیالٚە چایەکمان دەیە، دەڕۆین...!)) کە زەینەب ئەوەی بیست قەرتالٚەکەی تاودایەوە و بە کولٚێی دادا، و دایی دەرکەی داخستەوە و هاتەوە.

هیچی وای نەگوتبوو؛ بابەگیانیش هەر هیچی نەگوت، تەنیا گوتی کە دەبیٚ وریابیٚ، هەر لەخۆوە دەگەلٚ ئەم و ئەودا، دانەداتە قسان، قسە چاك و خراپی هەیە، قسەی لە خۆڕا کاران دەشێوێنیٚ. بابەگیان قاوەلٚتی کرد، و راسپاردەی شەوێشی دووپات کردەوە، و پێلاٚوەکانی کاکەی دە پارچە پەڕۆیەکیەوە پێچاو بە روخسارێکی گرژەوە بەرەو دوکانێوە چوو.

تا تاوهەلاٚتیٚ دایی بای دوو سالاٚن زیاتر پیربوو- هێندەی پیش خواردنەوە و هێندەی هاویشتەوە هەناوی خۆی. ئیٚ خۆ نەدەکرا بەو کەڕی بەیانییەی بگاتە سەر مالٚیٚ پوورە فاتمیٚ؛ بەلانی کەمەوە دەبیٚ چێشتەنگاو قایم ببیٚ ئەوجا بچیٚ- و تا ئەودەمیش عومرێکی مابوو.

هەر کە گوێم لە دەنگی کاکەی بوو یەکسەر رامکردە پاشخانیٚ... هێشتا دەرفەتی ئەوەی نەبوو حەوتیرەکەی بخاتەوە بەرپشتێی- من دیتم. ئای کە گەورە بوو! کە کاکە ئەو تاسەو حەسرەتەی دیتم ئەوی لە کیفەکەی هێنایە دەریٚ. جوانترین دیمەن بوو کە دەمدیت: بە بریقە، وەك ئاوی روونی زستانیٚ، کە بەشینی دەنواند. چوومە پێشتر، و هەروا کە بەدەست کاکەیەوە بوو دەستێکم پێداهێنا. هێشتاش نازانم چ خۆشییەك بوو. ئەوەندەم دەزانی کە هەم لە هەیبەتێی دەترسام و هەم لە دیتنێی خۆشحالٚبووم. جارێکیان سەید موختاری مارگر مارێکی هێنابوو. دایکان هەریەکە و وەلیفەتانەیان دەدا کە مندالٚەکانیان دەستی بەپشتێدا بێنن، تا

ئەوەی کوڕە سامی بشکێ و ئەوەی کچیشە تا دەستی بە بەرەکەت بێ و مەشکەکەی نقیشکی زیاتر بکەوێتێ. منیش دەستم بەپشتی مارەکەیدا هێنا- سارد و سڕ و سامناك بوو. دەست لێدانی ئەو چەکەش راست وەك وی بوو، تەنیا ئەوە نەبێ کە لە دەستلێدانی ئەمەیان دڵنیابووم چونکە دەمزانی ئەوە وەك ماری نییە لەپڕ هەڵگەڕێتەوە و پێوەدا. دەتگوت دەست بەپشتی مارو دەست بەپەڕو باڵی بێچووە قومرییەکیدا دێنم... کە تاو و بان گەرم بوون دایی بانگی مەلیحەی کرد. گوتی ئەو دەچێتە ماڵێ پوورە فاتمێ، و دوای وی دەرکێ داخاتەوە، حوسێنیش- یانی من- ئەگەر چووە دەرێ ئیدی نەیکاتە رێچکەی بزنە گەلێ هەر بێتەوە و بچتەوە دەرێ، ئەگەر چووە دەرێ دەبێ وەك دۆخینی کورت ئەگەر بەزی نەیەتەوە و یەکجاری بڕوا و لای بابەگیانی وەمێنێ، تا نیوەڕۆیە؛ دەرکە دەبێ داخرێ هەرچی هات لێی نەکاتەوە، تا بۆخۆی دێتەوە. بەلاّم مەلیحە شتێکی گوت من تێی نەگەیشتم. گوتی کە بابەگیان گوتوویەتی بچمە دوکانێ و تا پێلاّوەکانی کاکەی چاك دەکاتەوە هەر لەوێ بم و بیانهێنمەوە ماڵێ. دەقساندا ناوی کاکەمان نەدەهێناو بەهێما ئاماژەمان دەکردێ. تۆزێکم خۆ هێناو برد، دواییش وەك دایی دەڵێ گۆڕمم ونکرد. دایی چووە ماڵێ پوورە فاتێ.

رۆیشتم بێ هەست و خوست لەبەردەمی بابەگیانییەوە دانیشتم. بابەگیان تابڵێی سەرقاڵ بوو. ئاگای لە من هەر نەبوو کە لەوێشم- هەر مشتەی دەکوتاو درێوشەی لێدەدا، و لەبن لێوانەوە دەگەڵە خۆی دەگوت. ماوەیەك هەروا دانیشتم، تاسەری هەڵێنا. چاوێکی سەیری بەسەرو روخساریدا خشاندم و گوتی: ((ها!)).

گوتم: ((هیچ، هاتمەوە...)) ئیدی هیچی دیکەم نەگوت. ئەو گۆشتەی کڕیبووی بردمەوە، نەچوومەوە ژوورێ، هەر لە دەرکێوە دامە دەست دایی و گورجێکی گەڕامەوە.

کە گەیمەوە بابەگیان تاوێکی تەماشاکردم. دوایە گوتی: ((ئاه، تێگەیشتم...)) دوایی ((ئافەرین —ئێستا پێدەچێ دە هەموو شتێکی بگەی. هەر لەوێ دانیشە، کە تەواوبوو هەڵیگرەو بیبەوە)).

بە دوو دەرزیانی دە دروی؛ زۆر کەمم بەم جۆرە و هێندە بەکەیف دیبوو. بەقسەی کوردان ((دۆم بێ و کەلاّشی بۆ خۆی بکا)) هەردەو دەمەیدا دوو کەسی دیش هاتن، و پێلاّوەکانیان بۆیاغ کرد، و من وەك هەموو جارێکی دەو جۆرە کاتانەدا کە لەوێبام، گورجێکی و تا بابەگیان



پێلاّوەکانی کاکەی دەبن مێزەکەیدا شاردنەوە من پێلاّوەکانی ئەو دووانەم بە فلّچە و کەفی سابوونێ پاك کردنەوە و بە پارچە پەڕۆیەکیم وشك کردنەوە. بەرەبەری نیوەڕۆیە بوو کە لێبۆوە — پێلاّوەکان نورت و نوێ ببوونەوە. خەریك بوو دەکۆنە پەڕۆیەکیانەوە پێچێ کە وەبیرم هێنایەوە بۆیاغی نەکردوون.

گوتی: ((بۆیاغیان ناوێ... هەروا چاترە... ئەگەر بۆ خۆشی قسەی کرد بڵێ بابەگیان گوتی واچاکترە)).

تەماشایەکی وەستایانەی دەستکارەکەی خۆی کردەوە، و ئەوجا پێلاّوەکانی دەکۆنە پەڕۆیەکییەوە لوولدا و دەبن هەنگڵێی نام، رایسپاردمێ لە چ جێیان رانەوەستم و یەکسەر بچمەوە ماڵێ. منیش هەر وامکرد. هاتمەوە لە دەرکێمدا، دایی بۆ خۆی دەرکەی کردەوە و دوای دڵنیابوون لە دەرکە داخستنەوێ پێکەوە چووینەوە ژوورێ. کاکە هەر لە پاشخانێ بوو. پێلاّوەکانیم دایەوە. دایی نارەحەت بوو: ((ئەوە ئەو پیاوە چی لێ قەوماوە! پەنجە بۆیاغێکی لێ چاو بووە، ئەوە ئەگەر ئی خەڵکی بایە!...)) کاکە پێلاّوەکانی دە پێ کردنەوە؛ زۆر چاك و ئاسوودە بوون.

دایی بە پێچەوانەی جارانییەوە چێشتێکی گەرموگوڕی بۆ کاکەی لێنابوو —ئاخر ئەو دەورو زەمانانە چێشت لێنان بۆ نیوەڕۆیان باو نەبوو- نیو رۆژیان بە هەرچییەکی خوا بیدابایە تێك دەپەڕاند؛ زیاتر ئێوارانیان لێدەنا. بەلاّم ئەمڕۆ بە پێچەوانەی تەواوی رۆژەکانی دییەوە گۆشتاوێکی تابڵێی بە تامی بۆ کاکەی لێنابوو: دەیزانی کە کاکە دەستاوی گۆشتاوێ وی زۆر پێخۆشە و دەمێکیشە نەیخواردووە. دوای نیوەرۆژەی کاکە دووبارە لێی نوستەوە و تا بەرەبەری ئێوارێ هەڵنەستا. منیش کە وازی یاریکردنێ نێو مندالاّنم نەبوو هەر لە ماڵێ مامەوە.

ئێوارێ بابەگیان هاتەوە- کەمێك لە جاران درەنگتر. هەموومان دانیشتبووین: مەلیحە لەبەر سەماوەرێ، کاکە لە جێیەکەی خۆی پشت لە سۆبەی، بابەگیان وەك جاران، پشت بە دیوارییەوە و دایی بەرامبەر —ومن کە لە هەموو جێیەکم خۆشتر بن باڵی کاکەی بوو. بابەگیان گوتی، گوتی کە ئەوڕۆ بە ئەنقەست لەجاران درەنگتر هاتۆتەوە و لەبەردەمی ماڵێ پوورە فاتمێ گەڕاوەتەوە؛ کاتی رۆینێ کەسی لەوناوە نەدیوە بەلاّم لە گەڕانەوێیدا عەلی میدالّی پاسەوانی دیوە کە لە خوار ماڵێ پوورە حەنیفێوە راوێچکەی کردوون. بەهەر حاڵ ئاسوودە بوو بەوەی کە

ئامۆژگارییەکانی هەموو رەبەرچاو گیراون و وەك خۆیان جێبەجێ کراون و ئەو دوو دەمانەش کە هاتۆتەوە دایی تا دڵنیانەبووە کە بابەگیان خۆیەتی دەرکەی نەکردۆتەوە. هەروەك جاران لەجێی پێڵاو دانانێ ئاوی بە دەستیدا کرد. دەست و پێ و دەموچاوی شوشت، ئەوجا هات، و دانیشت پیاڵە چایەکی خواردەوە، جا بە دایی گوت: ((باشە، تۆ کارێك، شتێکت کرد؟)).

دایی گوتی کە چووە و زۆر تایبەتمەندانە، بەشێوەیەکی نهێنیانە و بەدزییەوە بە پوورە فاتمێی گوتووە کە ماڵە عەجەمێك لە شارییەوە وەڵامیان داوە و گوتوویانە کە منداڵێکی تاقانەی ناسکیان هەیە، دەترسن بیبەنە سەربازییە و دەشترسن بەو نەخۆشی و دەرد و دوو و پەتایانەی جارجارە دەناو سەربازخانەکاندا بڵاو دەبێتەوە کوڕەکەیان لە دەست بچێ، و رایان سپاردووە ئەگەر بکرێ چارەیەکیان بکەین، داخوا دەکرێ کوڕێژگەی دەگەڵ پیاوێکی دڵنیا و بە متمانە تا سەرسنووری بنێرین. مامی کوڕەکەی لە کەربەلایەیە؛ هەر ئەوەندە بەسە بگاتە سەرسنووری ئەودیوی و ئەودایی و بابە بەستەزمانەی لە کۆڵ ئەو هەموو غەم و خەفەت و دڵەڕاوکێیە بینەوە...

بابەگیان گوتی: ((هەردەبێ لەجیاتی ئەو دایی و بابەش (سەیرێکی کاکەی کرد و پێکەنی)یەك دوو فرمێسکۆکەت بۆ ئەو منداڵە بەستەزمانەی هەر هەڵوەراندبن!؟)).

دایی گوتی: ((ئەدی، جا ئەوە هەر دیارە! ژن وەك پیاوان نین، تۆ سەیری خۆت مەکە)).

((بەڵام ئێمە دوێنێ شەوێ هەموو پێکەوە بڕیارمان وابوو کە!)).

هەر بەقسە لە گرفتارییە منداڵی ماڵێکی دووری کەس نەناسدا پشکی دایکایەتییە خۆی باوێتە سەر سفرەی هاودەردیان. لە درێژەی قسەکانیدا گوتی کە پوورە فاتم سەرەتا بەجۆرێکی روانیوەتێ، وەك بۆنی شتێکی کردبێ، تەنانەت گوتوویەتی کە ئاگایان لەخۆ بێت —یانی ئێمە- پاسەوانێك لەو ناوە هاتوچۆیەتی وەك لە ماڵێکی بخەفتێ... و کاتێ دڵەڕاوکێی ئەوی دیوە گوتوویەتی کە ئەویش هەر دایکە و دەوشتانە دەگا؛ غەمێ نەخوا —بەسەرچاوان. بەیانی نا دووسبەی شەوێ، سەعیدی زاوای، دێتەوە- ئیدی، بەرەو ئەو ژێرانە چووە (بەزاراوەی ناوچەکە ((بەرەوژێر)) عێراق و ((بەرەو ژوور)) تاران بوو) ئینشاڵڵا هەر کە هاتەوە کارێکی هەردەکا، ئەوجا پرسی، باشە ئەوە سبەی شەوێ هاتەوەو من قسەم دەگەڵ کرد، ئەودەمی ئێوە ئەو



ماڵەی چۆن ئاگادار دەکەنەوە تا کوڕەکەیان بنێرن، تا سێ سبەی یا چوار سبەی دەگەڵی وەڕێ کەوێ چونکە وەك ئەو —یانی پوورە فاتم- بیستوویەتی عەجەمستان لەوپەڕی دنیایەیە- لەسەقزیش بەولاوەترە. دایی لە بەرامبەر ئەو پرسیارەیدا تێدەمێنێ و ئاخریەکەی دەڵێ کە بەهەر شێوەیەك بێ ((تەلگراف))ێکی دەکەین کە بەزووترین کات خۆی بگەیەنێتە ئێرە. بەڵام پوورە فاتم وەك ئاگای لە هەموو بەندو سەرەبەندان بێ گوتی عەیبی نییە، هەر کە زاوایەکەی بە سەلامەتی گەیشتەوە قسەی دەگەڵ دەکا؛ ئیدی خۆ ئەو سەفەرەشی نەبووە سەفەر- پەنا بەخوا. چی وانیە دوو سێ رۆژ پتر زیاتر نابا. و لە وەڵامی سەرنجە پڕ لە پاڕانەوە ئامێزو روخسارە داچۆڕاوەکەی داییدا گوتبووی دڵ لە دڵێ نەدا؛ ئینشاڵڵا بێ ئەوەی کەس پەی بە هیچ بەرێت ئەو منداڵە بەستەزمانەی لە سنوری ئاودیو دەکا؛ ئەگەر ئەو بەستەزمانە لەودیویش کەسی وای نەبوو ئەوە بەزاوایەکەی دەڵێ و رایدەسپێرێ بیباتە لای کەس و کار و خزمەکانی خۆی و بەوانی بسپێرێ- پەنا بەخوا. گوتبووشی ئەوەی لەلای کەس باس نەکات و نەیدرکێنێ، و واو واو فلان و فیسار و ئەوشتانە...

بابەگیان بە سوربونەوەیەکەوە گوتی: ((دە فەرموو)) دایی هەستی نەما، ئێمە هەموو سەرمان سوڕما، کاکە گێژ و وێژبوو، خۆدایی تا ئێرە هیچی بێ جێی نەگوتبوو، کەچی بابەگیان هەر بەڕاستی گەرم داهاتبوو سەروچاوەکان هەموو سڵ و چاوەڕوان بوون. بابەگیان گوتی: ((دەفەرموو! ئەوانە موسوڵمانن و ئەمانەش نا موسوڵمان و ئادەمخۆر! ئەمانە دەچنە دۆزەخ و رێزداران و هاوپاشکۆکانیشیان تەشریفی نا موبارەکیان دەبەنە بەهەشتێ! ئەگەر یەکسانی و داد ئەوەیە، با هەر پێشکەش بەخۆتان بێت!)) هەموومان هەناسەیەکی ئاسودەییمان هاتەوەبەرێ... ((بەڵێ، مەمەدی، هەر ئەو شتانە بوون کە دەست و پێیان بەستم و هێشتمیانەوە- و دەنا بەهەر نرخێك بایە ئەم کاولە وڵاتەم بەجێ دەهێشت و دەڕۆیشتم، تەنانەت ئەگەر بەگەدایی و دەروێشیش بایە!)).

جارێك پوورە فاتمە گوتبووی کە بۆخۆی وەڵام دەنێرێتەوە و هەوڵدەدا هەرچی زووترە ئەوکارە بە ئەنجام بگەیەنێ. بابەگیان دایی راسپارد کە ناوە ناوە سەرێکیان لێبداتەوە تا واتێنەگەن کەرو گێل و ئەمەك نەناسین: دەو هات و چوون و سەردانانەشدا، تا ئەو بۆخۆی شتێکی نەڵێتەوە ئەو نەکا هیچ بلێ.

هەر ئەو شەوە نوردووە نانە قەرزەکەیان دایەوە دەستم بیبەمەوە و ڕەوانەی ماڵێ پوورە فاتمێیان کردمەوە، پێشیان گوتم کە بەدزیەوە چاوان بەولاولایاندا بگێڕم و تەماشاکەم داخوا پاسەوان هەروا دەوناوەیدا پاسێ دەکەن و هەن یان نا، و مەلیحە هەمدیس لەبن دەرکێ وەمێنێ تامن دێمەوە بۆ ئەوەی زوو دەرکێ بکاتەوە، و پێویست بە لێدانێ نەکا.

چووم. ئەو جارەیان حەیدەر گوێ پانی پاسەوان لەوێبوو، هەروا بەدەم هاتوچۆوە تا لای حەوزەکەی بەردەمی ماڵێ پوورە حەنیفەی دەهات و دەگەڕایەوە.

پوورە فاتم گوتی: ((ئێستا کە هاتی پاسەوانەکە هەر لەوێ بوو؟)).

خۆم گێل کرد... ناراحەت بوو- گوتی ((ڕۆڵە)) هێندە سەرت بەرمەدەوە —کە بەرێیەدا دەڕۆی ئەولاولات باش سەیرکە... هەرچییەکیش دەبینی بە ماڵێی بڵێوە... زیانی نییە...)).

هاتمەوەو ئەوەی ڕوویدا بوو گێڕامەوە.

ئەوەش بڵێم کە بابەگیان گوتبووی پیاڵە و ژێرپیاڵە و کەوچك و هەوری زیادە بۆ کاکەی مەهێننە گۆڕێ: بابە پیاڵەی هەریەکێك لە ئێمە چای بخواتەوە و نانیش دەگەڵ دایی یادەگەڵ بابەگیانی بخوا. پێڵاوەکانیش — پێڵاوەکانی کاکەی- هەمیشە با لە پاشخانێ بن، تا ئەگەر کەسێك لەپڕ هاتە ژوورێ و دەرفەتی لابردنی ئەو شتانە نەبوو با قولاغێك لەبەرچاوان نەبێت. ئەو شەوەش تا درەنگانێکی دانیشتین. کاکە ماندووی حەسابۆوە و بەکەیف بوو، و دایی هێور بوو- جگە لەوەی کە جارجارە هەڵوەستەیەك دەقسان دەکەوت. دەوکاتانەدا دەستی دە ئەژنۆی وەردێنان و دەکەوتە دەریای بیر و خەیاڵانەوە. تێڕامانی هەر دە ڕوخساری کاکەیەوە بوو؛ چاوی لێ نەدەتروکاند. هەروەك نەیبینێ. جۆرێك بوو وەك ئەوەی لەخۆیدا ونبووبێ و دەگەڵ یەکێکی دیکەیدا سات و سەودابێ، کە ئێمە نەماندەدیت.

بابەگیانیش دڵی زۆر خۆش نەبوو. چاوەڕێبوو دڵی خەبەری دابوو کە ئەمشەو بەماڵێ هەر وەردەبن. ئێستا تێدەگەم، پێی وابوو پێش نوستنێ بێن چاکترە، ئاخر ترس و لەرزی لەخەو ڕاپەڕین و هەستانێ و لەجێ دەرپەڕینێ شڵەژانێکی ناخۆشی لەدوایە، لەوانەیە کاکە دەستە پاچە بێت و نەزانێ چ بکا. هەربۆیە بوو تا درەنگانێکی شەوێ دانیشتین. چ باس نەبوو؛ بۆ کات بەسەربردنێش، ناوە ناوە شتێك- لەلایەن بابەگیان یان داییەوە- دەهاتە گۆڕێ و لەو



شتانەی دایی بە پوورە فاتمێی گوتوون و پوورە فاتم بەوی گوتوونەوە و کاکەیان ڕادەسپارد کە هەرکە گەییە ئەو جێیەی بۆی دەچێ ماشەڵڵا خوێندەوارە و زەینی ڕوونە گورجێکی کتێب و دەفتەران بکڕێت و زوو خۆی فێرە زمانی ئەو شوێنەی کا-چی وای دەگەڵ زمانی فارسیدا نییە، ئێمەش چ لە بەیانی زووتر نییە دەست بەوکارەی دەکەین، (من کە هەر لە ئێستاوە کوردییەکەم وەك ئاوێیە)، بەڵکە ئێ ئەوەخواو ڕاستان کردی و ئێمەش سەرەنجام توانیمان دوای ماوەیەك لێرە هەڵکەندرێین و بچینە کوردستانی عێراقێ و بەو شادبینەوە. دایی هەروا دەکولا هەر دەیهێنا و دەیبرد و دەدڵی خۆیدا لێکی دەدایەوە؛ تەواوی شەوێ لە سەرجێی هەرگریا، غەمی وەیبوو ڕۆژێك بێت بەناچاری ڕۆڵە غەریبەکەی —عالیە- تاك و تەنیا و بێکەس و بێدەر و ((بێ پەنا)) لێرە لەناو ئەو خەڵکە غەوارەیە بەجێ بێڵێ!

هەقیشی بوو، تا ئەودەمی ئەو شوێنە نەبوو بووە نیشتمانمان، کە مردوومان لێ ناشت ئەودەمی بووە نیشتمانی ڕاستەقینەمان و بەلانی کەمەوە، ئەوەندە بەلای داییەوە ڕوون بوو کە ئیدی تازە ناڕۆین... ئێمە ئاگامان لەوەی نەبوو بەڵام وەك هەمووشمان ئەوەی بزانین وابوو- لەبەرئەوە هەر بە ئاوات و ئومێدی ئەوەوە بووین ڕۆژێك لە ڕۆژان بەخت و ناوچەوان و ئیقباڵەکە بگۆڕێ و کاکەبێتەوە!

سەرەنجام چووینە ناوجێی. ناخۆشییە دوێنێ شەوێ ئەگەر چی سوکتریش ببوو بەڵام دەقووڵایی ناخدا هەرمابوو: نیشتبوو. نازانم کاکە، بەڵام دایی و بابەگیان هەر ڕاست وەك فەنەرێ بوون کە پێیان لەسەرداگرتبن: دە ناوێدا کۆك و خڕ ببوونەوە سەریەك، هەرچاوەڕێی هێندێ بوون پێیان لەسەرلابەیت و فشاریان لەسەر نەمێنێ، ئیدی هەر هێندەیان بەسە تا لەجێی خۆیان بترازێن دەرپەڕن. ئەو شەوەش دایی هیچی وا نەنوست: بەردەوام ئەودیوەو دیوی بوو و ئاهی هەڵدەکێشان و دەپاڕایەوە... ئەو شەوەش بەخێرگەڕا... ئەو ڕۆژە دووبارە دایی چۆوە ماڵێ پوورە فاتمێ و من هەمدیس چوومەوە دوکانێ لای بابەگیان و تا نیوەڕۆیە نەهاتمەوە. ئەو ڕۆژەش دایی سەوزەکوکوی بۆ کاکەی لێنابوو، کاکە دوای نیوەڕۆیە نوست. بابەگیان گوتبووی شەوێ کەمێك درەنگتر دێتەوە، نیگەران نەبین. تا دوای نوێژی شێوان مابۆوە، لە دوای نوێژێ دەگەڵ حاجی عەولای پێکەوە هەریەکەیان بۆ ماڵێ خۆی دێتەوە. لە خوار ماڵێ پوورە حەنیفەی تووشی زەینەڵ پاسەوانی دەبێ؛ بە هەویای وەدەست هێنانی باس و هەواڵێکی،

دەگەڵێدا دەکەوێتە چاك و چۆنی و ئەحواڵپرسییە، هەرچەندە هەوا بەسەر تاریکییەدا بوو و ڕەنگ و روخسار زۆر دیار نەبوون. هەر بۆ شوێنە ونیەش فەرمووی شامێی لە —زەینەڵ—ی کردبوو.

گوتی حاجی عەولاَ بەڵێنی پارەی پێداوە بیداتیَ، و سوپاس بۆ خوا وەك کارەکان بۆخۆیان مەیسەربن هەموو شتەکان روو بەرەوخێرن. دایش گوتی کە ئەورِۆ لای پوورە فاتمێ بووە، گوتوویەتی کە زاوایەکەی بەسەلامەتی گەیوەتەوە و هەموو شتەکانی دەگەڵدا باسکردووە؛ زاوایەکەی گوتوویەتی هەرشتەکان ساغکەمەوە ئەوپەڕی تا سێ سبەی دووبارە وەڕێ دەکەوێتەوە و رایسپاردووە تازووە ((تەلەگراف)) بکەن و کوڕەکەیان وەڕێ خەن، تا خوانەخواستە نەکەوێتەوە جارێکی دی؛ خوا دەزانێ، هەزار موقەددەر لە رێیەیە؛ لەوانەیە، زمانی شکێ، پێشهاتێکی بێتە پێشێ؛ یاکێ چوزانێ، لەوانەیە هەزار رێکەوت رووبدات، بەقسەی وی کە سێوێکی هەڵدەدەیە حەوای تادێتەوە خوارێ بە هەزار لایاندا خول دەدات. کورتییەکەی، واچاکترە ئەو دەستاو دەستییە نەکەن. دایی دە وەلاَمدا گوتوویە کە هەر لە دوێنێوە ((تەلەگرافی)) کردووە و ئەوە هەر چاوەڕێیە کوڕە بگاتێ —لەوانەیە ئەمشەو یا بەیانی بگات. بەهەرحاڵ با ئەو وابزانێ گەیشتووە و ئەوە لێرەیە و چ هەیە ئاگاداری کات. بابەگیان گوتی جلەکانیش تا سبەی ئێوارێ فەیزوڵلاَ تەواویان دەکات. لەبەر ئەوە ئەگەر ئەو یەك دوو رۆژە، پەنا بەخوا بەخێر و خۆشی تێپەڕێ ئەوە خەیاڵمان لەولایەنەوە ئاسوودە دەبێت.

دایی هەر لەو دەم و ساتەوە کەوتە رێکخستنی تەدارەکی سەفەری کاکەی. سەرەتا ئەو جلانەی بۆی شوشتبوو هەمووی بۆ پێچایەوە، و دواییش هەر ئەودەمی بەرەو لای تاوەکەوە چوو، بۆ حەلوا دروستکردنێ، بۆ تویشووی رێیەی. من و مەلیحە بەپێچەوانەی بابەگیانییەوە کە دەیویست هەرچی زووترە کاکەی بەرێکات یەکجار زۆر نارەحەت بووین لەوەی کە بەو زووانە دەڕوات و ئیدی نایبینینەوە.

ئەو سەرنجانەی تێك هەڵدەنگوتن و تێك دە ئاڵقان هەمووی بۆنی لێك دابڕان و جوداییان لێدەهات و تاك تاکەی ئاهەکانی کاکەش کە جاروبارە لە سینەیڕا دەهاتنە دەرێ هەر ئەوانەیان دەگێڕایەوە. شەوانی بەر لێك دابڕان و جوداییە هەمیشە هەروایە. کە نیشانەی وەبیرهێنانەوەی جودایی و لێکدابڕانێکی گەورەترە بابەگیان رووی دەمی دەدایی کردەوە: ((تەدارەك و مەدارەکی ناوێ- پارەی دە باخەڵێدا بێ هەرچی بیەوێ، لە هەموو جێیەکی هەیە- بەخۆڕایی باری قورس مەکە. ئەگەر



پارەیەك، چووزانم، وردە زێڕێکت هەیە بۆی لەجێیەکی جلەکانی بدرووی لە هەموو شتێکی چاکترە...)).

دەودەمەیدا یەکێك بە توندی لە دەرکەیدا- هەرچەندە زۆریش توند نەبوو. بەلاَم بە بەراوردکردنی دەگەڵ ئەو لە دەرکەدانانەی ئەو چەند رۆژانەی خۆمان، دەتگوت تۆپە. هەموو لەجێی خۆمان راچڵەکین، و سەیرمان کرد! دایی ڕەنگی سپی هەڵگەڕا بوو، دەمولێوی وشك بوون و لێوەکانی وێك هاتنەوە. بابەگیان بەدەست ئاماژەی پاشخانێی کرد. گوتی با لایەکی دەرکەکەی والاَ بێ. بە ئێمەشی گوت لەجێی خۆمان نەجولێین، زۆر سادە و ساکارانە دانیشین- هەروەك هیچ نەبووبێ. هێشتا شامان نەخواردبوو. سەماوەر تازە وەکوڵ هاتبوو. کاکە بە تەنیشت دیوارییەوە باریکەی دایە و چۆوە پاشخانێ. بابەگیان هاتە نێو پەنجەرەکێوە و گوتی: ((کێیەوە؟)) یەکێك لەودیو دەرکێوە گوتی: ((بیکەنەوە، خۆمانین)).

سەرسامییەك بەسەر روخساری بابەگیانیدا تێپەڕی: ((خۆمانین!)) دایی لە هەوتییە و پەشۆکاوی و دڵە خورپەوە بەربۆوە. بابەگیان چوو. دیسانەوە بە ئاماژەی دەست تێیگەیاندین لەجێی خۆمان نەجولێین، تا بچێت بزانێ کێیە و چی دەوێ.

دەرکەی کردەوە... ئەبولفەتح خان بوو، مەئموری ئەمنییە (ئاسایش)! بابەگیان لە ترسی ئەوەی نەوەکو —بەقسەی وی- کاکە منداڵکارییە بکات یا دەستە پاچە بێت و بەخۆڕایی خۆ لە پەنجەرێڕا ئاو دیوکات، هەر لە حەسارێوە و بە درێژاییە دالاَنێ و تاجێی پێلاَو دانانێ- تەنانەت لەجێی پێلاَوانیش- و تا ئەودەمەی ئەبولفەتح خان دانیشت ئەوە بەردەوام یەك لە دوای یەك بەخێرهاتنی دەکرد و دەیگوت و دەیگوتەوە: ((گەورەییتان فەرمووە، ئاوەدانتان کردەوە. پێلاَوتان سەرچاوان...)) بەلانی کەمەوە دە جارانی گوت و گوتەوە. هەموومانی لەبەر هەستاین. هات و بەدەم پرسیارانەوە چووە بنەبانێ، سەری سەرەوە، لەجێی بابەگیانی دانیشت. فەرمووی کردەوە، ئێمەش هەموو بەتەواوی رێز و ئەدەبەوە لە بەرامبەری دانیشتین. دایی چای گەیاندێ؛ ئەبولفەتح خان پیاڵە و پێلاَو و هەموو جێیەکی وەبەر سەرنجاندا.

بابەگیان گوتی: ((ئەوە چۆنە! بەندە نەوازیتان فەرمووە... لوتفتان فەرمووە، سەربلَندتان کردین)). تا ئێرە بووە سێزدە جار.

ئەبولفەتح خان گوتی: ((دەبێ ببوورن، دانیشتنەکەم لێ تێکدان... هەروا هاتم... لێرەوە رادەبردم، لەپڕ ئێوەم وەبیر هاتەوە. گوتم ئای، هاوشاری و خۆماڵەتیان گوتوە، با هەر نەبێ لادەم و سەلامێکی بکەم و هەواڵێکی مەشەدی و مەشەدی خانمێ بپرسم... دەی توخوا چۆنی ئەرباب؟)).

ئەو رستەی دوایەیانی دەگەڵە من بوو؛ من بەنیوە سەرشۆڕییەکەوە، قامکم بۆ زاری برد و بە چاوی سرك و سڵەوە و بە کەمێ زەردەخەنەوە دە سەروچاویەوە رامام- یانی وەك ئەوەی بڵێم چاکم.

بابەگیان هەروا کە چاوی دەویەوە بڕیبوو. دەستی هێناو قامکی لە دەمم دوور خستەوە و بێ ئاوڕدانەوە لەمن گوتی: ((ئیختیارتان هەیە، جەناب رەییس. جا باشە کێ لە جەنابعالی بەولاوە شایانی مەجلیسانە... بەڕاستی بەندە نەوازیتان فەرمووە. ئەگەر دەمزانی، بەواتەی ژنان، گایەکم لەبەر پێی سەردەبڕین...)).

نازانم بابەگیان ئەو میوان نەوازیانەی وا بەمجۆرە لە کوێ فێرببوو. بێ ئەوەی هیچ بە کەس بڵێ، بە پێچەوانەی خوو و رەوشتی خۆیەوە، هەر بۆخۆی بڵند بوو و چوو سینییەك و ئەو شووتییەی کڕیبووی لە پاشخانێڕاهێنان. چەقوی تاودایە، شووتییەکەی شکاند، و قاشێکی زۆر جانانەی لە پێش جەناب رەییسی دانا. هەردەو دەمەشدا دایی دەڵێ: ((خوا لە ئێمەتان نەستێنێ... خوا لە گەورەییەتان کەم نەکا، خانم و ئاغازادەکان چۆنن، چاکن، بەکەیفن، ساز و باشن؟)) و بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵام بێت سوپاسی خودای دەکا!

ئەبولفەتح خان گوتی: ((لە سایەی سەری ئێوەوە باشن. سلاوّیان هەبوو. ئینشاڵلا رۆژێکی رێك دەخەین تەشریفتان بێننە ماڵێ مە و منداڵەکانیش ببینن- دڵیان پێخۆش دەبێ، چونکە لێرە هاونشینێکیان نییە- خۆ ئەو کاول بووەش هەر شارنییە!)) و چاوێکی بەلای پاشخانێدا گێڕا: لایەکی دەرکەکەی کراوە و ئەویدیکەی داخرابوو، و تاریکییە ژوورێی دیاربوو.

بەوچاوە قاوەییە مەیلە و زەردە بیلبیلە رەش و گەورانەی و ئەو سەروچاوە چرچ و لۆچاوی و شانە باریکەلانە و ئەوقژە خۆڵەمێشییە دێزەیەوە کە بۆ دواوەی داهێنابوو و خەتێکی دەناوەراستێ کردبوو و هەریەکەی بەلایەکیدا خستبوون، هەر راست بە مەیمونی پیر دەچوو.

شوتییەکەی خوارد؛ تا لەوی بۆوە چایەکەش پێگەیی. دایی چای تێکرد. دایی خۆی هێنا حاڵی جاوێ. هەردەتگوت ئێستا نا ئێستا بەلا دادێ و راست نابێتەوە. هەروەك بۆ خۆی لەدوایەدا گوتی



ویستوویەتی کارێکی وابکا هەرچی زووترە بڕوا نەکا خودا نەخواستە مەمەد دەپاشخانێدا کۆکە یا پژمینێکی بێتێ و ماڵوێرانی کات.

ئەبولفەتح خان چایەکەی خواردەوە؛ چەند جگەرێکیشی بەدوادا بە بادان- و دوایەش چایەکی دیکەی خواردەوە. ئەوجا زۆر خۆماڵیانە و بەدەنگێکی زۆر لەسەرخۆوە گوتی: ((بەڵێ، گوتم با هەر نەبێ سەرێکی لەو هاو شاریانەم هەڵێنم- خۆ چ زیانێکم لێناکەوێ...)).

بابەگیان گوتی: ((گەورەییتان فەرمووە...)).

ئەبولفەتح خان تاوێکی بیرکردنەوە. چەند چەسپێکی جانانەی لە جگەرەکەیدا. من بێ ئیختیار بەدزیەوە سەیرێکی دەرگای پاشخانێم کرد؛ بابەگیان رەنگی سپی و زەرد هەڵگەڕا، گوتی: ((چاوت لێیە جەناب رەییس راست دەفەرموون- ئیدی تۆ منداڵ نیت؛ هەستە دەی منداڵ بازاڕییە مەکە... گوتم هەستە ئەو چایەی بەرە خزمەتیان!)) لەکاتێکدا کە واشی نەگوتبوو.

جەناب رەییس کە سیگارە تەواو بووەکەی نێوان پەنجەکانی خۆی لەبیر چووبۆوە، هاتەوە سەرخۆ- وەك لەشیرن خەوێ راپەڕیبێ- گوتی: ((نا، وازی لێ بێنە نارەحەتی مەکە... منداڵە ئیدی... خوا لێتان نەستێنێ)). و دوای ساتەوەختێك بێ ئەوەی رووی دەمی لە کەس بێ بەدەنگێکی نیوە رەسمیانەوە درێژەی دایە: ((بەڵێ، گوتم لەوانەیە خراپ نەبێ —بەڵکە باشیش بێ...)) و روخسارە پرسیاراوییەکەی بابەگیانیشی دیت بەدوای قسەکاندا گوتی: ((بەڵێ... گوتم لەوانەیە کاریگەر بێت...)) سەیرێکی ئەملاولای کرد، وەك کارێکی گرنگ و نهێنی و لێپرسراویانە نیشاندا: ((بەیانی حەزرەتی ئەجەل تەشریف دێننەوە؛ شتێکم لەلای خۆمەوە دەبەرچاوگرتووە، گوتم بەڵکە ئێ بتوانم کارێکی بۆ هاو شارییەکانم بە خزمەت بگەیەنم...)) بۆ تاقیکردنەوەی ئەو هەواڵە دە دەموچاواندا، تاوێك راوەستا. دیاربوو دڵی بە قسەکەی خۆش بوو. لێی زیاد کرد: ((بەهەرحاڵ، بەیانی تەشریف دێننەوە)) (گیانمی، بەیانی دەچینە سەیرێ!) ((بەلای منەوە خراپ نابێ ئەگەر سکالانامەیەکی بۆ مەشەدی خانمێ بنوسن، و بەدەستی خۆیان بیدەنە دەست خودی جەنابی حەزرەتی ئەجەل- هەر راست لەسەر لێواری چۆمی بەردەمی پێشوازیکەرانیش دادەبەزن. بنووسن منداڵ بووە، و کارێکی منداڵانەی کردووە، نەیزانیوە، لە بچووکان خەتا، و لە گەوران عەتا... پێم وابێ بێ جێ نابێ...)).

بابەگیان وەك رمووزنەی دیتبن لەجێی خۆی مات و سەرسام دەیڕوانی. کاتێ جەناب رەییس ئەو سەرسامییەی بابەگیانی دیت گوتی: ((بەڵێ، ئیدی...)) و ئەوجا دایدایە تورکیە. بە تورکی لە بابەگیانی پرسی ((منداڵەکان تورکیە دەزانن؟)).

بابەگیان گوتی نەء، تەنیا ئەو و دایی دەیزانن. جەناب رەییس بە تورکی گوتی: ((ئاخر، هەلاتووە... چەکی ئەفسەرێکیشی دەگەڵە خۆیدا فڕاندووە... لە ناوەندی ئوستانێوە یانڕا نووسیووە. —ئەڵبەتە دەبەخشن- ئەم شتانەشیان بەو دواییانە هاویشتۆتە سەرێ، خۆ دەزانی دەڵێم چی؟... هەرچەندە خوا بۆ خۆی دەزانێ... لەوانەشە ئەوە هەر ئەویش نەبووبێ)).

دەو دەمەیدا دەنگی خشپەی پێیەکیش لەسەربانییەوە هات. هەموو خۆمان واپێشاندا کە گوێمان لێنەبووە. لە زگ و سینگ هەڵچوون و داچوونی بابەگیانییەوە دیاربوو کە تووشی شڵەژان و نارەحەتییەکی زۆرە. بابەگیان ئەوق ما- رەنگی پەڕیبوو. کاتێ جەناب رەییس راوەستا، بەروخسارێکی تەواو سەرسامەوە- زۆر ئاساییانە- گوتی: ((راستیت دەوێ!؟)) داییش هەروا سەرسامی بەروخسارییەوە دیاربوو- یانی دەگەڵ ئەو نیگەرانییەی هەمووواندا، ئەویش سەرسامی خۆی دەردەبڕی. بابەگیان لێی زیاد کرد: ((گاڵتە دەفەرموون!)) و روخساری سامناکیی لێ نیشت: ((باشە ئێستا ئەو گێلە رووی دە چ دەرکێکی کردووە؟... عەرزی جەنابتیان نەکردووە؟...)) ئەبولفەتح خان گوتی: ((ئیدی ئەوەیان نازانم...)) و بێ وازانە گوتی: ((ئەگەر بمزانیبایە ئێستا لێرە نەدەبووم...!)) بۆ پینەکردنێ ئەو هەڵەیەی کۆکەیەکی کرد و بەسەروچاوێکی نیگەرانەوە رووی دەمی دە هەمووان کرد گوتی: ((بەهەرحاڵ، مەشەدی، مەشەدی خانم، منداڵینە... مەردی خودای بن دەستمان دەزاخی نەنێن!)) ئەوەی بە فارسی گوت. بابەگیان هەر بەو سەرو رووە ترساوییەیەوەو- گێژ، بەلام بە پێزانینەوە، گوتی: ((نا، جەناب رەییس، ئەو قسانە چین دەیا نفەرموون- زۆر دڵنیابن! ئێوە چاکەیەکی گەورەتان بەسەر ئێمە و منداڵەکانەوە هەیە. ئێمەش هێندە بێ چاو و روو و پەرژین بێ لێتان نمەك نەناس و بێ ئەمەك نین... نەخێر، دڵنیابن!)).

دایی گوتی: ((خودا سایەتان لەسەری ئێمە و منداڵەکان کەم نەکا؛ خوا منداڵەکانتان پێ بێڵێ- بۆ خاتری ئیمام ئەبولفەزل!)) بابەگیان گوتی نازانێ سکالانامەکەی بەکێ بنوسێ، چونکە بۆ خۆی سەوادێکی وای نییە و حەزیش ناکا لە غەریبایەتییەدا کەس بە نهێنی ماڵ و خێزانی بزانێ.



ئەبولفەتح خان گوتی: ((کچۆڵەکە چۆنە؟)) مەلیحەی دەگوت، و مەلیحەش لەوە و دوا بووە ((کچۆڵە)). هەرکاتێ بمویستبایە سەری بکەمە سەرێ دەمگوت: ((کچۆڵێ چایەکی تێکە!)) و ئەوەی بەلاوە لەسەد جنێوان خراپتربوو- بەوچاوە زەرد و رەشانەیەوە دە روخساری مەلیحەیەوە راما: ((ئەوانیش هەر نەخوێندەوارن؟)).

بابەگیان گوتی: ((بۆ، تا پۆلی چوارەمی خوێندووە، بەلام هێندە نییە بتوانێ سکالانامە بنوسێ... ئەوماوەیەش ئەوە هەر هیچ کە کتێبی لێك نەکردۆتەوە...)) جەناب رەییس گوتی: ((من بۆ خۆم دەینوسم، با هەر ئێستا ئەو خاتوونەش پاکنوسی کاتەوە... چونکە باش نییە دەست و خەتی من دەو بەسەرهاتەیدا دە دۆسیێیەیدا بێت، دەنا خۆ ئەو ئەرکەم نەدەخستە سەرشانی وی)).

دایی و بابەگیان تا توانیان دوعای سەروماڵیان بۆ کرد. بەلام کاغەز و قەڵەم و مەرەکەب چییە، دەوماڵەیدا نەبوو. ناچارمنیان وەدوای کاغەز و قەڵەم و مەرەکەبی بۆ ماڵێ پوورە حەنیفەی نارد کە کوڕەکەیان ((میرزا)) بوو. گوتیان بچم و دوو پەڕە کاغەز و مەرەکەب و قەڵەمێکی لەوێ بێنم، و زوو بێمەوە، و وریابم مەرەکەبەکە نەڕێژم و نووکی قەڵەمەکەش نەشکێنم؛ دەربارەی سکالانامە و ئەو جۆرە شتانەش هەرلەلای هیچ کەسێك باس نەکەم؛ هەر بڵێم نامەی بۆلای خۆمان دەنووسین.

بەڕاکردن چووم، و هاتمەوە. زەینەڵ پاسەوان هێروەتر هاتبوو. هەرکە منی دیت دوورکەوتەوە... هاتمەوە. جەناب رەییس سکالانامەی نووسی: ((بۆ خاکی بەرپێی جەنابی حەزرەتی ئەجەلی پایە بەرز ئەمیر لەشکری رێزدار و شکۆداری خۆراوا، خوا پایەیان و شان و شەوکەتیان زیاترکا)). ئەو ناو و نیشانەم تائێستاش وەك دوێنێ لە بیرماوە. دوایی دە دووسێ دێڕاندا ((زەعیفە)) —یانی دایی- بوو کە عەرزی خاکی پیرۆزی بەرپێیانی دەگەیاند کە ئەوە عومرێکە لە دابڕان و دوورییە جگەر گۆشەکەی محەممەد عەلی رەزایی فرمێسکی خوێن دەڕێژێ و بێجگە لە زاتی پیرۆزی شاهانە و جەنابی حەزرەتی ئەجەلی پایە بەرز ئەمیر لەشکری شکۆدار بەولاوە جێیەکی دیکەی نییە هانای بۆ بەرێ داواکارییەکی خاکەڕایانەی بێ دەسەلاتانە دەخوازێ کە مەرحەمەت بفەرموون بەچاوی لێبوردن و بەخشینەوە چاوپۆشی لە ((جگەرگۆشە))کەی بفەرموون کە زۆر بەداخەوە کارێکی نەزانانە و منداڵانەی ئەنجامداوە و بەو نەزانییەی ژیانی بنەماڵەیەکی شێواندووە و تێك و پێکی داوە و دایکێکی زەعیفەی توشی دەرد و غەم و کەسەران کردووە. تا ئەو ((زەعیفە))یە هەیە و

عومری ماوه دەستەو نزا روو لە خوا بۆتـان بپارێتـەوە خـوا زاتـی پـیرۆزی شـەهریاری و جـەنابی حەزرەتی ئەجەلی شکۆدار دەبن باڵی خۆی گرێ.

جەناب رەییس سکالاٚنامەکەی خوێندەوە- تابلێی چـاك بـوو. هـەموومان لـەو هـەموو زانـست و زانینە، مات و سەرسام و ئەوق ماین و ئەومان دەنێو سـەرنجەکانی خۆمانـەوە لولـدا- بەتایبـەتی وشەی ((زەعیفە)) ، ((دەردی جودایی))، سینییەکی نخـون کـردەوە و چـوار مەشـقی لەبـەردەمی سینییەکەدا پان بۆوە و بەهەر شێوەیەك بوو بە خەتێکی شەش تەقەڵ و مانگەشەوی سکالاٚنامەکەی لە نوێ نوسییەوە. پێدەچوو جەناب رەییس دەستنوسەکەی خۆی دە سۆبەی هاویشتبێ- و ئارەزووی رۆینێی کرد؛ چونکە هەربۆیە دەیگوت هەست دەکا مەشەدی خانم تەندروستی باش نەبێت. دەدەمی رۆینێدا، تیلەچاوێکی لەجێی پێلاٚو دانانێوەڕا گرتەوە ژووری پاشخانێ —و هەر کە چاوی کەوتەسەر ئەوێ سەری بابەگیانی بێ ئیختیار شۆڕبۆوە و لێوەکانی تێك هەڵقرچـاندن- ئامۆژگـاری کـرد کـە بەیانی سکالاٚنامەکە دەبا، با هەر بەو دەستەی ژێرچەنەی عەبایەکەی پێگرتووە سـکالاٚنامەکە بـە بەرسینگی خۆیەوە بگرێ تا لە دوورەوە دیار بێت، و ئەوجا بچێت بیداتە دەست جـەنابی حـەزرەتی ئەجەل. زۆری پۆزش لەوەی هێنایەوە کە بەو ناوەختە هەراسانی کردبن، و بابەگیان لەوەلاٚمدا زۆری سوپاسی ئەوە کرد کە لوتفیان فەرموو و بەندە نەوازیی کردوون. چرایەکە هەر زوو رەپێش خرابـوو؛ مەلیحە لەوسەری دالاٚنێوە لەسەر پلیکانەکان چاوەڕێ بوو. بابـەگیان جـەناب رەییـسی تـا سـەری کۆلاٚنێ بەڕێکرد. دایی یەکجار دڵخۆش بوو. پێم وابێ دە دڵی خۆیدا وای دانابوو کە هـەر ئەوەنـدە بەسە شەهریار یا جەنابی حەزرەتی ئەجەل- بزانن بەندی دڵەکەی کـارێکی نەزانانـەی لێقـەوماوە و ((زەعیفە)) کە شەو و رۆژ فرمێسکی جودایی دەڕێژێ و پێی وایە تامێنێ هەر دوعایانیان بۆ دەکا. ئەودەمی گومان لەوەدا نامێنێ چـونکە بـۆ خۆشـیان بـاوکن و جـەرگیان هەیـە، بـێ دواکـەوتن، کەمتەرخەمییە ((جگەرگۆشایەتییە)) بەچاوی بەخـشین چـاو لێدەپۆشـن و ئـەو بـەدوعا گۆیـەکان دەسپێرنەوە.

تا بابەگیان نەگەڕایەوە کاکە نەهاتەوە ژووری ناوماڵێ؛ کاتێکیش کـە هاتـەوە زۆر شـڵەژابوو. بـە بابەگیانی گوت: ((چەندم حەز دەکرد ئێوە لێرە نەبان تا نەزانییەکم پیـشاندابایە تـا مـاوە لـەبیری نەچێتەوە... پەحا! من داوای لێبوردن بکەم! ئەدی ئەوە کەسێك نییە لەو بێ شەڕەفانە بپرسێ کـە من گوناهم چ بووە؟...



بابەگیان گوتی: ((هەرچۆنێکی بێ، یەکێکی ئاوا دەنێواندا هەرچاکە. بەقسەی پێشینان بزن لەکەرێ جوانترە. دیسانەوەش هەزار رەحمەت لەبابی کە دەو تەنگژەیەیدا هاتووە و ئەو رێنماییەی کردووە... هەرچەندە پێم وابێ بۆ قسە و باس و خواسانیش هاتبوو... ئەگەرچی بە دڵی خۆی، هـەر لـە ڕووی خۆیەتی و هاوشاریەتییەوە نەکرا سەرێکی لە پاشخانێ خوارکاتـەوە. بـەلاٚم سـەرنجەکانی ئـەوەیان پێشاندەدا کە بێ مەبەست نەهاتووە... سەرەڕای ئەوەی کە دەنگی خشپەی پێیەکم لەسـەربانییەوە بیست...)) هەموو هەر بیستمان، و کاکە گـوتی کـە لـە پاشـخانێوە زۆر بـە ئاشـکرا دەبیـسترا. بابەگیان لەدرێژەی قسەکانیدا گوتی: ((بەهەرحاڵ، بەلاٚیەك بوو هاتبوو بەلاٚم سوپاس بۆخوا وەخێـر گەڕا)).

کاکە سکالاٚنامەی بەلاوە پەسەند نەبوو، دەحاڵێکیشدا کە هەموو هیواو ئـاوات و ئومێـدی دایـی بەوەوە بەندبوو. بابەگیان دەگەڵ رای کاکەیدا بوو، بەلاٚم هەر گوتیشی: ((ئێستا ئـەوەخۆ زیـانێکی نییە- سکالاٚنامەکە بۆ شوێنە ونییە هەربەرێ خراپ نییە. ئێمـەش بـەدەم ئـەوەوە کـاری خۆمـان هەردەکەین. کورتییەکەی ئەوەیان یان چ رێیەك لە مەیان ناگرێ. خۆ ئەگەر پیاوە بیشیەوێ کارێکی بکا خۆ هەر سبەینێ راست نایکا- ئێمە کاری خۆمان هەر دەکەین- خۆ ئەگـەر موعجیزەیـەکیش لەو ئیمامزادە بێ غیرەتەشەوە روویدا ئەوا ئەودەمی دەتوانین نامەیەك بنێرین؛ بەلاٚم ئەو دڵی ئـاوی نەدەخواردەوە... با وایدانێین ئەو بەسـەرهاتە ((ئیـدی)) هـەروەکو خۆیـەتی و هیـچی... لێ شـین نابێتەوە. بەهەرحاڵ، ئێمە تەدارەکی رۆینێ رێکدەخەین، تابزانین دوایەش خوا چ دەکا. دەحاڵێکـدا کە دایی پێیوابوو و سووریش بوو لەسەرئەوەی کە کاکە هـەرلێرە وەمێنـێ تـا وەلاٚمـی حـەزرەتی ئەجەل دێتەوە، بابەگیان گوتی: ((بەڵێ ئەوە حەزرەتی ئەجەل دانیشتووە و چـاوەڕێی سـکالاٚنامەی خانمێیە، تاببینێ چۆناو چۆنی فرمێسکی جودایە جگەر گۆشەکەی هەڵڕشتوون- ئمم!)) و پیشیشی دەخواردنـەوە و ددانـی دەچـیڕەوە دەبـردن، کاکـە بەروویـەکی سـوور هەڵگـەڕاوەوە و چـاوێکی خەیالاٚوییەوە زەردەخەنەی دەناردن و ناوبژی دەکرد. بەوەی نارەحەت بـوو کـە دەیـدیت لەسـەر وی نێوانی دایی و بابەگیانی تێکدەچێت و ناخۆش دەبێت، و خێراخێرا بەهەر بیانوویکەوە بایـە ماچـی دەکردن. پێش چوونەوە نێو پاشخانێی چەند جارێکانی هەردووك ماچکردن.

* * *

## (١٢)

دەنگی زریکە و هات و هاوار و پەڕ و باڵ لێکدانی مریشکێ دە حەساریێ گەڕا، و سێبەرێك بە هەشتاوی بەسەر پەنجەرەیدا تێپەڕی. من و مەلیحە گورجێکی رامانکردە حەساریێ- بەلاّم بێسود. مریشکە بێ نەوایەکە پەرێشان حاڵ بوو، و بەسەر و پۆتەلاکێکی قرژ و چاوە سوورەکانیەوە سینگی رەپێش کردبوو و باڵەکانی نەختێك شۆڕکردبوونەوە، زۆر بەنیگەرانییەوە بەرەو جووجەڵە ساغەکانیەوە کە پەنایان بردبووە پەنا ئاودەستێوە چوو- هەلۆ، سەرەنجام بێ گوێدانە هاتنەوە و هات و بات و بەپیرەوەچوون و بەخێرهێنانەوەی حەزرەتی ئەجەل، یا بێ گوێدانە هیچ خوو و خدە و دەستوور و ئادابی گەورە پیاوان، جووجەڵەکەی فڕاندبوو و بۆی دەرچوو بوو! دەستووری رۆژ، بەقسەی مرۆی ئەم سەردەمە، هەرتێك پەڕاندنی کار و نیوەکاران بوو. دایی بەدوای پەیسەری ئەنجامدانی نەخشەکەی خۆیدا چووە ماڵێ پوورە فاتمێ و سەرو بنی کارەکانی دیکەشی ئەوەبوو کە دەبوو سکالاّنامەکە بدا. منیش هەر لە بەیانی زووەوە رامگەیاندبوو کە دەچمە سەیرێ. خۆشبەختانە لە جوجکە فڕاندنەکەیدا دایی لە ماڵ نەبوو. بڕیاروابوو مەلیحە لە ماڵێ بێ. ئەلّبەتە کە هەمیشەش هەر لە ماڵێ بوو، بەلاّم ئەمجارە هەر بەڕاستی دەبوایە لە ماڵێ بێ، بەتایبەتی دە سەروبەندی هات و بات و هاتنەوەی جەنابیاندا هاتوچۆ بە بەردەرکێ مەدا کە سەرەڕێ بوو، زۆر لە رۆژانی پێشووتر زیاتر بوو. بڕیار بوو ((لەماڵ بێ))، دەرکێ باش داخات و تاهاتنەوەی دایی دەرکێ لە هیچ کەسێکی نەکاتەوە، و کاکەش هەر لە پاشخانێدا بێت و نەیەتە دەرێ. کاکە گوتبووی هەروەکو دوێنێ ئیسراحەت دەکات؛ پێشی گوترابوو کە هەر دەبێ ئیسراحەتێ بکا چونکە پەنا بەخوا رێیەکی دوور و درێژی لەبەرە، تا زیاتر ئیسراحەتێ بکا چاکترە. ئەلّبەتە —ئەگەر وەڕەزیش بوو- دەتوانێ، زۆر بە وریاییەوە، هەر لە پەنجەرەیڕا سەیرکات و ئەگەر ویستیشی با رێ و رەسمی پێشوازییەکەش



ببینێ، بەلاّم وا چاکترە سەری لە پەنجەرەیڕا نەهێنێتە دەرێ و خۆی ئاشکرا نەکا، چونکە ماڵەکە لەژێر چاوەدێری دایە. پێشوازی هاتنەوەی حەزرەتی ئەجەل- حەزرەتی ئەجەلەکانی دیش- هێندەی نەخایاند و هێندەش پڕپێچ و خەم نەبوو —بەقسەی لێکۆڵەرەوان هێشتا چ پێشکەوتن و پێگەیشتنێکی وا لە مەیدانێدا وەدەر نەکەوتبوو و نەگەیشتبوو تا بە دەستوبردی و لەوەختدا هەواڵ و باس بگەنە جێی خۆیان. هەروەك جاران، حەزرەتی ئەجەل پێش نیوەڕۆیە دەگەیشتنەوەجێ، چونکە گوایە دوای نیوەڕۆیان ئەو رێیە مەترسیدارە: ترسی توشبوونی یاخیانیان دەکرد. هەربۆیەش رۆژی هاتنێیان لەپێشدا ئاشکرا نەدەکرد. ئەمجارەش ئێمە بە رێکەوت ئەوەمان زانیبوو.

ئەلّبەتە ئەو قسانەی سەرەوە هەموو ((پڕوپاگەندە)) بوون؛ شتێك بوون ناحەزان بلاّویان دەکردەوە. دەنا ئەوە دیارە کە حەزرەتی ئەجەل ترسی لە هیچ کەس و لە هیچ شتێك نییە، بە ((کردەوە))ش کەس نەیدیبوو بۆیە گومان لەوەدا نەبوو کە ترس هەر بە خەیالاّنیشدا نەدەهات. کێ رێی دەکەوت هێندەی لێ بچتەپێشێ هەر روخساریشی ببینێ، جا چ جای ئەوەی هێندەی لێ نزیك بێتەوە ببتە مایەی مەترسی- خوا نەکا! ئەوە کفرێکی گەورە بوو.

کاتی هاتنێ، دوو کاتژمێری مابوو بۆ نیوەڕۆیە، بەپێچەوانەی جارانەوە تەنیا کەنناسی شاری کە ئەویش هەر لەبەر خودی جەناب رەییسی بوو، بلووزێك و شەرواڵێکی زەرد، بێ سۆرانی و کاسکێتێك لەسەر، دەحاڵێکدا کە سەتلەکەی وەك شتێکی گڕوێیان باڵێك دوور لە خۆی بەدەستەوە بوو، لە کۆلاّنێڕا پەیدابوو، بانگی لادێییەکی کوردی دەکرد، سەتڵەکەی دەدایە دەستی و ((فەرمانی پێویستی)) بۆ دەردەکرد و بۆ خۆشی دەستی دە کەلەکێ دەناو لە دوورەوە رادەوەستاو چاوەدێری کارەکانی دەکرد. تەنانەت جاری واشبوو کابرای وەبەر شەقان دەدا، کە بۆ سەتڵەکەی بە تەواوی پڕنەکردووە یا ئاوەکەی بە نالەباری بەڕێی ئوتومبێلەکەی حەزرەتی ئەجەلدا کردووە! —چونکە رێی قیرتاو هەرنەبوو. من ئەو سەردەمە زۆر منداڵ بووم و بێگومان مانای بێدادیم بەچاکی نەدەزانی. بەلاّم شتێك هەبوو، ئەویش ئەوەبوو کە هەردە و سەروبەندە کورتەیدا هێندێك رووداوی خێزانیمان بۆ هاتنە پێشێ، دەگەڵ ئەو ترس و لەرز و دڵەڕاوکێ و رێ پێوانە و هەست بە سەرشۆڕی و نالەباری کردنانە، رێیەکی دوور و درێژم لە قەڵەمڕەوی هەست بە ئازار و ئەشکەنجە و ناخۆشییان بڕی. پێشتر بە بیانووی عەجەم بوونێمەوە، ئازاری

بێدادیم لەنێو منداڵاندا هەست پێکردبوو. لە بیرمە، هەر کە منداڵێکی لە تەمەنی خۆمدا لە کۆڵانێ بە تەنیا وەگیری دێنام فیتەیەکی لێدەدا و لەچاو تروکانێکیدا رەوە منداڵێکم وەسەر دەگەڕا و خڕ دەبوونەوە و گاڵتەیان پێدەکردم، لچ و لێویان لێ بادەدام و زاریان لێ خوار دەکردمەوە، و وردە وردە لێم دەهاتنە پێشێ، تا خۆیان هەڵدەدامێ و گوێیان رادەکێشام و هەڵ دەهاتنەوە؛ جاری وا هەبوو بەردە بارانیشیان دەکردم. دەمەویست خۆ قوتارکەم و هەڵێم، بەڵام لە لایەکییەوە غیرەتم قبووڵی نەدەکرد و لەلایەکی دیشەوە کە بمویستبایە هەڵێم دەنا وەخۆیان دەگرتمەوە و رێی هەڵاتنێم نەدەما —تا سەرەنجام دەستم دەکرد بەگریانێ. رۆژێکیان کوڕی کاک سلێمانی کە تازە لە خوێندنێڕا هاتبۆوە و کتێبێکی زلەی ئەستووری دەبن هەنگڵێدا بوو کە هەموو کەسێك خۆزگەی پێ دەخواست فریام کەوت: هات و لە منداڵەکان قەڵس بوو. لەو دەمیەوە بووینە ئاشنا: یانی هەرکاتێکی گەیباینایە یەکتری من بێ ئیختیار بەدووچاوی پڕ لە شادی و روخسارێکی پڕ لەمتمانەوە بەرەولایەوە دەچووم و ئەویش دەستێکی بەسەریدا دێنام و بە فارسی دەگەڵمدا دەدوا: وەك ئەوەی کە کەی دەچمە قوتابخانە، چەند خوشك و برام هەن، کامیانم زیاتر خۆشدەوێ، شار خۆشە یانە نا، و ئاوا لەم جۆرە قسانە...

جاری وابوو، هەستم دەکرد کە ئەوەش هەر بێدادیە کە کوردێکی لادێیی دەلینگ هەڵکراو دێنن و ناچاری دەکەن سەرجادەی ئاوڕشێن کات یان دایەرەی پۆلیسخانەیان پێ دەماڵی و پێیان خاوێن دەکردەوە، و خۆ ئەگەر نارەزاییەکیشی پێشاندابایە یا بیگوتبایە ئیشی هەیە و دەبێ زوو بگەڕێتەوە گوندی و بە کارەکانی رابگات، ئەوە باریان کوتەك دەکرد. راستە هێشتا نەمدەزانی بێدادی دە دنیایەدا بەهێز و توانایە و ئاریشەکە زۆر لەو قسانە گەورەتر و بەولاوە ترە، یا بێگومان دەو تەمەنەیدا نەبووم یا ئەو کاردارە نەبووم کە بچم و هاوبەشییە دە بێدادییەدا بکەم یا نەکەم؛ بەڵام دەمزانی کە بە کوردێکی بێچارە پێکەنین کە مرادسپۆری پاسەوان لێیدەدا ئەوەش هەر هاوبەشی کردنی بێدادییەیە. هەستی ئەوەم دەکرد. تەنانەت هەر بەدیتنیشی غەمبار دەبووم و خەفەتم دەخوارد بەڵام بەداخەوە زۆرجاران دەگەڵ هەموو منداڵاندا دەو پێکەنینانەدا هاوبەشیم دەکرد- هەروەك ئێستای تەواوی خەڵکی. ئەگەر پێشنەکەنیبام بەلانی کەمەوە هەستی پەسەندییە زۆر لێکردنی مرادیم بەلاوە زیاتر پەسەند بوو تا دەگاتە ئەو لادێییە بێنەوایە. ئەڵبەتە ئەوەش هەبوو: ئەو دەور و زەمانانە نەك هەر من بەڵکە هیچ کەسێك لە خەڵکی نەیدەزانی کە وڵات و کیشوەریان هەیە و دەبێ یاسایەك



بیانپارێزێ... دواییش کە زانیان تێنەگەیشتن چۆن. چونکە خۆ ئەوان یاساکانیان دانەنابوو و نەشیان نوسیبوونەوە. کاتێکیش کە گوایە تێیگەیشتوون، لەجیاتی یاسا وشەیەکی دییان دەبێژت، ئەویش ئەودەمیان بەسەر زمانی دادەهات کە قسەی فلاڵن رەییس یا فلاڵنە فەرمانبەر یان گێڕاباوە و وشەی یاسایان بەزمانیدا هاتبایە.

دەنا خۆ بۆخۆیان کاریان بەسەر یاساو بەکارهێنانیەوە هەر نەبوو. لەبیرمە رۆژێکی مرادسپۆر کوردە لادێییەکی دەلینگ هەڵکراوی وەبەر کوتانێ دابوو، پیاوەی بێچارە نارەزایی دەردەبڕی و دەیگوت بە چ یاسایەکی لێیدەدا... و مراد هەمدیس بە یاسای خۆی وەریدەگەڕایەوە بەلێدانێ، و ئێمەش بەو یاسا گوتنەی کابرای پێدەکەنین- ئەمەش ئەوکاتە بوو کە تازە چووبوومە قوتابخانێ!

بەهەرحاڵ، رێڕەوی ئوتومبێلی حەزرەتی ئەجەلیان ئاوڕشێن دەکرد و کاتژمێرێکیشی مابوو بۆ هاتنێی، پاسەوان بێرە و بەوێیاندا رادەکرد و دەچوون حاجی و دوکاندار و پیاو ماقووڵ و سەرۆك دایەرەکانیان ئاگادار دەکردەوە کە ئەوە خەریکە تەشریف دێنن، بچنە قەراغ چۆمی، و چاوەڕێبن. شێخ و ئیمامی مزگەوتێشیان هەر ئاگادار کردنەوە. بۆ پێشوازییە چ سنوورێك نەبوو: هەموو کەسێك دەتوانێ بچێ- تا زۆرتر بێ چاکترە. منداڵان بێ دەستوور و بانگهێشتن دەچوون، چونکە ئەو سەیرە گۆڕان و خۆشییەکی گەورە بوو، تەنیا کەسانێکی کە لەو پێشوازییەدا بەخشراوی نەهاتنێ بوون ژنان بوون، مەگەر دایکێك یا خوشکێکی بێنەوا کە کوڕەکەی یا براو مێردەکەیان گیرابێ یا نان پەیداکەری ماڵێیان بۆ سەربازییە بردبن یا بیانبەن، کە دەهاتن و گوایە سکالانامەی دەدەن —هەروەك ئەوڕۆی دایی. دەنا ژنانی دی تەنانەت لەماڵێش نەدەهاتنە دەرێ. خۆ ئەگەر هاتباناشنە دەرێ و لەبەر دەرکێ راوەستابانایە ئەوە پاسەوانان نەیاندەهێشتن، نەك خودا نەخواستە خواگیرێك دەجلی ژنانەدا یا ژنێك دە جلوبەرگی خۆیدا حەزرەتی ئەجەل بەچاوەزارێ بنگێوێ. ئەڵبەتە وایان نەدەگوت؛ ئەوەیان وە پاڵ چاو و دڵپاکییە حەزرەتی ئەجەلییەوە دەدا. ماڵەکانی ئەولاولای رێڕەوی حەزرەتی ئەجەل زۆر پێش تەشریف هێنانێ، راست وەکو خەڵکەکە، ملکەچ و سەریان بەردابۆوە؛ چاوی زۆربەیان نووقابوو، و هەروەك خەڵکەکە، بەرامبەر حەزرەتی ئەجەل شەوق و تروسکەی خۆشەویستییە دەچاوی هیچ یەك لەواندا نەبوو.

پێشوازی دەگەڵ سادەیی و ساکاری خۆشیدا هێندێکی نارێکی هەر هەبوو، کە گرنگترینیان شێوەی راوەستانی پێشوازیکەران بوو- یانی رێکوپێکی و ریزبەندی راوەستانێ، کە کێ لەسەرووی کێوە بووەستێ، تا ئاوڕت دەدایەوە، هەر لەچاوتروکانێکدا، دەگەیشتییەوە ئەوسەری ریزێ، ریزەکە هەمیشە نارێك و خوار و خێچ بوو، وەك ماری کوژراو، چونکە هەر یەکێك لەولاوە دەهات و بەنەرمە کۆکەیەك و یارمەتی ئانیشکی و گوتنی ((بێ زەحمەت))ێکەوە دەناو ریزەکەیدا جێیەکی بۆخۆی دەکردەوە و هەمووی بەسەریەکدا دەدانەوە! لەپێشدا پاسەوانێك هاتبوو و هەر راست وەك وەستای دیواری کە نەخشە و خەتی ژوورانی برێژێ خەتێکی راستی بە گەچێ رشتبوو کەوا چاوەڕوان دەکرا سنورێك بێ کەس نەیبەزێنێ و بەولاوە نەڕواو لە خەتێ لانەدا. بەلاّم هەموو ئەم پێشدەستیانە چ سوود و کاریگەرییەکیان نەبوو. دەربارەی شێخ و ئیمامیش ئاریشەکە زۆر لەوەی توندوتیژتر بوو. لەسەرجێی راوەستانێ بەردەوام لەنێوان ئەم دووانەدا ئەوە هەراو ناکۆکی بوو، و هەموو جارێك دوای تەشریف بردنی حەزرەتی ئەجەل یا هەر خاوەن مەقامێکی دی داوێنی ئەو ناکۆکییە زیاتر هەڵدەکشا، لەبەر ئەوەی لەوانەبوو حەزرەتی ئەجەل یا هەر ئەجەلێکی دی کە تەشریفیان دێنا لەوانەبوو ئێ چەند قسێکان دەگەڵ ئیمامی بکات و بەشێخی رانەگا، یا بەپێچەوانەوە، ئەودەمی ئەوە گەڕەکێ بەرەوە شانازی بەسەر گەرەکێ سەرەوەدا دەکرد و فیز و ئیفادەی لەسەر لێدەدا و مەتەڵەکی داویشتێ، چونکە ئیمام و شێخ، شاریان کردبووە دوو گەڕەك، ئەوەش لەبەروەی کە ماڵێ ئیمامی لە گەڕەکێ بەرەوە و ماڵە شێخی لە گەڕەکێ سەرەوە بوو. هەر هێندە بەس بوو ماڵێکی گەڕەکێ سەرەوە بگوازێتەوە گەڕەکێ بەرەوە —کە زۆرکەمی روودەدا- تا شێخییەك، ببێتە ئیمامی و ئیمامییەك ببێتە شێخی... بەڵێ، سەرەنجام دوای ئەم هەموو هەراو ناکۆکییانە کە ماوەیەك دڵ و مێشك و هزری خەڵکی شارەکەی بەخۆوە سەرقاڵ کرد، وابوو —بڕیاردرا- کە ئیمام لەسەر و هەموانەوە راوەستێ، و شێخیش لەخوارە وییەوە، و کاتێ پایەدار تەشریف دێنن ئەو لەوێبێ- یانی ئیمام- تا ریزی دەوڵەمەندان و شادۆستییە ((زانایان)) و گیان فیدایانی پیاوماقووڵ و سەرانی خەڵکی ناسراو بەعەرزی دەوڵەت بگەیەنێ و دەوڵەت دڵنیا کاتەوە کە خەڵك و ناوچەکە هەموو لەبەر رۆشناییە ئامۆژگارییەکانی زاتی پیرۆزی شەهریاری و فەرماندە و فەرمانڕەوایانی پایەبەرز دەتەواوی خێر و خۆشی و ئاسایشدا ژیان بەسەر دەبەن و لەپاڕانەوە و نزا بۆ زاتی پیرۆز و سەرۆکە بەڕێزەکان بەولاوە بیر لە هیچ ناکەنەوە و سەرقاڵی هیچی



دیکەنین. دیارە شێخیش ئەو دارە بییە لەرزۆکانە نییە کە بەو بایانە بلەرزێ، خوا هەڵناگرێ هەرگیز مەیدانی بۆ ناحەزی خۆی بەجێ نەهێشتووە. ئەویش بێ درەنگ بەدوای قساندا دێ، پشکی بەندایەتی و پاڕانەوە و نزای خۆی، و لەباتی هەموو ((زانایان)) و چین و توێژی سەرانی خەڵك و ناوچەکە دە سەبەتەی دڵسۆزی و سەر سفرەی چاوەڕوانییە دەکات و چەند رستەیەکی عەرەبی خەست و خۆڵ یا تێکەڵ بە عەرەبی و فارسییەکی وشك و برینگ بەشێوە زمانێکی رەوانی کوردی بەڕێ دەکات هەر دەگەڵەوەیدا بەیانی ئومێدەوارییە دەکات کەزاتی پیرۆزی هومایۆنی و دەوڵەتی شەهریاری هەروەك جاری جارانە لە چاودێری خەڵك و کۆمەڵگادا درێغی نەفەرموون. با ئەوەندەش بڵێین کە مەبەست لەو کۆمەڵگایە، یەکە و دەردوو شەخسی ئەوبوو و ئینجا ئەگەر ((دەوڵەت داوای دەست نیشانکردنی فەرموو، ئەوا ئەودەمی ئیمام و خەڵکانی دیکەن. جاری واشبوو ئەو هەلانە هەڵنەدەکەوتن و ئیمام هەر هێندە پێ رادەگەیی کە عەرزیانکا کە خۆی ئیمامە و ئەوەی تەنیشتیشیەوە شێخە، ئەوەی دیش... وەك ئەو خانی بەختیارییەی کە بە قسەی یەکێك لە ئاشنایان لە یەکێك لە سەفەرەکانی شادا بۆ باشوور، دەستی خەسرەوی- کوڕی- دەگرێ و لەپێشەوەی پێشوازیکەراندا رادەوەستێ و کە شا دەگاتە جێ دوای ئیکلامێ گوتبووی: ((بەننە (بەندە) ئەرشەد، بەننەزادە، خەرسەو)) و بەدەست ئاماژەی کردبوو —کە یانی خەرسەو ناوچەیە و ئەو دوو نەفەرە و ئەوانی دیشی بێگومان هەموو بەکیری!...

زۆربەی جاران لەکاتی پێشوازییە حەزرەتی ئەجەلیدا ئەو پێشهاتانە روویاندەدا: جاری وادەبوو کە حەزرەتی ئەجەل ماندوو بوون، یا کاتیان نەبوو یا سیاسەتی تایبەتی ناوچەکانی دەوڵەت پێویستی نەدەکرد رووی خۆشییان پێشان بدەن. ئەودەم هەر بە هێندێ دەبڕایەوە کە بگوترێ ((بەننە ئیمام، تەنیشتی بەننەش شێخ... ئەوانی دیش... پیاو ماقولاّنی شار!)).

بەلاّم بەشێوەیەکی گشتی وابوو کە لەپێشدا گوتم، دە و کات و شوێنانەدا حەزرەتی ئەجەل لە ئوتومبێلێ دەهاتنە خوارێ و دەگەڵ ئامادەبوواندا تەوقەیان دەکرد، و تانیوەی ریزەکە دەچوون. هەر کە لە ئیمام و شێخ رەت دەبوون هەموو ریزەکە، پێکەوە و جاری وابوو کۆمەڵێك لەودیوی ریزەکەوە، هەردوو دەستیان درێژ دەکردە پێشێ تا تەوقەی دەگەڵدا بکەن. بەلاّم زۆر جاران هەر کە لە سەرۆك و ئیمام و شێخی رەت دەبوون پێش ئەوەی بگەنە ((خەڵکەکە)) هەر لە

ناوەڕاستی ریزێوەڕا دەگەڕانەوە و سواردەبوونەوە، و دڕۆیشتن- و خەڵکەکەیان دەتەپوتۆز و لوتف و مەرحەمەتی تۆزاوییە دەوڵەتێدا بەجێ دەهێشت و هەر کە دەگەیشتنەوە ماڵێ جەناب سەرهەنگی ئەوە یەکەو دەردوو موچەی ساڵانەی دیاریکراوی ئیمام و شێخیان (کە بیست تمەن و دوزادە تمەن بوو) دەنارد- ئەوە ئەگەر پێش وەخت نەیان ناردبایە. دوای تێپەڕین و ڕۆیشتنیان ئەوجا بگرە و بەردە دەستی پێدەکرد کە بەڵێ، ئەو ئاوای دەگەڵ ئەمیری لەشکریدا تۆقە کردووە و ئەم ئاوا، و قوڕ بەسەر ئەو کەسەش کە ئەمیری لەشکری دەستی لێ کێشاوەتەوە و لەبەردەمیەوە تۆقەی دەگەڵدا نەکردووە و بەلای ریزەکەدا تێپەڕیوە! ئیدی ئەوە ئەو قوڕبەسەرە دەبووە مەخسەرە: ماوەیەك گێژو وێژ دەبوو: ((ها، کە گەییە بەردەمی میرزا سەعیدی لەپڕ وەك بلێی وشك بوو! ئەو پیاوە بێ نەوایە هەردوو دەستی رەپێش کردبوو، بەڵام تۆ بڵێ هەر ئاوڕیشی لێدایەوە — حاشا!)) ئەو قسانەیان بەدەنگێکی دڵسۆزانەوە دەگوتن و زەردەیەکی تانە و تەشەرانەشیان ناواخن دەکردێ. تا چەند ڕۆژێکان ئیدی ئەوە باس هەرباسی قەد و باڵا و قەلافەت و زەردەخەنە و ئوتومبێلی حەزرەتی ئەجەل بوو.

رێ و شوێنی پێشوازییە لەوبەری چۆمییەوە بەرێوە دەچوو، کە بەلانی هەرە زۆرەوە شەست مەتر لە ماڵێ مە بەولاوەترەوە نەبوو. خەڵکی بەسەر پردە چەپەرەکەیدا دەهاتن و دەریزێدا رادەوەستان.

رێکوپێکی ((ریز))ەکە بەمل سەرۆکی پۆلیسەوە بوو. پەخشداریش دەچوو لە تەکیەوە رادەوەستا و جارجارە تێوەرێخێکی تێوەردێنا کە گوایە ئەویش دەوکارانەدا نەخشی خۆی هەیە.

ئەڵبەتە کە پاسەوانەکانیش بێکارەیەك نەبوون: بەردەوام دەگەڵ منداڵاندا هەرایان بوو. ئێمەی منداڵ بەخشکەیی خۆمان دەگەیاندە ئەو سەرە و سەری ریزێ و ریزەکەمان وەك کەوانەی خوار لێدەکرد. تا لەپڕ پاسەوانەکان ئێمەیان وەبیردەهاتەوە و هێرشیان دێنا و دادەهاتنەوە بەردان هەڵگرنەوە و بیانهاوێن- و ئێمە هەڵدەهاتین، تا دیسانەوە بەخشکەیی بێینەوە جێیەکەی خۆمان و ئەو گەمە و گاڵتە بازییە تا هاتنی ئوتومبێلی حەزرەتی ئەجەلی هەر بەردەوام بوو، و ئێمە نیمچە ئازادییەکمان دەستگیردەبوو... هەرچەندە لە سنوریشمان تێ نەدەپەڕاند. ئوتومبێلەکان هەمیشە دووان بوون: یەکێکیان ئوتومبێلی خودی حەزرەتی ئەجەل بوو، کە دەتگوت بەلیفکە و سابوونێ شۆراوە و تازە لە حەمامێ هاتۆتە دەرێ، وەك ئاوێنەی



دەبریسکایەوە- پێش ئەوەی بگاتە جێ و بێتە نێو شاری، لەرێیە لە نزیك چایخانەکەی رەشەقەلاتێ دەیانشوشت- و بەدواشیدا ئوتومبێلێکی زەیتونی بە حەوت هەشت سەرباز و گروبانێکەوە کە پارێزەر و پاسەوانییە حەزرەتی ئەجەلیان پێك دێناو دەگەڕانەوێدا ئەو کەسانەشی تێدابوون کە ئەسپی چاك، یا شتێکی بەزاران خۆشیان هەبوو، کە تا ئەوکاتی پێشکەشیان نەکردبوو و سیاسەتی ناوچەکەش وای دەخواست کە هەبوونی ئەمانە دەبێتە هۆی تێکچوونی ئاسایشی ناوچەکە، تا وردە وردە لێیان دەکۆڵنەوە و گومانیان لەسەر نامێنێ. رێیەکە لە قەراغی چۆمییەوە دەستی پێدەکرد و بەدەشتێدا، تا داوێنی چیای دەڕۆیی و دەگەیشتە باغی میرزا رەشیدی، کە هەمووی رەزی مێوە ترێی بوو. هەر کە دەگەیشتە باغی پێچی دەکردەوە و لە چاوان وندەبوو. شێوەی هاتنی ئوتومبێلەکان رێکخراو و دیاربوو: ئوتومبێلی پارێزگارییە لە پێشەوە، و ئوتومبێلی حەزرەتی ئەجەل بەدووری سەد مەتر لە دواوە. کاتی هاتنی، ئوتومبێلی پارێزگارییە هەر کە لە باغی میرزا رەشیدی تێدەپەڕی رادەوەستا و ئوتومبێلی حەزرەتی ئەجەلی وەپێش دەکەوت، ئەوجا ئوتومبێلی پارێزگارییە بەدووری سەد مەترێك لەپشتەوەڕا دەهات. کاتێ ئوتومبێلی حەزرەتی ئەجەلی دەگەییە بەردەمی ریزی پێشوازیکەران ئوتومبێلی پارێزگارییە لە دووری سەد مەتری شوێنی دیاریکراوی خۆی، رادەوەستا، بۆ ئەوەی ئەو تەپو تۆزەی بەدواوەیدا دێت پێشوازیکەران و جەنابی حەزرەتی ئەجەلی نارەحەت نەکات. کە لەراستیشدا وەك بلێی ئەو گەرد و خۆڵ و تەپوتۆزەش تۆتیای چاوی پێشوازیکەران بێ وابوو.

سەعاتێکی مابوو بۆ نیوەڕۆیە کە گەرد و خۆڵ و تەپوتۆزی خوار باغی میرزا رەشیدی مژدەی هاتنی حەزرەتی ئەجەلی راگەیاند. ئوتومبێلی پارێزگارییە (ئیسکۆرت)هات و لەسوچێکی خوار باغی میرزا رەشیدییەوە راوەستا، و ئوتومبێلی حەزرەتی پۆلیسان گۆڕا؛ سپی بوو، شین و مۆر هەڵگەڕا، زەردبوو و روومەتەکانی تێك قوپانەوە. هەروا بەسەر ئاماژەی پاسەوانێك و پێیەکانی خۆی کرد و هەناسێکی قووڵی هەڵکێشا؛ پاسەوان رایکرد و بەدەستەسڕێکی چەکمەکانی جەناب رەییسی سڕینەوە. جەناب رەییس خۆی راستکردەوە، توند و تۆڵی قایشی پشتێی بە تاقیکردەوە و دەستێکی پێدا هێنا، و گوتی: ((برایان، هەریەکە لەجێی خۆی!...)).

ئەوجا دەستی برد و شاورەکەی راکێشا. شاور لێدانەکەی دەگەڵ حەزرەتی ئەجەل بوو. هەرچی چاو هەبوون دە ئوتومبێلەکەی حەزرەتی ئەجەلەوە رامابوون و ئوتومبێلەکەی حەزرەتی ئەجەلی دە بیلبیلەی هەموو چاوەکاندا بوو. یەك دوو نەفەر کە بەهەشتاوی بەسەر پردە چەپەرەکەدا تێپەڕین، بەڕاکە راکە لەریزەکە نزیك دەبوونەوە؛ بێدەنگییەکی مەرگ ئاسا ئەو ناوەی داگرت، و سەرنجی هیچ پاسەوانێك، هیچ زیندەوەرێك جگە لەوەی بۆ پێشەوە بەهیچ لایەکیدا نەدەگەڕا...

پاسەوانێك بە ئاماژەی جەناب رەییس لەوانیدی جودا بۆوە و کوردێك کە بەخۆی و کەرو بارەدارەکەیەوە لەرێی لای سەردەشتێوەڕا نزیك دەبۆوە رایگرت و بۆخۆشی بەلای کەرەکەوە جووت پێ، راوەستا. لەولاترەوە کەرێکی بەرهەڵدا دەنێوگیایدا کەوتبوو و قەلێك کە مرخی لێ خۆشکردبوو لەسەر پشتە بریندارەکەی هەڵنیشتبوو و بە دەندووکانی وەرگەڕابۆیە؛ دوورا و دووریش سەیەك بەسەر دەستەکانی خۆیدا کەوتبوو و دەسەروچاوە بێ وازەکەی کەرەکەوە رامابوو. ئوتومبێلی حەزرەتی ئەجەلی نیشانەی تیری هەموو سەرنجەکان بوو. لەو سەری ریزێوە، چەند هەنگاوێك لە رەییسی پۆلیسان بەولاوەترەوە، دایی خۆی دە سەرپۆشی نوێژێوە پێچابوو و سکالانامەکەی وەك دەستەسڕی ئەو تاوانبارکراوە ئازاو بە جەرگانەی بەکوشتنێ، کە لەبەر ئازایەتییە، تا وەختی تیربارانکردنێ بەسینگی خۆیانەوەی دەگرن تا جەللادەکانیان سەر دڵیان بکەنە نیشانەی تفەنگەکانیان، ئاوای بەخۆوە نوساندبوو. سەرۆکی پۆلیسان بەریزێی راگەیاند: ((برایان، با کلاوەکانیان دانێن، ئیدی کەس دەست نەجولێنێ!)) سەرۆك دایەرەکان بۆ دواجار دەستێکیان بە یەخە و داوێنی چاکەتەکانیاندا هێنایەوە و دەستەکانیان وەك کاتی نوێژی شیعان بەم لاولادا بەردایەوە... ئوتومبێلەکە هات و لەبن دارتووەکەوە راوەستا. سەرۆکی پۆلیسان بە رەنگ و روویەکی لەپێشان پەڕیوەتر، دووبارە گوتییەوە: ((هەرکەسە و جێی خۆی!)) ئاگاداری دا ((ئا-گا-دار)) گروبان ناسرخان بەرەو ئوتومبێلەکەیەوە راکرد، و لە چەند هەنگاوێکەوە، دەست بەلێوی کلاوەوە جووت پێ راوەستا- چووبوو دەرکێ بکاتەوە، بەڵام هەردە و دەمەیدا ئەفسەرێکی کەڵەگەتەی چەکمە لەپێ لەپێشەوەی ناو ئوتومبێلەکەوە دەرپەڕیە دەرێ- ئیسماعیل خان بوو- دەرگاکەی بۆ حەزرەتی ئەجەل کردەوە، خۆی لەلای دەرگاکەوە، دەستێکی بەلێوی دەرکێوە و دەستەکەی دیشی بەلێوی کلاویەوە، هەروا دە ئامادە باشییەدا مایەوە، تا حەزرەتی ئەجەل بە نەقە نەقەوە هاتە خوارێ و چەند هەنگاوێکان هاتە



پێش. ئەوجا ئیسماعیل خان دەرگاکەی داخستەوە و هەرلەوێ دەست بەهەواوە راوەستا، حەزرەتی ئەجەل بەخۆی و بەقەد بالاکورت و ورگە مام ناوەندی و ئەو سەروچاوە چرچ و پیر و داچۆڕاو و لەخۆڕازی و خود پەسەندییەیەوە، و بەو روومەتە شل و روخسارە خڕو داتەپیوەیەوە گەرمای هیچ هاوینێك و سەرمای هیچ زستانێك کاری خراپ و کاریگەری نەکردبووە سەرهەڵاوسان و پف کردنێیان و بەو زەردەخەنە لەخۆباییەی کە لە روویدا شەپۆلی دەدان، هاتە پێشێ، بەرپرسەکان هەموو ئیکلامیان کێشا، ریزەکە وەجوولە هات، پاسەوانان دەستی سەلامانیان بەرزکردنەوە، ئیمام و شێخ چەمینەوە، پاسەوانی لای کەرەکەشەوە، بەرامبەر حەزرەتی ئەجەلێی دەستی سەلامی هەڵێنابوو و لە دوورەوە دەلەرزی، کەرەکە مێشیشی لێ میوان نەبوو، سەرۆکی پۆلیسان تاتوانیبووی زگی بردبۆوە ناوێ و سینگی دەرپەڕاندبوو و لەبەر سەر زۆرهێنان و بردنێش لارەمل سەری خوارکردبۆوە، ئەودەستەی بۆ لێوی کلاوەکەیەوە بردبوو، بە ئاشکرا دەلەرزی، یانی هەر بۆخۆی پێی خۆشبوو بلەرزێ، تا حەزرەتی ئەجەل بیبینێ و بزانێ چ سام و شکۆ و هەیبەتێکی هەیە؛ دایی جولا؛ پاسەوان نەیهێشت... دوایی، وەك دەشێرن خەوێدابم و خەونێ ببینم... دەنگی تەقەی گوللەیەك هەوای شڵەقاند...

خەڵکەکە هەموو وەك بروسکەی لێدابن لەجێی خۆیان وشك بوون؛ حەزرەتی ئەجەل بەپێچەوانەی ئەو ورچەی دەخەوێمدا دیتبوو نەك هەر نەهاتەپێشێ بەڵکە لەسەر چنگان و بەماتە ماتە بەرەو لای ئوتومبێلەکەوە هەڵات... گوللەیەکی دیکە و یەکێکی تریش... و دەنگی کاکەی گوتی: ((تف لەو ناوچەوان و بەخت و شانسەی!)) دەنگی زریکەی دایی ئەو ناوەی پڕ کرد... خەڵکەکە هەروەك چۆن لە پڕێکدا وشك بوون هەرواش کتوپڕ بەئاگا هاتنەوە: ریزەکە، سەرەتا تێکچڕژا، و راست وەکو زەروویەکی خوێی پێداکەی لەجێی خۆی لێك هەڵوەشاو چی لە هەناویدا بوو هێنایەوە... و لێك پچڕا. ئەوانەی کە توانای هەڵاتنێیان هەبوو بەرەو چۆمی هەڵاتن؛ هێندێکیش وەك کەروێشکی تاژی بەدواوە هێندێکیان راکرد و گەڕانەوە؛ سەرۆکی پۆلیسان دەودەمەیدا کە پێی وابوو خەتەرەکە نەماو رەویەوە ئاهێکی هاتەوە بەرێ و بەدەنگێکی فەرماندارانە گوتی: ((بێ- جووڵە!)) ئەوەندە خەڵکەی کە لەریزەکەدا مابوونەوە، راوەستان، بێ جووڵە- بەڵام دوو دڵانە. هەر بۆ دڵنیاییە کە بە ئاگام و خەون نییە نوقورچێکم لە روومەتی خۆمدا... نا، نەنوستبووم! کاکە بە بڵندییە بالایەوە قیت راوەستا بوو، بەڕوویەکی پەڕیو و دەمانچە بەدەستەوە؛ و ئیسماعیل خان بەرەو لای ئوتومبێلی پارێزگارییەوە رایدەکرد،

و حەزرەتی ئەجەل خەریکی چوونە پشت ئوتومبێلێوە بوو و دایی هەروا دەیزریکاند و دەستەکانی هەڵدەتەکاندن، هەموو ئەو رووداو و پێشهاتانەش دەچەند ساتەوەختێکیدا روویاندا- لەسێ گوللان زیاتر نەهاوێژرا- پێمابوو ئەم جارەیان کاکە بەقسەی ئەبولفەتح خان بەراستی دوچاری کارێکی زۆر (نەزانانەتر) ببوو: هەردووکیان پێکەوە، هەم حەزرەتی ئەجەل و هەم ئیسماعیل خانی وێکڕا بەنۆرە وەبەردابوو... ((تف!...)) ئەوە دەنگی کاکەی بوو. لەپێشدا ویستی هەڵێ، بەڵام سەیری کرد بۆ کوێ؟ خۆ لەو دەشتەی پەنایەك نەبوو- تا کوێ هەڵێ؟ بۆ کوێ هەڵێ؟... بە پەشۆکاویەوە سەیرێکی دەوروبەری کرد... تەنیا یەك سانییەی پێچوو... ((بیگرن!)) پاسەوانەکان هێرشیان کردە سەرێ، کاکە بەرگری نەکرد، تەنیا کارێکی کە کردی ئەوەبوو دەمانچەکەی بەدەوری سەری خۆیدا هەڵسوڕاند و زۆر بەرقەوە، بەدوو چاوی دەرپەڕیوەوە، دە حاڵێکیدا کە چەناگەی ژێرەوەی هاتبووە پێشێ روخساری و لەبەر ددان دەچیڕەوە بردنێی رانەدەوەستا، بەرەو لای حەزرەتی ئەجەلییەوە هاویشت. دەمانچەکە بە شووشەی ئوتومبێلەکە کەوت؛ شووشەکە ورد و خاش بوو و هاتەخوارێ؛ پاسەوانەکان کاکەیان لەزەوی بڕی؛ دایی زریکاندی، و خۆی بەسەردادا: خۆی پێوە چەسپاندبوو و دەیزریکاند و هاواری دەکرد و سکاڵانامەکەی رادەوەشاند، عەلی میدالی چەند پێلەقەیەکی بەلاکەلەکە و پشتی داییدا دادا، بەڵام دایی لە کاکەی هەر نەدەبۆوە.

کە خەتەر نەما ئەوجا حەزرەتی ئەجەل لەنوێ فووی دە دەبدەبەی بەخۆ نازینێوەی کردەوە و لە سوراودانێ خەیاڵی خۆیەوە بەخۆکەوتەوە و هێندێکی بەسەرو رووی خۆیدا هێناو رەنگێکی هاتەوە بەرێ، و دەستی راوەشاند- کە نەکەن لێیدەن! و بە سەرۆکی پۆلیسانی گوت کە سکاڵانامەکە لەو ژنەی وەرگرێ- زۆر ئامیرانە... ئافەرین! ئەوەیە ئەمیری لەشکر، کە دەو بارودۆخانەشدا هەر دەبیری خەڵکیدایە! بەڵام ئەوەش هەیە ((کە گەورەیی و نەگبەتی هێندە لێك دوور نین))، چونکە گوتن دەربارەی حەزرەتی ئەجەلی دەونێوەیدا چ بایەخێکی ئەوتۆی نییە، لەبەرئەوەی گەورایەتییەکەی لە رەوشتی کەسایەتی خۆیەوە نییە و نەبووە. هەر لەگەڵ تەقەی یەکەم گوللەدا هەرچی رەنگ و روو هەیە پێی نەماو کەش و فش و گەورایەتییە درۆزنانەکەی یەکسەر سەد پلە دابەزی و بەیەك سانییە گەیشتەوە سەر هیچ و پووچییە راستەقینەکەی خۆی.



کاکە راستبۆوە؛ شەرواڵە بە خۆڵەکەی زۆر بێباکانە تەکاند. سکاڵانامەکەیان لەدایی وەرگرت و دایانە دەست حەزرەتی ئەجەل، دایی ئەوەی بە چاوی خۆی دیت- و ئەوەش هەموو کارەکە بوو. هەر دەودەمەشدا پارێزگاران و پاسەوانانیش گەیشتنێ. سەربازەکان هەر بەرێوە خۆیان لە ئوتومبێلێ فڕێدا و هەر لەدوورەوە بەرامبەر خەڵکەکە ئەژنۆیان دادان و لوولەی تفەنگەکانیان دەحەشیمەتەکەی کرد. حەزرەتی ئەجەل وەك چۆن مێشێکی لە پەنا گوێی خۆیەوە دەرکا دەستێکی هەڵتەکاند —یانی پێویست ناکا... ئیسماعیل خان شتێکی بەسەرگروبان و سەربازەکان گوت، و سەربازەکان هەستانەوە، کاکە کە رەنگی لەرووان بڕابوو و کتوپڕ تێکشکابوو و دەلەرزی، بەدەم هاوار و زریکە و لەخۆدانێ داییەوە بەرەو ئوتومبێلی پاسەوانەکانیانەوە برد: لە دوورەوە دیاربوو کە خەریکی دەست لەپشتەوە بەستنێی بوون. سەرەنجام هاویشتیانە نێو ئوتومبێلەکەوە، ئوتومبێل بەرەو سەربازخانەی وەڕێ کەوت. دایی ماوەیەك هەروا بەدوای ئوتومبێلەکەیدا باڵی راوەشاندن و زریکاندی- هەر راست وەك مریشکەکەی ماڵێمان- و دواییەکەی خۆی دەخۆڵێ وەردا. گوایە بە قسەی خۆی، خۆی بەسەر چەکمەکانی حەزرەتی ئەجەلدا داوە. ئەڵبەتە چ چەکمە و مەکمە دەگۆڕێدا نەبوون؛ چەکمە سیفەتی توانایی و بەهێزی حەزرەتی ئەجەل بوو... پاسەوانەکان نەیانهێشت... چ رێ و رەسمێك بەرێوە نەچوو؛ حەزرەتی ئەجەل سواری ئوتومبێل بوونەوە، و لێیاندا رۆیشتن، و حەشیمەتیش دەست لە گونان درێژتر هاتنەوە شاری.

بەهەرحاڵێکی بوو داییان هێنایەوە ماڵێ- فەیزوڵڵای بەرگدروو بن پیلی گرتبوو، و ئەویش هەر خۆڵی وەسەری خۆی دەکرد، هاواری دەکرد، سەروپرچی خۆی و دەموچاوی خۆی دەرنینەوە، و منداڵەکەی دەویستەوە. حەشیمەت وەك سوپای بەزیو، کۆمەڵ کۆمەڵ، بەرەو شار ملیان نابوو. باس هەر باسی کاکەی بوو... خوا رەحمی کرد... نێرەکەرێك بوو بۆخۆی... هەروا پشتێکی دی بەولاوەترەوە بایەکاری دەدیت... لاوێکی لێوەشاوە بوو... هەر بە خەیاڵیشی دانەدەهات!... بە چ رقێکەوە دەمانچەکەی بۆ سەری هاویشت! دیاربوو زۆری دە دڵیدایە (و لە بن لێوانەوە یەکی یەك دوو ماشەڵڵا، و بەدزیشەوە چەند چاو و برۆ بادانێك). ژنان هەموو لە ماڵێ هاتبوونە دەرێ. هەر کە لێیان نزیك بووینەوە داییان دەنێوە خۆیانەوە گرت و فەیزوڵڵای بەرگدروویان ئازاد کرد. لە پێشدا هێندێکیان ئاو بەزاریدا کرد تا تۆزێك بێتەوە سەرخۆ و تینێکی دە ئەژنۆیان گەڕێتەوە، هێنایانەوە لەبەردەرکی ماڵێ پوورە فاتمێیان دانا. مەلیحە

بەگریان و پەشۆکاوییەوە گەیبوویە... دوایی چەند سەرە ژنێك داییان بردەوە ماڵێ. بەڕاکە ڕاکە چوومە دوکانێ بابەگیانی... بابەگیانیان گرتبوو! بەگریانەوە هاتمەوە ماڵێ و هەواڵی گیرانی بابەگیانم بەدایی و مەلیحەی ڕاگەیاند. دوو سێ ژن بۆ دڵدانەوێ دایی لەوێ مانەوە. دایی لەلای ڕوونبوو کە تا ئێستا کوڕەکەیان لەسەربازخانەیدا گوللە باران کردووە و هەر لە سینگ و ڕانی خۆی دەدا، و خۆی ڕادەژاند و پێی هەلاّ دەگوت؛ و پوورە فاتمیش دڵی دەدایەوە: ((نا، بە قوربانت بم... ئەگەر خوانە خواستە، زمانم شکێ، شتێکی وابایە دەنگی تەقەی دەهات... باشە خۆ ((خانووەکە)) هێندەش دوور نییە... دەنگی دەهات- خوانەکا خوایە!)) بەلاّم سەربازخانەکە دوور بوو، هەرچەندە ئەو قسانە فەرامۆشیەك بوون بۆ دڵی دایی و ئەو لە حاڵێکدا بوو کە ئومێدی خۆی لە جیاوازی قسەکانی خۆیدا دەدیتەوە. و بچوکترین مژدەیەك گەورەترین ئومێدی پەیدا دەکرد ((... نا، خوانەکا! توخودا گوڵبەهار بەپیرناخۆشیانەوە مەچۆ... جحێڵە... خودا پشتیوانییەی دەکا ئینشاڵلاّ!...)).

منداڵانی بەردەرکێ ڕانەدەوەستان یەك یەك و دوو دوو دەهاتنە بەردەرکێ و خۆیان پێشاندەدا و دەگەڕانەوە: ئیدی ئەوانیش دەیانەویست بچم و باسی ئازایەتی و نەبەردییە ئەو کاکەیان بۆ بکەم کە بە تەنیا تەقەی لە حەزرەتی ئەجەل کردووە، و تەنانەت چەکە بەتاڵەکەشی هەر حەواڵەی سەری کردووە...

هێشتا زۆری مابوو بۆ نوێژی عەسرێ کە لەپڕ دەنگی ئوتومبێلان هەمووی قوشقی کردن. چ بووە؟ چ ڕوویداوە؟ حەزرەتی ئەجەل بە پێچەوانەی جارانییەوە هەر وازوو، ئەویش بەو دوای نیوەڕۆیە، چۆن دەگەڕێتەوە! دایی دڵی بەربۆوە: چیان بەسەر کوڕەکەی... کوڕە جحێڵەکەی- بەندی دڵەکەیدا هێناوە! و کەوتەوە کۆشی بێهوشییە. هێشتا نەهاتبۆوە سەرخۆ بەسەر غەمێکی دیدا کەوتەوە- تا فەیزوڵلاّ بە هەناسە بڕکێوە پێ ڕاگەیی و گوتی کە بۆخۆی، بەو دووچاوانەی خۆی، کاکەی دە ئوتومبێلی سەربازەکاندا دیوە و هەرچەندە چاکیشی ناناسێ بەلاّم دەستی بۆ هەڵتەکاندووە و هەرچەندە کاکەش ئەو ناناسێ بەڕوویەوە پێکەنیوەتەوە. ئەوەی واگێڕایەوە هەر مەپرسە و گێڕاشیەوە کە لەجێی جامی ئوتومبێلەکەی مقەبیایان بەپێشی ئوتومبێلەکەی حەزرەتی ئەجەلیەوە گرتووە. بەچاوی خۆی دیویەتی. و هەر کە چاویشی دەچاوی مەلیحەی هەڵەنگوتن بێ ئیختیار



چاوی بەردانەوە، هەرچەندە ئێستا تێدەگەم و کە ئەگەر سەریشی بەرنەدابایەوە و چاویشی دانەخستبایە هەر جیاوازی نەبوو، چونکە بەهەرحاڵ هەروەك دەڵێن عەشق کوێرە...

ئێستا وەك جاری جاران دەرگا لەسەر پشتە؛ مریشکەکەش چوو بووە دەرێ و جوجکەکەشی سەری تێداچوو بوو- بەسەرهاتی هەڵۆ و بردنێ جوجکەکەمان بەقسەی پوورە فاتمێ لە دایی شاردەوە، تا بەگفتی وی خەیاڵی خراپ نەکات و بەهیچ و خۆڕایی، و بەشتی هیچ و پووچەوە خۆی بە هیلاك نەدا. دەو دەمەشدا دایی لەسەرنج تێگرتنی پڕ تانە و تەشەرانەی مەلیحەی غافڵ نەبوو: ئاخر خۆ بڕیار نەبوو دەرکەی ئاوا لەسەر پشتێ لێگەڕێ یا لە کاکەی غافڵ بێت. بەلاّم هەرجارێکی کە تیری ئەو سەرنجانەی لە چاوی مەلیحەی دەچەقین، بەستەزمانە وەك کونی ((بەنداو))ێ پاڵوێنی دەربێنی جۆگەلەی فرمێسکێی بەخوڕ دەهاتە خوارێ، هەرچەندە دایی هێشتاش ئامۆژگاری بابەگیانی هەر دەگوێیدا دەزرینگایەوە و بە ئاشکرا هیچی نەدەگوت، ژن دانیشتبوون و جارجارە دەگریان و جارجارەش بە هەزار قوربان و سەدەقەوە تا چایەکیان دەرخواردی دایی دەدا، کە جەناب ڕەییس بوو، زەمینی!

هات و هەروەك جاران بەپێلاّوەوە بەسەر ڕایەخەکاندا چوو لە سەری سەرەوە لەجێی پاڵدانەوێی لای پەنجەرەکەوە دانیشت. ژنەکان لەچکەکانیان بە بەر دەمولووتی خۆیانەوە گرت و چمکی لەچکەکانیان بە ددانیانەوە گرت. جەناب ڕەییس گوتی کە پێی خۆشە ماڵەکە چۆڵ بێ- و ژنەکان بەناچاری و نا بەدڵیەوە هەستان و ڕۆیشتن.

هەر کە ئەوان ڕۆیشتن گوتی کە هەر تەنیا دایی لە ژوورێدا وەمێنێ... من و مەلیحەی ناردە داڵانەکێ، کە پاسەوانێکی لێبوو. چەند شتێکی لە دایی پرسیبوو کە ئێمە ئێستاش هەر نەمانزانی چبووە و ئەو چ وەلاّمێکی داوەتەوە.

جگە لەوەی کە کاکە کەی هاتۆتەوە، و دایی بە لەخۆچوون و بەلاداهاتنێی وەلاّم دابۆوە. مەلیحەش کە هەمیشە ئامادەبوو بروسکەیەك لێدا تا جۆگەلەی فرمێسکی وەك کوندەی سەر بەرەوژێر هەڵوەرێ، ئەویش چ وەلاّمێکی وای نەدابۆوە: کەی کاکەی دیوە- نەیدیبوو و نەیدیبوو و گریان و گریان. جەناب ڕەییس زۆری بە هۆش و گۆش و هەڵس و کەوت و ڕەفتاری مندا هەڵگوت، تا توانی ڕستی. گوتی ئەگەر ڕاستییە بڵێم توپێکی فوتبۆڵێنێم بۆ دەکڕێ، ئەهێندە گەورە- لەوانەی کە میرزا کەریم خەڕڕازی تازەی هێناون! و هەردوو دەستی بە ئەندازەی شوتییەکیان تێوەچێ لێك

کردەوە و چاوەکانی بەسەر سامییەوە هەڵێنانەوە. بەڵام منیش هەر نەمدیبوو- هیچ شتێکم هەر نەدیبوو. دەگەڵ ئەوەشدا کە سەری بردبۆوە ناو شانەکانی روخساریم لەبەردەمی بوو. جەناب رەییس گوتی: ((بڵێ بزانم، کاتێ کە هاتەوە تۆچووی دەرگات لێکردەوە یا خوشکەکەت؟ گوتم: ((نازانم)). گوتی: ((چ نازانی؟)) گوتم: ((هیچ)) گوتی: ((من چیم گوت، بیلێوە!)) گوتم: ((هەرئەوەی کە گوتت- گوتت کەس هاتۆتە ماڵێ؟ بەخودای لە جەنابی ئەبولفەتح خان بەولاوە کەسی دیکە نەهاتووە...!)) گوتی: ((تێنەگەیشتم، گوتت دوای نوێژێ خەوتنان بوو یا پێش نوێژێ خەوتنان؟)) من شتی وام نەگوتووە. دیسانەوە گوتی: ((دایی زۆری پێخۆشبوو؟)) و هەروا لەبەر خۆشییەوە گوتی: ((ئەدی چۆن، دیارە کە پێی خۆش دەبێ، وەنا؟)) هەر راست لەسەر زمانم بوو بڵێم: ((نا، تێکچوو...)) خوا رەحمی کرد. لە جیاتیان گوتم: ((بۆ خۆشحاڵ بێ؟)) گوتی: ((بەهاتنەوەی کاکەی ئیدی!)) گوتم: ((بەخودای من کەسم نەدیوە... بە پێغەمبەر نەمدیووە...)) گوتی: ((ئەگەر زانیت کاتی هاتنەوەی روخساری بابەگیانی چۆن بوو دەڵێم زۆر زیرەکی!)) گوتم: ((بەخودای من نەمدیتووە... جەنابی ئەبولفەتح خان بوو... بەخودای هەر ئەوبوو...)) گوتی: ((کێ؟)) گوتم: ((مف- مف... ئەبولفەتح خان!)) و لەپرمەی گریانێمدا. گریانەکەشم بە درۆوە نەبوو- هەر بەراستی دەگریام: دەگریام و هەنیسکم دەدان ((هەك —هەك!)) و سەردەستەم بە دەمولووتمدا دێنا ((هەك- هەك!)) جەناب رەییس حەو سەڵەی نەما، و هەستا و رۆیی.

ئەودەمی کۆمەڵگا وا پێش نەکەوتبوو و لەماڵبوونی کاکەش هەرچەندە بێ گێرمە و کێشە و دەردەسەری نەبوو بەڵام گوایە لە بەرامبەر یاسادا بەتاوان دانەدەنرا و کوڕ یا کچ یا برا ئەگەر لە ماڵێ بابی یا برای یا خوشکی خۆی پەنا دابایە و خۆی شاردبایەوە، جا بە هەر تاوانێکەوە بایە، ئیدی ئەوە کاریان بە باوك و براو خوشکی ئەو کەسەوە نەبوو. ئەوەمان لە زمانی سەعید بەگی نەواقیلەوە بیستبوو. ئەو کتێبێکی یاسای هەبوو؛ سکاڵانامەی بۆ خەڵکی دەنووسی. لەوانەشە هەر بەو هۆیەوە بووبێ کە بابەگیانیان بەرهەڵدا کرد.

شەوێ کە بابەگیان هاتەوە وەك نیوەی ناخۆشیان کۆتایی هاتبێ وابوو، دایی دوای رۆیشتنێ ژنەکان و جەناب رەییس، لەبەردڵی ئێمە- من و مەلیحە- زۆری لە خۆی کرد خۆی راگرێ تا چاوی بە بابەگیانی کەوتەوە، ئیدی سەرلەنوێ دەستی پێکردەوە و کەوتەوە بێ ئارامی و نارەحەتییەوە. بابەگیان دەگەڵ ئەو هەموو نارەحەتی و ناخۆشیانەشیدا جارێك لە جارانی لەڕووی دایی نەدا و پێی



نەگوت کە کەمتەرخەمییەکە لەویەولەوە بەدواوە هەرگیزاو هەرگیز جارێك لەجارانیش ئاماژەیەکی بۆ ئەم لایەنە هەر نەکردەوە- و دایی ئەوەشی چاك دەزانی. بەهەرحاڵ، دیاربوو ئەوەی لە ئێمەیان پرسیبوو هەر هەمان ئەو پرسیارانەشیان لە بابەگیانی کردووە و بابەگیانیش وەك ئێمە نکوڵی کردبوو و ئەبولفەتح خان و زەینەڵی بە گەواهی هێنابوونەوە و پێی وابوو ئەوانیش هەر جەختیان لەسەر قسەکانی وی کردۆتەوە... لەوێ هەموو کاتێ هەر نارەحەتی ئێمە بووە و ترساوە نەکو نەزانانە قسان ببەزێنین و زۆری سوپاسی خودای کرد کە ئەو لایەنەیان وەخێرگەڕاوە و بەخێرتێپەڕیوە و دیسانەوە جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە لێرەش بەدواوە نابێ کەس لەو دوو لێوانەمانەوە ببیە کە کاکە هاتۆتەوە و ئەوەی پرسیشی ئێمە هەر ئەوە دووپات کەینەوە کە بڵێین هەرگیزاو هەرگیز نەماندیوە.

دایی و بابەگیان ئێستا تێدەگەن کاکە بۆ دوێنێ شەوێ هێندەی ماچکردبوون... ((دەك خودا بمکوژێ، ماچی ماڵئاوایی بوو!)) ئێستا دەزانن کە هەر ئەو دەمەی ئاگاداری هاتنەوەی حەزرەتی دەبێ بڕیاری خۆی دەدا. هەر بۆیەشبوو جلەکانی ژێرەوە و شەرواڵەکەی بابەگیانی داکەندنەوە و ئەوانەی خۆی دەبەرکردنەوە! (ئەڵبەتە هەر ئەودەمی دایی گلی دانەوە و دەگەڵ گەواهی نامەی کاکەی و هەندێ پەلکەگوڵی وشکدا هەڵیگرتن و شاردنییەوە). ئیدی ئەوە دیارە کاکە دەپاشخانێدا راکشاوە؛ مەلیحە جارێکی دەچێتە لای و سەری لێدەدا تابزانێ داخوا هیچی ناوێ کەچی خۆی لێدەکا بە نوستوو؛ دوای ئەوەی کە ئەو دەڕوا هەڵدەستێتەوە و لە پەنجەرەیڕا کە چاوەدێری کردووە و هەردەو دەمەیدا کە ئوتومبێلی حەزرەتی ئەجەلی لە خوار باغییەوە وەدەردەکەوێ و بە دەپێش گرتنی ماوەی نێوان ماڵێ تا چۆمی و سەرنجدانی ئەوەی کە هەموویان هۆش و گۆش و هەست و نەستیان بەلای هاتنێ ئوتومبێلانەوەیە و دیارنەبوونی مەلیحەش بە هەل دەزانێ و بەسپایی لە ماڵێ دێتە دەرێ- و خۆی دەگەیەنێتە قەراغ چۆمی، و تا تەقەی گوللەی نایە مەلیحە نازانێ ماڵی بەجێهێشتووە. هەر کە گوێی لە تەقەی دەبێت گورجێکی رادەکاتەوە ماڵێ، تا هەڵیستێنێ و ئاگاداری کاتەوە، کە دەبینێ نەماوە، و تازەش کار لە کارترازاوە.

* * *

## (١٣)

له دایەره لەبەردەمی بابەی دانیشتبووم کە پاسەوانێك هات و گوتی: ((حەزرەتی ئەجەل تەشریفیان دێنن)). بابە هەر دەستوبرد دەستی بە ئایەتەل کورسی خوێندنێ کرد و بەسەرخۆیدا فووکرد لە ترسی ئەوەی نەکا ئەمجارەیان حەزرەتی ئەجەل بە گومانێکی خراپەوە بیڕوانێتێ و دە ئوتومبێلی پارێزگارییەی هاوێت و دەگەڵە خۆی بەرێت. چونکە جێی باوەڕێ نەبوو. هەروەك لە خۆیم بیست ئەوجارەی دیش کە تەشریفیان هێنابوو لە رێی ئیسماعیل خانی بەردەستیەوە هەواڵێکی ((گەرموگوڕیان)) ناردبوو: ئیسماعیل خان گوتبووی کە حەزرەتی ئەجەل ئەحواڵی پرسیون. ئەحواڵی بابەی! ئەویش لەکێ، لە ئیسماعیل خانی! هەر راست وەك ئەوەی گورگێك ئەحواڵی مەڕێکی بپرسێ، ئەویش نەك لە شوانی، چونکە شوان هەر نەبوو، و هیچ کاتێکیش هەبوونی هەرنەبوو — و بابە ئەوەی چاك هەست دەکرد و دەیزانی — بەڵکە لەمام رێوی پرسیبوو، کە هەمیشە خەریکی خواردنی پاشماوەی کەلاکانە. گوایە بابە بیست و پێنج تومانی (تمەن) داوەتە ئیسماعیل خانی و هەرچۆنێکی بووە بەڵکە سەر و بنی کێشەکەی بۆ بێنێ، هەرچەندە چاوەڕوانییە خودی حەزرەتی ئەجەلیش لە گوژمەی (مەبلەغ) دوو هێندەی ئەوە زیاتر نەبوو، و ئیسماعیل خان گفتی دابوو کە هەرکاتێ سەرووڕووی حەزرەتی ئەجەل گوڵی کرد و گەشبۆوە و ئەوی بیرکەوتەوە، ئەودەمی قسان بێنێتە نێو قسانەوە و ئەوی لە بیربەرێتەوە، تا بابە هەمیشە هەردە دڵەڕاوکێ و بیر و خەیاڵاندا سەرقاڵ بێت، و و پەروەندەی فەرمانەکەش هەروا کراوە بێ...

باوە دوای جلك گۆڕینی بەئایەتەل کورسی خوێندنێوە بەرەو دەم چۆمی ملی لێنا. بەقسەی وی من لە ماڵێ مامەوە. نیو سەعاتی مابوو بۆ نیوەڕۆیە کە بەڕەنگ و روویەکی پەڕیوەوە، دەم بە ویرد و سەڵاوات، هاتەوە ماڵێ، لە وەڵامی پرسیارەکەی مندا هەروا بە کورتی گوتی کە لەدەم روبارێ کارەساتێك قەوماوە و هەر وا ویرد و سەڵاواتیشی دەخوێندن و بەسەرخۆیدا پف



دەکرد. دیاربوو بەو زەردەخەنەی کە کردم، باوە لەپێستی خۆی هاتەدەرێ، گوتی: ((تۆ منداڵی؛ هێشتاش هەر منداڵی، چ نازانی و تێناگەی!...)) و من نەمزانی چ تێناگەم و چ نازانم: و دواشی نەکەوتم... چوومە بازاڕی و بەسەرهاتەکەم بەشێوەیەکی جۆراوجۆر لەدەمی خەڵکییەوە بیست. کورتەی داستانەکە ئەوەبوو کە جحێڵەیەکی تاوانبار بە کوشتنی خوشکەکەی لە ماڵێ کەلایی رەجەبی، لەپڕ رێك دەو دەمەیدا کاتی دابەزینێ حەزرەتی ئەجەلی، وەك رمووزنەکی مووی لێ هەڵکڕوزێنن لە دەم چۆمی قوت دەبێتەوە و حەزرەتی ئەجەل وەبەر دەمانچان دەدا و کە گوللەشی پێنامێنێ دەمانچەکەی حەواڵەی سەری حەزرەتی ئەجەلی دەکات و جامی پێشەوەی ئوتومبێلەکەی دەشکێنێ. هەرچەندە قسەکانی لێك جیاوازیش بوون بەلاّم لە هەندێ لاوە تێکیان دەکردەوە: دە هەموو قسەکاندا ئەوە هەبوو کە کوڕە جحێڵەیەك تەقەی کردووە و لاوێکی جوان و لێوەشاوە و گوستاخ بووە؛ هەرکە حەزرەتی ئەجەل کوڕەی دەبینێ و گوێی لە تەقەی دەبێ، کونە مشکی لێدەبێتە قەیسەری و هەڵدێ و خۆی بۆ پشت ئوتومبێلەکەیەوە دەکوتێ؛ ئیسماعیل خان کە بەناو ((پێشمەرگە)) یا پارێزەری خودی حەزرەتی ئەجەل بوو بەجێی دەهێڵێ و تێی دەتەقێنێ؛ کەس دەستی بۆ چەکی نەبردبوو، دەگەڵ ئەوەشدا کە هەم ئیسماعیل خان و هەم سەرۆکی پۆلیسان و هەم پاسەوانەکانیش — هەرهەموو- دەمانچەیان بەلاکە لەکێوە بوو. پارێزگارانیش (حمایە) درەنگ وەخۆکەوتبوون. جحێڵەکە، کوڕی ئەکبەر عەجەمی پێنەدۆزبووە، کە پیاوێکی خەڵکی هەمەدانێ یا دەورووبەری هەمەدانێیە —سەعاتێك پێشتر ئەکبەر عەجەمیان گرتبوو؛ گوایە چەند جارێکی دیشیان گرتووە و ماڵەکەیان پشکنیوە. پڕوپاگەندەیەکی سەر پێیش کەوتبووە سەر زاران کە وەك زۆرینەی ئەو پڕوپاگەندانەی دی کەس نەیدەزانی بناوانی لە کوێوەیە و چۆناو چۆن داکەوتووە. پروپاگەندەکە دەیگوت کە گوایە حەزرەتی ئەجەل ((چاو لە دووی)) ئەو کوڕە جحێڵەی بووە و گرتوویەتی و زیندانیی کردووە، و خوشکە عازەبەکەشی بۆ بەردانێ برایەکەی، خۆی دە باوەشێ ئەم و ئەوی هاویشتووە و سەرەنجام سەری لە ماڵێ کەلایی رەجەبی وەدەرهاتۆتەوە و لاوەش ویستوویەتی تۆڵەی خۆی و خوشکەکەی بکاتەوە، تا کارەکە دەگاتە ئێمە. چەکی لە کوێ هێناوە؟ -کەس راستییەکەی نەدەزانی. لەوانەیە لە سەربازخانەی دزیبێ کە لێی زیندانی بووە، یا لەوانەیە لە چەتە و رێگرانی کڕیبێ؛ بەلاّم چۆنی دەست بە چەتە و رێگران راگەیوە؟ دوایی بەو شێوەیەی کە بابە بۆ جەنابی سەفوەتیی گێڕایەوە گوایە لە جەنابی زەمینی سەرۆکی

ئاسایشی، بیستووە کە، لاوەکە دەمانچەکەی لە قەراوڵخانەی سەراپەردەی حەزرەتی ئەجەلی دزیوە. من برا بچکۆلەکەیم دەناسی، بەهیوای ئەوەی بتوانم ئەوی ببینمەوە و شتێکی لێ هەڵکرێنم بە بازاڕیدا هاتمەخوارێ. دوکانێ بابی بەرامبەر مزگەوتی گەورە بوو... دوکانەکە داخرابوو؛ حوسێنیشم نەدیت... چوومە ماڵێ داپیرەی- (دایکی دایکم) کونە هەواڵ بوو. سەرەڕای ئەوەش ماڵەکەی بەرامبەر ماڵێ ئەکبەر عەجەمی بوو، هاموشۆی دەگەڵدا هەبوون. داپیرە لەماڵ نەبوو، و لە ماڵێ ئەکبەر عەجەمی دەنگی گریان و لەخۆدان و شیوەن وزاری دەهات- دیاربوو لەوێبوو.

دوای نیوەڕۆ بوو هەواڵیان هێنا کە حەزرەتی ئەجەل تەشریفیان ڕۆیی... بەبێ هیچ ڕێ ورەسمێکی بەڕێکردنێ! کە ئەمە یەکێك بوو لە شتە هەرە سەیرەکانی دنیایە، بەلاّم لەجیاتی ئەوەی ئەم هەواڵە جێی سەرسامی و ناڕەحەتییە بابەی بێت هێوری کردەوە و ئاسوودەییەکی تەواوی بەدڵ و دەروون و مێشکی بەخشی، بەلاّم بێجگە لەوەش کە نەکا ئەو ڕووداوە ببێتە مایەی توڕەیی و سەختگیرییە خەیاڵی بەولایەیدا هەر نارەحەت بوو. هەربۆیە و بۆ بەهێزکردنی مێشك و دڵ و دەروونی و ناخی بێ هێزی خۆی کەوتەوە ئایەتەل کورسی و قول وەڵلاّ خوێندنێ. دیاربوو هەر بۆ وە دەستکەوتنی سەرەپەتێکی و بە مەبەستی هەواڵ و باسێکی، یا هەرنەبێ بۆ سوککردنی باری مێشك و بیری، دەوروبەری عەسرێ بوو گوتی بچم و لەزاری وییەوە تکا لە سەفوەتیی و خاو و خێزانی بکەم بۆ شامێ (نانخواردنێ ئێوارێ- وەرگێڕ) تەشریف بێننە ماڵێ مە.

چووم. خزمەتکار بە جەنابی سەفوەتیی ڕاگەیاند. جەنابی سەفوەتیی بۆخۆی هاتە دالاّنێ و منی بردە ئەو ژوورەی بەرامبەر ژووری ئەقدەس خانمێ بوو. لە سیلەی دەرکێوە ئەقدەس خانم دیت کە بەسەرو روخسارێکی گرژ و مۆن و —پێدەچوو گریاناوی-یەوە خۆی دەچارشێوێکی مەیلە و کەسکەوە پێچابوو بەلاّم عەزیزە خانم جلوبەرگی میوانییەی دەبەردابوو- پێدەچوو یا بچێتە جێیەکی یا تازە ئەویش لەجێیەکی هاتبێتەوە. ئارایشتیشی کردبوو. ڕاسپاردەکەی بابم گەیاند. جەنابی سەفوەتیی بە روخسارێکی کە لێوەی دیاربوو حەزی لێیە هەرچی زووە من لەیەخەی خۆی کاتەوە هەر بەدەنگە نووزە نووزاوییەکەیەوەو بە پیتە (س)یەوە کە وەك فیت



فیتەی لەلایەکی ددانی پێشەوەیڕا دەهاتە دەرێ گوتی: ((سلاّوان بە جەنابی رابگەیەنە، بلّێ بەداخەوە ئەمشەو تۆزێك سەرقاڵم، لەوانەیە هەر کاتێکی داوامانکەن، داوامانکەن...)).

وەبیرم هێنانەوە کە حەزرەتی ئەجەل تەشریفیان بردۆتەوە. گوتی: ((دەزانم، دەزانم... ئەوە ئێستا لەوێڕا دێمەوە. ئێوەش هەروا بە باوکتان بلّێن...)) و بەڕوویەکی ئەندێشاوییەوە، دەحاڵێکدا کە سەری بەردابۆوە، لێی زیاد کرد: ((سبەینێش هەر سەرقاڵم. بەلاّم دووسبەی شەوێ بە چاوان... بە خزمەتیان دەگەین)). ئەوەی گوت و چووە ژوورێکی دیکەوە و دوای چەند دەمەتەقێیەك دەگەڵ ئەقدەس خانمێدا، کە من هیچ سەرە دەریەکم لەو بگۆمگۆیەی دەرنەکرد، هاتەوە و گوتی: ((بەلّێ، سلاّوان بگەیەنەوە؛ و بلّێ دووسبەی شەوێ بەچاوان... هەر چۆنێك بێ بەخزمەتیان هەردەگەین... دەموچاوی عەزیزە خانمێ سور هەڵگەڕابوو: جا لە توڕەییان، یا لە شەرمان، نازانم. بەلاّم هەرچی بوو دوو هێندەی دیکەی جوانترکردبوو. زەردەخەنەیەکم پێبڕا و ڕۆیشتم...

ئەو دوو ڕۆژانەش تێپەڕین؛ ڕۆژی دیاریکراو هات کە بڕیار بوو جەنابی سەفوەتیی بەخاو و خێزانەوە شەوێ بۆ شامێ بێنە ماڵێ مە. دەو دوو ڕۆژانەدا، هەرچەندە ناخی هێورتر ببۆوە بەلاّم دەئاگری خۆتێهەڵقوتانێدا دەسووتا، بەتایبەتی کە جەنابی زەمینی ڕووی نەدابوویە. شەوانە کە ئارەقەکەی دەخواردەوە دەبیر و خەیالاّنەوە دەچوو و هەروەك یاریی شەترەنجێ کە بیەوێ بزوتنی ئایندەی بەرامبەرەکەی بزانێ و پەی پێببات دەمەیدانی بیرومێشکی و ئەگەری بزوتنێ بە مەزەندەوە دەمۆرەکان ڕادەما؛ تەنانەت بادانی تەزبیحێی لەبیر دەچۆوە، جا چ جای سەرکردنە سەر و دەست تێوەردان و پێکەنین- دەست تێوەردانی من و بەمن پێکەنین... دوای نیوەڕۆیە دیسانەوە گوتی بچمەوەو وەبیر جەنابی سەفوەتیی بێنمەوە، نەوەکو لەبیری چووبێتەوە. هەر لە بازاڕی تووشی جەنابی سەفوەتیی بووم. پێدەچوو هەروا سەرقاڵ و بێ واز و بێ کەیف بێ. بڕیارەکەم وەبیرهێنایەوە. گوتی: ((سلاّوان بە جەنابیان بگەیەنەوە، و بلّێ بە چاوان- من و عەزیزە بە خزمەت دەگەین؛ بەلاّم ئەقدەس لەوانەیە نەتوانێ بێت، تەندروستی زۆر تەواو نییە)). دوای چەند ساتەوەختێك هاتەوە سەرقسان: ((لەوانەشە بێت... بەهەرحاڵ، گرنگ نییە... بەخزمەت دەگەین بە چاوان)). هاتمەوە ماڵێ؛ بابە هێندە خۆشحاڵ بوو، وەك نەحەزرەتی ئەجەلێك هاتبێ و نە حەزرەتی ئەجەلێك ڕۆیشتبێ. هەر بۆ ئاوی ڕووان بەزڕداکێی

گوت: ((هەرچۆنێك بووە تۆ دوای نیوەڕۆیە بەرەبەری عەسریێ بچۆوە و داوا لە ئەقدەس خانمێ بکە ئەویش هەردەبێ بێت. بلێ هەردەبێ تەشریف بێنن، خۆ ئەگەر خوانە خواستە نەساغییەکیشتان هەبێ ئەوە جێی حەسانەوێمان هەیە و لەوێ وەحەسێ... هەمووی هەریەك ماڵە، ئێرە و ئەوێی نییە-... ماڵێ مەش هەر ماڵێ وەیە)). و لێی زیاد کرد: ((ئەوشتانەی گوتنم بۆت دەچنەوە سەریەك؟ بە گاڵتەی نەزانی)).

زڕدایکەکە گوتی: ((نا قوربان هێندەش گێل نیم، ئەوەندەی هەر دەزانم!)).

ئەڵبەتە من دەمزانی، بابەش هەردەیزانی- بێگومان دەشیزانی- کە ئەگەر ئەقدەس خانم چینیش بوایە و وشەی زڕدایك (باوەژن) وشەیەك بایە و دە هیچ زمانێکی دنیایەشدا نەبایە، تەنانەت دەکوردیشدا وەبەرگوێیان نەهاتبایە، بەلاڵە پەتەیی و هەر فێڵ و تەڵەکەبازییەك بایە تێی هەردەگەیاند، و بە تیرێکی دوو نیشانەی دەنگاوتن، یەکێکیان ئەوەی کە ئەقدەس خانمی لە ماڵێ هەڵدەکەند و دووەمیش نەیدەهێشت عەزیزە خانم بەتەنێ سوار چاکی مەیدانێ بێت و بەتەنێ جلیت بازییەی تێدابکات.

بابە دووپاتی کردەوە: ((بلێ تەشریف هەربێنن، جێی حەسانەوەتان هەر لەوێ بۆ چێدەکەین. هات هات نەهات نەهات. ئێمە بە ئەرکی خۆمان هەستاین...)) دوای هێندێك راوەستان، وەك بێ بیرکردنەوە بێ گوێدانە هیچ گوتی: ((زۆری دەگەڵ پێدامەچۆ، خۆتی لەبەرچاوی چووك مەکەوە... ئەوانە نابێ زۆریان زەنگوڵە و گوڵێنگە بە پاڵوێوە کەیت —هات هات، نەهات نەهات... زۆری دەگەڵ پێدا مەچۆ...)).

زڕدایك رۆیشت و بە پێچەوانییە چاوەڕوانییە بابەی، دوای سەعاتێك هەموو پێکەوە دەگەڵ ئەقدەس خانم و عەزیزە خانم و جەنابی سەفوەتیی هاتەوە... دانیشتنە ئارەق خواردنەوێ. جەنابی سەفوەتیی هێشتا لە داچڵەکینێ ئەو رووداوەی نەهاتبۆوە سەرخۆ، بەلاّم دیاربوو دەربارەی گۆڕین و لابردنی جەناب سەرهەنگ و هەژانی بارو گوزەرانی خۆی دڵ ئاسوودە بوو، بەتایبەتی بۆ چاوترساندنی ناوچەکە، بەیانی، ئەو قاچاغچییە چەکدارەی ماوەیەك لەمەوبەر گیرابوو و شەوی پێشوو حەزرەتی ئەجەل ئەوی لە ناوەندی سوپاوە ناردبۆوە و بە دارێیاندا کردبوو.



عەزیزە خانم ئارایشتی تەواوی کردبوو: بلوزێکی پڕ وێنەی جوان و شیك رەنگی دەبەرکردبوو. گەردەنی بەرزی، دەگەڵ ئەو زنجیرە زێڕەی ملی کە ئەو ((دڵە))ی کە بە زنجیرەکەوە بوو دەگەڵ هەر قسەو پێکەنینێکیدا لە خەوێ رادەپەڕی. بێگومان دڵی هەر بینەرێکیشی لە خەوێ رادەچڵەکاند. ئەقدەس خانمیش، دیاربوو ئەویش لەبەر چاولێکەرییە، حەوت قەڵەم ئارایشتی کردبوو، و گەمەو گاڵتەی پیاوانەی دەگەڵ من و بابەیدا دەکرد- شتی وایدەگوت تەزووت بەلەشیدا بێت: ((ئەو ژنە تاس و لوسانە)) بە تیلەچاوێکی لای عەزیزە خانمێوە- ((هاربوون! هەر مل ئەستوورێکی وەك تۆیان گەرەکە دەروەستیان بێت و پێیان رابگا...!)) وای... هێندەی نەمابوو لە شەرمان بتوێمەوە! عەزیزە خانمیش تا دەهات وەك هەڵۆژەی سوورهەڵدەگەڕا، و سوورهەڵگەڕانەکەشی نەك هەر لێ ناشیرن نەبوو بەڵکە زیاتریشی جوان دەکرد. کاریگەری ئەو مەتەڵەکانەشی لەوەی زیاتر نەبوو کە لەوەندی و گوستاخییەی زیاتر دەکرد. هەر چۆنێ بوو سفرەی شامێ راخرا. بەلاّم لەسەر سفرەی شتی زێدەتر نەگوترا- تا ئەوەی کە دامودەزگای تریاك کێشانێ هاتەگۆڕێ و راخرا. باس و خواسی ئەو شەوە هەمووی هەر دەربارەی باسە کۆمەلاّیەتییەکان بوون، بەرەو سیاسەتی دەرەوە نەچوو: پێدەچوو سیاسەتی ناوەوە هێشتا گرنگی خۆی پاراستبێ و لە دەستی نەدابێ. ئێستا ئیدی ئەوە گرنگ نەبوو کە ئەعالی حەزرەتی خۆمان بیانەوێ بە پشتیوانییە هێتلەری عێراقێ بگرن و شارە بچکۆلەکەمان ببێتە ناوەندی لەشکر و سەربازان و بەگوێرەی ئەوە قەڵەمڕەوی دەسەلاّتی هەندێکان بەر فراوانتر بێت یا نەبێت؛ ئاریشەکە ئاریشەیەکی ناوچەیی بوو. جەنابی سەفوەتیی پێیوابوو- بەو خۆ نواندنەیەوە وا پێشاندەدا کە ئەو باوەڕ و بۆچوونەشی لە سەرچاوەیەکی کارفەرمایی بەتواناوە دەستکەوتووە... باوەڕی وابوو کە حەزرەتی ئەجەل بڕیاری سەخت و توندوتیژی بەرامبەر ناوچەکە بڕیاردابێ و لەبەرچاوگرتبێ. و گوتی: ((ئاه، ئەوە خەت و ئەوەش نیشان...)) و خەت و نیشانی بەسەری پەنجەی بەسەر گوڵی قالێییەکەی داهێنا. دوایە وەك بڕیارێکی زۆر گرنگی وەبیر هاتبێتەوە و بەروارەکەی لەبیرکردبێ یا گومانی لێیەتی پرسی- لە دانیشتوان- ((ئەوڕۆ چییە؟)) گوتم: ((سێ شەممەیە بیستی خوردادێ...)) جەنابی سەفوەتیی بەڕەنگ و روویەکی زانایانەوە، دەگەڵ ئەوەشدا بە هەڵشاخینەوە گوتی: ((ئەوڕۆ سێ شەممەیە و بیستەمی خورداده... چاکی گوێ بدەنێ...)) ئەمجارەیان رووی دەمی لە بابەی بوو: ((لە بیرتان بێت، شەوێکە و لێك خڕبووینەوە و دانیشتووین گەنجەفە و جەفەنگان دەکەین... سەیرکەن بزانن

دەڵێم چی. هەر لە ئێستاوە قەرێتەی ملی ئەو خەڵکەی توندکەنەوە تا دەڵێن بەس! پێش بارانێ کە پەنك، هەر ئەو رووداوەی ئەمڕۆکە ئاگاتان لێیە!...)) و دوای نەختێك وەستان هاتەوە قسە: ((بەڵێ هێشتا ئەوە سەرەتای عیشقە... من پێم وابێ کارتی بلانشیان[1] دابێتە جەناب سەرهەنگی)). کارتی بلانش زاراوەیەك بوو کە ئەمساڵ من لەوێ نەبووم هاتبووە تارانێ و سەرۆك و بەرپرسان دەقساندا، بەجێ و بێ جێ دە قسانیان دە ئاخنی تا بەوجۆرە جێ پێی خۆیان دەگەڵ ئەو رووداوانەی لە تارانێ دەقەومان بگونجێنن و وەبیر گوێگرانی بێننەوە.

بابە گوتی: ((ئەو خەڵکی خوایە گوناهیان چییە؟...)).

((راست دەکەی! جا ئەگەر وابێ هەر شاقەل دڕاوێك لەولا ڕا بێت و لەهەر جێیەکی بیەوێ شریخ، ترەقەیەکی بتەقێنێ ئەوە وڵات دەبێتە مەملەکەتی حوسێن قولی خانی؛ و بارودۆخێك دە مەملەکەتیدا دروستدەبێ کە سەگ ساحێبی خۆی نەناسێتەوە!)).

عەزیزە خانمیش هەر بڕوای وابوو: ((نەگبەتانە... وەل- لا)) و لێوەکانی بەتووڕەییەکی واوە — کە یەکجار زۆر جوان و شیرین بوون- وێکهێنایەوە.

بەڵام ئەقدەس خانم ئەوکارەی زۆر بەسەختی پەسەند بوو. ((چاکیکرد، بە قوربانی ئەو دەستانەی بم... بەڵام ئیدی، فایدەی چی؛ ئەوانە شانس و بەختیان وەك خۆیان، هەروەك سەیی بەرەڵلاێ، بەردەوام پێیان دەوەڕێ!)) [((ئەمانە)) حەزرەتی ئەجەل و جەناب سەرهەنگ و بێگومان جەنابی سەفوەتیی و عەزیزە خانم بوون] ((چەندم حەزدەکرد لە تەختی نێو چەوانێی دابایە، تا تێگەیبایە یەك مەن ماست چەندی کەرە دەکەوێتێ!...

نەمدەزانی، ئەگەر بمزانیبایە شەکێکم نەزر دەکرد!... بەڵام ئیدی، فایدەی چی. ئاخ ئەگەر پیاو دەبووم و شان و قۆڵ و بازووی تۆم دەبوو!...)) ئەو رستەی دوایەی روو پێ لەمن بوو.

جەنابی سەفوەتیی زۆر بەتوندی نارەحەت بوو. پێستی سەری لەبن مووە لاواز و تەنکەکەی سەریەوە سووردەچۆوە. ئەقدەس خانم تیلەچاوێکی سەرکەوتووانەی بەهەر چوارلایاندا گێڕا. بەڵام جەنابی سەفوەتیی شتێکی تێداهێشتەوە. گوتی: ((سەیری، ئەقدەس گیان، سەدجارم پێ گوتووی؛ تۆ بەوقسانەت سەرەنجام کارەکان لەدەست خۆت و لە دەست منیش دەدەی. ئەوە

[1] carte blanche: دەسەڵاتی تەواو یا دەسەڵاتی بێ سنوور.



جاری چەندەمە- بەڕاستی من نازانم، تێناگەم تۆ مەبەستت چییە، دەتەوێ چ بڵێی؟... لەوەی زیاتر کەلەوانەیە بتەوێ ئەو ژیان و ئەو پاروەنانەی خوا داویەتی ئەویش ببڕی!)) ئەقدەس خانم زەردەخەنەیەکی ساردی کردێ، و گوتی: ((بۆ خۆم دەزانم دەڵێم چی! بەڵێ، بەگیانی خۆت، تۆ زۆر سادە و ساکاری، زۆرشتان هەرنازانی- هەی لەبەرت مرم!... نا، چاکیش دەزانی و تێشدەگەی! ئێوە وەك کەوەکەتان لێهاتووە سەرتان دەبن بەفرێ ناوە و پێتان وایە کەس ناتان بینێ. نا، گیانە، زۆر چاکیشتان دەبینن... ئێوەش هەردەبینن، ئیدیش هەردەبینن- ئە-مم!)) و بە تەشەرەوە سەرێکی بادایەوە ((ئە -مم! بە قسەی هەندێکان وەل-لا!)) ئەو ((ئەوانیدی))یە و ئەو ((هەندێکیان))ە لە خانمێ تەنیشت منەوە بەولاتر کەسی دیکە نەبوو.

بابە بۆ ئەوەی ئاریشەکە هێورکاتەوە چاوێکی لە من کرد، یانی کە بۆ هەروا دانیشتووم و بەقسەی وی هەر ئاوم لە دەمولەوسان دێتەخوارێ و لاشەویلاکەم تا بناگوێیان چووە؛ بۆ گرامافۆنەکەی وەکارناخەم؟ گرامافۆنم خستەکار و قەوانی ((گوڵزاری ئاشناییە بووە خەزان))م هاویشتە سەرێ، کە تازە بەتازە هاتبوو و دوایین وشەی مەیدانی مۆسیقا بوو: هەرکە گوێت لێدەبوو بەدەست خۆت نەبوو دەگەڵیدا وە هەلەکە سەما دەکەوتی. دەگەڵ ئەوەشدا جەنابی سەفوەتیی زۆری کەسەر و غەم و خۆخواردبۆوە سەرەنجام لەبن لێوانەوە دەگەڵ بەدیع زادەیدا تێکەڵاو بوو. دەمولێو و چاوەکانی عەزیزەخانمێ و ئەو خۆڕاژاندنە لەسەرەخۆیەشی هەر ئەو هەماوازییەیان پێشان دەدا. ئەقدەس خانم ویستی بەدوای مەبەستەکەیدا بچێتەوە، بەڵام بابە سووربوو لەسەرئەوەی کە حۆققەکە سارد دەبێتەوە. هەردەو دەمەیدا عەزیزە خانم داد و بڕۆی گەرمایەی بوو و بە باوەشێنێ سینگ و بەرۆك و گەردنی خۆی باوەشێن دەکرد و بەردوام تاریفی گوڵی کراسەکەی زڕدایکێی دەکرد. بابە هیچ رانەوەستا و هەر زوو زوو دووەم و سێهەمیشی بۆ ئەقدەس خانمێ دادەگرتەوە تا لە پەل و پۆی خست و بەدنیای بێ ئاگاییەی سپارد. دەو نێوەیدا جەنابی سەفوەتیی چەند تاریفێکی لە سام و هەیبەت و شان و شکۆی حەزرەتی ئەجەلییەوە... کردن ((هەروەك بورجی ژەهرەمار...)) و بەسەر ئاماژەی عەزیزە خانمێی کرد و بەدەنگێکی نزمەوە درێژەی دایە: ((عەزیزێکیش هەبوو... هەروەك بورجی ژەهرەمار!...)) لە وەڵامی سەرنجە پرسیاراویەکانی بابەدا، گوتی: ((چووبوو یارمەتی خانمێ جەناب سەرهەنگی بدا...)) بێدەنگی. ئەو رستەی دواییان وەك لەلاوە چووبێتە ناومێشکی ئەقدەس خانمێوە، کتوپڕ چاوی کردەوە و وەئاگا هاتەوە و دەنگەکەی گۆمی ئەو بێدەنگی و

خامۆشییەی شڵەقاند. بە دووچاوی خەواڵووی پێڵو و قورسەوە بەدەنگێکی مانادارەوە گوتی: ((بەڵێ، چووبوو یارمەتی بدا!)) و دووبارە کەوتەوە دنیای بێ ئاگاییە. دوایە لە زڕدایکەکەمم بیست کە گوتی ئەویش لە ئەقدەس خانمێی بیستووە کە جەنابی سەفوەتیی عەزیزە خانمی بردووە تا کاتێ حەزرەتی ئەجەل ئیسراحەت دەکا ئەو باوەشێنی کات، قاچەکانی بشێڵێ!... من قەوانەکەم گۆڕی؛ بابە سەرنجێکی دەست خۆشانەی تێگرتم. جەنابی سەفوەتیی هەربەدوای قسەکەیدا و بەهەمان دەنگی لەسەرخۆیەوە گوتی: ((بەڵێ، پێتان وایە دەتوانن- پەرژین بێت- چ گووەکی بخۆن. هەروەك بیستبووم... و بێگومانیش بووم... چونکە دەزانم ناتوانێ لەوە زیاتر بێت... ئمم، ئەویش لەگەڵ کێ!؟ کەسێك کە ژیانی لەناو گوللە تۆپ و تفەنگ و خومپارەدا بەسەر بردووە و سەدان جار گوللەی وەك تاوەتەرزان بەبناگوێیدا ((ویزە))ی کردووە... بیستم وەك لە گۆڕەپانی مەشق کردنێدا بن و بە بەردەمی سەربازاندا بێن و بچن، راست و رەوان، وەك رۆستەمی داستان هاتنە پێشی ریزەکە و سکالانامەکەیان لە دەستی دایکەکە وەرگرتووە، و تەنانەت زەردەیەکیشیان بەڕووی ئەو جحێڵە گێلۆکەیەشدا کردووە...)).

جەنابی سەفوەتیی ئەومافەیان نەبوو کەوا پێشاندەن ترساون. هەرچەندە ئەوە بە پارێزگاری و خۆپاراستنی خودەوە پەیوەندە، لەبەرئەوە هەر لەبنچینەدا مافێکی سروشتی بوو. وەك کەڵەشێرێکی کە دەگەڵ کەڵەشێرێکی دیکەدا شەڕیەتی و بەردەوام دەندوکان لەزەوی دەدا و گوایە واخۆی دەنوێنێ کە بەرامبەرەکەی هەر بە خەیاڵیشیدا نایەت و گوێشی ناداتێ و هەڵگرتنەوەی دەنکە دانێکی زۆر لەلا بەنرخ و بایەخترە لە بوونی بەرامبەرەکەی، لەکاتێکیشدا کە بۆ چرکە ساتێکیشی لێ غافڵ نابێ و لەژێرەوە لەراست و چەپێوە لێی دەڕوانێ و بە ئومێدی ئەوەی کە بای سەرە دەرزییەکی ترس و لاوازییە وی بۆ دەرکەوێ... بەڵێ ئەویش مافی ئەوەی نەبوو کارێکی وابکا کەسێك بای سەرە دەرزییەکی ترس نەك هەر لەودا بەڵکە بەپلەی یەکەم لە جەناب سەرهەنگ و حەزرەتی ئەجەل و دوایەش ((دەوڵەت))دا ئاشکرا کات. بەڵام دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا گوایە خراپ بووە- گوایە حەزرەتی ئەجەل لە بەرامبەر خەتەری مەرگ رزگاری بووە، هەرچەندە ئێستا ئەوە چیرۆك و داستان دەربارەی حەزرەتی ئەجەلی دروستدەکرێن کە گوایە بە چ هێز و تواناو خۆراگریەکەوە، بانگی داکێ کوڕەی کردووە و هەربۆخۆی سکالانامەکەی لە دەست وەرگرتووە و چۆن هەروەك باوکێکی میهرەبان کە لە



گوناهی رۆڵە سەرەڕۆیەکەی خۆی دەبووری ئاوا بە زەردەخەنەوە بەڕووی لاوەکە پێکەنیوە و نەیهێشتووە بەد رەفتاریی دەگەڵدا بکرێ.

بەهەرحاڵ سەرچاوەی دەربڕینی ئەوکارە و سەرهەڵدانی ئەم ئەفسانەیەش دیسانەوە هەر ئەمەبووە کە ئەوانیش ((مافی)) ئەوەیان نییە بە ئاشکراکردنی ترسی خۆیان ترس و دڵەخورپەی خەڵکی بشکێنن.

بابە کە بە خودی خۆی لەرێ و شوێنی پێشوازییەکە ئامادەبوو لە وەڵامی سەرنجە پرس ئامێزەکانی سەفوەتیدا بەشێوەیەکی نادیار دەستی رەزامەندییە قسەکانی بۆ لە ملیدا، یانی لەراستیدا شتێکی بە کەڵکی وای نەگوت شت بێ- رەنگە ئەویش هەقی ئەوەی نەبێ، چونکە ئەو دوو سەرەبوو و پەیوەندی بە هەردوو لایانەوە هەبوو: هەم پەیوەندی بە خەڵکی ناوچەکەوە و هەم بەدەوڵەتیشەوە. هەروا کە خۆی بەدامودەزگای ترياكێوە سەرقاڵ کردبوو، بەچاوان ئاماژەی کردێ کە دەنگی گرامافۆنەکە کەمتر کەمەوە گوتی: ((بەڵێ- بەڵێ... باشە... ئیدی- بەڵام)).

جەنابی سەفوەتیی گوتی: ((عەرزمکردن، تازە سەرەتای بیسمیللایەیە... ئەو سەرەپەتە زۆری بەدواوەیە- عەرزمکرد ئەوەپێ و قودومەکەی بوو)). لەلای گرامافۆنەکەوە، هەروا لەخۆڕا، گوتم ((بەڵام خەڵکی دەیانگوت هەرکە دەنگی تەقەی هاتووە حەزرەتی ئەجەل قوچاندوویەتی و هەڵاتووە...)).

هەرئەوەم گوت و نەگوت بابە سەرنجێکی وا توندوتیژی تێگرتم کە هەر وشك بووم، و نەمتوانی رستەکە تەواوکەم و جەنابی سەفوەتیی واقی وڕما و گوتی: ((واش نا، دەتویست هەروا رێك و راست راوەستێ و سینگی خۆی وەبەر گوللەیدا... ئەویش گوللەی ئەو شاقەل دڕاوە!؟ دیارە منداڵی!)) و چاوەکانی سوڕاندن، و سەرنجی دەسینییە ئاوردووەکەی کرد.

ئەقدەس خانم خەوەکەی رەویبۆوە. گوتی: ((راستیان گوتوە. هەر گوللێکی بتەقێنی هەموو ئەو گەووا... پاسەوان و ئەفسەرانە میزێ بەخۆ دادەکەن...)) ئەو بێژەیەی حەزی دەکرد بیڵێ دیاربوو بێژەی گەوواد بوو کە بە پاسەوان گۆڕا. ((...ئێستا دەبێ لە ((خانمەکان))- خانمی

جەناب سەرهەنگ و هەموو ((خانمەکان)) و قورمساغەکانی وەك ئەو ئیسماعیل خانە بپرسن کە تا ئێستا چەند جارانی دەرپێ گۆڕیوە!)).

گۆزە و دیزەکانی هەموو دەسەری منی بێ چارەدا شکان. گەرم داهاتنێ دەمی ئەقدەس خانمێ کاتی وتنی وشەی ((خانمەکان)) و ئاوازی تانە و تەشەری وشەکان و تیلاوتیل تەماشاکردنێ بابەی و چاو بەردانەوەی جەنابی سەفوەتیی و سوڕهەڵگەڕانێ عەزیزە خانمێ هەموو تێکڕا ئەوەیان نیشان دەدا کە دەستە گوڵێکی وام بە ئاوێ داداوە بەسەد ((خەزانی ئاشناییە))ش هەڵناوەرێ. قەوانم هاویشتەوە سەرێ... جەنابی سەفوەتیی یاری بە قوتووە جگەرە زیڕلییەکەی دەکرد، و هیچی نەدەگوت. ئێمەش هەموومان، هەر لە بابەیڕا تازڕداکێ و من، خۆمان لەگێلییە دابوو کە ئاگامان لە هیچ نییە و هیچیش نازانین- هەروەك مەشتی شاعیر وەك گوێمان لە گریمانەی نیسبی ئەنیشتاین راگرتبێ. عەزیزە خانم راست بۆوە و لە گەرمان چووە حەسارێ.ماڵێ مە باغچەی نەبوو، و ئەویش دەگەڵ باغ و سەوزە و جێی فێنك راهاتبوو. بابە بەدەنگێکی وەك بلێیی توندەوە گوتی: ((راستبەوە، بزانە خانم ئیشێکیان نییە... لە خزمەتیانڕا بڕۆ- نەکا ئیشێکیان ببێ)).

ئیشەکە دیاربوو ئاو لە مەسینەکردن بوو، کە لەوانەبوو کارەکەر تێنەگا و ئەو شانازییە بەهۆی زمان زانینەکەمەوە بەمن ببڕێ. عەزیزە خانم چ ئیشێکی نەبوو، گوتی کە گەرمایەتی، دەیویست هەناسێکی بدات، و تێیگەیاندم کە مانەوەشم خراپ نییە. ماوەیەك ماینەوە، و پێکەوە لە هەموو ئاشێکمان لێکرد و زۆرمان قسە لێرە و لەوێوە کرد- لە راستیشدا هەر دەربارەی شتێك بوو: ئەو زۆر شتی دەپرسین و من وەڵامم دەدایەوە. ئەوشتانەی دەشی پرسین زیاتر دەربارەی ئەو وانانە بوون دەمخوێندن و ئەوەش کە ماوەی چەند ساڵی دیکە هەروا دەبێ لە ناوەندی ئوستانی وەمێنم. و دوایی دەمەوێ چ بکەم. دیاربوو لەو رێیەوە دەیویست منداڵییە خۆمم تێگەیەنێ. دیاربوو ئەوشتە لە عادەت بەدەرانەی ئەقدەس خانم لە گەرمەی تووڕە بوونێیدا وەپاڵ منی دابوون هەر لە بنەڕەتدا نەچووبووە گوێیەوە و قبووڵی نەکردبوون. ئەڵبەتە منیش ئەودەمی هێندەم گوێ نەدەدایە ئەو وردە ئیشانە کە خۆم زلتر پێشان بدەم. دوای چارەکە سەعاتێك و لەوپەڕی ئیرەیی و حەسرەتی بابەیدا هاتینەوە ژوورێ، ئەویش دانیشتەوە و



بەتکای بابەی بە هەمان لێو پێکەوەنان و چەسپ لێدانێ جگەرە ئاسای و سینگ و مەمك هەڵتەکاندنیەوە، گەش بۆوە و کرایەوە.

جەنابی سەفوەتیی بەدوای ئەو قسانەیدا کە من گوێم لێ نەببوون گوتی بەڵایەك بوو هاتبوو کە سوپاس بۆ خوا بەخێر تێپەڕی؛ جەناب سەرهەنگ شەکێکی کوشتبۆوە و گوتبووی خوێنەکەی بەتایەکانی ئوتومبێلی حەزرەتی ئەجەل داکەن؛ ئەویش یانی جەنابی سەفوەتیش نەزری لە خۆگرتبوو؛ بەڵام دڵی هێندە پڕبوو، کە بەڵێ، ئێستا ئەوە دەقسەکانی پێشووی دەگەین- دەفەرموون، ئەوە پێ و قودومەکەشی ئەو لە داردانەی ئەمڕۆ... وارێکەوت هەر ئەو رۆژە دوای نیوەڕۆیە دەگەڵ بابەی چوینە لای ئامۆزا گەورەکەی کە تازە لە دێڕا هاتبۆوە- رەنگە هەربۆیەشیان هێنا بێ پارە و پوولێکی لێ بستێنن، چونکە لاوە لەدار دراوەکە وەرزێر و رەشو رووتی ویبوو، حوسێن سمێڵ، برای لاوە لەدار دراوەکە نۆکەر و چاپەزی ئامۆزای بوو. ئەویش لەوێ بوو، راوەستا بوو، پاڵی وە دیوارییەوە دابوو؛ دەستێکی دەبن پشتێندێ نابوو و وردە وردە فرمێسکی بەردەدانەوە. هەرچەند جارێکی کە خوار دەبۆوە و پیاڵە چای لەبەردەمی دادەناین یا پیاڵەی بەتاڵی لەبەردەمی هەڵدەگرتینەوە تەڕیە یەخەو بەرۆکی نیشانی دەدا کە دەمێکە کوڵی گریانێی نەنیشتۆتەوە و هەرگریاوە. ئامۆزاش زۆر نارەحەت بوو. دەرکەوت کە چۆنیەتی دەستگیرکردنی قاچاغچیش لەراستیدا شاکار و ئازایەتییە ئاسایشان و بەقسەی خەڵکی ئازایەتییە ((دەوڵەت))ی نەبووە. ئەوە ئامۆزا بۆ بابەی باسکرد: ((... دانیشتبووم چام دەخواردەوە...)) نەیویست بڵێ دانیشتبووم و تریاکم دەکێشا کە رووداوی پێکداهاتنێیان دامێ. ((چام دەخواردەوە. سوارێك هات. گوتم بڕۆن بزانن کێیە، هەرچەندە دیاریش بوو- لەبەرئەوەی جلەکانی شین بوون؛ دیاربوو ئاسایشە. گوێمان لە تەقە بوو. پێکداهاتنەکە لەداوێنی کێوەکەی بەرامبەرێ روویدابوو، بەڵام ئێمە بەگوێرەی خدەی خۆمان دەستمان تێوەرنەدا، یانی نەشماندەتوانی دەستی تێوەردەین- چونکە بێ چەك بووین. تازە یەك دوو تفەنگە حوسکەمان شاردبوونەوە ئەگەر بیانهێنینەوە دەرێ تا ئەوانی پێ لەو بگرەو بەردەی رزگارکەین، کە کارەکەیان تەواوبوو ئەو بێشەرم و ئابڕووانە کە هەرگیز نەشیان بووە، چەکەکان بە پاساوی ((بێ مۆڵەت))یەوە دەست بەسەردا دەگرن- جا ئەودەمی وەرە و ببینە!... بەڵێ، ئاسایش ((ئەمنیە)) هات و گوتی کە گروبان فلاَن سلاَوی ناردوون و تکا دەکا کە تەشریف بێنن... ئەلحوکمولیللا. گوتم ئەسپیان زین کرد و سواربووم و دەگەڵ نۆکەرێکیدا چووم. چەند

دەقیقێکانی زیاتر نەخایاند... پێکدا هاتبوون؛ ئاسایشەکان خۆیان دەپەنا بەردان نابوو و هەروەك عادەتی خۆیان تەقەیان بەهەوایدا دەکرد... ئەوجا شەکەرە... ئەو...)) مەبەستی ((عەبدوڵلاّ))ی برای لە دار دراوی حوسێنی بوو. بەلاّم ئامۆزا لەبەر زۆر توڕەییە و نارەحەتیان داخی دڵی خۆشی بەو قسانە دەدایەوە. هەر راست وەك خزمێکی دڵسۆز کە بەتوڕەییەوە لە گوناهەکانی خزمە لە دەست چووەکەیەوە بدوێ.

((گێلە هەر منی دیت لەپشت بەردەکەوە هاتەدەرێ- دەگەڵ ئەوەشدا کە جێیەکەی زۆر قایم و لەباربوو و بەسەر وانیدا دەڕوانی و هیچ پێویست بەوکارەی نەبوو. دەیتوانی هەر لەوێ وەمێنێ. هەرنەبایە تا دەهاتنە لای من و دەستەوداوێنی من دەبوون و تکایان لێدەکردم بچم و دووری خەمەوە.

هەموو کارەکە دەمایەوە سەرئەوەی کە شتەکان بەجێ بێڵێ و بۆ خۆی بڕوا...)) بەڵێ لەپشت بەردییەوە هاتەدەرێ و وەك فڕفڕۆکەی، بەڕاکردن، بەرەو لای منەوە هات. هەر کە دیتم زانیم چ هەڵەیەکی کردووە. ئاوزەنگیم لێدا و بەچوار ناڵە بەرەولای ویم تاودا، و لەکاتێکدا کە هەولّم دەدا ئاسایشەکان نەیبینن هاوارم کرد: ((بڕۆ- بگەڕێوە- بگەڕێوە هەی جاشەکەر- بەرەولای منەوە مەیە!)) بەلاّم بۆ تێدەگەیی! ئیدی رێکەوتەکە وابوو... ئێستا من، وەك ئەوی هەر نەبینم، چوارناڵەکی و تەقڵەکوت دەڕۆم- و جەنابی بەدوامەوە. تادوایی ئەسپەکەم راگرت، و جەنابی تەشریفی هێناو هەردوو دەستی ئەسپەکەی دەئامێزێ وەرێنا، و گوتی: ((ئاغا، منم!)) گوتم: ((جاشەکەری سەگباب، چەندم گوت کوڕە بڕۆ... بۆ هاتی؟)) جەنابی هەمدیس دەیفەرموو: ((ئاغا، منم!)) دەو نێوەیدا جەنابی گروبان شەرەفیش تەشریفی سەگانەیان هێنا، و جەنابیان ((دەستگیر)) فەرموو!.

ناچارگوتم تفەنگەکەی بداتێ- هیچی دی نەدەکرا. ((خان گێڵدی)) بەدەستەوە بوو... بەڵێ ئەوەش شاکارەکەی جەنابی!... دوایەش زۆرم هەولّدا تا هەرچۆنێك بووە رووداوەکە دیزە بە دەرخۆنە بکەم و بەهەر جۆرێك بووە تفەنگەکە ون کەم... بەلّێنی هێندێك پوول و پارەشم بەگروبان شەرەفی دابوو، گوتم فیشەکەکانیش چارە دەکەم، بەلاّم گوتی کە ناتوانێ، لەبەر ئەوەی کە هەموو گوێیان لە تەقەکان بووە؛ سەرەوەش لەناو ئاسایشدا پیاوی خۆیان هەیە، و



نارەحەتمان دەکەن. بەلاّم پێموابێ ئاریشەکە شتێکی دیکەبوو... گروبان لە دەرەجەی دەگەڕا... لەدواییشدا هەر وەریگرت...)).

ئەو شەوە بابە چەند پارچە قوماش و عەترێکی کە لە عێراقیێوەیانڕا هێنابوون- لەسەر داوا و دڵخواز- پێشکەشی ئەقدەس خانم و عەزیزە خانمی کرد- وەکو یەك. میوانداریيەکە وەخێر گەڕا، و تا دەرنگانێك درێژەی کێشا و بەخۆشی و شادییەوە کۆتایی هات.

*　　　*　　　*

## (١٤)

((حوسێن، ئەو پێڵاوانە پاککەوە...)) بابەگیان سەرگەرمی ئیشێیە. گفتوگۆ دەبازاڕیدا گەرمە. ئەبولفەتح خان عەلی شەیتانی هێناوەتە دایەرەی؛ عەلی شەیتان لە چایخانەی باسی لێهاتوویی و جوانی و جحێڵی و ئازایەتییە ((جحێڵە))یەکی کردووە کە تەقەی لە حەزرەتی ئەجەل کردووە. هەرزە کارانێکی کە تا ئەودەمی پێلاوەکانیان بۆیاغیان نەدیتبوو و هەر بۆئەوەی بێن و لە نزیکەوە ببینن دە شاییان بە قوربانی بۆیاغی پێڵاوەکانیان دەکرد و دۆستانەش بەڕووی منەوە پێدەکەنین و زۆر بەڕێزەوە دە بابەگیانیانەوە دەڕوانی. جاری وایە هەروا بەڕێوە گوێم لێیە کە دەڵێن: ((چوار لاوی ئاوا پەیدابن بارودۆخەکە چاك دەبێت)). بەڵام کەس نازانێ بارودۆخەکە چۆنا و چۆن چاك دەبێ، یا بارودۆخی چاك چ جۆرە شتێکە. تەنیا شێوەی چاکی بارودۆخی بەلای ئەوانەوە وەك من تێیدەگەم، ئەوەیە کە ئەبولفەتح خان پارەی ئەو شتانە بدات کە هەڵیان دەگرێ و دەیانبات و مرادسپۆر، کوردە شەلەی ئاوڕشێن پێنەکات، و جەناب سەرهەنگ و سەرۆکی پۆلیسخانە و پەخشدار وەك کوڕی ئەو خەڵکە بەجادەیدا بێنەخوارێ و کاریان بەسەرکەسەوە نەبێت...

ئێمەی منداڵانیش هەروا خەریکی یاری و گەمە و شەیتانییە خۆمان بووین. ئێمەی منداڵان وەك تەڕاش و دار و دەوەنی کێوی هەر لەخۆوە بۆخۆمان دەڕواین و گەورە دەبووین. یارییەکانیشمان ئاوا هەروەك خۆمان سروشتی و خۆڕسك و لەخۆوە بوون، وەك هەموو شتەکانی شاری، ئەوە چەپەرەکان بوون رۆژانە ژنان لە سایە و پەنایاندا جلوبەرگیان دەشوشتن و سەری منداڵەکانیان دەدۆزی و یا جاری وادەبوو بزنە گڕوێیەکی بریندارییان کە لە بزنە گەلێیان گێرابۆوە دەرمان دەکرد. ئێمەی منداڵە وردتکە وەك سەی بەرەڵڵا بە کۆلانان وەربببووین. بەڵام بەپێچەوانەی سەیە بەرەڵڵایان کە لە سێبەرێکی دەگەڕان تا سەریانی بەڕاست و چەپەیدا تێدا بادەن و بە تەقەتەقی شەویلاکەیانەوە خەریکی مێش گرتنێ بن، هەرگیز نەدەسرەوتین و



هەدادانمان نەبوو، لە یەکێکی دەگەڕاین تا ئەوەندە هێز و توانایەی تیماندا ماوە ئەویش بە قوربانی وی کەین و لەم بارەیەوە لە هیچمان کەم نەبوو. لە هەموو شتێکی بێ وەیتر دار تەلەفۆن بوو کە بای تێدەگەڕا و ئێمەش دە دنیای منداڵییە خۆماندا پێمان وابوو ئەوە راسپاردەی جەناب سەرهەنگی دەگەیەننە تارانێ و دەستووراتی تارانێ بە جەناب سەرهەنگی دەگەیەننەوە، و بەردوچکەیەکمان هەڵدەگرتەوە و پێمان لە دارتێلەکان دەدا و کە ((وو-وو))ی دەنگی ناو دارتێلەکان زیاتر دەبوو زۆر راشکاوانە، دەگەڵ تارانێمان قسە دەکردن- پێمان وابوو هەرنەبێ خۆ ئالۆز بلۆزییەکی دە قسەکانی سەرهەنگیدا دروستدەکەین. بەردەکانمان لە دارتێلەکان دەدان و گوێمان پێوە دەنانەوە و شتێکمان دەگوت، و خۆمان واپێشاندەدا، وەك شتێکمان بیستبێ و کتوپڕ دەردەپەڕین و دەستماندەکرد بە درۆیان بۆ یەکتری...

دوایە پێشوازی و بەڕێکردنی تەرمی کوژراوی ئاسایشانیش کە تا سەرقەبران بوو... دەچووین. کاتێ کە مردووە کوژراوەکەیان دەشاردەوە، چەند پیاوێکی ئاسایشی دی کە لەوێ ئامادەبوون بە فەرمانی گروبانەکەیان تەقەیان دەکرد و چەند فیشەکێکیان بە ئاسمانێوە هەڵدەتۆقاند، هەموو پێکەوە- بەرەو ئاسمان. و وێکڕا، بەئاسمانێوە، رایاندەگەیاند کە سەرجوخە سەوزە عەلی قوربان عەلیزادەی کرمانی فرزەندی رەحیم عەلی شەهیدبووە- ئەو گوللانەی بەچەتەو یاخییەکانیانەوە نەنابوون لێرە بە ئاسمانێیاندا هەڵدەتۆقاندن، دەیانگوت بۆیە ئەو تەقانە دەکەن تابڵێن دەوڵەت ناترسێ دەنا راگەیاندنی چی؛ خوا بۆخۆی دەزانێ، خەڵکیش دەزانن و تەنانەت چەتەکانیش...

ئەوجا، پوورەقەوەت بوو، کەلاوێکی دێهاتی بوو، بێچارە و تێماو فێدار. نازناوەکەی ((پوورەقەوەت)) بوو: چونکە بگەیشتبایە هەر ژنێکی دەیگوت: ((پوورە قەوەت)) یانی خوا قەوەتتدا، یا ماندوو نەبی، کەچی ئەو خوایەکەی لە قەوەتەکە لادەبرد. و ئەوەش ببووە هۆی ئەوەی بەو ناوەیەوە بانگ کەن. من تا ئێستاش ناوەڕاستییەکەیم هەر نەزانی؛ پێشم وانییە کەس بزانێ. تەختی دەموچاوی و شێوەی چاوەکانی و پێکەنینەکەی زۆر بە سەیری بەروخسارو چاووپێکەنینی سەرۆکی ئەنجومەنی دەچوو، هەرچەندە دەموچاوی ئەو داچۆڕابوو و پێکەنینەکەشی بەپێچەوانەی پێکەنینی ئەوەوە پاك بێدەرەتانانە بوو، هەروەك منداڵێکی شەرمێون کە گوناهێکی لێ روودەدات و دەیهەوێ بەزەردەخەنێکی دیزە بەدەرخۆنەی بکات.

کەواو پانتۆڵێکی کۆنە لەبەر و ((مێزەر))ێکی رەنگ و رووکاڵبووەوەی دەگەڵ کڵاوێکی چڵکن، کە جارجارە ژنێکی خێرەومەند بۆی دەشوشت لە دەوری سەریەوە پێچابوو- بێ پشتێند پوورە قەوەت بەسەرێکی شۆڕ و سەرنجێکی ئاڵۆز و هەراسانەوە بەرەڵڵای نێو کۆڵان و بازاڕان بوو. جاری وابوو لێوی خوارێی، نازانم بەهۆی چییەوە، نەیدەتوانی مێشکی خۆی و بیری خۆی کۆکاتەوە و لەشتان وردبێتەوە، بۆیە قسەکانی هەموو حەللەق مەللەق بوون و بۆی نەدەچوونەوە سەریەك — کێ دەزانێ، رەنگە هەر بەڕاستی مێشك و بیری بەشتێکی دییەوە خەریك بێ... بەهەرحاڵ جاری وابوو لێوی خوارێی لەدەست خۆی دەردەچوو و پێیڕانەدەگیرا تاڵە لیکاوێکی بەلالێویدا دەهاتەخوارێ، هەر بۆ ئەوەی هەستی پێبکات و بەسەر دەستەکەی پاکی کاتەوە و دەم و لەوسیشی وێك بێنێتەوە. من تا ئێستا بوونەوەرێکی لەم کەساسەم بێوەیتر نەدیوە: کاری بەسەرکەسەوە نەبوو، هیچی لەکەس داوا نەدەکرد. رێی خۆی دیتبۆوە. سروشت بە جۆرێکی وای فێرکردبوو کە دەیتوانی زیاتر پشت بەسۆزی نیوەی دووەمی ژیان ببەستێت؛ و پشت و پەنای وی ئەو پوورانە بوون:

((پوورە قەوەت!)) پوور دەیزانی و تێدەگەیی و بەڕوویەکی خۆشی دایکانەوە کارەکەی بۆ جێبەجێ دەکرد و پارچەنانێ، پاشماوەی خواردنێکی دەدایە، تا دیسانەوە برسی دەبۆوە و دەچۆوە لای پوورێکی دیکەو ((پوورەقەوەت))ێکی دیکە بڵێ.

هیچ کاتێ نەیدەگوت کە برسیەتی و نانی دەوێ. دەیگوت ((پوورە قەوەت)) و ئەوجا چاوەکانی هەڵدەگلۆفین، و دەیگوت: ((خەوم دێ!)) و پوور تێدەگەیی، و دەرمانی ((خەوێ))ی دێنا. تا ئێستا هیچ ژنێکم نەدیتووە بەتوندی دەگەڵێدا بجولێتەوە یا هیچ گومان و ترسێکی لێی بوو بێت. هەموو هەر بەچاوی ئەندامێکی نەخۆشی خانەوادەوە سەیریان دەکرد. جاری وابوو تەنانەت بێ ئەوەی بۆ خۆشی چ دەنگان بکات بانگیان دەکرد و پەرداغە دۆیەك یا پیاڵە شیرێك یا چایەکیان دەدایە، ئەویش هەر بەو روومەتە داچەکیوو زەردەخەنە پاك و شەرمێونییەیەوە و دەگەڵ ئەو دوو دەستەی بن باخەڵیەوە- کە زستان و هاوین هەروا بوو وەك ئەوەی هەمیشە سەرمای بێ- دەهات و ئەوەی بیاندابایە وەریدەگرت و دەیخوارد، بەو کەسەی کە شتەکەشی دەدایە، جا هەر کەسێك بایە و تەمەنی هەرچەندێك بایە، دەیگوت: ((عەمرت درێژبێ)) و هەمدیس هەردوو دەستەکانی وەبن هەنگڵێ دەدانەوە و ساڵدانە ساڵدانە دەکەوتە رێیە. بەلاّم



ئێمەی منداڵ، دوور لەو دنیاو سۆزانە، بێ ئامانج وەدووی دەکەوتین. هەرچەندە بە تاقیکردنەوە ئەوەمان بۆ دەرکەوتبوو کە مرۆڤێکی بێ وەیە و ئێمەش حەزمان بە ئازاردانی نەدەکرد. بەلاّم جاروبارە هەر دەهاتین و وردە بەردێك کەرسەکە گلێکمان هەڵدەگرتەوە و دوور لە مەبەستی پێدادانێی، هەروا دەمانهاویشتێ. پوورە قەوەت دەگەڕایەوە، هەر بەو زەردەخەنەیەوە؛ سەری بەردەدایەوە، هەر راست وەك ئەو بەرخەی کە بیەوێ بەگاڵتەوە قۆچان باوێ- و ئێمە لە تریقەی پێکەنینێمان دەدا، و هەڵدەهاتینەوە، جاری واشبوو هەروا کە بەدوایەوە بووین لەپڕ دەیگرت و نارەتەی لێدەدا، و دەکەوت. ئەوکاتە هەمووومانی لێ کۆ دەبووینەوە و دەورەمان لێدەدا. دەو جۆرە کاتانەدا جینگڵی دەدا، برۆیەکانی تێکدەکردنەوە، رەنگی پێنەدەما، ئەو دەمانەی کە چاوەکانی لە سەریەك دادەنان و نەدەسرەوت دەشگریا. جاری وابوو دەشڕشایەوە و هەر لەوجێیەی کە لێی کەوتبوو و جینگڵی دەداو چاوی لێ لەسەریەك دانابوون و بە دەموچاوێکی گرژەوە، بێ هۆش و بێ ئاگا، ئەو شتانەی دەریدابوون دەیلستەوە، و ئێمەش بەڕوویەکی ترش و تاڵ و بێزارەوە سەیرمان دەکرد و ئەویش هەروا پەلەقاژەی بوو. گەورەکان دەهاتن و قول هووەڵڵایان دەخوێند و بەسەریاندا پف دەکرد: دەیانگوت ئەوە رموزنە سواری بوون و وای لێدەکەن وابکا: داوای لێدەکەن بچێتە سەردینی ئەوان و ببێتە لایەنی ئەوان و ئەویش بەرگریە دەکات! هەر ئەو بەرگریەشیەتی کە ئەوی واهێندە لەلای ئێمە گەورە کردووە... بەسەر و چاوێکی تێك ترشاوەوە دەورمان چۆڵدەکرد و لێی دەکشاینەوە... تورك و فارسەکان دەهاتن بازنەیەکیان بەهەرچوار دەوریدا دەکێشا، تا لەمەچێترانی دیکە، نەیەنە یارمەتیدانی ئەوانەی پێشتر و کارەکە خراپتر نەکەن، ئەگەر هەر ئەوانەی هەوەڵێ بن ئەوە زوو ماندوو دەبن...

ئەوجا ((فەتەشێت))[1] بوو. پیاوێکی بالاّ مام ناوەندی، ئێسك پان، چوارشانە، قەیرە، برۆپڕو موو ماش و برنج، و چاو رەش و گەورە و زیتەڵە و ریش درێژ و دووفاق، لوتێکی گەورە و روومەتێکی دەرپەڕیو. سەرقۆت، پێخواست، هەنگاو ورد و لەسەرخۆ، هەردەتگوت ئەوە سیاسەتمەدارێکە و بە بازاڕیدا دێتەخوارێ: دوایە لەپڕ، بێ هیچ ئاگادارییەك، دەستیدەکرد بەرمبازییەو وەك منداڵێکی سواری دارێکی ببێ ئاوزەنگی لەخۆی دەدا و بەباڵ راوەشاندنێوە و راست وەك لەسەرخانەی زینێ بێ قیت دانیشتووە و قورساییە خۆی هەموو داوەتە پێشێ. کە

[1] فەتەشێت: فەتاحەشێت.

تاوێك دەڕۆیی لەپڕ جڵەوی توند دەكردەوە و هەروەك هیچ نەبووبێ لەبەردەمی دوكانێك یا ماڵێكی رادەوەستا. لەبەردەمی دوكانەكە یا ماڵەكە دادەنیشت، و بە دەنگێكی زۆر نەرم و شلەوە دەیگوت: ((نەخۆشم!)) و داوای چای لە دوكاندارەكە دەكرد، یا بێ گوێدان دەستیدەبرد جگەرەی لەلێوی دوكاندارەكە دەكردەوە و چەند چەسپێكی جانانەی یەك بەدوای یەكی لێدەدا و دوایە دەیدایەوە. كە چایەكەشی دەخواردەوە بەرەنگ و رووی پیاوێكی كە ماندووی حەسابێتەوە پیاڵە بەتاڵەكەی بەسەر روومەتە دەرپەڕیو و ناوچەوان و چەناگەیدا دێنا، و دەگەڵ هەرتێهەڵسوینێكیشیدا دەیگوت: ((وەی! وەی!)) تا پیاڵەكە بەتەواوەتی سارد دەبۆوە. ئەگەر ماڵ بایە كلوكلدانی لە ژنی ماڵەكە داوا دەكرد. زۆر جارانم بیستبوو ژنان دەو جۆرەكاتانەدا دەیانگوت: ((وەی، فەتە چ بووە وا هەمدیس نەخۆش كەوتییەوە!؟ خۆ من هەر دوێنێ بو كلدانم دایتێ، ئەوە نابێ هەموو رۆژێ چاوان بڕێژی، چاوەكانت خراپ دەبن!)) دەگەڵ ئەوانەشدا كلدانیان هەر دەدایە و ((فەتە))ش بەكاوەخۆ قەیتانی كلدانەكەی دەكردەوە و كلچێوكەكەی جارێك لەراستەوە بۆ چەپ و جارێكیش لە چەپەوە بۆ راست دەچاوان دەكێشا، و برۆیەكانی دەستێك پێدا دێنان و رێكی دەخستن. جاری واش هەبوو كەللەیی دەبوو- لە دەست ئێمەی منداڵ كە وەدوای كەوتبووین و بەدزیەوە لەسەری كۆلانێرا چاودێریمان دەكرد و هەر هەڵدەستایەوە بە هوهاوە وەدوای دەكەوتینەوە. جنێوەكانیشی كە دەیدان هەمیشە هەر یەك جۆربوون، و حیسابی: ((هەی پانایی و قولاّییە قوزی دایكت بگێم!)) و ژنان بە روویەكی خەندانەوە چاویان بەردەدانەوە، و دەیانگوت: ((دەك خوا شەرمەزارتكا، فەتە، ئەو قسە قۆڕانە چییە دەیانكەی! ئەوە تەریق نابییەوە!)) و پەنجەی شایەتمانیان بۆ زاری دەبرد و بەدەم پێكەنینێوە چاویان شۆڕدەكردنەوە. جارێكیان یەكێك لە دایكەكان گوتی: ((دەك رووت رەشبێ، فەتە؛ خۆ ئەوە منداڵی منە!)) فەتە بێ ئەوەی خۆی تێكدا دە سەروچاوی ژنەیەوە روانی. گوتی: ((چاك راوەستە بابتبینم...)) تاوێكی بەچاوی رەزامەندییەوە تێهەڵڕوانی، دوایە گوتی: ((نا، با لە بەینی خۆماندا بێ، گۆشتت دەخورێ!)) و دایكان هەموو لە پڕمەی پێكەنینێیاندا- دیاربوو قسەكەی پێ خراپ نەبوو، قسە یا لە شێت یا لە منداڵ. عەسران كاتی چای عەسرێ دەگەییە هەرماڵێكی دەچووە ژوورێ، یەكسەر هەڵدەكشایە سەری سەرێ و داوای چای دەكرد، ئەڵبەتە هەمیشە ئەوەشی دەبەرچاو دەگرت كە پیاوی ماڵێ لەماڵ بایە. دادەنیشت؛ چای دەخواردەوە و دەربارەی ئەوكارانە دەدوا كە دەبەرچاوی خۆی گرتبوون بیانكا. دەیگوت ئەگەر



وەستا ساڵحی تەنەكەچی یارمەتی بدات نیازی وایە بن ساپیتەی شاری هەموو تەختە بەندكات تا زستانێ كووچە و كۆلانی شاری نەبێتە قوڕ و قوڕاو و لیتاو، چونكە بە قوڕ و چڵپاوێ دڵی دەگیرێ. هەموو مەبەستەكەشی ئەوەبوو كە سەرمای دەبێ. كێوی ئاربابـاش زۆر لە شاری وەدوور كەوتۆتەوە، دەبێ تەنافێكی دە سەری هەردوو لوتكەكان خرێ و بە یارمەتییە رەحیم لەندەهۆر و حەسەنە بۆقی تۆزێكی بێننەوە پێشێ. رەحیم لەندەهۆر شوانێكی كەتەی ملەستوور بوو، و بۆ ئەو كارانەی دەست دەدا. بەلاّم حەسەنە بۆق چی، پیاوێكی كورتە بنەی قوتە كە هەرگیز بۆ ئەو جۆرەكارانە نەدەبوو! ((ئەوە رەحیم لەندەهۆر شتێكە، ئەدی حەسەنە بۆق چییە؟)).

فەتە زیرەكانە خۆی دەنواند و دەیگوت: ((ها! كە تەنافەكەم بە لوتكەكانی ئاربابـاوە بەست، لە ناوەڕاستێڕا گرێی دەدەم؛ زۆرباشە كە گرێیەكەم لێدا سەری تەنافەكەی دەدەمە دەست رەحیم لەندەهۆری و دەڵێم رایكێشە! هەر كە تێینوسا بە حەسەنە بۆقی دەڵێم خۆی هەڵدا و ((لووت))ی بگەزێ و هەردوو گوێیەكانیشی راكێشێ)).

خاوەن ماڵ پێدەكەنی و دەیگوت: ((ئێ، ئێستا تێگەیشتم!)).

فەتە دەیگوت: ((نا، تێنەگەیشتووی... دەڵێم گوێیەكانی توند راكێشە. تا رەحیم لەندەهۆر لەبەر ئازارێ تەنافەكەی چاكتر راكێشێ، ئەودەمی منیش خۆ هەڵدەدەم لاقێكی حەسەنە بۆقی دەگرم و رایدەكێشم... ئێستا تێگەیشتی؟)). خاوەن ماڵ تێدەگەیی و ستایشی ئەو پرۆژەیەی فەتەی دەكرد كە هیچی وای لە پرۆژەكانی لەمەڕخۆمان كەمتر نەبوو و زۆریشیان وێدەچوو.

فەتە بەدوای قسەكانیدا دەیگوت: ((ئەودەمی هەر نەبێ خۆ بەلانی كەمەوە خەڵكەكە ژەمە ترێیەكی تێر بەزگی خۆیان دەخۆن!))- ئاربابا هەمووی هەر رەزە ترێ بوو.

ئەگەر وەرزی ترێی بایە و ترێیان لەماڵێ هەبایە ئەوە دەیانهێنا و دەیاندایە. هەر كە فەتە ترێیەكەی دەدیت دەستێكی دێناو بە بەرچاوییەوە دەیكردە سێبەر و بەسەرسامییەوە دە ئاربابای رادەما و دەیگوت: ((سەیرە! خۆ ئەو ناقۆلاّیە لەپێش مندا وەخۆكەوتووە! دیارە كێوەكە هاتۆتەوە پێشێ- تف لەو ناوچەوان و بەخت و ئیقباڵەی كە من هەمە!... دەی، باشە، عەیبی نییە، ئیدی تێپەڕی... بەڵێ، ئەوەم دەگوت: ((ئەگەر یارمەتیم بدەن دۆخینێكی

شەرواڵیش بۆ خۆم دەکرم... نەك لەو دۆخینە خوریانە)) دۆخینەکەی خۆی دەردێنا و پێشانی دەدا: ((بەڵکە لەو دۆخینە فتیلەییانە...)) و ئەوجا لەپڕ راست دەبۆوە و چوارناڵی غارێکی بەدەوری ژوورێدا دەکرد و هەر بەچوار ناڵییەوە دەردەپەڕیە دەرێ، بەباڵ راوەشاندنێوە کە شەویلاکەی خوارێی وەك ئەسپی ماندوو کە سوارەکەی بە قامچیانی وەرگەڕاوەتێ شۆڕ دەکردەوە و-تا دەم چۆمی- دەڕۆیی. ئەوە هێڵی کۆتایی بوو. کە دەگەیشتە وێندەرێ رادەوەستا؛ خۆی خواردەکردەوە و یەك دوو مشتە ئاوی دەخواردنەوە.

((ئەحمەد شا)) ئەوە یەکێکی دیکەیان بوو، کە بەدبەختی و چارە رەشییەکەی نەك هەر بۆ ئێمەی منداڵان بەڵکە بۆ تەواوی خەڵکی کووچە و کۆڵان و بازاڕی شاری مایەی خۆشی و سەیر و سەفا و رابواردنێ بوو.

گوایە ناوی راستەقینەی خۆی وەستا حەسەن بووە- بەقسەی خەڵکی خەلیفە حەسەن- بەرگدروو بووە و یەکجار زۆر بەرێزبووە. ئێستاش خەڵکی یادی ئەو رۆژانەی ئەویان هەر لەبیرماوە کە ئەورۆ پێیدەڵێن ((خەلیفە)). بەڵام ئەم یاد و بیرەوەرییانە و پەیوەندییان بەرابوردووەوە لەراستیدا زگ پێ سوتانی حاڵی ئەورۆی ئەویان دەچەندانی دیکە زیاتر دەکرد... دەیانگوت خەلیفە حەسەن حەزی لەکچێك کردووە و شێت و شەیدای بووە و کچەش هەروەتر دەگەڵێدا بووە بەڵام خوازبێنی بۆ پەیدابووە و شووی پێکردووە و پێش ئەوەی پێکیش بگەن دەزگیرانەکەی جوانە مەرگ بووە و لەسەرەنجامی ئەو هەژان و داچڵەکینەیدا ئاوای لێهاتووە و رۆژی بەم رۆژە گەیشتووە. سەرچاوەی ئەو قسە و قسەلۆکانەش هەمووی شەوگەڕییە حەلیفە حەسەنی بوو بۆ سەردانی گۆڕی جوانەمەرگان و گەڕانی بەناو گۆڕستاناندا. بەڵام کەس بەراستی نەیدەزانی وایە یان نا، هەرچی هەبوو هەر قسە و قسەلۆکی سەر زاران بوو.

خەلیفە حەسەن هەمیشە زەردەخەنەیەکی بەلالێویەوە دیاربوو، وەك لە هەموو ژیانیدا غەم و ئارەزووی هیچ شتێکی نەبێ، و دنیا بەکامێویە و خەڵکی دنیایان بە ئارەزوو و حەزی وی دروستکردووە: هەموو دەمێ رووخۆش بوو و دەتریقایەوە: لە چایخانان دادەنیشت، گوڵی دەبیستن و گوڵی دەگوتن و خەندەی وەردەگرتنەوە. بەڵام کاتێ کە بە کووچە و کۆڵان و بازاڕیدا دەهات و دەچوو بە روخسارێکی غەماوییەوە پارێزی لەسەرنجی چاوی خەڵکی دەکرد و بەشێوەیەك بوو کە گوایە نەهیچ دەبیسێ و نەهیچیش دەبینێت، ئەگەرچی هەندێ جار بەرقەوە



یا هەروا ئاوڕێکی دواوەی دەدایەوە و بەگوێرەی پێویست برۆیەکانی تێك دەنان، یا زەردەیەکی دەهاتێ و دەڕۆیی. ناوی گراوییە مردووەکەی ((گوڵێ)) بوو. سەرنجە رقاوییەکانی ئەو دەمانە بوون کە منداڵێك یا هەر هەموومان پێکەوە ناوی ((گوڵێ))مان بەزاریدا دەهات. بەداخەوە هەروەك دەڵێن و ئێستا تێیدەگەم تەنیا دەزگا بچووکەکانن کە بەخێرایی گەورە دەبن و پێدەگەن و مێشك نەبێ کە لەو ئەندام و دەزگایانە بەدەرە. هەربۆیە وا بێ مەبەست و بێ بیرو لێکدانەوە ئەو کەسانەمان ئازار دەدان.

دەو کاتانەدا خوێن دەزایە دەموچاوییەوە، چاوی زەق دەبوونەوە، برۆیەکانی دەهاتنەوە یەك، و ماوەیەك رەنگی دەگۆڕا. ئەوەدەمی تەزبێحەکەی لەبەر پشتێندێ دەردێنا، و لێوی دەبزاوتن. دیار نەبوو چ دەڵێ؛ لەبن لێوانەوە شتێکی دەگەڵە خۆیدا دەگوت و تەزبێحەکەی بادەدا. کە ئێمە ئەوەمان بە دوعاکردن دادەنا. بەڵام دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، بەگرژییەوە، راست و رەوان دەڕۆیی، هەروەك بازرگانێکی بەوەج سوود و زیانەکانی دەمێشکی خۆیدا تاوتوو بکات یا وەك سەرفەرماندەیەکی وا بیر لە نەخشە سەربازییەکانی بکاتەوە کە داپڕشتوون.

هەر لە هەوەڵێوە کە وازی لە کارەکەی هێنا ناوی لەخۆی نا ((ئەحمەد شا))؛ بۆ ئەو ناوەی لەخۆی نا، ئەوە دیارنییە، خەڵکیش وردە وردە بەو ناوەیەوە راهاتن و دەگەڵێدا رۆیشتن. کەسێك نەیپرسی ئەرێ بۆچی و لەبەرچی- پێویستیشی نەدەکرد: ئەوە لە لایەنی خۆیەوە کۆتایی هاتبوو و چ زیانێکیشی بۆ خەڵکی نەبوو. بۆ ئەوانەی خۆشیان بە فەیلەسووف و ئەدیب و پێشەوا و زەعیم دەزانن نیو هێندەی ئەویان تێدەبێ؟ ئەحمەد شا یا ناسیرەدین شا چ کاریگەریەکیان بەسەر ژیانی خەڵکییەوە هەیە کە بیانەوێ بزانن هەیە یان نییە یا ئەگەر کاریگەریان هەیە بۆ بە تەنیا لەم ناوەدا هەر ئەحمەد شا؟

عەرەبانچییەکی تورك لە گەڕەکێ بوو گەچی بۆ ((ساختمان))ێ ((سەربازخانە))ی دەبرد. هەموو هەوڵی ئەحمەد شا پەیداکردنی پێنج شایی پوڵ بوو. ئەوەدەمی سکەی پێنج شایی یا بیست و پێنج پەناباتی لێدرابوو. هەرکە وردەکەی دەبووە پێنج شایی دەچوو دەیکردە پێنج شاییەکی خڕ و لەسەررێی ((ساختمان))ەکەی رادەوەستا تا عەرەبانچییەکە دەگەڕایەوە بێ هیچ دەنگ و بەنگێك پێنج شاییەکەی دە دەستیدەکرد و دەڕۆیی (هیچ کاتێ پارەی وردەی نەدەدایە) و دیارە ئەوەش نرخێك بوو بۆخۆی دیاریی کردبوو. جارێکیان بابەگیان لەم بارەیەوە

گلەیی لە عەرەبانچییەکە کردبوو کە بۆچی ئەو پارەیە لەو بێچارەیە وەردەگرێ. بەڵام عەرەبانچییەکە دەڵێ کە هەرگیز بەخۆڕایی سوار نابێ، دەنا ئەو هیچ ناڵێ ((ئەحمەد شا)) پارەی دەدا و سوار دەبوو و عارەبانە لەوسەری شارییەوە دەچووە ئەو سەری شاری. مەبەستەکەش هەمیشە پەخشداری بوو لەوپەڕی شاری لەسەر بستووی گومرگێ. ئەحمەد شا وەکو پاشایان دەناو عارەبانەکەیدا بەپێوە رادەوەستا؛ دەستی وەك بۆ سەلامێ بەرزدەکردەوە، گرێی داویشتنە نێوچەوانێوە و هەروەك سوڵتانێکی کە بەناو حەشیمەتێکیدا رابرێ بەردەوام سەری بەلای راست و چەپاندا دەگێڕاو بەزەردەخەنەوە هەستی خۆی بەرامبەر بەو حەشیمەتە دەردەبڕی کە لە مێشکی خۆیدا پێیوابوو هوڕای بۆ دەکێشن و ئەویش وەڵامیان دەداتەوە. دوایە تێگەیشتم ئەو ئەحمەد شایانە چەند زۆرن کە لەناو گالیسکە و ئوتومبێلاندا دادەنیشن یا بەپێی پیادە بەدڵنیاییەوە بەرێیەدا دەڕۆن و دەمێشکی خۆیاندا و لە وەڵامی هەست و نەستی ئەوجانەوەرە ساختە و پۆشتەو پەرداخانەدا دەست رادەوەشێنن و بەڕوویانەوە پێدەکەنن یا برۆیان تێك دەنێن!.

ئەڵبەتە نەك هەر من بەڵکە هیچ کەسێك نەیدەزانی چی بەمێشکیدا دێت و دەچێ- لەوانەیە هەر ئەو شتانەی پێدا بێت و بچێت کە دەمێشکی هەر هەموو شاو بەرپرس و رابەراندا دێت و دەچێت... ((ئەحمەد شا)) هەروا دەست بەهەواوە دەڕۆیی. دەستەکەی دیکەشی بۆ ((مێزەر))ەکەی دەبرد و کلاو یا تاجە خەیاڵییەکەی دێنایە سەر برۆی و بە لاتیلاکی سەریەوە دەنا. لەو دەنکە ئارەقانەی کە لەنێوچەوانیەوە هەڵدەقوڵا دیاربوو کە ئاریشەکەی زۆر بەڕاستی و راشکاوانەیە. خەڵکی لەسەر دوکان و کۆڵانەکانەوە پێدەکەنین و جارجارەش مەتەڵەکێکیان داویشتن، ئێمەی منداڵانیش لە پاش و پێشەوە عەرەبانەکەمان دەنێوەخۆ دەگرت و بەدەم رێوە دەمانکردە قەڵەبالغی، بەڵام ئەو هەرگیز گوێی لە هات و باتی کەسەوە نەبوو- ئەو دە هەوای خۆیدا بوو: دەستی بڵند کردبوو و چەناگەی داچۆڕاندبوو و بەرغەبابەی فوودابوو. سەرنجەکانی ورد و بەڵام ئاڵۆز بوون؛ شانە چکۆڵەکانی زیاتر داکەوتبوون، وەك قورسایی هەرچی باری ژیانە لەسەر شانەکانی هەستبکات، بە ئاگا لەوەش، کە ئەو بارەی، بەهەر حاڵێك بووە، تا ئێرە هێناوە. بەڵام ئەوەشی پێوە دیاربوو کە پشتی لەژێر ئەم بارەگرانەدا دوولاهاتۆتەوە. دەڕۆیی. تا دەگەیشتە نیوەی رێیە. لێرەدا کتوپڕ وەقسە دەهات، بێ ئەوەی رووی دەمی قسەکانی لە کەسێکی تایبەتی بێ، یا گۆڕانێکی بەسەر راوەستانەکەی خۆیدا بێت، هەروا کە دەستی بەلای



لاجانگێوە بوو رووداوە نهێنییە شاردراوەکانی شاری بەدەنگێکی بەرز و بڵند و نێرانەوە، وەك دەگەڵ خاوەن پلە و پایە و بەرپرسانی بێت، ئاشکرا هەڵیدەڕشتن: ((خەڵکینە! رۆژی شەموو سەروان زەهری دەگەڵ ژنێ فەرماندەی کە لە ماڵێ نابێ، گەمە و گاڵتەی دایە مەمدە بەگورگییان پێکەوە کردووە و هەر لە هەوارا گورگەی قوزتۆتەوە... دەموقەپۆزی گورگەش رەش بوون- هەواڵێکیشمان پێگەیشتووە ئاوا دەڵێ رۆژی دووشەموو کە ستوان ناهیدی لەسەربازخانەی ئێشکگربووە، سەرفەرماندە چووە بووکە شووشەیەکی بەرتیل داوەتێ- خەفیەکان رایانگەیاندووینێ. ژنێ سەرەك نەزمییەش چۆتە ماڵێ سەرۆکی دارایی، گوایە لەوێ حیکایەتی ئەمیر ئەرسەلانیان خوێندۆتەوە... ژنێ گروبان ناسریش بۆ خەنەبەندانێ چۆتە ماڵێ رەییسی- مەئمورانی تایبەتیش دەفەرموون. سەفوەتیی ژن خوشکەکەی خۆی بۆ ئەمیری لەشکر بردووە کفتەی قولقولێ بۆ لێنێ- ئەمەیان سەرۆکی تایبەتی قەراوڵخانەی رایگەیاندووە...)) هەموو رووداوەکانی ناوشاری دەگوتن و خەڵکیش بەتاسەوە گوێیان دەدایە و بەزەردەخەنە و لاقرتێوە بەرێیان دەکرد و سەیرەکەش لەوەیدا بوو ئەو شتانەی ئەو دەیگوتن زۆربەیان راستبوون. چۆن و لە کوێڕا ئەو زانیاریانە وەدەست هێنابوون، ئەوە لەخۆی بەولاوە کە بەردەوام دەکۆڵانَاندا دەسوڕایەوە کەس نەیدەزانی و کەسیش پێی وانەبوو کە دەتوانێ تەواوی ئەو هەموو وردەکارییانە بە ناو و رۆژ و بەروارەوە ئاوا دەمێشکی خۆیدا بپارێزێ. ((ئەحمەد شا)) بۆ ئەوەی ئەو سەربەستی و ئازادییەی ئاوا دەستکەوێ چەندین جارانی لە پۆلیسخانەی شەو رۆژ کردۆتەوە تێهەڵدانی بەدوادا خواردووە. تا سەرەنجام بۆیان دەرکەوتووە شێتە. هیچ کاتێ، لە شوێنی هەڕەمەکیدا ئەو جۆرە وشانەی بەزمانیدا نەدەهات، ئەگەر کەسێك بیگوتبایە و وەبیری هێنابایەوە، ئەوە دیسانەوە هەر خۆی لێ گێل دەکرد و وای پێشاندەدا کە ئاگای لە هیچ نییە- لە دۆستایەتییەدا زۆر سەر راستبوو، و هەربۆیەش روویەکی خۆشەویستی شارە بچکۆلانەکەی ئێمە بوو. لەراستیدا جۆرێك لە ((بیروڕای گشتی)) یا زمان حاڵی خەڵکی بوو، هەربۆیەش بوو هەمیشە ئاهەنگ و بەزم و رەزم و پێنج شاییەکەی ئامادەبوو. بەڵام سەیرەکەی لەوەدا بوو کە هیچی لەبارەی خەڵکی شارەکەوە نەدەگوت و لەنێو وانیشدا بە بەرێوەبەری گشتی پەروەردەشی هەر هیچ نەدەگوت. رۆژێك عارەبانەکە بە بەردەمی بەرێوەبەری گشتی پەروەردەدا رەتبوو؛ ئەحمەد شا هەروا بەدەستی سەلامێوە، دە ئاماژەیەکی بە بەرێوەبەریدا، رووی قسانی دە حەشیمەتەکەی ناو مێشکی خۆی کردەوە و گوتی: ((تا ئێستا لە بارەی وانەوە

چ هەواڵێکی نالەبار نەگەیوە، نابێ بشگات؛ ئێمە پێمان وایە کە هەر نەگات، پەروەردە و فێرکردن (فەرهەنگ) جێی کاری نابەجێ و نالەبار نییە. ڕەزامەندی تەواوی ئێمە بە هەموو کارمەند و فەرمانبەرەکان بگەیەنە؛ وەبیر سلێمانیش بێنەوە کە ڕاپۆرتی نالەباری دەربارەوە دێت- با دەست لە ملهوڕییە هەڵگرێ، دەنا بە جوققەی هومایونییە قەسەم هەڵیدەگرێتەوە!)).

هەر کە ڕێ و ڕەسمی ڕەژە و تێپەڕینی مەوکیبی هومایونی تەواو دەبوو و دەگەیشتە پەخشدارییە بێ ئەوەی عارەبانچی هیچ بڵێ یا داوای دابەزینێی لێبکا دەهاتە خوارێ و دەهاتەوە سەرخۆ و دەچۆوە کەوڵەکەی جارانی، بە پێخواستی و بە شانە داتەکیوەکانیەوە دەکەوتەوە ڕێیە، هەروەك نە ئەحمەد شایەك هاتبێ و نە ئەحمەد شایەك ڕۆیشتبێ! و دەوکاتەیدا یەکێکی وەك بلێی حاجی حوسێن بەزازێك بانگی دەکرد ((هۆی، ئەحمەد شا)) و ئەحمەد شا زۆر خاکەڕایانە، بەغار، دەچوو ((وەرە ئەو گۆشتەی بەرەوە ماڵێ مە، بڵێ حاجی ناردوویەتییەوە... ڕاکە، ئافەرین)) و پرێسکە گۆشتەی دەدایە دەستێ و هەقی ڕێیەشی دە مستی دەنا و ئەحمەد شا هەر بە غار دەڕۆیی.

ئەو کۆمەڵە شێتە زۆربەی شەوان دەتوونی حەمامەکەی میرزا عەبدوڵڵایدا دەنوستن بۆیە بەلای خەڵکییەوە پەیوەندی ئەوانە ڕاستەوخۆ دەگەڵ کۆمەڵی لەمەچێتران —یا پێشەوای وان- بوو.

مەش ڕوحوڵڵاش هەبوو —تورك بوو، هێندێکی شەکرۆکە لەسەر سینییەکی لەبەر دوکانێ دانابوو و هەر بەوەندەشەوە ناوی لە دوکانەکەی نابوو قەننادی (شیرنەمەنی). هیچ دەمێکی لەبەر دوکانێ نەبوو- بەقسەی خۆی لە ((کرخانا)) ((کارخانە))ی بوو. کرخانەکەشی هەر پشت دوکانەکەی خۆی بوو کە لەوێ نوکوڵی دروستدەکرد، یا هەوڵی دەدا بێ وەستایی و بێ زانین نوکوڵ دروستبکات. چەند هەنگاوێك لەولای دوکانەکەیەوە بۆنی شەکری کولاوە دەهات. دەیانگوت — لە کوێ، ئەوەش هەر دیار نەبوو و پێم وانییە کەسیش زانیبێتی — دەیانگوت بە منداڵی بە مشتە کشمیشێکیان لە خشتە بردووە، پیاوێکی مرچ و مۆن بوو، خاوەن دەموچاوێکی ڕەقەڵە، بەڵام پڕ چرچ و لۆچ و سیسەڵە، هەروەك توێکڵە هەناری وشکەڵاتوو، دووچاوی بەقوڵداچوو، و سەرنجێکی پڕ لە چاوچنۆکی و دوو لولاکی چەماوە. کلاوەکەشی کە بەشێك بوو لە خودی کەسایەتییەکەی- تا، کەپی، بوو، کەپی بوو، دوایەش کلاوشاپۆ یا بەقسەی خۆی، شاپکا. من هیچ کاتێ ئەوم بەسەری قۆتەوە نەدیوە کەواو سەڵتەیەکی درێژی



دەبەر دەکرد و بەدارە دارەوە بەلاڕێیاندا دەڕۆیی. هەر کە کافی (ك) ((کشمیشی)) دەبیست دەبووە فیشەکە شێتە. گەورەکان دەیانناردە لای ڕوحوڵڵای تا چارەکە کشمیشێکیان بۆ بکڕێ؛ جاری وابوو بۆ خۆیان دەچوون. دەچوون و زۆر بەڕاشکاوییەوە دەیانگوت: ((مەش ڕوحوڵڵا، شیرینی چ هەیە، مەش ڕوحوڵڵا دەیگوت: ((ئاوی نەبات، نەوگوڵ، شیرنەنان، ڕاحەتەلگو...)).

((گەزۆت نییە؟)).

((نا، گەزۆی نییە...)).

((ئەدی بادامی برژاو؟)).

((نا، نیەتی)).

((ئەدی کشمیش؟)).

ئا لێرەدا مەش ڕوحوڵڵا شێت دەبوو، و بەربینگی بە کابرای داواکار دەگرت- بەڵام شتێکی وانەبوو کە قانون بیگرێ تاشکایەتی پێبکرێ؛ بۆیە زۆرجاران شەڕ و هەرایەکە نوێ دەبۆوە، جاری وادەبوو دەگەیشتە مریشکە ڕەشەی. بەڵام زیاتر دەر و دراوسێ دەکەوتنە نێوانێوە و مەش ڕوحوڵڵا بەباڵ ڕاوەشاندنێوە دەچۆوە ((کرخانا))کەی.

ئێمەی منداڵانیش لە دەرێوە لوتمان بە شوشەی جامخانەی دوکانەکەیەوە دەنوساند و بەچاوی پڕ لە شەیتانی و بەپێکەنینەوە کلکیمان دەگرت: ((کیشمیش وار))[٢] و تا ئەو وەك مراوییە بە باڵ ڕاوەشاندنێوە دەگەیشتێ ئێمە بۆی دەردەچووین.

ئەوجا ((داودە کەرخۆر)) ئەوە جوولەکە بوو، پیرەمێردێکی ڕیش درێژ و چەرمگ، بالا مام ناوەندی و قەڵەو و وورگن، دەموچاو پانێکی ڕەقەڵە و زۆر بێڕەنگ، و مل و گەردەنێکی زۆر کورت و چرچ و لۆچاوی و زەردەکەوا و سەڵتەیەکی درێژی جوولەکانەی سووکی دەبەردەکرد، کە لۆکەکەی شی ببۆوە و ڕیشاڵە لۆکە لە تەواوی کون و کەلێن و کەلەبەرەکانیەوە هاتبوونە دەرێ. هۆی ناوبانگییەکەشی بە ((کەرخۆر)) لە ساڵی گرانییە قات و قڕی دەبێ، کە دەگێڕنەوە و گوتوویانە دەوساڵێدا لە برسان گۆشتی کەرێی خواردووە.

---

[٢] کیشمیش وار: کیشمیش هەیە؟

له گەڕەکێ جوولەکان لە پەنا دیواری لەبەر بەربەڕۆچکەی دادەنیشت و ((راوەکویر))انەی دەکرد —شتێکی وەك کویر فڕینێیە لە مەشقی فرۆکەوانانەدا: نادیدەخۆی دەدۆزی، لەبەرئەوەی چاوەکانی، بەقسەی خەڵکی مە، کەم حوکم ببوون. بەڵام نێچیر بە ئەندازەیەك بوون کە بێ سەیرکردن و تێنۆڕینێ راوچی بەدەستی پڕەوە دەهاتەوە، لە پەنا دیوارییەوە چوار مەشقی دادەنیشت هەروا کە لەبەر هەتاوێ پرتە پرتی چاوی بوو دەمیشی هەروا داچەقابوو، بەهۆی سەرە پەنجەکانیەوە کە نەخشی مین هەڵگرەوەیان دەدیت ((مین))ەکانی یەکەیەکە و چەند چەندانە لە کون و کەلێن و درزەکانەوە دێنانە دەرێ، و دەیفلێقاندنەوە- جا چەند بەرق و خۆشییەوە! هەروەك پەیوەندییەکی هاوخوێنی لەنێواندا هەر نەبووبێ. دەگەڵ ئەوەشدا کە نەیدەدیت جارجارە سەرنجێکی چاوە لێڵ و پێڵەکانی دەکەمینگای ئێمەی نارەسەن دەگرت... جاری وابوو وەك کەری گڕوێ پشتێکی بە دیواریدا دێنا. خۆشییەکەی ئێمەش ئەوەبوو کە وردە وردە لێی نزیك ببینەوە و دەحاڵێکیدا کە هەناسەمان لەخۆ بڕیوە بچین سێبەرێی لێبکەین. هەر سێبەری گەیبایە ئەوتێکدەچوو؛ دەستێکی بەڕاست و بەچەپەیدا درێژ دەکرد و بازنەیەکی بەدرێژایی هەردوو باڵی، بە دەوری خۆیدا دەکێشا؛ و دەکەوتە گەڕان بەدوای شوێنی هەتاوەکە و تێپەڕینی پەڵەهەورێکدا کە بەلای ئەوەوە ئەو پارچە هەورە بەری رۆژێی لێگرتووە، سەری بەرەو ئاسمان بێرەوبەوێدا دەگێڕا، و ئێمەش راست دەگەڵ جوولە و بزووتنێ وی خۆمان بەراستە و چەپە و پاش و پێشاندا دەجوولاند. منداڵانی دی لە دوورەوە خۆیان لێ خێل و خوار دەکردین و شتی سەیریان دەکرد، تا دەگەیشتە ئەوەی کتوپڕ تریقەی پێکەنینی یەکێ یا ئەوەی کە بە خۆجولاندنێ سێبەرەکەی جولاندبوو فێڵەکەی ئاشکرا دەکرد. بە پێکەنین و هوها کێشانەوە، دوور دەکەوتینەوە، لە کاتێکدا کە داود گورجێکی بەدەوری خۆیدا دەسووڕایەوە و بە تووڕەییەکی جوولەکانەی بێ دەسەڵاتانەوە لە بەردوچکەیەك یا شتێکی وا دەگەڕا بە ئێمەی دادا و دەستیشی رادەوەشاندن و جنێوی دەدان. بەڵام ئێمە چ ترسێکمان نەبوو. لەبەر ئەوەی کە جوو بوو. جاری وابوو لە پەنا دیواری خەو دەیبردەوە؛ دەو جۆرەکاتانەشدا دیسانەوە لەسەرخۆ لێی نزیك دەبووینەوە خۆڵمان دەزاری کە هەمیشە داچەقابوو یا لە گوێیە پڕ لە مووە سپییەکانی دەکرد، و هەڵدەهاتین، و سەیرەکەش لەوەدابوو کە دەگەڵ ئەو هەموو گەمەو گاڵتە پێکردنەیماندا هەر پێشمان دەگوت- مام داود، بەلابردنی (کەرخۆر)ەکە.



هەندێ کات سەرمان بە ماڵاندا دەگرت: زیاتر بەماڵە پیرێژنە تەنیاکاندا. یەك دوو جارانیشمان سەر بە ماڵێ پوورە خاتونێدا کە جلوبەرگی پیاوانەی دەبەردەکرد داگرتبوو. ژنێکی رەشتاڵە بوو، ئێسك پان، دەموچاوێکی هێلکەیی، بەڵام گۆشتن، تاو بردوو و رەش داگەڕاو، خاڵێك بە چەناگەوە، کە موویەکی رەش راست لەناوەندی ئەو خاڵەیەوە روابوو، مێردەکەی دوو سێ ساڵ لەمەوبەر مردبوو و ئەو دەگەڵ کڵاو رۆژنەیەکی تێدابوو کە لە گەڕەکێ پێیان دەگوت پەنجەرە. دەرکەی ماڵێ لەسەر حەسارێکی بوو کە چوار پێنج ماڵی دیکەشی تێدابوون و وەك زۆرینەی خانووەکانی شاری بە شڕە چەپەرێکی لە کۆڵانێ جودا دەبۆوە. پوورە خاتوون پیاوی سەردەمی خۆی بوو. هەر کە مێردەکەی مرد (هەروەك دەگێڕنەوە و حاڵ و باڵی ئێستاشی گەواهی ئەوەی دەدەن) دووکەری کڕین و هات جلوبەرگی پیاوانەی دەبەرکرد و دەستیکرد بە بارەدار هێنانێ...

هەروەك ((کەرداران)) پێڵاوی لاستیکی بن تەختی لەپێکرد، پووزەوانەی دەبەست، پرچەکانی خڕ دەکردنەوە و دەبن کڵاوێی دەنانەوە و مێزەری لەسەر دەپێچان. بەو پشتێندەی پشتی و ئەوجلانەی کە لەبەری دەکردن و بەو دەموچاوە تاو بردووە گرژەیەوە و بەو نەقیزەی کە بەدەستیەوە دەگرێ و ئەو ((هەچەچە))یەوەی کە هەمیشە دەیڵێ، کەس نازانێ کە هەر ژنیشە. بەپێچەوانەی کەردارەکانەوە ئەو شەوێ لە دەشتێ نەدەمایەوە. لەکێویڕا هێندێکی گیا بۆ کەر و مەڕو بزنەکانی کە هەیبوون دەدروو و دەیکردە سەربار و دەگەڵە خۆیدا بۆی دێنانەوە. بەیانی، دەگەڵ بولێڵێ، لەپێشدا سەری لە پەزەکان دەدا؛ دەیان نێرێتە دەشتێ، دوایە بەرەو کێوی بۆ داران وەڕێ دەکەوت. بەرەبەری نیوەڕۆیە دەگەیشتەوە شاری. پێنج شایی باجی بارانەی هەر لە دەرکێ دەروازەیڕا دەدا و پسوولەی وەردەگرت. نازانێ بۆ لێی دەستێنن، بەڵام دەیزانی کە دەوڵەت لێیدەستێنێ؛ هەر دەوڵەتە، هەمیشە دەستێنێ، هیچ کاتێکیش نادات، و دەشزانێ کە دەبێ بدات، و جنێوەکانیشی هەربدات، ئێستا دەوڵەت یا دەبیسێ یا نابیسێ...

پوورە خاتوون بارە دارەکانی دەفرۆشێت- هەر لە زووەوە فرۆشتوویەتی- و بە هەشتاوی بەخۆ و نان و پەنیر و شووتی یا ترێ یا هەرچییەکی کە رووناك پێی راسپاردبایە دەهاتەوە ماڵێ. کە لەوێ نابێ کچە بچکۆلەکەی لای خەجیجێ هاوسێیان بە جێدێڵێ کە چاوێکیشی نییە، چ کچێکی دڵسۆز و میهرەبان! هەمیشە گۆرەوییان دەچنێ؛ چاوەکەشی هەر بە میلی چنینی کچە دراوسێیەکەیان کوێربووە.

دەچین و لە پەنجەرەیڕا سەیری پووره خاتوون و کچەکەی دەکەین. دیاره کە دایکەکە لە ماندوویەتییان ئاگای لەخۆی نییە، حەسیرە شڕێکی راخستووە و لاجەوالێکی لوول داوەو سەری پێکردووە و نوستووە- کەلێنۆکەکیشی بۆ کچەکەی هێشتۆتەوە تا ئەگەر ماندوو بوو و ویستی با دەگەڵ ((داك))یدا بنوێ. روناك بەو بووکۆکەی داکی بۆی لە پەڕۆ و پاتالاَن دروستکردووە و قۆپچەی کۆنەکراسانی بۆ کردۆتە ((قلقلانە)) یانی دەموچاو، یاری دەکا. چاوەکانی، هەموو گیانی، تێکڕا بە دەوری داکیدا دەگەڕێن و سەما دەکەن. روخسارە رەنگ پەڕیوەکەی لە خۆشی و شادیان هەروا دەبریسکێتەوە؛ لە ناخی دەروونییەوە شادانە پێدەکەنێ و پێکەنینەکەی وەك دەنگی زەنگۆڵەی زیوی ژەنگ گرتوو دەو ژوورە چۆڵ و هۆڵ و بەتاڵەیدا لە پاڵ ئەو سەماوەرە تەنەکە و ئەو دوو پیاڵە و ژێرپیاڵە گڵینانە و ئەو حەسیر و جەواڵەدا، دەڵێی ئاوازی ئەو مۆسیقایەیە کە هەر دەبێ لەناو گۆڕستانانی لێبدرێ. دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هەر پڕجۆش بوو. من تەنانەت ئەو کاتانەی کە لە منداڵێکیش بەولاوەتر نەبووم بەدیتنی ئەو کچە و هەڵسوکەوت و بیستنی ئەو قسانەی کە دەگەڵ کۆکەکەیدا دەکردن دڵم توند دەبوو و دەگوشرا. ئێستاش هەرکاتێ کە ئەو رۆژانەم وەبیردێنەوە، هەموو ئەو کاتانەم دێنەوە بەرچاو و دڵم دەگیرێتەوە... کچۆڵەیەکی وردیلەی لاق باریکی، قژ خورمایی و دەموچاوێکی یەکجار زۆر بچووك و جوانکیلانە.

روناك کراسێکی چیتی کاڵبووەوەی بچووکی دەبەردایە. پووره خاتوون پرچەکانی بۆ هۆندوونەوە- بەڵام چ جوان! داره دارەی دەکات و دەگەڵەخۆی و بووکەکەیدا دەدوێ. هەرتاوە ناتاوێك دادەنیشێتەوە- دیاره قاچە باریکەڵەکانی رایناگرن —هەرجێیەکی بیگاتێ- سەر عەردی رووت- و قسەکانی دەگەڵ بووکۆکەکەی، بەروخسارێکی زۆر ڕاشکاوەوە، و بەدووچاوی ئەبڵەقەوە، درێژە پێدەدا. ((... وای کچی خراپ... باشە ئێستا من چ قوڕێکی بەسەری خۆمدا کەم! چوویت و خۆت لەو خۆڵەی وەرداوە و ئاوات لە خۆت کردووە، ئاخر خۆ پووره خەجیج هەروا سەعاتێك نابێ دەست و دەموچاوی شوشتووی!)) هەروا بۆ سەرسامییە یا بۆ وەبیرهێنانەوێ ئەنگوستی بۆلێوی دەبرد، دەماڵێکدا کە وەك هەموو دایکان پێکەنینی دەچاواندا شەپۆلیان دەدا. ((گوتم مەچۆ دەرێ... بەڵام بۆ تۆ گوێت هەیە! خوا رەحمی کرد کە نەکەوتوویە بن دەستوپەلی ئێسترەکانی تۆپخانەی؛ ئەگەر کەوتبایتەتە بن دەست و پێیانیان من چیم جوابی دایە بدابایەوە!... دەڵێم ئەگەر کچی چاك بی و ئازاری پووره خەجیجێ نەدەی ئەوە



شەکرۆکەیەکی گەورەت بۆ دەکڕم- باشە؟... نوقڵت ناوێ، بەڵێ باشە مامی؟ ئەدی ئاوی نەبات؟ ئەویشت هەر ناوێ؟... ئێ ئێ، ئێستا تێگەیشتم- کورسی نەعنات دەوێ- هەی شەیتان! باشە، ئەگەر پووره خەجیجت لێ رازی بێت کاتێ کە لەکێوی هاتەوە و بارەدارەکانم فرۆشتن دوو دانە کورسی نەعنای گەورەت بۆ دەکڕم- لەو سپی سپییانە، باشە؟ - باش...)).

چاوەکانی زەق دەکاتەوە، دەگەڵ بووکۆکەکەی پێدەکەنێ و بەخۆیەوە دەنوسێنێ: ((گیانەکەم!... دەزانی چییە؛ ئەگەر کچێکی زۆر چاك بیت ((چاوەکانی وێك دێنێتەوە، ڕوومەتە چکۆڵەکانی چرچ دەکا)) کە گەورەبووی دەتدەمە یەکێك لەو چەتانەی بەگژ دەوڵەتێدا دێنەوە و شەڕی دەگەڵ دەکەن، باشە؟)) دوایە کتوپڕ روخسارێکی شڵەژاو بەخۆوە دەگرێت ((ئەیەرۆ، دەك خوا بمکوژێ! دوێنێ گوتم قەندی مەخۆ، ددانەکانت هەڵدەوەرن!)) مستە بچکۆلانەکەی وەبەرچەناگەی دەدات ((بەقسەی دایەی ناکەی — باشە. بابە پیرە، وەرە بیبە، ئوووو هەروا بە گاڵتەوە چاوەکانی زەق دەکاتەوە و رەنگ و رووبەکی ترسناك بەخۆیەوە دەگرێتەوە: ((ئەی قوڕم بە سەری، خۆ ئەوە خەریکە بێت... کچێ راکە وەرە لەبن کراسەکەی دایەی خۆت وەشێرە!... نا بابە پیرە، زولەیخا کچێکی نازدارە- لێرە نییە، هەر لە ماڵ نییە...)) بابە پیرە دەڕوات و دایە، زولەیخای لەبن کراسەکەی دێنێتەوە دەرێ. زولەیخا نوستووە. ((ئەی خوا مەرگ، چاویشت زەقن و نوستووشی! هەی نەگبەت، تۆش بوویە داکێ پووره خەجیجێ- ئەویش هەر دەڵێ کەروێشکانی نوستووم... ئامان لە دەست ئەو پیرێژنانە!)).

دەو ماوە کەمانەی کە تێشیدا بێدەنگ دەبوو دایکە نوستووەکە بەرێنمایی هەستێکی نادیارەوە لەو خەوە شیرنەی رادەچڵەکی و بێ ئیختیار دەستی بۆ جێ پێکەنین و وردە قسەکانی منداڵەکەی کە هەستیشی بەشەپۆلەکانی نەدەکرد دەخۆیدا، درێژ دەکرد و هەر کە منداڵەکەشی وەقسە دەهاتەوە پەلی ئەو هەستە نادیارەی دەکردە داردەستی پێشەخۆی و بەسینگ و بەرۆك، یا لە تەنیشتییەوە جێیەکی بۆ خۆی دەکردەوە و ئەو نیگەرانی و شڵەژان و دڵەڕاوکێیەی کە کەوتبوونە سەر روخساریشیەوە هەمووی دەڕەوینەوە و نەدەمان. جارێکیان بەدەم ئەو سەرپێداگرتنانەدا، کچۆڵەکە لە گەرمەی راکە راکەی و قسەکردنی دەگەڵە خۆی و بووکۆکەکەیدا چاوی بەو سەرەتاتکێیەی ئێمە کەوت. بەشڵەژاوییەوە لەجێی خۆی چەقی؛ خۆشیی دەچاوەکانیدا نەما؛ زەرد هەڵگەڕا، سپی بوو، بۆکۆکەکەی بەهەردوو دەستان توند

بەدەموچاوی خۆیەوە نا، ئەژنۆیەکانی شل بوون، دانیشت و دەستی کرد بە گریانێ؛ ملی بوکۆکەکەشی بەسەر سینگیدا لاربۆوە و بووکۆکە بەچاوە رەشە قەترانییە بێ بیلبیلەکانیەوە کەوتە گریانێ و لووتە رەشەکەشی بەسەر دەستەی رووناکێدا هێناو هەموو سەروچاوی خۆی پیسکرد. پوورە خاتوون دەخەوێیدا دەستێك درێژکرد؛ و مندالّەکە لەسەر راخەرەکە گەوزێکی داو خۆی بەرەو لای وییەوە رانا و ئەویش بەدەستە پێچراوەکەیەوە بەخۆیەوە نوساند و لەبن لێوانەوە هەروا بەدەم خەوێوە گوتی: ((کچەکەی خۆم!)).

مانەوەمان بە چاك نەزانی، چونکە پوورە خاتوون ژنێکی توندە تەبیات و نالەباربوو. ئێواران کچۆلّەکەی لەباوەشێ دەکرد و خۆی دەگەیاندە مەجلیسێ ژنان کە لەبەردەمی مالّێ پوورە فاتمێ دادەنیشتن و کۆزیلکەیان دەبەست؛ جەفەنگی لێدەدان و گولّە بەرۆژەشی دەقرتان. دەو جۆرەکاتانەدا لەسەر بارە سروشتییە راستەقینە ژنانییەکەی خۆی بوو: جلکی ژنانەی دەبەردەکردەوە ژنەکان هەموو تێکڕا رێزیان لە پوورە خاتوونێ دەگرت و هەمووش ئەو مندالّەیان خۆشدەویست، لە کۆشێیان نەدەهاتە دەرێ، ئیدی هەمووش هەر پوربوون... ئای لەو خۆشییەی! نازانم، لەوانەیە وەك دەیانگوت هەرواشبێ نەداری و دەردەداری و بەلاّو ناخۆشی ئەو خەلّکەی هەموو واکردبوونە پوور و مام و خزم و کەس... گوایە ئەو بەلاّیانە بەپێچەوانەی مردنێوە شتێکی نادیار و کەس نەدیتە بوو، دەنا بە ڕوالّەت کەس بەلاّی نەبوو. دیاربوو هەربۆیەش لێنەدەگەڕان کەس بەکەسەوە بنوسێ... خۆشییە دیکەمان تەماشاکردنی لە سێدارە دراوانبوو، کە من تا هێشتا نەمدیبوو. ئەگەر ئەوانەمان دەست نەکەوتبایە دەچووینە بەردەمی دوکانێ وەستا رەحمانی بەرگدروو رادەوەستاین، وەك ئەوەی هیچمان لەبن سەریدا نەبێ و هەروا راوەستابین، لە روخساری ورد دەبووینەوە، بەتایبەتی کاتێ پارچە قوماشێکی دەبڕی و دەگەلّ هەر جوولّەیەکی دەست و مقەستەکەیدا دەم و شەویلاکی خوار و خێچ دەکردنەوە و بایدەدان و چرچ و لۆچی دەنێوچەوانی خۆی دەخستن. رادەوەستاین و تێمان هەلّدەڕوانی و بەدرۆوە دەستمان دەکرد بە باویشکدانێ تائەویش وەباوێشکان دەهات. یەك دوو رۆژان دوای تەقەکانی کاکەی، لە حەزرەتی ئەجەلی بوو، تازە قاوەلّتیمان کردبوو، من تا ئەودەمی نەمدەزانی چ بکەم، دایی خۆی بەئیشی مالّێوە سەرقالّ کردبوو و ئاوی دار بییەکەی دەدا؛ مەلیحە چووبوو لە حەوزی مالّێ پوورە حەنیفێ ئاوێ بێنێ، منیش لە هەیوانێ راوەستابووم، کە یەکێك لە مندالّەکان بە بەردەمی مالّێمەدا تێپەڕی و فیتوێکی لێدا. زۆرم گوێ نەدایە. تاگەڕایەوە و بەئاماژەی چاوو



برۆیان تێیگەیاندم کە شتەکە گرنگە. چووم. بەراستیش گرنگ بوو. گوتی قاچاغچییەکی چەکداریان بە دارێوە کردووە بابچینە سەیرێی. بەدایکمم نەگوت، چونکە دەمزانی چاوەرێی بەهانەیەکیەتی دەستکاتەوە بە شیوەن و لەخۆدان و لەخۆچوونەوێ و بیکاتەوە هەرا. رۆیشتین. قاچاغچییەکەیان لەلایەکی تەپەی ((کۆنەبانە))ی، بەڕووی پیرسولەیمانییەوە، کە بەسەر بەشێکی زۆری شاریدا دەڕوانێ، هەلّواسیبوو. کۆمەلّە مندالّێکی زۆر و تەنانەت هەرزەکاریش بەرەو خواری تەپەیەوە دەچوون خۆر هێشتا هێندە لەکێوی بابوسی دوور نەکەوتبۆوە؛ سێبەر تاهێشتا بەسەر شیو و دۆلّی ئاربابا و ((جنەدەرە))دا هەر بازبازێنی بوو. لە خوار تەپەوە لەجێیەکی نیمچە گۆڕیلکە کە گۆڕستان بوو، سێدارەکەیان دانابوو. هێشتا زۆرمان مابوو بیگەینێ کەسێبەرە درێژەکەی ئەو پیاوەمان بەسەردا کشا. رەنگی هەتاوێ بەپێچەوانەی جاران، زەردێکی کەم رەنگ بوو. پوورە فاتم دەیگوت هەرکاتێ خوێنێکی بەناهەق بڕێژرێ رەنگی خۆرەتاوێ ئاوایە. ئەوە ئەوەی پێشاندەدا کە خوێنە بەناهەق رێژراوەکە خوێنی ((پیاو چاکێك))ە.

حەشیمەتێکی مەیلە و زۆر لەسێدارەکە خڕببۆوە، هێندێك چاویان لەپیاوە لەدار دراوەکەوە بڕیبوو، هێندێکی دیکەیان لەلای ((بانگەواز))ەکەوە کۆببوونەوە، ئەو کۆمەلّەی کە خوێندەواربوون بانگەوازەکەیان بۆ نەخوێندەوارەکان دەخوێندەوە، جگە لەوانەی کە بانگەوازەکەیان دەخوێندەوە و لەسەرەخۆ بۆ خەلّکەکەیان روون دەکردەوە دەنا دەنگ و بەنگ لەهیچ کەسێکەوە نەدەهات، راست وەك ئەو دەمانەی کە مردوێکی بەخاك دەسپێرن. لەوە زیاتر لە دوورەوە هیچ شتێکی دیکە دیار نەبوو. نزیك کەوتینەوە... یەکەم جارم بوو سێدارە و لە سێدارە دراوم دەدیت... سێدارە ئەوەیە کە دەیانگوت! سێ کۆلّەگە بوون کە دوویان نزیکەی سێ چوار مەترێك —سەروخوار- چەقێندرابوون، دەگەلّ کۆلّەگەیەکی دیکە لەنێوەڕاستێ، کە تۆزێك لە دووەکانی دی نزیك بوو. بەسەری هەریەك لە کۆلّەگەکانەوە پارچە دارێکی وەك گورگەیان بەشێوەیەکی ئاسۆیی لەسەر داکوتابوون، و لەژێر ئەویشەوە پارچەدارێکی دیکەیان لەبنەوەڕا کردبووە پشتیوانەی ئەوەی سەرەوە و دایان کوتابوو و بە هەمووان سێ گۆشەیەکیان دروست کردبوو، کە بارێ سەرەوەیان راست وەك ئەو دارانەی سەری کۆلاّنەکان دەچوو کە فانۆسیان پێدا هەلّدەواسین. لەسەرەوەی دوو کۆلّەگانڕا تەنافێك تێپەڕببوو کە بە ئەلّقەی سەری

کۆڵەگەکەی ناوەڕاستێدا تێدەپەڕی و کۆتایی تەنافەکە بە ناوەڕاستیدا هاتبوو و توند لەملی قاچاغچییەکەی شەتەك درابوو.

پێیەکانی قاچاغچییەکە مەترێك لە زەوییەوە دووربوون؛ پێڵاو و گۆریەی دەپێدا نەبوون؛ هەردوو کەڵە پەنجەی پێی پارچەداوێکیان لە پشتەوەڕا پێوە بوو و توند بە دوو کۆڵەگانەوە گرێدرابوون؛ دەستەکانی لە پشتەوەڕا بەسترابوونەوە. سەرقۆت بوو، پشتی لە هەتاوێ بوو. لاوێکی کەڵەگەتەی بەلەباریکی ڕەشتاڵە، دەموچاوێکی ڕەقەڵەی بە تەنکە ریشێکەوە، لووت بەرانی، وەك بە قولاپەی ماسی گرتنێوە بووبێ و بەلایەکیدا سوڕابێ و دیمەنێکی وای دابوویە، وەك بۆنێکی ناخۆشی بەبن لووتیدا هاتبێ و ڕووی وەرگێڕا بێ وابوو، بەڵام دەمولێوی ئەو دیمەنەی دیکەی وندەکرد و دەیسڕییەوە. لێوی خوارێی بەلای ڕاستەیدا کەوتبوو و دەمیشی تۆزێك بەش ببۆوە؛ زمانیشی لەنێوان درزی دوو لێوەکانیەوە دیاربوو. ڕەش داگەڕابوو، هەروەك یەکێکی لەبەر ئازاران خۆی وێك هێنابێتەوە. بەو دەستانەیەوە کە بۆ پشتەوەی بردبوونەوە و ئەو سەرەی کە بەدوایەدا کەوتبوو و بەلایەکیدا خواربۆوە هەر دەتگوت ئەوە هەواڵێکی یەکجار زۆر ناخۆشیان داوەتێ بۆیە هەر دەستبەجێ ئاوا لەجێی خۆی وشك بووە. برۆیەکانی تێك نەنابوون، یەکێك لە برۆیەکانی بەنیشانی سەرسوڕمانێکەوە بەرزکردبۆوە. نێوچەوانی کراوە نەبوو، بەڵام گەش و دەردەدار دیاربوو؛ واتدەزانی ئازار و ئێش و دەردیان بەدەرزی لێداوە.

نەرمە بایەك دەهات و ئەوی بە هەواوە دەشەکاندەوە، و سێبەرەکەی دەشارییەوە هەڵدەسوی. هەردوو دەلینگە شەرواڵەکەریان لێك بەستبوون، پێڵاوە دڕاوەشڕ و وڕەکانی، هێشتا لەبەر پێی بوون، تۆ بڵێ لە پەلەپەلییە ڕۆینێی بۆ لای خودای بۆ پێشکەشکردنی ئەو سکاڵانامەیەی بۆی نوسیبوو دەگەڵ تەکانێ لەپێی داکەندرابوون و سەراسیمە بە دەرگای حەق هەڵگەڕابوو و لە نیوەی ڕێیە شتێکی چاوەڕێ نەکراو ڕوو دەدات و دەمێنێتەوە. بەیانێکی بەدەرزییە سنجاقێکی بەسینگییەوە درابوو: ((عەبدوڵڵای کوڕی... ناسنامەی ژمارە... بەتاوانی سەرپێچی چەکدارانە دەگەڵ مەئمورانی دەوڵەتدا لە بەرواری... لە دیوانی جەنگی لەشکری ڕۆژئاواوە دادگایی و بەرامبەر مادەی... یاسای لێکۆڵینەوە و سزای ئارتەشی شاهەنشاهی فەرمانی لە داردانی درا...)) دوو کۆڵەگەی کورتی دیکەیان چەقاندبوون. چەند بەیانێکیش لەوان درابوون، کە بەمەرەکەبی مۆر نوسرابوونەوە. بانگەواز و بەیاننامەکانیان بەکەتیرەی لە شەپکە تەختێکی



پانکەڵە دابوون و بە کۆڵەگەکانیانەوە داکوتابوون: ((ئاگاداری: ماددەی... لە یاسای لێکۆڵینەوە و سزای ئارتەشی... هەر کەسێك بەچەکەوە ڕووبەڕووی مەئمورانی هێزی ئینتیزامی...)) کۆڵەگەکەی دی پەیامی بانگەوازێکی دیکەی پێوەبوو، کەمن نەمزانی دەربارەی چییە —ئەویان دەپێشدا خوێندبۆوە.

ڕاستەوڕاست نازانم کە ئەو پیاوەم بەدارێوە دیت هەستم بەچی کرد. هەرئەوەندەی دەزانم کە زۆر بەسەختی تێکچووم و بێ ئیختیار ڕەنگ و ڕووم تێکچوو- یەکێك لە منداڵەکانی گوتی... ئەدی، ئێمەش جوانی و ناشیرینی، هەردووکیان بەڕابردنی زەمانە و کات و وەختان فێردەبین.

هەروەك چۆن یەکە و دەردوو و بێ پێچ و پەنا و بێ پەروا و پەرۆشی من، ڕووداوی شوشتنێ ((سۆزانی))یەك بۆدایی گێڕایەوە... ئاواش یەکێك لە منداڵەکان گوتی: ((حوسێن، ئەگەر تۆش کاکەت ئاوا بە دارێداکەن چ دەکەی؟)) بە سەرسامییەوە تێم ڕوانی- هەرگیز ئەوەم بەبیردا نەهاتبوو: کاکەی لەدار دەن!... هەرگیز شتی وا نابێ... دایی ئەو هەموو پاڕانەوە و هێندە دەستە و دامانی پیر و پیاوچاکان بووە؛ ڕۆژێ سەد نوێژان دەکا، نیوەی نوێژانی بەدەستی بەهەواوە و نیوەی دیکەیان بەدەست بەردانەوێوە، وەك نوێژی پیاوانی گەڕەکێ. دەڵێ بەڵکە ئەوە خوایە نوێژی وان ڕاستتربێ و بیگرێ.

بەڵام ئەم پرسیارە وەك ددان ئێشێکی کە جارجارە بروسکان بکات و هێشتا تینی نەهێنابێت و تاوی نەسەندبێت؛ جار جارە بروسکەی دەدایەوە و دەمێشکمدا دەهات و دەچوو. دەوساتانەدا ڕوخساری کاکەم دێنایەوە پێش چاو و بەخۆمم دەگوت لەو بارودۆخەیدا دەموچاوی چۆن دەبێ!... نا، ئەوە هەر نابێت... شێوام، ئاخر کاکەم زۆر خۆشدەویست... ئەوەیانم بەدایی نەگوت.

دوو سەعاتی مابوون بۆ نیوەڕۆیە. چەند کەسێك و مەلایەك لە شاریەوەڕا هاتن و تەرمەکەیان لە دارێ کردەوە. ئێمەی منداڵانیش پێمان وابوو هەر لە دارێ بێتەخوارێ و پێی بە عەردی کەون بەدوامان دەکەوێ و ڕاومان دەنێ! سەرێکی تەنافەکەیان لەو کۆڵەگەی کردەوە کە تێوەی پێچرابوو؛ چەند کەسێکیشیان بۆ ئەوەی تەرمەکە یەکسەر بەر نەبێتەوە و خوانەخواستە ئازارێکی پێبگا هاواریان کرد: ((ئەهای، لەسەرخۆتر... بەرینەدەن!))یانی سەری تەنافەکە یەکسەر بەرهەڵدامەکەن. ((باشە... زۆر باشە- ئەهاا ئەها!)) بە شلکردنەوە و لە دوودانێ

تەنافەکەی لاوەکە داکشیە خواریّ؛ هەر کە پێیەکانی گەیشتنە عەردی دوو سیّ کەسیان کە بەلای سێدارەکەوە وەستابوون و چاوەڕیّ بوون هەردوو شانەکانیان گرت، و هەر بەو حالّەوە کە پاشەلّی گەییە عەردی زۆر بەزەحمەت تاگرێی مل بەندەکەیان کردەوە، پێستی گەردەنێی رووشاندبوو. ئێمەی مندالاّن چەند هەنگاوێك لەولاترەوە بووین هەردوای تاوێکی وەك جاران هاتینەوەپێشیّ. دەمی لاوەی ئێستا بەتەواوی بەش ببۆوە و زمانی لەلایەکی لێوەکانیەوە و سەریشی بەسەرسینگیدا شۆڕببوونەوە. کە دەگەلّ هەر جوولّەیەکیدا وەك سەری بوکۆکەکەی روناکیّ تەکەتەکی بوو بە ملیەوە- چاوەکانی نوقاندبوون. لەسەر پشتێیان درێژکرد. دوایەش هەردوو دەست و لاقیان گرتن و دە دارەبازێکیان هاویشت کە لە مزگەوتێیانڕا هێنابوو و بۆ شوشتنیّ بردیانە مزگەوتی سەید رەزای.

وە دووی تەرمەکەی کەوتین؛ بە کۆلاّناندا هاتینەخواریّ، و دەگەلّ ئەو حەشیمەتەی کە تا دەهات زیاتر دەبوو چووینە ئەو گۆڕستانەی کە نزیکترین گۆڕستانی بەشی خۆراوای شاری بوو. گۆڕ هەلّکەنەکان هێشتا لە گۆڕهەلّکەندنیّ نەببوونەوە. تەرمەکەیان لە تەك گۆڕەکەوە دانا. هەردەو دەمیدا مەلا محەمەدیش لە مزگەوتیّ شێخ سالّحییەوەڕا هات. کە گۆڕەکە تەواوبوو تەرمەکەیان هاویشتیّ و خۆلّیان وەسەردا و مەلا محەمەد تەلّقینەکەیدا، و حەشیمەتەکە هەموو راستبوونەوە...

هێشتا چەند هەنگاوێك بەولاترەوە نەچووبووین کە دەنگی ژنێکمان بیست، کە بە قریشکە و سینگ و بەرۆك و سەروپۆتەلاّك و دەموچاو رنینەوەوە لەداوێنی شاریڕا بەرەو گۆڕستانیّ دەهات. راوەستاین. پیرێژنێکی سەرو پرچ سپی، بەپشتی کەرێوە، چنگی دەسەروپرچ و سینگە رەقەلّەکەی خۆیەوە نابوو و لەخۆی دەدا و دەموچاوە چرچەکەی دەڕنییەوە. کوڕە لاوێکی لەپشتەوە بوو، بە نەقیزێکیەوە، کە کەرەکەی پیّ لێدەخوڕی و لەسەرەخۆشی دەگریا: دایك و برای لە دار دراوەکە بوون. خەلّکەکە دەیانگوت برا گەورەکەشی دەگەلّ ئاغایەکەی کەریم بەگ پێکەوە لە شارین. بەلاّم ئێمە ئەومان نەدیت... لەو دووانە و خەلّکەکەی شاری بەولاوە کەسی دیکەمان نەدیت. ئەو زەمانە- تا سەردەمی کوڕی رەزا شای- چاوەدێری حوکمەت لەسەر پرسە و چلەو ریّ و رەسمی کفن و دفن و بەخاك سپاردنێوە نەبوو. دەگەلّ پیرێژن و کوڕە لاوەکەیدا گەڕاینەوە- ئیش و کارێکی دیکەی خۆ پێوە خافلاّندنێمان نەبوو. پیرێژن جارجارە لەخۆی دەدا



و جارجارەش ((زیکری دەکرد)): ((یا ئەلّلاّ، یا ئەلّلاّ... خودایە زۆر شوکر، خودایە زۆر شوکر، شوکر، هەزارجار شوکر!)) بەلاّم هەردوای تاوێك جلّەوی هەستی خۆی لە دەست دەدا و لەخودای دەپاڕایەوە تاتەخت و بەختی سەرنگون کات، مەملەکەتەکەی وەبەرلافاوی نوح پێغەمبەری کەویّ... و دووبارە لەخۆدان و سەروپرچ رنینەوە؛ تا سەرلەنویّ گەیشتینەوە تازیە باران. هەرکە گەیشتینەوە نزیك گردی، نزیك دارژالّەکە، لاوە نەقیزەکەی وەبن هەنگلّیّ خۆیدا و دایکەکەی لە باوەشیّ کرد و لە کەرەکەی هێنایە خواریّ.

دوایەش بن پیلی گرت و بەرەو لای گۆڕەکەیەوە برد... گۆڕەکە دیاربوو- تازەبوو. پیرێژن هەر لە دوورەوە خۆی لە دەستی لاوەی راپسکاند. گوتی: ((پێدەزانم... پێدەزانم... گۆڕی کوڕی خۆم پێدەزانم و دەیناسمەوە... دەیناسمەوە... لەنێوان سەد هەزار گۆڕانیدا دەناسمەوە دەیناسمەوە!)) و خۆی بەگۆڕەکەی دادا. گۆڕەکەی دەئامێزیّ گرت و ئەوگلّەی لەبنی گۆڕەکێوە هاتبووە سەریّ هەمووی بەسەر و رووی خۆیداکرد. لاوەش راوەستابوو و دەکولّی و دەگریا. براگچکەی مردووەکە بوو- و پیرێژن دەگەلّ کوڕەکەیدا دەدوا و راز و نیازی دەکردن. هێندەی لەخۆدا تا لەپەل و پۆبوو. جاری وابوو وەك پێبکەنیّ، جاری وابوو شل دەبۆوە و هەروا بەدەم گریانێوە بەلادا دەهات. سەعاتێکی پێچوو؛ لاوە لە دایکەکەی نزیك کەوتەوە، و شتێکی پێگوت. پیرێژن بە گۆڕەکەی گوتەوە: ((عەبدوللاّ گیان... جگەرگۆشەکەی داکیّ... دلّبەندەکەم... هەموو کەسی داکیّ... ئازیزی دلّم... ببورە! برایەکەت دەلّیّ درەنگە... دەلّیّ چ جێمان نییە... پەنایەك شك نابەین... ئاخر ئێمەش هەروەك تۆ غەریبین، ئازیزەکەی دلّم... دەبیّ بچینەوە مالّیّ...لای خوشکەکانت... ئاخر خوشکەکانیشت چاو لە رێگان... تا هەوالّی زاوایەتییە براکەیان بۆ بەرمەوە... هەوالّی زاوایەتییەی... خودا حافیز... مالّئاوا کوڕەکەم!... دەبیّ هەربچمەوە تا دەگەلّ خوشکەکانت شینێت بۆ بگێڕم... ئاخر بەستەزمانانە بە تەنێن... بەتەنیّ پرسەی دەکێشن... ئەگەر جێیەکم دەبوو.. یەك مانگ... یەك سالّ... دە سالّ... شەو و رۆژ هەر لەلات دەمامەوە... بەتەنێم بەجیّ نەدەهێشتی... بەلّیّ، ئازیزەکەی داکیّ، جگەرگۆشەکەم، ئازیزی دلّم!...)).

دەگەلّ ئەوەشدا کە مندالّ بووین بیّ ئیختیار کەوتینە ژێر کاریگەری ئەو نالّە و لەخۆدان و شین و گریان و زارییەوە. کەس دەنگی لێوە نەدەهات؛ روخسارەکان هەموو گرژ و ماتبوون-

هەموومان هەستمان بە ئازار دەكرد. نیوەڕۆ بوو كە، لاوە دایكی بە ئامێزیٚ سواری كەرەكە كردەوە، و چۆن هاتبوون هەر ئاواش دایك و كوڕە بەناڵە و شیوەن و گریانەوە، بەرێی خۆیاندا چوونەوە. ژنان هەروەك هەمیشە لەبەر دەركیٚ ماڵیٚ پوورە فاتمیٚ جەم ببوونەوە- ماڵەكە لەسەرچەقی ڕێیە بوو؛ بەڵام دیاربوو دایك و كوڕە لەكاتی هاتنێیاندا لەباریٚ بەرەوەی چۆمیڕا قەدبڕ لێیاندابوو و هاتبوونە گۆڕستانیٚ. هەر كە لە دووڕرا دایك و كورە وەدەركەوتنەوە ژنەكان هەموو بەپیریانەوە چوون، و كەوتنە گریان و چاوسڕینەویٚ و لەچك و سەرپۆش بەدەم و لووتەوە هەڵدانیٚ، و دەوری دایكەیاندا. دایكەكەش هەر ڕاست لە خودای دەویست كۆمەڵە ژنێكی ئائاوای وەدەستكەویٚ و شینێیان دەگەڵدا بگێڕێتەوە. بەڵیٚ، دەورەی پیرێژنێیانداو بەهەزار تكا و رجا دایانبەزاند: ((ئاخر ئەوە نابیٚ، ئاخر دەبیٚ شتێكی هەربخۆی- قومەئاوێك... پیاڵەچایەك... باشە خۆ كافرستانی نییە... خۆ لە چۆڵەوانییەت لێنەقەوماوە... ئەدی بە قوربانی ئەو سەر و پرچە سپییەت بین! ئەو منداڵەش ماندووە...)) و دەستوبرد سەماوەریان تێهاویشت. دوو سیٚ ژن گورجێكی ڕاپەڕین و چوونەوە ماڵیٚ هێلكە و ماست و نڤیشك- و ئەوەی خوا دابووی و وەبەردەستانیان هاتبوو هێنایان. داییش بە غارچۆوە و هێندێكی قەند و ((خۆراكە)) چایەكی هێنا-و دوایە دانیشتنەوە گریان و لەخۆدان و شیوەن و زارییە- هەركەسە و بۆ غەمی خۆی دەگریا. كەرەكەیان بە منداڵێكیدا ناردە دەم چۆمی و لاوەشیان لەلایەكیەوە دانا و نان و چایان لەپێش ڕۆنا. داكیٚ لاوەی دەگەڵ هەر سوڕە شینێكیدا دەیگوت: ((خودایە زگ سوتاو نەبن! خودایە داغی ئازیزانتان نەبینن!... خودا ڕۆڵەكانتان لێنەستێنیٚ...!)) هەموو دایكەكان پێیان دادەگرت شەویٚ وەمێنیٚ، ڕێیەكە دوورە، بەیانی بڕواتەوە، بەڵام دایكەكە هەروا بەخۆ ڕاژاندنێوە بەدەنگێكی وەك باللۆرەگوتنێوە دەیگوت: ((كە كچۆڵەكان بە تەنێن... هەردەبیٚ بچنەوە... تا مژدەی زاوایەتییە براكەیانیان بۆ بەرێتەوە...!

یەك دوو سەعات دواتر بەو حاڵ و باڵەوە كەوتنەوە ڕیٚ.

*　　　*　　　*

## (١٥)

ئیدی هیچ گومانێك بۆ خەڵكەكە نەمابۆوە: هەروا بە تاقیكردنەوە و ئەزموونەكانی خۆیان دەیانزانی كە حەزرەتی ئەجەل بۆ دیزە بە دەرخۆنەكردن و شاردنەوەی رووداوەكە خۆی ئامادە كردبوو و دەیویست ناوچەكە —لە ناوجەرگەیەوە- شارۆچكەكەی مە- چاوترسێن و سەركوت بكا. هەر لە پیرو پێشینانەوە ترس هەروا بووە. پیاوی ترسنۆك هەمیشە توندوتیژ و دڕبووە پیاوی بە توانا و لێهاتوو زۆر بەدەگمەن جڵەوی خۆی لە دەست دەداو پەلە لەكار و كردەوەكانیدا دەكات. دیارە لە دوایەدا تێگەیشتم كە ئەو دەزگایەی حەزرەتی ئەجەل نمایندەیەتی و ئەویش یەكێكە لە مۆرەكانی لەجێیەكی دیەوە هاتووە و خەڵكی ئێرە نییە و لەناو جەرگەی خەڵكەكەوە هەڵنەقوڵاوە و نەهاتۆتە دەرێ و لەناوە وان پەیدانەبووە، تا هێز و توانایەكی وای پێ ببەخشێت و خەڵكەكە بە ئی خۆی بزانێ. لەبەرئەوە دەترسا، و لە بەرامبەر ئەو ترس و لەرزەشدا هێز و وزەیەكی وای دەخۆیدا بەدی نەدەكرد ببێتە پاڵپشتی و بە پشتیوانیە وی ترسەكەی مەهار كات و بیرەوێنێتەوە. هەر كە ترس پەیدا دەبوو راست وەك رۆنیان بەسەر ئاوێدا كردبێ لوس باریكەی دەدایەو دەرۆیی. دەیانویست تۆ بترسێنن و زراوت بەرن. بۆ، چونكە تۆ ئاگاداری هیچ و پوچی و سوكی و بێ مایەییەیان بوو ویت و ئاگات لێبووە. مادامەكی تۆ ئاگادار و شاهیدی ئەو چاو شكاندنەیان بوو ویت كەواتە تۆ تاوانباری، و ئیدی نابێ لە گیانی خۆت دڵنیابیت، چونكە تۆ هەر بەلەوێ بوونێت، بە دیتنێت، بەجۆرێك لەو تاوانەیدا هاوبەشی، و دەبێ بەلانی كەمەوە تێتبگەیەنن كە ئەوەی دیوتە ئەوە هەونیە و ئەوەی كە دەیبینی ئەوەیان ئەوەیە كە دەبایە بیبینی... لەوانەشە دیبێتت، بەڵام ((چاك))ی تێنەگەیوی: ئەمە ((من))ێكە كە دەتوانێ مرۆڤ بكوژێت و ئەگەر تۆشی نەكوشتووە هەر بۆ هێندێیە كە دەیەوێ بمێنی، تا بزانی كە هەیت و دەشتوانی نەشبیت- هەیت وەك ئەوەی ئەو دەیەوێت، خۆ ئەگەر ناتوانی وەك ئەوەی ئەو دەیەوێت وابی، هەركاتێ بیەوێ تۆ تێچوو ویت. بەڵام ئەم گەورەییە وەڵامی ئەو سوكایەتیەیە... لەو جۆرە كات و شوێنانەدا یەك دوو سەعاتان



وەك خەڵكەكە هەموو لێك وەڕەز و بێزاربن، كەمتر وێك دەكەوتن و كەمتر لە یەكتر نزیك دەبوونەوە- دەیانویست تەنیا بن. و دەموچاو و سەرو سەكوتەكان هەموو تێكنرابوون و گرژومۆن؛ پیرەمێردەكان دەتگوت دەبزڕكێنن؛ قەیرە پیاوەكان هەموو برۆیان تێكدەنان... بەڵام جحێڵ و لاو و هەرزەكارەكان... ماشەڵڵا لەو جحێڵانە... هەر لەسەر بەزمی خۆیان بوون و هەر دەتریقانەوە و پێدەكەنین و مەتەڵەكیان داویشتن- وەك نەبایان دیبێ و نەباران.

رۆژگار و بەسەرهاتەكان، خەڵكەكەیان كردبووە مشتێك نمایشگەر. هەموویان لەڕوودا، و بە ئاشكرا خزمەتكار و دەست بەنزاوە بۆ بەردەوامی زاتی پیرۆز و ((دەوڵەت)) دەپاڕانەوە- راست وەك هەمیشە- و لەبنەوەش ئەژداد و ئابادی زاتی پیرۆز و ((دەوڵەت))یان دەردێنا. هەر راست وەك هەمیشە بارودۆخەكە بەگشتی بە بارودۆخی مێگەلە خەونەكانی ئەحمەدشای دەچوون كە ئەوانیش لە دوو سێیەكان زیاتر نەبوون —خەونەكان دەڵێم- هەمیشە و ساڵ دوازدەی مانگێ هەر ئەو دوو سێیەكە بوون و هیچی دی. دەیگوت: ((وەختێكی دەخەونێمدا دەمدیت هەموو دنیا شین هەڵدەگەڕا: هەتاو شین، ئاسمان شین، دەشت شین، كێوی ئاربابا شین- هەموو جێیەك شین... و هەموو كەسیش بوونەتە مەڕ، ئەمنیش بوومەتە ئەحمەدشای مەڕان. یانی هەر راست مەڕی مەڕ نا، سەرو كلك و لەش مەڕ، بەڵام چاوەكان چاوی ئادەمیزاد. تا چاو دەتروكێنی دەبیە سەگ، پشیلە، رێوی- بەڵام دیسانەوەش هەر مەڕ. تێدەگەن دەڵێم چی! ئەمنیش ببوومە ئەحمەد شای مەڕان. رۆژێكیان هەر ئەو سۆفی سەلیمەم دیت كە هەر بەو قەدو قەوارە و قەڵافەتە مەڕیەیەوە ئەوا لە دووی گاسن و ئاموورێیە و خەریكی عەرد كێڵانێیە و بەزمانی مەڕانیە خۆی گایەكەی دەدواندن و گۆرانی بۆ دەگوتن: ((بەع بەع و بەع بەع- بەع و، بەع، و بەع!)) گایەكانیش هەر مەڕ بوون، بەڵام جەناب رەییس و دەوڵەت، هەموویان زەردبوون- زەردێكی زەیتونی. هەندێ كەسی دی بەڵەك بوون: سەرەكان سپی و لەشەكان رەش- دەموقەپۆز زەرد. حەزرەتی ئەجەل، هەر ئەو حەزرەت ئەجەلەی خۆمان، راست ببۆوە، بەراز، بەڵام دیسانەوە ئەوەی كە كەریم كاڵەی ئەنگاوت؟... لە پڕ سەری دەنێو گەڵۆزێ دەنا و بەشفرەكانی یەك دووێكی كەت و پارچە دەكردن. ئەوانی دیش وەك مێشیان لێ میوان نەبێ، بەزمانە مەڕانەكەی خۆیان پێدەكەنین و دونگۆڵەكانیان رادەوەشاندن. لە یەك لەحزەدا دەبوونە سەگ، دوایە دەبوونەوە مەڕ- دوایی دەبوونە كەڵەشێر (كەڵەباب)...)).

((کەڵەباب؟)).

((بەڵێ، دەبوونە کەڵەباب و دەیانخوێند: ((قوو قوو قوو!)) وەك ئەسپێیان دەکـەوڵی کـەوتبێ و یا دڵیان لە ژێڵلا بێت و دەردێکیان پێوە نوسابێ، ملیان درێژ دەکرد و چاوەکانیان دەنوقاندن و وەك باوەشێنی شکاو باڵیان لێکدەدان، و دەیانخوێندەوە: ((قوو قوو قـوو!)) ئـەو رەبییـسە جـل زەردەکە... ناوی چ بوو. خۆ هەر ئێستا گوتم؟)).

((حەزرەتی ئەجەلی لەمەڕ خۆمان!؟)).

((بەڵێ ئەو... دەستی دەبەرکێ دەنا و مشتە دانێکی- لەو گەنمەی بۆنی کردبوو- لەبەرکێ- لە بن کەوڵە خوریيەکەوە —دەردێنا- ئاخر بۆ خۆشی هەر مەڕبوو- لەبەر کەڵەبابەکانی رۆ دەکرد.

کەڵەبابەکان گەنمەکەیان دەخوارد، بەڵام بـە چ دڵەخورتەیەکـەوە! بـەردەوام سـەریان بەراسـت و چەپەیدا دەگێڕا و تەماشای ئەولاولایانیان دەکرد و دەندوکیان لـە عـەردی دەدان. وەك لـەوەی بترسن مەڕەکانی دی دانەکەی پێشیان هەڵقۆزنەوە. کە دانەکەیان دەخوارد دەفڕینە سـەر داران، و سەریان دەبـن باڵـەکانیان دەنـاو لێـی دەنووسـتن... نـا، خوانـەکا، لـەبیرم چـوو. لەپێـشدا کاتژمێرەکانیان لە باخەڵێ دەردێنان و کۆکیان دەکردن نەك خودا نەخواستە بـە ئاگـا نەیـەن و نوێژی ئەو خەڵکوڵلاێەی بچێ. ویردیان دەخوێندن، ئەوجا دەنووستن، بەڵام سەیرە کە تەماشات دەکرد دەتدیت نا، دیسانەوە هەر ئەو مەڕانەن کـە بـوون- لاسـایی کەڵـەبابانیان دەکردنـەوە. جارێکی دیکەشم خەون دیتەوە، سەیر دەکەم بوومەتە ئەحمەد شای بزنان...)) ((عەجەب!)).

((بەڵێ خەونێ دەبینم... یانی نووستبووم، دە خەوێمدا دەدیت- ئەبولفەتح خـانیش دەزانێـت. دیتم هەموو دنیا سوور داگـەڕا، چ سـووریەك، هـەروەك پـەڕی سیاوەشـان. هـەروەك شووشـە مەرەکەبێکی سوورت هێنابێ و بەدنیایەت وەرکردبێ، ئەمجارەیان هەموو بووینە بزنـێ سـور... سوبحانەڵلا!...)).

بە روخسارێکی سەرسامەوە دەبیر و خەیاڵانەوە دەچوو.

((سوبحانەڵلا! تەگەی بزنە گەلێ نێرییەکی تا بڵێی قەد و قەوارە ناشیرن بـوو، هـەر راسـت وەك قـەد و قـەوارەی ئـەمیر لەشـکری لەمـەڕ خۆمـان، بـەخۆ و بەیـەك دوو دەسـکە ریـشەوە، دەموچاوێکی پانکەڵە و لەڕ و رەقەڵە و، دوور لـە ڕووی ئـەم حەشـیمەتە- ئـەوەش کـە هـەر



ناگوترێ- هەموو دەزانن کە هەروەك ئەوەی ناو زگیان هەموو دەرێنـابێ، هـەر راسـت کەوڵـە خوریيەکی بەتاڵ و هیچی دی...)).

قاقای پێکەنینی حەشیمەتەکە.

((بەڵێ، دیاربوو لە کوێستانێ لەوەڕا بوو، و لە قەد و قەوارەیڕا دیاربوو کە لـە تـەواوی ژیـانی خۆیدا جگە لە خواردن و نووستن و... چ شتێکی دیکەی نەبووە...)) (قاقای پێکەنینێ).

((... ئێستا منیش هەروەك ئێستا بێ ئەحمەد شای بزنانم... دیارە نەوەك ئێستاکە لە چایخانە دابنیشم. و دەگەڵ خەڵکی تێکەڵ بم. نـا، ئـەو دەمـی تێکـەڵاوی قەدەغـەبوو... دەخەوێـدا، قەدەغە بوو... نەچن ئەو قسانە بـۆ خـۆ بـادان و فیـشاڵ و خـۆ هەڵکێـشانێ لەجێیـەکی دی بڵێنەوە.

ئێوە بۆ خۆتان گوتتان خەونەکەمتان بۆ وەگێڕم- چاك دەزانن کە تەگەگەمان نازانێ- ئەوانـەی وەك ئەبولفەتح خان و رەبییسی گـەورە بەگـەد و گیپاڵیانـەوە ناناسـێت و چ حیـسابێکیان بـۆ ناکا...)) خەڵکەکە بەدەم گاڵتە و پێکەنینەوە دڵنیای دەکەنەوە کە ئەو شتانە لـە چ جێیـەکی دی نەڵێنەوە.

((بەڵێ، عـەرزمکرد کـە، ئێـستا ئـەمنیش بـەخێری ناگیـانم بـابڵێین ئەحمـەد شـای بزنـانم- هەمووشـیان لێـرەن... هـەر ئـەو حـەزرەت ئەجەلـەی لەمـەڕ خۆشمـان- بـەڵام زۆری خـۆ دەرنەدەخست... لە بنەبانێ ژووریی چاوپێدەکەوت... بە تەگە کەی...)).

بەقەد و قەوارەیەکی هەست پەرێـشانییەوە و بـەدەنگێکی وەك پاڕانـەوێوە لـە بـن لێوانـەوەی دووبارە دەکردەوە: ((لە کونی ژووری!؟)) و ئینجا ((بەڵێ... ئیدی- بۆ نا؟... ژووریش دەرێـی هەیە. ئاخر هەم بزنیش بوو و هەم ((پێشەنگی)) بزنە گەلێ... هەندێ وەختان هەر بۆ خۆشـی بوو- لە ژووری. بەڵێ لە ژووریی دەدیت و چـاوی پێدەکـەوت. نەیـدەوێرا لەبەرچـاوی ئیدیکـە شاخانی دەگەڵ لێکدا. لەبەردەمی بزنە گەلێ کە دەگەیشتنە یەك قەپۆزیان لە قەپۆزی یـەکتری دەسوی و یەکتریان بۆن دەکرد... ئاوا. لە کوێ بووم؟ ... بەڵێ، خەریك بووم بڵێم: تەگە، یـانی پێشەنگێ بزنان، سەر و کەللەی وەك کەڵەبابی بوو، وەك سەردارێکی، دەهاتە سـەرهەمان ئـەو تەپەیەی میری، و بە بەردەمیاندا راوێـچکەی دەکـردن، و هـەر ((شـادبن))ی پێـدەگوتن... چ

دەنگێك! و خەڵكی... یانی ئێمەی بزنیش... بەزمانی بزنانە و بە ئاوازی مەڕانەوە، وەڵاممان دەدایەوە.

ئێستا بۆ نموونە منی تەگە، ((هەر شادبن))تان پێدەڵێم، ئێوەی بزنە گەلیش بە زمانی مەڕانە وەڵام بدەنەوە: ((مەڕە... کان... هەر شادبن!)).

و حەشیمەت پێکەوە یەك دەنگ وەڵامی دەدایەوە: ((بەع بەع- مەمە مەع- مەع))و بەدوای ویدا قاقای پێکەنین و هەرا و هوریا... لە کۆڵان و بازاڕیەوەڕا دەیانگوت ئەوە دیسان ئەحمەد شا بەزمیەتی. بەڵام ئەحمەد شا بۆ خۆی مات و بێدەنگ و کڕ دەمایەوە: یانی چی؟ خۆ ئەو شتێکی لە عادەت بەدەری نەگوتبوو! یەکە یەکەی تەماشا دەکردن، چاوەکانی خێل و خوار دەبوون، و بە هەموو رەنگ و روو و چاوەکانییەوە دەیویست بزانێ کوێی ئەو قسانە مایەی پێکەنینێن؟ خۆ ئەگەر مایەی پێکەنینێش بن ئیدی ئەوە خەونە خۆ خەون بەڕاستی نییە. روخساری سەرتاپا هەوت دەبوو. هەروا بە هەوتییەوە زمانی لێ دەردەکێشان، تا سەرەنجام یەکێك دەیگوت: ((بەڵێ، گوتت هەر شادبن!...)).

((باشە، مەگەر چۆن؟ دەوڵەت ((هەر شادبن))ی قەدەغە کردووە؟ -دە خەونێشدا؟

ئەبولفەتح خان گوتی؟ کێ گوتی- تازە!؟ ئەدی بۆ دەنگتان نەکردووە؟)).

((نا، کەس هیچی نەگوتووە، بەڵام بزنەکان ئیدی بە زمانی مەڕانە وەڵامیان دەدایەوە!)).

ئەحمەد شا بەڕوویەکی شادەوە لەجێی خۆی پان ببۆوە و دەیگوت: ((سوبحانەڵڵا... پێم وابوو خەون دیتنیش هەر قەدەغەکراوە! وەرنە سەیرێمان و ببینن بۆ کێ گەرووی خۆمان دەدڕێنین! ئێستا ئەگەر حەزرەتی ئەجەل بامایە و چەند وشەیەکی فارسی یا تورکیم گوتبایە هەرچییەکم بەزاریدا هاتبایە هەموویتان پەسەندبوو، بەڵام بە زمانەکەی خۆتانم لێ تێناگەن... کەسێك نییە بپرسێ و بڵێ ئەرێ پیاو کوێی ئەو قسەیە مایەی پێکەنینێیە؟ نا، من لە ئێوە دەپرسم، ئێوە دەفەرموون بزن ئافەریدەی خودای نییە؟ زمانی نییە؟... نا، قوربان، لینگە و قوچی تێگەیشتوون، بیستوتانە گوتوویانە بەستەزمان بەڵام خۆ نەیانگوتووە بێ زمان. وەختێکیش دێ گەز و نیوێك زمانی درێژ دەبێ. تازە، من گوتوومە بوومەتە ئەحمەد شای بزنان، خەڵکیش هەموو بوونەتە بزنەکانی ئەحمەد شای؛ لەوەو پێش گوتم کەسەر و کەللە و شاخی هێندێکان



سپی بوو دەنا ئەوانیدی هەموویان شاخ و سەرو لەش و بەدەنیان رەش بوو، تەگەکەی گوتیشم، سەرتاپای رەش بوو- پێستی سەروچاویشی هەر رەش- راست وەك قۆزاغیان... کە لەوێوە دێن بۆ خەڵك کوشتنێ دێن... ئێستا لەوانەیە بڵێی کە، ئەدی، ئەوەش هەر تەگەیەك بووە و وەکو هەر تەگەیەکی دی و وەپێش بزنە گەلۆکەیەك و مێگەلە مەرۆکەکی کەوتووە و بڕایەوە... نا جانەم- نا. هەڵەکەت ئالێرەدایە- تەگە هەمیشە لەپێش مێگەلێوە ناڕوا... وەك ئەمیری لەشکری کە گەییە قەراغ شاری، نزیك چۆمی، خۆی رەپێش دەکات و سینگی دەردەپەڕێنێ... یانی أنا رجل (هەر من پیاوم)... دەنا بە درێژایی رۆژێ هەر خەریکی لەوەڕ و پەڕینێیە... لەوانەشە بڵێی ئەدی ئەو هەموو قایش و قروش و شمشێرەی بەستوویەتی؟- نا، هەروا لەخۆوە نەیبەستووە داویانەتێ- خاوەنەکەی گوتوویەتی بیبەستێ- ئەویش وەکو من و تۆ مرۆڤە، حەزی لێیەتی...

((ئاه...!)).

حاڵەتێکی پەرت و بڵاوی و شڵەژانی بەچاوەکانیەوە دیاربوو. چایەچییەکە چایەکی دیشلەمەی بەرەنگ و خەستی لەبەردەمی دادەنا و ئەوەی تەنیشتیشی سیغارێکی دەپێچایەوە و دەیدایە دەستی. ئەحمەد شا هەر بەو پەرتی و بڵاوی و شڵەژاویەیەوە چایەکەی هەروا بەگەرمی هەڵدەقوڕاند و چەند چەسپێکی جانانەشی بەدوای یەکدا لە سیغارە دانەگیرساوەکەی دەدا و ئینجا دەیدایەوە دەست خاوەنەکەی، و دەیگوت: ((تاڵ نەبی، ئینشاڵڵا!)) حەشیمەتەکە دەبێدەنگییەوە و ئەویش دەبیر و خەیاڵان رادەچوو- لەگلۆڵەی سەرەپەت ونی خەونەکانییەوە سەرە دزووێکی دەدیتەوە. لە پڕ هەروەك جێ پێیەکی دەمێشکی خۆیدا دیبێتەوە، وەخۆ دەهاتەوە. رووی لە ئامادەبووان دەکرد، و دەیگوت: ((ئەرێ گوتتان لە کوێ بووم؟)).

((تەپەی میری)).

بەخۆڕانانێکی کە هیچی وای دەبەر ئارخمیدسیدا نەبوو لێو بەخەندەوە دەیگوت: ((ئا... زانیم... وەبیرم هاتەوە!)) و دەستی بە تەزبیحەوە بۆ پێشێ را دەداشت، یانی کەس ورتەی لێنەیەت. ((بەڵێ، گوتم هەر شادبنی پێدەگوتن، و بزنەکانیش وەڵامیان دەدایەوە. تەگە هەرکە وەڵامی ((شادبن))ی دەبیستەوە لەخۆشیان چاوەکانی بریسکەیان دەدا- راست دەبوونە دوو کوانووە ئاگر... ریش و کلکی دەلەقاندن، وە مرقەمرقێ دەکەوت... هەر راست وەك نێرییە

پورە ریحانیّ... دوایە یەکسەر دەبووە ورچ... بەلاّم چ ورچێك! رەشە ورچێکی نەڕڕە دێو!)) چاوەکانی زەق دەکردنەوە و پەیکەری نێرە ورچە زلەی دێنایە بەرچاویان، ئەوجا سەری دە دوو قسان دەنا. ((و وەك یەك مێگەلەمەڕی قەلّەو و پتەوی دونگ چەوری لە دوورەوەڕا بەدی کردبیّ گوێی قولاّغ دەکردن و وەك بزنەکانیش ئاگایان لە مەحموودی بیّ زەواد نەبیّ کە ئەوە نێرە ورچە، چونکە هیچ سەروبەندێکی دەگەلّ بزناندا نییە و بەخوێی چێشتێش ناگەنەوە یەك، هەروا بەو شێوەیە وەك مەڕان بەرامبەری رادەوەستان و سەیریان دەکرد- بەدەست خۆشیان نەبوو، دەلّێن چاوەکانی موگناتیسیان تێدایە- و بە باعەباعەوە هەستی حۆیان دەردەبڕی. هەر راست وەك ئەو سەربازانەی حەزرەتی ئەجەلی لەمەڕ خۆمان کە هوڕای دەکێشن. ورچەکە هەستابووە سەرپاشوان و دەستی رادەوەشاندن- وەك هەموو ورچێکی دیکە کە خۆی دەکردە شوان- هەروەك حەزرەتی ئەجەل... لەولاترەوە لەپشت مالّیّ سەلیمە کەچەلّی دالاّندار- پشت سەربانی مالّیّ کەریم رێوی بە تەنیشت حەشیمەتەکەوە چەند پشیلەیەك کە قالّبە نقیشکێکیان دزیبوو و لێی خڕببوونەوە، و لێکتریان دەمڕاند- هەرا و هوریا و زەنایەکیان نابۆوە هەر مەپرسە، تەگە، هەروا کە لەسەر پاشوان راوەستابوو لاونیو سەیرێکی پشیلەکانی کرد، بەلاّم پشیلەکان هەر سەرگەرمی شەڕ و هەرای خۆیان بوون- هەر راست وەك یاساکانی ئێمە... مەڕ و مێگەلە بزنەکانیش کە باعەباع و ماعەماعیان بوو. تەگە دەستێکی بەلای راست و یەکێکی بەلای چەپدا هەلّتەکاند- یانی بێدەنگ! منیش هەروا وەستاوم، ئەوە بەلای خۆیەوە من ئەحمەد شای بزنانم، و ریزیّ تەماشا دەکەم! بەلاّم کەس گوێم ناداتیّ. کاتیّ حەشیمەتەکە بێدەنگ بوو، تەگە گوتی: ((ئەلبزنون وەلبزنات...)).

وەك حەشیمەت چیدیان خۆ پیّ رانەگیریّ لە پڕ وەجۆش هاتنەوە؛ روخساری ئەحمەدشای گرژبوو، و جۆش و کولّی حەشیمەتیّ وەك یەك مەنجەلّ ئاوی ساردی بەسەرداکەی وردە وردە ((فس))ی دایەوەو نیشتەوە. ئەحمەدشا بەڕەنگ و روویەکی پەڕیوەوە، سەیرێکی ناوچایخانەکەی دەکرد و دەیگوت: ((ئەلبزنون وەلبزنات، ئیننەل پشیلاتی قەد سەرەقەت پەنیروکوم، ئیشکەنوچرنوکوهوم...)).

حەشیمەت لەخۆ دەبۆوە، بەلاّم هەر زوو دەخامۆشیەدا نقوم دەبۆوە.

((باشە بۆ... بەعارەبی!؟)).



((بەلّیّ، بە عارەبی- چییەتی؟...)).

((ئاخر خۆ تۆ گوتوتە مازەندەرانیە!...)).

((باشە با مازەندەرانیش بێت... عارەبی چییەتی، خۆ خراپ نییە- مامۆستای خۆمان کوردیشە کەچی خوتبەی هەر بە عارەبی دەخوێنێتەوە... بەلّیّ دیسانەوە بزنەکان بن کلکیان گەرم داهاتەوە: ((بەع بەع —مەمەع- مەع!)) بەلاّم پشیلەکان، هەروا بە زمانی خۆیان خەریکی مشتومڕیّ بوون... ئەوانیش هەر بزن بوون، بەلاّم بزنەپشی... چەند کەروێشکێکیش مەئموری رێك و پێکیەبوون، بەناو مێگەلێدا دەهاتن و دەچوون و دەگەڕان، و سمێلّیان بادەدان- هەر راست وەك سمێلّی حاجی عەولاّخانی خۆمان، و هەموو جێیەکیان دەپشکنی، و گوێیەکانیان یەك بۆ پێشەوەو یەك بۆ دواوە هەلّدەخست... خەفیەبوون... یەکێکیان هەردەتگوت ئەوە ژنیّ ئەبولفەتح خانی خۆمانە و لەوێت داناوە- چاوەکانی قیچ بوون... بەکورتی، تەگەکە، کە ئێستا ورچە دەستێکی درێژکرد و یەکێك لە بزنەکانی بەردەمی کە لە پێشدا بۆی دیاریکرابوو راکێشا و قرچە قرچ، لەبەردەمی هەمووانندا دایپاچی و خواردی- بزنەکانی دی هەموو گوتیان: ((بەع بەع- مەمەع- مەع!)) ئەوەندەش بلّێم- ویژدان شتێکی چاکە، پیاو نابیّ پیّ لە هەقیّ نیّ- بەویژدانەوە دەلّێم من هیچ کاتیّ نەمدیتووە کاروبەرخی شیرەخۆرە بخوات، تا کاروبەرخ لەشیری نەبڕابانەوە نەیدەخواردن: پێش خواردنێشی بەگوێرەی یاسا دەسکەگیایەکی تەڕ و تۆلّیان دەدایە ئەوجا دەیخوارد. دەیبردە ئیجبارییە و لەویّ دەیخوارد. خوا هەلّناگریّ بزنی ئاوسیشی نەدەخوارد- لێیدەگەڕا تا دەزا- بۆ ئەوەی مێگەلە توشی زیان و کەمایەسیە نەویّ... بەلّیّ، ویژدان شتێکی چاکە... ئەوەشی هەرکاری رۆژێك و دوو رۆژ و جارێك و دووجاران نەبوو، کاری هەموو دەموسەعاتێکی بوو- هەمیشەی خودای دەبازاڕیدا قیت و قنج بەرهەلّدا بوو... رۆژێکی حاجی سەعدوللاّم دەوچایخانەیدا دیت...)).

((هەر دەوخەونەیدا؟)).

ئەحمەدشا بە روخسارێکی ئالّۆزەوە گوتی: ((نا، دەحەمامێدا! ئمم... جا وەرە سەیرکە ئێمە چەند وەختە یاسینیّ بۆ چ کەرێکی دەخوێنین!... سەد جارم گوتووە خەونم دیوە، ئەوانەم هەموو دەخەونێدا دیتوون... سوپاس بۆ خوا کە ئەو هەوالّ و باس و خواسانە دەکاتی وشیارییەو بەئاگاییەدا نین، دنیا شامیّ شەریفە، بزن بزنە، و مرۆڤ مرۆڤە- و لەناوکەر و چوارپێیاندا! تۆ

هەر خەریکی نۆك هارینێ خۆت بەو بەپێخواستی وەنێو قسەکانم کەوە! رەنگە بتەوێ بڵێی کە تۆ دەنێو مێگەلێدا نەبوو وی!؟...)).

((باشە، ئێستا نەیزانی شتێکی گوت- ببوورە... خەریك بوو بڵێی... گوتت حاجی سەعدوڵلات دیوە!)) ((شەیتانی پاك بە نەعلەت بێ، بەڵێ حاجی سەعدوڵلام دیت... بەڵێ، هەر راست خۆی بوو، چونکە مێزەری تایبەتی حەجێی دەشاخیەوە پێچابوو؛ بن چەناگەشی تاشیبوو... بەڵێ بۆیە دەڵێم خۆی بوو. گوتی: ((ئەرێ ئەحمەدشا ئەتۆ چ شایەکی کە ئەو ورچە کەوڵەمەڕێکی بەخۆ داداوە و خەریکە یەك یەك و چەندان و چەندان دەخوا و خەریکە مێگەلێ قڕکات و کەچی تۆ خۆت لێ کەڕکردووە. دەنگت لێنایە؟ ئاخر هەر نەبێ شتێکی بڵێ، فەرمانێکی دەرکە... مەگەر کەسانێکی وەك تۆ، دەنا خۆ لە گەورەی بزنانەوە تالە موویەك ناجولێ و متتەقیان لێنایە...)).

((گوتم: ((جا ئێستا چ بووە کاك حاجی... هیچ روویداوە؟ تا ئێستا نەمبیستووە لە بزنە گڕۆییەکانی تۆ هیچیان خورابن... هەواڵی تازە هیچ هەیە؟ ئێستا بۆ ناچییە لای مەلا خەلیلی بزنان و سەرێکی لێدەی- نەکا تەلاقت کەوتبێ!؟)). گوتی: ((رەحمەت لە بابت، مەسەلەی تەلاقێ لە گۆڕێدا نییە؛ ئەگەر وابایە مەلا خەلیلی بێچارە قسەیەکی نەبوو- هەر بە کەللەقەندێك یا هۆقە برنجێکی پێکیەوە دەنوساندەوە و لەحیمی دەکردەوە...! نا، قوربان مەسەلەکە مەسەلەی تەلاقێ نییە. پیاو- دەفەرموو سەیری من، دەڵێم پیاو- هۆش و گۆشم هێندە پەرتە! مێشکی پێنەهێشتووم- ورچەی دەڵێم. هەموو رۆژێ خوادایناوە ئەبولفەتح خان و ناسرخان و کێ و کێ دەنێرێ بۆ باج و سەرانەی؛ ژیانی پێ تاڵ کردووم. رۆژێك مریشك، رۆژێك فروج، رۆژێك برنج، رۆژێك پارەو پولی بێدەنگ... لەکار و کاسبی کردووین. سێ شاییان پەیدا ناکەین سەر و کەللەی بزنەکەرۆیشکان پەیدا دەبێ و بەشی خۆی دەبات... دەڵێین بۆ تارانێ... چووزانم، ئەوە باجە، ئەوە سوپایانەیە، ئەوەیان بۆ کەمایەسیە شتومەکیە... هەر رۆژە بەناوێکەوە- تەنگیان بەخەڵکی هەڵچنیوە!...)).

((نا، دیاربوو کاکە حاجی بەڕاستی تێماوە! دیارە ئەویش وەك هەموو بزنەکانی دی هیچی نەدەگوت، بەلام وەك هەموو حاجی بزنان بەدڵ و بەگیان ئامادەی خزمەتێ بوو، تێڕا دیاربوو کە وردە تێگیراوییەکی هەبێ. ماوەیەك سەیریم کرد. زگم پێی سووتا- بزنەی بەندەی خوا



خەریکبوو هەرنەمێنێ. کتوپڕ چارەسەرییەکی تەنگوچەڵەمە و تێگیراوییەکەیم دیتەوە: تێم هەڵکردە ئاوازە بزنان و گوتم: ((مەع مەع... مەمە مەع مەع!)) و زیاتری بۆ هەستام و چریکاندم، هەر راست وەك ئەو قەمەرول ملوکانە. حاجی سەعدوڵلای ناڵێی، وەك هەموو دنیایان دابێتێ، رەنگ و رووی کرانەوە، و دەستی دە بناگوێی نا، و تێیهەڵکرد: ((مەع مەع- مەمە مەع مەع!)) و بۆی هەستاو چریکاندی... سوپاس بۆخوا گرێ کوێرەی تێگیراوییەکەی کرایەوە- و راپەڕی و بازێکی دایە سەربانی، و دەستی بە لەوەڕێ کرد!...)) وەك دەستی بۆ نێوچەوانی بەرێ، و چەند ساتێکان کەوتە بیر و لێکدانەوان، دوایە گوتی: ((ئاه، لەبیرم چووبۆوە... باش بوو وەبیرم هاتەوە- مەیموونە گەڕێکیشی لێبوو... راست وەك مەیموونەکەی مامەڵلا ئەکرەمی... پیر و تولەك... دەو ناوەڕاستەیدا دەسوڕاو چەرخی دەدان. کۆڵوانەیەکی سەردارانەی بەشانییەوە بوو... لاسایی دەکردەوە- ئەویش هەر بزن بوو... پێدەکەنی و لاسایی دەکردەوە- جێی دۆستانی دەست نیشان دەکرد. دەمی وەك دەمی پشیلەی بوو، لالێوەکانی کەفیان دەردابوو. لەسەر پاشوان راوەستابوو و بەزمانی بزنە- مەیمونێ شتی دەگوتن. بەلام سەرو رووی خۆش نەبوو. هەریەك دوو وشەی دەگوتن و پشووی سوار دەبوو و ((رمب)) بەسەرقوندا دەکەوت، و بزنەکان قاقا پێدەکەنین. تەگە چاوێکی لێ زەق دەکردەوە و حەشیمەت بەزمانی بزنانە هوڕایان دەکێشا: ((بەع بەع- مەمە مەع- مەع!)) و رێپێوان بە تەپڵ و شەیپوورەوە دەستی پێدەکرد...)).

حەشیمەتەکە چاوەڕێبوون. ئەحمەدشا دوای چەند ساتەوەختێك بە روخسارێکی واوە کە پەی بە هێمای دروستبوونی دنیایە بردبێ و هیچ گرێ کوێرەیەکی نەکراوە دەدنیایەدا نەمابێ دەیگوت: ((بەلام کە بە باشی سەیرمکرد دیتم، هەی دڵی بێ ئاگا، بەرازەکەی کە هەر بزنەکەیە- هەمان ورچەیە، و ورچەش هەمان بەرازی هەوەڵێ... کاتێ کە چاکم تەماشاکرد دەبینم کارەکە کاری ئەو حاجی عەبدوڵلا دەباغەیە کە لە پشت قەلاتێی خۆ ماتداوە و سەودای پێستە مەڕ و بزنان دەکات، و چاوان لەتەگەی هەڵدەتەکێنێ: ((بنێرە بێت!... پەنا بەخوا)) تاوێك بێدەنگ دەبوو، و ئەوجا سەری هەڵدێنایەوە و بەڕوویەکی خۆشەوە، بەڕوومەتە چرچ و لۆچاویەکانییەوە کە پێکەنینیان پێوە دیاربوو رووی دەمی دە حەشیمەتەکە دەکرد و دەیگوت: ((ئێستا بە سەلامەتیە سەری رەییسی گەورە یەك ((هەرشادبن))ی بزنە جوانێکی بەشێوە زمانێکی رەوانی مەرانە مەرحەمەت بفەرموون: ((و حەشیمەت بەپیر و لاو و گەورە و بچووکەوە، بەدەنگێکی

لەبار بەع بەع و مەع مەعیان تێهەڵکرد و ژاوە ژاوێکیان بەرپاکرد هەر مەپرسە، هەر راست وەك دەمی تێبەردانیٚ زاوەماك و كارو بەرخان- هەموو وێکڕا هەر بەع بەع و مەع مەعیان بوو.

من ئەودەمی منداڵ بووم، و دەدنیای منداڵیەدا ئەو شێوە رەفتارەی حەشیمەتەکەم بەدوو روویی لێکدەدایەوە. نەمدەزانی کە ئەوەش شێوەیەکە ئەزموون و بەسەرهاتەکانی عومر فێری کردوون و جۆرێکی زۆرانبازی و بەربەرەکانێی بەردەوامی و مانەوەی ژیانە.

مەقامات- پایەداران- بە تەواوی فیز و خۆبادان و ئیفادە لێدانێوە، بە برۆتێکنانێوە، وەك لە جەنگی فەتحولفوتوحەوە هاتبنەوە دەبازاڕیدا راوێچکەیان بوو و دەهاتن و دەچوون، دەیانبردن و، جنێویان دەدان، و دەیانکوتا و خەڵکەکەش هەروا، ئەگەر دەرفەتیان هەبایە ئەوا هەڵدەهاتن، دەنا کەرتڕێن دەکران بە لێدانیٚ یا ماڵ و سامانیان هەرچی بایە دەبووە تۆز و با- و دەنگیان نەدەکرد و لێویان نەدەبزاوت؛ بەلاٚم هەروا لە رق و کینە و توڕەییانیشدا خۆیان دەخواردەوە، و پڕێسکەی دڵ و دەروون و هەناویان لیٚ دەئاخنی و لەبەر زۆرناڵیە ئەو کارەساتانە رەنگیان بەرووانەوە نەدەما و لێویان سورایی لێدەبڕا. لەو چەند کەسانە بەولاوە کەسی دی دەشاریدا نەمابوو لەبەر ورگ و گەدە و گیپاڵ زلی و تەنگەستوریە دەرۆینێدا سەری بۆ دواوە بەریٚ و قیتی کاتەوە- سەر هەموو شۆڕ و قەد و بالاٚ هەموو بۆ پێشەوە بەرەو چەمینەوە بوو... دایکانیش ئەوا بۆ رۆژی لیقەومانیٚ هەروا خەریکی زانێن- ئەوەش هەر ئەزموون و تاقیکردنەوە فێری کردبوون، هەرچەندە ئەو کارەش جێی پەسەندی ((پایەداران)) نەبووە: سکالاٚیان لەوەیە کە ئەو هەموو خەڵکوڵلاٚیە هەموو رۆژیٚ ((جرت)) منداڵێکی دەردەفرتێنن و بەکوچە و کۆلاٚنانیان وەردەکەن و خورد و خەو و حەسانەویٚ لە خەڵکی دی حەرام دەکەن و هەراسانیان لێهەڵدەگرن- بەتایبەتی نووستنیٚ دوای نیوەڕۆیان. هەرچەندە پێشتر ئەو منداڵاٚنە لە بیٚ خواردن و بیٚ دەرمانیەدا هەر بە منداڵی سەریان دەنایەوەو دەمردن کەچی دەگەڵ ئەوەشدا هێندەیان هەر لیٚ دەمانەوە کە کوشتوبڕیە نمایشییەکانی گەورەکانیش گۆڕانێکی وا دەرنەخا ببێتە هۆی ئاڵۆزی بارودۆخەکە و وەزعەکە بشێوێنیٚ. منداڵەکان، کچ و کوڕ، بەلولاکە باریکەڵەکانیان و ورگە دەرپەڕیوەکانیان و ئەو سەلکە خڕانەیانەوە کە تەکەتەکی بوو بەملیانەوە دەگلٚ و خۆڵێدا دەگەوزین، دەگریان، پێدەکەنین، و هەرچەندە پێکەنینەکانیان وەك پێکەنینی گەوران بوو و دەگەڵ قاقای پێکەنینی شادی منداڵە تێر و تەسەل و پۆشتەو



پەرداخەکاندا جیاوازییەکی یەکجار زۆری هەبوو دەگەڵ ئەوەشدا هەرچی بوو خۆ تریقانەوەو پێکەنین بوو و دەنگ و رەنگێکیشیان هەر هەبوو و بەقسەی پیرێژنە سەرسپیانیش ئاوی ئاسیاوی ماڵەکان بوو. ئاخر خۆ ماڵی بیٚ منداڵ وەك ئاشی ئاو لێبڕاوە.

بەڵیٚ، دەو شارە دەردەدارەیدا، بەو هەموو رابوردووە نەنووسراوەی و بەو هەموو هەژارییەوەی کە دەچرچ و لۆچی نێوچەوانی هەموو دەموچاوەکاندا چەسپاو و دیاربوو، خەڵکی رێچکەی ژیانیان بەشێوەیەك کە خوو و رووشت و خدەو نەرێت کردبوویە شتێکی سروشتی بۆیان ژیانیان بەسەردەبرد و ئەو رێیەیان دەپێوا: زۆربەی خەڵکی بە پیر و لاو و قەیرە پیاوەوە هەروا کاریان دەکرد و نەیاندەکرد، لاوەکان ئەوە هەر لەخۆوە شادو دڵخۆشبوون؛ منداڵەکان بەرەو ئایندە پەلەیانبوو- لەراستیدا بۆ رزگاربوونیان لە دەست توندوتیژی و دڕیە ماڵیٚ و ئەو نەکەیەی لە ژیانی ماڵێیاندا هەبوو، دەنا چ هیواو ئومێدێکیان بە ئایندە نەبوو: باوکەکانی خۆیانیان لەبەرچاوی بوو... پیرەمێرد و پیرێژنەکان بەردەوام هەناسەی ساردیان هەڵدەکێشا و لەخودای دەپاڕانەوە هەرچی زووترە لە دەردو رەنج و کەسەری ژیانێیان رزگار کا، بەلاٚم دەگەڵ ئەوەشدا وا بە ژیانێوە نووسابوون رۆژ لە رۆژیان زیاتر هەستی هەلاٚتنیٚ بەخۆ دەکرد لە دەست مردنیٚ: ((پورە فاتم، ئەریٚ چۆنن؟))- ((سوپاس بۆ خودای، ئەوڕۆچاترم...)) — ((پورە رەعنا، ئێوە چۆنن؟))- ((خودا راوەستاوت کا کوڕەکەم، سێبەندەم تۆزێك دێشیٚ، بەلاٚم ئەوڕۆ چاترم)) سبەینێش چاترن، و دووسبەش ئەوە هەر...

کاریان دەکرد، پێدەکەنین و گۆرانیان دەگوت و شەیتانییان دەکردن. ئەو لاوانەی وەکێویش کەوتبوون و دەگەڵ ((دەوڵەت)) و ئەمنیەکان دەستەویەخە دەبوونەوە و دەگەڵیاندا پێکدادەهاتنەوە، و ئەولاوەی دەستیشی لە ((رەییسی گەورە)) وەشاند، بە ئاشکرا و بەنهێنی ستایش دەکرا، بە راستەوچەپاندا قسەی بەجیٚ و نابەجێیان دەپڕژاندن، هەروەك لەخۆڕا فێربووبن کە جنێودان ئەگەر خوێی ژیانیش نەبیٚ یارییەدەری ژیانێیە: بیٚ جنێودان ژیان ناچێتە سەریٚ، پیاو دیق دەکا، جنێودان پەنجەرەی ئاسوودەییە بوونێیە... و پینەکردنیشی ئاسانە: لە شوێنی زۆر توندوتیژ و نالەباردا چارەکەی هەریەك ((خودایە تۆبە و ئەستەغفیروڵلاٚ))یە — حیزبەکان تاڕادەیەك پەیان بەو مانایە بردووە: گوتنی بابمریٚ و بابژی، لە رێپێوانەکاندا و رەژە رۆینەکاندا، جگە لەو ئامانجانە زیاتریان نییە: دەیانەویٚ ئەندامەکان سووك بن و هەڵنەچن. بۆ

لاوان چاکترین جیّ گۆڕەپانی فوتبۆلێنییە. لە شارۆچکەکەی مەدا بۆ ئەو مەبەستە چایخانەکان و هاید پارکەکانی گەڕەکیّ بوون... پێشەوای ڕەخنەگرانی ئوسولّ، ڕەحمانی گا پەرستبوو، کە بەقسەی دایی، قسەکانی ئەو پیاوە، خودایە هەزار جار تۆبە، کولّی دلاّنی هەلّدەستاندن. پیاوێکی ڕووگرژ و توڕەو تێکشکاو. خێراخێرا دەدوا، و بەدەم ڕێوە کە قسەی دەکرد هەنگاوی توند دەکردن و خێراخێرا دەڕۆیی، هەروەك خۆشی بە دوای قسەکانی خۆیدا ڕاکا، مەلایەکان ناویان لێنابوو گا پەرست، تا لەوریێیەوە لە خەلّکی بگەیەنن کە هۆش و گۆشی تەواو نییە و گێلە و وازی لە هەموو شتێکی چاك هێناوە و بۆ ((پەرستن))ێش وە دوو ((گا))ی کەوتووە و گای بەشەریفترین ئافەریدە دەزانیّ. دەگەلّ هەموو ئەمانەشدا گوێیان لە قسەکانی ڕادەگرت- ئیدی هەرچۆنێك بوو ئەویان بە ((بالّولّ))ی شاری دەزانی: بەلای ئەوانەوە ئاقلّێکی —شێتی وابوو کە کەس هیچی لێنەدەگرت. ئەوەی بیگوتبایە گوێیان بۆ ڕادەگرت، و پێدەکەنین و لەبن لێوانیشەوە ((ئەستەغفیرولّلاّیەکی)) پۆزش هێنانەوێیان پێدا دەدا؛ و سەیرەکەش دەوەیدا بوو کە ڕەحمان بۆ خۆی و زۆر بەوردیش هەرچی ئەرکی دینی هەبوو هەمووی بەجیّ دێنان: ڕۆژووی دەگرت، نوێژی دەکرد —و نوێژیشی هەر لە مزگەوتیّ دەکرد. دەیگوت- ڕەحمان گاپەرستی دەلّێم- دەیگوت شەیتان کەسێکی ماقولّ بووە کە گوتوویەتی کڕنۆشی بۆ ئادەمی نابەم، ئەگەر منیش بامایە هەر نەمدەبرد، بۆ بیبەم؟ بەلاّم، ئەلعەیازوبیللا، خودا دەگەلّ ئەو ((خان))ە ملەستوورەی کە ملی بە بیورێکی تیژ نابڕێتەوە، چ جیاوازییەکی هەیە؟ ئەویش هەر دەلّیّ کڕنۆش بۆ سەرکارەکەی من ببە. ئێمە سەرکارەکانی وی دەبینین کە چۆنن! سەد ڕەحمەت لەکفن دزی هەوەلّیّ، خۆ ئەمانە تەنانەت هەبوو و نەبوویەکیشیان بۆ کەس نەهێشتۆتەوە!...

بیرێکی بکەنەوە، کە هەر ئەو شاهەنشایەی خۆمان ئەگەر بێت و هەربەو جەناب سەرهەنگەی خۆمان کە لە خزمەت گوزاریەدا ملی لەداوە دەزوویّ باریکترە، یا هەر ئەو حەزرەت ئەجەلەی خۆمان، کە بەو هەموو هەراو ماشەلّلاّ و قایش و قوروش و نیشانە جوانانەیەوە کە پێوەیەتی، بلّیّ لوتت لە عەردی دەو ئیکلامیّ بۆ ئەو ڕەحمانە گاپەرستەی بکێشە! جاریّ لەپێشدا بۆ ئیکلامیّ بکێشیّ، ئەگەر وانەکا کاروباری خەلّکی بیّ ئیکلام ڕادەوەستیّ؟ بۆ من ئیکلامیّ بۆ ئەو مانگایەی دەکێشم بۆوەیە کەوا بەجوانی شیریّ دەدا؟ دوایەش... ئەوە کام پیاوە ئاقلّەیە دێت و نۆکەر و سەرکار و گیانفیدای دلّسۆزی خۆی بە قوربانی پیاوێکی ئاسمانی دەکا؟ حەزرەتی ئەجەل هەر خەریکی کاری خۆیەتی، چاکیش دەکا. نە ئیکلامێك دەیانیش دەکێشی،



هەر چیت ویست دەیکا، و تەنانەت ئیکلامیّ بۆ خاوخێزانیش دەکێشیّ. ئیدی ئەوە چ نەخۆشییەکە تۆ بێیت و پیاوێکی دنیاو ئەزموونديدە لە سەراپەردەی خۆت وەدەرنێی ئەوە چییە ئیکلامی بۆ مەشەدی ڕوحولّلاّی قەنادی نەکێشاوە!؟ یان وەرە هەر لەبنەڕەتدا چ پێویستیە کت بە دروستکردنیّ مەشەدی ڕوحولّلاّی بوو- ئەویش لە قوڕیّ، دەحالّێکیدا کە ئیدیکەت هەن و لە بلّێسەی ڕوناکییەت دروستکردوون؟ دوایەش، تازە بەتازە دێی و مەشەدی ڕوحولّلاّی بێچارە و بیّ دەرەتان لە بە هەشتیّ وەدەردەنێی ئەویش لەبەر دلّی خاتوو حەوا خانیّ... ئێستا واز لەوەش دەهێنین کە ئەو خاتوونە بەڕێزە چی بەسەر ئەو پیاوە کلّۆلّە هێنا... بەوە شەوە ڕاناوەستی و هەر ئەو سەرکارەی لە دامودەزگاکەی خۆتت وەدەرنا دەستەیەکی دیکە دەنێرییە سەرو سۆراغی، تا بەهەلە هەل و تیلیلیان لەخشتەی بەریّ و هەلّیخەلّەتێنیّ! و دواجار بەو هەموو سوکایەتییەوە، بەخۆو بەیەك گەلاّ هەنجیرەوە، لە بەهەشتێی تێهەلّدەدەیە دەریّ... خۆتان لە خودای مەکەن! خوا لە مردووی ئاغا و بەگلەران خۆشبیّ کە هەر نەبیّ کاتێك کرمانجێکی وەدەردەنێن خۆ هەر نەبیّ دەرپیّ و شەروالّی لەپێی خۆی و ژن و مالّ و منداڵی داناکەنن.

جارێکی بە کاك سلێمانی گوتبوو: ((دەزانی جیاوازییە من و تۆ ئەوەیە کە بابی تۆ لە بابی من زیرەکتربووە. بابی تۆ لە جیاتی ئەوەی وەك بابی من لە سای سێبەریّ پالّداتەوە و ئانیشکان دادا و سیغاران بکێشیّ و دوکەلّەکەی بە باکا، تا خەلّکی بەخۆ هاتنەوە دەستی خۆی وەشاندو بووە خاوەن زەویوزار.

من بوومە ڕەحمانی گاو مانگا پەرست و تۆش بوویە نەسرولّلاّخان... بەلّیّ، هەربۆیەشە کە دەفەرموون خودا هەر پێنج پەنجەی دەستانی وەك یەك دروست نەکردوون! (ئەستەغفرولّلاّ) )).

ژنان زۆر بەوردی بەلاّم بەڕوالّەت بەگرژییەوە گوێیان دەدایە قسەکانی. بەلاّم ئەو پێکەنینانەی کە جاروبارە دە نێوان سەروچاوە تێکەوەنراوەکانیانڕا دزەی دەکرد تێکیەوە با دەدان. دەو جۆرەکاتانەدا دەیانگوت: ((وای، بلّێم خوا چت لێبکا، ڕەحمان؛ هێندەت شتی بیّ سەروپاگوت و هێندەت کفرکردن گۆرەوییەکانم بەراوە ژوو چنین!)) نیشانەی پیّ خۆشحالّییە شای بەقسەکانی لەوەیڕا دیاربوو کە جارجارە پیالّە چایەك یا بادیە دۆیەکیان بۆ دێنا. پیا لە چا یابادیە دۆیەکەیان بەدەستەوە دەگرت و- زۆر خۆمانە- و لە کاتێکیشدا کە چمکێکی سەرپۆشەکانیان

گرتبوو و بەدرۆوە نێوچەوانیان تێکنابوو و زەردەخەنەیان بەلێوانەوە شەپۆلی دەداو بە دەمولێوی هەڵقرچاوەوە دەیانگوت: ((بگرە، ئەو پیاڵە چایەی وەخۆ، هێندەش کفران مەکە، منداڵی ساوامان هەن؛ هێندە کفران دەکەی خێر و بەرەکەتێ خودای لە ماڵەکان هەڵدەگیرێ! خەڵکی لە خۆڕا پێت نالێن مانگاپەرست!)) رەحمان پیاڵە چا یا بادیە دۆیەکەی وەردەگرت و دەیگوت: ((ئامەننا، ئەی باجی تۆ بۆ خۆت چیت؟ تۆش هەر مانگاپەرستی... وەنا؟ ژنە دەیگوت: ((وا، خوا شەرمەزارت کا، رەحمان!)) رەحمان دەیگوت: ((زۆر چاکە، با شەرمەزارم کا. بەلاّم من بۆ خۆم بەلانی کەمەوە سەدجارانم بەو دووچاوانەی خۆم دیتووی کە سەرت بەلاکەلەکێیەوە نووساندووە و بە قوربان و بەسەدەقەی بوو ویت و لەبەری گەڕاوی. کارێکی چاکیشت کردووە. چونکە خۆ هەر نەبێ پیاڵە شیرێکت دەداتێ... ئیدی خۆ وەك رەزاشای هەر نەبێ خۆ گەڵ و گونیت پێشان نادات...)) و ژنەکان لە پڕمەی پێکەنینێیان دەدا، و دوایە لەو خۆشیەی کە دەریان بڕیبوو، تۆبەیان دەکرد و هەر ئەستەغفیرولڵاو خودایە تۆبە بوو کە دەماودەمی دەکرد، و دەگەڕاوە. ((دەزانم، باوەڕتان بە مانگالەی هەیە بۆیە گۆرانیانی بۆ دەڵێن... ئەدی بۆ من بۆ نالێن؟ بۆ خۆشتان چاك دەزانن. ئەوە هەزار ساڵە پارە دەدەنە ئەو ((نوشتە و گشتەك)) نووسانە و دوعایەکیان لێوەردەگرن و- تا ئێستاش موعجیزەیەکتان لێنەدیتون؟ نا، نەتان دیوە، بەلاّم دیسانەوە هەر دەشیاندەنێ... بێدەرەتا نییە چ بکەن- دەبێ هەربیدەن... چارچییە. هەر ئەوەتان بۆ ماوەتەوە؛ لەوەی دەترسن بڵێن باوەڕمان پێی نییە و ئیدی دەستتان لەبنی هەنبانەی بێتەدەرێ... باشە، هەڤیشتانە...)).

قسەیەکی زۆر جوان بوو. دەیگوت: ((خودا، بە قوربانی بم، هەموو شتێکی بە ئادەمیزاد گوتووە، بەلاّم شتێکی لەبیرچووە نەیگوتووە کە ئادەمیزاد مرۆڤێکی دڵخۆش نییە!)) ئەو قسەیەی لە تەواوی گەڕەکێ، لەسەر هەموو زمانان بوو.

لەلایەکی، خەڵکی نێوچەوانیان تێك نابوو؛ لەولای دیشەوە کوڕە جحێڵ و لاوەکان دەتریقانەوەو گۆرانییان دەچڕی و سەیرەکەشی ئەوەبوو کە جاری وابوو، بەتایبەتی شەوانی مانگەشەو، هەریەکەی بۆ یاری راستەقینەی یا بۆ یاری خەیاڵی، شیعری زۆر نایاب و یەکجار جوانیان دەگوتن کە من هەستم بە جوانی و نایابیان دەکرد و هەموویم بۆ دایی و بابەگیانی وەردەگێڕانەوە:



یاخوا هەروا گەرد و تۆزبێ
دەسرۆکەی لەملان ئالۆزبێ
لەیلا جەژنت لێ پیرۆزبێ

* * *

دیسان شەوهات بۆ حاڵی من
بۆ دڵەکەی پڕ خەیاڵی من
عالەم سووتا لە ناڵەی من

* * *

ئەگەر عەشقت زمانی بێ
سەد جار عومرت زووفانی بێ
حەیفە ئیخلاس پەنهانی بێ
مەلا زادە بەخێرهاتی

بەلاّم سەیرەکەی ئەوەبوو کە ئەوەی زووتر دەهاتە سەر زاران حەز و ئارەزووی بوونێ چەك و ئەسپ و ژنی چاوجوان بوو بۆ رووبەڕووبوونەوەی ((دەوڵەت))ێ:

ئاخ! ماینێکی نەو گوانم بێ
سێ ریزە فیشەکدانم بێ
ژنێکی چاو جوانم بێ
جا دەوڵەت تۆ بێ بۆ شەڕم

ئەمە خەونێك بوو گەورە و بچووك دەیاندیت و تێیدا هاوبەشبوون و دەگەڵ ئەوەشدا ئەو خەونە هەرگیز نەدەشێواو ئالۆز نەدەبوو: بۆ هەندێکان وەدی دەهات و بۆ هەندێکانیش هەروا بەخەونی دەمایەوە، بەلاّم چۆن خەونێك کەوە دیهاتنەکەیان لە کەسانی دییەوە چاو دەکرد و هەموو

رۆژێك دەیاندیت. چتان لێ بشارمەوە، ئەوە ئارەزووی منیش بوو. دیارە من لە تەمەنێکدا نەبووم کە بوونی ژنێکی شۆخ و شەنگ و چاوجوان بە پێویست بزانم بۆ رووبەڕووبوونەوەی ((دەوڵەت))ێ. بەڵام وەك هەر کوڕێك حەز و ئارەزووی تفەنگ و فیشەکدانم دەخوێنیدا دەگەڕا، و ئەو ئارەزووە کە دەگەڵ بەسەرهاتێکی بەسەر بنەماڵەی مەدا هاتبوو ببووە پێویستییەکی هەرگیز لەبن نەهاتوو. راستە ئەوددەمی نەمدەزانی کەڕەگ و ریشەی ئەو ئارەزووانە دە قوڵایی مێژووی ئەم نەتەوە دایە، یانەخۆ مێژوو هەر زۆردار و نۆکەرەکانیان دەینووسنەوە، و نەمدەزانی کە راستییەکانی مێژوو هەمووی دەو ئارەزوو و چیرۆکە نەتەوایەتیانەدایە.

بەڵام دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەو ئاوازی گۆرانییانەی کە دەشیانگوتن شتگەلێکیان تێدابوو کە چاکیان تێدەگەیشتم: تێدەگەیشتم کە کێو و چیا بەڕاستی سەربڵندن، و هەر ئەوە نییە کەمن دەیبینم- لەوە بەرزترە کە من پێم وابوو. یاخییەکان هەموو هەر لەکێویەوەڕا دەهاتن، هەرچەندە کاتێ لە کێوی دەبوونەوە و دەهاتنەخوارێ ئەو یاخییە نەدەمان کە بوون. منیش وەك زۆربەی زۆری هەموو ئەو خەڵکانە، لەخۆوە گەیبوومە ئەو سەرەنجامە کە رزگاربوون لەکێویڕایە، و لە کێویڕا دێت، و ئەوەی لەکێویە و دەگەڵ کێوانە باکی بە هیچ نییە، و هەریاخییەك کە لە کێوی بێتەخوارێ دەگەڵ هەر هەنگاوێکی کە لە دەشتێدا هەڵدێنێتەوە بستێك خۆ بۆ داری سیدارەی بەرز دەکاتەوەو خۆی بۆ هەڵدێنێ. ئێستا دەزانم کە ئەوە هەرکێوە سێبەری خۆی بەسەر دەشتێدا هەڵدەکێشێ، ئەو کاتانەش هەستم دەکرد: هەستێکی نادیارم لە گەورەیی و شکۆمەندییە کێوی و قێزە و نییە ئەو جێیەی کە کێو نییە، و تێمانی ئەو خەڵك و جێیانەی کێویان نییە، و گەورە بوونی ئەوانەی کە دەگەڵ چۆڵ و چیایان راهاتوون و ئولفەتیان پێوەگرتووە دەناخیدایە: پیاوی چەکدار تابەکێویەوەیە هەر راست بۆ خۆی کێوێکە؛ کاتێ بەرەو دەشتێ شۆڕبۆوە دیسانەوە تۆزە هەوایەکی کێوی هەر تێدا دەمێنێ: تەنانەت بە تیلەچاوەوە دەڕواننە تەرمەکەشی- یانی بەڕێزەوە.

دوو تاکە درەختەکەی نێوان هەردوو لوتکەکانی چیای ئەربابام دەمێشکیدا بەلاوە گەورەترین و سەر سوڕهێنەرترین ئافەریدەن؛ کە نهێنی جوانی و رازاوەیی و شکۆمەندی کێوەکەن. کێوەکە ئارام و سەربڵند دەبینم، کە لە دوای هەر تۆفانێك، هەر تەمێك، هەر بارانێك، رووەگەش و



دەردناکەکەی دە ئاسمانی پاك و بێگەرد هەڵدەسوێ و وەك داپیرەی ماڵێ، لەوپەڕی دەردەداریەیدا، لەبەر دڵی نەوەکانی پێدەکەنێ.

لەو ئاواز و گۆرانییانەی دەچاپخانەکاندا دەیانڵێن تێدەگەم کە هەموو داریوشەکان، شا ئیسماعیلییەکان، شا عەباسییەکان، هەموو هاتوون و ماوەیەك دەگەڵ خەڵکی سای سێبەری ئەو کێوانە پەنجەیان لێکداوە و دوایە بە کۆڵێك باری قورسی نەنگ و نەفرینەوە رۆیشتوون، و کێوەکانیش- دەگەڵ خەڵکەکە-دا هەرماوەنەتەوە و خەڵکەکەش هەروەك ئەو کێوانە، بەدڵی پڕ ئێش، ئارام، هەر بەو پەخشندەییەیانەوە زاوزێ دەکەن و نێرینەکان بە ((کۆمەڵ)) بۆ گۆڕەپانی قوربانییە دەنێرن، و دیسانەوە وەك چیا هەروا وەك خۆیان دەمێننەوە. لێگەڕێ با شاپوور و ئەتاتورك و رەزاخانەکان بوونی خۆیان بەسزای مەرگ بدەنەوە. تا دایکان بمێنن و کێو هەبن، غەمی ناوێ: دایکان منداڵان دەبوێنن و زمانیان دەپارێزن و کێویش لاوەکان. دەونێوەشدا، دایی وەك هەموو دایکانی دی هەرگیز لە کێوی غافڵ نییە: چاوێکی هەر لە کێویە و بەسەر پێدەشتێدا دەگریەت، و وەك هەموو دایکان دڵەڕاوکەی نێرینەکەی خۆیەتی، کە بردوویانەتە قوربانییە، و ئیدی هەروا بەم جۆرە چاوێکی بەلای کچەکەیەوەو ئەویدیشی، بەلاپاڵی کێویەوە، و هەفتەی جارێك دەچتە سەرگۆڕەکەی- و بەدەردی بۆ خۆی دەڵێ دەچتە سەردانێی، و رازو نیازی دەگەڵ دەکات. راستیش دەکات؛ منداڵ بەشێکە لە بوونێ وی، تا ئەو مابێ منداڵەکەش دەناخی ویدا هەر زیندووە، هەرچەندە زیندووێکی —ئەگەرچی نزیك- دوورە دەستە.

بە ئامۆژگاری و سپاردەی پوورە فاتمێ و تێکرای ژنانی گەڕەکێ پێکەوە دەچتە ((پیرسلێمان)) و ((پیرمراد))ی و مرازان دەگرێتەوە. منیش دەچم —هەموو هەر دەچین. ئەوانە ((پیاوچاکن)): نێرینان دەپارێزن، مرازان حاسڵ دەکەن، ئارەزووان وەدی دێنن.

دەچین. کێوی پیر سلێمانی یەکپارچە بەگوڵی رەنگاورەنگی سەوز و زەردی کێوی داپۆشراوە- گیاو گۆڵ کە هەر هەموو گۆڕەکانی داپۆشیوە، لە باریکە رێیەکی زۆر باریك بەولاوە رێی نزیك کەوتنەوەی کەس نادا بچنە سەر گۆڕی کەس و کارەکانیان. بەشێوەیەك چڕوپڕ و حەستەمە کە هەر دەتوانی لە داوێنی نزیك گۆڕەکانەوە راوەستی و دووراو دوور سەیری کێلەکانیان بکەیت و هیچی دی. مەزاری پیرسلێمان کەوتۆتە داوێنێ؛ کێوەکە هێندە بڵندنییە؛ لەراستیدا لە تەپۆلکە گردێك بەولاوە زیاتر نییە. مەزارێکی سادەو ساکار، بێ ئارایش و شایستەی پیاو

چاكێكی گەورە، دەگەڵ ئەوەشدا سەرپەنایەكی شێروانی بەسەرەوە كراوە؛ هەموو ساڵێ خەڵكی خێرەومەند بە یارمەتی لاوەكان دەستێكی پێدا دێننەوە، بەردێكی گەورەی بەرز بەژوور سەرەوە، و لە پەینگانێش ئەوە وردە بەردی نەرم، كە نیازمەند و چلدانە گرەوەكان هەڵیان دەگرن و بەكێلی گۆڕەكەیەوە فشار دەدەن و دوای فاتیحا خوێندنێ بە پەنجە بەكێلە كەوەی دەلكێنن. كە فاتیحایان خوێند زۆر بەسپایی پەنجەیان لەسەر بەردەكان هەڵدەگرن: ئەگەر پێوە نووسا، ئەوە نیازە كە هاتۆتە دی...

خەڵكەكە رۆژی پێش رۆینێ هەموو شتێكی ئامادە دەكەن: یەكێك گۆشت، یەك گەلامێو، یەكێك نان و ماست، یەكێك شەكروچا- هەر كەسەو بەگوێرەی توانا و دەست رۆیشتوویی خۆی- شتێكی ئامادە دەكات- و دەكەونە رێیە، بەخۆو بە منداڵ و مەنجەڵ و قابلەمەو تورەكە ماست و سەماوەر و پیاڵە و ژێرپیاڵەوە. منداڵەكان دەو ناوگیا و گوڵ و دار و دەوەنانەدا گەمان دەكەن و بەدار و باراندا هەڵدەرۆچكێن. وەك دەگێڕنەوە دەڵێن كێوی پیرسلێمان وەختی خۆی لێرەوارێكی پڕ لە ورچ و بەراز بووە.

پورە فاتم دەیگوت: ((بەڵێ، بە قوربانی بم، زۆربەی خەڵكی كەڵكیان لەوانە وەردەگرت بۆ مراز حاسڵبوونێ)). پیرسلێمانی دەگوت. دەیگوت: ((كافییەكەم...)) بەسەر ئاماژەی دەكردە سەرێ ئەوجێیەی كە گۆڕی كافییەكەی وی بوو ((چەندگڵ لەسەر گۆڕەكەیەتی هێندە تەمەنی منداڵەكانی ئێوە بێ، بەقەد ئێستای مەلیحەی ئێوە بوو... نۆبەتێی دەهاتنێ؛ هێنابوومە سەر پیرسلێمانی... چووبوو هەروەك ئێستای ئەو منداڵانە بەدار و باران هەڵدەگەڕێن و گەمان دەكەن، دەگەڵ هاوتەمەنەكانیدا گەمەی دەكرد كە... كتوپڕ بووە هاتوهاوار. وای دایە رۆژی رەش نەبینی! دەناو دارودەوەن و هەژگ و گیاو گۆلاندا ورچێكی جا بڵێم چەند- بە قەدەر گوێلكێكی گەورە- بەرامبەری هەستابووە سەرپاشوان!... زریكاندم، هەڵاتم... هەركە ورچەم دیت جەرگ و دڵ و هەناوم بەربوونەوە. بەڵام خۆم لێ ون نەبوو. هاوارم كرد: ((نەترسی، دایە؛ كاری بەتۆنییە- مەترسە!)) بەڵام بۆ خۆم دەڵێی، هەناوم دەوێدا نەماوە. كافییەكەم راوەستابوو، دوور لە گیانتان وەسەرپێیان كەوتبوو. بۆ پێت وایە یەك زەڕڕەی رەنگ بەڕووانەوە مابوو، نەمابوو! منداڵە وردیلەكان هەموو بەزاقوزیقەوە هاتبوونەوەو خۆیان دەبن داوێنێ دایكەكانیاندا شاردبۆوە. لاوەكان دەستیان كرد بە بەرد هاویشتنێ. قیژاندم: ((منداڵینە بەردان



ماوێن، تورەی مەكەن...)) بەڵام من شتێكی دەڵێم و ئێوە شتێكی دی دەبیسن... ئەوە حەنیفە زرپ و زیندووە، ئەوێ رۆژێ ئەویش بوو- تازە بووك بوو. ئەگەر درۆ دەكەم بڵێ درۆدەكەی...)) پورە حەنیفە بەدەنگێكی سەرسوڕهێنەوەو ناڕازیانە گوتی: ((ئەیەڕۆ، دوور لەڕووی ئێوە!)) و پورە فاتم دە درێژەی قسەكانیدا گوتی: ((وەی خوایە! چم بەسەرهات... خانمێكی وەك ئێوە، كاتێ كە هەراو هات و هاوار و قیژە و زەنایەكە بڕایەوە، ورچە وەك زانیبێتی دەناو كۆمەڵە ژن و منداڵێكیدایە، و وەك دەوەی گەیشتبێ كە گوتم وازی لێ بێنن كارتان پێی نەبێ. نەیهێناو نەیبرد یەك چنگەتفی بە دەموچاوی كافییەكەمدا كرد، و ملی رێیەی گرتەوەو لێیدا رۆیی. بەكورتی، سەرتان نەیەشێنم، كافییەكەمم هێنایەوە، و بەهەر شێوەیەك بوو یەك دوو قومە ئاوم بەگەروێدا كرد، تا وردە وردە هاتەوە سەرخۆ، ئیدی لەو رۆژە بەدواوە بە قودرەتی ئەو خودایەی، بلێی لەرزی لێ بێتەوە، حاشا... بە قودرەتێ خودای، هەر بەوچنگەتفەی!)).

ئێستاش بە هەوڵە جوانەكانی ((دەوڵەت))ێ لە چەند پیرەدارێكی كۆنە ساڵ بەولاوە، دارێكی دی لە پیرسلێمانی نەماوە؛ هەموویان بڕی و چووە چێشتخانەی سەربازخانەوە. بەڵام بڕینی ئەو سوتەمەنیانەش بە نرخی سوتانی ژیان و لەنێوچوونی چەندەها سەربازی بێنەوا تەواو بوو و كۆتایی هات، كەچەتەكان بۆ تفەنگەكانیان بۆسەیان بۆ دەنانەوەو لەناویان دەبردن. دەگەڵ ئەوەشدا ((دەوڵەت)) لە هەنگاوەكانی خۆیدا دەست بەتاڵ نەهاتۆتە دەرێ و سەركەوتوو بووە، چونكە كێوەكەی روتاندەوە و لە پەناگاییەی هێنایە دەرێ و جێی خۆتێدا شاردنەوێی تێدا نەهێشتەوە. بەڵام كێوەكەش دووبارە هەروەك خەڵكەكە دەستی بەزاوزێ كردەوە و درەختەكان سەرلەنوێ سەریان دەرێنایەوەو قەد و بالایان كردەوە. هەوای ئەوێش هەروەك هەوای شاری پڕی غەم و كەسەربوو، بەڵام بەپێچەوانەی شاریەوە بۆنێكی كە دەگەڵ هەموو ئەو غەموحەسرەتانەدا ئاوێتە ببوو ئارامییەكی شكۆمەندانەی بەوجێیە بەخشیوە: هاشوهوشی لاوەكانیش لێرە وەك هەر جێیەكی دی، ویزە ویزی پیرانەی زەنگەسوورەكان و هەموو ئەوجرو جانەوەرانەی دی بە ئاشكرا دیاربوون. غەڵبە غەڵب و جۆش و كوڵی لاوەتییە هەموو ئەو ناوەی داگرتووە، و كە فوكوڵی ژیان بەسەر هەموو لایەكی ئەم دیاری مەرگەدا پەخشانە- ئەم سەرزەمینەی كە رۆژێك بوو خەڵكەكەی هەموو دڵیان پڕ لە كەفوكوڵ و دڵێكی پتەویان دەسینگیدا تەپەی بوو و هەموو جوان و رازاوە و پڕ عەشق و ئەوین و ئەویندار بوون و دەدوان

و دەتریقانەوەو پێدەکەنین ئەوا ئێستاش لە تاشەبەرد و دار و دەوەنان بەولاوە کەماروموور سەرەتاتکێیان دەبندا دەکەن، دەنا شوێنەوارێکیان دیارنییە و نەماوە.

مندالەکانی گەمان دەکەن؛ لاوەکان- کچ و کوڕ- بەدزی دایکانەوە، لەوانەشە وردە ئاگایەکیشیان هەر لێ بێ و بەڕەزامەندییە وانەوە- بەپاکییەوە خەریکی ئەویندارییەن: دە جۆلانەیدا دادەنیشن، یەکتری وەجۆش دێنن: کوڕان قۆڵ و مەچەکی کچان دەگرن و کچانیش بەدەست وێکەوتنێ وان خۆیان تاوتوێ و بەنازدەکەن و لەژێرەوەشڕا دەڕوانن و بەگۆناخوێن تێزاوەکانیانەوە دەگەڵ فشاری دەستی کوڕە لاواندا خۆ دەکێشنەوە تا بەچاکی لەنگەر دەگرن؛ ئەودەمی کوڕان هەنگاوێکی بەچەپەی یا راستەیدا هەڵدێننەوەو کەنار دەگرن و دەستان دەبن هەنگلێ خۆ دەنێنەوە... و دووبارە جارێکی دی و جارێکی دی... جاری وایە جۆلانە دووکەسیە: دووگوریسیان بەدوو لقەداری بەرامبەر یەکەوە هەڵخستوون: کوڕە دە یەکێکیدا و کچە دە یەکێکیدا؛ پێیەك ئازاد و ئەوەیدی دەقولفەی هەلۆرکێدا: بە لەنگەری پێیە ئازادەکەیان پالأن پێکوە دەنێن و دیلانێ دەکەن- تا سەر سپییەکی ناقۆلأیان لێ پەیدا دەبێ، ئەو دەمی کچ بەچاوی شۆڕەوە و بە روخسارێکی کە لەشەرمان و لەبەر گڕو بلێسەی گەرمی دەروونی رەش داگەڕاوە و دەنکە ئارەقەی شەرمێی لەسەرنیشتووە، ناچارە چمکی لەچکەکەی بەلالێویەوە بگرێت و دوورکەوێتەوە. سەر سپییەکان ئەوجۆرە دیلانێیەیان لاپەسەند نییە، ئیدی خۆ سەروەختێك ئەوانیش ئەو جۆرە دیلانێیەیان بەئاوات خواستووە، زۆر جاران شاییە دەکەن. کچ و کوڕ، دەست لەناو دەست، پەنجە لەناو پەنجەدا، بە شێوەیەکی نیوەبازنەیی چەند ساتێکان لە دەوری ئەو کوڕەی بەزمی شاییە دەلێ هەڵدەپەڕا، هێندە هەڵدەپەڕن تا کاتێکی کە دەست بەردەدەن هەرچەندە زۆر جارانیشیان جێ گۆڕکێ کردووە ناو لەپیان ئارەقەی دەرداوە، کوڕانیش زیاتر جێ گۆڕکێ دەکەن و لەو دۆیەی دەگوزانەوە دەستی دۆیەکی دی. دیارە کە هێشتا بەتەواوەتی دڵیان نەدۆڕاندووە، دەنا ئەویندار هەرگیز لێك دوور ناکەونەوە و لێك دانابڕێن. سەرەنجامی زۆربەی ئەو دیلانێ و رەشبەڵەکانەش خوازبێنی و هاوسەریەتییە... لەناو کیژاندا بەتەنێ هەر مەلیحەیە کە ناچتە دیلانێ و رەشبەڵەکێ ناکا- ئاخر هێشتا دانەمەزراوین؛ هەرچەندە ئاشکراشمان نەکردووە کە پرسەدارین. جگە لەوەش، کاکەش هەر زیندانییە...



فەیزوڵلاش هەر دیلانێ (جۆلانێ) ناکات؛ ئاوالەکانی رووی لێدەنێن کە دە دەستی سیروانی یا شیلان یا گەلاوێژێدا هەڵپەڕێ کەچی ئەو هەروەك گوێی لێنەبووبێ دوور دەکەوێتەوە...

دایی دڵخۆشە: بەردەکەی هەر لە هەوەڵی مرازەکەیەوە گرتوویەتی و پێوە نوساوە! بەڕوویەکی مەیلە و ترس و زەردەخەنەوە دەڵێ: ((بە قودرەتی خوای! هەر پاڵم پێوەنەنا، باوەڕتان بێت!)) پورە فاتم و هەموو ژنەکانی دی دڵخۆش و شادن: ((نیازی گوڵبەهارێ گرتوویەتی! کام دایکێك لە وەدیهاتنی نیازی دایکێکی دیدا، ئەویش کە پەیوەندی بە مەرگ و ژیانی کوڕەکەیەوە بێ، خۆشحاڵ نابێ؟ و گوڵبەهار، سەیرکە چ دەڵێم... ئینشاڵلا هەر ئەو یەك دوو رۆژەیە، هەواڵێکی خۆش دەبیسی. من بۆ خۆم نەزرم کردووە، ئینشاڵلا هەر کە هەواڵێکی خۆش هات و کوڕەکەت بەرهەڵدابوو یەك دانە گیسکم داناوە بیکەمە قوربانی...)) دایی دەیگوت: ((خوا بکا وابێ؛ خەریکە شێت بم- خوابکا- خوا مندالی هەمووان بپارێزێ- بۆ خاتری هەر پێنج ئیمامان!)) و ئەوجا دەهاتینەوە؛ و دایی تا بلێی سووك ببوو، وەك بلێی دوای چەند مانگ رێپێوانی حەمامێکی گەرمی کردبێ و چێشتێکی خۆشی خواردبێ- تا چێشتەنگاوێکی درەنگ هەرنوستبوو. دیاربوو دەو نێوەیدا جاروبارە ئاوازێکی هەر سازکردبوو: ((تۆ کە ئەو پارەیەی بۆ بەرێکردنێیت قەرز کردبوو ئەگەر نەتداوەتەوە یەك دوو رۆژان برۆ، بەڵکە سوسەیەکی بزانی و هەواڵێکت دەستکەوێ... ئاخر ئەو منداڵە بەستەزمانە گوناهە. ئێمە هەروا بەهەویا خوای لێگەڕاوین- گوناهە: یەك دوو رۆژان برۆ، بەڵکە ئەوە خوایە هەواڵێکی بزانی!... خۆ ئەگەر پارەکەشت داوەتەوە ئەوە دەتوانی وەرگریەوە... ئاخر وەڵلاهی خەریکە شێت بم... ئێمە هەروا دانیشتووین، و کەس نازانێ ئەو بەستەزمانە چی بەسەرهاتووە. خوا هەڵناگرێ!...)).

بابەگیان لەجێی خۆیەوە زەرد دەبوو و رەش دادەگەڕا، بەلأم هیچی نەدەگوت- هیچی نەبوو بیلێ. لەوانەبوو دە دڵی خۆیدا بیربکاتەوە داخوا ئەوەی کە روودەدا و تێدەپەڕێ، یا ئەوەی کە دەیبینێ راستە و ئەو تێی ناگا. ئاخر وێنەی ئاریشەکان زۆر سادە و ساکار و دڵنیاکەرەوە دیاربوون: ئەوە ئەبولفەتح خان هەروا شتومەکان دەکڕێ و پارەی نادا، جەناب سەرهەنگ و ئەوانیدی هەروا بەردەوام زۆر بەپشت ئەستووری و دڵنیایی تەواوەوە دەبەن و دەخۆن و دەکەن؛ رەفتاری لەسەرەخۆشیان دڵنیایانە و روخساریان پشتیوانی و زەردەخەنەی سەرلێوەکانیان ئەوە پێشاندەدەن کە ژیان هەر وەك خۆیەتی و سادە و ساکارە، و دەوڵەت دەوڵەتی ((خەڵکی))یە.

لەدڵی خۆیدا وای بۆ دەچوو کە دەبێ پێویستییەکی وا دەژیاندا هەبێ کە ئائاوا ئەم کوردە یا ئەو کوردە بێ دەسەڵاتەی دەگرن و لێیدەدەن، یان بەدارێیدا دەکەن، یان منداڵی خەڵکی دەگرن و بەزۆر دەینێرنە سەربازیە و لەوێ لەناوجۆرەها نەخۆشی بێ پزیشك و داودەرمان بەرەڵڵای دەکەن. هەردەبێ پێویستییەکی وابووبێ کە خودی ئەو خۆی، و کوڕ و کچەکەیان ئاوا بەورۆژە گەیاندووە. گێژو وێژ بوو، بەڵام نەوا کە هەست بەهیچ نەکات: خۆی دەخواردەوە؛ ئاڵۆز بوو، وەك بەدوای سەرە دەزووی خەونێکدا بگەڕێ کە بەشی زۆری ئەو خەونەی لەبیرچوو بۆوە و دەیویست بەپینە و پەڕۆ و پارچە و پوچان خەونەکەی پینەکاتەوەو وەبیری بێتەوە... بەڵام سەرنەدەکەوت- و کێ دەڵێ وەختی خۆشی فەتەشێت و ئەحمەد شاش هەروا نەبووینە!... ئێستا ئەوە وردە وردە دێ دەگەڵە خۆیدا بڵێ- جاری وایە تووڕە، جار هەیە تێماو، و بە روخسارێکی پۆزش ئامێزەوە. جاری وابوو کە دەچووە دوکانێ- زیاتر لە گەڕانەوێشیدا- کە لەپشتەوەی دەڕۆیشتم بگرەو بەردەیەکی کە دەگەڵ خۆیدا بوو کەمن هەرگیز سەرم لێدەرنەدەکرد، وەبەر گوێم دەهات و دەبیست. داییش بەو حاڵەی وی زانیبوو، و هەر لەبەر هێندێش بوو کە زۆری سەرنەدەکردە سەرێ. دیاربوو بابەگیانیش هەر بیری لەوە دەکردەوە حەوت هەشت تمەنێکان پاشەکەوت کات و دوو سێ رۆژان وەدووی کاکەی کەوێ تا بزانێ چی بەسەرهاتووە. خۆر هەروا هەنگاوی بەسەر رۆژەکاندا هەڵدێنایەوەو بەرەو وەرزەکان دەچۆوە. ساڵێ دی زوو تێپەڕی و پایز بە خۆو بەغەمە هەمیشەییەکانیەوە بەخێرایی نزیك ببۆوە ((سەرما لێرە زوو دەستی پێدەکرد) و هەر راست وەك پەرەستارێك کە بەزەیی بەناڵە و هاواری منداڵاندا نایەتەوە و گوێیان ناداتێ، ئەئاوا بەرگی لەبەر درەختان دادەماڵی و بۆ خەوی زستانیی ئامادە دەکردن. پەرەسێلکەکان لەسەر تەلی تەلەفۆنی پێش ماڵێمان ریز دەبوون و دەربارەی کۆچی بەرەو گەرمەسێرییان راوێژ دەکردن- هەندێکیان پێشتر رۆیبوون. ئاسمان پاك و بێگەرد بوو، بەڵام پەڵە هەورەکانی کەوەپێش بای کەوتبوون بەسەر چەند ئەستێرەیەکی تازە هەڵاتوودا کە تازە بەتازە تروسکە تروسکیان بوو رادەکشان و پەردەیان بەسەردا هەڵدەکێشان- و تێدەپەڕین. با، گەردەلول و تەپوتۆزی دەشتێی دێناو بەسەر شاری وەردەکرد و هەناسەی ساردی بەسەر ماڵێ مەدا هەڵدەکێشا، تۆز و خۆڵی غەمی چەند مانگانی بەسەر داییدا دێناو دەبرد، مەلیحەی دەتەکاند و ئارەزووی فەیزوڵڵای بەسەر ویدا دەتەکاندەوە. فەیزوڵڵا دەمەو خۆراوایان لە دەرماڵێ پورە فاتمێ کەجێی خڕبوونەوەی ئەویندaران و گۆیندەی هەواڵان بوو



رادەوەستا و دوورا و دوور دەماڵێ مەوە، گوایە تەماشای مانگێ دەگا، ئەگەر مانگ بە ئاسمانێوە بایە، رادەما، دەنا دەقشڵە و قەڵاتێ حوکمەتییەوە رادەما و هەناسەی هەڵدەکێشان و گەرمی ئەو هەناسانەشی بۆ یاریدەدانێ دەست و پەنجەکانی مەلیحەی دەناردن کە پێیان خەریکی شوشتنێ مەنجەڵ و قابلەمە و پیاڵە و ژێرپیاڵان بوو و لەسەرمان شین هەڵگەڕابوون، بای دەهات و ئاگری غەم و لێکدابڕانێ ئاواڵی گەمان دە دەروونی مندا هەروا نێڵەی بوو- ئاخر دەبوو ئەو ساڵ بچمە قوتابخانێ. با هەڵێدەکرد و لە کوچە و کۆڵان و بازاڕاندا کڵاوی سەری ((گەورە پیاوان))ی دەفڕاند. گەورە و پیاوماقوڵ بەدوای کڵاوەکانیاندا باڵیان لێکدەدان؛ ئەوانەی کڵاویشیان بەسەریەوە مابوو بە هەردوو دەستان دەستیان بە کڵاوی خۆیانەوە گرتبوو بانەیبا. بەڵام دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بیری لەو خەڵکە و لە رۆڵ و نەخشی خۆی نەدەکردەوە و کەس نەبوو نەخشی خۆی و بای پایزێ و ئەو کڵاوانەی با لەسەرانی دەفڕاند پێك بگرێ، چونکە وادیار بوو وازیان لە کڵاوێ هێناوەو ئێستا نۆرەی پێستییە.

دایی لەلای پەنجەرەکەوە دانیشتبوو وەدە درەختەکەی حەسارێوە رامابوو، وادیاربوو درەختی تاین بەو سەرنجانەی وی وەلەرزە هاتووە و گەڵا رەنگ و روو پێنە ماوەکانیشی یەك بەدوای یەکدا هەڵدەوەراندن. بەڵام دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا وەك منداڵێکی بزۆز خەریکی بزۆزیە بوو، و هەموو جلەکانیشی لەبەرخۆی دانەدەماڵین- ئەوشۆ، بەلانی کەمەوە، بەگۆرەوی و کراسەوە دەنوون! تەپوتۆز و گەردەلول بێدەنگییەکی سەیریان کە پێش شەوداهاتنێ بەسەر دەشتێدا کێشابوو هەر ئاڵۆز بوو- قیڕەقیڕی بۆق و قوڕاویلکان لە چ جێیەکیرا نەدەهات.

پەنجەرەکانمان هەموو داخستبوون، و چاوەڕێی هاتنەوەی بابەگیانمان دەکرد، کە فەیزوڵڵا بە هانکەهانکەوە گەیشتێ، و هەواڵی هێنا کە بابەگیانیان گرتووە! چەند نانێك و شووتییەکیشی دەگەڵە خۆیدا هێنابوون، گوتی ئەوە بابەگیان داویەتێ بیانهێنێتەوە. چارەکە سەعاتێك زیاتر وەك دەنگی ئوتومبێلێکم بیستبێ؛ پێوە بووم بچم و وەك منداڵەکانی دی خۆی پێوە هەڵواسم، بەڵام گەردەلول و چاوزەق کردنەوەی دایی و رووترش کردنێ مەلیحەی نەیانهێشت، و ئێستاش تازە وەختی چوونەوە دەرێ نەمابوو. بای دەهات و رەهێڵەی بە باوەش تاوە ناتاوێك پەنجەرەکەی دەکوتا. فەیزوڵڵا هیچی دەربارەی ئوتومبێلێوە نەگوت. گوتی دووبارە دەچێتەوە بزانێ داخوا هەواڵێکی وەگێردەکەوێ یا نەنا- بەهەرحاڵ هەردێتەوە. دایی و من و مەلیحە، بە

غەریبی، ماینەوە- ماوەیەك دانیشتین، و فەیزوللاّ قولاّغێكی نەبوو، و دایی وردە، وردە كەوتە دڵەڕاوكان. چوو بوو هەروەك جاران كە كاكە لە ماڵێ بوو دەركەی دەرێی داخستبوو، هەرچەندە هەوڵیشی دەدا بەسەرخۆی نەهێنێ، بەلاّم بە ئاشكرا پێوەی دیاربوو ناراحەتە. نیو سەعاتێك بەسەر رۆینێ فەیزوللاّیدا تێپەڕیبوو كە دیسانەوە دەنگی لە دەركەدانێ هاتەوە. ((ئاه، فەیزوللاّ... خودایە تێر عەمربی، لاوە!)) من چووم و دەركەم كردەوە. فەیزوللاّ نەبوو- پورە خورشید بوو! دایی بەدیتنێ وی تێكڕابوو- وای لێهات! ترس و نەفرەت و شەرمەزاری دە روخساریدا... هەمو شتێك بوو؛ هەروەك لەلای كۆمەڵێك بێگانە پیسپیسۆكێك یاسیسركەیەك شەڵتەكەی كون كون كردبێ. ئاخر رووداوی مردوو شۆڕییەكەم هەموو بۆ گێڕابۆوە. دایی زەق زەق سەیری كرد- بێ ئەوەی فەرموویەكی لێبكات. پورە خورشید بەو چاوانەوەی كە هەمیشە پرتە پرتیان بوو، بەو دەنگە گڕەیەوە گوتی كە بەڵێ، كاك سلێمان میوانی هەیە- ئەوە لەوێڕا دێت- گوتبووی بچێت لە دێیەكەی خۆی، بەلاپاڵەكەوە، گۆزە رۆنێكی لە كوێخای وەرگرێ و بیهێنێ؛ لە دێیڕا دەگەڕێتەوە ئوتومبێلێكی دەبینێ، لەو ئوتومبێلانەی كە سەربازان هەڵدەگرن كە لەدەم جۆگەكە خوار چایخانەی ((رەشە قەلاّت))یەوە راوەستابوو، ئوتومبێلەكە پڕ لەسەربازبووە؛ كاتێ ئەو بەخۆو بەگۆزەوە بەلایدا رەتدەبێ وەكیل باشی گەورە سەربازەكان وا دەزانێ ئەو گۆزەیە گۆزەی دۆیە، داوای دۆی لێدەكا... دوایی چایەچییەكە بە سینییەك چاوە هاتووە و هەرچی دەگەڵ وەكیل باشی كردووە كە تا درەنگ نەبووە و چەتە و مەتە دیارنین وەڕێكەوێ، بەلاّم وەكیل باشی گەورەی سەربازان گوێ ناداتێ، گوتوویە دەستوور وایە كە تا هەوا تاریك نەبێ نەچینە نێوشاری و نەیهێشتووە ئەو و چایەچییەكەش لە ئوتومبێلەكە نزیك ببنەوە. (هەروەك كلیلی دەزگایەكی لەناوێڕا بادەن، روخساری دایی وردە، وردە نەفرەتەكەی سەر دەموچاوی لێ وەلاكەوت و حەز و تاسە و ئارەزوویەك جێی ئەو نەفرینەی دە دەموچاویدا گرتەوە- دایی ئەوە ئێستا زۆر بەتاسەوە گوێی هەڵدەخا) ؛ بەلاّم ئەو، یانی پورە خورشید پیاڵە چای یەك لە ئەمنییەكانی كە بۆ لای ئوتومبێلەكە بردووە، ئەو چاوەدێری كردووە و... هەمان ئەو لاوەی دیوە كە ئەو رۆژە تەقەی لەو رەییسە گەورە كردووە. كوێر بێ ئەگەر درۆ بكا- ئاخر بۆ خۆشی ئەو رۆژە بە ناخێری گیانیەوە چووبوو سكالاّنامە بداتە رەییسی گەورە، لەبەر ئەوەی دەیانگوت كازمی كوڕیان دەوێت بیبەنە سەربازییە. بەڵێ بەو دووچاوانەی خۆی دیویەتی- هاتبوو مزگێنی دەویست.



دایی دەستوبرد فانۆسەكەی پێكرد. دەستی گرتم، و لە ماڵێ هاتینە دەرێ- بێ ئەوەی بەكەس بڵێین. بایەكەی شكاندبوو، بەلاّم باران هەر دەبارێ- چاڵ و چۆڵ داوەستابوون و پڕ ئاوببوون؛ ئاوی چالاّوان هەموو بڵقیان دابوو. تا دەهات بڵقەكان دە ئاوسان و دەگەڵ دڵۆپە بارانێدا دەتەقینەوە، و ئاسمانیش هەروا بەردەوام رێژنەی دە چالاّوان دەكرد. بەلاّم ئاسمان نیوە ساف ببۆوە و مانگی چەند شەوە بە ئاسمانێوە لەنێوان لوتكە چیای ئاربابا و پیر سلێمانیدا هەروا سەرەتاتكێی بوو. وێنەی مانگەكە دەچالاّوەكاندا دەلەرزی، هەرچەند جارێكی پەڵە هەورێكی ناقۆلاّ پەیدا بایە ئەوە ئەو دیمەنەی لێڵ و پێڵ و وندەكردەوە. ئێمەش دەستێكمان دەوتێكدانەی وەردەدا و دەهاتین وەنێو چالاّوان دەكەوتین و وێنەی مانگەكەمان تێدا ورد و خاش و پارچە پارچە دەكرد، و مانگیش وەك ماری سەرپانكراوە هێندێكی جینگڵ دەدان و دوایی هێور دەبۆوە و دەهاتەوە دۆخی جارانی. بەلاّم تا لێرەی وەك خۆلێدەهاتەوە لە لایەكی دیكەوە تێك دەچۆوە. دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هیچ تێكنەدەچوو و توڕەش دیار نەبوو: زۆر بە ئارامییەوە نووكە داسولكەییەكەی لەلێوی چاڵەكە گیردەكرد. گەیشتینە نزیك پەخشداری، سووسەیەك نەبوو. هەرچیەكمان كرد و كراند زەینەڵ پاسەوان نەیهێشت بابەگیانی ببینین. لە هەوەڵێوە گوتی لێرە نییە، دوایی گوتی قەدەغەیە، كاتێ دایی زۆر پاڕایەوە زۆر بە توڕەییەوە لە دەركێی دوورخستینەوە. ناچارهاتینەوە. لە گەڕانەوێدا چووینە ماڵێ پورە فاتمێ. دایی هەموو رووداوەكەی بۆ گێڕایەوە. قسە لەوەی نەبوو كە ئوتومبێلەكە هاتووە، ئەو دیتوویەتی. پورە فاتم منی دەگەڵ مەحموودی نەوەیدا، ناردە ماڵێ پوورە فریشتەی كچی، كە هەر دیوار بە دیوارییەوە بوون دەگەڵ ماڵە خۆیاندا. بە مەحموودی گوت هەرچەندە وەختیش درەنگە وەختە بەڵكە بچێت و لە دایەرەی لە یەكێك لەو سەرجوخە و وەكیلانە، چووزانێ، هەر كەسێك بوو، هەواڵێكی وەرگرێ. ((دەی، بە قوربانت بم، خێرە، -غەریبەن- گوناهن!)) هەر ئەو رستەیەی لەزاری هاتەدەرێ دایی لە پڕمەی گریانێیدا.

لە بن لێوی سواندەی بانی، هەتیوانە سەری بەردابۆوە و بەكەساسی دەگریا... مەحموود دوكاندار بوو و دەگەڵ نیزامیاندا دۆست بوو و دەیناسین. گوتی هەر ئێستا دەچێت و هەوڵدەدا هەواڵ و باسێكی هەر بێنێتەوە، هەرچەندە دایەرەكەش دوورە و قەرەوڵ و پاسەوان نایەڵن. بۆ سەگ لەخۆ دەركردنێ بێڵێكی كە لە سوچێكی ژوورێ هەڵپەسێردرا بوو، دەستدایە و سەرەكەی لێكردەوە و كلكە بێڵەكەی بەدەستەوە گرت و ملی لێنا. گوتی هەركاتێ هاتەوە خەبەر دەدات.

دەگەڵ داییدا هاتینەوە ماڵێ. مەلیحە دانیشتبوو و دەگریا. هێشتا زۆر نەبوو هاتبووینەوە کە دیسانەوە دەنگی دەرکەی هاتەوە. ئەمجارەیان دایی بۆ خۆی چووە دەرێ. فەیزوڵڵا و دایکی بوون، و بەخۆ و بە دەورییەك کە بابەوە. گوتی کە چووە، بەڵام هەرچییەکی کردووە و کراندووە هەواڵێکی راستی بۆ لە گروبانی قەراوڵخانەی دایەرەی وەچنگ نەکەوتووە. گوتی ئوتومبێل هاتووە بەڵام هیچ کەسێکی ئەوتۆی نەهێناوە- هەر تەنیا ئەو سەربازانە بوون کە تازە گوازراونەتەوە ئەو هەنگە (فەوج)ی ئێرە. و لەوانەشە بەلای خۆیەوە راستی گوتبێ، چونکە پورە خورشید هەر لەخۆڕا زۆر دەڵێ- دیارە ویستوویەتی شتێکی وەگێرکەوێ.

بۆیەشی کەباب هێناوە، چونکە زانیویەتی پورە گوڵبەهار نەپڕژاوە شتێکی بۆ ئێوارێ لێنێ؛ دایکیشی هەر بۆیە هێناوە، چونکە مامە مەشەدی لەوێ نییە، تا لەلامان بێت و بە تەنیا نەبین. دایی لەبنی زگییەوە دوعای بەخێری بۆکرد. بەڵام هەروا لە کوڵ بوو. هاتبووە سەری بچێتە ماڵێ ئەبولفەتح خانی بەڵکە ئەو شتێکی لە دەستبێ، فەیزوڵڵا گوتی ئەویشیان دەگەڵ دێت. تا ئێمە لە نانخواردنێ دەبینەوە ئەولەلای پورە فاتمێ دادەنیشێ، تا مەحموود دێتەوە. ئەگەر پورە گوڵبەهاریش هەر لەسەر قسەکەی خۆی سووربوو بچێ ئەوە هەموومان پێکەوە دەچینە ماڵێ ئەبولفەتح خانی.

دانیشتین و هەرچۆنێك بوو شامەکەمان خوارد —لەو دەمیەوە کە فەیزوڵڵا هاتبۆوە مەحموودیش هەر هیچی بە هیچ نەکردبوو. هەر ئەو وەڵامەی بە فەیزوڵڵایان دابۆوە بەویشیان گوتبۆوە. فانۆسەکەمان داگیرساند، فەیزوڵڵا فانۆسی تاودایە و کەوتینەڕێ.

شار دە باوەشی مێژوویەکی مردوودا نووستبوو —جگە لە چایخانەکان- سێبەری دیوارە باریك و سەربانە هەڵتەکیوەکان، کۆڵانە تەسك و تروسکەکانیان پڕکردبوون: دلۆپە ئاوی بارانێ لەسەرخۆ و بەخوڕ لە سواندەکانەوە دەهاتەخوارێ: یەك- دوو- سێ چوار پێنج. دوو- سێ... یەك دوو سێ! و ئەوجا لورەی بایەکە دووکەڵی لولە سۆبەی سەربانەکانی لول دەدا، هەر دەتگوت مووشەدەمەی ئاسنگەرییە: ((فوو- و-ها!)) و ئینجا شەققەی پێکدادانی دەرگای ماڵێکی ئەو نزیکانە، و سوڕ و لول و پێچدانی ئەو گەڵایانەی لە داران دەبوونەوە، و خۆیان بە دیواراندا دەدا و دەکەوتنەوە و بەردە بوونەوە سەر زەوی و ئارام دەبوونەوە، و ((عەوە عەو))ی سەگێکی بێ پەناو بێ کەڵبەوددان، و دەنگی گرامافۆنێکی ماڵە خوا پێداوێکی کە مێژووی مردووی تێدا



بێداربوو- ماڵێ سلێمانی- و ئاوازی ((گوڵ- شە- نی- ئاشنایی- بووە- خەزان!)) دەکۆڵانێدا دەرشایەوە و دەنگی پێی دوو رێبواری درەنگ وەخت تێکەڵاوی شڵپە شڵپێ دەبوو.

ماڵێ ئەبولفەتح خانی لە گەڕەکێ سەرەوە، نزیك مزگەوتی سەید رەزای بوو. فەیزوڵڵا لەسەری کۆڵانێوە ماڵەکەی پێشاندا و بۆ خۆی چوو لە پەنایەکی راوەستا، و ئێمەش بەخۆ و بە فانۆسەوە چوینە پێشێ، و لە دەرکێماندا... دەنگی کرانەوەی دوورا و دووری دەرکێکی ئەو نزیکانە و پرسیاری کچێك ((کێیە؟))- وتکای ((بیکەوە))و دووبارەی دەنگی کچە ((کاکە گیان!)) و بەدوایدا هەمدیس کردنەوەو داخستنەوەی دەرکێ و ئەوجا خشەخشی پێڵاوێکی کە لە عەردی دەخشا.

ئەبولفەتح خان دەرکەی کردەوە... بەخۆ و بەبێجامەوە. راست وەك مەیموونە قون سووری سێرکان کە بۆ گاڵتە بازییەی جل دەبەر دەکەن.

دایی سڵاوی کرد؛ من خۆم گورج کردەوە، و ئەبولفەتح خان لادەرکێکی بە تەنیشت خۆیەوە ناو بەو دووچاوە زەرد و بیلبیلە رەش و زەقانەیەوە تێمان راما. پشیلەیەك لە بانی ماڵە دراوسێیەکەوە خۆی هەڵدایە سەر دیواری حەسارێ. دیتم، ئەبولفەتح یەك بەخۆی راچڵەکی، و هەروەك ئێمە بازماندا بێ رووی لێ تێکنایین.

بێ هیچ فەرموو و مەرموویەك گوتی: ((ها، چتان دەوێت؟)).

دایی بەسەرهاتەکەی زۆر بەکورتی بۆ دووبارە کردەوە: ئەبولفەتح خان بە روخساری خاوەن قەرزێك کە قەردارەکەی هاتبێ و داوای مۆڵەتی قەرزدانەوەکەی لێبکات گوتی: ((باشە مەشەدی خانم، ئێستا دیوارێکی لە دیواری ئێمەت نزمتر نەدۆزیوەتەوە، هاتووی توشی چورتمێکمان کەیت؟ ئەوەی پێتان کردین لە باب و باپیرانیشمان زیادەو بەشی حەوت پشتمان دەکات!)) ویستی بچێتەوە ژوورێ بەڵام دایی کەوتە پاڕانەوەو لالانەوە.

ئەبولفەتح خان بەڕوویەکی ترش و تاڵ و توڕەوە گوتی: ((ئەوە بۆ خۆتان دەبینن من لەماڵەوەم و بەخێری ناگیانم گوایە دەحەسێمەوە! ئێوە دەڵێن ئوتومبێل هاتووە — من ئەوە ئێستا لە ئێوەی دەبیەم، ئاگام لە مەحموودی بێ زەواد نییە. لەکوێڕا بزانم؟ گەراجم هەیە، بابم شوفێر بووە، بۆ خۆم شوفێرم... ناتوخوا هەر بۆ خۆتان بڵێن، لە کوێڕابزانم؟ دەڵێن کوڕەکەتیان

هێناوەتەوە، باشە وایە، دەبا ئەویش وەکو کوڕی ئەو خەڵکەی ملی خۆی شۆڕکردبایە و خەریکی کاری خۆی بایە و دەرسی خۆی بخوێندایە، و ئەو کارە چەوتانەی نەکردایە!... خەڵکی هاربووینە. دەو هەموو ناز و نیعمەتەیدا دەگەوزن و ئەوجاش دەگەڵ ئەو هەموو ئەمن و ئاسایشەیدا دێن و ئاوا چەلەنگانە بەڕووی گەورەکانیاندا دێنەوە! دیارە، کاتێ کە کارێکی وا دەکەن ئیدی نابێ چاوەڕێی ئەوەی بی نوقڵ و نەباتی لە پێش بگێڕن و خەڵاتی کەن. نا، ئەوە هەر خۆمانین- ئێوە بن وادەکەن؟... دەڵێی ئەدی مەشەدییان بۆ گرتووە، بڕۆ لە خۆی بپرسە؛ سەرێکی هەیە و هەزار سەودا! منیش وەکو ئێوە تێماوم... بۆ گرتوویانە؟...)) ئەو قسانەی هەموو وەك ستلێکی ئاوی سارد بەسەرداکردین و دەرکەکەی داخستەوە. ئەو چۆوە ژوورێ و ئێمەش هەروا لەجێی خۆمانەوە وشك بووین. سەرەنجام دایی هاتەوە سەرخۆی، و غەمبار و پەرێشان هاتینەوە سەری کۆلانێ و دەگەڵ فەیزوڵلایدا هاتینەوە ماڵێ. و بەدەم رێوە دڵخۆشییە خۆمان بەقسەکانی فەیزوڵلای دایەوە لەو قسانەی کە پورە خورشید کردبوونی- هەرچەندە گرتنی بابەگیانیان بەلاوە مەتەڵێك بوو. وشەکانی ناز و نیعمەت و ئاسایش و دڵنیایی، لەزاری دایی نەدەکەوتن. دیارە هەر لەبەر ئەو هەموو ناز و نیعمەتەی بووە کە دەبوو فەتەشێت و ئەحمەد شا و پورە قەوەت وایان لێ بەسەر بێ، ناز و نیعمەت! عەجەب ناز و نیعمەتێك!

لەلایەکی ئەوە منداڵەکەت. ئەو بەلایەی بەسەربێنن، لەلایەکی دیشەوە ئەوەشیان ئاوابگرن، مێردت هەر رۆژە نا رۆژێك باوێنە ژوورێ... ئەوە چییە ئەمنییەت! لەبەر زۆر ئەمنیەتیان لەو کاول بووەی ئەو لای هەڵاتین... لێرەش ئەمنییەت هەروا زمان لێناهێنێ... فەیزوڵلا تاوێك دانیشت، دوایە بۆ نووستنێ چۆوە ماڵێ. ئەو شەوە تا درەنگانێکی دەگەڵ داکیدا دانیشتین. دایکی پیرێژنێکی لاواز و رووخۆش و قسەخۆش و بەسۆز بوو، و دەگەڵ کوڕەکەیدا پێکەوە نزیکی کانیی میر، لە بەشی لای بەرەوەی شاری، پێش گۆڕستانی غەریبان سەریان پێکەوە نابوو. کراسێکی گوڵداری لە رەنگی کراسەکەی مەلیحەی دەبەردابوو.

گوتی: چاوەکانم، سەیری کراسەکەم دەکەی؟ رەنگە بڵێی بەخۆو بەو تەمەنەتەوە کراسی گوڵدارت لەبەرکردووە؟ راستە ئازیزەکەم، بەڵام خۆ من بۆ خۆم قەت ناچمە بازاڕی، ئەوە فەیزوڵلاگیان هێناوەتیەوەو دەڵێ ئیللان و بیللان هەردەبێ دەبەریکەی، حەزم لە رەنگەکەیەتی)).



مەلیحە هیچی نەگوتبوو. سورهەڵگەڕاو چاوە بێ گوناهو منداڵانەکەی بەردانەوە. لەجێی هەمیشەیی بابەگیانی، لای سۆبەکەوە، دانیشتبوو و بەچاوە زیتە بە قوڵداچووەکانی وای تەماشای مەلیحەی دەکرد، هەر دەتگوت پیاوێکی پیسکەی رژدی چاوچنۆکە و لەمشتە لیرەیەکییەوە راماوە- بە شێوەیەکی وا بەتام و چێژ و خوێ و بەڕوویەکی واگەش و روونەوە هەر دەتگوت ئەوە ئاوی دەزاری زاوە. هەر مەلیحە قسەیەکی دەکرد ئەو سێ چوار جارانی خۆ بە قوربان و سەدەقە دەکرد. فارسی نەدەزانی، بەڵام هەمیشە رووخۆشبوو، و هەرکاتێ مەلیحە پیاڵە چایەکی لە پێش دادەنا دەیگوت: ((بەدایکی کوڕان بی))- هەر لە ئێستاوە مەلیحەی گڕدابوو. بەلانی کەمەوە ژوورەکە بارودۆخێکی سەیری بۆ مەلیحەی وەدی هێنابوو. بێجگە لە نیگەرانی دایی- و هەمووان- لەوێبوونی پورە غونچەی بارێکی لەبار و تایبەتی دە دڵی مەلیحەیدا وەدی هێنابوو: هەموو گیانی هەرگوێ بوو، وەك هەر ئێستا ترپەی پێی ئەو کەسەی کە ماوەیەکی زۆرە چاوەڕێیەتی دە دالانەکێدا ئەوە دێت، یا هەر خودی ئەو کەسەیەو لە دەرکێدەدا. سەرەنجام لای بەرەبەیانی نووستین. پیرێژن خەوی نەبوو، و دایی سوودی لەم هەلە وەردەگرت و بۆ غەم و ترس رەوێنیە، و دڵدانەوەی خۆی هەر تاوە ناتاوێك دەیپرسی: ((پورە غونچە، ئەوە نەنووستووی؟ بۆ نانووی، جێیەکەت ناخۆشە؟)) و پورە غونچە دەیگوت: ((نا، بە قوربانت بم، لە دەورت گەڕێم، جێیەکە زۆر خۆشە! ئیدی پیری و هەزار عەیب؛ هەموو ئێسقانەکانم ژانێ دەکەن، دەڵێن ئەوە بادارییە)) و هەناسێکی هەڵدەکێشا ((ئای-یە!)) و پلێتەی چرایەکەی هەڵدەدایەوە، و دادەنیشتەوە، و چاویان تێك دەبڕینەوە.

بایەکەی شکاندبوو؛ لایەکی پەنجەرەی کرابۆوە. ئەو شەوە هەروەك ئەو چەند شەوانەی کە کاکە لە ماڵێ بوو، دایی وەك کاکەی بە تەنیشت خۆیەوە هەست بکات و نیگەرانی ویبێ، چەندین جاران هەستایەوە و سەری بە پاشخانێدا گرت، و تا بەیانی هەر هەناسەی هەڵکێشان و جینگڵێدا.

* * *

## (١٦)

دایی و داکێ فەیزوڵڵای چێشتەنگاوێ لە خەوێ هەستابوون. دایی دەرکی حەسارێی کردبۆوە. تازە چاوم هەڵێنابوو کە زریکەی پێکەوەی دایی و مەلیحەی دە نێو جێیەکەیاندا هەژاندم. هەر زریکاندیان و هێرشیان بەرەو دەرکی کۆڵانێ برد، بەڵام وەك لەبەردەرکێ بۆ چوونەکانیان لێك جیاواز بووبنەوە: دایی بە دیتنێ مەلا حەسەن و سەروپرچ سپیانی گەڕەکێ خورپەیەکی بەدڵێدا هاتبوو، بەڵام دوو دڵ بوو. لە پەنجەرەیڕا روانیم. مەلا حەسەن بەخۆو بە شاقەلی شۆڕی دڕاو و پێلاوە لەبەریەك هەڵوەشاوەکەیەوە لەپێش سەر و پرچ سپیانی گەڕەکێوە ساڵدانە ساڵدانە دەهات و لێوی دێنان و دەبردن. فەیزوڵڵا چەند هەنگاوێك بەولاوەتر، بە گریانەوە، لە کەناری حەشیمەتەکەوە رێی دەکرد- و من چاوم هەڵدەگلۆفین و لە پەنجەرەیڕا ئەو شتانەم دەدیت. کاتێ کە نزیکبوونەوەیانم دیت و زانیم وەك بۆ لای ماڵێ مە بێن بەهەر دەردە سەریەك بوو لێفەو دۆشەکەکەم بردنە پاشخانێ. مەلیحە بەدەم گریانێوە هاتەوە. ژنەکان هەر کە گەیشتنە بەر دەرکێ هەموو پێکەوە لە سەلای گریانێیاندا. داکێ فەیزوڵڵای کە بەشە لەشەلەوە خۆی گەیاندبوونەوە دەگەڵە وان تێکەڵ بوو... زریکەکانی هەوەڵێی دایی دامرکانەوە، و بێدەنگییەکی مەیلە و کەم ئەوناوەی گرتەوە- دیاربوو وەك جاران لەخۆ چۆتەوە. سەروچاوی هەموو خوێن بوو، لە هۆش خۆی چوو بۆوە. فەیزوڵڵا لە باوەشێی کردبوو؛ چاوەکانی خۆشی بە گریانێ سووربببوونەوە... ژنەکان دەستێکیان دەگەڵ دایە و داییان لە پلیکانان بردە سەرێ. مەلا حەسەن بێ گوێدانە ئەو هات و باتەی، بەویرد خوێندنێوە، لە پێش دوو سێ ژنانەوە یەکسەر هاتە ژوورێ و، چوو لە بارێ سەرەوە، جێی هەمیشەی بابەگیانی لە پەنا ئاگری لە سەرچۆکان دانیشت. داییان بردە پاشخانێ؛ یەك دوو ژن و چەند کچۆڵەیەك پاشخانەکەیان راخست و ئامادەیانکرد؛ چەند ژنێك هەر لەوێ لە پاشخانێ مانەوە، و سەر و پرچ سپییەکانیش دەگەڵ داکێ فەیزوڵڵای هاتنەوە ژوورێ ناوماڵێ. من کز و مات و بێدەنگ بووم. گریانێ فەیزوڵڵای دەرفەتی نەدەدا هیچی لێ بپرسم. ژنەکان دانیشتن، مەلا حەسەن شاقەلی



کەوا یەکەی وەبن کلاوەی ئەژنۆی دایەوە، ئاهەنگی لێو بادانەکەی گرانترکرد، و گوتی: ((ئەعزەمەڵڵاهو ئوجورەکم وە ئەحسەنە عەزا ئەکوم و غەفەرە لەنا وەلە کوم، بیحورمەتی سورەتیل فاتیحا!)).

بێدەنگییەك باڵی کێشا، ژنەکان لێوی سەرپۆشەکانیان داکێشایە خوارێ، و هەموو فاتیحایان خوێند؛ دایی وەهۆش هاتەوە، و زریکاندی، و کوڵی، ژنەکانیش دەگەڵە وی دەستیان پێکردەوە. من لەسەرەتاوە پێم وابوو بابەگیان شتێکی بەسەر هاتووە، بەڵام دوایە هەر چۆنێك بوو بەلێو و چاو و برۆ بادانێ شتێکم لە فەیزوڵڵای هەر پرسی: ((بابەگیان هیچی لێهاتووە؟)) تا ئێرە گریانم نەهاتبۆیە. فەیزوڵڵا سەرێکی بە ئاماژەی نەخێرەوە باداو سەردەستەکەی بەدەم و لێو و چاوەکانیدا هێنا... ((کاکە؟)) ئەم جارەش هەر بەسەر، بەڵام بە نیشانەی ئەرێ! هەر کە ئەوەم دیت بێ ئیختیار یەکسەر وەگریە هاتم... مات مات ((لە کوێ؟)) هەر بەسەر بەتەپەی ((کۆنەبانە))ی ئاماژە کرد. وای، دیمەنی سێدارە و قەد و بالای کەڵەگەتی لاوە لە سێدارە دراوەکەم هاتەوە بەرچاوان؛ سەرم سوڕاو گێژ بووم؛ هەستم کرد رەنگم پێنەماوە...

دەونێوەیدا دایی وە ئاگاهاتبۆوە و سەروپرچی خۆی دەرنیەوەو دەیقریشکاند و لەڕووی خۆی دەدا. ژنان دەوریان لێدابوو، و دەگریان و ئەویش هەروا بە هەردوو دەستان لەخۆی دەدا و جاری واشبوو وەك دەهۆڵ کوتێ بەتاکە دەستێکی وەردەگەڕایە سەر و سینگ و بەرۆك و دەموچاوی خۆی. ئاوازی دەنگەکەی ئاوازی ناڕەزایەتیە بوو- بە بوون و نەبوون، بە چارەنووس: باشە ئاخر چی کردبوو کە ئاوا مستەهەقی هەموو ئەو سزایە بوو، چی کردبوو کە ئاوا دووچاری هەموو ئەو بەلایانە ببوو و دەبوایە ئەو هەموو تاڵیە بچێژێ- هێندە؟ بۆ؟... ئەمانە هەموو ئەو شتانە بوون کە هەر دەیگوتن و لەسەر و رووی خۆی دەدا، و رووی خۆی دەرنیەوە، و بگرەو بەردەو کێشمەکێشم و هەوڵی ژنەکانیش مەگەر لە لەخۆدانێ دایی زیاد کردبا دەنا بێ فایدە بوو. بۆ خەڵك بڕابوو خوا ئەو هەموو دەرد و مەینەتی و بەلاو ناخۆشیانەی بۆ وی ناردبوو؟ بۆیەخەی زەینەل عابیدینی کافر و ئەمیر لەشکری پیاوکوژ و خودا نەناسەکانی دی نەدەگرت، کە ساڵێ دوازدەی مانگێ بێ کار و بێ عار هەر دەلەوەڕێن و بەزەییشیان بەکەسدا نایەتەوە؟ ها؟ باشە بۆ؟ بۆ؟...

دوایە دەردە دڵەکانی خۆی بە شیعر دەکرد و دەستی دەکرد بە شیعر خوێندنەوێ:

غەمی عالەم نەسیبی گیانمان بوو

بە دەردی مە فەراغەت کیمیا بوو

غەمی هەر کەس لە ئاخردا دەوای هات

دەوای دەردی دڵی ئێمە بەلاَ بوو

مەلا حەسەن وەك هەمیشە زەردەخەنەیەکی شەرمێونی بەلالێوانەوە نابوو و تەزبێحی بادەدا، و لە بن لێوانەوە تۆبە و ئەستەغفاری لە دەست کفرەکانی دایی دەکرد... بەلاَم دەیزانی کە دایکە، و زگ سوتاوە، و خوداوەند رەحیمە... و دایی هەروا دەیگوت: تەنیا هەر ئەو و ئەوانەی وەك وین کە دەبێ سزاو تۆڵەی هەمووان بدەنەوە، و ئەو هەموو بەد بەختیەی بکێشن و... وای- وای... و ((شریق- شریق)) و ناوبژیە ژنان، کێشمەکێش و ((وای، کوڕەکەم، کوڕە لاوەکەم؛ وای کچەکەم، وای کچە نەو بووکەکەم، وای کوڕی تازە زاوام!... مەلا بخوێنە... بخوێنە... ئەوە بۆ وابێدەنگ دانیشتووی... کوڕە دەی فاتیحای مارەییە هەریەکەیان بخوێنە!... دەی دەبیخوێنەوە، بۆ وابێدەنگ دانیشتووی؟ وای، وای!)) دیسانەوە لەخۆچۆوە.

زێنەب بەخۆو بە شەربەوە بۆ ئاوێی راکردە دالانێ، و خێرا هاتەوە. هێندێکی ئاو بەسەروچاواندا پژاند... ومن هەوتبووم... مێشکم بەتاڵ بوو... لە پڕ قسەکانی بابەگیانم وەبیر هاتنەوە... ئێستا بابەگیان دەبێ چ بکا...! مەلا حەسەن ئەوەی بە هەل زانی و عەشەرە قورئانێکی خوێند: چاوی نوقابوون، زەردەخەنەیەکی شەرمێونی بەلێو و سەروچاوانەوە دیاربوو، و دەدەمی خوێندنێدازاری خوار و خێچ دەکرد. سەری دایی دەکۆشێ پورە فریشتەیدا بوو؛ پورە ئامینەی ژنێ ساڵحا غای، بەچکمی لەچکەکەی دەمی بۆ دەسڕییەوە- کەفی هەڵدابوو.

بەڕاستی ئەو مەلا و پزیشکانەش شتێکی سەیرن؛ دەماڵێدا کە بەلاَیەك دێت ئەوانە تەسەللا و دڵنەواییەکی یەکجار زۆر گەورە دەگەڵ خۆیاندا دێنن و دەبنە مایەی ئارامی و دڵنیاییەکی تەواو؛ هەر کە دەنگی قورئانێ هات ئیدی ئەوە هەموو بێ ئیختیار زاریان بەش دەکەنەوە؛ هەر کە پزیشکێکی دەبینن وەك هەلاَتنی مردنێ بە چاوی خۆیان ببینن هەموو رەنگ و روویان دەکرێتەوە و گەش دەبنەوە. چ بەهرەیەکی گەورەی ماڵە بەدبەخت و کلۆڵ و بەلاَ لێدراوانن! داکێ فەیزوڵلاَی دەو وەرەو بڕۆیەیدا، بە هاریکارییە کیژ و کالاَن سەماوەری دەم کردبوو و



ئەسبابی هەموو ئامادەکرد بوو- دایی دەپێشدای سەماوەر تێهاویشتبوو- داکێ فەیزوڵلاَی لە باری لای خوارێی ژووری، لە بن سەماوەرێ دانیشتبوو چای تێدەکرد و فەیزوڵلاَش هەروا بەدەم گریانێوە پیاڵە چایەکانی لە پێش مەلا حەسەن و سەر و پرچ سپییەکان دانا. دایی بێدەنگ بوو. رەنگە بەهۆشیش بوو بێ، بەلاَم لەبەر رێزی قورئانەکە وا بێدەنگ بووە. مەلا حەسەن بەردەوام دەیخوێند و دیاریش بوو هەر لەبەردایی زیاتری درێژە پێدەدا. هەر دەوکاتیدا دوو سێ پیاوی دیکەی گەڕەکێش هاتن...

سەعاتێك رابرد- بەلاَم چ رابردنێك! هەردەو سەعاتەیدا مەلا حەسەن دوو سێ جارانی دیکەی بەناچاری خوێندبۆوە. سێ چوار جارانیشی ((رەحیمەڵلاَهو لیمەن قەرەئەل فاتیحا)) دووبارە کردبۆوە. سێ سەعاتی مابوو بۆ بانگی نیوەڕۆیە کە ((لیمەن قەرەئە))ی چوارەم یا پێنجەمیشی گوت. کە فاتیحایەکە تەواوبوو هەستا؛ ژن و پیاو لەبەر مامۆستای لەجێی خۆیانەوە هەستان، و بێدەنگی پاشخانەکەی داگرت. دەدەمی رۆیشتنیدا بە فەیزوڵلاَی گوت وە دووی کەوێ، و رووی لە پورە رەعناو پورە فاتمێ کرد: ((ئێمە دەبێ بچین و بەکفن و دفنەکەی رابگەین...)) و بەدەنگێکی ئاشکراوە گوتی: ((ئێوەش ئاگاداری خوشکێ بن. هەر ئێستا مەشەدیش دێننەوە. بەداخەوە ئەویش حاڵی خراپە، زۆر چاك نییە. ئەو قسەی لە زمان منەوە بە خوشکێ بڵێن))- مەبەستی گوڵبەهارێ ژنی بابەگیانی بوو —وەرگێڕ- و بەدەنگێکی بەرزترەوە گوتی: ((کارێکی وانەکا خودا نەخواستە ئەویش لە دەست بچێ. ئینشاڵلاَ لە دەستیش ناچێ، بەلاَم حاڵی چاك نییە... هات و هاواری زۆری بۆ چاك نییە- منیش کە کارەکان تەواوبوون ئینشاڵلاَ دوای نیوەڕۆیە، بە پشتیوانییە خودای، سەرێکی هەڵدێنمەوە...)). پورە رەعنا وەك گەورە سەر سپییەکی بەدەنگێکی زۆر لەسەرخۆ و نهێنییەوە پرسی: ((مەلا، لێیانداوە؟)) مەبەستی بابەگیان بوو.

مەلا حەسەن بە سپاییەکەوە گوتی: ((نا، قسە لە لێدان و ئەو شتانەوە نەبوو. دوێنێ شەوێ کە بە دوای منیاندا نارد، ئەویشیان لە پۆلیسخانەوە راهێنا، تا دەگەڵ ئەو رەحمەتیەیدا بۆ دواجار یەکتری ببینن و بزانێ ئەگەر رەحمەتیش، قسەیەك، شتێکی هەبێ پێی بڵێ...)).

پورە فاتم گوتی: ((دەك بمرم خوایە!)) و ژنەکان ئارام ئارام، لە دڵەوە فرمێسکیان داباراندن.

مەلا حەسەن لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: ((بەڵێ... بەلاَم خۆی رانەگرت، ئەژنۆیەکانی شل بوونەوەو کەوت... نێوچەوانیشی کەمێك قرنجا...)) زیاتری دەنگ لێ هەڵێنا و گوتی: ((بەهەرحاڵ لە زمانی منەوە بە خوشکێ بڵێن کارێکی وانەکا ئەو پیاوە بێدەرەتانە لەوەی زیاتر ناراحەت بێ)). و ئیدی رانەوەستا، لەسەر شانیەوەڕا ئاماژەیەکی فەیزوڵڵای کردێ، و کەوتەڕێ... و دیسانەوە هاوار و زریکە و لەخۆدان و بە قوربان و سەدەقەی ژنان بەرزبۆوە...

پیاوەکانی دەرو دراوسێ لەلایەکی خوارێی ژوورەکەوە، بەرامبەر بە پیرێژنەکانەوە دانیشتبوون و سیغاریان دەکێشا و چپەچپیان بوو و لە چەند و چۆنی ئاریشەکەیان دەپرسی. منیش زۆرم حەز دەکرد بزانم. گوێم هەڵخست بەلاَم پێنەدەچوو کەس هیچی لێ بزانێ... دووبارە قریشکە و لە خۆدانێ ژنان، کە تا سەرپێچی کۆلاَنێ ماڵە پورە حەنیفەی هەر بەدوای مەلا حەسەنییەوە بوو- و دوای هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر: دایی لەپڕ لەجێی خۆیەوە دەرپەڕی، ژنەکان گرتبوویان، و ئەو دەیویست بڕواو تەرمی ئازیزی ببینێ، دەستی داتێ. ژنەکان دەروەستی نەهاتن، پیاوەکان ناچاربوون وەخۆکەون، و لەبەردەرکێ گرتیانەوە، بەلاَم ئەو هەر خۆی دەرنیەوە، و دەیزریکاند و پڕی دەدایە هەمووان... ماوەیەك هەروا سەروپرچی خۆی رنیەوە و لەسەر و سینگ و بەرۆکی خۆیدا و کفری کردن، تا لە هۆش چۆوە.

نیو سەعات بەسەر رۆیشتنێ مەلا حەسەنیدا تێنەپەڕیبوو کە لە پڕ بەردەرگا قەڵەباڵغ بوو- هەروەك ئەو کاتانەی کە دەهاتن و ماڵکەیان دەپشکنی: ترپەی بە پەلەی هاتوچوونێ و ئالۆزیە بەردەرکێ دەگەییە گوێیان. هەموو تێکڕابوون، تەنانەت ئەوانەی قسەکانی مەلا حەسەن و پورە رەعناشیان بیستبوو. چەند کەسێك دارەبازێکیان بەدەستەوە گرتبوو و دەیانهێنا. دایی هەر کە چاوی بەو حەشیمەتەی کەوت لەجێی خۆی دەرپەڕی و هەر بەقەڵەمبازان و بەزریکەوە- بە خەیاڵی ئەوەی کە ئەوە تەرمی کاکەیە- بە پیریەوەچوو: ((لەبەر تەرمەکەت دەمرم! گایەکیشمان نییە تا لەبەرپێتی سەربڕم- قوربانی خۆت و قوربانی تەرمەکەشت بم، بە قوربانی خۆڵی ژێر پێیەکانیشت دەبم...!)) و مەلیحە و ژنەکانیش بەدوای ویدا... گوێم لە دەنگی ئەحمەدی شاگردی عەبدول حوسێن کەبابچی بوو بەدەنگێکی نیگەرانەوە هاواری کرد: ((هێواش- هێواش!)) لە پلیکانەکانەوە دەهاتنە سەرێ ((ئای، وریا بە، خەریکە دەخزێ!))- بابەگیان بوو!



دایی زمانی بۆوە و دەستی کردەوە بەسەردوولکە هەڵدانێ:

((فەلەك زار و نزارت کردم ئاخر

بەدووری گوڵعوزارت کردم ئاخر

بەدەستی نەردەوە گیرۆدە ماوم

شەش و پێنجت بەکاری کردم ئاخر!)) و ژنەکان ((ئوهو، هو، هو)) دەستیان پێکردەوە.

زێنەب و یەك دوو کیژ و کاڵی دی رایان کردو لەپاشخانێڕا لێفە و دۆشەگ و سەرینیان هێنان و رایانخستن، و پیاوەکان بابەگیانیان لەجێی جارانی خۆی درێژکرد و دایی هاتە نێو حەشیمەتەکەی، هەروا بەدەم سەردوولکانەوە:

((موسڵمانان سێ غەم هاتوون بە یەکجار

غەریبیی و ئەسیریی و غەمی یار

غەریبیی و ئەسیری سەهلە ئەمما

غەمی یار ئەستەمە، چۆن چاك دەبێ کار... هوهو هوهو!))

بابەگیان بێهۆش بوو؛ پەنا برۆی خوێنی پێوە مەیی بوو؛ پشووی سواربوو. ماوەیەك چاوی لە مۆلەق راوەستان- چاوەکانی دەبن میچییەوە بڕیبوون، بەجۆرێکی وا کە هیچ نابینێ. هیچ جوڵە و بزاوتێکی دەچاواندا نەبوو. هەرتاوە ناتاوێك ((ئاخێك))ی هەڵدەکێشا و بەدەنگێکی کە زۆر بەزەحمەت دەبیسترا دەگەڵە خۆی دەگوت: ((ئاخ! پشتم شکا، بڕبڕەی پشتێم شکا!)) و هەمدیس دەکەوتەوە دنیای بێ هۆشییەوە. دایی سەرلەنوێ بێ ئەوەی هیچ گوێیەك بداتە پیاوەکان و پاڕانەوەی ژنەکان بەسەرو پۆتەلاك و سینگ و بەرۆکی خۆی دادایەوەو شیعری دەخوێندنەوە:

((غەمی عیشقت، بیابان پەروەری کردم

هەوای بەخت بوو، کە بێ باڵ و پەڕی کردم

بەمن ئێژن سەبووریکە- سەبووری

سەبوری واقوڕی دنیای وەسەر کردم... وای وای!)) و لەسەر و پۆتەلاك و سینگ و بەرۆکدان، و خۆ راژاندن، و چەند ساتەوەختێك لە دیواری ئەو بەرێوە رامان، بەلاّم چۆن بە شێوەیەك کە هەردەو دنیایەیدا نییە. دوایە، لە پڕ هەر راست وەك فەتەشێتی خۆی هەڵداویشت و دیسانەوە دەکەوتەوە لەسەر و سینگی خۆدانیّ، ئەو سینگەی کە هەموو ئێسکەکانی دەرپەڕیبوون و پەراسووەکانی دیاربوون... هێندەی لەخۆیدا تا پیاوەکان وەدەنگ هاتن: ((پوریلیّ، مەهێڵە، خۆ خەریکە خۆ بکوژیّ- گوناهە؛ مەهێڵن!)) و ئەوجا ((گوڵبەهار خانم، ئەوە دەبینی مەشەدی نەخۆشە، تۆزێکت ئارام بیّ و دگان بەخۆتدا بگرە...)) بەلاّم دایی ئەو قسانەو هەوڵ و تەقەللای ژنەکانی نەدەچووە گوێی.

سەرەڕای ئەوەش ژنەکان لە گریان و لە لەخۆدان و شیوەنیّ درێغیان دەگەڵدا نەدەکرد، تەنانەت یەك دووێکیان سەردوولکەشیان دەگوتن و گەرمە شینیشیان دەگێڕا.

بانگی نیوەڕۆیە سەعاتێکی مابوو کە دووبارە فەیزوڵلاّ هاتەوە؛ چرپە چرپێکی دەبن گوێی داکیدا کرد. دایکیشی بەشە لەشەل چووە لای پورە رەعنا و پورە فاتمیّ و چرپە چرپێکی دەگەڵدا کردن. فەیزوڵلاّ چرپە چرپەکەی دەگەڵ پیاوەکاندا دووبارە کردەوە. دیاربوو دەبوایە ژنەکان وەڕیّ کەون بۆ سەر قەبران- بۆ گۆڕستانی غەریبان-... بە چ حاڵێکی چووین! دایی نەیدەتوانی بڕوا کەچی راشی دەکرد- تاوە ناتاوێك دەو نیوەیدا تێدەما، نەدەیتوانی بڕواو نەدەیتوانی راکا. ژنان قۆڵیان گرتبوو... دەرو دراوسێکان هەموو هاتبوون- لەولاتریشەوە ژمارەیەك ژن و کچی دیکە هەر هاتبوون- خوشکەکانی فەیزوڵلاّ و تەنانەت بووکیّ ئیمامی، و کچیّ پورە فریشتەش.

داکیّ فەیزوڵلاّی و زێنەبیّ کچیّ پورە حەنیفیّ و پیاوەکان لای بابەگیانی مانەوە، و ئێمە کەوتینەڕیّ. هەروا بەڕێوە منداڵەکانی گەمانیش گەیشتنەوە مە و دەگەڵمان کەوتن. لە ماڵەکانی نزیك گۆڕستانی غەریبانیشڕا چەند کیژۆکاڵ و چەند ژنێکی دیشمان بە پیرەوە هاتن و هەروەك باوە بەسۆزدارییە ژنانەوە چمکی لەچکەکانیان بۆ چاوان بردن...

ئاسمان هەور بوو. با هەورەکان را دەدا و ڕێی بۆ خۆرەکە خۆش دەکرد و هەورەکانیش وەك یەکێك پاڵیان پێوەنیّ وەلا دەکەوتن و کە بایەکە تێدەپەڕی ئەوان دەهاتنەوە. هەر خۆرەکە دەگەییەوە هەوران لە ترسی تەڕبوونیّ، گورجێکی بەلایاندا تێدەپەڕی. و دیسانەوەش بە تەڕیە



وردە دلۆپانەوە خۆی لەپشت چادری هەورەکانەوە دەشاردەوە، و دیسانەوە هەڵدەهاتەوە، و هەورەکان رایاندەکردەوە و گەمارۆیان دەدایەوە کلچێوکیان دەچاوان دەکێشایەوە. بەلاّم بەری خۆرێیان هەر پێنە دەگیرا، و خۆرەکە بەچاوی گەشەوەو بە کوێریە چاوی هەورەکان دەرکەوتەوە و دووبارە هەڵدەهاتەوە. هەورەکان گرژ دەبوون، و توڕە دەبوون و بە مڕەمڕ وەك سەگی گڕویّ دەڕۆیشتن و ناڵە ناڵیان بوو، و با دەگەڵەواندا سرووتی پرسەدارییەی دەگوت و درەختەکان وەك پرسەدارانی شەوی قەدریّ خۆیان رادەژاند- بیّ ئەوەی بزانن بۆچی و لەبەرچی- و هاشەیان دەکرد و گەلاّکانیان بەدەم باوە دەدان تا بەسەرگۆڕی کاکە و عالیەیاندا بوەشێنن.

هەر کە گەیشتینە گۆڕستانیّ، دایی کە ڕێیەکەی وەك ئاویّ شارەزا بوو هەر راست وەك داکیّ لاوە قاچاغچییەکەی خۆی بە گۆڕەکەی کاکەی دادا... کاکەیان بە تەك عالیەیەوە ناشتبوو؛ دەو ماوەیەیدا چ غەریبەیەکی دیکە نەمردبوو. گۆڕەکەی دە ئامێزیّ گرت، یەخەی کراسەکەی بە هەردوو دەستان دادڕی و سینگە رووتەکەی بەگڵی گۆڕەکەوە نوساند، و قروسکەیەکی هاتیّ کە تا سەرمۆخی ئێسقان دەچوو. سینگی لەگڵی سەرگۆڕەکەی هەڵدەسوی و دەیخوێندەوە:

((کە من سووتە دلاّم چۆن نەناڵم

کە من بیّ حاسلاّم چۆن نەناڵم

کە بولبول لای گوڵی خۆییبیّ و بناڵیّ

کە من دووری گولاّم چۆن نەناڵم...))

سینە و بەرۆکی هێشتا ئەو تاکە زەمینە نەبوو کە لافاوی زەمانەی پێدا هاژە بکات و ڕیّ بگرێتە بەرو چۆنە هەروای لێگەرێت و بڕوا: لافاو، پارچە پارچەی ئەو زەمینەی هەڵدەکەند و دەگەڵەخۆی رادەدا، و دایی بۆ خۆی بەدەم لافاوێوە دەڕۆیی. بەلاّم سەیرەکە لەوەدابوو کە هەروا بەردەوام لەخۆ بوردە بوو. جووتە لاستیکێکی کۆنەی دەپێدابوو. هێشتاش ئەو جووتە پێیە بە ژانانەیم هەر لەبەرچاویە. هێشتا دەیبینم کە ژنان گرتبوویان، و ئەو خۆی رادەپسکاندەوە و بەدەوری گۆڕی کاکە و عالیە و خۆیدا دەسوڕایەوە و دووبارە دەهاتەوە سەر گۆڕەکەی کاکەی، و چوار مەشقی دادەنیشت و سینگی لە خۆڵەکەی هەڵدەسوی. ((کافر، چۆنت دلّ هات... چۆنت دلّ هات ئەو لەش و لارە بەو هەموو جوانیەوە، ئەو تەختی دەموچاوە... کافر، دلّ رەق،

چۆنت دڵ هات پەتی باوێیە ئەو گەردنە زەردەی- هەی کافر، شمر، دڵ بەرد! وای، وای!)) و توند لەڕووی خۆی دەدایەوە. ((وای، وای! دایکت بمرێ...)) و ئەوجا بە تورەییەوە: ((بۆ نامرم... باشە بەکەڵکی چ دێم ئەگەر بمێنم!)) و چنگێکی موو لەسەرو پرچی خۆی دەڕنیەوە- ((وای!... لێفە و دۆشەگم بۆ درویبوو... خەریکی بەرگە پشتیە بووم بۆی بدرووم... ئاخر دەمویست بیکەمە زاوا... جووتێك قومری... دەك زەلیل بی کافر... ئاورت دە منداڵی بەربێ خوایە- وەك ئاورت لەگیانی من بەردا!... وەك ئاورت لە ماڵێ بەردام!... هەردوو قومرییەکانت لێ ئەستاندم... کافر... کافر!)) و دیسانەوە گەرمەشین- هەروەك بۆ دڵدانەوەی ئەوانە:

((ئازیزان مەردی لە نامەرد نایە

گریان و ناڵە لەبێ دەرد نایە

لەم داپیرەیە ئەو راستییە ببیە

بڵێسە لەناو کوانووی سەرد نایە))

زمانی شیعرەکانی بابەتایەر زۆر لە کوردییەوە نزیك بوو، ژن و دایکەکان چاکی تێدەگەیشتن، و خۆیان دەکوشت.

تاوێك بە هوهوی گریانێوە رادەبرد، دوایە کتوپڕ هێور دەبووەوە، و کێلی گۆڕەکەی دە ئامێزێ وەردێنا. من دڵنیام کە بەو کارەی ئازاری رووشانی گەردنی کاکەی سارێژ دەکرد و بەو سینگە رووتەوەی کە لەگڵی گۆڕەکەی دەسوی هەموو ئازارەکانی وی دادەمرکاندەوە... کێلی گۆڕەکەی دەباوەشێ دەگرت و رووی دەکردە عالییەی و دەیگوت: ((کچەکەم هەستە راستبەوە، کاکەت بە میوانی هاتۆتە ماڵێ... کوڕەکەم، دڵبەندەکەم، خوا تەمەنت درێژکا- چاکت کرد کە لەبەر دڵی داییت دەگەڵ خوشکەکەت ئاشتبوویەوە... خوا تەمەنت درێژکا... خودایە خێر لە جوانیە خۆت ببینی... لەبەر دڵی دایکە بێچارە و بێدەرە تانەکەت!)) ئەوجا لەپڕ دەهاتەوە و دیسانەوە وەك منداڵان، یا وەك جاران کە دادەنیشت و سەوزەی پاك دەکردەوە، و پێیەکانی لێ درێژ دەکرد و بەدووچاوی لە مۆلەق وەستاوەوە، هەروەك هیچ نەبینێ، و تەنیایە و راز و نیازان دەگەڵە خۆیدا دەکا یا لە وەڵامی پرسیارێکی مێشکی خۆیدا، بە دەنگێکی وەك پاڕانەوێوە



دەیگوت: ((زۆر پێکەوە چاك و تەبابوون... گیانیان لەسەر سەری یەکتریدا دەخولایەوە... هەر کە لە قوتابخانەیڕا دەهاتەوە و خوشکەکەی دەدیت زەردەخەنەی لەسەرلێوان نییە هەر لە دوورەوە بە پەلە پەل دەیپرسی: ((دایە، عالیە بێوازە؟ چییەتی؟))و کوڕەکەم دەچوو دەستێکی بەنێو چەوانییەوە دەنا- نێوچەوانی خوشکەکەی. ئەوجا دەهاتەوە، و دەیگوت: ((دایە، شەڕت دەگەڵ کردووە، لەسەرچی؟)) دەمگوت: ((نا دایە گیان، نا بە قوربانت بم، شەڕی بۆ دەگەڵ کەم، خۆ شێت نەبووم، دەڵێ سەرم دێشێ)). هەر کە دەستی دەگەیشتە نێوچەوانی ئەگەر بەقەدرایە یەك کێوی ئازار هەبایە یەك دەنکی نەدەما. دەمگوت: ((عالیە گیان خۆ تۆ کاکەی چاك دەناسی؛ کاتێ دێتەوە زەردەیەکی بۆ بکە؛ کچەکەم، خۆ تۆ بۆ خۆت دەزانی دەنا ناراحەت دەبێ...!)) دەك کویراییت دایە کە ئاوا دەستت تێچوو، کە دەستت نایە ئەو دڵە پاکەوە!)) و خۆی رادەژاندەوە ((ئاور لە ژن و منداڵت بەربێ، و تاعونت دەگیانی منداڵان گەڕێ، و خۆرکەیان لە گەروێ بێ!... عالیەکەم دەیگوت: ((دایە، من بۆ خۆم کچێکی بۆ کاکەی دەبینمەوە... بۆ خۆمی دەگەڵ دەچم، ماڵی دەگەڵ دادەنێم... بۆ خۆم چاوەدێریە منداڵەکانی دەکەم و دەیان عاملێنم... ئاخر دایە، لەوانەیە ژنەکەی نەزانێ کە کاکە لە ماڵێ چەند نازدارە)) دەمگوت: ((عالیە گیان. باشە تۆ خۆشت دەبێ شووبکەیت، خۆ تۆ ناتوانی تاقامی قیامەتێ هەر لە ماڵێ کاکەی بی...)) دوایە لە پڕ، بە هەردوو چەپۆکان لە سەرو ڕووی خۆی دەدایەوەو لە نێوان هەردوو گۆڕاندا وەك فڕفڕۆکەی دەخولایەوەو تێیهەڵدەکردەوە: ((لاوەکەی تازە لاوم، بووکەکەی تازەنە و بووکم...!)) و لە نێوان هەردوو گۆڕەکاندا دادەنیشتەوە:

((وەرە بولبول بناڵێنین لە دەس غەم

لە من عیشقی سەحەر فێربە، دەمادەم

ئەتۆ بۆ نەو گولێکی وا دەناڵی

ئەوا من بۆ دلاڕامم هەتا هەم!)) دەگەڵ هەر بەندێکی کە دەیخوێندەوە ئیدی ئەوە ژنەکان بەگریان و شیوەن و لەخۆدانێوە وەڵامیان دەدایەوە، و دە پێچ و لولی ئەو گفتوگۆیانەی ناو مێشکیانەوە فرمێسکیان دادەباراندن.

سەیره! دایك هەمیشە ئامادەیە کە چاکییە منداڵەکەی و ئەو بەڵێنەی کە منداڵ دەیدا بەچاکییە خۆی بەبێ هیچ قسەیەك قبوڵ بکات و بچووکترین گومانێکیشی بەدڵیدانەیە لە چاکی و پاکییەی. باوك هەرچۆنێکی بێ ئەو شتانە بەجۆرێکی دی لێکدەداتەوە.

دایی هەمیشە لە پاکییە عالیەی دڵنیابوو. بەلای ویەوە منداڵێك بوو لە گوڵ پاکتر، هەر راست وەك پاکی فریشتەیەك. خوا ئەو کەسەی کوێر و زەلیل کات بووە هۆی تێوەگلانێی؛ ئەو بۆ خۆی ئالوودە نەبوو. داوێنی لە داوێنی یەك پێغەمبەرزادەی پاکتربوو. خوا ماڵێ سەبەبکاری وێرانکا کە مەمەدی هاندا دەست لەڕووی خوشکە گوڵەکەی هەڵێنێتەوە، کە لە گیانی خۆی خۆشتر دەویست و خۆی لەپێناو دادەنا؛ خۆ ئەویش هەر لەبەر خاتری وی رۆژی خۆی بەو رۆژە گەیاند! دایی هەرگیز هیچیانی بە گوناهبار نەدەزانی: هەریەکەیان بە شێوەیەك بێ گوناه بوون. بەلاّم دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بەدوای گوناهباریدا دەگەڕا... بۆ خۆی؟ بۆ نا، خۆی... بۆ خۆشی، ئەدی، کەمتەرخەم بوو- کاکەی دەستی دەستی تووش کردەوە؛ عالیەشی هەروا دەستی دەستی ناردە نێو ئەو زەلکاوەی ((وای، بۆ خۆم بەدەستی خۆم کوڕەکەم کوشت —دەك ئاگرم تێبەر بێ- بۆ خۆم دەستی دەستی منداڵەکەی خۆم ناردە بەردەستی مردنێ!... بۆ خۆم دەستی دەستی منداڵەکەمم هاویشتە نێو ئاوری...!)) بەلاّم هەر نا. ئاور لە ئەمیر لەشکر و تایەفە و دوور و نزیکییەوە چێ، تەخت و تاجی رەزا شای وەرگەڕێ... وای، وای! دەحاڵێکیدا کە بابەگیان، بە پێچەوانەوە، داد و بڕۆی لە دەست ئەو کوڕە گێژو لاسارە و ئەو گێلە کچەی بوو، بەلاّم هەر دەیهاویشتەوە هەناوی خۆی، بەوەی نییە ئێستا ئەوە کە دوای رۆیشتنێیان یەکیان بەسەرفیرازی و ئەویدیان بەچاو لێ پۆشینێوەیاد دەکاتەوە.

رابوردوو و ئێستا و ئایندە هەرسێکیان دەمێشکی داییدا تێکەلاّو ببوون و بە بەرچاویدا رادەبردن، و وەك نەتوانێ لە یەکتریان هەلاّوێرێ و تاك تاکە بیاننۆڕێتێ و بیریان لێبکاتەوە. رابوردووی لەلا ئێستا و ئێستای لەلا ئایندە و ئایندەشی لەلا هەر هەمان رابوردووەکە بوو- هێندە زیندوو هەروەك لەبەرچاوی بن! رابوردووی ئێمە و مانان چ جیاوازییەکی دەگەڵ ئایندەماندا هەیە؛ ئێستامان دەگەڵ رابوردووماندا دەتوانێ چ جیاوازییەکی هەبێ؟- و گوایە دایی بەقسەی یەك لە رۆشنبیران گەیوەتە ئەو راستییەی کە گوتوویانە، کە یەکێك لە نوختەیەکی یا کەناری هێڵی شەمەندەفەر راوەستێ و هەر سەیری تێپەڕینی شەمەندەفەرەکانی



ئێستا و ئایندەو رابردوو بکات و ببینێ کە بەخێرایی بەلایدا تێدەپەڕن: دەبینێ هەمووی یەك رەنگ و یەك شێوە، و بەهەمان خێراییەوە، بێ گوێدان، و هەر بەو ساردییەوە: تروسکە تروسکی روناکییە چەند پەنجەرێکی نیوە تاریك و لەرزۆك، و دەنگێك، و چنگە دوکەڵێك و بایەکی سارد، و چەند پارچە کاغەزێك و خۆڵ و وشکەگەلاّی بەدوایدا دێن و بلاّودەبنەوە، و رێڤینگێکی بێ بلیتی فێڵبازی هەلاّتووە و لە پەنجەرەیڕا خۆ فڕێداوە و لە قەراغ رێیە خۆی مات کردووە- و ئیدی هیچی دی، لە تاریکییە بەولاوە، و هەمان بێدەنگی و جارجارەش دەنگی سیسرکەیەك، و حەپەی چەند گەماڵێك یا وڕە وڕی چەقەڵێك، و هەر ئەو دوو هێڵە ئاسنەی کە وەك لە کۆتاییدا پێك گەیشتبن، و کە هەرگیزیش بەیەك ناگەن. ئێستا و ئایندە و رابوردووی مە ئاوابوو. سەرەتای ژیان لەوێوە دەست پێدەکات کە تۆ پێت وایە ئەوە گەیشتوویە ئەو سەری کەچی تازە بەتازە گەیشتوویە شوێنێکی کۆتایی نایە و تەواو نابێت. بۆ ئێمە نوختەی گەیشتنێ نەبووە. ئەوەی بووشە هەر نوختەی بێ کۆتایی نادیار و بێ هیوا و ئاواتی و نائومێدی بووە. هەروەك دەشتی کاکی بەکاکی و بێ کۆتایی. دایی دڵی دەشیعرەکانی بابەتاهیریدا دەتوایەوە، بەلاّم قاڵبی شیعرەکان هێندە بەرین نەبوون جێی ئەو هەموو ئازارانەی وی تێدابیبێتەوە. مێشك و بیر و خەیاڵە چڕ و پڕەکەشی کۆتاییان نەبوو و هەرگیز بەتاڵ نەدەبۆوە: بیرەوەرییەك بوون، بیرەوەرییەکی نەنووسراوە، هەربۆیەش هێندە سادەو ساکار بەسادەیی قاڵبەکانیان، بەسادەیی لایلایە- و لایلایەیەك بوون کە بۆ منداڵە نووستووەکانی خۆی دەگوتن. و چونکە منداڵەکانی نووستبوون لەبەر هێندێ قسەکان دەگەڵ خەوناندا ئاڵۆز و نادیار و تێکەڵ و پێکەڵ دەبوون- و دیسانەوەش هەر سادە. وەك سادەیی خەونێ، بەلاّم لێڵ و نادیار، هەروەك خەونێ؛ بەسادەییە وەرزە سروشتییەکان، هەروەك گوڵێلکی بەهار، و بەفری زستانێ، و گەلاّرێزان، و بولێڵیە بەربەیانان و ئێواران و ئەو چەند گەلاّزەردە پایزیانەی لە نێوان گۆڕەکاندا دەگەڵ شنەی نەرمەبایدا خشەخشیان دەهات و خولیاندەدا و دەبن پێی داییدا ورد دەبوون و دەمردن. ئەوانە گەلاّی غەمێك بوون کە لە لق و پۆپ و قەد و قەوارەی لەش و لاری داییدا دەوەرین و بەردەبوونەوە و بەسەر گڵ و خۆڵی گۆڕی عالیە و کاکەیدا دەرژان؛ ئەو کۆترانە بوون کە لە هێلانەی دڵی داییەوە بالیان دەگرت و دەفڕین تاببنە نامەبەری غەمەکانی وی:

((ئەمن نازانم رازم، لای کێ بێژم

غەمی سوتان و سۆزم، لای کێ بێژم

چ بێژم، هەرکێ زانی، ئاشکرای کرد

ئیدی راز و نیازم، لای کێ بێژم)) خڵتەی ئازارە نهێنییەکان بوو کە لە بێگەردی بێ خەوی و بێ ئارامی شەو و رۆژانی رابوردوو مابوونەوە و ئێستا راپەڕیونەوە و خۆ بێروبەوێدا دەدەن و بێ هیچ گوێدانە یەکتر پەلەیانە کامیان زووتر لە سینگە رووتەکەیەوە خۆ دەداوێنێ گۆڕەکان هەڵسوون. ئەوە هەر قسەی خەیاڵ و دواندن نەبوو- لەراستیدا چ قسە و خەیاڵێك لە ئارادا نەبوون، ئەوەی هەبوو هەمووی سۆز و هەست و نەستێك بوون کە قاڵبیان شکاندبوو- بۆ خۆشی هەر حەجمینی لەبەر بڕابوو. هەر خودی واژە و بێژەکان ئازارێك بوون بۆ خۆیان، و واژە و بێژەکان سۆز و خڵتەی نیشتووی غەم گرتوو؛ لافاوێکی بێ بەستێن کە راستەو راست و بێ وێنە و رتووشن و لێواولێو ئازار و رەنج و توانەوە و برژان و سووتانن، کە لە کارگەی سینەوە بەرهەڵدا دەبن، و تاوێك دەخولێنەوە، و دیسانەوە وەك ئەو باڵندانەی گەردەلولی جەنگەڵێ ئاگری دەجێ و رێیەکانیان بەردابێ دوای ماوەیەك سەرگەردانی بەسەر ئەو ئاشیانە و هێلانە سوتاوانەی خۆیاندا دێن و دەچن و دەخولێنەوەو بەهەر چواردەورانیاندا دەسوڕێنەوە، و سەرەنجام خۆ دەنا و ئەو سووری ئاگرەی داوێنەوەو دەبنە خۆڵەمێش، هەمووی خەون بوون، خەونێکی بێ خەو، و هەموو وەك باڵندەی خەون باڵیان لێك دەدان و دەڕۆیشتن و بەلاّم دوور نەدەکەوتنەوەو هەروەك گەلاّزەردە هەڵوەریوەکانی خەزەڵێ بەسەر گۆڕەکاندا دەخولانەوە و چەرخێکیان دەدا و دەکەوتنەوە بن پێیان. وێنەی ئازارەکانی عالیە وێنەی بەرجەستەی ئێش و ئازارەکانی کاکەی دەدایەوەو تاریکی و رەشیە دووکەڵی چەکەکەی کاکەش ئاوێنەی رووی پڕ ئازاری عالیەی لە درەوشانەوە دەشاردەوە و تاریکی دەکرد تابەو ئاهو هەناسانەی کە لە سینەی دایییەوە زمانەیان دەکێشا و بڵێسەیان دەدان روون ببێتەوە. وێنەکان وەك کلووی بەفرێ کە بەدەست باوە لەزەم هەریرێوەڕا دەهاتن، بەکورەی سینگێ داییدا رادەبردن، دەبوونە تۆفان و گەردەلول، و تێکیانەوە دەدا، و تێکدا دەتوانەوە، و دەبوونە تەمومژ، و ئەوجا دەبوونە ئاو و بەچاوی دایی و مەلیحەو من و هەمووانداً، دەهاتنەخوارێ- و گیانیان وەبەر غەمێدا دەکردەوە- غەمی سارد و لەکوڵ. لە قولاّیی تاریکی دەروونەوە دەهاتنە دەرێ و رەنگی تاریکایی دەروونیان لێ نیشتبوو، بەلاّم شتێك بوون وەك ئاوی روون و زولاّڵی کانی و سەرچاوان، بەسادەییە لایلایەی، بەسادەییە خودی



ئێش و ئازاران. دایی ببووە کیژۆڵەیەکی منداڵی کەم تەمەن کە دەگەڵ بوکۆڵەکانی دەدوا، دەردە دڵی دەگەڵدا دەکردن؛ چاوەکانی زەق دەکردنەوە: ((دادەخان، سەیرکە چ کراسێکی جوانم بۆ درووێت... تا ئەوەم درویوە کوێربووم... ئیدی نەچییە کۆڵانێ و بەرۆژێکی خراپی کەی، باشە!)) — ((وای، بە قوربانت بم!)) گۆڕەکەی دەئامێزێ دەگرتەوە، و ئەوجا دەستی دەکردەوە بەگریان و لەخۆدانێ: ((باشە من چ لەو گڵ و خۆڵە ساردەی بکەم!؟)) ئەوانەی زۆر بەراستی و زۆر بەڕاشکاوییەوە دەکردن و دەگوتن- هەر راست وەك هەر کیژۆلەیەکی خوردەساڵ!؟)) خۆکچۆڵە هەرگەمان دەگەڵ بووکەکانیاندا ناکەن و بەس، بەڵکە هەر راست دەگەڵیاندا دەژین، بەهۆی وانەوە ژیان دەقاڵبی خاو و سروشتی و سادەیی خۆیدا بۆوان دەبێتە ئەزموون و تاقیکردنەوە، تا لەدواییدا بزانێ کە ژیان لەوە زیاتر هیچی دی نییە، و ژیانی پڕوکەنەفتێك ژیان نییە، گاڵتە و گەمەو یارییەکی زبر و دڕەو هەر ئێمەشین مۆرەی ژێر پێی یاریکەران کە وردو خاش دەبین و دەسڕێینەوە- وەك گەلاّی زەردی بەربای خەزانی پایزێ. منیش گێژو وێژ و ئالۆزبووم، و ئەگەر ئێستاش ئەو شتانە وەبیر دێنمەوە بۆ هێندێ نییە کە وەك بینەرێك و بیسەرێکی ئەو شانۆیە وردبووبمەوە تا رۆژێك بێت بیانگێڕمەوە. نا، مێشکم هەر بۆ خۆی لە خۆڕا فەرمان و ئەرکی خۆی بەجێ هێناوە و ئەو شتانەی لەخۆیدا هەڵگرتوون و هێشتوونیەوە، و ئێستا ئەو شتانە، وەك بیرەوەرییە رابوردووەکان، وەك لە دنیایەکی دیەوە بانگم کەن و داوام لێدەکەن کە ئەوانە هەموو بڵێمەوە.

بەولاوە ترەوە دوو کۆتر لەسەر لێوی گۆلاوێکی کەندڕی خوار گۆڕستانێوە خەریکی ئەویندارییە بوون- ژیان هەروا دەڕۆیی. دەنگی قورئان خوێندنێکی لەو نزیکانەوە، دایی و ژنەکانی هەموو پێکەوە بە ئاگا هێنانەوە: کۆترەکان لە شەققەی بالاّنیاندا و فڕین. پیاوێك دوو سێ گۆر بەولاوەترەوە قورئانی دەخوێند. کەس ئاگای لە هاتنێی نەببوو: وامانزانی- بەلانی کەمەوە من وامزانی- کە لەوانەیە فەیزوڵلاّ قورئان خوێنی هێنابێ، بەلاّم نا؟... ئەحمەد شا بوو! هەموو کش و مات و بێدەنگ بووین... شتی وانەبووە- ئەحمەد شا و قورئان خوێندن!؟.

بێدەنگییەکی تێکەڵ بەنیگەرانییەوە باڵی بەسەر ئەو ناوەدا کێشابوو: نیگەرانی ئەوەی نەکا ئەحمەد شا بیکاتە گاڵتە جاڕی و هەروا یەکێك لەخەونە رەنگینەکانی بگێڕێتەوە ((هەر شادبن))ێکی بزنانە بەزمانێکی رەوانی مەڕانە داوا بکات. ئەحمەد شا بەلای گۆڕی کاکە و

عالیەیدا وەرچەرخا و سورەتی ئەڕڕەحمانی تا کۆتاییەکەی خوێندەوە: ((تبارك اسم ربك الذي ذي الجلال والاکرام)) و لە کۆتاییشدا ئەو ئایەتەشی لە دوودا کە بۆ خۆی دایدنابوو: ((وەل ئەمیر لەشکر فیرار و فیلپشتی پان، فبأي آلاءِ ربکما تکذبان...)) دوایی بێ ئەوەی چاوەڕێی کاری پێچەوانەی کەسێکی ئەو شاکارەی بێ یا شتێکی بەکەس بڵێ یا کەسێك شتێك بەو بڵێ هەستا و بەپێخواستی سەری خۆی بەردایەوەو بەڕێی خۆیدا ڕۆیشت.

من کە هیچ کاتێ ئەو دیمەنەم لەبیر ناچێتەوە. داییش هەر لەبیری نەچۆوە: سەیرکە چەند پاك و بێگوناه بوون کە تەنانەت شێتێك هاتووە قورئانیان لەسەربخوێنێ! سەیری تەنانەت شێتێکیش هەستی هەیە! ئەو کافرە خوانەناسانە نەبێ کە لە دڕندەش دڕەندەترن.

دایی لەو ڕۆژە خۆشەویستییەکی سەیری دەگەڵ ئەو پیاوەیدا پەیداکرد: هەر کاتێ بە بەرماڵێ مەدا رابردبایە بەپێ داگرتنەوە منی دەنارد و بێ هیچ ترسێك بانگهێشتی چا خواردنەوێی دەکرد؛ یا ئەگەر بۆ خۆی لەبەر دەرکێ بایە، خۆمانە و زۆر سادە و ساکارانە، بانگی دەکرد: ((ئەحمەد شا، وەرە پیاڵە چایەکمان دەگەڵدا بخۆوە)). و ئەحمەد شا دەهات... بەڵام هەرگیز لەو ڕووەوە قسەیەکی نەهێنایەوە گۆڕێ — لە هیچ بارەیەکەوە؛ هەروەك لە شاریش نەبووبێ. چایەکەی دەخواردەوە و دەڕۆیی؛ مینبەریشی، چایخانە و سەرپشتی عارەبانەکە بوو.

ماوەیەك لە نیوەڕۆیە تێپەڕیبوو کە ژنەکان بە تکاو پاڕانەوەوە، ویستیان دایی بێننەوە ماڵێ، بەڵام ئەو هەر هات و هاواری بوو، و بە گۆڕەکەوە نووسابوو ولێی نەدەبۆوە. دایکەکان دەیانگوت: ((ئاخر وانابێ، دەبێ تۆزێك خۆڕاگری، هێندێکت ئارام هەبێ... هێندە خۆت مەکوژە، ئاخر حوسێن گیان و مەلیحە گیان ناراحەت دەبن — هەر لەبەر دڵی وان- لەبەرخاتری مەشەدی- ئەویش نەخۆشە، ئەو پیاوە بێچارەیەش گوناهە!... دەبێ ئاگایەکیشت لە خۆت بێ؛ ئەوە تۆ وردە وردە خەریکە خۆت لەنێو دەبەی؛ ئاخر ئەوان هەموو چاویان لە تۆیە)). بەڵام لە گوڕ پچڕاندنەوەکەی کارێکی هەروا ئاسان نەبوو. تێیهەڵدەکردەوە:

((کە من ئاشیفتە حاڵم، چۆن نەناڵم

شکستەی پەڕڕ و باڵم، چۆن نەناڵم

هەموو ئێژن فلانی، ناڵە کەم کە



ئەتۆ دێیتە خەیاڵم، چۆن نەناڵم)) و دیسانەوە:

((غەم و دەردی دڵی من بێ حیسابە

خودا بۆ خۆی دەزانێ، دڵ کەبابە

فیدایی دەست و بازووی تۆمە، جەللاد

ئەگەر بێ و بمکوژی، وەڵڵا سەوابە... بیللا سەوابە، بەخوا سەوابە!))

و دوایی بە پاڕانەوەوە دەیگوت: ((باشە دێمەوە- دێم، بەڵام لێگەڕێن... تەنیا هەر یەك دەقیقەی دی- نیو دەقیقە... بەخودای قەسەم هەر نیو دەقیقە- با جارێکی دیشیان دە ئامێزێ گرمەوە- بە چاوان؛ بە چاوان!)) و دیسانەوە لەسەر...

خوشکەکانی فەیزوڵڵای نیوە ڕۆژیان ئامادە کردبوو و ناردبوویان- بای هەمووانیان لێنابوو. شیوەن و گریان و لەخۆدان هەروا بەردەوام بوو. هەوا ئاڵۆزتر ببوو: بۆرانی بوو: با بە تەوژم دەهات و خۆی بەدیواریدا دەداو دەگەڕایەوە، سەری دە دەرکێ هەڵدەکرد و لێیدەدا و هەروەك منداڵی ناقۆڵا دوای لە دەرکەدانێی هەڵدەهات. بابەگیان هەروا بێ هۆش و گۆش و بێ ئاگابوو و بەپێچەوانەی گەورە پیاوانی دییەوە کە نەخۆش دەبن خزمەتکار جلوبەرگیان لێدەگۆڕن و سەرو ریشیان دەتاشین تا مردنێ هەڵخەڵەتێنن و گاڵتەی پێبکەن، ئەو هەر دەجێیدا کەوتبوو، و هەر بەو جلوبەرگانەی خۆیەوە، و بەسەر و ریشی هاتووەوە، و نەگاڵتەشی بە مەرگ دەکرد و نە هەڵیشیدەخەڵەتاند، بەڵکە لێشی دەپاڕایەوە و دەستەو دامێنیشی دەبوو چاوی لێ بپۆشێت و لێیگەڕێ و نەیباتەوە. ئەوەش نەك لەبەر خاتری مانێ خۆی، بەڵکە لەبەر خاتری ژن و منداڵەکانی تا بێکەس و بێدەر و بێ سەرپەرشت نەمێننەوە. ئەوەشی بەجۆرێکی واگوت کە هەموو بیستیان و گوێیان لێبوو و هەموو ئەو دڵۆپە فرمێسکانەشیان دیتن کە لە چاوی هەڵوەرین. دەستی زۆر بەبێ وازیەوە هەڵتەکاند. فەیزوڵڵا گورجێکی چوو، و کەلەکەی پێ گۆڕی. گوتی: ((مامە مەشەدی، شتێکت دەویست؟)) وەڵامێکی وەرنەگرتەوە. بابەگیان هەروا کە چاوی دە دیواری بەرانبەرێوە بڕیبوو لە مۆلەق وەستا- هەروەك چ جێیان نەبینێ، وەك دەنێو بیر و خەیاڵە ئاڵۆزەکانیدا سەرگەردان بێ و خۆی لێ ونبووبێ و نەتوانێ شتان لێك هەڵاوێرێ. سەرەنجام، وەك بڵێی دەو نێوەیدا بیروبۆچوونێك سەرنجی ڕاکێشا بێ. چاوەکانی بەرەو

لای جێی پێڵاو دانانێوە وەرگێڕان، و گوتی: ((حوسێن...)) قسەکەی روون نەبوو. کاك حەسەنی چایچی لێوە نزیك بوو؛ سەری لێ بردە پێشێ. هەر کە بابەگیان ئەوی دیت دەستی درێژ کرد. کاك حەسەن دەستی گرت؛ دایی و ژنەکان وازیان لە گریانێ هێنابوو. بابەگیان گوتی: ((حوسێن... کاکە حەسەن... منداڵەکان بەوە دەسپێرم...)) و تاکە دڵۆپە فرمێسکێك لە چاڵی چاوەکانییەوە پەردەی قورس و پێڵووە سیسەکانی هەڵدایەوەو بەدێراوە خوار و خێچەکانی روویدا داگەڕاو پلوسکەی ئەو دڵۆپە فرمێسکە دە باغی زەرد و وێرانی خاتیرە و یاد و بیرەوەرییەکانیدا ونبوون دەنگی لرخەی سینگی هەروەك دەنگی پێچکە عارەبانەیەکی شەق و شڕ کە لە هەورازێ وەسەرکەوێ بەقاو و قیژەوە خۆی دەگەیاندە لاپاڵی تەنگەی گەرووی و وڕەی گەرمی هەناسەی ئازارەکانی بەناو قەڵشتی دوو لێوە قەڵشیوەکانیدا سەریان دەکرد.

کاك حەسەن گوتی: ((ئەوە ئەو قسانە چن دەیانکەی، مەشەدی... سوپاس بۆ خوا زۆر چاکی لە خۆڕا دڵی خۆت ناراحەت مەکە!)) کاك سەلیمی دالاَنداریش لەولاوە هەڵیدایە و گوتی: ((هەی بابە! حوسێن و منداڵەکانی دی دەگەڵ منداڵەکانی مە فەرقیان چییە! خوا سەلامەتیانکا ئینشاڵڵا، ئەوانیش هەر منداڵی مەن. پورە گوڵبەهاریش ئەوە هەر خوشکێ گەورەیە، ئەوەشیان ئەوە هەروەتر، کچێ مەیە... یەکەمین سوپاس بۆ خوا حاڵت زۆر چاکە... ئەوجا خۆ ئێمەش نەمردووین...)).

منیش چوو بوومە پێشێ، بەلاَم وادیاربوو بابەگیان چاوی لەمن نییە- ئاە کە سەرنجەکەی چەندە دوور و نیگەران بوو. و بێدەنگییە ژوورەکەی چەند قورس و گران بوو! ئەمن هەروا وەك خۆم بووم، و پیاوەکان هەریەکە بەنۆرەی خۆی بۆ دڵدانەوێ شتێکی دەگوت، پورە رەعنا و پورە فاتمیش لە پیاوەکان کەمتر نەبوون. میرزا رەشیدی عەتار کە چەند خانووێك لەولاترەوە خەریکی قوڕکارییە بوو گوتی: ((نەکەی ناراحەت بی؛ حوسێن دەگەڵ منداڵەکانی خۆمدا هیچ جیاوازییەکی نییە- هیچ ناراحەت مەبە، خۆ لە چۆڵەوانیەتان لێنەقەوماوە!... حوسێنیش هەروەك یەك لە منداڵەکانی خۆمان... ماشەڵڵا ئێستا گەورەیە، پیاوێکە بۆ خۆی. چ لە سبەینێ زووتر نییە بابێتە لای خۆم و وەك پیاوی ماڵێ نانی پەیدا کات و شانداتە کاسبیە- هەر لە سبەینێوە دەیبەمە لای خۆم- نا، ئەو قسانە نەکەی... هەروا بەخۆڕایی منداڵەکان ناراحەت مەکەن)) دیاربوو هەریەکەیان چاوەڕێی کارەساتێکی دیکە بوو- و ئەو کارەساتە چەند



تاڵ بوو! پزیشکێك لە هەموو گەڕەکێدا نەبوو، تا ببێتە مایەی دڵخۆشییە ماڵێ. ئەوە حاڵی دایی بوو؛ مەلیحەش زۆر ناراحەت بوو، و من هەستم دەکرد کە پێستی دەموچاوم لە لەشم بۆتەوەو بە ددانەکانمەوە نووساوەو بابەگیان گوتی: ((ئەدی دایکت...)) گوتم: ((لێرەیە، بابەگیان- دایە!)) بابەگیان هەناسێکی هەڵکێشا: ((گوڵبەهاری بێچارە... بێچارە- خێروخۆشی لە ژیانی خۆی نەدیت!... کچە بێچارەکەم، مەمەدی نەولاوم... ئاخ سێبەندەم... ئاخ پشتم... ئاخ!... ئیدی ئەوان رۆیشتن و تێپەڕین... ئەمانە بە تۆ دەسپێرم- فەیزوڵڵا ئەوە تۆی؟)) فەیزوڵڵا گوتی: ((بەڵێ، مامە مەشەدی، منم، فەرموو چت گەرەکە؟)) بابەگیان بەو بێتاقەتی و بێ هێزییەیەوە وەك پاڕانەوێ گوتی: ((خوا بتهێڵێ، لاوە... تۆ ئێمەت... قەت بەتەنێ بەجێ نەهێشتووە... ئێوە قەت بەتەنێتان بەجێ نەهێشتووین...)) و دوای کەمێك گوتی: ((خودا لە شێخ زەینەڵ عابیدین و جل خوارەکانی وەك وی خۆش نەبێ... ئێوە کەسانێکی باشن... باشن)) فەیزوڵڵا و کاك حەسەن سەریان هێنابووە پێشەوە، بەلاَم وەك ئەوەی هیچ تێنەگەیشتبن چاویان دەگێڕان بۆ روونکردنەوێ. چاوەکانی بابەگیانی فرمێسکیان تێزا و ئاماژەی کرد تا وەریگێڕنە سەرپشتێ... تین و توانای لەبەربڕابوو، هێزی تێدا نەمابوو. قەنداغ بایە، چێشت بایە، ئاوی رووت بایە... هەرچییەکی بیاندابایە هەقی بەسەرەوە نەبوو چییەو چ نییە ئەو هەر دەیخوارد و دەبن میچی ژوورێوە رادەمایەوە. مەلیحە دەو ناوەیدا لە نێوان بابەگیان و داییدا تێمابوو: جارێك دەگەڵ داییپاندا شیوەن دەکرد و جارێك ئارەقەی نێوچەوانی بابەگیانی دەسڕیەوە، یا سەرینەکەی بۆ وەرگێڕ و داگێڕ دەکرد، و بابەگیان جاروبارە یا داوای من، یا داوای عالیەی دەکرد —مەلیحەی لێ ببووە عالیە- و هەندێ جارانیش کە گریان و لەخۆدان و شیوەنی ژنان بلند دەبۆوە ئەویش فرمێسکەکانی دەهاتنە خوارێ...

شەو بوو؛ هەوا ئالۆز بوو؛ با، تینی دابۆیە، خۆی بە پەنجەرەیدا دەدا، کە دەیزانی دەروەستی نایە، بەرقەوە رایدەتەکاند، و دووبارە خۆی پێدا دەدایەوە؛ هێندەی بە توندی ئامباز دەبوو لە ژوورێڕا هەست پێدەکرا و ئەوجا تا دەیتوانی بە هەموو هێزی خۆیەوە، خۆی بەدرەختەکاندا دەدا، درەختەکان دەلەرزین، و بەسەدان چاوی تەڕەوە دەگریان و سەرو پرچی خۆیان دەڕنیەوە؛ چەند جارێکان بروسکە سێبەری دارەکانی لەسەر پەنجەرەکەی دەنەخشاند؛ نووکی هەموو قەڵەمە رەنگاورەنگە تیژە زەرد و سپی و سوور و مۆرەکانی بەسەردا دەهێناو لێیدەدا و دەڕۆیشت؛ تارماییە روناکییە دەگەڵ سێبەری درەختەکاندا لەناوجەرگەی تاریکییەوە

دەردەپەڕی؛ هەر کە هەورەکان پێکیان دادەداو ئاسمان وەناڵە دەهات دڵۆپەی شەستە بارانێ وەك بنە پێی منداڵی تازەوە سەرپێ کەوتوو لەسەربانی، دەستیکرد بە تەپەتەپێ. دڵۆپە باران سەراسیمە داوێنی خۆیان لە پەنجەرەی هەڵدەسوی و گریان لەپێش بایدا دایدەکرد.

دەرو دراوسێ هەموو هاتبوونەوە، و هەروا دەشهاتن. هێندێك لە ژنی گەڕەکێ هەر لەوێبوون: سەرو پرچ سپییەکان مابوونەوە؛ ژنە خاوەن ماڵ و مێردەکانیش، هەر دەهاتوچۆیەدا بوون، دەهاتنەوەو دەچوونەوەو دووبارە دەهاتنەوە، و هەر کە مێردەکانیان دەهاتن ئەوان دەچوونەوە، تا منداڵەکانیان تەنیا نەبن. دوای نوێژی خەوتنان مەلا حەسەنیش، بە هەمان ئەو سەروچاوە داتەپیو و شەرمێونییەیەوە کە مردە خەندێکیان لەسەر مەیی بوو دەهاتەوە. مەلا حەسەن پیاوێکی قسەخۆش بوو؛ هیچ کاتێ نەیدەگوت: ((داوەت بووم)) یا ((میوان بووم)) ؛ هەر دەیگوت ((مەدعوو بووم)) و ئەو وشەی مەدعووەی هێندە بەخەستی دەگوت لە قولاییە گەروێیرا دەهات، پێیوابوو بەم کارەی شکۆمەندی و گەورەییە میواندارییەکەی چاکتر و زیاتر دەردێخی. و لە وەسفی میواندارییەکەیدا شتی زۆر سەیر و سەمەرەی دەگوتن، ئەویش چۆن بەنێو چەوانێکی گرژ و دەموچاوێکی یەکجار زۆر راشکاوانەوە، کە دەرفەتی بەکەس نەدەدا لوتی تێ بژەنن و دەستی تێوەردەن. دیارە کەسیش سەرسام نەدەبوو؛ دەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو لەپشتە دەستی خۆیان دەدا و پێدەکەنین. دەیگوت: ((مەدعوو بووم، بێوەناخۆش، هەرچی گەندو گووە لەسەر سفرەی بوو- ئەوەی دڵ بیەوێ!)) دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هاتنێ مەلای فەرامۆشی پێوەبوو، هەرچەندە جێی باوەڕێ نەبوو کە عەمباری غەم و تێکەوەدانێ دڵی دایی گوێی لەو شتانە بێت و تەواو بێت، و دایی ئەو غەم و کەسەر و کۆڤانەی خۆی بەردەوام، بە شیعر و بێ شیعرەوە دەرداویشتن، و ژن و دایکانیش لە هەڵڕشتنێ تاڵی و سوێری و حەسرەتێ دڵ و دەروونان درێغیان دەگەڵ نەدەکرد- ئەوەی هەبوو هەر دەنگی شیوەن و گریانێ بوو.

مەلا حەسەن هات و دوای گوتنێ ((رەحیمەڵڵاهو)) و خوێندنی فاتیحایە حەدیسێکی بەسەرداکرد، هەروەك کتێب دەفەرمووێ، دەربارەی ئەوەی کە گوناهبار بە سزایە پاك دەبێتەوە، و دەبێتەوە منداڵێکی ساوای شیرەخۆرە، پاك و بێگەرد و بێگوناە، و بۆ خۆشیە کۆتایی پێهێنانێش زەردەخەنەیەکی پانی هێنایە سەرلێوان، و دایی لە ناخی دڵیەوە لورەیەکی کرد، و مەلا حەسەن کە دیتی ئەو زەردەخەنەیەی لە سنووری خۆی تێپەڕاندووە و هیچی وای



لەبەر قاقای پێکەنینێدا نەبووە، بۆ راستکردنەوێ لاسەنگیە کارەکەی و هێز وەبەر دڵی خۆ هێنانەوێ یەك دوو نەرمە کۆکەی بۆ کرد. خودی ئەو، و ئەوانی دیکەش لەبەر رێزێ ((حەدیس))ێ لەسەر ئەژنۆیان دانیشتبوون، و هەموو چاویان دەزاری وییەوە بڕیبوو... تۆ پێت وایە ئەو خەڵکە هەم بە بڕواوە دەژیان و هەم بەویشەوە دەمردن؟ ئاخر ئەوانە دوو شتی جیاوازن. بۆ نموونە و هەر بەڕاستیش وابوو، کە ژمارەیەك لەسەر بڕوای خەڵکانی دیکە دەژیان: سات و سەودایان پێدەکردن، و سوودیان لە ژیان و مردنیان وەردەگرت... بەڵام خودی خەڵکەکە؟- دەو نێوەیدا چیان پێدەبڕا؟- هیچ... خۆ ئەگەر هیچیشیان وەچنگ نەکەوێ هەر نەبێ بەبڕواوە دەمردن... خۆ ئەوەش شتێکی کەم نییە- زۆرە، بەبڕواوە مردن! هەر نەبێ دەتوانرێ باوەڕت بە مانی میللەتێك بێت و دەگەڵیدا بمێنێ و رەنج بدەی و بەرگەی ئازار و دەرد و رەنجان بگری، و بەبڕواوە بڕۆی- ئەوکارەی کە زۆران دەیانکرد، زۆرانیش هەبوون نەیاندەکرد. زۆرن ئەوانەی کە باوەڕیان بە خاك و موڵك و میللەت نییە. هەرچەندە، جاری وابوو، ناڵیان بەراوەژوو دادەکوتا و دەمیان دەوشتانە شەوە وەردەدا، و سوودیان لێدەدیتن... مەلا کوردەکان، بارودۆخ و گوزەرانێکی تایبەتیان هەیە: بەو حاڵ و گوزەرانەی کە خەڵکی تێیدان- بە قسەی کاك سلێمانی، کە ئەو شتانەم لە دواییدا لەوی بیست- جێ پەنجەو نەخشی تایبەتیان هەیە: ئەوانە پێشەوای ئایینی خەڵکی بوون کە دەبایە بەڕووی فشاری زۆرداران و هێرش کەرانی مێژوودا بێنەوەو بەرامبەریان راوەستن هەربۆیە دەبایە ببانایاتە چیمەنتۆی نێو ریزەکانی کۆمەڵگا: چونکە ئەوان تا رادەیەك پارێزەری ئەفسانەکانی نەتەوە بوون؛ خاوەن کەلام و کتێب بوون، شیعریان دەگوتن، و چیرۆك و بەسەرهاتەکانی نەتەوەیان کۆدەکردەوەو دەیاننووسینەوە، لە بەرامبەر نفووزی دینی هێرشکەران خەڵکیان هاندەدا و لێیانیان راست دەکردنەوە- ئەوانە هێشتا هەر دەگەڵ خەڵك بوون، بەتایبەتی ئەو کۆلکە مەلایە پیرۆچکانە. کە سەر بە هیچ سازمانێکی ناوەندییەوە نەبوون و بەبیرو بۆچوونی سەربەخۆی خۆیانەوە کاریان دەکرد، هەرچەندە بەڕواڵەت و بەگوێرەی شوێن سەر بە ئیمامێك یا شێخێکەوە دەناسران.

مەلا حەسەن زەردەیەکی هاتێ و سەیرێکی سەماوەرەکەی کرد. داکێ فەیزوڵڵای چای تێکرد، و فەیزوڵڵاش پیاڵە چایەکی لەپێش دانا. لەکاتێکدا کە مەلا حەسەن کلۆقەندەکانی تاوتوێ دەکردن هەناسێکی هەڵکێشا. لە دەرێ باران دەبارێ و تۆپچی ئاسمانێ بێ وچان تۆپی داویشتن و دە نێوان هەر تۆپێك و تۆپێکیدا، لە دەنگی ویزە ویزی سەماوەر و تەپەتەپی بارانی هەیوان و

سەربانی، و لورەلوری بای کە دەردەختەکانەوە ئالاّبوو و رایدەوەشاندن و دەیتەکاندن و دەیشەکاندنەوە، دەنا هیچ دەنگێکی دی دەژووریدا نەدەهات.

مەلا حەسەن گوتی: ((ماشەڵڵاّ لەو قودرەت و رەحمەتەی زاتی باری تەعاللا!)) و چاوەکانی وێك هێنانەوەو سەرنجی ئاراستەی گۆشەی بن میچی لای خوارەوەی ژوورەکە کرد، وەك باری تەعالا لەو قوژبنەی بیّ. دوای راوێژیّ دەگەڵ بن میچەکەیدا گوتی: ((کتێب دەفەرمووێ، دوای مردنی پیاوی چاك، خواوەندی باری تەعالا بۆ ئارامیە دڵی ئادەمیزادی بارانی رەحمەت دەبارێنیّ... ئینشاڵڵاّ لاوەی ئەو بنەماڵەیەش لە پیاوچاکانە؛ خودا گیانی غەریقی رەحمەتی خۆی بفەرمووێ، و دەگەڵ فریشتانی تێکەڵ کا- ئامین!)) هەموو گوتیانەوە، ئامین. ((دە فەرمووێ پیاوچاکان پێویستیان بە تەلقینیّ نییە... بەلاّم هەردەبیّ ببیّ، سوونەتە... دەنا خۆ ئەگەر نەشبیّ چ پێویست ناکا... خودا گیانی دەگەڵ گیانی فریشتان هاویّ!)) دەنگی ((ئامین))یّ دایی لەنێو هەمووانیدا روون و ئاشکراتربوو- ((ئامین!)) و ئاهێکی وەك گڕەی تەندووریّی لەگیانیەوە هەڵستا. ئەو دەناوەخۆیدا دەسووتا، و ژنانیش یا لە خەت خەتی بەڕەکە و یا لەسەر لوتی خۆیان رامابوون، دەستێك بەچمکی لەچکیّ، یا لایەکی ((سەرپۆش))ێوە، یا تۆزێکیان خۆ سوڕاندبوو و منداڵەکانیان شیر دەدان؛ پیاوەکان چاویان دە زاری مەلا حەسەنیەوە بڕیبوو، و تەزبێحیان بادەدان.

((بەڵیّ... ئێمە کە ئاگاداری دیار و نادیارو دوایی و سەرەنجامی کاری خەڵکی نین- بەندەناس هەرخودایە، لە زاتی باری تەعالا بەولاوە کەس نازانیّ، ئینشاڵڵاّ لە پیاوچاکانە...)) دەنگی مەستانەی یەك لە مشتەرییەکانی کەلایی رەجەب هاتەگویّ:

((بەرەو ژوور دەڕۆی.. شل و مل... گیان-ن تەمای کوێت هەیە... ئازیزم... بە قوربان-ن)) کۆتایی گۆرانییەکەی بەوەستایانەترین و خاوترین شێوەوە دەگوت. هەموو بڕۆیان تێکنان؛ مەلا حەسەن بەدوای قساندا گوتی: ((بەڵیّ... ئێمە هەموو وەك کەشتییەکی نێو دەریایەکی هاروهاجی پڕ شەپۆڵ و تۆفانین- هەموومان بە بایەکییەوە بەندین، کە هەموو کاتیّ لەوانەیە چرای تەمەنمان بکوژێنێتەوە- لە راستیدا ژیانی ئێمە بە فوویەکییەوە بەندە- بە هەناسێکییەوە...)) کەمێك راوەستا تا قسەکانی بە مێشکی گوێگراندا بچێتە خواریّ و جیّ خۆش کات... ((بەڵیّ... ئێمە لە بەندەیەکی هیچ و پوچ بەولاوە زیاتر نین، بەندەناس



هەرخودایە... لەوانەیە بە لوتفی خودای ئێمەش لە پیاوچاکان بین)). و بە شەرمێونیەوە شێوەی کۆی بەکارهێنا.

لەوانەشە راست بکات. مەلا حەسەن هەر بەڕاستی دەو سەردەمەیداچی دەزانی... مەلای کورد هیچ شتێك نازانن. لە شوێنێکدا فراژوو بووە تا بلێی نەزان و دواکەوتە، بە بۆچوونی ئەو و ئەوانەی وەك وی بڕیار و بەزماندا هاتنی یەکتایی خودا و پێغەمبەری خودا موحەممەد (د.خ) بۆ وەرزێرێکی بەس بوو، و چوونە ناو کون و کەلەبەری ئاریشەکانیش پێویستی نەدەکرد... دەو جۆرە شوێن و دەوروبەرانەدا هەقیش هەر هێندە بوو... یەك رستە بەس بوو؛ ئیدی پێچ و پەناو کارێکی دی دەگۆڕێدا نەبوون تا تەنگوچەڵەمان بنێتەوە، دەبوو ئاریشە کردەییەکان دەکارێدا سەروبەرکرێن، و دیارە سەروبەرکردنی ئاریشەکانیش دەکارێدا سەر ئێشەی لیّ پەیدا دەبوو و کارەکە هێندەی دی دژوارتر دەبوو.

چایەکەی رۆکردە ژێرپیاڵەکەوەو هەڵیقوڕاند؛ چەند ساتێکان دەگۆشەی بن میچەکەوە رامایەوە. ئەو کلۆقەندەی کە خێراخێرای دەزاری خۆیدا دێناو دەبرد و هێلکۆکەی چاوەکانی دەگەڵدا دەبزاوتن پێدەچوو چایەکە داغە و زۆر گەرمەو وەهەلەکە سەمای خستووە. دوای تاوێك کە لە بابەت روحم و سۆز و بەزەیی خواوەندانە و بەرهەمەکانی بە هەشتێوە دوا چایەکەی یەك بین خواردەوە. وەك دەڵێن، بۆ خۆی لە قسەکانی خۆی چاکتر بوو. خۆی خۆیبوو، سادەو رەنگ و روو پەڕیو، و شڕۆڵ؛ قسەکانی زۆر زل و لەخۆی گەورەتر و باوە خۆشتر بوون. گوتیەوە: ((بەڵیّ... وەسیەتی کرد... دیاربوو هیچی نییە؛ سلاّوی بۆ دایی و بابی، بۆ خوشکێی و بۆ مەشەدی هەبوو...)).

هەر کە ئەوەی گوت دایی وەك مەنجەڵیّ کولاّ، و دانیشتنەکە تێك چۆوە... مەلا حەسەن گوتی: ((خوشکیّ، لەجیاتی ئەو گریە و زاریە فاتیحایەکی بۆ بخوێنە؛ بۆ یەکێکی وەك وی کە چۆتە سەرای باقی هەر فاتیحایەکە دەتوانیّ توێشووی رێیەی بێت و لە هانای بیّ- هەرچەندە ئینشاڵڵاّ پێویستی بە یارمەتییەش نییە)). (وەك پەیامێکی دیشی پیّ بیّ) ((بەلاّم بەهەر فاتیحایەکی چرایەکی دیکەی لە ماڵی قیامەتێدا زیاد دەبیّ و هەڵدەگیرسیّ)) و بیّ گوێدانە دایی گوتیەوە: رەحیمەڵڵاّهو لیمەن قەرەئەل فاتیحا!)) و بۆ خۆی بە دەنگێکی بەرز و ئاوازێکی قەبەوە دەستی بە خوێندنیّ کرد.

که فاتیحا تەواو بوو مەلا حەسەن لە وەڵامی روخسارە چاوەڕێیەکاندا- چاوەڕێی داستانان- گوتی: ((بەڵێ... هەم سوننەتە و هەم قەرزێکیشە بەملەوەیە؛ نامەوێ لەراستییە زیاتر و ئەوەی بووە هیچی دی بڵێم... بەڵێ، نوێژەکەی زۆر بە ئاسوودەییەوە کرد. دیارە بۆ خۆم رێنمایم کرد- نوێژەکەی زۆر دروست و رێك و پێك بە قاعیدە کرد، هەر راست وەك خۆمان...)) لە نیشانەی کارێکی پێچەوانەی دایی دەگەڕا، بەڵام دایی ئاگای لەو نەبوو. ((... ماشەڵڵا زۆر بە قاعیدە، هەر وەك لە ریزی نوێژی جەماعەتێ راوەستابێ- زۆر ئارام و لەسەرخۆ- دیارە بۆ خۆشم هەر دەگەڵەویمدا نوێژدا بەست. کاتێ سەلامی نوێژێی دایەوە زەردەیەکی هاتێ، و هەر لەسەر بەرماڵێ بوو گوتی کە بەتایبەتی بێم و دڵی خوشکێ و مەشەدی و خوشك و برایەکەی بدەمەوە، و پێیان بڵێم غەمێ نەخۆن- دیارە غەمیشی ناوێ، چونکە ئەو چۆتە داری باقی و ئێمە لە داری فانی ماوینەتەوە؛ ئەو چۆتە ماڵی هەق و ئێمە ماوینەتەوە لە ماڵی ناهەق- لە راستیدا ئێمە جێی بەزەیین نەك ئەو. گوتی با دوعای بەخێرم بۆ بکەن، نوێژان بکەن، خێر و چاکەی بکەن... ئینشاڵڵا لە پیاوچاکانە...)) خەڵکەکە گوتیان ((ئینشاڵڵا!)) بێدەنگییەك بەرپابوو. پێش ئەوەی دایی بێتەوە سەرخۆی و دەستەی ژنان و بۆ شیوەن و گریانێ تەواو بێتەوە مەلا حەسەن دەستی بە قورئان خوێندنێ کردەوە. چەند عەشەرەیەکی خوێندن. دوایی فاتیحای دادا- و دووبارە بێدەنگی...

دەڵێن دەو جۆرەکاتانەدا گوێگر دەبێ ئارام بێ. ئەوە دەبێ کە جارجارە ئاهێکی هەڵکێشێ، یا سەرێکی بادا، و خۆ ئەگەر دڵۆپە فرمێسکێکیش هەڵوەرێنێ و دەستێکی بۆ لوتی بەرێ ئەوە چاکتر- ئەوە تەواوە و هیچ کەموکووڕیەکی نییە. بەڵام جحێڵەکان ئەوەش رەبەر چاوناگرن و گوێ نادەنێ.

یەك لەو جحێڵانە- کە بەڕاستی نازانم کامیان- پێم وایە ئەحمەدی کوڕی پورە حەنیفێ بوو- پرسی: ((مەلا حەسەن، راستە کە دەڵێن جنێوی بەرەزا شا و ((دەوڵەت))یش داوە؟)) لە بازاڕیان وا دەگوت... دەبێ ببووری پورە گوڵبەهار... ئەویش... فەرقی چییە... ئەویش هەر برای ئێمە بوو... پێمان خۆشە بزانین برایەکەمان چی گوتووە...)).

مەلا حەسەن گوتی: ((ئەڵبەتە، برای دینی هەمووانمان بوو... ئەڵبەتە)). و دەستێکی بەڕیشیدا هێناو گوتیەوە: ((ئۆ هووم!)) و دەبیرەوە چوو.



ئەمە زۆر گرینگ بوو. وەك ئەحمەد پرسیارێکی زۆر زانایانەی کردبێ هەموو بەلای ویدا سوڕان و بەرەزامەندییەوە سەیریان کرد، و ئەحمەد پێی وابوو کە هەڵەیەکی گەورەی کردووە لەپێشدا سەیرێکی شەرمێونانەی دایکی کرد، و دوایەش سەری بەردایەوە.

ئەوە زۆر گرنگ بوو، و من دەمەویست کە کاکە ئەو شاکارەی کردبێت و ئەوەی بەدڵێدا هاتبی بەرەزاشای کردبێ؛ ئیدی بەلای منەوە وایە کە دەستبەجێ راپۆرتێ دەدەنە رەزاشای. لێگەڕێ بابزانن کە خەڵکیش دەتوانن جنێوان بدەن. چاوم لە چاوی مەلا حەسەنی نەدەتروکاند و رووم لێوەرنەدەگێڕا. دایی و مەلیحەش گوێیان کلۆر کردبوون.

مەلا حەسەن تۆزێکی بیرکردەوە، و سەیرێکی ئەو لاولای کرد، شا قەلی کەوایەکەی لەبن کلاوەی ئەژنۆی راکێشایە دەرێ، و گوتی: ((ئوهووم!... بەڵێ... بەڵام- بەڵام... هەرچەندەش گوتوویانە کە لە هیچ جێیانی نەڵێم... باشە، بەڵێ... زۆریش))، و لە وشەی ((زۆریش))دا گنجی کەوتنە نێوچەوانێ، وەك قەپاڵی لە لیمۆی ترش دابێ. ((بەڵام کەس ئەو قسەیەی لە چ جێیان لە زمان منەوە نەگێڕێتەوە... ماشەڵڵا هەر دەتگوت نەڕڕەشێرە- رووی ئەو داکەی سپی بێ شیری داوەتە ئەو شێرە پیاوەی!)) و ئیدی هیچی دی نەگوت.

لە بیرمە دوایی من و مەلیحە پاشەملە- پاشەملەی مەلا حەسەنی- هەردەمانگوت و پێدەکەنین: ئەویش بە فارسی گوتنەکەی کە واوی (و) نەخوێنەرەوەی دەخوێندەوە، لەبەر بێ سەروزمانیەشی... بابەگیان تورە دەبوو. سەیەکی ناو کۆڵێتێ سەد پیاوی دەست و پێ سپی و دەستەوستان دێنێ. بێچارە چاوەڕێی چییە، چەندین جار هاتووە و قورئانی خوێندووە و چاوەڕێی کەمترین شتێکیشی نەکردووە و چاوی لەشتییەوە نەبووە- هەزار رەحمەت لە بابی...

دایی بە دەنگێکی کەساسانەوە دەیگوت: ((ئەرێ وەڵڵا! بە دەردی پورە فاتم دەیگوت هەرچی دەقورئانێدا کافە بە کەوای ئەو بێچارەوە شکافە!))- بەردێك لە ئاسمانێوە بەربێتەوە وەسەری وی دەکەوێ —وەرگێڕ-.

ئەو شەوە لە ماڵێ کاك سەلیمی دالاندار و کاکە سەنی چایەچییەوە شامیان هێنا- پێکەوەیان نان سازکردبوو. کچ و ژنە جحێڵەکان هەموو چوونە پاشخانێ و ژنە سەر و پرچ سپییەکان و پیاوەکان هەموو لە دیوی ژووری هۆدەی پێکەوە نانیان خوارد. دایی حاڵی هەروا پەرێشان بوو.

ئێستاکە دەنگی نووسابوو و نەیدەتوانی سەر دولکەو بەندو بالۆران بڵێ، ئارامی لێ هەڵدەگیرا: دەو بێحاڵیەشیدا چەند وشەیەکی بەس بوون کە ئەو پێیان بە ئاوارەییە خۆیاندا هەڵ بڵێ: ((گوڵبەهارخان، پورە گوڵبەهار، وەرە و توبی و خودا هێندە خۆت ناراحەت مەکە، هەر لەبەر دڵی منداڵەکان، لەبەر خاتری مەشەدی!...)) هەر کە ناوی بابەگیان و منداڵەکان دەهات دایی لەخۆ راژاندنێ دەوەستایەوەو دەهاتەوە سەرخۆ، و دە بابەگیان و من و مەلیحەیەوە رادەما. تاوێك هەروا دەمایەوە. دەو هەلەیدا یەك لە ژنەکان پیاڵە چایەك یا کەوچکە چێشتێکی دێنایەپێشێ: ((لەبەر دڵی ئێمە، لەبەر دڵی منداڵەکان — ئاخر ئەوانیش گوناهن!)) و دایی دەحاڵێکیدا کە چاوی دەمنەوە بڕیبوو و خۆی رادەژاند دەیگوت: ((بە قوربانی دەستت بم، دڵم نایبا، وەڵڵاهی نایبا، چ بکەم، خۆ بەدەستەخۆم نییە!...)) و بەدەنگێکی نیوە پاڕانەوەوە هەر بەهەمان دەنگە نووساوەکەیەوە و زۆر کەساسانە رووی تێدەکردمەوە و دەیگوت: ((بە قوربانی ئەو چاوانەت بم، مەگریە کوڕەکەم، نانەکەت بخۆ... مەگریە دایە، چاوەکانت سوورهەڵگەڕاون... زۆر گریاوی... بۆ کاکەی؟ لەسەر سفرەی بەوەندە خۆڕاژاندن و هەوت بوونەی قنیاتی دەکرد.

ئەو شەوە داکێ فەیزوڵڵای و دوو سێ ژنی بە تەمەن لەلای دایی مانەوە... بەڵام کوا خەو؟ دایی دەمێك بێهۆش دەبوو، یا لەپەل و پۆ دەکەوت، و دووبارە بەهۆش دەهاتەوەو سازی تازە کۆکی وەدەنگ دێنایەوە:

((دڵێکم هەیە، وەکو تەیرێکی، پەڕو باڵ شکا و
وەك کەشتییەکی، لەناو شەپۆلی، دەریادا وەستاو
هەموو هەریە ژن، دەسادەی تایەر، سازێکی لێدە
چۆن دەنگ هەڵدەستێ، لە ناخی دڵی، سازێکی پساو))

و من، هەرچەندە منداڵ بووم، هەروەك بە گوڕو باز و تینێك گەورە بووبم و گەیاندرابمە دنیای جحێڵی و پیاوەتیە. شەو درەنگ بوو، هەموو نووستبوون؛ دایی لەخۆ چووبۆوە، دەمی بەش بوو؛ روومەتەکانی تێك قوپابوونەوە؛ دەموچاوی چرچ و لۆچیان تێکەوتبوو؛ جێ رووشانەکانی دەموچاوی لەبەر شەوقی رووناکیە رەنگ پەڕیوەکەی لامپایەکە رەش دیاربوون. با، هەروا



هەبیا هووی بوو دەگەڵ پەنجەرەکان و باران و شێی سەرشوشەکانی وشك دەکردەوە. چوومە سەر سەری بابەگیانی- لۆچەکانی نێوچەوانێی هەروا قوڵ بوون، وەك دەخەوێشدا هەر غەمان بخوا؛ روخساری گرژ دیاربوو. چ هۆیەك هەبوو تا، وانەبێ؟ بە ئاستەم هەناسەی دەدا، و هەردوو پەڕەی لێوەکانی بڵند و نەوی دەکردن و دەهاتە دەرێ، هەروەکو هەڵمی کانزایی کەناری سەرچاوە ئاوە کانزاییەکان، کە گڵی ئەولاولای خۆیان زۆر بەگرانی لادەدەن و بەزەحمەتەوە دێنە دەرێ؛ چاوەکانی نیوەکراوە، بێ حاڵ و روون؛ دەماری گەردنێی بەتوندی لێیدەدا؛ ئارەقەی دەردابوو، و دەنکە ئارەقەکانی بەسەروگەردنێدا هاتبوونە خوارێ؛ زەردێکی تاریکە رەنگی دەگەڵ رەش و سپییەتییە دەموچاویدا تێکەڵ ببوون و رەنگە سپییەکەی تەڵخ کردبوو، هەروەك لالێواری شۆرە خاکێکی زەنەك کە خوێی لە لێوار درز و کەلەبەرانەوە پێوە وشك ببێتەوە. شوێنەواری رەنج و ناخۆشی و کارەساتانی بەتێکڕای هەموو جێیەکییەوە دیاربوو. وەك مەرگ پێلاوی لە ماڵێ مە داکەندبێ: ((دەنگی پێیەکانیم لە چرچ و لۆچی دەموچاو و گەردن و رەنگی روخساریدا هەست پێدەکرد. خوا بکا لینگەوقوچی تێگەیشتبم!- هەرچەندە رووناکییە چرایەکەی هێندە نەبوو کە ناشیرنەکان وەك هەبوون وایان پێشان بدا. ئەودەمیش هەر لەخۆڕا دەمزانی کە رووناکی ناشیرنەکان ناشیرنتر پێشان دەدات و وەدەریان دەخات، و شار شەوانە جوانە و بەرۆژ دەگەڵ چێشتەنگاوێدا دیمەنێکی ناقۆڵا بەخۆوە دەگرێ. هەموو هەروا لەخۆوە دەمانزانی کە ((تاریکی)) هۆی جوانکردنەوەی ژیانە!... بەڵێ، ئەوە ئێستایە کە تێدەگەم بە چ هەوڵ و کۆششێکەوە هەوڵیداوە زەردەخەنە و پێکەنینێکی بەلایەکی روونی ناخیدا هەڵێنجی و بەمەی ببەخشێ- لەبەردڵی ئێمە- ماوەیەك راوەستام، و تێمڕوانی.

مەلیحەش نوستبوو؛ دەمی نیوە بەش ببۆوە؛ شوێنەواری فرمێسکانی هەر بەڕووانەوە بوو، بەڵام وەك دەخەوێدا پێبکەنێ؛ رەنگی تۆزێك کرابۆوە و سورهەڵگەڕابوو، لەوانەبوو لەبەر گەرمیە ژوورەکەی بووبێ؛ لەوانەشە فەیزوڵڵای دەخەوێدا دیبێ. پرخە پرخی پورە فاتمێ ئەو ناوەی داگرتبوو؛ پورە رابیعە خۆی گرمۆڵە کردبۆوە؛ پورە رەعنا فووی لە بن میچێ دەکرد؛ درەختەکان خۆیان بە پەنجەکانی بای دەخوراند، و سەیەك بە قروسکە قروسکێوە راوی بێکەسیە خۆی دەنا- دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بێدەنگیە شەوێ ئازار و غەم هێن بوو...

ڕۆژی دواییش هاوسێکان دووبارە هاتنەوە، و سەرلەنوێ نیوەڕۆژە و شامیان هێنایەوە، و هەمدیس گریانەوە، و مەلا حەسەنیش هاتەوەو قورئان و فاتیحای خوێندنەوە، و ژنەکان لای دایی مانەوە. ڕۆژی سێهەمیش هەروەتر... بەڵام پیاوەکان چوونەوە مزگەوتێ و لەوێ هەستان و پرسەیان بە کۆتا هێنا. خاوەن خەتم فەیزوڵڵا بوو، و مـن لەلایەوە لەبەردەرکێ، لای جێ پێڵاوەکانێ دانیشتم. زۆران قورئانیان خوێند... نیوەڕۆژەیان لە ماڵێ میرزا ڕەشید عەتتاریەوەڕا هێنایە مزگەوتێ، سفرەیان لە حەساری مزگەوتێ ڕاخست؛ نیوەڕۆژی ماڵێشیان لە ماڵێ کاک سلێمانییەوە بەناوی پورە فاتمێوە، هەناردبوو، قەند و چای مزگەوتێشی فەیزوڵڵا هێنابووی. بۆ سێ ڕۆژەی، هەموو ژنەکانی گەڕەکێ دەگەڵ داییداچوونە سەرقەبران- حەوتەش هەروەتر؛ و هەموو شەوێ و هەموو ڕۆژێش ماڵ هەر قەڵەباڵغ بوو، و چەند ژنێك هەردەمانەوە. بەڕواڵەت هەموو چووبوونە سەر قەبران. دوایی لە فەیزوڵڵام. بیست کە گوتی گەرەکێ خوارێش هەموو دوکانیان داخستوون و چوو ون؛ وەك خەڵكی هەر لەخۆوە بەپێی هەستێکی نادیارەوە تێگەیوون کە ئەم جۆرە بەڵاو کارەساتانە پەیوەندی بە هەمووانەوەیە.

ڕاستە هاوسێکان هەموویان دڵسۆز و میهرەبان بوون، هەموو یەکتریان خۆشدەویست، و ئەمەدەبووە مایەی دڵ گەرمی و ورە پەیداکردنێ و تین وەبەر هاتنەوێ بەتایبەتی کە کێ دەیوێرا ناوی دڵسۆزی و میهرەبانیە هەرببات- سەردەمانێك کە یاد و بیرەوەرییەکان هەموو پڕبوون لە پۆلیس و ترس و لەرز و دڵەڕاوکە لە پۆلیس. دیارە ئەوەشی هەیە کە هێشتا بەڵاو کارەسات دەدڵ و دەروونی هەمووواندا زاوزێی نەکردبوو و نەببووە بەشێکی بوونی ژیان... بەڵێ، هەموو یەکتریان خۆشدەویست، بەڵام دیسانەوە ئێمە هەر تەنیا بووین، و دایی یەکجار پەرێشان بوو، چونکە دەستێك و پشتیوانێك نەبوو کاکە و عالییەمان بۆ بستێنێتەوە... غەم، غەمی ئەو تەنیاییە و تەنیاییە نێو ئەو هەموو حەشیمەتەی- ئەمە شتێکی هەمەلایەنە بوو. هەموو هەر تەنیا بووین، هەر لە پورە خاتونێوە بگرە تا دەگاتەوە مە. هەریەکە نانی خۆی دەخوارد و مەنجەڵی خانیشیان دەکوتا؛ منداڵی خۆیان گەورە دەکرد و ئەویان- پارچەی جەرگی خۆیانیانی- دەدایە خان- و سەیرەکەش ئەوەبوو کەس لەو شارە بچکۆلانەیە هەڵنەدەقەنا و نەدەڕۆیی، و غەم ماڵی شاری بوو و شاریش ماڵی وان...

* * *



دووسێ هەفتە بەسەر کارەساتەکەدا ڕەتدەبێ؛ دایی نیوە شێت بووە و هەموو ڕۆژێ بەلانی کەمەوە جارێکی دەچتە سەرقەبران، و رووشانی تازە لە رووی خۆیدا دەچێنێ و قەتماغەی ڕۆژی پێشتر و ڕۆژەکانی دیش لەبن و بێخەوە هەڵدەداتەوە. ماڵەکە سارد و سڕە هەروەك پێش چەند ساتێك تەرمیان لە ژوورەکە بردبێتە دەرێ: تاوەکەی بە قوژبنی دیواریانەوە هەڵپەساردووە سارد و سڕە، جێ و بان ساردن، سەرین و باليف ساردن، ئاگریش هەر ساردە، و دڵی داییش لە هەمووان ساردتر: سەهۆڵبەندانێکی دە دەروونیدا بەرپابووو؛ هیچ شتێك بۆنی ئاشنایەتیەی لێنەدەهات. ڕوخساری لامپایەکەش هەر غەماوی بوو، شار هەمووی هەر سارد و نامۆ بوو و نائاشنایەتی دەنواند، دوای لە سێدارەدانێ کاکەی، وەك هەر قسە و باسێکی بن لێوان کە بەدوای هەڵمەتێکی نەزۆکدا دێت و سەرهەڵدەدا. قسەیەکی نهێنی و لەبن لێوانەوەو بەدزیەوە وەبەرگوێی خەڵكی دەهات: ((دیارە، پیاو دەبێ سنووری خۆی بزانێ... بۆ شاری بێ حاکمە؟ یاسایان یاسا گوتووە، و گوێڕایەڵی، گەورەیان گەورە گوتووە، و بچووك بچووکی، ئەمیر لەشکریان ئەمیر لەشکر گوتووە و تۆش کاسبکار یا نۆکەری... هەر لە باب و باپیرانەوەڕا گوتراوە پیاو نابێ پێ لەبەرەی خۆی زیاتر ڕاکێشێ، هەر لە باب و باپیرانیشەوە گوتراوە ئەوەی پەنجەی لە پەنجەی وەستای خۆی بدا وای پشت وەعەردێ دەکەوێ تا ماوە هەڵنەستێتەوە... دە وەرن و خۆتان لە خودای مەکەن بێی و تەقەی لە ئەمیر لەشکری بکەی!...)) بەڵام دیسانەوە هێندێکی دی هەبوون کە هەر لەسەربیر و باوەڕی خۆیان بوون و دڵنیابوون کە ئەگەر چواردانە لاوی ئائاوا پەیدا بن کارەکان یەکسەرە دەبنەوە، و ئەمیر لەشکریان بەچاوی خۆیان دیبوو چۆنی قوچاندبوو و هەڵاتبوو...

بابەگیان هەروا نەخۆش و دەجێیدا بوو، و هۆش و گۆشێکی وای نەبوو، دەتگوت هەستی دەرك کردنێ کات و شوێنانی لە دەست داوە، وەك کەسێك بەردەوام مێشکی بەمراکێ تێك وەردات و زەڕڕە زەڕڕەی ئەو مێشکەی تێك هەڵشێلێ. زۆرجاران دەهاتەوە سەر مەلیحەی کە هەمیشە بەلایەوە بوو و بەسەریدا دەچەمایەوەو خواستەکانی جێبەجێ دەکرد، یا جێ سەرینەکەی بۆ دەگۆڕی یا وەریدەسوڕاند و تەنیشتی پێدەگۆڕی و دەیگوت: ((نەڕۆی، بمبەوە ماڵێ... ماڵە خۆمان- لای دایکت!)) دواییش چاوەکانی دەکەوتنەوە، و زاری هەروا بەبەشیەوە دەمایەوە، و دەیگوت: ((ئاخ سێبەندەم- ئاخ پشتم! بمبەوە ماڵێ- نەڕۆی!)) ترپەی پێیەکی دەبیست، دیاربوو یادی ئەو شەوەی بوو کە کاکە هاتەوە، یا ئەو شەوەی کە کاك سەلیم ئەوی لە

پۆلیسخانەیەوەڕا هێنایەوە ماڵێ — کێ چووزانێ. دوایی چاوی هەڵدێنانەوە و دەیگوت: ((حوسێن کوا؟ بۆ نەهاتە دوکانێ؟)).

((ئەوەتام بابەگیان...)) و دەچوومە لای جێیەکەیەوە- وای رەنگ و رووی چەند پەڕیوو بێ هێزبوو! مەلیحە لەسەرەخۆ دەگریا؛ دایی لەبەرخاتری وی هەرخۆی دەخواردەوە ((حوسێن، بمبەوە ماڵێ- حاڵم باش نییە)). و پشووی سواربۆوە.

((بابەگیان خۆ لە ماڵێین- ئێرە ماڵێیە- سەیرکە- ئەوەش مەلیحەیە!)).

پێڵوەکانی بە قورسی هەڵدێنانەوە- هەروەك دوو پارچە مز- و بەروخسارێکی وڕەوە، بەزەردەخەنەیەکی وەك مردوانەوە، دەیگوت: ((ئاە، ئەدی دایکت کوا!... ئەبولفەتح خان رۆیی!؟)).

دەتگوت لەپڕ لافاوێك هاتووە و ماڵەکەی پێکداداوە و کاول و وێرانی کردووە و کاکە و عالیەی لەلایەکەوە و دایی و بابەگیان و هەموو ئەوانی دیکەشی لەلایەکی ترەوە تێکەوە لول داوە و دەگەڵە خۆی راداون. ئێمە هەر دوور دەکەوتینەوە و کاکە و عالیەش هەر دوور دەکەوتنەوە، و ئەم نێوانە تا دەهات هەراوتر دەبوو- ئێستا ئیدی کاکە و عالیە کەم کەمە بوونە نوختەیەك کە تەنیا هەستی دایی بێ هەوڵ و تەقەللا ئەوانی بەهێزی گومانەوە دێنانەوە پێشێ؛ بەلاّم هەر کە قسەیەك دەکەوتەوە نێوێ ئەوان خێرا دوور دەکەوتنەوەو دەبوونەوە بەو نوختەی کە ببوون، دیسانەوە دایی لەم بەرەوە بەخۆو بەکۆڵێك حەسرەتەوە دەمایەوە، و کاکە و عالیەش، ساردوسڕ و جێماو لەوبەرێ دەمانەوە: ئەم یەکەیان لێرەوە هەمووی هەر سۆز و شیوەن و گریان، و ئەو دووانەش هەمووی ساردی و سڕی و جێماوی... بێ گوێدانە نوختەکان کە بە هیچ و بە چ جێیەکەوە پەیوەندنین، تەنانەت گوێ نادەنە خودی خود- کاتێ دەونوختانە رادەمێنین روخسارەکان کەم کەمە لەپەردەی نەمانەوە سەر دەردێنن، بەلاّم هێشتا دەرنەکەوتوونەوە وندەبنەوە و دەسڕێنەوە، هەرچەندە پەردەی خەیاڵی دایی لەپەردەی خەیاڵی ئێمە ناسکتر و هەستیار و خۆڕاگرتر بوو، تاوێك وێنەکانی رادەگرتن و- دەیهێشتنەوە. بەلاّم ئەو وێنە خەیاڵیانەی ویش بە تێپەڕبوونی دەور و زەمانان لە هەڵپەو رووناکی دەکەوتن، و تاریك دەبوون و راستییە دوو وێنان کەم کەمە لەیاد و بیرەوەرییاندا دەنیشتەوە، و بەتێپەڕبونی زیاتری



زەمانەی ئەو یاد و بیرەوەرییانەش رەنگیان کاڵ دەبنەوەو دەچنەوە- رێچکەی سروشتیی رووداو و بەسەرهاتان هەروایە...

من دەچمە قوتابخانە، و زۆربەی دەمان لە ماڵێ نیم، و کاتێ کە لە قوتابخانەش دێمەوە هەر پێم خۆش نییە لە ماڵێ بم: ماڵ بۆنی مردنی لێدێ. میرزا رەشیدی بەننا کرێکاری هەن، بانگم دەکا؛ دەچم- هەموو رۆژێ ناچم؛ رۆژێك نا رۆژێك دەچم. دووسێ سەرانی بەردو خشت دەبەمە بەردەستان- هەرجارەی دوو خشت- و رۆژانەکەم وەردەگرم: جاری وایە قڕانێك، جار هەیە دوو قڕان. پارەکەی دەبەمەوەو دەدەستی دایی دەکەم. لە رابوردوودا، ئێواران یاری و گەمە و گاڵتەی نێو منداڵان، کە بەرەوماڵ دەبوومەوە هەر لە دوورەوە کە شەوقی چرایەکەم دەدیت هەستم بە گەرمی ناو ژوورێ دەکرد؛ دەمزانی کە دایی لەبەر سەماوەرێ دانیشتووە و مەلیحە تەشت و ئاوی گەرمی ئامادە کردووە و دەقیقە ژمێریە لە چاوەڕوانیە هاتنەوەی بابەگیانیدا دەکەن. روخساری خۆشیە دایی و رووگرژی و توڕەییە درۆزنانییەکەی، و بەسەردا شیڕاندنێیم کە دەست و پەلم بۆ واپیس و پەلۆخن و جلەکانم بۆ هێندە خۆلاوین، و روخساری نەرم و لەسەرەخۆی مەلیحەی، هەمووی تێکڕا مایەی دڵگەرمی و بەختەوەرییە بوون. بەلاّم ئێستا هەر لە دوورەوە، لەبەردەمی دەرکێ ماڵە پورە فاتمێوە، ساردیە ناوەوەی ماڵێ هەست پێدەکەم، هەر لە دوورەوەڕا بێهۆش و گۆشی و بێحاڵی بابەگیان، و دۆش دامانێ دایی لە کونجێکا و، کە وەك مەلی شەستە لێدراوی تەڕبووە، و مەلیحە کە دەستەو ئەژنۆ دانیشتووە و زۆر بەبێ وازیەوە، هەروەك بە فەرمانی دەوڵەتێ سەماوەرێ تێهاوێ، دەبینم...

حاڵی بابەگیانی ئێستا چاکترە؛ کەم کەمە دەجێیدا دادەنیشێ؛ مەلیحە دەچێ لێفەکەی بەسەرشانیدا دەداتەوە. حاڵی چاکترە، بەلاّم جاری وایە کە دەبیر و خەیالاّنەوە دەچێ کاری وادەکا زەندەقی هەمووان دەبا: دە دیواری بەرامبەری، یا دە ئاوریەوە رادەمێنێ و دەگەڵ ((مەمەد)) و ((کچۆڵەکەی)) دەست دەکا بە قسان. ئێمەش غەمبار و پەرێشان بێدەنگ و مات دەبین. بەجۆرێکی وا کە هەر دەڵێی دە رابوردوودا دەژی. جاری وایە پێدەکەنێ و دەڵێ: ((قوربانی کچەکەی خۆم دەبم!)) پێڵووی چاوەکانی دەنێتەوە سەریەك و چاوەکانی وەجووڵە دێن. سەروڕووی بەمشتێك چرچ و لۆچەوە کە زەردەخەنەیەکیان تێدا شەپۆل دەدا دەگۆڕێ. رەنگ و رووی راست وەك شووشەی تاریکی پەنجەرەی حەمامێ کە چرایەکیان تێدا

هەڵگیرساندبێ و تەمی گرتبێ. دایی بە روخسارێکی مات و غەمناکەوە سەری رادەوەشێنێ، هەناسان هەڵدەکێشی دەڵێ: ((بێنەوایە! گوناهی نییە؛ هەر هاویشتیەوە دڵی خۆی، و بەسەریەکیدا کەڵەکە کرد و خۆی خواردەوە تا سەرەنجام رۆژی خۆی بەو رۆژە گەیاند!)).

جاری وابوو هەرکە دەگەڵ خۆیدا دەدوا و پێدەکەنی کتوپڕ سەروچاوی تێك دەنا، رەنگ و رووی رەش دادەگەڕا و تاریك دەبوو، چاوەکانی وەجووڵە دەکەوتن، چەناگەی وەلەرزین دەهات و دگانە شاش و واشەکانی وەدەردێخستن. دیاربوو کارەساتەکانی لێ دوور کەوتوونەوە و ئەو هەوڵی دەدا نزیکیان خاتەوە. هەروەك لە کونی دوور بینێوە سەیری کارەساتەکان بکاتەوە. بەوردی لەو وێنانە رادەما کە لە کونی دووربینێوە دیتبوونی. هەوڵی دەدا بیرو وێنە پەرت و بڵاوەکان هەموو وەسەریەك خاتەوە، و ریزبەندیان کاتەوە، و شتێکیان لێ دروست کاتەوە. بەهەمان زاری لەکلیلە چووەوە دەیگوت: ((ئای بەدشانسی! چ دەبوو ئەگەر یەکێکی وێکەوتبایە- تەنیا یەکێك- یەك بست بەولاوە ترەوە، ها؟ خودا وەجاغی کوێر دەبۆوە؟ منێکی پینەدۆز وەجاغم کوێر نییە- تۆ وەجاغت کوێر دەبوو؟... بەڵام هەر باشە، ئاواش هەر خراپ نییە. هەرنەبێ تێگەیشتی کە لاوێکی ئازای بە جەرگ دەو مەملەکەتەیدا هەیە!)) رووی گەش دەبۆوە. دەنکە ئارەقەی گەورە گەورە بەسەر لوتییەوە بریسکەی دەدایەوە ((ئەم جارەش دەستخۆش لاوە... هەربژی ئەو دایکەی تۆی لێکەوتوویەوە! باشە، ئیدیش هەیە، ئیدیشم هەیە... ئیدیشیان هەن)). و فرمێسکەکانی دادەبارینەوە. دایی زیاتر پەرێشانی حاڵی ویە؛ هەموو نیگەرانی حاڵی یەکترین- بەڵام دایی لەهەر هەمووان زیاتر...

رۆژێکیان بابەگیان گوتی جلەکانی دەبەرکەین... دە بەرمانکرد... دوای جلك دەبەرکردنێ لەبەر بێ تاقەتیە هەر بەهەمان ئەوجلانەیەوە، لەسەرجێیەکەی خەوبردیەوە. رۆژی دواییش هەر لەسەر داوای خۆی جلکمان دەبەرکردەوە؛ باشمان پێچایەوە، و تا لای پلیکانەکانمان برد... سەرەنجام ئەو رۆژە هات کە گوتی وردە وردە و لەسەرخۆ بیبەینەوە دوکانێ...

سەرەتای بەهارێ بوو دەگەڵ فەیزوڵڵایدا- بردمانەوە دوکانێ- هاوسێکان هەموو خۆشحاڵبوون و کەوتنە یارمەتیە دوکان کردنەوێیان؛ لە جێگاکەی خۆیان دانایەوە، لە چایخانەیرا چایان هێناو دەورەیان لێدا... ئێستا ئیدی دەڕوا... لەوێ دادەنیشێ و دەگەڵە خۆی دەڵێ، جاروبارەیەك دوو



درێوشانیش لێدەدا، هەرچەندە بۆ خۆشی دەڵێ کارەکەی پوخت و لەبارنییە و هەمووی شەش تەقەڵ و مانگەشەوە...

ئێواران، هەروەك جاران، بەڵام زیاتر دەگەڵ فەیزوڵڵایدا، دێتەوە ماڵێ؛ لەبەردەمی ئاگرەکەی دادەنیشێ و دە بڵێسەکانەوە رادەمێنێ. ئێستا ئیدی بەهۆ و بەبێ هۆ ئاوی بە لوت و چاواندا دێتەخوارێ. خووەکی دیکەشی لێ پەیدا بووە. جاری وا هەیە —ئێواران- ئەگەر هاوین بێ بە تویێی کراسێکەوە، ئەگەریش پایزبێت بە پاڵتۆیەکی یەخە هەڵدڕاوەوە- دەچتە قەراغ چۆمی؛ لە پردێ دەپەڕێتەوە و لە بن دارتووەکەی کە کاکە تەقەی لێوە لە ئەمیر لەشکری کرد، راوێچکان دەکا؛ زاری بەشە، زەردەخەنەیەکی لێڵی بەسەرچاو و لێوانەوە پەخش بووە. چەندی بڕوا، دوایی هەتا سەر پردەکەی دێتەوەو هەر لەوێوە و بەهەمان شێوەی روخسارییەوە سەیری جێگای تەقە کردنەکە دەکاتەوە، گوایە ئەوە بەرەوماڵ دێتەوە. دەو کات و ساتانەدا ئەگەر یەکێك سەلامیشی لێبکات ئەو گوێی لێ نییە، خۆ ئەگەر بەقسانیشییەوە بگرن ئەوە ئەو لە کورتیەی دەبڕێنێتەوە و تێدەپەڕێ و دەڕوا...

دادەنیشێ و دە بڵێسەی گڕەکانەوە رادەمێنێ. جاری وایە بەسەرسامییەوە برۆیان تێکدەنێ، و تورە دەبێ، وەك ئاگای لە کێشمەکێشێك و بگرە و بەردەیەك بێ لە خۆی بەولاوە کەس نەیبینێ. تەنانەت جاری وایە هەردوو دەستان دەبن هەنگڵێ دەنێ و خۆی رەپێش دەکا، تا بەڵکە چاکتری ببینێ. رەنگی سوور هەڵدەگەڕێ و دەنکە ئارەقەی بەنێوچەوانێوە هەڵدەتۆقن. دایی بۆ ئەوەی لەو حاڵانەی وەدەرنێ شتێکی دەدۆزێتەوە: پیاڵەچایەك یا قسەیەك: پیاڵە چایەکی وەبەر دەنێ، و بێ ئاگا لەوەی کە داخوا چایەکەی تازە تێکردووە یا سەماوەرەکە قوڵپان دەدا دەڵێ: ((ئەکبەراغا، سەماوەرەکە کوژاوەتەوە، چایەکەت سارد دەبێتەوە، ئیدی ناخورێتەوە!)) بابەگیان دوا سەرنجی دەداتەوە ئاگرەکە، و کەم کەمە خۆی دەکێشێتەوە؛ ریشی دەخوراند و دەیگوت: ((ئای- هەی رۆژگار!)).

دەونێوەیدا دراوسێییەکان ئێواران کاسە دراوسێیەتیان دەنارد. جاری وا دەبوو لە دوو سێ ماڵانڕا دەهات. دایی ئەو کاسە دراوسێیەتیەی جارانی کە لە ئێستا کەمتربون زۆر بەسەروو رووەکی گرژەوە دەگێڕانەوە و قبووڵی دەکردن. ئێستا وا نییە. ئێستا کاتێ قاپەکان دەشوات و دەیانداتە من بیانبەمەوە پڕ بەزاری دوعای خێریان بۆ دەکا. دەڵێ: ((بڵێ دایکم دەڵێ زۆر

مەمنون، خوا منداڵەکانیان لێنەستێنیێ!)) پورە فاتم ناوەناوە هێندێك هێلکان دەنێرێ تا دایی و بابەگیان بیانکەنە دەڵەمە، تا بێنەوە سەرەخۆ. پورەکانی دی هەروەتر درێغیە ناکەن، بەتایبەتی خۆ ئەگەر چێشتێ لێنێن- ئەوکاتانە بەشی ((مامەمەشەدی)) هەردەنێرن.

بابەگیان هەرچووە سەرقەبران، هەرچەندە تەندروستیشی تەواو نەبوو. چوو لە نێوان هەردوو گۆڕەکەی کاکە و عالیەی ڕاوەستا. دەپێشدا ماوەیەك دەگۆڕەکەی کاکەیەوە ڕاما، دوایی چەند هەنگاوێکان واوەتر هات و دوورا و دوور بەرامبەر عالیەی چەند دڵۆپە فرمێسکێکی بەردانەوە. بابەگیان ئێستا دەچتە مزگەوتێ، و نوێژێ دەکات. بەڵام ئێستا کەوتۆتە بارێکی دیکەی پەرتبوون و توڕەییەوە، و جاری وایە جۆرێکە هەر دەڵێی ڕوخسار و شتەکان لە دوورەوەڕا دەبینێ و دەنگی داییش لە دوورەوەڕا دەبیسێ.

دەچتە مزگەوتێ و دەگەڵ خەڵکی نوێژێ دەکا، و جاری وایە ستایشی خوو و ڕەوشت و خدەو نەریت و شێوازیان دەکات: هەر لە دەستنوێژشتنیانەوە، تا دەگاتە چاوەدێریان بۆ کات و ساتی نوێژێ: کەسێك ناجوڵێتەوە و بە هیچ شێوەیەك سەرو دەمولەوسی خۆیان ناخورێنن، و قامکان دەلوتی وەرنادەن؛ ستایشی لە سادە و ساکاری خەڵکی، و میوان نەوازی غەریبەیەکی کە دێتە مزگەوتێ و فەرموودەکردنی بۆماڵێ و ڕێزلێنانی هەروەکو نەدی و بدیان تا بڵێی دەمارگیرە، و شتی وا بە کوردانەوە دەڵێ کە بەقسەی پورە فاتمێ لە قوتوی هیچ عەتارێکیدا نییە- لەوانەشە هۆی ئەوە بێ کە عەتار بۆیە هێندە ناپڕژێتە سەر قوتوەکانی بیانگەڕێ و بزانێ چیان تیدایە. ئەو بڕیاری خۆی داوە- بابەگیانی دەڵێم- کە لە هەموو ماڵە کوردێکیدا بێ پەردە و پەروا و بەدڵنیاییەوە قسان بکەین- ئەگەر قسان نەکەین ناراحەت دەبێ: ئیدی تازە ئێمە کوردین. ئەوەش جاری وایە دیمەنی سەیر و سەمەرەی لێ پەیدا دەبێ و جاری واشە سەرەنجامەکەی زۆر بەتاڵی و ناخۆشییەوە دەشکێتەوە. من تاقەسوارەی ئەو مەیدانەم، بەڵام دایی زۆر جاران دەیەوێ ڕازەکانی دڵی خۆی هەموو بەکوردی دەربڕێ، بەڵام ناتوانێ و بۆی ئەستەمە، و ناچار بەدڵ ساردییەوە بە فارسی دەست پێدەکاتەوە. بابەگیان وا خۆپێشاندەدا گوێی لێ نییە، و دایی سەرودەستان ڕادەوەشێنێ: ((پیاوەکە دیارە شێت بووە!)) یان مەلیحە... بەڵام مەلیحە هەرکاتێ تێدەمێنێ بە پێکەنینێکی دیزە بەدەرخۆنەی دەکا. دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هەموویان هەر هەوڵدەدەن فێربن و زۆریش پێشکەوتوون، چونکە ژنەکان زۆرن و کارەکەیان ئاسان کردووە.

ئێواران بابەگیان لەنشێوی بەردەمی مزگەوتێ وەدەردەکەوێ دەست لەگەمان هەڵدەگرم و دەگەڵەویدا دێمەوە ماڵێ. دێمەوە ماڵێ ڕوخساری دایی دەگۆڕێ، هەروەك مۆمێکیان لە پشت پەنجەرەیەوە هەڵکردبێ و ڕووناکییە بپژێنێ ڕووی گەش دەبێتەوە، تەنانەت نەرمە زەردەخەیەکیشی دەکەوێتە سەرلێوان. بەڵام کاتێ دڵنیا دەبێ کە هەم و هێشتا دەتوانم هەبم بیری بەلای کۆچکردووەکاندا دەڕواتەوەو سێبەری غەمێی لەڕووی دەنیشێ و باڵ دەکێشێ.

* * *

سەروەختێك بوو کە فەیزوڵلاّ تەنیا لە دوورەوە لەبەردەرکێ ماڵێ پورە فاتمێوەی، ڕووی ((مانگەشەوێ)) ماچ دەکرد. ئێستا چەند هەنگاوێکان لە ((مانگ))ێ نزیکتربۆتەوە. ئێستا هەروەك کوڕی ماڵێیە. مەلیحەش، وەك ئێستا تێیدەگەم کەم کەمە خەریك بوو دەهاتە ناو تەوەرەی ژیانەوە، و جوێباری لاوەتیەی بەرێچکەیەکی دیاریکراودا خوڕەی دەهات و دەڕۆیی- هەرچەندە بەپێوانەی گەڕەکێ ماوەیەك بوو کەوتبووە ناو ئەو تەوەرەوە، چونکە لێرە کچان زوویان مێرد دەکرد- یانی زوویان بەشوو دەدان. تاچاویان دەکردەوە یەك دوو منداڵی سەلك و بنکیان بەدواوە بوو، و تا ئاوڕیان دەدایەوە چرچ و لۆچیان دەکەوتنە سەروچاوان مەلیحە، کەم کەمە گوێی لە دەنگی سروشتە؛ گوێ قوڵاغە؛ بەقسەی دایی ((خەریکە چاکە و خراپەی تێبگا)). و دیسانەوە هەر بەقسەی وی ((-ماشەڵڵای لێبێ، دەگەڵ ئەوەشدا کە منداڵە و هێشتا ئێسکی هەر نەرمە، دەڵێی گوڵی پشکوتووە)). هەمیشە گوێ قوڵاغ و لەسەر هەستە؛ بەچاوی دوو دڵییەوە- دوو دڵی لەوەی کە داخوا ڕاستی گوێ لێبووە؟ ئەوکاتە دەو شارە چوکەڵەی مەدا بۆ وەسف کردنێ ژنان لە دوو زاراوە بەولاترەوە نەبوو: چاو و برۆرەش و کاڵ- مەلیحە چاو و برۆرەش بوو. چونکە لاویش بوو- ئاخر من برای بووم و زۆر شتم نەدەدیت- لەوانەیە بتوانی بڵێی زۆر ڕاز و نهێنی غەماوی لە دەموچاویەوە هەڵدەقوڵێن کە من نەمدەدیتن، بەڵام دایی پێش ئەو ناراحەتیانەی ئەم دواییە هەمیشە دەیگوت کە چاوەکانی بەچاوی ئاسکێ دەچن، لەبەرئەوەی کەمن ئاسکم نەدیبوو نەمدەزانی مەبەستی چییە و بۆ وا دەڵێ، لەوەی زیاتر کە دەمدیت چاوەکانی یەکجار زۆر ڕەش و گەورە و خەواڵوون. پێم وابێ ئەو دەمی

وابوو- ئێستاش کەمو زۆر هەروان- هەر لاوێکی دوور لە ئەڤین و دڵداری کە تەماشای هەر کەسێکی دەکرد ئەوە بەدوای ژنێدا دەگەڕا، و هەرکچێکیش کە سەیری هەر لاوێکی دەکرد ئەویش هەرچاو بەهەوای ئەگەری هاوسەریەتیەی دەڕوانیە، چونکە هەڵبژاردنی دەزگیران بۆکچان دەگۆڕێدا نەبوو- شوو نەکردن بەلاوی داواکار ئەستەم و گران بوو بە ئەندازەی ریسوایی و ئابڕوو چوونێ بوو.

بەهەرحاڵ یادەوەری دوانی رۆیشتوو و بەسەرچوو هێشتا هەر گەرم و زیندوو بوو کە دوانی دی یادەوەری تازەیان بنیات دەنا و ژیانێکی پڕ جۆش و پڕ کەف و کوڵیان دادەنا... و ژیان لە کاردا بوو، و هەست و نەست و ئەوین و دڵداری هەر زیندوو بوون و نەمردبوون. گەرمی دڵی دوانی بێچارە بوو کە چرای ژیانیان کوژابۆوە، بەڵام کوورەی ژیان هەروا لە لرفەلرف و جۆش و کڵپەی خۆیدا بوو و لە سووتەمەنیە دەگەڕاو داوای سووتەمەنیەی دەکرد- و سووتەمەنیش ئامادەبوو: سووتەمەنی ژیان لە هەموو لایەنێکەوە هەرلاوەکان بوون: لاوەکان، لەلایەکەوە هەم مایەی بەختیاری بوون و هەم مایەی ئازار و ناراحەتی، لەولاشەوە هەم قۆڵ و بازووی دەوڵەتن و هەم قۆڵ و بازوو شکێنی دەوڵەت... لاوەتی هێشتا رەنگ و رواژای تاوانی لێ نەنیشتبوو. بەڵێ، هەر ئەو لاوانە بوون هەر ئەوانە کە لەو دەوروبەرە بچکۆلانەیەدا، و لە شوێنانی دیکەی وەك ئێرە، ئەگەر جوان و لەبار بانایە ئەوە وەك ئەسپی رەسەنیان رەفتار دەکرد، بەخۆیان دادەهاتن و بە بەردەمی ماڵاندا رادەبردن یا شەوانە بە کۆلانأندا دەگەڕان و گۆرانییان دەگوتن، خۆ ئەگەر جوانووە ماینیش بانایە ئەوە دایکەکانیان وە دواخۆیان دەدان و دەیانبردنە حەمام و سەمەنی لێنان و خەنەبەندانان، و ئیدیکەش چاویان دەگێڕان، تا سەرەنجام مامۆژنێك یا پورێکیان لێ پەیدا دەبوو، تا سەیری ددانێ ((جوانووان)) بکات.

راستیەکەشی دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، ئەو لاوانە چەند جوانن! کە لەسەرتاپای ژیان و بوونیانەوە ئومێد و هیوا و ئاوات و حەز و خۆزگە هەڵدەقوڵێ. و ئەوانەش چەند ناشیرن و قێزەوونن کە سەرتاپایان هەر شەڕانخێوی و نائومێدی و مەرگیان لێدەبارێ. ئێ باشە دەبێ مەبەست چ بێ. خۆ ئەگەر مەبەست هەر تەنیا مەرگ بێت ژیان لە شەڕانخێوی بەولاوە هیچی دیکەی لێ نایەتە دی، جا لەبەرئەوەی هەر ساتێکی ژیان گوناە ئاوەرە، و گوناهیش خودی ژیانە، و ژیانیش مەرگ نییە. هەرکاتێ مەبەستی ژیان مردن بێت دەبێ ژیان بکوژرێ،



چاکترین رێی کوشتنی ژیانیش کوشتنی لاوانە: کاتێ لاوەکان بکوژرێن، ئیدی تازە پێکەنین لە ئارادا نامێنێ و باردەکا، و هەست و سۆزەکانیش هەموو روو لە ئامانجێکی دیکە دەکەن کە ئامانجی لاوەکان نییە: زۆر هەن پەیڕەوی ئەم فەلسەفەیە دەکەن: بە بیانووی تازەکردنەوەو جوان کردنەوەی ژیانەوە بڕیاری کوشتنی لاوان دەدەن. بەڵام لەبەرئەوەی ئەو کارە و هیچ کارێکی دی بەبێ هەبوونی لاوان ئەنجام نادرێ، دێن بە بەڵێن و قسەی لووس و پووسەوە ئەو لاوانە لەرێچکەی لاوەتیە لادەدەن و هەڵیان دەفریوێنن و لاوان بەدەستی لاوان بە کوشت دەدەن، بەدەستی نەزانین، یا هەر بەهەستە سروشتیە لەرێ لادراوە سروشتییەکەی خۆیان. لاو بەقسەی پزیشکان، هەروەك شمشێری دوو دەوە، لایەك بڕندە و لایەك دەرماندە. بەڵام هەرچییەك بێ بەبێ بوونی وی کار ناڕوا، و ژیان بەناچاری رێی بەردەوامیە خۆی دەدۆزێتەوە: ئەو و مەلیحە و فەیزوڵڵاش نەبن، هەزاران ئەو و مەلیحە و فەیزوڵڵای دی...

پێشان فەیزوڵڵا نیشانەی دەگرت و وەك مێشەکەرە یا زەنگەسوورە گەورەکان، راست خۆی بە ناوەڕاستی نێوچەوانی ((مەبەستەکە))ی دادەدا... گێژو وێژ بوو ببووە پەپوولەیەك بێ پەروا خۆی بەگڕی ئاگری شەمدا دەدا- بەڵام نا، لە شەم نزیك دەبۆوە، و هەروا لەجێی خۆیەوە دەچەقی... ئێستا دێت و لەسەر هەردوو ئەژنۆیان، لەبەردەستی دایی، بەرامبەر بابەگیانی دادەنیشێ و زۆر بەشەرمێکی تایبەتییەوە سەری بەردەداتەوە، سەیرەکە لەوەدایە دایی تازە دێ و زۆر لایەنی وێکچوونی ئەو و کاکەی دەدۆزێتەوە- ئەو شتانەی کە من نایانبینم، لەوە زیاتر کە کاکەش سوورو سپی بوو. بابەگیان دەڵێ خودا تەمەنی درێژکا، لە خۆشی و ناخۆشیاندا، لەشین و شاییاندا بەجێی نەهێشتووین و هەر دەگەڵماندا بووە- هەرچەندە ئێمە شاییمان هەرنەبووە! دێت و تاوێك دادەنیشێت. کاتێ کە هەڵدەستێ بڕوا لە دالأنەکێڕا دەگەڕێتەوە، بێ ئەوەی رووی دەمی لە کەسێکی تایبەتی بێ دەڵێ: ((کارێك، شتێکتان نییە؟)) ئەو قسەیەی دەگەڵ هەرسێکمانە. من سەیرێکی دایی دەکەم، هەروا ناراحەت و پەرێشانە؛ ئەوجا بە مەلیحە، کە سوورهەڵدەگەڕێ و لایەکی لەچکەکەی بەددانی دەگرێ. (رۆژانی دوای مەرگی کاکەی و ئەو ماوەیەش کە بابەگیان لە ماڵێ بوو هەروا بوو. بەرەبەری چێشتەنگاوێ پەیدا دەبوو و گۆشتی ناو دەستەسڕەکەی لەبەردەمی دەرکی پاشخانێ دادەنا، و دەیگوت: ((گۆشتێکی چاکیان هێنابووە بازاڕی، بۆ خۆمانم کڕی، گوتم با چارەکێکیش بۆ ئێوە بکڕم... مامە مەشەدی کەمێکی پارە پێبوە...))) مەلیحە شەرمێونانە بەمن دەڵێ: ((نا- بڵێ نا-

زۆر سوپاس)) لە کاتێکدا من و فەیزوڵڵا هێندە لێك دوورنین، و فەیزوڵڵا تۆزێك خۆ دێنی و دەبا و دەیهەوێ بڕوا، بەڵام دووبارە دەگەڕێتەوە. ئەگەر بەیانی بێ دەڵێ: ((بۆ نیوەڕۆیە چتان ناوێ؟)) ئەگەر دوای نیوەڕۆش بێت ((قەندێك، چایەك، شتێکتان ناوێ؟ بیکڕم و بە شاگردەکەمیدا بنێرمەوە)) و من دووبارە بەدایی یا بە مەلیحەی دەڵێمەوە داخوا چمان ناوێ. دایی جاری وایە هەر لەبن لێوانەوە، لەکاتێکدا نقوومی دنیای خۆیەتی دەڵێ: ((خودا عومرت درێژکات و بەرەکەت دەعومرت کەوێ!)) و مەلیحە دەڵێ- دیسانەوە هەر بەمن- ((نا، زۆر سوپاس. ئەگەر شتێك بوو ئەوە حوسێن لێرەیە)) و ئەوەی هەر بەخۆم دەگوت و بەروخسارێکی گوایە ڕەنجاو، و گرژ، و سورهەڵگەڕاوەوە رووی وەردەگێڕا، و چاوەکانی دەگێڕان، و هەر بەیەك چاوگێڕان و سەرنجدانێ سەرپێیی ئەوی هەردەدی... مەلیحە ئێستا کراسی هەراو دەبەر دەکات: هێندێ جێی گەورە بوون و وەدەرکەوتوون بۆیە نایەوێ لەوەی زیاتر ببنەجێی حەز و تاسە. پێش ئەمە کراسی تەسکی دەبەردەکرد تا ئەو جێیانەی کە نەگەیبوون و گەورە نەببوون وەدەریانخات... بەڕاستی ژنانیش ئافەریدەیەکی جێی سەرنجن! دایی کراسی بۆ دەدروێ. دەو ساڵ و تەمەنەیدا هەمیشە گریانی لە بن برۆیانە: چاوەکانی هەمیشە تەڕن، ڕەنگە چاوی ناسکیش هەمیشە هەروا تەڕبن، هەر راست وەك ئەستێرەی ناو حەوزە ئاوێ. پێموابوو ئەگەر ئەگەر تۆزێك بە بەرزی بیدوێنم یا تەنانەت هەروا بەگاڵتەوە پلارێکی باوێمێ وەگریە دێت. شێوەی دەمولەوسی هەمیشە وایە، گوایە هەروا بەگاڵتەوە توڕە بووە. دەگەڵ ئەمانەشدا هیچ کاتێ نەدەگریا. کاتێ کە فەیزوڵڵا دەهات ئەو لچ و لێوی تێکدەنانەوە، و پێت وابوو ئێستا دەگریە، بەڵام دوایە وەك کەسێك مەتەڵەکێکی ئەنگێوی تێگرتبێ سووردەبۆوە و لالێوی چەپەی دەلەرزی، و دوایە ڕەش دادەگەڕا. فەیزوڵڵاش بە جۆرێك پێدەکەنی کە هەروەك کارێکی خراپی کردبێ و چاوەڕێی شەڕو هەرایە بێ و خۆشبەختانە بە پێچەوانییە ئەو چاوەڕوانیەی، هەروا بەسەرزەنشتۆکەکی قنیات دەهات! زەردێکی دەهاتێ و چاوی بەردەدانەوە، و سوور و سپی هەڵدەگەڕا، بەڵام دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لەبنەوەڕا تەماشایەکی هەردەکرد. فەیزوڵڵا بیری لە وشە و رستەی ئاشقانە نەدەکردەوە، خۆ ئەگەر بیریشی لێکردبایەوە هیچی وای نەبوو وەبیری بێتەوە. بەڵام هەر لەخۆوە ئەوەی دەزانی کە دە دەموساتی خۆیدا شتێك بڵێ زۆر لەو رستانە جوانتر بێ کە دەپێشدا ئامادەی کردوون، و دیارە زۆریش سادەتر. مەلیحە لەکاتی ئامادەییە فەیزوڵڵایدا- یانی کاتێك کە ئەو دادەنیشت- خۆی یەکجار سەرقاڵ دەکرد



بەئیشانەوە، زیاتریشیان بەچنینێوە. بەڵام زۆرجاران دەتدیت دەستبەرداری کارێ دەبوو و لەسەر لاتەنیشتێکی دەکەوت، و یان دە هەوای، یان دەخەت خەتی بەڕەکەیەوە رادەما، و کاتێ کە بانگت دەکرد و بەئاگات دێنایەوە رادەچڵەکی- وەك چوبێتە دنیایەکی دییەوە؛ هەر کە گوێی لە قسەی یەکێکی بایە- گێژانە دەیڕوانی. جارێکیان فەیزوڵڵا هەروا سەری هەڵێنا و تەماشایەکی کرد ئەو چایەکەی هەموو بەسینگ و بەرۆکی خۆیدا کرد و سینگی سووتا. گوتی ((ئۆف!)) و فەیزوڵڵا نەیزانی چبکا، و ئەویش یەخەی کراسەکەی گرت و لە سینگی خۆی کردەوە و بەرەو پێشێی تێنووسا، و رووی لەولای کرد و دایی لەبنەوەیڕا تەماشایەك کردێ و خۆشی و ناخۆشی پێکەنی. لەوانەشە تائێستا ئەو هەست و ئیدراکەی بەتەواوەتی لەلا دروست نەبووبێ بزانێ کە داخوا بەڕاستی خۆشی دەوێ یان نا... لەوانەیە ئەو گێژیەشی هەر هۆی ئەو ئەنجامە نادیارە بووبێت. ڕەنگە ئەو سڵی و شەرمێونیەشی هەر بۆ ئەو قسانەی خەڵکی بگەڕێتەوە کە دەربارەیان دەکردن؛ ئاخر دەو ساڵ و تەمەنانەی کچ و کوڕاندا کە تازە دێ یەکتریان خۆش بوێ یا بیردەکەنەوە کە دەبێ دەزگیران و گراوییان هەبێت هەر کە دەگەنە عاستی یەکتر دەلەرزن. هەربۆیەشە فەیزوڵڵا کە ئێمەی بە لاگری خۆی دەزانی پێی ناخۆش بوو. چونکە ئەو شتەی کە دەبوو بە ڕێچکەی سروشتی خۆیدا بڕوات و گەورە ببێت و پێبگات و ئێستا شتی دەستکردی هاتۆتە ناوێ- بە لاگری، بەپارە، بە سوپاس، پیس بووە. کێ دەزانێ. دەوناوەیدا وەك هەر کچێکی- یا هەر دوو سێ کچێکی کە پێکەوە بەڕێیەدا دەڕۆن و تووشی لاوێکی دەبن و تێدەپەڕن و کە تێشپەڕین وردە کەنی و وردە نازان دەکەن. ئەویش هەروا نییە، فەیزوڵڵا هێشتا نەگەیوەتە دەرکی حەسارێ. نەرمە خەندێکی دێتێ. دە زۆر کاتاندا تا فەیزوڵڵا دەگاتە بەردەرکێ، وەك پاڵ بە دوگمەیەکی نادیارەوە بنێ، لە پەنجەرەیڕا سەرێکی خوار دەکاتەوە، کوڵمەکانی سوورهەڵدەگەڕێن، و هەرکە دێتە ژوورێ و چاوی بە مەلیحەی دەکەوێ ئەویش هەروەك دەزگایەکی ئەلیکترۆنیکی دە دەروونیدا بێت سووردەبێتەوە... لەوانەشە فەیزوڵڵا ئەو قۆناغەی دڵەڕاوکێ و پەرێشانی و هەوتبوون و نائارامیەی تێپەڕاندبێ کە مەلیحە ئەوە تازە خەریکە تێیدەکەوێ. و ئەمەش قوناغێکە کە ئاگرەکەی هەڵایساوە و لێك دووری و دابڕانەکانی هەر نەیسە کە ناتوانێ بی مرێنێتەوەو خامۆشی کات، بەڵکە هەر بەتین و تاو و گەرمتریشی دەکات. بە هەرحاڵ ئەویندار شتگەلێکی هەن کە دەیەوێ بەجێیەکی گونجاو و لەبار و دڵنیایان بسپێرێ و هەر کە سپاردنیشی ئیدی ئەوە ئەرکی دیکەی لە بەرامبەردا بڕیار

دەدا: دەبێ بیر لە ئەسپاردەی هاوبەش بکاتەوە و لێی زیاد بکات و هەمووی پێکەوە بە ئاکام بگەیەنێ...

* * *

ئێستا ئیدی ئەوە گەورە بووم، بەقسەی دایی ((پەڕم دەرداوە)) ئێستا وەك جاران نییە. پێشان حوسێنی کوڕی ((ئەکبەر عەجەمی بووم؛ ماوەیەکی دی حوسێن، و ئینجا حوسێنی کوڕی مامە مەشەدی و پورە گوڵبەهارێ و برای دادە مەلیحەی. ئێستا ئیدی غەمێ لەیاری و لەگەمە دابڕانێ ناخۆم، لەبەر ئەوەی کە سەردەمی جاران نییە و ئێستا بەخۆم رادەپەرمووم و دەبێ خۆم لێ لادەن؛ ئێستا ئیدی وەك جاران کەس بەردم تێناگرێ و کەس کلاۆم لێ نافڕێنێ، یا نقورچم لێناگرێ، یا ناماقولێەم بەرامبەر ناکات و زارم لێ بانادات و هەڵێت. هەمیشە هەروایە؛ بەقسەی دایی، دوورە زێد، سەگی غەریبە تەنانەت دەگەڵ سەگی لەخۆی بچووکتریشدا کلکی دە گەلۆزێ دەنێ و هەڵدێ و دوور دەکەوێتەوە. ئێستا ئیدی دەگەڵ دەوروبەرێدا ئەمنیش هەم. ئێستا یاری و گاڵتە و گەمەکانمان گۆڕاون؛ دواتریش هەر گۆڕانەوە، و ئیدی دەستی رۆژ کە لە هەموو لایانڕا جووتەی زەمانەم وە کەلەکێ دەکەوت- و ئازارەکەیم زۆر بەتوندی و بەزیادەوەش هەستکرد. ئەڵبەتە ئەوەش بڵێم کە ئەو یارییانە بوونیان زیاتر توند و تۆڵ کردم و لەمەحەکیاندا... خەڵکی چۆنن هەروان: هەندێك هەن بەردەوام بەگلە و گازندە، و هەندێکی دیکە هەن بەگوێرەی کات و شوێن و بارودۆخ جارجار بەگلەیی و جارجارەش رازین. خەڵکی زیاتر داخ و کەسەری رابردوو دەخۆن. بەلاّم کەسانێکی وەك حاجی سەعدوڵلاّ و حاجی عەزیز کە بازاڕیان گەرم بوو و بەرامبەر ئێستا و ئایندە بەرچاو و دڵ روون بوون هەرگیز ئاوڕیان لەرابردوو نەدەدایەوەو غەمیان نەبوو: ((هەر لەو رۆژەوەی چاوم کردۆتەوە خوا لێخۆشبووی دایکم هەمیشە لەسەر یەك تاکە شایی پوولێ رۆژانە هەرای بوو)). دایی ئێستا هێورتر بۆتەوە؛ عالیە و کاکە هەروا و هەردەم هەر لاون: بەجحێڵی چوون، و هەرواش بەو شێوەیە، جحێڵ و جوان و بێگوناه. دە بیر و خەیاڵی مندالاّنەی مەدا و لە یاد و بیر و مێشك و هەستی دایی و بابەگیانیدا ماونەتەوە، تا وردە وردە رەنگیان کاڵ دەبێتەوە و لەراستییەوە دەبنە خەیاڵ و لە خەیاڵیشەوە دەبنە یاد و بیرەوەری و تا دەبنەوە خەیاڵێکی لێڵ و پێڵ و ئەوجا نادیار، و وەك شۆخ و شەنگ و پاڵەوانی ئەفسانان دەتەپۆتۆزی ونبوونێدا وندەبن- بێ رەنگ و روخسار



و، بە هەزاران سیماو روخسارەوە بە ژمارەی ئەو سەرو روو و رەنگ و رواژایانەی دە داستاناندا بە شێوەی جیاجیا خۆ دەنوێنن و دەوێدا بە ژمارەی ئەو کەسانەی کە ئەو داستانانە دەخوێننەوە و دەبیسن و ئەو وێنانەی کە دەداستانەکاندا دێنە بەرچاوان پێشوازییان لێدەکرێت... لەولایەنەوە کە داخوا من و مەلیحە چ وێنەیەکی ئەوان بە منداڵەکانمان پێشاندەین و چۆنیان پێ بناسێنین و خەڵکی شاری چۆنا و چۆن باس و خواسی ئەمانە سینە بە سینە و پشتاوپشت، بەنەوەی داهاتوو دەگەیەنن. دایی ناوە ناوە پاشخانی بیرومێشکی خۆی دەتەکێنێ، و یادە کۆنەکان، وێنەی کاکە و عالیەی، کارنامە و کراس و دەرپێی کاکەی (کە لە راستیدا ئی بابەگیانی بوون) و وردە و پردەی عالیەی کە لە ساردەوێدا لە یەغدانێ دەردێنێ؛ ماوەیەکی تەواویان وەبەر بای دەدا، دەگەڵ یادو بیرەوەرییەکاندا، پەلکە گوڵە وشکەکان بە پەڕەگوڵی تەڕو تازەی بۆنخۆش دەگۆڕێ و پێیان وەردەکاتەوە و کۆلاّن بە کۆلاّنی سەردەمی رابردوو بەناڵە و هاوارەکانی خۆیەوە بەدوای دەنگی کاکە و عالیەی دەکەوێ و بانگیان دەکاتەوە و بەو لاواندنەوە نەگبەتیانەی خۆی یادێکم لە یادی رابردووی ئەو رۆیوانە بیر دێنێتەوە، و هەروەك منداڵان ئێمە دە باوەش دەنێ، و دەگەڵ یاد و بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەمانباتەوە رۆژانی دوێنێی رابوردوو- خەواڵوو، پەڕێشان، و ماندوو... و دەباوەشی داییدا، ئەستێران دەبینم... ئەستێرەکان نەمردوون... ئاسمانی دەشتی دەروونم رووناك و گەش و ساماڵ و پاك و بێگەردە.

ماوەیەکە پورە فاتم دەقساندا بێ ئەوەی چ ئاماژەیەك بە فەیزوڵلاّی بکات دەڵێ: ((مارەییە جووتە لاوانیان هەر لە ئاسمانێوە بڕیون)) لەوانەشە ئەو راست بکا، بەلاّم ئەوە وەك قسە دە ئاماژەی دوو ئامۆزاياندا بگوترێ، هەرچەندە بە ئایینزای (مەزهەب) ئاشقان دەبێ ئەو کارە لەجێیەکی دیکەی جیا لە ئاسمان، هەر لەسەر زەوی، جا لە کەنار چۆمێك، یا لە پاڵ کێوێك، یا بیابانێکدا، ئەنجام بدرێ- بەلانی کەمەوە زۆران هەروایان کردووە. دایی دە ئاماژەکە دەگەیی- ماوەیەکە هەستی پێکردووە، لەسەرەتاوە — و کارەکە بە دەنگێکی پەسەندانەوە دەگەڵ بابەگیانیدا و زۆر بەسادەییەوە، لە پشتگیرییە فەیزوڵلاّی، بێ ئەوەی ناویشی بێنێ- و هەروەها بەرەزامەندیە خەڵکی شاریش- دێنێتە گۆڕێ و ئەوەش دەڵێ: ((من بۆ خۆم دە حەمامێمدا روانیوە و سەرنجم داوە، ئەوەی ئەو زەلیل مردانە و هاو ئاخوڕەکانیان دەیڵێن هەمووی درۆیە- سوننی کلکیان نییە)).

بابەگیان بێ ئیختیار پێدەکەنێ و دەڵێ بە شێوەیەك بە پورە فاتمێ بڵێ کە من چ قسەم نین، فەیزوڵلاڵ لاوێکی تا بڵێی زۆر چاك و پیاوانەیە، چ جیاوازییەکیان دەگەڵ حوسێنیدا نییە، ئێمە ئەومان لەجێی مەمەدی داناوە، بەلاّم ئێستا هەر بەو یەکان دەردووەی نا. با ماوەیەك تێپەڕێ...

ئەوەم لەبیرچوو. هەر کە گێژاوی دەروونی کەمێك دامرکایەوە دایی لەلایەکی دییەوەی دەست بە ناراحەتییە کردەوە: لەو لایەوە کە ئیدی چاوی بەرایی نادات ماڵەکەی لەسەر ڕێی دەزگای ئەو پیاوەی ببینێ (کەلایی رەجەبی دەگوت)، هەر کە ئەو سەروچاوە ناقۆلاّیەی خودی کەلایی خۆی، دەبینێ و گوێی لە دەنگ و سەدای مەستانەی مشتەرییەکانی دەبێت چین چین گۆشتی بەردەدات. دیاربوو وەك ئێستاکە تێیدەگەم مەبەستێکی دیکەشی هەبوو: دەیویست لە ((منداڵەکان))ی نزیکتر بێتەوە. ئێستا لە نزیك ((کانیی میر))ەوەین. بە تەنیشت گۆڕستانی غەریبانەوە، دە خانووێکی داین، وەك هەمان خانووی پێشوو، هەراو و چەند ژوور و پاشخان و دالاّنێکی وەك دالاّنی ئەوەی دی و حەسارێکی بچکۆلانە، روو بە باکوور. بەلاّم هاوڕێکانی یاریم لەکیس نەچوون، زۆربەیان لە قوتابخانە دەبینم. دایی لە چوار دەوری گۆڕی کاکە و عالیەی پەرژینێکی بە دارانی هەڵبەستووە — هەر بۆ خۆی... زۆربەی کاتەکانی خۆی بە سواغدانی گۆڕەکان و دەوروبەریانەوە بەسەردەبات. گۆڕەکان چۆن بوون، هەروا وەك خۆیانن. ((گوڵە تۆوت بۆ کاکە و عالیەی کڕیوە؟)) — ((ئەمن ئەورۆ نەپرژاوم، گوڵەکانی عالیە و کاکەت ئاوداون؟)) ئەمانە هەموو راوپرسێکن لەمن و مەلیحەیان دەکات، بەو حاڵەوە ئێمە هەموو رۆژێ، ئەگەر نا رۆژێك نا رۆژێك سەرێکیان هەر لێدەدەین... چەند خۆشە مرۆڤ بیرێك دەمێشکی خۆیدا پەروەردە بکات و گەورەی بکات و شەیدای بێت- رۆمان نووسان لەو بابەتانەن، گوایە کە پەروەردەی ئەوانە سەرەنجام رۆژێك بە ئاکام دەگات و گەلاّو گوڵ و بەرومیوە دەدات. بەلاّم ئەوانەی وەك دایی هەروابێ چاوێنی ئاکامی کارەکانیان تەنیا بە خاتری دڵ، و بەخاتری خودی بیرەکەیە کە بەدوایدا دەچن، و بیرۆکەکە هەروا بێ گوێدانە سەروەخت و زەمانە، داوا لە خاوەنەکەی دەکات تا لەجیاتی ئەوەی بە شێوەی خەیاڵێك دەرکەوێتەوە دە خەیاڵێکی ونبووی رووتدا مل دەنێ و لە تەپوتۆز و تەمی گوماندا شێوە دەگرێ.

ئێستا دایی لە جیاتی ئەوەی لەبەر دەرکی ماڵێ پورە فاتمێ دانیشێ دەچێتە سەر کانییە و لەوێ دەگەڵ ژناندا دەردە دڵیە دەکا. جاروبارەش سەر لە دراوسێ کۆنەکان دەداتەوە؛ ئەوانیش دێن- قیسپی کوڕی



پرسە و فاتیحایانە، و بۆ کوژراو و لە سێدارە دراوان، وەك دایکێکی زگ سوتاو، لەناخی دڵ و دەروون و هەناویەوە بۆ وانیش دەگری.

رۆژێکیان دوو کۆتر هاتن و لەسەر چوارچێوەی پەنجەرەی نیشتنەوە. هێشتا بەتەواوەتی خۆیان نەگرتبوو؛ بۆ راگرتنی پارسەنگیە خۆیان کەمێکیان باڵەفڕە کرد و باڵیان پێکدادان- دوو کۆتری جوان. دایی هەر کە ئەوانی دیت شێت بوو؛ لە سینگی خۆیدا، و وەك ئەوەی منداڵەکەی بێ ئاگاداری لە سەفەرێکی دوورەوە هاتبێتەوە ماڵێ گوتی: ((خوایە بە قوربانت بم- وەرە، وەرە، کۆرپەکەم!)) تا ئێمە تەکانماندا کۆترەکان باڵیان لێکدان و رۆیشتن. دایی بڕوای وابوو ئەوە گیانی کاکە و عالیە بوون، و بە توندی بەسەر من و مەلیحەیدا شیڕاند، کە بۆچی زوو رانەپەڕیوین و پەنجەرەکەمان نەکردۆتەوە- یان بۆچی پەنجەرەکەمان داخستووە؟ دەگەڵ ئەوەشدا کە بۆ خۆی پەنجەرەکەی داخستبوو. ئەو شەوە حەڵوای دروستکرد. لە مەلا حەسەنی پرسی داخوا دەبێ ئەوانە گیانی منداڵەکان بووبن؟ مەلا حەسەن گوتی: ((بەڵێ... باشە — بەلاّم... بەڵێ- دوورنییە... بۆ نابێ؟ هەموو شتێك لە قودرەتی زاتی باری تەعالا دەوەشێتەوە و دەبێ. سوپاس بۆ خوا پاك و بێگوناه بوون... بەڵێ، لەوانەیە؛ ئینشاڵلاّ هەردووکیان بەهەشتین!)) هەردەو دەمانەی کە گێژاوی دەروونی دایی هێور بۆوە دەنگی فەیزوڵلاّم لەناو دەنگی ئەو لاوانەی شەوانی مانگەشە و بەکوچە و کۆلاّناندا دەگەڕان و گۆرانییان دەگوتن جیادەکردەوەو دەمناسییەوە. لاوەکان کە بە کۆلاّناندا دەهاتنە خوارێ و گۆرانییان دەگوتن گراوییە راستەقینە یا خەیاڵییەکانیان بەناوی خۆیانەوە یا بە ئاماژە دە گۆرانییەکانیاندا دەگوتن. ئایا ئەو ئاواز و دەنگ و گۆرانی و شەوگەڕیانەش جۆرێك تێڕامان بوون- بیرکردنەوە بوون لەخۆ؟. ئەوە چۆن بوو، لەلایەکەوە برسییەتی و رەنج و ترس و لەرز لە هەر چوارلاوە دەوری خەڵکی تەنیبوو کەچی ئاواشیان دەگوتن؟ ئایا هەر بەراستییان دەگوتن؟ ئایا ئەوانە هەر بەڕاستی دەرکەوتنی گیان بوون یا شتگەلێك بوون هەروا لەخۆڕا خوو یان پێوە گیرابوو و لەخۆڕا روویان دەدا، هەروەك تەزبێح بادان و جگەرەکێشان و دووکەڵ بەباکردنێ؟ راستە ئەگەر لەلایەکەوە سەیرکەین بۆشاییەکی هەراو هەبوو، بەلاّم شتگەلێکی دیکەی زۆرتریش هەبوون کە ئەو بۆشاییەیان پڕدەکردەوە: سەرما، برسییەتی، نەخۆشی، و ترس لە زۆرداری و ملهوریە... لەبەر ئەوە گیان لە کوێوە دەرکەوتبایە؟ قسەی هیچ و پووچ و خورافە پەرستی و پەنابردنە بەر نوشتە و کشتەکان باوی بوو و توانای بەرفراوانتری دەبەردەستاندا بوو. دەو بارانەدا ((دەوڵەت)) بە قوتابخانە و بەخۆشی و ناخۆشییەوە یارمەتی خەڵکی دەدا: ئامادەبوو تا ئەو ژیانە هەر ئاوا درێژترکاتەوە و ئەو رەنج و ترس و لەرزانەش بەهێزو توندوتیژتر کات؟ ئایا ئەوانەش هەروا کە دوایی

گوتران خورافاتی تازەبوون کە مەبەست لە هاندانیان بێ هێزکردنی خەڵك و ملهوڕ کردنی زیاتری ((دەوڵەت)) بوو؟ داخوا مەبەست لەوانە ئەوەبوو کە هەر لە ئەمیر لەشکرەوە تا ئەبولفەتح خان هەموو هەروەك جاران خەڵکەکە بدۆشن و ((ئەبولفەتح خان))انی دیکە بۆ ((دەوڵەت))ێ زیادکەن؟...

بابەگیان و دایی نازانم، بەڵام من دەنگی فەیزوڵڵام دەنێوەواندا دەستنیشان دەکرد. دەیگوت- جوانیشی دەگوت ئەو شیعرەی هەڵیدەبژارد جوان بوو:

((سەد وەستای بێنن لە کۆیە    هەشتای موسڵێ و شەستی شنۆیە

کراسێکی لە گوڵە لیمۆیە    بدروون لە بۆ چاو هەڵۆیە))

دوایی وەك بەوەش دڵی هەر دانەکەوێ:

((سێسەد وەستا لە دەریازێ    شەستی موسڵێ و چلی شیرازێ

کراسێکی لە پەلکە پیازێ    بێن بدروون بۆ بووکە نازێ))

خوا بۆی دابووم، هەرکاتێ بمویستبایە مەلیحەی تووڕەکەم زۆر سادە و ساکارانە دەمگوت:

((دادەی بووکە نازێ بێ زەحمەت چایەکم بۆتێکە!)).

* * *

پشووی هاوینان هەروا دێت و رادەبرێ و دووبارە دێتەوە... ئەمسالٚ دوایین ساڵمانە. نزیکبوونەوەی پشووی هاوینان تەنانەت کۆمەڵە دورگەکانی کەللەی مەحموودیش کەش و هەوایەکی دیکەیان تێدەگەڕا، و وەك دورگەکانی سیبك و هاوایی ئاسمانی ساف دەبوو. گەروی جەنابی تاج بەخش کە دەتگوت ئەژنۆی کەڵەبابی لاری جانێیە کەمێك تیژیە گۆشەکەی لە دەست دەدات و ساردیە چاوە رەشە زیتەکانی کە دەڵێی چاوی بزنێن کەمێك دێنەخوارێ، و سەرە لەرزۆکەکەی بەرێوەبەریش شتێکە بەسەر راوەشاندنی ئەسپی پێش قەتارێ دەچێ، کە دەگەڵ هەر بزاوتێکی دەنگی سەدەها زەنگوڵەی خۆش ئاواز بەهەوایدا پەخش و بلاو دەکاتەوە. دەنگی زەنگی قوتابخانە ناسکی و خۆشییەکی پێوە دیارە و خشتەکانی رووپۆشی پۆلەکان رەنگ و روویەکی دۆستانە تریان بەخۆوەگرتووە و تەوقاتەکانی جەنابی تاج بەخش و بەرێوەبەر نەرمونیانی و نەوازشیان لێدەبارێ، و ((جا شەکەر)) گەلێکی کە بەرێوەبەری هەروا بۆ خۆشیە دەیکردنە دیاری زۆر جوان و خنجیلە و ژیکەڵە دەهاتنە بەرچاو- هەر



راست وەك جا شولەیەکی یەك رۆژە؛ و ئەو تۆوانەی کە مەلا ئاورەحمان دەپۆلێدا دەیقرتاندن پۆلی پڕ دەکرد لە بۆن و بەرامەی خۆی؛ و چاوی چەپی جەنابی (کۆشا) کە فەرڕاشە و وانەی ژمێرەی پۆلی چوارەم دەڵێتەوە و قوتابخانە تا ئێستا نەیتوانیوە بە وەزارەتی پەروەردەی بسەلمێنێ کە خوێندەوار نییە و وانەش دەڵێتەوە، لەپڕ دەکەوێتە بارێکی واوە کە دەگەڵ مەستییە چاوی خۆش روویانی نێو ئەفسانانەدا خۆی رادەنێ- مەسەلەکە مەسەلەی پێکەنینی دایی و گەرموگوڕی ماڵ و ژیانی خۆش نەبوو؛ بەڵکە مەسەلەکە ئەوەبوو کە ئیدی ئازاد بووین، و ئەوجا دەم چۆم و ئاو و دەشت و دەر، و کوچە و کۆلاَن و بازاڕ، و هەڵماتێن، و سەگ راونان- شار و دەشت و دەربوونە گۆڕەپانی زرمە زلەو رمبازێنی ئێمە...

جەنابی مەحموودی تارێك بوو دوو ژێی زیاتر نەبوو (چەشنی دوو تار یا دووتا): ئەو دوو ژێیانەشی قورئان و وانەی فارسی بوون- وانەی فارسی پۆلی یەکەم. بەڵام لەم دوولایەنانەوە تا بڵێی کۆك بوو: یەکەمیانی بەزەبری شوڵەداران فێربوو و بەپارەی دەخوێندەوە، دووەمیشیانی بێ مامۆستا فێربوو و بەزەبری شوڵکەداران دەگوتەوە. کرێکارێکی بەویژدان بوو- پۆلەکەی پشیلە شۆرنەدەکرد و وانەکەی هەڵنەدەکردووزاند؛ هەرچی لە کارەکەی وەچنگ کەوتبایە خەرجی دەکرد، و هەموو دەستکەوتەکەشی مشتە بەهێیەکی میراتی بوو. جارجارەش وادەبوو بە منداڵەکانی دەگوت ((دەوران وەکەن)) ئەوەشی ئەو کاتانەبوو کە بۆ خۆشی ((دەور))ی دەکردنەوە: دادەنیشت و بەکلاوەوە- چونکە کلاوی پەهلەوی و دوایی بەکلاوی شاپکاوە قورئان خوێندن چاك نەبوو- ((خەتمی قورئان))یی بۆ موسوڵمانان دەکرد و دوای تەواوبوونیی، خەتمەکەی هەدیەی روحی مردووی ئەوانە دەکردەوە کە بۆی خوێندوون: ((هدیە و تحفەً الی روح...)) لەسەرو بەرکردنێ وانەی فارسیدا ((دەستێکی بالاً))ی زۆر چاکی هەبوو؛ بە چەند دارانی بۆ چووبایە سەرێ درێغی نەدەکرد و دەمێشکی منداڵانی دە ئاخنی.

مەلا عەبدوڕڕەحمان ئەوە هەرتۆویشی دەقرتاند- و بەتایبەتی تۆو کولەکە- و قسەی هەرە خۆشیشی ((گووسەگ)) و ((بۆنی خەلا))یە بوو کە بەهەردوو لایاندا مەبەستی بۆن ناخۆشییە پۆلەکەی بوو. دەو جۆرەکاتانەدا سەرە لە قیوەکەی بادەدا و بڕۆی تێکدەنان، و دەیگوت: ((بۆن خەلا)) و لامی خەلایەکەی بە قورسی دەگوت: ((خەللا)) ئەوەش کاتێکی کە بۆنەکە کەسکونتربایە. ئیملای لە شتی زۆر قورس پێدەکردین و دەبایە لەبەریشی کەین.

جەنابی تاج بەخش بەدوو سەرە ئاگر پەرست بوو. لەوانەش بوو پەرستنی یەکەمی پاساوی پەرستنی دووەمی بداتەوە، لە رواڵەتدا وادیاربوو: یەکجار زۆر متووی پەنا مەقاڵەکەی ئاوری بوو، و یەکجار زۆریش پەرێشان و سوتاوی گەورەیی و شکۆمەندیە ئێرانی سەردەمی ساسانیان بوو، خۆ ئەگەر بۆی کرابایە هەر هەلێکی وەچنگ کەوتبایە سەرێکی لە قوتابخانە هەڵدێنا و خۆی دەگەیاندەوە شانۆ نامەی کیشی گەورە بۆ مەرگی یەزدگوردی کز و مات و غەمبار دەبوو.

لەدوای هەمووان جەنابی مامۆستا کۆشا بوو کە فەراش بوو و ژمێرەشی دەگوتەوە: شەوێ پرسیار و راهێنانەکانیان بۆ حەل دەکرد و ئەویش بەیانی دەهات بەمەی دەگوتەوە.

ئەوانە مامۆستا گەلێك بوون وەك شوانان کە رەگەڵ مێگەلی دەکەون، ئەوانیش ئاوا رەگەڵەمە دەکەوتن. پۆل بە پۆل، قۆناغ بە قۆناغ، تا سەرەنجام دەیانگەیاندینە ((مەیدانێ حەیوانان)) جا بەگوێرەی بارودۆخ یا بۆخۆیان دەگەڕانەوە یا ئەوانیش دەگەڵەمەدا دەمانەوە. تەنیا جەنابی مامۆستا مەحموودی نەبێ کە هەمیشە لەجێی خۆی و لە هەمان شوێندا و ساڵانێکی دوور و درێژ بوو لەوجێیەی خۆیدا چەقیبوو — هەروەك خاوەن ئوتێلێ، هەروا خەڵکی هەمەجۆرە بوون دەهاتن و دەڕۆیشتن و ئەو هەر لەجێی خۆی بوو- و تا دوا رۆژانی تەمەنیشی هەر لەوجێیەمایەوە... بەرێوەبەر هەمیشە هەر خەریکی ئەندازە گرتن و بڕینی شوتڕکە داران بوو، بۆ سەردانێ هەندێك لە پۆلەکان- تەنیا پۆلی مامۆستا مەحموودیی نەبێ- لەبەر وانە و زانست ئاخنینەمێشکی مندالان نەدەپرژایە سەرهیچی دی. لەپێشدا شوتڕکەکەی هەڵدەسەنگاند و سەرە باریك و ئەستوورەکەی دیاری دەکرد و بارە ئەستورەکەی دە مستی دەگرت و بە شێوەیەکی ئاسۆیی رایدەگرت، ئەگەر شل و پل بایە و خواربایەوە، ئەوە تا ئەوجێیەی کە راست رادەوەستا دەیبڕیەوە، تا وای لێدەکرد خواربوونەوەی نەمێنێ و دارێکی لە دەستاخۆشی لێپەیدا دەبوو. جەنابی مامۆستا مەحموودی دەگەڵ وەرگێڕان و لێکدانەوەی قورئانێدا نەبوو. دەیگوت — لەوانەش بوو راست بکا- هێندە بەسە هەر سەرو ژێرێك[1] وێك کەون جاوەرە سەیریی چ بەلاّ و هەراو هۆریا و ئالۆزییەکی گەورەی لێ پەیدا دەبێ و چ گوناهێکی گەورەی بەچاویەوەیە.

[1] **سەرو ژێر: ((فەتحە و کەسرە)) دوو نیشانەن لە کۆتایی وشەدا لەسەر یا لە بن دوایین پیتی وشەکەوە دادەنرێن بەگوێرەی پێویست. فەتحە: لە سەرەوە- و کەسرە: لەژێرەوە —وەرگێڕ-.**



کاتێ لە وەزارەتی پەروەردەوە ((ئایاتی هەڵبژاردە)) چاپ و بلاّوکرانەوەو سەرەنجام گەینە شارەکەی ئێمە سەرێکی راوەشاند و ئەستەغفیروڵلاّیەکی بەزاریدا هات. گوتی بۆ خۆتان بیخوێننەوە، ئێوە هێشتا نەبالّغن چتان لەسەر نییە، کەچی ئیواشیان تێدابوو بالّق. هەرچۆنێك بوو ئیدی ئەو، ئەو گوناهەی نەهێنایە ئەستۆی خۆی، و کاتی دەرسێش کەلێی دەپرسینەوە، هەر کە ((یا أیها الذین آمنوا))مان دەخوێندەوەو دوابەدوای ئەودا دەمانگوت ((ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە)) ئەو چاوە شینەکانی زەق دەکردنەوە، هەروەك گوناهێکی گەورە کرابێ و هەڵەیەکی گەورە روویدابێ، هەرچەندە هێشتا بەربار نەبووین و چمان لەسەرنەبوو...، و ((سەر)) و ((ژێر))مان لە یەکتر جیا نەدەکردەوە.

دەنگی زەنگی تێکەڵ و پێکەڵ و هارەی زەنگی دێری فەلان، کە هەرگیز نە دیتبومان و نەبیستبومان دەبایە بزانین لە چ کانزا و چ فلززێکە کە خەو و خۆراکی لێ هەڵگرتبووین و ژیانی تێکدابووین ((ئەرکی نووسینەوە))ش ئەوە هەر دێوەزمەیەك بوو بە تەنێ، بەتایبەتی کاتێ کە مامۆستا رقی هەڵدەستا و تورە دەبوو و لە دامێنی نووسینەوەکەی دەنووسییەوە: ((دەجار)) یانی دەبێ هەر ئەو ئەرکەی کە نووسیومانەتەوە دەجاری دیشی بنووسینەوە- بەگوێرەی ئەمە، یاری و خەو و حەسانەوەش ئەوە هەر فت! هۆی توڕەبوونەکەشی لە تەنیا شتێکی بەولاوەترەوە نەبوو: ئەویش ئەوەبوو خەڵکی بۆ دەست بەئاو گەیاندنێ ئێواران دەچوونە دەم چۆمی و لەوێیان خۆ بەتاڵ دەکرد. ئێمەی مندالانیش وا بزۆز و ناراحەت حەزمان دەکرد بزانین داخوا مامۆستاکانیش چۆن دادەنیشن و خۆ بەتاڵ دەکەنەوە، داخوا هەروەك ئێمە و مانانن یان ئەوان رێ و شوێنی تایبەتی خۆ بەتاڵ کردنی خۆیان هەیە، کە بەلای ئێمەوە شتێکی سەیربوو. دووراو دوور رادەوەستاین و سەیرمان دەکرد.

خۆ لەبەرکردنی خشتەی لێکدان ((جەدوەلی زەرب)) و دابەشکردنیش ئەوە هەر داستانێك بوون بۆ خۆیان... ئەو ناخۆشی و دەردە سەریانە مێشکە بچکۆلەکانمانی وا دەگوشین کە حالّیان بەکەس نەهێشتبوو. قوتابخانە تەڵەیەکی وابوو هەر کە بیگرتبای بەرەڵلاّ بوونت نەبوو، هەر هێندە بەس بوو رۆژێکی نەچییەوە قوتابخانە کە گورجێکی سەرو سەکوتی فەراش و پاسەوانی یا لە دوکانێ یان لە مالّێ پەیدا دەبوو تا پەیمان و بەلێنیان لە گەورەکەت وەرگرتبایە- دیارە ((بەخشیش))یش کاری خۆی دەکرد. ئەو رۆژانە ئێمە ئەوەمان بە ستەمێکی گەورە دەزانی. مامۆستایە بێ چارەو بێنەواکان وەك مامۆستای ئێستا نەبوون کە هەموو شتێکیان دەوێ. بێ خۆبادان و بێ خۆ هەڵکێشان و لەخۆبایی بوون، ناو و نیشانیان تەنیا و نۆکەری دەوڵەت)) بوو- وەسەلام. لەراستیدا ئەو خاکەڕاییەشیان لەباری

زۆر زانیەوە نەبوو؛ راستییەکەی خاکەرایی نەبوو، ترس و بێ جەرگی کەم زانین و تێکەڵ بە دەست کورتی و بێ غیرەتی بوو کە لەبەر لەڕو لاوازی و بێ تووکیە سەری هەڵدابوو. دە قوتابخانەکەی مەدا مامۆستایەکی بەناوی ((رووخۆش))ی تێدا نەبوو تا دەستمان بگرێت و کارەکانمان بۆ ئاسان بکات. ئەوەی هەبوو هەر زۆر و ستەم بوو کە مێشکی تێکدەداو دەبووە مایەی توڕەبوون و لاسارییە. بەلاّم دەگەڵ ئەمانەشدا هەمووی ئەوتەڵەیە بە تەنیا خۆی نەبوو- منداڵەکانیش بوون، و منداڵەکان بوون کە دوایی بیرم کەوتنەوە؛ بە وتەیەکی دی ژیانی ئەم قۆناغەی تەمەن، تەنیا روخساری بێ گوناهانە و پاکی و دۆستایەتی بێ غەل و غەشە. دوای مانگی شەهریوەری (          ) ساڵی ١٩٤١ز. کە قوتابخانەکەمان بەهاندانی دەستەیەك خان و بەگلەر وێران بوو، هەرچەند جارێکی بەلای کەلاوەکەیدا تێدەپەڕیم سەروچاوی منداڵەکانم دەهاتنەوە پێش چاوی و دڵم توند دەبوو و دەگیرا. تەنانەت ئەو کاتیش ساردی و توندوتیژی چاوەکانی مامۆستا تا ج بەخش یا مامۆستا مەحموودییم، دە عالەمی خەیاڵدا بە نەرمی دەهاتنەوە یاد- و ئەمە وێنەیەکە کە هەمیشە یادی دەکەمەوەو دەیهێنمەوە پێش چاوم- هەروەك ئاواڵ و دۆستێکی نەخۆش کە رەنگی روویت بە هەڵبزرکاوی و زەرد و شیواویەوە دیوە کەچی کاتێ کە دەمرێت هەر ئەو رەنگ و رووەت بە جوانترین و شاد و گەشترین رەنگ و روو دێتەوە بەرچاو.

بەهەرحاڵ، هەرچی بوو بیروبڕوا وابوو کە نەزانین خەریك بوو جێی پێ لەق ببێ، چونکە قوتابخانە هەبوو. بەلاّم خەڵکی ناوچەکەش هێندەیان قوتابخانە لاپەسەند نەبوو: ((های بابە، ئەمن گەرەکمە منداڵەکەم لەبەردەستی خۆم بێ باشترە، رۆژانە سێ شاییان پەیداکا، و یارمەتییەکم بدات... قوتابخانە!... تازە چیان فێردەکەن... سروود!)) و ئەم وشەیان چەند بە نەفرین و قێزەونییەوە بەسەرزماندا دێنا! بەلاّم دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا منداڵەکان تەکانێکیان هەردابوو و ((سەواد))یان، لە دەست میرزا و ئیدیکە هێنابووە دەرێ، و ئێستا هەر منداڵێکی بتگرتبایە دەیتوانی دانیشێ و ((سکالاّنامە)) بۆ پیرێژنان بنووسێ، و لە سکالاّنامەی گەروەکانیش کەمتر نەبێ- وەکو یەك، یانی هیچ- هەرچەند نازناو و ناو و نیشانەکانیان وەك میرزا و ئەوانیدی نەدەنووسی: ((حوزوری موستەتابی جەلالەت مەئاب... بەندەکانی ئەجەلی ئەکرەم حەزرەتی ئەمیر لەشکری موعەززەم...)).

هەرچەندە داواکاران خۆیان دەخواردەوە و لەتاو حاڵ و باڵی شاری کە خەریك بوو دەبووە کافرستان، داخیان دەخوارد و دڵ پڕ کەسەربوون- ئەڵبەتە هەندێکیش بۆ زاڵبوونی دەرسی رەحمانی بەسەر دەرسی



شەیتانیدا هاوینان منداڵەکانیان دەناردنە مزگەوتێ. مەلایەکانیش لەوەی غافڵ نەبوون کە بەخشکەیی منداڵەکانیان بنێرنە قوتابخانە، گوایە نەك لەبەرفێربوونی زانستێ بەڵکە بۆ دۆزینەوەو ئاشکراکردنی هێماکانی ((توانای دەوڵەت))ێ...

ئەڵبەتە ئەودەمی وەك پێشتر پزیشك نەبوو تا بە خەڵکی رابگا، چ جای ئەوەی کە لە نەخۆشی بپرسێ کە داخوا دەخوێنێتەوە یان نا و ئەگەر دەخوێنێتەوە چ جۆرە کتێبێکی دەخوێنێتەوەو واچاکترە فلاّنە جۆرە کتێبان بخوێنێتەوە تا مێشکی بحەسێتەوە- ئەودەمی هێشتا مێشك نەدۆزرابۆوە، یا ئەگەر دۆزرابووبێشتەوە نەگەیبووە شارە بچکۆلانەکەی ئێمە و خەڵکی هێشتا نەیان کڕیبوو. رێچکەی ژیانی کۆمەلاّیەتی بەو هەموو سستییەی خۆیەوە هێندە قوڵ نەبوو، سادە و ساکاربوو، وەك تەنکاوێکی داوەستاو؛ ئەوەی لەباو بوو خەوی دوای نانی و پاش نیوەڕۆیان و زۆر بلێیی و برسییەتی و ئایینزای درۆزنانە و دەروێش و سۆفیگەرییەتی بوو. ئەوە سەرباری ریش و پرچی ئاڵۆز کە نەدەشاردرانەوە، کاروباری بەدزی و بەنیوە دزیەوەش لەباو بوو و بێ رەونەق نەبوو: لەسەر قۆڵ و بازوو و بەسەرکلاّوەوە، و لەبن کلاّوەوە، لەبان شان و لەبن باڵی منداڵاّندا جار هەبوو یەك و جاری واش چەند ((نوشتە))یەکی چاوەزارێ، و ئی لەرز و تا، ئی ترسێ... کە هەموو ئەوانە ئەوەیان پێشاندەدا کە تەندروستی میللی زۆر چاپووکانە لە پێشڕەودایە و ئەو شتانە جێی هەموو داو دەرمانێکیان گرتۆتەوە. پێشکەوتنی ((تەندروستی)) لێرە، بەلای منەوە، لە هەموو جێیەکی دیکەی مەملەکەتی پێشکەوتووتر بوو: ئەگەر ((تا))ت لێ هاتبایە ئەوەندە بەس بوو، کەسێکی بەتایبەتی ئەوانەی نەفەسیان پاکە- و مەلایەکان، بەتایبەتی سادات کە لەوان کەسە نەفەس پاکانە بوون- حەوت جار قول هووەڵلاّی بخوێنێ و هەرجارەی فوویەکی لەداوە دەزووێکی بکات و دەگەڵ هەر فووەکی گرێیەکیش لە دەزووەکێ دات و دەزووەکەت بەمەچەکێ رابەستێ- و... بڕۆ ئاوو ئاوچی؛ و ئیدی تایەکە وەك دڵۆپە ئاوێکی بە عەردیدا بچێتە خوارێ، و بڕوا و نەیەتەوە! ((نوشتە)) دوعایەکی سێ گۆشەی دوو لایەکسان بوو- کە دە پارچە سیمێك و دوایە دەمێوێیان دەگرت و ئەوجا یا لەسەر کلاّویەوە یا لەبن کلاّویەوە، یا لەسەرشانی یا راست لە ناوەڕاستی هەردووك قۆڵنجان لەسەر بڕبڕەی پشتێ یا لەبن هەنگڵێیان دەدروی، یا جاری وابوو وەك بازوبەندی پاڵەوانان لە قۆڵی دەکرا. من بۆ خۆم چەند دانەیەکم لەوانە کردنەوە- دیارە کردنەوەی ((نوشتە)) قەدەغە بوو، چونکە نە هەر ئەوەندە کە بەتاڵ دەبۆوە، بەڵکە بۆ ئەو کەسەی کە دەشیکردەوە هەر خراپ بوو. هەر راست وەك ئەوانەی کە لەلای خۆمان بۆ من و مەلیحەیان کردبوو: جۆرە شتێك بوون وەك خشتەی کاتەکانی هاتوچۆی شەمەندەفەرێ، یا خشتەی زیادبوونی کۆمەڵگا، بە

کۆمەڵێك نیشانە و ژمارەوە. سەرەڕای (+) و (-) و دابەش(÷)، و سێ گۆشە و چوارگۆشە، و جاری وا بادامی و تەنانەت بازنەیی- بە چەند ژمارە یا پیتێکی نێوانیانەوە. ئەو نیشانە و پیتانە لە مەکتەبی پزیشکی ئەو ((حەکیمانە))دا هەریەکەی چەکێك بوو دژی شەیتانەکان و هێز و توانایە خراپ و بەدفەڕەکانیان، و راکێشەری توانایی چاکە و هۆی جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی ئەوان بوون دەناو گیان و لەشدا.

شێت چاك کردنەوە بەلێدانێ بوو، و ئەوەش تەنیا کاری شێخان بوو: شێتی بێنەوا و بەستەزمانیان لە کۆڵەگەی دەبەست و وەریدەگەڕانێ بەلێدانێ، و دەی ناوی ئەجندان بلێ، و خۆ ئەگەر ((تاوانبار)) خۆی بواردبایە و یارمەتی نەدابان لەو داوایەی لێیدەکەن، ئەوە هەمدیس وایان لێدەکردەوە بەلێدانێ کە ناچار هەر لەخۆوە شتێکی بلێ و لە یەخەی خۆییان کاتەوە. نەخۆشەکە جاری وابوو لە بن لێدانێدا دەمرد، و یارمەتی نەدەدان و هیچی نەدەگوت. بەلاّم هەرچەندە ئەم شتانە دەپلانی کاردا کاریگەرییەکی یەکجار زۆری هەبوو کەچی گرێی تەنانەت یەك گیروگرفتی نەدەکردەوە: مرۆڤ کە تەنگەتاو بوو هیچ شتێك نییە پێش بە تەنگەتاوییەکەی بگرێ و بە هیچ شتێکیشی چارەسەر نەدەکرا: ئاودەست دەماڵاندا نەبوو، و بۆ خۆ سووك کردنێ تەنیا هەر ئاودەستی مزگەوتێ، یا قەراغ چۆمی، یا کۆلاّنی چۆڵ بوو، ئەوە ئەگەر تەنگاوەکە پیاو بایە خۆ ئەگەر ژن بایە، سەربان خۆت بگرە و هاتم... و خۆ ئەگەر تەنگاویەکە سەری کردبایە و گەیبایە تەنگەتاویە، ئەوە هەر لەجێی خۆیەوە دادەنیشت داو و تەژگەڵی لە دەوری خۆی بلاّو دەکردن و وای خۆ پێشاندەدا کە ئەوە شتێکی لێ ونبووە و دانیشتووە لێیدەگەڕێ، و بە هێنان و بردنێ برۆ و دەموچاوانیش تێیدەگەیاند کە ((ونبووەکە)) شتێکە نایەوێ کەس بزانێ چییە، چونکە منداڵەکان دەستوبرد ئامادەبوون بێ پێگوتن، بچنە یارمەتیە و تەنگاوەکەیان وەك کەری نیوەزەڕ لێدەکرد و بەنیوەچڵی هەڵدەستایەوە. ئەورۆکە پێشکەوتنێك لەو لایەنانەوە روویداوە و دیارە. بە زۆربوون و بلاّوبوونەوەی ((ماشینیزا سیۆن)) ماشێن دەکوچە و کۆلاّناندا هێندە زۆر بووە، دەتوانی بە ئارەزووی خۆت بە تایە لاستیکەکانیاندا هەڵ میزی و کەسیش نەتبینێ... راستە ئەو دەمی ئەو لەو جۆرە پاڵەوانە جیاجیایانە نەبوو، بەلاّم دەگەڵ ئەوەشدا کار هێندەش شەل و سەقەت نەبوو: هەبوون ((پسپۆڕان))ی تەندروستی هەبوون کە زمانی سیسرکە و مۆریانان بزانن. بابەگیان دەیگوت ئەودەمی لەلای خۆمان ئەو پسپۆڕانە دەهاتنە مالاّن و سلاّوێکیان لە سیسرکان دەکرد و زۆر خۆمانە داوایان لێدەکردن بڕۆن- و سیسرەکەکانیش رێزیان بۆ فەرمانی ((چۆڵکردنێ)) دادەنا و دەڕۆیشتن!...



بەڵێ لە شارە بچکۆڵەکەی ئێمەدا لەم جۆرە هەنگاوە تەندروستیانە زۆر بوون، و هەر لەبەر ئەو دەست پێشخەرییە تەندروستیانەش کە هەر لە هەوەڵی کارێوە کە سبەینان لەبەردەمی پۆلی، پێش ئەوەی بچینە ژوورێ چەند حەبێکی (کنین)ی شینیان دەدایە قوتابییەکان و بەراسپاردەی ماڵەوەیان مەگەر بەلێدانێ دەنا نەیاندەخوارد. خۆتان لە خودای مەکەن! حەب! حەب چ پەیوەندییەکی بە لەرز و تایەوەیە، حەبێکیش کە لە ((عەجەمستان))یۆەیانڕا هێنا بێت، و رەزا شا رێگەی دابێت و پەسەندی کردبێت. ئەو زەمانی ئازووقە داکردن، بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بوو؛ لەپێوانەی کار و بار سوڕانێدا یاسای راپەڕینی بەردەوامی ژیان لێرە نەبوو و نەدەبینرا کە هەرکاتێ یەکێك کەوت یەکێکی تر لە جێ- هەموو هەر کەوتبوون؛ کەس لە پڕ دەوڵەمەند نەدەبوو؛ وەك ئەو کاتانەی دواتر نەبوو کە هەموو شتێکی تێدا بارهاتبایە و هیچ شتێك مەرجی هیچ شتێك نەبێ، و کەسێك دوای تەمەنێکی دوور و درێژی دەست کورتی و نەداری یەك شەوە ببێتە خاوەن سامانێکی حوندە و دەمودەست بێت و دیواری خانووەکەی سێ نهۆم بەسەر دیواری ماڵە دراوسێیەکەیدا بەرزکاتەوەو بێت بەگرام و ریکۆردێر و ڤیدیۆ و چەند سەگێکی گورگ خنکێنی گەورە لە حەسار و سەربانانیان بەرەڵلاّ بکات و رۆژگاری هاوسێیان بکاتە جەهەننەم و رۆژی رەش. ئەو رۆژانە تێکەوەدان و بگرە و بەردەو وەرە و بڕۆی کۆمەڵ وەك ئەورۆکە توندو بەند و خێرا و دەستوبرد نەبوو. وانەبوو کە سەرۆکی فلاّنەگروپی سیاسی ئەورۆ قوڕێ بۆ لایەنەکەی خۆی وە سەری کات و سبەینێش لەو شتانەی دوێنێی بە تەواوەتی پەشیمان ببێتەوە، وانەبوو نەواری قسەکانی دوێنێی بەنیوە تەواویەوە بێنێ و ئەورۆ یەك خولی تەواوی بەپێچەوانەوە لێدا... یا دەم و لەو سێ بسڕێتەوە، و کتوپڕ ببتە پشیلەی عابید!.

بەلاّم دەگەڵ هەموو ئەم بارودۆخانەدا- بە تەواوی ئەو سستی و نەجوولاّنە- دوای ماوەیەك، بەلانی کەمەوە لە پڕ ژمارەیەك وە ئاگا هاتنەوە کە وەك بلێی هەموومان- خەڵکی شارۆچکەکەی مە- بەشێك بووین لە ((کاروانی پێگەیشتن)) بەلاّم رێگران پێشیان بەکاروانەکە گرتووە و تالاّنیان کردووە و سەر قافڵە باشیەکەیان فڕاندووە...

❊ ❊ ❊

## (١٧)

پشووی هاوینە. کارتی دەرچوونی پۆلی شەشەمان وەرگرتۆتەوەو دەخولێینەوە: یانی دەگەڕێین و دەسوڕێینەوە. جێیەك نەماوە نەگەڕێین- ئەوە چەندەمین جارە بەهەر چوار دەورەی شار و دەوروبەرەکەیدا بخولێینەوەو بگەڕێین... تەمبەڵ و تەوەزەل و بێ ئیش و بێ کار، بەتایبەتی کە ئیدی بەلانی کەمەوە لە ماڵێ و لەبەرچاوی خەڵکی دی وەك جاران منداڵ نین و ناتوانین وەك پێشان، ڕۆژ تا ئێوارێ بەرهەڵدای کوچە و کۆڵانان بین. لەماڵێش کارێك نییە خۆی پێوە بخافڵێنی. دەمێنێتەوە هێندێ سەرکەمە سەر مەلیحەی و دەگەڵیدا بەدەمەقاڵ بێم و دایی خۆ باوێتە نێو گۆنگەڵێ و بەڕوومدا بتەقێتەوە و دووسێ جنێوی تەڕ بە بڕوانامە و کارتەکەم بدات، و ئەوی بۆ کارێکی، و منیش بنێرتەوە بازاڕی و بچێ دڵی وی بداتەوەو دەستی بەسەریدا بێنێ. مەلیحەش ئێستا کچەکەی جاران نییە. ئێستا سەراپای چوست و چالاکی و وەرە و بڕۆیە و بەخڕخاڵ و دەستبەند و گوارەکانیەوە خۆ رادەنێ و چاوان دەڕێژێ، و وەسمەی دەبرۆیان دەدا. هەر ڕاست بۆتە کچی حاجی حەمە قودۆی موسڵێ، کەمن نازانم ئەو حاجی حەمە قودۆیە هەرکێیە و پێشم وا نییە کەسێکی دی بزانێ، چونکە لە زۆرانم پرسیوە نەیانزانیوە، بەڵێ بۆتە کچێ حاجی حەمە قودۆی و بەردوام بە کەش و فشێکەوە لەژووریڕا دێتە هەیوانێ و لە هەیوانێوە دێتە حەسارێ و لە حەسارێشڕا بەهەلینگێکی دەچێتە سەرکانییە و من هەر بەهیچیش نازانێ!... ئیدی مێردی کردووە و من لەو لایەنەوە داشم سوارە، و بەردەوام لە شەڕێ دەگەڕێم، هەرچەندە کە دایی هەمیشە لایەنی وی دەگرێ و بەردەوام بەسەرمندا دەبۆڵێنێ کە خودا ئەو بڕوانامەیەی ببڕێ کە من وەرمگرتووە و ئەو قوتابخانەیە کوێر بێتەوە کە من تێمدا خوێندووە، کە ئاوا بیست و چوار سەعاتەی خودای لە ناو لینگی ژناندام و خۆ لەکاری ژنانە هەڵدەقورتێنم و بوومەتە ئەسپێی ناوگەڵیان! چت بەسەریەوەیە، ئەو تازە خاوەنی خۆی هەیە. بەڵام هەفتە حەوت ڕۆژە مەلیحە هەشت ڕۆژان لە ماڵێ مەیە.



بۆ منیش، هەروەك هەموو ئەوانیدی، چ ئایندەیەکی بەرچاو نییە کە بۆ خوێندنێ بچمە جێیەکی و وەکو کوڕی کاك سلێمانی لە ناوەندی پارێزگای یا لە تارانێ بخوێنم. ئەمەیان چاك دەزانم- و ئەوە تێماوم. بابەگیان دەڵێ دەبێ بچم کەم کەمە فێری بۆیاغ کردن و پینەدۆزییە ببم و هەم یارمەتییەکی ئەویش بدەم. بەڵام من هەر خوێندوومە و قوتابی بووم هەرچەندە سەری خۆم دێنم و دەبەم سەیر دەکەم من بۆ هیچ کارێك بارنە هێنراوم... بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە هەروەك (مرۆڤایەتی) هەرگیز کار و کردەوە و هەوڵ و ڕەنجێکی نەدابێ و نەگەیبێتە چ جێیان- یانی بەلانی کەمەوە بۆ من وابوو. هەموو خوێندنەکەمان کە ئەو هەموو چاوەڕوانیەی لێدەکرا و بەلانی کەمەوە لە منداڵیەی جیاکردبووینەوە، تەنیا مشتێك شیعری بێ سەر و پابوو کە هیچ پەیوەندییەکی بە ئێمەوە نەبوو و بەکەڵکی هیچ شتێك نەدەهات: ((بیستم گەورە پیاوێك مەڕێکی لە چنگ گورگێکی ڕزگارکرد!)) هەروەك بە عومری خۆمان مەڕمان نەدیبێ و تازە بەتازە ناوەکەی دەزانین. یان ببیسین یەکێك- ئەویش گەورەیەك!- ئەوی لە چنگی گورگێکی دەرێناوە. هەروەك ئەو گەورانەی ئێمە دیومانن و دەیانبینین ڕاست ئەوانە بن کە مەڕی لە چنگی گورگان دەردێنن، و هەروەك ئەوەی کە ئەگەر ئەو گەورەیە نەبێ هەرگیز نەمەڕ لە چنگی گورگ و نە بزنە گڕوێیەك لەچنگی چەقەڵێکی ڕزگاریان دەبێ و دێنەدەرێ. ئینجا...

و دیسانەوە وێنەی درۆزنانەی ئەقڵی ئەو شایانەی مێشکی ئێمەیان پێ ئاخنیبوو کە شاپووری ساسانی لە منداڵییەوە- بەقسەی دایی هەزار ماشەڵڵای لێبێ- چ مێشکێکی هەبوو؛ چ شاکارێکی کرد و وەك هەموو ((گەورە پیاوانی مێژوو)) هەر لە منداڵییەوە چ ئەقڵێکی نیشاندا!- بەوپڕدەی کە دروستیکرد. و ئێمە هەر نەمانزانی و تێنەگەیشتین ئەو ئەقڵ و زانایییەی لە کوێوە هێناو چ بووە هۆی ئەو هەموو ئەقڵ و زانینە. ئەو ناوەندە بازرگانیەی ئەو بیرو بۆچوونانەی، بەو هەموو جەنجاڵیەی خۆیەوە لەکوێ بوو کە بووە مایەی ئاوا شارێك!؟ یانە و شیروانی دادوەر بەو کەر و بەو دادە کۆمپیۆتەریەی و بەوخۆ پەنادانەی لە ئەیوانی کۆشکێدا بۆ ڕاوی زۆرلێکراوان! یا ئەو خودا پەرستە بەڕێزە، بەو هەموو تەنتەنە و بەن بەنەی کە پێیانەوە هەڵواسیوە و بەو هەموو خواپەرستی و هەژاری و نەدارییەوەی هێندەی نەماوە لە خۆشیان لە پێستی خۆیدا جێی نەبێتەوە، چونکە لە پاداشی ئەو هەموو زوهد و خواپەرستیەیدا هەر کە ژنەکەی زگی ماسییە هەڵدەدڕێ مرواریەکی گەورەی وای لێ دێتە دەرێ بڵێم چەندە! ئای ڕۆژگار... ماڵی دنیایە وەك دەڵێن هەروا کەلاکێك نییە بەسەریدا

بکەوی و بەهەوەنتە بێتە بەر دەستت... و ئا ئەوەی دیش، کە گوایە لە بیابانێ توشی سەگێکی تینوو دەبێت کە لە تینوان هێزو توانای لێبڕاوە و خەریکە گیاندەدا- ئەویش دەبیابانێکیدا- سەگ! سەگ چ دەکا لە بیابانێ! و بایەزید، دەو چۆڵەوانیەیدا، بە پێخواستی لە چ دەگەڕێ، یان ئەوەی دی کە سەگەی دەبینێ برسییەتی مریدەکەی دەنێرێ بەرخێکی بکڕێ و بیکوژێتەوە و ئەو بەستەزمانەی ((خودا))ی یانی سەگەکە لە برسییەتیە رزگار بکات. و...

مەبەستمان ئەوەیە، کە لە ئۆپێرا و بالیە و مێژوو و زانست و ئەو جۆرە شتانە هیچیان بەگوێدا نەداین و فێریان نەکردین. خۆ ئەگەر خودا نەخواستە ئەوانەیان هەموو دەکتێباندا نووسیبان و بمانخوێندبانایە بێگومانم کە جەنابی مامۆستا مەحموودی دەیگوت ئەوشتانە هێندێك هەوڕو هیباری ئاشپەزخانەن کە لە عەجەمستانێیان چێشت تێدا دەخۆن، یان تێیانڕا لێدەنێن- و هێشتا نەیان هێناونەتە شارەکەی مە! بەهەرحاڵ وەزعی درەختی زانین بە جۆرێکی وانەبوو کە بەرو میوەیەك بدات یا ئەگەر بیشیدات ئەوە نییە شایانی هیچ بێت و بەکەڵکی هیچ بێت. دیارە سەردەمانێکیش نەبوو کە بتوانی کەمالیاتی بەنرخێکی گونجاو بکڕی. خۆ ئەگەر تازەش هەبووبن ئەو دامەزراوانەبوون کە لە کۆتایی حوکومەتی شادا ئەو کەمالیاتانەیان بەنرخێکی گونجاو دەفرۆشت، دەگەڵ ئەوەشدا، نرخە ((گونجاوەکەیان)) وەچنگ نەدەکەوت و پارە نەبوو. ((دوکان)) دووربوو. بەدەردی حاجی سەعدوڵڵا دەیگوت دڵی شێرو سەبری ئەیوب و کاڵە و پێتاو و دار عەسای ئاسن و عومری نوحی گەرەك بوو تا پیاو دەگەیشتە تارانێ ئەویش بۆ کڕینی کەمالیاتێکی کە تۆ تەنانەت نموونە و کەتەلۆکەکەشیت نەدیوە!...

ئەمەش لە بارەی خوێندنێوە... لە هیچ جێیەکی دەربارەی کاری خوێندنی سەردەمی رەزا شای کاریگەریەکی ئەوتۆ نەبوو هیچ بێنێ، مەزەندەکان هەموویان دەهاتنەوە سەر ئەوەی کە ئەو خوێندنە، خوێندن نەبووە، خۆ ئەگەر بشبووبێ هەر بۆ ئەوەبووە کە چین و توێژی ملکەچ و ژێردەستە هێندەی دی و زیاتریش بەقوڕێدا بەرێتە خوارێ و کارێکی وابکا کە ژێر دەستیەخۆی زیاتر هەست پێبکات، و لەو رێیەوە- بەقسەی ئەم سەردەمە- ببێتە پاڵپشتی پتەوی ((سەرمایەداران)) و ((گەورە مالیکان)). بەتایبەتی پاڵپشت و پشتیوانی رەزاشا کە گەورەترین ((زەمیندار))ی وڵاتی بوو. بەقسەی کوڕەکەی جەنابی کاك سلێمانی- لە گفتوگۆیەکی دەگەڵ بابیدا- بەڵێ دیارە دەبوو بەوەش بڵێین پێشکەوتن، بەلاّم دەبوو پێشکەوتن چ بێ، و لە چ



شوێنێکیدا بێ، و مەبەست لە پێشکەوتن چ بێ؟ لەو لایەنەوە کە هەموو توشی دڵەکوتە و هەناسە سواریەبن، مەئمووری دامودەزگاکان کەی ئارەزوویان کرد بە مالاّن وەربن و هەر کارێکیان ویست دەگەڵ خەڵکیدا بکەن!؟ ئەوە ئەوپەڕی پەروەردە و بار هێنانی یەك مشت نۆکەر و بەردەست و پیاوی ماڵێ و پۆلیسن- مشتێك خەڵکی وەك ئەبولفەتح خان و جەنابی زەمینی و ئیدیکەن. ئەوەی کەلێرە حیسابێکی بۆ ناکرێ تەنیا خەڵك و کۆمەڵگایە...

بەلاّم سەیرەکە لەوەدایە کە ئەو قسانە کەسانێك دەیانکەن کە خۆیان پەروەردەی سەردەمی رەزا شا و دەست چێنی خۆیان بوون- و پۆلیسیش نەبوون! بەهەرحاڵ ئەوەی کە من دەمدیت لە هەڵسەنگاندنی کەسانێکی دیکە زۆر راست بینانەتربوو: ئەو پەروەردە و راهێنانانەش هەر بۆ ئەوەبوو کە هەر پێنج ئەنگوستی دەستان یەك ئەندازە و وەکو یەك پێشاندەن؛ گەورە و چوکایەتیە لە نێواندا نەهێڵێ. هەردەبوو واشبێ. ئەوە لە پیاوێکی وەك رەزاشای کە لە بن لێفەی بابی خۆی نەتڕیبوو و هەر لە تەویلەی ولاّغان و لە بن دەستوپێی ئێستراندا لە دایك ببوو شتێکی سەیر نەبوو کە کارێکی وابکا هەر پێنج ئەنگوستی دەستان بەقەدەریەك بن. بەلاّم ئەم جارەیان سەیرەکە لەوەدا بوو کە رازی و ناڕازی هەردووك باری سەرنج و تێڕوانینیان یەك بوو...

تا، ئاخری و ئاقیبەتی خودا رەحمی کرد لە تەمبەڵی و تەوە زەلیەمان رزگار بوو. گیانەکەمی، چەند رۆژێکە فرۆکە دێت! دەڵێن ئینگلیزین. هاتوون وێنان بگرن! ئێمەی منداڵ، و تەنانەت گەورەکانیش، دەمێشکی خۆیاندا داودەجوویان دێنایەوە بەرچاوی خۆیان کە ئەوەتا لەو بەرزیەوە سەری دەناو مەشکۆڵەی کامێرای وێنەگرتنێ ناوە و سێ پایەکەی چەقاندوون و خەریکە دەچتەشاری ((ماهروخ)) و دووربینەکەی تەرازوو دەکا. ئەوە چاومان لێیە سەرقەپاغی کامیراکەی لابردووە، لە بن لێوانەوە خەریکی ویرد و دوعا خوێندنێیەو هەر بەو شێوە زمانە جوولەکانییەیەوە بە فرۆکەوانەکە دەڵێ: ((بێ جوولە)) و کامێرا ((چکە))ی لێ هەڵدەستێ- ((طاواو!)) تەواو.

فرۆکەکان لە ((خانووەکان)) تێپەڕین، گەیبوونە پیر سلێمانی کە دەنگی هاڕژنی تەق و تۆقی لە ((خانووەکان))ەوە هەستا. گوتیان ئەوە شەستیری دژە هەوایی بووە تەقەی لە فرۆکەکان کردووە؛ گوتیان لەوانەیە بشکەون- دیارە لەولاترەوە- چونکە هێشتا بەنزینیان تەواو نەبووە- هەر بۆئەوەی کە شەستیرەکەشیان هەڵە ناکات و ئەنگێوە- بەتایبەتیش ئەو شەستیرە، کە

ئەڵمانیە و هەر راست بۆ فرۆکەی ئینگلیزیش دروستکراوە- لەوانەیە نەگەنەوە کەرکووکێ! بەداخەوە ئێمە نەماندیتن. بەڵام لادێییەکان دەیانگوت هەوایان شەق دەکرد و دەڕۆیشتن، بەڵام چۆن! ئەوڕۆ سبەینێ فرۆکەیەکی دی هات- رەش، گەورە، ئەستێرەیەکی سوور بە بن باڵەوە. فرۆکەکانی پێشتر سپی بوون- بەڵام ئەم یەکەیان رەش بوو. پەڕە کاغەزی لەکلکێوە هەڵڕژاندنە دەرێ و شارشلەژا: ((یادداشتی شۆرەوی بە دەوڵەتی ئێرانێ..))- کە بەڵێ، مافی دراوسێیەتیەیان دەبەرچاو نەگرتووە... کە دیارە ئێمە هیچ سەرەدەرییەکمان لێنەکرد. لەوانەشە هەر قسەکەی پورە فاتمێ بێ کە گوایە ژنێ پاشای عوروسان و یارەکەی پێکەوە بوون و بۆنی چێشتی ماڵێ رەزا شایان بەسەرداهاتووە و ژنێ رەزاشای دڵی نەهاتووە و کاسە دراوسێیەتی نەناردووە و منداڵەکەی بەنیوەچڵی لە دایکبووە و ئەوە ئێستاش شای عوروسان پێی لە شاقەلی کەوایەکەی گیربووە و دەیهەوێ چارەسەری بکات، بەڵێ مافی دراوسێیەتیەی دەبەرچاو نەگرتووە، جاسووسی ئەڵمانی دە ئێرانێدا زۆرن، بەکورتی... هاتووین. پیرۆزە...

ئێستا ئیدی ئەوە بەیانیان و ئێواران فرۆکە رەش پەیدا دەبێ، ئەگەر نایە هەموو دڵتەنگین، هەروەك ئێستا ئەوە هەردێن، زیاتر هەریەکێك، جاری وایە دوون- هێشتا ئەو یەکەیان نەڕۆیوەتەوە ئەویدی پەیدا دەبێ. دێن و بەسەرشایدا تەقلان لێدەدەن و خۆ بەرەپشت دەکەن و هەڵدەستنەوە- بەڵام چۆن! و هەمووش دەزانن کە فرۆکەوانەکان هەموو کچن. ئەمینی خەڕەکچی سوێندێ دەخوا، ئیدی چ مایەوە، کە لە گاڵتە و گەمە و جەفەنگانیانڕا دیارە کە کچن.

قسەگەرمن. خەڵکی دەستە دەستە و کۆمەڵ کۆمەڵ لەسەر شەقامەکان راوەستاون و باری سەرنج و بۆچوونەکانی خۆیان دەردەبڕن. جەنابی سەرهەنگ رایگەیاندووە کە هەرکاتێ فرۆکە هات خەڵکی بچنە ژێر درەختەکان و نەجوولێن. بەڵام کەس گوێ ناداتێ، دەچنە سەربانان، یا دەڕژێنە کۆلانە و سەر شەقامان، دەستان دەکەنە چەتری سێبەری چاوان، و تەماشا دەکەن و بەدوای راگەیاندناندا رادەکەن.

هەر کە جەناب سەرهەنگ و ئەفسەرەکان فرۆکەیان چاوپێکەوتن ئیدی ئەوە دەستوبرد شمشێرەکانیان لە پشتێ دەکەنەوەو فڕێیان دەدەنە ناو جۆگەلەی قەراغ شەقامەکەوەو



ئەستێرەکانی سەرشان و نیشانەکانی بەرۆکێیان بەهەردوو دەستان دادەپۆشن و بێ جووڵە لە بن درەختەکان رادەوەستن و هەر پیشێ لەو خەڵکە بێ سەروبەرەی دەخۆنەوە.

دوێنێ جەناب سەرهەنگ هەر لەبەر ئەو بێ سەروبەریەی تا توانی وەستاساڵحی تەنەکەسازی بەقامچیان کوتا: لە دوکانێ هاتبووە دەرێ و کەوتبووە دوو راگەیاندراوان. ئەمە جاری دووەمی بوو جەناب سەرهەنگ لە وەستا ساڵحی بدات. وەستا ساڵح پیرەمێردێك بوو، بەڕاستی وەستا و دەست رەنگین، بەقسەی شێخی، بەبێ وەستا، هێندە وەستا و دەست رەنگین و بێ وێنە. شتی سەیرو سەمەرەی دەکرد. تەنەکەساز بوو کەچی ترومپای دروست دەکرد، سابوونی دەکرد، تاقمەددانی دەکردەوە، بەڵام چۆن، چەند پاکوتەمیز! تاقمە ددانێکی زێڕی بۆ خۆی دروستکردبوو، سەیر. نیو تاقمیشی بۆ کابرایەکی لادێیی دروستکردبوو، لە ((زەرد))ی- بەقسەی خۆی-یانی لە وەرشەوێ- شەش ددانی پێشەوەی سەر و خوارێی، کە بەگیرە بە ددانەکانی تەنیشتێوەی بەستبوونەوە- بەکون بوونێ زەردی سێ ددانانی دەتەقن و سێ ددانی دیشی لێك دەترازێن و لێوی پیرەمێردەی بریندار دەبێ، و پیرەمێرد بۆ چاك کردنەوێیان هەمدیس دێتەوە لای وەستا ساڵحی. وەستا ساڵحیش وەك هەموو بلیمەتێکی دیکە تۆزێکی حاڵ ئاڵۆز بوو... و ئەو رۆژە کە خەریکی شتێکی دەبێ لەحیمی کات سەیرێکی ددانەکانی پیرەمێردیش دەکاتەوە؛ دەبینێ کە بەڵێ کانزای ددانەکە ((کیشەفەکە)) دەرپەڕیوە و لێوی پیرەمێردەی بریندار کردووە. هەروا بەدانیشتنەوە چاوێلکەکەی سەرلوتی پاڵ پێوەدەنێ بۆ سەرنێوچەوانی، ئەو پەڕۆکەی بەدەستیەوەیەتی دەی ئاخنێتە زاری پیرەمێردەی و بە هاویەکەی بەدەستیەوەیەتی و لەحیمی پێدەکا درزی نێوان دوو ددانەکانی بۆ لەحیم دەکاتەوە. پیرەمێرد دووکەڵی لە زاری دێتەدەرێ، پوك و ددان پێکەوە چزەچزیان لێ هەڵدەستێ، پیرەمێرد قۆڵ و باڵان رادەوەشێنێ و بەلادا دێ. بێهۆش و گۆش و بێ ئاگا، نەك هەر ئێستا بەڵکە ئەوە سەد ساڵە مردووە! هەرکە پیرەمێردە دەکەوێ خەڵکی وەك زۆرجاری دیش، دادەوەرن و ئاوێ بەدەموچاوی پیرەمێردەی دادەکەن و لەلا روومەتانی دەدەن تا بەئاگابێتەوە... و هەر بەو حاڵەشەوە وەك جاران دەو جۆرەکاتانەدا دەیکەنە گاڵتە و جەفەنگ. جەناب سەرهەنگ کە دەودەمەیدا دەگەڵ ئەفسەراندا لەسەربازخانەیڕا دێنەوە کە ئەو حاڵ و باڵەی ئاوا دەبینێ وەردەگەڕێتە وەستا ساڵحی و تا هەڵدەگرێ لێیدەدا. دوایش سەرانە دەکرێ، کەچی خۆشبەختانە ((چارەسەر))یەکە کاریگەر دەبێ و پیرەمێردیش وەهۆش دێتەوە. ددانەکە چاك

بۆتەوە- ئەوە گومانی تێدا نەبوو- بەلاّم لچ و لێوی پیرەمێردەی لە تۆقەڵە هاتبووە دەرێ و وەك کولیچەی رەمەزانێی لێهاتبوو. ئەو زەردەیەی کە لە چاوی پیرەمێردەیرا دیاربوو نیشانەی ئەوەی بوو کە کارەکەی بەدڵە و زۆریشی لێ رازییە، بەلاّم ئەو شەرمەی دەگەڵ ئەو زەردەخەنەیدا تێکەڵ ببوو و ئەو گەردەنەی کە بەداخەوە کەچی کردبوو هەمووی تێکڕا نیشانەی ناراحەتییەکی زۆری پیرەمێردەی بوون، کە ببووە مایەی ئەو هەموو زەحمەت و ناراحەتیەی وەستا ساڵحی و نەیدەزانی چ بکا لە شەرمان! بەڵێ، خەڵکی دەستە دەستە راوەستاون و دەربارەی بارودۆخەکە دەدوێن. سوێندی گەورە دەخۆن کە رەزا شا هەلاّتووە. تەنانەت هێندێك هەر دەڵێن، کە گوایە لە هەندێ کەسی بەمتمانەیان بیستووە، کە رووسەکان لەسەر پلیکانەکانی تەلارەکەی خۆی گۆشا و گۆشیان سەربڕیوە. وەستا قادری دارتاش یەکێك بوو لەوانەی سوێندیان دەخوارد. دەڵێ هەر بەو دووگوێیەی خۆی بیستوویەتی، کەچی هەر گوێیەکیشی دێنایە پێشێ.

- بەن مووسەکەکە شل بۆتەوە- و وای لەو رۆژەی کە بەن مووسەکی دامودەزگای دیکتاتۆریەت شل دەبێتەوە، کە ئیدی بە هیچ وەك خۆی لێنایەتەوەو گشت نابێتەوە.

یانی بەڕاستی راست بوو؟ شتی وا دەبێ؟ یانی ئەو رابەرە بەهۆش و بلیمەتە، کە وەك هەموو رابەرێکی دی هەموو شتێکی پێشبینی دەکرد و لەهەر کارێك و لەهەر بابەتێکدا شاکاری دەکرد، ئەمەیانی چۆن پێشبینی نەکردووە؟ نەبووەو نابێ. کەواتە ئەو هەموو قایش و قروش و چەك و جلوبەرگە خورمایی و ئەو هەموو مامزە و شمشێر و سەلامانە خۆڕایی بوون، و هەمووی هەر ((فیلم)) بووە!؟ راستە هەموو هەر لەخۆوە دەیانزانی کە کەس رەوڕەوەی ((پێشکەوتن)) بەرەو پێش پاڵ نادا، چونکە چ رەوڕەوەیان نەدەدیت، بەلاّم ئەوەشیان دەزانی کە رەزاشا هەمەکارەیە، و رەنگە رەوڕەوەیەکیش هەربووبێ کە ئەوانە نەیاندیوە. بۆچوونی ئەم جۆرە راستیانە سوکایەتیە بە ئەقڵ و هۆشی رابەرێکی واو سوکایەتیە بەو هەموو قایش و قروش و چەکمانەی دەبریسکانەوە. بەلاّم دەگەڵ هەموو ئەمانەدا وەك ئەوەی کە ئەمە راست ئەو شتە بووبێت کە روویداوە، ئیدی ئەوە لە چاوەڕوانیە تێپەڕیبوو.

راستیت دەوێ هیچ چاوەڕووانییەك دەگۆڕێدا نەبوو. گومان لەوەدا نەبوو کە ئێرانی پەهلەوی ((سەدقات لە ئێرانی کۆن)) پێشکەوتووتر بوو، و هەروەك لە رۆینێ جەناب سەرهەنگیرا



دیاربوو لە ((سەدقات))ان دووەم بوو تەنیا شتێکی کە گومانی دەخستە دلاّنەوە ریتمی رۆینێ ئەبولفەتح خانی بوو. ئیدی گەڕانەوە بۆ دواوە چ مانایەکی هەیە؟ بەلاّم دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا وەك ئەوەی رۆینێ ماشێنەکەی لەنگ کردبێ. رابەرییە خاوەن شکۆی چۆنی رێیی ئەو جۆرەشتەی دابوو؟ ئیدی ئێمە ئەوەمان بەلاوە روون نەبوو. هەموو هەر کز و مات و سەرسام بووین. ئاخر جێی باوەڕێ نەبوو.

هەروەکو ئەوەش کە نیشانە و دیاردەکان هیچیان وا پێنەدەچوون کە رەزاشا رۆیبێ و هەلاّتبێ و یا بڕوات. ئەوە دیاربوو کە ئەگەر هێز و توانا کەسیشی بەدەورەوە نەبوو و خەڵك نەیاندەویست بەلاّم کەسانێکی خۆی هەر هەبوو. خەڵکی خوویان پێوە گرتبوو، قبوڵیان بوو، و بەو خدەو خووەوە دەژیان. دیارە دامودەزگاش هەروا دەستە وەستان نەبوو: سوپای هەبوو، پۆلیسی هەبوو، و بەدوای سیاسەت و تۆقاندنی خۆیدا بەردەوام بوو، بەلاّم خۆی دەرنەدەخست و کاری لە عادەت بەدەری نەدەکرد.

دیارە هێندێك قسەی قەڵە و هەبوون کە ئەو لەداردانانەی دەوڵەتیان پەسەند نەدەکرد و بەپێچەوانەی کاروباری دامودەزگایان دادەنا، هەروەها هەشبوون کە گومانیان لە راستیە هێز و توانای دامودەزگای دەکرد. ئەوە زۆری دەخایاند تا دامودەزگا بگاتە ئەو قەناعەتەی کە نابێ وێنە و لەداردانێ تاوانباران بلاّو بکاتەوەو بگاتە ئەوەی کە دەبێ کارەکانی بەدزیەوەو بێ هەراو هۆریا و قەڵەبالغی ئەنجام بدات. خۆ هەر چۆنێکی بیگری هەر بەدزیەوەو هەر بەبێدەنگی چاکترە. منێکی کە گومانێکم دەدڵیدایە تێدەگەم کە دەتوانرێ بەدزیەوە بکرێ؛ بەلاّم ئەدی کەسوکاری ونبووە لە داردراوەکە هەمیشە چاوی لە دەرگای دەوڵەتە کە بتوانێ ونبووەکەی دەست کەوێتەوەو هەر بۆیەیە کە هەم ئەو ئومێدەی بمێنێ و هەم ئەندامانی دیکەی ون نەبن هەربۆیە زۆر بەخشکەییەوە رەفتار دەکەن. جگە لەوەش کاریگەری دەروونی ئەویش ئاریشەیەکە: جاری وایە شتی وا دێتە پێش کە نەگوتنی چاکترە لە گوتنێی، و تەنیا وشەیەك کاری سەد هاوار دەکات و یەك چاو سورکردنەوە کاری سەد قامچی دەکات. ئەمەیان دایك و باوکانی تێگەیشتوو باشتری دەزانن و بەتاقیکردنەوە بۆیان ساغ بۆتەوە. بۆیان دەرکەوتووە کە نابێ لەمپەری نێوان گەورەو بچووکان بشکێ و پەردەیان لە روو هەڵماڵدرێ- دەبێ بچووك هەمیشە بزانێ چاو سورکەرەوەیەکی هەر هەیە...

بەڵێ هەرچی بوو، ڕەزاشا لەهەڕاجخانەی هێز و توانادا سەرکەوت و بردیەوە؛ خەڵکیش دە دنیای پەرتی و شومیدا دەژیان و هیچ کەس بیرێکی نەدەکردەوە جارێك لە جاران لەو بێدەنگی و داوەستانەی خۆیان بێنەدەرێ و گۆڕانێکیان بەسەردابێت و بەپیر ئەو ئاڵوگۆڕ و گۆڕانەوە بچن (هەرچەندە لەدواییدا بۆمان دەرکەوت کە هەموو گۆڕانێك لە بێدەنگییەوە سەرهەڵدەدات و ئەو دەم زۆر سادە و ساکارانە قبوڵی دەکەن و بەپیریەوە دەچن- هەروا لەسەرخۆ و هەروا توندوتۆڵ).

هێندێك لەو باوەڕەدا بوون کە هەڕڕاج گەلی خاوەن هێز و توانا هەڕڕاجێکی دیکە دێنن و دایدەنێن.

خوا دەزانێ یار مەیلی لەکێیە و بەکێ ڕازییە. قسە و باسێکی گەرم دەسەر جادەو شەقاماندا دەگۆڕێدایە.

ئەمین خەڕەکچی دەیگوت بۆ خۆی فرۆکەوانەکانی دیون. کە کچن. کاتێ کە لە سەقز دەگەڕێتەوە کە دەگاتە قەدی گەردەنەی یەکێکیان- یەکێك لەکچەکان- لە پەنجەرەی فرۆکەکەوە سەری دەرێناوەو دەست و دەسماڵی بۆ ڕاوەشاندووە و بەزمانی خۆیان پێکەنیوە. بەڕەوینەوەی کەرەکەی وی پێکەنیوە! لەوکچەی زۆرداخ لە دڵ بوو. بەروخسارێکی توڕەوە، و هەر لەوکاتەشدا دوو لێوی پڕ لەخەندەوە، دەیگوت: ((بەخوا حەکەدار بوو! دەنا لەو ئاسمانە بەرین و هەراوەی خوادیڕا چ جێت نەدیتەوە سەرسەری من نەبێ تا کەرەکەم بڕەوێنیەوە حەکەدار!؟ بەتاقی تەنێ و بە چ دەردە سەریەکی تا بارەکەم ڕاست کردۆتەوە- قەحپەخانم!)) و دەستێکی بۆ یەخەی کەوایەکەی دەبرد و ئەسپێیەکی دەگرت و لەداخی کچەی حەکەدار زۆر بەتوندی دەیفلیقاندەوە. حەمە نیکلە- کە لە ئاوارەکان بوو- دەیگوت: ((ڕووسەکان!- هەی...))یانی من شتێکی دەڵێم و ئێوە شتێکی دەبیسن ((ڕووسەکان، منداڵەکانی خۆیان هەروا بە خاوی دەخۆن... داك و بابیان نین- ئیدی باڵشەویکن)). خەڵکەکە بەچاوی زەق و دەرپەڕیوەوە، بێدەنگ، دەیانپرسی ((باڵشەویك!))- بەڵێ، باڵشەویك... پەرژین بێ- یانی هەموو شت- هەر لە ماڵاتییەوە بگرە تا ئادەمیان... کاتێ کە هیچیان دەماڵێدا نەبوو بیخۆن داك و بابەکە کێردێکی دێنن و دەکەونە گیانی منداڵەکانیان، و منداڵێکیان سەردەبڕن و دەیکەنە کەباب... یا کفتەی لێ دروست دەکەن. دیارە کەسیش نازانێ داخوا ئەوان داك و بابی ئەوانەن یان نا))



ئەمەشی هەروا بەقسەکانییەوە هەڵدەواسی ((... چونکە باڵشەویکن ئیدی؛ ژیانیان وەك کەڵەباب و مریشکانە. چونکە کەڵەباب لە پێش چاوی هەمووان خۆ هەڵدەداتە سەرمریشکێ ئەوانیش ئاوا، لەبەرچاوی یەکتری سواری یەکدەبن- کێ کێی وەبەردەستی هات...)).

((بەڵێ، باب دەگەڵ داکێ خۆی، برا دەگەڵ خوشکێ خۆی...و هەموو پێکەوە. دەوڵەت داك و بابی هەمووانە، و منداڵێکی کە لەو کەربازاڕیە و کەرە زەڕەیدا لە دایك دەبێ دەیدەنە سەربازخانەی- ئەودەمی دەبنە سوپای سوور! بۆیە پێیان دەڵێن سوپای سوور چونکە هەموو زۆڵن... چونکە زۆڵەکان زیاتر سوورن- دیارە لەوێ زیاتر... هەر ڕاست وەك هەڵوژەی سوور)). دەیگوت- **محەممەد** نیکلەی دەڵێم- دەیگوت هەموو شتێکیان باڵشەویکییە: ئەگەر دوو پیاو و ژنێك بن، ئەوە ژنەکە ئی هەردووکانە؛ ئەگەر مانگایەکیان هەبێ پێکەوەی دەدۆشن. هەموو نانی لە دەوڵەتێ وەردەگرن. جا چ نانەواخانەیەکی گەورە- بەقەدەر حەسارێ مزگەوتی گەورە! هەموو ژەمەنانیان هەیە- هەریەکەی ڕۆژی نانێك، کە بۆ خۆیان دەڵێن چورنی خلب- هەموو یەك جۆرە چێشتی دەخۆن- زۆر بەشی چێشتی کەلەم- و ئەگەر یەکێکیش بەمیوانی بچێتە ماڵی یەکێکی دی دەبێ ژەمە نانی خۆشی بەرێ، دەنا نابێ بچێ. (وەك ئەوەی کە ڕاستی دەکرد کە دەیگوت، لەو دوایيانەدا خوێندوومەتەوە کە لە شەڕی جیهانی دووەمدا، ستالین بە خەیاڵی ئەوەوە کە بڵێ ئێمەش هەر ((ئاوا))ین کاتێ هاتە تارانێ خواردنی خۆی بە فرۆکە دەگەڵە خۆیدا هێنا. تا هەم نەبێتە ناڕاحەتکردنی کەس و هەم بشزانێ چ دەخوا)... بەڵێ... ئیدی ژن هێنان و ئەو جۆرە شتانە لەوێ کۆن بوون و بەسەرچوون و باویان نەماوە؛ دوور لە ڕووی هەمووان، ئاوی پیاوی دێنن و دەمەکینەکی دەکەن، ئاوا هەروەکو مەکینەی گۆشتی و بایدەدەن، و لەو سەریەوە هەر منداڵە و بەواقە واقەوە دێتە دەرێ. هەر بۆیەیە هێتلەر تا لێیان دەکوژێ هەر تەواو نابن و نابن... بێنەوایە چەندان بکوژێ!... ئەسپ و مانگاش هەروەتر، بەڵام ئەو نهێنییەی نازانێ کە بۆ ئاوی ئەسپ و گاجووت و پەزی بەزۆری دەومەکینەی ناکەن تا شیر و گۆشتیان زۆر هەرزان بێت- نازانێ، لەوانەشە تائێستا مەکینەکەیان تەواو وەگەڕنەخستبێ و تەواو نەبووبێ- چونکە هەریەکەیان مەکینەی تایبەتی خۆیان هەیە. هێندە زۆرن قرژاڵ و کیسەڵ و بۆقیشیان نەهێشتووە بە خواردنێ ئەمینی خەڕەکچیش کە دوێنێ لە سەقزیڕا هاتۆتەوە بەچاوی خۆی دیتبووی کە ئەسپەکانیان هەموو ئاسنەواڵێن و کاو جۆی ناخۆن (پەنا بەخوا!- ئەوە دایی دەڵێ) گوللەکاریان تێناکا (بابەگیان زەردێکی دێتێ، هەروەك ڕاست

وابێ کە حەمەدەمین دەڵێ!) دەیگوت- ئەمینی خەڕەکچی دەڵێم- دەیگوت پەرژین بێ وەك گایەکی بیەوێ قۆچان باوێ سەریان بۆلای هەردوو دەستان شۆر دەکەنەوەو- ئیدی خۆت بگرە و هاتم! جا ئیدی تۆ هەر گوللە باوێ، بۆ کاری تێدەکا و بەخۆی دەزانێ! تا دوژمنەکەی نەنگێوێ گەڕانەوەی نییە. کە لێشیداو ئەنگاوتیشی هەر ناگەڕێتەوەو راناوەستێ: بەدوای ئەوانیدی دەکەوێ (پەنا بەخوا- ئەوەش هەر قسەی داییە). دەیگوت چاوەکانیان هەر راست دەڵێی ئەوە دوو پشکۆی ئاگری سوورن، و کاتێ کە رێ دەکەن دەنگی سمیان لە شەش فرسەخ بەولاوە تڕەوە دەبیسی (دووبارە پەنا بەخوا!) دوایەش یەك ((زرێپۆش))ی دیوە (خەڵکی لە کۆڕ و مەجلیسان ئەو ناوەیان لەو ئەسپە ئاسنینە نابوو) هەر رێك بەقەدەر ئەو قەلاٚتەی حوکمەتی- کە دەڕۆیی و دەستڕێژی دەکرد، کێوی لە پێش خۆ رادەنان... بابەگیان گوێی بۆ ئەو شتانە شل دەکرد و هیچی نەدەگوت؛ جارجارە نەبا زەردەیەکی دەکرد، و چاوەکانی بە جۆرێکی دەبریسکانەوە وەك ئەوەی گوایە ئەو بۆ خۆی هەموو ئەو شتانە دەزانێ. بەلاٚم هیچی نەدەگوت، و دایی لەو بێدەنگیەی وی زۆر ناراحەت بوو، و هەرخۆی دەخواردەوە. دەیگوت: ((مەش ئەکبەراغا، ئەوەی دەیلێن راستە!)) ئەوەشی بەدەنگێکی زۆر کەساسانە، و ئاوازێکی زۆر سادەوە، و بەدووچاوی نەتروکا و پڕ لە پاڕانەوەوە بوو کە ((هەر نەبێ بەلانی کەمەوە ئەوەیانمانە پێ بڵێ!)) بابەگیان بەسەرسامییەکەوە، بەلاٚم نادیار، سەیرێکی دایی دەکرد، و دەیگوت: ((همم؟)) و دوای تاوێك ((وەڵلاٚ بڵێم چی؛ قسە زۆرن. خودا دەزانێ)).

دایی لە ناراحەتیان جینگڵی دەدا و دەیگوت: ((جا تۆ کەنگێ قسەی دڵی خۆتت بە من گوتووە تائێستا پێم بڵێ! کەینێ تۆ منت بە بنیادەم زانیوە تا ئێستا بزانی!)).

بابەگیان دەیگوت: ((لا الە الا اللە... کچێ ژنێ ئەمن لەکوێرا بزانم، ژنەکە- بۆ من عیلمی غەیبم پێیە!)) و بەزەردەیەکەوە، برۆیەکانی تێك دەنان.

ئەوە دیسان دایی بوو دەیگوتەوە: ((لەکوێڕا؟ -لەو جێیەیڕا کە بۆ خۆت دەزانی!)).

بەلاٚم بابەگیان لە جیاتی ئەوەی هەڵچێت و توڕە بێت پێدەکەنی و ددانە شاش و واشەکانی وەدەردەکەوتن. دایی لە پێستی خۆی دەهاتەدەرێ: ((من منداڵی گەورەکەم و ئەو کافرە خوا نەناسەش بەو شێوەیەی بەسەر بێنێ، کە ئێستا وەك سەگیشم دانەنێت!)) و گریان دەتەقێتەوە.



ئەو پێکداهاتنانەش هەروا لەخۆڕا نەبوون. بابەگیان ئەو یەك دوو رۆژانە زۆر شاد و شەنگوڵ و دڵخۆش بوو وەك دەڵێن لە خۆشیان پێی بەعەردی نەدەکەوت. دەیگوت درێوشەکەی ئامادە کردووە تا دەهەمان ورگ و گیپاڵی رادا... بەس ئەوەندە دەستی بیگاتێ! (کە ئەوەی دەگوت چەناگەشی دەگەڵ دەلەرزی) مەبەستی ئەمیر لەشکربوو؛ ئاخر ئێوارەی رۆژی پێشتر ئەمیر لەشکری ئازەربایجان کە لە دەست رووسەکان هەڵدێ دێتەوە قەراغ چۆمی و بەدزیەوە سەرهەنگی دەبینێ دوایی بەقسەی پیاو چاکێك وەك ژێر دەریاییەکی خاکی بە عەردیدا دەچێتەخوارێ و لە (مەلایەر) سەر وەدەر دێنێتەوە! دەیگوت، بابەگیانی دەڵێم ((ئەوە دەمەتیغ ئامادەیە- تەنیا دەستم بیگاتێ- وەبەرچنگانم کەوێ!)) ئێستا دایی تا دەهات وردە وردە دڵتەنگ و نیگەران دەبوو- نیگەرانی حاڵی بابەگیانی...

بابەگیان لەپێشدا حەزی لێبوو بچێ مەڕێکی بکڕێ و لەبەر پێی رووسەکانی سەربڕێ. کاتێ کە هاتیشن دایی ویستی چێشتێکیان بۆ لێنێ و بۆیان بەرێت- چوون ژمارەیەکیان دەقشلەکەی حوکمەتی پشت خانووەکەی پێشوماندا بوون یانی لە راستیدا لە پشت دەزگایەکەی کەلاییی حوسێنییەوە. بەلاٚم خودا رەحمی کرد... بەڵێ خودا رەحمی کرد... وەستاساڵحی تەنەکەساز کە شەقی سەرهەنگی وێکەوتبوو لە خۆشیە هاتنێ رووسەکان یەك دانە قەرتاڵە ترێی وەك ((دیاری)) بردبووە پێشێیان و دابوویە ((قوماندان))ی رووسەکان؛ و بە کوردی شکایەتی کردبوو، و قوماندانیش بە رووسی پێکەنیبوو، و ددانە زێڕەکانی وەدەرخستبوون، یانی ((ئاگام لە مەسەلەی ددانەکانەو دەزانم!))و وەستا ساڵحیش لە وەلاٚمی ویدا پێکەنیبۆوە و قوماندان گوتبووی ((شاخنشاخ))، و فیتۆێکی درێژی: ((فیوت)) لێدابوو، و دەستی بەرەو لای کێوی بابوس راداشتبوو، یانی کە چووە پشت کێوی قاف، ئیدی چت دەوێ؟- و هێندێکیشی قەندی کلۆ دابوویە- ئەودەمی قەندگران بوو. وەستا ساڵح دەیگوت: ((نا، بەویژدانەوە، دەڵێم، ئەوەی کردوونی، چاکی دروستکردوون..نا، بەویژدانەوە، نێوانەکانیان هەموو فیت بوون، موویان بەنێوانێوە نەدەچوو...)) ئەوە مەبەستی لەو قسانەی ددانە زێڕەکانی قوماندانی بوو. ئەدی خوا رەحمی کرد. چونکە دوایی کە ((دەوڵەت هاتەوە وەستا ساڵحیان گرت، و رووسەکان کە سەرهەنگیان دەگەڵە خۆ بردبووە (میاندواوێ) لەوێ ئازادیان کرد و لە پاداشی ئەو هەموو خزمەت و کوێرەوەرییەشی... پلەی سەرتیپیان دایە و بەرزتریان کردەوە. بەڵێ خودا رەحمی کرد، هەرچەندە بە ئاشکرا دیاربوو کە جەناب سەرهەنگیان... بەهەرحاڵ، ئەو پێش بینیەش-

بۆچوون و پێش بینی دایی و خەڵکانێکی دی- یا پێش بینی بابەگیان و کەسانێکی دی چۆن بوو ئاواهاتە دی و دەوڵەت هاتەوە.

باڵێرە لەوەی گەڕێین. ئەودەمەی کە دەنگۆی هاتنی رووسەکان بڵاوبۆوە و بارودۆخەکە کەمێك شلۆق و شەپرێو بوو بابەگیان بووە دەمڕاستی کاروباری رووسیا: پەڕەی کۆن هەڵدرانەوە: ئەدی بابەگیان و کاکەیان وەختی خۆی بە تاوانی جاسوسیە رووسان گرتبوون، هەربەوەش دوو منداڵی لە دەست دابوون، دیارە دەوڵەتی رووسیەش دەفتەرو دۆسیە و دەستەکی خۆی هەیە- بێگومان خەبەری هەبووە. ئەوەیان ئەبولفەتح خان دەیگوتن. دەیگوت: ((ئاوێش بخۆیەوە ئەوان دەزانن... ئەوە کاری خۆمە- دەزانم؛ بێ دەفتەر و دۆسیە کار بەڕێوە ناچێ!)) و هەر بۆ ئەوەی بایەکیش دەکەوڵێ بابەگیانی کات درێژەی دەدایە: ((جەنابی ئاغای رەزاییی، ئیدی ئەوە بۆ خۆتان دەزانن و سەرتان لێی دەردەچێ!)) جەنابی ئاغای رەزاییش بەو بێدەنگیە شاراوەیەوەو ئەو زەردەخەنە ناسکەیەوە لابەلا پەسەندی دەکرد کە بەڵێ سەری لێ دەردەکات و دەزانێ کاروبار بێ دەفتەرو دۆسیە بەڕێوە ناچێ.

ئێستاکە رووسەکان دەهاتن هەموو لایەك پێخۆشبوون و دڵسۆزیە خۆیان پێشاندەدا و خۆیان رەپێش دەکرد- ئەوانەی سەر بە دەوڵەتیش کە لەپەل و بۆکەوتبوون، و لە هەموانیش زیاتر ئەبولفەتح خان کە خۆی لە هەموانیش لەپێشتر دادەنا؛ و جا ئیدی ئەوە هەر پلان و نەخشەبوون دادەڕێژران... بەلاّم یەك لەو نەخشانە لە هەموان گرینگتر: کوشتنی ئەمیر لەشکری خوانەناس بوو.

دایی دەیگوت: ((دەبێ بلێی بیدەنەوە دەست خۆمان، تا من بەم نینۆکانەم چاوەکانی دەربێنم، دەنا دڵم داناکەوێ و ئاوێ ناخواتەوە!)) ئەوەی دەگوت و چاوە دەقوڵەوە چووەکانی هەروا پرتە پرتیان بوو، و لێوەکانیشی زیاتر دادەچۆڕان: ((و دەنا سوودی چییە کە هەروا بیبەنە سەرگردی، و بەماوەی دەقیقێکی کاری ببینن و لە کۆڵی کەنەوە... ئەمن دەمەوێ جەزرەبەی ببینێ!))
بابەگیان دەیگوت: ((نا، تۆ ژنی؛ هەروا دڵۆپە فرمێسکێکی بەچاویەوە ببینی ئیدی ئەوە تێکدەچی... ئەوانە وا سەیرمەکە، ئەوانە بە هەموو گەد و گیپالێیانەوە هەر کە هەراو ماشەڵلاّیەکەت لە شانی کردنەوە، دەبنەوە کەری بێ کورتان... هەروا دایە رۆ و بابە رۆیەکیان بەسە قۆڵت پێ لە کراسی بێننەدەرێ و داوای کراسەکەشت بکەن بیاندەیەی... نا، ئەوە ئیشی



تۆ نییە! ئەدی درێوشەیان بۆچی دروستکردووە. هێندەی درێوشە لە کونێ بنەوە دەکوتم خێری سەری بابی دە شەو و دە رۆژان خوێن دانێ... چاو، و ریخۆڵەکانی هەموو بەدەمەتیغێ پارچە پارچە دەکەم و فڕێیدەدەمە بەر سەگان... پێتوایە، هەروا بە سانی وازی لێدێنم و دەستی لێهەڵدەگرم! دەبێ دەردێکی دەمێ و ئەمیر لەشکرێکی دیکەی وای لێ دروستکەم بەماکەرێ بلێ بابە!)) من و مەلیحە- هەموو جاران- بە خەیاڵی ئەو پێشهاتە و لە کلیلەوە چوونی زاری بابەگیان و دەرکێشانی دەمەتیغ و راوەشانێ درێوشەکەی دەهەوایدا لە رێچکەی خەیاڵی وانەوە چێژمان وەردەگرت؛ چاوەکانی فەیزوڵلاّی لە خۆشیان دەبریسکانەوە و زەردەخەنەیەکی بەسەرلێو و روخسار و گەردنێوە دەنیشتەوە، و سوورهەڵدەگەڕا، هەروەك بەفر و خوێن تێکەلاّوبن. بەلاّم ئەو قسانە هەر قسەی ماڵێ بوون و لە ماڵێش دەرنەدەچوون؛ چونکە بارودۆخەکە هێشتا وا روون نەببۆوە. راستە بەن مووسەکی بارودۆخەکە نەختێك شل ببۆوە بەلاّم سەرباز و پاسەوانەکانی دەوڵەتی هەروا مابوون، سەرهەنگ جارێ لە هاتوچۆ و خۆبادانێ هەر نەکەوتبوو، و شار وانە شڵەقابوو.

مەلا حەسەنیش هاتبوو، بەقسەی خۆی لەلایەن خەڵکیەوەش راسپێردرابوو کە بابەگیان بەپشتیوانیە خوای و هیمەت و بەرەکەتی ((مەشایەخان)) دەبێ ببێتە مایەی خێر و نەهێڵێ مزگەوتی گەورە تێکدەن، چونکە لایەکی منارەکەیان لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا خراپ کردبوو و ئێستاش دەترسان ئەوەی ماویشە بیڕوخێنن. دەیگوت ((مەلا حەسەن)) دیارە، وەکو دەیانگوت ئەودەمیش قوماندانی سوپای حەزرەتی ئیمپڕاتۆری رووسیە چ نیازێکی خراپی نەبووە و جوولەکەکان چوونەتە بنی و هانیانداوە، دەنا کارێکی وا پێچەوانە لە سوپا و قۆشەنی حەزرەتی ئیمپراتۆرەوە نەدیتراوە. هەر نەبێ مزگەوتی گەورە بۆ خەڵکەکەی بهێڵنەوە خواپەرستیەی تێدا بکەن و دەستەونزا بۆ تەخت و دەوڵەت و ئیمپراتۆریەتی ((ئەسەد عەلین))[1] بپارێینەوە، و جەناب عالیش- یانی بابەگیان- دەبێ دەو نێوەیدا ببنە مایەی خێرو چاکە و پیاوەتیە و ئەو توێشوەی قیامەتێ لەکیس نەدەی، ئینشاڵلاّ!

بابەگیان رازیبوو، بەلاّم بەڵێنی تەواویشی هەرنەدا. بەلاّم زۆری رێز لە مەلا حەسەنی نا، هەروەك جاران، تا بەردەرکێی دەگەڵ چوو. ئێمە هیچ کاتێ ئەو چاکە و دڵسۆزیەی ویمان کە لە

[1] ئەسەد عەلین: ئستالین: ستالین.

مردنیٚ کاکەیدا دەگەڵی کردین، لە بیر ناچێتەوە هەربۆیە ئێمەش بە هەمان گەرم و گوڕییەوە پێشوازیمان لێکرد.

ئەبولفەتح خانیش هاتبوو- یانی ئەو یەکەم کەس بوو هاتبوو. لەلایەنی خۆیەوە دڵنیاو ئاسوودە بوو. بەلاٚم ئممم- چ بڵیٚ! جەنابی ئاغای رەزایی بۆ خۆیان ئاگاداری رووداوەکانن. (بابەگیان جەناب رەزایی و دایی، سەرکار خانم بوون!) بەڵیٚ، وەی لەو یاریەدەرەی پۆلیسان- وەی لەو مارە خۆش خەت و خاڵەی! ئەو دەمانەی شەو و رۆژ بەجنێوان دەوڵەتی رووسی دەڕەقاندەوە، ئەوە ئێستاش دەستنوێژی خۆ پاك کردنەویٚ دەشوا!... دەمولەوسی پاك کردوونەوە و دوور لەڕووی سەرکار خانمیٚ بۆتە گوربەی عابید... و مەکەمەکەی نییە! و ئەوجا خودی سەرۆك پۆلیسان... کە هەر لەوکاتەوەی هەستی کردووە کە ئەو- ئەو ئەبولفەتح خانەی حازری- سەرەداوێکی داوەتە دەست جەنابی رەزایی، ئیدی سەرۆکی لێی بۆتە دوژمنی بابە کوشتەی. جا وەرە ئەوجار وردە ناراحەتییەکانی دایەرەی- کە پێویست ناکا، و ناشیەویٚ سەری جەنابی ئاغای رەزایی و سەرکار خانمێیان پێوە بێشێنیٚ- دوو جارانی- داوای پلە بەرزبوونەویٚ کردووە، کەچی ئەو سەرۆکە هەردوو جارانی رەش کردۆتەوەو ناوەکەی لاداوە، پەرژین بیٚ نامەردە پلەکەی داوەتە فەتتوحی، و پەرژین بیٚ هەقی ویشی سەگ خۆرکردووە... با هەر دەستی لێنەدەین، ئەوە لە خەفەتیٚ زەمانەیی و لەخەفەتیٚ دەوڵەتی خەریکەوە زگ دەدا... بەڵیٚ عەرزی بە حوزوور هەرچەند دەکا (ئەبولفەتح خان) تا بەڵکە بەهەر شێوەیەك بووە سەرۆك ئەوکارەی بۆ دیزە بەدەرخۆنەیەك بکات و هەرچۆنێك بووە دەمی ئەو سەگ و تولاٚنە ببەستیٚ، نەیکرد و نەیکرد. تەنانەت ئەو شەوە... ئاە!- کە گەییە ئێرە هەناسێکی هەڵکێشا، دایی سەری دەبەرەخۆنایەوە... بەڵیٚ، تەنانەت ئەوشەوەش، هەر بە سیاسەت، فەرمووی یەك پیاڵەچای سەرکار خانمێی نەکرد، یا هەر بۆ ئەوەی بڵێی پیاوی چاکی، بە پیاوەکانی خۆشیاندا هەر هەواڵێکیان نەدا، تا ئاوا روو رەشیان بۆمایەوە و تا هەتایە شەرمەزاری سەرکار خانمیٚ بوونەوە، و ئەوە تا ئێستا هەرچەندی دەکا نازانیٚ چۆن خۆی لەو شەرمەزاریەی رزگار کا.

دایی گوتی: ((نا، جەناب رەییس، دوژمنتان شەرمەزار بێت)).

جەناب رەییس گوتی: ((ئێوە گەورەییە دەفەرموون... دەنا ئێمە قابیلی هێندیٚ نین... بەهەرحاڵ دەبیٚ بە گەورەییە خۆتان، بمانبەخشن، و ببوورن)).



دایی گوتی: ((ئەو قسانە چن، جەناب رەییس، خودا ببەخشیٚ...)).

جەناب رەییس هەر دەگەڵ قسەکانی پێشوویدا گوتی: ((هەروەك دەڵێن، لەگچکان خەتاو لە گەوران عەتا... و هەر بەقسەی پێشینان، ئەوە پشتی من و ئەوەش داری تۆ، ملم لە مووی باریکترە- جا هەرچۆنێك بیٚ دەبیٚ ببەخشن)).

دایی گوتی: ((خودا ببەخشیٚ...)).

جەناب رەییس گوتی: ((خودا منداڵەکانی ئێوە و هەموولایەکی ببەخشیٚ)).

دایی گوتی: ((ئامین بۆ خاتری پێغەمبەری)).

بەلاٚم من. من هیچ حەزم نەدەکرد بابەگیان چ ((دەست پێشخەری))یانی بۆ بکا. ئەوشەوەم هەرگیز لەبیر ناچێتەوە کە بە چ سوکایەتیەکەوە لە دەرکیٚ ماڵە خۆی دەرکردین، وەك پیرە قەلێم لێهاتبوو لەرقیٚ ئەو بەزەیی و دڵ نەرمیەی دایی.

جەناب رەییس لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: ((بەڵیٚ، خەریکبووم عەرزم دەکردن... ئەو وەلی بەگە سەرپاسەوانە، لەڕووی خۆتان نەبیٚ، مەگەر هەرخوا بۆ خۆی بزانیٚ چەند ئینسانە... کاری بەسەر ناسر و ئەو قسانەوە نییە! جەنابی رەزایی باشی ناناسن- لە راستیشدا کەمتەرخەمیەکە لەمنەوە بووە، چونکە رێزێکی زۆری بۆ جەنابی بەڕێزتان هەیە، زۆریشی حەز لێیە دەرفەتێکی بۆ بڕەخسیٚ و لە هەلێکیدا بەخزمەت جەناب عالی و سەرکار خانمیٚ بگات. بەلاٚم من گوتم جاریٚ پێویست ناکا... دەنا بە خزمەت هەردەگەیشت)).

بەسەری هەردوو پەنجەکانی و لەسەرەخۆ دەستی بەتیغەی لوتیدا دێنا. ((تێبینیە هێندیٚ شتانم کرد. کە جەنابی رەزایی بۆ خۆیان دەزانن)) بابەگیان پۆزێکی لێدا کە یانی بەڵیٚ، ئەوەش وایە و دەزانیٚ.

((بەندە هەروەك بۆ خۆتان پێدەحەسێن من لەو جۆرە پیاوانە نیم بەم و بەودا هەڵ بڵێم و باسی ئەم و ئەو بکەم، ئەگەر وابامایە ئێستا وانەدەبووم. ئەوە بۆ خۆتان دەزانن)).

بابەگیان دیاربوو دەزانیٚ. ((بەلاٚم باوەڕ بکەن بەندە شتێکی عەرز دەکەم و جەناب عالی شتێکی دیکە دەبیسن. بەندە نەمدەویست... قەتماغەی کۆنە بڕینان هەڵدەمەوەو باسی رابردوو

بکەم و ئاماژەی دەمێ. داوای لێبووردنێ لەسەرکار خانمێ دەکەم... شەوی کارەساتە دڵتەزێنەکە...)).

روویەکی ماتەمینانەی بەخۆوە گرت و دووبارە تیغەکەی لوتی نەوازش کردەوە؛ چاوەکانی نەك هەر کزومات و غەمناك نەبوون زەردەخەنەشیان لێدەباری و شاد و شەنگوڵیان دەنواند؛ وەك ئەستێرەی شەوێکی سارد هەروا جریوە جریویان بوو. ((شەوی کارەساتە دڵتەزێنەکە ئەویان کردە مەئموری ئەنجامدانی فەرمانەکە، کە هەرچەندە گرانیشی لەسەرکەوت؛ بەلاّم هەرنەچووە ژێرباری ئەو فەرمانەوەو نەچوو هەرنەچوو...)) (خودا منداڵەکانی لێنەستێنێ!)).

ئەبولفەتح خان کە بەو پاڵپشتیە گەرمەی کە لە داییەوەی دیت، دڵنیابوو کە تازە ئیدی دەچێتە ئەنجوومەنەوە لێی زیاد کرد: ((جەنابی رەزایی، باوەڕتان بێت، وەك خوداوەند ئەوی هەر بۆ کۆمەکیە ئافەریدە کردبێت!)) و تەماشایەکی پڕ چاوەڕوانیە دایی کرد؛ و دایی چاوێکی پێشبینانەی لە بابەگیانی کرد... و من ئارەقەم دەردابوو...

جەنابی رەزایی پێوەی دیاربوو کە لە شادی و ((خۆشیان)) جێ بەخۆی ناگرێ. دانیشتبوو و گوێی لەو قسانە راگرتبوو و تەزبێحی بادەدا. جاران هەرکاتێ کە جەناب رەییس دەهاتنە ماڵێ بابەگیان زۆر لە خوارووییەوە- نەك هەر لەریزی ئەونا، بەڵکە لە ریزی دایی لە شوێنێکی لەسەر هەردوو ئەژنۆیان بە شێوەی سێ گۆشەیەکی تەواو هەردوو دەستی داویشتنە سەر ڕانی و وەك یەکێکی دەدەمی ((تەحییات))ێدا دادەنیشت، و جەناب رەییس، جەناب رەییسی، بەدوای یەکدا ریز دەکردن-.

ئێستاش ئەوەتا زۆر سەربەستانە دادەنیشێ: قاچێکی وەبەرەخۆ دەداتەوە لەسەر ئەژنۆیەکی دادەنیشێ؛ رووی زۆر پێشان نادا، وەك کۆنە بازرگانێکی گوێ لە قەرزدارێکی بگرێ کە هێشتا قەرزی کۆنی نەدابێتەوە هاتووە کردوویەتیە بازاڕی خۆی و داوای قەرزی دی دەکا بەو ئومێدەی دوایە بە پشتیوانیە خوای هەمووی پێکەوە بداتەوە! ئێستا بە پێچەوانەی جارانەوە کە زەردەخەنەکانی بابەگیانی وەك ئاسۆی بەیانیان گورگ و مێش و بولێڵ بوو، ئەوەتا ئێستا هەمووی هەر رووناکییە.



بابەگیان بەدەنگ و ئاوازێکی لێواو لێو تێکشکاوی و هەر لەو دەمیشدا وای پێشاندەدا کە حەزدەکا ئەو داوایە پەسەند بکات و بەرخوردێکی لێدەکات، گوتی: ((های بابە، کێ لە ئێمە دەپرسێتەوەو کێ بە گەز و ربەی کێ دەپێوێ و کێ ئێمە بە پیاو دەزانێ؛ ئەوە خۆمان هەڵشەنگاند و هاتین چمان لە دەست دێ لەوەی زیاتر کە دەست بەکلاّوی سەری کەچەڵمانەوە بگرین با نەیبا!)).

جەناب رەییس روخسارێکی ناڕازییانەی نواند و بە تیلە چاوێکەوە بەدایی گوت: ((ئیختیارتان هەیە، جەنابی رەزایی؛ کێ لە جەنابعالی پیاوتر و چاکترە! سوپاس بۆ خوا پیاوێکی کاسبی سەربەرز و بەڕێزی، و ماشەڵلاّ سەرناس، جگە لەوانەش کەمیشتان بەلاّو ناخۆشی بەسەرنەهاتووە... کێ لە ئێوەی جەنابعالی چاکترە!)) بەکورتی بابەگیان ببووە جەنابی ئاغای رەزایی، و سەرکاری کاروباری شۆرەوی، و دایی سەرتاپا گومان، و لە هەمان کاتیشدا سەرتاپا سەرسامی و نائارامی کە هەی قوربانی ئەو کەللەیەت بم، ئەو هەموو ماوە دوور و درێژە ئەو هەمەکارەیە بووە و کەچی دەخەوێشدا وشەیەکی لەم بارەیەوە نەدرکاندووە! —و ئەوجا، بەهانەگرتن و ماڵ شێواندن: کە هەر لە هەوەڵێوە دەیزانی، هەر لەسەرەتاوە دیاربوو رەفتارەکانی واپێدەچوون، کە نەماڵی بە ماڵی خۆی و نەژنی بە ئی خۆی زانیون- خوا ئەو ژیانەی ببڕێ! و هەرچەندە بابەگیان سوێند و قورئانی دەخوارد و توڕە و تۆسن و گرژ دەبوو و خۆی دەخواردەوە دایی لە سێ جار بیستەی خۆی نەدەهاتەخوارێ و هەر بەزمێکی دەزانی ئەویش سێ پێیی بوو... کە بەڵێ متمانە بە ژن و منداڵەکانی خۆشیان هەر ناکەن (ئاماژەی بە جاسوسیەتێیە دەکرد کە متمانە بەهیچ شتێك ناکەن!) پڕوپاگەندەکە توندتر بوو و سەرەنجام وەڕاست گەڕا: گوتیان ئەوڕۆ دوای نیوەڕۆیە دەگەنەجێ (یانی رووسەکان) و پاسەوان کەوتنە جموجۆڵ، و بێدەنگی باڵی بەسەر شاردا کێشا کە نەکا وەك شەڕی جیهانی هەوەڵێ بە ماڵان و بەخەڵکی وەربنەوەو (ماتیشکا)یان بوێن و یەك فەوج سالْدات دەگەڵ یەك ژنی بێچارەدا یەکانگیر ببنەوە! وای، خودا ئەو رۆژەمان پێشان نەدات و نەیبینین! ژمارەیەك یەکسەر شاریان بەجێهێشت و هەلاّتن و لێیاندا رۆیشتن؛ تەنانەت پورە فاتمیش کە هەمیشە دەو جۆرەکاتانەدا لەبەر دەرکێ دەچەقی و گوێی هەڵدەخست و بەڕاست و چەپەیدا دەڕوانی بەروبزگوڕی خڕ کردەوەو چووە ماڵێ کچە گەورەکەی. بەلاّم سەرکردەکانیان بەدەم ئایەتەل کورسی خوێندنێوە بۆ پێشوازییە بردنە دەم چۆمی و ریزیان کردن، ئاغای توغرول، و بەخشداریش، گایەکی

قەڵەوی چوارپەل ئەستووریان هێنا و بەپەل بەستراویەوە لەو گۆڕەپانەی مرادسپۆر ئاوڕشێنی کردبوو لەخوار ریزێوە لە عەردیدا، عەزە خڕیلیشی بەسەرەوە، تا ئەگەر بەخێر و خۆشی گەیشتن لەبەر پێیانیان بکرێتە قوربانی- ئاخر ئەوان میوانی مەبوون- لەپێشدا بانگەوازیان لە دەرکی مزگەوتی گەورە دابوو و داوایان لە خەڵکی کردبوو کە دەگەڵ دۆستانی کیشوەری دۆست و دراوسێ، یەکیەتی جەماوەری شۆڕەویدا بەگەرمی و رووی خۆشەوە هەڵسوکەوت و رەفتار بکەن. ئەوەیان لەڕاگەیاندراوەکانەوە وەرگرتبوو. بەڵێ، بە سەلامەتی گەیشتنەجێ. دە دوازدە لۆری بوون، دەگەڵ ((زرێپۆش))ێکی، کە جگە لەوەی بەقەدەر تەپەی حوکمەتی نەدەبوو لە لۆریەکی باری ئاساییش هەرگەورەتر نەبوو، جگە لەوەی کە تەنیا قوللغێکی شەستیردار و تۆپێکی هەبوو، و دەیانگوت گوللە نایبڕێ. ئەگەر ئەو قوللغەی نەبوایە ئێمەی منداڵان یەکپارچە زۆر ناراحەت دەبووین. تێکڕا هەموویان سەد سەرباز نەدەبوون- ئەوانیش هەموو مێرد منداڵ، هەر کە دامەزران دەستیان کرد بە تەقەی و بەراوەماسییە دە رووبارێدا، و شەوانەش یاریکردنە بەتفەنگان و تەقە و فیشەکە شێتەی رووناکی هەڵدانێ بە ئاسمانێدا.

بەهـ بەهـ لەو قۆشەن و سوپایەی! خۆ تفەنگەکانیشیان وەك برنۆیەکانی ((خۆمان))نە دەبریسکانەوە- ماشەڵڵا! بەهەرحاڵ، بەقسەی ئاغای توغروڵ بەخێر گەڕا. رێ و رەسمی پێشوازییە بە شێوەیەکی زۆر شایستە ئەنجامدرا، و هەموو لە هەموو رازیبوون. بەتایبەتی خانەخوێ. ژمارەیەك لە مێوانان چوونە قشڵەی حوکمەتی و ژمارەیەکیشیان چوونە سەرباخانێوە. دەو نێوەیدا فڕۆکە رەشەش هەر پەیدابۆوە و بەسەرشاریدا کەوتەوە چەرخ و خولدان و تەقڵەلێدانەوەو خۆ ئەو دیواو دیوکردنێ...

هێشتا سەعاتێك بەسەرهاتنێیاندا تێنەپەڕیبوو کە لە بازاڕی بووە ژاوە ژاو: سەربازەکانی هەنگی (فەوج) دەوڵەتیان هەموو پایدۆس کردبوو، و هەروا پۆتین و پەتوو و ناوەو ئیباربوون لە بازاڕیدا دەستا و دەستیان دەکردن.

دایی و هەموو دایکەکانی دی پاڕانەوە: ((خوداوەند دەوڵەتی ((ئەسەدعەلین))و بەخت و ئیقباڵی هەر بەردەوام کات! خودایە، خێر لە سەڵتەنەتەکەی خۆی ببینێ! خودایە رۆژ بەرۆژ ئەستێرەی بەخت و دەوڵەتی هەر لە گەشە و سەرکەوتنێدا بێت)) و فرمێسکی شادی



خۆشییەیان هەڵوەراندن، و چاو لە رێی منداڵەکانیان کە لەولاولا بوون دانیشتن، و دایی فرمێسکی حەسرەتی هەڵڕشتن: ئەگەر پێنج شەش ساڵ زووتر هاتبانایە چ دەبوو!

بەڵام کەس گوێی نەدایە بابەگیانی. بابەگیان ئەو رۆژە پارەی ئیشی لە کەس وەرنەگرت، بۆیاغ و دروونەوەو پینە هەمووی بەخۆڕایی بوو... ((شایانی نییە، قوربانی سەرت! هیچمان نەکردووە، دوو تەقەڵ و بستە دەزووێك هێندەی ناهێنێ!)) بەیانیش هەرکەس بەسەر وەختیەوە نەهات، و بابەگیان یەکجار زۆر مرچ و مۆن و گرژ بوو، هەرچەندە خۆشی نەدەهاویشتە ناو گۆنگەڵێ. لەبەر دوکانێ رادەوەستا و تەزبیحی بادەدا- زۆری دەست نەدەچووە ئیشێ. بۆ بەیانی هەروا کە راوەستا بوو و دەستی لە پشتەخۆیەوە گرتبوون و تەزبیحی بادەدا زەردەیەکی بەڕووی ((قوماندان))یدا کرد کە لە دووکانێ ئەو بەریەوە شووتی دەکڕی- زەردەیەکی تابلێی پان و پۆڕ و هەراو- و بەچاو و روخسارو دەم و هەموو ئەندامەکانی لەشییەوە داوای لێکرد کە ئەو شانازییە بفەرمووێت و تەشریف بێنێ و بەیەك دوو پتکە بۆیاغان قنیاتێ بفەرمووێ. بەڵام بەداخەوە چەکمەکانی ((قوماندان))ی حیسابی بۆیاغ کرابوون و نەیفەرمووو. دیارە ئەویش هەر پێکەنییەوەو ددانە زێڕەکانی وەدەر ئێخستن، بەڵام هیچ نیشانە و ئاماژە و شتێکی نەدا...

شەوێ بابەگیان پەست بوو و سەری رادەوەشاند: ((ئمم! ئێستا ئەگەر ئەوە ئینگلیزبایە، بەسەر وەختی نەوەو رەچەڵەك و تۆرەمەیەوە دەهات و لێی دەتۆژیەوە... شازدە ئەسکەندەر میرزای بەو هەموو تاوانانەوە لە زیندانی مەشرووتەی دەرێنانەوە، گوتی ئەوانە سەر بەمنن، لەژێر بەیداغی مندان. هەموو ماڵ و موڵکەکەشی دانەوە! پێم وا نییە بەو شێوەیە رەعییەتدارییە سەڵتەنەتی بکرێ...!)).

سۆزانی خانەکە چۆن بوو هەروای لێگەڕان؛ کەلایی سەرومڕ بەکوڵك و پێستەوە دەهات و دەچوو و کەسیشی بەبنە پێڵاوی خۆی نەدەزانی- دەك کوێربییەوە رۆژگار!

دووسێ رۆژان مانەوە —رووسەکان دەڵێم- و دوایی لەناکاوێکڕا گوتیان دەڕۆن، و تا ئێمە بەخۆمانزانی ئەوان رۆیشتن. سەرهەنگ و چەند ئەفسەرێك و ژمارەیەك تفەنگ و فیشەکیان لە لۆریان بارکردن و رۆیشتن- حاجی؟ -حاجی مەککە!

دەگوترا- یانی زیاتر بۆ خۆمان دەمانگوت- لەبەرئەوەی نەدەمانەوە بۆیە بە بەرژەوەندیان نەزانیوە ((پەیوەندی)) بە بابەگیانیەوە بکەن و ((نیشانان)) ئاشکراکەن- چونکە ئی مانەویٚ نەبوون، دەنا ئەوە هەرنەبووە و نابیٚ، ئەوان دەفتەر و تۆمار و دۆسیەیان هەر هەبوون! بابەگیان وردە وردە بۆوە ئەکبەراغا، و ئەکبەراغا و مەشەدی، ئەوەشی هەروەك پۆزی بەڕیشی خۆیەوە هەڵواسی کە بەڵیٚ بۆیە یان خۆ تێنەگەیاندووە و ئەویش ((کە بەڵیٚ بۆ خۆشم دەمزانی!)) و دایی سەرلەنویٚ نێوچەوانی لەمە تێکنانەوە، بەتایبەتی کە بابەگیان نەیهێشتبوو سکالاٚنامەیەکی بداتە ((قوماندان))ی و ئەمیر لەشکری لەوی بوێتەوە.

بە کورتی پشتێن. هەر کە لە پێچی باغی میرزا ڕەشیدی بایاندایەوە چەند ئەفسەرێك کە خۆیان شاردبۆوە وەك قارچکیٚ لە ناوەڕاستی شەقامیٚ هاتنەوەدەریٚ- هەروەك هیچ رووی نەدابیٚ؛ شەوێش کە چەند ئەفسەرێك لەرێیە هەڵدێن بە هانکە هانك و هەناسەبڕکێوە هاتنەوە، دانیشتن و هێندێکیان خواردەوە و بانگەوازێکیان بەدەرکی مزگەوتی گەورەوەدا و حکوومەتی سەربازییان ڕاگەیاند. ئەوجا نۆرەی ئەوەیە ئەوە چییە؟ بۆ حوکمەت لە پێشدا چبوو وا ئێستا بووە حکوومەتی سەربازی ((عەسکەری))!... بەڵیٚ، ڕایانگەیاند کە حکوومەت بووە حکوومەتی سەربازی، و پەخشدار بووە پەخشدارێکی سەربازی: سەرگورد عەببادی! و مراد سپۆریش ڕایکردەوە شەقام ئاورشێن کردنیٚ، دیارە ئەمجارەیان هەر بۆ خۆی ئاوڕشێنی دەکرد، چونکە وەك بۆنی شتێکی کردبیٚ. ئەوجارەیانی بەچاك نەزانی لادێییەکان تەنگەتاو کات و کارەکەی خۆی بەملی واندا بێنیٚ و بەوانی بکات. هەر بۆ خۆی کەوتە پینە و پەڕۆ کردنیٚ کارەکان. و مەئمورانی حکوومەتی سەربازیش، یانی گروبان گەل و چەند سەرجوخە و سەربازە رووتەیەکی کە مابوون، کەوتنە گەڕانیٚ بەناو شەقامەکاندا... سەرکار ناسرخان، یا سەرکار عەباسقولی، یا سەرکار عەلی میدالی هیچ کامێکیان دیار نەما بوون. و کە بە بەر دوکانانداا تێدەپەڕین کەس لەبەر ئەو گروبان و سەرجوخە و سەربازە رووتەلاٚنە هەڵنەدەستا، گوایە بۆ خۆیان پێیان خۆش نییە کەس لەبەریان هەستیٚ. هەر چەندە خەڵکەکە بەزەردەخەنەوە رووبەڕوویان دەبوونەوە، بەلاٚم تیڕوانینەکان تا دەهات هەڕەشەیان لێدەباری.

* * *



## (١٨)

گۆڕانکارییەکە واپێدەچوو لینگە و قوچ بووبێتەوە: هەواڵ هات کە عەشایەر دەورەی شاریان داوە و دێن سەربازخانە بگرن. ئیدی ئەوە شتێکی تازەبوو!

عەشایەر! عەشایەر چییە؟ -عەشایەر هەر ئەو کوردە لینگ هەڵکراوە نییە کە مرادسپۆر دەیهێنان و ئاوڕشێنی پێدەکردن... ئیدی ئەوە عەشایەرە... یا هەر ئەو حوسێن بەگەیە کە بارەداری دێنان و دەیفرۆشتن یا هەر ئەو سەعید بەگەیە کە شووتییان دەفروشیٚ... ئاهە... بەڵیٚ، ئەوە ئێستاش تفەنگیان هەیە، و بەڵیٚ عەشایەرن... ئەی با... بە، ئێمە بۆ نالێی، ئەدی ئێمە لە کویٚ بووین!

خەڵکی دیارە ناراحەتن، پێدەچیٚ خۆشییان لە عەشایەرنەیە. بۆ نازانم. ئەو چەند ماڵە ((عەجەم))انەی دەشاریشدان کەوتوونەتە بارگەوبنە تێکنانیٚ. بۆ ئەوەشی هەر نازانین. ئەوانە سەرو سەودا و پەیوەندییەکی وایان دەگەڵ بابەگیانیدا نەبوو. تەنانەت لە مەرگی کاکەشدا جگە لە وەستا عەلی دارتاش، کە ئەویش وەك ئێمە وردە وردە وەك خەڵکی ناوچەکەی لێهاتبوو بە کوردی دەدواو لە مزگەوتێی نوێژ دەکرد. دەنا کەسێکیان هەر نەشهاتنە ((پرسە))ی.

عەشایە هەڕەشەیان بۆ سەرگورد، و پەخشداری سەربازی نارد، و سەرگورد لە وەلاٚمی واندا، بەڕیٚ و ڕەسمی سەردەمی هەریٚ کۆن ((چاخی ناوەڕاست)) گوللەیەك و مشتیٚ باروتی بۆ عەشایەران ناردەوە و خۆشی قایم کرد و سەنگەری بەهەرچوار دەوری شاریدا لێدا؛ و عەشایەر هاتن، و شەڕ و پێکدادان بەرپابوو. بەلاٚم چۆن شەڕێك تا بڵێی سەخت و توند و تیژ و خوێناوی؛ و عەشایەر شاریان گرت و ڕژانە نێو ماڵە ئەفسەر و سەرۆك دایەرەو کارمەندەکانەوە، و بەدەردی بۆ خۆیان دەیانگوت ماڵی خۆیانیان لە ماڵەکانیان دەرێنایەوە. سەربازخانەشیان هەر تالاٚن کرد. دەونێوەیدا ژمارەیەك لە هەردوولایان کوژرا، دەنێوەواندا جەنابی ڕەییس زەمینی، و

چەندین سەرباز و پاسەوان و ئەمنیە، و یەك دوو ئەفسەریش، کە عەلی میدالی یەك لەو کوژراوانەبوو، و دایی بەچاوی خۆی تەرمەکەی دیبوو.

بۆ سبەینێی رووداوێکی سەرنج راکێش روویدا: کلاوی کەپی و شاپکا وەك جندوکەی بیسمیللا لێ خوێندراو، هەروا لەچاوتروکانێکدا لە حەوت کونەمشکاندا شاردرانەوە، بەلام چاکەت و پانتۆڵ، بەتایبەتی چاکەت، تۆزێکی زیاتر خۆڕاگرت، عەجەمەکانیش هەموو بوونە خۆ ولاتی و رەنگ و رواژایان گۆڕی: بابەگیان گورجێکی کەواو سەڵتە و مێزەرێکی لە فەیزوڵلای خواستەوەو هاتم یەخەی چاکەتەکەیم بۆ هەڵدایەوەو وام لێکرد لە یەخەی کەوایەکەی بچێ... دیسانەوە دووبارە بوونەوەی مێژوو!... دنیا و رۆژگارێکی سەیرە... رۆستەمی ئەم شانامەیە بووە دێوو، ئەم سەدرولئەشرافە لە پڕ بووە ئازادیخواز و وەزیری دادگەری... ئەڵلاهو ئەکبەر!

هەر ئەو رۆژە خانمە سۆزانییەکانی کەلایی رەجەب و ژن و منداڵی ئەفسەر و سەرۆك دایەرەو ئەوانی دیکەیان سواری ولاغان کردن و ناردیاننە شارەکەی تەنیشتیێ خۆیان، تا لەوێوە بۆ کوێیان حەزلێیە بچن، کەلاییش شەوێ پارچە پەڕۆیەکی قەدیفە دەسەریەوە دەپێچێ و دەگەڵ قولی خزمەتکاریدا هەڵدێ! (ئەو کارەیان چاك بوو- کاری عەشایەر- خوا منداڵیان لێنەستێنێ!- ئەوەش دوعای دایی).

دوکان و بازاڕ داخراون، زۆربەی خەڵکەکە لە دەم چۆمی خڕبوونەتەوە. ژن و منداڵی ئەفسەر و سەرۆکەکانیان لەولاوە خوارتری ماڵێ پورە حەنیفەیەوە، بەرامبەر کۆنە خانووەکەی مە راگرتوون: ژن و منداڵ و خانمەکانی کەلاییش لەسەر پشتی ولاغانن و ئەفسەرێك کە چەکمەکانی خۆی بەجووتە کەوشێکی بن لاستیك گۆڕیونەوە و بەجلوبەرگێکی شڕو سەری قۆتەوە، چاودێری رێکخستنی ریزی ولاغەکانە. تفەنگ بەدەستی پارێزگاری تا هێشتا نەهاتبوو و فەرمانی رۆینێ دەرنەکراوە. بەرێکەوت سێ چوارێك لە خانمەکانی کەلایی لە پێشەوەی ریزەوەن، ئەوانی دیکەش لەپشتەوە. زۆریان گوێ لێ نییە- خانمەکانی کەلایی دەڵێم- هەروەکو خۆیان بوون. چۆن بوون هەروان: جارجارە جەفەنگان دەگەڵ یەکدا لێدەدەن، و پێدەکەنن. بەلام ژنە ئەفسەر و سەرۆك دایەرەکان، بەتایبەتی خانمێ جەناب سەرهەنگی، زۆر ناراحەتە — هەقیشیانە- و بەردەوام لەسەرکورتانێوە بەلادادێن. دیارە کە زبری پشتی کورتانەکان دەگەڵ ئەو ڕان و بەلەکە خڕ و خۆلانەدا هەڵناکەن. بەردەوام لێوان هەڵدەقرچێنن و ((ئایش و



ئۆف))یانە، تەنانەت وایە دەشگرێن. دیارە بەوەی ناراحەتن کە دەگەڵ خەڵکی تێکەلاو بوون. هێشتاش نەگەیشتونەتە ئەو پلەوپایە و قۆناغە عیرفانیەی کە هەستی ئەوە بکەن چاکە و باشی ئەم جۆرە بارگەوبنە لێنانانە ئەوەیە کە ئەم هەست بەکەمی نزمیە رووالەتییە، دەگەڵ پەیوەستی مرۆڤ بەمرۆڤەوە، لەپلەو پایە و گەورەیی مرۆڤ زیاتر و بالاتر دەکات. ژن و کچ و منداڵانی گەڕەکێ، تەنانەت ئەوانەی گەڕەکێ سەرەوەش، هەموو هەر هاتوون و خڕبوونەتەوە. هێندێك جام و گۆزە بەدەست هەن بەناو ژن و منداڵی ئەفسەر و سەرۆك دایەرەکاندا دەگەڕێن و ئاو و دۆیان دەدەنێ- هەوا گەرمە.

ولاغەکان بەردەوام کلکان رادەوەشێنن و چوارپەلان دەکوتن و مێش و مەگەزان لە بن زگ و خالیگەی خۆیان دەردەکەن، و جاری واشە لەبەر بێ ئیشی و چەمووشیە سەردەکەنە سەرولاغەکانی پێشەخۆیان:

لەسەرەخۆ و بەسپایی لمبۆزیان دەبەنە بن کلکیان و وردە گازانیان لە کەفەلان دەدەن و دەیانخورێنن؛ جاری وایە زۆر بەتوندی، بە شێوەیەکی وا کە ولاغەکەی پێشەوە جەنەی دەگرێ و گوێیان دە ((مووچ))ەوە دەبات و واخۆپێشاندەدا کە وەك بیەوێ جووتان باوێ. ژن یا کچی سەرپشتی ئەو ولاغانە دەزریکێنن و ئەودەم جەناب سەروان یا جەناب سەرگوردێك دەستبەکار دەبێ و دەگاتێ.

سەگەڕەشی ماڵێ جەناب سەرهەنگیش لەبەردەمی ولاغە بەستراوەکەوە، وەرکەوتووە: دەمی داپچڕیوەو هانکە هانکییەتی. بەردەوام سەری هەڵدێنێ و بەدووچاوی کزەڵەوە سەیرێکی خانمێ جەناب سەرهەنگی دەکات، و لەروونکردنەوەی ئەم بارودۆخە دەگەڕێ. کە هیچ وەلامێکی چنگ نەکەوت هەڵدەستێتە سەر پاشوان و دەستان داوێتە کورتانێ ولاغەکەی و لە ناخی دڵیەوە قروسکێکی وەك فیتویێ لە دەروونییەوە هەڵدەستێ و دەیەوێ قەپۆزێکی بە ران و بەلەك و سینگ و زگی خانمێدا بسوێ، و خانم لە شەرمان چاو و برۆیان تێکدەنێ و چاوان بەردەداتەوە، و ئایش و ئۆفی لەوەی دەکا نەك خودا نەخواستە گلاو ببێت! هەردوو دەستان بلند دەکات، هەروەك ژن چاکان کە دەستنوێژێ دەشۆن و نایانەوێ دەستی تەڕیان وەهیچ کەوێ و بەترس و لەرزەوە خۆ بۆ دواوە دەکێشێتەوەو بەدوو لێوی مووچەوە دەڵێ: ((وش، دی بڕۆ ونبە... ئێە، پیسی ناشیرن!))و سەگە لەو بێ ئەمەکی و بێ سۆزی و نامیهرەبانیەی

سەرسامانە وەلا دەکەوێ- و لەبەر پێی وڵاغەکەی وەردەکەوێتەوەو بەزمانی قروسکاندنێوە دەگری.

حەشیمەت هەموو راوەستاوە کە لە پڕ عارەبانەی عەلی عەجەمی لە دوورەوە، و ئەحمەد شا بەسەرەوە دەستێکی بەرزکردۆتەوەو بەرەو پێش وەدەردەکەوێ. برای سەلیمی کەبابچی خێراخێرا ئاگادارییە دەدا: ((ئاگا-دار!)) ئەفسەر و سەرۆك دایەرەکان بێ ئیختیار قیت رادەوەستن، ژنەکان دەشڵەژێن- تەنانەت منداڵیش هەر بێدەنگ دەبن. ژنە کوردەکان پڕمە پڕم پێدەکەنن، و هەرواش ئاو و دۆیە دەگێڕن. کوڕی حەمە غونچێ بەخۆ و بە قەرتاڵە ترێیەك و تەرازوویێکەوە، بێ مشتەری لەسەرچیچکان دانیشتووە. هەر کە ئەحمەدشا دەگاتێ، هەروا بەدەستی بەهەواوە ئاماژەی قەرتاڵە ترێیەکە دەکا؛ کوڕی حەمە غونچەی هێشوێکی هەڵدەگرێ و فەرمووی لێدەکا؛ ئەحمەدشا بێ ئاوڕلێدانەوە لێی هێشووە ترێیەکە وەردەگرێ و دەیداتە سەرگورد عەببادی، دووبارە دەستی درێژ دەکاتەوە، و هێشوێکی دیکە وەردەگرێ و دەیداتە ژنێ جەناب سەرهەنگی. عارەبانەش هەروا دەڕوات. کوڕی حەمە غونچەش بەهاندانێ تەماشاچیانەوە بەخۆو بەقەرتاڵەوە بە تەنیشت ئەحمەدشایەوە دەگەڵ عارەبانەکەیدا بەرەو پێش دەڕوات. ئەحمەدشا هەروا دەست بەهەواوە بە زەردەخەنەیەکەوە سەری بەڕاستە و چەپەیدا دەگێڕێ و زۆر بەخۆشییەوە وەڵام دەداتەوەو بە ئاماژەوە فەرموویان لێدەکات، و کوڕی حەمە غونچەی قەرتاڵە ترێی لەپێش ئەفسەر و سەرۆك و خانمەکان دەگێڕێ.

هەریەکەی هێشوێك، جا گەورە، یا بچووك، هەڵدەگرێ. دەوبێنە و بەرەیدا ژنێ سەرهەنگی و ئەوانیدی زەردێکیان بەلێواندا دێت. شوێنەواری زەردەخەنەکە زوو لە رووانەدا نامێنێ و هەرهەتا دامێنی کورتانی وڵاغەکان بڕ دەکا. دەستەکان بێ ئیختیار دەکاردان و بۆڵووە ترێیان دەگەیەننە زاری.

هەرچەندە لەبەدبەختیان ئەم ساتانە دەهیچ مێژوویێکیدا نەنووسراونەوەو چاوی هیچ کامێرایەکیشیان ئازار نەداوە... ئێستا هەموو ئاسوودەن؛ بە ئاسوودەیی لەسەر پشتی وڵاغەکان دانیشتوون و ترێی دەخۆن، دەڵێی سەرەنجام هاتوونەوە سەرخۆ و بەخۆهاتوونەوە: دەخۆن و سەران بادەدەن و بەڕابردووی خۆیان پێدەکەنن، ئەوەش دیارە لەبەر هێندێیە کە دەگەڵ خەڵکەکەی تێکەڵاو بوون و وەك وانیان لێهاتووە. ئەحمەدشا تا ئەو سەری ریزێ کە بەیەك لە



خانمەکانی کەلایی کۆتایی دێ دەڕوا؛ لەوێ دەستێکی لە شانی عارەبانچییەکەی دەدا و بەپێچەوانەی جارانییەوە تێیدەگەیەنێ کە جڵەوی ئەسپەکەی باداتەوەو وەگەڕێ. عارەبانچی ئەسپەکەی دەگێڕێتەوە، و ئەحمەدشا هەروا دەست بەهەواوە، و بەشێوەی حەزرەتی ئەجەل بە برۆتێکنانێوە دەڵێ: ((ئەفسەران- هەر شادبن!)) ژاوە ژاوێك لە پێکەنین و دەنگە دەنگێ ((هەر شاد بنی- حەزرەتی- ئەجەل-))یەوە دادەکەوێ. لادێییەك بەخۆو ماکەر و بار و جاشەکەرێکییەوە دەگاتە سەرچۆمی؛ کەرەکان هەموو گوێیان مووچ دەکەنەوە؛ نێرەکەری بن یەك لە خانمەکانی کەلایی دەست بەزەڕینێ دەکات، کە دەگەڵ قاو قیژ و زریکەی ژنەکاندا تیکەڵ دەبێ و کەرە دایدێڵێ. یەك لە کوڕەکان رادەکات و کەرەی دەگرێ تا لادێیی و ماکەرەکەی تێدەپەڕن... دووبارە ژاوە ژاو و پێکەنین دەست پێدەکاتەوە. بەڵام ئەمجارەیان بەچاوی شەرمێونییەوە، چاوی خۆیان بەردەدەنەوە. ئەحمەدشا دادەبەزێ و بە پێخواستی لە دوایین ماڵی خوار چۆمییەوە لە چاوان وندەبێ. دەو دەمەیدا تفەنگچیە پارێزگارەکانیش دەگەنە جێ، و ((ریز))ەکە وەڕێ دەکەوێ. ئەبولفەتح خانی بێنەواو بێچارە بەو گەرمایەی چۆن رێ دەکا!

ئاسمان ساوە. دەشت و دەر لەبەرچاوان تابڵێی پان و پۆر و هەراوە، و کێو هەروا گەردەنی کێل کردووە، سەرچاوە لە تەنیشتێوە بەبێدەنگی قیت راوەستاوە تا رێبوارانی لێو وشك و تینووی رێ و بانی چۆڵ و هۆڵی مێژوو وەك کیژۆڵە کوردەکان بەقومە ئاوێکی فێنك و ساردی خۆی میوانداری بکات.

زۆرنابا پڕوپاگەندە پەیدا دەبێتەوە کە عەشایەر دەیانەوێ ئەو شارەی تەنیشتێش بگرن: بۆ تاڵان کردنێ ماڵە خەڵکی! لەبەر ئەوە شار بەسەر سێ بەشی حوکمەتیدا دابەش دەکەن، هەریەکەی بۆ خان و بەگلەرێك، خانی هەرسێ بەشان، هەریەکەو مەلایەکی دادەنێت- و وەڕێ دەکەون. ئێستاش دەور دەوری حەس حەس و پۆلیسانە، کە لە ناخی دڵی کاولە وێرانەی مێژووی مردووەوە دەرکێشراونەتەوە دەرێ. چەرخەچی و دارۆغە دەبازاڕیدا دەگەڕێن، و بەزۆری شەوانە بۆ خۆیان دوکان و ماڵان دەست پێدادێنن، و سوارەو پیادەش بە ماڵان وەردەکەن و بۆ راگەیاندنێ بەرزبوونەوەی پلەو پایە و مەقامانیش بەناو شاریاندا دەگێڕن. جێی ئەبولفەتح خانی خاڵی: جاڕچی دەشاریدا بانگ رادێڵێ کە ئەی خەڵکینە لەم ساتەوەختە بەدواوە حوسێن

بەگی میراویێ، حوسێن خانە؛ هەر کەسێك بە هەڵە یا بە ئەنقەست بە بەگی بانگ کات هێندەهێندەی جەزا لێوەردەگیرێ... بەڵێ، ئەوەیە کاری راست و پیاوانە، نەك وەك ئەوەی پلەو پایەی لە تارانێوە بۆ ئەبولفەتح خانی بنێرن و لەژێرەوە بەدزیەوە بە سەگان خواردووی بدەن و بیدەنە فەتتوحی!... بەڵێ، ئەوەیە کاری چاك و پیاوانە...

کەری بەستەزمان چوو لە کلکێ بگەڕێ- هەردوو گوێشی خستە بانی! (بۆ ریش چوو سمێڵیشی لەسەردانا) جاران هەبوو و نەبوو گروبانێك هەبوو، ناسرخان، ئێستا هەر کەسێکی راستبۆوە و تفەنگێکی بەشانیدا کرد ئەوە بۆ خۆی رەییس و هەموو شتێکە- بەلاّم چۆن رەییسێك کە هەرچی یاسا و رێسا و دەستوور و بنەمایەکە نییەتی؛ هەرچەندە یاساو رێسایەکی خۆی هەر هەیە: هەر بۆ خۆی شکایەتکەر، و هەر بۆ خۆشی لێکۆڵەرەوەو قازییە، و هەم مەئموری جێبەجێکردنی فەرمانانیشە. بەڵێ، وەك دەڵێن میللەت تازە خەریك بوو تامی ناخۆشییەکانی دوای گۆڕانی رژێمیان دەچێشت... ئەم کەف و کوڵ و بەرەڵلاّییەی دوای چەندین ساڵ سەرکوتکردنە، شتێکی تازەبوو.

رەگ و ریشەی دەمارگیری و چاوبەستەکێ (خورافات) تا ناخی ناوەوەو قولاّیی دەروونی خەڵکی رۆچوو بوو. خەیاڵ و بیری چاك و جوان لە ئارادا نەبوو... بە ئاشکرا ترسی ئەوە دەکرا کە ئەوەندە ((پەیوەندی))یەی هەبوو ئەویش لەنێودا نەمێنێ. بەرێداچوونی بێ هیواو مەبەست و بێ ئامانج کارێکی تا بلێی سامناك و ترسناکە. بەلاّم دەی، شارەکە بچووك بوو، و بۆیە رووداویش وا گرنگ نەبوون- هەرچەندە بەلای خەڵکەکەوە هێندە گەورەبوو، لە کیشوەرێك گەورەتر. باشە دەی، میللەتیش بێ رابەر و سەرکردە و بێ بیرکردنەوە بەرەو دڕندایەتیە دەچێ، بەتایبەتی کە هێندە لەو قۆناغی دڕندایەتییەوە دوور نەبن، و جا وەرە دادوەریش (حاکم)خان بێت و یاریدەر و راوێژکارەکەشی کرمانج بێت...! بەلاّم کە بەڕاستیش سەیر دەکەی دەبینی کە سروشتە راستەقینەکەشی هەر ئەوەیە. ئەگەر ئەوە پێشەکییەکە بووبێ دیارە کۆتاییە لۆجیستییەکەشی هەر ئەوە دەبێ: پەروەردە نەبوو، ئەوەی بەناوی پەروەردە و فێرکردنێشەوە لەبەردەست و دەکاردابوو شتێك نەبوو هیچی لێ بووە شێتەوەو کەڵکی کەس بگرێ. شێوەی پەروەردە لێرەش وەك سەرتاپای شوێنەکانی دیکەی مەملەکەتی، دەگەڵ ئەو جیاوازییە سروشتیانەی بەگوێرەی دەوروبەر زۆر سروشتی و خۆرسك نەبوون کەرێ بە کەسێك بدات هەروا



لەخۆوە وەك ((گوڵ))ێك سەرهەڵدات و بپشکوێ یا وەك گیایەکی بەگوێرەی سروشتی خۆی پێبگا. مامۆستا لە جیاتی ئەوەی یارمەتیدەر بێت و ئەوانە بەرەو پێش بەرێت گوێی رادەکێشان و لێی دەخوڕین. هەرکاتێ ئەوەش سوودی نەبایە قامچی دەکار دەخست. ئەوەشیان هەر سروشتی بوو چونکە: کاتێ کە سوودی نەبوو شوولّی تەڕ- بارەبەر نابن گا و نێرەکەر. ئەو کەسانەی کە پەروەردە کرابونو و راهێنرابوون شتێکیان لەم بارەیەوە دەزانی بە شێوەیەکی سروشتی گەورە دەبوون و دەهاتنە ژێرباری ئەوەی کە بارێ بەرن. کە رەزایی رۆیی سەرەتا گوتمان چاك بوو رۆیی؛ زۆرمان شادی و کەیف و خۆشی خۆمان پێشاندا. دوایە سەیرمان کرد کە نا، زۆریش خراپ بوو، زۆریش سەرشۆڕ و ملکەچ بووینەوە- هەموو هەر سەرشۆڕبوونەوە. ئێستاش هەرکەسێکی تفەنگێکی بەشانیەوەیە رەییسێکە- و چ رەییسێك!- و ئەوەی وەڕەز دەبێ لە دێی دێتەدەرێ و بەرەو شاری دێت و پۆلیس دەیبەنە سەرماڵە خەڵکی- بۆ بابە بۆ، چونکە تفەنگچییە، عەشایەرە! تازە خۆ ئینشاڵلاّ کاك میوانیش نییە، کاك لەسەر سەرانە، و دەبوو نانی خۆی و ئالیکی ولاّغەکەشی جا کەربایە یا ئێستر دابین کرابایە، دەنا خۆ کاك هەردەمی کردبایەوە هەقەکەی دەدەست خانەخوێی دەنا کە مەکە بابە کاتی خۆی کەمی ئەمنیە و رەییس پاسگا کوشتوون! ئەوە جگە لەوەی نە قوتابخانەیەك نە خەستەخانەیەك و نە پاکوخاوێنییەك... هیچی هیچ، هەرنەبوون.

زستانێش گرانەتا هۆڵی دەکرد و خەڵکی لەبەر: گرانەتا، و سورێژە، و کۆخە و پەسیو، و تەنگەنەفەسی و بێ خۆراکی، بەسەریەکدیدا دەمردن: باران نابارێ؛ بووکە بەبارانەی دروست دەکەن- ئەگەر ئەوە هیچی پێنەکرابایە، ناوی چل کەچەلاّنیان لەسەر پەڕە کاغەزێکی دەنووسین و کاغەزەیان بەسواندەی بانیەوە هەڵدەواسی تا ئاسمان بیبینێ، و باران ببارێ، هێندە ببارێ تا ناوی ئەو چل کەچەلاّنە دەشواتەوە، بەلاّم ئاسمان لوتی لەولای دەکرد- ئەو جارەی نا ئەو جارەی... ئەم جارەیان چل کەچەڵیان خڕدەکردنەوەو دەیانبردنە سەر تۆقەڵەی گردێکی، و کەللە تاسە بێ مووەکانیان بەرامبەر ئاسمانێ رادەگرت و رێیان پێشاندەدا، بەڵکە ئێ شەرمی ئەو سەرەتاس و لوسانە بیگرێ، و ببارێ... ئەوەش هەر هیچ، کەڵکی نییە؛ ئەوجار دەستەو دامانی جوولەکان دەبوونەوە... ئەوانیش دەست بەکار دەبن- شالۆم و شەلمۆ و عەبەدیە و یۆناتان و ئیدیکە دەگەڵ ماڵەکەیاندا دەچوونە گۆڕستانێ خۆیان و دەپاڕانەوە... دیسانەوە بێ ئاکام... ئەوە خەڵکیش وەك خەڵکی هەموو شوێنەکانی دیکەی وەك ئێرە هەروا دەمرن... تا

ساغن ئەوە ساغن و کەمتر نەخۆش دەبن؛ بەلاّم هەر کە کەوتن ئیدی راستبوونەوەیان نییە و پاشی دوو سێ رۆژان دەمرن... دەمە تەقێیەکەی ((پێشان)) هاتەوە گۆڕێ. هێندێك باوەڕیان وابوو کە قوتابخانە بۆ هەژار و نەداران نییە- هەژار و نەدار و قوتابخانەیان نەگوتووە!. زۆربەی دایك و باوکەکان لەو دەستەیە بوون. خەڵکی هەرەمەکی دەبێ هەر بەدوای کشتوکاڵ و ((کەسابەت))ی خۆیاندا بچن و بژێویە خۆیان لە زەوی و یان لە یەکتریەوە پەیداکەن. بابەگیان دەیگوت هەر راست وەك ((لای خۆمان)). میرزا شەریف سادەو لوس و لێك دەیگوت قوتابخانە ((حەرام))ە! ((ئەگەر لێیان پرسیت منداڵەکەت بۆ ناردۆتە قوتابخانە، چ وەلاّمی خودای دەدەیەوە؟)) وەلاّمی خودا! پێغەمبەرەکەی کە موحەممەدە (د.خ) فەرموویەتی ئەوە واجبە، ئەم دەڵێ حەرامە! و ئێمەی منداڵاّنیش لە خوامان دەویست حەرام بێ- هەرچەندە من دەگەڵ ئەو جۆرە منداڵاّنەدا نەبووم- من بڕوانامەی خۆمم وەرگرتبوو... بەلاّم هەر لە تاقیکردنەوەی خۆمەوە ئەوەم وەرگرتبوو کە هەردوای ماوەیەکی کەم هەموو دڵیان بۆ دیداری یەکتری لێدەدا... بەڵێ، ئەگەر بڕیار وابێ هەموو هەر بەدوای زانینێدا بچن ئەدی کێ سەودا و مامەڵە و کشتوکاڵ و چێوداریە بکات؟ ئەودەمی دەبێ خەڵکی هەموو لە برسان بمرن، و بۆ ئەوەی تا لە برسان نەمرن خانەکان بە رەزامەندیە ئەو کەسانەی کە لە راستیدا رێ پێشاندەر و جێگر و راوێژکارانیان بوون- و بە پشتگیریە تەواوی دایك و باوکانەوە- لەوپەڕی خۆشی و شادیە منداڵاّنەوە، قوتابخانەیان تێك و پێك داو دیرەگەکانیان هەموو سوتاندن. زستان بوو، سەرمایەکی بێداد بوو- وەی وەی، لەو ئاگرەی، چ دارێکی وشك و پتەو!... و ئەوجا حەسیریان راخستنەوەو هەرچەند سوختەیەك دەوری مەلایەکیاندا و بۆوە بەبێ ژەربی، سین زەنە... بیس، میم ژەرمی... بیسمی و هێشتا جوزووی عەممە بەنیوە نەببوو دەنگی مەلای بڵندبوو کە ((ئیننە هوکانە تەووابا... مریشکە رەشەی کەبابە، بۆ مامۆستای سەوابە!))- ئەوە دایکانیش هەر دەیانگوتەوە- و سوختەکان نۆرەیان دەگرت، و مریشکە رەشە بۆ کەبابی مامۆستای دەهات، ئەوەش لە پاداشی ئەو هەموو کوێرەوەرییەی دەگەڵی کێشابوون، و سەرەنجام دەگەیشتنە ((عەبەسە))ی ئەودەمی مامۆستا هەناسێکی ئۆخەی هەڵدەکێشا و دەیگوت: ((عەبەسە، خوێندن بەسە!)) ئیدی ئەوە کۆتاییەکار و خوێندنێ بوو، مەگەر یەکێك خوا لێی گۆڕیبایە و بەردەوام بایە لە خوێندنێ، ئەودەمی ((هەنبانە))ی بەکۆڵێ دادەدا، و سەری دە دوو خوێندنێ دەنا، و ماڵە و ماڵی دەکرد و راتبە و نەوتێ چرای لە ماڵاّن وەردەگرت، و دەکەوتە



هەڵمژینێ دووکەڵی چرا رەشکەی... دەو نێوەشدا ئەسپێش کە جاران بەهۆی بوونێ مێز و کورسیانەوە لە قوتابخانێ هێندێکی قوتابیەکە لێك دەتەکاندنەوەو نێوانێکی دەدانێ، ئەسپێیەکان تەنیا ((نیمچە ئازادی))یەکیان هەبوو بۆ گەڕانێ. بەلاّم کەمێز و کورسییەکە نەمان ئیدی ئەسپێ بەرەی خۆی لێ راخستەوەو ئازادی تەواوی وەرگرتەوە؛ لە جیاتی جێگرەکانی دەوڵەتیش، ئەوان کەوتنەوە مژینی خوێنی خەڵکەکە، چونکە حوکمەت ئەوانی لە هەموو دەرد و رەنجێکی ژیانێ رزگار دەکرد...

بەڵێ، زۆر خراپ بوو. هەر ئەوەندەشمان دەزانی کە زۆر خراپ بوو، بەلاّم هەرگیز لە خەیاڵی ئەو ((چاکی))یەیدا نەبووین کە دەبوو ببایە و نەبوو. نەماندەزانی لەدوای چوونێ رەزاشایەوە چ دێت، تا چاك بێت، و بەراستی دوای رۆیشتنێ رەزاشای چاوەرێی چ بووین. ئەوەندەمان دەزانی کە خراپ بوو- ئاخر هیچمان لەو بارەیەوە نەخوێندبۆوە و نەبیستبوو تا لەسەر ئەوەوە خەیاڵێك لە چاکیە بکەینەوە. خراپمان چاك دەناسی، و دەمانزانی خراپی لەو خراپترە نییە- هیچ ئاگایەکمان لە مێژوو نەبوو؛ ئەو مێژووەی کە ئێمە بیستبوومان شتێکی دیکەبوو. جاری وابوو کە لەگەڵ بابەگیانیدا دەچوومە ماڵێ مامۆستای مامۆستا لە مێژووی دەدوا و دەیگوت ((مێژوو دەفەرمووێ یەحیای بەرمەکی شەوانە لە بن تەختی نووستنێ سەییدە زوبێدە و هاڕونە رەشیدیدا (رەزای خوایان لێبێ) دەنووست و دەگەڵ کەڕی بەیانیان لەخەوێ راست دەبۆوە و بەدەنگی بانگی خەلیفەی لە خەوێ هەڵدەستاند. شەوێکیان لای بەرەبەیانی، هاڕون ویستی دەگەڵ سەییدەی تێك خزێن، داوای لە سەییدەی کرد ئەو جارەیان ئەو بکەوێتە ((سەرێ))... کە لێبوونەوە هاڕون هەروا لەبنەوەڕا بانگی کرد: ((یەحیا، دەمی بانگیە، هەستە بانگەکەت بڵێ!)) یەحیا لە بن تەختیەوە گوتی: ((من بۆ بانگی بڵێم، با ئەوەی لەسەرمنارەکەیە بانگی بڵێ!)) و قاقای خەلیفە لە دەمی مامۆستاوە بڵند بوو!

جارێکی دیکە مێژوو دەیگوت، دەیگوت مێژوو دەفەرمووێ هەرکاتێ کە باپیرە گەورەی دەچووە خزمەت شا عەبباسی (خودای لێ رازی) پاشای ئیسلامێ، بەرێ و رەسمی پاشایەتیە، ئێسترێك و دە تمەن پوڵی سپی و یەك دەست تاقەی عەبای هەرێ چاکی پێ مەرحەمەت فەرمووە و ئەوە بەردەوام لە باپیرانەوە بەناوی بنەماڵەی ویەوە لە ((مێژووی کۆن))دا نووسراوە...

ئاغای سلێمانیش ئامۆزایەکی پیری هەبوو، رۆژێکیان هەروا بەرێکەوت لەلای کوڕەکەی بووم ئەویش لەوێ بوو، و مێژووی دەگوت. گوتی کە بەڵێ، میوانی ئاغایەکی ((پشدەری)) بووە و ئاغای پشدەریش بەشێوە دەنگێکی وا کە بەلای وییەوە مانای گاڵتەجاڕی و قەشمەری و گەمەپێکردنێی داوە لێی پرسیوە ((ئێوەی بیگزادەکانی ئەولایە چ لە بارەی مێژووی خۆتانەوە دەزانن؟ دەزانن کێن و لەکوێڕا هاتوون؟)) ئامۆزاش بە نۆرەی خۆی زەردەیەکی گاڵتە جاڕیانە و قەشمەری پێکردنەوەی تێگرتۆتەوە و گوتوویە: ((رەنگە جەناب عالی پێی وابێ کە ئێمە کۆنەفرۆشین و لە عەردی هەڵتۆقیوین؟)) ئاغای پشدەری دەڵێ: ((ئەستەغفیروڵڵا! نا، نا. ئێوە نەك هەرکۆنە فرۆش نین، بەڵکە زۆریش بەڕێزن- ئێوە لە رەچەڵەکی بەهمەنی کوڕی ئەسفەندیارین... راست وەك ئەسفەندیاری کە لەدوا رۆژەکانی تەمەنیدا کوێر بوو!

ئێمە تەنانەت ئەوەشمان نەدەزانی کە فەتح عەلی شابووە کە لەراستیدا ناپلیۆنی کردۆتە ناپلیۆن، دەنا ناپلیۆن بۆخۆی هیچ نەبووە... ئەوەشمان بەو دواییانە بیستووەو خوێندۆتەوە، چونکە مێژووەکەی تا ئەو دوا دواییانەش هەر دەپاشخانێدا ماوەتەوە. ئەوە ئێستا دەزانین کە گوایە چەندین شۆڕش روویانداوەو گوایە شتێك هەیە پێیدەڵێن مێژوو... دەنا خۆ بۆ خۆمان نەبوومانە و نەبیستوشمانە: مێژووی ئامۆزای لەلای یەکێك لەو ئاغایانە بوو؛ مێژووی مامۆستا و ئاغایەکەی پشدەرێش لەلای خۆیان بوو... ئێمە بۆ خۆمان چ شتێکمان نییە، لەوەش کە بەو دواییانە کەوتە بازاڕیەوە هیچیان نەدایە مە. ئەوەی لە رابردووشدا دایانینێ و خوێندمان تێینەگەیشتین-یانی سەرە دەرمان لێنەکرد.

دەیانگوت لویسی شازدەهەم بۆیە شۆڕشی لەسەرکرا ئافرەتی زۆر هەبوون، دەگەڵ هێندێشدا کە دەمانبیست فەتح عەلی شا سەد هێندەی وی زیاتریشی هەبوون و چ شۆڕشیشی لەسەر نەکرا؛ دەیانگوت ئیمپراتۆری رووسیا هێندە هێندەی پارە لە بانکەکانی دەرەوەدا هەیە بۆیە رەش و رووتەکەی شۆڕشیان بەسەردا کردووە، لەکاتێکدا کە رەزاشای لادێیی هەژار و نەدار لە مەملەکەتی مەدا دەهێندەی ویشی دەبانکی ئینگلیزاندا هەبوو و چ شۆڕشیشی بەسەردا نەکرا...

بێگومان ((مێژوو))یەك، دە پاشخانێدا شاردرابێتەوەو تۆز و خۆڵی لەسەرنیشتبێ دیارە هیچیش پێشان نادا، بەلاّم کارەساتەکان شتێکی لە بیرچووەوەی دیکەیان فێرە خەڵکی کرد: کە



رەزا شاش عومری نوحی نییە و هەروا زیندوو نابێت و رەوتەنیە- و رۆیشتووشە. بەلاّم بە خەیاڵی هیچ کەسێکدا- یانی زۆر کەس- نەهات کە میللەت رەزاشایان نەبردبێ. پێویستیش نەبوو، چونکە خەڵکی بۆخۆیان دەیانزانی؛ دەیانزانی کە ئەویان لابردووە و میللەتیش دەونێوەیدا هەر ((میللەت))ە، ئەوانەی لاشیان بردووە میللەت نەبوون، و لەبەرچاو و بڕۆی رەشی میللەتیشیان لانەبردووە، هەرچەندە دیبوویان کە رەزاشا بۆ ئەوەی پێشانیدا کە ئەو بۆ خۆی هاتووەو خۆی کردووە بە شا و کەس نەیهێناوە کەوتبووە گیانی میللەت و یەك بەدوای یەکیدا دەکوشتن... هەربۆیەشیان هێنابوو تا بکوژێ...!

بەهەرحاڵ، ئەو بەرهەڵدابییە زۆری نەخایاند- یانی ژیان بۆ خۆی دەرفەتی ئەوەی نەدا: خەڵکی کتوپڕ وەئاگا هاتنەوەو سەریان هەڵێنایەوە و دیتیان، هەی بێ ئاگا، رەزا شاش رۆیشت؛ هەروەك خاوەن موڵکێکی وەك شبلی بووبێت، و لە کەللەی دابێت و کەشکۆڵی دەروێشیەی تاودابێتێ و دەستی وەکێوان دابێت و مشتە رەش و رووتێکی بە تەمای خودای بەرهەڵدا کردبن! باشە، ئەو رەش و رووتە بێنەوایانە چ بکەن؟... سەرەتا و کۆتایی هەر بەدبەختی و چارە رەشی و بەرهەڵدایی، و دواییش دەستەو ئەژنۆ دانیشتن و بیر لە زۆرداری خان و بەگلەرەکان کردنەوەو ئەوسا قسەی سوك و جنێودان، و داس و تەورداس سوین- و گەڕان بەدوای گوناهباردا... گوتیان- یانی بیستمان- کە هەرچی فێڵ و فەتەرە هەمووی لە بن سەری پزیشکیاری زیندانێدا بووە، کە ئامپولی هەوایان بەدەرزی لە زیندانییەکان داوە. موختارێکیشیان گرتووە و چەند رۆژێکانیان هێشتۆتەوە، دواییش زەوی و زارو بەراوێکیان داوەتێ و بڕۆ بۆ خۆت لە دەم جۆیە دانیشەو سەیری رابوردنی تەمەنی خۆت کە و دەست بە دوعاوە زوڕنای خۆت لێدە- و جا وەرە تۆ سەیری گەمە و گاڵتەی رۆژگار کە، کە ئەوانە وەختێکی خەڵکی دەگرن کە سەدر ولئەشراف دادوەری باغشا، و وەزیری دادە!

رەزا شاش کە رۆیی بە بیروبۆچوونی خەڵکی (رەشۆکی) مەحکوم بوو؛ تەواوی چاکەکانیان هەموو بەخراپە بۆ لە قەڵەمدا، و گوتیان ئەوە هەر لە رەچەڵەکدا ستەمکار و تاوانکار و خوانەناس بووە. بەلاّم کەس نەیزانی کە بەڕاستی چی کردووە و چی هەبووە، و ئەوەی کە بووشیەتی لە کوێڕا هێناوە- هەروەکو هەموو ((شۆڕشێك)). لە رووسیاش هێشتا کەس نازانێ کە قەیسەر کەی و لەکوێ کوژرا. هەروەك ئەوەی ئەمە راستیەکەی بێت، چونکە ئەگەر بێت و

دۆسیە و پەروەندە و کاغەزان ئەو دیوەو دیوکەن و بیانخوێننەوەو چاکە و خراپانیان لێك هەلاوێرن و پێکیان بگرن، کە ئەوەی کردووە و ئەوەی نەکردووە، و ئەوەی چاکە، و ئەوەی خراپە، و هێندە هێندەی ئافرەت هەبوون، و ئەوەی کوڕە و ئەوەی کچە، دۆسیە و پەروەندە و پەڕەکاغەز هێندەیان لێدێ نەك هەر گوێدرێژێك وشترێك نایانتوانێ! ئەوە بەکەڵکی چ نایەت و ناگاتە چ جێیان. هەرکاتێکیش لەو وردە کارانەت کۆڵیەوە، ئەوا ئیشەکە گەند دەبێ و خەڵکی قسان دەکەن... خۆ ئەگەر گوتت بۆخۆی و خاو و خێزان و بنەماڵەکەی هێندە هێندە ئافرەتە و ژنەیان هەبووە، ئەوە لەسەر ئەو ژن و ئافرەتانە دەبێتە کێشمەکێش و هەرکەسە بەشی خۆی دەوێ و دوایەش دەبنەمایەی دەردەسەری. سەرەڕای ئەوەش رەنگە پیاوەی بەستەزمانیش هێندە خراپ نەبووبێ، لەوانەیە خزمەتێکی بەتۆیا بە یەکێکی دی هەرکرد بێت و سەردەمانێك خاوەن چاکەیەك (وەلی نیعمەت) بوو بێت، و بەخششێکی دابووبێت، و تۆ پەیمانێکت دەگەڵدا دەنێوانێدا بووبێ، کەواتە بەم جۆرە پەروەندەو دۆسیە چ خێرێکیان هەیە؟ تازە ئەو ماڵ و سامانەی بدەیەوە کێ؟ میراتگر یا کوژراون یا ون کراون، و خوا دەزانێ دە چ خەرەندێکیدان. و زۆر شتی دیکەش... وەك بڵێی خۆ دنیا هەر ئەوڕۆ نییە، و بەیانیش هەیە، کە ئیدیکە بێن و رێز و ئابڕووت ببەن...

رەزاشا رۆیبوو و مێژوو پێشانیدا بوو- ئەڵبەتە بە ئیدیکەی پێشاندابوو- کە هیچ کەسێك، هەرچەندە گەورەش بێت لە نەتەوەو میللەتی خۆی گەورەتر نییە، و هەرکەسێکیش خۆی لە نەتەوەو میللەتی خۆی بە گەورەتر بزانێ دەچێتە ئەو جێیەی کە ئەو جۆرە کەسانەی دەچنێ. ئەو رۆیشت و میللەت مایەوە. بەلاّم فایدەی چی، مێژوو هەزاران هەزارجاری ئەمە پێشاندا و پێشاندایەوە خەڵك هەر نەیدیت، و ئەوەندەی کە دیتیشیان تێینەگەیشتن؛ ئەوەندە کەسە کەمانەی کە تێشی گەیشتن- یا تازە تێیەگەیشتبن- هیچیان بەکەس نەگوتبوو و یان نەیانتوانیبوو بیلێن- دوایەش کە هاتنە سەر ئارەزووی گوتنێی یا بۆ لە ناوی بردن و نەیهێشتن. راستیەکەی نازانم، لەوانەشە خەڵکەکە هەروا نەدیتە و نەبیستە لە هەستی ناسکی خۆیانەوە بۆنێکیان کردبێ و شتێکیان زانیبێ. ((گەورەکان))ی مێژوو کە بەناوی سەردار و سوڵتان و باوکی میللەتەوە... دەهاتن ئەوان چاکیان دەزانی. بەخۆڕایی نەبوو کە کاتێکی دەهاتن بەناوی خزمەتکاری میللەت و رزگارکەری خەڵك و ئەو جۆرە شتانەوە دەهاتن، و سوێند و قورئان و ئایەتیان دەخواردن کە هەر تەنیا بۆ رەزای خودای و لەبەرخاتری خەڵکی خودا و رزگاری



نیشتمان هاتوون و خۆیان دەو ئالۆز و بلۆزیەی هاویشتووە... بەلاّم هەر کە دەگەیشتنە دەسەلاّت و خۆیان لەسەرپێ دەگرت و سەقامگیر دەبوون ئەو سوێندانەیان هەموو لەبیر دەچۆوە و دڵنیا دەبوون کە کاروباری میللەت بەبێ ئەوانە بەڕێوە ناچێ و هەر ئەوانە بڕۆن و نەمێنن و لاچن ئیدی ئەوە هەموو شتێك دەڕوا و نامێنێ... و راستیەکەشی مەبەستیان لە هەموو شتێك ((هەموو شتێك)) بوو- و دەوبارەشدا خاك بە سەری میللەت! بەلاّم سەیرەکە ئەوەبوو کە کاروباری میللەت چۆن ئاوا بەبێ ئەو دەگوزەرا... و لە راستیدا کەسێك بە خەیاڵیشیدا نەدەهات کە خانێك هاتووە و یەك رۆیوە. پێم وابێ ئا ئەمەیە نەخشە و پلانی گۆڕان و گۆڕانکاری: دیسانەوەش هەر میللەت بوو کە رەزا شای وەك شای شەترەنجێ کش مەلیك پێکرد و شێت و شبر لە گۆڕەپانێی وەدەرنا، و بارودۆخێکی دیکەی هێنایە گۆڕێ... و دوایە کوڕەکەشی هەرشێت و وەیلان کرد... هەمیشە هەروایە، تا کۆتایی و ئەولاتریش، هەروایە... مەگەر ئەو رابەرە لە داوێن و کۆش و بەرو باوەشی میللەتەوە کەوتبێتەوەو هەڵبژاردەی ((مێژوو))بێ، کە بێگومان بەگوێرەی پاڵپشتی ئەم توانایی و چۆنیەتیەیەوە هێزی ئەوەی تێدایە کە فریوی دەمە لاسکە و کلکەسوتە و پانکردنەوەی دەوروبەرەکەی نەخوا...

ئێستا ئەوە سێ ساڵە چاومان بەچاوی ئەفسەر و سەرباز و پاسەوانان نەکەوتۆتەوە. بەقسەی لادێییەکان ((دەوڵەت؟ -ئەها- پف!)) لەپی دەستی دێنایە پێشێ و وەك مشتێك وردە توتنی لەسەربێ فووی لێدەکات و ((دەوڵەت)) با دەیبا و تا تارانێ- دەڕوا. ئەگەر یەکێك لە جێیەکیڕا دەهات- کە زۆر بەدەگمەن رێك دەکەوت- و باسی پەخشداری و پارێزگاو سەربازخانە و ئەو جۆرە شتانەی کردبایە هەموو بەلاقرتێو گاڵتە پێکردنەوە سەیرمان دەکرد، هەروەك باسی پاشماوەی هەرە رەسەنەکانی داروین بکات، بێ ئەوەی کە وەك ئەوروپاییان بڵێ ((باشە، خۆ کە هەر لە رەچەڵەکی مەیمونێین، دەبا یەکتریمان خۆشبوێ)). ((هەهە- دەوڵەت! پوف-ف!)) ئەو پفەیان پفی سوکایەتیە بوو، نەك وێرانی و تێکدان؛ لەولاشەوە دەنگ و سەدایەك لە دوورەوەڕا بەرگوێ دەکەوت: بریندار و کوژراو و دیلیان دەهێنانەوە، و دیاربوو ((دەوڵەت)) هەر ماوەو گیان بەدەستەوە نادا. جارێکیشیان چەند ((زرییپۆش))ێك لە ((دەوڵەت))ێ گرت. نازانم چۆن؛ دەیانگوت لاڕێ ببوون و کەوتبوونە ناو کێڵگەیەکیەوە! لەسەرزرێپۆشان ناخۆشی کەوتە نێوان مەلا رەحیم و مەلا مەحموود و ئەو مەلایەی دی، ئەو سێ مەلایانەی کە هەریەکەیان نماینەدەی خانێکی بوو. زۆری نەمابوو کار بگاتە کوشت و کوشتارێ.

مەلا ڕەحیم زرێپۆشەکەی خۆی ناردەوە؛ وەلاّمیدا کە ئێوە زرێپۆشە نوێیەکانتان بۆ خۆتان گلداونەوە و کۆنەکەتان بۆ من ناردووە، من زرێپۆشی کۆنەم ناوێ. (کەس نەیدەزانی مەلا ڕەحیم چۆنا و چۆنی زرێپۆشی کۆنە و نوێ دەست نیشان دەکرد و یان زرێپۆشی هەربۆچی بوو!) کورتیەکەی، خودا ڕەحمی کرد. مەلا مەحموود زرێپۆشەکەی خۆی بۆ وی نارد و کۆنەکەی بۆ خۆی هێشتەوە.

ئێستا زرێپۆشەکە، بەپاڵ دیواریەوە، بە تەنیشت ئاخوڕێوە، لە بن پەنجەرەی باڵەخانێیە، و سامێکی داوەتە ماڵێ. منداڵی گەڕەکێی پێ خەنی بوون، و بەسەرو پۆتەلاّکی هەڵدەگەڕێن، و ((مانۆڕ))ان دەکەن، و هەر مەلاژنە کە بەردەوام داد و بڕۆیەتی لە دەست منداڵاّن: ((وای- خودابیبڕێ! هەراسانیان لێ هەڵگرتووین. گوو بەگۆڕی بابی زرێپۆش و خاوەن زرێپۆشی!)).

دەمە و ئێواران بەرە بەری خۆراوایە لەبەر پەنجەرەی دادەنیشێ و بە پۆزێکەوە سەیری دەکات وەك بڵێی ئەوە ناپلیۆنەو لە ((ئیستەرلیز))ێیە. ئەو کاتانەی کە لە ماڵێ دەستنوێژ هەڵدەگرێ بەردەوام هەر لەسەر لێوی لە گەنەکەیڕا، ئخ و تفێکی دەگرێتە قوللغەکەی- وەك بڵێی بەنیازی شەیتان ڕەجم کردنێوە. منداڵ و تاڵیش هەموو ڕۆژێ سێ جاران، بەیانی و نیوەڕۆ و ئێواران، تڵپەچای لە پەنجەرێوە لەسەر قوللغەکەی بەتاڵ دەکەن و دەیڕێژن. جاری وایە کە تەنافی جلکان بەش ناکات بۆ جل هەڵخستنێ لولەی تۆپەکەی دەکەنە تەناف- و زرێپۆشی تاین هەروا لەسەرخۆ و ئارامە، و بێدەنگ و بەنگ ئەو هەموو سوکایەتیەی قبول دەکا...

دوێنێ شەوێ دزێك لولەی تۆپەکەی دەسوڕێنێ و بەسەر لولەکەیدا بە پەنجەرەی هەڵدەگەڕێ و چەند پارچە ڕایەخان دەبا... دزەش ڕۆیی، بەلاّم ماینەوە ئێمە و زرێپۆش و مەلا ڕەحیم، ئەو ئخ و تفان داوێ، و ئێمە باز بازێن، و دەشزانین کە خراپ بوو... زۆریش خراپ بوو.

* * *



**(١٩)**

بەڵێ، ڕەزا شاش ڕۆیشت. بێجگە لەو زۆری دیش ڕۆیشتن. بەلاّم وادیارە سەرگوزوشتەی وی لە هەمووان نالەبارتر بوو. ئەمیر لەشکریش هەر ڕۆیی- بەلاّم ئەو بە وەرە و بڕۆیەکی زیاترەوە چۆوە ماڵەخۆی لە تارانێ... ئێستا ئەمیر خانەنشینە، یانی گەورەترین تراژیدیایەکی مێژوو: تۆ کە بە درێژایی تەمەنی خۆت بە جلوبەرگێکەوە ڕاهاتبی و کتوپڕ هەڵگەڕێیەوەو ئەو جلوبەرگانە داکەنی و جلوبەرگێکی دیکە لەبەرکەی. ڕاست وەك ئەوەیە کە لە پڕ بێی و کورتانی لە پشتی کەرێ کەیەوەو زینی کەی. دیارە لەش لێی خۆش نایە و قبوڵی ناکا. هەربۆیەشە هەرکاتێ کە زینەکە داوێیە سەرپشتی کەرەی و لێی سوار دەبی بەستەزمانە نازانێ چ بکا، و بەردەوام، لاونیو دەڕوا و خۆ دێرەو دەوێ دەکوتێ. بەڵێ کە جلوبەرگ داکەنی، و لەجیاتی بلوزی چین چینی ملدار، بێی بۆینباغی ببەستی، ئەویش دەگەڵ ئەویەخە ڕەقە قەد نەشکاوەی کراسیدا؛ لەجیاتی پشت بەستنێ کە هەمیشە دەیبەستی بێی و هیچ نەبەستی، وەك ئەوەیە بەبێ پانتۆڵ هاتبیە دەرێ؛ یا لەجیاتی کلاّوێ کە قالّبی سەرەو سەرت فیت دەخۆوە دەگرێ بێی پارچە لبادێکی لەسەری خۆت نێی یا نەنێی- ئەوە جلوبەرگی خورمایی و نیشان و میداڵ و ئەستێرە و هاتوهوتیش هەر هیچ؛ و تازە بۆ خۆت سێ مراسیلان بنێریە سەربازخانەی و کەچی ئێستا بێی و ڕوو لە ئەمیری تازە بە سەرداکەوتوو بنێی تا بە دزیەوە مراسیلێکت پێ مەرحەمەت بفەرمووێ! کاتێکیش کە لە ماڵێ وەدەردەکەوی نە تەپڵ و شەیپورێك، نە گوزارشێك و نە پاسەوانێکی دەرێ... و منداڵی کۆلاّنێش بە یاریی تۆپێنێ هەراسانت لێ هەڵبگرن و ئاسوودەییت پێنەهێڵن، و بەتایبەتی تۆپەکەش والێدەن کە ڕاست بێت و بە پەنجەرەی ژووری نووستنێت کەوێ- سەگبابانە!... ئەو هەموو پارە لە خانووە کۆنێکی مێژووییدا خەرج دەکەن، ئەو چی لەوانە کەمترە؟ ئێستا ئەگەر شتێکیشی لێ خەرج ناکەن با هەر نەبێ بەلانی کەمەوە ئاوێتەییەکەی (تەرکیب) تێك نەدەن- هەرگیز دەست لە تەرکیبەی خانووی مێژوویی نادرێ. هەرنەبێ لێیگەڕێن با ئەویش جلوبەرگە نیزامییەکانی

(سەربازییەکانی) دەبەرکا، نیشانەی پلەوپایەکانی ببەستێ، نیشان و میدالەکانی بەخۆوە هەڵواسێ...

ئێستا ئەمیر خانەنشینە- ئەویش ئەو، بەو هەمموو گەورەییەیەوە... بەڕاستی پیاوێکی گەورە بوو؟- بەڵێ، گەورە بوو... چ جۆرە گەورەیەك؟- لە جۆری خۆی. بەڵام ئەو پێ نەدەحەسا؛ گەورەییە خۆی بەجۆرێکی دی دەدیت، و سەیری دەکرد پیاوێکی سادە و ساکار دەگەڵ پیاوێکی گەورەدا نێوانیان هەر تەنیا شەقاوێکە، هێندە بەسە ئەو شەقاوەی باوێت و گەورە ببێ؛ بەڵام هەر کە گەورە دەبوو ئیدی کەوتنەکەی کاری یەك شەقاو و دە شەقاوان نەبوو- جاری وابوو کەوتن هەر لە گۆڕێشدا نەبوو، و گەورەیی بە دوای گەورەییدا دەهات. بەڵام گەورەییە وی... هەر ئەوەندەی پلەو پایە و شوێنەکەی چوو، هەمموو شتێك دەگەڵ چوونێ ویدا نەما... پیاو بڵێ چی!

ئێستا ئەمیر خانەنشینە- هەمموو رۆژێ دادەنیشێ، راوێچکان دەکا... دەگەڵ خەڵکیدا دەدوێ... دەربارەی چی؟- بێگومان دەربارەی خۆی، کە بەڕێیەشدا دەڕوا بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە، ئەو دەمانەی کە داشدەنیشێ دەگەڵ خۆیدا دادەنیشێ، هەر خۆی و خۆیەتی- ناوەندێکە کە هەر بۆ خۆی بەدەوریدا دەسوڕێتەوە و گلە و گازاندەشی لە رۆژگار ئەوەیە کە رۆژگار بۆ بە دەوری ویدا ناسوڕێتەوە و بۆ ناوەند و چەقێکی دیکەی هەیە.

راستیش دەکا چونکە بەقسەی هەندێ زانایان دنیا لەخۆ وەدەرخستنێ مرۆڤی زیاتر چیدیکەیە؟ هەمووی هەر ((منم))ەکەیە- لە مندالیەوە؛ منم- لەهەرزەییەدا؛ منم- لە گەورەیی و پێگەیشتنێدا... دیسان هەر منمەکەیە... دوایی لە هەمموو قۆناغە جیاجیاکانی ژیاندا، و خەڵکی دی- کۆمەڵگا- هەمموو لە هەمموو لەمندا و من لەواندا... بەڵام ئەو —ئەمیر- وابیرناکاتەوە؛ ئەگەر وای بیرکردبایەوە بۆی دەردەکەوت کە هەرگیز نامرێ و دنیایەك کە شوێنی خۆ وەدەرخستن و خۆبادانێ وییە هەردەما و هەر بەو هەوایەوە درێژەی بە ژیانی خۆی دەدا؛ دەیزانی کە هەر لە سەرەتای دەسپێکی ئافەریدەی ئەم گەردوونەوە تا ئێستا شتێك لەسەر ئەم گۆی زەوییە زیاد و کەم نەبووە. مەگەر هەواڵی بەربوونەوەی مشتێك گڵ و خۆڵی بێ نرخی ئاسمانێ... ئەوە، هەر ئەوە کە دەگەڵ کەسانی دیدا بووە، و ماوەتەوەو هەر دەشمێنێتەوە- لە خۆیدا، لە کەسانی دیدا، خەڵکی دی دەواندا، و هەمووش دەجیهاندا. بەڵێ، هەستان و دانیشتن و گەڕانی بەتەنێ دەگەڵ خۆیدایەتی، بەڵام لەم هەستان و دانیشتن و



گەڕانانەشیدا هەمیشە هەرخۆی نییە: زۆرجاران توندوتیژیە دەگەڵ خۆیدا دەنوێنێ: پیاو، ئەو هەمموو خزمەتەی کردت، کێ قەدری خزمەتەکەی زانیت؟ ئەو هەمموو زەحمەتەی کێشات کێ ئافەرینێکی کردی؟ تەنانەت جارێك لە جاران ئەو سپڵە و بێ ئەمەکانە لە وەزارەتی جەنگ یا لە ستادی سوپاوە گوتیان با تەلەفۆنێکی بۆ بکەین و یا دەربارەی کاروباری ناوچەکە راوێژێکت پێ بکەین؟... ئەو هەمموو تەلەزگەو مەترسیە... ئەو هەمموو ناراحەتیە... هەیهو هەیهو، ئەمەش هەمووی لەپێناوی نیشتماندا...

ئێستا ئەمیر خانەنشینە، بەڵام کەموزۆر ئەو نفووزەی جارانی هەرهەیە: برازا و خوشکەزایەکانی وردە وردە گەیشتوونێ. هێشتا هەمموو لە هەمموو خانەنشین نەکراون: ژمارەیەکی هاوقەتارەکانی خۆی هێشتا هەرماون و لەسەرکارن؛ ئەو لاوانەش کە کار بەدەستن و لەسەرکارن خۆیان هەر بەبچووك دادەنێن و لە جەژنە و سەردانەکانیاندا دێنە دەست ماچکردنێی. رۆژگارە و هەمموو شتێکی لێدەوەشێتەوە، لەوانەیە رۆژێك لە رۆژان کارێکی بکەوێتەوە دەستی، و کاریان تێیکەوێتەوە، بۆ پێش بارانێ کە پەنکیان گوتووە؛ رێزگرتنیان لێی ئەرکی سەرشانە. بۆیە واچاکە ئەو پەیوەندیە هەرگیز نەپسێ و هەربمێنێ... هەرچەندە دە جلوبەرگی سڤیلیدا (مەدەنی) نموودێکی وای نییە، بەڵام پیر و پەککەوتەو کە نەفت و زوڕهان نەبووە، و هیچ ناراحەتییەکی دەلەشیدا نییە، لەوەی زیاتر کە ئێستا بۆ بەڕێوەبردنی ماڵێ دەبێ دەست بەگیرفانێدا بکات، و هەمموو سەرەهەفتان ئیسماعیل خان داوای پارەی مەسرەفێ دەکا- و ئەوەش بەڕاستی لە توانا بەدەرە کە پیاو دوای ئەو هەمموو تەمەن خزمەتە راست و رەوانەی بە مەملەکەت، ئێستا بێ و لە گیرفانی خۆی پارەی مەسرەفێ بدا! بەڵام ئەوەی دەزانێ- و دەزانێ لەوەتەی دنیا دنیایە هەر ئاوا دەنی و هیچ و پووچ بووە و لەوەش زیاتر لە دنیای دەنی چاوەڕێ ناکرێ...و ئەوەش بۆ خۆی لە خۆیدا دڵدانەوەو سێبوریەکە تا ئەو دەمەی وەك لە شوێنە تایبەتیەکاندا بلاوە گوایە ئەنجوومەنێکی پیران پێك دەهێنرێت، تەماشای ئەو جۆرە ئاریشانە دەکات و ئەو هەمموو خزمەت و فیداکاریانە نابێ هەروا بێ پاداش بمێننەوە.

ئێستا چ کارێکی تایبەتی نییە، لە ئامۆژگاری کردنێ ئەم و ئەوان بەولاوە و رێکخستنی دانیشتن و کۆڕ و کۆبوونەوەی دۆست و ئاشنایان بەولاوە و بانگهێشتنێ هەژار و نەداران- ئەویش هەرتەنیا بۆ شەربەت و چا خواردنەوێ. — ئێستا یەکێکی دیکەی بنەماڵە چۆتە

جێگاکەی و جێیەکەی گرتۆتەوە- ئەویش لە شوێنێکی دی، و بە بەرپرسیاریەکی دیەوە: بنەماڵە، برایەکەیان ناردۆتە پەرلەمان تا لەوێ یاسا دانێت و یاسا بنووسێتەوە، تا حەزرەتی ئەجەل و مەشەدی ئەکبەراغا و باجی گوڵبەهار لەژێر ئالآی ئەو یاسایەدا بە ئاسوودەییەوە بژین- ئینشاڵڵا!

سەروەختێکی تەواوی کەوتۆتە نێوانێ؛ منداڵانی دوێنێ دە داڵانە پیس و پۆخڵ و چۆڵ و هۆڵەکان هاتوونە دەرێ و لە جموجۆڵ و بزۆزیە منداڵییە کەوتوون و بەرەو سەر سەرای پیس و پۆخڵتر و کەم جووڵەتری لاوەتییەوە هەنگاو دەنێن؛ لاوەکانیش ئەو سەر سەرایانەیان بڕیوە و دەپێچ و پەنای کێوی هەژاری و بێ نازیە زیاتری بەرپرسییە ماڵ و ژنێوە، سەرگەردان بوون؛ قەیرەکانیش هەموو پیر و کەنەفت و زورهان بوون و خۆیان بۆ سەفەری مەرگ و کۆتایی و ئەو دنیای دی ئامادە کردووە؛ لەپاڵ دیوار و دەناو دوکان و نێوماڵەکاندا... پاڵیان داوەتەوەو لە چاوەڕوانییە گەیشتنێ کاروانیدا وەنەوزان دەدەن.

بەڵێ، زەمانە رابردووە و کۆڵێکی لە غەم و ناراحەتییەکان لە دووخۆی بەجێهێشتووە و هێندێکیشی دەگەڵە خۆیدا بردووە و دەنێو ساتەوەختەکانیدا دابەش کردووە- و بەو شێوەیە باری گرانی ئەو غەم و ناراحەتیانەی مەیلە و سوکتر کردووە، بۆیە کاتێ ئاوڕ بۆ دواوە دەدەینەوە گۆڕستانی ساتەوەختە مات و خامۆش و گریان و پرسە و شیوەنەکان دەبینینەوە. هەر دەوکاتیشدا بەشێك لەوانە بەرابردوو دەسپێرینەوەو بەشێکی دەگەڵ خۆماندا بۆ ئایندە دەبەین، چونکە بۆ خۆشمان لە رابردوو دادەبڕێین. بەهەرحاڵ هێندێکی هەر بەدەم رێوە بە عەردی وەردەکەین و لێدەدەین دەرۆین. دیسان هەردەو دەمەیدا کە هەستی ئێش و ئازار و ناراحەتییە دەکەینەوە زەمانە دووبارە تێدەپەڕێتەوە و بتەوێ و نەتەوێ بەشێکی دیکەش لەو غەم و ناراحەتیانەی دی بەجێ دەهێڵینەوەو خلتەنیشتووە ئەستەمترەکە دەگەڵ خوی دەبا...

برینە کۆنەکانی ناخی دەروون هەموو قەتماغەیان گرتووە و گۆشتە زوونەیان هێناوەتەوە، و هەرچەندە جێ برینەکان جاری وایە- دەدڵی باجی گوڵبەهار و ئەوانەی وەك وی- وەبن دەدەنەوە بەڵام بە هەرحاڵ کۆن بوون: ئیدی تێك هەڵقرژان و وێك کەوتنی بیرو لێکدانەوەکان دەگەڵ هاتنەوە بەرچاوی وێنەکانی حەزرەتی ئەجەلدا، پڕیشکە ئاگر و بریسکان ناوێن و گێژاو و هەڵچوونی ناخی دەروون سەرهەڵنادەن و وەجۆش و کوڵ نایەنەوە- مردووەکان مردوون، و



چوونە سەرای هەق و ئێمە لەسەرای ناهەقدا ماوینەوە. باجی گوڵبەهار چۆن بوو هەروایە- یانی بەلانی کەمەوە هەروایە: گۆڕەوییان پینەدەکا، تیکودورمانان دەکا، سەوزەجاتی وشك دەکاتەوە، گوڵزاری گۆڕی توولە نەمامەکانی- یا گۆڕی لاوەتیە خۆی؟ ئاودەدا... ئێستا تاڵەمووی سپی دەناو قژە رەشەکەیدا بەزۆری پەیدابووە. دەموچاوی وەك دەفتەری نووسینەوەی منداڵان هەمووی خەت خەتۆکە و چرچ و لۆچاوییە. زۆر لەسەرخۆ برنجی دەبژێرێ، بە ئەسپایی... هەناسان هەڵدەکێشێ... و جاری وایە بەتایبەتی کە منداڵەکان دیار نەبن، ئاوازی ئاشنا کۆك دەکاتەوە:

موسوڵمانان سێ دەرد هاتووە بەیەکجار... بە لە دەستچوونێ عالیە و محەممەد عەلی دوو بەشی لاوەتیەی چووە. ئاخر دایك، منداڵەکەی بەچاوی هاتنەوەی بەشێکی لاوەتیە خۆیەوە سەیر دەکا: دەگەڵ هەر منداڵبوونەکێیدا دەبێتەوە منداڵ و مەشقی منداڵییە خۆی دەکاتەوە؛ دەگەڵ هەر تریقانەوێکی منداڵەکەیدا ئەویش سەرلەنوێ تریقانەوەی سەردەمی منداڵییەی تاقی دەکاتەوە؛ دەگەڵ هەر قسێکی کە منداڵەکەی پێ دەدوێنی لە نوێ فێرە قسان دەبێتەوەو دەگەڵ هەر سەرنج و تەماشاکردنێکی شادانەی منداڵەکەیدا یادی شادی و خۆشی رۆژانی سەردەمی منداڵییەی، دێتەوە ناو چاو و سەرلێوو دەمیەوە- دەگەڵ هەر یەکێکیاندا گەورە دەبێ: تا ئەو بەشە لاوەتیەی کە بە یاری و چوونە قوتابخانەی ئەو منداڵە و یا هاتنەوەی لە قوتابخانە و یاری کردنی ئەو هەستی تێپەڕبوونی تەمەن دەکاتەوە: چونکە لە لاوەتیە دوور کەوتۆتەوە. تا منداڵەکە لە قوتابخانە دەگەڕێتەوە- ماندوو و شەلاڵی ئارەقە و خۆڵاوی- ئەو بە پیریەوە دەچێت؛ لەبەردەمی هەڵدەتووتەکێ، جلەکانی دەتەکێنێ، یەك دوو و شانیش بە سەرزەنشتەوە دەڵێ- بەڵام هەمدیس ماچێکی لە روومەتە ئارەقاوییەکەی دەکاتەوەو دووبارە دەبێتەوە هاوبەشی منداڵییەی و سەرنجی منداڵەکەی کە بەدووچاوی نیگەرانەوە لێرەو لەوێ لە خواردنێ دەگێڕێ دەقۆزێتەوە، هەروەك ئەو بە خودی خۆی ئەو نیگەرانیەی دەدڵیدا بووبێت و تازەی وەبیر هاتبێتەوە! بەڵێ ئەوان هەر بەلاوەتی دەگەڵ مردنێدا پێکەوە چەسپین و ئەو دووبەشەی لاوەتیە وییان دەگەڵەخۆ بردو لاشە و پەیکەرێکی بەتاڵیان بەجێهێشت...

بەڵام ئایا بەڕاستی مردوون؟ ئەوانیش محەممەد عەلی و عالیە، کە تامردن دەدڵی باجی گوڵبەهارێدا هەروا خەڵفیان دەکرد و نەمام بوون و دەگەڵ یاد و بیرەوەرییەکانی ئەکبەر

ئاغاشدا ئاوێته ببوون و هەموو گیانیان بەڕەنگی خۆیـان ڕەنـگ کردبـوو و دڵیـان گوشـیبوو- چەند بێ بەزەییانە- و ناڵەیان لێ هەستایەوە- چەند جوان... مردن؟ یـەکێك گوتوویـەتی کـە دەکرێ ژیان بگۆڕدرێ، بەڵام مردن هەرگیز. بەڵام ئـەم قـسەیە ڕاسـت نییـە. لـە کـوێ مـردن هەمیشە یەکسانە؟ مەرگ یانی مردن و مردنیش چەند جۆر و بەشی هەیە: تـۆ دەتـوانی وەکـو مردن بمری، دەشتوانی بەزیندووەتیە چاوان بژیەیت و بشمریت، دەشتوانی بمری بـۆ ئـەوەی هـەر زیندوو بیـت و نـەمربی و لەبـەرخاتری ئـەو خەتـەرەی کـە کردووتـە و ئـەم ((مـن))ەی کـە خستووتەتە خەتەر و مەترسییەوە دەتوانی هەزاران ((من))ی دیکە لە جیاتی خـۆت لـە بـیر و مێشك و خەیاڵ و دەروونی خەڵکیدا بەجێ بێڵی.

شریخەی ئەو سێ گوللانە ناوی **محەممەد عـەلی**یان دەمێـژووی نەنووسـراوەو خـەواڵووی گەڕەکێـدا نووسی. ئێستا هەموو دەیناسن: لە پڕ لە گومناویەرا هاتە نێو ناوانـەوەو ناوبـانگی دەرکـرد- ناوبانگێکی گەورە، کە دەیهێنا بیری لێ بکرێتەوە... هەروا کتوپڕ هـەموو هـەرخۆیان بـەناوی وییەوە هەڵدەدایەوە. لە چاکەی ئەو کارەوە عالیەش هەر ناوی دەرکرد... **محەممەد عەلی** ئێـستا هەقی شایستەی خۆی وەرگرتەوە... بەڵێ، ئەو جووتە لاوەی باجی گوڵبەهار ڕشتەی تەمـەنیان زۆر ئەستەمانە پسێندرا هەرچەندە زۆر نەژیان و لە ژیان دابـڕان، بـەڵام کەوتنـەوە ناوجیهـانی ئەفـسانەکانی گـەڕەکێوە و زۆریـان خایانـد. ئێـستاش خـەڵکی فاتیحایـان لەسـەر گۆڕەکـان دەخوێنن، مەزارەکەیان ناولێناون مەزاری ((خوشك و برایان.- چوویە کـوێ؟)) — ((هـەتا لای خوشك و برایان چووم))... ((بابـچین یـەك دوو هـەنگاو ڕاوێـچکان بـەلای خوشـك و برایانـدا بکەین!)) لە **محەممەد عەلی** و عالیەیڕا بوونە خوشك و برایان، لە دابڕانێوەڕا پێك گەیشتنەوە، و بوونە نوختە نیشانێك هەموو خەڵکیان بەلای خۆیاندا ڕادەکێشا. ئەوەش هـەرخۆی لـە خۆیـدا هەنگاوێکە بەرەو پێش. دەبوایە هەرواش بێ؛ بە دەربڕینێکی دی ئەو کەسەی سـەری لـەپێناو ڕاستیەکدا داناوە وەك کەسانی دی هـەر پێـی گەیـشتووە: یـەك شـەهیدی سـتەم بـووەو یـەك شەهیدی زمانی دەوروبەر، یانی ڕاستییەکەی هەر شەهیدی ستەم.

بەڵام ئایا بەڕاستی سۆزانی و قاچاغچی و **محەممەد عەلی** و ئەوانەی وەك وان شەهید بوون؟ باشە خۆ ئەوان هیچ کامێکیان ((ڕزگارکەر)) نەبووینە. **محەمـەد عەلیـ**ەك ئەگـەر ((ڕزگارکـەر)) یـا خاوەن پەیامێك بایە بەزەییەکی بە سۆزانییەکەیدا هەردادەهاتەوە. سۆزانییەکە خوشـکی بـوو.



ئەوی خۆشدەویست و دەشیزانی هەر لەبەر وی کەوتە دەو زەلکاوەیەوە، و نەیدەکوشـت. دیـارە لەبەر هێندێی کوشتووە کە خۆشیویستووە. ئاخر هەر کاتێ کە خۆشەویستی لە ئەندازەی خـۆی تێپەڕاند سەرەنجامەکەی بە نەمان کۆتایی دێ. تەنانەت بە نەمانی خۆشەویست. چونکە گوایـە بۆ زۆر خۆشویستنێ کوشتنیش پێویستە. دەکوژی بۆ ئەوەی خۆشەویستەکەت هەر بۆ خۆت بێ و تەنیا هەرتۆی خۆشبوێ و بە تەنیا خۆت خۆت بەهرەمەندی ئەو خۆشەویستییە بیـت. بـەڵام خۆ سۆزانییەکە هـەر ئـەوی خۆشدەویـست. هـەردووکیان ئـەوەیان دەزانـی. ئـەو بـۆ خۆشـی لەسەرەتاوە گوتی کە دەیەوێ لەو زەلکاوەی ڕزگارکا. پێش ئەو کارەش کە بە کوشتنێ کۆتایی هات چوو بوو و چەند هەنگاوێکی بۆ ڕزگارکردنێ باوێ. ئەگەر ئەو هەر بڕیـاری بـە کوشـتنێی بایە هەر لەسەرەتای کارەکەوە ئەوەی دەکرد. بەدڵنیاییەوە بیر و خەیاڵی کوشتنێی دەکەللەیـدا نەبووە- کوشتن کارێکی یەکجار زۆر دزێوە. بەڵام دەبێ بگوترێ کە **محەممەد عـەلی** ئامـانجێکی بڕیار دابوو کە ئەو ئامانجە لە بوونی سۆزانییەکەدا خۆی حەشاردابوو، و سـۆزانی بۆیـە کـوژرا چونکە ئەو ستەمەی بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو، و چونکە بێ مەبەست ئەو ستەمەی بەلای خۆیدا هێنابوو بە ناچاری هەر بووە قوربانیی ئـەو سـتەمەش، و بەناچـاری بـووە شـەهیدێکی سـتەم لێکراو و زۆر کەساسانە خۆشەویستە ئەویندارەکەشی دەگەڵە خۆیدا سوتاند و بـەم جـۆرە کـارە دزێوەکەی ڕەنگ و ڕووایەك و ڕوخسارێکی دیکەی بەخۆوە گرت، و ئەمـە بـووە تـوخمی هـەرە گەورەی ئەو بەسەرهاتە تراژیدیە: ئەو زانین و نەزانینە... نـا، بکـوژ نـەبوو، ئـەو نەیدەویـست خوشکەکەی ببێتە گاڵتەجاڕی گەندەڵی و پیسی دامودەزگای بێ ئابڕوویی؛ دەستێك بوو ئـەوی لەو گێژەنە هێنایە دەرێ و پاکی کردەوە...

((ئەدی، ئەوەش دەڕوا... بابزانین خودا چ دەکا... ئەگەر خـودا حـەزکا!)) تاکـەی ڕاوەسـتێ- ئەویش لاو- تا ئەوەی ئەو دەیەوێ خوا بیەوێ و دەبێ تاکەی چاوەڕوانی ئەم (ئەگەر)ە بێ پـەنا بەخوا تا لەمێشکی خودایدا دەبێ بە پرسیار و دەیهێنێتە سەرباری بڕیار؟

دلاٚزاری و بۆگەنبوون تابلێی ترسناکە. دەبێ خۆ دە هەر ئاو و ئـاگرێکی بـاوێی و نـەهێڵی بـە بۆگەنیوی بڕۆی. خۆزگە بەو کەسانەی وابیر دەکەنەوە. ئیدی سـوکایەتی و بەردانـەوەی سـەری شـەرمەزاری و چەوسـانەوە تـا خـوا حـەزدەکا ترسـناکە، و ئـەوەی دەچەوسـێتەوە بێگومـان

دەستخۆشی سوکایەتیەیە. جا بۆ ئەوەی سوك نەبێ دەبێ نەچەوسێتەوە، و سوکایەتیە قبوڵ نەکا...

رەنگە بە پێچەوانەی ئەوەشەوە بێ کە دەڵێن پارێزگاریە کردنێ رێزی ژیان ژیان نییە. راستییەکەی هەرگیز نابێ پارێزگاریە ژیانێ بکەیت جا چ جای رێزگرتنەکەی. کار دەگاتە جێیەکی کە هەر نابێ بژیەیت- ژیان بە ملکەچییەوە قەت ناچتە سەرێ! چونکە ئەو جۆرە ژیانە، ژیان نییە: گومانێکی دزێوی ژیانە، کە ناویان لێناوە رامبوون و کەوی بوون و دەگەڵ هەڵکردن. زۆرجاری وایە کە دەبێ ژیانی خەیاڵی بە قوربانی ژیانی راستەقینەکەی...

ئەو سەردەمەی کەس نەیدەزانی- بەلانی کەمەوە خۆ حوسێن نەیدەزانی- کە لە ژیاندا پێشهاتی وارووەدا کە یەکێك بەخۆ بەختکردنی خۆی و دەرهێنانی خۆی خۆشەویستی خۆی لە دەست کەسانێکی کە دەیانەوێ سوکایەتیان پێبکەن. دەتوانێ خۆی و ئەو خۆشەویستەی بگەیەنێتە پلەو پایەو جێیەکی ئەوتۆ زۆر لەجێ و رێی ئەوانە بەرز و بالاتر کە دەیانەوێ سوکایەتیان پێبکەن و دەچنە شوێنێکی ئەوتۆ کە لەوێوە بەرپشیان پێبکەنن و ئەوان گاڵتە بەو جۆرە کەسانە بکەن و تۆڵەیان لێبکەنەوە- و وەك درندەی تێماویان لێ بەسەربێنن و نێچیریان لەچنگان بستێننەوەو دە کوورەی رق و کینەی خۆیان و خۆ بەگەورە زانینە درۆزنانەکەیاندا بە رۆنی خۆیان سوورببنەوە. و چ شتێك لەوە گەورەترە؟ **محەممەد** عەلی ئەوەی لە نەدیتەو بێ فێربوون، وەدەست هێنابوو. لەراستیدا دەیەویست بە نەمانێ خۆی قەڵەمی سڕینەوە بەسەر گەورەییە درۆزنانەکەی ئا ئەوانەدا بهێنێ. ئەوە گەورەییە؛ ئەو ئەنارشیزمە[1] بەو مانایەی کە ئێمە دەمانەوێ لێوەی بەدی بکەین و دەویدا ببینینەوە، نییە، چونکە ئەمە فەلسەفەی ژیانی ئەو جۆرە کەسانە نییە، لەراستیدا ئەو جۆرە کەسانە چ فەلسەفەیەکی ژیانیان نییە. لەبەر ئەوە مردن ناکەنە ئامانج و بە ئامانجیشی دانانێن. بەلام بە لاوەتیە خۆیان بۆ مانا بەخشین بە ژیان چ باکێکی وایان بەرامبەر مردنێ نییە و لێی ناپرینگێننەوە...

خودی راستییە، لە رووی کەسە هەڵواسراوەکەدا بوو: برۆی تێکنابوون؛ لێوەکانی هەردەجوولان، وەك بیەوێ بە هەموو هێز و توانایەکی خۆیەوە دەنگی خۆی بگەیەنێتە هەرچوار کون و قوژبنی دنیایە. شنەبایەك هەموو لەشی- زیاتر پێیەکانی- بەرەو پێشەوە دێنا، و نووکە شەقی لە

[1] ئارناشیزم: ئەوانەن کە نەدەوڵەت و نە یاسایان قبووڵە.



هەموو کائینات هەڵدەدا: دەك مەرگتان بێ- ئەو هەموو بێ غیرەتییە، ئەو هەموو بێ هەست و هۆشییە! کە لە ترسی مردنێ ناوێرن بژین. ئێوە لە راستیدا مردنتان بە خەیاڵدا نایەت و بیری لێناکەنەوە؛ ئەوە مردنە لە ئێوە دەگەڕێ و دەخەیاڵی ئێوەدایە، و هەردەمە نادەمێك بەخۆو ئەسپێ و پیس و پۆخڵی و بۆ گەنەوە دێتە سۆراغتان و کاتێ بە تەواوەتی بۆگەنتان کرد ئەودەمی زەویتان لێ پاك دەکاتەوە.

لە راستیدا جگە لە روخساری لەسێدارە دراوەکان کە راستییەکی راستەقینە و بێ درۆن، دەنا هەرچی روخسار هەنە هەمووی درۆن.

بەلام وای کە مرۆڤ چ ئامێرێکی ئاڵۆز و تێك قژاوە! دەگەڵ هەموو شتێکیدا رادێت، لەهیچەوە مایەی مانەوەو بەردەوامیە خۆی وەدەست دێنێ: وردە نانیشی لەسەر سینیە نییە کەچی بیر لە سفرەی حەوت ترنگێنە دەکاتەوە گیانلەبەر وا نییە: هەر ئەو باڵندە کەنارییەی بێنە بەرچاوی خۆت، دوو رۆژانی بێ دان و ئاولێگەڕێ، لە ناکامیاندا دەمرێ. ئەو لەوپەڕی تەنگەتاویەدا، ئایندە و ئەفسانان بۆ خۆی هەڵنابەستێ تا فەرامۆشی خواردنێی پێ بێن. دروشمی وی لەوەی زیاتر نییە: یازگ، یا مەرگ. بەلام مرۆڤ جانەوەرێکی دیکەیە: هەم زگ هەم ژیان، لەپێشدا زگ، دوایە ژیان، و ئینجا — ئەوجار ژیان، دوایەشی ئای، زگ...

رق و کینە نیشتوونەوە، هۆی شادی و خۆشی تازە هاتوونە نێوێ: مەلیحە کوڕی بووە، ژیانێکی ئاسوودەی هەیە، منداڵەکەی ساغە و تریقەی پێکەنینێی دەماڵێ گێڕاوەتەوە، و پێکەنینەکەی، و نەخۆشیە منداڵانەکەی، و بۆنەکانیان دەگەڵ فەیزوڵلایدا، بە ئاودانێ گوڵەکانی عالیە و **محەممەد** عەلیەوە... هەموو کاتەکانی ئەکبەراغا و باجی گوڵبەهارێیان پڕ کردوونەوەو دەرفەتی گڕ کرتنەوەی توندوتیژیە خڵت و خاڵە نیشتووەکانی دەروونیانیان بڕیون. حوسێنیش لە چاوی پیس بە دوور بێ و سەد ماشەڵڵای لێبێ، ئیدی گەورە بووە؛ ئێستا ئیدی جاری وایە لەسەر دوکانێ دادەنیشێ، جاری واشە رۆنێك، خورییەك، بزنێك، مەڕێکی دەکڕێ و دەفرۆشێتەوە، یا دەگەڵ دۆست و ئاشنایاندا دەچنە دەشتێ یا شەوانە بە کۆلانانەدا گۆرانییان دەڵێ، وردە وردەش دەبێ غەمێکی لێبخۆرێ و ماڵ و حاڵێکی بۆ رێکخرێ و بەڕێ کرێت...

سەرەنجام باجی گوڵبەهار ((مقەببا))یەکەی لە چاوی کۆمەدینەکەی هێنایە دەرێ و دەو چوارچێوەی گرت کە وەستا عەلی دارتاش دروستی کردبوو. هەموو دانیشتبوون: ئەکبەراغا بە

جلوبەرگی پاك و خاوێنەوە- دە حاڵێكیدا كە هێشتا زەردەخەنەی هەر بە لێوانەوەیە، باجی گوڵبەهار بە روخسارێكی دایكانەوە، وەك لێرەش هەر ناراحەت و نیگەران بێ و هەر هێندەی ماوە ئاوڕ داتەوەو ببینێ كە داخوا دەنگی هەناسەی عالیەی بۆ هێندە لەسەرەخۆیە كە نایەتە گوێ یا مەمەدی بۆ وای پۆزلێداوە. حوسێنی بە باوەشێوەیە؛ مەلیحە دووبەشی پەنجەی دەزاری ناوەو دە عەردیەوە راماوە، ئێستاش كە ئێستایە ئەو خووەی هەر دانەناوەو لەسەرساممییەدا خێرا قامكی دەزاری دەنێ و دەیمژێتەوەو تا ئێستاش سەرسامی بەرینەداوە؛ حوسێن مەمك مژەی دەزاریدایە- هێشتاش هەروایە.

ئەوانیدی هەموو تەسلیمن؛ هەروەك نە خانێك هاتبێ و نەخانێك رۆیشتبێ. كاتێ ناوی حەزرەتی ئەجەل دێنی بەرامبەرەكەت، بەجۆرێكی وا سەری دێنێتە پێشەوەو دەستی بە شێوەیەكی وا بە پەنا گوێیەوە دەنێ و بە چەشنێكی واخۆ دەنوێنێ كە دەنگەكەی نەگەیوەتێ و واخۆ لەگێلیە دەدا هەروا دەزانێ لە وەتەی هەیە هەر كەڕبووە: برۆیان تێكدەنێ و بەروخسارێكی پەرتەوە دووبارەی دەكاتەوە: ((حەزرەتی ئەجەل!)) بە شێوەیەكی وا كەپێتوایە لە تەواوی ژیانیدا ناوی هەر نەبیستبێ. و دوای كەمێك خۆگێژ و وێژكردن: ((ئێ، ئێ!))یانی تێگەیشتم ((بەڕاستی... چ باسە؟)) ئائاوا! ئەویش بەزەردەخەنەیەكی ساردەوە، وەك كەسێكی كە لەشە و نشینییەكی بپرسێتەوە كە بۆ خۆی لەوێ نەبووبێ و بانگ نەكرابێ: ((راستییەكەی نەمزانی، خۆش گوزەرا، هایدەش لەوێ بوو!؟)) ئێستاش هەروەك پێشوو بەلانی كەمەوە بە ئەندازەی رابردوو هەر ئێستایە؛ و تۆ هەمیشە دەرفەتی ئەوەت هەیە كە ببینی و هەستی پێبكەی- جگە لە هەندێ جێگۆڕكەیەكی كەم نەبێ. لێرەدا بە پێچەوانەی فەیلەسووفەكانەوە كە دەڵێن تا وشەی ئێستات لە دەمی دێتەدەرێ ئێستا، نامێنێ و بەسەردەچێت، ئێستا هەمیشە هەر ئێستایە- نە یەك پشت بەڵكە تەنانەت چەندین پشتیش. بەڵام رابورد، یانی هەست پێكردنی، هەستی ئاگادارییە وی- ئەڵبەتە نە بە مەبەستی چاو پێداخشاندنەوەی بەڵكە هەروا- هەمیشە وەك هەموو شتەكانی دی هەیە و لەبەرچاوە: وەك گاوگۆل و مەڕ و مالاٚت و مەلا و رووبار و خەڵكی شاری.

ئەبابە! سەرەتا كە برینەكان تازەبوون تاسە و كەف و كولێك بوو مەپرسە، خەڵكی بڕیاری زۆر سەختیان دان. نەك هەموو كەس، بەڵكە دەردە دارەكان. پیرەمێردێك كە ناوی خالۆ عەلی بوو



و ماینێكی رەسەنی هەبوو و نەیدەدا ماوەیەكی زۆر یەك دوو هەفتان دەزیندانێ كرا، بەخۆو جووتە كەوشێكی لاستیك لەپێ، تفەنگ بەشانەوەو توێشەبەرە بەپشتێوە بە كۆلاٚن و شەقاماندا كەوتە راوێچكان. خەڵكی خالۆ عەلیان پێكتر نیشاندەدا: ((سەیری ئەوە خالۆ عەلیە، ((توێشەبەرە))ی لە پشتێ بەستووە دەیەوێ پێش بە ((حەزرەتی ئەجەل)) بگرێت و لە هەر كوێیەكە بیگرێت و بیهێنێتەوەو بیكوژێ- یان بكوژرێ!)) هەموو بەسەرسامییەوە سەیری دەكەن و جاری واشە گاڵتەیان پێی دێ. پیرەمێردێكی كورتە بنە، و بە دەموچاوێكی پانكەڵەو خڕیلە و بە قامكە ریشێكی رەشەوە، و هێندێك ئاڵۆز، و بە زەردەخەنەیەكی پڕو پوچانەوە، تفەنگی وەك بێلێ داوێتە سەرشانی و بوخچێك كە هێندێكی وردەنان تێناوەو بە شەقاماندا هەلینگ دەدا، و هەروەك هەموو كارەكانی بە ئەنجام گەیاندبن پێدەكەنێ، دەچێتە ماڵێ یەك لەو خانانەی لە دوور خراویەوە هاتۆتەوە، تا خەرجی سەفەرێی لێوەرگرێ. پێنج شەش تمەنان لەوێ وەردەگرێ، هێندێكی لێ خەرج دەكات و ئەویدیش بۆ رێیە هەڵدەگرێ. لەبەر دوكانێكی یا لەبەر دەركی مزگەوتێ خەریكی سەبیل كێشانێیە، و جارجارانیش لولەی تفەنگەكەی دە حەوا دەكا و بەشتێكی خەیاڵییەوە- رەنگە بە حەزرەتی ئەجەلەوە بێ- سێرە دەگرێ، و دووبارە چەسپێكی لە سەبیلەكەی دەداتەوە، و لێوی بەزەردەخەنێكی لێك دەقلیشنەوە... پیرەمێردە چەند رۆژێكان ونبوو. گوایە بە پێیان چۆتە سەقزێ و هێندێكیش واوەترچووە- بۆ خۆی دەیگوت تا مەراغەی، یەك دوو پارووە سابوونی مەراغەشی دەگەڵ خۆ هێنابوونەوە- و دوایە ماندوو بووەو هاتووەو تۆڵەی حەزرەتی ئەجەلیشی حەواڵەی پیر و پیاوچاك و ((مشایەخان)) كردووە. دەیگوت نەیزانیوە تاران هێندە دوورە- زۆر دوورە! و زەردەخەنەیەكی پان و پۆڕی دەهاتێ، یانی كە زۆر دوورە. ئەو هەموو رێیەش با بۆ ((حەزرەتی ئەجەل)) بێت كە بێ توێشەبەرە بریویەتی! دەو نێوەیدا تەنیا هەر لاوەكانن كە بەردەوام دەخنێنەوە و لەهیچەیڕا شادی و پێكەنینێ پەیدا دەكەن، تەنانەت لەو پیرەمێردە شڕا.

حەزرەتی ئەجەلیش هەر تەسلیمە، بەڵام تەسلیمیە وی تێكەڵ بە گەورەیی و گوێ نەدانێیە. خۆ ئەویش هیچ چاوەڕوانییەكی لە میللەت نەبوو تا پاداشی خزمەتەكەی ئاوا بەم جۆرە بدەنەوە. بەڵام دەی باشە ئیدی زەمانەكە خراپ بووە؛ میللەت كەسپڵەیە- چ دەكەی! ئەو چاوەڕێبوو لە ناوچە كوردیەكانەوە (كوردستانات) كە لە سایەی بوونی ویەوە ((ئەو هەموو)) ئاسایش و دڵنیایی و ئاسوودەییە هەبوو، هەر نەبایە دەبوو هیزە رۆنێك، مەڕێك، رێز و ئەدەب

بەجێهێنانێك هەرهەبایە... بەڵام چ دەکەی، ڕێیەکە دوورە... بەڵێ، دوورە، هەربۆیە خاڵۆ عەلیش گەڕایەوە.

لە هەموو شتێك ناخۆشتریش ئەوەبوو کە ئیدی ئەحمەد شاش نەمابوو. ماوەیەك لەمەوپێش ڕەق بۆوە لەسەرمان. ئەویش وەك زۆرانی دیکە چاکی سەر لە جوغرافیای دەرنەدەچوو. ئەویش هەرپێی وابوو بەغدا، یەك دوو هەنگاو لەولاترەوەی پیر سلێمان و ئینگلیزیش سێ چوار هەنگاو لەولاترەوەیە... چووبووە بەغدایە ((شانۆ نامە))ی ببینێ: بیستبووی لەوێ شانۆنامەی پێشان دەدەن؛ چووبوو بزانێ چ باسە، و چونکە بیستبووشی کە بە شەوێ پێشان دەدرێ هەر بەشەویش وەڕێ کەوتبوو و دەبەفرێدا مابۆوەو لەسەرمان ڕەق ببۆوە. تەرمەکەیان بەداخ و کەسەرێکی زۆری خەڵکییەوە هێنایەوە شاری... و ژن و ژاڵ و باجی گوڵبەهار بە کوڵ و دڵەوە بۆی گریان...

هەموو هەر گیرۆدەن. ئیسماعیل خانیش هەروەتر گیرۆدەی زۆر لە گرفتە تایبەتییەکانی خۆی و گرفتە کۆمەڵایەتییەکانە: ئەویش هەردەبێ دانیشێ و بەردەوام کاری داهێنەرانە ئەنجام بدات. ئاخر دانیشتنێ چایخانەی سەری کۆڵانێ ئەویش دەو تەمەن و ساڵانەدا و بەو هەموو ڕێ و ڕەسم و ناوەوە، چاوەڕوانی لێدەکرێ، و ناچار هەردەبێ شتێك لە کەرامەتەکانی حەزرەتی ئەجەل، و ((عەمەلیاتەکانی)) کوردستان و لوڕستانی بۆ پەیوەندیدارانی ئەم باسەوەی باس بکات- بەڵام چەند؟ سروشتییە خودی خۆشی بەگوێرەی نزیکی و خزمایەتیەی دەگەڵ ویدا- یانی هەردەبێ بۆ خۆشی دەو عەمەلیاتانەدا هاوبەشی کردبێ و سەربوردە چیرۆکەکانی وا دێنانەوە کە وەك بڵێی هەر بۆ خۆی و بەچاوی خۆی دیویەتی. هەربەو خەیاڵەوە- مرۆڤی هیچ لەباردا نەبوو- هەمیشە لەبیر و لێکدانەوەدایە، و تەزبیحان هەڵداوێ، و ڕووی گرژ دەکات و پێدەکەنێ: پێکەنین بەو گوللانەی کە دەبایە لە تەختی ناوچەوانی حەزرەتی ئەجەلیان دابایە و ئەو لە ساتەوەختی گونجاوی خۆیدا دەستی درێژ کردووەو حەزرەتی ئەجەلی بەرەو پشتەوە بۆ پەنایە ڕاکێشایەوە؛ ڕوو گرژیەکەشی بۆیە بوو کە ئەو ئامۆژگارییانەی بە حەزرەتی ئەجەلی کردبوون و ئەو گوێی نەدابوونێ و نەدابوونێ، و ناخۆشیان نەبینن، کەوتنە چ گێژەنێکییەوە! هەروا گوللە بوون وەك تاوە تەرزەی سەرەتای بەهارێ لە چەپ و ڕاست و لەسەرو خوارێوەڕا وەك ڕەهێڵەی دادەباری، و



پیاوم دەویست دەرچێ- ڕۆژ ڕۆژی هەڵاتنێیە. ئەوە ئەویش (ئیسماعیل خان) هێشتا هەروا دەستووران وەردەگرێ، بڵێی خۆی بشارێتەوە، نەبوو شتی وا هەرنەبوو نەبوو.

مەشەدی ئەکبەراغا چ یاد و بیرەوەرییەکی وای نەبوون- بەو مانایە کە هەر نەیبووبن، هەلی، کێ لەوی زیاتر هەن؟ بەڵام کە بیری دەکردەوە گێڕانەوەی یادەوەرییەکان کەڵکی چی وی دەگرێ، ئەوە چ سوودێکی هەیە بێت و دانیشێ و ئەو غەم و ئێش و ئازارانە بگێڕێتەوەو دەدڵی خەڵکیان کات... بەوەی چ دەبێ؟ قەڵتاغی لێنەداوە، لە هیچ کردەیەکی سەربازیدا هاوبەشی نەکردووە، تەنیا ئیشی خۆی کردووە و زەحمەتی کێشاوە، لەوەتەی ئەو وەبیری دێ ناچار بووە هەموو ڕۆژێ خوا دایناوە، بە گەرمای هاوێنێ و سەرمای زستانێ، مشتە و دەرزی و درێوشەی لێدا تا زگی ئەو چەند نانخۆرانە تێرکات و جلوبەرگێکیان بۆ پەیدا کات، و بەگوێرەی وەرز توانیویەتی کەمو زۆر نانێکیان هەر بۆ پەیدا کات... تازە دەهات یەکێکیان پێ دەگەیی و دەبووە گۆچانی پیریەی، ئەویش ئاوای بەسەرهات... ئای هەی!

کەلایی ڕەجەبیش هەر گیرۆدەیە: وابلاوە کە ئەویش کارەکەی نوێ کردۆتەوەو دامودەزگایەکی دیکەی داناوەو لە باغی، لە تەجریش دوو سێ کۆڵان لەولاوەتری کۆڵانی حەزرەتی ئەجەلەوە دەزگاکەی وەگەڕخستۆتەوە، بەهەمەجۆر قەمەری بچکۆلانەتر و قەڵەو و کورتەبنەوە؛ دەگەڵ خواردنەوەی بیانی و سازو سەنتور و دمبگی پێش ((عەمەلیاتەکان)) بەڵام وەك بڵێی سەرانە و باجگیری زۆرە، و دامودەزگایەکە بە زەحمەت دەریدێنێ- دەبێ بیر لە کارێکی دی بکاتەوە. هەموو ڕۆژێ بەیانیان و ئێواران دێتە سەری کۆڵانێ و لەڕووی ڕێزی حەزرەتی ئەجەلییەوە کە دەچێتە پیاسەیی و یا لە پیاسەی دێتەوە، کلاوەکەی دادەگرێ و ئیکلامێ دەکێشێ. نا، هەر بۆ خۆی پیاوێکی بەڕێزەو؛ هەرچەندە شتومەکەکەی نایەتە بەردلان، بەڵام ویژدانەن پیاوێکی بەڕێزە، پیاوێکی ((نیشتمانپەروەر)) و قەدرزانە... ڕووسەکان لەو ڕۆژەوەی کە ڕۆیشتوونەوە ئیدی چوونیان هەبوو، هاتنەوە نا؛ لە مەهاباد و تەورێزیش هەر ڕۆیشتن؛ دەوڵەتییەکان ژمارەیەکیان گرت و کوشت، ئێستاش هەردەگرن و جار جارە دەشکوژن. بەڵام ئەوان جارێکی دیکە نەهاتنەوە. گوتیان لە گەڵتانین، بەڵام وادیاربوو یەکجار زۆر گرفتار بوون و دەرفەتیان نەبوو بێنەوە ئەوەندەیان بەس بوو کە هەر لە دوورەوە هاو دەردییان دەردەبڕی. بەڵام وەك شەولەبانی ناو داستانان هەمیشە لە پەناو پێچی مێشك و بیری مەقاماتی دەوڵەتی و تەنانەت

ژمارەیەکی زۆری خەڵکیشدا خۆیان مەلاس دابوو، و ئەو بەرێزانە بڕوایان وابوو لە هەر ئان و ساتێکیدا بێنەوە هەر بێنەوە- هەر دەگەڕێنەوە! لەسەرەتاشەوە چ ناوی ئینگلیزان نەبوو، ئێستاش هەر نییە- چل ساڵ دواتریش هەرنابێ، وەك لە ڕۆژهەلاتی ناویندا ون بووبن. ئەی ئافەرین بۆ ئەو مرۆڤە پیاوانەی کە هیچ کاتێ خۆیان لە دەستێوەردانی کاروباری خەڵکی دی هەڵنەقورتاندووەو حەزیان پێ نەکردووە و حەزیشی پێناکەن. ئێستا وەك بڵێی کە ئەمەریکاییەکان بیانەوێ بێن!...

* * *



(٢٠)

دەڵێی وردە وردە خەریکە خۆش دەبێ، ئێستا زۆربەی ئێواران لای کوڕەکەی ئاغای سلێمانیم، کە قوتابی دانیشگایە، یا رەنگە تەواویشی کردبێ — دڵنیاش نیم، چونکە تا ئێستا لە خۆیم نەپرسیوە. پێشان کە چووم بۆ ئەوێ بە دەستە خۆم نەبوو، جارجارە دەچوومە ماڵێ ئاغای سلێمانی: بە بیانووی گوێ لە رادیۆ راگرتنێوە مۆڵەتی چوونێم وەردەگرت: ئەو دەمی رادیۆ هێندە زۆر نەبوو؛ لە دوو سێ دانە بەولاوە دەشاریدانەبوو. دایی لە سەرەتاوە لچ و لێوی تێکدەنان و رووی گرژومۆن دەکرد، هێشتا لەبیری مابوو کە چۆن بۆ ئارەق خواردنەوێ بەرەو دەم چۆمی دادەگەڕا و بەدوای خانمەکانی کەلاییدا دەنارد بێن و گۆرانیانی بۆ بڵێن. ئەویش — دایی- هەر قسەی خەڵکی دووپات دەکردەوە- و سەیرەکەش لەوەدابوو کەمن پێم ناخۆش بوو. دەیگوت هەرنەبێ با شەرمێکی لەخودای بکا و ئەوکارانەی تۆزێك بە سەرودەرو بێت (ئەڵبەتە لە بن لێوانیشەوە بە هەمان سەرنج و دەنگە ساف و بێگەردەکەیەوە، لەسەرەخۆ تۆبە و ئەستەغفارێکی دەکرد و چاوەکانی بەرەو بن میچییەوە، کە لەپشت ویڕا، ئاسمان و خودا بوون، بەرز دەکردەوە). و دەپاڕایەوە، کە خودایە ئەگەر هەمیشە هەروا چاوی لە ژن و منداڵی خەڵکیەوەیە، یەکێکی بۆ بڕەخسێنی تا ئاوا ئەویش چاو ببڕێتەوە ژن و منداڵ و خوشکەکانی و ناموسی دی. بابەگیانیش یەك دوو جارانی پلارهاویشتبوومێ کە (قەل بەقەل و کۆتر بەکۆتر) و ئەو جۆرە قسانە، بەلام من زۆرم گوێ نەدەدایە- و هەردەچووم. هەر زۆر لە زووەوەم ئەو خۆشەویستییە دەگەڵدا پەیداکردبوو، هەر لە سەرەتای هاتنێمانەوە بۆ ئێرە: ڕۆژێکیان منداڵی کۆلانێ دەورەیان لێدابووم؛ کلاویان لێ دەفڕاندم، ناماقوڵیان دەکردن، قژیان رادەکێشام، بەرد بارانیان دەکردم، و من وەگریە هاتبووم کە ئەو کوڕەی ئاغای سلێمانی کە ئەودەمی لە قوتابخانەی ناوەندی دەیخوێند و بۆ پشووی هاوینە هاتبۆوە پڕیدایە منداڵەکان، دەستێکی بەسەری داهێنام و زۆری دڵخۆشی دامەوە. دوای ئەوە هەرکاتێ کە لە کۆلانێ توشی بامایە- و هەمیشە هەوڵێشم دەدا کە تا دەتوانم هەر توشی ببم- هەر کە دەمدیت و چاوم دەکرد کە سەیرم دەکات و بەدەممەوە پێدەکەنێ لەخۆوە، بێ ئیختیار، بەڕوویەکی شەرمێون و منداڵانەوە،

و پێم وابێ کە پەنجە گەورەشم دەمژی، دەچووم و سەرم بەلا کەلەکێیەوە دەنوساند، و ئەویش دەستی بەسەریدا دێنام، هەواڵی دەپرسیم، لە بابەگیان و دایی و خوشکمی دەپرسی، و لەوەش کە داخوا چ دەکەم، کەی دەچمە قوتابخانە، بۆ سەری لێنادەم- خۆشحاڵ دەبێ بە چوونێم بۆ لای- ومن زۆرم دڵ بەو دڵنەوازییەی وی خۆش بوو. لە هاتنی رووسانەوە رێی چوونە وێم کرایەوە. پار بۆ پشووی هاوینێ نەهاتەوە... ئەمساڵیش واپێدەچێ کە حاڵی زۆر خۆش نەبێ. دەیانگوت حەزێ لە کارەکەرەکەی خۆیان دەکا، بەلاّم ئەو کارەکەرەی کە من دەمدیت دێوێک بوو- جوان، بالاّبەرز و تەن و مەند، هێندەی سێ کەسان! چووزانم... ئەوە بەقسەی دایی، خواش بۆ خۆی دەزانێ.

لاوێکی مردەڵە، لوتێکی مەیلە و گەورە، دوو چاوی رەش و بادامی بەلاّم قوڵ و تیژ بین، برۆ رەش و مەیلە و پڕ و دەموچاوێکی رەقەڵە و باریک و چەناگەچاڵ و دوو لەت. هیچ کاتێ نەبووە دیبێتم بەرپێی خۆی تەماشاکا: سەری قیت رادەگرت، هەروەک نەیەوێ لە یەک فرسەخ کەمتر بەردەمی خۆی ببینێ. دەگەڵ ئەوەشدا زۆر بێ ئاگا نەبوو، چونکە هەرکاتێ کە منی دەدیت زەردێکی دەهاتێ و هەنگاوەکانی دەگرتنەوە. زۆر نەدەهاتە دەرێ؛ زیاتر دەگەڵ بابیدا بوو و بەبابی دەگوت ((بابە)) و زۆریش دەگەڵ یەکدا تەبابوون. هەر لەبەرمەمکانییەوە دایکی مردبوو، و نەنکی هەمان پورە فاتمەی بەرامبەر خانووەکەی پێشومان تێیدابووین گەورەی کردبوو. دایکی کرمانج بوو (دەگەڵ فەیزوڵلاّی مەشدا دەگەیشتنەوە یەک و بۆرە خزمایەتییەکیان هەبوو) بەلاّم دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ((بابە))ی زۆر خۆشدەویست و هەر بەپێکەنین و رووی خۆشەوەی دەدواند کەمن خۆزگەم پێدەخواست. نێوانی من و بابەگیانی قەت خۆش نەبوو؛ ساردی و سڕی ئەو ژیانە کلۆڵەییەمان نەیدەهێشت هێندە ئاسوودەبین بەسەروەختی گەرموگوڕیە نێوان یەکتری رابگەین. پێم وابێ کەسانی دیکەش هەمو هەروایان هەست دەکرد، چونکە دەمدیت هەرکاتێ ئاغای سلێمانی لە خواردنەوێڕا دەهاتەوەو بەخۆشییەوە دەستی دەخستە سەرشانی کوڕەکەی و بەدەم قسانەوە تێدەپەڕین هەموو- منداڵە هاوتەمەنەکانی دیکەی وەک وی- بە چ حەز و حەسرەتێکەوە رادەوەستان و سەیریان دەکردن. منیش زۆرم حەز دەکرد، یەکجار زۆریشم حەز دەکرد، کە بابەگیانیش ئاوا پاک و خاوێن وشیک پۆش بایە و ئاوا دۆستانە بیدواندبامایە و دەستی هاویشتبامایە سەرشانی، و بەرووەمدا پێکەنیبایە. هەرکاتێ کە ئەو روخسارەم وەبیر دەهاتەوەو روخساری بابەگیانیشم دەدیت دڵم



تێکدەچوو. ئەو پەیوەندیەشمان لەوەوە پێ سەیربوو کە دایکی ئەو کوڕە وەک گوتم، لە کرمانجان بوو و ئاغای سلێمانیش خان و بەگلەر بوو- ژنی ئێستاشی کچە مامی خۆی یانی ئامۆزای بوو- و هەر منداڵێکی کە لەناو خێزانێدا دایکی لە خان و بەگلەران نەبایە ئەوە ئەو منداڵە هەمیشە سەرکزەڵە بوو دەماڵێدا. بەلاّم بە شێوەی هەڵسوکەوتی زڕداکانە دەگەڵە ویدا و هەستان و دانیشتنی وی دەماڵێدا ئەوەی پێشاندەدا کە ئەوە تاکە ((نەشازێکە)) کە دەگەڵ یاساو رێسایاندا رێك بێتەوەو رێککەوێت. هێندێکان دەیانگوت لەبەر ئەوەی داکی نەبووە بۆیە بابی هێندەی خۆشدەوێ- دیاربوو کە لە منداڵەکانی دیکەی زیاتر چاوەدێری دەکا: دوو برا و سێ خوشك بوون. هێندێکانیش دەیانگوت لەبەر ئەوەی کوڕی گەورەی ماڵێیە و خوێندەوارە بۆیە هێندەی دەلاوێنێتەوە؛ هێندێکانیش دەیانگوت لەبەر ئەوەی دایکی ئەو کوڕەی زۆر خۆشویستووە و هەر بەشلکێ سەری مردووە بۆیە ئەو کوڕەی هێندە خۆشدەوێ یا لەبەر هێندێیە کە دایکەکەی ژنێکی رووسوورو بە ئابڕوو بووە؛ (ژنە خان و بەگلەر قسەی چاکیان پێنالێن) و، دیسانەوە هێندێکی دیکەش هەبوون کە هەر ئەو پەندە پێشینانەیان دووپات دەکردەوە کە دەڵێ، کاسەی پڕ ئاشتی ماڵە. بەهەرحاڵ هەروەکو دووبرادەر پێکەوە دادەنیشتن و دەگەڵ یەکدیدا دەدوان. بابیشی بەپێچەوانەی بیرو راو بۆچوونی بابەگیان و دایی کە بەرامبەری وییان هەبوو کە گوایە لە رێ و بان و کوچە و کۆلاّناندا کە دەیگەیەی بەتایبەتی کە کوڕەکەی دەگەڵدا نییە و بەتەنێیە کابرایەکە پیاو دڵی پێی تێکەڵ دێ، کەچی پیاوێکی تابلێی رووخۆش و بەرێزو قسەخۆش بوو کە هەرزوو بەلای خۆیدای رادەکێشای، و لە ماڵێشدا یەك لە رابواردنە خۆشەکانی ئەوەبوو کە سەری دەکردە سەر کوڕەکەی و گەمە و گاڵتە و جەفەنگی دەگەڵدا لێدەدا. بەپێچەوانەی کوڕەکەیەوە کە لوتی دە ئاسمانێ دەکرد و سینگی دەردەپەراند و خێراخێرا بەرێیەدا دەڕۆیی، بابەکە سەری بەردەدایەوەو بەجۆرێکی وا بەرێیەدا دەڕۆیی وەک بڵێی پێ لە مێرولان دەنێ. کە منداڵبووم دەمبیست کە دەیانگوت، چونکە نەجیب زادەیە، بۆیە وا دەڕوا! جگە لەو دەمانەی کە کوڕەکەی هاوینان دەهاتەوە، دەنا هەر بە تەنیا بوو. مەگەر میوانی هاتبایە. زۆریش شیك پۆش بوو، بۆنی عەترەکەی لە دووریە دە هەنگاوانەوە پیاوی گێژ دەکرد. بەپێچەوانەی دەموچاوی کوڕەکەیەوە کە رەقەڵە بوو، ئەو دەموچاوێکی مەیلەوپان و گۆشتنی هەبوو، چەناگەی قوڵ و دوولەت بوو، چاوەکانی گەورە و لەدەرێ بوون، و دیسانەوە هەر بەپێچەوانەی کوڕەکەوە کە لێوەکانی تەنك و باریکەڵە بوون ئی وی مەیلە و ئەستوور بوون. لە

شولارێكی تۆكمە، و بالاّ مام ناوەندیش بوو. بەتێكڕایی پیاوێكی زۆر رووخۆش بوو، و هەر گەرمیە پێكەنینەكەی سەرو رووی و ریزە ددانە زێڕەكانی بوون كە بێ ئیختیار پیاویان بەلایدا رادەكێشا. بەپێچەوانەی بیرو بۆچوونەكانەوە، فیزیشی نەبوو؛ دەماڵێ خۆشیدا تابلێی میهرەبان بوو.

جاری وابوو بیانووم دەدیتنەوە، یا بەبێ بیانوو دەچووم. لەسەرەتادا حەزم لێبوو بزانم داخوا ژیانی ماڵێ خان و مانان چۆنە. ئێستا دەمەوێ بزانم لە تارانێ چ باسە، چ دەڵێن، بە بیروبڕواو دیدی كوڕی سلێمان ئاغای بارودۆخ و گوزەرانی دنیایە دەچدایە، بۆ وای لێهات- چی لێ بەسەر دێتەوە، ئاخر ئەو دانیشگای دیوە، كەسێكیش كە لە دانیشگای خوێندبێ- ئەویش دانیشگای ماف (حقوق)- و پیاوێكی وەكو وی كە هەڵگری بیروباوەڕی پێشكەوتووانەیە- هیچ نییە نەیزانێ. ئەوە هەر گومانی تێدانییە. جاری وابوو هەروا كە سەیریم دەكرد دەمێشكی خۆمدا —پێم وابوو- ناوەڕۆك و كرۆكی مێشكی دەبینم. وای لەو بازارەی، چ كەل و پەلێك، و چ ((ماف))ێكی دەناو كەللەیدا لول و پێچی دەخوارد و چ فەرەنسییەكی دەمێشكیدا دەكوڵی و قوڵپی دەدا: پێم وا نییە ئەودەمی هیچ بۆچوونێكم بۆ ((ماف)) هەبووبێ، جگە لەوەی كە دەمزانی دەبێتە ((دادوەر- حاكم)) و ئەگەر بشیەوێ دەتوانێ خەڵكی لەسێدارە بدات یا نەدات... و ئەمەش ((زۆر)) بوو! جاری وابوو بەدەم قسانەوە دەگەڵ بابیدا دەیگوت فلاّن ماددەی یاسای سویل (مەدەنی) فلاّنەشتی دەڵێ یا ماددەی فلاّنە یاسای سزایی، یا بیروڕای فلاّنە دیوانی بەرزی كیشوەر... و من پێم وابوو كە هەرچی ناو كەللەیەتی پڕیە لە ماددەی یاسا و بنج و بناوان و لێكدانەوەی یاسایی، ئەمە بێجگە لەو هەموو كیمیا و فیزیایەش- كە من قەتم نەدیبوون، و هیچ جۆرە بۆچوونێكم لەبارەیانەوە نەبوو. جارانیش كە بۆ سوود وەرگرتنی لە پشووی هاوینان دەهاتەوە قاموسە زلەكەیم بەدەستییەوە دەدیت گەشكەم دەكرد- وای، چ لەو هەموو زانین و زانیاریانە دەكا؛ چۆن دەروەستی ئەو هەموو زانینەی دێت و پێیان رادەگا، هەرچاكە شێت نابێ!

ئەودەمانەی بابی لەوێ نەبایە، لە هەرچی ((بووە))و نەبووە دەدوا. دەربارەی داروین و بیروباوەڕەكەی دەدوا. دەیگوت ((داروینیسم))شتی وای دەگوت كە مرۆڤ كلكی دەردەكرد. دەیگوت مرۆڤ لە رەچەڵەكی مەیمونێیە.



ئێستا چاكم لە بیر نییە كە ئەودەمی چی دەگوت، بەلاّم لە بیرمە كە وشەگەلی ((موتاسیون)) و ((بایۆلۆژی)) و ((پرۆسە)) و ((تەكامول))ی زۆر بەكاردێنا، و من لە ترسێ وەی نەكا نەخوێندەواری و نەزانیە خۆم بسەلمێنم بەروویەكی خۆشەوە دەستم بۆ لەملی دەدا و گوێم رادەگرت، وەك زۆربەی قوتابیانی پۆلی بیركاری، ئەودەمی وام دەخەملاّند كە سەردەمانێك رەوە مەیموونەكان لەبەر هێرشی سەرمای زستانی نێو دارستانەكان، لەجێی خۆیان هەڵقەناون و بەرەو گەرمە سێرانیان داقەلاّشتووە، ئەو شوێنانەی كە جەنگەڵیان لێ نین. و لەبەرئەوەی كە دارو درەختیشی لێنە بووە پێی هەڵگەرێن وردە وردە دەستەكانیان كورت بوو و نەوە و كوركەكانیان وەریون و لە سەرەخۆ بەهۆی داردەستانەوە، یا وەك منداڵاّن كە تازە پێدەگرن بەلێواری كێو و تاشە بەردەكانەوە خۆیان راگرتووە تا ئاوا قیت بوونەتەوە، و بوونەتە مرۆڤ- و فێرە رۆیشتن بوون. و من هەموو ئەو مەزەندانانەی خۆمم بەوپەڕی دەستپاكییەوە دەگەیاندەوە دۆست و ئاشنایان، ئیدی بە تەواوی ببوومە جۆرە ((دێوەرە))یەكی وی. و هەموو ئەو سەربوردەو قسانەی وی و خەملّەكانی من لە چەند ساڵێكانیان بەولاوەتر نەخایاند.

دەربارەی كۆمۆنەی سەرەتایی و قۆناغی كۆیلایەتی و دەرەبەگایەتی و بۆرژوازی و یەكیەتی شۆرەوی و ماركس و ئینگلس و كۆمەڵگا و گۆڕانەكانی مێژوو و ئەوجۆرە شتانەشەوە شتی دەگوتن و زۆرجاران وشە و زاراوەی فەرەنسیشی تێكەڵ قسە و بابەتەكانی دەكردن، بە خەیاڵی وەی كە من تێیدەگەم- یا رەنگە هەربۆیەشی بووبێ تا من تێینەگەم یا تێیبگەم كە چ فەرەنسییەكی دەزانێ؛ یا لەوانەش بوو وابچێتە ناو بابەتەكانییەوە ئاگای لە خۆی نەمێنێ و جڵەوی زمانی لە دەست دەرچێ و قسەكان وابكات. منیش بۆ ئەوەی ئەو واتێنەگا من هیچم لەباراندا نییە زۆر بەڕاشكاوییەوە گوێم بۆ رادەگرت. بەلاّم چاوم دەچاویەوە نەدەبڕی؛ وەك ئەویش پێی خۆش نەبێ دەچاوانییەوە رامێنم...

بابی چی وای نەخوێندبوو، بەلاّم پیاوێكی بە ئەزموون بوو و قسەكانی زوو دەچوونە دلاّنەوە، هەرچەندە قسەكانی كوڕەكەی بێگومان ((زانست))یانە تربوون... هەربۆیەشیان گومان لێنە دەكرا، چونكە زانستی بوون. هەركاتێ كە، بابەكە قسەی كردبایە، كوڕەكە زیاتر گوێی رادەگرت- ئەو ساڵ زۆر راشكاوانە و توڕانەتر دەدوا. نازانم بۆ، وەك ئەوەی ئەمساڵ پەیوەندییەكان درزیان تێبوو بێت و لێك ترازابن. جارجارە ئەگەر قسێكی كردبایە یا

نەیکردبایە. ومن دڵنیابووم ئەگەر لەبەر ڕێزی بابی نەبایە بەدوو دانە ((مارکسیزمان)) قەڵاقوپی بەبابی دەکرد و ورتەی لێدەبڕی. بەڵام وەك خودی خۆی- مەگەر بەدەگمەن- دەنا هیچی وای نەدەگوت. بابی وەك پیشەی هەمیشەی خۆی جلوبەرگ ئوتوکراو و پۆشتە و پەرداخ، بە پێڵاوەوە (دوایەم زانی کە ئەوە ڕێ و ڕەسمی تازەی خان و بەگلەرانە) لەو سەری ژووری لەبەردەم سینییە خواردنەوەکەی چوار مەشقی دادەنیشت؛ یەك دوو پێکی هەڵدەدان و ئەوجا سەری قسانی دەکردەوە، جا بۆ خۆی چی پێ خۆشبایە- و بە شێوەیەکی وا کە ئێستا من تێیدەگەم زیاتر بۆ ڕێنماییە کوڕەکەی و دوورخستنەوەی لەو بیرو بۆچوونانە بوو کە بەلای ئەوەوە زیانبەخش بوون. دوایی منیشی بۆ هاتمە سەر کوڕەکەی. لەبیرمە ڕۆژێکیان بەرەبەری خۆرئاوایە بوو کاتی دەنگوباسەکانی لەندەن کوڕەکەی هەروا بەناو شەپۆلەکانی رادیۆکەدا دەگەڕا بەڕێکەوت کەوتە سەر ئێستگەیەك قورئانی دەخوێند و دەگەل رادیۆ لەندەندا تێك گیران. رادیۆکەی هەر بەوجۆرە تێك گیراویەوە لێگەڕا و بەزەردەخەنەیەکی شەیتانانەوە، و تا ئەندازەیەکیش گاڵتە ئامێزەوە، سەیرێکی بابی کرد- یانی سەیرکە چۆن ئایین کراوەتە داردەست و بیانی لاونیو سوودی لێوەردەگرن.

و ئەوەش ئەو کاتەبوو کە، بابی دوای پێکی دووەمی سەری گەرم دەبوو، و لە بن لێوانەوە بەفیتوێکی سوکەڵەوە گۆرانییە هەڵبژاردەکەی خۆی دەگوتەوەو خۆی بۆ قسان ئامادە دەکرد. هەرکە، بابەکە ئەوەی دیت کتوپڕ روخسارێکی راشکاوانەی بەخۆوە گرت؛ من خۆمم کۆکردەوە، دیتم وەختی ئەوەیە کە بقەومێ. دەموچاوی سور هەڵگەڕابوو، ڕەنگە لەبەر خواردنەوەکەش بووبێ. گوتی: ((نا، نا؛ ئێوە سەهوون. ئێوە دەبێ لەوەی ئاقلانەتر بیربکەنەوە. دەزانن هەر ئەو هەڵەیەی کە حیزبەکەتان کردی- بەو لەدین دەرچوونەی- چ زیانێکی کوشندەی لەخۆیدا، ئێستاش کە ئێستایە نە بەپێکهێنانی ئەنجوومەنی ڕەوزە خوێنی و دانانی پرسە و ئەو جۆرەشتانە ناتوانێ هەڵەکانی پینە و پەڕۆکاتەوە؟)) هەر کە دیتی من خۆم کۆکردۆتەوە، زەردەخەنەکەی جارانی هێنایەوە سەرلێوان و گوتی: ((کا حوسێن، تۆش گوێ بگری خراپ نییە- ڕەنگە ئەوەی بێنێ گوێی لێ بگیرێ)). و بەڕووممەوە پێکەنییەوە.

گوتم: ((بە چاوان ئاغا، ئەوە گوێم راگرتووە)).



ئاغای سلێمانی لە درێژەی قساندا گوتی: ((تۆ دەتەوێ کۆمۆنیزمی دەو مەملەکەتەیدا سەقامگیرکەی- بەڵێ؟ بەچی؟ بە ململانێ و دژایەتی چینایەتیە؟ کە ئەوە هەر بەقسەکەی خۆت دەبێتە فلیمێکی سەرانسەر تێکهەڵدان و پێکدادانێ- ئەویش لەکوێ؟ -دەو وڵات و مەملەکەتەیدا، کە ئێمە لای خۆمانەوە حەزرەتی غەوس و ئەوان لەلای خۆیانەوە حەزرەتی عەبباسیان هەیە؟ دەوەرە پێم بڵێ تۆ چ تەنگوچەڵەمەیەکت هەبوو بەحەزرەتی عەبباس چارەسەر نەکرێ واچوویە لای دژەکەی وی؟ خۆ تۆ بەلای خۆتەوە لە تارانێ ژیاوی ((تو حەزرەتی عەبباس واز لەو شتانە بێنە!)). ((بە هەردوو دەستە پەڕیوەکانی حەزرەتی عەبباس!)) ئەولا دوایی دێت. بەجەخت و بەگرێیەکانی ناوچەوانیدا و بەو سەرو دەست بادان و هەڵسوڕانەیدا- دیاربوو ئیدی کە ئەوە دوایین سوێندەو، هیچ پاساوێکی نییە؛ بەرامبەر دەزانێ کە بەرامبەرەکەی ئەولای درۆیان ناکا- سوێندەکە، بە حەزرەتی عەبباسە! و فریارەسی تەنگوچەڵەمانە (پێکەنی) ((ئەولا، دەزانێ کە یارۆ هەموو شتێکی ناوەتە ژێر پێ- وەنا؟)) ڕووی قسانی لە من بوو، من بە زەردەخەنەیەکەوە سەرم بەردایەوە. ((سەیرەکە لێرەدایە کە مسیۆی ئەرمەنی ئارەق فرۆشیش دەڵێ- من خۆم چەند جارانم گوێ لێی بووە- ((بەها زەراتی ئاباس)) ئەوجا تۆ دێی و ئەو فریارەسەی واز لێدێنی و ڕوو دەکەیە دژەکەی!؟ ((ئێوە سەڵاواتان لە گیانی پاکی حەزرەتی عەبباس لێدەن و کارەکان یەکسەرەکەنەوە!)) — سەڵاواتان لێدەدەن، و ئاریشەکە دەبڕێتەوە. ئێستا تۆ هەر بڵێ پرۆسە، تەعاروز، موتاسیون، داروینیسم... پففف! بەڕاستی کۆمەڵگاتان ناسی!)) کوڕەکەی بە پێکەنینەوە گوتی: ((باشە، بابە، ئێمەش ئەوەی دەیڵێین، باوای دانێین نەبوو، ئەودەمی بەقسەی ئێوە بەیەك سەڵاوات یا یەك سوێند بە حەزرەتی عەبباس هەموو شتەکان یەکسەرە دەبنەوەو جێبەجێ دەبن- خراپتان عەرز دەکەم؟)).

((بەڵێ خراپ دەفەرمووی- لەبەر ئەوەی کە ئەوکەسەی سەڵاواتان لێدەدات و سوێند بەحەزرەتی عەبباس دەخوات باوەڕی پێیەتی...)).

((تەنانەت مسیۆی ئارەق فرۆشیش!؟)).

((بەڵێ، تەنانەت ئەو مسیۆ ئارەق فرۆشەش! هەڵەکەی تۆ دەوەیدایە کە نازانی دەکیشوەرێکیدا دەژی کە بەگوێرەی یاسای بنەڕەتی، ئایینەکەی ئایینی پاکی ئیسلامە- کە دەبوو تۆ ئەمەت لە

من باشتر زانیبایه- ئەمە وانە و خوێندنی تۆیە... مسیۆی ئەرمەنیش دەوەی گەیشتووە- تێگەیشتووە کە دەگەڵ ئەم خەڵکەدا دەژی؛ وەك ئێوە نییە کە دەنیشتمانی خۆتاندا نامۆ کەوتوونەوە- ئێوە تەنانەت بنەماڵە و خێزانیشتان دەگەڵدا نین... ئەگەر ئێوە ماڵی ئەو مەملەکەت و ئەندامی ئەو خانەوادانە بانایە دەوەی دەگەیشتن و باوەڕتان دێنا... بەڵێ بۆیە دەبێ باوەڕیشی هەبێ- و هەشییەتی، و لێرەشدا مەبەست لە حەزرەتی عەبباس یا حەزرەتی غەوس یەك مرۆڤی نموونەییە- نموونەی راستی و پاکی. ئەو پیاوە ئەرمەنییە بەو کەسایەتییە پاکە سوێند دەخوات- بەقسەی ئێوە هەروا- تۆش دەبێ سوێندێی پێ بخۆی- پیاوی راست و پاك یا بەزاراوەی خۆمان ((پیاوچاك)) مێژوویەکی لەپشتەوەیە... هەروا لەخۆڕا نەگەیوەتە ئەو پلەو پایەیە. هەڵەی کاری ئێوە لەوە دایە کە دەتانەوێ بە لۆژێکی دانیشگاییەوە رشتەی کاروبارەکان و بارو گوزەرانی خەڵکی سادە و ساکار چاودێری و ئاراستە بکەن...)).

((...!)).

((بەڵێ، قوربان، باوەڕی هەیە، یا هەرنەبێ دەخەڵکی گەیاندووە کە باوەڕی هەیە- دەنا هیچ یەك لە گیروگرفتەکانی یەکالاٚ نەدەبوونەوە. تۆ ئەگەر باوەڕت هەبایە یا کە دەتویست تەنگوچەڵەمەیەك حەل کەی دەخەڵکیت نەدەگەیاند کە بێ باوەڕی... و بەدوای ئەو بیرۆکانە نەدەکەوتی. ئێستاش کە وە دووی کەوتووی و دەخەڵکیت گەیاندووە کە بێ باوەڕی و هیچ باوەڕێکت نییە. ئەگەر یەك مەشکە دۆ بخۆیەوەو سەدقرپانی بەدوادا لێدەی کەسێك پێت ناڵێ نۆشی گیانت بێ)).

((بابە تۆ پێت وا نییە خەڵکی ئەو قسانەیان زۆر بیستبێ؟ بەلاٚم ئەمانە هەمووی ئەوە پێشاندەدەن کە ئەو ((وەجاغ زادانە)) چ کارێکیان لە دەست نایەت و هیچیان پێناکرێ. هەروەکو پێشینانی مەلا حەسەنی چیان کردووە کە هەر ئەو مەلا حەسەنە و ئەو خەڵکانەی دی نەیانکردبێ؟ لەکاتێکدا کە ئێمە هەروا لەو جێیەین کە لێی بووین...)) ((نا... تۆ هەر منداڵی، هیچ نازانی. من شتی وام لێدیون کە ئەگەر تۆ تەنانەت یەکێکیشیان لێ ببینی یا ببیسی لەسەرسامیان کاسەت لەسەریەوە دێ؛ هەرچەندە ئەو شتانە بەشێکی ئایینەکە نین- هەروەك رابەرەکانی ئێوە، کە کار گەلێك دەکەن بڕوا ناکەم ئەو کارانەیان بەشێکی راستەقینەی رێڕەوەکەیان بێت. هەر بەقسەی خۆت دەبێ دیاردەکان لە ((دەوروبەرو لە رەوتی تەکامولی



خوددا بدۆزیتەوە، دەوروبەر هەر ئەو دەوروبەرە بووە- هێندێك خراپتر- وانەبووە کە هەریەکەیان، ئەبو عەلی سینایەك بووبن، ئەمە جگە لەوەی تاك و تەرا کەسانێك بوون کە وایان پێشاندابێ بوعەلی سینایەك بن (لەبیرمە جارێکیان دەنێوان یەك لەو قسانەدا کە لە بارەی ئایین و کاریگەریەوەی لەسەر خەڵکی، داستانێکی لە بوعەلی سینای گێڕایەوە، کە زۆرم بەدڵییەوە نوسا. گوتی لە یەکێك لە شەوە هەرە ساردەکانی زستانێدا ئەبوعەلی سیناو شاگردەکەی پێکەوە دە ژوورێکیدا نوستبوون؛ لای نیوە شەوێ ئەبوعەلی سینا لە تینوان لە خەوێ رابوو و داوای لە شاگردەکەی کرد ئاوی بۆ بێنێ؛ لەبەروەی شەوەکەی زۆر ساردبوو و شاگردەکە نەیویست لەجێیەکەی بێتە دەرێ بیانوویێکی بۆ هێنایەوە کە تازە شامت خواردووە و ئاو کیلۆسی و کیمۆسی کۆ ئەندامی هەرست روونتر دەکاتەوە و زیان بە هەرسی خواردنەکە دەگات- کورتییەکەی ئەوەی لە خۆی فێرببوو پێی فرۆشتەوە.سەعاتێك تێپەڕی، دیسانەوە داوای ئاوی کردەوە؛ شاگردە بیانوویێکی دیکەی هێنایەوە- هەروا بەم جۆرە دوو سێ جاری دیشی داوای ئاو لێکردەوە، بەلاٚم ئەو هەر هەڵنەستا، تا بەیان ئەنگوت و دەنگی بانگی لە مزگەوتێوە بڵند بوو. ئەودەمی بە شاگردەکەی گوت: ((تۆ هەمیشە بە من دەڵێی بۆ داوای پێغەمبەرایەتیە ناکەی- ئەوا ئێستا وەلاٚمت دەدەمەوە. کەسێك داوای پێغەمبەرایەتیە دەکات کە دوای تێپەڕبوونی چەند ساڵ بەسەرمردنیدا، بۆ بەجێ گەیاندنی فەرمانەکانی، خەڵکی بەو سەرمایە سەختەوە بچنە سەرمنارەی و بانگی بڵێن، و بە ئاوی سارد دەستنوێژ هەلگرن، و نوێژان بکەن، نەك وەك ئەوەی داوای ئاوێ لە شاگردەکەی بکات و ماوەی چوار سەعاتان هەمەجۆر بڕوبیانووان بێنێتەوە تا لەجێی نەیەتەدەرێ)... نا، ئەوانە پێشەوایانی دەوروبەرەکەیان بووینە. هەر ئەو شێخ و مەلایانەی کە ئێمە وا بەم جۆرە لەبەردەمیاندا ملکەچین بەشێکی گرنگی ژیانی ئەو خەڵکەن: یەکی یەك دوو ئایەتی دڵنەوازییەیان بۆ دەخوێننەوە و ئازارەکانیان دادەمرکێننەوە. بەلانی کەمەوە خۆ ئەوانە یەك دوو ئایەتیان هەن- ئێوە چتان هەیە؟

((خوداوەند چاکترین پەنایە)). و ئەوانیش خۆ بە خودای دەسپێرن، ئەگەر خۆ بەوی نەسپێرن چ بکەن؟ ئیدی ئەوە ژیانە، تێگیراویە، دڵنیاییە، ئەمنیەیە، سەربازییە، ئێش و ئازارە، نەخۆشییە- هانا بۆ کێ بەرێ؟ کاروبارو رێ و بانی ئێوە، کات و ماندووبوون بەفیڕۆ دەدات، هەرچەندە بۆ خۆتان هەستی پێناکەن. چونکە ئێوە وافێرکراون و واتێگەیەنراون کە گوایە هەر

ئەورۆ و سبەیەکە و ئیدی کار تەواوە... بەلاّم نا، کار و ماندوو بوون بەفیڕۆ دانە. خەڵکی ڕانەهاتوون، کاریان نەکردووە، ئەزموونیان نییە. ڕەنگە سەردەمانێکیش کەسانێکی دیکەی واهاتبن و شتێکیان گوتبێ- هەر بەقسەی خۆت، وەك مەزدەك- بەڵێ هاتوون و شتێکیان گوتووە و ڕۆیشتوون، و بەدبەختی و چارە ڕەشی و بێنەواییەکە بۆ ئەمانە (ئەم خەڵکە) ماوەتەوە. بەهەرحاڵ مەلایەکان هەرنەبێ پەیمان و بەڵێنی ئەو دنیای دی دەدەن، کە هەموو بەتاقیکردنەوە بۆیان دەرکەوتووە و دەزانن کە درەنگ یا زوو کۆچ دەکەن و دەچنە وێ. ئەوەشت هەر لە بیر نەچێ کە هەر ئەوانە بوون پارێزەری ئەو فەرهەنگ و ئەدەبیاتانەی کە ئێوە وا ئیمرۆ بۆی دەگریەن و لە تاوانیان نەماون. بوون و ژیانی ئەمانەش وەك هەر شتێکی دیکە لایەنی چاك و خراپی خۆیان هەیە؛ نابێ هەر ڕاست و ڕەوان و یەکسەرە تاوانبارکرێن و فەرمانیان بەسەردا بدرێ. هەر لەوجێیەی کە ئێمەی لێین، هەر ئەوانەبوون کە لە بەرامبەر هێرشە یەك لەدوای یەکەکانی مێژوو، پەیوەندی کۆمەلاّیەتی ئەو میللەتەیان پاراستووە، و هەر بەقسە قەڵەوەکانی خۆتان ئەمانە چیمەنتۆی نێوان ئەندامەکان و تاکەکانی کۆمەڵ بووینە... هەرنەبێ خۆ بەلانی کەمەوە پارێزەر و چاودێری ئەفسانە میللییەکان بووینە...)) ((نەخێر، وا نییە... ئەوشتانە زیاتر کاری گۆیندەو نەقڵ بێژ و حەکایەتخوانان بووە...)).

((بەهەرحاڵ، هەر ئەوانە بوون کە ئەو ئەفسانانەیان نووسیونەوە و لە ونبوون و لەناوچوونێیان ڕزگار کردوون... ئەمانەش لەپێشدا هەر نەقڵ بێژ و حەکایەتخوان بوون... ئێستاش هەروان... خۆ هەموو هەر مامۆستا نین...)).

((بەڕێزتان پێتان وا نییە کە ئەو جۆرە قسانە زۆرکرابن، و خەڵکی لە ئەندازە بەدەریان گوێ لە دوعایان بووبێت، و کەچی دوعاش هیچی پێ نەکرابێ و هیچیشی لە دەست نەهاتبێ؟)).

ئاغای سلێمانی سەرێکی بادا. گوتی: ((ماشەڵلاّ- دوای ئەو هەموو قسانە تازە دێیەوە سەر قسەکانی ڕەحمان گاپەرستی! ئەمن دەڵێم چی و ئەتو دەڵێی چی! ئەمن دەڵێم دەست تێوەردانی بیروباوەڕی خەڵکی کارێکی چاك نییە؛ ئەمن دەڵێم خەڵکی باوەڕیان بە حەزرەتی عەبباس و حەزرەتی غەوس هەیە. جا ئەگەر تۆ حەزت لێیە، هەر گاڵتەت پێ بێ! بەو گاڵتە بازیانە ناکرێ و ناتوانرێ خەڵکی لە بیروباوەڕیان بکرێن و لادرێن. باشە قەت جارێکت لەخۆ پرسیوە کە هەر ئەو ڕەحمان گاپەرستە بۆ نوێژان دەکات و ڕۆژونیش دەگرێ؟... بۆ خۆشی نازانێ- من



ئێشم بە ئا ئەمەیە- بەو شتانەی کە تۆ دەڵێی لە ویژدانی فلاّنیدا چۆتە خوارێ و ڕۆچووەو ماوەتەوە... چیرۆکەکەی ئەبوعەلی سینای کە بۆم گێڕایتەوە؟... بەڵێ جەناب، زۆربەی زۆری خەڵکی باوەڕیان پێیەتی. باوەڕیان وایە ئەوکاتەی کە جەواڵە گەنمێکی بڵند دەکەن، هەرکە هاواریان کردە حەزرەتی غەوس ئیدی ئەو زوو بەهانایانەوە دێت و دەیانگاتێ و بارەکەیان سوك دەبێت؛ کە لە ئەسپێك یا ولاّغێکی دەپەڕن و بەردەبنەوە هەر کە ناوی حەزرەتیان هێنا ئیدی ئەوە ئەو دەگاتێ و کارێکی وادەکا چ جێیەکیان ئازاری پێنەگا، خۆ ئەگەر ئازاریشیان بگاتێ ئەوە کەمتریان بگاتێ. ئەمانە هەمووی هەست پێدەکەن، چونکە باوەڕیان وایە. ئیدی ئەوە پەیوەندی بە خودی ئەوانەوەیە. ئێمە وەکیلی ئەو خەڵکە نین تا هەست و نەستی خۆمان لەجێی هەست و نەستی ئەوان دانێین. لەبەر ئەوەی بڕوایان وایە وا هەست دەکەن کە هیچ گومانێکی تێدانییە و هەر دەیانگاتێ. بەدبەختیە زەمانەی دەوەیدایە کە ئێوەو ئەوانەی وەك ئێوە پێیان وابێ کە حەزرەتیش وەك فەڕەنگی یا ((هاوڕێیان))ی ئێوە بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانی ڕۆژێ ڕەفتار بکا- و نەگاتی! جا ئەگەر وابوو ئەوە دیارە دەکەون و ملیشیان دەشکی... ئێوە دە چ دەگەن، بۆ پێتان وایە، چونکە دوو کتێبۆکەی حیزبیتان خوێندوونەوە بە دەردی کرمانجەکانی لای خۆمان دەڵێن ئیدی حەزرەتی عەبباس ((ئا))، پف))؟ ئێوە هەڵەکانتان ئالێرە دایە! ئێوە دەم دە مێژووی وەردەدەن، و لە بابەت تەکامولەوە دەدوێن، بەلاّم من دڵنیام یا ئەوەی نووسیویانە هیچ نییە، یا ئێوە لینگە و قووچی تێگەیشتووون. لەوانەیە ئێوەش هەروەك مەلای گوندی، ئەوەی دەیخوێننەوە تێینەگەن؟ ئێوە چووزانن کە حەزرەتی عەبباس لە کوێڕا هاتووەو چۆن بۆتە حەزرەتی عەبباس. بۆ ئێوە پێتان وایە لەبەر ئەوەی لە دەشتی کەربەلایە هەردوو دەستیان بڕیونەوە بۆتە حەزرەتی عەبباس؟ بۆ مەگەر بەدرێژایی مێژوو تەنیا هەر ئەو دەستانەی ئەویان بڕیونەوە؟ نا، گیانە خەڵکی ئەوە هەزار ساڵە دەگەڵیدا دەژین، و هێناویانەتە ناو ژیانی خۆیانەوە؛ وایان کردووە بارانیان بۆ ببارێنێ و مانگای ئاوسیان بەساغی بۆ وەسەرگوان بێخێ... ئەمانە شتێکی کەمن؟ بەلای ئێوەوە ئەوەش هەر کەمە کە دوای هەزار و چەند ساڵ هەر کە دەمت کردەوە گوتت ((بە حەزرەتی عەبباس!)) ئیدی بەرامبەرەکەت دەستە پاچە دەبێ و بە پەشۆکاویەوە دەڵێ ((نا، نا، سوێندێ مەخۆ —ڕازیم- سوێندێ مەخۆ!)) وەك بانگی ماریت کردبێ، بێت و پێوەیدا؟ چونکە نایەوێ حەزرەتی عەبباسی دەو شەڕەی وەردەن و ناڕاحەتی کەن... ئێستا...)) ئەمجارەیان بە ڕوخسارێکی زۆر ڕاشکاوانەوە دەبیر و

خەیالاْنەوەچوو؛ تاوێك راما، دوایە سەری هەڵێنایەوە، و دەستی پێکردەوە: ((خودا نەکا رۆژێك لە رۆژان ئێوەو نموونەکانی وەك ئێوە سەربەست و ئازاد بن! چونکە ئەودەمی بەو جۆرە بیروڕا و بۆ چوونانەتان حوکمەتی هێندەی دی دڕتر دەکەن. هەر لەبەر ئەو راستیەشە کەمن باوەڕم وایە سەربەستی و ئازادی ئێوە، بەلانی کەمەوە بۆ کەسانی دی زیانبەخشە؛ چونکە ئێوە بەکەمی رازی نین، زۆریشتان نادەنێ، مەگەر ئەوە کە ئەعالی حەزرەت کتوپڕ شێت بێت و جێی خۆی بۆ سەرۆکی حیزبەکەتان چۆڵ کات و واز لە سەڵتەنەت بێنێ و بڵێ... فەرموو جەنابی سەرۆك!)) هەروەك فەرموو لە یەکێك بکات، بەدەست فەرمووی لە سەرۆکی خەیاڵیی دەکرد: ((فەرموون، تکا دەکەم، بەندە بە ئیجازەی سەرکار هێندێك هەست بە نەساغیە دەکەم. منەتبار دەبم ئەگەر بفەرموون و سەڵتەنەتێ قبوڵ بفەرموون!)) ئەوانەشی هەموو بە جۆرە ئاوازێکەوە، و بەسەرو دەست راوەشاندن و گاڵتەجاڕی و پێکەنینەوە دەگوتن. لەبەر ئەوەی کە راناوەستن تا کارەکان جێی خۆیان بگرن... بەیەك دوو هەنگاوی کارەکانیش قایل نین... یانی ((هاوڕێیان))ی گەرمە تەریقەت رازی نین... بەڵێ یا هەر ئێستا، یا هەرگیز! ماشەڵلاٚ... بەوەی دەڵێن... ئەرێ ناوی چ بوو... بەوەی دەڵێن دیالەکتیك! بەوەی دەڵێن بەرنامەی شۆڕش! کە ئاغا بۆ خۆی بیپێوێ، بۆ خۆی لێیکاتەوە، بۆ خۆی بیبڕێ، بۆ خۆشی بیدروێ و هەرخۆشی لەبەریکا... بەڵێ کەوا، هەی کەوا- زۆر پیرۆزە، بەواتای تورکان چۆخ موبارەك! بەوەی دەڵێن ئایندە بینی تەکامول!... هەر لە ئێستاوە ئاغا نەبۆتە هیچ، کەچی گاڵتە بە ئایین دەکا... بەڵێ، تەکامول!)).

کوڕەکەی بێدەنگ و هەڵپنمابوو. من دڵنیابووم کە رێزی لێدەگرت دەنا دەیتوانی هەر رایماڵێ. سەر و چاویشی وای پێشاندەدا کە هەر ئێستا نا ئێستا دەتەقێتەوەو دەیکاتە تەپوتۆز. بابەکە لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: ((بەلای منەوە...)) پێکەکەی هەڵدا، دەموچاوی تێکنا، لێوەکانی هەڵمشتن... ((بەلای منەوە شەریف موکری زۆر لە ئێوە ئاقلاٚنەتر رەفتار دەکا...)) شەریف موکری دزێکی هێندە بەوەج بوو داستان و سەربوردەی لێ کەوتبوونە سەر دەمەوزاران. بەڕوومەوە پێکەنی: ((حوسێناغا، دەزانی لە یەکێك لە دزییەکانیدا چ شاکارێکی نواندبوو؟)) دیاربوو ئەو سەرگوزەشتەی لەپێشدا بۆ کوڕەکەی گێڕاوەتەوە، کوڕەکەی پێکەنی، یانی کە بیستوومانە.



گوتم: ((نەخێر)).

((بەڵێ، هەر ئەو دزە هێشتا بە نووسین وەکالەتی تایبەتی بۆ ئاغایان نەکردووە تا کاروبارەکانی بۆ راپەڕێنن —دەگەڵ ئەوەشدا ئاغایان قبوڵیانە ئەو زەحمەتەی لە باتیان بکێشن و کاروباری دزییەکەی وەئەستۆ بگرن...)) (هەموو زەردەیان دێتێ) ((بەڵێ، هەر ئەو دزە نەفامە شەوێکی بۆ دزیە دەچتە ماڵێکی. لە پارچە بەڕەیەکی بەولاوە هیچی دیکەی وەبەر دەستان نایە، ئەویش دووکەسی لەسەر نووستوون- کەواتە هیچ. لەلایەکی دیشەوە چ بکا، ئەو هەموو رێیە هاتووە، چۆن بەدەستی بەتاڵ بگەڕێتەوە، ئەدی ئەو هەموو زەحمەتەی بە دیوار هەڵگەڕانیێ چ لێبکا، دەبێ هەروا بەدەستی بەتاڵ بگەڕێتەوە! باشە... چ بکا، چ نەکا... بەهەر دەردە سەریەك بووە جێی خۆی دە نێوان هەردوو نووستووەکاندا دەکاتەوەو تێدەخزێ... زۆرچاکە، ئەوە ئێستا جێ پێیەکی هەیە! ئەوجا وردە وردە، لەسەرەخۆ؛ ئانیشك ولاکەلەکان، گوایە نووستووە، زۆر بە سانایی، یەکێکیان لەسەربەڕەکەی وەلادەنێ... ئەوجا دێتە گیانی ئەوەی دییان، و هەمدیس ئەوەشیان بە هەمان دەستوور و لەسەرەخۆ و هێورهێور، لەبەڕەکەی دادەبڕێ- و بەڕەی تاودەداتێ و پەنابەخوا هەی لە لینگان دەکا و بڕۆ و نەیەوە-! ... بەڵێ، حەزرەتی ئاغا، ئێوەش دەپێشدا دەبێ جێ پێیەکی دە نێو میللەتیدا بۆ خۆتان وەکەن، ئەوجا وردە وردە، زۆر سروشتیانە، بێ ئەوەی کەس هەست پێبکات و بزانێ میللەتی بەرەو ئەوجێیەی لێخوڕن کە دەتانەوێ. با ئەوەندەش هەر بڵێم کە دەبێ و وەرزەکەشی دەگەڵ ئەوکارەیدا گونجاوبێت، نەوەك هەر کە کەلەکەی خاوەن ماڵی لەبەڕەکەی جودابۆوە بکەوێتە سەر زەوییەکی سارد و سڕو لەسەرمان وەئاگا بێتەوە، و بەدەستی بەتاڵەوە هەڵێن؛ چونکە خۆ کارەکەی ئێوەش هەر جۆرە دزییەکە، هەروەك دزییەکانی شەریف موکری، ئەوەندە نەبێ کە ئەو دەزانێ چ بکات، بەلاٚم ئێوە نازانن)).

پێکە ئارەقێکی دیکەی تێکردەوە و یەکسەرەهەڵیدا، کەوچکە ماستێکیشی بۆ زاری برد و گوتی: ((حوسێناغا دەبووری، سەرم ئێشاندن. ئەو جۆرە دەمەتەقێیەمان دەگەڵ ئاشنا و رۆشنایاندا هەیە؛ لەبەر هێندێش دەمانەوێ ئەو شتانەی کە نایانزانین لە یەکتریەوە فێربین- بەزاراوەی ئێوە، بیروڕایان دەگۆڕینەوە)). سەیرێکی کوڕەکەی کردو پێکەنی. ((سەربوردە و حەکایەتیش هەروا لەخۆوە نەگوتراون؛ دەحەکایەت و چیرۆك و سەربوردە و ئاواز و

گۆرانییەکانیشدا هەر راستییەك هەیە، بەلاّم ئەو راستییە لەسەرەنجامی بەسەرچوونی زەمانە و دەماودەم هاتنیّدا و کالّ و تۆخ بوونەوەی رەنگ و رواژیان ویّنە راستییەکەی هەوەلّیّیان هیّندیّك گۆڕاوە. ئەم راستییە زیاتر دەچیرۆکەکاندا وە دەردەکەویّ... ئیّوەی لاو دەبیّ ئەوەی لەمە چاکتر بزانن!)) دیسانەوە بەڕووی کوڕەکەیدا پیّکەنینەوە. ئاویّتەکردنی چیرۆك و بەسەرهاتان دەقسە و بابەتەکاندا یەکیّك بوو لە پسپۆڕییەکانی ئاغای سلیّمانی و کوڕەکەشی بەو شتانە زۆر قەلّس بوو. بەلاّم من حەزم لیّبوو.

((بەلّیّ، دەبیّ واز لە قۆناغی منداڵییە بیّنین و دنیا بەو شیّوەی کە هەیە سەیرکەین. دیارە خەیاڵیش خۆشە- خەیاڵیش بەشیّکی ژیانە؛ بەشیّکی گەورەشی. پیّت وابیّ جلّەوی حوکمەتیت بەدەستەوەیە، یا دەیگری- ئەمەش خراپ نییە؛ ئەمە هەر بۆ خۆی گیانی بەرزەفڕی دەنویّنیّ، هەرچەندە پیّم وا نییە بەو بیروهزرەوەی کە دەمیّشکتدایە زۆر دەگەلّ ئەو خەیاڵەیدا ریّك بیّتەوە... بەلّیّ، باشە، بەلاّم بە مەرجی وەی کە هەمیشە ئەوەی بزانی کە پیّیەکانت لەسەرزەمینەی راستییەکانە، چونکە ناتوانی تەنیا هەر بە خەیاڵەوە و لەسەر خەیالّ بژیت. چیرۆکەکان هەرچەندە سادە و ساکاریشن، بەلاّم پڕن لە پەند و ئامۆژگاری، هەرچەندە کوڕگەل، یانی لاوی وەك ئیّوە هاوتەمەن، لیّتان خۆش نایەن و پەسەندیان ناکەن. زمان هەرچەندە ئالّۆزو شیّواوتر و تیّنەگەیشتووانە تربیّ هیّندە زیاتر بەلای وانەوە سەرنج راکیّشترە. رەشە خەلّکەکەش دە ((ئەفسانەکان))دا توشی نموونەی زۆر لەو جۆرە کەسانە دەبنەوە: ئەفسانەکان چەند ناماقولّتر بن هیّندە سەرنج راکیّشترن. هەربۆیەیە کە ئەفسانە گۆ بەجیّ و بیّ جیّ واژەی قەلّە و قەلّەو و هەللەق مەللەق دەقسەکانییەوە دەگوشیّ- ئەوە قەیناکا کە بۆ خۆشی تیّیان ناگات و نازانیّ چن، گرنگ ئەوەیە کە خەلّکەکە سەرسام و هەوت و هیّڕ کات...)).

کوڕەکەی ئاغای سلیّمانی گوتی: ((بابە، باشە بۆ بەم دریّژدادڕیەی گازاندە لە زمانی نووسینەکانی مە دەکەیت؟)) ((من بەزمانی منداڵانە دوام؛ من نەمگوتووە زمانی ئیّوە بۆ گەوران سەرنج راکیّشە...ئیش بە منداڵان پیّکنایە! گوتم زمانی چیرۆکان سادەیە، دەبیّ هەریەکە و بەزمانی خۆی بدویّنریّ، بەگویّرەی کەش و هەواو وەرز ئیش بکریّت زۆرانیدی بەپیّچەوانەی ئەمەوە ئیشیان کرد و بیّ سەرەنجام، ناکام مانەوە... ئاشنایەکم هەبوو...)) کوڕەکەی زەردیّکی هاتیّ، یانی دیسانەوە کەوتەوە حەکایەتان!



ئاغای سلیّمانی گوتی: ((بەلّیّ... باشە، قەیناکا. بەلاّم هەروەك گوتم تۆ بە پەند و ئامۆژگاری و بارە رەوشتی و کۆمەلاّیەتییەکانی ناو چیرۆکەکان بکەو هەقت بەسەر گۆیندەکەیەوە نەبیّ. بەلّیّ... ئاشنایەکم هەبوو، دەیگیّڕایەوە کە دوای شۆڕشی بالشەویّکی لاوەکان، بەزاراوەی خۆیان، کەوتنە زۆرانبازی و ململانیّ دەگەلّ خورافات- و تەبعەن ((ئاینزا)). دەیگوت دە حەساری مزگەوتیّکیدا درەختیّکی باکۆت وەك هەمان ئەو درەختانەی خۆمان هەبوو- بە پارچە پەڕۆ و پاتالاّن داپۆشرابوو: خەلّکی دەستەو دامانی دەبوون و نەزر و نیازیان لەسەردەکرد و لیّی دەپاڕانەوە تا ((تا))ی منداڵەکانیان بخات و ئیّش و ئازاری باداران چاك کاتەوە... و زۆر شتی دیکەی تریش لەو بابەتانە. رۆژیّکیان لاوگەلیّکی ئائاوا وەك ئیّوە لاو ویستیان رەگ و ریشەی خورافاتان لە بن و بیّخەوە هەلّکەنن و بەمشاری دوو سەرەوە بەسەروەختی درەختەیەوە چوون... ئەوانەی کە لە مزگەوتیشن و خەریکی نویّژانن... ناڕاحەت، تووڕە، خویّنی خۆیان دەخواردەوە... بەلاّم هیچیان لە دەست نەدەهات؛ چونکە هاوڕیّیان شۆڕشگیّڕن، ئەندامی حیزبن، لە هاوڕیّیانن... و کورتییەکەی، بەلّیّ، سەرتان نەیەشیّنم، لاوگەل مشاری دەبەن درەختەی ببڕنەوە. ئاشنایەکەم دەیگوت کە ئەو ئاشنایەی وی کە ئەو رووداوەی بۆ گیّڕاوەتەوە ئەویش هەرکۆنە چەکمەرەق بووە، یانی کۆنە بەلشەویکیّکی دیارو ناوداربوو؛ کاتیّ کە دەگاتیّ و ئەو بەسەرهاتەی دەبینیّ و دەزانیّ کە خەلّکەکە زۆر ناراحەت و هەراسانن و ئیّستا نا ئیّستا بتەقنەوە و هەرایەك بقەومیّ هاواردەکا ((ئەهای، راوەستن!)) ئەمجارەیان کە کوڕگەل دەبینن لەبنەبڕکردنیّ خورافاتی قەدەغە دەکریّن و ((شۆڕش)) کەوتۆتە خەتەرەوە و بۆنی ((لادان)) وەبەر لوتان دیّت، بەسەروچاویّکی ترش و تالّ و ئالّۆز و تورەو تۆسن و هەلّپنماوەوە سەرنج دەدەن! یانی چی، ئەو گالّتە جاڕیە چییە! ئەوە چ لادانیّکە! ئەدی بڕیار نییە دەگەلّ ئاینزا و دەگەلّ خورافاتدا ململانیّ و زۆرانبازییە بکەن! بەلاّم... بەلاّم یارۆ کابرایەکی سەر بەدەرەوەیە و زۆری دەست دەڕوا، و هیچی دەگەلّ ناکریّ.

ناچار، خۆشی و ناخۆشی، دەست دەگرنەوە، پیرەمیّرد دەلّیّ: ((ئەو درەختەی بۆ دەپڕنەوە؟)) چی کردووە وامشارتان بۆ هیّناوە؟)) دەلّیّن: ((خەلّکی دەستەو دامانی دەبن، لیّی دەپاڕیّنەوە- ئەوە سومبولی کۆنە پەرستییەیە!)) پیرەمیّرد دەلّیّ: ((باشە، با دەخیل و دەستەو دامانی بن؛ ئیّوە بۆ خۆتان دەلّیّن دەستەودامان و دەخیلی دەبن؛ ئیدی ئەوە دیارە ئیدی، دەخیلی دەبن؛ خۆ ئەو ناتوانیّ قۆلّ و بالّ راوەشیّنیّ و نەهیّلّی دەخیلی بن، هەرلەبەر ئەوەی کە هاوڕیّیان پیّیان

ناخۆشە و دەگەڵیدا ناگونجێن!... پیاوینە، ئێوە تائێستا داو دەرمانێکتان داوەتە ئەو پیرێژنە و منداڵەکەی، نۆبەتێی منداڵەکەیتان چارەسەرکردووە، دەرمانێکتان بۆ لاق و لەتەری خۆی هێناوە، تابێی و ئەوەندە هۆیەی ئارامی و دڵنەواییەشی لێ بستێنی؟ هەرکاتێ داو دەرمانێکتان هێنا و چارەسەری هات ئەوددەمی ئیدی پێویستی بە ململانێی ئێوە نییە- هەر بۆ خۆی نایە. خۆ ئەگەر هەر هاتیشەوە و لەخۆوە دەستەودامانی بۆوە ئەوە شتێکی دیکەیە- ئەوددەمی دیارە نەنگییەکە لە خودی درەختەکەوەیە- ئەوددەمی هەمدیس شتێکی دیکەشە؛ ئەوددم بیبڕنەوە، ئەوکاتیش هەردەبێ لە هۆی بڕینەوەکەی هەر بگەڕێن، نەك لەدوایە بڵێن نەمانزانی و بێن گوناهی نەزانین و تێنەگەیشتنەکەی خۆتان بەملی ویدابێنن. تا ئەو کاتەی داودەرمان و چارەسەرییە دێنن دەبێ ئەو هەردەستە و دامانی درەختەی بێتەوەو لەوی بپارێتەوە، خۆنایە دەستە و دامان و دەخیلی ماشەڵلاَ ئەو نێوچەوانە ترش و تاڵە پڕ چرچ و لۆچەتان بێتەوە!...)) بە کورتی، درەختە، بێ پشت و پەنایەکە رزگار دەکات. بەندەش هەر ئەوەو عەرزدەکەم. دەڵێم ئەگەر بێت و بە شێوەیەکی ئاقلاَنە بێن و زەمینە خۆش کەن و لەخۆوە خەڵکی تووڕە و تۆسن نەکەن ((درەختی خورافات)) بەقەدەکەی خۆیەوە دەڕزێ- بەلاَم خورافات، ئایین نییە- ئێوە دەبێ ئەوەی چاك بزانن... قسەکانی من هەر ئەوەن)).

کوڕەکەی گوتی: ((بابە، بۆ خۆشتان دەزانن. خەڵکی بێکارە لێرە یەکجار زۆرن و خەڵکی هیچ لەوە سەرسام نابن کە هێشتا کەسانی مفتەخۆر و ملهوڕ دەدنیایەدا هێندە زۆرن، و هێشتاش ئاگایان لێ نییە کە، هیچ ملهوڕییەك نییە دەدنیایەدا درم نەبێت، جگە لەوەش کە ملهوڕی درمە ئەدی گێل کردنێ خەڵکی و بەهێڕەبردنیان کە نەك هەر درمە بەڵکە بە قوڵایی و ناخی ناخدا رۆدەچێ و رەگ و ریشە دادەکوتێ. ئەوانە مێشکی ئەو خەڵکی خودایە وادەئاخنن و بە شێوەیەکی وایان لەلا دەڕازێننەوە کە نەتوانن بەخۆیان و مێشکی خۆیاندا بێنەوە، هەرنەبێ بەڵکە ئێ سەرسامییەك بیانگرێ و هۆشێکیان لەو گێل و وێل کردنەیان بە بەردابێتەوە بەرێ. ئێمە تەنیا ئەوەمان دەوێ ئەم کارەبکەین: بروسکەیەکیان بەمێشکیدا بێنین، تا وەئاگابێتەوە. بەس نییە، تاکەی؟... ئێوەش هەروەك من دەزانن کە ناتوانرێ کارێکی بکەی و تێوە نەگلێی. ئەو کەسەی کاردەکا بێگومان هەڵەش دەکات، تێشەوە دەگلێت- ئەمە راستی کارەکانە. ئێوە دەڵێن کارتان بەکاری کەسەوە نەبێ، خۆتان لە هەموو شتێکی دوورخەنەوە، بارودۆخ و گوزەران هەر بۆ خۆی، لەخۆڕا، چاك دەبێت... بەلای منەوە ئەمە هەرگیز راست نییە)) ((باشە تۆ بۆ



خۆت دەڵێی تەنتەنە و بەنبەنە... تەنتەنە و بەنبەنە هیچ کاتێك بەشێك نین لە خوو و خدەو ناشن... ئێستا واز لەوەی دێنین کە داخوا بەلای منەوە چ شتێك راستە یان نا؛ جا یا پێگەیشتنی سروشتی راستە یاپێگەیشتنی دەستکرد. من لەمبارەشەوە هەروەك باوە دەگەڵ ئێوەدا نیم. من باوەڕم وایە کە ئەو تێهەڵدان و خەڵك لێخوڕینە بەزۆری و بەزەبری گۆپالان و وەپێش خۆدانیان و سەرانە و باج لێ ئەستاندنیان بۆ جلوبەرگ گۆڕین و ئەو جۆرە شتانە سەرەنجامەکەی لەوەی چاکتر نابێ کە دیتوتانە. من پێم وایە ئەگەر خەڵکی بۆ خۆیان پێویستیان بە شەپقەی بێ ئەوە بۆ خۆیان دروستی دەکەن، هەر راست وەك ئەو ((مێزەر)) و رانکوچۆغە کوردییەی کە خۆمان دروستمان کردوون. پێویستی ژینگە وایکردووە کە بەسەر عەرەبانیدا بسەپێنێ چەفیە و عەگالی لەسەرنێ، ئێستا تۆ وەرە بەزۆر شەپکە و کلاَو کەپی لەسەرنێ. باشە، بەوەی دەڵێن کاری ناسروشتی و بابی یارۆی لە قەبری دەردێنێ. من ئێستا لەوەش بەولاوەتر دەچم و دەڵێم ئەگەر ژینگە فەرمانی کردبایە دەبوو خەڵکی هەر بۆ نموونە یەخچاڵ ((سەللاجە))یان دروستکردبایە و ئیدی پێویستی بەوەی نەدەکرد بچن لە دەرەوێڕا بێنن. دیارە پێویستیان نەبووە بۆیە دروستیان نەکردووە. مرۆڤ کاتێ کە پێویستیی ناچاری کرد تیروکەوانی داهێنا. گوللەی داهێنا، و دوایی بەقسەی ئێوە هەنگاو بە هەنگاوی تەکامول، ئەو ئابزار و ئامێرانەی هەموو پێکەوەنا، و تەواوی کرد...)) ((راست دەفەرمووی. بەلاَم ئەوەش راست نییە هەموو بێن دابنیشن و بەسەرخەتێکی دابێنەوە- هەرکەسە لەبەرەخۆیەوە. یەکێك پێش دەکەوێ ئوتومبێل دادەهێنێ؛ ئەوانیدیش نابێ هەموو بێن و گوێ نەدەنە کارەکەی و بەهیچی دانێن و بۆ خۆیان سەربەخۆ دیسانەوە لەبناوانێڕا دەست پێبکەنەوە، تا سەر لەنوێ بگەنەوە ئەو سەرەنجامەی کە ئەویەکەی گەیوەتێ و ئوتومبێلی داهێناوە. ئاڵوگۆڕی فەرهەنگی یا زانستی، یا تەنانەت پەیوەندی و بۆنە مرۆڤایەتییەکان، هەموو تێکڕا هەر بۆ هێندێیە کە مرۆڤ سوود لە ئەزموون و تاقیکردنەوەکانی یەکتری وەرگرێ. ئەگەر بڕیار وابێ هەرکەسە بۆ خۆی هەمەچیزە بێت و سوود لە تاقیکردنەوەی کەسانی دی وەرنەگرێ، بۆ نموونە هەریەکە و بۆ خۆی بێت و ئەوە تاقیکاتەوە کە ئاو لەدوو توخمی هایدرۆژین و ئوکسیژین، و لەژێر کاریگەری هەندێ مەرجی تایبەتیدا، پێك دێت، ئەوە مرۆڤایەتی تا هەتایە هەر لەو جێیەی دەبێ کەلێی بووە... کاری کەلەپووری فەرهەنگی و زانستی، یا سات و سەودای فەرهەنگی ئەوەیە کە پێش لە دووبارەکردنەوەی بێ جێ بگرێ.

((ئافەرین!)) ئەوە بەبێ چەندوچوون، خۆم بووم.

((قبوڵە! قسەی من دەربارەی پێگەیشتنی زۆرەملێی و ناسروشتییە. دیارە ئەوەی دەزانین کە کەسانێك هەن ئاروێ و تەماتە و پرتەقاڵی دەچلەی زستانێدا دەکەن... بەلاّم دەکوێدا؟ دیارە تۆ باشتر دەزانی کە دەبێ لەپێشدا ژینگە ئامادەکرێ ئەوجا تۆ و بکرێ، و دوای چەقاندنێ تۆوەکەی دووبارە دەبێ ئاگات لە گونجانێ ژینگەکەی بێ دەگەڵ تۆوەکەیدا، ئەوە بێجگە لەوەی کە دەپێشدا دەبێ خودی ئاروێیەکە و سروشتی ئاروێیەکەت چاك ناسیبێ. خۆ ئەوەتان قبوڵە؟)).

((بەڵێ)).

((حوسێناغا، بەلای ئێوەوەش خۆ هیچ پەرجوویەکی نییە؟)).

هەرچەندە من ئاروێ و تەماتەم دەچلەی زستانێدا نەدیبوو و تا ئەوەدەمیش ئەو جۆرە شتانەم نەبیستبوون بە کەمێك خۆ وەخراندنێوە گوتم: ((نەخێر)).

((زۆر چاکە. بەلاّم بەندە دیسانەوە دەڵێم دەبێ شارەزابی و بزانی، ئەوجا بێنی ژینگەی سازو ئامادەکەی. چونکە بە ناشارەزایی نابێتە هیچ. هەر تەنیا سەرگرتنە... هەردوو دلۆپە باران ببارێت و دوو دەنکە تەرزەی لێدا ئیدی ئەوە هەمووی دێتەوە خوارێ و بانەکە دەتەپێ. ئەوکارەی ئێوەش هەمان ئەوکارەیە کە دەیکەن- دیارە مەبەستیشم ئەو حیزبەیە کە ئێوە دەم دەلایەنگریەیەوە دەدەن- ئەوە دەبێتەوە هەمان شەق خواردن)).

کوڕە جوان زەردەیەکی هاتێ؛ بابەش پێکەنی؛ منیش هەرپێکەنیم، و هەروەك خووی جارانم دەو جۆرەکاتانەدا سەرم بەردایەوە.

ئاغای سلێمانی گوتی: ((مەگەر وا نییە؟)).

کوڕەکەی گوتی: ((ئێستاکە کردووتانەتە رۆژی خۆتان با وابێ، وەنا)).

ئاغای سلێمانی گوتی: ((من کردوومەتە رۆژی خۆم!؟ ئەوە ئێوەن کردووتانەتە رۆژی خۆتان و داوای شارەزاییە هەمموو دنیا و ناسینی هەمموو دنیایە دەکەن، و هەرچی کاروباری دنیایەیە بەیەك کۆبوونەوەو بەنووکە قەڵەمێکی هەمووی تێك و لێك دەنێن. هەر لەو دەمەیرا کە



ئادەمیزاد ئادەمیزادە تەنیا یەك شتی لە جانەوەرانی دیکە زیاترە... ئەوەش کتێبەکانی خۆتان وادەڵێن... ئەویش ئەوەیە فێرە زمانی ژینگەکەی خۆی بووە و لێی شارەزا بووە، جا هەر لە زمانی باوبارانێوە بگرە، تا دەگاتە دەنگی کێو، و لێڕەوارەکان. ئەمەش بەزاروەی ئێوە یەکێکە لەهۆ و لە ئابزارەکانی مانەوەی خۆی. ئێستا تۆ دەتەوێ بە نەزانی و نەشارەزایی لە زمانی ژینگە بێیت و بژیت... ئیدی ئەوە شتێکی تازە بابەتە!... تۆ بۆ خۆت تاهێشتا دەوروبەری ئەو شارۆچکەیە چاك شارەزای؟... دەوروبەری هەمان ئەو دێیەی چاوی وەدنیا هاتنێت تێدا هەڵێناوەو سەردەمی منداڵیەت تێدا بەسەربردووە و شارەزای و دەیناسی؟ ئەوە باسی جێیەکی دی هەرناکەم کە پێی ئاشنا و شارەزا نیت. بۆیە پێشم وا نییە کە شارەزای ئەوجێیەی نەبی و لێی دووربی، ناشتوانی بڵێی کە درەخت و گیاو گوڵ و جر و جانەوەرەکانیشی دەناسی- هەولێشت هەرنەداوە تا بیانناسی و شارەزایان بیت- بەلاّم زۆر بەڕاشکاوییەوە دەم لە شارەزاییە فلیپین و ئەمەریکا و ئالمان و دیمۆکراتییەت و ئەوجۆرە شتانە وەردەدەیت و دەربارەیان دەدوێی، ئەوە دەگەڵ ئەوەشدا کە هیچ کامێکیانت نەدیوەو...)).

((پێویست بەدیتنێ ناکا، تەمەنی مرۆڤ هێندەی بە بەرەوە نییە ئەو هەمموو کون و کەلەبەرانەی دنیایە بپشکنی. کتێب بۆ ئەوەیە، دەنا خۆ کیشوەرە بەستەڵەکەکانیشمان هەر نەدیون. کەسانی دیکە چوون و پشکنیویانن و ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانیان بلاّوکردوونەوە؛ بەندە و ئەوانەی وەك ئێوە دەیانخوێنینەوە، وەك ئەوەیە کە بۆ خۆمان چووبین)).

((بەلاّم دە ئاریشە کۆمەلاّیەتییەکاندا دەبێ هەر بەراستی کۆمەڵگا بناسی و شارەزای بیت و راستەوخۆ دەگەڵیدا بژیت!... بۆ خۆتان دەڵێن تا کەسێك رەگ و دەمارێکی ((پرۆلیتاریا))یی نەبێت هەست بە ئێش و ئازارەکانی کرێکاران ناکات و بەراستی تێیناگات، و نازانێ بۆ دەبێ ((رابەر)) بێت و پێشڕەو... ئێوە دەکێشەی لادێکاندا، یانی سەرەکیترین کێشەی کۆمەڵگای ئێمە، دەگوێی گایدا نوستوون. بۆ نموونە ئێوە پێتان وایە یارۆ هەروا بە ئارەزوو و لەخۆوە گاوگۆل و مەڕ و مالاّتی خۆی دەداتە ئێوە تاشیرکەتی بۆ دروستکەن... ئەرێ بەراست لەبیرم چۆوە لەجیاتی شیرکەت شتێکی دیکەت گوت، وەنا؟)).

کوڕەکەی بەروخسارێکی مەیلە و توڕەوە گوتی: ((کوڵخۆز)).

ئاغای سلێمانی گوتی: ((بەڵێ... تا کەڵخۆزی دروستکەن- یانی هەمان شیرکەت- لەراستیدا هەمان وشتر)). و پێکەنی. ((وەك وشترەکەی مندالاًن- لەبیرتە؟)) ئەودەمی رووی قسانی دەمن کرد: ((ئەوە نییە کەسێو یا هەرمێیەکی لە مندالاًن وەردەگرن تا بۆیان بکەنە وشتر. هەرکەسێو یا هەرمێیەکەیان لێوەرگرتن قەپاڵێکی گەورەی لەسەرێڕا بۆ خواریٚ و ئەوجا لەلاتەنیشتانەوە لێدەدەن و دەیخۆن، مندالە بەستەزمانەکەش هەروا چاوەرێیە و پێی وایە ((مامە)) خەریکە وشترەکەی دروست دەکات... مندالەی بەستەزمان کاتیٚ کە بەخۆی دەزانیٚ سێو یا هەرمێیەکە هیچی وای لێنەماوەتەوە بەگریانەوە قەڵەمبازێکی دەدا و پەلاماری پاشماوەکەی دەدا و دایدەپاچیٚ!... بەڵیٚ، ئەویش مەڕ و بزن و مالاًت و پاتاڵەکەی هەروا بە ئاسانی دەداتە ئێوە تا کۆڵخۆزی بۆ دروستکەن!... یا هەروا ئامادەیە بێت و دەگەڵ چەند کەسێکاندا دەدەستەیەکی نەناسیاودا بچێنێت و بدروێتەوە؟ ئێوە کرمانجان ناناسن؛ لە کرمانجان ماڵ پەرستتر هەر نییە. ئەو دەیەویٚ بەشی خۆی دیاربیٚ. راستییەکەی، ئێوە کە ئێستا هاتوونە پاڵپشتی و کۆمەکییە خوداکەرەم و دەروێش رەحیم و مراد و سۆفی رەسووی، (ئەوانە هەموو رەش و رووتی خۆی بوون) ئەمانە تا چەند دەناسن؟ هەر بەڕاستی دەیانناسن؟ تا ئێستا چوونەتە مالێیان؟... شتێکی دە رۆمانانیدا دەخوێننەوە، کەچی رۆژانە و جلوبەرگیشتان لە ئێمە و مانان دەستێنن- تەنانەت رەنگەکانیشیانتان بۆ هەڵدەبژێرن — دە کۆبوونەوەکانی گەڵ هاوڕێکانتاندا کە ژیانی دەروێش رەحیم و سۆفی رەسووی هەڵدەسەنگێنن، ئێمە دەبینە موڵکدار، یا بەقسەی ئێوە دەبینە دەرەبەگ (فیۆداڵ) و دەروێش رەحیم دەبێتە نیوە بێحاڵ)) (ئەمە واتەیەك بوو کە بەگاڵتەجاڕییەوە بە ئاماژە بەو کرمانجانە (لادێییانە) دەگوترا کەمیانە حاڵبوون) ((و بۆ خۆشتان دەبنە شۆڕشگێڕ؟ بێگومان چاوەڕێی ئەوەشن هەرکاتیٚ لەخێران لە ئایندەدا شۆڕشتان فەرموو و حوکمەتتان بەدەستەوەگرت دەروێش رەحیم ئەوەی لەبیربچێتەوە کە ئێوە کوڕی کێن و بۆ خۆشی کێیە؟ هەی ئافەرین لەو شارەزاییە و ناسینانەتان! ئەویش کەسانێکی وەك جەناب عالی کە چێشتی شلە بە چەنگاڵی دەخوات... داخوا ئەودەمی ئامادەی ئەوەن دەگەڵ دەروێش رەحیمیدا دەیەك لەگەنیدا، پێکەوە، بەدەستی نانی بخۆن!؟ بەڵیٚ ئەوە گوتمان خواردتان و ئەو بەچاوی خۆی دیتی و من بەگوێی خۆم بیستم و باوەڕم کرد! تۆ و ئەوانەی وەك تۆ ئەو چەپەڵی ژیانەتان هەر بۆ هێندەی پێخۆشە، ئەویش لە دووڕا، کە تامی ژیانی خۆتانی پیٚ خۆشتر و بەتام و چێژترکەن... ئەو کاك مستەفاخانەی ئامۆزات!)) (بەبێزو



قێزەوە) ((کە ئێستا بۆتە رۆشنبیر! ئازادیخواز!... ئمممم- بەڵیٚ...! ئەویش لەراستیدا هەر لەسەرهەمان رێچکەی دیکتاتۆران دەڕوات: لەپێشدا یەکسانی ئەوجا ئازادی، دوایەش سڕینەوەی هەردووکیان... ئازادی! هە! هەروەك کۆمەڵگا بورغی بێت هەرکاتیٚ ویستی شل و توندی کاتەوە! ئیدی خۆ نازانیٚ کە ئەم شل کردنەوەیان ئیدی ئەو شل کردنەوەیە نییە... ئاخر چۆنیەتییەکان چوون یەك نین و جیاوازن.

یەکەم تۆ باوکت نیت، منیش ئەو رەش و رووتەی وەك بابم نیم، سەردەمی تۆ سەردەمی بابت نییە... ((سوپاس بۆ خوا کە بەلانی کەمەوە جۆرە تەکامولێکت قبوڵە!)).

((من هەمیشە قبوڵم بووە، بە مەرجێك تەکامولی راستی بووبێت، نەك تەکامولی کەرانە. هەرنەبیٚ ئەوەی دەزانم ئەگەر بابم بەسەری قۆتی (رووت) چووبایە جێگایەکی گاڵتەیان پێدەکرد و ئێستا ئەگەر بۆ خۆشم بەکلاوەوە بچمە جێیەکی گاڵتەم پێدەکەن... بەڵیٚ، ئاغا، ئیدی ئەو شتانە هەموو تێدەگەم و دەیانزانم)).

سیغارێکی لە قوتووەکەی دەرێنا، دایگیراند و یەك دوو چەسپی لێدان، و گوتی:

((بەڵیٚ، زەمانە ئەو زەمانە نییە؛ حاجی ئاغاسی ئەوڕۆ، حاجی ئاغاسی دوێنیٚ نییە؛ شێخ فلانیش شێخەکەی جاران نییە- شاش هەروەتر... ئاغایان دەبیٚ ئەوەی چاك بزانن... بلێ چای بۆ حوسێناغای بێنن... ئەو کوڕەت بۆ کویٚ نارد؟)).

((بۆ مالێ مستەفاخان))ی هەر لە دەرکێوە بە قەرەواشەکەی گوت کە چای بێنیٚ.

((بەلێیٚ، مستەفاخان...! بەڵیٚ، جەنابی حوسێناغا، ئیدی تازە واژەی کرمانج لەوە تێپەڕی بلێ کرمانجە، یا هەژارە، ئێستا تێر و تەسەلە، پولدارە، جاری وایە رەگێکیشی دەچێتەوە سەر نەجیبزادان. جاری واشە نەجیبزادەیە و دەبیسییەوە گلاوە، بە کورتییەکەی هەموو شتێکە. زۆر لەو کرمانجانە لە خودی ئەو جەنابی خانە دەوڵەمەندترن، و دەزانن چ دەکەن. دەشارەکاندا ساماندااران دەبنە سایەنشینی سەرەنێزان، دە دێهاتیشدا دەبنە سایەنشینی خان- کە لەمانادا چ جیاوازییەکیان نییە. ئێمە ژمارەیەکمان لەوانە هەن بەناوی هاودەم، کە لە کوردەواریدا پێیان دەڵێن ((رەشایی))یانی رەشاییە سوپای؛ چونکە چ سەر و سەودایەکیان دەگەڵ زەوی و گاو گۆل و مەڕو مالاًتیدا نییە. ئیش و کاری ئەوانە زیاتر بازرگانی سەرپێیی و قاچاغچیەتییە دە

نێوان شار و گوندەکاندا، و بەهەرحاڵ پێویستیان بە پاراستنێیە، ئەو پاراستنەشیان، ئاغا و تفەنگچییەکانی ئاغا و مەلای ئاواییە: مەلا دەپارێتەوە کە دە کاروبارەکانیاندا هەر سەرکەوتووبن، هەروەها مەلا کاروبارەکانیشیان حەلاڵ دەکاتەوە، و نوشتە و کشتەکان بۆ ژن و منداڵەکانیان دەکات و دوعایان بۆ دەنووسێ؛ ئاغاش لەولاوە پێشگیرییە لە زۆر تفەنگچی دیکەی زۆر بلێ دەگرێت؛ جاری واشە لەسەروان دەگەڵ رەییس ئەمنیەی تێکی دێخن. ئەوانەش هەموو لە زۆر لایەنانەوە لە جەنابی خان دەوڵەمەندترن هەم لەلایەنی پارە و هەم لەبارەی تێگەیشتن و هەست و نەست و زانینێوەش لەوی بەولاوەترن، چونکە ئەوان سەر بەزۆر شاری جۆراوجۆردا دەکەن و دەچنە دیوی عێراقێ و دێن و دەچن و دەگەڵ جۆرەها چین و توێژاندا سات و سەودایە دەکەن. بەلاّم دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هەر هێندە گەینە لای خانی، ئیدی ئەوە خۆ دەکەنەوە گوێلپار و دەست بەسینگەوە بەدوایەکدا ئیکلامێ دەکێشن. ئاغاش وەك هەموان ئەو ئیکلام و پانکردنەوەو کلکەسوتەی وانی پێ ناخۆش نییە و پێشی وایە ئەوە بۆ خۆی شتێکی زۆر نایاب و عەنتیکەیە بۆیە وای ئیکلامان بۆ دەکێشن)).

راستی دەکرد. دەمدیت. دەو شارەچکۆلانەی مەدا تەنانەت ((هاورێی حیزبی))ش هەلۆێستەی دەڕوودا دەکرد، هەمیشە بۆ شتە و پەرداخ و جلوبەرگ و کراس ئوتوکراو کە تەنانەت دەکتێبانیشدا نموونەی نەبوو. ئەوەی دەکتێباندا هەبوو تەنیا خەڵك بوو: خەڵکەکە لەوی خڕ ببوونەوە؛ خەڵکێکی بێ نان و برسی؛ هەر پێستەکەیان مابۆوە... ئەو خەڵکە هەر تەنیا شتێك بوون گیاندار، بێ سەری پادار...

گۆڕەکانیشیان هەروەك خۆیان، بەعەردییەوە دیارنەبوون و بێ ناو ونیشان لەو گۆڕەیدا، ئەوە بێجگە لە گۆڕی ئەو خوا پێداوانەی کە گۆڕەکانیان ئەوەی پێشاندەدا کە خاوەنەکانیان زۆر لەو خەڵکە بەولاوەترن... ((ئاغای مستەفا خانی ئامۆزاشت ئێستا بۆتە رۆشنبیر و ئازادیخواز، و لایەنگری کۆمەڵگا! ئەوە لە کەیەوە؟ لە دوای لێدانی ئەو ژاندارمەوە- لە ژنێ ئەو کرمانجەی! ئیدی ئەوە نازانێ بەو کردارەی هێندەی دیکەی خۆ لە کۆمەڵگای دوورخستۆتەوە. ئەویش دە کۆمەڵگایەکەی خۆیدا هەروەك ئێوەی ((رۆشنبیران))ی لێ بەسەرهاتووە... ئیدی ئەو خۆی لە کۆمەڵگا وەلاناوەو خۆی دەراویشتووە، یانی راستییەکەی ئەوەیە کە کۆمەڵگا ئێقی کردۆتەوەو ئەو ئەوی وەلاناوە. چونکە ئیدی ئەو بۆ کۆمەڵگا زۆر زیانبەخش و ترسناکە. گوایە لەپێش



ئێوەوەشە... مەبەستم لە حیزبەکەتانە)). ئەوجا بەروخسارێکی گاڵتە ئامێزەوە ((بەڵێ، ئێستا سەربەخۆ دەچتە ماڵە کرمانجان و بەخەیاڵی خۆی گوایە تێکەلاّوییان دەگەڵدا دەکات... دە ماڵەکانیاندا ئاسوودەیە... بیستوومە دەستووری فەرمووە هەرکەسێك بەدەنگ ((خان))ەوە بچێت دەبێ جەریمە بکرێ، یانی پووڵی ئەو تاوانی بە دەنگەوە چوونەی بدا...

ئەوە گوایە ئاغا رۆشنبیرە، کەچی خەڵکیش جەریمە دەکات! بەمەش دەڵێن رۆشنبیر! تۆ بیستووتە؟.

((نەخێر)).

((کەواتە گوێت لێبێ، دەچێتە ماڵەکانیان و بە زمانی خۆیانیان دەدوێنێ؛ دەماڵەکانیاندا ئاسوودەیە... ئەو ئاگای لەوەی نییە کە خۆی ئاسوودەیە، بەلاّم ئەوان هەراسانن. هێندەی تێگەیشتن نییە بزانێ کە ئەو لەوان نییە و بە هیچ سرێشێکی ناتوانێ خۆی بەوانەوە بلکێنێ و هەرگیز ئەوە نابێت کە ئەوان ئەو بە ئی خۆیان بزانن و وەك خۆیانی دانێن: ئەو بە کرمانجی لە دایك نەبووە، رەچەڵەکی کرمانج نییە. من بەلێنت دەدەمێ کە کابرای کرمانج دوای ئەو هەموو ماندووبوون و ئارەق رشتنەی دە دێبەرێدا کاتێ دێتەوە کاو لە ئاشەکەی تا لاقانی لێ درێژکات و بە ئارەزووی خۆی یەك دوو قرپان بداتەوە، هەرگیز پێی خۆش نییە سەرەکەرێك لەولاڕا پەیدا بێت و نەیەلێ یەك دوو پیالە چایان دەگەڵ ژن و منداڵەکەی خۆیدا بە ئاسوودەییەوە ژەهری مار کات)).

ئەو قسەی راست بوو. دیارە ئەودەمی من ئەو دووربینی و وردە سەرنجانەم نەبوو، بەلاّم ئێستاکە پێکداهاتنی مستەفاخانم دەگەڵ کرمانجاندا وەبیر دێتەوە بێ ئیختیار دەکەومەوە یادی زیندانێ. شێوەی پێکداهاتنەکەیان راست بەشێوەی پێکداهاتنی زیندانییە بە تەمەنە ئەزمووندارەکان بوو دەگەڵ زیندانییە تازەکاندا: لەدەرێ هەموو رێز و لەسەرەخۆیی و لە ژوورێش هەمووی گاڵتە و گاڵتەجاڕی و بەدگۆیی.

پێکەکی دیشی بۆ خۆی تێکرد، بەلاّم دەرفەتی هەڵدانێی نەما: هات و هاوارێك لە حەسارێوە هەستا. یەکێك لە حەسارێوە بەدەنگێکی بڵند گوتی: ((تەشریفیان لەوێیە؟)) سەرهەنگی

دەرەکی سنووربوو. قەرەواشەکە بەڕاکەراکەوە هات؛ ئاغای سلێمانی زووتر هەستابوو، و ئێمە لەپێش ئەویشەوە.

گوتی: ((حوسێناغا، دەبووری... برایم برۆ بڵێ با تەشریف بێنن!)) من هەر بەو سەرو ڕووە شەرمێونییەوە ماڵ ئاواییم کرد... لەسەر پلیکانەکان دەگەڵ سەرهەنگیدا گەیشتینە یەك، خۆمان لێك لاداو خۆمان بەدیوارییەوە نوساند تا ئەو تێپەڕێ! دیارە دوای تاوێك وام پێشاندا کە ئەو کارەم لەبەرخاتری ڕێزی کوڕی ئاغای سلێمانی بووە، چونکە کاتێ کە تێپەڕی ئەمن رووم گرژ کرد. کوڕی ئاغای سلێمانی هەستی پێکرد. گوتی: ((سوپاس- ببوورە!)) و پێکەنی، یانی چ بکەین، منیش هەر بەو دەردەی تۆوە گرفتارم. بەڵێ، هەر کە نزیك کەوتەوە کوڕی ئاغای سلێمانی دوای سەلامێ گوتی: ((فەرموون!)) ئاماژەی بۆ کردم وەمێنم، و بۆ خۆشی بەرەو پێشەوەی راکرد تا دەرکێ وەکا. دەرگا کرابۆوە؛ ئاغای سلێمانی تا بەردەرکێ هاتبوو.

کاتێ سەرهەنگ چووە ژوورێ کوڕەکەی گەڕایەوە؛ لەسەرلێوی پلیکانەکانەوە بەدەنگێکی نزم بانگی کرد: ((خانزاد!)) خانزاد قەرەواش بوو: (( بە پورێ بڵێ!)) بەزڕ دایکەکەی دەگوت پورێ. بڵێ، با سفرەکەی ئاوەدان کاتەوەو دەبیری نانیشدا بێت؛ و بۆ خۆی بە پلیکانەکاندا هاتەوە. هەر لەوێ پێك هەڵوەستاین. گوتی: ((هاوڕێیەکی حیزبی)) لە تارانێوەڕا هاتووە تا لقێکی حیزب لێرە بکاتەوەو سبەی ئێوارێ لە ماڵێ ئاغای کەریمی دانیشتن هەیە، واباشترە منیش لەوێ بم... گیانەکەمی!... و ((فیعلەن)) خودا حافیز!.

* * *



## (٢١)

لە خەونیش خۆشتر بوو! لقی حیزب کرایەوە، من بە هەموو هەست و نەستێکمەوە دە ژێر فشارێکی وادا بووم هەروەك چۆن ئاوی ناو بۆڕییەیەکی بەری دەگیرێ و ئاوەکەی پەنگ دەخواتەوەو تین بۆ هەر چوارلای بۆڕییەکە دێنێ ئاوابووم، تا لقەکە کرایەوە ئەوجا بەرهەڵدا بوومەوەو هەستم بە لەش سوکییەکی تەواو کرد. ئاخر تاکەی بچمەدەم چۆمی و دەگەڵ منداڵ و پالاّندا خەریکی سێ بازیە بم، یا بەردان بە ئاوی چۆمی دادەم و تێی رامێنم، یا خەریکی مەلەی بم و لەبن دارو دەوەن و تەڕاشاندا وەنەوزان بدەم و سەرخەوان بشکێنم یا لە کۆلاّنەو ناو بازاڕاندا تەشقەڵەی بەلادێییان بکەم و سەریان بکەمە سەرێ؟ ئایا من بۆ خۆم حەزم لەو ژیانەی بوو؟ یا وەك هەر لاوێکی هەر بەپێی لاوەتیەم، دنیام هەموو هەر بە ئی خۆم دەزانی و حەزم لە تفەنگ و فیشەکدان و جوانووە ماینێکی غورد دەکرد تا پێیان بەگژ ((دەوڵەت))یدا بێم، بەرچاوی خۆمم نەدەدیت، بیرم لە سبەینێ و لە ئایندە نەدەکردەوە. بۆ دەبوو هەروەك بابەگیان منیش هەر هەمان ئیشەکەی بابم فێرببم و جێی وی بگرمەوە، یا ببمە چەرچی و مەڕ و بزنم کڕیبانایە و بمفرۆشتبانایەوە؟ دوایە چی؟- ئەوجا وەك بابەگیانی پشتم کووڕ بێتەوە و لیکاوم بەدەمولەوساندا بێتەخوارێ، دواییش حاجییەتی، حاجی مەککەی؟ بەڕاستی من حەزم لەمانە نەبوو- ناڵە و هات و هاوار و داد و بڕۆی هاندانێ بابەگیانم بۆ کارکردنێ ئەوەی تێدەخوێندرایەوە کە ئەویش لە ئەزموونەکانی ژیانی خۆی رازی نەبێت. بەلاّم ئەویش تێمابوو و سەرەنجام بەوە گەیشتبوو کە خەتای کەمایەسییە خوێندنەکەی منە. بەقسەی وی خوێندنەکەی من راستە و راست بە بۆیاغی پێلاّوەکانی ئەبولفەتح خان چووە، کە تا پێلاّوەکانت بۆ بۆیاغ دەکردن لەبەر بۆگەنێ قاچ و گۆڕەوییەکانی هێندەی نەدەما دڵت لە ژێللاّ بێت و هەلێی. بەلاّم هەرکە وشە دەبریسکانەوە روخساری جەناب رەییسیش گەش دەبۆوەو دەبریسکایەوە، و بەر غەبابە چرچ و لۆچاوییەکەی بن چەناگەی پف دەکرد و بەدەری دێخست. باوەڕنامەکەی ئێمەش هەمان کاری لە ئێمە کردبوو. ئاخر ئێمەش هەر بەوەندە خوێندن و فێربوونەی کە ((یەکێك لە بیابانێ توشی سەگێکی تینوو بوو)) یا ((کەری بەستەزمان هەرچەندە بێ تەمیزە)) یا بەوەندە

زانستەی کە ((ئاوی خاوێن ئەو ئاوەیە کە سەوزەی زوو تێدا بکوڵێ و سابوونی بە چاکی تێدا کەفێ بکات)) و لەم بابەتانە، هیچمان بۆ کەس نەهێشتبۆوە و بەهیچێکی ئەو ڕەش و رووت و خەڵکە بێنەوایەی قایل نەبووین. هەموو شتێکمان بە گەزوربەی بڕوانامە و گەواهینامەی دەپێوا و چاکە و خراپەمان بەوان لەمحەك دەدا. ئیدی هەقمان بەسەروەیەوە نەبوو داخوا بێ تەمیزن یان نا، راستییەکەی ئەوەیە مادام بارێ دەبەن خۆشەویستن.

منیش وەك کوڕی ئاغای سلێمانی زەردەخەنە و هەندێ جاریش رووگرژیەکم ئاوق دەکردێ. ئەودەمی ئەو قسانەم هەموو بەلاوەگران بوون بەتایبەتیش کە بێ ئیش و کاربووم. دیارە دوایە تێگەیشتم و دیتم کە ئەودەمیش بە خەیاڵ، راست هەمان ئەوکارەمان کردووە کە دواجار بەڕاستی کردمان: هاورێی کرێکار هاوڕێیەکی چاك بوو، زەحمەتکێش بوو، شۆڕشگێڕبوو، رابەر و پێشڕەو بوو... بەڵام هەرچی بوو، کرێکار بوو، گوناهێکی نەبوو، لە هەموو لایەکی ئەو دنیایە هەمیشە رۆشنبیرەکان چرا هەڵگربووینە؛ گوناهی دەوروبەربوو کە ئەوی بەزەین کوێری هێشتبۆوە و هەلی رۆشنبیربوونی بۆ نەڕەخساندبوو. لەبەرئەوە زۆر سروشتی بوو کە ئێمەی بێ ئیش و کارو بڕوانامە و گەواهینامە بەدەست ببینە دەمڕاستی ئەوان (کرێکاران) کە هەمیشە تۆز و خۆڵیان هەڵدەمژی و ماندوو و مردوو بوون و ناچاربوون ئێمە بکەن وەکیلی هەڵسوراندنی کاروبارەکانیان، خۆ ئەگەر ئەوانیش نەیانکردبایانایە وەکیلی خۆیان، ئێمە خۆمان ئەوەمان هەر بە ئەرکی خۆمان دەزانی- ئەوە ئەرکێك بوو، ئەرك، ئەرکێکی نەتەوایەتی و کۆمەلایەتی، بەرامبەر بە هەر زەحمەتکێشێکی جا لەسەر هەر ئایین و ئاینزایەك بایە. ئێمەش وەك هەر بێکارەیەکی کە بەدرێژایی تەمەنی دەستی نەداوەتە کلکە بێلێکی دەبوایە ستایشی ئارەقە و ماندوو بوون و زەحمەتکێشان بکەین و بەشان و باڵی چەوساواندا هەڵ بڵێین تا بەڕاستی ئەو ئارەقەی دەگەڵ ئارەقی ئێمە و ماناندا لێك جیانەکردبایەوەو ئێمەش لە پەنای واندا سوودێکی ماددی یا مەعنەویمان هەر پێگەیشتبایە.

ئێستا ئیدی ئایندە بەتەواوەتی روون بوو: رۆژێك دێ شوێنەواری زۆر و ستەم نامێنێ، هەموو دەبنە خوێندەوار و دەستەیەك کۆمەڵگا بەڕێوەدەبەن هەموو هەڵبژێردراوی میللەت (پێم وابێ ئەودەمی گومانێکم هەبوو، کە بەم شێوەیە هەرکەسە بەگوێرەی لێهاتوویی، و هەرکەسە بای قنیاتی خۆی وەردەگرێ. ئەودەمی ئیدی ئاغای سلێمانی و ئەوانەی وەك وی گەلۆر گەلۆر



ناخولێنەوەو لەمفتەی بخۆن و دەست لە بناگوێیان نێن و گۆرانییان بلێن و حەکایەتان بگێڕنەوەو مەتەڵەکان لە خەڵکی گرن. ئەوانە هەمووی تێکڕا هاوڕێی حیزبی دەیفەرموون و زۆریشی بەدڵنیاییەوە دەگوتن...

ئەوە ئیدی ئێستا خوێندنەکەشمان شتێکی لێ پەیدابوو. هاوڕێی حیزبی دەیگوت کە کردنەوەی پۆلێك لە ناوەندی پارێزگا یا لەتارانێ دەبەرچاو گیراوە، بۆ ئەو هاوڕێیانە بکرێتەوە کە خوێندەوارن: پۆلی کادیران، بۆ کاروباری لادێکان و قسەکردنێ لە کۆڕو کۆبوونەوەکاندا... خۆ خوێندەواریش لەمە زیاتر کەسی دی نەبوو. ئیدی ئەوە ئایندەش هەم نزیك و هەم روون بوو.

ئەودەمی دە کۆمەڵگا بچکۆلەکەی مەدا خوو و خدە و نەریت وابوو ئەگەر غەریبەیەکی بەناو و دەنگ و ماقوڵ هاتبایە شارەکەمان ئەوە پیاو ماقوڵانی شاری هەریەکە و بەنۆرەی خۆی بۆ شامێیان بانگهێشتن دەکرد- جا بیانناسیبایە یان نا، ئەوە گرینگ نەبوو. راستییەکەی ئەمەبوو کە کابرای غەریبە ئەو شانازییە بەخانەخۆی بفەرمووێ، و خانەخوێش دووسێ رۆژان لە بازاڕ و لێرە و لەوێ خۆی بەو شانازییەوە بادات و خۆی بەسەر ئەموئەودا هەڵشەنگێنێ. بەڵام ئەو دەستە غەریبەی دەگەڵ هاوڕێی حیزبی هاتبوون هەرچەندە هەر غەریبە بوون: پیاو ماقوڵانی شاری حەزیان بەسەردانێیان نەدەکرد: وابڵاوبوو کە حیزبی تووتە (ناحەزانی حیزبی تووده دەیانگوت تووتە- گوایە نازانن. بەڵام لەراستیدا بە مەبەستێکەوە دەیانگوت، چونکە بێژەی تووتە بە تولەسەی دەگوترا) دەیەوێ هەر پێنج پەنجەی دەستان وەك یەك لێبکات، گەورەو گچکەیان دە نێواندا نەهێلێ، ژن و مێردایەتیە هەرلابات... و کورتییەکەی مەملەکەتی بکاتە بالشەویکی! لەبەر هێندێ لە ((هاوڕێ))یەکانی خۆمان بەولاوە کەس رووی تێنەبوون. ئەمەش لەجێی خۆیدا مایەی شانازییە بوو. یەکەمین داوەت کوڕەکەی ئاغای سلێمانی کردی- بە واتەی هاوڕێی حیزبی ((میوانییەکی شۆڕشگێڕانە دەکۆمەڵگەی فیۆداڵ- بۆرژوا))دا... ئەویش دەو دەمەیدا کە، بابی لەماڵ نەبوو، جا یا چووە بۆ گوندی یا ئەو شارەی نزیکیانەوە، و ئەوجا ئەوانیدیش بەدوای ویدا.

دوو سێ رۆژە لە ماڵێ ورتە ورتمە. بەتایبەتی دوێنێ پێنج تمەنم بۆ چاوبەستەکیە دانە دایی. بابەگیان لەوە گەیشتبوو کە هەرگیز ئەو سەردەمە نایەت کەسێك سەرگەورەی یەکێکی دی نەبێ، ئەرباب و نۆکەری نەمێنێ، دەوڵەمەندی و هەژاری هەڵگیرێ؛ لەوەتەی دنیا دنیایە

هەروابووە و هەرواش دەبێ: فەرمانڕەوا و فەرمانبەر، و ئەرباب و نۆکەرایەتی هەربووە و هەردەشبێت. جلوبەرگ و دەموچاو و ناوەکان و جۆری حوکمەتەکان دەگۆڕێن- ئەوە بنەچەکەی تاقیکردنەوەو ئەزموونەکانی بوون. بابیشی ئەوانەی هەر تاقی کردبوونەوەو بەلاّم بەواتای وی بابیشی هەروەك من و ئەوانەی وەك من لەسەرەتاوە هەڵەی کردووە و شەقی هەڵەکانیشی خواردبوو. وەك ئەوەی ئەویش لەرێیەکی دیکەوە گەیبێتە ئەو سەرەنجامەی ئاغای سلێمانی. ئەمانە ئیدی گوێیان لەوەی نەبوو کە هەر ئەو قسەوباسانە و هەر ئەو خۆپارێزیەی ((دەوڵەت)) و تەنانەت خانەکان لە بەداردادکردنیّ خەڵکی و کەسادی بازاڕی و دەست و پیّ بڕینەوەو چاو هەڵکۆڵین و لەملدانی هەروا بە ئارەزووی فەرمانڕەوایەکان سەرەنجامی هەمان شەق خواردنی ((هەڵەکان))بووە. دایی وەك هەر دایکێکی دی دەترسا، هەقیشی بوو. دەیگوت: ((من بۆ خۆم مشتە پێست و ئێسقانێکم لە دوو جوجکانیشم زیاتر نین!)) جوجکە! مەلیحە بەو هەموو زەبەللاحیەی خۆیەوە ببووە جوجکە! و منیش هەر بەواتای خۆی هەزار ماشەڵڵاّ تازە خەتی سمێڵێم دەدا جوجکەی بچووکی بووم! وشەی جوجکەی بە جۆرێکی وا دەگوت کە ئەگەر گوێت لێبایە دەتگوت ئەوە هەبیّ و نەبیّ دە خەیاڵی خۆیدا زەڕنەقووتەی دیوە. ((جوجکە!)) و بەجۆرێکی دەست گرمۆڵە دەکرد هەروەك ئەوە جوجکە چوێلەکەیەکی گرتووە و هەروا تۆزێکی دیکەی رێك بێنیّ، ئیدی ئەوە ئەو ((جوجکە)) بەستەزمانە دەنێو دەستیدا دەپڵیشێتەوە- جا چۆنیشی دەگوت ((جوجکە)) ئەویش بە ئاوازێکەوە، دەمولێوی بۆ وێك دێنایەوەو نێوچەوانی تێك دەنا وەك ئەوەی بڵێی سەرەڕای ئەوەی کە جوجکەشە نەخۆش و بیّ حاڵیشە! بابەگیان دەیگوت: ((باشە، جحێڵە ئیدی، چ بکا؟... خۆ ئەو وەك ئێمە ناتوانیّ لەبەر سۆبە و لەبەر بەرۆچکەی پاڵداتەوەو وەنەوزان بدا. لەسەرمە پێگوتنە... بۆ خۆشی ئێستا گەورەیە، چاکە و خراپەی دەفامیّ. ئێمە ئەوەندەش بۆیە دەڵێین ئاگای لە خۆی بێت و رۆژێك نەیە سەری لەبەردیدا. لەوانەشە ئێمە هەڵەبین. تا لە دواییدا ئەگەر کارێکی کرد، هەروەك ئێستا کە ملی لێناوە با راست و رەوان بیکات...)).

دوایی نازانم لەژێر کاریگەری چ هەست و نەستێکدا بوو درێژەی بەقسەکانیدا: ((لێیگەڕیّ بابڕوا؛ با خۆی بەئاو و ئاگری دادا- بۆ خۆی پێدا نەدا؟ ئێمە کە خۆمان پێدانەدا چ بوو؟ بۆ مەگەر ئێمە شاکاری بوونەوەریەین کە ئەگەر شتێکمان بەسەربیّ ئەستەغفیروڵڵاّ خوا وەجاغی کوێر دەبێتەوە؟)) دوایەش وەك لەبەر دڵنەواییە دڵی دایی بێت، دەیگوت: ((دیارە دەزانم، تۆ



دایکی، هەقتە... بەلاّم خۆ ناکریّ کوڕەی ببەستیەوە. ئەگەر هەر دێڵە گورگێك بەردەوام بێچووەکانی خۆی بترسێنیّ و پێیان بڵیّ های نەکەن واوە نەچن راوچی لێن، نەچنە ئەولای دڕندەی لێن، بەولاوەتر سەی شوانانە... بێچووە گورکی بێنەوا لە برسان دەمریّ. نا. من ناڵێم نەڕوا، بابڕوا بەلاّم- بە ئەقڵ و وریاییەوە؛ بجەنگیّ، بەلاّم بە ئەقڵ و وریاییەوە؛ تۆڵە بستێنێتەوە بەلاّم- بە ئەقڵ و وریاییەوە، نەك وەك... ئەوەی دی... هەیهات!)) و هەناسێکی هەڵدەکێشا.

ئەوە ئاماژە بوو بۆ کاکە. کە قسە دەگەیشتنە ئێرە سوور هەڵدەگەڕا، ئارەقەی دەکرد، و قسەکەی دەبڕی، و دایی دەکوڵی- و دەوگێژاوەیدا نەیدەزانی داخوا دەکرا بڕۆم یا نەڕۆم!؟ دوو دڵ بوو: بەدەستێکی توند دەیگرتم و بەویدیش بەرەو پێشێی پاڵدەدام. لەو دەمەیڕا کە بابەگیان ئەو سپاردەیەی کردووە دایی گومانێکی لیّ پەیدا بووە کە ناکا بابەگیان ((بەگوێرەی بڕیار)) منیش وەك خۆی دە دەزگای سیخۆڕیەوە گلێنیّ! دوایی بەهەر شێوەیەك بوو داییم رازی کرد، هەرچەندە لە هەوەڵێشەوە هەر رازی بوو: کام دایکێك هەیە کوڕێکی گەورەی هەبیّ و بیەویّ داوەت و میوانداریە بکات و دایکەکە ناڕازی بێت! بەلاّم من ئەودەمی ئەمانەم نەدەزانی؛ بۆیە هەر خێراخێرا دایەگیان دایەگیانم بوو و زوو زوو ماچم دەکرد و لەدەوری هەڵدەسوڕام و بە قوربان و بەسەدەقەی دەبووم، تا دوایە بەسەرو روویەکی ناڕازییانەی جارانیەوەو بە بۆڵە بۆڵە ئاشناییەکەیەوە، کەتا کەنگیّ بەو پلیکانە مردە خێوانەدا هەڵگەڕێم و بێم و بچم و شەویّ تا سبەینیّ لەبەرژانی سێبەندە و لاقەکانم چاوان لێك نەنێم، رازی بوو- ئەڵبەتە بەو مەرجەی کە ئەو شەوە مەلیحە و فەیزوڵڵاّ لەویّ نەبن، چونکە منداڵی شیرە خۆرەیان هەیە و زاق و زیقیّ دەکات و دانیشتنەکەی تێك دەدات.

بەلاّم ئەمە هەرلایەکی ئاریشەکە بوو: ئایا هاوڕێی حیزبیش ئەو داوەتە پەسەند دەکات؟ ئاخر ئەو ئەندازیار بوو، هاوڕێی حیزبی بوو، لە تارانێوە هاتبوو- گاڵتە نەبوو. ویستم کوڕەکەی ئاغای سلێمانی لیّ راسپێرم. بەلاّم بەو هەندە شتانەی کە لێم بیستبوو و لێم دیبوو وازم لەوەی هێنا. نە لە میوانداریە، بەڵکە لە راسپاردنیّ خەڵکی. بیستبووم یەکەم شەویّ کە هاتبووە شاری لە ماڵیّ ئاغای کەریمی جیّ و بانێکی پاکوخاوێنیان بۆ راخستووە و کەچی ئەو زۆر لەو ((کارە پیسە بۆرژواییە))ی قەڵس بووە و هێناویەتی لەلایەکییەوە پەتوویەکی دەخۆیەوە

پێچاوەو لەسەر بەرەی خۆی گرمۆڵە کردووە. هەی ئافەرین لەو هاوڕێیە، بەوەی دەڵێن شۆڕشگێڕ! کاتێ ئەوەم بیست منیش ویستم بێ دۆشەگ، هەروا بە پەتوویەکیەوە لەلایەکی ژوورێوە بنووم، بەلاّم بۆ دایی هێشتی!...

چوومە ماڵێ ئاغای کەریمی و راست و رەوان بانگهێشتم کرد. بەلاّم دەستوبرد لە قسەکەم پەشێمان بوومەوە. هەروەك شتێکی سوکایەتیم بەسەرزاریدا هاتبێ، ئەوق بوون (لە حەساری راوەستابوون) سەر و رووی تابڵێی گرژبوو. پیاوێکی سی سی و دوو ساڵە، پێستێکی سپی، دەموچاوێکی نەرەقەڵە و نەگۆشتن، بەلاّم قەبە، روومەتێکی دوولەت وەك بەنوکە چەقوێکی تا خوار لێوی بەرەوەت داهێنابێ و شوێنەوارێکی ئاشکرای بەجێ هێشتبێ: خەتی نێوان هەردوولا روومەتەکانی بەتەواوەتی دیاربوو، چەناگە و لاشەویلاکی پانکەڵە، چاو شینێکی کاڵ و موو زەرد و نەرم، کە زیاتر دەهاتەوە سەر نێوچەوانی، و لۆچێکی قوڵی لە گرێی ناوەڕاستی هەنیەی نێوان هەر دوو برۆی و بن قژەکەیەوە دیاربوو- لۆچێکی کاتی نا کە هەروا بەهۆیەکەوە بێت و لاچێ و نەمێنێ. نا، بەڵکە لۆچێکی وابوو نەدەسڕایەوە: هاتبوو و هەروا دەگەڵ هاتنێشیدا مابۆوە. زۆر بەتوندی تەوقەی دەکرد، بە شێوەیەکی وا دەتگوت ئێستا پیلی پیاوی بەردەداتەوە. پێت وابوو دوژمنایەتی دەگەڵ پیاویدایە و زۆر لە گوینەکە هەر هێندە دەستی بەردای وەك مست وەشێنان لاقان لێك بلاّوکاتەوەو سەر و شانان بۆ پێشەوە بێنێ و تۆزێك خۆ بەرەو پشت کات و دەستان دەنێو لینگی زەلامی نێت و وەك چەپۆکی گورگی پیاوی سەروبن کا- داچەکانە کەمەکەی شانەکانی ئەو بۆچوونەی وەڕاست دەگێڕا. ئەو زەردەخەنە فەرمییانەی دەیهێنانە سەرلێوان لەو حاڵەتەی وی کەم نەدەکردەوە، چاوەکانی تێکەڵی زەردەخەنەکەی نەدەبوون و بەدوای بیر و لێکدانەوەیەکدا وێڵ بوون کە دەمێشکیدا دەهاتن و دەچوون و بێگومان بەرەو مەبەستێکی بەرزەوە دەچوون کە واز لێهێنانی دەکەوتە قالّبی خیانەت بە ولاّتەوە. سەرنجەکانی لێڵ و پێڵ بوون.

گوتم ئەوق بوو. لە دڵی خۆمدا گوتم ((هەی بێ هۆش و گۆش، هەی گێلە، دیتت!؟ تازە دەهات چاك بێتەوە، کە ئەویش ئاوای لێهات!)) سەری بەگوێرەی شان و ملی زیاتر هێنابووە پێشێ. تاوێکی بەوچاوە لێڵ و پێلاّنەوە تێهەڵڕوانیم سەرەنجام گوتی: ((هەڵەم نەکردبێ، هاوڕێ ئێواری



لە ماڵێ خۆتانو بۆ شامێ داوەت کردووم؟)) گوتم- زۆر بە پەشۆکاویەوە... گوتم: ((بەڵێ، لەبەر... لەبەر هێندێ- هاتمە خزمەتتان)).

زەردێکی بۆ کرد- دیسانەوە بێ هاوبەشیە چاوەکانی: ((ئەو زەحمەتەی نەدەویست؛ بەبێ بانگهێشتنیش هەردەهاتین)). ئاخر... خراپیە کارەکەی دەوەیدا بوو کە لۆچی گۆڕین تا دەهات گەورەتر دەبوو: ((بەلاّم پارەی ئەو داوەتەتان دابایە بە سندوقی حیزب چاتر نەبوو کە بەلانی کەمەوە کەلێنێکی هەر دەگرت؟)) ئەو قسەی بە جۆرێکی واکرد، یا گوێی من وای وەرگرت وەك ئەو شتە زۆر ((شت)) بێت.

تەریق بوومەوە؛ راستی دەکرد. گوتم، یا هەوڵمدا بڵێم کە مەبەستەکە ئەوەیە شانازی ئەوە بفەرموون کە هەموو لێك خڕبینەوە، و هەرنەبێ (سوودێك وەرگرین- دیارە بەزمانێکی تێکەڵ و پێکەڵەوە گوتمن.

کەمێکی بیرکردەوە، دوایە بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: ((بەچاوان، بێگومان))، و ئەمجارەیان زەردەخەنەکەی بەڕاستی زەردەخەنە بوو، هەرچەندە دەگەڵ گوتنەکەیدا واژەی چاوی بەکارهێنا دیسانەوە چاوەکان چ هاوبەشییەکی قسەو زەردەخەنەکەیان نەکردەوەو هیچیان لێ وەدەرنەکەوت. ((بێگومان- هاوڕێ کەریمی ئەوە بە ماڵێ دەزانن؟...)) بە سەیرێکی ئاغای کەریمی. بەڵێ- و ماڵئاوایی!

مژدەم دایە کوڕی ئاغای سلێمانی و هەر بە هۆی ویشەوە بەڵێنی هاتنێشم لە مستەفاخانی وەرگرت؛ ئاغای رەحیمیش کە خانەخوێی ((هاوڕێ)) بوو ئەوە هەر هیچ کەجێی خۆی دیارە. ئەو مژدەیەشم دایە دایی و بابەگیانیش، هەردووکیان پێکەوە زۆر بەتاسەوە چاوەڕێ بوون کە داخوا ئەوەی دێ کێیە و چۆنی داوەتی مە قبوڵ کردووە!؟ دیارە ئەو سەرەی ئی خۆی نییە، ئەگەر نا وەك ئەبولفەتح خانی مەبەستێکی دە ((وەی))دا هەرهەیە. تەنانەت بابەگیان گرژ بوو.

ئەو شەوەم تا سبەینێ بەبێ ئارامییەوە رۆژ کردەوە؛ بەیانییەکەم دەگەڵ کوڕی ئاغای سلێمانیدا گەیاندە نیوەڕۆیە؛ دوای نیوەڕۆیە وەك لەسەرئاو و ئاگران بم جێم بەخۆم نەدەگرت: خۆم بەرێك و پێك کردنێ ژوورێوە سەرقاڵ کرد: هەرچەند جارێکی دایی چووبایە سەرکانییە یا تا بەردەرکێ

چووبایە، ئەمن گەسکێکم بە رایەخاندا دێنایەوە و جێ سەرین و بالیفەکانم دەگۆڕین: جارێکیان بەرەو رۆژهەڵاتێ، دوایە روو بە رۆژاوایە، دیسانەوە روو بە باشوور و هەموو جارێش دەچوومە نێو دەرکێ و لەوێوەمڕا جێیەکە تەماشا دەکردنەوەو چاوێکم بە شوێنی سەرین و بالیفەکاندا دەخشاندەوە، تا سەرەنجام رۆژهەڵات- رۆژاوایەکی گونجاوم دیتەوە. قوتووە حاجی مەنیزییەکەی دایی کردبوویە چادان- بە وێنەکەی حاجییەوە- وام لێکرد بە بریسکە بریسکم هێنایەوە؛ پەنجەرەکانم هەموو شوشتن و سڕینەوە، حەسار و سەر پلیکانەکانم هەموو گەسك دان و ئاوڕشێنم کردن. دایی هەرچەند جارێکی هاتبایەوە چاوی بەو گۆڕانکاریانە دەکەوت، بەڵام هیچی نەدەگوت. وێنەکانی ناومالێشم هەموو پاك کردنەوە: ئەو رەسمانەی کە لە مقەببای گیرابوون و بەسەرقاوەییەیاندا دەڕوانی و جاران دەنا و یەغدانێ داییدا بوون و ئێستا دە چوارچێوەیدا بە دیوارییەوە بوون. حەسیری نێوان بەڕەکانم چەند جارێکان لوس و لێك کردنەوەو بزماری پەردە چنراوەکانی خەسرەو و شیرنیان لە قەراغ چۆمێکیدا دە دەمی رابواردنێدا لەسەر نەخشێنرابوون و سەرێکی تێدا دیاربوو کە خەریکی سەرەتاتکێیە و بە لێکدانەوەی مە خەسرەو خەریکە هەستێت و بە شمشێرێکی ئەو سەرەی بپەڕێنێ، و چەند وەختان جێی سەرسامیە دەرو دراوسێیان بوو، هەمووم داکوتانەوەو توندو تۆڵم کردنەوە. مەسینە و دەستشۆرم بردنە پاشخانێ، دەستێکیشم بە سەماوەرە تەنەکەکەشدا هێنایەوە. بەڵام بۆ کات دەڕۆیی؟ تا ئێوارە داهات پیر بووم. هەردەو سەروبەندەیدا دووبارە سەرێکم لە کوڕی ئاغای سلێمانی هەڵێنایەوە، نەکا لە بیری چووبێتەوە- لە بیری نەچوو بۆوە. بە راکە راکە هاتمەوە نەکا ئاغای کەریمی و هاوڕێی حیزبی هاتبن- نەهاتبوون!

ئەوە چەندەمین جاربوو دەست و دەموچاوم بشۆمەوە، و دەستم کردە فیتوو لێدانێ. ئەوە ئێستا خۆراوایە، ئیدی ناکرێ لەبەردەرکێ راوێچکان بکەی، ئەگەر بەسەردا هاتبانایەوە جوان نەبوو لەبەر دەرکێ بم و هاوڕێی حیزبی وا تێبگا چاوەڕێم، هەرچەندە بەڕاستی نەمدەزانی کە چاوەڕوانی بەلای ئەوەوە بە چ لێك دەدرایەوە. بەهەرحاڵ بابەگیان هاتەوە، هەوا تاریك ببوو؛ ئەگەر هاتبانایە دەبوو تائێستا گەیشتبان... یانی، دەهاتن!؟.

پەنجەرەکانم خستنە سەرپشتێ و لەلای پەنجەرەکەوە بەرامبەر بابەگیانی دانیشتم. ویستم پێی بڵێم با ئەو شۆ لەوێ دەگەڵەوان دانەنیشێ، بەڵام شەرم گرتمی- تازە دانیشتبوو. یانی دەزانی



کە نابێ لەوێ دانیشێ!؟ دایی بە زۆری  هەر لە پاشخان و حەسارێدا سەرقاڵی ئیشێ بوو. کاتێ کە هاتن ئەو لە حەسارێ بوو. ئاغای کەریمی سەرێکی خوارکردەوە، دایی یەکسەر گوتی ((فەرموون))و سەریم لە دوورەوە رادیت و وەك فەنەر لەجێی خۆمەوە دەرپەڕیم و بەسەر پلیکانەکاندا هەر هەنگاوێکم کردە چوار و چووم...

هاتن... بابەگیان قیت بۆوە و لە ژوورێڕا هاتەخوارێ، هەروەك ئەو دەمانەی کە ئەبولفەتح خان دەهات- و لەسەر ئەژنۆیان دانیشتەوە. کەوتنە حاڵ و باڵ پرسینێ یەکتری و چاك و چۆنی و فەرموو فەرموو و چاخواردنەوێ. منیش دانیشتبووم- یانی پێم وابوو دانیشتووم، دەنا لەراستیدا لەوێ نەبووم: گیان و بوونم دەکوچە و کۆڵانٚاندا دەخولایەوە. دەگەڵ خشپەی پێی پشیلانمدا بێ ئیختیار ئاوڕ دەدایەوەو گێژ و وێژانە دەدەر و کۆڵانٚ و تاریکییەوە رادەمام. روناکیە پەنجەرەی ژووری کوڕەکەی ئاغای سلێمانی چەند دەقیقەیەك دەبوو کوژاربۆوە: ماڵێ مە کەوتبووە لای سەرەوەی گردەکە و بەسەر ئەو ئاوەڕۆیەیدا دەڕوانی کەماڵێ ئاغای سلێمانی لێ کەوتبووە ئەوبەرێ. دیاربوو جولاٚبوون؛ رەنگە تا وەرە و بڕۆ و جموجۆڵی ئێرەیان نەدیبێ وەڕێ نەکەوتبن ((حوسێناغا...!)).

دایی گوتی: ((بەڵێ فەرموون! حوسێن، تۆیان دەوێ)).

بەڕاکە راکەوە چووم: ((فەرموون، فەرموون!)) و چرا قوتیلەکەم لەسەر دوایین پلەی پلیکانەکانەوە تاودایە و بڵندم راگرت. هاتن.

هاوڕێی حیزبی و کوڕی ئاغای سلێمانی زۆر بە گەرمییەوە دەست و مستی یەکدی بوون. (بەواتەی بابەگیانی وەك گیانلەبەران بۆنیان پێکوەکرد و تێگەیشتن کە هەردووکیان کەری سەر ئاخوڕێکین!) ئەو تەوقەیەی کردیان تەوقەیەکی هەروا سادە و ساکارانە نەبوو؛ سەریان لێك بردنە پێشێ. کوڕەکەی ئاغای سلێمانی دوای ئەوەی کە تەوقەی دەگەڵ کرد و لە هەواڵی پرسی چوو لە بارێ سەرەوە- لەسەروو هاوڕێ حیزبییەکەوە- دانیشت و دایی هەرزوو تێگەیی کە دەو ((دەستە))یەی خۆیاندا، ئەو لە هاوڕێی حیزبییەکە ((گەورەتر))ە، دەنا وا لەسەرەوەترەوە دانەدەنیشت. دەبێ ئەوەی بۆ پورە فاتمێ هەر بگێڕێتەوە- ماشەڵڵا ماشەڵڵا، هەر لە ئێستاوە! ماشەڵڵا لاوێکی چەند شۆخ و شەنگە!

هاوڕێ حیزبییەکە مستەفاخانی نەدەناسی- منیش هەروەتر ئەوم وانە دەناسی- ئەوم دیبوو، شتگەلێکیشم لەبارەوە بیستبوو، دیارە زیاتر لە ئاغای سلێمانییەوەم بیستبوو، بەڵام بۆ خۆم هیچ ئاشنایەتییەکی وام دەگەڵدا نەبوو، تازە لە زیندانێ هاتبۆوە... ئەوی نەدەناسی، بەڵام کاتێ کە ناسی زۆری پێ خۆش بوو. منیش هیچ جێ بەخۆی نەدەگرتم، بەڵام زیاتر بە هاتنێ هاوڕێی حیزبییەوە، کە لە تارانێوەڕا هاتبوو. وام هەست دەکرد کە ئەوە منداڵێکی تەمەن خوردە ساڵانەم و ئەو تفەنگێکی بەدەستەوەیا دەگۆلمێ دابێ و یەکێکی مل ئەستووری وەك رەحیم لەندەهۆری بە مستێکی بخات یا وەك سواری سەرپشتی ئەسپێکی گەردن کێلم دەهاتە بەرچاوان. سەدان کتێبم لە گنجەکەی نێوچەوانیەوەڕا دەخوێندەوە. بەڵام شادییەکەی وی بەدیتنێ مستەفاخانی ئەوە هەر شتێکی دیکەبوو. پێم وابوو وای بیر دەکردەوە کە ئەگەر ئەوی هەبێ، ئیدی ئەوە هۆزێکی هەیە، هەر مەپرسە چەند گەورە! لە هاوڕێی هاوڕێکەیڕا دیاربوو. ئاغای کەریمیش هەروەك من وابەستە و بەترس و لەرزەوە و لە میوانداری و نزیکیەی یەکجار زۆر شاد و شەنگوڵ بوو. بابەگیان دە بارێکی شل و شەرمێونیدا بوو؛ دایی پەشۆکاو بوو- بۆ، نازانم، رەنگە ئەوانەش هەر (وەك جوجکە چوێلەکان کە هێشتا هیچ فێر نەبووینە کەچی لە ئادەمیزاد دەترسن ئەوانیش لە دانیشتنێ دەگەڵ ((گەوران))دا بترسن. یارەنگە دایی، وەك هەر دایکێکی دیکە، بەوە دڵخۆش بێ کە منیش سەرێکم و هاتوومە نێو سەرانەوە، بەڵام لەوەش بترسێ نەکا ئەو سەرە بەو نێو سەرانەوە تێبچێ! لە هەمووان ئاسوودەتر کوڕی ئاغای سلێمانی بوو هەم بۆ خۆی ئاسوودە بوو، هەم ئەوانەی دی بەویەوە ئاسوودە بوون: هەر بەگوێرەی ناوچەکە بابەگیانی بەمامە مەشەدی ناو دێناو دایی بە پورە گوڵبەهار. بەلایەنی پورە فاتمێ نەنکییەوە، خۆی وەك ئێمەی خەڵکی شارەکە، دادەنا. مستەفا خانیش بەلانی زیندان و گرتنێوە، خۆی رادەنا- یا رەنگە هەر بەلای منەوە وابووبێ چونکە هەوایەکی پێوە دیاربوو. لاوێکی توکمە و دامەزراو، دەستەپیاو و مەیلە و کورتەبنە، چوارشانە، سەروچاو رۆمیانە: چاو گەورەو بادامی، هەم کێوی و هەم شارستانیانە و تێکڕاش سل؛ موو زەرد، لوتێکی دەگەڵ دەموچاوێدا لێکهاتوو، چەناگە نەختێك درێژکۆلە، و روویەکی هێلکانی و تا ئەندازەیەك گۆشتن. شێوەی سەقامگیریە لێوە دەرپەڕیوەکانی دەگەڵ گۆشەی هەمان ئەو لێوانەدا، بارێکی تورەو وێنەیەکی لەخۆ باییەیان دەدایە رەنگ و رواژای: لێوەکانی هێندێك هەڵامسا و دیاربوون، و واپێدەچوو کە هەمیشە، دەبن ئەو ئارامی و هەڵامسانەیدا شتێك هەیە. بەرغەبابەی، بەتایبەتی کاتێکی



کە دەبیر و لێکدانەوانڕا دەچوو لە بن چەنگایەوە تا دەهاتە بەرگەردەنێیەوە کەمتر دەبۆوە کە ئەو بارەش شێوەی تورەییەکەی زیاتر دەکرد. ئەویش دەوەختدا، کاتێ کە خۆی رادەنا و روخسارێکی راشکاوانەتری بەخۆوە دەگرت گنجێکی دێنایە نێو نێوچەوانی خۆیەوە کە ترسێکی لەچاو و روخساریدا زێدەتر دەکرد. بەڵام خۆشبەختانە ئەمشەو هیچ یەکێك لەو هۆیانەی گرژ و مۆنیە پەیدا نەبوون. هێندێکان دەیانگوت لەبەر ئەوەی نەیتوانیوە دەگەڵ بابیدا هەڵکا بۆیە ملی لە ئازادیخوازییە ناوە. بابیشی وەك دەیانگوت موڵکدارێکی بەوەج نەبووە، بەڵام لەبەر ئەوەی کابرایەکی توندوتیژو بە تەشقەڵە بووە بەو شێوەیەی شتێك بۆ خۆی پچڕیوە و خزمە خوردە مالیکەکانی خۆی دەبن باڵی خۆی دەگرێتەوە. ئەفسانە دەیگوت کە باب و باپیرانی دەوڵەمەند بوون؛ بەقسەی ئاغای سلێمانی یانی خەڵکی لە ئێستا هەژارتر بوون؛ هەموو جێیەك هەر دارستان بووە، کێوەکان وەك ئەورۆ ئاوا رووت و نیوە رووت نەبوون، و بەروبووم هێندە زۆر بووە کە هەر لەجێی خۆیانەوە رزیون... ژمارەیەکیش ئەم ئازادیخوازییەیان دەدایە پاڵ ئەو بیرو بۆچوونانەی تازەدا کەوتبوونە نێو ناوچەکەوە. خۆ ئەگەر یەکێك ناوی بە دیموکرات و ئازادیخواز رۆیبایە ئەوە راست وەك ئەوەی تەماشا دەکرا کە تەواوی ژیانی لە کاری خراپە و خراپە کاریدا بەسەر بردبێت و کتوپڕ گۆڕابێت و ملی لە نوێژ و رۆژوو و خواپەرستی و مزگەوت دروستکردنێ نابێ و تەکیە و بارەگای کردبنەوە و ریشێکی تۆپنەی بەردا بێتەوەو تەزبیحێکی سەد و یەك دەنکی بەدەستەوە بێت و لە ترسێ خودای ئاگای لەخۆی و لە کەس نەمابێ! ئاغای سلێمانی پێی وانەبوو کە مستەفا لە کەسانێکە لە کۆمەڵگەی خۆی لە پێشترو گەورەتر بێ؛ هەروا لەخۆی چووە... بەڵێ هاوڕێی حیزبی و کوڕی ئاغای سلێمانی هەردووك وەك خەڵکی شارێکی پێکەوە دانیشتن و دەستیان کرد بەباسی لالەزار و تۆپخانە و بەهارستان و شانۆ و سینەما و کلەپ و لۆقەنتە و ئەو جۆرەشتانە، کە هەموویان بەلای ئێمەوە شتگەلێکی تازەبوون. هاوڕێی حیزبی وەك بۆنێکی زۆر ناخۆشی بەلوتیدا هەڵاچووبێ بەبیز و قێزێکەوە لچ و لێوی خۆی هەڵەنگاوتن و گوتی: ((هاوڕێ، ئەو شتانە لە یەکیەتی شۆرەویدا هەمووی شتگەلێکی بێ بایەخ و هیچن. لەوێ دەتوانیت لە بەناوبانگترین سەماکەرەکانی ئەوێ وێنە بگری و بیهێنیەوە لە ماڵە خۆت دەگەڵ ژن و منداڵەکانت، یا دەگەڵ دایك و باوکتدا لێدەیەوەو تەماشای کەن لە پرۆژیکتۆرێك و شریتە فلیمێکیش زیاتر هیچی دیکەی تێناچێ)).

سەماکەر، پرۆژیکتۆر، شریتە فلیم! ئیدی هەر دەتگوت ئەفسانەن. ئاخر چۆنی دەبینن؟ پرۆژیکتۆر چییە؟ ئەو سەماکەرەی لە مالێی دەبینن چ جۆرە بوونەوەرێکە؟ دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کەس هیچی نەپرسی؛ تەنانەت هەر نەیانپرسی داخوا بۆ خۆت قەت لەیەکییەتی شۆرەوی بوویت، یاخود دیوتە؟ پێویستیشی نەدەکرد؛ هەموو پێمان وابوو هەر لەخۆوە وانالێ.

قسە قسەی دوای نانخواردنێ بوون. سفرەمان زوو راخست، و هاورێ حیزبی سەرەنجام بە هەوڵ و تەقەللایەکی سەرنەکەوتووانەوە خۆی لە نانخواردنێ بەدەستی هەڵکرد. برنجەکەی بە شێوەیەکی وا دەخوارد وەك بە گۆلمان ئاوێ بخواتەوە. کاتێ کە شلە و برنجەکەشی پێکەوە تێکەلاو دەکردن وەك دەست بەپشتی ماری مردوودا بێنێ تێکرا دەبوو. مستەفاخان لە پێش هەمووناندا لێبۆوە؛ لەسەرکەس رانەوەستا، چۆوە ژوورێ، دەست و دەمی بشواتەوە. بە ناچاری لەسەر سفرەی هەستام و چووم ئاوم بەدەستیدا کرد. دەست و دەمی شوشتنەوەو ئاوی دەزاری وەرکرد. هەر دوای وی ئیدی هاورێی حیزبی چیدیکەی نەخوارد، و ئەوجا مایەوە دایی- کە تازە لە پاشخانێوەڕا هاتبوو- کە ((ئاغا، هەر پاروێکی دی... باشە خۆ هەر هیچت نەخوارد! دیارە چێشتەکەتان پێخۆش نەبووە!)) بەلام نا، تێرببوو، زۆر سوپاس، دەستتان خۆشبێت، هەر زۆریش بەتام و خۆشبوو.

دایی گوتی: ((نۆشی گیانتان بێ ئاغا، نانی ئێوەش نەبوو)). چاوەڕێ بوو هاورێ هەر بەدەستووری خۆمان بلێ لە ئێوە هەزار هێندە، زۆریشی زیادبوو، و ئا لەم بابەتانە، بەلام هاورێ بەیەك ((مێرسی)) وشك و برینگ پینەی کرد و بڕیەوە.

هەرکە یەکەم چای دوای نانخواردنێمان خواردەوە، سەری قسان بۆوە. ئاغای کەریمی گوتی: ((هاورێ...)) و سەیرێکی کردێ- هیچی دی نەگوت، هەروەك لەسەرمینبەرێوە بە ئاغای بلێ ((کات درەنگە، قسەکان بکەن و بابڕۆین!)).

هاورێ هەروەك قورمیش کرابێ، دەستی پێکرد. لەپێشدا لە کۆمۆنە سەرەتاییەکانەوە. ئەوجا، لە کۆیلایەتییەشی تێپەڕاند، گەییە دەرەبەگایەتیە (فیۆدالیزم) لەویش رەت بوو و ئینجا بۆرژوازی دایە بەرێ و گەییە چینایەتیە و ئەوجا بەدووردرێژی ملی لە چینایەتی و هێزە شۆڕشگێرییەکان و گەنجینەی شۆڕشگێڕی و توێژە بێ لایەنەکان نا. دەو قۆناغەیدا شوێن پێی هێزەکانی بەوردی دەرئێخست. هەر راست وەك فیردەوسی کە باسی شەڕی یازدە سەران دەکا:



ئەو ئالآیەی دەبینن؟- ئەوە ئەژدیها پەیکەرە- ئالآی رۆستەمە؛ ئەو ئالآیەی دی، ئەوەی لای راست، ئەوە گا پەیکەرە- ئالآی گودەرزە؛ ئەوەی دوورتر، ئەوەی دەکەوێتە پشت گا پەیکەرەوە، لای چەپی ئەژدیها پەیکەرەوە، ئەوە کەرکەدەن پەیکەرە- ئالآی گیو... ناوەڕاستێ سوپای دەبینی- ئەوە ناوەڕاستە... ئەوە ئالآی کاویانییە...! جارجارەش بەدەم قسانەوە کلێو قەندێکی دەزاری داویشت و دەیکردە نوختەی کۆتایی رستەکە، لە راستیدا کۆتایی باسی قۆناغێکی تایبەتی بوو، کە رێی بۆ تازەکردنەوەی هەناسەی شۆڕشێکی دیکەی دوای وی خۆش دەکرد.

قسەکانی دوایین قۆناغی قسەکانی، هەر بەگفتوگۆی نێوان تاراشکین (Tara shkin) و ئیڤان گۆسف (Ivan Gussev)ی خوردە سالێ نێو رۆمانی (تیشکی مەرگی گارین)) نووسینی ئەلێکسی تۆلستۆی دەچوو. (بنەماڵەی هاورێی حیزبی لە کۆچبەرەکانی سەردەمی شۆڕش بوو. ئەوەم دەدوایەدازانی، دە زیندانێشمدا دیت کە رووسی دەزانی).

((دەزانی کاپیتالیزم چییە؟)).

((نەخێر ڤاسیلی ئۆڤا نۆڤیچ نازانم)).

((باشە، ئێستا من زۆر بەسادەیی بۆت روون دەکەمەوە: دە کەس ئیش دەکەن؛ دە هەمیان هەموو بەرهەمی کارەکە بۆ خۆی دەبا. بەوەی دەلێن کاپیتالیزم، تێگەیشتی؟)).

((نەخێر، ڤاسیلی ئیڤا نۆڤیچ، تێنەگەیشتم)).

((چ تێناگەی؟)).

((بۆ هەموو بەرهەمەکە بۆ خۆی دەبات؟)).

(( بە زۆر لێیان دەستێنێ؛ ئیدی ئەوە چەوسێنەرە)).

((چۆن بەزۆری دەیبا؟ ئەو یەکە و ئەوان نۆن)).

((ئاخر ئەو چەکدارە، ئەمانە بێ چەکن)).

((خۆ، پیاو هەمیشە دەتوانیٚ یەکێکی دیکە چەك کات، ڤاسیلی ئۆڤا نۆڤیچ. دیارە ئەو نۆ کەسەی کە تۆ باسیان دەکەی زۆر گێل بن)).

تاراشکین بەکزی و واقێکی وڕەوە، سەرسامانە دەهەیوانێوە راما.

((بەڵیٚ کوڕەکەم، تۆ راست دەکەی؛ تۆ وەك بەلشەویکییەکی بیر دەکەیتەوە. ئەوە هەر ئەو کارەیە کە ئێمە لە رووسیا دەمانکرد. ئێمە چەکەکانمان لە چەوسێنەرەکان ئەستاند و وەدەرێماننان. و ئێستا هەر دەکەسیان کاردەکەن و دەخۆن.

((و هەمووومان هێندەی دەخۆین تا لەقەڵەوییاندا دەقەڵشین)).

((نا کوڕەکەم پێویست ناکا هێندەی بخۆین تا لە قەڵەوییان بقەڵشین؛ خۆ ئێمە بەراز نین)).

(ئیدی تاراشکین نەیگوت کە شۆڕشی ئۆکتۆبەر تەنیا جەنگێك بووە لە پێناو دابەشکردنی یەکسانی بەهرەماددییەکان بەڵکە بە پلەی یەکەم تێکۆشانێك بووە لە پێناوی نرخ و بەها مرۆڤایەتیەکاندا...) مێشکم وەك شیعر بەسەر باڵی خەیاڵە تازەکانەوە کەوتە فڕین- خەیاڵی واژەکان! وەکو ساتەکانی رۆچوون و قوڵبوونەوەی سەردەمی منداڵیە، دەگەڵیدا بوومە یەك: یەکجاری دەبوونیٚ ویدا ونبووم و توامەوەو نەمام. ئیدی دە سەردەمی منداڵیەشدا هەروایە: ئەوە لەلایەکییەوە دانیشتووی، ماندووی، وازی گەمانت نییە، بەلاّم دەگەڵ ئەوەشدا هەردەگەڵ منداڵاٚندای، دەگەڵ جووڵە و بزاوتیاندا خۆت دەبزێوی. دەگەڵ گەمانیاندا تێکەڵ بووی- زۆر جاران ئەوە دە سەردەمی گەورەییەشدا روو دەدات: لە تەنیشت شوفێرێکیەوە دادەنیشی؛ لە هەندیٚ شوێنی دیاریکراودا، بەتایبەتی لەو شوێنانەی کە دەزانی ئەوە خەتەرە، دەبوونی شوفێر و ئوتومبێلەکەیدا ون دەبی؛ دەگەڵ ویدا لە جێی خۆتەوە پیٚ دادەگری وەك ئەتۆش ئیستۆپیٚ بکەی... لەوەش بەولاوەتر، ئێمە هەمیشە هەر بە تەنیا بۆ خۆمان نین و واراهاتووین کە لەناوبوونی کەسانی دیدا دەژین- دە دنیای حەز و ئارەزوودا- هەرچەندە کە دەمانهەویٚ هەر خۆمان بین کەچی لەلایەکی دیشەوە حەز دەکەین وەك ئیدیکەش بین. من پێم وابوو دە تەواوی ئەو ماوەیەیدا کە هاوڕێی حیزبی قسەی تێدا دەکردن من بەراستی و دروستی خۆم بووم و بەتەواوی تایبەتمەندییەکانی خۆمەوە، بەلاّم خۆم و دانایی و توانایی و ئاسمانی فڕینی



خەیاڵەکانی وی. قسەکانی وەك ئارەقێکی زۆر خەست و کەسکون کە تادەبخۆیەوە دە هەموو لایەکی لەشتدا دەگەڕیٚ، هەموویم ئاوا دە لەشیدا دەگەڕا.

گومان دەوەیدا نەبوو کە ((حیزب)) چاك بوو، چونکە هەموو ئەو شتە چاکانە یا نیەت و ئامادەگییە چاکبوونێیان تێدابوو هەمووی تێدا کۆببۆوە. هەروەك مامۆستایەك بیٚ وابوو — ومامۆستاش بوو- کە هەموو ئەو چاکیانە و ئەو نیەت و ئامادەگیانەی هەیە بۆ کۆکردنەوەو چاك کردنیان دەبەر چاوبگرێت و چاودێریان بکات تا ((چاك)) بن- دیارە ئیدی کار تەواوە: لێك خڕبوونەوەی کۆمەڵێکی چاك بەگوێرەی ئەقڵ و لۆژێك دیارە کە چاکە- ئەوەم باش دەزانی، هێشتاش هەر لەسەرئەو باوەڕەم. ئەودەمی پیاو ئەرکەکەی دیارە: خودا و خێزان و (نیشتمان؟)... و هەموو شتێکی وازلێدێنیٚ و دەچیٚ وە دووی حیزب دەکەویٚ. دەناو حیزبیشدا ئەوە جێی دیارە، ئیشی دیارە، کار و ئەرکی کەسانی دیش هەر دیارە... بەڵیٚ، کۆمەڵێك دەرکرا و وەلانراو کە وەبەر نەفرەتی کاتی کەوتوون، و ((کۆمەڵی هەڵبژاردە))و ئەوجا کۆمەڵی ئەو نێوانەی کە هەروا ماوەماوە چاویان دەکرایەوەو شت فێردەبوون. دەنا ئیدی ئەوە هەر حیزب بوو ئاشی بە ئاوی ئێمە دەگەڕا. خۆ دەربارەی ئایندەش و سەرکەوتنەکانیشی ئەوە ((خودای حیزب)) کەریم بوو. بەڕاستی ئامانجی راستەقینە و تایبەتیمان هەبوو- ئەوەندەش بەس بوو.

ئاغای سلێمانی لەسەر ئەم باوەڕە نەبوو. دەیگوت ((بەپێچەوانەی ئەوەی کە ئێوە بیری لێدەکەنەوە ئێوە هیچ ئامانجێکی راستەقینە و نزیکتان نییە... بێگومان بەلای ئێوەوە گرینگ نییە داخوا ئەوڕۆ چتان دەبێت، و چتان وەگیر دەکەوێت- گرینگ سبەینێیە. و بە گاڵتەوە درێژەی دەدایە: ((سبەینەی قیامەتیٚ))یانی سبەینەیەکی دوور، کە دەبیٚ خۆشی و بەختەوەری ئەوڕۆی بە قوربانکەی- بیٚ ئەوەی ئەو سبەینێیە هێشتا دابین کرابێت. هەرچەندە دیارە دابینیش کراوە، نابیٚ بگوتریٚ کە دابین نەکراوە، چونکە هاوڕێی حیزبی ((بەڵێنی داوە))! (ئەو شتانەی هەموو بەقەشمەرییەوە دەگوتن. چاوەکانی بادەدان و برۆیەکانیشی هەڵدەتەکاندن) بەڵیٚ، نەوەکانی ئایندەی دوور زۆر لە خودی ئێمە گرینگترن، چونکە ((ئایندەییەکان))ن، لەبەر ئەوەی ئامانجی ئێمەش ئایندەیە و ئایندەش هەمیشە لە ئێستا جوانترە بۆ؟ ئەوە بۆی ناویٚ- هاوڕێیان گفتی شەرەف دەدەن: مێژوو ئایندەی دابین کردووە! ئەدی ئێستا بۆ دوێنیٚی دابین نەکردووە تا من چێژی لێوەرگرم و تێیدا وەحەسێم. ئەو قسانە هەمووی زیادەن، لەبەر ئەوەی

بابم بەچاوی منی نەدەڕوانیە دنیایە؛ ئەگەر وای بڕوانیبایە ئێستا ئیدی توشی ئەو تێگیراوی و ناخۆشیانە نەدەبووم؛ ئەگەر ئەو دابینکردنە ئەوددەمی بوایە، و ئەو خۆی گیانفیداکردبایە ئێستا لاقم لەسەر لاقی دادەنا و نێرگەلەی خۆمم دەکێشا و ئاسوودە بووم...)).

بێگومان ئەو شتانەی هەموو لە کتێبان دەرێنابوون.

دیارە ئەگەر لە بارودۆخێك و لە شوێنێکی دی بامایە و جحێڵ نەبام ئەو قسانەم کاریگەرتر دەبوون... یانی، ئێستا وابیر دەکەمەوە. ئەوددەمی هەست و نەستەکانم هەرگیز ئەوەیان پەسەند نەدەکرد و پێی قایل نەدەبوون. منیش فێربووم دەمدەمە زەردەیەکی بەدەمییەوە بدەم، ئەویش وەك لە روخسارییەوە دیاربوو زەردەخەنەکەی منی پێ ناخۆش نەبێ. لەوە بترازێ من چیم دەکرد؟ سەرم بەردەدایەوەو سەرقاڵی ئیشی خۆم دەبووم تا ئەوانیش بە خەیاڵی ئاسوودەوە خەریکی کاری خۆیان بن؟ تازەکەم کار... خۆ من کارێکم نەبوو. وادیارە ئەو هاوڕێیە، ئەندازیارە و هەرواش بوو و سەدەها پزیشك و ئەندازیار دە حیزبدا بوون، ئەگەر خراپ بایە نەیدەچوونێ. ئەو قسانە ئێستا دەکەن کە ((بەڵێ دەڕۆن بەلام دەگەڕانەوە)) ئەوددەمی ئەو باس و خواسانە نەبوون. دیارە کە خاوەن دێ نەبووم، فەرمانبەر نەبووم، کوڕە حاجی نەبووم- سەرم بەردەمەوەو تەماشای عەردی کەم کەچی؟... پف!

بەڵێ ئاینده رووناك و دیاربوو- ئەمانە هەموو دەکێشرانە بەردەمی مێزی دادگا... دایی بێ ئیختیار پێکەنی- لەو پێکەنینانەی بە قاقاوەن. و یەکسەر چایەکی خەستی بۆ هاوڕێی تێکرد. هاوڕێ قسەی بە تام و چێژی دەکردن. دەیگوت کاتێ شۆڕشگێڕان چوونە بەردەمی کۆشکی شای و لەوێ ئاپۆرەیان بەست شاژن پرسی ئەمانە چیان دەوێ؟ گوتیان قوربان برسییانە- نانیان نییە. گوتی باشە کە نان نییە با بسکویتی بخۆن... دایی بەڕاستی بە کوڵ و دڵەوە پێدەکەنی. ئەوە رەنگە یەکەمین پێکەنینێکی راستەقینەی وی بێ کە دوای مەرگی کاکە و عالیەی پێدەکەنێ. دوایە وەك بێ متمانەییەکی بەسوڕانی چەرخی گەردوون، لە ناخی ناخەوەی دەروونیڕا ئاهێکی هەڵکێشا و گوتی: ((یانی ئەو رۆژە دێت ئەمیر لەشکری رۆژاوا بگرن و دادگایی بکەن و خۆی و خاووخێزانی بە رۆژی رەشی خۆیان بگەیەنن!؟)) رووی قسەکانی لە کوڕی ئاغای سلێمانی بوو. هاوڕێی حیزبی گوتی: ((بەڵێ، خانم، من بەڵێن و گفتێ و پێدەدەم. دڵنیا بە کە ئەو رۆژە هەردێت- بێگومانیش بە کەدێت. هەرهێندە بەسە خەڵکی بیانەوێ و



داوا بکەن... حیزبیش هەر بۆ ئەوان شتانە دروست دەکەن)). پێکەنی، و ئێمە ئەو پێکەنینەمان بە بەشێك لە ساتەوەختەکانی مێژوو تۆمار کرد- من یەکێکم کە بەدڵنیاییەوە وامکرد- و وامان هەست کرد کە ئەو، بزاوت و جووڵەی مێژوو زۆر بەڕوون و ئاشکراییەوە بە بەرچاوی خۆیەوە دەبینێ و ئەو ئایندەیەی کە بە بەرچاویشیدا رەتدەبێ زۆر بەوردی سەرنجی دەدات و چاوەدێری دەکات.

بابەگیان دەحاڵێکدا کە شەویلاکی تا بناگوێیان داپچڕیبوون دوو دڵی و گومانی دە روخساریدا شەپۆلیان دەدا و گاڵتە و گەمەی بەو قسانە لە روخسارییەوە دەباری گوتی: ((وەڵڵا بڵێم چی!)).

هاوڕێی حیزبی گوتی: ((گاڵتەت پێ نەیە باوە- هەر رەخنەیەکت هەیە فەرمو. ئێمەیان هەر بۆ هێندێ ناردووە))یانی ئێستا ئەوەتۆ لە کوێتە و چت دیوە!.

بابەگیان گوتی: ((دیارە دەبوورن... چۆن بڵێم... راستییەکەی من دڵم ئاوێ ناخواتەوە)).

((چۆن؟)).

((ئێستا عەرزتان دەکەم...)) هەموو گوێ قولاغ بوون، و من لە ترسێ وەی کە بابەگیان نەکا تێوەرێخێکی تێوەرێنێ و لەلای هاوڕێی حیزبی و هاوڕێیانی دی ئابڕووم ببات بەناراحەتییەوە جینگڵێکم دا، و سەیرێکی داییم کرد، دایی کە هەستی بە ناراحەتیە من کرد گوتی: ((مەش ئەکبەراغا، دە وازبێنە هەر ئەمشەوە با ئاغا هێندێکمان قسان بۆ بکا)). وەك ئاغا حەکایەتخوان بێت.

بابەگیان بە تەسلیمییەکەوە گوتی: ((باشە، چ قسەم نین!)).

هاوڕێی حیزبی گوتی: ((نا، تکا دەکەم؛ خانم، رێمان بدەن، دەمانەوێ سوودێك وەرگرین)).

بابەگیان دوو دڵ بوو؛ هاوڕێی حیزبی چاوەڕێ بوو؛ هەموو گوێ قولاغ بوون. بابەگیان گوتی: ((بەڵێ، دەمویست ئەوەتان عەرزکەم... بابی خودا لێخۆشبووم...)).

((خودای لێخۆش بێ)). بەپێکەنینەوە.

((دەگەڵ مردووی گوێدێران... ئامین!)) ئەوە بەروبوومی چوونە مزگەوتێی بوو.

بابەگیان گەرووی ساف کرد و بەدەنگ و روخسارێکی خاوەن هەق و پڕداخەوە درێژەی دایە: ((بەڵێ، بابی خودا لێخۆشبووم دەیگێڕایەوە؛ دەیگوت ئەودەمەی منداڵ بووین —یانی ئەوان- مەشرووتە دامەزرا، ئێمەی منداڵاٚن، رۆژانە بەخۆ و بە یەخەی سپییەوە بەڕیز بە شەقاماندا دەهاتینەخوارێ و سروودی ئازادی و نیشتمانیمان دەگوت... گوایە ئەو دەمی لە رەشت بووە... من بۆ خۆم ئەو جێیانەم نەدیون، هەر دەڵێن رەشت و گێلاٚن)).

بابەگیان گوتی: ((بەلاٚم لە بیرمە کە شیعرێکیش هەبوو، بابم بە حەسرەتەوە لە ماڵێ دەیگوت)). کوڕی ئاغای سلێمانی وەك دەگەڵە خۆی بڵێ گوتی: ((ئەی منداڵی ئەی سەردەمی زێڕینی ژیان یادێك لە مۆمی کوژاوەی دوێنێ بکەوە...)) بابەگیان وەك بڵێی تێکڕا بوو، پێکەنینێکی غەماوی بەڕوویەوە نیشتەوە، گوتی: ((ماشەڵلاٚ... خودا تەمەنتان درێژکا... ماوەیەکی زۆربوو ناوەکەیم لەبیرچوبۆوە، و چەندی مێشکی خۆم دەگوشی وەبیرم نەدەهاتەوە... ئاغا، ئێوە ئەو شیعرەتان لەبەرە...؟)).

کوڕی ئاغای سلێمانی شیعرەکەی لە بن لێوانەوە دەست پێکرد، و چون هەموو ئامادەبووان حەزیان لە بیستنێی بوو دەنگی بڵند کرد.

... ...                    ... ...

... ...                    ... ...

هەموو گوێیان قولاٚغ کردبوو؛ دایی چاوی لە زاری نەدەتروکاند- ماشەڵلاٚ، ماشەڵلاٚ، لەو مێشکەی... لەو شیعرەی... دەبێ ئەوەی بۆ پورە فاتمێ هەر وەگێڕێ- دەك بەرەکەت لە عەمرت کەوێ لاوە...

کوڕی ئاغای سلێمانی چواردێڕی شیعرەکەی خوێندەوە و گەیبووە دێڕی پێنجەمی، بابەگیان چاوی سووربوونەوەو روخساری سورهەڵگەڕا، دلۆپە فرمێسکێك بە گۆشەی چاویدا هەروا سەرەتاتکەی بوو.

بابەگیان ئاهێکی هەڵکێشا و وەخۆ هاتەوە. ((بەڵێ، عەرزی بە حوزورتان بێ، دەیگوت- بابم عەرز دەکەم- دەیگوت بە شەقاماندا سروودی ئازادی و نیشتمانمان دەخوێندنەوەو دەمانگوتن و ئەو خەڵکانەی لەو بەرەو بەرانیش راوەستابوون چەپڵەیان لێدەداو پیرەمێردەکانیش هۆن هۆن



دەگریان، و بەحەسرەتەوە دەیانگوت: ((خۆزگە بەو جحێلاٚنە- ئا ئەم کوڕانە- ئێمە حەسرەتی ئەوەمان لەسەر دڵی بووە گرێ، بەلاٚم هەرنەبێ خۆ ئەو کوڕانە وەك مە بەدبەختیە ئابینن و تام و چێژێك لە ئازادی و ژیانی خۆیان وەردەگرن!...)) بەلاٚم ئاغا، هەرهەمان کوڕەلاوی کە باپیرەی من بوو لە پێناو هەمان بیر و باوەڕدا دە زیندانێدا رزی و عەمری دایە ئێوەی حازریان... ئێستاش ئێوە دەڵێن بارودۆخ و گوزەرانەکە دەگۆڕێ —نازانم- خودا دەزانێ- خوا لەزارتان بڕوانێ!... بەلاٚم من دڵم بەو قسانە ئاوێ ناخواتەوە!)).

بابەگیان ئەمەی گوت و سەری بەردایەوە. ئەوە یەکەمین جاری بوو کە دەربارەی بابی و بنەماڵەکەیان بدوێ؛ من هەروا لەجێی خۆمەوە جینگڵم دەدا، و حەجمینم لێ هەڵگیرابوو، هاوڕێی حیزبیش سەری بەردا بۆوەو دە خەیالاٚنەوە چوو بوو. ئەوانیدیش هەموو بێدەنگ دانیشتبوون.

دوای ماوەیەك هاوڕێی حیزبی سەری هەڵێنا و بێ هیچ گوێدانێ قسەی بابەگیانی، یا بێ ئەوەی بە هیچ شێوەیەك دوور و نزیك بەلای قسەکانی ویەوە بچێت، چەند سەرەپەتێکی لە گۆڕانکارییەکانی دەوروبەر و بارودۆخی جیهان، و ئەو گۆڕانکاریانەی شۆڕشی ئۆکتۆبەر هێنانییەکایەوە لە جیهاندا و ئاگری ئەو شۆڕشانەی کە لە زۆربەی شوێنەکانی دنیایە بڵێسەیان دابوو هەڵکردەوە و باسی کردن. وتەکانی پڕبوون لە بێژەی ((یزم)) و ((لۆژی)) و زۆر بێژەی نامۆ و کێویلکە: مارکسیزم، سۆسیالیزم، تریدیۆنیۆنیزم، ریفۆرمیزم، سۆسیۆلۆژی، بایۆلۆژی، ئایدیالۆژی... لەراستیدا، خەریك بوو بە شرۆڤە و شیتەڵکردنێکی ماتماتیکیانە هەر چوار وەرزی گۆڕانکارییەکانی بەهاتنی بەهار و تێپەڕینی زستانێوە بە ڕوودانی شۆڕشەکانی جیهانەوە ببەستێتەوە، لە کاتێکدا کە بابەگیان سەرما و سۆڵە و بەستەڵەکی کەوتن و هەستانەوەکانی ژیانی بە کوڵك و پێستی خۆیەوە تاقیکردبۆوەو کەچی تا ئێستاش بەهارێکی تێدا نەدیبوو. هاوڕێ، لە کۆتاییدا شتێکیش دەربارەی گەندەڵی دەوروبەرەکە دوا و ئەنجامەکەی واهێنایەوە کە لەبەر ئەمانە-یانی لەبەر ئەوشتانەی کە ئەو گوتنی- ئەو قاچاغچی و سۆزانییانە لەراستیدا هەموو قوربانی ئەو ستەمە کۆمەلاٚیەتیانەن (لە قسەکانیڕا دیاربوو کە سەرەداوێکی حاڵ و باڵی خێزانێ مەی دیوەتەوە) هەر ئەوەی لەزاری هاتەدەرێ دایی لێوە لەرزەی هاتێ، رەنگ و رواژای بابەگیانیش پەڕی؛ و من ئارەقەیەکم کرد. هاوڕێیان دەگوڵی

رایەخەکەوە رامابوون. هەر کە هاوڕێیەکە ئەوەی دیت هەر زوو کەوتە پینە و پەڕۆکردنێ بابەتەکەی و درێژەی دایە: ((لەبەر ئەمە، ئەوان هیچ گوناهێکیان نییە... لەراستیدا گوناهبار ئێمەین. چونکە ئێمە دەوروبەر و ژینگە پێکدێنین و دروستی دەکەین، چونکە هۆی گۆڕانکارییەکانمان بەدەستەوەیە. ئەرکی ئێمە بەرامبەر خەڵك و بەرامبەر مەملەکەت وا دەخوازێ کە ئێمەش بەلانی خۆمانەوە ئەرکی سەرشانمان ببینین)).

بابەگیان بەرەنگ و روویەکی پەڕیوەوە پێکەنی.

هاوڕێی حیزبی گوتی: ((ئیختیارتان هەیە. زۆر سوودمەندبووین! من خۆم یەکجار زۆر سوودمەندبووم- نازانم هاوڕێیانیش)).

هاوڕێیان گوتیان: ((ئێمەش هەروەتر)).

((دیارە دەبوون، حەزم لێبوو بۆ خۆم شتی فێرببم، دەمویست ئەوەی بڵێم: بەدەردی دەڵێن هەر لەو دەمەیرا کە خۆم ناسیوە... یانی چاکە و خراپەی ژیانم لێك جوداکردۆتەوە. هەمیشە ئەوەم بیستووە. ئەوە ئاغای زەینەل عابیدینیش هەردەیگوت...)).

دایی گوتی: ((خودا کوێر و زەلیلیان کات ئینشاڵڵا!)) بابەگیان تیلەچاوێکی دایە. من دەستبەجێ، بێ ئارام، کەوتمەوە جینگڵدانێ، لە ترسی وەی کە هەر ئێستا نائێستا دانیشتنەکە تێك بچێت و هاوڕێی حیزبی نیگەران و توڕە بکات.

بابەگیان دە درێژەی قسەکانیدا گوتی: ((بەڵێ، ئەوە بەڕێوەبەری پەروەردەش هەر دەیگوت- ئەو رۆژەی کە کوڕەکەم بروانامەی وەردەگرتەوە...)) بابەگیان و دایی هەردووك ئاهیان هەڵکێشا؛ بابەگیان دەستێکی بەنێوچەوانیدا هێنا، وەك بیەوێ ژەنگی غەمی یادی کوڕەکەی بسڕێتەوە- هەنیەی ئارەقەی دەردابوو. ((... ئێستاش ئەوە سەرۆکی پۆلیسخانەی هەر ئەوەی دەڵێتەوە- یانی هەر ئەوەی دەڵێتەوە کە جەناب عالی فەرمووتان... کە دەبێ ئەرکە نیشتمانییەکانی سەرشانمان ئەنجام بدەین. بەلام باشە، هەمووشی یەك لایەنە... تەنیا من و ئەوانەی وەك منن... ئەرکی ئێمەیە کارەکان ئەنجام بدەین، بەلام سەرۆکی پۆلیسخانەی و سەر لەشکر و ئەوانیدی هیچ ئەرکێکیان بەلایەنی ئێمەدانییە، یا رەنگە ئەو ئەرکانەیان هەشبێ و ئەنجامیشی بدەن، بەلام ئێمە نایانبینین...)).



من و هاوڕێی حیزبی، ویستمان پێکەوە لە قسەکانی هەڵدەینێ. بابەگیان هەردوو دەستی، بە تەزبیحەوە، بەرەولای هاوڕێی حیزبییەوە درێژکرد و بەسەر و دەست جولاندنێوە کە نەختێکیش هەستابووە سەرپاژنان گوتی: ((راوەستن، راوەستن!)).

هاوڕێی حیزبی گوتی: ((فەرموون!)).

((... بەلام من هەرخۆم بەخۆم دەڵێم ئەرکی تۆ چییە؟ خەڵکی دی چیان بۆ کردووی، و تۆ دەبێ چ بکەی؟ پێم وایە- یانی بەندە پێم وایە- کە ئەرکی من ئەوەیە... نازانم، رەنگە هەڵەش بم... بەڵێ، پێم وایە کە پارووە نانێکی حەلاڵ پەیداکەم، کوڕەکەم بنێرمە قوتابخانە بخوێنێ- ئەگەر قوتابخانە هەبێ- دوایەش بەپشتیوانیە خودای لەسەرکارێکی دامەزرێنم تا پارووە نانێکی حەلاڵی دەستگیر ببێ و بتوانێ ژنێکی بێنێ و ماڵ و خێزانێکی پێکەوە نێت و چەند منداڵێکی چاك و پوخت و لەبار، بارێنێت و پەروەردەیان کات. جگە لەوەش من ئەوەندەشم لەوی دەوێت گوێڕایەڵ بێت، و خاو خێزانی خۆشی خۆش بوێت و نالەبار نەبێت- کە سوپاس بۆ خوا تائێستا بێ گوێییەك و کارێکی خراپم لێ نەدیوە...)).

هەموو سەرنجی ئافەرینیان بەلای مندا ئاراستە کرد. هاوڕێی حیزبی گوتی: ((بەڵێ، خوا لێت نەستێنێ، لاوێکی بارهاتووە)). داییش ویستی هێندێك شتان بخاتە سەرقسەکانی بابەگیانی و لێیان زیادکا، بەلام گرژینەوەی بابەگیانی نەیهێشت- هەروەك ئەوەی من داواکاری ئەو کارەبم و واپێویستکا کە هاوڕێی حیزبیش شتێك دەربارەی ستایشی من هەر بڵێ.

((... بەلام ئاغا، پێم ناڵێی ئەرکی سەرۆکی پۆلیسخانەی، و سەر لەشکر و ئاغا زەینەل عابیدین بەلایەنی من و کوڕ و خاو و خێزانەکەمەوە دەبێ چ بێ؟ -هیچ. ئەوە دیارە کە تەنیا ئەرکیان هەردەست پانکردنەوەیە بۆ وەرگرتنێ. پێڵاوان چاك کەن پارەی نەدەن، شتی بەرن پارەی نەدەن، خۆ مات کەن تاشتێك دە قەومێ یا شتێك روودەدات تا هەریەکەیان بەگوێرەی خۆی مایەفوتت کەن. هەر خۆشیان بە داواکار بزانن... یەك لەولاوە هاواری لێ هەستاوە کە ئەرك و کار دەرفەتی هێندێ نادا بە ماڵ و منداڵیش رابگەی؛ یەکی دی لەولاوە داد و بڕۆیەتی کە هێندە چۆتە لای رەییس و بەڕێوەبەر و سەر لەشکران هەمووشی هەر بۆ واسیتەی ئەم و ئەو هێندەی روو لە پیاو و ناپیاوان ناوە، کە لەبەر خەڵکی خودای، هەم سوك و ریسوا بووە و هەم

ناوی خوداشی لەبیرچۆتەوە... باشە من تێماوم کە قسەی کامیان راستە، و دەبێ چ بکەین تا ئەو ئاغایانە، هەم مرۆڤ وەك مرۆڤ سەیرکەن هەم مافێك بۆ ئەم خەڵکە دیاری کەن...)).

هاوڕێی حیزبی ئیدی دەرفەتی نەدا. ((بەڵێ، ئێمەش هەرئەوەمان دەوێ: دەمانەوێ خەڵکی- بە سەرۆکی پۆلیسخانە و بەقسەی ئێوە، سەرلەشکر...)) ئەوە پێدەچوو ئاماژەیەکی گاڵتە ئامێز بێ بەو هەڵەیەی بابەگیان کە لە جیاتی فەرماندەی لەشکر سەر لەشکری بەکارهێناوە. بەوەی زۆر ناراحەت بووم. بەلاّم روخساری راشکاوی هاوڕێ زوو ئەو گومانەی رەواندەوە ((... ئەوانەیدیش وەك بازرگان و کاسبکار و وەرزێر و کرێکار و هەمووان بە ئەرك و کاری خۆیان ئاشناکەین و هەریەکە کاری خۆی بزانێ چییە: هەریەکە چ ئەرکێکی بەرامبەر بە کەسانی دیکە هەیە، مافیان چییە. رێی وەدەست هێنانی ئەم مافانە کامەیە و بەرگری لە پێشێل کردنی چییە و چۆنە. ئامانجی ئێمە ئەوانەن. ئامانجمان ئەوەشە کە بە هێنانە دی یەکیەتییەکی پتەو لە نێوان چین و توێژەکانی خەڵکی زەحمەتکێش و تێکۆشەراندا ئەم گۆڕانکاری و رووداوانە بەرەو پێش ببەین...)).

بابەگیان گوتی: ((ببوورن ئاغا، ئاگام لێنەبوو... گوێم لەوەی نەبوو کە دوایە گوتت. فەرمووتان بەچی؟)).

((عەرزم کردن تێکۆشەران)).

بابەگیان بەروخسارێکی پەرتەوە گوتی: ((ها، تێکۆشەنان!)) مستەفاخان پێکەنی، من هەمدیس ئارەقەم دەردایەوە، سەرنجەکانی کوڕی ئاغای سلێمانی بەگەڕانی نێو پاشخانێوە مژوول بوو؛ ئاغای کەریمی سوتووی جگەرەکەی لە ملی پاڵتۆکەی دەتەکاند. ئیدی بابەگیان نەیپرسییەوە کە ئەو ((تێکۆشەنانە)) کێن یا چن، یا ئی کوێن. هاوڕێی حیزبی دە درێژەی قسەکانیدا گوتی: ((بەڵێ، بۆ نموونە ئەگەر ئێوەی دوو سێ پینەدۆز کە دەو شارۆچکەیدایت دەگەڵ چایچی و دەباغ و سەرتاش و تێکڕای خەڵکانی زەحمەتکێشدا یەکتر بگرن و ((سەندیکا))یەکی دامەزرێنن، ئەودەمی نە سەرۆکی پۆلیسخانەی یا هەر سەرۆکێکی- یا هەر کەسێکی دی ناتوانێ زۆریتان لێبکات و مافەکانتان پێشێل کەن، یا لە فلاّنە چایچی بدات)). (چەند رۆژێك لەمەوبەر مەئمووری گومرگێ لە قادری چایچی دابوو) ((ئەگەر هات و لێیبدا ئەوە هەموو لە هەموو دەست لەکارێ دەکێشنەوە- و ژیانی شاری پەکی دەکەوێ)).



بەلای بابەگیانییەوە سەیربوو-پەکی دەکەوێ! بەو روخسارە سەرسامەیەوە دیاربوو دەمێشکی خۆیدا خەیاڵی دەکردنەوە: دەست لە کارێ بکێشنەوە تا چ ببێت؟ بۆ دەو شارۆچکە لاچەپەکەیدا رۆژانە چەند جووت پێلاّو دەدڕێن تا چاکیان کەنەوە یا چەند کەس پێلاّوەکانیان بۆیاغ دەکەن؟ بۆ ئەوەی پێلاّوەکەشی دەدڕا هەر راست دەستوبرد دەهات و چاکی دەکردەوە؟ یا چەند کەس چایان لە چایخانەی دەخواردەوە- ئەگەر هەر نەیانخواردبایەوە چ دەبوو؟ چەند کەس سەریان چاك دەکرد؟ هەموو کەسێك لە ماڵە خۆی گوێزان و هەسانێکی هەبوو؛ هەرکاتێ سەری مندالّەکان هاتبایە مندالّەکان بۆ خۆیان دەچون سەری خۆیان تەڕ دەکرد و دەیانخوساند و باب یا مامیش سەرەکانی بۆ دەتاشین. گەورەکانیش هەروەتر. زۆرجارانم دیبوو هەر کە فەقێ ئەحمەد گوێزانەکەی بە بەری دەستیدا هێنابا، ئیدی ئەوە منداڵی دەر و دراوسێ دەهاتن و ریزیان دەبەست و سەریان تەڕ دەکرد. خەڵکی زۆر بەقنیاتەوە دەژیان: ئیش و کار هەمووی رۆژ بە رۆژێ بوو. ئەگەر ئیشیان نەکردبایە لە کوێیان دێنابیخۆن؟... ((بەڵێ، هەرکاتێ خەڵکی ئەو دژ کردارە ئەنجام بدەن ئەوە ئەو دەمی سەرۆکی پۆلیسخانەی یا سەر فەرماندەی لەشکر یا هەر رەییس و فەرماندەیەکی دیکە، شارەزای ئەرکەکانی خۆی دەبێت و وەك دەڵێن دەزانن یەك کیتەڵە ماست چەندی نڤیشك تێدەکەوێ)).

بابەگیان هەروا بە هەوتییەوە زەردێکی هاتێ. وەك ئەوەی هەر لەخۆوە وای هەستکردبێ کە ئەوەی هاوڕێی حیزبی دەیلێ شتێکی دیکەیە. بۆیە هیچی نەگوت، تەنانەت نەیپرسی ((سەندیکا))ش چییە. ئەو شتانەی ئەودەمی نەیگوتن ئەوا ئێستا دەیانڵێ: دوای تێپەڕینی سی و پێنج ساڵ و ئەو هەموو هەوراز و نشێو و بە قسەی وی ئەو هەموو ((تێکۆشانانە)) سەختانە! کەچی ئەو هەموو ئەرکانە تەنانەت لەخودی پایتەختی مەملەکەتیشدا هەر بەمل کۆڵکێش و زەحمەتکێشانەوەیە. کارەبا دەبڕێ، بابڕێ، دیارە کەمتەرخەمییەك دە ئارادابووە- خۆ نابێ لە دەوڵەتێ داواکەی- داواکردن ماڵی هەژار و نەدارانە. هەی قوڕ بەسەروەی کە پێلاّوێکی بدروێتەوە و سەرە داوەکانی دوای دوومانگان بێنەوە دەرێ! ئەودەمی وەرە و مشتەریە بێنە و بزانە دەیکاتە چ هەرایەك، هەروەك تالاّنت کردبێ، وەك ئەجەلی لەناکاو پەیدا دەبێت و دەکوژێ و دەبڕێ و بە هیچ زمانێکیش تێناگا کە بابەگیان، موسوڵمانی خودا: ئەو دەزووە غەرغەرەکەی جاران نییە. ئەگەر دەوڵەت هەبایە- ئەو دەمی دەیوێرا ئاوا بیکاتە هەرا! هەر ئەو کارەبایە کارۆئاویە رۆژانە سەدجار دەکوژایەوە؛ یا هەرکاتێ کە هاتەوە دەبێ لە بەرزی

و نزمی و هەڵبەز و دابەزی کارەباوە هەرچی ئامێری کارەبای خەڵکیە دەبێ بسوتێ و پارەی ئەو کارەبایەش بدەن کە شتەکانی سوتاندوون- شتێکی دیشی بخەمە سەرێ بەناوی باجەوە! ئەرکی دەوڵەتیشە ئەگەر هات و لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا پارەی ئەو کارەبا جرپنەیان نەدا، ئەوا دەستوبرد بیبڕن، خۆ ئەگەر هات و دوای بڕینێ ناماقوڵیە بەستنەوەیان کردەوە ئەوە شتێکی دیش جەریمە و هەقدەستانەی دی بدەنەوە. جا ئیدی هەروا بەم جۆرە دەست بۆ هەرچی شتێکی بەری ئاوایە!

ئەوە هەر هیچ کە تا هێشتا دوو دڵیەکەی بابەگیانی نەڕەویوەتەوە هێندەی دیش توند و تیژو زیاتر بووە. ئاخر سۆفی عەزیز- ئەگەر سەد دانە سۆفی عەزیزیش هەبن- هەرگیز تایبەتمەندییەکانی دەگەڵ ویدا وەك یەك نەبوون: نە کەوڵەکەی بەر بەرۆکێی، نەدرێوشە و نە ئەو دەزووەی دروومانێی، نە مشتەرییەکانی، نە ژیان و گوزەرانی- هیچ شتێکی بەوی نەدەچوو، ئەوە جگە لە کەسایەتییەکەی، کەچی هاوڕێی حیزبی هەمووی تێکڕا وەك یەك دادەنان- تەنانەت وەك سەرەك عەشیرەتێك کە هەموو تیرە و تایەفە و کوێخا و گزیر و شوان و گاوانی لێك جیادەکردنەوەو دەستنیشانی دەکردن ئەو وای نەدەکرد و هەمووی وەك یەك سەیر دەکردن، و ئەوجا بێی ناماقوڵیە بکەی و وەك دەرۆزەکەران پیتاکێ خڕکەیەوە. ئەو کارانە فلسێکی قەڵب ناهێنن، هەرکەسە بۆ خۆی دەبێ هەست بکات و بڕیاری خۆی بدا. ((باشە خۆ دەبێ یەکێك هەبێ ئەو خەڵکەی بخاتە سەر ئەو بیر و ڕایانە و بیانجولێنێ...)).

نا، خەڵکی دەبێ بیربکەنەوە، لەوانەشە لە بارودۆخێکی وا دابن نەتوانن ڕێی ڕاست هەڵبژێرن و بیدۆزنەوە. ئەودەمی دیارە ئەگەر کەسێك ئەو بیروڕایانەیان بە شێوەیەکی ڕاست و دروست و دیار و ئاراستە پێشان بدات سەدی سەد پێی قایل دەبن.

((ومن پێم وایە کە ئەوئیشە لە جێیەکی وەك ئێرە، کەمێشکی خەڵکەکەی پاك و خاوێنە و دەهیچەوە نەگلاوە، سوك و ئاسانتر بێت)).

کوڕی ئاغای سلێمانی گوتی: ((نا هاوڕێ، مێشکی خەڵکی لێرە نەك هەر تەنیا پاك نییە، بەڵکە هەر یەکجار زۆریش ئالودەیە و تێوەگلاوە. ئێرەش وەك هەموو جێیەکی دی، تەنانەت لەجێی دیکەش خراپتر، بیرو هۆشێکیان بەخەڵکی نەهێشتووە. ئێمە لێرە سەرەڕای ئەو خەڵکانە، تیرەی دیکەش، یانی لەراستیدا دوو لقی دیکەشمان هەن)).



((شێخ هەن کە هێندێکیان سۆفی و هێندێکشیان دەروێشان پەروەردە دەکەن، کە ماری دەخۆن، خۆ دە ئاگری داوێن، کێرد و شمشیران بەزگی خۆدا دێنن، و ئیدی ئەو کارە سەیرو سەمەرانە دەکەن. دیارە با ئەوەش عەرزکەم کە سۆفیگەری و دەروێشی ئیرە دەگەڵ شوێنانی دی زۆر لێك جیاوازە. دەروێش و سۆفییەکانی ئێرە هەر هەمان ئەو وەرزێرانەن کە دەیانبینی: کشتوکاڵی خۆشیان دەکەن، و لە هەمان کاتیشدا سۆفی و دەروێشیشن، و جگە لە خان و ئەمنیە و کەسانی دی زەکاتێش دەدەنە شێخی- زۆریش بەزیادەوە و بەتەواوی حەز و ئارەزووی خۆشیانەوە)). سەیرێکی مستەفاخانی کرد. مستەفاخان لەوەلاّمدا پێکەنی. ((هەروەکو ئاگاداریشن دەروێشی شوێنانی دیکە کارێ ناکەن و بەسەودای مەولاوە هەر دەگەڕێن؛ ئەو چەندانەی دیش کە هەروا تەمبەڵ و تەوەزەل پاڵیان داوەتەوە و لە چلێسیە دەگەڕێن ئەوە ئیشەکانیان دیارە. بەلاّم دەروێشی ئێرە ئیش دەکات و ڕەنج دەدات- جگە لەو هێندێکانە نەبێ کە هەڵبژاردەو دەستنیشانی شێخین، کە پێیان دەڵێن ((دێوانە)). لێرە لە گوندان، خەڵکی بە تێکڕایی یا سۆفین یا دەروێشن- و دوایەش دەبنە حاجی دەروێش و حاجی سۆفی. دەروێش پرچنە، سۆفی ریشن؛ دەروێش ئەهلی زاهیری و هات و هاوار و هەییا هوویە، سۆفی ئەهلی باتینە، ئەگەر ماوەیەك تەشریفتان لێرە بن کردارەکانیان دەبینن... بەلای منەوە بەپێچەوانەی بۆچوونی ئێوەوە، لێرە کاروبار- ئەویش کاروباری کۆمەلاّیەتی- بەڕێز زۆر لە جێیانی دیکە دژوارتر و گرانترە)).

هاوڕێی حیزبی زۆر بەوردی گوێی دابوویە. دیاربوو حەزی لە روونکردنەوەی زیاتر بوو. کوڕی ئاغای سلێمانی، لە وەلاّمی ئەو حەزەی ویدا دە درێژەی قسەکانیدا گوتی: ((دەروێش و سۆفی جگە لەو پەیوەندییانەی کە دەگەڵ خان و مەلای دێیانیاندا هەیە- کە دیارە پەیوەندییەکی قوڵ و رەگ و ریشە داریشە- پەیوەندی بە تینتریشیان بە ((پیر))ی خۆیانەوە هەیە. تەنانەت بۆ تایبەتمەندترین کاروباری خێزانیشیان پرسیان پێدەکەن: بۆ نموونە داخوا جەنابی شێخ پێی چاکە کچەکەی بەمێردبدات؛ ئەگەر پێی چاکە داخوا بەڕاستی دەزانێ بیداتە فلاّنە یا کوڕی فلاّنە کەسی؟ ئەمانە- شێخەکان عەرز دەکەم- هەم راوێژکارن، هەم پزیشکن، هەم گوناە بەخش، هەم دار و دەستەی خانەکان، چونکە خانەکانیش خۆشیان بێ و ناخۆشیان بێت دەبێ هەر دەگەڵ شێخێکدا بن، دەنا کاروبارەکانیان ناڕواو هیچیان بۆ ناچێتە سەرێ. ماڵەکانیشیان پەناگای لێقەوماوانە... خانەکان، و تەنانەت حوکمەتیش- تا ئەندازەیەك- ڕێزیان رادەگرن. هەر بەوجۆرە

باج له خانەکانیش دەستێنن. کاسبکاری شاریش هەریەکەیان سەر بەشێخێك هەن و بەلانی کەمەوە ساڵانە جارێك دەچنە سەردانێ شێخی تا هەرنەبێ ئەوەی بە ئەستۆی وەیە بیدات و لە هیممەت و بەرەکەتی ویش بەرخوورداربێت و پشتیوانییەك بێ بۆ بەرێوەچوونێ کاروباری ماڵ و حاڵ و کاروکاسبی و بازرگانییەکەی. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی شێخ و بنەماڵەکەی ئەوەیە کە هەرچی بیانەوێ دەیکەن. یانی هەر چییەکی بکەن جێی گلەیی و گازاندان نییە لەبەر ئەوەی ((وەجاغزادە))ن دەو دواییانەشدا یەکێك لەو شێخ زادانە ملی لە نوێخوازیە نا، و بەورێ و شوێنەوە دەستی دایە ئارەق خواردنەوێ، وشتی دی. بەلاّم بۆ مردیدەکان ئەوەیان لە دڵی گران هات! دەزانی چیان دەگوت؟ دەیانگوت ((بێچووە مراوی دە ئاوێشدا پشتی تەڕ نابێ!)) من بۆ خۆم ئەوەم چەند جاران لێ بیستوون. شتی سەیریان هەیە، یانی مریدەکان ئەو کارانە وەپاڵ ریشەکەیانەوە دەدەن و ئەوانەش های زۆر بە بێزارییەوە بەواتای قەبە قەبە و قەڵەو قەڵەوەوە و زۆر بەناز و نوزەوە ئەو جۆرە کارانە نەفرەت لێدەکەن- یانی لەراستییەکەیدا پەسەندی دەکەن: ((ئێمە بەندەی گوناهبارین... کارەکان هەموو بەدەست خودان... ئێمە هەر تەنیا نزایان دەکەین و دەپاڕێینەوە... ئێمە هەر تەنیا واسیتەیەکین و هیچی دی... ئینشاڵلاّ، بەپشتیوانیە خودای...)) بەڵێ، ئاگایان لە هەموو نهێنییە مریدەکان هەیە، هەموو شتێکی دەزانن، رووداوان لە دووریە چەند فرسەخانەوە دەبینن.

مریدەکان هێندەیان باوەڕ بەو رێ و شوێنەیە زۆر جاران کە بۆ نیازێکی دەچنە خزمەت شێخی مرازەکانیان لەلا نادرکێنن، چونکە زۆر بەڕاشکاوییەوە باوەڕیان وایە کە حەزرەتی شێخ، بە قوربانی بن، بۆ خۆی دەزانێ بۆ چ هاتوون، و ئاگای لێیە)) (پێکەنینی دانیشتووان) ((کابرایەك بووکەکەی یا کچ یا کوڕەکەی شێت دەبێ، ئەگەر پارەداریش بێ ئامادە نییە بیباتە لای پزیشك- ئەوە ئەگەر پزیشك هەبێ- یا هەرنەبێ نەخۆشەکە بەلایەکیدا ببات و چارەسەری بکات. بووك یا کچ یا کوڕەکەی دەباتە ماڵە شێخی- خزمەت حەزرەتی شێخ- تا ئەو چارەسەری بکات و چاکی کاتەوە. حەزرەتی شێخیش خۆ ناڵێ کە پزیشك نییە- خۆ ئەگەر واش بڵێ ئەوە لایەکەی دی قبوڵ ناکات. بەهەرحاڵ، نەخۆشەکە دەهێڵێتەوەو هەروەك باوە بۆ دان پێدانان و وەقسە هێنانێی دەربارەی ئەو جندوکانەی لەخشتەیان بردووە و کردوویانەتە ئاڵقە لە گوێی خۆیان و کردوویانەتە ((لاگر))ی خۆیان دار و فەلاقە و برسییەتی و ئەو ((جۆر و شێوە دەرمانانە))ی لێ وەکاردێخن)) (دیسانەوە پێکەنین) ((ئەگەر خودا و راستان گرتی و نەخۆشەکە ئیفاقەی هات ئیدی ئەوە،



حەزرەتی شێخە- قوربانی بێت- چاکی کردۆتەوە، و ئیدی ئەوە هەر دەست و دیارییە و پێشکەش دەکرێ. ئەگەر مردیش، ئەوە دیارە موقەددەر بووە: حەزرەتی شێخ لە پێشدا فەرموویەتی کە ئەویش هەر بەندەیەکی گوناهکارە و تەنیا نزایان دەکات و دەپاڕێتەوە- دیارە مانەوەی لە ژیاندا چاك نەبووە بۆیە خودا بردوویەتییەوە، و ئەوەی لە چارە نووسراوە. خۆ ئەگەریش نەمرێ و بمێنێتەوەو چاك بێتەوەو توانای ئیش کردنێی هەبێ ئەوە لە ماڵە شێخی دەبێتە خزمەتکار و لەوێ کارێ دەکا- و کێ خوا دەیداتێ و کەی لەوە خۆشتر کە پیاو یەکێکی هەبێ لە ماڵێکی وەجاغزادەی وا خزمەتکار بێ!)) هاوڕێیان پێدەکەنن! کوڕی ئاغای سلێمانی بۆ پەسەندیە قسەکانی پەنای وەبەر دایی و بابەگیانی هێنا: ((ئەرێ وا نییە پورە گوڵبەهار؟ درۆ دەکەم مامە مەشەدی؟)).

دایی گوتی: ((وایە، ئاغا، کە میشت گوتووە؛ هەر ئەو دراوسێیەی تەنیشتمان- میرزا حوسێنی عەتتار...)) بابەگیان قسەکەی دایی بڕی و دەستوبرد گوتی: ((ئێوە بە کورت و کرمانجی هەموو شتێکتان فەرموو. خەڵکیان زۆر گیرۆ دەکردووە- وەك هەموو جێیەکی دی بەلاّم خودی خەڵکی، بەویژدانەوە، تا بڵێی زۆر سادە و ساکار و میهرەبان و دڵسۆزن)). و سەیرێکی دایی کرد، یانی ئەوە من گوتم ئیدی تۆ هەڵمەدەوە و بەدوایدا مەچۆ. هاوڕێی حیزبی گوتی: ((سەیرە! کەواتە منیش هەر بەو سادە و ساکاریەیانەوە هەڵخەڵەتاوم و فریوم خواردووە!)) کوڕی ئاغای سلێمانی گوتی: ((بەڵێ، تا بڵێی سادەن- زۆریش سادەن. و بەداخەوە گەورەکان سوودیان لەو سادە و ساکارییەی وان دیوە و دەیبینن. ترسی هەڕەشەی شێخ و کوتەکی پاسەوانان و خان و مەئموری مالییە و مەئمور نفووس و سەربازی و دایەرەی توتنێ و هەرچی دایەرەی ئەم دنیایەیە هیچ دەرفەتێکی ژیان و بیرکردنەوەیان بۆ نەهێشتوونەوە. ئەو دووسێ ساڵەی دوایی نەبێ بارودۆخ تۆزێك گۆڕاوە، ئەویش هێندە نا؛ ئێستا مەئمورەکان تۆزێك تێبینیە دەکەن؛ خەڵکی رەش و رووت تۆزێکی تا ئەندازەیەك ترس شکاوەو بەواتای خانەکان دەمیان درێژ بووە... بەلاّم دەگەڵ ئەوەشدا هەر زۆر گیرۆدەو داماو و تێماون)).

هاوڕێی حیزبی گوتی: ((بەڵێ!)) و دووبارە کەمێکی دیکەی دەربارەی بزاوتی جیهانی بەیان کرد و درێژەی دایە کە بەهەرحاڵ دنیا روو لەبەرەو پێشکەوتنە و دەیەك هەسارەدا تەنیا ئەستێرەیەك بەتایبەتی ناتوانێ لە یاسا و رێسای هەمووان لابدات و بچێ بە تەنیا تەوەرێکی بۆ خۆی بگرێ و

له فەرمانی هەسارەکە دەرچیٚ و بۆ خۆی سەربەخۆ بە ئارەزووی خۆی بسورێتەوە، و بەبوونی کیشوەرێکی وەك یەکیەتی شۆرەوی و ئۆردوگای سۆشالیستی بێگومان دیارە کە بارودۆخی جیهانی دەگۆڕیٚ و بەگوێرەی وی کە ئێرەش بەشێکی ئەو جیهانە گەورەیە گۆڕانی بەسەردا دێت.

دایی دیسانەوە خۆشحالٚ بوو کە: ڕەنگە بەخت و شانس و بارودۆخ بگۆڕیٚ. خودا لە دەمتان بنۆڕیٚ! کیٚ دەلٚیٚ هەتا هەتایە هەر شەیتان کار بەدەست دەبیٚ. بەلاّم دلٚیشی ئاوی هەر نەخواردبۆوە. چونکە لەوەتەی ئەو دیویەتی و لەوەتەی هەیە بارودۆخ هەروا بووە و هەرواشی دیوە- بەلاّم ئەوە خودا کردی! بابەگیان سەرێکی ڕاوەشاند.

هاوڕێی حیزبی گوتی: ((باوە، پێدەچیٚ ئێوە ئەوەتان لا پەسەند نەبێت، ها؟)).

دیسانەوە بابەگیان دەیویست چ تێوەرێخێکی دیکەی تێوەرێنیٚ؟ لا ئیلاهە ئیللالّلاّ- ئەمشەو بۆ وای لێهاتووە!

بابەگیان گوتی: ((بەلٚیٚ... وەلّلاّ بلٚێم چی... ئێوە وا دەفەرموون، بەلاّم ئێمەی نەدیتکە. پەرژین بیٚ، چتان لیٚ بشارمەوە، زۆرمان خۆ خڕهەلٚدابوو!)) ڕووی لە دایی کرد ((ئەوە گولٚبەهاری حازری دەزانیٚ... گولٚبەهار، وانییە؟)).

دایی بە دەنگێکی کە ساسانەوە گوتی: ((بۆنا، ئەریٚ وەلّلاّ، زۆریش!)) ئاهێکی هەلٚکێشا.

((بەلٚیٚ... هاتن- ڕووسەکان دەلٚێم- نەوەی کە نەهاتبن... هاتن... بەلاّم خۆزیا هەر نەهاتبان. بە دەردی دەلٚێن دەماوەند هەر نەزا و هەرنەزا کە زاش مشکێکی بوو... بەلٚیٚ، هاتن، بەلاّم دەگەلٚ ئەوەشدا کە دەیانزانی سەری دوو جگەرگۆشەم دەگەلٚ دەولٚەتیدا لەپێناو وان دانا)) (ئاهی دووبارەی دایی) ((لەبەر چاوی دۆست و دوژمنان، تەنانەت هەر بۆ ئەوەی دوژمنمان پێخۆش نەکەن... نەیانگوت مامە کەرت بە چەندی!... دەیانگوت دەفتەر و تۆمار و دۆسیەیان هەیە، ئاوێش بخۆیەوە ئەوان دەزانن، بەلاّم هەروەك عەرزم کردن کەسێك نەیپرسی مامە کەرت بەچەندی! — وا نییە گولٚبەهار؟... پێتان وانەبیٚ چاوەڕێی نەبووین، ئاغا، بووین، زۆریش چاوەڕیٚ بووین، بەلاّم هەروەك عەرزم کردن ئیدی نەیانویست و ئارەزوویان لێنەبوو!)).

دایی گوتی: ((ئەریٚ وەلّلاّ، زۆریش چاوەڕیٚ بووین- هەموو هەر چاوەڕیٚ بوون- بەلاّم هەروا کە مەش ئەکبەراغا گوتی کەسێك نەیپرسی کەرتان بە چەندی!)) و هەناسێکی قولٚی هەلٚکێشا.



ڕوخسار هەموو غەمبار بوون؛ مابۆوە سەر هاوڕێی حیزبی شەکرێکی بشکێنیٚ؛ ئاخر من لەوەی تێمابووم کە ئەو چاوەڕوانیە بۆ. سەرەڕای ئەوەش، پەرژین بیٚ لەرووی وان، بۆ خۆیان خڕ هەلٚدابوو!

کوڕی ئاغای سلێمانی کە هەروا تەزبیحی بادەدا، وەك بلٚێی بۆ دلٚنەواییە، گوتی: ((بەلٚیٚ ئێوە ڕاست دەفەرموون)) سێبەری پێکەنینێکی دەچاوانڕا دیاربوو کە دەگەلٚ ئەو گنج و گرژ و مۆنیەی هەنیایدا جیاواز بوو، بەلاّم سەری بەردابۆوە، و پشتە لێوی ئارەقەی دەردابوو. ((ئێستا من عەرزتان دەکەم. هەروەك لە دوایەدا ڕوون بۆوە ڕووسەکان بە هەلٚە هاتبوونە ئێرە و لێیان گۆڕابوو- ئێرە جێی دەست بەسەرداگرتنی ئینگلیزەکان بوو. هەر بۆیەش لە دوو سیٚ ڕۆژان بەولاوەتر نەمانەوە... مامە مەشەدی، ئەگەر وەبیرتان بیٚ هەر دوای ئەوەی کە بووە عەشایەری کاپیتان شوتەر و کاپیتان فیلچەر دەهاتن- لە بیرتانە؟)).

بابەگیان بەروخسارێکی هەوتەوە، هەروەك نوکتەیەکی خۆشیان گێڕابێتەوە کە تازە خەریك بوو تێیدەگەیی، لە کاتێکدا کە زەردەخەنەیەکی هێنابووە سەرلێوان زەق زەق سەیری دەکرد: ((ئاااا، دیارە ناوچەی دەست بەسەرداگرتنیٚ وان نەبووە! تومەز لێیان گۆڕاوە! چاك بوو خودا ڕەحمی کرد و نەچووە لای قوماندانی و چ ((نیشانە))یەکی نەدایە! هەردەو نێوەیدا کە هاوڕێی حیزبی تازەی خۆ دیبۆوە، قسەکانی لەسەر ئەم پایە و بنچینەیە دارشتەوە، و گوتی: ((بەلٚیٚ، هەروایە کە ئاغا دەفەرموون. ئێرە جێی مانەوەی سوپای سوور نەبوو؛ دەنا ئەگەر وابایە بارودۆخەکە وا نەدەبوو. ئەو جێیەکی ڕوویان تێکردبیٚ خەلٚکەکەیان ئازاد کردووە. خەلٚکەکەش ڕاپەڕیون و دەستیان بەسەر دامودەزگایەکاندا گرتووە و ئەوانەی کە گوناهباریش بووینە ئەوە بەسزای کردارەکانی خۆیان گەیاندوون- خۆ ڕووداوەکانی لیقوانی و سەرگورد موعین زادە و ئەوانەتان بیستوون... بەلٚیٚ، هێشتا ئەوان نەگەیبوونیٚ دەرەبەگ و سەرمایە دارەقەبەکان کە بارودۆخەکەیان وا دیبوو هەلاّتبوون...)).

بابەگیان گوتی: ((ببوورن ئاغا، ئەوانەی گوتتن چ بوون؟)).

((دەرەبەگ؟ -دەرەبەگ یانی ئەو خاوەن زەوی و زارە گەورانە)).

بابەگیان گوتی: ((ئاااه)) بەدەنگێکی کە وای دەگەیاند: ((باشە مامە، ئەوە شێتی، لەپێشدا دەتگوت مالیك ئیدی!)) بەلاّم دیسانەوە هەر پڕ بوو. ((سەرمایە دارەقەبەکان!)) گومانێکی لەلاپەیدا ببوو کە ناکا کولیچە فرۆشیش هەر هەلاّتبن.

دەرفەتی پرسیارم نەدا، گوتم ((بەڵێ، لەپێشدا دەرەبەگەکان بازرەقەیان بەست و هەلاّتن ئەوجا سەرمایەدارەکان)).

بابەگیان دووبارە گوتی: ((ئێ ێ ێ))یانی ئە ئاوا!- و درێژەی دایە: ((ئا، ئەدی ئەوە بۆ پاشەملە هێندە باسی خراپەی حیزبەکەتان دەکەن؟)).

((کامانە؟)).

((خەڵکی)).

((نەخێر خەڵکی نا. خەڵکی خراپەی حیزب نالێن، ئەگەر بشڵێن لەڕووی نەزانینێوەیە. ئەوانەی خراپەی دەڵێن با هەر بڵێن. ئەگەر نەیڵێن ئێمە ناراحەت دەبین. حیزبێکی پێشکەوتنخواز و پڕ چەك بە تیۆری شۆڕشگێڕی لەراستیدا هەوێی دەوڵەتە، هەربۆیەشە خراپەی دەڵێن... تا خەڵکی ساوێلکە و نەزانمان بەگژداکەن. حیزبێکی چاك، بەواتای ئێوە، وەك کابرایەکی لە خواترس وایە)).

((هەروا بۆ نموونە عەرزتان دەکەم، پیاوێکی خوایی و لە خواترس هەرگیز جێی سەرنجی حوکمەت نییە و هەرگیزیش گوێی ناداتێ. هەربۆیەشە کە حوکمەت هەمیشە هەر خەریکی دروستکردنی پیاوی خودایی ساختەیە)).

((سوپاس بۆ خوا لێرە لەو بابەتانەی لێ نییە)).

((ئێمە لە دۆستایەتییە بەولاوە هیچ ئامانجێکی دیکەمان نییە؛ هەروەك کە هاورێمان لەو دانیشتنەیدا گوتی کە هەموو ئەندامانی فراکسیۆنی تودە ئامادەن هەرچی سامانێکی هەیانە بیدەنە خەڵکی بە مەرجێك کە هەموو نمایندەکان یەك لە دەی سامانەکانیان بدەن)).

بابەگیان گوتی: ((کە چ بکەن؟)).

((کە دەرمانگایان دروستکەن، قوتابخانە و ئارامگایان دروستکەن)).

((ئەو ئاغایانەی دەفەرمووی شتێکیشیان هەیە؟)).



هاورێی حیزبی زەردەیەکی خنجیلەی هاتێ. ((بەڵێ، هەروەك، هاورێمان دکتۆر دیهقانی کە یەکێکە لە خاوەن زەوی و زارەکانی گێلانێ، یان ئیدیکە...)).

((باشە چونا و چۆن لایەنی هەژار و نەداران دەگرن؟)).

((پێغەمبەری ئیسلام کە خۆی بازرگان بوو چۆنی لایەنی هەژاران و نەداران دەگرت؟)).

بابەگیان گوتی: ((ها!)) من هیچی وام لەو قسەیە هەڵنەکڕاند.

شەو درەنگانێك بوو؛ دیاربوو ناوی بابەگیانیش- پێم وابێ دە لیستی لایەنگرانی حیزبدا بە ((بزۆز)) رۆیشتبوو سەرو وەختی رۆینێ بوو. هاورێی حیزبی هەستا. هەموو قیت بوونەوە؛ هاورێی حیزبی لەسەرەتاوە دەگەڵ داییدا کە ئەو هەموو ماندوو بوونەی کێشابوو زۆر سوپاسی کرد و دەستخۆشی ئەو نان و خوانە خۆش و بەتامەی لێکرد کەلێینابوو و بەپێچەوانەی بۆ چوونەکانی منەوە زۆری سوپاسی ئەو رۆشنبیریەی بابەگیانی کرد و زۆریش بە راشکاوییەوە رێزی لێنا- بە شێوەیەکی وا کە هەموو گومانەکانی پێشووی دایی رەواندنەوە- من چرا بەدەستەوە دەگەڵ دایی و بابەگیانیدا لەسەر پلیکانەکان راوەستام- و هەڵێدایەوە کە ئای خۆزگە خەڵکانی دیش ئاوا هەست و نەست و وردەکاری و دەرکی جەنابی رەزاییان ببوایە. ئەگەر وابایە ئەو هەموو گیروگرفت و ئاریشانە دە ئارادا نەدەبوون... و خودا حافیزییەکی گەرمی دەگەڵ بابەگیانیدا کرد و دۆستانە دەستێکی دەکەمەری مستەفاخانی وەرێنا، و بەدەم پێکەنینێوە دوورکەوتنەوە.

* * *

## (٢٢)

ئێستا زیاتر لە ماڵێ ئاغای سلێمانیم- وەك ئەندامێکی تەواوی ئەو خێزانەم لێهاتووە. ئاخر پیاو کە شەیدا دەبێت و دەگاتە دڵخوازەکەی، ئیدی ئەو پێك گەیشتنە بەهیچ نوختەیەکی دیاریکراوی کات و شوێنەوە پەیوەست نابێت. ئەو ئەڤینە دەسەرتاسەری گیانیدا دەگەڕێ و هەرچی بوون و نەبوونی هەیە هەمووی دەخۆوە دەپێچی و بەواتای عاریفان دەبێتە ((فەنافی مەعشوق)). و ئەمەش هەر تەنیا بۆ ئێستا نییە و بەس بەڵکە رابردوو و ئایندەش دەگرێتەوە. چونکە ئایندەش بەردەوامی ئێستایە، بێگومان بەردەوامی ئەڤین و سەرەنجامەکەشی دیارە، بەڵام رابردوو- مرۆڤ وا هەست دەکات کە وەك بڵێی دە رابردووشدا هەر شەیدا بووەو وێنەی یاری ناسیوەو هاتووەسەری دە دووناوەو لێیگەڕاوە تادیویەتییەوەو کاتێکیش کە دیویەتییەوە ئیدی هەرگیز لێی جیا نەبۆتەوە پێ بەپێی بەرەو ژوورچوونی تەمەنی دەگەڵیدا فراژوو و گەورەبووە و هەرچەندە لەراستیشدا نەیدیوە، بەڵام دە خەیاڵ و خولیاو هەست و نەستی ویدا هەر هەبووەو هەستی بەوبوونەی کردووە تا سەرەنجام پڕیشکی پێك گەیشتنێکی کت و پڕ لەناکاو پەردەی نێوانێی سوتاندووە و رووی یاری لەبەردەمیدا ئاشکرا و والا کردووە و گوتوویەتی: ((ئەوە من!)) ئەگەریش لێك دابڕان و جوداییش بێتەوە پێش و بڕوات و ون ببێتەوە دیسانەوە شوێنەوارەکەی دەویدا هەردەمێنێ، و بەردەوامیش هەر زیندووە، و بەخۆشی و ناخۆشیش بێت دیسانەوە هەر دێتەوە بەردیدەی: جێیەکی تایبەتی دەمێشکی ویدا هەیە کە هەرگیز هەڵناقەنێ. تا بشمێنێتەوە شوێنەواری دیکە بەجێدێڵێ. تا ئەوکاتەی دەگەڵ ویدا دەژی ئەوە تۆ بەشێکی لە بوونی ویدا، و لەوی زیاتر هیچ شتێکی دیکە نابینی، بەڵام هەرکاتێ کە لەو دابڕای، وەك تازە لە دایك بووبێتەوە، لە پڕ، لەوپەڕی ناخۆشیاندا، هەموو شتێکی دەبینی- هەروەك ئەوەی ئەوکاتەی لە دایك بوویت نەبووبێت و وەك بڵێی تازە خۆت دیبێتەوە و هەست بکەی کە ئەو پیر و کەنەفت و تێکشکاوە و تۆ هەر تازە لاوی و یا بەپێچەوانەوە. بەهەردوو لایاندا هەرمایەی ناکامییە. بەواتای ئەورۆ، ئەوە تازە خەریکی دە ئاوێنەی رۆژگاردا



ئەوی دەبینی، وەك چڵێکی ناسکی تازە چرۆ کردوو بە تەك قەدێکی پیر و مۆریانە خواردووەوە، هەڵچووە و تۆش بەهەست و نەستی بینەرێکی دیکەوە دێی دەو ((شلك و ناسکی)) و ((پیری))یەوە رادەمێنی...

بڵێم چی، بەسەرەوەم خۆ هاویشتۆتە نێو رووداوانەوە- نێو دەریای شۆڕشی جیهانییەوە. هەروا لەهیکەوە دەزانم ئەگەر قومارچی لە دۆڕانێ بترسێ بێگومان ئەوە لەدنیای بووندا کەوتووەو دۆڕاوە. دەبێ تا پەتەکە برانەوە هەر بەمسۆگەر دانێ. ئەڤینداریش هەروا؛ ئەویش هەردەبێ تا پەتەکە هەربچێ، تا بە دڵخوازەکەی دەگات، یا، خۆی قوربانی خاکی بەرپێی ئاستانەکەی دەکات و دەسووتێ و دەبتە خۆڵەمێش، یا سەرلەنوێ لێك دابڕان و سوتانێکی دیکە و بوونەوە خۆڵەمێشێکی دی. جا هەی لەوەی دەڵێ ((ئا... بەڵێ یان، نا... نەخێر)) ئەوەش بۆدوایە دەمێنێتەوە، -ئەگەر خوایاربێ- بۆ سەردەمی قاڵبوونەوێ.

وەك بڵێی هێندە بەسە مرۆڤ کەللەرەقییە بکات، یا هەر بەڕاستی بیەوێ شتێکی خۆش بووێ یا نەفرەتی لێبکا و ئەو پێویستیانەش بۆ من لە هەموو لایەکەوە لەبەردەستدا بوون کەوابم. ئەوجا دەمایەوە سەربڕیار: بڕیاری سەقامگیریە ئەو نەفرەتیەی و دۆزینەوەی پارسەنگێك بۆ نەهێشتنی ئەو نەفرەتیەی: دۆزینەوەی شتێکی وا کە حەزی لێبکەم و خۆشم بووێ. هەروەك کچێکی کە لەڕقی زڕداکێ (باوەژن) پەنا دەباتە بەرخۆشەویستییە لاوێکی کە رەنگە ئەوە هەرنەبێ کە ئەو چاوەڕێیەتی. و ئەی تازە من کە حیزب بۆتە هەموو شتێکم بەدوای چدا بگەڕێم... هەرکە گەیمە پشت دەرکێ گوێم لە ناوی مستەفاخانی بوو... ((بەڵێ، ئاغای بەڕێز، رۆشنبیر منم نەك ئێوە! دەزانی بۆ؟ چونکە من سەرانە و باج نادەمە کەس. بیدەم ئەو ملهوڕانە بیخۆن؟ ئەگەر شتێکم لێ هەڵوەرێ دەچم دەیدەمە یەك دوو بێوەژنان دەگەڵ منداڵە کوێر و کەچەڵەکانیاندا بیخۆن. بەڵام ئێوە دەچن نانی شەوێتان دەدەنە حیزب! ئەربابەکانتان گۆڕیون و ناوتان لێناون هاوڕێی حیزبی!...)).

سلاوم کرد؛ ئاغای سلێمانی هەروەك جاران بەگەرمی و بەدەم پێکەنینە هەمیشەییەکەیەوە بەخێری هێنام. بەڕوویەکی خۆشەوە، دانیشتم. بەڵام کوڕی ئاغای سلێمانی هەروا گرژ و مۆن بوو؛ ساردییەك کەوتبووە نێوانێوە ئەوەم هەر لە سەرەتای هاتنێیەوە هەست کردبوو، هەرچەندە هێشتا هۆیەکەیم بەتەواوەتی نەدەزانی. کوڕەکەی زۆر بەدەگمەن دێتە دەقسانەوە، تەنیا

جارجارێکیان نەبێ کە پلارێکی داوێ یا دە تورەییەدا لێوە خنکێکی دەکا. هێشتا زووبوو؛ سینییە خواردنەوێیان نەهێنابوو.

ئاغای سلێمانی وەك یەکێکی کە دەگەڵ خۆیدا بدوێ گوتی: ((تێکۆشان لەرێی بەختیاری خەڵکدا! هە، بەڕاستی کە! باشە بۆ شەرمێ دەکەن بڵێن تێکۆشان بۆ وەدەست گرتنێ حوکمەتی؟... ئەو بەختیاری و خێر و خۆشییە بەدەستی کێ ئەنجام دەردێ؟ بەدەستی ئێوە؟ من هەر ئەوەندەی دەڵێم- ئەوەش دەبێتە حوکمەت. جا ئەودەمی ئێوەش چ جیاوازییەکتان دەگەڵ ئیدیکەدا نابێ. ئێوەش وەك هەندێکیان هەر بەدزییەوە حوکمەتتان دەوێت، بەڵام وەك وان ئازا نین بەئاشکرا بیڵێن. بۆیە بەلای منەوە ئێوە لەوانەی دی زۆر خراپترن، چونکە بە کوڵك و پێست و بەگیان و دڵەوە خۆتان دەو گۆنگەڵەی هاویشتووە. ئێوەش ئیدی هەروەك هەمان ئاغای وەزەغ پور- کە بەدیداریان شادببوون- یا ئەو ئاغای سوسمارییە... ناوی چییە؟ بەروخسارێکی پرساوییەوە سەیرێکی منی کرد.

بەلێوە خنکەوە سەیریم کردەوە- مەبەستەکەی باش تێنەگەیشتم.

((رەییسی هەواڵگری دەڵێم)).

((گوتم: ((ئاغای کامیاری)).

((بەڵێ، ئەو سوسمارە... ئێوە وەك ئەو وەزەغ پورە یا ئەو سوسمارە نین کە بەیەك دووتمەن قایل بن، و دابێنەوەو هەستنەوە. ئێوە مەبەستێکتان هەیە- بێ ئەملاو ئەولا؛ ئێوە دەتانەوێ کودەتا بکەن؛ حوکمەتیە بکەن. بەڵام ئەو بێنەوایانە دەیانەوێ بژین. دیارە ئێوەش لەرێی ئەو ئامانج و مەبەستانە و شێوەی ئەو رەفتارانەتاندا کوتەکانیش دەخۆن- زۆریشی وێدەکەوێ. بەڵام واوەیلا بۆ ئەودەمی کە کلکەگایەکتان وەمست دەکەوێ- ئەودەمی خودای هەر ناناسن و لەبیرتان دەچێتەوە... خودا رەحمێ بەو خەڵکە بێکەس و بێدەرەی بکات؛ ئەودەمی هەرهێندە لەخەڵکی گەڕێن بە ((چرای گەنە گەرچەکێ)) بەدوای ئەوانەی وەك وەزەغ پوریدا بگەڕێن، لەدەست ئێوە!...)).

کوڕەکەی گوتی: ((بۆ بابە هیچی تێدایە، ئەگەر هەوڵی وەدەست گرتنێ حوکمەتی بدەین؟ بۆ ئێمە بەشێکی خەڵکی ئەم وڵات و مەملەکەتە نین؟ شتێکی زۆر سروشتییە کاتێك کە حیزبێك



دادەمەزرێ و هاوبەشیە دە هەڵبژاردنێدا دەکات و هەوڵ دەدا و تێدەکۆشێ تا زۆرترین کورسییەکانی ئەنجوومەن وەدەست بێنێ و بێت حوکمەتی دامەزرێنێ... بەلای ئێوەوە ئەوە هیچی تێدایە؟)).

((نا، بەلای منەوە، ئەگەر راستکەن هیچی تێدا نییە، بەڵام ئەودەمی چ لەو تیۆرییە شۆڕشگێڕانەییەتان دەکەن؟ ئێوە بۆ خۆتان ئەو ئەنجوومەن و بەزاراوەی خۆتان ئەو هات و باتە بۆرژوواییانەتان پەسەندنییە- پەسەندتانە؟)).

((نەء.)).

((کەواتە دەتانەوێ فێڵە مراوییە بکەن؟)).

((نا ئەوە فێڵە مراوی نییە- ئەوە تاکتیکی تێکۆشانە...)).

((تێناگەم، ئێوە هەر لەبناغەوە ئەو ئەنجومەن و ئەوهات و باتە بۆرژووایانەتان لاقبوڵ نییە و لە ژێرەوەش بەدزی هاوڕێیانتانەوە دەڵێن کە ئەمانە هەمووی بنەمای کۆنەپەرستین. یانی ئا بەو راشکاوی و بەو ئاشکراییەوە درۆ دەگەڵ خەڵکیدا دەکەن؟ خۆ هەروا چەند رۆژێك لەمەوپێش بوو- رەنگە حوسێناغاش لێرەبووبێ- کە گوتت بنچینە و بناغەی کاری حیزبتان لەسەر راستی و دروستییە و لینین دەڵێ دیپلۆماتییەتی حوکمەتی زەحمەتکێشان حوکمەتی فێڵبازییە رۆژئاوای نییە- ئەی ئێستا ئەمە بە چ شێوەیەك ئاراستە دەکەن و بەڕێوەی دەبەن و ناوی چی لێدەنێن؟)).

کوڕە بەدەنگێکی پلاراویەوە گوتی: ((ئێوە هەتا دوێنێ تاکتیکی ((شەریف موکری))تان ئامۆژگاری دەفەرموو!)) بابە بەهەمان دەنگی پێشووەوە گوتی: ((من رای خۆم گوتووە؛ خۆڕای من رای حیزبەکەی ئێوە نییە)).

گوتم ئەگەر من لەجێی ئێوە بامایە- خۆ ئێستانیم، هیچ کاتێکیش کە نابم. ئێوە حیزبی خەڵکین، هەر ئێوەن کە رادەگەیەنن هیچ شتێکتان لە خەڵکی شاراوە نییە، و تیۆری و دیپلۆماتیکی راستەقینەتان هەیە... باشە ئەدی خۆ نەتانگوتووە، ئەو جیاکاری و جوداوازییە چۆن ئاراستە دەکەن؟.

((خۆ من حیزب نیم، من تەنیا لایەنگرێکم... ئەگەر ئێوە بەڕاستی دەتانەوێ بزانن فەرموون تەشریف ببەنە نێو حیزبەوە. ئەودەمی دڵنیا بن کە کەسانێك هەن ئەوانەتان هەموو بۆ روون دەکەنەوە)).

((بەڕاست! بچمە نێو حیزبەوە!... ئەوەشتان هەروەك رووبەڕووبوونەوەی ئایینزاکەیە، کە لەسەرەتادا دەگەڵی تێك ئاڵاُن، دوایی کە زانیتان خراپ پێوە بوون، کەوتنەوە بادانەوە و پانکردنەوێ:

((حیزبی تودەی ئێران لە دایکبوونی پیرۆزی ئیمامی عەسر عەجەلەڵلاهو فەرەجە لە تەواوی شیعەیانی دنیایە پیرۆز دەکات!)) بە (گاڵتەوە) ((دەبڵێ بزانم ئەو دروشمەت لەبەردەمی بارەگای ناوەندی حیزبتان، لە سەرەتای شەقامی فیردەوسیدا نەدیوە...)).

((جا بۆنا... دیومە)).

((باشە، ئەوە درۆیە یان نا؟ تۆ بۆ خۆت قبوڵتە؟... من دڵنیام کە قبوڵت نییە، یەکەم تۆ لە بنەماڵەیەکی ئایینزای سوننی هاتوویە دنیایە، و زۆری دیکەی وەکو تۆش هەروا. دووەمیان ئێوە بەقسەی خۆتان باوەڕتان بەداروین و ئەو جۆرە شتانە هەیە... کەواتە تۆش هەردرۆ دەکەی، ها؟

((...)).

((ئەودەمی ئەوەش بووە دیپلۆماتیکی راستەقینە؟ پیرۆزە... بەلای منەوە، هەق وابوو کە هەر ئەودەمەی گوتتان دەگەڵ ئەو سیاسەتەیدانین، هەرچەندە بێ زیان و خەتەریش نەبوو، هەر ئەودەمی بەدوای قسەی خۆتدا دەهاتی. بەلانی کەمەوە خێرێکی هەر هەبوو: خەڵکی هەستیان دەکرد کە خاوەنی قسەی خۆتی و باوەڕت بەقسەی خۆت هەیە. هەروەك سەید ئەحمەدی کیسرەوی. بابەش قسەی خۆی هەبوون- جا راست یا هەڵە. خاوەن رێڕەوێکە- قسەی خوار و خێچ و ئەو جۆرەشتانە نین. قسە قسەی خاوەن قسەی خۆبوونە. هەر لەسەر قسەکانی خۆی مایەوەو تا دوایە سەری لەسەر قسەکانی خۆی دانا. پێداگرتن و سووربوون لەسەر بیروڕا ئازایەتی دەوێ.



من دیارە لایەنگری کیسرەوی نیم، و هەقم بەسەر راستی و ناراستییە قسەکانییەوە نییە- من موسوڵمانم بەلاُم... راستییەکەی، ئێوەی لایەنگرانی دیپلۆماتیکی راستەقینە بۆ کێشەی ئازربایجانتان بۆ خەڵکی روون نەکردەوە- بەلانی کەمەوە هەر بۆ هاوڕێیان؟ ... دیارە ((هاوڕێیان))ی سەرەوە، هەرێ سەرێ، بەچاکیان نەزانیوە)). بەدەنگێکی لاقرتێوە، و بە ئاماژەی سەر، بەرەولای سەرێی باکوورەوە، ((هاوڕێیان، راست گوتنێ بەچاك نازانن!... راستیشە؛ راستی تاڵە، منیش هەر بەچاکی نازانم... بێین کتوپڕ خەڵکانی سادەی وەك ئێوە بەسەرتەوقی سەردابخەین، جاوەرە بزانە چ دەقەومێ؟ وازی لێدێنم، هەر بۆ خۆی لەخۆوە بیردەچێتەوە. یەك مریدی دڵسۆز، بە فەرموودەی شێخی خۆمان لەدێیەکی شەش دانگ گەلێك چاترە- دەتۆش هەردەم دە راستیەوە وەردە!...)).

دەونێوانەیدا قەرەواشەکە سینییە خواردنەوێیەکەی هێنا. من و کوڕی ئاغای سلێمانی هەردووك پێکەوە هەستاین؛ من سینییەکەم وەرگرت و لەپێشیم دانا. زەردێکی هاتێ. گوتی: ((سوپاس... حوسێناغا، دەزانی، پێش ئەوەی ئێوە بێن قسەمان لەسەر برادەرەکەتان- ببوورە هاوڕێکەتان- مستەفاخان بوو. بیستم ئێوەی بانگهێشتن کردووە... هەروەك کە دوێنێ خۆتان گوتتان؟...)).

گوتم: ((بەڵێ.)).

((خراپ نییە؛ هەربچن و بزانن ئەو ئاغایانەی کە دەبوایە بەسەر و ماڵ و حاڵ و ژیانی خۆی رابگا بۆ وازی لەماڵەکەی خۆی هێناوەو پەڕیوەی یەکیەتی شۆرەوی بووە. دیارە من دەزانم بۆ، چونکە کەس داوای بەرپرسییەتییەی لێناکا. هەرچۆنێکی بێ یەکیەتی شۆرەوی دوورە و هێندێکی چاك یا خراپ بەڕێوەی دەبەن؛ لە هیچی کەم نییە، تەنیا لەو دەهۆڵ کوتانەی وەك وی و ئیدیکە نەبێ)) (بە تیلەی چاوێکییەوە لە کوڕەکەی) ((بەلاُم ماڵ و حاڵ نزیکە، بەسەر راگەیشتنی هەست بەلێپرسینەوەکردنی گەرەکە، هەست بە لێپرسینەوەش دیارە ئۆباڵێك دروست دەکا، ئەنجامدان و هەڵگرتنی ئەو ئۆباڵەش هەروا بەلاف و گەزاف و خۆبادانێوە بەڕێوەناچێ- کاری دەوێ. بەداخەوەکاریش رەنجی دەوێ؛ جەنابی مستەفاخانیش ئەوە سەدجار دیارە کە خانە- سەرباری ماڵی رەش و رووت و رەنجدەرانە... بەڵێ، هەربچن و دیموکراتییە تازە بابەتەکەشی ببینن. بیستوومە پەیوەندییەکی نزیکی دەگەڵ رەش و رووتاندا پەیداکردووە،

ها! بەڵێ، پەیوەندییەکی برایانە- هەروەك پەیوەندی حیزبێکی برا بە حیزبێکی برا گەورەوە)) (و وشەی ((گەورە))ی چەند بەقەبەیی لە دەمی دەهاتە دەرێ! چاوی دەگەڵ دەرپەڕاندن و بەرغەبابەی دەگەڵ دادەچۆڕاند) ((دەچتە مالێیان، دەست دەژیانیانەوە وەردەدات، دەستووری خواردنێش دەدات: ((پورە حەلیمە لاقی دێشێ- دەڵێ شۆرباوی بۆ لێنێن، نەنە نازێ چاوی کزبووە- دەڵێ پیازاوی بۆ لێنێن؛ سۆفی حەسەن سێبەندەی دێشێ- دەڵێ نیوەنمەکی بۆ لێنێن؛ چێشتی ماشی چاك نییە، بای هەیە، فڕوجاو چاترە!)) گەلحۆ، وەك کابرا بۆخۆی نەزانێ فڕوجاو چاترە؛ فڕوجان دەفرۆشێ، تا گوسەگێکی بداتە تۆ کە بەگژ ژاندارماندا هاتوویی و دەردەسەریت بۆ پەیدا کردووە!... بەڵێ وەك دەبیسمەوە کار لە برایەتییە تێپەڕیوە، بۆتە پەیوەندییە باب و فرزەندایەتییە. دیارە نە هەر باب و فرزەندایەتیش- پێوەندییە بابی بە فرزەندی هەرێ چوکەڵەوە ئەوە برایم بۆخۆی دەزانێ- رەنگە ئێوەش دەو ماوەیەیدا هەستتان پێکردبێت و ئاگاداریش بن- کە من هەرگیز دەست دە ژیانی کەسی و تایبەتییە وی وەرنادەم، چونکە من باوەڕم وایە کە ئەو بۆ خۆی لەمن چاکتر دەزانێ چییە و لەمنی زیاتر هەست پێدەکا، ئەو هەموو هات و هاوارەشم هەر بۆ رێنماییەوییە. من هەقی ئەوەم نییە بێم و بەرنامەی کارێکی بدەمە دەستی و بلێم ئەم هەفتەیە لە تارانێ وابکە و هەفتێکی دی هەر لەوێ وامەکە- ئەوە دەبێتە جۆرە ساختە و باختەیەکی ئایینزایانە و چاوبەستەکێ: شەوی شەمووان فلانە شتی مەکە دەنا دەموچاوی منداڵەکەت واوای لێدێ؛ دووشەمووان واو وابکە، ئەگەر منداڵەکەت کوڕبێ ئەوە بەویقار دەبێ- ناگیانە ئەو قسانە سەر بە چ جێیانەوە نانێن (هەموو بە پێکەنینەوە- ئێمەش ناچار دەوپێکەنینەیەوە گلاین) ((بەڵام خۆ ئاغاش گوناهێکی نییە، هەروەك ئەوەی هاوڕێی حیزبیش هەر لەو باوەڕەدابێ... بەڵێ، نابێ گوێ بدەیتە ئەو هات و هاوارانە)) هاوڕێی حیزبی ئەوانەی سەبارەت بە پەیوەندییەکانی شۆڕشەوە گوتبوون و ئەوەتا ئێستاش ئاغای سلێمانی کەڵکیان لێوەردەگرێ. ((بەڵێ، نابێ گوێ بدەیەی، ئەوانە وەك هاواری ژان و بەرە ژانانن، بۆیەیە تا مرۆڤێکی تازە بابەت لە دایك ببێت و بێتە سەردنیایە! خۆ ئەگەر حیزب یا دەستەیەکی رابەری یا کەسێکی وەك جەنابی مستەفاخان بەزەییان بجووڵێ و گوێ بدەنە ئەو هات و هاوارانە ئیدی ئەوە شۆڕش خۆمان خۆش و دایك و منداڵەکە هەردووك پێکەوە لە بەین دەچن! ئەمانە هەموو دژەکرداری ئۆرگانیزمی لەش و جەستەن، و چاکتروایە چۆنن هەروابن! مامان بۆ هێندێیە کە نەیەڵێ پرۆسەی بوون و رووداوەکان لەرێچکەو



رێڕەوی سروشتی خۆیان لادەن!... بەڵێ، ئەوە ئێستاکێ جەنابی مستەفاخان بوونەتە ((مامان))ی خەڵکی گوندی- جاچۆن مامانێکو عەرزکەم، فاسقی خەمسەی تازە بابەت، چونکە شتی وا بەدایك و منداڵەکەوە دەڵێ هەر مەپرسە چەند لە رەوشتەوە دوورە ئمم!.

ئێستا هەر بۆ نموونە جەنابیان دەیانەوێ سۆفی رەسوی والێبکات چ بکات و چ نەکات، شتێکی تازە بابەت بێت و لەنانە جۆیەکەشی بکات- هەی ئافەرین بۆ ئەو مێشکە!)).

کوڕەکەی گوتی: ((بۆ بابە تۆ باوەڕت بەفێربوونێ نییە؟ فێربوونێ رەتدەکەیتەوەو وەلای دەنێی؟ جا ئەدی ئەگەر باوەڕت پێی نییە ئەو هەموو پارەو پوولەت بۆ لە فێربوونێ من داوە؟)).

((ببوورە، هەڵەبووم)).

((نا، هەر بەڕاستیمە)).

و بەو دەنگ و رەنگەوەی کە جەنابی بەڕێزتان دەفەرموون دەبێ دووبارە هەر عەرزتان کەمەوە کە هەڵەبووم، و داوای لێبوردن دەکەمەوە)).

کوڕەکەی پێکەنی.

((ئا هەه، ئەوە شتێکی لێ پەیدابوو. نا، من هەرگیز دژی فێربوونێ نیم، بەڵام دژی هەموو کارێکی نالەبار و کەرانەو زۆرە ملێم- ئاغا دەیەوێ سۆفی رەسووی لە نوێ داڕێژێتەوەو دروستی کاتەوە... لە کوێڕا دەست پێدەکاتەوە- لە یاسای جۆرج ئوهمەوە[1]- و ئەو قسانەم هەر لەخۆت دەبیستنەوە کە نایەڵێ ئەو بەدبەختە لە ماڵەکاو لە ئاشەکەیدا تاوێك لاقان راکێشێت و وەحەسێ.

((مرۆڤ هەمیشە و لەهەر تەمەنێکدا بێ ئامادەی فێربوونە. جەناب عالی دەفەرموون کە باوەڕتان بە ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلام هەیە و رێزی لێدەگرن، و کەچی هەموو شەوێش دەگەڵ ئارەق خواردنەوێدا، لەسەرجێی نووستنێ دەست دەکەی بە نزاو پاڕانەوێ. ئەرێ هیچ جارانت ئەو فەرموودەیە دێتەوە یاد کە دەفەرمووێ: ((هەر لەسەرپشتی لانکێوە هەوڵی

[1] جورج اوهم: فیزیکدانێکی بەناوبانگی ئاڵمانییە کە لە ساڵی ١٧٨٧ لە دایکبووە و لە ١٨٥٤دا مردووە کە خاوەنی ((یەکەی ئەندازەگیری بەرگری ئەلیکتریکییە))-وەرگێڕ-.

فێربوونێ بده تا دەمری؟)). ئەوە فەرموودەی پێغەمبەرە. ئەوە بێگانەکانیش شتێکی لەو بابەتەیان هەیە: دەڵێن هیچ کاتێك درەنگ نییە بۆ فێربوونێ. خۆ بەلای ئێوەوە ئەو فەرمایشات و واتایانە هەموویان لە ئەزموون و تاقیکردنەوەکانی مرۆڤایەتییەوە سەریان هەڵداوە... دەو نێوەشدا، وشیاری سیاسی بابەتێکی دیکەیە، و هیچ پەیوەندییەکی راستەوخۆی بە خوێندەوارییەوە نییە)).

((بەڵێ... فێربوون... وشیاری سیاسی! بەلاّم ئەوەشت لەبیرنەچێ- فێربوون، نەك فەرموودە و فەرمانەکانی لەخۆڕای جەنابی مستەفاخان. جەناب عالی کە دۆستیانن لێی بپرسن)) (رووی دەمی لە من کرد) ((بە چ هەقێك- یا بە چ زانستێك- یا بە چ ڕێیەك؟ سەیرە ئاغا!)) (بەدەموچاوێکی سورهەڵگەڕاوەوە) ((پیاو کە بۆ خۆی دە تەواوی تەمەنیدا دەستی بۆکلکە بێلێکی نەبردبێ چۆن دێ یاسا و ڕێسای بێڵکارییە فێری خەڵکی دەکا! قسەی قۆڕ!... هەرچی دەشیلێ هەمووی هەر درۆیە. بۆ گوایە بەڕاستی دەیەوێ هاو کوفی رەش و رووتان بێت؟ کە ئەوە هەرنەبووە و ناشبێ.

ئەو رەش و رووتان وەبەر شاپان دەدات و کەرترێنیان دەکا بەلێدانێ؛ لە دارێیان دەبەستێ، دە تەویلەی ولاّغانیان دەکا! لێت تێك نەچێ، کە لە ژاندارمان دەدات و لەسەرئەوەیان دەگەڵ بەشەڕ دێت کە سواری ژن و کچەکانیان بوون، دەنا لەڕووی دڵسۆزی و ئازادیخوازییەیەوە نییە. لەڕووی پیناخۆشیەشییەوە هەر نییە. بەڵکە وا هەست دەکا کە هەقی وییان خواردووە و مافی ئەویان پێشێل کردووە، چونکە دەبێ هەر بۆ خۆی لەرەش و رووتان بدا! کاتێك ژاندارمێك لە یەکێك بدات ئەوە بێگومان مافی وی پێشێل کراوە! خۆ ئەگەر بچووکترین گومانێکتان لە قسەکانی مندا هەیە کە دەیانکەم شەوێکی یەك دوو پەرداخانی ئارەق دەنێ ئەوجا دەزانن پاشەملەی ئەو رەش و رووتانەی کە دەیهەوێ وەك وان بێت و بەرگری لە ((مافەکانیان)) دەکات ئەودەمی دەزانن چ تەنتەنە و بەن بەنەیەکیان بەکلکێوە دێخی و چیان پێدەڵێ: ژنە پاپەتییەکانیانی هەموو لە پشتەوەڕا دەکار هێناون- و هەمووشی درۆ. درۆ دەکا وەك سەی!... ئازادی!... تۆ تەنانەت کە دەچیە ماڵەکەشی لەوە ئازاد نیت لەسەر سفرەی حەزت لە چییە دەستی بۆ بەری و بیخۆی. من ئەوەم زۆرجار بە رووداداوەتەوەو تینیشم بۆ هێناوە- بەلاّم بۆ تێدەگات؛ ئەوە دەست دەبەی باڵە مریشکێکی تاودەیەی، هەروەك هەڵەیەکی زۆر گەورەت



کردبێ ئاڵۆز دەبێت و دەستت وەبەر دەستی دەنێت و بەو بەرغەبابە و ئەو دەنگە ناخۆش و ئەوچاوەسامناکانەیەوە)) (چاوی دەرپەڕاندن و بەرغەبابەی پفدا) ((دەفەرمووێ: ((نا، نا! سینگ خۆشترە، سینگ خۆشترە!)) هەروەك گونیان راکێشابێ- ئەنتەر!... کابرای داوەت کردووە... حوسێناغا ئەوەی نەبیستووە... من و رەییسی دارایی و ژنەکەی بانگهێشت کردبوو. بێنەوایانە هەر نەیانزانی چۆن هاتن و چۆن چوونەوە- رێیە کە دوورە... گوناهی من بوو. خانم بە زمانی سوتووەوە، ئەوەندەی گوت کە: ((چ سروشتێکی جوانە، ئەفسووس!)) جەنابی خان ئەوەی بە سوکایەتییە خۆی تێگەیی و ئەو دوو رۆژەی تا خانم لەوێ میوان بوو لێوی لە لێوی نەبزووت و نەیدواند. هەر لەبەر ئەوەی گوتبووی ئەفسووس، یانی بە بۆچوونی وی وایە کە ئەفسووس ئەو گوند و ئەو سروشتە بەدەست کەسانێکی وەك ئێوە تەمبەڵ و تەوەزەل و بێکارەوەیە!... وای لەو بوختانە گەورەیە! دیارە دواییش بەخشکەییەوە چۆوە لایان و یەك هیزە رۆنیشی دەگەڵەخۆیدا بۆ بردن و بەملکەچیەوە داوای لێبوردنیشی لە خانم و ئاغای رەییسیش کرد. ئەو لەو جۆرە کەسانەیە کە لەلای خەڵکی سوکایەتییە بەم و بەو دەکات و بەدزیشەوە، ملکەچانە، دەست و پێیان ماچ دەکات، بەڵێ دەمگوت... بەو دەستە چەپەلاّنەیەوە ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشبایە ئەوە بۆ میوانێی دەقاپی دەکرد. ئێستا ئاغا بۆتە سۆشیالیست! تەڕیش نەبۆتێ... دەیەوێ بەپشتیوانیە خودای و هاوکاریە هاوڕێیان، ببێتێ، تا ئەگەر بارودۆخەکە گۆڕا و ئاشی شۆڕش ئاوی وەسەرگەڕا، ئەوە بەدەردی شێخ دەڵێ، چاکە و پیاوەتییەکە بۆ وی وەمێنێ. ئیدی ئەوە ئەوکاتە دیارە: ((کە جەنابی مستەفاخان لەپێش هەموانیدا دەست لەملی داوە، لەبەرئەمە ئەوان دەکەینە خانی سۆشیالیزم!)) وەك بلێی هێشتا هەر لەسەردەمی خولەفایا جەنگیزخاندا بین- سوبحانەڵلاّ!)).

گوتم: ((ئاغا، یانی ئێوە لەو باوەڕدان کە رەش و رووتەکانی ناناسێ؟)).

زەردێکی هاتێ و گوتی: ((بەڵێ رۆڵە، هەرواشە- چاکی تێگەیشتوی. هەرگیز کەس ناناسێ، خۆشی ناناسێ تا دەگاتە رەش و رووتان)).

((بەلاّم ئاغا... دەگەڵیاندا ژیاوە...)).

((نا، نەژیاوە- پێی وایە ژیاوە، لەکاتێکدا کە هەم خوێندەوارە و هەم خوو و رەوشتێکی نەرمی هەیە، و هەم دەگەڵ رەش و رووتان تێکەڵ و پێکەڵ بووە. سەرەڕای ئەوەش، من خۆم لە

زۆربۆناندا دەگەڵ رەش و رووتاندا شتێکی وام نەکردووە خراپێکم لێوە فێربووبێ. مـن هـەروەك چۆن کە دەگەڵ وەدا دەدوێـم، کـە دەزانم لوتفیێکتـان دەگەڵەمـەدا هەیـە و جاروبـارە سـەرتان دەکەمە سەرێ، دەگەڵەوانیشدا هەروا رەفتار دەکەم. من هەرچی هەم، دەماڵـە خۆمـدا هـەم. تەنانەت ئەو دەمەی کە دەنێو گوندیشدا دەژیام و جحێڵیش بووم هیچ کاتێ چاوم نەبڕیوەتـە ژن و کچ و منداڵیان؛ تەنانەت ناوی ژن و کچەکانیشیانم هەر نەدەزانی- و ئەمـەش شـتێکی کـەم نییە- بەڵێ، هەربۆیەیە کە هەمان ئا ئەم دۆستەی ئێوەش کەس ناناسێ دەگوندیدا.

ئەگەر بیناسیبان ئەو قسانەی نەدەکردن، و بەو خەتەیدا نەدەچوو... لە خراپیە ئەو خەتەیە کـە کەوتیشن.

هۆیەکەشی ئەوەیە کە بەداخەوە هەموو شتێکی دەزانن. و وای بۆ ئەوکاتەی حوکمەت بکەوێتە دەستی ئەوانەی هەموو شتێکی دەزانن. چونکە ئەوانەی ئێستا کە کاربەدەستن دەگـەڵ هـەموو ئەو توانا هەواڵگریانەیان هێشتا زۆر شت هەیە کە نایزانن- بۆ خۆشـیان ددانـی پێـدا دەنـێن: دەزانن کە ناخی ناوەوەی خەڵکی نازانن، و ژیان بە ئەندازەیەکی بەرچاو ئاڵۆزو بـەگرێ و گـۆڵ بووە. هەربۆیەشە خەڵکی کەمتر دەکوژن. بەڵام ئێوە کە ئاگاتان لە هەموو هێماو نهێنییەکانی سروشت و بوونی مرۆڤ هەیە ئیدی رەحم بەکەس ناکەن و شەلم کـوێرم ناپـارێزم- ئێـوە خـاوەنی ئایدیۆلۆژیان. بەڵێ- بالەوەی لادەیـن. ئـەو دۆسـتەی ئێـوەش رەش و رووتـان ناناسـێ. ئێـوە هەمیشە هەر باسی رەنجدەر و زەحمەتکێشان دەکەن- ببورە حوسێناغا، کە دەڵێم ئێوە مەبەستم خودی ئێوە نییە مەبەستم شتێکی دیکەیە، چونکە دەزانم کـە ئێـوە خۆتـان لـە بنەماڵەیـەکی رەنجدەر و زەحمەتکێشن- مەبەسـتم ئاغایانـە- هەمیـشە لـە بـارەی خـەڵکی زەحمەتکێـشەوە دەدوێن بەڵام بەکردەوە یەکێکیان نابینن یا ئەگەر بشیانبینن نایانناسن؛ خۆ ئەگەر بـشیانناسن ئەو ناسینە راستەقینە نییە. ئەوە شتێکە کە هەر بۆ خۆتان دەمێشکی خۆتاندا و بـە پێـوەر و محەکی خۆتانتان سازداوە. خۆ ئەگەر بە مەزەندەش بتانەوێ بیانبینن و بیانناسن هیچتان نییـە پێیان بڵێن، چونکە زەمینە و حەز و ئارەزوو و مەبەستەکانتان تێك ناکەنەوە تا ئەگەر ویستتان شتێکی لە بارەوە بڵێن، و کاتێ کـە رووبـەڕوویان دەبنـەوە زمانتـان لاڵ دەبـێ و هیـچتان بـۆ ناگوترێ. ئەوشتانەی ئێوە دەیـانڵێن بـەلای وانـەوە لـە توڕڕەهاتـان بـەولاوەتر چـیدیکە نـین. قسەکانی وانیش بەلای ئێوەوە هەروەتر. ئەوەش دەو تەمەنیدا؛ دوایەش لاوێکی وەك کوڕەکەی



من برادەرتان، دوای خوێندن تەواوکردنێ بەخێر و سەلامەت دەچـتە سـەربازییە: ئـەو دەبێتـە ئەفسەر و ئەوانیش دەبنە سەربازە رووتە- سەرلەنوێ هـەمان تـاس و هـەمان حـەمام یـا وەك مستەفاخانی دەبێتە ((سەربازی مومتاز))، چونکە دەتوانێ بـەرتیلی بـدات و و ئاسـوودە لـە ماڵێ خۆی راکشێ و رۆژانە لە مەشق و شەوانە لە ئێشکگریە ببەخشرێ. یانی لـە راسـتییەدا سەربازێکی رووتە، بـەڵام چ جیاوازییەکیـشی دەگـەڵ ئەفـسەراندا نییـە- یـانی براگەورەیـە، تەنانەت بابە. بەڵام قسەی خۆمان بێ چ لە برا گەورایەتی و چ لە بابایەتیە دەزانـێ؟ تابێـت و گیروگرفتی ئەمانە سەرو بەروحەل کات- ئەویش ئی سەرباز و جووتیاران. هەر بۆ نموونە بـەلای وییەوە- جەنابی مستەفاخان- ئـەوین و دڵـداری شـتێکی سروشـتییە. ئیـدی نـازانێ کاتێـك کەشتێك سروشتی بێت دەبێ جێ و رێ و زەمینەشی هەر سروشـتی بـێ. بـەڵێ... ((ئەوەنـدە بەلای منەوە بەسە...)).

هەر بەو بەرغەبابە و دەنگە هەڵەشەیەوە ((دووکەس پێکەوە پەیوەنـدیان هـەبێ، دڵداریـە کـە شتێکی سروشتییە، کچ و کوڕێکی کە یەکتریان خۆشدەوێ بە تەنیا هەر بە مـارەبڕینێ هـەموو شتێکی وەدەست ناهێنن، رەنگە ئەگەر ئەو مارەبڕیەش نەبێ هیچیان لەکیس نەچـێ و بەڵکـە شتگەلێکیشیان چنگ کەوێت، بەڵام ئەمە رێ و رەسمە، دەبێ ئەوچـەند وشـە عارەبیانـە هـەر ببیسترێن، لەوەش بەولاوە هەرچی بگوترێ هیچە! ((... زۆر زۆر پیرۆزە. ئێستا چونکە بۆ خۆی قەرەواشەکەی خۆی هەڵناوە پێی وایە کە خوشکەکەشی دەتوانێ مێرد بـە نۆکەرەکـەی خۆیـان بکات. ئیدی ئاگای لەوەی نییە کە لە کۆمەڵگای ئێمەدا ژن، پیـاو نییـە. ژنیـان ژن گوتـووەو پیاویش پیاو، و ئەوجا تەنگوچەڵەمەی خێزانی- و بنەماڵەکان و دەنا خۆ بەنـدەش دیتوومـە و بیستووشمە کە کچ و کوڕ یەکتریان خۆشویستووە بێ مارەیی و بێ خواستن کارەکەیان بەجێیـەك گەیوە سەری سپی و پرچی سپییان بۆ هۆندۆتەوەو هەموو تەمەنی خۆیـان لەسـەرداناوەو چـیان پێنەکراوە. هەر بەهەمان بەڵگەشە کەمەلایەکانی خۆمان دەڵێن دەبێ کەو و سوێسکە و قەل و مەل و هەرچی ئافەریدەی خودایە، تەنانـەت دار و بـەرد و کێـو و چـۆڵ و بیابـانیش مـارەبڕی بکرێن، چونکە ئەمانە هەموو ئافەریدەی خودان و رۆژی قیامەتێ گەواهی دەدەن، و لەبەر ئەوە دوولاوی نێر و مێ دەتوانن بەبێ مەلاش خۆیان دە قەبەڵ یەك کەن. ئاخوندی شیعانیش دەڵـێن کە هەردوولایان دەتوانن هەر بۆ خۆیان مارەییە ببڕن. ئاخوند بـۆ خـۆی دەزانـێ چ دەکـا: ئـەم لێبوردەییە تەنیا بۆ پارێزگاریە کۆمەڵگایـە، دەزانـێ ئەگـەر ئـەوە نـەبێ شـیرازەی کۆمـەڵگا

لەبەریەك دەچێ و لێك دەترازێ؛ ئەوەش دەزانێ کە کاتێك تەلاق لەق دەبن و مەسڵەت دەکرێتەوە ئەوە گرێبەندییەکە نوێ دەبێتەوە. بەڵام ئاغا ئەوەی ناچتە گوێی. ئێستا گوایە بەڕاستییەتی دەیەوێ خوشکەکەی خۆی بداتە کوڕە نۆکەرەکەی. جا باشە من بەڵێنتان دەدەمێ هەرکاتێکی خوشکەکەی شتێکی وای هەر بەمێشکیدا هات بزانن چۆن لات و لوتی هەرچی بنەماڵەیە کۆدەکاتەوەو نایەڵێ پێ دەبەرپێی نێ لەناوی دەبا. بەڵێ، هەر ئەو لات و لوتانەی، کە وەختێکی مستەفاخان کەوتە زیندانێ دووجارانیان نامەنووسی و تێیدا پارانەوە: جارێکیان لەژێرەوە نووسیان، کە ئەی دەوڵەت، دەستمان بەدامێنت، نەکەی نەکەی بەرهەڵدایکەی؛ ئەوە پیاوخۆرە، ترسناکە، و ئیدی لەو بابەتانە؛ جارێکیش راستەو راست و بە ئاشکرا نووسییان، کە بەڵێ، ئامۆزایە، بەڕێزە، شاخی وا، و کلك و گوێ و باڵی وا؛ بوونی وی دە ناوچەکەدا زۆر پێویستە، ئەگەر ئەو نەبێ پەشێوی پەیدا دەبێ. و هەردەو دەمەشدا دەیانەویست دەنێو ماڵەخۆیدا ئابڕووی بەرن... لا ئیلاهە ئیللالڵلا! دەزانن چاکەی رەش و رووتان بۆ جەنابی مستەفاخانی ئەوەیە کە ئەو رەش و رووتانە وەك کتێبان یەك و دووان دەگەڵ ئاغایدا ناکەن، هەرچەندە بەپێچەوانەی کتێبانەوە لەدڵدا بەڕیشی ئاغاش پێبکەنن و ئەژداد و ئابادیشی لە گۆڕێ دەرێنن.

((... یا ئەڵلا، سۆفی رەسوو!)).

دەو دەمەیدا دەرگا لەسەر پشتێ بوو. پشتم لە دەرکێ بوو. ئاوڕم دایەوە... ئاغای سلێمانی بەرەو رووی دەرکێ دانیشتبوو.

((... بەخێربێی- بەڕاستی حەلاڵزادەی... خەریك بووین دەگەڵ برایمی باسی تۆمان دەکرد...)).

برایم سور هەڵگەڕا. ئاغای سلێمانی چاوێکی لێداگرتم. گوتی: ((گوتمان رۆژێکی هەروا سەعاتێکی بچینەسەر ئەو حەوزو کانی و ئاوەی نیوە رۆژێکیش بەمل سۆفی رەسوویدا بێنین)). و پێکەنی.

سۆفی رەسوو زۆر بەتاسوقەوە گوتی: ((قوربان سەر و ماڵت دەرێدایە! جا ئەوە کەی ئینشاڵلا؟)).



((ئینشاڵلا پێش گەڕانەوێی بۆ تارانێ رۆژێکی هەر بەملدا دێین... دانیشە، دانیشە... هێروە، هێروەتر... برایم، بڵێ چای بێنن)).

سۆفی رەسوو دانیشت لە خۆشیان گێژ و وێژ ببوو. ئەوە هەمان ئەو سۆفی رەسووە بوو کە دەقساندا هەمیشە لەسەر زمانان بوو: بالابەرز، سینگ پان و توکن، دەموچاو پانکەڵە و رەقەڵە و ریش درێژو پڕ، بەڵام رێك و پێك، نە زۆر کورت و نەهێندەش درێژ، سپی وەك لۆکەی؛ ددان زەرد و گەورە؛ پاژنە پێ قەڵشیو، نێوچەوان گنجاوی، چاوڕەش و قوڵ و لێك دوور و مەیلە و گەورە، رانك و چۆغەیەکی مەیلەو کۆن لەبەر، قۆڵ و باڵ لێك بلاو، شوتییان بەنێوانێوە دەچوو.

((خودا تەمەن درێژ و سەرفیرازتان کا ئاغا. خودا سایەی وەو ئاغازادەمان لەسەری کەم نەکا!)).

((باشە، چ باشە؟)) و پەرداغێکی ئارەق تێکردەوە، و یەکسەر هەڵیدا. رەش و رووت زۆریان گوێ نەدەدایە ئارەق خواردنەوێ ئاغای. بەداخێکی ئاشکراوە دەستیان لە دیدەنییە ئاغای شوشتبوو دەبەهەشتێدا. ((دوعای سەرت قوربان)). و دوای کەمێك ((هاتبووم مۆڵەتێ ژن گواستنەوێ حەسەنی نۆکەرتان وەرگرم!)) ئاغای سلێمانی وەك هەواڵێکی یەکجار خۆشی بیستبێ بەڕوویەکی خۆشەوە گوتی: ((بەه بەه، پیرۆزە ئینشاڵلا، بەخۆشی!)) و دوای ساتەوەختێك ((بەخۆشی، جا کەنگێ؟)).

((خودا تەمەن درێژ و سەرفیرازتان کا، ئاغا. هەرکاتێ کە ئاغا بفەرموون. شەکراوێ ئاغازادە، ئاغا برایم خانیشم هێناوە)). و دەستی دەبەرکێ راکرد.

ئاغا گوتی: ((زۆر سوپاس- پێویستی بەو زەحمەتەی نەبوو...)) سۆفی رەسوو هەستابوو. ((بیدە بەخۆی، چەند رۆژێکی دیکە دەگەڕێتەوە تارانێ، بابیبات بۆ خۆی خەرج کات)).

سۆفی رەسوو گوتی: ((بەخۆشی ئینشاڵلا و بەرەو لای ئاغازادەوە چوو کە پارەکەی پێشکەش کات. ئاغازادە هەر لەدوورەوە بەدەست هەڵتەکاندنێوە، پارەکەی رەتکردەوەو گوتی: ((من شیرنیە وەرناگرم؛ بیبەوە بۆ ژن و منداڵەکانتی خەرج کە)).

سۆفی رەسوو هەروا لەجێی خۆیەوە وەك کارەبای لێدابێ، سست بوو؛ رەنگی گۆڕا.

ئاغا گوتی: ((دانیشه سۆفی- دانیشه!)).

سۆفی ڕەسوو شێواو و پەشۆکاو دانیشتەوە؛ وەك لالێوەکانی هەر بەودەمەی کەفیان دەردابێ؛ هەنیە و لاملی ئارەقەیان دەردا. بێ ئەوەی سەیری ئاغازادەی کا هەروا کە لەسەرچۆکان دانیشتبوو و هەردوو لەپەدەستی وەك دەمی نوێژکردنێ هاویشتبوونە سەر ئەژنۆی رووی دەمی دە ئاغای کرد و بە هەناسە بڕکێوە گوتی: ((قوربان، جا هەر بەیەکجاری بفەرموون و بڵێین بە یەکجاریمان دەست لەنۆکەری و خزمەتکاریە ئێوە هەڵگرتووەو ئەها! واچاتر بوو هەر بۆ خۆتان ئەوەتان فەرموبایە، نەك ئاغا زادە برایم خانتان راسپاردبایە... بەلاّم ئاغا، من کە ئەژداد و ئابادم لەبەر پێی بنەماڵەی ئێوە بڕاوەتەوە و خۆم و کوڕەکەشم هەر لە دەرگای خۆتان پێگەیشتووین شایانی ئەو بێ مەرحەمەتییەی نەبووین...)).

ئاغا سەرنجێکی گاڵتە ئامێزی دەمن و ئاغازادەوە گرت، وەك بڵێ: ((مەردی حیسابی، بۆ خۆی کەری هێناوە، تۆ بۆ هێندەگێلی سوار نابی!)) ئینجا رووی دە سۆفی ڕەسووی کردەوە و گوتی: ((خۆ من چی وام نەگوتووە- ئەستەغفیروڵلاّ! برایمیش قسێکی نەکردووە- مەبەستی خراپیشی نەبووە... ئاگات لێیە، ماوەیەکە ئاگای لە دێ و کاروبار و گوزەرانی نێو دێی هەرنییە؛ نازانێ کە لەسایەی خوداوە گوزەرانی ژیانت چاکە و ماشەڵڵاّ منداڵەکان گەورە بوون و گۆچانی دەستتن)).

((خوداوەند تەمەن درێژ و سەرفیرازتان کات! لە سایەی سەری ئێوەوە ماڵ و منداڵم نەدارنین- هەموو شتێکیان هەیە!)) بە جەختەوە، و بەگنجی نێوچەوانێ و تیژیە چاوەکانییەوە هەمدیس ((لەسایەی سەری ئێوەوە نانی زستانێشیان هەیە، لە لوتفی ئێوەوە بێ جلوبەرگیش نین، و تەنیا ئارەزوویان ئەوەیە کە ئاغا هەروەك جاران گەورەییە بفەرموون و یەکێکی بنێرن پشتی بووکێ ببەستێ[۲]... بەلاّم بەو قسەی کە ئاغا برایم خان فەرموویان ئاویان دەدەستی کردین- وەك ئەوەی کە ئیدی ئاغا بە نۆکەریە مە قایل نین! ئەوەی زۆر بەدڵشکاوییەوە گوت.

سەیر بوو، بەڕاستی ناراحەت بوو. ئاغا زادەش لە حەژمەتان سوورببۆوە و ئارەقەی دەردابوو. ئاغا لە ترسێ وەی کە ئاغازادە شتێکی ناقۆلاّی لەزاری دەرپەڕێ بێ رامان گوتی: ((نا،

[۲] پێش بووك گواستنەوێ بۆ ماڵی زاوای گەورەیەکی ماڵێ دەچێت و کەمەری بووکێ دەبەستێ.



ناراحەت مەبە، گاڵتەی دەکا... ئاخر ماوەیە کە لێرەنییە... ئیدی ئەو تازە لەمە شۆراوە... ئەوە هەر ئەمن و تۆین زیخی بن جۆیەین و دەمێنینەوە... ئەو ئێستا قسەی خۆمان بێ بۆتە عەجەم؛ لەڕێ و ڕەسمان دووركەوتۆتەوە... گوناهیشی نییە... دوورە، ئاگای لە رووداوان نییە... بەهەرحاڵ زۆر پیرۆزە، لەوانەشە هەر بۆ خۆم بێم و پشتی بوکێ ببەستم- هەوڵدەدەم بۆ خۆم بێم... کوڕی تۆ دەگەڵ کوڕەکەی خۆمدا جودا ناکەمەوە- پیرۆزە ئینشاڵڵاّ!)).

هەر ئاغا ئەوەی گوت سۆفی ڕەسوو لە خۆشیان وەك بۆ شەڕەقۆچێ ئاغای بچێ لەجێی خۆیەوە راپەڕی و بەسەر بەرەو لای ئاغایەوە چووە؛ لەپێشە وی چۆك دادان و دەستی ماچکرد. ئاغاش بۆ پارسەنگێ لاجانگی وی ماچکردەوە. سەروچاوی یەکپارچە لە سووریاندا ببووە خوێن؛ بەبیستنێ ئەو هەواڵەی وای لێهاتبوو جێی بەخۆی نەدەگرت. گێژانە گوتی: ((هەر بە مۆڵەتیە ئاغای ئەو لالێکردنەوەیە دەکەمە مژدانەی ماڵێ!)) هەروا بەو شێوەیە وەك بۆ سەردانێ زاتێکی پیرۆز چووبێ لەبەردەمی ئاغایەوە قیت بۆوە و ئەو پارەیەی دە دەستەسڕە چڵکنەکەیەوە پێچابوو لەبەردەمی ئاغای دانا.

ئاغا گوتی: ((ماڵیاوا!))[۳].

سۆفی ڕەسوو هەستایەوەو پاشەو پاش چۆوە جێیەکەی خۆی، و هەروا راوەستا. ئاغا گوتی: ((دانیشە، سۆفی)). و سۆفی دانیشتەوە. ئاغا بەدەم لێوە خنکێوە کەوتە دارسیغار پاك کردنەوێ. هەمیشەیەك دوو پەڕەمووچی مریشکێیان بۆ لە ناو ژێر پیاڵێکی لەسەر سینییە دادەنا تا ئەگەر ویستی مۆدنەکەی پاك کاتەوە. رەنگە ئەوە هەر رێ خۆشکەرییەك بووبێ بۆ ئەو شتەی کە دە دڵیدایە دە دەرفەتێکیدا بیڵێ. چاوم لێبوو هەرکاتێ دەستی درێژ دەکرد مۆدنە و پەڕە مووچەکەی تاوداتێ و سەرقاڵ دەبوو کوڕەکەی زەردێکی دەهاتێ و بێ ئیختیار رەنگە هەربێ ئەنجامیش، دەیپرسی: ((بابە، عەبدوڵلاّ بەگ کەی لە گوندی دەگەڕێتەوە؟)) یان ((بابە، ئەرێ بەڕاستی هەرایەکەی حوسێن خان و ئەحمەدخانی بەکوێ گەیی؟)) یان ((ئێستا زەوییە پەنا دار هەڵوچکان بەدەست کێوەیە؟)) بەلاّم بابە لەو سەرێڕا هاتبۆوە دەبزانی دەیەوێ بابەتی قسەکان بگۆڕێ. هەروا بەدەم مۆدنە پاك کردنێوە چەند جارێکیان وردە سەرنجی گاڵتە ئامێزی هاویشتینێ، هەروەك یاری سێرك کەورچێکی دێنن و بۆ ئەنجامدانی هێندێك کردەوەی

[۳] ماڵیاوا: ماڵت ئاوا بێ، ماڵ ئاوەدان بێ.

سەرسوڕهێنەر وای لێدەکەن ئەوەی دەیانەوێ ئەنجامی دەن زۆر لەوەشی چاتر ئـەنجام بـدەن کـە چاوەڕێین. نا، بەویژدانەوە لەوەی باشتر نابێ! دیاربوو کە تەواوی هەوڵ و کۆشـشی وی هـەر بـۆ هێندێیە کە بە هەر نرخێك بووە ئاغا زادە، و تەنانەت منیش لەکەری شەیتان بێنێتە خوارێ و وەبەرچاو خستنی هەڵەکانمان وامان لێبکات بمانهێنێتەوە گـەڵ گـەلێ. دیـارە ئاغـازادەش وەك هەموو ئاغازادەیەك گوێی دەگرت بەڵام کاری پێنەدەکرد.

ئاغا گوتی: ((راستییەکەی، سۆفی، جارێکی دیکەشم پرسی، ئێستا چەند گوێدرێژت هەن؟)).

((وەڵڵا قوربان- بێ ئەدەبی نەبێ- دوو... بۆ ئاغا، خۆ چیان نەگوتووە؟ لەوەی دەترسا کە نەکا دەوڵەت ولاغان بنووسێ و ((کەرانە))ی وەرگـرێ. رووداوی کـڵاو پەهلـەوی هـەر لـەبیرمابوو: رۆژێکی هەر کە لە خەوێ رابوو دیتی ئەوە دارۆغە مێزەران خڕ دەکەنەوە —بۆ خۆیـان- ئـەوجا دەستیان کرد بەکڵاوی مقەببا فرۆشتنێ، ئەویشیان هەر بۆ خۆ- دوایەش پێنج تمەن و دوو ریـاڵ باج و سەرانە. ئەودەمی هەموو کـەس بـە خەیاڵیـدا دەهـات قیڕوسـیا لـەخێر و بیـری کـڵاو پەهلەوی بکات و بەسەری قۆتیەوە بـە کـۆڵان و بازاڕانـدا بگـەڕێ- بـەڵام سـەرانە و باجیـان لەسەری قۆتیش دە ئەستاند. بۆیەشیان لەسەری قۆتی دەستاند دەیانگوت گەڕان بەناو کـۆڵان و بازاڕاندا نیشانەی جۆرە شێتییەکیە و هەر سەرێکی رووت پێنج تمەن و دووریاڵی سەرانەیە، تـا ئەودەمەی ساغ دەبێتەوە کە سەرقۆتەکە شێت نییە ئەوە دەبووایە ئەو پێنج تمـەن و دوو ریاڵـە بدرێت! ئیدی لەو جۆرە قسە و بابەتانە! باشە ئەوە پێنج تمەنە کە قەیناکە ئەدی ئەو دوو ریاڵـە چییە؟ جندووکەش ئەقڵی بەکاری ((دەوڵەت))ێ ناشکێ- دیارە شتێکی هەرتێدایە...

((نا، هیچ لە گۆڕێدا نییە. برایم دەڵـێ هـەروا کـە تـازە کـەریان لـە ئەمـەریکا و رووسـیاڕا هێناون، پێیان دەڵێن کاپیتالیزم و سۆشیالیزم)).

سۆفی رەسوو بەدەنگێکی سەرسوڕهێنەرانەوە گـوتی: ((سـوبحانەڵڵا!))یـانی وەك بڵـێ، بـۆ بـۆ خۆمان کەممان هەن! برایم پێکەنی، بەڵام هیچی نەگوت. سۆفی رەسوو وەك دوو دڵ بـێ. ئاغـا سەری لەبەرەخۆی نابوو و خەریکی مۆدنەکەی بوو. سۆفی رەسوو گـوتی: ((ئاغـا بـێ ئـەدەبی نەبێ، فەرمووتان ((شتێکتان فەرموو... ناوەکەیم لەبیرچۆوە...)).



ئاغا زۆر بەکاوە خۆییەوە گوتی: ((کاپیتالیزم. هەرکایەکەی خۆمانە و دەتەلیسیدا. ئەوان کای دەتەلیسیدا دەخۆن... ئەگەر بێت و دەئاخوڕ و دەتورەکەیدا بخۆن ژانە زگیـان دەگـاتێ... هـەر قسەکەی لای خۆمانە و ئەمەریکییەکان وایان لێکردووە... چونکە ئەوان زمـانی مـە نـازانن، شتێکیان وەبەرگوێی کەوتووە بۆ خۆیان ناویـان لێنـاوە. ئـەوەی دیـش سۆشـیالیزمە. ئـەویش هەرقسەی خۆمانەیە: چۆش یالیز! چۆشەکەی ئەوە دەزانی؟)).

((بەڵێ قوربان، بێ ئەدەبی نەبێ)).

((ئەوانە کاتی بێ ئیشیە دەبێ بەردەوام خوێی بە لیسی بکوتن... لەو خوێیە رەقە سـەلکانە- خۆ خوێی سەلکت دیوە، ئەوەی کە لە عەجەمستانێوەیڕا دێنن؟)).

((بەڵێ، قوربان، بۆ خۆشمان لەسەر بێستانێمان هەیە، بێ ئەدەبی نەبێ بە ئارۆێیانی دادەکـەین بۆ خواردنێ)). ((گوێدرێژی چاکن؛ کاپیتالیستەکان سـپین، ئەوانیـدیش سـوورن، وەك خـوێنی لوتی، هەروەك دەخەنەت گرتبن)).

ئەوانەی زۆر بەڕاشکاوییەوە دەگوتن. ئێمە سەرمان لێ تێکچوبوو. مـن هێنـدەی نـەمابوو لـە پێکەنینان بتەقم. بۆ خۆ رزگارکردنێ بەرزەپێ راست بوومەوەو بـێ مۆڵـەت و پێـشەکی پیاڵـە بەتاڵەکانی پێش ئاغا و ئەوانی نزم هەموو تاودانێ و چوومە دالانێ.

ئاغا گوتی: ((حوسێناغا ئەوە تۆ بۆ زەحمەتێ دەکێشی؟ فەرموون، فەرموون، واچـاترە ئێـوەش گوێتان لێبێ- ئەمن زۆرم پێ خۆشبوو)).

سۆفی رەسوو بەروخسارێکی راشکاوانەوە و زۆریش بەنیگەرانییەوە گوتی: ((ئاغا، جـا ئێـستا ئەوانەیان هێناون بیاندەنە رەش و رووت و کرمانجان؟. ئەوە ئەگەر بەسەردابڕین بێ مانای وایـە بتەوێ و نەتەوێ دەوڵەت هەر دەتوانێ و پارەکەشی بەهەرچۆنێك بـێ بـە چـەند قـات زیـادەوە حیساب دەکات، ئەوە جگە لەوەش هەرکاتێك کە داوای کردنەوە وەکـو خۆیـان سـاغ و سـەلیم چۆنی داونێ دەبێ وەك خۆی ئاوا بێ کەم و زیاد بیاندەنەوە.

ئاغا هەروا بەراشکاویەوە گوتی: ((نا، بۆ فرۆشتنێیان هێنـاون؛ دەوڵـەت هـەقی پێـوە نـین... بەسواری فرۆکانیان هێناون)).

سەرنجی سۆفی رەسووی بێ ئیختیارانە دەبن میچییەوە ئەوق بوو، گوتی: ((سوبحانەڵلاّ!)).

ئاغا گوتی: ((جا تۆ؟)).

((ئاخر فەرمووتان بە فرۆکە!)).

((بەڵێ، بەفرۆکە... بۆ نابێ؟... بۆ عەیبی چییە؟)).

سۆفی رەسوو بەدەنگێکی تێماوەوە گوتی: ((وەڵلاّ قوربان چتان عەرزکەم! بێ ئەدەبی نەبێ، پێموانەبوو، گوێدرێش بتوانێ سواری فرۆکەی ببێ... ئاغا فرۆکە بەو چوکەڵەییەوە، خۆی چییە و جێیەکەی چییە؟)) بێنەوایە نەیدەزانی رۆژانە ملیۆنەها ئەسپی هەڵمین بۆ هەڵخەڵەتانـدنێ مشتێك کەر و گایان دەهاتوچۆ و هەولێ و تەقەللادان.

((چکۆڵە نییە- ئێمە پێمان وایە چکۆڵەیە. دە هەوایدا زۆر گەورەیە- هێندەی ئـەو خـانووەی- جێشی زۆرە... بۆ خۆیان سوار نابن، سواریان دەکەن؛ بەڵێ لە دەرەوە ئەو جۆرە فرۆکانـە هـەر راست بۆ گاو ئێستر و گوێدرێژانی دروست دەکەن)).

((پەنا بەخوا!)).

((بەڵێ بە برایمیم گوتووە، ئەگەر هاتەوە یەك دووێکان بکڕێ... بەتایبەتی لە سـوورەکان، کـە زۆریان باس دەکەن)). و چاوێکی لە برایمی کرد، کە خودای نەمابوو. ((بـەو جـۆرەی کـە ئـەو باسی دەکرد هەریەکەیان سەد باتمان بار دەبەن، هێندەشیان ئالیك ناوێ... بەڕاست، گوتت سەد یا هەفتا؟)).

برایم بەڕوویەکی گرژەوە گوتی: ((بەڵێ... سەد- هەفتا!)).

سۆفی رەسـوو سـەرتاپای واق ورمـان و هـەوتبوون بـوو. گـوتی: ((ئـیلا ماشـەڵلاّ!)) و دوای ساتەوەختێك ((ئاغا ئەدی نرخیان چۆنە... بێ ئەدەبی نەبێ خۆ زۆر نییە؟)).

((نا، وەك ئەو دەڵێ هەر لە دەوروبەری گوێدرێژەکانی لای خۆماندان- رەنگـە هـەروا کـەمێك زیاتر بێت)). ((کەواتە، ئاغا دەستم بەدامێنت، تا ئیدیکەیان لێ وەئاگا نەهاتوون هەروا چەند دانێکان راسپێرن... دیارە نەك هەر بۆ من، بەڵکە بۆ هەمووان...)).



ئاغا گوتی: ((بۆ خۆشم هەردەو خەیاڵەیدا بووم)).

((خوداوەند تەمەن درێژ و سەرفیراز و کات)).

ئاغای سلێمانی پرێسکەکەی پەنا سینییەکەی لێك کردەوە؛ پارەکەی هاویشتە بن سینییەکە، و پرێسکەکەی دایە ئاغازادەی تابیداتەوە سۆفی رەسـووی. لەبنـەوە چـاوی هەردەمنـەوە بـوو و پێدەکەنی. ئاغازادە بە نارەزاییەوە، پرێسکە چلکنەکەی بەسەری دوو قامکان گـرت، هـەروەك بێچووە پشیلەی تۆپیو، هەرچەندە لە چلکنیان هیچی واشی لەبـەر بێـچووە پـشیلەی تۆپیـودا نەبوو، دایەوە خاوەنەکەی.

ئاغا هەروەك ئارەزووی بوو، مەبەستەکەی گەیاند بوو گوتی: ((زۆر چاکە، پـیرۆزە؛ هەولـدەدەم هەر بۆخۆم بێم)).

((ئینشاڵلاّ!)).

((... و بۆ خۆم پشتی بووکێ ببەستم)).

((خوا لە گەورەییەتان کەم نەکات!)).

((چ ئیشی دیکەت هەنە؟)).

((نەخێر قوربان، تەنیا دوعـای سـەرتان. خـودا سـایەی ئێـوە و ئاغازادەمـان لەسـەری کـەم نەکات... ئەگەر مۆڵەتێ بفەرموون دەڕۆمەوە و ((مژدە))ی دەدەمـەوە مـاڵێ... ئـەدی ئێـوە ئەگەر فەرمایشێکتان هەبێ)). و چاوەڕێی دەستوورێکی بوو.

ئاغا گوتی: ((نا، من هیچ ئیشێکم نییـە- خواتـان لەگـەڵ. لـە زمـان منـەوە پیرۆزبـایی لـە ((ماڵەوە))و لە کوڕەکەت بکە... تا بۆ خۆم دێم)).

((خوا لە گەورەییتان کەم نەکا)). هەستا و پشتا و پشت لە ژوورێ چووەدەرێ.

((هەهە، بەو رەفتارانەشەوە دەیانەوێ شۆڕش بکەن. هێشتا ئەقڵی بەوەی ناشکێ پرێـسکۆکەکی بگرێ و لاجانگە چلکنەکەی ماچکات و کە ئەویش رۆیی بچێت دەسـت و دەمـی بـە سـابونێ بشواتەوە)).

سیگارێکی بە مۆدنەیەوە کرد؛ پێکەکەی هەڵدا، و روو بەمنەوە درێژەیدایە: ((بەڵێ، حوسێناغا! پێت وانەبێ تێناگا- نا، چاکیش تێدەگا؛ زۆر لە من و لە تۆ چاکتر تێدەگا. تاقیکردنەوەکان فێریان کردووە کە چۆناو چۆن بەرگری لە بەرژەوەندییەکانی خۆی بکات و بیانپارێزێ. ئەو بەرژەوەندییەکەی دەوەیدایە بێت و شیرنیە بداتە من، چونکە ئەو دەزانێ کە هەر ئەورۆ و سبەیەکە کوڕەکەی بۆ سەربازیە بانگ دەکرێ و دەبێ یەکێك هەبێ قسانی بۆ دەگەڵ رەییسی بکات. ئەوە بۆ خۆی هیچ کە ناتوانێ، چونکە چ ئاشنایەتییەکی دەگەڵ رەییسیدا نییە و نایناسێت و زمانەکەشی نازانێت، ناتوانێ دەگەڵ رەییسی دانیشێ و ئارەقێ بخواتەوە. شیرنیە دەداتە من تابچم و دەگەڵ رەییسیدا ئارەقێ وەخۆم و کوڕەکەی لەسەربازییە بۆ ببەخشم. ئاغایانی شۆڕشگێڕ چ کارێکیان بە سەرۆکە سەربازییەکانەوە نییە خۆ بەرتیل ئەوە خوا هەرنەکا! هەر بۆیە ئەو وەرزێرەی کە دەبێ زەخیرەی شۆڕش بێت ئەو ئاغایانەی لا پەسەندە! چ دەکەی، نەزانە، دەوروزەمانە گۆڕاوە؛ بەواتای پیرێژنان ئاخر زەمانە!... بەڵێ، هەر ئەو عەبدوڵلا بەگەی ئامۆزاخان- کە پیاوێکی زۆر چاکە- بەسەریدا هات و ماڵی هێنایە شاری، بەلاّم بۆ کرمانج و رەش و رووت هێشتیان!؟ -چونکە یەکەم چاوی دە ژن و کچی رەش و رووتانەوە نییە؛ ئەوجا باری ئەرك و کاروباری مەئمورانیان هەر بۆ خۆی ئەنجام دەدا. هەر کە ماڵی گەیشتە شاری کرمانج کێچیان کەوتە کەوڵی و کەوتنە تکاو پاڕانەوە و داوا و داواکاری و سەر دێرەودەوێ هەڵکردنێ؛ و بە تەواوی حەزی خۆیانەوە هاتن ئوتومبێلێکیان بۆ کڕی هەر بۆ ئەوەی ئاغا بێتەوە گوندی، ئێستاش کە ئێوە دەفەرموون بانەیەتەوە ئەوە شتێکی دیکەیە... یا ئەڵلا، قولەی دەرویشییەیە!)).

هەروەك شانۆی شانۆگەرییە، بۆ دووەمین جار دەرکەکرایەوە. دەروێشێکی ریشنەی سەرو پرچ درێژی ئاڵۆز و رەشتاڵە: دەروێش رەحیمی وەرزێری خۆی بوو.

((دانیشە، دانیشە، تاپێکێکت بۆ تێکەم. تۆ بتوانی ماری بخۆی دەبێ بشتوانی ئارەقێش بخۆیەوە!)).

دەروێش رەحیم لەبەر خۆیەوە پێکەنی: ((هەهە!)) هەروەك منداڵان.

پیاوێکی کەڵەگەت بوو- هەروەك ئاغای سلێمانی دەیگوت دە تەمەنی ویدا، بەلاّم بەسەرو روو زۆر لەوی جحێڵتر- موو رەشێکی تەواو، دەموچاو هێلکەیی، و پێست تاو بردوو و وشکەڵۆك.



لەراستیدا هەموو شت رەش، هەر لە پێستی لەشیەوە بیگرە تادەگاتە چاوەکانی، ئەوەندە ریپۆقەی گۆشەی چاوەکانی نەبێ کە سپی دەچوونەوە؛ جلوبەرگێکی مەیلەو نوێ، و پشتێندی پشتێشی هەروەتر- دیاربوو نێرو پڕو تیرووە.

((تێکەم؟)).

((هەهەهە. نەخێر قوربان!)) بەروخسارێکی زۆر گێل و منداڵانەوە.

((بۆ نا؟ یانی لە گۆشتی خراپترە؟)).

((ئاخر ئەوە حەرامە قوربان!)).

((دەروێش حەلاڵ و حەرامی نازانێ- بۆ گۆشتی ماری حەلاڵە؟)).

((ئاخر قوربان حەزرەتی شێخ رێی ئەوەیانیان فەرمووە و ئی ئەمەیان نا)).

((رێیان فەرمووە کە مار حەلاڵ بێت!؟)).

((وەڵلا چتان عەرزکەم قوربان- هەهەهە!)).

((ئەوە ئیچمە بەبێ رێدان دەخۆینەوە، بابزانین چۆن دەبێ)).

((نەوشی گیان، قوربان... کەس ناخەنە گۆڕی کەسەوە... هەرکەسە بە حیساب و کیتابی خۆی)).

((ئافەرین!... نا، بابە، ئێمە پێمان وابوو؛ خودا نەخواستە تۆ زۆر شێتی! کەچی لە زۆران تێگەیشتووتری!... دەڵێی دەگەڵ رەسووی هاتبووی؟)).

((بەڵێ قوربان)).

((کەواتە، ئەو هەندە ماوەیە هەر لە دەرێ وەستابووی؟)).

((بەڵێ، قوربان)).

((بەڕاستی شێتی! دەبووایە بچی ببیە دەروێش!... ئەتۆ وەرە ئەو هەندە وەختە لەوێ راوەستی!؟)).

((هەهەهە! بەڵێ ئاغا)). چ ددانێکی ڕێك و پێك و سپی و سۆڵ!

((باشە، منداڵەکانت چۆنن، چاکن، بەکەیفن؟ کارو کاسبی چۆنە؟ گەنم لە چ دایە، ئومێد هەیە ئەمساڵ شتێکمان وەگیرکەوێ؟)).

((لە سایەی پیاو چاکانەوە، باشە)).

((چیدی؟... برایم بڵێ چای بۆ دەروێشی بێنن)).

((هە هە هە!)).

((ئەرێ هەروا بۆ دیدەنیە هاتووی، ها؟)).

((بەڵێ، ئاغا، لەپێشدا بۆ دیدەنیە، ئێرەجێی ئومێدێ مەیە... ئەرکی خۆمانە بیەینێ... عەرزێکی چکۆڵەشم لە خزمەتتاندا هەیە)).

((زۆر چاکە. بەخێربێ- وەك بۆ خۆتان دەڵێن ماڵە ((لێقەوماوان))ە!)).

((هەر ئاوەدان بێ ئینشاڵڵا، بەهیمەت و بەرەکەتی مشایەخان!)).

دەی؟.

دەروێش ڕەحیم تاوێکی خۆ هێناوبرد، تەماشایەکی من و تەماشەیەکی ئاغازادەی کرد، و سەرەنجام سەرنجە دوو دڵییەکەی لە روخساری ئاغایەوە بری.

ئاغازانی، گوتی: ((ئەو ئاغایە وەك منداڵەکانی خۆمانە- سەرەڕای ئەوەش زمانی مە نازانێ...)) بە چاوداگرتنێکی سووکەڵەوە لەمن ((کاری ئێوەی دەروێشان هەمیشە هەر کاری شەرعیە؛ وەك بۆخۆشمان دەڵێین چ لە شەرعێ عەیب نییە)).

دەروێش ڕەحیم سەرنجێکی دیکەی تێگرتەوە، ئەوسا بەدەنگێکی ڕاشکاوانە، بەلام بەروخسارێکی پڕ داخەوە رووی دەمی گوتنێ مەبەستەکەی لە ئاغای کرد:

((ئاغا، بێ ئەدەبی نەبێ ئەو کچەتیوە گرفتاری و دەردەسەریەکی سەیری بۆ دروست کردووین. باوەڕ بفەرموون هەر لەو دەمەوەی پێی ناوەتە ماڵە من هەرچی خۆشیە وەك بە مقاشی هەمووی لە کونە لوتان هێناومەوە دەرێ. تا ئەو نەهاتبوو، وەك پاشای سەرتەختیم ڕادەبوارد.



هەرکە ئەو هات ئیدی ژیانم لێ شێوا و خۆشیم لێ هەڵگیرا. باوەڕ بفەرموون ئەگەر عەرزتان کەم کە لەو دەمییەوە قومە ئاوێکی خۆشیمان بە گەروێدا نەچۆتە خواری درۆم عەرزنەکردوون... بۆیە هاتبووم تەگبیرێکمان بۆ بکەی...)).

((کام کچەتیوە؟)).

((ژنێ حوسێنی، ئاغا، کچێ حاجی غەفوری)).

((ئا))... جا چی کردووە؟)).

((وەڵڵا ئاغا، چاتربوو بفەرمووی چی نەکردووە. ئەوەی کە ئێوە بفەرموون کردوویەتی، و دەیکا)).

هەردوو دەستی دەبن هەنگڵێ نابوون و خۆی ڕەپێش کردبوو.

ئاغا ناڕاحەت بوو. بەروخسار و دەنگێکی تووند وتیژ و جووتە بڕۆی تێکناوەوە گوتی: ((تێنەگەیشتم- یانی تا ئەو ئەندازەیە!

((هەموو کارێك)) ئەو هەویرە ئاوی زۆر دەوێ!)).

دەروێش ڕەحیمیش هەر ناڕاحەت بوو. ((نا، ئاغا، خەیاڵی خراپ مەفەرموون. مەبەستی عەرزم ئەمەیە کە قیرسیچمەیە، هەرایە دەکات... و شەڕانیە و هەردەڵێی دۆم و قەرەجە)).

ئاغا وەك لەشی سووك بوو بێت گوتی: ((ئا))، باشە، سوپاس بۆ خوا! خەیاڵم بۆ شتی دیکەچوو- مێشکم ناڕاحەت بوو. گوتم خودانە خواستە نەکا کاری خراپی کردبێ...)).

((بەلام ئاغا، بۆ کاری لەوەش خراپتر هەیە؟)).

((بەڵێ، جەنابی دەروێش، شت گەلێك لەوەش خراپتر هەیە- تۆ شێتی، نازانی!)).

دەروێش ڕەحیم پێکەنی: ((هە هە هە! وەڵڵا ئاغا بەسەری موبارەکتان- گاڵتە نەماوە پێمان نەکا...)) و دەستی بەورتە ورتێ کرد.

ئاغا گوتی: ((بڵێ، کەسی بێگانەی لێ نییە؛ تۆش بە ناخێری گیانت دەروێشی، خۆ سۆفی نی تا ئەهلی شەرمێ بی)). و پێکەنی. دەروێش ڕەحیم بە دەنگ و روخسارێکی ڕاشکاوانەوە

گوتی: ((بەڵێ ئاغا، نازانم کێ چۆتە بن کڵێشەیەوە- پێم وابێ... خودا بۆ خۆشی دەزانێ... بەڵام من هەر پێم وایەکاری دایکەکەیەتی... چۆتە بنی؛ فوویداوە کە، پەرژین بێت، شاخت وا، باڵت وا، و گۆشت و بەزت وا... ئەگەر تۆ ژنێ ئەو خێل و خوارەی نەبای هەموو میرزا و عەتار و دوکاندارێك خۆڵیان دەخوارد ئەتۆیان ژن بای- و ئیدی پەرژین بێ لەو بابەتە پڕو پووچانە... و ئێستاش کچە بای چۆتە دەکەولێ و ئیدی ئەستەغفیروڵڵا خوای نەماوە. هەموو شەوێ خودا دایناوە هەراو زەنایە کە مەپرسە، بەزمی ئەڵڵا کەرەمی لۆتی لەچاو هەراو زەنا و بەزمی مە نوێژی جەماعەتێیە- باوەڕ بفەرموون ئەوەند و کۆکە ئابڕووەی دەدێیدا پێنەهێشتووین)). قامکێ گەورە و شادەی هاویشتنە سەریەك و ئەوەندە وردە ئابڕووەی کە هیچی وای لێنەمابۆوە، پێشاندا.

((دەگەڵ خەسوێی هەڵناکا؟ ئیشان ناکا- قسەی بن زمانی چییە؟)).

((نەخێر ئاغا، خوا هەڵناگرێ. با پێ لە هەقێ نەنێین، زۆر چاك و لەبار ئیشان دەکا، و کاری چاکیش دەکا، ئیشەکانی هەموو پوختن و هیچ کەمایەسییەکیان نییە، جا چ کاروبارو ئیشی مالاتی بێ یا کاری مەزرایە)).

((رەنگە کراس و کڵۆجە...)).

((نەخێر ئاغا، بەسەری موبارەکتان، لەلایەنی جلوبەرگییەوە خاترجەم بە هیچ کەموکووڕییەکی نییە... تەنانەت بێ ئەدەبی نەبێ پێڵاوی سووری مۆدەشمان هەر بۆ کڕیوە- بێ ئەدەبی نەبێ بۆ خۆم بۆم کڕیوە- هەر لەو حاجی عەبدوڵڵا کەوش فرۆشەی خۆمانم کڕیوە. دەتوانن هەر بۆ خۆتان لێی بپرسن، یان هەنگاوێکە بەسەرپێوە ئاغازادەی بنێرن لێی بپرسێ)). ئاغا تیلە چاوێکی گرتە ئاغازادەی، ئاغازادە پێکەنی.

((نەخێر ئاغا، گرفتەکە شتێکی دیکەیە)).

((هەی مەرگت بێ! پیاوە، منیش هەر ئەوەم پرسیوە!)).

((وەڵڵا چتان عەرزکەم ئاغا- دەترسم بێ ئەدەبی بێ)).

((بڵێ، خۆ من بێگانەیەك نیم؛ منیش یەکێکم وەکو تۆ...)).



((ئەستەغفیروڵڵا، ئێوە گەورەی مەن)).

((کەواتە بڵێ ئیدی... گوتم ئەو ئاغایەش هەر یەکێکە وەك منداڵەکانی خۆمان... زمانی مەش نازانێ... دەی بڵێ دەی!)).

((بەڵێ ئاغا. بۆ خۆتان ماڵ و حاڵ و جێ و رێ و گوزەرانی ماڵێ مە دەزانن. سەرتەندوورەکەم داوەتە وان؛ بۆخۆم و خاوخێزان هەموو لە ژوورە گەورەکەی دەنووین. ئەوەش نەك لەبەروەی جێ نەبێ، نەخێر، لە سایەی سەری ئێوەوە لەبارەی جێ و رێوە هیچ کەموکەسرییەکمان نییە... لەهیچمان کەم نییە. بەڵێ، ئەوەم عەرز دەکردن، سەرتەندوورەکەمان داوەتە وان، لبادێکی یەکپارچەی پڕاو پڕمان بۆتێدا راخستوون، و باوەڕ بفەرموون وامان رازاندۆتەوە هەر دەڵێی شانشینە- پیاو حەزدەکا هەروا راوەستێ و تەماشای کا! بەواتای دەرو دراوسێیان پیر بێنە سەیرێی جوان دەبێتەوە. ئەوە هەر لەخۆوە وانالێم، لە دراوسێیەکانی دەبیسم، کە بەتایبەتی دێنە سەیرێی و وادەڵێن. دەگەڵ ئەوەشدا، ئاغا، هەموو شەوێ شەڕو هەراو زەنامان بەرێوەیە. باوەڕ بفەرموون، ئەگەر بێ ئەدەبی نەبێ، هەر مەیمونێکمان کەمە، ئەویشمان هەبوایە ئەڵڵا کەرەمی لۆتیەوان تۆزی لە دوو نەدەکردین)).

((جا بۆ چ دەکا؟)).

((وەڵڵا چتان عەرزکەم، ئاغا)).

ئاغا بەسەرو روویەکی تووڕەوە گوتی: ((لا ئیلاهە ئیللاڵڵا! دوای ئەو هەموو قسانە تازە چتان عەرزکەم! بەڕاستی دەروێشی چاکی!)).

سەرەنجام دەروێش رەحیم خۆی پێدادا و گوتی: ((بەڵێ ئاغا- ئەلحوکمو لیللا: بەڵێ، بێ ئەدەبی نەبێ، خۆ بەدەست کوڕەیەوە نادا)). و وەك هەناسێکی ئاسوودەییەی هەڵکێشابێ، وردە وردە و پچڕ پچڕ هەناسەکەی دایەوە. من و ئاغازادە لالوتی خۆمانمان دەخوراند، و ئاغای سلێمانیش هەر خەریکی مۆدنەکەی بوو. ((ئاغا، بێ ئەدەبی نەبێ هەر دەستی دەگەیەنێتێ، ئەو دەست دەکا بەلینگە فرتێ)).

ئاغای سلێمانی بەدەنگ و روخسارێکی واوە کە لە بابەتێکی زۆر سادە و ساکارەوە بدوێ گوتی: ((باشە، کە ئەو دەست دەکا بەلینگەفرتێ کوڕە چ دەکا؟)).

((بەڵێ، قوربان؛ کوڕە چ ناکا- ئەو منداڵە بەستە زمانە چ بکا! ئەگەر درۆم عەرز نەکردبن تا ماوەیەکی زۆر ددانی بەجەرگی خۆیدا نا و دەنگی نەکرد؛ ئاخری وەك هەر بەندەیەکی خودای خۆی رانەگرت و هاواری لێ هەستا و گوتی، بابە، حاڵ لەوەی و حیکایەت لەوەی... دیارە من هەر زوو دەمزانی بەلاّم لەروویم نەدەدا... بەڵێ، درۆم عەرز نەکردبن منیش، بە مۆڵەتی ئێوە، گوتم هێندێکی چاوترسێن کە... کوڕەش، پەرژین بێ لێتان، دەست و قامی خراپ نییە. شەوێکی تا دەخوا کوتای، ئێمەش، هەروەك ئاگامان لە هیچ نەبێ، خۆمان لێ کەڕکرد، یانی ئاگامان لێ نییە- درۆم عەرز نەکردبن چرامان کوژاندەوەو چووینە بن جێی. بەلاّم ئاغا، رۆژی بەد نەبینی، کارێکی کرد رۆژ بەپێوە راوەستێ و ئەو سەری دیار نەبێ؛ زریکەی وای لێدەدا پیاوم دەویست گوێی لێ بێت و لەپێستی خۆی نەیەتە دەرێ... هەرخوا بۆ خۆی دەزانێ چمان چێشت، ئاغا!)).

((بریا هەر ئەوەندەت زانیبایە کە بەو هوهایانەی دەیکێشان خەڵکی چۆن بوون؟)).

((هە هە!)).

((باشە- دوایی؟)).

((دوایی دوعای سەرت... هیچ رێیەکی ناگرێ)).

((دوایە چتان کرد؟)).

((نۆکەری خۆت یان ئەو؟)).

((نۆکەری خۆم!)).

((دوایەش... هیچ ئاغا... تۆ لە جێی بابمانی، ناتوانم درۆتان عەرزکەم. بەکوڕەکەم گوت کە ئەو دەستی بەلینگەفرتێ کرد تۆ بچۆرە سەر سینگی دانیشە و هەردوو لاقەکانی بەگوریسێ توند ببەستە، و کاری خۆتی دەگەڵ بکە- خۆکاری نا شەرعییە ناکەی- بەخۆشی نەبوو بەزۆر و بەناخۆشی... خراپ دەڵێم ئاغا؟)).

((نا، بلێ)).



((بەڵێ، ئێوە لەجێی بابمانن، ناتوانم درۆتان عەرزکەم! تەنانەت شەوێکیان بۆ خۆم چوومە یارییە کوڕەکەی بۆ بەستنەوێی. بەلاّم ئاغا ئەگەر دەزانی چ قیامەتێکی بەرپاکرد- ئاغا دوژمنت نەیبینێ! کاتێ دوور لە رووی ئێوە کە دەست وپێیم دەبەستنەوە، ئەو چنگە تفانەی ئەو بەدەموچاویدا دەکردم باوەڕتان بێ ورچ بەدەموچاوی شەلەمووی جوویدا نەدەکرد!...)).

((باشە، زۆری زەرەر نەداوە؛ دەموچاوی تۆش هێندە پاکوخاوێن نییە!)).

((هە هە! ئێوەش ماشەڵلاّ هەر خەریکی جەفەنگانن، ئەمن شتێکی عەرز دەکەم و جەناب عالی شتێکی دەبیستن باوەڕ بفەرموون هەر کەسێکی لەجێی مەبایە یان ئەوی دەکوشت یان ئەستەغفیرۆڵلاّ، خودایە تۆبە، یان خۆی، یا بەرگی عەوداڵییەی دەپۆشی و ملی لەکێوو بیابانان دەنا. کارێکی کردووە، ئاغا کە تازە ڕوومان نایە لەلای دەرو دراوسێیان سەرهەڵێنین... ئێستا فەرمایشتتان دەگەڵ ئەو کارەیدا بەچیە بیکەین؟)) ئاغا تاوێك راما، دە قافێدا سیغارەکەی لە مۆدنەکەی هێنایەوە دەرێ، فوویەکی بە مۆدنەکەیدا کرد، و گوتی: ((بەڵێ... ئەوەش بۆ خۆی گرفتێکە... باشە ئێستا ئەمن پرسیارێکی لە تۆ دەکەم...)).

((بەڵێ، ئاغا)) بەچوار چاوان چاوەڕێی ئاغای بوو.

((تۆ لە کوڕەکەت دڵنیای کە پێی دەکرێ، و ناتەواو نییە؟ لەوانەیە کچە گلەیی لەوەی هەبێ)).

لە پڕ رەنگ و رووی دەروێش رەحیمی سوورهەڵگەڕا، وەك سەرزەنشت کرابێ.

((ئای ئاغا، ئەوە چ فەرمایشتێکی دەفەرموون! بەندە بۆ خۆم، دوور لەرووی ئێوە، پەرۆی شەوی بووکێنییەیم بەوچاوانەی خۆم دیوە- باوەر بفەرموون دوو دەقیقەشی پێنەچوو، هەرچووە ژوورێ و هاتەوە دەرێ... بێ ئەدەبی نەبێ- ئەو شەوە تا چەند سەعاتێکیان خوێنی هەر رانەدەوەستا... نەخێر ئاغا، ئەگەر کەسێك ئەوەی عەرز کردبن درۆی پێ راگەیاندوون- بەندە لەسەر ئەو دوو گوێیانەمی دەکەم... بەڕوویەکی گرژەوە، هەرکەسێ ئەوەی عەرزکردوون درۆی فەرمووە)).

((نا، کەس نەیگوتووە- پێویستیش ناکا خۆت شێت کەی؛ پێویست ناکا قولەیەکی بکێشی و پڕدەیە ئارەقەکەی مە و بەسەریەوەکەی هەڵیدەی- هەر ئێستا چاری دەکەین!)).

((هه هه!)).

((زۆر چاکه. کەواتە لەو لایەنەوە ئاسوودە و دڵنیابین؟)).

((بەڵێ ئاغا، ئەگەر درۆ بوو ئەوە بۆ خۆت، چ دەکەی بیکە)).

((باشە دەی، ئێستا گوێ بدەیە بزانە چ دەڵێم...)).

((بەڵێ ئاغا گوێم لێتانە)).

((ئەوە دیارە کە دەزانم تۆ درۆ ناکەیت و کراس و پێڵاوی مۆدەت بۆ کڕیوە... بەڵام کەی کڕیوتن؟)).

((وەڵڵا قوربان درۆم عەرز نەکردبن زۆر لە مێژە؛ بەڵام کەوشەکان هێشتا نوێ نوێن، باوەڕ بفەرموون لەکەیان پێوە نییە)).

((باشە... ئێستا ئەگەر بەقسەی من دەکەی کراس و کڵۆجە و جووتە کەوشێکی مۆدەی سووری دیکەشی بۆ دەکڕی... ئەگەر ئێستاش پارەت بەدەستەوە نییە ئەوە من دەیانکڕم و سەری خەرمانێ حیسابێ دەکەین، خۆ ئەگەر نەشیدەیەوە هەردەبێ)).

((نەخێر ئاغا، لە سایەی سەری ئێوە و هیممەت و بەرەکەتی مشایەخانەوە پارە هەیە، ئەورۆ سبەیەکیشە بەروبووم و خەلە و خەرمانیش هەڵدەگیرێ)).

((زۆر چاکە، منیش هەروا لەم بارەیەوە دەگەڵ حاجی غەفوریدا دەدوێم... قسان دەگەڵ داك و کچەشدا دەکەم. داوا لە داکەکەی دەکەم ئامۆژگارییە کچەی بکات؛ بە فاتمێش دەڵێم لە ئاریشەکەی نەبێتەوەو وازی لێنەهێنێ- چونکە هەرچوونێکی بێ ژن هەر ژنە و چاکتر دەقسەی یەك دەگەن. تۆش کە گەڕایتەوە گوندی بە کوێخای بڵێ بەیانی نا دووبەیانی- یان نا، سێ سبەی، بێتەلام. پێم خۆش نییە بزانێ هاتوویە لای من بۆ شکاتێ، دەنێو دەرو دراوسێیاندا خۆش ناکەوێ؛ نابێ ئەو جۆرە لالوتیانە گەورە بکرێن. بۆ خۆشت لای کەسی باس مەکە کە هاتوویە لای من و بەمنت گوتووە... من بۆخۆم قسانیان دەگەڵدا دەکەم... دەڵێم بە دەم قسانەوە لە کوێخام بیستووە؛ و هەوڵدەدەم پەنا بەخوا بڕیارێکی لەم بارەیەوە بدەم- ناڕاحەت مەبە)).



((ئینشاڵڵا! خودا تەمەن درێژ و سەرفیراز و راوەستاوتان کا، هیممەت و بەرەکەتی مشایەخان پشتیوانتان بێت!)).

((ئەدی حاڵی کچەکەی خۆتان لەماڵێ حاجی غەفوری چۆنە... دیارە کە ژن بەژنەتان کردووە؟)).

((بەڵێ قوربان... چتان عەرزکەم...)) و ئاهێکی هەڵکێشا ((باشە خراپ نییە)). بە دەنگێکی کزەڵەوە.

((بەڵام سەرو چاوت وا پێشان نادا)).

((وەڵڵا ئاغا، درۆم عەرز نەکردبن، باش نییە. هەرکە هات و هاواری ئەو کچەی بڵندبوو دایکەکەشی لەوێ کوڕەی بەردەداتە گیانی کچەی بێچارە- لەوێش هەموو شەوێك هەراو زەنا لە گۆڕێیە. هەروا چەند رۆژێك لەمەوپێش بەدار دۆژەنگی مەشکێی لێدابوو و دەستی شکاند بوو؛ بردمانە لای حاجی قادری شکستەبەند، بۆی هەڵبەستەوەو ماوەیەکی بە ملیەوەی هەڵواسی)).

ئاغا بە روخسارێکی شێواوەوە گوتی: ((ئمم! بەڵێ، هەر لەبەر هێندێیە کە دەڵێم نابێ ئەو جۆرە لالوتی و دڕدۆنگیانە بمێنن و پەرەی بستێنن؛ دەبێ بەهەر شێوەیەك بووە دیزە بە دەرخۆنەکرێ... پێویستە بە هەندێك وردە شڕو شالاتان ئەوانەی لەبیر ببرێنەوە، تا منداڵێکیان دەبێ؛ کە بووە منداڵە بەر ئیدی بۆ خۆی چاك دەبێ... بەڕاست چەند دەبێ هێناویەتی؟)).

((وەڵڵا قوربان هەر ئەو بەهارەی رابردوو بوو)).

((هێندە لە مێژ نییە- باشە، بە پشتیوانیە خودای هەوڵدەدەم بڕیارێکی دەو کارەیدا بدەم- ناراحەت مەبە)).

((خودا تەمەن درێژ و سەرفیرازتان کا)).

((چ کاری دیشت هەبوو؟)).

((نەخێر قوربان... هەر ئەوەندە بوو کە عەرزم کردن)).

((باشە، ئەدی ئێستا دەگەڵ پیاڵەیەکیدا چۆنی؟ دەروێش نابێ هێندە خۆی بەو شتانەوە ببەستێتەوە)).

((هە هە هە !)).

ئاغا بەڕوویەکی خۆشەوە گوتی: ((هە هە و زەهرەمار! خودا ئەو سەروچاوە پیس و پۆخڵ و ناقۆڵایەت لەناو بەرێ!)).

((هە هە هە! ئەگەر مۆڵەت بفەرموون درەنگ بووە، ژیان و ماڵ و حاڵمان لەو گۆڕەیە...)) و بەرێ پێدانێی هەستا و بە خۆشحاڵی و بەدەم پێکەنینێوە پشتاوپشت لە ژووری وەدەرکەوت... ژیان و ماڵ و سامانی لەگۆڕێ بوو...

راستیشی دەکرد: ژیانەکەی رەنێو هێنانی زەوی و ماڵاتەکەی، یا وەك خۆی دەیگوت ((پاتاڵەکە))ی بوو. هەر کە بەهار دادەهات، دەستێکی بەسینگ و پشتی خاکی دادێنا سوڕان و گەڕانی خوێن و هەناسەی دە دەمار و لەشیدا وەگەڕتر دێخست؛ خاك و زەویش هەروەتر. کە ئاوی دە زەوییە دەکرد، لەشی خۆیشی ئارەقەی دەردەدا؛ تۆوی دەکرد، خاك وەك نەوبوکی ئاوس بەشەرم و شکۆوە ئاوسیە خۆی لەچاوان پەنا دەدا- و ئەو ترسەی لێدەنیشت، نەك خوانەخواستە ((شەیتان ئاوس)) بێت؟ و هیچ لەگۆڕێ نەبێ و لەبەرچاوی گەورە و گچکان شەرمەزار بێت؟ هەر کە دەنکێك چەکەرەی دەکرد تۆوی شادی و بوونێ ویش چەکەرەی دەکرد، هەروەك چاوەڕێی ئاماژەکی بێ. ((سەبیلە)) بەلێوەوە رادەوەستا، دەستێکی دەبەر پشتێندێ دەناو لەدوورەوە بەشادی و خۆشی و زەردەی سەرلێوەوە دانەی خۆشی و شادی و بوونێ خۆی لە خاکەکەوە دەدەیتەوە. دەستی دە لەشی خاکدا دەگێڕا، هەستی بەگەرمی لەشی خۆی دەکرد، و هەر کە بژار و مشەخۆر و لا پرەسەنگی لێ قەلاچۆ دەکرد و لێی وەدەرداویشت، هەستی بە ئارامی و ئاسودەییە لەشی خۆی دەکرد- هەروەك ئێستا ساتەوەختێك بێت جلەکانیان بۆ تێوەشاندبێ[٤]. کاتێ منداڵ لە غەم دەرەخسا و دڵنیا دەبوو کە خۆی گرتووە ئیدی لە راوەستان

[٤] تێوەشاندن: وەبیرم دێ سەردەمانێك دەو وڵاتەی مەدا بەشار و گوندییەوە، خەڵکی لەبەر کێچ و ئەسپێیان هەراسانی لێهەڵگیرابوو- ناچمە ناو درێژەی باسەکەوە- کە نان دەکرا، تەندوور بەداران دادەخرا، دوای نانکردنێ کە لێدەبوونەوە، منداڵ و ژن و ژاڵ دەهاتن جلەکانیان دادەنان و دە تەندورێیانەوە دەوەشاندن، بەتینی گەرمیە نێو تەندوورەکەی



و سەیری راکردن و لول و پێچ خواردنی لەشی بەدەم باوەو ((کەروێشکە)) و یاریکردن بەولاوە کارێکی دیکەی نەبوو. ئەو ((کەروێشکە))ی دەکرد و ئەم ((سەبیلە))ی دەکێشا و سەیری دەکرد.

ژنەکەشی هەر رانەدەوەستا، یادەنێو ((دەرماڵ))ێدا بوو یا لە زگ ((پاتاڵ))ی — ئەویش ئۆگری وان بوو و دەگەڵەواندا دەژیا. هەر کە دەستی دەگەییە گوانیان گواندێنیان بەدەست و پەنجەی وی ئاشنابوون ((گرژ)) دەبوون و شیریان دەدایە؛ ئەویش هەر کە تەڕاییەشیری وەدەست و پەنجان دەکەوت دڵی دەجۆشا و هەمان ئەو ئاواز و لاواندنەوەی بۆ مەڕو بزن و مانگایەکان تێهەڵدەکرد کە بۆ منداڵەکەی خۆی دەگوتن؛ و بزنێ تاین وای لینگ لێك بڵاو دەکرد و وای پشت نەوی دەکرد هەروەك راست ئەوە دەمی کاریلەکەی خۆی بێ وەگوانانی کەوێ. بەڵام ئەو بەشی زاوەماکانی دەگواندێناندا دەهێشتەوەو وەك منداڵی بەرمەمکانی خۆی چاودێری دەکردن تابرسی نەبن. نێرەکانی بە بانگێکی تایبەتی نێران و مێیەکانیشی بە دەنگێکی نەرم و ناسکی دایکانەوە بانگ دەکردن و تێیەوە دەخوڕین: نێرەکەر ئەوە شێت بوویی وا سەردەکەیە سەر ئەو بێچووەی!... هەی حەکەدار! بەڕاستی حەکەداری، دەبخۆ دەی، نۆشی گیانت بێ- ئێستا باشە!)).

منداڵەکانیش هەروەتر- ئەوانیش بە سواری گوێدرێژان؛ روو لە چۆڵ و بیابانان، بەرەو ژیان دەچن، لە کاتێکدا کە لەبن رانی خۆیانەوە هەستی ژیانێکی دی دەکەن، و داژۆن، گاوان، گاڕانێ داژوێ. منداڵ توێشووی بابەی کە داکی بۆی دە ((خورجێن))ێ ناوەو لە پشتێی بەستووە: ژیانی بەکۆڵ و بە پشتییەوەیە و بەرەو لای بابە و دەشتێ لێدەخوڕێ. قەلەڕەشێك فڕکەی دەکا، سیسارکێك باڵە لێك بلاوەکانی لێکدەدا، ((سمۆرە))یەك بەدارگوێزێ هەڵدەگەڕێ. هەڵۆژەکانی هەردووبەری جۆیە، مروارییە رەنگینەکانی خۆیان بەسەروبەرەوە بە منداڵان و پێکتر نیشان دەدەن...

دەمی هەڵگرتنەوەی بەروبووم و خەڵەو خەرمانە. منداڵ، و ولاغ و باب و داك و خوشك و براکان هەموو لە هەموو سەرقاڵن. باب ((شەنەبا))ی دەکا؛ داك ((سەرکۆزەرە))ی لە بێژینگ

ئەسپێ هەڵدەوەرینە تەندوورێوەو قرچە قرچی ئەسپێیان وەك قرچە قرچی برێشکانی دەنگ دەهات... ئەوجا خوا وەتحەسێنێ ئەو شەوەی پاش تێوە شاندنێ خەوێکی خۆشی بێ خۆهەڵکڕاندنی بەدواوە بوو- وەرگێڕ-.

و کەودەدا؛ خوشك چای لێدەنێ، برا باراشی بەروبوومی تازەی لە کەرێ ناوەو دەیباتە ئاشی؛ برا گچکە لۆکەکەش چیلکە و چێوان وەکۆ دەکا بۆ ئاوری... ژیان قوڵپان دەدات، و ئارەقە لە لەشی باب و داك و براو هەمووانیدا سەری کردووە. گوێی بابە بە ئاوازی شنەی باوە چاوی بە ئاسمانەوەیە: لەوەی دەترسێ دەو وەرە و بڕۆیەیدا بیەوێ داکات و دەستی دەزاخی نێ. ئەو پەڵە هەورە نالەبارەی دەودەمە خراپەیدا لە ئاسمانێ پەیدابووە... خوا بێ ئافاتی کا... ((گەلاوێژ تۆش هەر وەرە ئەو ((شەنە))ی تاودەیە، بێژینگەکەی بدە مەنیژێ- کەمێك خێراکە، چایەکەش درەنگ بوو! هۆۆی، رۆستەم، راکە بە برات بڵێ با داسەکەی دانێ و هەر ئێستا بێتە ئێرە و یارمەتی ئێمە بدات!)) رۆستەم و براکەی هەردووك گیای دەدروون. ئالیکیش سوتەمەنی ژیانی ((پاتاڵ))یە، پاتالیش سوتەمەنی ژیانی خاو و خێزانە- شیرەکەی دەگەڵ شیلەی ژیانی خێزاندا تێکەڵ دەبێ- و خێزانیش کانوونی ژیانە، و ژیانیش درەنگ و زووی نییە: شیلەی ژیان دەبێ بەردەوام بتکێ. گەنمیش دەخاکدا هەر ژیانە، و لە دەرەوەشدا هەروەتر. هەروەك گۆزەگەری دێوانە هەربینە لە کەللەیدا، و دوای ئەو هەموو رەنج و کوێرەوەرییە هات و بەناویان وەربوو و هەمووی پلێشاندنەوە... چایەکە درەنگ بووە... هەموو پێکەوە دە هەوڵ و تەقەللا و کۆششدان.

جادەی شاری تەنیشتێ لە دوورەوەڕا دیارە، کە دووریە وەنێزیك دێخی. لەپشت کێویڕا دێت، و لەو دیوکێو و شیو و خەرەندە هەرە زۆرەکانەوە... کە دەبێ لەو پشتانەوە چ باس بێ؟ لەوێوەڕا ئوتومبێلان بەڕێ دەکەن. ئەو پیاوە شاپکا بەسەرانەی کە دەو ئوتومبێلانەدا دانیشتوون چۆنن... ئاغای سلێمانی مۆدنەکەی بەلاوە نا و گوتی: ((تێبینیتان فەرموو، جەنابی حوسێناغا! دەلاڵیەش دەکەین... چ بکەین، ئەوە ژیانە- دیارە بە یارمەتی جەنابی مستەفاخان و هاوڕێیانەوە... بەڵێ، کاتێ ئەو کەسە خۆی وەك یەکێکی خێزانی من بژمێرێ و خۆی وا دانێ منیش ناچارم گیروگرفتەکانی بە گیروگرفتی خۆم بزانم)).

((راست دەفەرموون)). ئاغازادە شەلاڵی ئارەقەی ببوو.

((بەڵێ... بەڵێ! باشە، ئینشاڵلاّ کەی دەڕۆن؟)).

((ئاغا، پێموایە بڕیارە دووسبەی ئەسپ و سواران بنێرن)).



هەر بچوو، خۆشە، بەلای منەوە خراپ نییە ئەگەر برایمیشتان دەگەڵ بێت، چونکە هەرچۆنێك بێ کەس و کار و قەوم و خوێشە، لێرەش هیچی رابواردنێی لێ نییە)). دەگەڵ کوڕەکەیدا ((خراپ نییە بچوو، خۆشییەکەی دێنێ بچی)). منیش سەرنجە پڕ پاڕانەوەکانم خستە سەر قسەکانی.

کوڕەکەی گوتی: ((چبکەم هێندێکم ئیش هەن... دەنا بۆ خۆشم هەر بەنیاز بووم... با حوسێناغا بچێت... من رەنگە دە پازدە رۆژی دی بچم)).

ئاغای سلێمانی سینییەکەی پاڵ پێوەنایەوە، و بۆ دەستودەم شووشتنەوێی، داوای مەسینە و دەستشۆرێی کرد.

* * *

## (٢٣)

جحێڵ بووم نەمدەزانی کە متمانە هەروازوو بە ساتەوەختێکی کەم پەیدا نابێ- ئێستاش هەر نازانم. کچ و کوڕێکی ئەوروپایی یا دوو کوڕە ئەوروپایی تا متمانەی پێك پەیدا دەکەن و دەگەنە ئەو قۆناغەی یەکتری بە وشەی ((تۆ)) بانگ کەن، وەك دەڵێن کلکی حوشترێ دەگاتە عەردی. یەکتری دەئامێز وەردێنن، بەلاّم دۆست و گراوی یەکترنین؛ زۆری پێدەچێ تا دەگاتە ئەوجێیەی بە فەرمی ئاشکرای کەن کە متمانەیان پێکە. بەلاّم ئێمە بەپێچەوانەی ئەوانەوە- بەتایبەتی ئێمەی دامێن چیانشین- دەردەست، هەر بەیەك سەرنج، و یەك زەردەخەنە دەبینە دۆست و خۆشەویست و گراوی یەکتر و نەك بەدڵێك بەڵکە بەسەد دڵ شێت و شەیدای یەك دەبین. هەر بەو کتوپڕیەش لێك دادەبڕێینەوە- تەنانەت بە یەك قسەی ناخۆش، یا هەر بەیەك قسەی ئەمو ئەو لێك دەترازێینەوە. جا وەرە بەو گیان و رەوشتەوە بۆ متمانە پەیدا کردنێ چ لە بوونە هاوبیرو بڕواییە چاکترە... هاوبیر! هاوبیری نا، هاو رەوشی: ئەوە هاوڕێیەتیە، ئاشنایەتی نییە- لە کاتێکا کە دەبێ هاوڕێیەتی چەندین پلە لەسەرووی ئاشنایەتییەوە بێت. من وشەی ((برادەرایەتی))م لە لاپەسەندترە، چونکە هاوڕێی ڕێگا مەرج نییە ئاشنای مرۆڤ بێت، چونکە هەر کە گەیشتنە مەنزڵێ هەریەکەیان بەدوای کاری خۆیدا دەڕوات و لێك جودا دەبنەوە. بەلاّم برادەر شتێکی دیکەیە، هەم ئاشنایە، هەم هاوڕێی ڕێگایە، هەم ئێستا و ئایندەشی، بە ئێستا و ئایندەی تۆوە گرێدراوە...

بەهەرحاڵ، ئەوە ئێستا تێدەگەم- ئەگەر بەڕاستی تێبگەم- کە بێجگە لە تازەگییە بوونێ خودی ((بیر)) و ((حیزب)) و ((چالاکی سیاسی)) و ((رۆشنبیری)) قسە و بەدگۆیی و سەرپێچیە کەسانی دی بوون کە ئاگری گەرمە تەندووریەمەیان هێندەی دی خۆشتر دەکرد، و بەواتای خۆمان و لە خۆمان گەورەترانیش کەللە رەقیەمەیان هێندەی دی جۆشتر دەدا. دەنا من



و مستەفاخان و کوڕی ئاغای سلێمانی کوجا مەرحەبا، چ دەیگەیاندینەیەك و چ شتێك پێکیەوە دەبەستینەوەو لە کوێڕا خزمایەتی و تۆرەمەو رەچەڵەکمان دەگەیشتنەوە یەك؟ لە لایەنی ئەو ڕێبازەوە کە من گرتبووم لەڕووی قسەکانی ئاغای سلێمانیدا چ قسەیەکم نەبوو؛ جحێڵ و بێ ئاگابووم، هەرچەندە وامان بیر دەکردەوە، یا وامان خۆپێشاندەدا کە ئەگەر هەلێك هەڵکەوێ و شەرمی رووان رێ بدا و گەورە و چووکایەتی لێگەڕێ شتگەلێك هەن بیانڵێین و بە شێوەیەکی شایستە و گونجاو بەرگری پێ لە ڕێبازو ئامانجەکانمان بکەین. من ئەودەمی پێموابوو ئەگەر باب و فرزەندایەتی دەگۆڕێدا نەبایە هەر ئەو کوڕەی بە دوو دانە مارکسیزم و چەند رستەیەکی فەڕانسەویانە هەڵیدەتەکێنێ: ئەو زەردەخەنە خۆ بەزل زانینەی کە کوڕەکەی دەیهاتنێ و ئەو سەرنجانەی کە لە بابی دەدان، هەموویان ئەوەیان دەنواند، یا رەنگە ئەوە نهێنییەك بووبێ، بۆیەی نەگوتبن، چونکە شایانی هەموو کەسێك نەبوون پێی بگوترێ...

مستەفاخان ئەسپ و سواری ناردبوون. سوارە هاتبوو و نامەی مستەفاخانی گەیاندبوو و گوتبووی لە کوێوە وەڕێ دەکەوێ: ئەوەی بە کەمایەسی زانیبوو ئەسپەکان بێنێتە بەردەرکێ ماڵێ مە، هەرچەندە من زۆرم کەیف بەوەی دەهات کە دایی بەچاوی خۆی ببینێ- رەنگ بوو مەلیحەش بیدیتبا- کە لەبەر دەرکێ چۆنا و چۆن سوار دەبم و وەڕێ دەکەوم. بەلاّم سوارەکە ئەو لوتفەی نەفەرموو و لەجیاتی بۆ خۆی بێت بەدوای منیدا نارد.

بەخۆو بە قابلەمەیەکی پڕ لەشفتەوە کەدایی بۆ ڕێیەی بۆ دروست کردبووم، و دەگەڵ کیسەیەکی حەمامێ و چەند پارووە سابوونێك و چەند رووشۆرێك و دوو جووت گۆرەویی ژنانە بۆ داك و خوشکی مستەفاخانی دەگەڵ نارەزاییە مندا دەپاڵ قابلەمەکەیدا جێ کردنەوە- قابلەمەکەی دە بۆخچۆکەکییەوە پێچابوو. سوار، یا نۆکەرەکە، لەڕووی لوتفەوە (چونکە من تا ئەوکاتە هەرگیز سوار نەببووم) قابلەمەکەی لێوەرگرتم و بە بەن مووسەکەی لای راستی زینەکەیەوە کرد، و بێ ئەوەی شل و توندیە بە ئاوزەنگییەکەی بکا یا بە من بڵێ بۆ خۆم ئەندازەی بگرم- شارەزای ئەندازە گرتنێ رکێفێش نەبووم- بن باڵی گرتم، هەروەك گونیە پەینێکی، هاویشتمییە سەرزینێ، بەلاّم چۆن، هێندەی نەمابوو لەولایڕا بەربمەوە خوارێ. هێشتا هیچ نەببوو دەلەرزیم. یەکەم جارم بوو سواری ئەسپی بم. تا ئێستا شارەزای زین و ئەسپی نەببووم، هەرچەندە زۆر سواری کەرێ ببووم. وەڕێ کەوتین- قیت و بەل، بەهەڵبەز و

دابەزەوە، بە کۆلاّناندا. بەلاّم نەمدەوێرا سەرم بەولاو لایاندا وەرسوڕێنم، تا خۆ لەسەر دۆست و ئاشنا و ڕۆشنایان و یان هاوڕێیان هەلّشەنگێنم. یەکەمین جاربوو کە بەرەو جێیەکی دوور لە شاری وەدەرکەوم. گوندی مستەخانی دوور بوو؛ دەیانگوت ئەگەر هەروا بە نەرمە ڕۆیشتن بڕۆین بەرەبەری ئێواریٚ دەگەینیٚ. هێشتا هیچ نەببوو هەموو ماسولکەکانی لەشم ڕەق ببوون، و وەك هەستیشم دەکرد، سوارەکە بەدزییەوە پێدەکەنی- قەلّنەی دەکێشا و کەنووی دەهاتنیٚ: بەقیت و بەلیە من، و بە لۆقەی ئەسپەکەی پێدەکەنی، کە وەك داری ڕەقی هەلّبەز و دابەزی بەمن دەکرد و هەناسەی لێدەبڕیم و قۆلّم هەلّدەتەکاند...

دارەبییە ((ئەحمەد سولّتان))یمان بەجێهێشت، لەدیمەنی شاری ڕەتبووین. شیو و دۆلّ و خەرەندەکان باوەشیان بۆ گرتینەوە، و هەرکە دەنگی سمی ئەسپەکان دەو شیو و دۆلاّنەدا بەرزدەبۆوە چیا بەرزە سەرکەشە گویٚ سووکەکان لوتکەیان وەدەر دەکەوتن. دوای چەند وردە ڕامانێك بەدەم دەنگی سمی ئەسپەکانەوە وردە وردە لوتکەکانیش دەکشانەوە دوایە و دوورا و دوور دەشت وەدەر دەکەوت، بەلاّم هێشتا هێندەمان ڕیٚ نەبڕیبوو کە هەردوو جەمسەری دەشتیٚ گەینەوە یەك و ئێمەیان دەگەرووی شیوێکی دییەوە تفاندەوە، و دارستان هەناسەی هەلّکێشا و جۆگەلە ئاوەکانی پێکەنین و درەختەکان لەرینەوە، و مەل و بالّندەکان هەوالّ و باسیان لەو دارەوە گەیاندە ئەو دار و کێو بە بێدەنگی دەیڕوانی، هەر ڕاست وەك ئەو داپیرە گویٚ گرانەی کە نەیدەزانی مندالّەکان بەچی پێدەکەنن هەموو ئەو شتانە بەلای منەوە تازەبوون، و هیچ و پووچیە ژیانی شاری و هەمەجۆریە گەورەکەی سروشتیان زۆر بە مەزنی بە من نیشاندەدا.

وردە وردە چێشتەنگاو قایمتر بوو؛ گەرما تا دەهات تاوی دەستاند، ئەسپەکان کەم کەمە بۆن ئارەقەیان لە لەشییەوە هەلّدەستا. نیوەراستی مانگی ئەیلولیٚ بوو، وەرزی گەزۆیە. چلّکە هەورەکان خۆیان دەپشت کێوەکان دەنا تا بەبڕوای خەلّکی ناوچەکە، گەزۆبباریٚ- یانی تا دارستان ئارەقەی دەرداو جڕو جانەوەران وە جوولّە خات و ئەو ئارەقەی بە شێوەی وەك دەنکەخوێی گەزۆی بداتە خەلّکی. کۆمەلّە تەپۆیەکمان لێرە و لەوێوە دەگەلّ دەهاتن: لەسەرەوە: بەرەو ڕوو، بەهەواوە تێکیانەوە داویشت، و هەر کە تاوی لە بن بالّی دابان ئیدی ئەوە ئاگریان دەگرت و شێت دەبوون- دیسانەوەش پیٚ بەپێی مە هەر دەهاتن. ئێستا گرژیە



ماسولکەکانم، هەروا لەخۆوە خاوببۆوەو نەمابوو: بە ئاسوودەیی دانیشتبووم، هەروەك لەسەر پشتی کەریٚ بم، و بە ئاسوودەیی دەمهاژوا، تەنانەت جاری وابوو دەستێکم درێژ دەکرد و ئەو تەپۆیانەم لەسەرو گوێی خۆم و ئەسپەکەی دەتەکاندەوە کە هێرشیان بۆ دێنایین. جاری وایە، دە دەشت و دۆلاّندا شەپۆلەکانی گەرمایە، هەوای دەبزێویٚ، هەر ڕاست وەك ئەوەی بوونەوەرێك بەدزییەوە بەدەستێکی نادیارەوە پەردەی تەنکی هەوای وەجوولّە خات و بیلەرێنێتەوە. ئاسمان بەرەو سپیەتییەوە دەچوو، تەنانەت دەسێبەرێشدا- دەناو لق و پۆپی درەختانیشڕا- مرۆڤ هەستی بە وڕەی گەرمایە دەکرد. تینی گەرمایە هەست و خوستی لەبەر هەموو شتێکی بڕیبوو. زاری دارستانیٚ بۆنی کالّیەی دەدا: نە مەلێك دەیخوێند، نە تەنانەت جۆگەلە ئاوێك خوڕەی دەهات، نەدرەختێك دەجوولاّیەوە: دارستان وەك مریشکە کورکیٚ خۆی گیڤ کردبۆوە، و لەبەر بێدەنگییە گوێیەکانی کاسەیان لێوە دەهات، لەجێیە بیٚ دارو باروداوێنەکان تاشە بەردەکان بە لاپالّی چیاکانەوە دەبرژان- جارناجارێك، دوورا و دوور، پەلّەیەکی چکۆلّە بەسینگی ((توکنی)) کێوەوە سەرنجی ڕادەکێشا، کە لە بێدەنگی و بیٚ هەستیە خۆیدا وەك خالّێکی سەرسینگ یا زگی تووکاوی یا بیٚ تووکی پیرەمێردێکی کەتەی دێو ئاسای دەنواند- ئەمە دیٚ ((گوند)) بوو. تا نزیکتر دەبوویەوە تۆخ و تاریکتر دەبوو؛ بەشێوەیەك ڕوخساری کێوەکەی گۆڕیبوو، وەك هەرشتێکی ناسروشتی کە بەتەك شتێکی سروشتییەوە بیٚ- هەروەك شوێنەواری برینێکی قولّ بەسەر لەشێکی تەن و مەندو بەهێزەوە.

زیاتر- کاکە هۆمەر-ی سوار، یا نۆکەر، لەپێشەوە بوو. دەستەسڕەکەی تەڕکردبوو و وەك چەفیەی عارەبانی بەسەرسەری خۆیدا دابوو- تا وشك ببێتەوە. هەتاو مێشکی دەبرژاند. بەدەم ڕێوە بەلای چەند پیادەو سوارەیەکاندا ڕەتبووین. هەر جارێکی کە بمانگەیبانایە بەخدەونەرێتی ناوچەکە دەستێکیان بەرز دەکردەوە- وەك سەربازی مەست- و چاك و چۆنیان دەکرد، یا وادەبوو بەبێدەنگی دەست بەسینگەوە، و لەلاڕێیە ڕادەوەستان. بەلاّم هەر کە دەگەلّ کاکە هۆمەری لە چاك و چۆنیە دەبوونەوەو دووسیٚ قسەیان دەکردن لەسەرو ڕوویانڕا دیاربوو وەك لە سلاّو و ئیکلامەکەیان پەژێوان ببنەوە- ڕەنگە ئەوەش هەر تەنیا بۆچوونی من بوو بیٚ- هێندێکیان لالوتی پێشان دەدا- چونکە خۆ من خان زادە نەبووم، لەپێشدا وایان زانیبوو خان زادەم؛ هەلّخەلّەتابوون- بەرپەرچیە هەلّخەلّەتانێش لە نەفرینیٚ بەولاوەتر چیدیکەیە؟.

له چایخانەیەکی بەڕواڵەت بەجێماوەوە تێپەڕین. چاوەڕێبووم بۆ نانخواردنی نیوەڕۆیە راوەستین، بەلاّم بڕیار بەدەست کاکە هۆمەر بوو، کە لەپێشەوە بوو، بەلاّم دیاربوو بە چاکی نەزانی. ملمان لەڕێیە نا. هەروا بەدەم ڕێوە چەند جارێکانم ویست لێی نزیك کەومەوە، بەلاّم ئەو هەموو جارێکان بەمینگە مینگەوە نەیدەهێشت بیدوێنم: قسەکانمی بە بەڵێ، یا بە نایەکی سادەوە وەلاّم دەدایەوەو دەڕۆیی. دیاربوو پێی گوترابوو؛ هەر کە لێی نزیك دەبوومەوە، دەیگوت: ((ئای ئای، لووشکان داوێ!)) یانی ئەسپەکەی جووتان داوێ، لە کاتێکدا کە دەمزانی ئەوە بۆ خۆیەتی کە هەڵداوێ.

نیو سەعاتێکی لە نیوەڕۆیە لادابوو کە دەشیویکیدا لەسەرجۆیەکی پەل بوو. منیش لامدا. لەسەرجۆیە دابەزی- ئەمنیش دابەزیم- قابلەمەکەی لە داموسکەی زینەکە کردەوە، لغاوی لەسەری ئەسپەکان داڕنی، زینەکانی لێکردنەوە، و ئەو دوو گوریسەی کە بە ئەڵقە و پێچ بەلابەلای قەرپوزی زینەکەوە بوون کردنیەوە، و ئاماژەی منی کرد: یەکێکیانم لێوەرگرت، و وەکو وی لە دەستی ئەسپەکەی خۆمم کرد و دوور لێکتر لە درەختەکانی کەنار جۆیەمان بەستنەوە...

هاتینە بن سێبەری دارێکی و بوخچەکەمان کردەوە، و نیوەڕۆژەمان بەوپەڕی بێدەنگی وشەکەتییەوە خوارد- چۆن خواردنێك، بەروخسارێکی شەرمێونانە و هێنان و بردنی بەکاوەخۆی پاروو و چاوگێڕانی چاو و دەنگی گرم و هوڕی ناو گەرووی کاتی پاروو قووتدانیێ، هەروەك کارێکی زۆر نابەجێ و نالەبار ئەنجام بدەین وابوو. کە نیوەڕۆژە تەواو بوو، هەروەك لەپێشدا بڕیار بێ، بۆ لەش سوکییەو حەسانەوێ زیاتر و خۆ سووك کردنێ هەریەکە بەلایەکیدا، بەلاّم بۆیەك مەبەست، ملمان لێنا. کە لێبووینەوە، هاتینەوە- من چاوەڕێی دەستوور بووم. کاکە هۆمەر هێندێك بەولاوە ترەوە راوەستابوو و دەستی وەبەرچاوی خۆیەوە نابوو و دەکێو و هەورو لابەلایانەوە رامابوو، و سەری رادەوەشاند. لە بن دارێکی درێژ بوو و مێزەرەکەی بەسەرخۆیدا هەڵکێشا، هەرهێندە درێژبوو پرخ و هوڕی بەرزبۆوە. منیش بەردێکم وەبن سەرمدا و لێی راکشام...

هەورەکان، مات و غەمگین، پاڵیان بەلاپاڵی کێوەکانەوە دابوو و جۆگەلە و دارستان هەناسەی هاودەردیەیان هەڵدەکێشا؛ لەولاوە پەڵە هەورێکی تەنکەڵە، بە باڵی ئاوالاّوە، پەلەی چوونەوە ئامێزی پەڵە هەورە گەورەکەی دایکی بوو. تەم، کێوە دوورە دەستەکانی دەباوەشی خۆیەوە



گرتبوون؛ زەرد و ماهی لوتکەی کێوەکان وەك پلیکانەی دیواری خەرەندێکی قوڵ دەچوون؛ و لەو دوورەوە دیاربوو کە چۆن با مێگەلی هەورانی لێدەخوڕی و لە پردێی دەپەڕاندنەوە...

پێموابێ هێشتا وانەبۆرژا بووین کە بەتەنگەتاوییەوە لە هاڕژنی باران و هاشو هووشەی دارستانێ لەجێی خۆمان راپەڕین و بێ ئیختیار بەڕاکردنێوە بەرەو لای جۆیە هاتینەوە.

ئەسپەکان بەملکەچیەوە، و بەسەرو پۆتەلاکێکی گرژەوە، لەبەر بارانێ راوەستابوون. دووکەڵێکی سپی بەسەر دارستانێدا کشابوو: باران جلەکانی دە تەندرووی دارستانێوە دەوەشاند. ئەسپەکانمان کردنەوە؛ وا تەڕببوون ئاویان لێدەتکایەوە. بێ دەستور و بێ فەرمان، زینی ئەسپەکەم تاودایە و ئەسپەکەم زین کردەوە. تا تەنگەم نەکێشا نەمزانی سەرجلەکەیم لەبیرچووە بیهاوێمەوە سەر پشتێی. کوڕەخۆ دەبوو لەپێشدا سەرجلەکەم لێکردبایەوە! لە بیرم چووبوو... ناچار سەرلەنوێ تەنگەم شل کردەوە و زینەکەم لێ هێنایەوە خوارێ، و بەیارمەتی و کۆمەکییە کاکە هۆمەری و کۆمەڵێك لوتف و گەورایەتیە بێدەنگەوە، زینەکەم لێنایەوە. بوخچەکە و — قابلەمە بەتاڵەکە و هەموو شتەکانی دیکەم- بە بەن مووسەکی زینەکێوە کردەوە...

ئەوا ئاسمانیش هەروا بەکوڵ دەگری، با، هەرواها شەیەتی و بەلورە لورەوە خۆی دەلاشەی کێوەکانەوە دەسوێ و بەرەو داوێنی چیای شۆڕدەبێتەوە. کێو لە نێوەڕاستێرا وە هەراسان کەوتبوو؛ تەڕاش و دارو دەوەن نێوچەوان و برۆیان تێکنابوون و وەك منداڵی کەللەڕەق و سەرسەخت کە گوێ نادەنە هەڕەشە و گوڕەشەی داکیان پێیان دە عەردی دەکوتا و لەجێی خۆشیان نەدەبزووتن؛ و واکە بەتوڕەییەوە بەڕێی خۆیدا دەچۆوە... درەختەکان تاوێکیان گوێ هەڵدەخست، دەکشانەوە دوایە، گوێیان هەڵدەخستنەوە و وەك منداڵێکی وردیلە گەورە یەك هەروا لە دوورەوە بەجوڵەی پەنجەکانی قدیلکە (ختووکە)ی بدات و ئەو پێی وابێ بەڕاستییە، خۆیان خڕ دەکردەوە و هەر کە دەنگی هاشەی بایان دەبیست ئەوان لەجێی خۆیانەوە دەستیان دەکرد بەخۆڕاژاندنێ، بەلاّم پێنەدەکەنین... دارستان هەروەك ژنە دراوسێییەکی کە گوێی لە شین و زاری و زریکە و گریانی دایکێکی دیکەی زگ سوتاو دەبێ ئاوا ئەویش دەهەناوی خۆیدا دەکوڵێ. ((وو وو- و!)) ئەوە دەنگی لورەی دایك بوو. بۆنی ئارەقەی لەشی دایکان (درەختان- وەرگێڕ) دەگەڵ بۆنی لەشی مە و ئەسپەکان تێکەڵ ببوو. هەوا بۆیناك بوو. و ئێمە — ئێمە و ئەسپەکان- سەرمان بەردابۆوە، و باران لاونیو دەباری و لە پشت ملمانەوە بەتیرەقەی

پشتێماندا دەچووە خوارێ- و ئەوە ئێمەش هەر دەڕۆین، و هەورەکان دەڕۆن و کوندەی بارانێ دەگەڵ خۆیاندا دەبەن، و (با)ش هەرچەند جارێکی پارچە جلۆکەی هەوری بەسەرڕووی رۆژێدا دەدا وەك ئەو کچۆلانەی دەیانشۆن، تاماوەیەکی دوای لاچوونێ ئەو جلۆکانەشی هەر دەگریا، و گەلاکان فرمێسکیان دەڕشت، و لەشی ئەسپەکان کەفی دەکرد، و هەروەك ئەوەی خۆر بیەوێ دڵی خوشك و برایەکانی بە کوچکێوەدا کتوپڕ هێور دەبۆوەو پێدەکەنی- تەنانەت گلێنەی چاویشی هەر تەڕبوو- بەلام دیسانەوە ون دەبۆوەو درەختەکان لەهیکڕا روویان تێکدەنایەوە، دوایەش هەروەك کیژ و کاڵی دەمی گەمان، دەستی یەکدیان دەگرتەوەو یەکتریان دێناو دەبردەوە. ئەو تاڵەپووش و پەلاشانەی کە لە ریشی چیای دەبوونەوە هەمووی بەسەرو دەموچاوی مە وەردەبوو. هەموو جارێ تێکڕا دەبووم، خۆرپێکەنینی دەهاتێ، و پێدەکەنی... و کێوەکانیش بۆیان دەستاندەوە، و بەو پێکەنینەیان تاریکیان لەڕووی پەڵە هەورەکان دەڕەواندەوە و روخساری عەرد و ئاسمانان دەگەشایەوە و ئاسمان دەهاتەوە دۆخی جارانی و پاڵی بەلاپاڵی کێوەکانەوە دەدایەوە.

هەمیشە هەروایە: کە هەورەکان تێدەپەڕن خۆر پێدەکەنێ و کێوەکان بۆی دەستێننەوە، مەل و باڵندەکان دەخوێنن، و ئادەمیزاد هەر لەخۆوە شاد و دلاوا دەبێ ((ئەرێ، دڵم کرایەوە!))- هەروەك خۆشیە دوای ناخۆشیان... بەلام لەولاوە دوورتر، هەورەکان دیسانەوە گرانابیان خستەوە سەر شانی کێوەکان و هەڕەشەی لە ئاسمانێ دەکەنەوە. کاتێ کە هەڕەشەکانیان ناگاتە چ جێیان وەك سەگی سەگ بە حەسارکراو خۆ دەپشت کێوەکان دەکوتنەوەو کێوەکانیش بەو سوکایەتییەی نێوچەوانێ تێکدەنێن، و هەر کە تۆش سەرنجت دانێ بێ ئیختیار ئەتۆش لەوانڕا نێوچەوانێ تێکدەنێی و روو گرژ دەکەی. جاری واشە، تیرەقەی پشتێت دەبروسکێنێ: ئەوەش ئەو کاتانەیە کە هەورەکان داچۆڕاون و دەزانی هەر ئێستا نائێستا سەراوی دەتۆقێ و دایدەکا؛ چونکە هەناسەی ساردی پێش بارانێت وێکەوتووەو دەزانی. (با)، شڕوشیتاڵی، رەشماڵی هەوران بەسەرلاپاڵی کێویدا دەتەکێنێ؛ ئەو چەندانەش، کە لەبەر بێ ئاگاییە دایی بە گۆشەیەکی رەشماڵێ بەرچاویان گیراوە و دەگرین؛ دەنگی گریانێیان لە دوورەوە دێت و دەنکە فرمێسکی بەربلاوی گریانێیانمان لەسەروچاوی دەدا. ئەوانەی کە دوورا و دووریش ئاگایان لەو رووداوەیە پێدەکەنن: سۆرانیی سپی کراسەکانیان وەدەردێخن، هەروەك خودی ژیان، وەك خوشك و برایانی خێزانێك. رەشماڵی پارچە پارچەی هەور لێك هەڵدەوەشێ، هەروەك کە فاوی سابوونێ دە تەشتە



ئاوێکیدا، و سەری خۆی هەڵدەگرێ و دەڕوا، تا لە جێیەکی دی بەرگدرووی (با)ی دەگاتەوێ ئەو چل پارچەیەی بۆ لەیەك دەداتەوەو بەسەرکێوو دارستانێیدا هەڵدەکێشێتەوە.

دارستان هەناسەی دەدا، وەك پیرەمێردێکی ماندوو، دەچلەی زستانێدا، و بەرامبەر رۆژێ ((هووە))ی دەکات؛ هەڵمی هەناسەکەی بەرەولای رۆژێ تەندوورەی دەبەستێ بەلام (با) ئەو هەڵمی هەناسەیەی بەرەولای هەورەکان راپێچەك دەدات و بەری رۆژێ لێل دەبێ. لەولاشەوە کێو بە ئاماژە و بەفیتی رۆژێ، وردە وردە، بە پێکەنینەوە، چەند داوە بەنێکی کە لە گلۆلەی هەورە رەشەکانەوە جێماوە بە تەشیی خۆی دەڕێسێتەوەو بەن و تەشییەکەی داوێتەوە نێو خورجێنێ کۆڵی و بەدەم رۆژێوە دەخنێتەوە. ئاسمان دەوەتاغی سروشتدا دانیشتووەو قەڵنەی دەکێشێ؛ دووکەڵی قەڵنەکەی بەسەر دیواری کێوەکاندا هەڵدەکشێ و سێبەر بەسەر گوڵە کاغەزیە دیوارییەکاندا دەکێشێ و تێدەپەڕێ. دەو بێنە و بەرەو بگرە و بەردەیدا دوو کیسەڵ لە قەراغ رێیە ئەوەدەمیان تێکناوە... لەسەرچی؟ لەسەر ژنێ یا لەسەر پاوانی، یا لەسەر سەرۆکایەتیە؟ وەك بڵێی ئەو بەرچاو تەنگیە هەردەنێو ئادەمیزاندا نەبێ و بەس... تۆ بڵێی ئەمانەش حیزب و هاوڕێی حیزبییان هەبێ..؟... کە ئێمەیان گەیشتینە سەرێ یەکێکیان پشتی ئەویدیکەی لە عەردی دابوو و خەریك بوو بەجێی بێڵێ و بەڕێی خۆیدا بڕوات. ئەوەی کە پشتی وە عەردێ کەوتبوو بەهەرچوارپەلان بەرەو ئاسمانێ لە خودای دەپاڕایەوە بیگاتێ؛ لە کاتێکدا کە دەیزانی- ئەگەر پێشتریش نەیزانیبێ خۆ ئێستا ئیدی دەیزانی- کە هەر چوار پەلان دەهەوایدا رادەوەشێنێ و دەستی بەچیەوە نییە. کاکە هۆمەر دابەزی و هەڵیگێڕایەوە، و ئەویش لە پاداشی ئە چاکەیەیدا بە ((فس))ێکی سوپاسی کرد و سەری بردەوە دە قەپێلکەکەیەوە. تا داخوا کەنگێ توشی غەنیمەکەی دەبێتەوە... ئەوە ژیانە، دەبێ یەکێك هەربگاتێ؛ ژیان بێ کۆمەك و یارمەتی ناچتە سەرێ. کێ دەڵێ، دەودەمەیدا کە ئێمە گەیشتینەوێ ئەو دانە چڵەکیوە و بەرامبەرەکەی ئەمەی لێ بەهەل نەزانیوەو پشتی لە عەردی داوە. یا رەنگە هەر بەرامبەرەکەی هەستی تێکدابێ و ترساندبێتی و گوتبێتی ((ئەها، هاتن!)) و هەر کە ئاوڕی داوەتەوە ئەو لەکاری خۆی بۆتەوە- ئاخر ئەو جۆرە فێلانە دەمێژوودا پێشینەیان زۆرە.

نەرمە (با)ش هەروا دەنکەبارانی لەلا روومەتی هەورە دوورە دەستەکانەوە دەڕنیەوە و بەسەروچاوی مەی وەردەکرد، مەل و باڵندەکان هەروا جریوەو جووکەیان بوو و جۆگەلەو جۆیبارەکانیش سەرپشتی خەرەندییان دەشوشتەوەو چڵك و شواری لەشیان دەگەڵ بڵقەکان بە ئاوێدا دەدا. بڵقەکان دەڕۆیشتن؛ جاری وابوو هێندەیان پاڵ وێکدەدا جێیان بەیەکتری تەنگ دەکرد و دەتەقین، هەروا هەنگاوێك بەولاترەوە دووبارە سەریان دەردێنایەوەو هەمدیس دەتەقینەوە، و جۆگەلە بێ ئاگا لەوان بەڕێی خۆیدا دەڕۆیی و بڵقی هەڵدەدانەوەو دووبارە دەیتەقاندنەوە. درەختەکانی نێو خەرەندێ و هەردووبەری جۆیەش بەرەو خوار ببوونەوە؛ لە هەردوو بەرانەوە خەریکی سەرەتاتکێ و ملەقوتێ بوون، و ئەویش —جۆگەلەکە- وەك پوورە خورشیدێ، بەزەحمەت و بەقەوەتێ هەردوو ئانیشکان، لێکی جودا کردبوونەوە، و هەروا بەو حاڵەوە چیرۆکی بۆ ئاسمانێ دەگێڕایەوەو کچۆڵەی ئاسمانێش پێدەکەنی.

هەر کە لە هەورازێکی وەسەردەکەوتی ئیدی ئەوە چاوەڕێی دیمەنێکی هەراوی پان و پۆڕی تر بوویت لەبەردەمت وەدەرکەوێ، بەڵام کە وەسەر دەکەوتیت و دەگەیشتییە تۆقەڵێ دیسانەوە نشێوێکی دیت دەهاتەوە پێشێ، و هەمدیس هەورازێکی دی- و دووبارە سیسارکە کەچەڵێکی دی کە باڵی لێکدەدان و بەسەروچاوە گرژ و شوومەکەیەوە تەکانی دەدا؛ چەند هەنگاوێك لەولاترەوە دەنیشتەوەو کەواو سەڵتەی باڵەکانی دەخۆیەوە دەپێچان و بەدوای کەلاکێکیدا بەرامبەر دارستانێ وەنەوزی دەدان... و دیسانەوە نشێو، و هەورازێکی دی- و تا لەپڕو بەبێ هیچ چاوەڕوانییەك جیهانت لە پێش چاوان پان دەبۆوە.

سەرەنجام گەیشتینە بەرزاییەکی کە دیمەنێکی هەراوی لە خوارێڕا کەوتە بەرچاوانمان: دەشتێکی بەرین، بە داروبارو درەخت کە دیاربوو کەم کەمە دێت داروبارەکەی تەنك بێ، بە کۆمەڵێکی دەچوون هاتبن گوندی بەڕێکەن و هەروا بەدەم ڕێوە، گوند رۆیشتبێ و ئەوان گەیشتبنە کۆمەڵێکی دی کە لەولاوە بۆ پێشوازییە گوندی هاتبن و گەیبنە یەك... پەڵەسێبەر بەسەر دارسپیدار و داربەڕووەکاندا هەروا خشەیبوو... بەرەبەری رۆژاوایە بوو لە باریکە رێیەکەوەی کە بەناو باغچەکانی پەنا گوندیدا تێدەپەڕی لە ئاواییە نزیك بووینەوە. گوڵە بەرۆژەکانی قەراغ پەرژینە شکاوەکان ریزیان بەستبوو- هەروەك پێشوازیکەرانێکی بەزۆر هێنرابن زۆر بەبێ حاڵیەوە سەریان بەردابوونەوە؛ خشەخشیان بوو و بەخێرهاتنیان دەکرد. تەماتەکان



سوورهەڵدەگەڕان و لەشەرمان خۆیان دەبن پەچە و چارشێوی سەوزی گەڵاکانیان دەنایەوە. ئاو ملی باریکە رێیەی گرتبوو، بەڵام کدووە مل باریکەکان کە لە کەلێنی پەرژینێوە خۆیان خزاندبووە دەم رێیە لەبەر تەمبەڵیان لەجێی خۆیان نەدەجوولان، داوەڵەکان، هەروا لەجێی خۆیانەوە بێ جووڵە شاقەل و باڵیان رادەوەشاندن...

گوند کەلاوە بوو، هەموو لایەك هەر گوفك و سەرانگۆیلك بوو، هەموو جێیەك پیس؛ بەسێ چوار سەگە بەرەڵڵاوە، کە چاوەکانیان پڕبوون لە چیرۆکی ستەم و ئێش و ئازاری ژیان، و چەند بزنە گڕۆییەکیش لە مێگەلێ دابڕاو و بەجێماو کەوەك دەوری دەرس و خوێندنێ بکەنەوە لە پەنا پەرژینەکان وەرکەوتبون و ریشیان دەجولاندن، و دوورا و دووریش چەند پیرەمێردێکی کە لە پاڵ دیواری ماڵەکانیانەوە لە پەنا سەرانگوێلکێ (گوفك)، چوار مەشقی دانیشتبوون و قەڵنەیان دەکێشا یا خۆیان دەدۆزی، یا دەبەرەو دوورایيەکی برۆیان تێکنابوون... هیچی وای نەمابوو بۆ شێوان. ماڵێ مستەفاخانی- سەرا- لە گوندییەوە دووربوو: لە باشووری گوندی، لەسەر بڵندایيە قەراغ چۆمی؛ و ئەولاتر، بەلای رۆژهەڵاتێوە، دامەنەیەکی چڕوپڕ کە گۆڕستانی گوندی بوو، و لە باکوورەوە داربەڕووە کورتیلە لێك دوورەکان، کە ببوونە رەنگی نەخشی کراسە خۆڵەمێشییەکەی کێوی...

((سەرا)) لە گوندییەوە دووربوو: وەك دەڵێن خاوەنەکەی ساماندار بوو، یا بەساماندار تاوانبار کرابوو و هەروەك باویشە سامانداران هەر بە تەنیا دەژین- تەنیاشن. خانووەکە، دەفەرهەنگی ناوچەکەدا، هەرتازەیە، یانی مەگەر هەر سەد ساڵێکی تەمەن بێت. خانووە کۆنەکەم بۆ بەیانی دیت: لەسەرگردێکی تورەکەرێژ، و بەهەرچوار دەوریدا ماڵە کرمانج، کە ئەوەی پێشاندەدا خاوەنەکەی، دەسەردەمی خۆیدا سەنتەر و ناوەندی کۆمەڵگای بەردەست و رەش و رووتان بووە، و تا سەرەنجام بەهۆی سامان و پارەو پولێکیەوە چۆتە ئەو داوێنە و خۆی کەنارە گیرکردووە، و خانووەکەی پێشووی بۆتە ((کاولە قەڵات)) کە بە دوکانەکانی دەوراندەوری دیواری حەسارێی و بەو پەنجەرەستونیانەی کە بە بارێ سەرو خواراندا دەکرانەوەو دادەخرانەوەو بەو شووشە پەنجەرە سێ گۆشە رەنگاو رەنگانەیەوە هەردەتگوت کاروانسەرایە.

ماڵی راستیش خانوێکی باکووری- باشووری و دوو نهۆمی بوو؛ مەیلەو گەورە، و بەرامبەر کێوی بەڕووی چۆمیدا، دارای حەسارێکی مەیلە و بەرین. ماڵەکە دووبەش بوو: ناوماڵ و

دەرێ. بەشی دەرێی ئەوەیان بوو کەمن چوومێ- لەراستیدا کە کەس بەپێشوازییەوە نەهات بۆ خۆم سەربەخۆ ملم لێنا. ئەو ژوورە کە پێیان دەگوت ((دیوەخان)) لە دەرەوەی سەرایەدا بوو، لەلای باشوورەوە دوو پەنجەرە، و یەکێکیشی لەلای رۆژهەڵاتێوە تێدابوو، کەمن چووم کرابۆوە، و دڵنیا بووم کە ((ئاغا)) نزیك بوونەوە گەیشتنێ منی زۆر دەمێك بوو لەوێڕا دیبوو، کە گەیشتمێ ئەو زۆر بەقوڵی دەخوێندنەوێ راچوو بوو. نەمزانی چی دەخوێندەوە، هەر کە منی دیت نووسینەکەی دەگێرفانێ نایەوە.

بەشی لای باشووری خانووەکە خشتی سوربوو، بەڵام نەك هەر رەنگی سوور هیچ رەنگێکی دیاریکراوی دیکەی پێوە نەمابوو. لای رۆژهەڵاتێی، لە ریزێك خشتی سووری دەوران دەوری چوارچێوەی پەنجەرێکی بەولاوە دەنا ئەوەی دیکەی هەموو خشتی کاڵ و قوڕبوو. دەرگای دەرێی خانووەکە بەڕووی رۆژهەڵاتێدا دەکرایەوە و راست دەچۆوە سەر پلیکانەکان کە یەکڕاست بەتاریکاییەدا بەرەو لای رۆژئاوایەوە دەچۆوە، بەبێ ئەوەی بەهیچ لایەکیدا لادات رێك دەچووە سەرێ. نەخشەی پێشووی زۆربەی خانووەکانی شاریش هەروابوو. پلیکانەکان دەپێشدا گوایە هەمووی خشتەرێژ بوون... بەڵام ئەو خشتانە هێندەیان چاڵ و چۆڵ و کەند و لەند تێکەوتبوو پیاوی دەویست بەبێ چرا بەوێدا تێپەڕێ و دەتەڵەو داوێیان نەکەوێت و ران و ملی نەشکێ. سەری دارو پەردوویان هێندە لێهاتبوونە دەرێ، هەر دەگەڵ کەمترین بێ ئاگاییە سەرپەنجەیان دەپەڕاندن- لە تەڵەی گورگان ترسناکتر بوون...

لە ئەسپی دابەزیم؛ لاقەکانم تەزیبوون- ماندووبووم- کاکە هۆمەر ئەسپەکەی گرت و بەبێ ئەوەی گوێ بداتە من بەرەو دەرکی ((سەرا))یەی قولاند: ((سۆفی ئەولکەریم، کاك سیامەند!)) و سەرقاڵی لێکردنەوەی زین و بەستنەوەی ئەسپەکان بوو لەسەر ئەو ئاخوڕانەی بەدیواریانەوە، هەڵنابوون. ئەسپەکان کەوتنە ئاودەردان و ئاخوڕ لستنەوێ- و من بەخۆو بەقابلەمەوە مامەوە؛ شەرمێون، و ترسەنۆك، کە چاوم دەگێڕان و سپێنەی چاوەکانم وەدەردێخستن و لەبنەوە چاودێریە دەوروبەران بووم، وەك کابرایەکی غەوارە، تا بەڵکە ئێ ئەوە خوایە یەکێك پەیدا بێت و فەرموویەکی بکا.

((ئەولکەریم!)) ئەوە دەنگی مستەفاخانیە. دوای یەك دوو چرکان: ((ئەوە بنیادەمێك لەوێ نییە؟... یەکێك بچێ، لەوانەیە میوان بێ)).



کەس ناچێ. ((گوتم ئەوە بنیادەمێك لەوێ نییە؟... با ئادەمییەك بێتەسەرێ!)) ساتەوەختێك تێدەپەڕێ، دیارە کەس ناچتە سەرێ، بەڵام وەك شتێکی وەك ئادەمیان بێتەخوارێ. خۆم وا پێشاندا کە گوایە خەریکی تەماشاکردنێ کێو و چۆمیم، ئەوە لەجێی خۆشمەوە خۆ دێنم و دەبەم بەڵکە ئێ لاق تەزینەکەم چاك ببێ، لەپشتەوەڕا گوێم لە دەنگی هاتنی پێیەکی بوو.

((کاکە هۆمەر هاتیەوە؟)).

((بەڵێ.... بۆ پێت خۆش بوونەیەمەوە؟)).

((نا)) بەخێرێیەوە، ماندوونەبی... گوتم زوو هاتییەوە)).

((ئیدی... لەرێیە باران باری، نەمانتوانی پشوێ بدەین. ئاغا لە ماڵێ نییە؟)).

((بەدی، لە دیوەخانێیە... ئەوە ئاغایە؟)).

((بەڵێ، بیبەسەرێ)).

باشە، ئەوەش بووە پێشوازی! هەستم بەناراحەتییە کرد، بەڵام هەرچۆنێك بوو ئەو هەستەم لە خۆم رەواندەوە: هاوڕێیەتی فەرمووی ناوێ- ئەویش ئەو هاوڕێیەتیەی مە! پێشوازی مانای نییە؛ ماڵێ هاوڕێی پیاوی، ماڵێ خودی پیاویە... دەو نێوەیدا بەهەرحاڵێکی بوو، بەیەك هەڵە- بەنێوچەوان دەدیوار کوتانێ بەردەمم- بەدوای سۆفی ئەولکەریمیدا بەپلیکانانـدا وەسەرکەوتم. ئاغا دەموتالاێ و خوێندنەوێدا نقوم ببوو؛ هەر کە منی دیت هەستا، و بەسەر سوڕمانێکەوە، گورجێکی هاتە دەمی دەرکێ. ((... ئای، ئەوە تۆ بووی!)) ئاااا، بەڵێ من بووم!...

بۆنی تریاك و دۆی ترشاو، ناو پلیکانەکان و ئەوناوەی داگرتبوو. دەرگایەکی بەرامبەر دەرکی دیوەخانێ داخرابوو- ئەوە دەرگای ناو ماڵێ بوو.

دانیشتینە چاك و چۆنیە. ئاوو دۆی ساردیان هێنا. ئەو بەخێرهێنانە زۆر لە پێشوازییە گەرم و گوڕ و هاوڕێیانەتر بوو، هەرچەندە دەگەڵ ئەو هەموو هەوڵ و تەقەللا و درێژدادڕییەی دەمکرد کەچی هەروەك شنەی شەماڵێکی تازە بەبیابان گەیشتوو بووم: لەپێشدا گەرم داهاتم، و ئینجا وەك لە بیابانی رەتبم شێوام- ئاخر گیانی ئادەمیزادیش وەك شەماڵ وایە؛ لە هەوراز و نشێو و

خۆپێکدادانێ کێو و بیابانەکانی ناخ، و ڕێپێوانە سۆزاوییەکاندا، هەمیشە و بەردەوام دەگۆڕاندایە...

ئێستا هەلێکم بۆ ڕەخساوە کە چاوێکی بەدیوە خانێدا بگێڕم. ژوورەکە گەورەبوو؛ لەوپەڕی لای سەرێییەوە پاشخانێك بوو کە دەرکەکەی دەچۆوە سەرپلیکانەکان. ئەو پاشخانە بەدەرکۆڵەیەکی چکۆڵەوە بەدیوەخانێوە پەیوەست بوو، و لەو دەرکۆڵەیرا سۆفی ئەولکەریم- یا ئەولکەریمی چاپەز- کورتەبنە و پانوپۆڕ و ریشێکی پان، و مەیلە و زەرد هەڵگەڕاوی وەك بنە مەنجەڵێکی کە چاك نەچوو بێتەجێ، چای دەدایە دەست سیامەندی، کە خزمەتکارانە راوەستا بوو، یانی بەگوێرەی خدەو نەریت، نەدەبوو لەلای ئاغای یان لەبەردەمی ویدا دانیشێ. سیامەند پیاڵە و ژێر پیاڵەی لەسەر کەشەفییەکی وەرشەوی چووك دادەنان کە تەنیا جێی پیاڵەو ژێر پیاڵەیەك و قەندانێکی زۆر چووکەڵەی وەك کەشەفییە وەرشەوەکە کەسێ کلۆقەندی زیاتر نەدەگرت، دەبۆوە، و لەسەرەخۆ بەهەنگاوی تێکەڵ و پێکەڵەوە دەیهێناو لەپێش میوانێی دادەنا. سینییە چکۆڵەکان و قەندانەکان لەسەرلێواری پێشەوەی دەرکۆڵەکەی بوون. سەماوەرەکە وەك لە دەرکۆڵەکەی پاشخانێوە دیاربوو پێدەچوو وەرشە و بێت- و گەورە. بەڵام خودی ژوورەکە- دە ژوورەکەشدا هیچ شوێنەوارێکی هەژاریە، وەك کە لە ناوچەکەدا ناسرابوو، وەبەرچاوان نەدەهات: بەڕەبوو، مافورێکی یەکپارچەی کۆنی رایەڵ بەدەرەوە راخرابوو. هەرچی هەبوو ئەوە هەبوو. سەماوەر گەورە بوو، مافوور گەورەبوو، بەڕەش هەر گەورە. کۆن بوون، بەڵام هەرهەبوون؛ نیشانەی سامانێکی کەونارابوون، و شوێنەواری کۆنینەش نەك هەر نیشانەی بێ ئیعتبارییە نین بەڵکە هەر بۆ خۆیان ئیعتیبارن. هەموو هەر سەربردەی پێشینیەییە و بەردەوامییەیان دەگێڕایەوە.

تاقێکی بەرین دە ژوورەکەیدا بوو، بەلادیواری بەری لای رۆژاوایەوە، بە پەردەیەکی رەش، و گوایەچنراو، و ریشووە دار کە رەنگ و رووی دار و گوڵ و غونچەکانی دەبن تۆزو خۆڵ و چڵکێدا ون ببوون. زۆربەی زۆری ریشووەکانی پێوە نەمابوون و هەڵوەریبوون؛ و ئاوێنەیەکی چوارچێوە داری رەنگ تێری بەسەرەوە کرابوو، کە راست بە مرۆڤێکی دەرمانداوکراوی بێهۆش دەچوو کە بۆ وەئاگا هێنانەوێی ئاویان لە دەموچاوی پڕاندبێ. تەواوی مینایەکەی دڵۆپە ئاوێك بوون کە رەنگی پشتەکەی خۆی بە شێوەیەکی وا ناشیرن پێشاندەدا هەرمەپرسە، و سەیرەکەشی



ئەوەبوو دەموچاوی ئادەمیزادی بە چەپ و چیڕی و خوارو خێچیەوە پێشان دەدایەوە، هەروەك لچ و لێوان لە بینەری بادا. هەرچەندە سەیریش نەبوو، چونکە تەوەری دیتنێی ئی سەد ساڵ لەمەوپێشتربوو. بەتەنیشت ئاوێنەکەوە سەعاتێکی چاڵمەی ژەنگاوی زەنگدار هەلاوەسرابوو، دیاربوو دەگەڵ ئاوێنەکەی سەرو ساخت و ئاشناو رۆشنایەتیەکی دێرینەیان هەیە و نەهەر تەنیا خوو بەڵکە رەنگ و بۆی ویشی گرتبوو. لەلای دیکەی تاقەکەوە چراتۆڕیەك (لۆکس)، نوێنەری ((شارستانیەتی تازە)) و هۆی خۆپێوەبادانێ، بەتۆڕێکی دڕاو و شووشەیەکی شکاو و دوکەڵاویەوە؛ کە بەلا تەنیشتێیەوە جێ ئیسپرتۆیەکی پێهەڵکردنێ کە هەر نەوتی تێدەکرا، و وەك تریاك کێشی پەڕپووت کە لەجێی تریاکێ سوتوێ بکێشێ هەڵاوەسرابوو. و سەرەنجام دیوانێکی چڵکنی حافز و لێو هەڵگەڕاوە، کە دەتگوت دەفتەری قەرزەکانی حاجی عەولای پێڵاو فرۆشە، دەگەڵ ئەو جیاوازیەدا کە ئەمەیان سەنتەری ئالوویری مێشەکزان بوو. لە نزیك تاقەکەوە خاولییەکی بچکۆلەی، گوایە سپی بەڵام پیس و چڵکن و ریشاڵ ریشاڵ، بەسینگێکیکەوە بە دیوارییەوە لە خاچ درابوو. دیاربوو کە تەرمی ویش لە تەرمی حەسەنەکی وەزیر لە ساڵێك و دوو ساڵان کەمتر بەدارێوە نەماوەتەوە. لە پەنا پەنجەرێکیدا جووتە چەکمەیەکی کالبوەوەی تۆز گرتووی لێبوو کە چەکمەی خان بوو، و لەسەرووی تاقەکەوە وێنەیەکی خان، دە چوارچێوەیەکی لەمەوپێش سپی و بەگوومێشێ داپۆشراو، کە ئەگەر لێی وردبووبایەوە لەبن لەکەو پیسیە شوشەی چوارچێوەکەیرا، لچ و لێوو گوپە هەڵامساوەکانی ئەو خانەی حازریت دەدۆزیەوە- بەروخسارێکی تابلێی راشکاوانە، و دەبیرەوە چووانەوە. لە پەراوێزی وێنەکەوە شیعرێکی بەناوی خەیامییەوە لێ نوسرابوو: ((ئەگەر نانێکی ئاردی گەنم و دوو مەن شەڕاب رانێك مەڕ دەبوو)).

ئەویدیشی دەبن چوارچێوەکەیدا وەك زۆربەی ئارەزووەکان دەبن بەسەرهات و کارەساتی ژیانێدا ون ببوو و سڕابۆوە. لەدوا هەموانەوە سەرینێکی زلەی وەك لولێنەی دێوان وەپاڵ لادیواری رۆژاوای ژوورێ، پەنا پەنجەرەیەوە درابوو، کە ئەوە هەرجێی خان بوو، و دەچۆوە سەربانێژە تەختە بەندەکەی جێ خەوی بەهاران.

ئەگەر کرمانج رێیان درابایە، ئەوە لەسەرهەمان مافوورە یەك تەختەکەی کە زوو، خانی خودالێخۆشبووی هەووەڵێ لە بارێ سەرەوە لەسەر ئەژنۆیان لەسەری دادەنیشت، دادەنیشتن یان

رادەوەستان. هەرچەندە بەرواڵەت کۆن و رایەڵی بەروپشتی وەدەرکەوتبوون دەگەڵ ئەوەشدا دانیشتنی لەسەرخۆشبوو. ئاتەشخانەی سەماوەرەکەی تەقیبوو. بەلاّم بەهەر کولە مەرگییەك بوو ئەرکی خۆی بە چزەچزەوە کە دوایە دەبووە ویزەویز و راست بە مۆسیقای پرسەی مردووان دەچوو بەکەمێك دواکەتنەوە- زۆر یاکەم- ئەنجام دەدا.

لەپێشدا تانیوەیان ئاو تێدەکرد، تا دەگەییە درزەکەی و کە دەستیشی دەکرد بە کوڵانێ ئەندازەکەیان دەشکاند و بێ گوێدانە چزەچزێی بێ بەزەییانە ئاویان وەسەردەگێرا و پڕیان دەکرد.

روخساری سەرتاپای ماڵەکە وەك چاوی منداڵە هەتیوان- منداڵی بێکەس- سکالای تێمان و بێ دەسەلاّتییەی بوو، و چەندین داستان و سەرگوزەشتەی پیس و پۆخڵی و چڵکنیەی بەسەر لێوە وشکەلاّتووەکانیەوە راوێچکەیان بوو. دیاربوو کە هێندەی گوتبوو و گوێیان نەدابوویە ئیدی وازی لە هات و هاوار و سکالاّیان هێنابوو. چاوەکانی هەموو جیقناوی و پیس و پەڵۆخی بوو.

روخساری تێکڕای پەنجەرەکان هەر بە روخساری مەستێکی تێهەڵدراو و شڕۆل دەچوو: هەموو لەشی هەر شوێنەواری جێ لێدانی رۆژگار بوو: هەموو جێیەکی هەر چەسپ و لەفافی برین پێچانێ بوو: کاغەز، سەرەتەختەی دەرپەڕیو، و پارچە مقەببا. بن میچ پڕ لەرەشیە دووکەڵێ؛ هەر چوارگۆشەی ژووری بەهێلانەو تەونی جاڵجاڵۆکان تەنراو، جا یا راوەستا و یا دەهاتوچوونێدا؛ حەسیرەکانی پشتی نیرگە جاڵجاڵۆکاوییەکانی بن میچی لە هەموو لایەکییەوە دوورو نزیك هەمووی دڕابوون و قەڵشی بوون. سەیربوو ئەوماڵە، هەروەك هەڵەیەکی مێژوویی بێت وابوو: نەمان و بەسەرچوونی قۆناغی نیمچە دەرەبەگایەتی دەسەردەمی شوانی و راووشکارێدا. —بەواتای هاورێی حیزبیش- سەردەمی بۆرژوازییەت لێرە لە چراتۆڕەکەی بەولاوە هەرچی نیشانەیەکی دیکە هەیە زۆر و کەم نەیبوو. هەویرێك بوو: هەرخۆی و هەوەسی خۆی... باشە ئەدی وەك ئاغا سلێمانی دەیگوت، ئەو دیمۆکراتبازییە لە کوێڕا هاتبوو؟ هەروای حەزدەکرد دیمۆکراتی بێ؟...

دەگەڵ ئەو بیرو خەیالاّنەدا تێك ئالاّبووم و بە شێوەیەکی پەرت و مێشکێکی بەتاڵەوە گوێم لە قسەکان و پێکەنینە ورگییەکەی مستەفاخانی راگرتبوو: هەرکاتێ کە لەدڵەوە پێکەنیبایە بە



((ورگ))ی پێدەکەنی: ورگی هەڵدەتەکاند، سەروچاوە نارێکەکەی بەشتێکی وەك پێکەنین و چاو و برۆگێڕانێوە سواغ دەدا و دەنگێکی لە گەروویەوە دێنا کە هەر راست دەتگوت ئەوە قاغوقوغی منداڵی شەش مانگانەیە. ئەو مۆسیقایەشی هەر لە فشاری بەرغەبابەیەوە و یا لەقورساییەویەوە بوو ((-قغغغ!)) بەلاّم ئەگەر پێکەنیبایە، ئیدی ئەوە هەرمایەی ئەوەی بوو پێی پێبکەنی، بن میچەکەی ژووریی وەلەرزە دێنا. یا کە دەپژمی، هەروەك لە بنکەیەکی هەڵدانێ مووشەکان بیت و ژمارەی پێچەوانەی مووشەك تەقاندنێ گەیبێتە سەر سفر و تۆ ئاگات لێنەبێ: لەپڕ دەتەقییەوەو دیوەخان دەلەریەوە و تۆ یەك بست لەجێی خۆتەوە بەرز دەبوویەوە؛ یا ئەو فنەی کە دەیکرد بێ گوێدانە هیچ جێ و رێ و شوێنێك، بەدەستە سڕە چڵکنەکەی کە لەبەر پشتێندیی دەردێناو بەبەر لوتیەوە دەگرت: ((پڕڕ!)) وەك ماتۆر سیکلی هۆندا. دەوددەمانەدا. چاوە قیچەکانی، کە پێکەنینیان تێدا شەپۆلی دەدا ترسناکتر دەبوون. بەو پێکەنینەی کە دەیکرد سەرنجی کەسی رانەدەکێشا.

گوێم بۆ پێکەنین و قاغوقوغەکەی هەڵخستبوو، کە لەپڕ کوریژگەیەکی پێنج شەش ساڵانە، خێراو دەستوبرد بەپێخواستی و پاژنە پێی قلێشاو قامکە گەورەی هەو کردوو، و دووچاوی زەقەوە هات لە تەنیشتیەوە دانیشت. کوڕەکەی بوو —حەسەن خان- کە لە کچە کرمانجان بوو. هەر کە دانیشت. سەری لەلاکەلەکەی ((بابەخان))یەوە سوی، و گوتی: ((بابەخان، ئەمشەو من ئەلەتریکەکەی هەڵدەکەم، ئێ؟)) و ویستی هەستێ و بەرەولای ئەلەتریکەکەوە بچێ، بابەخان گێڕایەوەو نەیهێشت. ئەلەتریك ئەلێکتریك بوو، و ئەلەکتریکەکەش هەر ئەو چراتۆڕیە- لۆکس- بوو.

بابەخان بەدەنگێکی زۆر لەسەرخۆوە، کە لەوی نەدەوەشایەوە، لەکاتێکدا کەسەرو ڕوو و روخساری ئازار و ناراحەتیە ئەو سەرو دەست و دەموچاو، و لاملە تۆزاوی و پەڵەسورانەی کوڕەکەی پێوەدیاربوو گوتی: ((باشە، چاك دانیشە... سلاّوت لە مامە گیانی کرد... بڵێ مامەگیان بەخێربێی- خۆ ئێمە بڕیارمان وابوو تۆ کوڕێکی چاك و چەلەنگ بی!...)).

کوڕیژگەکە سەری لەکەلەکەی بابەخانی کردەوە و سەرنجێکی قیزەونانەی، هەرچەندە مندالانەش، بەمەشقی خان بابایەتییەوە تێگرتم و گوتی: ((ئەوە مامەگیان نییە. دایە خانم گوتی ئەوە بەچکە عەجەمە!...)) و سەری بەکەلەکەی بابەخانی کردەوەو بەدوو دڵی و گومانەوە تێم راما.

بابەخان دەستەپاچە بوو؛ چاوەکانی زەق کردنەوە و بەدەنگێکی فەرمانانە و خێرایانەوە گوتی: ((نا، نا! گوتم مامەیە ئیدی، بڵێ، دەی بڵێ مامە حوسێن بەخێربێی)). ئەوجا ئاوازی دەنگەکەی نزمترکردەوە و لەشێوە فەرمانییەکەی داشکاندەوە و درێژەی دایە: ((ئەگەر دەزانی چ دایە خانمێکی چاکی هەیە... ئەگەر ئاقڵ بی کە چوومە شاری دەتبەمە ماڵێ وان- باشە؟)) منداڵەکە بێ گویدانە قسەکانی وی هەر بەهەمان جوولە و دەنگی بزۆزانەیەوە گوتی: ((بابەخان، بابەخان- گوێ بگرە بزانە دەڵێم چی!)).

((بڵێ!)).

منداڵەکە لەبنەوە، بەڵام هەر بەوجووڵە و شەیتانییەیەوە، گوتی: ((دەڵێم... دەڵێم، کاکە سیامەند قدیلکەی پوورە تەلایەیدا!)).

من چاوی خۆم بەردانەوە، وام پێشاندا کە جوانییە چیاو بەندەنێ رایکێشاوم. گوتم ((ئاغا، ئەو کێوەش ناوی هەیە؟)) مستەفاخان دیاربوو کە رەنگ و رووی هاتبوونەوە سەرەخۆ، لەخودای دەویست گوتی: ((بەڵێ، ناوی پیرمحەممەدە... لە هەموو جێیەکی ئەو پیر و پاتالانە هەن... ئەوانە تا زیندوون گیانی خەڵکی داگیردەکەن، کاتێ کە مردیشن ئەوجا کێوەکان- بەڵێ)) مەبەستی پیاو چاك و مشایەخان بوو. دوایە رووی کردەوە منداڵەکە: ((هەستە، هەستە برۆ دەست و دەموچاوت بشۆ)). بانگی کرد: ((کێ لەوێیە؟))، کەوەلام نەبوو دووبارەی کردەوە: ((ئەوە زەلامێکی لێ نییە؟)). بەڵام منداڵەکە هەر وازی نەدەهێنا، ناراحەتی ئەوەی بوو کە گومانیان لە قسە و راستگۆییەکەی کردبێت بۆیە هەرپێی دادەگرت: ((بابەخان، بە خودای بۆ خۆم دیتم —دە دالانێدا- قدیلکەی دا- ئائاوا!)) و دەستی برد قدیلکەی بابەخانی بدات. بابەخان لە دەستی دایەوە و گوتی: ((گوتم هەستە برۆ دەموچاوت بشۆ- ئێ!)) و هەروا درێژەیدایە: ((هەردەڵێی ئەو منداڵە کرمانجانەی...))و کە بەهەڵەکەی خۆی زانی سوورهەڵگەڕا.



منداڵە هەروا گێژو وێژ تێمابوو؛ زەلامێك نەبوو؛ منیش چووبوومە کێوی؛ ناچارخان ئەو زەحمەتەی دایە بەرخۆی، راستبۆوە، دەستی منداڵەکەی گرت و رۆیی. دەنگی کرانەوێی دەرکەی نێو ماڵێ هات، دوابەدوای وی دەنگی تێکەڵ و پێکەڵ و لەسەرخۆی واهات کە نیشانەی تۆفانێکی مام ناوەندی پێوە بوو...

تەلاخانم خوشکی بوو؛ دایە خانم دایکی بوو کە ژن خوشکی ئاغای سلێمانی بوو؛ کاکە سیامەند ئەو خزمەتکارە بوو کە راوەستابوو، لاوێکی توندوتۆڵ و رەنگ و رووجوان بوو: کەڵەگەت، چاو و برۆ رەش، دەموچاو رەقەڵە پێستێکی رەنگ تاریك و لووتێکی رێك و چەناگە مەیلەو باریك و تازە دەهات خەتی سمێڵێی دەدا. جلوبەرگ و سەر و وەزعی بەگوێرەی کەسانی دییەوە تابڵێی پۆشتە و پەرداخ و پاکوخاوێن و رێك و پێك بوو، بۆ خۆشی زۆر بە ئەدەب. بەڵام واپێدەچوو کە دیمۆکراسییەکەی خانی سەرەنجامێکی وەك پێویستی بەدەستەوە نەدابێ. دوایەش دیتم کە هیچ کەسێك خۆی بە بەرپرسیاری ئەنجامدانی هیچ کارێکی نازانێ: بەرپرسایەتییەکان دە دیمۆکراسییەدا ون ببوون و بۆ دیتنەوەشیان خان ناچار بوو بەلای دیکتاتۆریەتیەیدا بشکێنێتەوە.

من بەلای خۆمەوە لە ستایشی جوانی و سروشتی دەوروبەرەکە و بەیانی چاکییەکانی کوڕی ئاغای سلێمانی و گێڕانەوەی گەمە و گاڵتەکانی باوکی کەبێ ناوهێنان پڕبوون لە ئاماژە بۆ خودی وی (مستەفا خان) و هەموو دیمۆکراسییەکانی دی، و دادوسکالا لە دەست ماندوویەتییە رێیە بەولاوە هیچی دیکەم نەبوو بیڵێم.

بەڵام ئەو بەو وەزعەی ماڵ و ژیانەیەوە، حەزی لە بیستنی بیروڕاو بۆچوونی بەرزبوو کە لە سروشتی ئەو بیروڕایانەوە و بەرێنماییەوانەوە دێیەکەی بکاتە باغچەیەکی جوانی مندالان: ((سەوزاییەکان پێخوست نەکەین- چیمەن جوانە، تێکی نەدەین و خراپی نەکەین- پاشەرۆکێ دە تەنەکەی خۆڵێ کەین!)) بە واتای ئاغای سلێمانی چۆخ یاخچی[1]!.

ماڵ و گوندەکە بۆماوەی نیو سەعاتێك یا زیاتر وەخۆهاتنەوە. دەنگی دوور و نزیکان وای پێشاندەدا. دانیشتوانی ماڵێ خانی، وەك جرۆجانەوەری ئالوودە بە دوکەڵی تریاکێ کە هەر

[1] چۆخ یاخچی: چۆك ایدر: زۆر چاك و بەجێیە- وەرگێر-.

لەسەرەتای رۆژی چوونە سەفەری خاوەن مالّییەوە، کتوپڕ دەکەونە بێ ئارامی و جموجوولّەوە: گاگەل و بەرغەلیان هێنابوونەوە نێو گوندی- پەز شەوانە لە کێوی دەمایەوە. دەنگی تەق و تۆقی سەتلّەشیری بێریان و بۆنی گاوگۆل و زاوەماك و کاریلە و بەرخان ژوورەکەی پڕکرد... روناکایی وردە وردە رەنگی دەچۆوە و لە بەرامبەر هێرشی سێبەرێ بەرەو پشت کێوەکان دەبۆوەو خۆی دەشاردەوە.

درەنگانێك بوو کە ((ئەلەتریك)) یان هەلّکرد- خان بۆخۆی پێیکرد، زۆر بەزەحمەتی هەلّکرد. مانگێکی بچکۆلانە بوو کە بۆ ((کرمانجەکان))ی کڕیبوو، تا دەمانگی ئاسمانێ بگەیەنن کە نابێ هێندە پۆزلێدا و چیدی هێندە خۆ هەلّشەنگێنێ. هەر کە مانگ چاوی بەو کارەی کەوت لەژوورێ تووڕە بوو و ئەوەندە روناکییەی ژوورێشی بۆ شوانکاران بردەوە تا خۆیانی پێ سەر گەرم کەن و ئاوری بکەنەوە و لە دەورەی دانیشن و جڕو جانەوەر و دڕەندەی کێویش دە خۆبگەن و لەمێگەلێ نزیك نەبنەوە. نانیان هێنا. برسی بووم، نانێکی شاهانە بوو: پلاّوێ بە گۆشت مریشکی، بەرۆنی خۆ ولاّتی کە هەربۆن و بەرامەکەی پیاوی مەستدەکرد. هەر لە زووەوە ئەو بۆنە کاسی کردبووم. بەتایبەتی بالّ و ملە قۆتەم هەلّنابوون بیانخۆم، چونکە دەمهەویست راستی و ناڕاستییە قسەکانی ئاغای سلێمانی تاقیکەمەوە. هەر کە ملەقۆتەکەم تاودایە، وەك مارێکم ئامباز بووبێت و بیەوێ پێوەمدا، بەدەستە پاچەییەکەوە و بەچاوێکی دەرپەڕیوەوە، و بەدەنگێکی تابلّێی تووڕەوە گوتی: ((نا، نا!)).

بەسەر سوڕمانێکەوە روانیمێ. بێ ئەوەی وەلاّمی تەماشاکردنەکەم بداتەوە هێرشی بۆ سینگە مریشکەکە برد. گەرم بوو؛ بە پاشدا هاتەوە. دانیشت و دووبارە دەخۆی نووسایەوە: پەنجەکانی لستنەوە، هەر بەو پەنجە لێسراوانەشەوە سینگەکەی دوولەت کرد و نیوەی لەسەر تۆقەلّەی برنجەکە بەلای منەوە دانا، و دووبارە پەنجەکانی لستنەوە. هەردووکمان دە بەلەمێکیماندا دەخوارد- بەدەست ئەو لەو دیویەوەیڕا دەر دەدا و من لە دیوەکەی دیڕا، تا سەرەنجام هێلّی سەرسنوور بشکێ و کەوشەن ببەزێ. بەلاّم ئەمجارەیان هێلّی سەنگەرەکانی سنوور نەشکان. بێ ئەوەی هیچ بلّێم سەیرێکیم کرد- هیچ نەدەگوترا، چونکە هەرچۆنێکی بوو ئەو کارەی هەر بەنیەتی چاکەوە کرد، بەلاّم بۆ ئەوەی دەرسێکی دادەم هەرچەندە زۆریش برسی بووم و خواردنەکەش زۆر خۆشبوو دەستم هەلّگرت و کەوتمە نان و ماست خواردنێ. پێی ناخۆش نەبوو،



چونکە لە دەرس وەرگرتنێ ببۆوە و لە تەقەی هەلاّتبوو، و لەراستیدا پێدەچوو دەرسی خۆمم دادابێ. گوتی بەلّێ، سەیری بەوەی دێت کە هەرکاتێ شارییەك دێتە گوندی لەنان و ماست و تەماتە و دۆی بەولاوە حەز لە هیچی دیکە ناکەن... بەلّێ، دیارە ئەوان چاکتری تێگەیون، یا رەنگە ئێمە لەبەر زۆریانیان کە هەمیشە لەبەر دەستانن لێیان وەڕەز بووبین. گوتم بەلّێ، هەروایە کە دەفەرموون. بەلاّم ئەوجار بۆ برسی نەبوونێ، ئەو دووسێ رۆژانەی کە لەوێ بووم هەر کە نانی ئێوارە و نیوەڕۆیان هێنابایە ئەگەر هەمەجۆربایە- کە زۆربەی ژەمەکان هەرواشبوو- لەپێشدا پرسم پێدەکرد ئەوجا دەچوومە پێشێ و دەستمپێدەکرد و قامکم بەولایاندا دەگێڕا، چونکە دیاربوو کە بڕیاری داوە هیچ دەرسێکی وەرنەگرێ.

چای دوای نانیشمان خواردەوە. دیسانەوە بانگی کرد: ((کێ لەوێیە؟... ئەوە زەلامێکی لێ نییە؟)) کاکە سیامەند هات. مستەفاخان گوتی: ((بە خانمێ (داکی) بلّێ، حوسێناغا دەیانەوێ بێنە خزمەتیان و سلاّویان عەرزکەن)). چاوێکیشی لەمن داگرت، کە یانی چ بکەین، خدەونەرێتی رزیو و کۆنە، دەبێ خۆی بۆ راگرین، تاوەختی...

سیامەند هاتەوە و مژدەی هێنا کە خانم ئامادەیە. بەلاّم مستەفاخان چەند ساتێکانی خۆ وەخراند: پێموابێ دەیویست هەلێك بڕەخسێنێ تاشمەکی نێومالّێ هەلّدەوێژێرن و خۆ خڕدەکەنەوە و پەنجەران دەخەنە سەرپشتێ تا هەوا تۆزێك بگۆڕێ. بەوجۆرەی کە دوایە زانیم تومەز بەدرێژاییە رۆژێ ئەوە دامودەزگای تریاکی خانمێ لە گۆڕێیە.

دووسێ خولەك تێپەڕین. دەونێوەیدا+ بوخچۆکەکەم کردەوە، قابلەمەکەم لە پەنا پەنجەرەکەیەوە دانا و ((دیاری))یەکانی داییم- کیسە حەمام و شڕ و شالاّتەکانی دیکەشم- بەشێوەیەکی گونجاو و رێکوپێك هەردەو بوخچەیدا پێچانەوە و خۆم ئامادەکرد و چووین.

ناومالّێش وێنەیەکی دەقاو دەقی خانووی دەرێ بوو، ئەوەندە نەبێ کە لە جیاتی پاشخانێ سەرەوە، پەنجەرەیەکی گەورە بوو. لەجیاتیان لەوێ پاشخان کەوتبووە بەری لای خوارێ: ژوورەکەیان تا ئەندازەی تاقچەکەی ((دیوەخانێ)) تیغە دیوارێك پێوە هەلّنابوو و لەوێیان ژوورێك بۆ تەلاّخانمێ لێ دابڕیبوو کە بە دەرگایەکی دەهاتەوە سەر ئەو ژوورەی نێومالّێ. دەنگە دەنگ و سرتەسرت و کەش و فشی قسان لەوێڕا دەبیسرا.

ژوورێکی لە دیوەخانێ پەرت و بلاۆتر بوو، جگە لە کەمێك بۆ گولاۆ کە دەگەڵ بۆن تریاك و بۆن خەو و بۆن ئارەقەی تێکەلاۆ ببوون.

مستەفاخان ناساندمی: دۆستەکەی حوسێناغا، کوڕێکی چاك، ڕێکوپێك، داك و بابێکی باش. من بەروخسارێکەوە کە هیچ شایستەییەکی نەبوو وەك قوتابییەکی پەڕپوت، ڕاوەستابووم، لە کاتێکدا کە خانم وەك مریشکە کورکێ ناو سەبەتەی سەرهێلکان لە ناوەڕاستی بازنەی چینەکانی دامێنی کراسەکەیەوە کە بە هەرچوار دەورییەوە پان ببۆوە و دانیشتبوو، بچکۆلانە، وەك سەلکەتووری چرچ و سیسەلۆکی سەرگەلاێ گوڵی لەیل و پەڕ (نیلوفر)ی شین، سەرێکی زلە و پرچ خەناوی کە خەتی نێوەڕاستێی سەری، مووەکانی لەبنەوەڕا هەموو سپی دیاربوون، و دەموچاو و پێڵوو هەلاۆمساو و چاو گەورە و بەقوڵداچوو، کە هەرکاتێ بەدیارەوە بان دەتگوت ئەستێرەن و دەشەوێکی سارد و سەرمادا جریوەیانە: دەموچاو خڕێکی سپی و ئێستا زەرد هەڵگەڕاو و تەڵخ؛ لووتی وەك لووتی خوشکەکەی ژنێ ئاغای سلێمانی، کورت بوو، بەسەری لووتی دەدواو کاتێ کە قسەی نەکردبایە وەك نوستبێ وابوو، پێڵووەکانی لەسەریەك دادەنان و دەستی بەمش و مۆشێ دەکرد.

لەجێی خۆی نەبزووت، منیش هەرچاوەڕێی ئەوەم نەدەکرد. بێ ئەوەی کەسەنتەری خۆی تێکداو بازنەی دانیشتنەکەی بشکێنێ بەدەستووری ناوچەکە بەخێرهاتنی کردم، ئەویش بەو گەرموگوڕیەوە نا، کە لە ژنانی شاریم دیبوو، و گوتی کە دانیشم. هەروا لەخوارێوە، تۆزێك لەکەوشان سەروترەوە دانیشتم. مستەفاخانیش هات و لەتەنیشتمەوە دانیشت. دەی باشە، دایی چۆنە؟ خوشکۆڵە چۆنە؟ باب چۆنە؟.

هەموویان چاك بوون، سلاۆیان هەبوو؛ بۆخۆم نەبێ کە ئارەقەم دەردابوو و هیچم نەبوو بیلێم. کە مستەفاخان منی وادیت بوخچەکەی بەرەو لای خانمێوە پاڵ پێوەنا و بردیە بەردەمی:

((داکێ حوسێناغای، دیارییان ناردووە)).

((وای —زۆر سوپاس- ئەو زەحمەتەیان بۆکێشاوە- ئەو زەحمەتەم پێخۆش نەبوو)).



بوخچەکەی کردەوە: ((چ چوانە! ئەو هەموو زەحمەتە بۆ... نەدەبوایە وایان کردبایە، خۆ ئێمە چاومان لەشتی وانەبوو)). بەدەنگێکی وای ئەو قسانە دەکردن کە دایی لەو دیوی سنورەوە گومانێ پەیداکا.

ئاماژەیەکی سیامەندی کرد. سیامەند چووە پێشێ. خانم دەستە کلیلەیەکی لەبەرۆکی کلۆجەکەی کردەوە، گوتی بیداتە تەلاۆخانمێ. سرتەسرتێك لەودیو تیغە دیوارەکەوە هات؛ تەلاۆخانم بە کەش و فش و خۆ بادانێکەوە هاتەژوورێ، لەبن لێوانەوە نازانم داخوا سلاۆی کرد یان نا. بێ ئەوەی سەیری کەس بکات سندووقۆڵەیەکی لەنێو تاقێ کردەوە؛ چەند دانە شەکرلەمەیەکی لێ دەرێنا. شەکر لەمەکانی لەسەر ئەو ژێرپیالەی دانان کە دەگەڵەخۆی هێنابوو و ژێرپیالەکەی دایە دەست سیامەندی. سیامەندیش بە ئاماژەی خانمێ ژێرپیالەکەی لەبەردەمی من دانا: ((بخۆ... ئی مالێین- لەوانەیە نەگەنە شەکرلەمەی شاری، بەلاۆم ئەوە ساغە، ئی مالێیە...)) مش، موش. هەردەو دەمیدا قەرەواشەکە لەژوورێ تەلاۆخانمێڕا چای هێنابوو و وەسیامەندی دابوو و سیامەندیش پیالە چایەکانی لەبەردەمی دانابووین. ژێرپیالەی شەکر لەمەکانم بەرەولای مستەفاخانییەوە پاڵ پێوەنا، مستەفاخان بۆلای منی هێنانەوە، و دووبارە من... تا سەرەنجام، لەنێوەڕاستێماندا جێگیربوو. مستەفاخان بۆئەوەی قۆرغێ بشکێنێ یەکێکی لە شەکرلەمەکان هەڵگرت و بەخڕی دە زاری نا: ئارد و وردە شەکرلەمەی بەسەریەخە و بەرۆکیدا هەڵوەری؛ بەهێندێك قاغ و قوغەوە، تەکاندنی. من یەکێکم دوولەت کرد، دەستم بەبنییەوە گرت، و بۆ زارمم برد، بەلاۆم ئەو ئارد و وردە شەکرلەمەی بەسەریەخەو بەرۆکی مندا هەڵوەرین زۆر لەوەی زیاتربوو کە بەسەرسینگ و بەرۆکی ویدا هەڵوەریبوو. خۆشبەختانە مشەمشی خانمێ مڵچەمڵچ و قوڵتەقوڵتی قوتدانێ قوڕگی مەی شاردبۆوە.

((باشە کوڕەکە، لە شاری چ باسە؟)).

((پاشماوەی شەکرلەمەکەی زاریم بە گورجی ڕۆهێشت: ((سەلامەتیتان)).

((بیستوومە هاتوچۆی مالە خوشکێم زۆر دەکەی- چاکە، منداڵەکانی باشن، سەلامەتن؟)).

((هەموویان چاك بوون، سلاۆیان هەبوو)).

((کوڕەکەی- هێشتا نەگەڕاوەتەوە؟)).

((کوڕەکەی ئاغای سلێمانی دەفەرموون؟)).

((بەڵێ)).

((زۆردەمێکە، گەڕاوەتەوە)).

((ئەوەی دەزانم... مەبەستم تارانە... هێشتا نەگەڕاوەتەوە تارانێ؟)).

((نەخێر، پێموابێ کۆتاییە هاوینێ بگەڕێتەوە)).

مستەفاخان گوتی: ((لەوانەیە لەو یەك دوو هەفتانەدا بێت و سەرێکمان لێدات)).

((ئا... ئەوە دەبێ تاکەی هەروا لە تارانێ بخوێنێ... ئەوە ئەو خوێندنە بوو بەچی... کەنگێ تەواو دەبێ!؟)) رووی ئەم قسەیە لەکەس نەبوو. مستەفاخان تەماشایەکی منی کرد. گوتم: ((پێموابێ تەواو بووە- ئەمساڵ دوا ساڵی بوو)).

خانم گوتی: ((دوایەش خوا دەزانێ دەبێ بەچی؟ ئەرێ دەبێتە هیچ؟)).

مستەفا خان بەدەنگێکییەوە کە بۆنی لاقرتێ و گاڵتە جاڕییەی لێدەهات بەدەنگێکی بەرزەوە گوتی:

((دەڵێن دەبێتە دادوەر- سەرۆکی دادگا- ئاخر حقوقی خوێندووە...)).

((حقوق؟ بای چەندی حقوق[٢]؟)).

((نا دایە خانم، حقوق یانی خوێندنی دادگا، تابێتە دادستان)).

((ها... دالستان!- وەك هەموو ئەو مەئمورانەیە؟)).

((نا، دایە خانم، دادستان داواکاری گشتییە... حوکمی قاچاغچی و ئەو جۆرە شتانە دەدا)).

((وای، خوانەکا! —ئەوە چۆنیان هێشتووە ئەوکارەی رەچاوکا- ئەوە دەست و پێ زنجیرکەرە.

(٢) حقوق: ئەم وشەیە لێرە بەمانای ((مووچە)) هاتووە... چونکە لە زمانی فارسیدا ((حقوق ماهیانە)) مووچەی مانگانەیە بۆیە منیش وشەکەم هەروەك خۆی بەکارهێنایەوە تا دیالۆگەکە تێك نەچێ. —وەرگێڕ-.



((مستەفاخان پێکەنی: ((نا، دایە خانم، ئەوە کارێکی گرنگە... دادستان لە دادوەر و پەخشداری زۆر گەورەترە)).

دایە خانم گوتی: ((هاا!)) و چاوەکانی مووشە کردنەوە ((هاا !)).

مش — موش.

((راستە دەڵێن دەیانەوێ کارخانەی کارەبای بۆ شاری بێنن؟)).

((کارەبا!؟)).

مستەفا خان گوتی: ((کارخانەی کارەبایان زۆر دەمێکە هێناوە)).

((نا-!... بەڕاست؟)).

((بەڵێ، زۆر دەمێکە)).

مش موش.

((راستە دەڵێن ئاغا لۆری کڕیوە؟)).

((نەخێر، لۆری نییە- پاسە)).

((پاس؟)) سەیرێکی کوڕەکەی کرد. مش موش.

کوڕەکەی گوتی: ((پاس، ئەوەی ئەوجارە دیتت- ئوتومبێلی نەفەران- ئەوەی خەڵکی دەگوازێتەوە)).

((هاا)) وەك شتێکی پێکەنیناوی و داخاوی، کە نەسروڵلاّ خانیش (ئاغای سلێمانی) دوای ئەو هەمووەی بووە میرزا عەولاّی قەتارچی و خەڵکی دێنێ و دەبا!.

مش- موش.

((دایە خانم حوسێناغا ماندووە؛ ئەگەر رێ بدەن بچێ پشوویەك بدات و وەحەسێ)).

دایەخانم زۆر بەزەحمەتێکەوە پێڵووەکانی لێککردنەوە: ((ئەو زەحمەتەی نەدەویست. پێمان ناخۆشە ئەو زەحمەتەتان کێشاوە. ئینشاڵلاّ ئەو چەند رۆژانەی لێرەیە خۆشی لێ رادەبرێ))

مش، موش. ئەو هەروا لە سەنتەری خۆیدا مایەوە و ئێمە هەستاین و هاتینەوە دیوەخانێ؛ چرا تۆڕەکەی دەگەڵە خۆیان هێنابوو بردمانەوە- و تا سێ چوار سەعاتان ئاییسا.

مش موش!.

هێندە ماندووبووم، لە ماندوویەتیانم خەولێنەدەکەوت. جێیان بۆ لەلای پەنجەرەی خوارێ راخستبووم. مانگی چەند شەوە هەڵکشابوو و لێفە رەنگ شیرییەکەشی بەسەرکێویدا هەڵکێشابوو؛ دەگەڵ ئەو هەموو پەلاڵەی کراسی خەوێشدا، کەچی کێوەکە لەبن ئەو لێفەیڕا هەردیاربوو. بەپێچەوانەی شار و شەوە تاریکەکانی شارییەوە، لەودیوی هیچ پەنجەرێکیڕا شەوقی تاك و تەرای چرایەکی کە وەك منداڵی بن لێفەی هار و هاجی و شەیتانییە بکەن، دیارنەبوو.

کێو بێدەنگ بوو؛ دەنگی خوڕەی ئاوێ دەهات، و هەرچەندە مانگەشەویش بوو و هیچ ترسێکی تاریکییەیش نەبوو دەگەڵ ئەوەشدا وا هەستدەکرا کە گوند و رووبارەکە خۆ بۆ باوەشی کێوی دەکوتن. دە حەسار و ژێرخانێدا دەنگی جموجۆڵی لەسەرەخۆی کچە قەرەواشەکە دەهات کە هەروا خەریکی جێبەجێکردنی کاروباری ماڵییە و بەجێگۆڕکێ سەتڵە شیرانەوە مژوولە. سەگ لە حەپە نەدەکەوتن؛ دەنگی بلوێری شوانان لە دوورەوە دەگەڵ شنەی شەماڵی، پەیامی مێگەل و سەلامەتییەوانی بەگوندی رادەگەیاند.

بێجگە لەمن دیوەخان میوانی دیشی لێبوون: مشك و سیسرکە، و دووپشیلە، کە جاری وابوو پێکەوە و زۆرجارانیش تاك و تەرا سەرێکیان بەژووورێدا دەگرت و ماوەیەك هەستیان رادەگرت؛ بەلاَم هۆشیان زیاتر بەلای ئەو میوانانەی دیکەی پشت حەسیرەکانەوە بوو کە دەهاتن و دەچوون و جووڵەجووڵیان بوو. هەروەك یەکێکی کە دەمانگ و رۆژگێرانێوە رامێنێ، بێ ئارام و تووڕە لووتیان بەهەواوە بوو بەڵکە ئێ ئەوە خوایە، لەو سەرەوە خوا شتێکی بنێرێ. ماوەیەك دەمانەوە، بەروخسارێکی تووڕە، و دوایەش بە پەرێشانییەوە دەکەوتنە پرخەی خەوی شیرینەوە. دوای تاوێك دەهاتنەوە؛ بێ شەرم و شکۆ بەسەر سەرینەکەدا زۆر بە سپاییەوە —تێدەپەڕین- و دەکەوتنەوە دەحەوا هەڵڕوانینەوێ. جاری وابوو سیسرکێکیان لە ناوەڕاستی ژوورێ یا بەقەدی دیوارییەوە دەدیتەوە و چەپۆکێکیان پێدا دەدا، هەروەك چۆن بۆ خۆمان سیسرکان بەلینگە کەوشێ دەکوژین ئاوا. و ئەو کارەشیان زۆر بەکاوەخۆ ئەنجام دەدا: لینگە کەوشی چەپۆکانیان



دوو سێ جار بەسەریدا دەدان و بەوردیەوە دە ئەنجامی کارەکەیانەوە رادەمان: ئەگەر کارەکەیان نەیگرتبایە ئەوە لینگە چەپۆکێکی دیکەیان بلند دەکرد و وەك مە، کە دە دڵی خۆماندا لەبەرگیان سەختییە ئەو جانەوەرانە جنێومان دەدا، پێدەچوو ئەوانیش لەبەر وەتەنگ هاتنێ و گیان بەدەستەوە نەدانێیان وەك مە بکەن. کە لە جووڵە لێبڕانێ گیانلەبەرەش دڵنیابانایە، ئیدی ئەوە لێیان دەدا و دەڕۆیشتن، بەلاَم هێشتا دووسێ هەنگاو بەولا ترەوە نەدەچوون دەهاتنەوە تابزانن داخوا دەجووڵێنەوە یان نا. خۆ ئەگەر جوولاَبانایەوە ئەوە یەك دوو چەپۆکی دیکەی دیشیان پێدا دەدانەوە.

خەوم لێنەدەکەوت، جایان لەبەر ماندوویەتیان یان لەبەروەی جێم لێ گۆڕا بوو.

ماوەیەکی دوورودرێژم بە تەماشاکردنێ مانگێوە رابوارد؛ تەپۆ (پێشکە) حەشری دەکرد... دەنگە دەنگێکی نادیار لە دالانێوە سەرنجی راکێشام، تیشکێك کە هەر دەدالانێدا دەهات و دەرکێك کە لەسەرەخۆ دەکرایەوە و دادەخرایەوە، ئەوەی پێشاندەدا کە ناوماڵێ هێشتا نەنوستوون.

دەنگی مستەفا خانم دەبیست. ئەوق مام. راستبوومەوە و دەگەڵ راستبوونەوێمدا ئەو جامە ئاوەی کە لەسەرلێوی پەنجەرەکەیان دانابوو بەسەر سەرینەکەمدا وەرگێڕا. چاك بوو بەسەر دۆشەگەکەیدا نەرژا- دەنا ئابرووم دەچوو. لەپڕ ئەوەم بەبیرداهات باشە ئەگەر پیاو وەك دەڵێن، تەنگاو بوو چی؟ هەر راست هەستی ((تەنگاوی))یەم کرد. بەلاَم ئەو خۆتێهەڵکردنە چاك بوو. خۆم گەیاندە لای دەرکێ؛ دەرکەکە رزیو و لەگرێژەنە چووبوو و تەرمەکەیان بەلادیوارێوە هەڵپەسارد بوو. ئێستا ئەگەر هەستم راگرتبایە دەنگەکانی دیوی نێو ماڵێم هەموو بەچاکی دەبیستن- گوێم هەڵخست.

((من ناڵێم نەسووتێ...)) پاش چەند ساتەوەختێك، هەروا بەقەدراییە چوارپێنج مشە مشانی کەوتە نێوانێ: ((دڵی منیش دەسووتێ...)) ئای، دڵ! ((گوناهن... بێچارەن. باشە، ئیدی ئەوەندە بەسە... ئێستا تۆ هەر پێبکەنە...)) ورگە پێکەنینەکەی مستەفاخانم دەتاریکییەدا دەدیت و هەستی قاغ و قوغەکەیم دەکرد ((... بێچارەن... بەلاَم ئیدی ئەوە جودایە... تۆ دەگەڵ کۆمەڵێك لاتولووت هەستی و دانیشی... تۆ کوڕی محەممەد خانت پێدەڵێن... دەگەڵ کوڕی نەسروڵلاَ خانی (ئاغای سلێمانی)دا جودای... پێ مەکەنە- چی چی من دەڵێی

گۆڕنەتەڵەم؟ دایکم بەدایکی یا بابم بە بابی، یا هەربۆخۆم بەوی دەچم؟...)) نەمزانی مستەفاخان چی گوت. دایکی گوتی: ((نا، لە خۆڕا بۆی مەپاڕێوە... بۆ خۆم دەزانم دەڵێم چی... تۆش هەردەزانی...)) ئەوە، مش موش ((هەمووی گوناهی کوڕی ئەو ژنە کرمانجەیە...)) کە دیسانەوە مش موش و قاغ و قوغ... ((هاوڕێی بۆ دۆزیویەوە، ئەویش کوڕی پینەدۆزی!))...

ئەوەش باشە، ئەوە دەخۆشمان گەیشتین! خۆ ئەگەر ئەو رستەیەی دواییشی نەگوتبایە هەر دیاربوو: کاتێ کە کوڕی نەسروڵلاخان (ئاغای سلێمانی)ی وابێ ئیدی ئەوەکاری ئێمە و مانان دیارە! بەناراحەتییەوە هاتمەوە سەرجێی- چارە چ بوو؟- درێژبوومەوە. ئاغای سلێمانی راستی دەکرد کە دەیگوت: مێژووی بنەماڵەیەك یاخانەدانێکی، شتێکی زۆر بەپەناو پێچ و گرێ و گۆڵ و نهێنییە. ئەفسانە مێژووە نەنوسراوەکانیش رۆژ بەرۆژ و سەعات بەسەعات ئەو کەلێن و کەلەبەرانە زیاتر دەکەن. هەر ئەو ئەفسانانە کەسانی بوودەڵە و هیچ و پووچ و چووکەڵە دەکەنە دێو و درنجی وا، کە ئادەمیزاد هەرچەندێکی گەورە و گران و بەقەد و بالاش بێت نەگاتە نیوەی- قەتیش ناگا، چونکە ئەوانە ئەفسانەن. باو و باپیرانیش واکەوتوونەتە ناو تریفەی ئەو گەورەییەوە کە دەستی هیچ کەسێکیان ناگاتێ، هەر کە منداڵ هاتە سەردنیایە ئیدی چاو و گوێی بەو ئەفسانانەوە دەپشکوێ و دەکرێتەوە؛ ژنە قەرەواش ئەو ئەفسانانە دەبیسن و کلك و گوێ و شاخ و باڵی دیکەی لێدەروێنن، ئەوجا بەردەوام دەگوێی ئەو مندالانەیدا دووبارە دەکەنەوە و رایدەکێشنە ناو دنیایەکی دیکەی واوە کە زۆر ئەستەمە جارێکی دیکە رزگار بێت و لێی بێتەوەدەرێ- مستەفاخانێکی وای لێ دروستدەکەن کە هەر بە خەیاڵ بەناو دنیای راستیدا هەنگاو دەنێ و هێندە دەخەیاڵەکەی خۆیدا قووڵ دەبێتەوە و ون دەبێ کە هەرگیز راستییە نابینێ.

هێزو توانای ئەفسانە و خەیاڵ و ئەندێشە هەمیشە لەپێش راستییەکانەوەیە: هەربۆیە کە راستییەکی دەمێشکی خۆتدا بەرجەستە دەکەی دەبێ هێندێکی بەخەیاڵ و ئەندێشە وە تیف تیفە بدەی، بۆ ئەوەی گیان و دەروونی خەڵکیش ئاسودە کەیت و بیانحەسێنێتەوە، ناچاری پەنا بۆ ئەفسانە بەریەوە... دەگەڵ ئەو بیرولێکدانەوانەدا دەستەویەخەبووم و جینگڵم دەدا. جگە لە شنەبایە و دەنگی ئەوتەنەکە و پارچە ئاسنانەی بەردەوام لە کێڵگەکانەوە بۆ بەراز راونانێ نێو



مەرەزەی دەهات... دەنا هەموو جێیەك کشومات بوو. دەنگەکان وەدیواری دەکەوتن و دەمردن، و منی پەرێشانیش، هەرجینگڵم دەدان، تا وردە وردە دوکانداری ناخی دەروونم پەتە نادیارەکانی سێبەری پەردەی پێڵووەکانمی شل کردەوەو بەسەر بیلبیلە و گلێنەی چاوەکانمیدا بەردایەوە و رۆناکایی لێبڕی... و مانگ کەوتە قۆلتێوە و من دە ئاسمانی خەوێدا بوومە پەپوولەیەك و بەرەو مانگ دەچوومەوە، مانگ ئارەقەی دەردابوو و ئارەقەکەشی بە سەردەستە سڕو وڕەکەی دەسڕیەوە... پشیلەم دەدیتن چەپەڵۆکیان بە ئەستێراندا دەدان... و ئەستێرەکان دووبارە دەسریوانەوە؛ سیسرکەکان لە مانگێ دەپاڕانەوە؛ مستەفاخان هەروا قاغ و قوغی بوو، و ئەستێرەکانی لەیەخە و بەرۆکی خۆی دەتەکاندنەوە و وردیلەکانی هەڵدەدانەوە ئاسمانێ و تەخشان و پەخشانی دەکردنەوە و ئەوانیش هەموو خڕ دەبوونەوەو چوار دەورەی مانگێیان دەگرت؛ سیسرکەکان بە پەیژەی مانگێدا وەسەردەکەوتن و شاخە دەزوولەکانیان لە تیشکێ وەردەدا، و مانگ فووی لە دەموچاوم دەکرد و دایە خانم لەسەر لۆیەکانی دامەنی کراسەکەی پان ببۆوە و هەر مش موشی (مشەمشی) دەهات؛ لە مشەمش و پرخە و پفەی وی وەئاگاهاتمەوە.

کە هەستام تاو کەوتبوو. بە پەشۆکاویەوە قیت بوومەوە؛ چوومە بەر ئاوێنەی و ناماقووڵیم بەخۆم کرد: دەموچاوم بە هێڵێکی سوور هەر لەگۆشەی چاوی چەپمەوە تا ناوەڕاستی لووتم ببووە دووبەش- ئەویش شوێنی سەرینەکەی بوو: لە پەو روو نوستبووم. خۆم توندکردەوە، و دانیشتم، تا دوایە ((زەلامێك)) هات. سۆفی ئەولکەریم بوو. گوتی ئەوە دەست و دەموچاوان ناشۆی؟ گوتم بەدی. گوتی دەبابڕۆین. چووین مەسینەکەی دەگەڵ سەلکە سابونێکی لە دالانێ تاودایە- سابونێ مەراغەی. دە جێ سابونێکی یەکجار پیس و پۆخڵدا. بەپلیکانانداچووە خوارێ. ئەمنیشی بەدواوە. هەرکە گەیشتە بەردەرکی ماڵێ- ئەو دەرکەی دوێنێی لێوە هاتبوومە ژووری- راوەستا؛ ئەمنیش راوەستام. بەچاو تێیگەیاندم کە دانیشم؛ هەڵترووشکام، و ئەویش ئاوی دە دەستی کردم و دەست و دەموچاوم شوشت. خاولی نەبوو؛ دیاربوو خاولی هەر بەکار نەدەهێنرا؛ خاولییەکەی ژوورێ ئەوە هەر رەونەقی ژوورێ و دڵداری گوڵ مێخەکەبوو: دوێنێ ئێوارێش کە نانمخوارد هەر خۆی نەبزاوت. بۆیە بە ناچاری هەروەك موسوڵمانان کە دەمەو ئێوارێ دوکانان هەڵدەگرن، دەستنوێژان دەشۆن و ویرد و نزایان دەخوێنن و دەستە تەڕەکانیان بە دوعاوە، بۆ بەلاوەگێڕییە بەسەر شتومەکەکانی دوکانێدا دێنن، بەدەستوبردی، هەروەك

ڕێوییەکی تاژی لەدوورڕا دیبێ، دەستەکانم بەلای پێشەوەدا تەکاندن، و دیوارەکەم پیرۆز کرد. بەدەموچاوی تەڕ و ئاو لێ تکاوەوە هاتمەوە سەرێ، تا بە بوخچەی قابلەمەکەی وشکی کەمەوە.

مستەفاخانیش زوو لەخەوێ هەستابوو. قاوەڵتیان هێنا... چرپ و چۆپانێك دەدالانێدا بوو، و دەنگی پیرانەی پیاوێکی. مستەفاخان لە ((زەلامەکان))ی پرسی. گوتیان سۆفی ئەحمەدە ئیشی بە مەحسەخانێیە- بابی ژنە کرمانجییەکەی بوو. دەیویست چاوی بەکچەکەی کەوێ. مستەفاخان گوتی، بانگی ((مەحسە))ی کەن- وەك بابی ڕێی چوونە ژووریی نەبێ. کە چرپ و چۆپانەکەی وان تەواو بوو هەستاین. خانم هێشتا لە خەوێ ڕانەببوو، بۆیە دەنگی قسەکان هێندە بە سپایی بوون... ڕابووین و وەدەرکەوتین.

مستەفاخان نائارام دیاربوو؛ من وام هەست دەکرد لەبەرخاتری خانمێ بێ، تا تریاکەکەی بەتەواوی سەڵتەنەتەوە بکێشێ- بەڵام کێ دەڵێ شتێکی دیکەی لەبن سەریدا نەبوو، دەیویست پێشمانم بدات. ڕۆیشتین، بێ ئامانج، بەداوێنی گوندیدا چووین، چ لەگۆڕێ نەبوو+ کاولە وێرانەیەکی ڕابوردوو، لە هەموو جێیەکییەوە لەدیوی ناو ماڵێڕا تا دەر و دیواران، هەموو گۆشە و کەنارێکی گوندی دەبن پاشەڕۆکی پاتالاندا دەڕزی، منداڵانی کوڕ و کچ بەبێ جیاوازی، بەدەموچاوی نەشۆراو و سەروپرچی ئالۆزەوە لە پەنا دیواران گوویان دەوکاولانەدا دەکرد. هەروا بەدەم گوو کردنێوە، پاشەڵی داو و تەژگەڵیان تا بنەبانێ هەڵدەدانەوە و لەنێو لینگانیانەوەشڕا سەریان شۆڕ دەکردەوە و لەخوارێڕا سەیری کارەکەی خۆیان دەکرد داخوا چۆنی دەکەن. مریشکەکانیش لە دوورەوە خۆیان مەڵاس دابوو، هەر کە منداڵێك هەستابایەوە، هێشتا دەرپێی هەڵنەدەکێشایەوە- ئەگەر دەرپێی لەپێدابایە- بە باڵەفڕکە و چاوانی پڕ تاسەوە، هێرشیان دەبردە سەر ئەوەی کردبووی. پیرەمێردێك لەبەردەمی چەپەری پەرژینێ لەسەر قەرتاڵەیەکی سەرەوبن دانیشتبوو؛ کوڕێژگەیەك سەری دەتاشی. کەڵێنێکی لەنێوەڕاستی سەری کردبوو.

((یاڵلا سۆفی حمەد!)) یاڵلا، ئەوە لەجێی سەلامێ. ((ئەوە بۆ خاتری پوورە حەلیمێیە... یا بەتەمای شاری؟)).



((نەخێر، ئاغا، لەبەرخاتری هیچیان نا. بێ ئەدەبی نەبێ هێند خراپ دەخورا- بە حوسێنیم گوت ڕزگارم کا)).

حوسێن کوڕی بوو، کە چەقوەکەی ڕاگرتبوو و چاوەڕێی ڕۆینێ مەبوو. مستەفاخان هەروا بەدەم قسانەوە گوتی: ((ئەرێ پێش چەند دەقیقێکان لە ((سەرا))ی ماڵێ بووی؟ گوتم ڕەنگە بیەوێ بچتە شاری و بۆیە هاتبێ داخوا چمان دەوێ لە شاری یان نا...)).

ئا- ئەوە بابی ژنەکەی بوو!

((نا، ئاغا... عەرزم کردن، دەخورا... حەلیمە بیستبووی میوانت هەیە هێندێکی هەنگوین ناردبوو)).

((ئاااا...)).

حوسێن گوتی: ((بابە وشك بۆوە — هێندێکی تەڕکەوە. منیش دەبێ بچمە سەرخەرمانێ)). دیاربوو ئەوە لەمە ڕاخوڕین بوو.

بابەکە وەك منداڵی گوێ لەمشت هێندێکی ئاو لەو ((حەوت جۆش))ەی پەنا سەبەتەکەی دە گۆلمێ کرد و سەری تەڕکردەوە. ئاوی بە چەناگە و لاجانگاندا هاتەخوارێ. حوسێن دەمە چەقوەکەی بە بەری دەستیدا هێنا. دەمەچەقو ((خشتە))ی لێ هەستا- و ئێمەش بێدەنگ لێماندا ڕۆیشتین.

((ئەوە گوێلکی کێیە چۆتە دەتووتنێ؟)) ئەمە دەنگی خان بوو، تووڕە و تۆسنانە. بەردێکی تاودایە و دەگوێلکەکەی ئالاند. تومەز گوێلکەکە شارەزای ئەو شتانە بوو کلکی باداو هاویشتییەوە سەرپشتێ و دەرپەڕی. ژنێك —ژنێکی ژیکەڵە- لەپشت پەرژینێوە خەریکی تیمارکردنێ برینی بزنێکی لە بزنەگەل بەجێماوێ بوو بە ڕۆنەکەرە و خوێیە. بێ ئەوەی سەر هەڵێنێ و یا هیچ گوێیەکی بداتە مە گوتی: ((ئێمە نییە ئاغا- ئێمە گوێلکمان نییە... ئی ماڵێ شەریفە لچەیە)).

گوندچۆڵ بوو- دیاربوو جگە لە هەندێ پیر و کەنەفت و تاك و تەرای ژن و پیاوی هەرزە. دەنا هەرچی ژن و پیاوی جحێڵ هەبوو هەموویان لە دەشتێ بوون.

ئاغا بانگی کرد: ((پوور زلێخا- زلێخا!... هەموو هەر مردوون واکەس وەڵام ناداتەوە!؟.

پیرێژنێك دەکونە رەشێکی چوکەڵەڕا کە دیـاربوو تاکـە ژووری ماڵەکـەی بـوو سـەری دەرێنـا. ((بەڵێ ئاغا... دیسانەوە چ بوو ئاغا!)).

((چ بووە! ئەگەر جارێکی دی ئەو گوێلکە خێو مردووەی تۆ ببینم دەتووتنێ کـەوێ رادەسـپێرم کلکی ببڕن... دیسانەوە چوو بۆوە دە تووتنێ!)).

ژنە گوتی: ((های ئاغا... داخوا گوتم چ بووە!... باشە، جا ئیدی ئەوە گوێلکە... خۆ ناشکرێ دە لاقی خۆمی کەم... کوا- خۆ ئێستا دەوێدا نییە)).

((دەوێدایە، دەوێدانییە!... ئیدی لەسەرەمن پێگوتنە- لەبیرت نەچێتەوە. پـاریش پـێم گـوتی گوێت نەدایە تا وەڵامدا کلکی ئەوێهێیان بڕی، ئەودەمی داکەوتی!)).

بە سەیرێکەوە تێم روانی، خۆی لە تێڕوانینەکەم گێل کرد.

تووشی کوڕێژگەیەکی دە دوازدە ساڵانە بووین، بـەخۆ و بەجووتـە کەوشـێکی لاسـتیك و شـڕە رانکێك و کەرێك و دوو تا ئارد و نەقیزێکەوە.

((بۆ کوێ؟ ئێستا درەنگە دەبایە پێش تاو هەڵاتێ وەڕێ کەوتبای)).

((پێش تـاو هـەڵاتێ هـاتووین ئاغـا...)) ئـاوازەی قـسەکردنی کوڕەکـە منداڵانـە و ریتمـی دەنگەکەی پیرانەبوو ((لەپێشدا چوومە ئاشی- دانیشتم تا تەواو بوو)).

ئاردەکەی بۆ پاسگای ئەمنییەکان دەبرد. پاسگایەکە لەسەرڕێی دوێنێمان بوو، کە من بـەهۆی دالغە لێدانێ یا گوێ نەدانێوە نەمدیبوو. لە بڵندایيەکی دوور لـە داروبارییـەوە دروسـتکرابوو، تاوەرێك بوو، کە لە دوورەوە پەیژەیەك و دوو کەسی پێوە دەبینرا.

((ئمم! باراشەکەشیان هەر ئێمە بۆیان لێدەکەین... با رۆژی خۆی بـێ داخـوا وەك توێلکـەدارە بییەیان ئاوەڕووت ناکەین... ئاخ، ئەگەر رووسەکان دەگەڕانەوە!)).



ژنێك لەکانییەڕا دەهاتەوە، گۆزە بەشانەوە. دەگەڵ هەر هەنگاوێکی کە هەڵیدێنایەوە، ئاوەکـە شڵقەی دەکرد و بە شانی و قۆڵ و لاملیدا دەهاتەخوارێ- شان و پیلـی تـا سـینگ و بـەرۆك و دەوروبەری کەمەری هەمووی تەڕبوو. دەشەلی. پێڵاوەکەی پێی دەگرت.

((شکۆفە، بزانە زێنەب قەباڵەدار لەوێیە یا رۆیوە؟)).

ژنۆکـەی تـاین بـە منـداڵی لەسـەربانی بـەر ببـۆوە و کـچێنییەکەی نـەمابوو. چـووبوون گەواهینامەیەکیان بۆ دەرێنابوو تاکاتێ کە مێردی کرد چ گێروگرفتێکی بۆ پێش نەیەت- و بەو گەواهینامەیە ببووە قەباڵەدار.

دوای ماوەیەك ژنێك، منداڵ بە کۆڵەوە، لەنێوانی دوو ریزە پەرژینانەوە پەیدابوو... منداڵەکەی دەخورجینێ نابوو و گرێی خورجێنەکەشی هاویشتبووە ملی خۆی و خورجێنەکـەی وەك کـڵاوی بەسەری خۆیدا کردبوو. ریسێکی خوری کە سەرێکی بەخورجێنەکەوە بوو لە قۆڵی خۆی شەتەك دابوو: گلۆڵەکەشی لە پاڵ منداڵەکە هاویشتبووە نێـو خورجێنەکـەوە. دەهـات و بـەدەم رێـوە تەشیشی دەڕست. ئەوە زێنەبێ قەباڵەداربوو. راوەستا، منداڵەکە بە سەرنجێکی پاکی منداڵانـە و خەواڵووەوە سەیرێکی کردین.

((زێنەب دوای نیوەڕۆیە کە هاتییەوە بەلای بێستانێدا وەرەوە و دووسێ شووتی و کالیـاران لـە مەمەندی وەرگرە و بیانهێنەوە... لەبیرت نەچێ، ها!... یان نا، بەو منداڵـەوە بـۆت نـاکرێ- هەر بە مەمەندی بڵێ با بۆخۆی بیانهێنێتەوە یا بە یەکێکیاندا بنێرێتەوە- تێگەیشتی!)).

مەڕێکی دونگ بە کۆنە پەڕۆیـەکی لەبـەر پێـشولان هەلپێـچراو هـەر لـە ئێـستاوە لـە پـەنا پـەرژینێوە هانکـەهانکی بـوو؛ ورگـی دەگـەڵ هانکـەهانکێ هـەر هەڵدەسـتا و دەنیـشتەوە. پیرەمێردێك لەودیو پەرژینێوە بەدیواریەوە وەنەوزی دەدا و ژنێك (تاماو)ی بۆ گوێلکی تەنیشت پەرژینێوە دەبرد... چەند ماڵێك بـەولاوەترەوە لـەبن سـێبەرێکی کـە هـەیوانی مـاڵێکی بـوو دووکیژ چوار دەستەکی مەشکەیان دەژاند- کەنگێ لەکێوی هاتبوونەوە؟ - دەگەڵ شڵق و هۆڕی مەشکێ پێیان لە زەوی دەدا و لەبن لێوانەوە ((هەی مەشکێ مەشکێ مەشکێ... هەی ماڵـە بابم مەشـکێ))یـان بـوو، و گێـل گێلـە و لەرزانەکانیـشیان وە هەڵپـەرین و سـەماهێنابوون، روخساری بێ دەسکاری و کوڵمی سوورگوڵ و خۆهێنان و بردنی شل و ملی کـچانە و جووڵـەی

قۆڵ و مەچەك و پاش و پێش چوونی سینگ و بەرۆك و گەردەنیان، بینەری دوور لە هەموو ئارەزووێکی سێکسیانە، وەهەلەکەسەما دێخست. منداڵێك دەپاشخانێدا، دەگریا، منداڵێکی دی هەر لەبن ئەو سێبەرەی دەجۆلانەیدا (هەلۆرکە) بە هاتوچوونێ مەشکە و بەگەرموگوڕییە کچەکانەوە خافلاّبوو و لەولاشەوە مێش و مەگەز بەسەر و دەموچاوی وییەوە مژوول بوون.

ئەوە گوند بوو.

مایەو کەرەستەی ژیانێ تابلّیی زۆر، و ژیانیش هێندە بێ رەنگ و روو و بێ تاموبۆن و لانەواز، هەر راست وەك تەختەی سینگێکی پانۆپۆڕ بەلاّم نەخۆش... و ئیدی هەر ئەو هەناسەش تایبەتمەندیەکی خودی ژیان بوو دەناکەس غەمی قەزەی سینەکەی نەبوو: سییەکان گیرابوون.

کۆنە سەراشمان دیت. منداڵان دەنێو کەلاوەکانیدا یاری ((قەلاّت گری))یان دەکرد سەیرەکە لەوەدابوو کە سەرکردەی دزەکان ناوی خانی گەورەی لەخۆی نابوو و هەڵس و کەوتیشی هەموو رێك لە هەڵسوکەوتی خانی گچکە وەرگرتبوو و رێك وەك وی دەکرد. قەلاّتەکە گیرابوو و دەسکەوتەکانیان بەشدەکرد: ((خان)) دەستی لەبەرپشتێ نابوو و بەدەنگێکی وا کە بەلای خۆیەوە مووی لە دەنگی خانی حازری لانەدابوو بانگی دەکرد: ((ئەرێ ئەوە پیاوەکانی من کەسیان لەوێ نین!)).

بە لێوارێ ((دێبەرە))یدا کە لەنێوان دێراوانیدا گەنمەشامی وەك سەری سپی پیرەمێردە چینیەکان کاکۆڵی سپییان بەسەردانە گەنمەشامییە زەرد و سپییەکاندا شۆڕبوبۆوە تێپەڕین: ئەو دێبەرانە دەرماڵێ تایبەتییە کرمانجان بوون، لە کولەکە و تەماتە و گەنمەشامییە بەولاوە هیچی دیکەیان تێدانەبوو. و سەیرەکەش لەوەدابوو کە لە تەواوی گوندیدا درەختێکی تێدانەبوو. بەلای رۆژاوایەوە، لە داوێنێ، دارستانێکی نیمچە چڕوپڕ هەبوو: ئەمە گۆڕستانی ئاوایی بوو. درەختەکانی تەنیا داربەڕوو و هەرمێ کوڕاسك بوون. ئەو دارانە بە ئاگادارییە مردووەکانەوە مابونەوە. درەختەکانی هەموو گەورە و وشکەڵ دەبوون و دوایەش دەبوونەوە کود و خۆراکی زەوییەکە: کەس دەستی بۆ داروباری گۆڕستانێ نەدەبرد. ئەوە چاکی ((پیرخەلیلە))ی بوو، گۆڕستانێ ماڵە ئاغای. بەرەو لای سەرایە هاتینەوە؛ هەرچوار دەوری سەرایە زبڵ و زاڵ و پیسایی بوو. رۆژ بە تەواوی هەڵکشابوو. دەوران دەوری سەرایە پێست و پەڕی مریشك و تلّپەچا و توێلکەشوتی و کالیار بوو. کۆمەڵە زەنگە سوورەیەك بەوناوەیدا بلاّوبوونەوە. ئەوە



هەموو زبڵ و زاڵی سەرایە بوو: لەجیاتی ئەوەی مریشکان ئاوەڕووت کەنەوە، دایانەدەماڵین و ئەو پێست و پەڕ و ریخۆڵە و پیساییانەیان هەموو لە پەنجەرەیڕا هەڵدەداشتنە دەرێ. توێلکە شووتی و تلّپەچاو توێلکە هێلکە و بەرماوەی خواردنێ و وردە ئێسقانیش هەروەتر، بۆگەنیو ئەو ناوەی تەنیبوو، هەر راست دەتگوت بۆگەنی کەلاکی سەی تۆپیوە.

مستەفاخان دەیگوت کە هەموو رۆژێکی خوا داینـاوە سەر لەیەکەیەکەی ماڵە کرمانجەکان دەدا؛ نابێ هەروایان لێگەڕێی؛ دەبێ هەمیشە یەکێکیان بەدوو قونێوە بێ دەنا ((کارەکان)) رادەوەستن.

گەیشتبووینە لای بەری خوارێی سەرایە بن دارگوێزەکانی دەم چۆمی، دڵمان بەوەی خۆش بوو کە دەگەینە سێبەرێ. بن دارەکان پڕبوون لە پیسایی کۆن و نوێ: بۆ دەست بە ئاوگەیاندنێ جگە لەو بن داروبارانە و ئاودەستی مزگەوتێ چ جێیەکی دی نەبوو. هێندێك بەولاوەتر، پیرەمێردێك و کوڕە جحێڵێك گیایان دەدروی- دیاربوو باب و کوڕن.

((سەلیم، ئەدی پێم نەگوتی بچن بە ئێستران ئەو باراشەی لە ئاشی بێنیەوە؟)).

((ئاغا، ئێسترەکە خواستە، دەشەلێ)).

((جا شەکەر، کارێکی وا مەکە لەبەردەمی ئەو بابە گێلەت هەرچی دەموقەپۆزت هەیە هەمووی بشکێنم!)).

چووبووە پێشتر؛ سەلیم راست ببۆوە، دەستی بەداسەکەوە لەبەر کەلەکێ نابوو؛ رەنگی پێنەمابوو.

پیرەمێردەکە هەروا داهاتبۆوە و بەگرژی و توڕەییەوە هەر دەیدروی؛ دلۆپە ئارەقەی بە چرچ و لۆچی پشتەملە سوورەکەیەوە دەدرەوشایەوە. وەك گوێ نەداتە ئەو بێنە و بەرەی.

ئاغا قامکی شادەی —وەك کەسێکی کە تیلە بازییە بکات- وەبن چەناگەی سەلیمی هەڵدا.
((تێگەیشتی!... پیرەمێرد، ئەو جاشەکەرەت ئامۆژگاری کە!)).

پیرەمێرد، پشتی راستکردەوە، و بەروخسارێکی گرژ و ماندووەوە گوتی: ((بە چاوان ئاغا...))و کەمێ دواتر ((ئاغا، خۆماشەڵڵا ئێوەش باوەڕتان نییە... راستدەکا، ئێسترەکە خواستە- دەبێ یەکێك هەبێ ناڵی کات، خۆ لێرەش ئەوە ناڵبەندی لێ نییە... بەچاوان ئاغا)).

((خۆ کەری خێو مردەتان هەیە، کەرەکەت ناردبایە)).

بەدەنگێکی تەسلیمییەوە ((بەچاوان ئاغا)).

کۆمەڵە ژن و ژاڵ و کیژۆکاڵێچك، دوو دوو و سێ سێ دیزەوگۆزە بەدەست و بەشانەوە لە ((بێری))یە دەهاتنەوە. دەنگی قسە و پێکەنینیان دەهات. هەر کە ئێمەیان دیت وەك بۆقی ماردیتە بێدەنگ بوون، رێیان گۆڕی و سەریان بەردانەوە و بەدەم لێوەخنکەی شیرینەوە کە وایان خۆ پێشاندەدا ماندوون، و بەدواویشدا هەناسە بڕکێ بوون و سوورهەڵگەڕان. ئارەقەی دەموچاویان لە دوورەوە دەبریسکایەوە... دیاربوو، کە خان هەر بەچاوی بابیەوەی دە دنیایە دەنۆڕی: خووی ((گەمایەتی))یەی وەك کەلەپوور بۆ مابۆوە. خەڵکیش دیارە دوو دەستە بوون: کۆمەڵێك کە ئەوانی- کەسانی وەك ئەو و داکی- هەر بەو چاوەوە دەدیت کە دیبوونی. ئەمانە کرمانجی رەش و رووت بوون، هەروەك کوتەکیان وەپشتی سەری کەوتبێ و چاویان سووڕابێ جاروابوو ئەو خان و مانانەیان بچوکتر و جاری واشبوو گەورەتر دەدیت، یا جاری وابوو جوان و جاری واشبوو کرێت و دزێوتر- و زیاتر دزێوتر- لە رابوردووی باب و باپیرانیانیان دەدیتن. بەڵام هەر کە بەخوو و خدە و نەریتی رابردوو رادەهاتن دوێنێ و ئەوڕۆیان وەك یەك سەیر دەکرد و دەدیتەوە.

تاقم و دەستەی دووەم خەڵکی شار و ((دەوڵەت)) بوون، کە هەروەك دووچاری ((کەم بینی))یە بووبن رۆژ بەرۆژ ئەو خان و مانانەیان لاواز و بچووکتر لە رۆژی پێشتر بەدی دەکرد. هەمیشە لەبازنەی دیتنی خۆیانیان دوور دەخستنەوەو بچووك و بچووکتریان دەکردنەوە، تا دەبوونە پەڵەیەکی بچکۆلەی هێندەی جیقنە قەلێکی.

دوێ شەوێ دایکی بەخراپەی باسی کوڕی ئاغای سلێمانی کرد. هەرچەندە زۆر بەڕاشکاوی و ئاشکراشەوە دەگەڵ کوڕەکەی دەدوا ئەو خراپییەی راستەوخۆ و بێ پەردە نەگوت و بە ئاماژەوە بەسەریدا تێپەڕی گوتم ئەرێ باشتر نییە بیرێك لەو زبڵ و زاڵەی دەوری ماڵێ و ئەو هەموو پیساییەی بکرێتەوە؟ گوتی ئەوە توێکڵی کارەکەیە، ئەودەیەوێ کارەکان هەر لەبنج و بناوانەوە



راست کاتەوە، نەك وەك کابرای کە تەنانەت ئاودەستی ماڵێشی هەر سپی کاری کردووە- و بەقێزەوە ورگە خەندەیەکی کرد. ئەو دەیەوێ وردە وردە خەڵکەکە بێنێتە سەررێ، تا رۆژێك دێت کە هەر بۆخۆیان و بێ زۆری لێکردن و تەنگەتاوکردنێ وی، ملی رێیە بگرن. بەڵام ئێستا دەودەمەیدا توندوتیژی و زۆر لێکردن پێویستە، ئەگەر کوتەك نەبێ یەکتری دەخۆن... دیسانەوە کەوتمەوە یادی قسەکانی ئاغای سلێمانییەوە. دەیگوت ئەو مستەفاخانە کۆیلەی نەفسی خۆیەتی؛ گەورایەتی کوێری کردووە، دەیگوت ئەگەر ژیان ماناو مەبەست و ناوەڕۆکێکی هەبێ ئەوە ئەو ناوەڕۆکە ((بەخۆنازینێ))وییە، کە ئەو بەخۆ نازینەشی هەر ئی خۆی نییە- بارێکە و هیچی دی- شتێکی بۆماوەی قاڵب گرتووە- هەر راست وەك جووتە هاویشتنێ ئێستڕێ و گازگرتنێ سەی. تازە ئاغا هاتووە مەلەی لە بیابانی فێربێت و خەڵکیش فێرکات- پیرۆزە!.

بۆ نیوەڕۆژەی هاتینەوە سەرایە. زۆر شتی سەرسوڕهێنەری دیکە چاوەڕێبووم: دە داڵانێیاندا برنج دە سندۆڵێدا دەکوتا، لاوێکی چوست و چالاك کە هەر چوار دەوری سەری وەك بازنەی بەمووسی تاشیبوو، هەروەك شووتییە کە هەر چوار دەورەی سەرێکی پاك کەی، چەڵتوکی دەکوتا. مستەفاخان لە دەرکی حەسارێوە چووبۆوە نێوماڵێ. تازە لەپێچە باریکەکەی پلیکانەکان رەت ببووم کە لە دوورەوەمڕا گوێ لە دەنگی خانمێ بوو- زۆر تووڕە: ((مەگەر لوولەی بە چەندی دەدا؟)) لاوەکە روو بەدەرکێوە گوتی: ((دەڵێ سێ مەن برنج بەیەك لوولە)). ئەی لەعنەت لە بابی هەرچی عەجەمی تریاك فرۆشە! هەموو گوناهی ئەو چاودێرە قوڕمساغەیە کە بەوییەوە نووساوە- وەك لە شاریدا هەر ئەو تریاكێ بفرۆشێ!... سێ مەن برنج و یەك لوولە... دەك خودا بیبڕێ!)) لاوەکە گەڕایەوە. رەنگی تێکچوو. خەریك بوو دەرکێ داخاتەوە خانم لە ژووریڕا گوتی: ((کە برنجەکەت برد بە چاودێرەکە بڵێ بەڵکە هەوڵێکی بدا بای لوولێکی کەمتری وەرگرێ...)).

هەنگاوەکانم شل کردنەوە؛ لاوەکە کارەکەی بەجێهێشت، دەرگاکەی داخستەوە و دەنگەکەی بڕیەوە.

دوای ماوەیەك مستەفاخان هاتەوە، نانیان هێنا: چێشتەکە قوڕاو (بەربەسێڵ) بوو، بە گۆشتی گیسکێ، دەگەڵ مریشکی سوورەوەکراو. سۆفی ئەولکەریم سینییەکەی دانا، و چوو دۆی هێنا، و گەسکێکیش بەدەستەوە؛ هەربۆنی گۆشتی هات زەنگەسورەی گەورە گەورە پێوەربوون، و

سۆفی ئەولکەریم دەست بەکاربوو: ئێمە خەریکی خواردنێ بووین و ئەویش بە گەسکان خەریکی دەور و بەر پاککردنەوێ بوو لە دوژمنان. کردەی پاکسازییە تا دوای نانخواردنێ هەر بەردەوام بوو. هەر کە نانخواردن تەواوبوو بانگی کرد: ((قالە!)) قالە هەمان لاوی برنج کوت بوو، کە دە دالانێدا هەر خەریك بوو. قالە هات و سینییەکەی هەڵگرتەوە، بەلام سۆفی ئەولکەریم هەرلەوێ بەخۆ و بەگەسکەوە مایەوە، هەروەك باوەشێنی بن میچی جاران راوەستان. هەرسینییەکە چوو زەنگەسورەکانیش نەمان، هەروەك دەرکێ دکتۆری داخەی و نەخۆش بلاوببنەوە و هەریەکە بەلایەکیدا. بەلام زەنگەسورەکان بەپێچەوانەی نەخۆشانەوە جاروبارە تاك و تووك، بێ نمرە و ژمارە سەرێکیان لەژوورێ هەڵدێنایەوە.

بۆ سبەینێ نەمویست ناراحەتی کەم، گوتم پێم خۆشە- بەقسەی ئەم سەردەمە- بەرنامەیەکی ئازادم هەبێ. ئاغا قبوولێکرد. بەلام بۆ ئەوەی نەکا کسۆکم پێ بجەفن، چونکە چاویان بەدیتنی هیچ غەریبەیەکی، ئەگەر بشیان لاوێنێتەوە هەڵنایە، بەلام هەموو پێدادان و تێهەڵدانێکی خودیان قبووڵە و کلکەسووتەی لەبەردەکەن. لەبەر هێندێ سۆفی ئەولکەریمی رەگەڵدام. ئالێرەدا زنجیرەی پلە و پایەکان بەتایبەتی رەبەرچاو دەگیران:

سەگی مەڕی پلەیەك لە سەگەکانی نێوگوندی بالاترن، پاتاڵ یەك پلە لەسەگی مەڕی، و کرمانج یەك پلە لە پاتاڵی بەرەو ژوورتر بوو، ئاغاش لەسەر و هەمووانەوە لە هەمووان گەورەتربوو. هەموو رەسەنایەتی و پلە و پایەی یەکتریان قبووڵ بوو، بەتایبەتی مستەفاخان کە خۆی پێ لە هەمووان پاکتر و گەورە و رەسەنتر دادەنا، چونکە ئەو هەر لەبنەچەکەوە رۆژێك لە رۆژان باپیرەیان خان بووە.

زنجیرەی ئەو پلەوپایانە بەو شێوە نایەکسانییە ملیان دابووە بەرێ و کەس گلەیی و گازاندەی لەپێش خۆتری نەدەکرد. کرمانج کۆیلە و ملکەچە، بەلام هەمیشە و بێ درێغانە داخی دڵی خۆی بە پاتاڵ، و سەگ، و ژناندا دەڕشت- ئاخر لە ئەفسانەکانی خانەوادەییدا، گوایە باپیرەی ویش ((پیاو)) بووە!.

بەڵێ، سۆفی ئەولکەریمی بۆ سەگ رەتاندنێ دەگەڵ خستم. رۆیشتین، بەلای چۆمیدا، لە پردێ پەڕینەوە و رەوکەی- ئەسپی سەرایە و ئەو خەڵکانەی گوندیمان- لە دوورەوە دیتن کە بەرهەڵدا بوون، ئاوی چۆمی تابلێیی روون بوو، زۆرم حەزلێبوو تەنیا بامایە و مەلەیەکم کردبایە...



گەیشتینە بێستانێکی. پیرەمێردێك و دوو کوڕێژگە لەبن سێبەری کەپرۆکەکی کە مەشکە دۆیەکی بە لاشیپانی دەرکەسێ گۆشەکەیەوە هەڵواسرابوو و تکەی دەکرد، دانیشتبوون. ئاو و دۆیان هێناو دەست بەقسان کرا.

پیرەمێرد بەپێکەنینەوە گوتی: ((سۆفی ئەولکەریم، ئاغا کەنگێ بەخێر و سەلامەت ئەو سندوقەی دێنێ؟)). سۆفی ئەولکەریم پێکەنی؛ پێکەنینەکەی هاویشتەوە هەناوی خۆی و باوەشێنەکەی راوەشاندەوە و ((خ س سە))یەکی کرد و بەگاڵتە جارپەوە گوتی: ((ئاغا؟... جا پەلەی چیتە- رۆژێکی هەردەیهێنێ!)) پیرەمێرد رووی قسەکەی لەمن کرد: ((کاکیلە، راستە دەڵێن سندوقێك هەیە خەریکە بیهێننە شاری، هەر کە پەنجەت بە دوگمەکەیەوە نا، هەروەك ئەو سندوقانەی کەچەڵ پاڵەوان و بیبی جان خانمێ دوو ژن و پیاوێکی لێ دێنەدەرێ و گۆرانییان بۆ خەڵکی دەڵێن؟)).

بەسەرسامییەوە تێمڕوانی.

((ئاغا لەو سەفەرەی دواییەیدا کە هاتبۆوە دەیگوت. دەیگوت بیستوویەتی خەریکن دەیهێنن... گەیوەتە عەجەمستانێ)).

بەسەرسامییەوە سەرێکم راوەشاند: ((من نەمبیستووە)).

((چۆن، خۆ دەیگوت ئالقەی چۆن چۆنی هەن و بالان رادەوەشێنێ)).

گومان گرتمی: ناکا مەسەلەکە مەسەلەی فلیم و ئەو پرۆژێکتەر و بالرینە بێ کە هاوڕێ حیزبییەکە باسی کرد!؟- خۆی بوو. هێندێك شتم گوتن، یانی زۆر و کەمی ئەو قسانەی هاوڕێ حیزبییەکەم چۆن بوو ئاوام دووبارە کردنەوە، لەوە زیاتر کە لەجیاتی وشەی بالرین، من سەماکەرم بەکارهێنا دەنا قسەکانم هەموو وەك خۆی کردنەوە: ئەویشم هەر لە کوڕی ئاغای سلێمانییەوە بیستبوو: کە لە قاموسەکەیدا لە بەرامبەر وشەی بالرین ((سەماکەر)) نوسرابوو.

پیرەمێرد گوتی: ((بەڵێ، هەوە، خۆیەتی...)) رووی دەسۆفی ئەولکەریمیەوە: ((باشە، نەتگوت- نەتگوت کەی دەیهێنێ؟)).

سۆفی ئەولکەریم بە دووچاوی زیت و شەیتانییەوە باوەشێنەکەی بادایەوە و ددانە زەرد و گەورەکانی وەدەرخستن، و ((سیخە))یەکی لە سینگە گیراو و توکنەکەیەوە هێنا.

پیرەمێرد دووبارە رووی لەمن کردەوە: ((کاکیلە، تۆ بۆخۆت دیوتە؟... چۆن چونێکە؟ ژنەکەی تێیدایە هەر بەڕاستی ژنە- یانی وەك ئەوەی ئاغا دەڵێ گیانیشی لەبەرە و زیندووشە؟)).

یەکێك لە کوڕەکان بەتیلەچاوێکەوە گوتی: ((باپیرە، ئەوە چاوی نەنە جەواهێرێ دیارنییە بۆیە وا- هەر بێت پێیدەڵێم ها!)).

((جا ئەگەر دەتەوێ تێروپڕی بیرازکەن ئەوە پێی بڵێ!)).

ئەو جارەیان سۆفی ئەولکەریم بەڕاشکاوییەوە گوتی: ((خۆ ئاغا نەیگوتووە دەستیان لێدەدرێ؛ گوتی هەر بۆ تەماشایەیە- هەروەك دەخەوێدا خەونێ ببینی)).

پیرەمێرد بە دەنگێکی باریکەڵەوە گوتی: (ئمم! من پێموابوو زیندوون- بەڵێ، کاکیلە؟ جا ئەگەر وابێ سوودی چییە؟)).

گوتم: ((راستییەکەی، منیش نەمدیوە؛ هەربیستوومە)).

سۆفی ئەولکەریم گوتی: ((نا، ئاویان لێ گەرم نابێ...)).

((های رۆژگار! دنیا خەریکە دەگاتە کوێ! ئاخرزەمانە! خودایە زۆر شوکر ئێمە دەمرین و نایانبینین)). شەوێ چووینە چایخانەی گوندی. ژوورێکی تاریك و چکۆلە و راوەستاوبوو، سەکۆیەکی بەدەوران دەورێدا و یەك دوو پارچە شڕەبەڕەی خۆڵاوی بەسەرەوە و سەماوەرێکی تەنەکە لەسەر سێ کوچکەیەکی گڵین و لەگەنێکی چڵکاوێ لەبن دووقۆری تێگیراوەوەی زەرد و بەڵغ گرتووی بە گەچ و تەنەکان پینەکراو، کە هەردەتگوت شووتییە رزیوی مەراکیشین. لادیوارێکی تەنیشت سەماوەرەکەی، جێ حیسابی چای مشتەریانیان بۆ بە خەڵوز لێ نوسینێ کەف ماڵ کردبوو. خەتی سەر ئەو ((کەتیبە))ی شتێکی داهێنەرانە بوو، هەردەتگوت نوسینی چینی و خەتی میخییە: یەك چا خەتێك، دوو چا راست و چەپێك (X) سێ چا راست و چەپێك و خەتێك بەنێوەڕاستێدا ((✳)) چوارچا نیشانەیەکی کۆ (+)، و پێنج چا نیشانەی کۆ لەناو بازنەیەکدا (⊕)... و ئیدی دووبارە و سەرلەنوێ بەو جۆرە دووبارە دەبۆوە. ئەمانەم لە کابرای



چایەچی پرسی. نیشانەی حیسابی قلیانێش چوارگۆشەیەك بوو (□)و دەناو ئەو چوارگۆشەشدا نیشانەی (X) بۆ دووبارە بوونەوەی قلیان کێشانێ لێدەدرایەوە (☒). شووتی و کالیاریشی هەبوو. نیشانەی شووتییە بازنەیەك و ئی کالیارێ بازنەیەکی بەتیرەوە (▯) لەوەی زیاتر چیدیکەی نەبوو. کرمانج دەهاتن- زیاتر پیرەمێردەکان- و لەسەرچا و قلیانێیان ((دامە)) دەکرد، کە یارییەکی وەك شەترەنجێیە. ژاوە ژاو و روناکییە ژوورێ دەگەییە دەرێ؛ هەر کە چووینە ژوورێ، هەموو بێدەنگ بوون، و یەك پێ بڵندبوون. مەلای گوندی و کوێخا لەبەر روناکاییە کزەکەی فانۆسێ بەدیوارییەوە دامەیان دەکرد. هەر کە گەیشتینە وێ ئاغا چوو لەجێیەکەی کوێخای دانیشت و هەر بە دەستوبردێکی داشەکانی هێنان و بردن و هەرلەچاو تروکانێکیدا دامەکەی بردەوە!... مەلا لەپێشدا خۆی دەدزیەوە... بەڵام دوایە وردە وردە رازی بوو یارییەکەی بکا. تا ئەو داشێکی دەجوولاند. ئاغا سێ چوارێکی دەجوولاندن. تا سەرەنجام بەژارە خەندێکییەوە دۆڕاندنێ خۆی سەلماند و گوتی: ((ئەلحوکمولیللا- بەڵێ ئاغا، بردتانەوە!)).

چایان بۆمەش هێنا. ئاغا زیاتر لە ناوەڕاستی چاخانەیدا هەر بەپێوە بوو و زۆر خۆمانە دەگەڵ هەموان تێك ئالابوو: لە کاروباری دەپرسین، لەمەڕومالاَت و پاتاڵ، و لەوانەی بن جێی نوستنێشی دەپرسین:

((ئەرێ سۆفی خوا کەرەم، داخوا پوورە جەواهێر دەتهێڵێ یان نا...؟)).

((دەك خودا بیبڕێ، ئاغا... هەر دەڵێی داکێ پۆلازرێیە! ئاغا بەسەری ئێوە، ئەو پیرێژنەی کە پێت وایە مشتێك پێست و ئێسقانە و هەردەڵێی ئێستا نا ئێستا بەردەبێتەوە- کە خوا بکەم زووتر بەربێتەوە و رزگارم بێ لە دەستی- لە ئێسترێ قۆڕخانەی چەموش ترە! خۆ ئێوەش ماشەڵلا ئاگاتان لە رەش و رووتی بڕاوە...)).

((چۆن)).

((ئاغا چەند جارم عەرزکردن- یا لەبەرخاتری مە یا لەرێی خودایڕا، قۆڵێکی لێ هەڵکە و تازووە ئەو سندووقە خێو مردەی بێنە- با خەڵکەکەش لە یەخەی ئەو نەك و نووکەی ژنان ببنەوە!)).

خەڵکەکە: هە هە هە! و ئاغاش ((قغ.. عغ!)).

ئاغا ئەو باسەی زوو سەنگە و بەردنا. مەیلە و بێدەنگیەك.

((ئاغا، جارێکی دیشمان ئەوە بۆ وەگێڕە... ژنێ شای گوتی نان نییە بابسکویتی بخۆن... هە هە!)) ئەمە داوای کوڕە جحێڵێکی بوو.

ئاغا خێرا بەسەر ئەوەشیاندا تێپەڕی و گوتی قلیانیان هێنا. بەدەم قلیان کێشانێوە زۆر خۆییانە کەوتە خۆ هەڵنانەوێ: کە لەڕاوێ، بە سواری، دەگەرمەی غارێدا، چۆنی ڕێوی ئەنگاوتووە؛ چی بەڕەییس ئەمنییەی گوتووە، و نیازی هەیە چ بە فەرماندەی هەنگ ((ئامیرفەوج))ی بلێ. ئەمانەی بەجۆرێکی واوە دەگوتن هەروەك ئەوانەی دەقساندا دەگەڵ ((مەقامات))یدا گوتبن، و زیاتریش ئەوشتانە بوون کە گوایە دوای دیدەنییە ((مەقامات))ی و بیستنی قسە توندوتیژ و تاڵەکانی وان دوای هەستانێی و لە ژوورهاتنە دەرێی بە خەیاڵێدا هاتبن، کە دەبوایە بیانڵێ و نەیگوتوون، و ئێستا وای دادەنا گوتوونی. ئەو قسانەشی هەر بەهەمان رووگرژی و توندوتیژی و ئەو گاڵتەجاڕییەوە دەگوتن کە مێشکی لەسەر پلیکانەکانی دوای هاتنە دەرێی وەبیری هێنابوونەوە.

بەدەم قلیان کێشانێوە دەستێکی هەڵتەکاند و گوتی کە پارەی چاو قلیانێ هەموان لەسەروی بنوسێ- هەموو پێکەوە یەك جێ، بێ چەند و چوون، دەستیان بۆ قسەکانی لەملیدا، و چایەچیەکە سەروچاوی تێکنا. لە پێکەنینە ناودار و ماناداڕەکان وەتەنگ هات. دۆخی روخسار و هەڵسوکەوتەکانی هەستێکی تایبەتیان دەبینەریدا وە ئاگادێنا: بینەر وای هەست دەکرد کە هەر لە منداڵییەوە سەروڕوو و روخساری ئێستای چۆنە هەروا بووە، منداڵی و خۆشییە منداڵەتییەی نەدیوە، هەر کتوپڕ و یەکسەرە بۆتە پیاو و بووە بە مستەفاخان، و هەر بەو سەروسەکوتەوە و بەهەمان پێکەنینەوە: ((هاهاهاها!)) وەك بلێی وەرزشێ بکات هەردوو دەستی دەکەلەکێ دەنان و سەروسینگی بۆ دواوە و ورگ و گیپاڵی بۆ پێشەوە رادەداو ((ها ها ها ها!))و دەگەڵ دەنگی ها های پێکەنینەکەیدا خۆی رادەژاند.

هەموو دەگەڵی پێکەنینەوە: لاوەکان بە پێکەنینی ناودارەوە، پیرەکان سەربەیەخەدا شۆڕ و جارجارەش بەسەربادانێوە، کە بۆخۆیان ئەوەیان بەبێ تاقەتییە پیرییە دادەنا...



بەڵێ، هیچ جێیەك لە ماڵەخۆت خۆشتر نییە. دوو رۆژی دیکەشم، زۆر و کەم بەهەمان شێوە، دەگەڵ زەنگەسورە و سیسرك و مشك و بۆنێ تریاکی و گەڕانێ نێو دێی و چوونە چاخانێوە رابوارد و بەیانیی پێنجەمین رۆژەکەی بەرەو شاری گەڕامەوە. خانم درەنگ لە خەوێ رادەبوو، جا هەر بۆئەوەی ناراحەتیان نەکەم هەر لە شەوێمرا مۆڵەتی گەڕانەوێ لێ خواستن. هەرچیەکم دەکرد نەیدەهێشت: ئاخر جارێ چ جێیەکت نەدیوە؛ هێشتا بە تەواویمان یەکتر نەدیوە؛ باشە چ بووە، بۆ، بۆ ئاوردووی هاتووم؛ئەوە دیارە نان و نمەکەکەی مەی پێناکەوێ...

زۆرم سوپاسی ئەو پێشوازییە گەرمەیان کرد. بە جەختەوە رایان سپاردمێ کە سەلامانیان بۆ بەدایی رابگەیەنم و سوپاسی ئەو هەموو زەحمەتەیان پێ بگەیەنم کە کێشاویانە؛ لە وەتەی کە مستەفاخان (کوڕەکەی بە خان ناودێنا) باسی ئێوەی بۆ کردووم هەروا لەدوورەوە خۆشم وبستوون، نەیدەزانی ئەوەچۆنە کە ئەوجارە مستەفاخان- دیارە وەك هەمیشە- کەسێکی ماڵ و خێزانداری دیوەتەوە... و زۆر شتی دیکەی لەو بابەتە.

بەیانی زوو پێش تاوکەوتنێ، هێندێکمان رۆنەکەرە لە دەوروبەری چاو و بن کلکی ئەسپەکان هەڵسوی- کاکە هۆمەر تێی هەڵسوین- تا مێش و مەگەزیان تێنەئاڵێ- و بەرەوشاری دەگەڵ کوڕیژگێك و ولاغێکی و دووجێ ماست و دوو فروج و گۆسکە رۆنێکی دیاری بۆ دایی، وەڕێ کەوتینەوە.

* * *

## (٢٤)

سەرەتای خەزەڵوەرێیە، ئەو ساڵ سەرما زوو هات! هەردەڵێی سەرەتای زستانێیە. دە ژووری زیندانێدا دانیشتووین و قاوەڵتییە دەخۆین: چوار مەشقی، دەسفرەی نانخواردنێوە راماوین، هەموو پێڵوو هەڵامساو بەچاوی ئاڵۆزەوە، بێدەنگ و بێ تاقەت؛ هەر راست وەك دووسمان کە بکا وێنەوە- ئاخر ئەوە سەرەتای خەزەڵوەرێیە و تائێستا کەسیان بەرنەداوە. ئەوانەی کە لە قاوەڵتییە بوونەتەوە دەدالانەکێدا دێن و دەچن و راوێچکان دەکەن، هێشتا دەرکی زیندانێیان نەکردۆتەوە. کوڕەکان خەریکی جگەرە کێشانێن، دەمەتەقێیانە- شتێکی دەجوونەوە کە جارە های جاریان کاوێژ کردۆتەوە و بێ تام بووە، ئێمەش هەروەتر لەسەر سفرەی کاوێژی خۆمانەوە هەروا خەریکین، بەڵام بێ چەقەچەق: چۆن بوو، بۆ، بۆ- و هەزاران بۆ-ی تر و زۆر جارانیش شەڕوهەرا، هەرا، و هەرا- چارە و رۆژ رەشی و شەڕ و هەرا. دەوروبەرەکە واپڕبووە هەر بەپتێکی دەتەقێتەوە. جاری وایە هێشتا (ب)ی بۆیەکەت لەزاری نەترازاوە کە جاسوست گەیوەتە سەرێ، و هەروەك بە شەپۆلە رادیۆییەکاندا هاتبێ- لەبەردەمت قوت بۆتەوە- هەرگیز حیزب هەڵەناکات- هەڵەشی نەکردووە- و تۆ پێت وایە بەهەڵە لێرەی! جاری واشە دڵی خۆمان بەوەی دەدەینەوە کە گیرانی ئێمە بێ هێز و لاوازییە دوژمنەکەمانە؛ ئەگەر بەهێز و توانا بووایە ئەو کارانەی نەدەکرد، جاری واشە خۆمان بەهێندێ قایل دەکەین کە دوژمنەکەمان نالەبار و ناقۆلایە، بەڵام هەر تەنیا نالەبار و ناقولا- دەنا نەك خوانەکردە لێرەبوون و گیرانی کەسێك بەو مانایەبێ کە ئەو کەسە شلك و خاو و نەزانە یا خوانەخواستە خاینە. پێش ئەمە هەر کە خەیاڵی وەپاڵدانی خەیانەتێت بەمێشکیدا تێپەڕیبایە، بناگوێی دەچووزاندییەوە و بیرومێشکی رادەتەکاندی و هزرت وریا دەبۆوە... ئێستا لەپێشان باشترە، هەرنەبێ سەرەتا چەقەچەقێکی هەردەکەی، ئەوجا بناگوێت دەچووزێتەوە... دەور و بەرەکە پیس و ناخۆش و گرژبووە.



بۆ وای لێهات؟... وردە وردە خەریك بوو تێدەگەیشتین، یانی گومان پەیدابیوو، بەلام شەرم و لەروودامان نەیدەهێشت... دوایەش هەر نەمانزانی... ئەوە ئێستا کە تێیدەگەین، بەلام کاتێك، کە میکانیزمی رووداوەکانی ناوەوە تێدەگەین، کە ئیدی تازە درەنگ بووە و بەکەڵکی ئێمە نایە- ئیدی تێپەڕیوە و بۆتە بەشێکی مێژوو؛ بۆ پێداچوونەوێ و پەند لێوەرگرتنێ چاکە! ئەویش نەك بۆ خۆمان بەڵکە بۆ پەند وەرگرتنی کەسانی دیکە، چونکە خۆمان پێویستمان بە پەند و ئامۆژگارییان نەماوە؛ کوڕەلاوەکان ماشەڵلا کە ئێستا جحێڵن، و دەبێ کارێکی وابکەن کە ئەو هەڵە و ئەو شتانەی پێشان روونەدەنەوە...! ئەدی هەر ئەودەمەی کە تارماییە گومانێ وەدەرکەوت دەبێ بجوولێی و دەستبەکاربیت، بەلام هەردەودەمیشدا تارمایی هەزاران شتی دی سەرهەڵدەدەن، ئەوە دۆست و ناسیاوەتییە، ئەوە گاڵتە پێکردن و لاقرتێیە، ئەوە لێو لێهەڵقرچاندن و تانە و تەشەر و گلە و گازاندەیە، هەریەکە لەلایەکەوە سەری قوت دەکاتەوە گەردەنێ کێل دەکا. جا یان دەبێ ئەو خەیانەتەی هەیە و وەپاڵت دراوە قبووڵ بکەیت و دەزیندانێدا بڕزی یان دەبێ ئەو ترسەنۆکی و گاڵتە و لاقرتێ و رەنگە تاوانی خەیانەتیشت وەپاڵدەن و هەموویانت قبووڵ بێت و ئەودەم لەزیندانێ بچییە دەرێ و بەرهەڵدابیت...

بەچاوی ئاڵۆزکاوەوە و زیاتریش بە وەپاڵدانی خەیانەتی بەهەوانتەوە زۆربەمان مابووینەوە، لەوەی دەترساین بەترسەنۆکمان دانێن و بەهیچ لەباردا نەبوومان لە قەڵەم بدەن...

تازە لاوێکی مازەندەرانیان هێنابوو- گران و سەنگین، گەمژە، بەلام شۆڕشگێڕ. گنجی نێوچەوانی هەر مەپرسە؛ رێ کردنی شۆڕشگێڕانەی هەرچی کەموکەسرییەك هەیە نیەتی. چاك دەشۆڕشگێڕییە خۆی گەیوە. راستە نەخوێندەوارە، بەلام هیچ کەمایەسییەکی دەبیروباوەڕیدانییە، نەك هەر ئەوە بەڵکە بە زیادیشییەوە هەیە. لەبەرئەوەی هیچ پێوەر و محەکێکم نییە بیروباوەڕەکەی پێ هەڵسەنگێنم، دەتوانم ئەوەندەی بڵێم کە بەقسەی موسوڵمانان شەونوێژی حیزبایەتییەی هەرگیز لەبیرناچێ و وازیشی لێ ناهێنێ، روو بەرەو ژوور دەنوێ، بەبێ هیچ گومان و دوودڵی و دڵەڕاوکێیەك هەموو رابەرەکانی تێکڕا قبووڵە، یار چی پێ چاك بێت ئەو لەناخەوە ئەوەی پێ چاکە، وێنەی رابەری گشتی حیزبی لەسەرقۆڵی خۆی هەڵکەندووە (کوتاویەتی)؛ رۆژانی خۆشوشتنێ بە بیانووی جێ بڕینێوە پارچە پەڕۆیەکی پێ رادەبەستێ؛ نەخوێندەوارە؛ بۆخۆی حەزی نەکردووە فێرببێ، بە کەڵکی چ دێت، بناغەی کار بیروباوەڕە؛ با

ئەو خوێندەواری هەرنەبێت، خۆ حیزب هەیەتی، یەکیەتی شۆڕەوی سەدان دانیشگای هەیە. وەك دەڵێن ئەو نا ئەو.

بەهاندان و دنە دنەی کوڕەکان (زیندانییەکان)، و زیاتریش وەك لاسایی کردنەوەی وان- چونکە، ئەگەر بەڕواڵەتیش بووە، دەبوو هەروەك ئەوانی هەڵسوکەوت کردبایە، و ((ئەوان)) هەریەکەیان خۆی بەکتێبێکەوە سەرقاڵ دەکا- بۆیە ئەویش کتێبێك و سیپارەیەك و قەڵەمێکی دەبن هەنگڵێ نا بەڵام چۆنی بگێڕمەوە، بەداخەوە فێربوونی خوێندەوارییە کارێکی تابڵێی سەخت و گرانە، دەگەڵ بیروباوەڕێدا زۆر جیاوازە. هەرتمەنەی حەوت قڕانی جیاوازە، بیروباوەڕ بۆخۆی دێت، خوێندەواری دەبێ بیهێنی- و ئەویش بە چ کوێرەوەرییەك! پیتەکان وەك مەسەلەی بیروباوەڕێ نین، ئەوان هەموو هەر خۆرادەنێن، کەچی هاوڕێیەك بە ئەندازەیەکی تەواو، و بەڵکە زیاتریش خۆڕادەنێ و خۆڕەپێش دەکا و کەسێکی دەوێ دەگەڵی بدوێ: ڕێ بکا، لێبکۆڵێتەوە- لێکۆڵینەوەی بیروباوەڕیانە؛ تۆڕی لێکۆڵینەوان بچنێ، لێکۆڵینەوەی باوەڕهێنان؛ ئاوی حەوزێ دەدرا، ڕانەوەستێ و هەر خەریك بێت و لێ بکۆڵێتەوە- لێکۆڵینەوەی ڕەخنەگرانە؛ بەڵام خوێندنێ فێر نەبێ.

چەند ڕۆژێك بوو چووبۆوە دە قەپێلکێ؛ گوایە نەخشە دەکێشێ... دوایە ئاشکرا بوو- کە نەخشەکەی سەرکوتکردنی ((دوژمنانی شۆڕش))ە. ئەوجا گەیشتە ئەو سەرەنجامەی کە باشترین ڕێگا بۆ خوێندن و نەخوێندنێ شێر و خەتە دەگەڵ مامۆستاکەیدا بکا. دەگەڵ مامۆستاکەیدا ڕێك کەوتن کە زۆرانبازییە مستەکۆڵە بکەن، ئەگەر بەزی بخوێنێ- خوێندەواریش هەمیشە دۆڕاوە- ئەگەر بردیشیەوە ئەوا کتێب و دەفتەرەکەی بدڕێنێ و قەڵەمەکەی بشکێنێ، تا هەمیشە نموونەی دامودەزگایەکەی فێربوونی خوێندەوارییەی لەبەرچاوی بیروباوەڕەکەیدا بێت. پێشبڕکێیەکە ئەنجامدرا. بووە شەڕ، هێندێ کەسی دیکەی تێوەگلا. بەڵام ئەو بە ئاواتی خۆی گەیشت. هێشتا ئەنجامی گرەوەکە ئاشکرا نەببوو و پشتی کەس وەعەردی نەکەوتبوو کە کتێبەکە دەخۆڵێ وەردرا. ئەو بەسەرهاتە کاوێژی مێشك و بیری دوێنێمان بوو.

غەم وەك بەفرێ، بەردەوام و لەسەرخۆ دەباری... ڕێ دژوار بوو. گوناهیشمان نەبوو؛ وەك دەڵێن کە ئاو سەرە و ژوور بڕوا بۆق لاوکان دەڵێ. دەگەڵ ئەو هەموو شتانەدا دۆست و ئاشنایان ڕێڕەوی خۆیانیان پێکەوە دیتەوە و سەر بەرەو ژێریان هەڵبژارد: بە پەیڕەو لە شۆڕبوونەوەی



ڕووداوەکانی مێژووەوە دەڕۆین بەڵام چۆن؛ شان بەشانی مێژوو، بەخۆ و بەکۆڵەباری سووك و گرانەوە، بێ توێشووی ڕێ، و بێ چاوساغ ((فیو-ت)) دەنگی فیتوێکی تیژ دە داڵانەکێدا هاشەی دێت؛ لە کوڕەکان ڕەتدەبێ وە دەرکی ژوورەکانی زیندانێ دەکەوێ، پێچ دەکاتەوەو دەگەڕێتەوە، و دووبارە خۆ دەکوڕەکانەوە دەسوێتەوە، و دەکەوێتە عەردی و دەنگی لێدەبڕێ. هەموو بێدەنگ دەبن...

((کاکە هەموو فەرموونە حەسارێ!)).

بەپێچەوانەی ئەمەوە، گروبانی زیندانێیە، ماوەیە ڕادەبرێ، وەك هەموو دەنگەکان چاوەڕێی ئەو فەرمانە بووبن لەپڕ وەخۆدێنەوە، و هەڵدەستن- هەموو پێکەوە- و هەریەکە وەپێش ئەویدی دەکەوێ، هەموو تێك دەقژێن، و دەیکەنە قەڵەبالغی- وەك بڵێی ڕێی یەکتر دەکەن، هەروەك شتێکیان هەستکردبێ، و دیسانەوە هەستیان ڕاگرتەوە و ڕاوەستانەوە و دوای ئەوە ڕۆیشتن. ئەو چەند ژورانەشیان کە داخستبوون دەکرێنەوە و لەسەرەکانی پەنادەرکێوە هەواڵەکە دەبیسن. جموجۆڵەکە دێتەوە سەرباروودۆخی ئاسایی خۆی و هێور دەبێتەوە...

((کاکە، فەرموونە حەسارێ... سەرۆکی زیندانێ دەیانەوێ ناوی بەربووەکان بخوێننەوە!)).

ئەمە سەرۆکی زیندانێیە- لە خۆمانە. ژاوە ژاو هەڵدەستێ؛ هەڵدەچێ و دادەمرکێتەوە- و وردە وردە هێور دەبێتەوە، تا ماوەیەکی دیکە هەڵچێتەوە. ڕەنگی هەندێکان دەپەڕێ؛ هێندێك ڕەنگیان پێنەماوە؛ هێندێك خۆ لە گێلییە دەدەن بەڵام ڕەنگ و ڕوویان سوورهەڵگەڕاوە لە دەرپەڕیوییە لاشەویلاکەی هەردوو گرووپەکانیشەوە دیارە کە هۆی ئەو جۆرە ڕەنگاورەنگییەی دەموچاوان چییە و لە کوێڕایە...

لەو سەری داڵانێوە سەروگەردن و ساقۆی (میزانیی) لەسەر ئەو خەڵکەوەڕا، لەپێش هەمووانەوە، دیارە؛ هەردەڵێی سەردەستەی دارخاچی فەلەی چاخەکانی ناوەڕاستێیە و لە هەفتەی موسیبەتێدا ئەو بەتەنێ نییە؛ هەموو خاچیان پێیە، و هەرکەسە و خاچی خۆی بە شانیەوەیە و بەرە و قوربانگای خۆی، خۆی کێش دەکات- هەموویان شەهیدن، و شەهیدانێکی زۆر و ستەم لێکراو!.

حەسار سارد و سڕە؛ بایەکی سارد لەلای تاوەرێوە، خۆی لوولدەکات و سووڕێکی بەناو حەسارێدا لێدەدات، لە مەنجەڵی حەساریٚ مشتێك تۆز و گڵ و خۆڵ و وردەکاغەزان هەڵدەگریٚ و لەترسی منداڵە وردتکان، ئەوەی پێیەتی هەمووی بەسەر چەند دار و درەختێکی ئەو ناوەداو بەنێو پەنجەرە میلدارەکانی ژوورەکانی زیندانیٚ و دەوران دەوری حەساریٚ و سەرحەوزە ئاوەکەیدا بلاٚو دەکاتەوە، و لێدەدا دەڕوا... حەسار چۆڵە. چوێلەکەکانی کە تا دوێنیٚ تاکە سوارەی مەیدانیٚ بوون و جریوەو جووکە و هات و هاوار و دروشمی خۆ پێشاندانەکانیان دەناو لق و پۆپ و گەلاٚی درەختەکاندا و لە بان گوێسوانە و حەساریٚ- لە هەموو جێیەکی- هەراسانیان لەو ناوەی هەڵگرتبوو و دەرفەتی هەموو شتێکیان لە خەڵکی بڕیبوو، هەر دەگەڵ هەوەڵێن سۆزی بای زستانیٚ گۆڕەپانیان بەجێهێشت و چوونەوە ناو کون و کەلەبەر و کەلێن و بن سوانان و خزینەوە دەلوولەی سۆبای مالاٚنەوە. ئەوانیش هەروا وەك دەڵێن، غافڵگیری زستانیٚ بوون. هەستیان نایە. خۆ لەك لەك و پەڕەسێلکەنین گەرمێن و کوێستانیٚ بکەن، نە ئەو مەلانەشن دە دارستانێدا هێلانێکی چێکەن- ئیدی چوێلەکەن. من بێگومانم لەوەی کە کەسانێك هەن و بە پەنجەی دەستیش دەژمێردرێن کە بەدرێژایی تەمەنیان گوێیان لە جیڕەجیڕی خوێندنی بەیانیانی پەڕەسێلکان راگرتبیٚ و زۆریش هەن بە خەیاڵێکی ئاسودەوە یەك دوو تلی دیکەیان دەنێوجێی خەوی بەیانیاندا داوەتەوە. ئەوەتا هەموو رۆژێکی خودای چەقەچەقە، هەموو رۆژیٚ رێپێوان، و رەگی مل دەرپەڕاندنە، و باڵ راوەشاندن. وەی لەو پاسارییە بیٚ دەست و پل و بیٚ دەسەلاٚتە زۆر بلێیانە، هەر دەڵێی بە درێژایی تەمەنیان فەلسەفەیان خوێندووە- دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەوەتا دەیانبینی غافڵگیر بووینە! ئەفسوس کە بەزمانیان نازانم. زۆرم پێخۆشبوو بمزانیبایە دوای رێپێوانەکانیان داواکارییەکان چین و چیان دە سکالاٚنامەی نارەزایەتییەیاندا نوسیوە و لەچی هەراسانن... رەنگە شتی سەیر بن. ئێستا زمانیان دەکالانەوە چووە، تەنیا ئەگەر جارجارەیەك تاك و تووك لە لوولە سۆبایان بێنەوە دەریٚ و رەش و برش و دوکەلاٚوی، جیکە و جوکێکی بکەن، هەر راست وەك ئەو ئەندامە حیزبیەی کە دوای تەپەسەرکردنیی نیوە شەوێك دەکۆلاٚنێکی چۆڵداو بەیادی خۆشبەجارانی یەك دوو دروشمان لێدا- ئەویش نا، بژی حیزب... بەڵکە ((بژی موسەدیق!)) بە واتای کرمانجی لای خۆمان پاش بارانیٚ کە پەنك!- ئەوجا دووپێی دیش قەرزکات و هەڵیٚ! یاوەك مەستێکی کە کۆلاٚنی بە چۆڵی بێتە بەرچاوان و گریٚی دۆخینیٚ بکاتەوە و وێنەی یارۆی لەسەردیوارێکی برشێنیٚ- ئەویش بە ترس و لەرزەوە...



دیارە شتێك هەیە!... دەنگە دەنگ و هەراو زەناو پێکەنینە ساختەکان هێوربوونەتەوە... هەموو لە حەسارێین. ژمارەیەك لەوانەی زووتر دەدا ویٚ کەوتوون بە حەسارێدا دەسووڕێنەوە، بەلاٚم هێزی کێشکردنی سووڕانەوە و هاتوچوونەکەیان هێندە نییە بتوانیٚ ئەو خەڵکە بە کۆمەڵ کۆمەلاٚنەی پێك هەڵوەستاون و خەریکی قسە و باس و لێکۆڵینەوە و تەخمینانن بەلای خۆیدا راکێشیٚ. ئەو هێزی کێش کردنە هەر راست وەك هەستان و نیشتنەوەی ئاوی دەریایە دەچیٚ کە هێشتا نەگەیوەتە کەناریٚ لەسەر زیخ و چەوی دەم دەریایە دەکشێتەوە و پاشەکشە دەکات. حەوزەکەش دەڵێی غافڵگیربووە: پارچە و پووچەی سەوز رەنگی تەختی بنەوەی هەموو بەلق و پۆپی درەختە چەماوەکەوە وەبەر تۆز و خۆڵی ئاسمانێوە داوە- دەرگەزی، ئەویش ئەوڕۆ بەبیٚ دەستەسڕ دەگەڕیٚ و چ قسەی نین! خێراخێرا و توندوتۆڵ، و پۆشتە و پەرداخ، و سەرو روخساری گەش، و سەروقژی ئاڵۆز و پەرش و بلاٚوەوە دەگەڕیٚ، و پێشی لە هەمووان بڕیوەتەوە. جیا لە رۆژانی دی، بیٚ درەنگ لەبەردەمی ئەمو و ئەودا قوت دەبێتەوە تا بزانیٚ داخوا فەرمایشێکیان هەیە یان نا، یا هەر بۆ خۆی پێیان بڵیٚ کە تەندروستی خۆی زۆر باشە و شەویٚ زۆر چاك نوستووە، یا هەرچی هەیە گرینگ نییە. لە بیٚ دەستەسڕیان دەستی دەگیرفانی پانتۆڵەکەی ناوە و شتێکی دیکەی بەدەستەوەیە و گەمەی پێدەکات. هاوڕیٚ کاویانی و دکتۆر هەرەندی پێکەوەن. سەری لە دەست و لەش و پێیەکانی زیاتر دەجووڵێتەوە؛ لۆچێکی سیاسەتمەدارانەی دیاری لەنێوان هەردوو برۆیەکانی کردووە و روومەتەکانی بەڕاستەخەتی تەوقە سەری لێك هەلاٚویشتوون و جودای کردوونەوە و سەرنجێکی ئاڵۆزی دیاری دەچاواندا دیارە. هەرچەند جارێکی لەپی دەستی بە دەموچاویدا دێنیٚ و بەیەك سووڕ بەلای ناوەندی شەویلاکەی چەپیدا، بە چوار ئەنگوستان بازنەیەکی تەواو لەسەر روخساری دەکێشیٚ کە بەلای راستی چەناگەیدا کۆتایی دێت. ((بەڵیٚ، وەك شتێك هەبیٚ... دروست نازانم چییە، وای بۆن دێت و واپێدەچیٚ)). بەدەنگێکی واوە کە تازەی بۆنی دەستی خۆی کردبیٚ تێگەیی، لەکاتێکدا کە ئاگای لە هەموو شتێکییە و هەموو شتێکی دەزانیٚ: دایك و خوشکەکەی هەموو جێیەکیان دیوە و بۆخۆشی بە هەموو رێیاندا بەزیوە. زۆر بەوردی، بە یارمەتییە پەنجە گەورەی جگەرەکەی لەنێوان پەنجەی شادە و ناوەڕاستێی دەردێنیٚ و بە پەنجەی شادەی لەسەرەخۆ سوتووی جگەرەکەی دەتەکێنیٚ. ((هەرچەندە پێموانییە. چونکە ئەگەر بیانویستبایە کەس بەرهەڵداکەن ئەوا دوێنێیان

بەرهەڵدەدان تا ئەورۆ گەیبانەوە و لەماڵە خۆیانیان)). سەیرکە، لەماڵە خۆیان نەك لەماڵە خۆمان!.

((ئاغای کاویانی... دیدەنی!)) پاسەوان ((هەشتی))یە. بەخۆ و عەللاگەیەکی جلانەوە کە قاتێکی پێوە هەڵواسراوە.

هەموو روو بەلای کاویانی و پاسەوانیدا وەردەگێڕن؛ تێکەوەڕابوون و شڵەژان و تێکچوونی روخساری کاویانی و ئاڵۆزییە سەرنجەکانی زیاتربوون. بەشێوەیەك وەك هیچ راز و هێمای چاوپێکەوتنێ نەزانێ. تێکڕای سەرنجەکان رق و کیناوین، تەنیا سەرنجی پاسەوانی نەبێ، کە پێکەنینی لە دەموچاوان دەباری و ئەو پێکەنینەشی گەیوەتە سەرخەتی بەرغەبابەی بن گەردەنێی، ئەویش بەهیوای پاداشتێك و بەخششێك. غەڵبەغەڵبەکە هێور دەبێتەوە و ریزەکە وەك خۆی راست دەبێتەوە و دەچێتەوە سەر شێوەی سادە و ساکاری خۆی.

خازنی، ژووری چواری زیندانێ، لە دیدەنیەڕا دێتەوە، ئەمجارەیان جیا لە ژیانی ناوەوەی حیزب. لەجیاتیان بەولاوەتردا دێتەوە و خۆ لە حەشاماتێ دەبوێرێ. هیچ خۆراك و میوەیەکی پێ نییە- یانی ئیدی تازە پێویستی پێی نەماوە: ئەوە بۆچوونی تاك تاکی کوڕانی زیندانێیە...

((ئاغای شەمسائی...)) دیسانەوە هەر پاسەوان ((هەشتی))یە. ((خێراکەن، ئاغا، خێزانتان دەمێکە چاوەڕێیە...)).

نا، هیچ نییە: چاوپێکەوتنە، چاوپێکەوتنیش هەر سێبوورییە...

دەنگی فیتوی: ئەمجارەیان گروبانی زیندانێیە: ((ئاغایان فەرموونە پێشێ، جەنابی رەییس تەشریف دێنن)) جەناب رەییس بەخۆ و بەدوو پاسەوانانەوە، هێندێك دوور، لەدواوە، ئەویش رەییسانە، و بەداو و ناوەوە، بەلاّم شاد و دڵخۆش — ئاخر ئەو بەرهەڵدانە- ئەگەر بەرهەڵدانێك لە ئارادا بێت- بەشە خێر و بەراتێکی ویشی هەرتێدایە. یانی راستییەکەی پاداشی بەشێك لە هەوڵ و ماندووبوونەکانی ئەویشە.

((ئاغایان فەرموونە پێشێ- پێشتر!)) و بەدەست چەند هەنگاوێکی بەردەمی خۆی پێشاندەدات. ئەمە خودی جەناب رەییسە. کوڕەکان هەموو دەچنە پێشتر، هەندێك بە پەلە و هەندێك بەکاوەخۆ، هەندێکیش مام ناوەندییانە!.



((...تکایە نەختێك پەلەکەن، کاتمان نییە!)).

دەرگەزیش دیارە بڕوای هەروایە، چونکە پێدەچێ وەك لەسەر ئاو و ئاگران بێت لەجێی خۆیەوە پێچان دەدا، بێ ئەوەی فەرمایشێکی هەبێ، بەلاّم گرینگ نییە. کۆمەڵەکە، سێگۆشەیەکی خوار و خێچ و سەروبنیان پێکهێناوە، کە جەناب رەییس دە ناوەڕاستی لایەکی خوارێی ئەو سێگۆشەیە دایە کە لە ژێوانانی گەرمە تەندووری و هاوڕێیانی دەمارگیری (سەری سێگۆشەکەوە، تەزبیح بەدەستەوە، یا بێ تەزبیح، و بە قەڵافەتێکی لاسارانەوە هەرکەسە جێی خۆی گرتووە و راوەستاوە.

جەناب رەییس دەپێشدا چەند ئاماژەیەکی بە پیرۆزی و خۆشییە رۆژی پیرۆز و پڕ بەرەکەت کرد و لەلایەن خۆی و بەناوی ((ئاغایان))و خاو و خێزانیانەوەی ئەم رۆژە مەزنە پیرۆز کردو بەو هیوایەی کە ((شنە))ی پەیامی دۆست بەگوێی یار بگەیەنێ- بە سەلامەتییە چاو و ئەبرۆی یار هوڕا دەکێشێ- یانی هەموو تێکڕا هوڕا دەکێشین: لە بنکەی سێگۆشەکەوە پڕ بە گەروو و، لە ناوەڕاستێیەوە هێندێك نزمتر، و لە قوچکەی سێگۆشەکەوە تەنیا هەر فسکەفسك هات، بەدەموزاری بەشەوە، بەلاّم بێدەنگ، وەك دەمی برسیان، ئەمما بێدەنگ و بەنگ! هەموو کارێك حیسابی خۆی هەیە، نەدەبوو دەموزار بەش نەبنەوە، بەلاّم دەکرا دەنگیان لێوە نەیەت- دەموزار کرانەوە و پێکدادانیان دەکردنە راپۆرت، بەلاّم دەنگ لێوە نەهاتن نا: بنەچەکەی کارەکە دەنگە. ((هەر دەنگە کە دەمێنێتەوە!)) ئەمەش بۆ خۆی لەخۆیدا هەرگاڵتە پێکردنێکە، بەلاّم بەڵگەی تاوانێشی بەدواوە نییە- ئەوەی بەتاقیکردنەوە فێرببووین. لە ژوورەکانی دیشەوە دەنگ و زەنای لەم شێوەیە، هەربە و ئاوێتەیەشەوە دەهاتەگوێ... هەندێ لە بەندییەکان دوای دیدەنییە کەسوکاریان دەگەڕێنەوە؛ هێندێکی دی دەڕۆنەوە. هاوڕێ شەمسائی لەجیاتی ((ئاغایان))و خاوخێزانەکانیان چەند وشەیەکی بە توێکڵی جوان ئاراستە دەکات و هاوڕێ کاویانیش بەشان و شەپیلکی داچەکاویەوە لەبنکەی سێگۆشەکەوە چەند شتێکان دەردەفرتێنێ... هاوڕێ شەمسائی، هوڕا- هەموو هوڕا!.

هەر کە هات و هاواری هوڕایە دەنیشێتەوە جەناب رەییس زەردەخەنێکی بە گۆشەی لالێوی چەپیدا دێنێ و بەدڵنیاییەوە پارچە کاغەزێکی بەدەم زەردەخەنێکی دیکەوەی لالێوی راستییەوە لە گیرفانەکەی سەرەوەی چاکەتەکەی دەردێنێ؛ تا ئەو قۆپچەی گیرفانەکەی

دەترازێنیٚ هێندێك چەپلاٚن لێدەدەن، و هوڕای دەکێشن... جەناب رەییس ناوی ئازادبووەکان دەخوێنێتەوە...

((ئاغایان، ئاگاداربن... ئاغایان، سەیرکەن!...)).

لەبەرئەوەی ئاغایان کردیانە هەراو قەڵەباڵغی دەبیٚ داوایەکانی جەناب رەییسی هەموو بەجیٚ بێنن.

((شەمسائی... ببوورن، بۆ کار ئاسانییە وشەی ((ئاغا)) لادەبەین... شەمسائی... کاویانی- مەحبوب کازمی... قاسمی- ئەشرەفی- سەباحی... رەزایی...)).

کە دەگاتە سەر رەزایی و سەباحی ژمارەیەك هوڕای دەکێشن- ئەوەش هەر گاڵتە کردنێکە- بەخۆمان. ((ئاغایان، ریٚ بدەن، ئاغایان ددان بە خۆتاندا بگرن و ئارامتان بێت!)) ئاغا دەستیان کردە قەڵەباڵغییە، بەلاٚم وردە وردە هەردوولایەنەکان دڕدۆنگ دەبن...

بارودۆخەکە هەڵگەڕاوەتەوە: ئازاد بووەکان بەپێچەوانەی ئەوانەی کە بۆ دوورخراوەییە دەچن یا فەرمانی خراپیان دەربارە دەرچووە گرژن، رەنگیان پەڕیوە، هێندێکیان سوورهەڵگەڕاون، بەلاٚم زۆربەیان رەنگیان پێنەماوە. زۆربەی زۆری لاشەویلاکە و روومەتەکان دەرپەڕیون. سەریان بەردەدەنەوە و روو لە زەوی دەکەن. ئەوانەی کە ناوی بەربوونیٚ و ئازادکردنێشیان تێدانەبووە ئەوە پێدەکەنن. لەوانەیە هەردوو گرووپ هەر درۆ بکەن- لەوانەشە هەردوولاشیان راستکەن. بچتەدەریٚ و بەرهەڵدابێت لە دەریٚ چ بکا؟ تازە سەرەتای کارە: ئەو سەودایە هەر ئەو قازانجەی لێدەوەشێتەوە؟...

با گەدە و گیپاڵی لێرە ون بیٚ و بحەسێینەوە! هەرنەبیٚ پیاو و ناپیاو لێك جودا دەبنەوە، لێگەڕیٚ با بڕوا! لەوانەشە هیچ لایەکیان نەبیٚ: لێرە بمێنێتەوە چ بکا؟ هەر دانیشیٚ و تەمەنی خۆی و ئاوەلاٚنی بجوێتەوە و بەتف بیداتەوە بەڕووی هەرچی جوانی و کرێتییەکی ئەم دنیایەیە؟... نا، زیندان جێیەکی چاك نییە: زیندان زیندووانە؛ یانی وایان داناوە کە تۆ زیندوویت، و کەچی هەر لەهەمان کاتیشدا مردووی؛ یانی هەر بەزیندوویی دەبیٚ رۆڵی مردوو بگێڕی- ئەگەر بۆ خۆشت نەیگێڕی پێت دەگێڕن. ئەگەر لە ماڵیٚ کەسێك هەبیٚ شانازی بە بوونی تۆ، بەزیندووییە مردوویەتیتەوە بکات یا کوڕێکت هەبیٚ کە بە شانازی تۆوە دڵی کیژە



دراوسێیەك بەلای خۆیدا راکێشیٚ، دیارە بەوەشەوە دەتوانی سەربەرز بیت و خۆت بەگەورە بزانی. رەنگە لەوانەش بێت حیسابی ئەوەشت کردبێت دڵی خۆت بەوەی خۆش کردبێت کە لە دەرەوەی ولاٚتی ئەوە ئاوەڵەکانت قاڵب و گەچیان ئامادە کردووە و خەریکن پەیکەری ئازایەتی و خۆڕاگری و بەرگریت بۆ دروستدەکەن و پێشانی دنیایەی دەدەن. ئی وا هەیە گوێی لە شڵپە شڵپی گەچ تێکوەردانی دروستکردنیٚ پەیکەرەکەشە... هێندێکیش هەن نایانەویٚ راستە و راست و بەهەموو جۆرە نرخێك بێنەدەریٚ، ((ئازادی)) بە هەموو جۆرە نرخێك قبووڵ ناکەن، چونکە دەیانەویٚ مرۆڤ بن و بەسەربەرزییەوە بژین، دەنا خۆ لەبەر چاوی رەشی ئەو ئاغایانە نییە کە بێن و چەند ساڵێکان دە زیندانێدا بە چەرمە سەریٚ و سووکایەتی پێکردنێوە بەسەربەرن...

ئیدی، زیندانە، زیندان فریشتان پەروەردە ناکات... ئەگەر ئامانج هەر تەنیا ((ئازادی)) بێت و هیچی دی ئەوە هەردەمێکی بتەویٚ دەتوانی پێی بگەی، چونکە شتێك بەناوی ((ئازادی))یەوە نییە، هەرکاتیٚ کە پێی گەیشتی دەبینی ئەو گەورەیی و مانایەی نییە کە دەزیندانێدا هەیبوو و لە دوورەوە خۆی بۆ وەدەردەخستی و خۆی پێشان دەدای- تەنانەت دەنگی دەهۆڵیش نییە لە دوورەوە خۆشبیٚ. ناو خوێندنەوە بە کۆتاهات، هوڕاکێشان تەواوبووە؛ کۆمەڵێك دەوری رەییسی زیندانییان داوە و سوپاسی لێدەکەن: سوپاسی ئەو زەحمەتانەی کێشاونی، ئەو لوتفەی کردوویەتی، ئەو رێنماییانەی کە فەرموونی، بەلایەنی خۆیەوە خاکەڕاییە دەنوێنیٚ: کە هیچی نەکردووە، و ئەرکی سەرشانی خۆی بووە، لەوەش زیاتری خەجاڵەت نەکەن! ئینجا روویان لێوەردەگێڕیٚ و هەر بەهەمان دەنگی رەییسانەی، مەیلە و دۆستانەوە، روو لە حەشیمەتەکە دەڵیٚ: ((ئەو ئاغایانەی کە بەرهەڵدا دەبن بەبیٚ زەحمەت سەعات یازدەی تەواو لەبەردەمی پەنجەنیگارییە ئامادەبن. تکا دەکەم دوانەکەون، کەلوپەلەکانتان هەر لەئێستاوە کۆکەنەوە، با درەنگمان بەسەردا نەیە، ئەو خێزانە بەستەزمانانە باهێندە لەبەر دەرکیٚ رانەگرین، چونکە دەبیٚ پێش رۆیشتنیٚ پەنجەمۆرتان لە فەرمانداری نیزامی وەرگیریٚ. سێگۆشەکە تێکچووە... سەباحی رایکردووە و تا ئەو بەستەزمانە ئاوڕی داوەتەوە چەند مستێکی حەواڵەی سەرو کەللەی کاویانی کردووە و کوتاویەتییەوە گوایە بەگوێی دانوساوە! کوڕەکان دەگەنیٚ سەباحی دەگرن، کاویانیان دەنێوەخۆگرتووە، و ئەویش بەڕەنگ و روویەکی هەڵبزڕکاوەوە راوەستاوە و دەستەسڕەکەی توند بەگوێی خۆیەوە ناوە... کوڕەکان لە پێهەڵپڕژینیٚ بەربووەکان خۆ دەپارێزن؛

هێندێکیان تەنانەت هەرتاکە سەرنجێکیشیان لێ چاون و هەر سەیریشیان ناکەن. دەچم و بەتاسەوە ئامێزێ دەگرمەوە و بەگەرمییەوە حوسێنی ماچ دەکەم- ئاخر دەست چێنی خۆم بوو؛ ئەوە شیوێك بوو بۆخۆم بۆم لێنابوو؛ شەرمەزاری خێزانەکەشیان ببووم، هەرچەندە بۆخۆشی و خێزانەکەشیان بەدەستی خۆیان دەستەچیلەی ئەو ئاگرەیان پەیداکردبوو. شەرمی دەکرد بێتە پێشێ؛ راوەستابوو و بەرەنگێکی ژاکاوەوە دەعەردییەوە رامابوو، هەرراست وەك ئەوەی کتوپڕ دەچاڵێکەوە کەوتبێ. دەستیم گرت، هەردوو پێکەوە سووچی چوارگۆشەیەك، ئەوپەڕی لای خۆراوای دیواری ژووری سێی زیندانێ. دەمزانی هیچی نییە کۆیانکاتەوە جلەکانیشی هەر ئەوەبوون کە دە بەریدابوون.

دەمەوێ سەری قسان دامەزرێنم، بەلاّم نازانم چۆن. لەسەرە داوێکی دەگەرێم، کە خۆی دەست پێبکا! ((زۆر ناخۆشە! برات بکوژن؛ خوشکت دەکاری نابەجێوە بگلێنن، خودی خۆشت بێ ئابڕووکەن، ئینجا بچی و دەست و پێیانیشیان ماچکەی و... هوڕای بەسەلامەتییەوانیشەوە بکێشی...)) لێو و چەناگەی دەلەرزین و دەستی بەگریانێ کرد.

دەڵێم: ((نا، ئیدی، بەخۆڕایی خۆت ناراحەت مەکە... ژیان کەوتنیش و هەستانەوەشی تێدایە... ژیان هەموو دەمێ هەر لەسەرباریێکی نییە... خۆت ناراحەت مەکە... نمونەی وەك مە زۆرن... سەربازی ئازاش بەدیل دەگیرێ، گوناهی وی نییە... خۆ بەسەرهاتی بلوخری دەزانی)). ئەودەمی وابوو، نمونەی لەمێژووەوە دینینەوە- ئەویش لەمێژووی میللەتانی دی: لە جۆرج وجان و ئەنتوانەوە... ((هەمان ئەو بلوخرە کە لەپێشدا دیلی ناپلیۆنی بوو دەگەڵ ویلینگتۆنی ناپلیۆنیان شکاندەوە... ناراحەت مەبە؛ ئەوە ژیانە، و دێتەپێشێ)). ئەوان قسانەم هەروا بەسەرزاریدا هاتن و گوتنم- ئیدی ئەمنیش هەڵچوو بووم. راستیدەکرد. رێیەکی سەیر و دژواری پێوابوو.

((ناراحەت نیم؛ گێژم... نازانم چ بوو... بۆ وای لێهات... کێشەی ئەو ئەفسەرانە چ بوو... ئەدی هەر ئەو ئەفسەرانە نەبوون دە هەموو کون و کەلەبەرێکی ناو دەزگاکاندا بوون؟- بەقسەی ئاغای-)) مەبەستی بابە بوو ((کاتێ ئەو چەند دانەیەی هەوەڵییان لێگرتن- ئەوکاتەی کە ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەرانیان گرت- هەر بەو سەرگوردە خێرخوازەی کە فەرماندەی گاردبوو بە نوێنەرایەتیە خۆیان هەڕەشەیەکیان بۆ شای ناردبایە لەو بلاڤۆك و



بەیاننامە شەوانەیانە باشتر نەبوو کە لەسەرمێزەکەی و مێزی ئەوانیدییان بلاّو دەکردنەوە و دەیانکردە تەپ و تۆز و تەمتومان... ئەوانەش هەر مرۆڤن، ئەوانیش دەترسن، ئەوان لەمە زیاتر دەترسن، چونکە ئەوان خواپێداون و هەموو شتێکیان هەیە و تام و چێژ لە ژیان دەکەن...)).

ژمارەیەکیان هاتنەوە دەرێ و بە بیانووی هێندێ کە گوایە هەواخۆش نییە بەرۆکەیان لێ راخست، گوایە موتالاّیە دەکەن. کتێبەکانیان کردنەوە، هەموو چاوەکانیشیان کردنەوە، بەلاّم وەك کتێبێکی دیکە- کتێبێکی لە هەموو کتێبان گەورەتر- تەماشاکەن، سەروبنی قسان گەرمە؛ هاتوچۆی دیدەنییان گەرمە؛ دەرگەزی چ سوسەیەکی نییە، هەروەك ئەوەی کە ئیدی فەرمایشی نەمابن و بەڕاستیش حاڵە چاکە و گرینگیش نییە. ناوی دەلیستی بەردراوەکاندا بوو. لەوانەی وەبەر بەخشین و کەمکردنەوەی حوکمەکانیان نەکەوتبوون، هێندێکیان بە دەردی وی (دەرگەزی) چووبوون- جێی خاڵی- خێراخێرا، بەتاقی تەنێ، بە حەسارێدا دەگەڕێن، هەموو پۆشتە و پەرداغ، چاوەڕێبوون ناویان دەلیستەکەیدا بێ و نەبوو. سەرنجەکان پەرت و بلاّوبوون سەرو روو و دەموچاو گرژ، وەك پێشبڕکێی راکردنی سەد مەتریان راکردبێ، هەرچەندە دەیانەوێ خۆیان هێور و ئارام و هێدی و هێمن نیشاندەن، بەلاّم ئەم هەوڵەیان کارەکەی هێندەی دیکە خراپتر کردووە...

من دەربارەی دۆڕان و بەزینێ دەدوام نەك بردنەوە و سەرکەوتن، دیارە ئەو هەستەمان هەبوو، بەلاّم نەماندەزانی و نەشماندەتوانی ئەو هەست و نەستەی خۆمان دەقاڵبێکی شایستەی والێوەشاوەدا بەیانکەین کە راپەڕینێك هەروا لە خۆیەوە و بەبێ خەبات و هەوڵ و تێکۆشان تەسلیم بێت دیارە ئەو راپەڕینە خۆی لەخۆیدا خۆی نەفی کردۆتەوە و هیچ نەبووە. دەمانزانی، خوێندبوومانەوە، کە دۆڕان و کەوتن بەمانای دۆڕانی موتڵەق نییە. بەلاّم، ئاخر خۆ ئەوەکەوتن نەبوو؛ کەوتنی رووبەڕوویانە، ئەویش کە رووبەڕوو بوونەوەیەکی راستەقینەی وا، کە دەگەڵ شەونامە و دروشم هەڵواسین و رێپێوانێدا زۆر جودایە. کەوتن دیوێکی هەوڵ و خەبات و تێکۆشانە. کێشەی ئێمە شەهید بوونێکی شەکەبەرانانەبوو: لاشە پێشکەشکردن بە کەسانێکی چوون خوداوەندانە. دیسانەوە خودا لەبابی شەکەبەرانێ خۆش بێ کە بەپێچەوانەی حەز و ئارەزووی خاوەن نەزر و نیاز هەرنەبێ دەدەمی سەربڕینێدا دەستوپێیەکی رادەتەکێنێ و لرخە

لرخێکی هەردەکا... گومان لەوەدا نییە کە مەرگ سامناکە، بەلاّم مەرگ و مردن لەرێی ئامانجدا، بۆ کۆڕەلاوان، کەوە دووی هەر پیاو و ناپیاوێك دەکەون و دەبنە قوربانی و هێشتا یەکێکیان نەکەوتبوو یەکی دی جێی دەگرێتەوە و وەك تیرەی ئاجوج ماجوجان لەبن نایەن تا بلێی دژوارە بەلاّم سامناك نییە. ئەوانە فێربوون و ئێمەش دەتوانین فێربین، ئەگەر ((ئێمە)) هەبین. ((یەك کۆمەڵە دۆست و پیاوی چاك و ئاشنا و رۆشنایان هێناونەتە ئێرە و دەگیانی یەکتریان بەرداون... دۆستی ئازیز، نەفرەت و بێز لە دوژمن کردنەوە کارێکی زۆر سروشتییە، بەلاّم نەفرەت لە دۆست و ناسیا و کردنەوە قوربانییەکە و گیانی مرۆڤ دەخوا، با ئەو دۆستانە لێکیش دڕدۆنگ بن... بەلاّم بۆ نابێ دۆست بن؟ چ قەوما وا ئەو هەموو دۆستە چوونە پاڵ دوژمن و دەگەڵ دۆستەکانیان کەوتنە جەنگ؟ بەو هەموو خوێنە رژاوە رەوڕەوەی کام شۆڕش وەگەڕ نەدەخرا؟ ئێستا ئەو هەموو گۆشت و خوێن و ئەو هەموو کەفوکوڵ و هەست و نەستانە، ئەوەتا بوونەتە ئێسك و پرووسك بەسەربەردانەوە، تا رۆژێك کەسانێك لەودیوی جاخانەی موغازەکانیانەوە دایانبنێن و وەك شتی عەنتیکە و شوێنەواری کۆن پێشانیان بدەن، ئەویش بەناوی رەنجی مێژوویی خۆیانەوە!)).

گوتم: ((تۆ راست دەکەی- بەسەرهاتی ئازاران دوور و درێژە و زۆری قسە گەرەکە، بەلاّم ئەمەش هەر رێچکەی ژیانە- ئێمە بێ گوناهین...)).

هاتە ناو قسەکانمەوە ((وایە کاکیلە! ئەوە رەفتارمان دەگەڵ کێشەی نەوتدا، ئەوە بەڕوو داهاتنەوەمان دەگەڵ ئەوێ پیرەمێردەی کەلاسایی هەرچی قەل و کوند و مەیمونە دەیکردەوە- ئەوە رەفتارمان دەگەڵ خۆماندا، رەفتاری ئاغایان دەگەڵ دەوڵەتی زاهیدیدا... ئێستا من بەڕوویەکەوە سەیری نەتەوە پەرستەکان ((میللیە)) دەکەم؟ من بەخودی خۆم سەدجارم موسەدیق بە نۆکەری ئەمەریکای تاوانبارکردووە... من بە چ روویەکەوە بچمەوە ماڵی ئێوە؟ کەمم شەونامە بۆ ئاغای چاپکردووە؟ هەموو کارەکانمان هەربووە شەونامە و هەواڵی بەراوەژوو و درۆ. من ناپاکیم دەگەڵ ماڵێ وەدا کردووە...)).

((ئەمەیان گرینگ نییە؛ کاری من یا ئی تۆ لەجێی خۆیدا بوو و راستیش بوو... ئەوانەی دیش هەموو لق و پۆپ و هەژگن. هەڵەی کارەکان ئەوە نەبوو کە بەراشکاوییان گرتبوون- شەونامەش پێویست بوو... کەواتە، بۆ ناتوانی سەیری چاوی نەتەوەییەکان (میللیەکان)



بکەی؟ کام لە نەتەوەییەکانیان، هەر لە ئەندامێکیانەوە تا رابەرەکانیان خستنەژێر دار و ئازار و ئەشکەنجەوە، کامیان کوشتن- دکتۆر فاتمیشیان هەر لەبەرهێندێ کوشت کە پەنای بۆمە هێنابوو و هاتبووە لای ئێمە...)).

((ئێستا ئەوە، هێندێك لەو گوو سەگانە چوون و کۆمیتەیان دروستکردۆتەوە کە بەخێری ناگیانیان رۆژێك بێت بێنەوە و هەمان تاس و هەمان حەمامی جاران دامەزرێننەوە، تا ئێستا دوو وشەیان لە بابەتی ئەوەوە نەنوسیوە کە داخوا ئەو بارودۆخە بۆ وای لێهات... ئەو یەزدییە گوێلپارەیە دەیگوت مریەم فەیرۆز ئەوی هەڵخەڵەتاندووە، ئەو گووسەگەیدی- ئەو بەهرامە بەدبەختە- هێشتا چ نەبووە ئەتۆ بچی عەلەوی فەرمانداری نیزامی لە خشتەبەری و دوایی ببیە هەوالّگری زیندانیّ!... ئەو گوو سەگەیدی- ئەو موتتەقیە- داوێ بۆ (زۆربەهی) بنێتەوە. دەو دواییانەشدا بیستمان کە ژنە فەرەنساوییەکەی جەودەتی دە شەو دانیشتنێکیدا! — بەختیاریی لە هەبوونی سازمانی نیزامی ئاگادار کردۆتەوە- ئاخر خۆ جەودەت بۆخۆی پەیوەندی بە سازمانی نیزامی (رێکخراوی سەربازی)یەوە بوو... یان وەك دەڵێن ئەو، کەیانورییە، رۆژی بیست و هەشتی مردادێ دەینێرن دەگەڵ موسەدیقیدا قسان بکات دەچێ ئاغایان دەبینێ و کاتێکی دێتەوە کە کار لەکار ترازاوە!...)).

((لەم بەسەرهات و رووداوە ورد و درشتانە زۆرن؛ وەك دەڵێن کەچکێ قوڵەی تێناچێ. بەڵێ بەداخەوە زۆرینەی قسە و مەتەڵەکانی بابەی راست دەرچوون. بەچاوی زەقەوە چووین کەچی پێشە خۆمان نەدەدیت؛ کاتێ وە ئاگا هاتینەوە و چاومان کردەوە کە وەك کرمانج دەڵێن ((ها، پف!)) ئەو حیزبە گەورە هەروەك میزڵدان (دەبدەبە)ی مندالاّن بەو هەموو گەورەییەیەوە بەنووکە دەرزییەکی فش بۆوە و لەجێی خۆی پان بۆوە و بووە مشتە چەرمێکی چرچ و لۆچاوی و سیس و ناشیرن و مردە. هەروەك بلّقی کەفە سابوونێ تەقییەوە و نەما... دەگەڵ ئەمانەشدا لەبیرت نەچێ...)).

چم لەبیر نەچێ! بۆ دەکرێ لە بیر بچێتەوە؟...)).

((زۆر چاکە- ئێستا وەختی گریانێ نییە، ئیشمان هەیە، وەخت کەمە)).

لووتی خۆی گرت و زەردەخەنەیەکی مات و بێڕەنگ و رووی بە لێواندا هێنا. تا ئێستا هەرگیز ئەو شتانەی نەگوتبوون.

((چ لەبیر نەکەم؟ بۆ ئەم هەموو سووکایەتی و خوار و خێچیانە لەبیر دەکرێن؟ باشە چەندم گوت و چەند جارانم هاوار کرد گووم خوارد؟)).

((مەبەستم ئەمە نەبوو؛ ئیدی هەرچەندە و بەهەرحاڵ هەرچی بیڵێم و نەیڵێم لەبیرت دەچێتەوە- هەموومان هەر لەبیرمان دەچێتەوە... گەورەکانیش زیاتر سوود لەو لەبیرچوونەوەیە دەبینن... ئادەمیزاد بوونەوەرێکی سەیرە. هەر ئەو رەییس زیندانەی قزڵ قەڵایە وەختێکی یەکێك بوو لە ((هاوڕێیان))، ئەمن چاکی دەناسم، و ئەوا ئێستاش بۆتە رەییسی زیندانیٚ ((هاوڕێیان))و ئامۆژگارییان داویٚ و شانازییە بەوەندەیەوە دەکا کە بۆخۆی بەدەستی خۆی ئەشکەنجەی زیندانییان نادات، و بە ئیدیکە دەڵیٚ ئەوکارەی بکەن. هەر ئەو رەییسی تەندروستیەش ئەویشیان سەردەمێکی دەگەڵ (ئارانی)دا گرتبوو. کەچی کە سەیریشی دەکەی هیچ وا پێناچیٚ هیچ بیٚ. بەداخەوە هەر بەو شێوەیەی کە، بابە دەیگوت نەماندەزانی. رەنگە ئەویش بەڕاستی نەیزانیبیٚ چ دەڵیٚ، و هیچ بەڵگەیەکیشی بەدەستەوە نەبوو بۆ قسەکانی، بەڵام ئەزموونەکان ئەو هێزەیان دابوویە کە هەندیٚ شتان هەر لە زووەوە پێش روودانی هەست پێبکات. لە بەدبەختیانمان ئێمە هیچ شتێکمان دەربارەی خەڵك و دەوروبەرەکەمان نەدەزانی- بە قسەکانی وی وەك سەرخۆشێکی وابووین کە هەموو کەسێکمان بەسەرخۆش دەزانی و خۆمان بە وشیار... ئەوانەش هەمووی لە ناکۆکیەرا سەری هەڵدا: نەمانزانی ئێمە چین و لە کوێین. ئازادیمان گەرەك بوو، ئەویش چۆن، ئازادییەکی بیٚ سنور! و هەر ئەو تێنەگەیشتنەش داوێنی زۆرانی گرت و بە داخەوەش لەجیاتی ئەوەی جەڵەوی ئەوکارەی بگرنەوە زیاتریان پیٚ لێهەڵێنا- واش پێدەچوو زیاتر بە ئەنقەست وابکەن. بەداخەوە بەدامەنی زۆرانەوە نوسا، جا هەر لە تەلاٚ و سیامەندەوە تا دارەگوڵ و من و لە تۆوە بگرە تا سەباحی، و لە هاوڕێی حیزبیەوە بگرە تا مستەفاخان... داوێنی گەورەکانیشی هەرگرتەوە کە ئەوە تائێستا وەسواڵیٚ کەوتوون... هەموو جێیەك هەر ناکۆکییە: ئەویش لەوەوە کە هاوڕیٚ نەبووین و یەکتریمان بە هاوڕیٚ بانگ دەکرد، لەوەوە کە خۆمان بەبرا بچوك دادەنا و نەماندەزانی بۆ؛ لەوەوە بوو کە کەسانی دیکەمان هەروا لەخۆڕا گەورە دەکردن، و هەروەها لە زۆر شتی دیکەشەوە...)).



حوکم کەم کراوەکان هەروایەك یەك و دوو دوو بەرەو ژوورەکانیان دەچنەوە تا نەوەکو شتێکیان لەبیر چووبیٚ؛ راسپاردان وەردەگرن، نامە و هەواڵاٚن دەبەنەوە، ناو ونیشانان دەگەڵ بەندییەکانی دی دەدەنە یەکتری. دیدەنی و سەردان و چاوپێك کەوتن هەروا بەردەوامە دەگەڵ ئەوانەی حوکمیان سووك کراوە و دەگەڵ ئەوانەشی کە هەروەك خۆیان ماونەوە و حوکمیان لەسەر سووك نەکراوە. خێزانەکانی تاقمی دووەم —ئەوانەی کە توانیویانە- هەر بۆ دلّدانەوە و روونکردنەویٚ هاتوون و بە پیر و پێغەمبەران سوێند دەخۆن کە دەستە و ئەژنۆ و دەستەوەستان دانەنیشتوون، هەمیشە هەوڵیان هەرداوە، بەڵاٚم چ بکەن کە لە دواساتەوەختەکاندا کەسێك زووتر پیٚ راگەیوە و یەکێکی دیکەی دەلیستی ناوەکاندا نوسیوە. یان بە پێچەوانەوە، ئەوانە هاتوون داوای روونکردنەویٚ لەوان دەکەن کە بۆچی هیچ هەوڵ و تەقەللایەکیان نەداوە و نەچوونەتە لای گەورە بەرپرسان، ئەوەتا ئەوان دەڵێن کە ئەم بەندییانە (زیندانییانە) بۆخۆیان نەیانویستووە حوکمەکانیان لەسەر سووك بکرێت و گوتوویانە هیچ پەیوەندییەکیان بەخێزانەکانیانەوە نییە و گوێشیان نادەنیٚ، دەنا ئەگەر وانەبەیا جووڵەیەکیان هەردەکرد- لەو رۆژ رەشیەی...

((راستییەکەی ئەگەر لە من دەپرسی واز لەو شتانە بێنە- تەنانەت یەك دەقیقەش رامەوەستە، ئەو پیرێژن و پیرەمێردەش هەقیانە)). من ناڵێم ریٚ و رێبازەکەمان چەوت بووە، بەڵاٚم هەڵە و ئەنقەستی ((هاوڕێیانی سەرەوە)) هەرتەنیا یەك و دووان نەبوو، ئێمە بیٚ ئەزموون بووین- لە هەر روویەکەوە کە بڵێی: هەر لەخۆ پێشاندان و ریٚ پێوانێوە کە بۆ ناردنی نەوتێمان بۆ شۆرەوی و دەست گرتنیٚ سەربازی سوپای سوورەوە بەسەرخاکی ولاٚتیدا گوایە بۆ پارێزگارییە، لەو رێپیوان و خۆپێشاندانانەوە بگرە تا رووداوەکانی ئازەربایجان و گەمە و یارییەکانی قیواموسەڵتەنەوە کەسەری حوشترێی لە چادرێڕا بردە ژووریٚ و کوشتی و لەویٚ لەملیدا، و دژایەتییە میللی کردنیٚ نەوت و دکتۆر موسەدیقیش، دیارە کەمایەی ریسوایی و ئابڕوو چوونێیە- ئیدی ئەوە بێجگە لە ((وردە هەڵە))ی دیش کە بەدەردی مەلاٚ حەسەن دەڵیٚ ئیللا ماشەڵڵاٚ! سەربوردەی چوونێشم لە شاری خۆمانەوە بۆ شارەکەی نزیکمان هەر ئاوابوو: لە شاری خۆمانڕا بەسواری ئەسپی دەچوومە سەقزی، زۆر ماندووبووم، دەبیر و خەیاڵاٚنەوە چووبووم، جا هەرچی بیٚ زۆربیٚ وازبووم. ئەسپەکە شارەزا بوو؛ جەڵەوم هاویشتبووە سەرملی و ئەو بۆخۆی دەڕۆیی. چاوم زەق بوون، ئەسپەکەم دەدیت کە لە گەرمان ملی راکێشابوو و سەری بەردابۆوە و ساڵدانە ساڵدانە بە ئارەزووی دڵی خۆی رێی دەکرد، و لە لالغاوەکانیەوە کەفی هەڵدەدا؛ و من

بەچاوی زەقەوە ئەولاولام دەدیت، و لەکاتێکدا کە سەرم تەکەتەکی بوو بەملمەوە دەدنیای خۆمدا نقوم ببووم، و ئەحمەدیش بەو نیازەی کەمن مەبەستێکم هەیە، هەروا بەدوامەوەیە و دێت، کە لەپڕ لە دەنگی سەگوەڕی گوندی بەخۆ هاتمەوە. دەبینم ئای، خۆ ئەوە لە دەوروبەری ((ئابچی))یەم![1] ناراحەت بووم: ئەسپ هەروا بەدەم لەوەڕێوە لاڕێ بووە... دوورا و دوورم ڕێیەکە دەدیت کە وەك ئەژدیهایەکی بۆرەقنە خۆی لە زەوی داوە و پێچ و لوولی لەشی دەوشیوو دۆڵەوە دەسوێ و کاژان داوێ و دەڕوا... دەك کویراییت دایە! هەر بۆ چەمکە گیایەکی! تا دەست دێنێ قامچییەکم ئاخا و تەسەر و مل و کەفەلانی. دەمگوت: ((ئەمنیش وردە وردە وەك بابەم لێهاتووە- حەکایەتان دەکەم؛ حەکایەتی مەلا ڕێوییە خۆ لەبیرتە؟)).

((من هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە!)).

((بەڵێ، ڕێ و بان بێ سەرو بەربوو؛ ئێمە هەموو گێژ و وێژ بووین، کە جەڵەومان شلکرد ئەسپەکان بە ئارەزووی خۆیان بڕۆن. دەبوایە ئێمە جەڵە و بەدەست باین و ئەسپەکانمان هاژوابا، دەنا ئەوە ڕێیە و پان و بەرین و بێ سەرە و بەرەیە. ئێمە نەدەبوو کەوتباینایە وەنەوزدانێ و ئاوا لێگەڕابایناية ئەسپەکان بەدەم لەوەڕێوە لاڕێ بن. من و تۆ و ئەوانەی وەك ئێمە ئەگەر گوناهێکیشمان هەبێ- بێگومان کە هەشمانە- ئەوەیە کە دەو مەملەکەت و وڵاتەیدا، دەگەڵ ئەو هەموو تێکەڵاویە نەژادی و فەرهەنگی و مێژووە شەپۆلاوی و ئەو هەموو بارە تایبەتییە جوگرافیاییانەدا، زۆر سادە و ساکار بووین؛ ڕووداوەکانمان زۆر بەسادەییەوە وەردەگرت. قسەکانمان هەمووی قسەی هەست و سۆزمان بوون، ئێمە نەماندەزانی کە دەبوایە شتێك بڵێین و شتێکی دیکەمان کردبایە و ئەنجامان دابایە. ئێمە پێمان وابوو یاری شەترەنجێنێ دەکەین، و بەرامبەرەکەمان دیار و ئاشکرایە، بیردەکەینەوە و بیرەکەمان دەچتە دەمێشکییەوە و ئەودەم مێشکمان بڕیار دەدات و لەو هەموو هەوڵ و تەقەللایە مەعنەوی و ئەو هەموو خۆراکەی داومانەتێ بەشێوەیەکی شایستە سودی لێدەبینێ... و ئەوا ئێستا دەزانین کە شەترەنجێنەکەمان هەمووی هەر دەستووری و تەلگرافیانە بووە، تازە دەزانین کە مێشکمان هەرتەنیا دەزگایەکی وەرگربووە و هیچی دی: هەر ئەو دەستوورەی جێبەجێ کردووە کە چۆن داشەکان بجولێنێ، و هەرکە دەستوورەکەشی پێگەیوە ئیدی داشەکە خوراوە. ئەمە بەلای بابەوە نەك هەر شەترەنج

---

[1] ئابچی: گوندێکی نزیك شاری سەقزە.



نەبووە بەڵکە دامەش هەرنەبووە. ئێمە نەدەبوو ببینە داشی بێ گیان، هەرچەندە وائێستا پەی بەوە دەبەین- دە تەواوی ئەو ماوەیدا- بەڵام خۆ ئەگەر هەزاران گیانی دیشمان هەبایە دەو دەزگایەیدا لەوەی هەر زیاتر نەدەبووین کەبووین.

دەوجۆرە دەزگایانەدا ئەگەر هەزار گیانیشت هەبایە تەنانەت دەردێکی تۆی دەرمان نەدەکرد و بەکەڵك نەدەهات. مێشکێك بۆخۆی بیرنەکاتەوە و تایبەتمەندییە بیرکردنەوێ خۆی بە یەکێکی دی بسپێرێ و چاوەڕێی هاتنەوەی شەپۆلەکانی مێشکێکی دیکە بێ ئەو مێشکە هەرگیز مێشك نییە، ئیدی ئەوە دیارە کە ئەو جۆرە مێشکە ناتوانێ ئەندامەکانی دیکە بەشێوەیەکی سروشتیانە دەکارخات و هەڵیان سووڕێنێ، ئیدی ئەوە تەنیا هەر ئامێرێکە و هیچی دی: پێویستی بە تەکنیکارێکی تایبەتی هەیە. ئەوە ئێستا ئەوەش دەزانم کە دەوجۆرە دەزگاماشێنی و ئامێریانەدا، وشەکانیش مانا و مەبەستی خۆیان لە دەستدەدەن- ئیدی ئەوە تازە شتێکی بێ گیان و بێ هەست و نەستە، لەکاتێکدا کە وشەکان دەربڕی هەست و نەستەکانن. من بۆ خۆم دەزانم کە زۆر بەدبینانە دەدوێم؛ ئەوەش هیچ سەیرنییە؛ مرۆڤێك کە هەرچی خۆشبینییەکی هەیە لێیان ئەستاندبێ ناتوانێ جیهان بەشێوەی بەهەشتێك سەیرکات و خەڵکەکەی وەك فریشتان ببینێ. بە هەرحاڵ، ئەوجۆرە دەزگایانە دیارە کە بێ هەست و نەست دەبن و دەمرن، بەتایبەتیش ئەگەر یەکێك خۆی بە بیر و بۆچوون و خەیاڵ کردنەوەی یەکێکی دییەوە هەڵواسی. دەزگاکان کاتێ دەتوانن پڕ هەست و نەست بن کە بتوانێ وەکو من و تۆ ئاوا روو بەڕوو دانیشی و قسانی دەگەڵدا بکەیت و دەردی دڵی خۆتی بۆ هەڵڕێژی. من و تۆ کاریگەرییە قسەکانمان لە ڕەنگ و رواژای یەکتریدا دەبینینەوە، بەرز و نزمییە ئاوازی قسەکانی یەکتریمان هەست پێدەکەین. جاشێوەی قسەکانمان هەرچۆنێك روون و ئاشکرا یالێڵ و ژێر پەردە و نادیار و شاراوە بن. کاتێ کە ڕووداوەکان لە سنووری کەسانێکەوە تێپەڕین ئیدی ئەو دەزگایەی کە قسان وەردەگرێ و دەیانبات و دەیانهێنێتەوە ئەوە دەزگایە ئا و مرۆڤ نییە؛ ئیدی ئەوە سەروکاری بە ئی مرۆڤان ناچێ و تەنیا کولەکەیەکی بەتاڵە و پێیدەڵێن مرۆڤ. بەواتایەکی دی مرۆڤیش بەکار و کردەوە و توانا و لێهاتوویە خۆیەوە هەڵدەسەنگێنرێت.

نابێ هەر خەریکی بەزەیی و دڵ سوتانەوێ بەم و بەوان بێت. خوشکەکەم وای لێهات، ژنێ فلانی لە فلانە ڕێگادا کەوت، منداڵی فیساری لە بانی بەربۆوە- ئەمانە هەمووی ڕووداوێکن

لە دەرەوەی خێزانەکانی مەوە ڕوویانداوە و بەهەموو پێوەرێکی بەرین و فراوانەوە- ئەم شتانە هیچ کاریگەرییەکی بەسەر ئەم و ئەوەوە نییە. ئەوانەی کە بەناوی دەستەی ڕابەرییەوە لێك خڕ دەبنەوە و دەگەڵ یەکتردا دەدوێن هەر هێندە مرۆڤن تاقسەی خۆیان دەکەن و داخی دڵی خۆیان هەڵدەرێژن. ئەوەی لەوێش قسان ناکا لە باشترین شێوەدا کاریان وەك کاری کۆمەڵە یاریکەرێکی فوتبۆڵێنە کە بیانەوێ بە کۆمەڵ هێرش بەرن و تۆپەکەی ئاوقای نێوداری گۆڵێ کەن. دەڵێی ((هاوڕێ)) کەیانورییان ڕۆژی بیست و هەشتی مردادێ نارد پەیوەندییە بە موسەدیقییەوە بکات لە جیاتیان چۆتە لای تەلگرافچییەکی تابزانێ دەستوورو فەرمان چییە. دەزانم چ دەڵێی. کاتژمێر دووی دوای نیوەڕۆیە دەگەڕێتەوە کە ئەودەمی تازەکار لەکار ترازاوە؛ ئەودەمی بووە کە بە ئاغایانی فەرمووە کە موسەدیق گوتوویەتی نیزامییەکان گوێ بە فەرمانەکانی نادەن و بەقسەی ناکەن، جا ئاغایان هەر کارێکی کە بۆخۆیان بەچاکی دەزانن دەیکەن. لە کاتێکدا گوایە کە هەر هەمان کەس لە دانیشتنێ سەر لەبەیانیدا نارەزای دانیشتن و دەست لەسەر دەست دانانێ بووە، دژی بەیاننامەی ((دەربارەی بیست و هەشتی مردادێ)) بەیانێکی دیکەی بلاْوکردۆتەوە، کە بە دەستوبردی و زۆر بەزوویی کۆیان کردەوە. خۆدەبینی نۆکەری و جاشەتی و شارلاتانی چۆنە! ئیدی خۆ ئەوەش شەترەنج و خانەی ڕەش و سپی نییە؛ ئەوە تەڕ دەستی و نۆکەرییە، خۆگۆڕین و هەڵخەڵەتاندنە، تا لەدواییشدا بڵێ ئیدی هەر ئەو بووە گوتوویەتی نارازی دانیشتن و دەست لەسەر دەست دانانێیە، و تا بەو پێیەش بچێتە باری هەرێ سەرێ دانیشێ و ببێتە شت!... ئێستا با لەوەی گەڕێین کە بۆ دەبێ حیزبێکی شۆڕشگێڕ مۆڵەت لە تاکە کەسێکەوە وەربگرێت بۆ کارێك بیکات یا نەیکات... بەلاْم چ دەگوترێ، ئای خۆزگە پەیوەندی بە موسەدیقەوە دەبوو! من زۆر جارانم لە خۆم پرسیوە باشە ئەوەچۆن ئەو ئەمیر حیشمەتییەی کە کیسرەوی دەمێژووی مەشرووتییەیدا هێندەی ستایش دەکات چۆن بەسەری پیری بۆتە وەزیری زاهیدی؟ نەخۆش نییە- بەلاْم ئازارێکی هەر هەیە. کەس لەخۆوە و بەبێ هۆ نایە مێژووی تەمەنێکی سیاسی و کۆمەلاْیەتی خۆی لە دەست بدات و پیسی کات... بەهەرحاڵ، من مرۆڤێکی بەزیوم... ژمارەیەك بەناوی پەنجاو سێ کەس- جگە لەو چەند کەسانەی کە نەماون و مردوون- لێك خڕ دەبنەوە و دادەنیشن و گرووپێکی دادەمەزرێنن. دیار نییە کە ئەوانە بۆخۆشیان دەزیندانێدا چ بوون و چیان کردووە. ئەوانەشمان هەموو لێبوونەتە فەلەکولئەفلاکی و خارکییەکانی مە. ئەوەتا دەشیانبینی، دەگەڵ مەدا زیندانین، دەگەڵ مە



دادگایی کراون، بەلاْم چونکە ماوەیەك لە زیندانی فەلەکولئەفلاك و خارکدا زیندانی بووینە، لە زۆر شتاندا متمانەی بە ئێمە ناکەن؛ هەر خۆ بەخۆ ڕاوێژان دەکەن: لەبارەی نوسینی نەفرەتنامەوە، یا پیرۆزبایی، یا ڕاپەڕین بۆ ئازادی؛ یا زۆر شتی سووکەڵەتر. خۆ لە مەبەستەکەم دەگەی؟ زۆریان متمانە بە ئێمە و مانان نییە. شتێکی سروشتیشە کە ژیانی بە کۆمەڵ هەندێ ڕێ و شوێن و پەیوەندییان دروستدەکات- بەلانی کەمەوە، هەر هیچ نەبێ، یەکتری دەناسن. تەنانەت کەسانێکی کە پێکەوە چوونە دادگایە، سەیردەکەی دەربارەی دادگاشیان شتێکی ناڵێنەوە، خۆ ئەگەر شتێکیش بڵێن، ئەوە هەموویان هەریەك شتی دەڵێنەوە، مەگەر بە دەگمەن، ئەوەش کاتێك کە ناکۆکیان بکەوێتە نێوانێوە. ئەودەمی قسەی بن بەڕێ دێتەسەربەڕێ. ئەوانە ئاوا بەجۆرە —پەنجاو سێ کەسە کە دەڵێم- ئەوانیش فریشتە نەبوون؛ بێگومان بێ یاسا و ڕێسایی ژیانی نێو زیندانێ بووە کە وەك مە شەڕ و هەراو چەقەیان لێ پەیدا بووە؛ و یەکتریان تاوانبار کردووە، تووشی لاوازی و بەرچاو تەنگییە هاتوون- هەرچاکە یەکتریان نەخواردووە... ئیدی خۆ ئەوانیش ئادەمین. بەلاْم تا ئێرە هیچیان لێوە نازانین، ئەوەندە نەبێ کە لە کتێبی پەنجاو سێ کەسەیدا دەخوێنینەوە، کە ئەویش هەمووی هەر بە شاخ و باڵ هەڵدان و پێدا هەڵگوتنێ کارزانی و پەی پێبردن و گەورە کردن و خۆڕاگرتنیانە، تا ئەودەمەی کە ناکۆکییەکیان تێدەکەوێ و لەو درزانەوە شتێك سەرهەڵدەدات و دەردەکەوێ. ئەوا ئێستاش بەقسەکانی تۆ خەریکن هەر بەڕاستی لە دەرەوە سوود لەسەرقفلاْنەی حیزب ببینن و لەرێی ڕەنج و بەدبەختی و ناوی ئێمە و مانانەوە کۆمەك و یارمەتی لەسەدانی وەك ئێرە و ئەوێوە وەردەگرن، تا لەمەودوا بێن و پەنابەخوا دەرگای دوکانان وەکەن و دەستکەن بە ماڵێن و ئاوڕشێن کردنەوێ و شەك لە نوێ دەستپێبکەنەوە. بەهەرحاڵ، ئەوانەش هەرکەسانێك بووینە وەك کاویانییەکەی لەمەڕخۆمان، کەلاتان ڕوون و ناسراوە)) (حوسێن دەم کەوچ) ((من پێم وایە کە هەر خراپ نییە؛ دەردەکەی مە شتێکی دییە...)).

((کەواتە زۆرچاکە، ئەگەر هەر خراپ نەبێ و هاوڕێ کاویانی پیاوێکی وابەڕێزە، ئەدی لەسەرچی وەستاوین دەفەرموو بابچین و نوێژی لەپشتەوە دابەستین...)). ((گوێ بدەیە- ئەمە وانییە... ئەو قسەیەت جارێکی دیش لەمن بیستووە. ئێمە هەمووومان جگە لە چەند کەسانێك کە هەر بەنەساغی و شەل و سەقەتییەوە هاتوونەتە دنیاوە، دەنا هەمووومان بە تەواوی هەست و سۆزی سروشتیانەوە چاومان بەژیان هەڵێناوە. ئەوە لە دوایەیە کە لەناو ژینگە و دەوروبەردا

و لەژێر کاریگەری خراپاندا کە ئەوانیش لەسەرەتاوە هەر خراپ نەبووینە، پێشێل دەبین و هەست و سۆزی سروشتی خۆمان بەهەزار و یەك هۆوە لەرێچکە و رێڕەوەکەی خۆی لادەدات و دەردەچێ، و دەبینە ئەوەی کە هەین؛ دەبینە سۆفی رەسوو، دەروێش رەحیم، مستەفاخان، هاوڕێی حیزبی، هاوڕێیانی دەزگای رابەری- تا ژینگەکەمان چۆنە وابێ، هۆکارەکان چۆنیان گەرەکە و زەمینەی ویستی تاکەکەسی چۆنی خواستووە وابێ. من دەمەوێ ببمە سەرکۆمار، ببمە سەرەك وەزیران؛ لەم دنیا دوو سەرەیەدا من سەرەکەی لای خۆمەوەم دەستنیشان کردووە. کاتێ ئاوابێ، دیارە من هەڵبژاردەی خۆمم گرداوە و بە مانایەکی دی من دیاریکراو و هەڵبژێردراوم، ناچارم، دەبێ گوێڕایەڵی فەرمانەکان بم- ئەگەر بمەوێ ببمە سەرەك کۆمار. جا ئەودەمی هەرچی چاکەکان هەن پاشەکشە دەکەن و خراپەکان، ئەویش ئەو خراپانەی کە بەلای تۆ و لەبەرچاوی تۆ خراپن- دێنە پێشەوە و خۆ دەنوێنن و دەبنە دکتۆر فلان، و ئەندازیار فلان، و دکتۆر ئەندازیار فلان. کە لە خودی ولاتی شۆرەویشدا هەروایە.

بەداخەوە ئێستا هەر لەخۆیان دەبیەین، کە چۆناو چۆن یەکتری لەنێو دەبەن و دەسڕنەوە. بە واتای رۆژنامەی کەیهان تەنانەت بەزەییان بە ئێمەی لاوانیشدا نایەتەوە کە لە ماڵ و حاڵی خۆمان وەدەرکەوتووین، هەرنەبێ نەیەڵن دوژمن دەستی بمانگاتێ. نە ئەو بت شکاندن و نە ئەو بت تاشینانەیان- هەرچی بڵێی لە ئادەمیزادی دووپێ دەوەشێتەوە)).

((باشە ئەودەمی دە و جۆرە هۆکار و بارودۆخانەدا ئەرکی مە چییە؟)).

((دەو دەمیدا هیچ- هەرچی بیکەی خۆ کوژییە- سەردەمانێك کە نەدەبوو ئەو هەڵەیە بکەی دەگەڵ کەسدا پەیوەندی بکەی یا بەدەم کەسەوە پێبکەنی! ئاخر خۆ ئەوانەی ئۆغریان فەرموو و چوونە دەرەوە، ئێستا گوایە بۆ حەلاڵکردنی پارەی ئەو سیمینارانەی دەیانگرتن پەیام و راسپاردان دەنێرنەوە!؟ مەسەلەی کابرایە کە قەرزیان نەدەدایە خۆی کوڕەکەی دەنارد و رایدەسپارد کە ئەوەندەم پارە بە قەرز بۆ بنێرن نیشان بەو نیشانەش کە نەتان داوەتە خۆم بیدەن بە کوڕەکەم!)).

((نا، دڵنیا بە- هێندەش خاو نەپێچراومەوە)).



((بەلای منەوە هەریەکێك لە ئێمە- تازە ئەویش بۆ لەمەودوا- دەبێ بەگوێرەی توانا بیرەوەری و بەسەرهات و تاقیکردنەوەکانی خۆی بنوسێتەوە، تا ئەگەر لە هەلێکا هەڵکەوت راستییەکان بەخەڵکی بڵێ. راستییەکان بۆیە خۆشن چونکە تاڵن؛ دەبێ راستی هەر بگوترێ تا لێوەی فێربین. نابێ ئەو بێدەنگییە هەروا بمێنێتەوە؛ دەبێ ئەو پیلانە ئاشکرا کرێت، بەلانی کەمەوە هەر بۆئەوەی پێشانیدەین- بەلانی کەمەوە بەخۆمان- کە ئێمە ئادەمیزاد و مرۆڤین، کەرەنجمان کێشاوە و هەستمان بەو ماندووبوونەی کردووە کێشاومانە و تێگەیبووین کە چۆن وەك داشی دامەی بێ گیان، رەفتاریان دەگەڵدا کردووین. لە چ بترسی؟ لە بەدناوی؟ -نا؛ بۆ مەگەر ئێمە چین؟. وایدانێ تاوانباریشیان کردیت... ئای بابە، مێشوولە چەند گەورەیە و ئێمە چەند بچووك و بێ نرخین ئەگەر بڵێین ئەو قسانە هەمووی گاڵتە و قەشمەرین بەمەکراوە. دەبێ هەر بگوترێ، و دەبێ هەر بنوسرێنەوە، هەر بەلانی کەمەوە بۆ ئارامی و تەسەللای دڵی خۆمان، یا بۆ وریاکردنەوەی کەسانی دیکە و تێگەیاندنیان، کە ئێمەش تێدەگەین و وەك ئەوەی لێتان لە دڵی گرتووین وانین. تا بەلانی کەمەوە ئاغایان دەگەڵ ئەوەی رابەرانی ئایندە و ئەم خەڵکە بێنەوایانەدا وشیارانەتر رەفتار بکەن.

((بەلای منەوە یەکیەتی شۆرەوی لەو نێوەیدا تابڵێی کەمتەرخەم و گوناهبارە...)).

((بەلای منەوە هەمووومان کەمتەرخەم و گوناهبارین، لەلایەکی دیکەشەوە کەس کەمتەرخەم و گوناهبار نییە)).

((- ؟)).

((لەبیرتە گوتم هەموویان چاکن، بەلاّم هەموویان مرۆڤن، مادامەکێ مرۆڤیشن ئەگەری ئەوەیان تێدایە کە رۆژێك لە رۆژان خراپەیان دەدڵ و دەروون و مێشکیدا هێلانە بکات. زیندان رێ و شوێنی خۆی هەیە. دنیای زیندان و کەوتن و تەسلیم بوون دنیایەکە نائاسایی. دنیای نائاسایی رەفتاری نائاسایی بەرهەم دەهێنێ- رێسایەکی دیاریکراویشی نییە- بەتایبەتی ئەگەر خواپێداوی ئەم (دنیا)یەش بیەوێ ئەو رەفتارانە لەسەربناغە و بنچینەی خوو و خدەیەکی نائاسایی دیکەوە هەڵسوڕێنێ. هەریەکە بەپێی خۆی سەرسمێکی هەرداوە. بە قەولی بابە یەکێك دەیەوێ ئاسودە و ئارام دانیشێ و خۆی دەگۆنگەلاّن وەرنەدا. بەلاّم هەروەکو گوتم کە دەور و بەرەکە نائاسایی بوو ئەویش لە خوو و خدەی ئاسایی دەردەچێ و زۆریش ئاساییە دەو

ژینگەیدا جێی نەبێتەوە، کە ناچاریشە هەردەبێ بژیەت... خۆ رەحمان گاپەرستی دەناسی؟ تۆ پێتوابوو شێتە؟... نا، بەڵام شێت دیاربوو، چونکە لە خوو و خدەی ناوچە و دەوروبەرەکەی لایدابوو. زیندانییش هەر راست وان. کەواتە هەرکەسەو جۆر و شێوەیەك و بەبارێکی تایبەتیدا هەڵەنگوتووە، دیارە دۆزینەوەی رێگا چارەیەکی هاوبەش کارێکی لە توانا بەدەرە. جا کێ تازە ئەو رێگایە بدۆزێتەوە؟ هەربۆیە سەیر دەکەی کەس کەمتەرخەم و گوناهبار نییە، و هەمووش هەر گوناهبارن: جا هەرکەسە و بای لێهاتوویی خۆی- پێموایە ئەمە بەیانێکە کە هەموو شتێکی دەخۆوە بگرێ: موتالای، بیروباوەڕی، زەمینەی خاو و خێزانەتییەی...)).

((وەلأمی من ئەمە نەبوو... دیارە نەمتوانیوە وەك پێویست کە ئارەزوومە مەبەستەکەم بگەیەنم. با نموونەیەکی لە شارەکەی خۆمانەوە بێنمەوە. تۆ ئەو رۆژەی هاتنێ سۆفی رەسووت لەبیرە کە دانیشبووین و ئەویش شیرینییە بوکێنیەی هێنابوو، لەبیرتە؟)).

((ئەدی، هەروەك ئێستا)).

((ئەگەر بیرت بێ وەك بڵێی بابە چاوێکی لێداگرتی... یا رەنگە من هەڵەبم؟)).

((نا، وایە، چاوی داگرت)).

((چی تێگەیشتی؟)).

((لە چاو داگرتنەکەی... پێموایە- وام دێتەوە بیر دەیویست بڵێ ((بۆخۆی دەڵێ سواربە بۆ سوار نابی؟)).

((یانی من وای تێگەیشتم)).

((خڕتەواوە. ئەمنیش هەرپێموا بوو؛ پێشداش هەر بەقسە ئەوەی ئاوا بەمن گوتبوو)).

((باشە؟)).

((خەڵکی دیش هەروان. کاتێ زانییان دەتوانن سواربن سوار دەبن)).

((بەڵام ئایا ئەوە رەوشتی سۆشیالیستە؟)).



((بەلای منەوە لەم ساتەوەختەدا، تا ئەوجێیەی ئێمە دەبیسین و دەبینین، شتێکی بەم ناوەوە، بەلانی کەمەوە وەك ئێمە رەوشت بزانین، هیچ ئەملاولایەکی نییە. ئەگەر تاوێك راوەستابای و لێی ورد بووبایتەوە ئەوەشمان بۆ دەردەکەوت)).

((...)).

((سۆفی رەسووم دەگوت... شیرینییە بوکێی هێنا. لەجیاتی ئەوەی ئێمە بمانبردبایە کەچی ئەو هێنابووی. شیرینییە بووکێ یانی چییە؟ بابە کوڕێکی هەیە، ئەو کوڕە کیژۆکەکی دیوەتەوە، یان ئەو کیژە کوڕەکەی وی دیوەتەوە... هەرچۆنێك بێت یەکتریان دیوەتەوە و دەیانەوێ خاو و خێزانێکی پێکبێنن- یانی جۆرە سەرمایەیەکی تازەی دیکە بۆ ئەربابی، بابی من دەوناوەیدا چ رۆڵێکی هەیە؟ نە لە بەخێوکردنی کچەیدا پشکدار بووە و نە لە پێگەیاندنی کوڕەیدا یارمەتییەکی داوە، نە تەنانەت نوقلۆکەکی دەدەستی هیچ کامێکیان ناوە. لەوانەشە هەرگیز هیچ کامێکیانی هەر نەدیتبێ. بەلأم دەگەڵ ئەوەشدا ئەوە چاوت لێیە شیرینییە بووکێ بە مافێکی خۆی دەزانێ، دیارە بەڵگە و مەڵگەی بەهەق زانینی ئەو مافەشی یەکجار زۆرن، کە یەك لەوانە ئەوەیە کە ئاغا گەورەی ویە. سۆفی رەسووش بەڵگە و هۆی ئەو پێشکێشی دانەی خۆی هەیە. بابەی منیش هەمان ئەو رۆڵەی دەگێڕێ کەسەرانی حیزب دەیگێڕن. ئەویش هەر کەڵی شۆڕشەکانی دنیایە و شیرباییی دەوێ. بابەی من سود لە بێ توانایی و لێنەهاتوویی و نەزانییە سۆفی رەسوو و دەروێش رەحیمی دەبینێ، هەرچەندە جارجارە ئیمتیازێکی هەروا بەدەمیش بێ دەداتە ئەوان و دەڵێ کە هەست و هۆش و تێگەیشتنیان زۆر لەو و لەوانەی وەك وی زیاترە. لە زۆر لایەنانەوە راستیش دەکات ئەگەرچی لەوانەشە دەدڵی خۆیدا ئەوەی قبووڵ نەبێ و ئەوەی وەك تاکتیکێك، یا زرنگییەك لە قەڵەم بدات- زرنگییە خۆی. بەلأم هەر راست دەکات، چونکە هۆش و گۆش و تێگەیشتنی وان دەوەیدایە، کە دەگەڵ زەوی و خاك و خۆڵ و گژوگیا و دار و درەختاندا سەرقاڵن و ئاگایان لە راز و نهێنییەکانی رووان و فراژووبوون هەیە و لە هەوڵ و تەقەللای رەگ و ریشە و شۆڕی چوزەران ئاگادارن... تۆوێ دەکەن کاران ئەنجام دەدەن- بە کورتی سەرەوکاریان دەگەڵ سروشتدا هەیە و وەکو من و تۆ- قسەی خۆمان بێ ئایدیالیست نین. هەروا بە خەیاڵەوە ژیان ناچێتە سەر؛ دەبێ تۆوێ داچێنی، چاوەدێرییەی بکەی و لە ئافەتانی بپارێزی، و دوایە بیدروویەوە. ئەوان بێ خوێندن داستانی کلاوکوڕەی کە دە

پەرێزییاندا هێلانە هەڵنابوو دەزانن- کەچی ئێمە خوێندبووشمان نەماندەزانی. ئەوەی دەزانن کە دەبێ کرمانج بەخۆ و بەمنداڵانییەوە داسان دەمەزەن و تیژ کەنەوەو بیانسوونەوەو پشتێ ببەستن و دروێنەی بکەن- بە تەمای کەسی لێنەگەڕێن- ئەگەر هەروا دانیشن دەغڵەکە هەروا بەپێوە دەمێنێتەوە و رەنج بەخسار دەبن. ئێمە خوێندبوومان، بەڵام هەستمان پێنە دەکرد. کە بەتەمای جیرانی بێ شێو سەردەنێیەوە و دەنووی... سۆفی رەسووم دەگوت... بەڵێ سوڕ دەزانێ کە ئاغا تۆوێ ناکا، بەڵام دەدروێتەوە، و هەردەو دەمەشدا دەبینێ کە ئاغا دەتوانێ ببێتە ئافەت: ئاغا مەئمووری سەرباز وەزیفەی هەیە، ئەمنییە و هەواڵگری هەیە. هێندە بەسە هەروا هەفتەیەکی لەو سروشتەی دابڕێ دەبینی هەرچی دار و درەخت و دەغڵودانە گوڵەکانی بە لاسکێوە وشکە رۆبن و بڕزن. دەزانێ کە ئاغا دەتوانێ سوود لە زەبروزەنگی ئەمنییەو سەرباز و نەزمییەی ببینێ و بەکاریان بێنێ- هەردوولاشیان ئەوەی دەزانن. مادەمەکێ ئاوایە هەوڵدەدا هەرنەبێ بەشێکی کەمی ئەو زۆرداری و زۆرکارییەی بۆ سوودی خۆی راکێشێ یا هەرنەبێ وای لێبکا لەو بەڵایەی بە دووربێت. جا ئێستا ئەگەر کەسێك یا دامودەزگایەك توانی بۆ مەبەستێکی خۆی ئاوا مل شۆڕکات ئەوە دیارە هیچ جیاوازییەك لەنێوان ئەم و ئەواندا نامێنێ. لەبیرت نەچێ کە گەورەکانیش هەر دەیانەوێ ببنە سەرکۆمار و سەرەك وەزیران یان وەزیر و وێنەی خۆیان لەسەرلاپەڕەی گۆڤار و رۆژنامەکان ببینن، چاوپێکەوتنەکانی خۆیان دەچاپەمەنییەکاندا بخوێننەوە... بەم جۆرە ئەوانیش هەرسۆفی رەسوویکن کە ملکەچی زۆرکاری شتگەلێکی دیکەبوون: ملکەچی زۆرکاری حەز و ئارەزووەکانیان... راوەستە، سەیرکە... دەزانم دەتەوێ چ بڵێی... ئێستا دەڵێی ئەوە سۆفی رەسوو لەولاوە، چونکە تێناگا، دەترسێ- یا هەرچییەکە. خۆ ئاغا تێدەگا ئەدی بۆ قبووڵی دەکا؟... چاکم زانی؟... زۆرباشە. ئاغاش لەجێی خۆی سۆفی رەسووی کەسێکی دیکەیە و ئەوکەسەش سۆفی رەسووی یەکێکی دی، هەروا بەو جۆرە بەدوای یەکدا وەك ریزی دەنکە تەزبێحان. تێمدەگەی دەڵێم چی؟ ئەمە خووڕەوشتی ئاغا و ئاغایانی دیکەیە. باشە بەو سیستەمە ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییەوە تۆ پێتوایە کەمتەرخەم و گوناهبارن؟ یەکیەتی شۆرەویش هەر بەم جۆرە. ئەڵبەتە تەرتیبی راست و مرۆڤایەتییەکەی وی ئەمەیە کە کاتێك خۆی دەکاتە برا گەورەی یەکێکی وی هەر نەیسە بەڵام بۆ دەبێ لەجیاتی بەرگری لەژێر دەستە و برا بچووکەکەی بێت و دەست درێژیەی بکاتە سەرێ و مافی پێشێل بکات. بەڵام چت لێوەشێرم مێژوو هەرگیز بەدوای برا گەورەی وادا ناگەڕێ. بەو



پێیە دەتوانی لە بەسەرهاتی مەلا رێویەڕا سەرەنجامی تەمەنێك ئەزموون و تاقیکردنەوەی ژیانی خەڵکی تێدا بزانی- کە بەڕاستیش بووە و روویداوە. ئەمن ئێستا گەیشتومەتە قۆناغێکی کە پێموایە مرۆڤ هیچ کاتێ ناتوانێ مەدینەیەکی پیرۆزی دی دروستکاتەوە... ئەوانە هەمووی خەونن و هەر لە قەڵەمڕەوی خەوندا ماونەتەوە. ئادەمیزاد ئەوە ئەوپەڕی توانی کۆمەڵگایەکی پڕ بە حەزی خۆی دروست بکات. بەڵام کێ پێخۆشە بە هەست و نەستێکی هاوبەشەوە دەگەڵ کەسانیدیدا دەکۆمەڵگایەکیدا بژیەت؟... ئەوە من چوومە دنیای عیرفانەوە...نا، من بە نیشانەی گەورەیەکی خێزانێوە رێی ئەوەم نییە بڵێم چۆن فلاّن دەست رۆیوە دەبێ منیش وابم، هەر چونکە من نزیکترم، دڵ و دەروون پاکترم- و ئا لەو جۆرە ئامۆژگارییانە. ئەوە خوو و رەوشت و کاری رێویانە؛ خوو و رەوشتی سۆشیالیستی یا تەنانەت رەوشتی پاك و بێگەردی پێشینانیش ئەو جۆرە شتانەی قبووڵ نییە. ئەو جۆرە بۆچوونانە ماناکەی وایە کە بەرامبەر، تۆ بەکەلاکە تۆپیوێك دادەنێ و مافی ژیانت پێ رەوا نابینێ، بە کورتییەکەی تۆ بە مرۆڤ نازانێ، خۆ ئەگەر بە مرۆڤیشت دانێ ئەوە لە پلە دووی ئادەمیانت دادەنێ، کە سەرەنجامەکەی دەبێتەوە هەمان نەژاد سالاری... ((رەوشت))ی بابە و ئەوانەی وەك وی زۆر لەمانە مرۆڤانەترە. ئەو بەلانی کەمەوە پێشوازییە لە سۆفی رەسووی دەکات و بەڕوویەکی زۆر خۆشەوەی دەگەڵدا دەدوێ... ئیدی واچاکە واز لەمانە بێنن، بێینەوە سەر قسەو باسەکانی خۆمان...)).

((جا کەواتە بە قەولی خۆمان ئاشبەتاڵ؟)).

((نا، تا ژیان هەیە هەوڵ و تێکۆشانیش بەردەوامە؛ تا ئاو هەبێ ئاشی ژیانیش هەردەگەڕێ. دەبێ بژین، بەڵام بە قەولی یەك لە گەورە پیاوان ((بە ئەقڵەوە)) جێی بابەی خاڵی، ئێستا ئەوا ئێمەش بووینە پەیڕەو... یانی سەرلەنوێ دەبێ بخوێنینەوە، فێربین، و ببینین؛ یانی دەبێ گوێ لە چیرۆکەکانی ئەوانەی وەك بابەی بگرینەوە هەرچەندە گۆیندەکەشمان بدزێ و پەسەندی نەکەین و خۆشیشمان نەوێ- ئەوان فەرهەنگی میللی نەتەوەی ئێمەن، فەرهەنگی کۆمەڵ. دەبێ مێژووی کۆن بخوێنینەوە- نەك هەر مێژوو، هەر کتێبێك بێت، هەر لە مێژووی بەیهەقییەوە بگرە تادەگاتە سیاسەتنامە، مەسنەوی، حافز، و هەمان ئەو نووسین و رۆمانانەی کەرێمان نەبوو بیانخوێنینەوە و خوێندنەوەیانیان لێ حەرام کردبووین. ئەمانە هەمووی شرۆڤەی حاڵ و

بەیانی گیانی پیاوچاکانی ڕێگای ژیانێن- هەریەکەیان بەرێی خۆیدا- هەریەکە بە بۆچوونی خۆی، کە لە دواییدا هەموو هەردەچنەوە سەربناوانێکی، بەڵام شتی ئەو کەسانە بخوێندرێنەوە کە دوورن لە هەموو مەبەستێکی فێڵاوی و پەتا و نەخۆشییەك. ئەوانەش- نووسەری ئەو کتێبانە دەڵێم- کە هەمان دەرد و ئازاری نەبڕاوە و نەپساوە سەرمەدییەکەی مرۆڤ و مرۆڤایەتیان لێبوو؛ و بەدوای هەمان ئەو ڕاستیانەدا گەڕاون کە هەموو بەدوایدا وێڵن: بەدوای ناسنامەی خۆیان کەوتوون. ئارەزووی دوارۆژی خۆش و چاککردنی ژیانی مرۆڤ دەکەن. دەبێ ئەوانە بخوێندرێنەوە؛ هەروەك بابە دەڵێ حەرام و حەلاڵی تێدانییە. سەیرەکە لەوەدایە کە پیاو تەمەنێك هەوڵ و تەقەللا بدات و یەخەی خۆی لەچنگی خراپەیەکی (منهیات) تایبەتی ڕزگار بکات کەچی بچێت لەولاوە خۆی تووشی دەردی خراپەکارییەکی دیکە بکات! ئیدی، هەرچۆنێك بێت دەبێ بخوێنییەوە؛ دەبێ هەرچوار سووچی ئەو جیهانە ببینی و بارودۆخ و گوزەرانی وڵاتی دەگەڵ مێژووی ڕابردووی ئەم جیهانەدا بگونجێنی، و بۆ هەمیشە خۆ پەنادان و کەنارگیرییە تێهەڵدەی و بەلاوەی بنێی. دەبێ ڕاستییەکان بە ئاشکرا جاڕبدرێن، لێگەڕێ خەڵکی دی چیان دەوێ بابیڵێن. باشە چ دەڵێن؟ ئەوە گوتیان دزبوویت، ماڵی خەڵکیت خواردووە، گانت داوە؟ لێگەڕێ بابیڵێن، هێندە بەسە مرۆڤ بزانێ کە مرۆڤە، هێندە بەسە کە پیاو خۆی وەبینێ- و بەداخەوە دەگەڵ ئەو ڕووپۆشە ڕاستەقینەیەی کە بەسەرڕووی خۆماندا هەڵدەکێشا، هیچ کاتێ ئەوە خۆمان نەبووین- سەرەنجامەکەشی ئەوەبوو کە دیمان...)).

((چاکە پیاو شێت نابێ. بەچاوی خۆی ببینێ هەرچی تەمەنیەتی بەفیڕۆچووە، خاو و خێزانی لێك هەڵتەکیوە، بۆخۆی ڕیسوا بووە و دەبێ هەر بەسەر شۆڕیش بژیەت!...)).

((نا، هیچ ڕیسواو بێ ئابڕوو نەبوویت. چت کردووە تاخۆت بە ئابڕوو چوو بزانیت؟ کێ دەتوانێ بڵێ پشتی چاوت برۆیە، باتانە و تەشەرانیشت هەرلێدا؟ - بابی من؟ ئەو کە بۆخۆی لە لێواری چاڵەکەوەیە هیچ هەقی ئەوەی نییە گلەییان لەتۆ بکات و لێت بپرسێتەوە؛ ئەویش بەرامبەرە تۆیە، ئەو هەقی ئەوەی نییە حیساب و کیتابان دەگەڵ تۆدا بکا. بە چ چۆرتێکی ئەو حیسابەی دەکا؟ بە چۆرتی گەندەڵی کارگێڕییە؟ تۆ یان من، یا دۆستانی دیکە، جگە لەسادەیی و هاوڕێیەتی و دڵپاکی بەولاوە هیچی دیکەمان نەبوو. ئەوە دامودەزگاکە بووە کە ئەو هەموو دڵپاکی و هاوڕێیەتییەی بەهێند هەڵنەگرتووە و بەلایەکی دیکەیدا بردووە، ئەمەش گوناهی



ئێمە و مانان نییە، تەنیا گوناهی ئێمە سادە ئەندێشی و متمانەی تەواومان بووە. ئێمە دەمانتوانی سەربازانێکی چاکی خەڵکی خۆمان باینایە، و بووشین. بەدانوستاندن و هەڕەشە و پشی پشی تەسلیمیان کردین؛ ئەوەش بۆخۆی شتێکی دیکەیە. هەڵەی هەرە گەورەی ئێمە ئەوەبوو کە فەرماندارە هەڵبژێردراوەکانمان داندرابوون و دەستنیشان کراوبوون- ئۆباڵەکەی بەملی ئەوانەی دایاننابوون، و زیاتریش بەملی خودی خۆمان، کە ڕێماندا فەرماندارمان بۆ دانێن. دەو سەروبەندەیدا تەنیا کەسێك کە دەتوانێ لەمە بپرسێتەوە خودی خاو و خێزانەکانمانن. ئەوانیش خوا تەمەنیان درێژکات هێندە گەورەن کە تائێستا، تەنانەت ڕوویەکیان لێ گرژ نەکردووین و هیچیان لە ڕوونەداوین، هیچ کاتێکیش لەڕوومان نادەن. بەڵێ هەر تەنیا ئەوانن بتوانن لەمە بپرسنەوە.

بەداخەوە درەنگمان زانی، کە بناغەی کارەکان ئەوانن، ئێمە لەڕاستیدا بەوانەوە بەندین. وایان تێگەیاندبووین کە هەرتەنیا بە حیزبەوە بەندین، و خێزانی گەورەش هەرئەوە، کە دەبێ خۆی بۆ تەرخان کەین. چ بکەین، تازە دەگەیشتینێ ولاو بووین؛ هەموو قسەیەکی لەم جۆرانەمان بەڕاستییەکی ڕووت و پەتی دەزانی... ئێمەی لاوان زۆر بێ ئینسافین، تا بڵێی بێ بەزەییشین... وەڵامی ئەو دوو پیرێژنانە چۆن بدەینەوە- دایکت و نەنکم؟ خراپ نییە ئەگەر گوێ بدەیە ئەو یەك دوو وشانەش؛ زۆرت لەمەوە بیست تا تووشی ئەو گێژاوە بووی، ئەویەك دوو وشانەی دوایەش هەر ببیسە...)).

((نا، ئەو قسەی مەکە. ئێوە بەڕاستی بۆشایی ژیانی ئێمەتان پڕکردەوە- ئەوە واهات. ئێوەش نەبوون من هێندەم هۆ هەبوون کە سەرمی پێ بەدار و دیواران دادەم. من لەو دەمیەوە کە خۆم ناسیوە وەك دەڵێن هەر داوای تفەنگ و فیشەکدان و ماینێ خۆشبەزم کردووە تا پێیان بەگژ (دەوڵەت)یدا بچم. من خراپەم لە دەستەی ئەشکەنجەدان و سەرکوتکردنێ دایی و بابییەوەڕا ناسیوە و تاقیکردۆتەوە بە هەڵە مەچۆ، شەوێك نەبوو کە دایکم فرمێسکان هەڵنەوەرێنێ و بابەگیان نەناڵێنی- جا چ دەخەوێدا یان دەبێدارییەدا... ئەوانە یەکەمین یادەوەرییەکانی منن؛ لەڕاستیدا من چاوم بەڕووی فرمێسکاوی دایکمدا هەڵێناوەتەوە... دەردی من هەریەك و دووان نین... تۆ ئاماژەی زۆربەی ئەو دەردانەت کرد، بەڵام...)) ((هەرچۆنێك بێ، ئەرکی سەرشانتە بەشێکی کات و ژیانی خۆت بۆ وان تەرخان کەی. پیرەمێرد، پێویستی هەن؛ پیرێژن شل و

شەپڕێو بووە. ئەو ڕۆژەی چاوم وێیکەوت ئەگەر تۆ نەبای نەمدەناسییەوە. ئەوە هەقی وانە و تۆ ناتوانی ئەو هەقەیان نەدەیتێ)).

((بۆ خۆم دەزانم. زۆریشیان هەقە. من هێشتاش ئەو کروزانەوەی دایـیم هەر لەبیرە کە لە مەرگی کاکەیدا دەکروزایەوەو دەنوزایەوە- هێشتا هەر دەگوێمدا دەزرنگێتەوە؛ هەست بە سۆزەکەی دەروونی دەکەمەوە- هەست پێکردنێکی پڕ بە پێست و گۆشت و ئێسقانم)).

((ئیدی ئەمنیش دەمهەویست ئەوەت برێمێ... خۆ ماندوونیت، حەزت لێیە گوێ ڕاگری؟ یا کارێکت هەیە؟)).

((نا، هیچ کارێکم نییە؛ و ماندووش نیم. تەنیا ناراحەتییە من ئەوەیە کە من دەڕۆم و تۆ دەمێنییەوە، دەترسم کارێکی وام کردبێ ناراحەتم کردبی، یا بیرەوەرییەکی ناخۆشم...)).

((نا، نا! هیچ ناراحەت مەبە و چ کارێکی خراپت نەکردووە، ئەگەر ڕێگای قسانم هەبێ زۆرجاران و لە زۆر شوێنانمدا گوتووە جێت خاڵی... ناراحەت مەبە، منیش ڕۆژێک هەردێت بەرهەڵدابم، هەرچەندە ((هاوڕێی حیزبی)) لێرە نابێ هەروازوو بەرهەڵدا بکرێن- وەڵڵاهی بەسەرهات و چیرۆکێکی سەیرە!...)) ((ئاخ! باوەڕت بێ دەمەویست خۆی پێدادەم و تەوقاتێکی وای لەبن گوێی دەم هەزاران ئەستێران بە ئاسمانێوە بژمێرێ... هێشتاش کات ماوە...)).

((نا، هەرگیز کاری وانەکەی! سەباحییش هەرکارێکی خراپی کرد- ئەمە ڕاست نییە. هەر ئەوەندە سووکایەتییەی بەسە کە هەر بە ئەندامیەتێکی سادەوە لە زینندانێ دەچتە دەرێ. ئەگەر یەك تۆزی غیرەت و پیاوەتی تێدابایە هەر کە دەگەیشتەوە ماڵێ دەبایە یەك مشت مەرگە مووشی خواردبایە و خۆی دەرمانداو کردبایە... نا، هەر گوێشی مەدەیە، هێندە پیاونییە. ئەگەر بای دەنکە جۆیەکی شەرم و ئابڕوو هەبایە ئێستا وانەدەبوو... ئەرێ، خەریك بووم بڵێم کتێبێکم دەربارەی تیۆرەکانی لایەنگرانی لابردنی لە سێدارەدان خوێندەوە: بەڵگە و بۆچونی دوولایەنانی ڕوونکردەوە: کەشیشەکان و مرۆدۆستان. کەشیشەکان- ئەوانەی ئەوروپا- کە ئێستا هیچیان بەدەست نەماوە- ئەنگیزیسیۆنیان لە بیرچۆتەوە- بەڵگەیان ئەوەیە چونکە خوداوەند ئادەمیزادی بە ((شێوە))ی خۆی دروستکردووە و گیانی خۆی وەبەرناوە، بۆیە نابێ



شوێنەواری ئەو دەستکردەی خودا بشێوێندرێ. یا بە مانایەکی دی کەس ناتوانێ شتێك لە یەکێك بستێنێتەوە کە بۆخۆی شتەکەی نەدابێتێ: گیان هەرخودا داویەتە ئادەمیزاد، هەردەبێ خوداش لێی وەرگرێتەوە. ئەڵبەتە ئەمەش دوای ئەوەی کە بۆخۆیان دە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەزاران هەزار شوێنەواری دەستکردانەیان کە وەك هەواڵ و باسەکانی ئەو سەردەمی باس دەکەن. دە نێڵەنێڵی ئاگریدا سوتاندن. مرۆڤدۆستانیش دەڵێن منداڵ لە ئامێز و کۆش و باوەشی دوو مرۆڤەوە هاتووە و تاکو بە بەرهەم هاتووە ڕەنج و ئازارێکی زۆری پێوەکێشراوە: باوك ئیشی کردووە، دایك شەونخوونی کێشاوە، سەرمایەی ژیانی خۆی لە پێناودا داناوە... کە ئەو بکوژن تەنیا هەر خودی ئەو ناکوژن، تێکڕای سەرمایەی سامانی تاك و کۆمەڵیان بەبا داوە. ئەو هەموو بەزەییانەی باوك، شەونخونییەکانی دایك، پەڕۆ و پاتاڵ شوشتنەکانی، نیگەرانی و دڵەڕاوکێیەکانی- کە تا منداڵەکە لە قوتابخانە یا لە کۆلانێڕا دێتەوە و هیچی بەسەرنەهاتووە و ماوە و تا لە پۆلێکەوە دەچێتە پۆلێکی تر هەر مەپرسە چەند تاڵەموون لەسەری سپی دەکەن- ئیدی ئەوە بێجگە لە ماندووبوون و ڕەنجی مامۆستا و ئەم و ئەوانیش... بەکورتی ئاواڵە خۆشەویستەکەم، ئەوان پێویستیان هەیە و تۆ بەرپرسیاری کە مەبەستەکانیان بێنیتەدی... ئەوەش بزانە کە ئەم هەموو شت و بەسەرهاتانە کە ئێمە دیتمانن و دەیانبینین هەر هەمان ئەو شتانەن کە هەر لە سەرەتای دروستبوونی ئەم جیهانەوە، خەڵکی دەستی پێ ڕاگەیون، و دەستیان بۆ لەملی داوە و چەندین جارانی دیش هەروا دووبارە و سێ بارە بوونەتەوە... ئەو شانۆگەرییە شتێکی دوو پاتەیە- و هەمیشە و بەردەوام دووپات دەبێتەوە- بەلاّم ئێمە نەمانخوێندوونەوە... دڵنیا بە چەندین جاری دیکەشیان دەقاڵب و بەرگ و ڕەنگی دیکەدا بەشێوە و جۆرێکی سەردەمانە و مرۆڤ پەسەندانەی ترەوە دێنە سەرپەردەی شانۆ و دەیانبینیەوە. ئێمە دەبێ وشیار بین، و بناسین؛ هەر بەقسەکانی باوکت، لێرەش تەنیا هەر دیمەن و کەسایەتییەکان ناوەکان دەگۆڕین. دەنا هەمان تاس و حەمام و هەمان داستان و سەرگوزەشتەی پێشوون کە بوون. شەهیدانی وەك موسەدیق و ئەمیرکەبیر یا سوپا سالار تەنیا هەر لە ناوەکانیاندا جیاوازن... دەبێ ئەمن و تۆ ئەوەی چاك دەستنیشان کەین و بەخەڵکی ڕابگەیەنین. دەبێ خەڵکی بزانن کە قیوامسەڵتەنەی بەناوبانگ دەتوانێ بەدەستی بەیرەمی و بەیارمەتی حەیدەرخانی و بە پشتیوانییە ((بوزورگانی))، ستارخانی مەرد و لێهاتوو تیر باران بکات یا لە ماڵێ دەست بەسەری کات و ئالوودەو فێرە تریاکی کات. دەبێ ئەوەش بزانرێ دە

ولاتێکیدا کە مێژووە فەرمییەکەی لەسەربناغەی فێڵ و تەڵەکەبازی و ئەفسانەی مێهتەر نەسیمیانە و ئاوقاییە بوونی ئەسپ و مایناوە هەستابێ ناتوانێ بەخواستنەوەی تیۆرە دەرەکییەکان و وەشاندنی تۆوێك کە بەخاك و ئاو و هەوای ئەم ولاتە بێگانە و نامۆیە و رەگ و ریشەی ناچەقن و بلاونابنەوە بێت و لەوخەڵکە فریشتان دروستکەیت کە هەروەك فریشتانیش هەڵسوکەوت و رەفتار بکەن.

من تەنانەت باوەڕم بەوەش نییە کە هەروا بەو زووانە گرووپی سۆفی رەسووەکان رۆژێك بێت و لەو بێ ئاگاییەی راپەڕن و هێندە هەستیاربن هەست بە نەقیزەی خانی سەرملیان بکەن و بکەونە هەلاویشتنێ و خانی لەنێو بەرن نا، رەنگە سۆفی رەسوویێك ئەوکارەی بکات- بەلاَم گرووپی سۆفی رەسووەکان نا. من لەو باوەڕەدام، کە سۆفی رەسووەکان، تاماوەیەکی دوورودرێژ وەك کەری بەرەڵلاَ لەدەم رووباری شاریمان هێندە لات و پووت و پشت بریندار و جدەو بن کە داڵەکەر خۆریان لەسەر پشتێ بنیشێتەوە و دەندوك ئاژنیان کەن و ئەوان کلکێ نەبزێون، تا سەرەنجام وەلاَمی بانگەوازی ئەو سەگە سپییانە دەدەنەوە کە لە تەکیانەوە، وەرکەوتوون و سەریان وەسەر هەردوو دەستی خۆیان کردووە و چاویان بڕیوەتە بەلادا هاتن و راقەنانێ وان. پێشت وانەبێ لەبەرئەوەی تووشی رەنج و ئازاران دێن لەچارەسەریەکی بگەڕێن چونکە سروشتی رەنج و ئازار لێ هەلاَتنیەتی. نا، ئاو هەر لەسەرچاوەوە لێڵە: خورافات و خوو و ڕەوشت و خدە و نەرێتی کۆن و زۆر شتی دیکەش کارەکانیان تێکداوە و خراپیان کردوون؛ سنوورێکیان بۆ خۆڕاگریە نەهێشتۆتەوە- و زۆر بەداخەوەش کە ئەمانە هەموو شتگەلێکن ریشەدار و درێژخایەن. بە یەك دوو کتێبان شەڕی ئەوانە ناکرێ...)).

((فیووت!)).

ئەمە گروبانی زیندانێیە. ژاوە ژاوەکە دەمرێنێتەوە.

((ئاغایانی حوکم لەسەرسووك کراو بۆ دالانێ... دەی ئاغایان هەرچی زووە خێراکەن!)).

حوسێنی ماچ دەکەم؛ ئەو دەستدەکا بە گریانێ، و من دڵی دەدەمەوە.

((کاکی خۆم... چ راسپاردەیەکت بۆ پوورە فاتمێ نییە، راسپاردەیەك... کارێك- شتێك... بەڵێنت دەدەمێ هەرچی هەتە بەجێی بگەیەنم)).



((نا، سلاویان بگەیەنێ. هەربچییە ماڵێ مەش- لەجیاتی من بەدوای قسەو باسەکاندا بچۆ- هەربچیت، بابم ئەو شتانە هەر بە حیسابی هەرزەکارییە دادەنێ- هەردەبێ بچی. نامەدەنێرم ئەگەر نەچووبی زۆرم پێناخۆش دەبێ. دڵی نەنکم بدەوە، بڵێ هەروا بەو زووانە ئەویش دێتەوە- راست و درۆ شتێکی هەر بۆ تێکەوە پێچە- بۆخۆت چۆنت پێ چاك بوو ئاوا... سلاوم بە پوورە گوڵبەهار و مامە مەشەدی بگەیەنە، هەروەها بە فەیزوڵلاَ و خوشکیشت)).

دەڕوا، دەستدەکا بەگریانێ... هەروا چەند هەنگاوێکان دەڕواو ئاوڕێکی دەداتەوە؛ دەڵێ: ((بانگی منت کردەوە؟)).

دەڵێم ((نا.)) بەلاَم ئەو دووبارە دێتەوە و منیش بەرەولایەوە دەچمەوە، و دیسانەوە ئامێزێ لێکدەدەینەوە: ((خودا حافیز... نامەی دەنێرم...)).

((هەر دەبێ بنێری... دەربارەی مستەفاخانیشم هەر بۆ بنووسە- گوایە هێشتاش هەر لە شاخییە... ئەگەر هاتبۆوە هەرهێندەی بنووسە کە ئامۆزا چاکە، بەسە، بۆخۆم تێیدەگەم... خوداحافیز... خودا حافیز)) چەند هەنگاوێکانی بەدوادا دەنێم: ((ئەوانەی پێم گوتووی لەبیریان نەکەی... ئەمانە هەموو راسپاردەی دۆستێکی زیندانین. بەواتەی یەك لە دانیشمەندان زیندانی وەك کەشتییەکی راوەستاو و چەقیو وایە، لەوانەیە بگاتە کەنار، و لەوانەشە نەگاتێ)).

((خوانەکا...)).

((خوداحافیز... بە سەلامەتی- خودا حافیز!)).

* * *

## (٢٥)

ئێستا ژیان بەلای منەوە دەسێ بۆچوونانداخۆ دەنوێنێ: یەکێکیان ئەوەیە کە دیومە، و لە هەمووان ناخۆش و دزێوتربوو، بەلاّم ئەفسوس کە دەتوانرا تابلێی جوان و رازاوە و خۆش بێت! ئەویدی شارو بازاڕ، کە ئەویش پڕی دژواری و سەختی بوو، بەلاّم هەرچۆنێك بوو پڕی هەوڵ و تەقەڵلاّ و جموجۆڵ و چالاکی بوو. سێهەمیان ژیانی ناوەوەی مالاّنی وەك ماڵێ ئاغای سلێمانی بوو، کە دادەنیشتن و پێکەوە دەکەوتنە قسان یا پێدەکەنین. دەنێو شار و بازاڕیدا پێکەنین و تریقانەوەی بەدەم یەکەوە هەروا شتێکی رێکەوتانە بوو؛ گاڵتە جاڕییەکی بە کۆمەڵ بوو و هیچی دی دەنا پێکەنینێکی بە مانای پێکەنین و دڵخۆشییەوە شتێکی دەگمەنی و نایاب بوو. خۆ دەگوندیشدا کە خەڵکی هەر لە بەیانی زووەوە تا ئێوارێ دەچوونە دەشت و دەر و کێو و بەندەنان و ئارەقەیان دەڕشت و پشتیان راست نەدەکردەوە ئەگەر پێکەنینێکیشیان هاتبایە ئەوە هەر پێکەنینێکی تایبەتیانە بوو، کە لاسایی کردنەوەی پێکەنینێ بوو، ئەوەندەش هەر لەبەرهێندێ پێدەکەنین تا پێکەنینیان لەبیر نەچێتەوە.

بەیانی ئەو رۆژەی کە لە گوندی مستەفاخانێرا هاتمەوە، وەك جاران، راست چوومە ماڵێ سلێماناغای، پێیان سەیربوو- پێیان وانەبوو وازوو دێمەوە. ئاغای سلێمانی زەردەیەکی هاتێ یانی ((باشە، خۆدیتت!؟)) پێکەنیم، چاوەڕێ بوو شتێکی بڵێم، هیچم نەگوت. پێدەچوو دەمەتەقێی پێش منیان گەرم بووبێ. کەزانی من هیچ نالێم رووی کردەوە کوڕەکەی و دیاربوو هەر بەدەم قسەکانی هەوەڵێیەوە گوتی: ((ئیدی، نۆکەریش شانازییەکی تێدایە، کە پۆزلێدەدەن!... دوو هەزار کیلۆمەترتان دەگەڵ یەکیەتی شۆرەویدا سنووری هاوبەش هەیە! یەکیەتی شۆرەوی هەروا دەستەوەستان دانانیشێ!)) هەستمکرد کوڕەکەی ویستوویەتی سەری بکاتە سەرێ و گێچەڵی پێبکات. چونکە هەرکاتێ ئەو قسانەی بەزاریدا هاتبان ئاغای



سلێمانی لەجێی خۆیەوە ئاگری دەگرت. هەروەك جنێوت پێدابێ. ((جا باشە چی لەدەست دێت و چ دەکا؟ ئەگەر زۆر ناقایل بوو باجامێك ئاوی سارد بخواتەوە... ((هەروا- دا- نانیشێ!)) بەلاقرتێوە و بەدەنگێکی مەیلە و توڕەوە.

((برالە وەك دەڵێن، ئەوەی کە چووە بن سێبەری خەڵکی بۆخۆی بێ سێبەرە. وەڵڵاّ بابە شۆڕشتان کرد؛ راستە عەقڵتان تەلاّق داوە بەلاّم زۆر بە هەرزانتان لە یەکیەتی شۆرەوی بەمێرد داوەتەوە. تەنانەت ئامادەنین سەرنجێکی دەوروبەری خۆتان بدەن و بەچاوی خۆتان ببینن؛ وردە وردە توانای دیتنێشتان لە دەستداوە. تا لە مۆسکۆوە هاوڕێ باگدانۆف نەنوسێ کە گرانەتا دە ئێرانێدا بلاّوبۆتەوە باوەڕناکەن. دەبێ یەکێك لەو هاوڕێیانە لەم بارەیەوە شتێك هەر بنووسێ، تا ئاغایان باوەڕ بفەرموون... بەڕاستی من دەمەوێ بزانم هاوڕێ باگدانۆف چ کارەیە، بە چ هەقێك دەست دە ژیانی ئێوە وەردەدا؟ هەر لەبەروەی هاوڕێیە؟ جا کەواتە ئەگەر سبەینێ ژنیشت هێنا دەبێ مۆڵەتێ لەوی وەرگری تا تەماشای ژنێ خۆشت کەی!)) هەر بەو دەنگ و گاڵتەجاڕی و چاو و برۆ هەڵتەکاندنەیەوە ((من پێم وانییە رێ بدات! بە بڕوای ئەو هاوڕێیە دەبێ ئەو وزەیە بۆ حیزب بەکاربەرێ- ئەوە چییە بێت و دەگەڵ ژنێ خۆتدا بنووی و ئەو هێزو توانایەت هەروا بە خۆڕایی و بێهوودە لەنێوبەری! نا، ئەوە راست نییە! هە، هە!)) دەستیکرد بە پێکەنینێ و هەموو لەشی خۆشی دەگەڵدا هەڵدەتەکاند.

((هاوڕێیانتان، ئەگەر بەڕاستی هاوڕێ و برا گەورە بانایە توشی ئەوەندە گرفتاریانە نەدەبوون. زۆر سادە و ساکارانە، ئاوا هەروەك من و تۆ، دەیانگوت ئاغا ئێمە هەر تا ئەوەندەتان دەتوانین یارمەتی بدەین و کۆمەکتان پێ بکەین، یا هەر بەڕاستی خەتێکی بە چوار دەوری مەدا بێنن- ناتوانین- ئێمە حیساب مەکەن، ئێمە هەر بۆخۆمان گرفتار و گیرۆدەین، ناتوانین: لە لایەکیەوە شەڕەقۆچێ دەگەڵ ئەمەریکای بکەین و لەلایەکی دیشەوە دەگەڵ گیروگرفتەکانی ناوەخۆدا... هەر بەڕاستی ناتوانین. ئەودەمی ئێوەش وەدووی کلاّوی بابردوو نەدەکەوتن. بەخۆتان و بەرو باخەڵی خۆتاندا دەهاتنەوە؛ دەتانزانی داخوا دەتوانن یان نا، یا تا چەندتان لە دەست دێت. هەروەك کە خولەفای فاتیمییەکان دەمیسرێیاندا دەکرد: ئەوان کەسێکیان دەستنیشان دەکرد بۆ دامەزراندنێی- لەسەر مەنسوولیەتی خۆی. شوێنی کارەکەشیان ((دورگەیەك)) دادەنا و پێیان دەگوت، یانی فلاّنی، هەرچوار لات دەریایە و ئاوە، لە هەموو لایانتەوە دوژمنە، لە هیچ

لایەکیڕا یارمەتیت پێناگا، هەر تەنیا خۆت و خۆتی، بابڵێین ئەو شوێنە دورگەی خوراسانەو دەستنیشانکراویش ناسر خوسرەو، ئەودەمی ئیدی جەنابی ناسر خوسرەو هەر تەنیا خۆی و خۆی بوو و بەس؛ ئیدی هەرگیز ئاوڕی بەلای ئەولای دەریایدا نەدەدایەوە داخوا کەنگێ خەلیفە سەربازان دەنێرێ یا نانێرێ، یا بۆ نانێرێ چونکە لەپێشدا ئەوەیان بڕیبۆوە. ئەمە بەلای منەوە زۆر لەوەی چاترە کە تەنانەت بەروون و رەوانی نەڵێن کە دە ئێرانێدا چ دەکەن و سیاسەتیان چییە و چۆنە و دەیانەوێ چ بکەن- ئەوە دەبێتە هاوبەشی دز و رەفیقی کاروانێ ((کاروان هەقیەتی گلەیی هەبێ و گلەییانیش بکات جا با نەشوێرێ گلەییەکانی بەزاریدا بێت و بیانکات)). دوای چەند ساتێك هەڵیدایەوە: ((حوسێناغا، بەلای ئێوەشەوە هەروا نییە؟)).

گوتم: ((ئاغا، راستییەکەی نازانم قسەکانتان لەسەر چییە)).

((قسەی هەموو دەمێ. لەبارەی سۆفی رەسووەکان و دامو دەزگا و دنیا، و کائیناتەوە. وەك هەمیشە، قسەی هەموو دەمان. من بەلانی کەمەوە پێموایە ئەو خەڵکە پێیان وانییە ئێوەی تێگەیشتوو و رۆشنبیر و خوێندەوار هەروا لەخۆوە قسان بکەن و بەبێ یاسا و رێسا هەڵسوکەوت بکەن. باشە، ئەوە بەقسەی خۆتان، ئەم بارودۆخە بەلایەکە و هاتووە، نەگبەتییەکە و باریوە. ئەڵبەتە من لەوەدا دەگەڵ ئێوەدانیم، بەلام دەزانم کە کۆمەڵگا نەخۆشە و نەخۆشییەکەشی نەخۆشییەکی درمە. من پێموایە هەوڵدان بۆ لەناوبردنی نەخۆشییەکی وا درمی نابێ واکسەن (لقاح) لە ئەمەریکا و ئینگلیز و شۆرەوییەوە بهێندرێ، چونکە نەخۆشییە هەر ولاتێکی تایبەتمەندییە خۆی هەیە و دەگەڵ نەخۆشییە جێیەکی دیداجودایە... ئەڵبەتە ئەوانەشم هەر لەخۆی- لە هەمان ئاغا بیستووە. دەنا خۆ من ئەو شتانەم نەخوێندوونەوە و نەبیستوون... من دەڵێم مادامەکی ئەو قسانە دەکەن فەرموون وەرن واکسەنی ئەو میکرۆب و ڤایرۆسانە لە ژینگە و دەوروبەرەکەی خۆمانەوە دروستبکەن، ئیدی بۆ بەدوای پەیسەری شۆرەویدا دەچن- وایە یان نا؟)).

((وەڵلاهی ئاغا، من پێموایە هەرکەسە و لەبارەخۆیەوە پێویستە بۆ وەسەرخۆکەوتنەوەی ئەم بارودۆخەی لابارێکی راست کاتەوە و دەستێکی یارمەتییە درێژکات- ئێستاش لەهەر رێگایەکەوە بێ... هەروەك خۆتان دەفەرموون- یانی خۆتان چەندین جارتان ئەوە فەرمووە-



بەهەر شێوەیەك بێ رێ بەدەست درێژکەر نەدرێ و تەنانەت سوود لەهێز و توانای دەرو دراوسێیانیشەوە ببینرێ بۆئەوەی دەست درێژکەر سەرکوت و پاشەکشە پێ بکرێ)).

((ئافەرین! بەلام دەبێ ئەوەش هەر بە دراوسێ و بە چاوی دراوسێیەتییەوە سەیرکەی، ئەویش هەر ئەو دراوسێیەیە کە چاوی تەماحی دە مەملەکەتی مەدایە. ئێمە جیاوازییەکەمان ئادێرەدایە: ئێوە هەروا خۆتان داوێنە بن پەڕو باڵی ئەو دراوسێیەوە تا لە شەڕی ئەو دراوسێیەی ترتان بپارێزێ. من دەڵێم سەگی رەش و سپی هەردووکیان هەر سەگن. رەنگە ئێوە دەناو رووداوەکاندا نەبووبن. من بۆخۆم تا ئەندازەیەك دەنێو رووداوەکاندا ژیاوم. ئەوەش هەر هەمان ئەو هەڵەیە بوو کە خودا لێخۆشبوو و ئەوانیدی کردیان. ئەڵبەتە ئەوانیش گوناهیان نەبوو، ناچاربوون؛ دەنا خۆ قازی پیاوێکی شەریف و نیشتمانپەروەر بوو... ئەوان، یانی حوکمەتی کوردستان، هاتن و پانە و پان لەجیاتی فرۆتنێ گاو مانگاو مەڕ و مالات و ئەسپ و تووتن و ئەو جۆرەشتانە کە بەڕاستی لەبن پەڕ و باڵ و سێبەری ویدا بوون هاتن و قوماش و تەواوی ئەو پێویستیانەی خەڵکیان لەو یەکیەتی شۆرەوییەی کڕی. مەتری چیتیان بە ٢٨ بیست و هەشت قڕان کڕی، لە کاتێکدا کە یەکیەتی شۆرەوی هەر هەمان چیتی دەدایە حوکمەتی ناوەندی، یانی دەیدایە هەمان جەنابی ئەو قیواموسسەڵتەنەی کە ئەودەمی دەیانپاراست و دواییش کردیانە ئەو ئیبلیسە رەجم کراوە، مەتری بە ١٨ هەژدە قڕانان.

باشە، ئاغایان، ئێوە وەلامی منێکی کورد کە دەچمە تارانێ و دەبینم هەمان ئەو چیتەی کەمن لە مەهابادێ بە ٣٤ سی و چوار قڕانانی دەکڕم و لە تارانێ بە دوو تمەنانی دەدەن چۆناوچۆن دەدەنەوە؟ دیارە دەڵێن ئەوە یارمەتی و پشتیوانییە زەحمەتکێشانە!؟ یا پاراستنی راپەڕین و خەباتی دژ بە ئیمپریالیستە!؟ ئێستا ئەوەیان پێشکێش؛ ئاخیرەکەی شتێکیان هەر وەرگرت، جا کەم یا زۆر شتێکیشیان دا. سەیرکەن. راست لەو ساتانەی کە هێزەکانی دەوڵەتی ناوەندی چوونەوە ئازربایجانێ هەرهەمان ئەو دەوڵەتی شۆرەوییەی پاڵپشتی خەباتی ئازادیخوازان، هەموو ئەو چەکە قورسانەی کە بۆ بەرژەوەندی، رۆژ بە دیاری دابوونە ((حوکمەتی میللی ئازەربایجان)) هەمووی وەرگرتنەوە و بردنیەوە! ئەوە لای هەموان روون و ئاشکرایە و دەیزانن. ئەوە هەر تەنیا ئێوەن کە نابێ ببینن و بیزانن. دەبێ چاوی خۆتانی لێ بنوقێنن و وابکەن کە نایبینن و خۆ ئەگەر کەسێکیش ئەو جۆرە باسانەی دەربارەی ئەو شتانە

بێنابایە پێشێ و باسی لێوەکردبایە، ئەوە خێرا و دەستوبرد مۆری سیای ئەمەریکیان بەنێوچەوانێوە دەنا...)).

سەری هەڵێنایەوە و بە روخسارێکی سوورهەڵگەڕاوەوە رووی دەمی دە کوڕەکەی کرد و گوتی: ((تۆ تائێستا چەند دانە کەسی مەئموورەکانی سیات لێرە دیون؟)).

((لە مەبەستەکەتان ناگەم)).

((بۆ تێناگەی؟ دەپرسم تائێستا چەند دانەکەسی مەئموورەکانی سیات لێرە دیون؟ ئێستا روونبۆوە؟ چاوت هەن، دیارە ئەگەر هاتبن هەر دیوتن)).

کوڕەکەی بە لالووتییەکەوە گوتی: ((نەمدیون)) و سەیرێکی دیوارەکەی بەرامبەریەوەی کرد.

((باشە ئەدی بۆ هەر کە زارتان کردەوە ئەوە وشەی جاسووس و سیاتان لە دوڕ دەوی و لەسەر زمانییە؟ خۆ ئەگەر کەسێکیشتان لە جاسووسی و پیاوبوونێ سیای دەراویشت ئەوە کارێکتان پێیەتی و بۆ ئەوەی کارەکانتان رانەوەستێ و مەیسەر بێت. دەنا ئەو بەندەی خودایەش وەك هەموو ئەو هاوڕێ لادەرانەی دی لە حیزب یەکسەر گێڕی لێدەگۆڕن و دەیکەنەوە جاسووسی یەك شەوە و دەبێتەوە چڵکاو خۆری ئینگلیز و ئەمەریکا! خۆ ئەگەر کەسانێکی دیش لە جاجوسییە بەدەردەکەن ئەوە کارێکیان بەدەستە و ناوێرن خۆتانیان لێدەن. حمم... بەڵێ، بەو جۆرە بیروبۆچوونانەتانەوە ئەگەرچی بوونتان بۆ خەڵکی زیانبەخشە بەڵام بۆ دەوڵەتێ هەر مەپرسە چەند بەسوودە. بۆ رۆژئاواییانیش هەر بە کەڵکە: هەرکاتێ ویستیان پەڵپ و بیانوان بەدەوڵەتێکی میللی بگرن و فشاری بخەنە سەرێ لەرێی گەورەیی خەتەری ئێوەوە کە نۆکەری ئەربابانی دیکەن بەملی میللەتەکەی دادەهێنن و باجەکەی لە دەوڵەتێ دەستێنن. من بم لەباتی دەوڵەتێ هەرکاتێ شتێکم لە ئەمەریکا ویست چەند کەسێکانتان لێدەگرم و هەرکاتێ نێوانیشم دەگەڵ ئەربابەکانی ئێوەشدا ناخۆش بوو ئەوە چەند کەسێکتان لێدەکوژم، و هەر کاتێکیش ئەربابەکانتان وەك منداڵی خەڵکی گوێڕایەڵ و ملکەچ بە بەشی خۆیان قایل بوون یا ئەمەریکا ویستی ددانان چیڕکاتەوە ئەوە چەند کەسێکتان لێ بار سوك دەکەم و بەرهەڵداتان دەکەمەوە...)).

پێکەنی، چاوێکم لە کوڕەکەی کرد، زۆر ناراحەت بوو.



ئاغای سلێمانی گوتی: ((حوسێناغا، ئاواڵەکەتان ناراحەتە، بەڵام من ئەمانە بۆیە دەڵێم بەڵکە ئێ هەرنەبێ بەشێکی کەمی ئەو قسانەی بچتە مێشکییەوە، بۆ ئەوەی کە من مردم...)).

کوڕەکەی بێ ئیختیار گوتی: ((نا، خوانەکا، بابە!)).

بابە گوتی: ((خودا رۆژێکی هەر دەیکا... ئای هەی ئاغای برایم خانی!)) هەناسێکی هەڵکێشا ((زۆرم حەزدەکرد خۆشەویستیەمە خۆشەویستیە ئەو شووشە و پەرداغەی بایە و من بمتوانییایە خۆم برێژمە ناو تۆوە... ئێمە هەردووکمان کوڕ و بابین! زۆرم حەز دەکرد منیش وەك ئەو شووشەی بمتوانییبایە گیانی خۆم دەتۆدا بەتاڵ کەم، یا هەروەك ئەو پەرداغەی ئەوەی نەمدەتوانی دەخۆمیدا بهێڵمەوە سەرلەنوێ دە شووشەکەم کردبایەوە. بەڵام بەداخەوە کە تۆخۆت لەمن دوورە پەرێز گرتووە و خۆتت لێ جودا کردوومەوە!)) و بەروخسارێکی پەشۆکاوەوە پەرداغەکەی پڕکردەوە و یەکسەرە هەڵێدا.

((نا، بابە، تۆ وابیرمەکەوە- ئێمە چووکەی ئێوەین!)).

((سوپاس...)).

ئاغای سلێمانی هەروەك خوو و خدەی زۆر بە ئاسانی ئەو چڵەوچڵی دەکرد- دیاربوو سەری بە هەموو دەرکاندا دەکرد تا یەکێکیان بەرووی کوڕەکەیدا بکاتەوە و بە هەرجۆرێك بووە بەرەو ((ماڵەوە))ی بێنێتەوە. تاوێك راما... گوتی: ((راستت دەوێ هەر دانیشتن و چاوەرێکردن کارێکی یەکجار ناخۆش و دژوارە. بەهەرحاڵ شتێك هەیە کە بەداخەوە سروشت لەلاوانی چاوبووە و نەیداونێ، هەرچەندە من ئومێدەوارم کە خوێندن و لێکۆڵینەوە و موتالا تا ئەندازەیەك بۆشایی ئەو تاقیکردنەوە و ئەزموونانە پڕبکاتەوە... بەڵێ، کار لەوانەیە هەمیشە بکرێ؛ هەر گێلێکی بیگری دەتوانێ سەرەو بن خۆی دەڕووداوان باوێ- جا یالێدەدا یا لێیدەدرێ- بەڵام پیاو ئەو کەسەیە بە ئارامی دانیشێ و تەماشا کات و تێڕامێنێ و بیربکاتەوە...)).

((ئەڵبەتە بەو مەرجەی کە تێریش بێت، و کەمێکیش بێ وەی بێت)).

((... و دەنا هەقی نەبێ، ئێرە ناجێیەکی دی- دەڕۆیی و سەرەنجامەکەشی دەبینییەوە. بەڵام پیاوی ئاقڵ ئەوەیە کە خۆش باوەڕ نەبێت و گوێ نەداتە ئەو بەسەرهات و رووداوانەی کتوپڕ و

لەناکاودا دەقەومن و زووش رادەبرن و بەسەردەچن- سەیرکات بەڵام گوێ نەداتێ، تا دووایی...)).

((وەك بڵێین تاکەی؟)).

((سنوورێکی دیاریکراوی نییە. سنوورەکەی بە ئەندازەی تێگەیشتن و هەستی کەسەکەوە بەندە)).

((ئێستا بەلای ئێوەوە ئەگەر کەسێك هەروا بۆ نموونە تێبڕوانی و تێگەیشت و دەستبەکاربوو ئەوە گوناهێکی کردووە کە لە خەڵکی دی زووتر تێگەیشتووە؟ ئاخر خۆ هەر بەقسەی ئێوە ئەو خوێندن و موتاڵایانەش هەر بۆ ئەو شتانەیە: بۆ ئەوەی خەڵکەکە چاویان بکرێتەوە و خێرا هەست بکەن و زوو تێبگەن)).

((نا، ئەوە نەك هەر گوناە نییە، بەڵکە تابڵێی چاکیشە. قسەی من ئەوەیە کە دەبێ بەسەرهاتە رابردووەکان دیاری بکرێن و بناسرێن و تاوتوێ کرێن و بگونجێندرێن. ئێوە بە خڕی بیردەکەنەوە. حوسێناغا، دەبووری، من بەرگری لە رەزاشا و لە هیچ شایەکی ناکەم؛ ناڵێم هەڵەی نەکرد یا ئەوەی کە هەیە هەڵە ناکات. بەڵام گوناە و کەمتەرخەمییەکە هەمووی لەملە وی نییە بەتەنێ. جاری وایە دەبارودۆخێکی وا دەکەوێ کە ناتوانێ جڵەوێ توندکاتەوە؛ شایە بەڵام ناتوانێ، ئەدی حوکمەت کێیە؟ حوکمەت من و تۆ و ئیدیکەین- هەمان ئاغای سوسماری وەزەغ پوورێکی کە ئاشکرا و ناسراوی لای جەنابتانە، یا فلاڵن سەرهەنگ، یا فلاڵنە پەخشدار، بەکورتی خڕی مەئمورەکانە. ئێوە رەزا شاتان نەدیوە، ئەم شایەشتان هەرنەدیوە، سەرەك وەزیرانیشتان نەدیوە. بەڵام خۆ ئەمیر لەشکرتان دەدیت، منیش هەر دەمدیت- من زیاتر! دەتاندیت کە ئیسماعیل خانی دەنارد و دەگیانی ئەو خەڵکەی بەردەدا، دەیگرت، پارە لەو، و ئەسپ لە یەکی دی و لە یەکێکی دیکەی شتێکی دی دەئەستاند. من ناڵێم ئەوکارانە راستن- من بۆخۆم هەزاران جنێو و قسەی ناشیرینم پێ گوتوون و سەرزەنشتم کردوون، جا با ئەمیر لەشکر نەبووبێ هەرکەسێکی دیکە بووبێ- بەڵام دیارە بەدزییەوەم ئەو جنێو و قسەو سەرزەنشتانە پێ گوتوون، نەك وەك ئێوە بە ئاشکرا؛ چونکە دەزانم، بە تاقیکردنەوە فێربووم، بەقسەی لای خۆمان کە ئەو کوردە وەك رەقەماری سڕ، وان، بەڵام هەرکە گەرمایان گەیشتە پشتێ سەرێ بڵند دەکەن و گەزارەی دەکێشن بەڵام ئێوە ئەمانە نازانن. کوڕەکەم تۆ بە هەموو



ئارەزووی خۆتەوە هەرچی دەربارەی روسیایە دەیخوێنییەوە بەڵام ئامادە نی تەنانەت سەرنجێکی بارودۆخی وڵاتەکەی خۆت بدەیت و لێی وردبییەوە. تۆ نابێ چاوەڕوان بی تا دەکەوییە زیندانێوە ئەوجا تێبگەی- تۆ خوێندووتە، تۆ دەگەڵ سۆفی رەسووی جودای؛ تۆ دەبێ زووتر تێبگەی نەك کاتێ کە کەوتییە زیندانێوە ئەوجا تێبگەی. ئەو دەڵێ من سەری خۆم لەبەردیدا، بەڵام تۆ دەتوانی لە هەزاران لاوە ئەو سەر لەبەرد دانە، دە کتێباندا وەبینی. هەر ئەو کتێبەی دواییەی کیسرەوی کە چوار پێنج ساڵە دەرچووە- مێژووی مەشرووتە دەڵێم- پێموانییە خوێندبێتتەوە- ئەگەر دەزانی قەدەغە نەکراوە وەریگرە و بیخوێنەوە، هەرچەندە دەزانم تا مێژووی حیزبی کۆمۆنیست لەوێ بێ ئەو جۆرە شتانە ناخوێنییەوە... چونکە وەك خۆتان دەڵێن ((مێژووی شارستانیەتە)) هەقیشتانە، چونکە مێژووی ئێمە مێژووی دواکەوتن و نەزانینە! دیارە کەیفت بەوەی سازە کە سەیر دەکەی هاوڕێ مۆلۆتۆف لێپرسراوی کۆمیتەی لینینگراد بووە شار وەك ماستی مەییو بووە! گوناە و کەمتەرخەمییە خۆتە کە کارێکی وات کردووە کە من بێم و تەشەران لە زانین و فێربوونەکانت بدەم، هەرچەندە تۆ خۆت ئەو تەشەرانە بەخۆت رەوا نابینی...)).

کوڕەکەی- لە ناخی دڵەوە- پێکەنی.

((تا ئێرەش زۆرخراپ نییە، حوکمەتیش بەلاوەی پەسەندە- ئەو پێشکەوتن بازییانەی بە کەڵك دێن... شیعر بڵێ، فەلسەفە بچنە، داستانان بڵێ... بە کەڵك هەردێن؛ دەوڵەتیش پێویستی بەو جۆرە شتانە هەردەبێ، ئەو کارانە خراپ نین؛ کاری خراپ ئەوەیە کە خودا نەخواستە رۆژێکی بێی و وەك منداڵان دەمەرقاچانێکی (ترەقە) بتەقێنی... بەلای منەوە ئەو شتانە هەمووی هەر تەنیا قسەی رووتن کە تۆ بێیت و دڵ بە ژیان خۆش کەی، کەچی ژیانی خۆتت لەبیربچێتەوە- هەر هەموو ژیانت بیربچێتەوە! ئەوە قەت نەبووە قسە. ژیان بە هەموو ئەو شتە وردیلانەوە خۆشە: بە ئەشقەوە، بەژن و ماڵەوە، بەگرفتارییە ژن و منداڵانەوە و دانیشتنێ نێو دۆست و ئاشنا و رۆشنایانەوە... ئەوەی کە دەمێنێتەوە هەمووی هەر قسەی رووتە و قسەش ناچێتە ناو گیرفانەوە. شۆڕش! ئەمانە هەمووی پارووی گەورە و پڕ بەزارین کە وەك تەقینەوەی گڕکانێ هەر لە دوورەوە جوانن. تۆ برسییەتییە شۆڕشیت نەدیوە؛ خۆ ئەوە شۆڕشیش نەبوو، هەر تەنیا قونچکە ترەقەکەی گەیشتەمە... چ ما، نەیکێشم و چ ما، نەیبینم- برسییەتییە

دەڵێم. هەر لە دوورەوە شتێك دەبیسی و هیچی دی، ئەویش نەك لە خەڵکی لە رادیۆوە. بەڕاستی ئەو تیۆرانە بۆ چییە ئەگەر ژیان و گوزەرانێ خۆش نەکەن؟ ئەو شۆڕشانە بە کەڵکی چ دێن ئەگەر هەموو شتە چاکەکانی لەناو ببەن؟...

کوڕەکەی لەپڕ روخسارێکی راشکاوانەی بەخۆوە گرت؛ چوارمەشقی دانیشتبوو هەستایە سەرچۆکان؛ هەناسەیەکی قوولی هەڵکێشا؛ هەناسەکەی بە پچڕپچڕی لە سینگییەوە دەرهاویشتەوە دەرێ؛ بابە روخسارێکی چاوەڕوانانەی بەخۆوە گرت و دەستی برد جگەرەیەکی لە قوتووی جگەرەکەی دەرێنا؛ من تێکچووم.

((دەی وادیارە هەر دەتەوێ شتێکی بڵێی؟ بڵێ، بڵێ!)).

((نازانم چتان عەرزکەم؛ بەداخەوە گفتوگۆی ئێمە هیچ کاتێ رێچکەیەکی راستی نەگرتووە- یانی هیچ کاتێ لە جێیەکەوە دەستی پێ نەکردووە تا لەجێیەکی دییەوە کۆتایی بێ. هۆیەکەشی زیاتر رەنگە هەر ئەوەبێ کە نامەوێ و نەمویستووە، ئەوچەند رۆژانەی کە لێرەم کارێکی وا بکەم کە ئێوەی پێ ناراحەت بن، چونکە دەزانم ئەوانە هەمووی بۆ رێنماییە من دەفەرموون. ئەڵبەتە زۆرتان سوپاس دەکەم)). بە ئاوازە بێ مەبەستەکەی وشەی رێنماییەکە، بابە پێکەنی.

((بەڵام لە دواییدا دەبینمەوە کە خودی جەنا بعالیش بەوە قایل نابن تانە و تەشەران لە زانیارییەکانی بەندە- یانی لە کتێبەکانی بەندە- بدەن... ئێستاش ئەگەر بفەرموون چەند قسەیەکتان عەرز دەکەم)).

زۆر دۆستانە گوتی: ((فەرموون، تکا دەکەم!)).

((ئاماژەتان بەڕێ بەخۆدانێ دۆستانی شۆرەوی فەرمووی؛ فەرمووتان بە چ هەقێك سەرنج و تێبینی خۆیان دەربارەی ئاریشە و مەسەلەکانی ئێمە دەدەن)). بابەکە بەسەر لەقاندنێ پاڵپشتی لە قسەکەی کرد)). بەندە عەرزتان دەکەم: یەکەم بە هەقی دراوسێیەتییە، چونکە هەرکاتێ کەماڵی هاوسێ ئاوری تێبەربوو، یا دیواری نێوانێیان خراپ بوو، دراوسێیەکەی دی ناتوانێ هەروا دەست لەسەر دەست دانیشێ و گوێ نەداتێ و خۆی کڕکا- دووهەم بەهەقی زانستی بوونی ئاریشەکان. ئەنجامی موتالا کۆمەلایەتییەکان دە کیشوەری مەدا بۆتە باو؛



نەدەور و بەریش ئەو ئامادەگییەی تێدایە نە تاکە کەسیش ئەو رێیەی پێدراوە. ئێستا ئەگەر بۆ نموونە فلاڵن باسکاری ئینگلیزی بێت و کە تیبەی بێستوون، یا تابلۆکانی تەختی جەمشیدمان بۆ وەخوێنێ یا بۆ نموونە موتالایەك دەربارەی ((مافەکانی)) کۆمەڵگای زەمانی ساسانیان بکات داخوا بەلای ئێوەوە کارێکی خراپی کردووە؟ ئەمەش هەروایە. تازە ئیدی ئەو بۆ ئێمە کارناکا- کار بۆ خۆیان دەکەن. منیش هەر نەمگوتووە کە هەرچی ئەوان دەیڵێن لەسەتا سەت راستە؛ بۆ خۆشیان هەروا ناڵێن. لەوەش بەولاوەتر کاروبار و ئاریشە کۆمەلایەتییەکان وەك پرسیارە بیرکارییەکان وەلامی بن بڕو دیاریکراویان نییە، چونکە بەخەڵکەوە بەندە و سەروکاری دەگەڵ مرۆڤە، و بارودۆخەکانی مرۆڤیش هەمیشە لە گۆڕاندایە و هەرگیز بە لایەکیدا ناکەوێ و سەقامگیرنابێ- جا ئەو خەڵکانە تاك بن یا کۆ، هیچ جیاوازییەکیان نییە...)).

((باشە؟)).

((زۆر جارانتان ئاماژە بە لە پێشتر بوونێ شۆرەوی فەرمووە؛ لە لەهیستان، و چیکۆسلۆواکیا، و زۆرجێی دیشت ناو هێناون و هەقایەتی مەلا رێویشت بۆ گێڕاوینەوە)).

((باشە!)).

((دەربارەی نەبوونی سەربەستی و تەپەسەرکردن و هەژاری ئەوێتان فەرمووە... ئەو رستانەی کە بەکارت بردوون شتگەلێك بوون بەم جۆرە: ((باشە، وەك ئازادیخوازان بیربکەرەوە، و وەك کەرێ رەفتارکە... هەموویان کاتێ کە دێتە سەرخۆیان هەروان... ئەوە هاوڕێ ستالینەکەتان بەخۆ و ئەو هەموو لەناوبردنانەیەوە... کەچەڵ حەکیم بایە دەرمانی سەری خۆی دەکرد...)).

((بڵێ، ئێستا هیوام روونە. لەبەرئەوەی کە گوێ دەگری؛ من تا ئێستا هەرپێموابووە لەو گوێیەت چۆتە ژوورێ و لەویدیت هاتۆتەوە دەرێ)).

((ئاواڵێکی وەك جەنابعالی، دەو دواییانەدا زۆر بەداخ و کەسەرەوە دەیگوت: ((ئەتۆ دەزانی، سلێمانی زۆرم غەمو کەسەر و داخ خواردن!)) بەروخساریشیەوە دیاربوو کەوایە. تازە لە چوونە مۆسکۆیە راهاتبۆوە. ئەویش تێدایە؛ برای یەکێك لە هاوپۆلەکانی منە- هاتوچۆی ماڵێیان دەکەم ((لە کارخانەی بۆڵبرینگ سازییە مۆسکۆیدا، کچێکم دیت هەردەتگوت تاڵە تیشکەکانی رۆژێیە، دەڕۆن و چەور و چەوێڵی و پیسیەدا ون ببوو... کە ئەوە بەلای منەوە

تاوانێکە نەبێتەوە- کە کچێکی ئاوا بەو هەموو جوانییەیەوە بەم جۆرە دەڕۆن و چەورایەتییەدا ون ببیٚ!)) بەسەرسامیەکەوە تێمڕوانی. کە سەرسامییەکەی دیتم گوتی: ((ئاخر جوانیش بۆخۆی سامانێکە؛ کە نابیٚ هەروا بەخۆڕایی ئەو سامانە لە دەست چیٚ)).

گوتم: ((وایە، سامانە... باشە تۆ پێتوایە چ بکریٚ باشە؟)) گوتی: ((دەبیٚ بپارێزریٚ... حەیفە)).

ئەڵبەتە منیش هەردەمزانی کەحەیفە و دەشزانم... دیسانەوە کچەم هاتەوە بیر، بەڕاستی حەیفە!...)).

هەناسێکی هەڵکێشا.

ئاغا گوتی: ((بلٚیٚ)). ئەویش بەو وەبیرهاتنەوەی ناراحەت بوو؛ سەری بەردابۆوە و دە قوتووی جگەرەکەیەوە رامابوو.

((هیچم نەبوو بیلٚێم- گوتم: ((دەلٚێی چی بینێرینە، ناوشاری تا لەویٚ ئاگایان لێی بێت؟)).

ئاواڵەکەم واقی وڕما رەنگە پێی وابوبیٚ گاڵتەی پێدەکەم. هەقیشی بوو. ئەو هەر ئەو جوانییەی لەبەرچاوی بوو، بەلاٚم ئەو جوانییە ژاکاوانەی ناوشار و ناوشارە گەورە و بچووکەکانی کۆڕی رابواردنیٚ گەورەکانی نەدەدیت. هەر تەنیا گریس و چەورییە دەست و مەچەکی ئەو کچە روسییەی و لەناوچوونی ئەو جوانییەی بە گوناهی گەورە دادەنا... ئەڵبەتە بە گوناهی رژێمی کۆمەلاٚیەتی ولاٚتەکەی- چونکە ئەو بەلایەوە وابوو کە ئەو جوانییە هەر بۆ کۆڕ و بەزمی رابواردنیٚ دانراوە... ئەو شتانەی هەموو دەدیت بەلاٚم خودی کچە و ئابڕوو و کەسایەتی و ناسنامە مرۆڤایەتییەکەی وی نەدەدیت...)).

((ئەوە بووە حیکایەت!)).

((ئەوەیانم وەك جەنابعالی دەفەرموون، هەر بۆ خۆشیە گوت. بەهەرحاڵ بالەوەی لادەین کە ئەمانە کیٚ دەیانلٚێت و کیٚ دەیاننوسێتەوە... بەندە خوێندوومەتەوە و هەروا بە ئەقلٚیش بۆم دەرکەوتووە کە ((هەر شتێکی تازە کە سەرهەڵدەدا دەبیٚ هەر لە دەوروبەرەکەی خۆیەوە لێی بکۆلڕێتەوە)).



ئێمە هیچ کامێکمان لە ژینگە و دەوروبەرەکەی ئەویٚ نەبووین و ئەوەی کە لە بارەشیانەوە دەیزانین هەر لە خۆیان و خەڵکی دییەوە دەیانزانین. دادوەرییە من و جەنابعالی دەربارەی ئەوانە و ژینگەکەیان راست وەك ئەو داوەریەیە کە دەربارەی سۆفی رەسووەکەی مە و ژینگەکەی داوەرییە بکەن. ئەمە بێجگە لەوەی کە ئەوان دەوروبەرە دەرەبەگایەتییەکەی ئێمەیان تاقیکردۆتەوە و ئێمە دەوروبەرەکەی ئەوانمان تاقی نەکردۆتەوە. زۆرجاران دەبیسم دەپرسن: ((باشە، ئەوە دامانناهەرچی ماڵ و سامانیشە هەموویتان دابەشکرد، کۆمۆنیزمیشتان بەرپاکرد، دوایە چی؟)) بەندە هەمان ئەو وەلاٚمە دەدەمەوە: ((هەر شتێکی تازە کە سەرهەڵدەدا دەبیٚ لە دەوروبەر و ژینگەکەی خۆیدا لێی بکۆلڕێتەوە)).

((زۆرچاکە)).

((بەرێکەوت ئەو رووداوە دە ژینگەی مەدا- هەر ئالێرە- زۆر وەڕاست دەگەڕیٚ- لەبیرتانە لە زەمانی رەزاشای لە تارانیٚ کۆبوونەوە و پێویستییەکانی ولاٚتیان چین بەندی کردن و کردیانن بە چەند بەشێکەوە: ئەو بەشەی زۆری لێدەهێنریٚ، ئەوەی کەمی لێدەهێنریٚ، ئەوەی قەدەغەیە بهێندریٚ. بەشی یەکەمیان ئەو پێویستیانە بوون کە لەناو ولاٚتیدا هەر دروست نەدەکران و ولاٚتیش زۆری پێویست بوون، وەك ماشین و ئامێر و ئەو جۆرەشتانە. بەشی دووەمیان ئەوانەبوون کە وێنەیان دەولاٚتیدا دروستدەکرا بەلاٚم کەم بوو و بەشی پێویستییەکانی ناوەخۆی نەدەکرد. بەشی سێهەم ئەوانە بوون کە وێنەکانیان (جۆرەکانیان) دەنێو ولاٚتیدا بەرهەم دەهێندرا و بەشی پێویستییەکانیشی دەکرد. بەلاٚم ئەوانەی کە لە تارانیٚ کۆبوونەوە و ئەم یاسایەیان نووسی نە ئێرە و نە زۆر جێگای دیکەی وەك ئێرەیان بەدرێژایی تەمەنی خۆیان تەنانەت هەر بۆ تەنیا جارێکیش نەدیتبوو. لەراستیدا یاسا و بڕیارەکەیان هەر بۆ تارانیٚ نوسیبوو و بەس. ئەودەمی کابرای کوردە یا کابرای بلوچی بێکار چ بکا؟ پیشەسازییەك نییە بەرەو خۆیەوەی راکێشیٚ؛ پارچە زەوییەکی دێرینەی لەسەردەمی چاخە بەردینەکانەوە بەبیٚ پشوودان بەرهەم دەدا، ئەویش هەر لە کەڵك بوو. کار گوزارییەکی دەوڵەتی دەنێودا نییە. ناچارە دەبیٚ بچێت و ببێتە قاچاغچی، دەوڵەتیش ناچارە دەبیٚ بیگریٚ و لەسێدارەیدا، بۆ چونکە ئاغایان یاسایان بۆ تارانیٚ نوسیووە و ئەو یاسایەش چ جێی دی ناگرێتەوە، بەتایبەتی ئەو جێیانەی کە بەدرێژایی تەمەنیان نەیاندیوە!)).

((دەی... باشە)).

((شتێکیشتان لەبارەی قازی محەممەدەوە فەرموو: بەلای ئێوەوە دەبایە قازی محەممەد چی کردبایە؟ قازی محەممەد و ئەوانیدی هەر هەموو وەدوا پەیسەر و شوێن پێی ناسنامەی نەتەوایەتی کەوتبوون؛ هاتن و حوکمەتێکیان دامەزراند، کە بێگومان ئەوەش کارێکی هەروا ئاسان نەبوو: ئینگلیز و ئەمەریکا- بەتایبەتی ئینگلیز کە هەر لەبنەڕەتەوە دابەشکردنی ئەم میللەتەی بەو شێوەیەی کە هەیە، شاکارێك بوو لە شاکارەکانی خۆی. هەربۆیەش چاوی بەرایی نەدەدا ئەو حوکمەتە ببینێ، و لەبەرهێندێ بە هەموو شێوەیەك خەریکی گێرە شێوێنی و تێکدانێی بوو، هەربۆیە چاو لەدەستییە وان و بەتەمای کۆمەکیە وان خەیاڵێکی بلاّو و بیرێکی خاوی نەفامانە بوو. واش دەفەرمووی ئەگەر دەوڵەتێکی دی هەبێ و بێت دەستی دۆستایەتییە و کۆمەکێت بۆ هێنانەدی ئامانج و خەونە دێرینەکانت بۆ درێژ کات قازی و ئی وەکو قازی ئەو یارمەتی و پشتیوانیانە ڕەت کەنەوە؟ بەلای منەوە قبووڵکردنی بە هانا هاتنەوەیەکی ئاوا هیچ هەڵەیەکی تێدانییە- دیارە ئەویش بە مەرجی پاراستنی سەربەخۆیی خاکی ولاّت و سەربەخۆیی کارە کەسییەکان. بەلاّم دوایە هەروەك ئاماژەشتان بە شاو بە دەوڵەت کرد، ڕۆژێك دێت کە بەڵێ شا، شایە، بەلاّم هیچی لە دەست نایە. باشە ئەگەر دەوڵەتێکی وەك یەکیەتی شۆرەوی کەوتە بارودۆخێکی واوە هیچی پێنەکرا، نابێ؟ ئەویش نەیتوانی و بەرگەی نەگرت، و ئۆباڵەکەشی کەسانی وەك جەنابعالی، کە کەمتان کلك دەکاروباری ئەو حوکمەتەوە وەرنەدا، لەکاتێکدا کە سوڕ دەتانزانی قازی پیاوێکی نیشتمانپەروەرە و ئێمەی کوردیش لە ئێرانیان ئێرانی ترین، و ئەگەر گوناهێکیشمان هەبێت ئەوەیە کە دە ئێرانی بوونێماندا، خۆمان بەڕەگ و ریشە و خەڵکی دیمان بە لك و پۆپ زانیوە...)).

((باشە...)).

((ئێستا دێینەوە سەر سەروپۆتەلاّکێ سۆفی ڕەسوو و ئەوانەی وەك وین. باشە، ئەگەر سۆفی ڕەسوو تێگەیبایە و بیزانیبایە کە دەبێ چ بکات و گرێی کارەکانی چین و لە کوێن و چۆناوچۆن دەکرێنەوە ئەودەمی چ پێویستییەکی بە بوونی ئێمە بوو و ڕۆڵی ئێمە نرخی چ بوو. کاتێ قسەوباس دێتە سەر کەسانی دی ئەوە هەموو دەبنە شەهیدی نەزانییە خەڵکی، و جێی ستایش و پێداهەڵدان و خاوەن بارەگا و جێ و ڕێ- هەقەکەش هەروایە. بەلاّم کە نۆرە دەگاتەوە



سەرخۆمان ئیدی ئەوە هەموو شێت و گێل و بەرهەڵدان... تەنانەت کەسێك نالێ هەیاران ئەوانە بێ ئەوەی چاویان دەهیچەوە بێت خۆ دەئاوری داوێن و بەلانی کەمەوە خەڵکێکی لەخۆ بوردەن، با هەر نەبێ لەبەر ئەوەندەی با قسەی نابەجێیان پێ نەڵێین- ئیدی با پێهەڵگوتن و ستایشکردن هەر پیرۆزی وان بێت. کەچی وازمان لێناهێنن و کۆڵمان لێنادەن و لە ئازار و ناخۆشیەمان درێغی ناکەن و شل نابن: دەبینە جاسوس و جاش و نیشتمان فرۆش، چلکاو خۆری بێگانان، بێ دین- هەرچی حەزیان لێبێ ئەوەمان دە پارسەنگێ داوێن، ئەوەش هەربۆیە چونکە خودی شا و دار و دەستەکەی زۆر دیندارن! بەندەش هەر دەگەڵ تۆدام، کە چارەی دەردی ئەو خەڵکە هەر ئەو خەڵکە خۆیەتی؛ ئەو واکسەنەی کە فەرمووتان ڕێك دەبێ دەسکاری دەستی هەمان ئەو خەڵکە خۆی بێت و لە میکرۆب و قایرۆسی بومی دروست، دروست بکرێت و لەسەر خەڵکی ناوچەکە تاقی بکرێتەوە. بەلاّم... دەربارەی حوکمەت... بەندە عەرزتان دەکەم کە ئەو کەسانەی بۆ حوکمەت کردنێ هەڵدەبژێردرێن و دەست نیشان دەکرێن هەموو دەسەلاّتدار و خواپێداو و دەوڵەمەندەکانن- جا ئیدی هەرچییەکی دیکەیان هەبێ یا نەبێ ئەوە گرینگ نییە. پارە و دەسەلاّتیان هەبێ یا توانای زۆر گوتنێیان هەبێ ئەوە بەسە، چونکە بە ناوی پوول و دەسەلاّتەوە حوکمەتییە دەکەن. قسەی هەڵبژاردنێش ئەوە هەر بەناو هەڵبژاردنە. ئەگەر هەڵبژاردنێکیش دەئارادا بێ ئەوە هەر بۆ هەڵبژاردن و دەستنیشانکردنێ چاکترینیانە لەوانەی بۆخۆیان دەیانهەوێن- یانی خراپترین کەسانێك. ئەو خەڵکە بەستەزمانەشیان والێکردووە و وایان دەرس داداون کە ئەگەر بە ئازادی و سەربەستیشەوە دەنگی هەڵبژاردنێ بدەن، دیسانەوە هەر ئەوانە هەڵدەبژێرنەوە کە سالاّنێکی دوورودرێژە هەر هەڵدەبژێردرێن و هەڵدەبژێردرێنەوە؛ لەراستیدا ئەو خەڵکە هەموو نەخۆشن و بەبێ ئەوەش هەست بە خۆیان بکەن کە نەخۆشن. کاتێ پێشکەوتن لەسەر ئەو پلەو پایەوە ڕاوەستێ دەبێ پیاو شەرمی لەو پێشکەوتنە بێتەوە، چونکە ئەو جۆرە پێشکەوتنانە پێشکەوتنێکی چەپەلاّنەیە و هاوبەشی کردنێکی ئاوا ورچ ئاساییانە چ شانازییەکی پێوە نییە: چونکە ئەو پێشکەوتنە بە توانایەکی واوە بەندە کە زۆر کەس ئەو توانایەیان تێدانییە و ناشیانەوێ تێیاندا بێت. و بەبیروباوەڕی ئێمە ئەرکی ڕاستەقینەی مە دەبێ ئەوە بێ کە نەهێڵین ئەوانە ببنە عادەت و بەلانی کەمەوە بەوەندە هێزو توانا و خۆڕانانەی تێماندایە ببینە لەمپەرێك و نەیەڵین خەڵکەکە خووی پێوەبگرن و ئەوانەی وەك حەزرەتی ئەجەلن تێبگەن کە ئەو هەموو نیشان و میداڵ و تەنتەنە و بەنبەنەی پێیانەوەیە

دە ئازایەتییە مەیدانی شەڕی راستەقینەیاندا وەرنەگرتوون و دەبێ خۆیان و خەڵکیش تێبگەیەنین کە ئەوانە گەورە و سالاری کۆمەڵێك ورچ و بەرازانن و هێندەیان لە باراندا نییە بێن بەسەر مشتێك خەڵکەوە حوکمەتێ بکەن؛ و دە خەڵکی بگەیەنین کە ئەوان ورچ و بەرازنین و ئەگەر بیانەوێ لە دەستیان دێت مرۆڤ بن و ئادەمی- و دیارە ئەمەی ئێستاش دەگەڵ سیاسەتی حوکمەت، تەنانەت زۆر بەداخیشەوە دەگەڵ بیر و سەرنجە ئینساندۆستەکانی وەك جەنابعالی، کە بەگوێرەی خوو و رەوشت و تاقیکردنەوە و پەیڕەوی هەست و نەستەکان، ئەم بارودۆخە تا ئاوا کە چاکترین رێچکەی ژیانە، نایەتەوە. ئێوە دەفەرموون کە هەر جارێکمان ژیان لە سۆفی رەسووەکان ئەستاند ئیدی بەسە- ئیدی ئەرکی وان هەر ئەوە دەبێ کە دانیشن و کارو ئەرکەکانیان ئەنجام بدەن و بپارێنەوە.

((دوایی، هەروەك فەرمووتان شا یا سەرۆکی دەوڵەت هیچ کەمتەرخەمی و خەم ساردییەکیان نییە؛ وەك رەشتییەکان دەڵێن لە تارانێ دانیشتووە و ماستی (خۆی) دەخواو هەقی بەسەرەمەوە نییە ((یەکێك قیسپیان لە پاشێ دەکوتا دەیگوت ئەو تەقە تەقە چییە- وەرگێڕ-)). رەندە، هەر ئەوەندە، دەپرسم داخوا هەر ئەو ئاغای سوسماری و ئاغای وەزەغ پوورە کە بەناوی نومایندەی دەوڵەتەوە یەخەی ئێمە و مانان دەگرن- یا داوای لێبوردن دەکەم، زۆری لەوانیش گەورەتر- ئەوانە کێ دایناون؟ بەکام قەرار و بڕیە و بە مۆڵەتی کێ بەر و بەرکی ئەو خەڵکەی هەڵدەتەکێنن؟ باشە چ دەبێ کاتێ کە کۆمەڵە وەرزێر و کرێکارێك هاتن و داوای سەرەتاییترین بەشە مافەکانی خۆیان بکەن- یانی بۆ وەدەست هێنانی پارووە نانێکی مەمرە و مەژیانە- کۆببنەوە کە سەروبنی هەر هەموو کێشەکەشیان ئەوەندەیە کە ((ئەرباب)) بفەرمووێ و ئاوڕێکیان لێ بداتەوە و وەك شاعیر دەڵێ هەریەکە و نانێکیان لە هەقدەستییە بۆ زیاد کات، ئەودەمی هەر یەکراست کتوپر هەموو دەبنە جاسوس و نیشتمان فرۆش و نۆکەری بێگانە و وەلامیشیان بە گوللە دەدەنەوە! ئەو ((نیشتمان فرۆشی)) و ئەو ((توندوتیژییە))ش بۆ خۆتان فێرتان کردوون- بەکردەوەکانتان- زۆرداوای لێبوردن دەکەم- ئێوە کەی چاوێکتان لە مافی خەڵکەوە بووە، کەی رێگاتان بەو خەڵکە داوە بزانن و تێبگەن کە نیشتمانێکیان هەیە تا بەرگری لێبکەن، یا بیفرۆشن. زۆر بەداخەوە یا زۆر خۆشبەختانە لە تاکە یەك رێگا زیاترتان بۆ نەهێشتوونەوە. نامەیەکی باستۆرم لەجێیەکی خوێندەوە کە تێیدا زۆر بەهەست و نەستەوەی بۆ کوڕەکەی نوسیبوو، ئامۆژگاری کردبوو و داوای لێدەکات کە بەخوێنی خۆی بەرگری لەو



نیشتمانە بکات کە تێیدا ژیاوە و گەورە بووە و بەهرەکانی خۆی تێدا پەروەردە کردووە و پێی گەیاندووە. هەناسەی نوێ کردەوە؛ بانگی ئەحمەدی خزمەتکارە لاوەکەی کرد، چای بێنێ. ئاغای سلێمانی هەروەك جاران گوتییەوە: ((باشە؟)).

((ئێستا بەندە لە جەنابعالی دەپرسم، تائێستا چ یاسایەك پشتی سۆفی رەسوو و خاو و خێزانەکەی گرتووە و پاراستوویەتی، چ سوودێکی لە بەهرەکانی ژیان دیوە تا داوا لە کوڕەکەی بکات بەرگری لێبکا.

خۆ سوسماری و وەزەغ پوورییەکان چ یاسایەك نەبوو پشتیوانییەی لێبکەن کە خەتەرێکیش پەیدا دەبوو و یاسا دەکەوتە خەتەرەوە- یانی ئەو ژیانە- ئیدی ماریان بەدەستی خەڵکی دەگرت. باشە ئەوەچییە، هەر کە فەرمانبەرێکی میری دێتە ناو گوندییەوە، گوند پیاوی تێدا نامێنێ و هەموو هەڵدێن؟ بۆ؟ بۆ فەرمانبەر ئادەمی نییە، یا خەڵکی ئێمە میوان نەوازییە نازانن و لە پیاوەتییە یان کەمە؟ بۆ... فەرمانبەریش ئادەمییە، خەڵکی ئێمەش تا خوا حەزکا میوان نەواز و غەریب دۆستن... فەرمانبەریش ئادەمییە، بەلام ئادەمییەك کە هەرچی هەست و سۆز و بەزەییە لێیان داماڵیوە و لەرێچکە ئادەمییەکەی خۆیان دوور خستۆتەوە. کامانە؟ - هەمان ئەو ((یاسایانە)) تۆ بۆخۆت ئەو جووجەڵە و مریشکەت دیبوون، و من زۆر جارانم ئاگا لێبوو کە بە چ تاسەو ئارەزووێکەوە سەیرت دەکردن و پێدەکەنیت، دەتدیت کاتێ کە بەلایدا تێدەپەڕین چۆنی خۆ گیڤ دەکردەوە و حاڵەتی هێرشی بەخۆیەوە دەگرت. بەلام خۆ ئەو کچۆڵەشت دەدیت...)).

دەنگی وەلەرزە هات و کزبوو. بابە سورهەڵگەڕاو سەری بەردایەوە و خێراخێرا گوتی: ((ئا. ئا!)) کوڕەکەی هەناسێکی قووڵی هەڵکێشایەوە؛ ئەحمەد چایەکەی لەبەردەمی دانا. چەند کلۆقەندێکی لە شەکردانەکە هەڵگرت، بێ ئەوەی کلۆقەندەکان دە زاری نێ، دە درێژەی قسەکانیدا گوتی: ((... ئەوت دەدیت کە چەند بەنەرم و نیانی و لەسەرەخۆییەوە، دەستی بە پەڕوباڵی دادێنان و کۆشی بۆ دەگرتنەوە و یەکە یەکەی دەکۆشی خۆی دەکردن: لەبەردەمی دایکەکەیان رۆدەنیشت و جوجکەکانی دەگرتن. هێشتا نەیگرتبوون کە چاویان بە کچۆڵەی تاین دەکەوت هەموو بەڕاکردن و باڵەفڕکێوە دەهاتن و خۆیان هەڵدەدایە سەر، سەر و پۆتەلاکی؛ و

ئەویش هەمیشە چەند مێشێکی دە قاوغە شخارتێکیدا بۆ دەهێنان- مریشك و جوجکەکان لێی دڵنیا بوون- ئەویان بە خۆشەویست و ئاواڵی خۆیان دەزانی)).

هەڵوێستەکی کرد؛ داواکارانە سەرنجێکم دایە- دەمویست بەردەوام بێت.

چایەکەی هەڵقوڕاند.

ئاغا گوتییەوە: ((دەی، ئێ!)).

((دەفەرموون مێژووی کیشوەری خۆمان بخوێنمەوە...)).

((بەڵێ)).

((چ وەخوێنم؟ -هەرچەندە خوێندنەوە پێویستە و بەردەوامیشم، بەڵام بەبێ خوێندنەوەش دەتوانی زۆر شتان ببینی. ئێمە زۆر بەداخەوە هەرگیز لە ڕووداوان هێندە بەخەم نەبووین تا تێیان بگەین و بۆ بەدبەختییە دە هیچ دەمێکیدا — تەنانەت تا ئەو دواییانەش- هیچ مایەیەکی نووسین شرۆڤەکردنی ڕووداو و بەسەرهاتەکان بوونی نەبووە. ئەگەرچی... هەروا بەشێوەی هەڕەمەکی- هەشبووبێ دەرفەت و ئازادیی پێویست لەبەر دەستاندا نەبووە. ئەوە بەلای جەنابتانەوە ئاشکرایە کە تا ڕووداوەکان بەسەر نەچن و ڕوونەدەن جێی شرۆڤە و لێکۆڵینەوە و لەسەر نووسینێ نین. چونکە هۆ و ئەرێ و شتە پەیوەندیدارەکان لەسەرەتاوە... ڕوون نین. هەر کە بەڵایەك دێت هێشتا ئەو بەسەرنەچووە و تێنەپەڕیوە یەکێکی دیکەی بەدواوەیە و هەمدیس یەکێکی دیکە- و بەڵایەکی گەورەتر. من نازانم کە کیسرەوی بەو هەموو ماندووبوونەی کە دەنووسینی ئەو مێژووەیدا چەشتویەتی، ئەگەر هاتبایە و هەر ئەو مێژووەی دە کەش و هەوایەکی ئازادانەتردا نوسیبایە دەبوو چ بایە. ئەم مەملەکەتە سەرزەمینی دێوی ئادەمی خۆرانە- هێشتا دێوێك نەڕۆیشتووە یەکێکی دیکە قوت دەبێتەوە، و شریتەکە ناپسێتەوە؛ هەریەکەیان لەویدیکە ئادەم خۆرترە: ئەوە نەوشیرەوانی عادیل کە بەناوی یەکسانی و عەدالەتەوە چی بە مەزدەکییەکان نەکرد؛ ئەوە قوبادەکەی، ئەوە خولەفا عەرەبەکانی کە بەناوی ئیسلامەوە چیان نەکرد؛ ئەوە جەنگیزخانی، ئەوە هۆلاکۆ خانی، ئەوە تەیمورەکەی- دە مێژووی کام نەتەوەی سەردنیایە گومبەز و منارە لە کەللەسەری ئادەمیان هەڵچنراوە! ئەوە سوڵتان مەحمودی و گەمەی قرمیتەکان، بەقسەی خۆی، پەنجەی دەهەر



کونێکی نابایە قرمیتییەك دەردەپەڕی، ئەوە شا عەباسەکەی کە بەتالیۆنێك ((ئادەم خۆر))ی هەبوون؛ ئەوە ئاغا محەممەد خانی، کەدە مەنی دە مەنی چاو دەویستن... ئەوە هێشتا دەربارەی دێرینییەکانم چ نەگوتووە. لە کوێی دنیایە ئەو هەموو بیدادییە دیتراوە. ئەوە شتێکی ڕێکەوتە و لەخۆوە نییە کە چۆتە نێو ئاواز و گۆرانیانیشەوە و لە غەموشادییەکانیشدا لەسەر زارانن و دەگوترێنەوە کە بە ((ئەی داد، ئەی بێداد- ئامان ئامان-ەوە دەست پێدەکەن. تۆ هەرگیز لە ئەورووپایە شتێکی لەو بابەتانە نابینی یەکێك دانیشێ و دەست لەبناگوێی بنێ و بەناوی گۆرانییەوە تێهەڵکاتە:

Oh. Judtice, oh in justice

بەڵێ، دیسانەوەش ئەم میللەتە، دەگەڵ هەموو ئەو ستەم و زۆرداریيەدا هەرماوە و بەردەوامیش دەمەیدانێدا بووە. ئێستاش ئێوە هەر دەفەرموون و ئامۆژگاریشتان هەر ئەوەیە کە ئەم میللەتە تاقامی قیامەتێ هەروا دانیشێ و دەست دە ئەژنۆیان وەرێنێ- بۆ؟)).

ئاغا گوتی: ((چیدیش؟)).

((بەهەرحاڵ قسە لەسەروەیبوو کە داخوا کەنگێ مەئمورێکی میری چۆتە دێیەکی و دەستێکی بەسەری منداڵی بێ دەرەتانی ئەو خەڵکەیدا هێناوە؟ کەنگێ دیارییەکی بۆ منداڵانی خەڵکی هێنابێ قوتوویەکی پڕ لە دووپشکە نەبووبێ، کەینێ لەسەرەخۆ دواوە و نەیشێراندبێ کەی ((دەوڵەت)) نەبووە؟ هەروا کە خودی جەنابعالیش دیوتانە، بە بۆچوونی ئێمە- لەبەر ڕۆشنابییە تاقیکردنەوەی خەڵکی- حوکمەت دەمێکە، سەدان ساڵە، چ پەیوەندییەکی بە میللەتەوە نەماوە؛ یاسا و عەدالەت ماوەیەکی زۆرە لەبەر یەك ترازاون، و لە یەك شوێن پێکەوە کارناکەن. هەر لە دێر زەمانەوە بگرە تا ئەمڕۆ چ ناهەقییەك ماوە حوکمەت نەیکردبێ و پشتی نەگرتبێ؟ بەم شێوەیە نابێ کەس چاوەڕێیی بێ، مەئموری دەوڵەتێ بێتە گوندییەوە و خەڵکی خۆ نەشارنەوە یا ئەو یاسایە بە ئی خۆیان بزانن و بەرگری لێبکەن... ((ئەوجا، دەربارەی ئازەربایجانتان فەرموو. بەندە عەرزبێ لە خزمەتتان کە جەنابی بەڕێزتان بۆ خۆتان شاهیدن کە من و ئێوە پێکەوە ئازەربایجانمان لەپێش شۆڕش و دوای شۆڕشیش دیتووە کە دە تەنیا ئەو یەك ساڵەی تەمەنیدا، حوکمەت بە ئەندازەی تەواوی مێژووی دەسەڵاتی حوکمەتی ناوەندی کاری کردووە: دانیشگای کردبۆوە، شەقام و شا ڕێیەکانی قیرتاو کردبوونەوە، ئێستگەی ڕادیۆی

دانابوو، زەوی دابەش کردبوو، هەروا زۆرکاری دیکەشی ئەنجامدابوون. خڕی ئەوکارانەی هەموو دەماوەی سالێکیدا ئەنجامدابوون. ئەودەمی ئەو چەند کەسی کوشت، و ((دەولەت))ەکە نەما، چەندی کوشت و چی کرد؟ تەنانەت ئابزاری هەمان ئەو رادیۆیەشیان دۆزییەوە و لەناویان برد- کە دەنگی دەگەیشتە زۆر جێیان! لەڕوویان نەهات دەنا دانیشگاکەشیان هەر دادەخست، لەبارەی دابەشکردنی زەوییەوە چتان عەرزکەم؛ لەپێشدا بە ((کفر)) داندرا. خودی بەڕێزتان لەوێبوون و بیستتان کەدەو تەنگنایەیدا بەڕێوەبەری گەراجی رۆژهەلاتێ چی دەگوت. لەلایەکەوە ستایشی حوکمەتی میللی، لەلایەکەی دیکەوە باس و شرۆڤەی دزی و کارە چەپەلەکانی حوکمەتی تارانێی دەکرد. من هیچ گومانێکم دەوەیدا نییە کە سوودی بێ جێ لە شۆڕ و هەلچوونی خەلکە شۆڕشگێڕەکە دیتراو هەلەکەیان قۆزتەوە کە ئەمەش هەر بێ هۆ نەبوو: راپەڕینەکە ساوابوو، بێ ئەزموون بوو، زۆرشتی دیکەی تریش، دیاریشە کە هەلە لە ئیشکردنەوە پەیدا دەبێ. دانیشتنی بن سێبەرێ و پەند و ئامۆژگاری و قسەی رووت چ هەلەیەکی وای بەدواوە نییە... دەربارەی سۆفی رەسووم عەرزکردن... سۆفی رەسوو چ پێویستییەکی بەتۆیە؟ ئەگەر بێت و هەموو شتێك لەجێی خۆیدا بێت، ئەگەر یاسا و رێسای باش دەکاردا بێت. ئەگەر لە دانانی ئەو یاسایانەدا بۆخۆی یانماینەدەکەی کە بە هەموو مەبەستەکانی وی ئاشنایە، هاوبەش بانایە، چ پێویستییەکی بە هاتنە لای جەنابعالی و ئەوانەی وەك تۆ دەبوو؟ یا دەروێش رەحیم- کەی ژنێك بە ئارەزووی خۆی مێردی کردووە، تا ئەو گیروگرفتانەی بۆ نەیەنە پێشێ؟ رێکەوتێك دەکێلگە و مەزرایەدا و تەمەنێك گرفتاری، ئەو بوو کە، ئیدی وەك عەزیزە خانمێ دۆستی پێشووی ئێوە نییە کە ئافەرینی سەربەستییەکەی بکرێت و پێی هەلبگوترێت...)).

ئاغای سلێمانی بە پێکەنینێکەوە دە مەقامی نارەزایەتییەدا گوتی: ((نا، خوا دەزانێ، خانمێکی جوان بوو؛ زۆریش قابیلی پێداهەلدانێ بوو، دەیهێنا ستایش بکرێت. باش بوو ئەودەمی ئەقلت پێنەدەشکا، ئەو هەتەر و مەتەرانەت نەخوێندبوو، دەنا لە دەستت دەردێناین... تۆ خۆشت هەر حەزت لێبوو!...)) پێکەنی، ئێمەش پێکەنین. دوایە گوتی: ((ئەوە بۆخۆت دەلێی کۆمەلگای چینایەتی خوو و رەوشتیشی هەرچینایەتییە. کەواتە مادامەکی وایە نابێ گلەیی و گازاندەت هەبن. عەزیزە خانم لە جوانییە بەولاوە چ گوناهێکی دیکەی هەبوو؟ بەلای ئێوەوە چونکە جوانە، گوناهبارە؟ مەگەر مارکس بۆخۆی نالێ کە



سەرمایەدار بە ئەندازەی کرێکار لە ژێر ستەم و جەوری مێژوودایە؟... والێ-لاێ!)) لێوەکانی بەشێوەی لێوی هەندێ خانمان، خانمانە وێك هێنایەوە بە ئاوازێکی پڕ لە نازەوە گوتی: ((وەلێ-لاێ)) و قاقا پێکەنی- و ئێمەش هەر پێکەنین. ((رێتان دابووین قسەکانم بکەم...)).

((بێگومان)).

((... ئەودەمی هەریەکێك لەولاڕا بیگوتبایە ئەوشتانە راست نین دەستبەجێ دەبووە بێ دین و بێ نیشتمان- نیشتمان فرۆش. باشە ئەو دینە چییە کە ئاغایان بە بوونێیەوە، وابوونەتە خاوەنی ئەم هەموو رەوشت و کەرامەتانە و وائێمەی لێ بێ بەرین، یا هەر نیمانە؟ ئەو نیشتمانە لە کوێیە کە هەر تەنیا مالێ ئاغایانە و ئێمە ئاوا سەربەخۆ و بێ پشك و بێبەش لێی، دەیفرۆشین، و کڕیارەکەی کێیە؟)).

((روسەکان)).

((بەلگە؟)).

((بەلگەکەی ئەوە هەمان ئازەربایجان و کوردستان و چیکۆسلۆواکیا، و پۆلەندا...

((بەقسەی رۆژنامەی ئیتیلاعات؟... ئێوە راست دەفەرموون، ئەوجۆرە تاوانبارکردنانە دە مێژوودا کەم نین و یەکەم جاریشیان نییە، پێش ئەمەش بە مەزدەك و بابەکییەکانیشیان هەر دەگوت نیشتمان فرۆش؛ تەنانەت بەیاننامەکانی ئەو زەمانیش بۆ خۆشەویست کردنێ خولەفای ئیسلام زۆلێیەتییەکیان نواند- جێگایەکیان لە قەحپەخانەی هەمەدانێدا بۆ داکێیان پەیداکرد... چونکە بۆ قوربانیانی مێژووی سەدەکانی پێشووی بەرد، لە سینگی خۆیان دابوو. چتان لێوەشێرم من ئەوا وردە وردە خەریکم دەگەمە ئەو سەرەنجامەی کە ئەو وێنە و باسانەی لە زوحاکیشیانەوە وەرگرتوونەوە هیچیان راست نەبن و چ بنەما و بنەچە و بناغەیەکیان نەبێ. زوحاکێك دەو هەموو هەل و مەرجانەدا بێن و دەو زەمانیدا ئەنجومەنی هەلبژێردراوان بەرپا کات! ئەوەش بەو مەرجەی کە شا و سێ بنەمالەی خانەدان ولاتی بەڕێوەبەرن و شای گەورە کە دادوەر و گەورە و سەر فەرماندەی هێزی چەکدارە؛ گاردی نەمر، و گاردی پاسەوانییە، و گاردی دوورهاوێژ، و کەماندار و نێزەداری هەیە! ئەو ئەنجومەنەی بۆچییە؟ ولاتێك کە بەهێز بەڕێوەبری شورا و ئەنجومەنی هەلبژێراوانی بۆچییە؟ چ پێویست بەو کارانەیە، دە کاتێکیشدا

که شۆڕش هەر چ شۆڕشێکە دەنێوناواندا نییە تا واپێشاندرێ کە ئەم ئەنجوومەنە سیاسەتێکە بۆ چاو بەستەکێ و هێورکردنەوە و دامرکاندنەوەی دەوروبەرەکەیە. بە گومانی من ئەو دوو مارانەی کە نایانە سەرشانی نمایندەی موبدان و ساتراپایەکان تا هەر کەسێ هەنگاوێك بەرەولای میللەتییەوە باوێ هێرشی بکەنە سەرێ و مێشکی بکۆڵن. سەردەمێکی ژمارەیەکیان بە گوناهی مەشرووتە خوازییەوە هەر لەو باغی شایەیدا بەتاوانی خەیانەتەوە کوشت و مۆری خەیانەتکاریشیان پێوەنان. ئەوا ئێستاش ئەوان خەڵکی دی دەکەنە نیشتمان فرۆش و بەبێ دینیان ناو دەبەن. هەر هەمان ئەو جەنابی قیواموسسەڵتەنەیە ستارخانی دە هەمان ئەو باغە خوێناویەیدا- جێی ئێستای سەرکونسۆڵی شۆرەوی- ئابڵوقەدا و برینداری کرد... ئاخر ئەویش هەر نیشتمان فرۆش بوو! ئەوە تەنیا هەر ئاغایانی وەزەغ پوور و سوسماری و سەرۆکەکانی دیکەن کە شەیدای نیشتمانن و لە تاوانی نەماون! ئەم نیشتمانە خوا هەر بۆوانی داناوە...

((گوێ بگرە- تۆ توڕەی)).

((نەخێر، تووڕە نیم)).

((خۆ نا، تووڕەی. گیروگرفتەکەی ئێمە لەوەدایە کە تێك ناگەین)).

((هەوڵدەدەین تێك بگەین)).

((زۆرچاکە... ئێستا پێکێکی هەڵنادەی؟)).

((نا، سوپاس)).

((زۆرچاکە)).

((بەڵێ، هەر ماڵێ ئەو حوسێناغایەی- هەمان ئەو ئاغایەی حازری- کە ئیدی ئێستا ئەویش بێگانەیەك نییە- ئەوان چیان کردبوو، چ تاوانێکیان کردبوو، کە ئەو هەموو بەلاَیانەیان بەسەرهێنان؟ گوناهەکەیان ئەوەبوو کە جەنابی ئەمیر لەشکر مرۆڤێکی لا رێ و بێناموس بوو، ئەوەبوو کە حوکمەت حوکمەتێکی سەربازی بوو، ئەوەبوو کە خەڵکی وڵاتی دەستێکیان دە چارەنووسی خۆیاندا نەبوو!؟ تێکۆشان و خەبات مافی ئەوە، ئەگەر نەیکا خەیانەت بەخۆی



و کەسوکار و خاوخێزانی خۆی دەکات. بەقسەی ئێوە من بۆ سۆفی رەسووی هاتوومە مەیدانێ، نا، ئەو دەبێ بۆخۆی و لەبەرخۆی بێتە مەیدانێ...)).

((ئممم!)).

((ئێستاش ئەوانە- و هەزارانی وەك ئەوانە- قەیناکا بە هەقی خۆیان نەگەیون و ئازار وستەمیان دیوە، شتێکیشی لەسەر قەرزدار بوونەتەوە: دەبایە دڵی دادەیان هێنابایەوە جێ تا دوعاگۆی شا و حوکمەت بوونایە چونکە بەقسەی مەلایەکانی خۆمان ((ئەل سوڵتان زیلل وڵلاهی!)).

(سوڵتان سێبەری خوایە —وەرگێڕ).

((ئممم!)).

((چەند جاران هەر بەڕاستی و بەزاراوەی خۆتان ئاماژەتان بە دیپلۆماسیەتی راستەقینە کردووە. هەروا سەرپێی ئەوەی عەرز دەکەم کە لە سروشتی ئادەمیزاددا نییە درۆ بکات. ئادەمیزاد وەك هەر جانەوەرێکی دی پەیڕەوی لە سروشتی خۆی دەکات و سروشتەکەشی کە لە ناوەکەیڕا دیارە شتێکی سروشتییە. ئێوە لە کوێتان دیوە گایەك سواری گایەکی بێت و لێی بێت؟ یا گورگێك برسی بووبێت و خۆی بەتێری پێشان دابێت؟ یا سەگێك- جگە لەو سەیانەی کە زۆریان برسییە و ناچارن- یەکێکی لێ خۆش نەیەت و هەروا لەخۆوە و بێ هۆ بێت و کلکە سووتەی بۆ بکات؟ هەلومەرج و بارودۆخە ئابووری و کۆمەلاَیەتییەکانە کە ئەوانە بێدەنگ و سەرکوت دەکات، و یەك لەو هەل و مەرجانەش کەسانێکن کە ساتوسەودا بە نەزانییە خەڵکییەوە دەکەن و بیروڕای گشتی لە قالب دەدەن و دوایش رۆژنامەکانی ئیتیلاعات و کەیهان هاتنە سەر سفرە و خوانی ئەو کەسانە و بوونە شەریك و برابەشیان: یانی هەر لە یەك رستەدا نەبوونی ئازادی بۆ زۆرینە و بەربلاَوی ئازادی بۆ چەند کەسانێکی بەقەدەر ژمارەی پەنجەکانی دەست. و ئێوەش دەفەرموون با فلاَنە کەس یا فلاَنە حیزب بێت و شمشێرێ هەڵکێشێ و لە خودا و پێغەمبەری خودای یاخی بێت تا هەستی دەست و پێوەند و دەوروبەرەکەی هەرە سەرێ ئارام و رازی بێت. بەلاَم هەر ئەو قسەیەی کە جەنابعالی دەیفەرمووی چاکیش دەزانی کە سزای هەر کەسێك و یا هەر کەسانێکی ئەوەیان لێ رووبدات و

لێیانەوە ئاشکرابێ بەگوێرەی ماددەکانی یاسا سزایەکەی چییە. تازە ئەوەش بەسینگییەوە بگرێ و دوولا بێتەوە، یا سۆفی رەسوویێکی بلێین وەك من. چۆن بە درۆوە دێت و ملکەچی و ئەمەکی خۆی بۆ ئەو یاسا زۆردار و ئەستەمانە دەردەبڕێ؟ ئەگەر وانەبایە راستییەکانمان راست و رەوان و لووس و لێك و بێ پێچ و پەنا و بێ توێکڵ دەردەبڕێ و لەسەریشی سوور دەبووین.

((دەربارەی نەوتێش ئاریشەکە بەو جۆرە نییە کە جەنابعالی دەفەرموون. ئەوانەی نەوتیان دەوێ لە دوولایەن بەولاوە زیاترنین. یەکیان زۆرتری دەدا و یەکیان کەمتر. ئەقڵی ساغیش فەرمان دەدا کە فرۆشیار کالاکەی بداتە ئەوەی کە زیاتری دەدات- و بە بیروبۆچوونی مە چ تەماحێکی ئیمپریالیانەشی تێدانییە، جا با کرێکارەکان- هەروەك چەرچییەکانی لای خۆمان- هەرچەندەکی دەبن با بن و چۆن لەناوەخۆیاندا رێك دەکەون با رێك کەون بێنە سەودایە و هەریەکە بەلای خۆیدا راکێشێ و بیەوێ کەمتری بدا، ئەودەمی شتێك هەیە، کە سەرەڕای هەموو ئەو شتانە، ئەویش ئەوەیە کە دەمەیدانی سیاسەتدا وا باو نییە کە هەمیشە هەر بەلایەکیدا چاوداگری و لایەکانی دی پشتگوێ بخەی. ئێوە خۆتان زۆر جارانتان فەرمووە کە لە دەوروبەرێکدا دەژین بەرچاو تەنگ، ئالۆز و نەخۆش، و جارەهای جار ناچاربوون، و بە بەرژەوەندتان زانیوە کە بۆ پارێزگارییە خۆتان بەرەی دۆست و دوژمنایەتییەتان بگۆڕن و سەنگەر بگوازنەوە. ئەی کەواتە دە دەوروبەرێکی بوغزاوی و هەلپەرست و بەرچاوتەنگی سیاسەتی جیهانیدا بۆ عەیبە ئەگەر ئێمەش سوودێك لە یەکیەتی شۆرەوی ببینین و بە کەلك وەرگرتن لە هێز و توانای وی مافی خۆمان بستێنینەوە؟...)).

((ئەو قسەیە هەر لە بنەڕەتدا بیروباوەڕی منە، بەلاّم ئێوە نۆکەرییە دەکەن)).

((وەلاّمی ئەمەشتان عەرزدەکەم)).

((زۆرچاکە فەرموون!)) بەگرژییەکەوە.

((و بەلاّم باشە... دروستکردنی حیزب عەیبی چییە، و خودی حیزب چ گوناهێکی هەیە؟)).

((هیچ کاتێ نابێ راستەوخۆ و بەتایبەتی بێت و حیزب تاوانبارکەیت. حیزب کۆمەڵە خەڵکێکی دڵ و دەروون پاکی وەك تۆ و حوسێناغان... رەنگە لە ئێوەش باشتر. بەلای منەوە زۆر لایەنی ئەرێیانەی تێدایە. وەك ئەوەی کە راتان دێنێ بخوێننەوە و ئارەقێ نەخۆنەوە و



بەدوای کاری نابەجێدا نەچن کە هەر ئەوانە بۆخۆیان شتگەلێکن، بەلاّم گلەیی و گازاندەی من لە رابەرەکانتانە)).

((دەگەینە ویش... لە دەوروبەرێکدا کە بەقسەی باوکی حوسێناغا تەنیا فەرمانڕەوایەکان و جۆری فەرمانەکانیان گۆڕاون- ئەویش هەر بەناو دەنا وەکی دیکە نا- دیسانەوەش شتگەلێك بووە کە لە دەرەوەی ولاّتەوە هاتووە. راستە ولاّتی ئێمە داگیرکرا و هاتن و خواردیان و بردیان. بەلاّم هەمووشی هەر بەزین و دۆڕان نەبوو. دەو بەیەکدا هاتن و وەرە و بڕۆ و بگرە و بەردەیەشدا میللەتیش شتێکی هەرپێبڕا. یەکەم هەر ئەو هاتنەی هاوپەیمانان هەموو ئەو راگەیاندن و بانگەشانەی سەردەمی رەزاشایان پووچەڵ کردنەوە کە دەیانگوت مەملەکەت بە چوار ناڵەکی بەرەو پێش خۆرادەنێ و لەهیچمان کەم نییە و بەرەنگاری هەر هێزێك دەبینەوە چاومان تێبڕێ. ئێمە سەربەخۆین و واو وا.

شتگەلێکیش دە مەملەکەتیدا سەری هەڵدا. خەڵکی تێگەیشتن کە دنیا پێشکەوتووە. خەڵکی شوێنانیدی چاك دەژین، هێزەکانی دنیایە سەنگ و سووکیان تێکەوتووە، هێزی دیکە هاتۆتە ناو مەیدانێ سیاسەتی جیهانییەوە... و بە کورتییەکەی، خەڵکی بەدڵ و دەروونێکی پاکەوە وا وردە وردە لە چارەسەرییە کێشەکان دەگەڕێن. ئەو خەڵکە دڵ و دەروون پاکانەی فەرمووتان خەڵکانێکی کەم نین، و رۆژ بە رۆژیش هەر زیاتر دەبن. ئەوان هەموو ئامانجی هاوبەشیان یەکە، کە ئەویش خۆشیی ئادەمیزاد و سڕینەوەی ناخۆشی و دەردە سەری و چەرمەسەرێیەکانە. دە هیچ شوێنێکی دنیایەدا نەدیتراوە و مێژووش پێشانی نەداوە کە هەرچی مرۆڤی دنیاییە کتوپڕ پێکەوە دەستیان لەکار کێشابێتەوە و یاسا شکێنیان نەکردبێ. تاك و تەرا مرۆڤیش هەن کە پەیڕەوی فەرمانی ویژدان دەکەن... بەلاّم خۆ ئەگەر هەریەکە لەلای خۆیەوە وە دووی پەیڕەوییە ویژدانی خۆی بکەوێ ئەودەم دەبێتە ئانارشیزم، چونکە نە هەموو وەك یەك بیردەکەنەوە و نەفەرمانی هەموو ویژدانەکانیش وەك یەکن. جا بۆیە دامەزراوەیەکی دەوێ کە ئەو هێز و توانایانە هەموو کۆکاتەوە، و پێویستییەکانیان بۆ دابین بکات، و بەرێگایەکی تایبەتی، و نەخشەیەکی تایبەتەوە وەڕێکەوێ. چونکە ئێستا ئیدی سەردەمی شای نییە کە هەر کەسە و بۆخۆی بێت و بەتەنێ و بەهێز و بازووی خۆی رووبەڕووی بەرامبەرەکەی بوەستێتەوە: ئێستا جەنگ، زانستیانەیە؛ بەرامبەر خاوەن زانست و تەکنەلۆژیایە خەباتیش

هەردەبێ زانستیانە بێ، چونکە خەباتی زانستیانە تیۆری زانستیانەی گەرەکە، تارێنمون و رابەریشی بێت. بەهەرحاڵ، دامەزراوەیەك پێویستە تا ئەو هێز و دژە هێزانە کۆکاتەوە و بیانخاتە سەر رێچکەیەکی راست و رەوان. ئەڵبەتە ناتوانرێ لە دامەزراوەیەکی ئاوا چاوەڕوانی ئەوەبکرێ کە لەترسی تێوەگلان و قسە و قسەڵۆکان بێت بناغەی کاری خۆی لەسەر بنچینەی دەروێشی و عاریفانە هەڵنێ و دابمەزرێنێ؛ ئێستا کام زاهید و بەندەی خودایەك ماوە دەفتەرچەی زەبروزەنگ و تیرۆرییەی لەبن هەنگڵێ نەبێ؟ -ئەوە مێژووی مەسیحیەت وا دەڵێ. ئەوە شتێکی سروشتییە. من لاریم لەوە نییە، زۆرچاك دەزانم کە رق و کینە و ناپەسەندی هەر رق و کینە و ناپەسەندی لێدەکەوێتەوە ئەوەش هەردەزانم کە نەفرەت زەبروزەنگی لێ پەیدا دەبێت، دیسانەوە بەپێچەوانەی ئەوانەی کە گوێ نادەنە ئەم وردەکارییانە. ئەوەش هەر دەزانم کە هەر دامەزراوەیەك کەبێت، ئەم هەموو رق و کینە و ناپەسەندییانە کۆکاتەوە، بیەوێ و نەیەوێ، بەتێپەڕینی کات بۆ خۆشی دەکەوێتە ناو بازنەی کاریگەرییە ئەو ناپەسەندییانەوە و هەرچەندەش هەوڵدا خۆی لەو شتانە دوورەپەرێز بگرێت بەڵام هەر تێوەگلێ راستییەکەی ئەوەیە کە ئەو سازمانە هەرگیز رێ بەوە نەدا بەشێوەیەکی وا تێوەگلێ خۆی لەبیربچێتەوە و تووشی خۆ بەزل زانینێ بێتەوە. دەبێ ئامرازێکی وا دەکاربێنێ کە بزانرێ رق و کینە و ناپەسەندی، شەرمەزاری و ریسوایی بەدواوەیە- هەستکردنی ناپەسەندی و شەرمەزاری لە زەبروزەنگ، بەڵام دەگەڵ تەواوی ئەو قسانەشدا نابێ چاوەڕێی ئەوە لەم دۆستە بکرێت کە کارەساتی برا کوژراوی و گریان و لەخۆدان و فرمێسکی دایی و ئەو هەموو لارو نەنگی و چاو لەبەریانەی لەبیربچێتەوە. لەسەرزەمینی دێواندا ناتوانی رۆڵی پەرییانە بگێڕی- ئەو هەرچییەك بێت مرۆڤە. ئەو ناپەسەندییەیان بەسەروی هێناوە. باشە، بێگومان هەرکەسێکی وەك ئەم دۆستەی مەیە کە ئەگەر رۆژێك لە رۆژان حیزبەکەی حوکمەتی گرتە دەست دێت و لایەکی کاروباری ئەو حوکمەتەی هەڵدەسووڕێنێ. ئەودەمیش هەرنابێ چاوەڕێی ئەوەی لێبکرێ نەکەوێتە ژێرکاریگەرییە هەموو ئەو کینە و رق و ژارەی دە دەروونیدا کەڵەکە بووە و نەیەت و کارشکێنییە نەکات. هەر دەیکات- دە شۆرەویشدا هەروەتر. حاڵ و باڵ و گوزەرانی رەعیەتی ئەوێ زۆر لە گوزەرانی سۆفی رەسووەکانی لای خۆمان خراپتر بووە. رەعیەتی وێ هەرتەنیا رەعیەت نەبووە، کۆیلەش بووە، یانی خۆی و ماڵ و منداڵەکەشی دەگەڵ زەوییەکاندا دەکڕان و دەفرۆشان؛ هەر راست وەك ئەو ئوتومبێلانەی ژمارەیان بە پاش و پێشانەوەیە، ژن و کچی،



هەمووی هەرماڵێ ئەربابەکەی بووە، و هەر لەویش ئاوس دەبوون و نانیشیان لە کۆیلایەتییە بابیانەوە دابین دەکرد. لە فەرەنساش هەروەتر، ئەم داستانانە بەدرێژی دەکتێباندا نووسراون نووسیویانە کە چۆنیان پیاو دەبن نیر و ئامووریێ ناوە بۆ جووتی، یا هەر هەمان ئەو رەعیەتانەیان هێناوە و دایانناوە تا بەرەبەیانی بەردان بەزەلکاو و گۆلاواندادا تا بۆق و قوڕاویلکە بێدەنگ بن و جەنابی ((کۆنت)) یا ((سنیۆر)) خەوەکەی نەزڕێ، و تێربنوێ، یا ئەگەر منداڵی رەعیەتێکی وەبن پێچکەی گالیسکەکەی کەوت بەو پارە کەمەی کە جەنابی کۆنت لە پەنجەرەی گالیسکەکەیڕا بۆی داوێ دڵخۆش بێت و دەستەونزا راوەستێت و نزای خێری بۆ بکات.

دیسانەوە توندوتیژی ئەو نارەسەنایەتیەشی تێدایە کە خەڵکی هەروا بۆ سەیر و خۆشی و رابواردنێ بچنە دیار گێۆتینێ و سەرەپەڕیوەکان بژمێرن و بەدەوریاندا هەڵپەرن. ئەمانە گوناهیان نییە- گوناهبار ئەو هەل و مەرج و بارودۆخەیە کە عەرزم کردن... ئێمە بۆ خۆمان رێ خۆشکەری ئەوکارانەین. دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا سروشتی ئادەمیزاد و مێژووی هەموو ئەو رەنج و ماندوو بوونانەی هەر بەردەوامە و لەجێی خۆی نالەقێ و دەمێنێتەوە. زۆر بەسەرهات و رووداوی لەوانەش سادەتر هەن، کە مەرگ هێنن: ناخۆشی وا دێتە پێشێ؛ کە هەست ئەو ناخۆشیانەی لێدەبێتە سووکایەتی، توندوتیژیش لە سووکایەتییەڕا سەرهەڵدەدا. زۆرجاران دە رۆژنامادا دەخوێنینەوە: ((شوفێری تاکسی، یا عەرەبانچییەك لەسەر دوو قڕانی کرێیەکەی دکتۆر فلانی کوشت)). هەواڵێکی تابلێی زۆر سادەیە، وەکو هەموو هەواڵەکان و بۆ زانینەکان؛ هەرچەندە ئەمجارەیان رێکەوتی بەسەرهات و رووداوەکەش زۆر سادەیە: هەروا بەڕواڵەت لەسەر دوو قڕانان کە نەیویستووە بیدا کوژراوە. بەڵام ئایا هەر بەڕاستی وابووە؟ -نا. دکتۆر، یا ئەندازیار یا هەرکەسێك کە دادەبەزێ لە شوفێرەکە دەپرسێ: ((چەندی کرد، ئاغا؟)) ئاغاش شتێکی دەڵێ، دکتۆر یا ئەندازیاریش لەوانەیە بپرسن ((بۆ؟)) ئەویش هەقیەتی، بیردەکاتەوە شوفێرەکە خەریکە هەلی لێ بێنێ ئەویش هەقیەتی بەرگری لە مافی خۆی بکات- هەق لەدووی هەقێیە، نەك لەبەر یەك قڕانی کەموزیاد. شوفێرەکە هەروا بەشێوازی شوفێرانەوە دەڵێ: ((هەروا بە هەوەس!)) دکتۆر ئەوە بەبێ ئەدەبی دەزانێ و بەڕووی دادەداتەوە. شوفێرە دە وەڵامدا پێیدەڵێتەوە کە، باب و باپیر و ئابادی وی بێ ئەدەبە، بە کورتی وای لێدێ لە باپیر و باپیرە گەورەی تێدەپەڕێ و دەگاتە گیرفان و دەست و چەقۆی شوفێری و سەرەنجام دەزگی

دکتۆری یا ئەندازیاریدا دەگیرسێتەوە! دکتۆر و شوفێر هەردووکیان قوربانییە دەوروبەر و ژینگەکەن...

((بەهەرحاڵ، حیزب هەرگیز نەیگوتووە کە هەڵەی نەکردووە و نایکات. چمکی رەخنە و رەخنە لەخۆگرتن ئەوەیە کە هەمیشە ترسی هەڵە هەیە. هەڵەمان بووە، بەڵام خەیانەت و نیشتمان فرۆشی نا. منێك تا ئەوکاتەی هەڵەیەك بەهەڵە دەزانم، دەو چوارچێوەیدا هەوڵدەدەم جارێکی دی دووبارە نەبێتەوە، و ئەو مافەش بەخۆم دەدەم وابکەم. وەك دەڵێن مرۆڤ هەموو کاتێك لە هەڵە و هەڵەکردنەوە نزیکە، رابەرانی حیزبیش مرۆڤن، جا هەربۆیە ئەوانیش هەڵە دەکەن؛ لەوەش بترازێ پەروەردەی هەمان ئەم دەوروبەرەن. ئەوەش دەزانم کە بەچاودێرییەکی بەرفراوانی خوارەوەی حیزب و هەڵبژاردنێکی راستەقینە ئەو ئاریشە و تەنگوچەڵەمەش تا ئەندازەیەك چارەسەر دەکرێ. ئەوەشتان عەرزکەم کە رابەرانی هەر حیزبێك لە نێوان شایستەترین ئەندامانی ئەو حیزبەوە هەڵدەبژێردرێن. نەك لە دەرەوەی وییەوە و هەرگیز نابێ وا چاوەڕوان بکرێ یا پێمان وابێ حیزب بێت و لە یەکێکی وەك جەنابی قیواموسسەڵتەنە یا حەکیمول مولك داوا بکات تا بفەرمووێ بێت و ببێتە رابەر. لە دەرەوەشڕا هیچ کەسێك نەهاتووە...)).

ئاغای سلێمانی گوتی: ((ئی دەرەوە نازانم... بەڵام ئەوەی دەزانم کە ئاغای قیواموسسەڵتەنەش هێندە سادە و ساکار نییە بێت و کە لەڕووی لوتف، یا بێ لوتفییەوە رابەرییە حیزبی ئێوە قبووڵ کات. دیارە ئەو کارانەی کە ئاغایان کردوویانە هەڵەنین، ئەنقەستن، خەیانەتن... هەم شۆرەوی بە ئانقەست وادەکات و هەم رابەرانی گوێ لە مشتی فەرمانەکانی ئێوە. باشە ئەوە دەستی ئەنقەست نییە کە ئێوە جێیەکتان بە ئاوەدانی نەهێشتۆتەوە؟ زۆرچاکە دامانناشا خراپ بوو. دەربارەکەشی هەرخراپ بوو، قیواموسسەڵتەنە خراپ بوو، حەکیمول مولکیش هەروەتر... ئەدی بەرەی میللی و تێکڕای گرووپە سەربەخۆ و میللیەکانی دی بۆ دەکوتن؟ بۆیەیان دەکوتن تا لە خۆتان و دەرباز زیاتر کەسی دی نەمێنێ، تا لاوە خوێن گەرمەکان لەنێوان میز و گوویدا لایەکی هەڵبژێرن؟...

دەربار خراپە، هەربۆیە... نا، گیانە، هەڵەکانتان، یا بە بیروڕای من رابەرەکانتان، ئالێرەدایە. دڵنیابن، ئێوەش هەر نامێنن- هیچ کەسێك نامێنێ- دیارە بەو جیاوازییەوە کە هەموو ئەوانەی دی بەدەستی ئێوە لەناو دەبەن. هیچ گرووپ و لایەنێك نامێنێ، تەنیا دوو لایەنی



دوژمن بەیەك نەبێ کە بۆ دابەشکردنی دەستکەوتەکانی دوایە دەمێننەوە تا لەنێو خۆیانیاندا بەش کەن. ئەمانە- رابەرەکانتان دەڵێم- یا نۆکەرن یا گێلەپیاو... کە من هەر پێموایە نۆکەرن...)).

((بەندە و ئەوانیدی وابیر ناکەینەوە. من ئێستا دەو دەمەیدا چ بەڵگە و قەباڵەیەکم لانییە تا لەسەر رۆشنایییەیانڕا ئەو جۆرە داوەرییانە بکەم. من هەر لەسەربناغە و بنچینەی ئەو پێوەر و بەڵگانەی کە دەوانەکانمدا خوێندوومە و فێریان کردووم هەمووان دروستکار و بێ گوناە دەزانم، مەگەر پێچەوانەکەی دەرکەوێت و بسەلمێندرێ.

((باشە چ دەکەی؟)).

((نارەزاییە دەردەبڕم)).

((جا باشە نارەزاییە تۆ چی لێ پەیدا دەبێ؟)).

((بەگوێرەی دەستوور دەبێ لێی پەیدا ببێ)).

((ئەگەر لێی پەیدا نەبوو؟)).

((دیسانەوە نارەزایی)).

ئێمە و ئاغا هیچمان دەگۆنگەڵێدا نەبووین. تێگیراوییەکان هەریەك و دوو نەبوون- ئێستا تێیدەگەین. دەردەکە دەوەیدا بوو کە تۆ سەر بەکەسێکی بووی، بەڵام شانسەکە دەوەیدا بوو کە دەردەکەت دەگەڵ ئەو سێ و چوار کەسەیدا هاوبەش بایە کەسەر بەلایەنێکی بوون و دەگەڵ بیروبۆچوونەکانت بانایە، ئەودەمی دەتتوانی داواکارییەکانت بەرز کەیتەوە بۆ سەروتر. بەڵام ئەگەر بەتەنێ و دەگەڵ تەنیا کەسێکی بای ئەوە دەبایە هەر لەجێی خۆت بچەقی و دەمت لێك نەکردبایەوە، یان دەبوو واز لە حیزب بێنی و بۆخۆت دانیشی، چونکە رێی ئەوەت نەبوو لە دەرەوەی شانە و رێکخراوەکانەوە —یانی حیزب- داواکارییەکانت بەرزکەیتەوە، خۆ ئەگەر شانسیشت هەبایە ئەوە داواکارییەکانت دەچووە سەروتر، و دیسانەوە ئەگەر شانسێکی دی هەبایە ئەوە بەرەو سەروتریش- هتد... هەر دەڕۆیی. کە ئەمەش شتێکی وانەبوو. چونکە هیچ کاتێك رووی نەدابوو کە لە هەموو رێکخراوە و تەشکیلاتەکاندا بیروبۆچوون و دیدی

ئەندامەکانی وەك یەك بن تا کێشە و ئاریشەکان پێکەوە تاوتوێ بکەن. مەگەر ئەوەی کە لەسەروترەوە فەرمانیان دابایە. دیارە گوایە دەکرا بچییە کۆمیسیۆنی پشکنینی حیزب و لەوێت سکالاێ خۆت کردبایە، بەلاٚم ئەودەمی سووربوون و پیٚ چەقاندن لەسەر ئەوکارانە هێندە باو نەبوون، چونکە هەموو شتەکانی خواریٚ خڕی لەسەربناغەی دلٚپاکی و متمانەی کوێرانە راوەستا بوو. ئەلٚبەتە ئاغای سلێمانی باوەڕی وابوو و دەشیگوت کە حیزبەکەی ئێوە وەك مامۆستای نەخوێندەوار وایە کە حەز بە قوتابی وریا و زیرەك و زیتەلٚە ناکات، لەبەرئەوەی بۆخۆی تێنەکەویٚ و دانەمێنیٚ حەزی لێبوو قوتابییەکان هەموو تەمبەلٚ و تەوەزەل و نەزان بن تا پۆلەکەی بۆ راوەستیٚ. ئەو دلٚپاکییە، ئەو دلٚپاکیەیە ئێوەی پیٚ کەرکەن و بەهێڕەی بەرن- لەو جۆرە قسانەی زۆر دەکردن).

ئاغای سلێمانی گوتی: ((ئەوە دیارە ناگاتە چ جێیان... تۆ گوتت کە مێژووی کیشوەری ئێمە مێژووی بەلاٚ و کارەساتی یەك بەدوای یەکدایە... جا باشە ئێوە بۆ خۆشتان هەر دە سەردەمی ئەو مێژووەیدا نین؟ ئەگەر وابیٚ ئەوە ئێوەش هەر گیرۆدە و گرفتارن:

هێشتا کێشەی ئازەربایجان و کوردستان روون نەکرابۆوە، لکێکی دیکەی لیٚ پەیدا دەبوو، چارەسەری ئەو لکەی نەکرابوو نەوت هاتەگۆڕیٚ، نەوت تەواو نەبوو شتێکی دیکە و شتێکی دیکە- هەر بۆ دیزە بە دەرخۆنەکردنیٚ کێشەیەکی بەشتێکی دیکە هەمیشە بیانوو هەبوون)).

((بەهەرحالٚ، ئێمە ناڕەزاییە خۆمان دەردەبڕین. هەر بۆ نموونە بۆ کردنەوەی لقی حیزب لێرە من پێموابوو دەبوو کۆمیسیۆنی مەئمووری ئامادەکردنی پێشەکییەکارەکان هەبووایە: کۆمیسیۆنێکی پێکهاتوو لە کەسانی ناوچە و شارەزا لە ناوچەکە. راستە لەوانەیە لە ناوچەکەدا حیزبییەکی لە منی زیاتر لێنەبووە، بەلاٚم کەسانێك هەبوون کە تا ئەندازەیەك لە بارودۆخی ناوچەکە شارەزابن: لە هاووڵاٚتیان... هەرچەندە دوور نییە کە راوێژ بەوانیش کرابیٚ. بەهەرحالٚ من رازی نەبووم، چونکە هەر بەقسەی ئێوە ئەوە من لە ناوچەکە شارەزانیم، جا چ جای ئاغای کاویانی، کە ئەمە یەکەمین و دوایین جاریەتی ئێرە ببینیٚ. راستییەکەی ئەوەبوو کە ژمارەیەکیان دەناردن دە ناوچەکەدا دەگەڕان و دەکەوتنە موتالاٚکردنیٚ ناوچەکەی: کەسانێکی وەك جەنابعالییان دەدیت؛ ناوچەکەیان بەسەردەکردەوە؛ لایەنە ئەریٚ و نەرێیەکانی کێشەکانیان تاوتویٚ دەکردن و ئەنجامەکانیان لە هەموو بارەیەکەوە پێك دەگرت- و ئا لەم بابەتانە.



لەلایەکی دیکەوە، لە خۆم دەپرسم، ئایا ئەو کارە سەردەگریٚ؟ باشەخۆ ئێرە هەمیشە ناوچەیەکی سەربازییە. هەر کە گەیشتییە داوێنیٚ شاخی ئوتومبێلیٚ رادەگرن و دەپرسن ((بۆ هاتووی، ئیشت چییە هاتووی، دەچییە مالٚە کیٚ، چەند رۆژان دەمێنییەوە؟)) هەر کە چەند رۆژێکان زیاتریش مایتەوە ئیدی ئەوە کێچ دەکەوێتە دە کەولٚی فەرماندەی پادگان و ئەوانی دییەوە کە داخوا بۆچی هاتووە؟ بۆ نارِواتەوە؟ - ((بابە گیان بۆ گەڕانیٚ هاتووم)). — بۆ گەڕانیٚ؟)) ((چونکە ولاٚت و مەملەکەتی خۆمە...)) و ئەودەمی سەدان جار تێدەگەیت کە ئەوە ولاٚت و مەملەکەتی تۆ نییە و هەربۆیەش هاتووی ئەوەی کە ئی تۆ نییە و بە بێگانەی بفرۆشی و بچییەوە ئەو جێیەی عارەب جوزەلەی لیٚ لێدەدەن... بابە خۆ دەردەکان هەریەك و دووان نین!...

((دەربارەی بەرگریکردن لە شۆرەویش- بەندەش دەگەلٚ تۆدام)). (ئاغا لێوە خەندێکی هاتیٚ- ئەوەندەش هەر باشە!) ((شۆرەوی هەوالٚگری هەیە، سەفارەتخانەی هەیە؛ با هەوالٚگری و سەفارەتخانەکانی خۆی بەرگری لێبکەن. خۆ حیزبی ئێمە نوسینگەی پەیوەندییە گشتییەکانی وی نین هەر کە هەوالٚێك لەسەر شۆرەوی چاپ بکریٚ ئەو بکەوێتە پەلە قاژەی وەلاٚمدانەوەوە. با بۆ خۆی وەلاٚم داتەوە کە هەروەك ئێوە دەلٚێن بۆ گەنمی لە ئەمەریکای دەکڕیٚ، یا بۆ خەلٚکەکەی ئازاد و سەربەست نین، یا بۆ هەموو خەلٚکی ویٚ دەژێر چاودێریدان! لەلایەکی دیشەوە، ئەگەر چاك بیربکەینەوە دەبینین کە تەنانەت ئەو کارەش (بەرگری کردن لە شۆرەوی — وەرگێڕ) کارێکی نابەجیٚ و لە عادەت بەدەرنییە. ئەدی ئەوە نییە هەر ئیتیلاعات و کەیهان و هەموو رۆژنامە ورد و درشتەکان بوونەتە پەیوەندی گشتی ئەمەریکا و ئینگلیزان؟ خۆ ئەوان چ پێویستیان بەوانە نییە، ئەوانەیان هەر تەنیا بۆ بەهێڕەبردن و گێل کردنی خەلٚکی دەویٚ. کاتێك کە هەرچی دەستە و دایەرە و کاربەدەستی رژێم هەمووی ئی خۆی بیٚ چ پێویستییەکی بە بەرگری کردنێیە. بە قسەی خەلٚکی رەشووڕووت، کە ئەوانیش وەك مندالٚی خەلٚکی ریٚ بکەن ئیدی پالٚ نانیان بۆچییە!...)) دەودەمیدا ئەحمەدی خزمەتکاری سەرهەنگی هات و رایگەیاند کە جەناب سەرهەنگ هاتووە و دەلٚیٚ جەناب سەرهەنگ چاوەرێیە. ئاغای سلێمانی قوتووە جگەرەکەی دەبەرکیٚ نا و گوتی: ((باش بوو! نا، پێموابوو خوێندەوار نیت- باش بوو، لەوە زیاتر، کە تۆزێك بە توڕەییەوە بوو... هی هی، ئەوە منیش دەلٚێم چی: وردە ئێسکی مەجنونی هاوێژە بەر تەیری هوما- چونکە ئەوە ئێسکی بەردەمی سەگی لەیلایە...! باشە، من دەڕۆم؛

تۆش دادا مەهێڵە حوسێناغا بۆ ئێواریٚ بچێتەوە تا بەتەنیٚ نەبی. حوسێناغا، تۆش هەروا بەدەم دانیشتنیٚوە داستانی مەلا ڕێوی بۆ بگێڕەوە- لەوانەیە لە بیری چووبێتەوە. خۆ تۆ لەبیرت ماوە؟)).

پێکەنیم؛ گوتم: ((بەڵێ)).

((ئەگەر دەزانی لەبیرت چۆتەوە، با بۆ خۆم بیگێڕمەوە!)).

پێکەنین، ئاغا پۆزشی خواست، و ڕۆیی، هەر کە وەدەرکەوت، ڕاستبوومەوە و چووم ئەولاولای کوڕەکەیم ماچکرد. گوتم ((خۆ، دڵم بوو بە ئاو! — ئەو هەمموو ماوەیە هیچت هەر نەگوت... خۆ خەریك بوو دیق کەم- بەڕاستی چاکت کرد! دڵم ئاوی خواردەوە!)).

((سوپاس! هەرچەندە نەشمدەویست- بەتایبەتی ئەمڕۆ هەر نەمدەویست، بەلاٚم لە پێستی خۆتت دێننە دەریٚ؛ هەر ڕێیان هەبوو ئیدی ئەوە دەستدەکەن بە هەقایەتان و هەڵبەز و دابەزیٚ و لە هەمموو ئاشێکی لێدەکەن!)).

((نا، ئاغاش بیٚ ئاگانییە- زۆری پێیە؛ ئەوانەی لە کوێرا دێنان؟)).

((بەلانی کەمەوە سوودی ئەم قسە و باسانە هێندە هەیە وای لێبکات کەمێك بخوێنێتەوە- ئاخر وەك بۆخۆی دەڵیٚ دەیەویٚ مەچەکم بگریٚ، ناچارە کتێبەکانی من بخوێنێتەوە- بەفشەی خۆی- لەوێوە نوقورچان باویٚ. ئەمسالٚ حالٚ و حەواسم خۆش نییە؛ جاران لەوەم زیاتر سەردەکردە سەریٚ. ئاە... دیارە بیٚ سودیش نەبووە — ئێستا زۆرجاران دەیبینم هەرخۆی دەخواتەوە؛ کەچی جاران ئەمانەی هەمموو بەپێکەنین و گاڵتەجاڕیەوە وەلاٚم دەدایەوە، ئێستا چاکتربووە. ئەڵبەتە با ئەوەندەش بڵێم کە هیچ کاتیٚ ڕق و کینە و مەبەستێکی خراپی نییە. بە خەیاڵی خۆی دەیەویٚ من لە کەری شەیتانی بێنێتە خواریٚ- تەنانەت ئێوەش- هەست بە خەتەرێکی دەکات... باوکە ئیدی... چووزانم، لەوانەشە حالٚ و بالٚ و گوزەران و جیٚ و ڕێی خۆشی دەتەلەزگە (خەتەر)دا ببینیٚ. زیاتر لەبەر من. چونکە پێیوایە ((حیزب)) دەبیٚ هێز و توانای لاوەکان بەفیڕۆ بدات و بەلای وییەوە حیزب ئەو هەمموو هێز و ڕوباری خرۆشان و هەڵچوونە هەمووی بە بیابان و بەست و ڕەقەنان وەردەکا!)) ((بەلاٚم زۆرت چاولێدەپۆشیٚ. من



زۆر کەمم بابی وادیون ئاوا دەگەڵ کوڕەکەی دانیشیٚ و وای دەگەڵدا بدویٚ... خۆزگەم بەخۆت کا!)).

((ئیدی، ئەوە هەر ڕەوشتی خۆیەتی- پیاوێکی زۆر نەرم و شلە. من تا ئێستا نەمدیوە جارێکی لە کەسێکی دابیٚ، یا لە یەکێکی توڕە بووبیٚ- جا هەر لە منداڵی خۆیەوە بگرە تا منداڵە کرمانجێکی، تەنانەت دەگەڵ گیانلەبەرێکیش لە سەفەریٚ دەگەڵیدا پیاوی شێت دەکا: جەڵەویٚ وا داوێتە سەر پشتە ملی ئەسپی. کە هەر مەپرسە. دووەم من کوڕە گەورەیم- و تاقە کوڕیشیم، هەرگیز وا تەماشای پیاوی ناکا کە ئەوە چووکەیە یان نا و دەزانیٚ، کە کوڕە گەورە دەنێو گەورانیشدا جیٚ و ڕیٚ و شوێنی دیارە، هەرچەندە داکیٚ من بەلای ئەوانەوە کچە کرمانجە و بەقسەی قەوم و خوێشان من بەرو پشت ئەتلەس نیم وەکەوان، دیوێکم پەلاٚسە!)).

بەتاڵە خەندەیەکەوە. ((ئەڵبەتە شتی دیکەش هەیە. دەگەڵ ئەوانەشدا چونکە کوڕە گەورەیم تا ئەندازەیەك- یانی تا ئەندازەیەکی زۆر- ئاگام لە نهێنییەکانیەتی: جا یا نهێنییە بەڕێوەبردنی کارەکانی یا ((کاروباری نێومالٚیٚ))ی یاکاری دەرێی. دەزانی کە بەداخەوە بابە پیاوێکی بەرەڵلاٚیە و دەومەیدانەیدا زۆر بیٚ تێبینی و زۆر بێباکە. جاران بۆ پارێزگارییە خۆی جاروبارەی دەگەڵە خۆیدا دەبردم بۆ جێی ڕابواردن و خواردنەوەکانی خۆی. کەمێکی ناڕاحەتییەکانی لەمن ئەوەیە کە وەتی کەوتوومەتە دەو خەتە شەیتانەییەوە کۆمەك و هاوکارییەی ناکەم و دەزانیٚ کە لەلای من ناتوانیٚ بەرمالٚیٚ ڕاخا. پێموایە هەست بە گوناهێکی دەکا- تۆ ناوی ئەو گوناهەی بنیٚ ترس، هەرچەندە ئەوە گاڵتەشە؛ دیارە نەك ترسان لە من، بەڵکە ترس لەخۆی... با وازبێنین!)) ((ئێستاش، لەسەر ڕاسپاردەی ئاغای دەبیٚ من چیرۆکی مەلا ڕێوییەت هەر بۆ وەگێڕم)).

پێکەنیین.

((بەڵیٚ. لێگەڕیٚ با یەکیەتی شۆرەوی ئێمەش هەر بخوا!)).

دەڵێن شەوێکی ڕێویەك چووە دزینیٚ مریشك و کەڵەبابان. چووە سەربانی خمخانەیەکی و دەکولانکەی خمخانێڕا بەربۆوە نێو کووپە خمی و سەرتاپای شین هەڵگەڕا. بەهەر گیانکێشانێکی

بوو له کووپەی خمی هاتەدەرێ. رووانی سەیرە، خۆ هەموو لەشی شین بووە! بەلای کەڵەبابێکیدا تێپەڕی. کەڵەباب گوتی: ((سلاڤ مام رێوی، ئۆغر بەخێر، تەشریف بۆ کوێ دەبەن؟)).

رێوی گوتی: ((مەڵێ مام رێوی، بڵێ مەلا رێوی- ئەوە نییە تۆبەکارم و تۆبەم کردووە. هەی ئاخر خێر، دەچمە حەجێ، سەردانێ ماڵە خودای. تۆش وەرە، با پێکەوە بچین. نێوان مەرگ و ژیانێ مووەکە. دەگەڵ ئەو هەموو بانگانەشدا، سەردانێکیشت کردبایە- خێرەکەی دوو هێندەی دی دەبوو)).

کەڵەباب گوتی: ((زۆرم حەزلێبوو دەخزمەتتانڕا هاتبام، بەلاّم ئەفسوس من تا ئێستا حەجم نەکەوتۆتە سەرێ، هێشتا وام لێنەهاتووە، لەبەر نەبوونێ بچمە حەجێ. وەك دەڵێن هێشتا خودا لەچارەی نەنوسیوم بۆ ماڵەخۆی)) رێوی گوتی: ((نا، تۆ سەهوی، پیاوی موسوڵمان هەمیشە داواکراوی خوایە. دەشزانم کە لە چارەی نووسیوی- هەستە وەرە و خەرجی رێیەت لەسەر من)).

کە کەڵەباب گوێی لەو قسەی بوو گوتی: ((لەببەیك، لەببەیك!)) و ملیان لێنا. رێوی کە دەدڵی خۆیدا هەروا ددانی لە کەڵەبابێ دەسوونەوە بەڕواڵەتیش لەسەرەوە خەریکی نزا و پاڕانەوە و تەزبیحاتێ بوو، تا کەڵەبابە واتێبگا کە هەر بەڕاستی تۆبەی کردووە و بۆتە مەلا. بەلاّم دەگەڵ ئەمانەشدا کەڵەباب هەردوو دڵ بوو: بە پێدزەوە هەنگاوێکی لە پێش و دووی لەدواوە بوون... بەهەرحاڵ، هەر رۆیشتن و رۆیشتن تا گەینە بیشەلاّنێکی. کە سەرنجیاندا دیتیان ئەوە پەپوسلێمانکەیەك بە تۆقەڵەی دارێوەیە. پەپوسلێمانکە ماندوو نەبوونی لێکردن و پرسی: ((مام رێوی، ئۆغر بەخێر!)) کەڵەباب هەڵیدایە: ((مەڵێ مام رێوی، بڵێ مەلا رێوی- و ئینشاڵڵاّ بەو زووانەش دەبێتە حاجی مەلارێوی. تازە ئیدی تۆبەی کردووە و وائێستا بەخێرو سەلامەت ئەوە تەشریف دەبەنە سەردانێ ماڵە خودای و ئێمەش دە خزمەتی خۆیاندا دەبەن. ئەتۆش هەر وەرە بابچین... پارەی رێیەشمان بۆ دەدا؛ هەم سەردان و هەم گەشت و گوزار؛ بەدەم رێگاشەوە سوودێکمان لە حوزوریدا پێدەبڕێ هەرچاکە. لە خزمەتی گەورەیەکی وادا خۆش رادەبرێ و وەڕەز نابین- تۆش هەر وەرە!)).

پەپوسلێمانکە گوتی: ((راوەستن با هەتا ماڵێ بچمەوە و مالاّوایيە بکەم، هەر ئێستا دێمەوە)). راوەستان تاچوو و هاتەوە. رێوی دەدڵی خۆیدا گوتی: ((ئممم، تائێرە ئەوە بوونە دوو- تائێرە دوو نێچیری چاکم بەداوێوە کردوون!)) پەپوسلێمانکە هاتەوە، و کەوتنەوە رێ، و



رۆیشتن. چوون تا گەیشتنە روبارێکی. مراوییەك هەرخۆی دە ئاوێدا نقوم دەکرد و دەهاتەوە دەرێ. کاتێ هاتەوە دەرێ و ئەوانی دیت چاك و چۆنی و هەواڵپرسی کردن و گوتی: ((ئەوە بەخێرو سەلامەت بۆ کوێ تەشریف دەبەن؟)).

رێوی ویردەکەی بڕی و گوتی: ((هەر خاوەن تەشریف بن، ئینشاڵڵاّ؛ بە تەمای ماڵە خوداین)). ویردەکەی بەدەنگێکی بەرزەوە کۆتایی پێ هێنا: ((رەببی ئیغفیر لی وەڕحەمنی...)).

کەڵەباب گوتی: ((مراوی، تۆش وەرە؛ تۆ ش تەمەنێکت بەڕێ کردووە، مردنت نزیکە؛ وەرەو لە خزمەتی حەزرەتی ئیبراهیمدا تۆبەیەکی راستەقینەی بەدڵ و بەگیان بکە بەڵکە ئێ ئەوە خودایە لە گوناهەکانت خۆش بێت- ئاخر خۆ ماسی و جانەوەری ئاویت کەم نەخواردوون، تا ئێستا چ خێرێکت دەو خۆ نقوم کردن و هاتنەوە دەرەیدا دیوەتەوە! دنیا ئەو هەموو خۆ نقوم کردن و هاتنەوە دەرەی ناهێنێ)).

مراوی کەمێك دەبیرەوە چوو، گوتی: ((راستە، مردن هەقە و تەمەنێکم رابواردووە- ئای هەی رۆژگار! راستدەکەی، زۆرم ئازاری خەڵکی داوە- کاتی تۆبەیە!)) و لە روبارێ هاتەدەرێ و وەك بیەوێ پاڵتۆکەی داکەنێ باڵی راوەشاندن و ئاوەکەی لەخۆی تەکاند و خلان خلان- وەك منداڵی تازە پێ گرتوو- دەگەڵ وان کەوتە رێیە.

رۆیشتن رۆیشتن تاگەیشتنە درەختێکی. قەلەڕەشێك لە سەردارەکە بوو. قەلە قاڕەیەکی کرد و بەزمانی قەلایەتییە ماندوو نەبوونی کردن و پرسی: ((ئەوە بۆ کوێ دەچن؟)).

گوتیان: ((ئەوە دە خزمەت مەلا رێویەڕا دەچینە سەردانێ ماڵە خودای)).

قەلە گوتی: ((ماڵ خراپ نەبووینە، بۆ مەگەر خودا شێتی کردوون؟ ئەوە چۆن دەبێ هەروا زوو و ئاواش بە سادە و ساکارییەوە بە مەلا و بەرێویان باوەڕکەن، کە ئائاوا بەو جۆرە جەڵەوی خۆتان داوەتە دەستی! مەلا رێوی هەموانتان دەخوا! هەم مەلا و هەم رێوی! هەر ئەوەندەی کەم بوو سەرباری رێوییەتییەی مەلایەتیشی خستەسەرێ!)).

گوتیان: ((نا بابە! ئەتۆ زۆر رەشبین و بەدبینی- دەرکی تۆبەیان هەر بۆ ئەوشتانە کردۆتەوە. ئەم مەلا رێویە دەگەڵ ئەو مام رێویەی تۆ دەیناسی هەر خودایان یەکە! ئەمەیان تۆبەکارە، بەدرێژایی رۆژێ بەڕۆژووە، پیاوی سەربردە و فەرمایشتانە، تەنانەت شەوانەش خۆ لە ئاو

خواردنەوێ دەبوێرێ و پارێزییە دەکا. مەگەر ریش و تەزبیحی دەستی نابینی، مەگەر خەمی ریشیت نەدیوە- خەمی هەموو لەشی! تەشریف دەبەنە حەجێ وەرە، لەکەری شەیتانی وەرە خوارێ- وەرە باپێکەوە برۆین!)).

زۆریان قەڵەقەڵ دەگەڵ قەلەی کرد، تا سەرەنجام رازییان کرد. رێوی، دەونێوەیدا، وەك ئەو هەموو قەڵەقەڵە هیچ پەیوەندییەکی بەوییەوە نەبووبێ لەبن لێوانەوە هەر سەڵەواتی لێدەدان و ویردی دەخوێندن. ناخی چاویشی بریسکەیان دەدا لە خۆشیان. سەرەنجام قەلە لەدارێ هاتەخوارێ و رەگەڵیان کەوت. مام رێوی بەدەم رێوە هەروا سوپاسی خودای دەکرد و تەزبێحی بادەدا. ناوەناوەش لەسەرتکای موسوڵمانان فەرمایشتیشی دەفەرموون.

شەو درەنگانێك گەیشتنە چیایەکی. لەوێ مانەوە. رێوی کونە ئەشکەوتێکی دییەوە و هەمووی دەوێ کردن، نەوەك خوانە خواستە شەوێ سەرمایان بێت و لەو سەفەری خێرە یان بوەخرێنێ. هەمووی دەکونێ کردن، بۆ خۆشی لەبەر درەندە و چەرەندان هات بۆ پارێزگارییە لە بەردەمی کۆنی دانیشت. نیوەشەو راشکا؛ زۆری پرسی بوو، چونکە ئەوێ رۆژێ هەر هیچی نەخواردبوو. دەدڵی خۆیدا گوتی چاکە، ئێستا وەختی خواردنێیە! قەلەبەدزییەوە بە هاوسەرانی خۆی گوت: ((ماڵ وێرانینە، دەزانن خۆمان دە چ داوێکی هاویشتووە! ئێستا یەکەیەکەمان بانگ دەکات و تاك تاکەمان دەخوات. ئێستا هەرچی ئازایە خۆی رزگار کات- خودایە بە تەمای تۆ!)) کەڵەباب بێ گوێدانە ئەو قسانە باڵێکی لێکدان و بانگێکیدا، قوقولی- قووو! و تۆز و خۆڵێکی دەکونێدا بەرپاکرد. رێوی وەك تازە لە خەوێ هەستابێتەوە، پژمەیەکی هاتێ و بەشڵەژاوییەوە گوتی: ((چ بووە، چ قەوماوە؟)).

گوتیان: ((چ نەبووە، کەڵەباب بوو، بانگیدا)).

گوتی: ((ئاه، وامزانی خودا نەخواستە پێشهاتێك روویداوە... گوتتان بانگی داوە؟ یانی هەر وازوو نوێژی بەیانی بووە!)) کەڵەباب و خڕی هاورێیان هیچیان نەگوت؛ کەڵەباب لە ترسان سەری دەبن هەردوو باڵەکانی نایەوە و خۆی لەخەوخست. رێوی رووی دە کەڵەبابی کرد: ((باشە، ئێستاکە هەستاوی، و ئێمەشت لە خەوکرد وەرە با یەك دوو قسان پێکەوە بکەین، منیش خەوم لێناکەوێتەوە. تازە چاوم گەرم کردبوون هەڵت ستاندمەوە. وەرە هەقایەتێکم بۆ بکە)).



کەڵەباب هاتە دەرکی کونێ. رێوی گوتی: ((راستییەکەی کەڵەباب، دەمویست ئەوەی لە تۆ بپرسم- ئەو پرسیارەم دەمێکە دەمێشکیدایە! تۆ بۆچی ئەو خەوە خۆشەت لەو خەڵکەی زڕاند و وابەو نیوەشەوەی دەستتکردووە بە هات و هاوارێ؟ چ ناوێکی لەوەی دەنێی؟ باشە تۆ چیت ئەو کارانە دەکەی؟ بۆ مەگەر خودا تۆی بۆ ئەوە ئافەریدە کردووە تا ئاسودەگییە لە خەڵکی خودای هەڵگری و بێزاریان کەی؟)).

کەڵەباب گوتی: ((مەلا رێوی، من کەسێکی مەردوم ئازار نیم؛ من زۆر سوودمەندی خەڵکیم؛ بۆ نوێژێیان هەڵدەستێنم؛ هەڵیاندەستێنم تا بچنە سەرکار و کاسبییەکانیان)).

رێوی گوتی: ((قبووڵمە، قسەیەکی بەجێیە- قسەی بەجێ وەڵامی ناوێ... قبووڵە. بەڵام تۆش ئەوەت قبووڵی بێ کە زۆر بێ شەرمی؛ لەبەرچاوی ئەو هەموو ئادەمیزادانە بێ هیچ شەرم و شکۆیەك خۆ هەڵدەدەیە سەرپشتێ مریشکان و پێیان دادەفسی بۆ شەرمێ لە خودای ناکەی؟ ئەدی فەرمان بەچاکە و نەفرەت لە خراپەکەت کوا؟ -خۆ ئێمە زمانمان مووی دەرکرد!... دوایەش هەروەك نەبات دیبێ و نەباران، بێ هیچ پاکانە و خۆشوشتنێکی چاوان لێك دەنێی و دەست دەکەی بەبانگدانێ، و دەشڵێی کە گوایە گوێت لە ئاواز و بانگی کەڵەبابی تەختی پەروەردگاری بووە!)).

کەڵەباب ویستی شتێکی بڵێ بەڵام دەرفەتی نەدا و ملی گرت و خنکاندی. دەم و لەوسی لستەوە و بۆ هەڵخەڵەتاندنێ ئەوانیدی، بەرەو تاریکییە روو لەلای دەرەوەی ئەشکەوتێ بانگی کرد: ((زۆرت پێنەچێ، ناراحەت دەبین، ها...)).

دوای ماوەیەك بانگی مراوییەی کرد. مراوی خلان خلان و بەترس و لەرزەوە هات. رێوی گوتی: ((باشە، خات مراوی... دەتگوت... تۆ بۆچی دە روبارێدا هەرچی گۆشتێکی خۆش و بەتامە دەیخۆی و کەس بۆی نییە چ بڵێ؟ باشە ئەتۆ زەکاتی ماڵی خۆتت داوە؟)) مراوی لەرزی، ئەویشی خوارد. دیسانەوە لەبەردەمی کونێ دانیشتەوە. قرپێکی دایەوە، و چەند ویرد و دوعایەکی خوێندنەوە، و ماوەیەك تەزبیحاتی کرد. ئەمجارەیان بانگی پەپوسلێمانکەی کرد. گوتی: خاتو پەپوولە، وەرە؛ وەرە هەقایەتی حەزرەتی سلێمان و خاتو بەلقیسێم بۆ وەگێرە... ئاخر خۆ تۆ ماوەیەك دە خزمەتی ئەو گەورە پیاوەیدا بوویت و تەتەریەویت کردووە و نامەت بۆ بردووە و نامەشت بۆ هێناوەتەوە. دیارە نوکتە گەلێکی زۆر خۆش و بەتامت لەکنە و دەیانزانی)).

پەپوسلێمانکە بەترس و لەرزەوە چوو. رێوی سەیرێکی کرد. گوتی: ((راستییەکەی لە پێشدا پێم بڵێ بزانم ئەو کڵاوە چییە لەسەرت ناوە؟ مەگەر تۆ شای، شازادەی، ئەمیری؟ هەر لەوەترا دیارە کە تۆ کەسێکی راست بیت و راستیش ناکەیت کە دەڵێی دە خزمەتی ئەو گەورە پیاوەیدا بوویت و تەتەریت کردووە- کەی تەتەر تاج و کڵاوی هەبووە؛ تاج هەر بۆ پاشایان دروستکراوە، بۆ تەتەرانیش کاڵە و پێتاو- کەواتە درۆ دەکەیت!)) پڕیدایە و گرتی و هەناسەی لێبڕی.

بەرەبەری بەیانی بوو کە قەلەی داواکرد- قەلە زۆر بە پارێزەوە چووە پێشێ- رێوی گوتی: ((وەرە پێشێ، پێشتر! چاوم چاك نابینێ- قەلەی یان یەکێکی دیکەی؟)).

قەلە گوتی کە خۆیەتی و قەلەکەیە- خۆی لەگێلیەدا. دەیزانی کە یەکێکی دیکە دەگۆڕێدا نییە. قەلە بەترسەوە هاتە پێشێ گوتی: ((قەلەم، مامە. دەڵێی ئەوانیدی چوونە راوێچکە و بای باڵی خۆدانێ)). رێوی گوتی: ((زۆر چاکە... وەرە پێشێ... راستییەکەی دەمهەویست لە تۆ بپرسم: تۆ بۆ کشتوکاڵی خەڵکی دەخۆی و هێلکانیشیان لێدەدزی؟ ئەدی نازانی دزی حەرامە؟ بۆ خەڵکی بۆ تۆ خۆماندوو دەکەن و رەنجێ دەدەن و ئارەقەی دەڕێژن. یا تۆش هەروەك شا و شێخ و مەلایان خۆت بەهاوبەشی ماڵی ئەو خەڵکەی دەزانی؟ ئەوجا، ئەو هەموو رق و کینە و دوژمنایەتیەت لەچی کە هەر من خۆم مات کرد و خۆم لە کەمینی نێچیرێکی داو هێندەی نەمالێی نزیك ببمەوە هەر وەك ئەو خوێندەوارانە بێ ئەوەی هیچ سودێکت پێبگات، دەست دەکەی بە قاڕە قاڕێ و نێچیرێ دەتارێنی؟ بۆ خودا تۆی بۆ جاسوسییە ئافەریدە کردووە، کە بێ مووچە و رۆژانە بێی و بۆ هەر پیاو و ناپیاوێکی جاسوسییە بکەی؟)).

قەلە گوتی: ((راستە؛ زۆر گوناهبارم؛ بەڵام با لەرێی خزمەتکارییەوە شتێك عەرز کەم- جا ئەودەمی ئارەزوو ئارەزووی جەنابی موبارەکتانە؛ دە بەردەستی ئێوەدام، ملم لەمووی باریکترە، هەرکاتێ ویستتان بمخۆن)).

رێوی گوتی: ((چییە، بڵێ- بڵێ بزانم چییە)).

قەلە گوتی: ((کەڵەباب و مریشکێکی پێدەزانم کە لەسەردەمی حەزرەتی بابا دەمییەوە تا ئێستا ماون و هەر دەلەوەڕێن، و وا قەڵەو بوون هەر مەپرسە. ئەگەر مۆڵەت بفەرموون دەچم دەیانهێنمە خزمەتتان. لەپێشدا ئەوان بخۆ، دوایەش ئەگەر زانیت وانەبوون کە دەڵێم، بەندەی



بخۆن)). رێوی دەبیرەوە چوو، گوتی: ((باشە... بڕۆ. بەڵام زوو وەرەوە. بەو قسانەی کردتن دڵم گۆڕا. ئەگەر ئەوانت هێنان، ئەوەتۆ ئازادی، ناتخۆم...)).

قەلە چووە دێیەکی تازە دەمەدەمی بەیانی بوو. دوو سەگ دە حەسارێکیدا یارییان دەکرد. قەلە خۆی پێشاندان. سەگەکان وەدووی کەوتن. بە ئەنقەست و لەسەرەخۆ دەڕۆیشت، بەواتای خۆمان ((قونەقونە))ی دەکرد: وەك کللك هەڵسەنگێنەی هەرکلکی هەڵدەتەکاند و یەك دوو هەنگاوان دەڕۆیی و رادەوەستایەوە و دووبارە بەهەمان شێوە... بەکورتییەکەی، هەر رۆیشت و سەگەکانی بەدوای خۆیدا کیش کرد تا بردنیە سەرکونە رێوییە. هەر لە دوورەوە ئاماژەی دایە رێویەکێ: ((ئەوەتان- خۆیانن!)).

رێوی سەیریکرد، هەر کە سەگەکانی دی هەستایە سەرپاشوان و دەستی هەڵتەکاند و گوتی: ((قبوولە؛ ئاواشم هەر قبوولە؛ بڵێ نەیەنە پێشتر...)).

*　　　*　　　*

## (٢٦)

ماوەیەکە هەردوای نانی ئێواریێ تا دامودەزگای تریاکیێ بۆ بابەی ڕێك دەخەن باس هەر باسی ژن و ژنخوازییەیە: ئەو باسە بابە دەیهێنێتە گۆڕێ و دایدەمەزرێنێ و باوەژنیش (زڕدایك) بەدوا ویدا. باس هەرباسی داواکارانی تەلاّ خانمێیە: فلاّن ناردوویەتی نەیان داوەتیێ، فلاّنە ئامۆزا ویستوویەتی کەسێکی بنێری، ڕایانسپاردووە، نەیەت، فلاّنە کوڕە خالّ پار چۆتە پێشیێ، دەست لە ئەژنۆیان درێژتر هاتۆتەوە؛ تەنانەت لە پشدەرێشەوە کوڕی مەمەنداغای راسپاردۆکەکی کردبوو، تاڕێیە خۆشکا. ڕەعنا خانم گوتبووی لەو تاقە کچەی زیاتر شك نابا، بۆیە نایەویێ بیداتە غەوارە و بێگانان و لەخۆی دوورخاتەوە- و ئیدی مەسەلەکە هەروا مایەوە- جا کچێکی چاك، چ نازدارێك؛ ج بەڕێ و جیێ و تێگەیشتوو! هەرکە دەمی لێك دەکاتەوە دوڕ و گەوهەری لەزاری دەباریێ، مێوژە ڕەشکەی بخوا لە ئەو کێیرا دیارە- پیاو حەزدەکا، هەروا بەخاوی، بەکالّ و نەکولێوی قوتیدا! بابە لاگریەی دەکات، و دەلّیێ داکیشی هەروا جوان بوو، پیاو لە تەماشاکردنێی تێر نەدەبوو... بەلّیێ یەکجار زۆر جوان بوو، ئەفسوس کە ئالوودەی تریاکیێ بوو، هەرچەندە تەمەنێکیشی هەیە. دوایە کتوپڕ وەردەسوڕێتەوە و بە باوەژنەی دەلّیێ: ((ڕاستییەکەی کە پارووەکی ئاوا چەور و گەرمونەرمە بۆ بۆخۆمان نەبیێ؟ ئێمە بۆ خۆشمان هەروەك وانین)). بەدەستی بە ماشە و ئاگرەوە، لەسینگی خۆیدا- یانی ئێمە وەك وان نین.

دە مەبەستەکەی دەگەم؛ دەست پێشخەرییە دەکەم، دەلّێم: ((پیرۆزە))و بەدەم باوەژنێوە پێدەکەنم.

ماوەیەکە منداڵەکان نوستوون. بابە لێوی بە قونچکیێ وافۆڕەکەیەوە ناوە، بەنیوە ئاماژێکی ئاشکرای دەکا کە قسان نەکەم تا بەستە تریاکەکەی تەواو دەکات و دەیکێشیێ- و ئیدی من بێدەنگ دەبم. بەکاوەخۆ بەستەکەی تەواو دەکات؛ دوکەلّەکەی تەواو هەلّدەمژێتە نێو سینگییەوە؛ ڕوخساری سوورهەلّدەگەڕیێ و گولّیێ دەکا، ماوەیەك دوکەلّەکەی دەسینگیدا



دیلّێتەوە، ئەوجا سەربلّند دەکا؛ دوکەلّەکەی بەهەوایدا بەبا دەکا، و ماشەکەی دادەنیێ، و دەگەلّ دەست بۆ قوتووە جگەرە بردنیێ بە باوەژنەی دەلّیێ: ((چای تێکە!)).

ئەوجار بەلای مندا وەر دەچەرخێتەوە، دەلّیێ: ((باشە، خۆ ئەوە گوتت پیرۆزە، ها؟ کەواتە وەکیلم؟)) ئەو قسەیەی سەرزارانم وەبیر دێتەوە: ((هەرکاتیێ ویستت ژنیێ بۆ کوڕت بێنی و هەرکاتێکیش ویستت کچیێ بەمێرد دەی...)) ئێستا ئەوە بابەیە کە دەیەویێ ژنێم بۆ بێنیێ. خۆم گێل دەکەم؛ بەزەردەخەنەیەکەوە بە باوەژنەی دەلّێم: ((بەلّیێ کە پیرۆزە؛ شەرع ڕێی داوە، ئەوە بۆ خۆشتان کە حەزتان لێیە؛ ئێمەش ئامادەین لەشاییەکەتان سەرچۆپییە بگرین... ئێستا بەخێر و خۆشییەوە کەنگیێ؟)).

دەلّیێ: ((نا، نابیێ! خەریکی باسەکە بەگالّتە وەردەگری. ئەوە بۆ خۆشت دەزانی کەتازە ئەمن تێپەڕیوم. من پێم خۆشە- ئەگەر تۆ بتەویێ- بۆ تۆی بخوازین... سوپاس بۆ خوا چاك ڕێکەوتووە و دەبیێ تۆش وردە وردە دەبیری مالّ و حالّ و ژیانێکیدا بی. لەوەشت چاکتر وەگیر ناکەویێ: جوانە، خانومانە، لە خۆمانە، ڕوو هەلّمالّدراوو چاوکراوە نییە...)).

باوەژن هاتە دەقسانەوە و گوتی: ((نەسرولّلاّخان، ئێوە پێتان وایە بیدەن؟ من دلّم زۆر ڕوون نییە)). بە ڕوخسارێکی خەماوی و خۆ بەهەق زانەوە.

بابە گوتی: ((دەبیێ منەتێش هەلّگرن، مێرد بەهەر کەسێکی دی بکا، دەبیێ تا دەمریێ، هەردە و پیس و پەلّۆخی و گەند و گووەیدا وەمێنیێ... خوا بەختی داوە تارانیێ دەبینیێ، بۆ خۆشی دەبێتە بنیادەم، جا مەگەر بۆخۆی نەیەویێ لەکۆلّ مێش و مەگەز و بۆن تەپالّەی ببێتەوە- ئیدی ئەوەیان نازانم!)) بەسەروچاوێکی توڕەوە. دوای تاوێك ڕامان: ((ئەوە تۆش بەخێری ناگیانت، پووریشی؛ لەجیاتی ئەوەی بچیە لای خوشکت و لای کچەی دانیشی و قسەیان دەگەلّ کەی... کە ئەوەش)) (ئاماژە بە من) نەکوێرە و نەشەل و سەقەت، لاوێکە ماشەلّلاّ بۆخۆی، خوێندەوار و لێهاتووە، هەموو کچێکی پیێ قایلە. من خۆم، هەر بەو قەد و قەبالّەوە، دە تەمەنی ویدا دەها گراوی و دۆستم هەبوون. ڕۆژ نەبوو کچانی دەر و دراوسیێ سێوی نەخشاو و دەستەسڕی بەگولّ چنراوم بۆ نەنێرن)).

باوەژنە پێکەنی و سەری بەردایەوە. یانی کە ((بەڵێ، زۆریش!)) بەسەرپۆشەوە لای بابمەوە دادەنیشت. تەنانەت کاتی نانخواردنێش بەجۆرێکی وا دادەنیشت کە بابە دەمولێوی بە پاروێوە نەبینێ: دەگەڵ منداڵەکانیدا نان دەخوارد.

بابە دە درێژەی قساندا گوتی: ((بەڵێ، ئێستاکە بیر دەکەمەوە دەزانم کە لە کچێ فلانێ چاکترە...)) بە روخسارێکی رازییەوە. یەك دووساڵ پێشتر پێی لێ دەکەوشێ نابووم و دەیویست کچێ ئەو فلانێم بۆ بخوازێ: مەستان خانم. ئەودەمی بۆ چوونەکەی وابوو کە چاوەکانیشی وەك ناوەکەی مەستن، خڕو خەپان و قەڵەوە و زستانان لێفە و دۆشەکم ناوێ. سەرەڕای ئەمانەش، نازو نووز و خۆبادانی هەمو بەگوێرەی دەستوورن، هەر ناز و نووزێکی بەسەد نازو نووزی کچانی دی دەچێ... ئەوە ئێستا بایداوەتەوە. دیارە کارەکەیان دەنێوان خۆیاندا بڕاندۆتەوە.

باوەژنە گوتی: ((نا، ئاغا، هەر پەنجەیەکی تەواوی بوونێ وی دێنێ! ئەو لەو یەك دوولەگەنە گۆشتەی زیاتر کە پێوەیەتی چیدی هەیە؟ هەریەك دوو زگان بکا، دوور لەڕووی ئێوە، بێزت نایە تفیشی پێداکەی!)).

بابە گوتی: ((وایە، تا یەك دوو ساڵان خراپ نییە... ئەوە بۆ من چاکە- من حەزم لە هەڵسوکەوت و رەفتارەکانیەتی- من وەك کاکی خوێندەوارنیم... باشە، تۆ پێتوایە بتوانی دەگەڵیان- دەگەڵ خوشك و خوارزاکەت- بدوێی؟... مستەفا خانیش ئەوە کە لە ((هاوڕێیان))ە...)).

((وەڵڵا، بڵێم چی- بابزانم: پێتوایە ئەوە راست بێ کە من هەروا یەکان دەردوو، بێ ئەوەی قسەی بن زمانیان بزانین بچم و خودا نەخواستە قسەم بشکێ؟ من پێموایە واباشترە وەڵامێ بدەمە دادە رەعنایە بۆ چەند رۆژێکان بێتە شاری، زۆر حەزی دەکرد بچتە کن دکتۆری- چاوەکانی کز بوون. ئێستاش کە ئەو دکتۆرە جووە هاتووە، خراپ نییە سەردانێکی بکا... هەم دیدەنییە، و هەم سەردانی دکتۆریشە، و هەم خوانە خواستە قسەشمان نەشکاوە. من هەمیشە دەبیری ئابڕووی ئێوە و کاکەیدام)). (بەمنی دەگوت کاکە) ((دەنا ئەو خوشکی گەورەمە، بۆی هەیە لە دوڕدەوم دا... من بیر لەو شتانە دەکەمەوە. رادەسپێرم تەلاش دەگەڵە خۆیدا بێنێ- هەر دەشیهێنێ. چونکە کەسیان لە ماڵێ نامێنێ. متمانەی بە ژنێ مستەفاش نییە تا لەکن



وی بەجێ بێڵێ. کە هات ئەودەمی کاکەش هەلی بۆ دەڕەخسێ تا لە نزیکەوە بیبینێ و سەرنج بداتە رەفتار و هەڵسوکەوتی. بۆ خۆشمان هەروەتر، خۆ ئێمەش لە چەند جارێکان زیاترمان نەدیوە، ئەویش دیتنێکی هەروا سەرپێی. راستە خوشکەزای منە، بەلام ناوی بووکی ئێوەشی پێوە دەنووسێ...)).

بابە گوتی: ((راستە؛ بەلام بۆ هەر بووکێ من- خۆ بووکێ تۆشە؛ بۆ مەگەر برایم دەگەڵ منداڵەکانی دیکەت جیاوازە؟ دەبێ هەر لە ئێستاوە ئەوەی چاك بزانی کە ئەگەر رۆژێکی ئێمە شتێکمان لێهات هەر ئەوە کە چاوی لە تۆ و منداڵەکانەوە بێت. ئیدی لەمەودوا من و تۆی تێدانییە)).

((چۆن دەفەرمووی وایە؛ خودا تەمەنی هەردووکتان درێژکا، خودا سایە و سێبەری ئێوە لەسەری خۆم و منداڵەکان کەم نەکا... جا چ بڵێم بە خودای من هەرگیز خۆم بە باوەژن دانانێم)).

بابە هەروا کە دە وافۆرەکەوە رامابوو گوتی: ((بەڵێ هاتنیان بۆ ئێرە زۆرینەی مەسەلەکان حەل دەکا... منیش بۆم هەیە ببینم و رای خۆم بڵێم... ئەوەشم هەر لەبەر هێندێیە کە چونکە ئەو ((بابا))یە راوچییەکی چاك نییە، لەوانەیە هەروا تێیڕامێنێ و ئاوی بە لالغاواندا بێتەخوارێ... تۆش بۆت هەیە بزانی... چونکە هەروەك خۆت دەڵێی ئەو بێرە بێگانەیە، و کچێکە دێتە دەوماڵەیەوە؛ ئێمەش نابێ هەروا کوێرانە لەبەروەی کە کچە مامی من و خوشکەزای تۆیە خۆمانی پێوە گیرۆدەکەین...)).

بەڕواڵەت شتەکە بڕابۆوە و من وەك ئەو دەمانەی کە دەوڵەتە گەورەکان بڕیارێك دەربارەی میللەتە بچووکەکان دەدەن وابووم، هەموو ئەو نەخشە و هێز و توانایەی کە هەمبوو هەر ئەوەبوو بێم داوێنی ئەو قونتەرات نامەیە واژۆ (ئیمزا) بکەم و ئەوجا ئۆباڵی خێر و شەڕەکەی دوایەی بەملی خۆم.

بابە یەك دووجارانی دەرزییەك دە کونی هۆقەی تریاك کێشانەکەی وەردا و ئەوجا گوتی: ((کەواتە تۆ بۆ خۆت کارەکان رێك بێخە؛ ئەویش با- بەسەلامەتی- بچێتەوە سەرکاروبار و ژیانی خۆی. ئەویش دەبێ دامەزرێ، ناتوانێ زۆر وەمێنێ، سەرەڕای ئەوەش، چت لێ

بشێرمەوە، من نیگەرانی ئەو کچەشم. دەترسم بەو دیموکراتبازییەی کە مستەفاخان دەستی داوەتێ و ئەوشتانەی کە دەربارەی سەربەستییە ژنانی دەڵێ، هەرچی خوو و رەوشت و خدەو نەریت و کەلتور هەیە هەمووان شەقێك تێهەڵدات و ئەودەمی خوانە خواستە سەرەنجامەکەی بەسەر کچەشدا بشکێتەوە و رۆژێکی هەروا خودا نەخواستە رەدووی نۆکەرێك خزمەتکارێکی کەوێ ئابڕووی بنەماڵەی بەرێ)) باوەژنە گوتی: ((نا، ئاغا، نا ئینشاڵڵا! وا مەفەرموو- ماشەڵڵا کچێکی تێگەیشتوو و پێگەیشتوو- شتی وا هەرنابێ... لەوەی هەر دڵنیابە... کچێ ئەو دایی و بابە- و ئەو بنەماڵەیە- نا ئاغا، ئینشاڵڵا- ئاسوودە بە، هیچ کاتێ شتی وانابێ و رووناداتا!)).

بابە گوتی: ((ئەگەر هات و روویدا. بەوکارانەی ئەو هەرزەکارە (مستەفاخان- وەرگێڕ) دەیکا هیچ شتێك لەو بنەماڵەی دوور نییە. پێت ناخۆش نەبێت، ئەگەر خۆشکەزای تۆیە نەوەی مامی منیشە... ئەو هەرزەکارە تا بڵێی جرپن و لووت بەرزە، هەرچەندە رۆشنبیر و هاوبیری کاکەی خۆشمانە!)).

باوەژنە سەری بەردایەوە و من زەردەیەکی گاڵتەجاڕیانەم هاتێ. لە تەواوی ئەو ماوەیەشدا هەروا بەو جۆرە دەخەنیم. ماوەیەك بێدەنگی ئەو ناوەی داگرت، کە لە جڕە جڕە و قرچە قرچی تریاکێ و ویزە ویزی سەماوەرێ بەولاوە دەنگی هیچیدی نەدەهات. خانزاد کە تازە لە کارو ئیشی هەوڕ شوشتن و سەروبەرکردنێ هیباری شیری ببۆوە دەرگاکەی کردەوە. باوەژن بێ ئەوەی لای لێبکاتەوە گوتی: ((خانزاد جێیەکانی ئاغا و کاکەت راخستن؟)) خانزاد گوتی رایخستووە. باوەژنە گوتی: ((دە باشە، تۆ بچۆ بنوو، من بۆ خۆم ئەوانە کۆ دەکەمەوە. بەیانی بیانبە بیانشۆ)). خانزاد دەرگاکەی داخستەوە و رۆیی، باوەژنە کە بەپەنجەی دەستێکیانی بەسەرگوڵی رایەخەکەدا دەهاتەوە بەدەستەکەی دیکەشی چمکی لەچکەکەی سەری گرتبوو و بەدەنگێکی دایکانەوە گوتی: ((کاکە بۆ خۆی هیچی هەر نەگوت، و سەروبنی کارەکەش ئەوە- خۆ دەبێ ئەویش شتێکی هەر بڵێ...)) و سەری بەرزکردەوە و تەماشایەکی منی کرد.

بابە گوتی: ((کێ دەڵێ سەرو بنی کارێ ئەوە؟ نەخێر، خانم، سەروبنی کارێ ئەمنم، ئەمنم پوڵی خەرج دەکەم و دەهۆڵ و زوڕنای دێنم. دەبێ زۆریش مەمنون بێ... چ لەوەی خۆشترە بێن و کچێکی جوان و رازاوەت بۆ بدۆزەنەوە و شایی و لۆغانت بۆ بگێڕن و لەسەری شەوێش



هەموو بڵێن فەرموو ئاغا- فەرموو- فەرموو فەرموو تەشریف ببەنە پەردەی- شەوێکی شاد!)) ئەمانەی هەموو بەسەر و دەست بادانێوە دەگوتن. ((جا مەگەر یەکێك شێت بێ ئەوەی نەوێ. ئاخ، لاوەتی لە کوێی!... کەسێك نەبوو ئەوەی بۆمە بکا... ئەودەمی دەتزانی داخوا سەدژنیشم زیاتر نەدەهێنا... لەسەرفەرمووش رانەدەوەستام- جاکەواتە ئەو شێتە نایەوێ؟ جا ئەوەی ناڵێم ئەگەر خودا نەخواستە هیچی پێنەکرێ... ئەودەمی چارنییە، و هیچ ناکرێ!)) بەدەم پێکەنینەوە سەرم بەردایەوە.

باوەژنە هەر بەهەمان روخسارە شەرمێونییەکەیەوە گوتی: ((ئێوە راست دەفەرموون؛ خوا ئێوەی لێنەستێنێ ئینشاڵڵا. خۆ ئەگەر بۆ ئەو کچەش نەبێ بۆ یەکێکی دیکەی هەردەبێ شایی و زەماوەند بۆ بگێڕی؛ بەڵام خۆ بەهەرحاڵ دڵی کاکەش مەرجە...

بابە گوتی: ((لا حەولە وەلا...! خانم، خۆ من نەمگوتووە مەرج نییە... ئەو دڵەی کاکەی چییە؟ جوان پەسەندە؟ زۆر چاکە، کچەش تابڵێی جوانە، ئەوەی ناڵێم کە دڵی کاکەی وەك مێشێ حەزێ بکا بە پیساییەوە بنیشێ. جێ گەورەی دەوێ؟ باشە، تابڵێی خانەدانە، ئێمە هەرچیەك بین ئەویش وایە، مەگەر کاکە وەك کابرای جۆلا بەسەرجلی دەسکاری خۆی رازی نەبێ. بێجگە لەمانەش ئالوودە نییە (یانی فێرە تریاك نەبووە- وەرگێڕ)؛ گیا ئەوەیە بەدەمی مەڕێ خۆش بێ. خۆمن زۆری لێناکەم. منیش وەك خەڵکی دانیشتووم و دەگەڵەوەدا راوێژان دەکەم. دیارە ئەگەر قسێکی هەبێ دەیڵێ، خۆ من لە دارێی نابەستم. ئەو بە درێژاییە رۆژێ بۆم بە مارکسیزمی هەلا دەڵێ و دەمی وێك ناکەوێتەوە- خۆ بۆ ئەوەش من زمانیم نەبەستووە)) و رووی دەمن کردەوە و گوتی: ((وەنا؟)).

بەزەردەخەنەیەکەوە گوتم: ((بۆ نا)).

((باشە، دیارە چ قسەیەکت نییە؟)).

بەزەردەخەنەیەکەوە گوتم: ((ئێستا دەکرێ وازمان لێ بێنن؟)).

هەر کە ئەوەم گوت باوەژنە تاسا، و بابە گڕی گرت.

((تێنەگەیشتم، بەندە وازتان لێ بێنم؟ نا قوربان، با جەنابعالی واز لە بەندە بێنن! بەندە منم کە پارە و پوول خەرجی ژن هێنانێ دەکەم، تا دز دزی گرت، دز ماڵ خۆی گرت!؟)).

هێندێکم شێر و ڕێوی لێرە و لەوێ هێنانەوە، کە هێشتا دانەمەزراوم و دەستم لەشتێکی گیرنەبووە، جارێ دەبێ کارێکی وەبینم... و جێ و ڕێیەکم دیار بێت... ئەوجا... ژن هێنان و بەخێوکردنێ ماڵ و منداڵی لە تارانێ گرفتاریەکی تابڵێی گەورەیە؛ لەوانەیە وا ڕێککەوێ بۆ ئەنجامدانی کارێکی لە تارانێ بچمەدەرێ؛ دەبێ ژنێکی وابێنم کە منیش لە ماڵ نەبووم بۆ خۆی بتوانێ خۆی بەڕێوە ببات- و ئیدی لەم وردەکارییانە.

بابە گوتی: ((ئەوانەی گوتتن هیچ نین. ژنێ دەگوازیەوە و چەند ڕۆژێکان لێرە بەخۆشی رادەبوێری و ئەوجا وەدووی کاری خۆت دەکەوی. من لێرە ئاگام لێیدەبێ تا تۆ دەکەویە سەرجێ و ڕێی خۆت؛ ئەودەمی دێیەوە و بەخێر و خۆشی ئەویش دەگەڵ خۆتدا دەبەی. دەتەوێ چ بکا، خۆی بەڕێوەبەرێ؟ ئەوە لە ماڵێیە، چ ڕێیەکی لە تۆ نەگرتووە؛ ناچتە سینەما، و شانۆ و نمایشنامەی ناوێن، لەسەرمۆدەی ناڕوا- تۆ منداڵی تێی ناگەی! گرفتارییە ماڵێ ئەو ژنانەن کە دەگەڵ دەوروبەرەکە شارەزان و راهاتوون و هەر ڕۆژەی بیانوویێکی دەبیننەوە و فلاٚن مۆدێل و فلاٚن جلوبەرگ و فلاٚنە مارکەی بۆن و کۆلۆنیایان دەوێ. تۆ چاکی لێ ورد نەبوویتەتەوە؛ من لە یەك دوو ماڵە ئاشنای تارانێم سەرنج داوە. پیاو دەبێ سەرینە ئەسکیناسی لەبن سەری بێ تا بتوانێ ژنێ رازیکات. ژنانی مە چیان ناوێ؛ لە ماڵ بی، لە ماڵ نەبی، گوێ ناداتێ. هەموو گرفتاریەکەت کە هەیە، تەنیا نان و گۆشت کڕینە، ئەویش دەتوانی ڕۆژی دەشاییان بدەیە شاگرد نانەوایەکی نانەکەت بۆ بێنێتەوە ماڵێ... زۆربەی شتەکان دەبەنەوە بەر دەرکی ماڵێ...)).

((راست دەفەرموون، بەلاٚم ژنی بێچارە گوناهی چییە کە دەبێ بەدرێژایی ڕۆژێ زیندانی بێ؟ هەرنەبێ لێرە دەشت و دەر و کێو و بەندەن و جۆگە و رووبارێك هەن، دەتوانێ هەرکاتێ کە دڵتەنگ بوو، بچێتە دەم رووبارێکی، یا ڕوو دەکێوی کا... یا هەر نەبێ بچتە بەردەرکێ دەگەڵ ژنە دراوسێیان دانیشێ و دەمەتەقەیەکی بکا...)).

نا، تەڕ واش نییە. با لەوێش لە پەنجەرەیڕا تەماشای شەقامان کات کە بۆ وی سەرگەرمییەکە و دەتوانێ خۆی پێوە بخافڵێنێ... لێرە بەستراوەتەوە... خۆ ئەویش هەروا لەسەربارێکی نامێنێتەوە، دەگەڵ دەوروبەرەکەیدا رادێ، فێردەبێ، هەروا لەخۆوە خەیالاٚن مەکە، خەڵکی مە هێندەیان توانا تێدایە، بەتایبەتیش ژنان کە پاش دوو مانگان کچە تارانیان لە بن هەنگڵێ خۆیان نێن... نا، هەرگیز بیر لەو شتانە مەکەوە؛ ئەوانە بۆخۆیان دەرسیان ڕەوانە)). بۆ



چوونێکی راست بە پێچەوانەی پێرارەوە. کە بێزاری و لالووتییە لە ئەندازە بەدەرەکەی منی دیت، لە لایەکی دییەوەڕا بۆم هات کە دەگەڵ هەموو ئەو لاوەتی و کەم تەمەنی و هەرزە کارییەمەوە هێندەی کارتێکردم دڵگیربووم.

گوتی: ((گوێ بگرە برالە، پێم خۆشە هەمیشە دەگەڵتدا راست و رەوان بم و هیچت لێنەشارمەوە. هەستدەکەم وا وردە وردە پیر دەبم و پێم خۆشە بۆخۆم ژنێت بۆ بێنم و دەپەردەت کەم؛ حەزم لێیە چاوم بەنەوەی خۆم کەوێت و بۆ خۆم گەمانیان دەگەڵدا بکەم)).

گوتم: ((بابە، ماشەڵلاٚ هێشتا هەر جحێڵی، منداڵت هێشتا هەر چوکن؛ ئەوی وردیلە تازەی زمان پژاوە... ماشەڵلاٚ کارخانەش هێشتا بەچاکی هەردەکاردایە- ئەوە تازە کەوتوویە سەر کەلەکان!)) باوەژنە پێکەنی. بابە گوتی: ((کارێ بکاو نەکا، حەزم لێیە نەوەم هەبن- نەوەی کوڕێ شتێکی دیکەیە... پێم خۆشە زاوایەتیەت ببینم...)) (بەگاڵتەوە) ((تا بزانم چ پیاوێکی! بێجگە لەوەش هەقمانە. دنیا بێ وەفایە، ئەوە ئەوڕۆ و سبێکی لە خەوێ هەڵنەستاینەوە و رۆیشتین- ئەودەمی پەژێوان دەبیەوە و پشتە دەستی خۆت دەگەزی)).

... زۆرچاکە بابیبینم، ئەگەر پەسەندم کرد و رام لێبوو ئەوە هیچ، ئەگەر راشم لێنەبوو ئەودەمی...)).

((ئەودەمی بیرێکی دی دەکەینەوە؛ چ زۆرە کچ زۆرە؛ غەمت نەبێ...)).

وەك ئەوەی کە دەبوو غەمی هەر بخۆم!.

((زۆرچاکە، بیرێکی دی دەکەینەوە؛ ئەمساڵ نەبوو ساڵێکی دی)).

(( نا ئیدی- هەر ئەو ساڵ... هەر لە ئێستاڕا بڕۆ خۆت سازدە)) و پێکەنی.

((باشە، ئەوەشیان ئەوە... زۆرچاکە، ئێستا بوویتە پیاوێکی بەڕێ و جێ!)).

بڕیاردرا بچم و سەرێکی لە مستەفاخانی بدەم و تەلاٚ خانمێش ببینم؛ بڕیار وابوو باوەژنە، کارەکان جێبەجێ بکات و ڕێکیان خات و دەست و دیارییان بۆ خوشك و خوشکەزایە ئامادەبکات و ئەحمەدیش بچێ لە دێیڕا ئەسپی بێنێ و بۆ خۆشی هەردەگەڵ مندا بێت. بڕیاری رۆینێمان دووسبەی ئەوێ ڕۆژێ بوو... بەلاٚم هەرچیم دەکرد دڵم نەیدەهێنا: ئەوەی من

لێیدەگەڕام ئەوە نەبوو. هەر لە بنەڕەتەوە حەوسەلەی ژن هێنانێم نەبوو. هەر لە ئێستاوە بڕیارم دابوو و هاتبوومە سەرهێندەی بچم و بگەڕێمەوە و بڵێم بەدڵم نییە... ئەوەی لێیدەگەڕام ئەو نەبوو... بەڵام سەیرە، هەردەو دەمیدا، هەر بەوەندە وەختەی، دڵم وە خوت خوتە کەوت- کێ دەڵێ، ئەگەر ئەوەی من لێیدەگەڕێم هەوبێ- یا شتی هاوبەشی وایان لەنێوانێدا بوو... کێ چووزانێ... بەیانی زوو وەڕێ کەوتین... بە کەناری دارتێلاندا. بەیان هێشتا فێنک بوو و دارتێلەکان ساڵدانە ساڵدانە بەڕێیان دەکردین و یەك دەیداینە ئەویدی، یان کە بەلۆقە و چوار ناڵی و غارغارێنەوە دەڕۆیشتین، وەك راسپێردرا بن بەدوامانندا دەهاتن و هەریەکێکمان تێپەڕاندبایە یەکێکی دیکەی لەجێ قوت دەبۆوە... کەوتینە دۆڵێ؛ هێشتا هەر فێنك بوو. کێو لووتی بە بناگوێی ئاسمانێوە نابوو و بەگوێیدا دەچرپاند و لێڕەوار کش و مات و بێدەنگ بوو. دوو دڵ و گوماناوی بەڵام بەشان و شەوکەت، وەك میوانێکی کە خۆی لەگێلیە دەدا، گوایە نەدەبیسێ و نەدەبینێ، و بەروخسارێکی ئارام و بەلابەلاییەکەوە گوێی بۆ سرتەسرتی ژن و مێردی خانەخوێ هەڵخستبێ و هەردەو دەمیشدا پێی خۆشبێ ئەویش دەمێکی تێوەردات و دوو قسان بکا، هەستی لێڕاگرتوون، تا بزانێ چ خەونێکی پێوە دەبینن...؟ دەغڵودان دروابوونەوە- بەڵام پێتوایە داخوا چەندە بووە؟ پارچە زەوییەکی ئەو لێڕەوارەیان خۆش کردبوو و هەروا بای مەمرە و مەژییەکیان و بای نانی زستانێ داچاند بوو: جێ دەغڵەکان (پەریزەکان) هەر زەردبوون. هێشتا گەلاوێژ نەکەوتبوو... هەوا گەرم بوو. بەهار و نیوەی هەوەڵی هاوینێ دەست و پێیان هەڵکێشا بوونەوە. کێو هەناسەی لێبڕا بوو، چاوی جۆگەکان وێك هاتبوونەوە و خودی جۆگەکە دەتگوت نەخۆشە و زۆر بە زەحمەتی خۆ رادەکێشا و هەروەك مارێکی کاژێ باوێ سینگی لە زیخ و چەوی بن خۆیەوە دەسوی و ئەو پەردە تەنکەی لەشی پێ شەق دەکرد؛ مەل و باڵندەکان لە جریوە و جووکە کەوتبوون. خۆر لاشەی گەرمی کێوی بەڵەك کردبوو- چەپکە گوڵەکانی کراسی چیا سیس و ژاکاو و وەریبوون؛ پەڵە هەوری رەشی چڵکن وەك کۆنە پەلاسێ سێبەری لەسەر کردبوون... دەنگی زیك زیکان ئەوناوەی پڕکردبوو؛ ئەسپ وەڕەزببوون پێشکە هەراسانی لێهەڵگرتبوون و هەوت ببووم.

ماوەیەکە وام: ناتوانم هیچ بکەم- کارێکیشم نییە. پێش ئەوە کتێبێکم تاو دەدایە و دادەنیشتم دەمخوێندەوە یا دەگەڵ هاوڕێیاندا خەریکی قسە و باسان بووم؛ ئێستا دادەنیشم و هەروا بە هەوتی لە پەنجەرەیڕا تەماشای ئەو جووجەڵانە دەکەم کە ئێستا وەك جاران جوان نین و بەو



کچانە دەچن کە لەسەراوێڕا دێنەوە و ئیدی وەك کۆلکە زێڕینە جوان و دڵڕفێن نین... دەگەڵ ئەوەشدا، هەر لە هاتوچۆی دیتنەوەی ونبووەکەم دام و هەموو رێیەکی بەوردی سەیر دەکەم... دڵم گیراو و گوشراوە.

هەروەك مێش هەنگی سەرگەردان، چاوم، بیرم، خەیاڵم، لەو گوڵ بۆ ئەو گوڵ، لەو غونچە بۆ ئەو غونچە، لەو روخسارەوە بۆ ئەو روخسار، لە گەرمی و ئارەقەی ئەو لەشەوە بۆ گەرمی و ئارەقەی ئەو لەشەی دی، لە کوزووی ئەو سەرشانەیەوە بۆ کوزووی ئەو سەرشانەیە، لەو یەخەو بەرۆکەوە بۆ ئەو یەخەو بەرۆکە جێیەکی دەست ناکەوێ لێی بنیشێتەوە- ئەوەی کە لێیدەگەڕا نەیدەدیتەوە... لە ((دارگوڵ))ی دەگەڕێم، لەنێو گوڵاندا و نایبینمەوە. ئەو زەردەخەنانە، ئەو پێکەنینانە، ئەو چاوگێڕانانەی، هەموو دەچاوم رادەچوون، بەڵام هەڵنەدەچەقینە گیانمەوە- ئەوە نەبوو کە لێی دەگەڕام.

پێشتر، پێرار هەموو شتەکان وەك ئەفسانەیەکی جوان، رێك و پێك و جوان و دڵگیربوون، ئێستاش بەڵا و نەگبەتی و ناخۆشی لە هەموو شتێکی دەبارێ: ماڵ، کاول و وێرانەیەك بوو، کێو و چیا غەماوی و تەم گرتوو و تاکەدارە دوولکەی نێوان جووتە لوتکەی چیای ئاربابا لە هەموو دنیایە لالووت بوو و گرێ و گرژییە نێوچەوانی نەدەبۆوە و نەدەڕەوییەوە. خودی چیایەکەش پیر و پەلۆس و گرژ و مۆن ببوو...

لە حاڵی خۆم وەڕەز بووم و دەتەواوی ئەو ماوەیەیدا وەك نەخۆشێکی سۆرکە (سووریژە) گرتووی بەرەبەری چاکبوونەوێ، مێشکم بەتاڵ و حەتاڵ بوو. و سەرم دەتگوت مەنجەڵی بەتاڵە و (با) پێچانی تێدا دەدات بەردەوام دەنگە دەنگ و ژاوە ژاوێکی نادیاری مێشکمی لە دیوارەکانیەوە هەڵدەستا، هەر پرسیارێکیان لێکردبام بە مێشکێکی بەتاڵەوە وەڵامم دەدایەوە و زۆرجارانیشم بە پێچەوانەوە وەڵامم دەدایەوە و گەرمییە هەوام دەکردە بیانووی ئەو خەمساردییەم. بابە گێژبوو... چم لێهاتووە؟ بەردەوام داوای لە ئاواڵەکەم دەکرد بە تەنیام جێ نەهێڵێ و زۆر جارانیش هەر بۆخۆی لەبەر دڵی من باس و خواسی وای بۆ دێنامەگۆڕێ کە بۆخۆی حەزی پێنەدەکردن...

بەردەوام نەرمە بایەك گەرمی هەوای دێنا و دەبرد و درەختەکانی دەگەڵ شنەی شەماڵێکیدا لق و پۆپ لێك نزیك دەکردنەوە و پێش ئەوەی دەستیان بگاتە یەك و سەر و پرچ و گەڵا و گوڵیان

بگەنەیەك لێك هەڵدەبڕانەوە- دایەش نەخۆش بوو... لادێییەکان، بێ ئەوەی گوێ بدەنە گەرمایە، ئارەقاوی و کۆڵەبار بە پشتێوە، ژن و پیاو، منداڵ بە کۆڵەوە، بەدەم تەشی ڕستن و سەبیل کێشانێوە، دەهاتن و تێدەپەڕین، سەڵاو و ئیکلام و ماندوو نەبوونێکیان دەکرد و دەڕۆیشتن- و ئێمەش دەڕۆیشتین.

جلەکانم وەك ئی عەجەمان دەچوو. بۆیە گومانم کەوتبووە سەرێ: مەئموری چیم؟ دەچوومە کوێ؟ دەچووم کێ بگرم؟ بەڵام ئەم گومانانە زۆریان نەخایاند. ئەحمەد ناوی بابەی دێنا- و گومانەکان دەڕەوینەوە و نەدەمان. گەرما و پێشکە پرزەیان بڕیبوو، و ڕێ وەك تیرەماری لەبەرپێیان لول و پێچی دەدا و خۆی لەداوێن و لاپاڵەکان هەڵدەسوی و دەڕۆیی و لە زۆرجێیانیش بەشێکی لەو داوێنانە دەخۆیەوە دەپێچا. جگە لە دەنگی سمی پێی ئەسپەکان چ دەنگێکی دی نەدەهات- مێشکم وەك هەمیشە بۆش و بەتاڵ بوو؛ هەردەتگوت بۆ ((کچ دیتنێش)) ناچم... هەروا لەبەر وڕەی گەرمایە شەوقی دەدایەوە. ڕۆژ داکەوتبوو؛ ئارەقە وردە وردە لەپشتە ملێ و تیرەقەی پشتێڕا دەچووە خوارێ، و شۆرەی ئارەقێ کەم کەمە بە هەنیانەوە دەمەیی. یەخەی کراسەکەمم کردەوە؛ تازەش دەهات کەراواتێ ببەستم!...

تینمان بۆ ئەسپەکان هێنا؛ دارتێلەکانمان لێ تەکینەوە، چوون تا لە تەپۆلکەی ئەوبەرێڕا سەرەتاتکێ بکەن و پێشەبڕمان بدەنەوە و سەر ڕێمان پێ بگرنەوە، ئێمە بە چوار ناڵی دەرۆیشتین. لێرەو لەوێ، قۆرییە گیایەکانی لارێیە وەك تاوەری ئێشکگرییە، بەو ناوەیدا هەڵنرابوون و هاتنێ مەیان بۆ ناوچەکە بەکێوی رادەگەیاند...

گەیشتینە بستوویێکی، لەوێ داگەڕاین، و ئەوجا بۆ بسوویێکی دی، تا لە دوورەوە ڕەشاییە کۆخێکی، لەلارێیە، تۆزێك دوور لە لێڕەواری، دەگەڵ تاقەدارێکی تەنیشتی و چەند درەختێکی بەرامبەریمان بەدی کردن: جەڵەوم توند کردەوە؛ لە ئەحمەدیم پرسی: ئەوە کۆخە یا چاخانەیە؟ گوتی ئەوە چاخانەی ((دارمازوو))ێیە.

بەو مەبەستەی کە نیوەڕۆژە هەرچی بێ، نان و ماستێك نان و هێلکەیەك هەرچی بێ لەوێ لەبن دارێکی بیخۆین و لەبن سێبەری دارێکی پشوویێکی بدەین و فێنکی ئێواری وەڕێکەوین- لاماندا- ئەگەر کەوتینە شەوێش ئەوەکەوتین. چاخانەکە لە نزیکەوە چۆڵ دیاربوو؛ ڕێیەکەی بە بەردەمیدا دەڕۆیشت. لەلای خواروویەوە پیرەدارێکی کۆنە ساڵی، گرێواوی خوار و خێچ کە



لقەکانی خوارتری هێندەی هەوساری وڵاغان پێوە بەسترابۆوە هەمووی سوابوو و قەدەکەشی کلۆر ببوو و جوجکە و مریشك پێپڕکەیان تێدا دەکرد؛ و خوارتریش، لە قەراغ جۆیە چەند داربییەك، و بەولاوەترەوە چەند بنە تووترکێك، لەولاترەوەش روبارێکی وشك و برینگ. دیسانەوە بەولاوەترەوە لاپاڵ و لێڕەوار، دیسانەوە لاپاڵ و گابەردی تۆخ و هێندێ جێگا بەردەلاّن ولێڕ و دوورتر بەرد و لوتکە کێو- هەموو رووگرژ و مۆن و برۆتێکناو و لەلای راستیشەوە، باری سەرێ، ئاسمانێکی کراوە، هەمدیس تەپۆلکە و لێڕ کە ڕێیەکەیان لێوە بەرەو خۆراوا بایدەدایەوە، بەرەو دەشتی ((نوێژگە)). لەولاشەوە لە بڵندایییە پێش لوتکەی شاخی، پشتی گەلاّی دارەکان دەبریسکانەوە و تاریك دەبوونەوە، هەر راست وەك پۆلووی نێو ئاوردانێ کە دەگەڵ بای باوەشێنێ کز دەبن و دەگەشێنەوە...

چاخانێکی دوو ژووری لەسەر هەیوانێك، ژوورێکیان بۆ ڕێبواران و ژوورێکیش بۆ ماڵێ چایەچییەکەی- کورتانێك و دووسێ مریشك و چەند جووجەڵەیەك کە لەناو زبڵ و زاڵی پێش هەیوانێ پێپڕکەیان دەکرد و کەڵەبابێکی جوان کە لەبن سێبەرێ سەری دەنێو باڵەکانی نابۆوەو وریایانە سەیری دەکردین- دیاربوو دەگەڵ ئەو جۆرە پێشهاتانە راهاتبوو. لە ئەسپی دادەبەزم، جەڵەوەکەی دەدەمە دەست ئەحمەدی. پێی دەڵێم ئەسپەکان بەرێتە دەم چۆمی و بیانبەستێتەوە و زینەکان بێنێتەوە هەیوانێ. خۆم پەلکێش دەکەم و دەچمە هەیوانێ- بێ ئیختیار بەلای خوارێدا کە پێدەچێ ئەم بەشە چاخانەکە بێ. لە دەرەوەڕا بانگ دەکەم- کەس نایە؛ دەرگاکە دەکەمەوە، لە دەرکێوە سەرەتاتکێکی دەکەم: چاخانەیە. لە سەکۆیەکانیڕا دیارە؛ تاریکە، بۆنی خاو و دۆی ترشاو و چای کولاّوی لە ژوورێوەڕا دێت. هەمدیس بانگ دەکەمەوە. دەچمە ژوورێ. لە ناوەڕاستی ژوورە تاریکەکەی رادەوەستم. لەو سەری لای رۆژهەلاّتێ ژوورەکەیەوە دەرکێك بەرامبەر پەنجەرێکی تاریك هەیە دەچتەوە سەردیوی ماڵێ، ئەمجارەیان بەدەنگێکی فەرماناوییەوە چەند جارێکان بانگ دێڵم ((ئەوە کەسی لێ نییە؟... چایەك... شتێك، هیچتان نییە بیخۆین؟)) وەلاّمێك نابیسم، بەلاّم گوێم لە دەنگێکی زۆر خۆشی کچێکە گۆرانییان دەڵێ: ((خۆ تۆ خۆت فەرمووت من بێوەفانیم- بێوەفاییەکەت بەچاوی خۆم دیم...)) و بەو شووڵەی کە بەدەستمەوەیە چەند تاڵە موویەکی کە بەشەرواڵەکەمەوە نووساوە دەتەکێنم، کە لەپڕ هات هاوار و قیژەیەك مێشکم پڕ دەکات، و سەرم دەگێژەوە دەچێ... دڵم دادەخورپێ- وەك دەنگەکە زۆر ئاشنا بێت... دیاربوو کە تەنیایە... دڵم لەرزی، نەمزانی بۆ... ئەو دەنگە

ژێیەکانی گیانمی هەژاند، کە زۆر دەمێك بوو نەهەژابوون و لەبیرم چووبوونەوە: ((ئۆف، ئەگەر بزانی من بۆ تۆ چۆنم- سەد کوورەی ئاگرها لە دەروونم!)) تارماییە ژنە جحێڵەکی لە دەرکێرا دەبینم، مندالّ بە باوەشێوە، شتێکی گوت، وەك تێیگەیبم گوتی: ((دەردیشمان هەبێ نایدەینە یەکی وەك تۆ!)) ژنە، لە دواییدا، هەروەك تارماییەکی دیبێ زەردهەڵگەڕا، تێکچوو، کشایەوە، هەروەك مندالّێکی شیرەخۆرە کە شەوە (ئالّ)ی دیبێ- هەروەك دەحەکایەتاندا دەیگێڕنەوە- و بیەوێ لە چنگانی هەڵێ و نەتوانێ- بە روخسارێکی زۆر ترساوەوە، لە ترسی ئەوەی کە شەوەکە لە پشتەوەڕا لەسەری دەدا... سپێنکەی چاوەکانی دەبینم... نەفرەت و توڕەییشی هەروەتر...

کچە تیوەگێلە!... راستیان گوتووە کە نابێ پشت بەوەفای ژنان ببەسترێ. ئەقلّیان دەچاویاندایە: ئەگەر لەبەرچاوانی، ئەوە لەبەر دلاّنی، دەنا... وەرە سەیری من کە، بۆی ببوومە سۆفی و پرسەم بۆ ئەو پەتیارەی داگرتبوو- کچە کرمانجەی کۆلاّن گەڕە... ئەویش هەڵیخەڵەتاندم و دەستی دەزاخی نام!... ئەو هەموو یادە و پاکی و ساکارییە رواڵەتیانەو ئەو هەموو دوو روویی و تەڵەکەبازییە! تف لە چارەت، ژن! دیسانەوە هەڵیخەڵەتاندمەوە، گەرمییەکی دە روخساریدا بەدی دەکەمەوە...

وێنەکان بەخێرایی بەدوای یەکدا دێنەوە... دلّم ترپە ترپ لێدەدا، وەك رەنگم پەڕیبێتەوە... سەرلێوەکانم ئارەقەیان دەرداوە... نازانم- دەگەلّ هەموو ئەمانەشدا لە تەواوی ئەو ماوەی لێك دابڕانەماندا شتێکم دەناخ و دلّ و دەروونیدا هەڵدەستا و بەرگری لەو دەکرد و هەمیشە دەگەلّ روخساری ویدا بوو- ئەمجارەیان بە پێچەوانەی هەمیشە غەمباری و دلّگیرییەوە، وەك ئەو رۆژەی کە لەسەرکانییە هاتبۆوە و ژنە قەرەج بەختی بۆ گرتبۆوە سادەبوو، هەروەك سادەییە، کێو و جەنگەلّ و روبار و سەرچاوەکان. بەلاّم دەگەلّ هەموو ئەمانەشدا پێچراوە و داخراو و خەیالّ خۆش، هەروەك هەموو شتە سادە و سروشتییەکان. بیری نەنوسراوی یاسایەکی تایبەت بەخۆی هەبوو، وەك مێشکی کێوەکان، کە تا پایز دێت ئەوە برۆیان تێك دەنێن، گیاو گوڵێ لەخۆ دەتەکێنن و پێستی تازە دەردەکەنەوە بۆ سەرمایە؛ هەروەك جەنگەلێ کە بەر لە لافاو هاتنێ ئەو هەست دەکا؛ یا وەك سەرچاوەی روونی کانیاوێ کە بۆنی بەهارێ لە درزی عەبای زستانێڕا دەکات و قاقا و قوڵپە قولپ و خوڕەخوڕی خۆی هەڵدەرژێنێتە دەرێ... وێنەکان



دێن... دلّم لێدەدا... سەرم دەگێژەوە دێ... خێراییە سوڕانێ وێنەکان، سەری دەگێژەوە هێناوم... ئەوی دەناسم... سادەبوو، سادە و سادەیی خۆشدەویست. خوشکە چکۆلّەکەم هەر گڕوویەکی گرتبایە و هەر بیانووێکی هەیبایە هەر کە زەردەخەنەیەکی وی دەدیت هەموو شتێکی لەبیر دەچۆوە و باوەشی دەگرتەوە و بەڕقی دایکییەوە بەدەست راوەشاندن و خۆڕانانێوە خۆی دەباوەشێ داویشت. لە کۆشێی نەدەهاتەوە دەرێ- ئەویش وەك جووجەلاّن دەیدۆزی.

((دەك خوا بتکوژێ کچێ! دەستیان دە ملی یەکتریش کردووە!)) ئەوەش قسەی تووڕەبوونێ خانمێ بوو... وێنەکان هەموو وەك بروسکە دێنەوە... و سەرم کاسەی دێ- وێنەکان رێی تێڕامانێ نادەن...

بە سەختی نارەحەت و دلّگیر بوو. قسەکانی ژنە قەرەجێی وا لە مێشکی چەقیبوو بەهیچ شتێکی لەمێشکی نەدەهاتەوە دەرێ. هەر بیرێکی چووبایە دەمێشکییەوە هاتنەوەدەری نەبوو، وەك ئەوەی وابوو هەزار پێیەکی کە دەچتە دەناو گوێیانەوە تۆ بە مقاشی لەپەردەی گوێی بکەیەوە... لەپڕ دە ورووژا و غەم دایدەگرت، لەپێشدا هەرچیەکم لێدەپرسی کە چ دەلّێ نەیدەگوت. هەردەیگوت ((هیچ))و وەك مندالاّن دەستی گرمۆلّە دەکرد و بۆ زاری دەبردەوە. و پێکەنینەکەی نەدەما...

پیرێژنی بەخت گرەوە وەك هەموو پیرێژنە بەخت گرەوەکانی دی پێی گوتبوو کە بەختی چاکە و ئەو سالّ نامرێ؛ حەز لە کوڕێکی دەکا؛ بەلاّم بەداخەوە کە ئەو کوڕە وەك پێویست دلّی بەوییەوە نییە. یانی دلّی پێوەیەتی، بەلاّم ئافرەتێکی رمووزنەی- کە لە باوەژنەکەی بەولاوەتر نەبوو- چاو و برۆ رەشی لێو تەنك هەمیشە خەریکی نوشتە و جادووانە لێی تا دلّی ئەو دلّدارانە لێك کات... دەبێ زۆر وریا بێت... هەوالّێکی ناخۆشی لە یارەوە پێدەگات... کە ئەگەر لە بیست و چەند سالّەییدا نەمرێ ئەوە سەد سالاّن دەژی... چاوی چاك نابینێ کە خەتەکانی نێو لەپی وە خوێنێ دەنا ئەوی هەبوو پێیدەگوت... ئەو قسانەی دەکردن و لێوە بچکۆلانە و جوانەکانی وێك دێنانەوە- هەر دەتگوت مندالّێکی گڕۆزە.

((کچێ بە خۆڕایی خۆت نارەحەت مەکە... ناماقوولّی فەرمووە! ئەو قسانە بۆ هەموو کەسێکی دەکەن!)).

((نا، ناماقوولّی نین... ئەوانە شتێکی هەر دەزانن... ئاگایان لە بەخت و چارەنووسی ئادەمیزادان هەیە...)).

((لەکوێرا دەزانن و ئاگایان لێیە؟)).

((ئاخر قەرەج بوو، قەرەج دەزانن... ئەگەر نەیزانیبایە نەیدەگوت...)).

((کە کوڕێك تۆی خۆشدەوێ؟)) سەیرێکم کردێ و پێکەنیم.

((نا، پێ مەکەنە- گاڵتەت پێ نەیە؛ دەیزانی!)).

((چی دەزانی؟)) بۆ خۆشت دەتزانی، هەموو کەسێك دەیزانێ... دەبڵێ نا، بڕۆ لەو کچەی کاکە رەحمانی بپرسە- ناماقوولّی کردووە!)).

((نا، وا مەڵێ، خراپە- مەڵێ ناماقوولّی کردووە- سەیری خەتەکانی کرد... درۆی نەدەکرد؛ سەیری کرد ئینجا گوتی)).

((چی دیت؟)).

((گوتی دەستت بێنە... گوتی: ئەم خەتەیانە...)) سەیرێکی دەستە جوانکیلەکانی خۆی کردەوە، بەروخسارێکی پڕ لە هێما و شکۆیەکەوە: ((ئا، ئەم خەتەیان هاتووە تا... تائێرە!)) و خەتی دەستی خۆی پێشاندا، هەروەك منداڵێکی کە هەڵلەق مەڵلەقێ دەگەڵە خۆیدا بکا... ((بەڵێ... تا ئێرە... ئالێرەدا ئیدی تەواو دەبێ)).

((چ تەواو دەبێ؟)).

((چووزانم، تەمەنم ئیدی!...)).

تووڕەبوو، لەپڕ فرمێسکی هاتنەخوارێ.

((باشە، دواییەکەی؟)).

((دواییەکەی ئیدی... هیچ)) و پڕمە پڕمی گریانێ.

((گوتی: ((هەك... بەمراد... هەك- بەمرادی خۆت دەگەی- هەك- ئیدی هیچی دی!)).



((باشە، خۆ ئەوە خراپ نییە... بەمرادی خۆت دەگەی!)) و پێدەکەنم... وێنەکان تێدەپەڕن و ئەو... دەگریە بەلاّم چۆن! بەلاّم هەر بەو کتوپڕیە، بێ ئەوەی بەخۆی بزانێ، جۆگەلەی لاوەتی و جوانییە لەماوەی چەند چرکەیەکدا هەموو ئەو نارەحەتی و ژاکانەی شوشتەوە و رایماڵی... بەلاّم ئەو پەڵەی بەمێشکییەوە نوسابوو هەرگیز لێبوونەوەی نەبوو، و جارجارەش سێبەری خۆی دەهاتنەوە سەر روخسار و چاوەکانی...

راستی و وێنەی نێو دەرگایەك، جووڵەی هەموو وێنەکانی ناو مێشکی راگرت... و ئێستا ئاوا! هەواڵێك لە یارەوە نەگەیشتەوە و بێ پرس و هەواڵ رۆی و تێپەڕی!.

ئەو دەناو دەرکێدا، منداڵ بە باوەشێوە، رەنگ پەڕیوە و لەرزۆك ومن لە هەموو شتێك خاڵی، و پڕ لە رق و کینە و تووڕەیی، ترس- توندی... نازانم، چەند ساتێك وەك دەنێو چنگاڵی ترس، ئالۆزی، تۆفاندا- راستییەکەی نازانم چ بوو، رەنگە بۆ خۆشی هەر نەیزانیبێ- دوایە پێستی دەموچاو و پێڵووەکانی، وەك هەرچی ئاوی ناو لەشی و گیانی کۆکردبێتەوە و دەجامی چاوەکانی کا... بەڕوونی نازانم کە من بۆخۆشم هەست و نەستم چۆن بوو، یا چیم گوتووە، هەرهێندەی دەزانم کە شەلاّڵی ئارەقەی بووم، چاوەکانم تارماییان بەسەرداهات- وەك تاو بردووان...

روخساری وی گەرمی و نەرمییان دەردا، رق و کینە و بێزی من بە هەوای وەربوو... خەندەیەکی نیوە مردووی لەسەرلێوان دەرکەوت... هەنگاوێك هاتە پێشێ... ئەوجا وەستایەوە... جووڵەیەکی کرد- وەك بترسێ. بە هەڵچوونەوە قیژاندم ((دارگوڵ!)) ئەو هیچی نەگوت، منیش زمانم لاڵ بوو و گیرا... دوایی سەیرم کرد وا رووبەڕوو بەرامبەریەك راوەستاوین و دیتم دەستێکی دە قەدی منداڵەکە وەرێناوە، ومن بۆن و بەرامەی قژ و روخساری ویم بە لووتیدا هەلاّ دەچێ و ئەویش چاوەکانی ناونەتە سەریەك.

ئەو کچەی کە بەدڵسۆزی و ئێش و ئازارەوە دەمویست دە ناخی دەروونی خۆمیدا بنێژم ئێستا ئەوەتا لەبەرامبەرم راوەستاوە و زرپ و زیندوو و ئامادە: دارگوڵ: بە گوڵە تۆزێك ژاکاوەکانیەوە کە دەبێ بێنەوە سەربارودۆخی تەڕ و پاراوی و رەنگ و بۆی جارانیان... سەرم دەسوڕا، چاوەکانم تارماییان بەسەردا دەهات، تەنیا قەپێلکی شتە دیارەکان نەبێ دەنا هیچم بە تەواوەتی نەدەدیت؛ گوێیەکانم هاشەهاشیان بوو و سەرم پڕی بێدەنگی و ژاوە ژاوی بێدەنگی

بوو- وەك تەپڵم دە کەللەیدا لێدەن... تەپڵ و دەنگی تەپڵ لێدان و ترپەی دڵم بوو، دەنێو قولاّیی دۆڵی سینەمدا چەرخی دەدا و بەنێو دالاٌنیٚ هەردوو گوێیەکانمدا دووبارە دەگەڕایەوە. تەنیا شتێکی کە وەبیرم مابێ ئەوەیە کە روخساری دارگوڵێ دەیەك دەمیدا چەند جارێکان گۆڕا: سپی بوو، زەرد هەڵگەڕا، داگیرسا، شین بۆوە، رەش داگەڕا- دەو دەمەیدا کە رەنگی لە رووان بڕابوو. چاوەکانی دەتگوت تایان لێهاتووە و وەك ئەستێرەی شەوی زستانێ سریوە سریویان بوو؛ سینگی وەك خالیگەی ئەسپێکی کە سوارتینی بۆ هێنابێ و تاوی دابێ خێراخێرا و بەردەوام هەڵدەچوو و دەنیشتەوە. دەمارە جوانەکانی لاملی بە پەلە هەڵیانداویشت. لێوی بە ددانەکانیەوە نوسابوو. لا لێوەکانی دەمی پێك داهێنان... چاوەکانی پڕ ترس بوون کە وردە وردە بە چاوەڕوانی و خۆشەویستییە، رام دەبوونەوە... هەرچۆنێکی بوو گوتم:

((دارگوڵ- ئەوەتۆی، خۆتی!؟ من لە ئاسمانێم دەویستی لەسەر عەردیم دیتییەوە!)).

راست نەمدەزانی چ دەڵێم یا هەستی چ دەکەم. کاتێ کە لەپڕ عیشقە ونبوو و ناکامەکەت دەبینییەوە هەست بەچی دەکەی؟ کاتێ کتوپڕ منداڵەکەت کە ماوەیەکی زۆرە رۆیوە و تۆش بە مردووی دادەنێی و هیوات بە گەڕانەوەی نەماوە بەرێکەوت کە دێتەوە و دەیبینییەوە هەست بەچی دەکەی؟ وشەکان، هەر ئەو وشە و بێژە سادە و ساکارانەی رۆژانەن —هەر هەون- هەویش نین؛ نرخ و بەهای ئەو وشە و بێژانە دەبارە سۆزدارییەکانیاندایە: دە هاژەی دەنگدانەوەکاندا، دەو هەستانەدا کە دەگەڵی تێکەڵاٌون، دەو پارچە دڵاٌنەی کە رەنگی وییان گرتووە، دە بۆنی شەپۆلی خوێنی جگەرانەدا کە لێی تێپەڕیون... دە گەردەلوول و تۆفانی سۆزدا... چووزانم، دە زۆرشتی دیدا، دەنا ئەو وشانە چ نرخ و بایەخێکیان نییە، و نووسینەوە و دووبارە کردنەوەشیان شتێکی سارد و سڕ و بێ رەنگ و رووە- وشە و بێژەکانیش پاشکۆی کات و شوێن و حاڵ و هەوای دڵاٌنن... دەستیم گرت، هیچی نەگوت. گوێم لە دەنگی ترپەی دڵی بوو. بەلێدانی دڵ وەلاٌمی لێدانی دڵیم دایەوە و هەستم بە بۆنی ئارەقەی روخسار و سەرلێو و هەنیای دەکرد... ئەوانەم دەدیتن و هەستم پێدەکردن... منداڵەکە کش و مات بوو: ئەوە کێیە وادەستی دایکی گرتووە و دە روویەوە راماوە؟ بەتاسەیەکی غەماوییەوە دەستیم گرتبوو و دەچاوە جوانەکانییەوە رامابووم و سەیرم دەکردن، رابوردوو و چارەنووس و ئازار و خۆشی و ناخۆشییەکانم دە چاوە گەورەو جوان و بێ بنەکانیدا دەدیتنەوە. لێوەکانی لێك ترازا بوونەوە. سەرەنجام هەناسێکی



هەڵکێشا، و ڕووی وەرگێڕا، و کەوتە هەنیسکی گریانێکی بەکوڵ... دەستم بەسەرشانەکانیدا هێنا بەلاٌم ئەو هەروا هەر دەگریا: دەنکە مروارییە سوێرەکانی فرمێسکی دە جامی دەمی دەکردم و تا تەرازووی دڵم تا دەهات قورستر دەبوو- و من نرخی ئەو هەموو دەنکە مرواریيانەم نەبوو بیدەم... منداڵەکەش دەیزانی کەمن لاوێکی دەست کورت و نەدارم، و بەخۆڕایی کانی گەوهەر و مرواری و مەرجان دەدەمەوە... رووی ترش کرد و لە بانگی گریانێی دا...

دارگوڵ وەخۆهاتەوە- منیش تێکەوە گلابووم... بێ ئیختیار بەرەولای سەکۆیەکەوە چووین- کەی؟ - نازانم؛ چۆن؟- هەر نازانم- بە تەك یەکەوە دانیشتبووین... هەستا و دەگەڵ منداڵەکەیدا رۆیی؛ گوتی منداڵەکەی دەداتە نەنکی و دێتەوە؛ منیش هەر هەستام و بەلای پەنجەرەکەوە چووم و دەستەسڕەکەمم دەرێنا... ئەو ساتانەی حەز و تاسە و دڵ سپارییە بێ چەند و چوونانە، کەمتر وایە دەژیاندا دووبارە ببنەوە کە ئادەمیزاد دەو ساتانەدا هەموو بوون و نەبوونی خۆی بداتە یەکی دی و هیچی لێوە چاو نەبێ.

ئەوە ئێستاکە تێیدەگەم و دەزانم کە ئەو ئاگرە چەند بەنرخ و مایە بووە کە ئەو هەموو لێك دابڕانە نەیتوانیوە بیکوژێنێتەوە هەربۆیەش دەگریم کە درەنگ تێیگەیشتم! پێشتریش هەستی ئەوەم کردبوو، دڵم ئەو بانگەوازەی پێ راگەیاندبووم. دایە گەورە راستی فەرموو بوو: دەیگوت: خودا دەپێشدا دڵی دروستکرد ئەوجا مێشك- و سەیرەکەش لەوەدایە هیچ کاتێ دڵم بە هەڵەی نەبردووم. دیسانەوە هەر بەقسەکەی دایە گەورە کە یەکەمین ((دەستکار))ی خودایە و ئەستەغفیروڵلاٌ و هەزار جاریش تۆبە، هەرگیز دەستکاری هەوەڵێ چاك دەرناچێ- هەروەك ئەو دەرگا و پەنجەرانەی دارتاش دروستیان دەکا کە ئەگەر یەکەمجار چاك دەرچوو ئەوە دەرچوو، دەنا قەزا و قەدەرە و هیچی دی- بەلاٌم دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هەر ئەو دڵە بانگەوازەکانی زۆر بەجێن هەر دەگەڵ یەکەمین چاوپێکەوتنێ ئەو نیشانەکانی دۆستایەتی، یا دوژمنایەتییە بە ئادەمیزادی دەڵێ و من هەستی ئەو دۆستایەتی و دوژمنایەتییەم کردبوو. ئەوەتا ئێستا ئەو ئاگرە ئەو زمانەیەی کێشاوە و بڵێسەی لێهەستاوەتەوە و هەموو گیانمی داگرتۆتەوە- ئەوەتا تازە بەتازە بە گەورەییە ئەو ئاگرەی دەزانم. راستیان گوتووە، جودایی بایەکە ئاگری پەرت و بلاٌو دەکوژێنێتەوە بەلاٌم ئاگری گەورە خۆش دەکا...

هەردەگەڵ دیتنێی یادی رابردوو، رابردووی نەچەندان دوور، هەروەك شەپۆلی وێنە رادێوییەکان، بە گورجی لە دوورەوەڕا سەریان دە دووی یەك ناو کۆمەڵ کۆمەڵ گەورە و بچوك هەموو هاتنەوە و ئاوێتەی یەك بوونەوە و وێنەکەیان تەواو کردەوە: خۆم بووم... ئێمە بووین... ماڵێ مە- و دارگوڵ ئێستاش ئەو و من و مندالّەکەی، هەرسێکمان لە کەناری داستانێکەوە بووین کە هەرسێکمانی پێکەوە هێنابووە ئەم چایخانەیە و پەلکێشی ئێرەی کردبووین. بەسەرهاتەکە ئی دوو ساڵ پێش ئێستا بوو، کە وەك سەدساڵ بێ وابوو... ساڵی دووەمی زانکۆم بوو؛ بۆ پشووی هاوینێ هاتبوومەوە ماڵێ. دایکێك نەبوو کە بەسەری قۆتی و بە پێخواستی بەرەو پیرمەوە بێت، خوشکێك نەبوو، هەر کە سەر و کەللەم لە پەنجەرەیڕا بەدی بکا، بەڕوویەکی شاد و گەش و خەندانەوە تیك و درووەمانەکەی فڕێدات و بەپەلە بە قۆڵ راوەشاندنێوە بە کۆلاّناندا راکات و دەستیم دەگەردنێ کات و لە خۆشیان هەڵداتە گریانێ و بۆنی مێخەك بەندەکەیم بەسەر سەروچاواندا بپژێنێ... دەگەڵ ئەوانەشدا ماڵەکە سەیر گۆڕابوو. بابە کچێکی، یا بە واتای باوەژنەکە ئاوردووێکی هێنابۆوە ماڵێ: کچێکی باریکەڵە، دەم بە پێکەنین، قەرەباڵغ و هەر بەواتای باوەژنێ ((بێ شەرم، حەکەدار کە هەر بە عالەمی ئاشکرا سواری کوڕان دەبوو!)) ئەگەر پێنەکەنیبایە دەگریا. پێکەنینەکەی پێکەنین بوو نەك گاڵتە- هەر لەخۆی دەهات؛ گریانەکەی لە دەست باوەژنێ بوو ((زمان درێژی سۆزانی)) ئەوە خۆشترین قسەی خانمێ بوو کە پێی دەگوت. کە پێدەکەنی وەك یەك ریز زەنگوڵە دەتریقایەوە؛ ئەوجا وەك دە دڵی خۆیدا شەرم بیگرێ دەستی گرمۆڵە دەکرد و دەدەمی خۆی دەنا و دەردەپەڕیە دەرێ و دەکولاّ. ((وای تۆ نازانی چ ئاگر تێبەر بووێکە! ماڵەکەی وەسەرخۆگێڕاوە، ئەو حەکەدارە!)) و ئەویش بێ هیچ گوێدانە خانمێ هەروا پێدەکەنی- وردیلە، و گەرموگوڕ. بە واتای خانمێ تا ئێستا کەسی بەلچکە سەرپۆشەکەی خۆی دانەدەنا، ئاغا هێندەی رووداوویە! وادەبوو لاسای توڕەبوونێ ((ئاغا))ی دەکردەوە، وەك ئەوەی کە پاروەوە نانێکی دەگەروێدا گیربووە و بۆی ناچتە خوارێ. کچە دەهاتەوە و بەبێ شەرمییەوە کە هەر لەخۆی دەهات دەیگوت: ((باشە خانم، مەگەر چم کردووە!... چبکەم بەدەست خۆم نییە، پێکەنین دەمگرێ!)) و ((هی هی هی هی، و کر کر کر کر!)) و نزم دەبۆوە، و چاوەکانی رەنگیان دەگۆڕا، و پێڵووەکانی دەکەوتنە پەلە، و ددانە سپییەکانی دەبریسکانەوە، و گەردنی دەکەوتە هەڵسوڕان و داسوڕانێ... سەیر و سەمەرەیەك بوو؛ دەنگی تریقانەوەی هەر دەتگوت تریقانەوەی منداڵێکی تازە زمان پژاوە ماڵی پڕکردبوو،



ئیدی ئەو بێدەنگی و تاریکییەی ماڵێ نەمابوو. هەرکە، بابەی دەدیت دەتریقایەوە و هەرکە، بابەش گوێی لە تریقانەوەی وی بایە سوور دەبۆوە و ددانە زێرەکانی دەبریسکانەوە و چاوەکانی پڕ دەبوون لە زەردەخەنە. ئێستا ئیدی بانگ و هاوارێ بابەی لەو دوو سێ هاوار و بانگانە زیاتر نەبوو: ((چایەکی تێکەن دارگوڵ بیهێنێ!)) یا ((بەسە ئیدی! ئەوە بە چ پێدەکەنی؟)) گوایە نارەحەتی ئەوەیە کە بۆ ئەویش هاوبەشییە ئەو پێکەنینەی نییە، هەرچەندە ئێمەش — من و بابە- لە ژوورەکەی خۆمانەوە دوورا و دوور درێغیمان لەو هاوبەشییەی نەدەکرد- ئەمەش کاتێك بوو کە کچەتیو تەنانەت باوەژنەکەشی دێنایە پێکەنین. یا ((چییە. ئەو منداڵە بۆ دەگریە، چتان بەسەریەوەیەتی!)) ئەو منداڵە دارگوڵ بوو، و ئەو کاتانە بوو کە باوەژنەکە بە قسەی نابەجێی تفت و تاڵ و ناخۆش دەیگریاند. باوەژنە چەقوت لێدابایە خوێنی لێنەدەهات: ((ئمم، منداڵ! هەر لە ئێستاوە بەرگەی گروبانێکی دەگرێ... منداڵ! غەمت نەبێ، هەر ئەوڕۆ و سبەیەکە منداڵێکت بۆ قوت دەکاتەوە ئەودەمی تۆش بە سەلامەتی بۆی گەورەکەی! هەستە راستبەوە گۆزەکەت تاودەیە و بڕۆ لەکانییەی پڕکە- ئاوی ساردمان نییە. نەچی وەك ئێرە دانیشی و لەوێ بیکەیە حیلکەحیلکی پێکەنینێ... زوو وەرەوە... ئیدی نەچی تا نیوەڕۆیە نەیەوە!)).

بەلاّم بە قسەی باوەژنێ، ئێستا (ئێستا کە من هاتوومەوە) وەك رمووزنەی کە مووی لێ هەڵکوڕوزێنی پاش تاوێکی گۆزە بەشانەوە دەهاتەوە! گۆزەکەی لەسەرشانی دادەنا و بەشان و شەپیلکی تەڕەوە دەهاتەوە، هەر کە دەگەیشتەوە و نەدەگەیشتەوە ئیدی ئەوە پڕمە پڕمی پێکەنینێی دەست پێدەکردەوە- و هەمدیس ماڵەکە پڕ دەبۆوە لە پێکەنین و باوەژنە، بەخۆشی و ناخۆشییەوە لە ((رقان)) پێدەکەنی و دارگوڵ یەکپارچە دەبووە پشکۆی سوور، وەك منداڵاّن دەستی دەدەمیەوە دەنا- لەشەرمان؛ دووبارە پێدەکەنیەوە- دیسانەوەش هەر شەرم!.

بەیانیان لە هەمووان زووتر لە خەوێ رادەبوو. حەساری ئاوڕشێن دەکرد. کاتی گەسك دانێ گەسکە جەگەنیەکەی وا لە عەردی دەخشاند حەوت کۆلاّن بەولاوەترەوە گوێیان لە خشەخشێی بوو... بەلانی کەمەوە ئەو رۆژەی وابوو: بەیانی هاتنەوەی ئەوێ رۆژێم بە تەواوی نارەحەتییەوە لەو هەرا هەرا و خشەخشەی وەئاگا هاتم. لەجێیەکەم هاتمەدەرێ و لە پەنجەرەیڕا سەیرێکی

حەسارێم کرد، ویستم بزانم ئەو کەڵەبابە ناقۆڵایە کێیە بەو کەڕی بەیانییە وا ناقۆڵایە! ماندووبووم، دەمویست تا بەرەبەری لای نیوەڕۆیە هەڵنەستم.

دارگوڵ بوو. داهاتبۆوە و ئاوڕشێنی دەکرد و دەیماڵی، و لەبەرخۆشیەوە گۆرانی دەگوت. هەردوو سمتە خڕەکانی روو بەلای پەنجەرەکەی منەوە دەهەوا کردبوون... چ جوان بوو! پێم وابێ هەردەگەڵ یەك سوڕی کە بەکەمەر و گەسکەکەی دەستیدا روخسار و چاوەگەشەکانیم دیتن، و هەستم کرد هەڵسوکەوتی لە جاران نەرم و شل و لەسەرخۆ ترە. ماوەیەك هەروا بە سەیرکردنەوە دانیشتم؛ لەپڕ پشتی راستکردەوە، کە منی دیت وەك بپەشۆکێ: ((ئاغا چوکەڵە، لە خەویشم کردی؟)).

هەر لە هەمان شەوی هاتنەوێمەوە جارجارە بە گاڵتەوە و بەڕاشکاوی- بەگاڵتەوە- بەروخسارێکی راشکاوانەوە — هەر بە ئاغا چوکەڵەی بانگ دەکردم. بابە ((ئاغا)) بوو و جارجارەش ((بابە)) و جاری واش بۆ تووڕەکردنێ باوەژنەی بە ((باپیرە))ی بانگ دەکرد- و بابە لەخۆ دەبۆوە لە کەنووان و باوەژنە چاوی لێ دەچوقاند و کە، بابەش لەوێ نەبایە پڕی دەدایە: ((چیکڵدانەم دڕا، دیقم کرد بەدەست تۆوە!)).

دەمگوت: ((قەیدێ ناکا، پورێ منداڵە!)).

((هەی خودا تەمەن درێژت کا! تۆش ماشەڵڵا زۆر سادەی؛ ئەوە کوێی منداڵە؟ هەر لە ئێستاوە چاوەکانی دەڵێی هەزار چاویان دیوە و شەرم و حەیایان قوتداوە و تفاندویانەتەوە! بە هەموو کارێکی رادەگا کە دەگاتە منداڵەکانی من ئیدی ئەوە مەپرسە. ((سەگبابە کەس نازانێ لە کوێوەیڕا سەردەرێناوە، ئەوەتا بە ئاغای دەڵێ باپیرە! وای لە نەجابەت و حەوسەڵەی ئەو پیاوەش! من وا خەریکە شێت دەبم!)) من ئاغا چوکەڵە بووم و جاری وابوو بۆ شەیتانییە زیاتر، بانگی دەکردم بێچوولە. بەو لێوە جوان و وێك هێنراوانەیەوە، بێچوولە بێچوولە، هێندەی یەك بێچووە پشیلە... پیاو چ بڵێ! یەك دووجارانم چاو لێ سوور کردەوە و دڵی باوەژنەکەمم پێ دایەوە، بەڵام هەر دەروەستی نەهاتم: ((هی هی هی هی!)) بابەش لێی خۆش هاتبوو، و بەدوویەکدا دەیگوت: ((باشە بێچووە ئاغا!...)) و باوەژنەش گۆشەی سەرپۆشەکەی بە پێش دەمیەوە دەناو بە تەشەرەوە پێدەکەنی... ((خوا چاکە بۆ ئەو کەسەی نەکا کە ئەو پارووە نانەی بۆمە دیتەوە، تا دەیخۆین دڵ و دەروون و هەناومان گڕی تێبەردەبێت!)).



گوتی: (( لە خەوم کردی؟)). و بێ درەنگ بەدەنگێکی شەیتانانەوە درێژەیدایە: ((دەبوو، نەمزانی لە تارانێوەڕا هاتوون، و ماندوون!)) و پڕمەپڕمی پێکەنینە پەنگ خواردووەکەیم هاتەگوێ. گوتم: ((نا، هەستابووم، تۆ ئیشەکەی خۆت بکە کارت بەسەر منەوە نەبێ)).

گوتی: ((نا ئیدی تەواوم کرد!)) هەر بەو رووە خۆشەیەوە وەك بیەوێ بڵێ: ((تا لەدڵتدا ببێتەگرێ!)) گەسکەکەی هەڵدایە لایەکی و بە پلیکانەکانی هەیوانێدا وەسەرکەوت.

ئەوە دووەمجاری چاوپێك کەوتنێمان بوو. چاوپێك کەوتنی هەوەڵێ زۆر لەوەی سەیرتر بوو: چووبوومە سەرجێی، لە ماندووەتیان خەوم لێنەدەکەوت؛ سەرچەفەکەم بەسەر لاقەکانمدا هەڵکێشا بوو و ئانیشکم دادا بوو کتێبم دەخوێندەوە. هاتەژوورێ، سەرم بڵندکرد، و سەیرێکیم کرد- مەسینە و دەستشۆری دەگەڵە خۆی هێنا بوون. هەر بەوچاوە شەیتانیانەیەوە کە زەردەخەنەیان تێدا سەمای دەکرد و بەڵام تا ئەودەمی پێشانی نەدابوو بۆچی هاتووە گوتی: ((ئاغا چوکەڵە!)).

بەترش و تاڵییەکەوە گوتم: ((ها! چتدەوێ؟)).

((هیچ مەسینە و دەستشۆرم هێناون)).

((مەسینە و دەستشۆر! من عادەتم نییە پێش نوستنێ دەست و چاوان بشۆم)).

((وەی، عادەتت نییە!)) و هەمدیس پێکەنین ((هی هی هی هی!)).

چاوێکم بە روخساری جوان و پڕ تەشەریدا خشاند و خۆشم زۆر بە ئالۆزییەوە دیت. ئاغا چوکەڵە، بێچووە ئاغا! گوتم: ((باشە، کە هەر هێناوتە دەیانشۆم- هەرچەندە عادەتیشم نییە...)).

گوتی: ((دەمزانی عادەتت نییە... گوتم رەنگە دڵت ژانێ بکا... ئاخر، دوور لە گیانت، وەك مریشکی جووجکە مردوو، دامابووی...)) و دەستی بۆ دەمیەوە چوو، رووە جوانکیلەکەی سوورهەڵگەڕا. پێکەنین لە دەرکێی دابۆوە و دەرکی ماڵێ سینگ و زگە جوانەکەی وەشەپۆلانی خستبوو... خۆمم گرژ کرد، و پێکەنینیشم دەهاتێ.

گوتی: ((ئاغا چوکەڵە، ئەوە بۆ وانارەحەت بووی!)) و لەفلقەی پێکەنینێدا، و مەسینە و دەستشۆرەکەی هەڵگرتنەوە و لێیدا ڕۆیی...

بەیانیان ئەرکی مەسینە و دەستشۆر بردنیێ ژووری بابەی و ئاو بەدەست داکردنی لەملەوی بوو. نەمدەزانی ئەو جەفەنگانەی کە دەگەڵ منی لێدەدان، دەگەڵ بابەشی لێدەدان یان نا. بەڵام بگۆ و مگۆیەکی کە لە ژووری بابەیرا دەهات و پێکەنین و ناقایلیە بابەی و تورە بوونیێ باوەژنیێ و درێژییە ماوەی ئاو بەدەست داکردنیێ دیاربوو لەوێش هەواڵ و باسێك هەیە.

دەگەڵ مندا هەمیشە وابوو- جاری وابوو هێندەم رق هەڵدەستا کە دەمگوت جارێکی دی نایەڵم پیێ دەدیوی ژوورەکەم نێتەوە، بەڵام دوای نیو سەعاتێکی، یا کەمێك زیاتر، بڕیارەکەم هەڵوەشابۆوە: هەر بەیەك زەردەخەنەی، دەهاتمەوە سەربای بەڕیێ: ئاخر نەمدەزانی ئەڵقەی ئەو زنجیرە جوولە و پێکەنینانەی لە کوێوە ئێمەی وا لێك گرێدا بوو. داستانی ئۆدیسەم وەبیر دەهاتەوە، کاتیێ کە چووە دە کەشتییەکەوە بە ئاواڵەکانی گوت لۆکەی دەگوێی خۆیان نێن نەکو قاقا و بانگ و ئاوازی کچانی دەریایە فریویان بدەن و لە تاوانیان خۆ بە دەریایە دادەن. ئەو داستانە نەدەبوو ئەفسانە بایە.

دارگوڵ یەکێك بوو لەو کچانە کە من هەرچەندە زیاترم گوێی خۆم لیێ دەئاخنی هۆشم دەنگی ژنانە و پێکەنینە مەستانەکەی زیاتر دەبیست و دڵم زیاتری لێدەدا... ئێستام دنیا بە جۆرێکی دی دەدیت: ڕەنگین، شاد، پڕ لە ئاوازی گۆرانی و مۆسیقا...

بەڵیێ، واتورە دەبووم دەمگوت جارێکی دی هەرگیز ئیدی نایەڵم ئاوم بەدەستیدا کات... سەرەتا وەك منداڵی بنیادەمان زۆر ماقولانەی ئاوەکە پێدا دەکرد، بەڵام هەر سابوونم لە دەموچاوم دەدا دەستی پێدەکردەوە و مەنجەڵی پێکەنینێی وەجۆش دەهاتەوە و لەش و لارو کەمەر و هەموو گیانی وەك خیزەڵێنیێ دەم چۆمی بەهاریێ دەکەوتە جوولە و شەپۆلان و لوولەی مەسینەکەی دەسینگ و بەرۆك و لامليێ دەکردم و بۆ خۆشی لە کەنووان لەولاوە دەکەوت و دەستی بەسەر دڵیەوە دەنا، ئەوە منیش بە دەموچاوی کەفاوییەوە، وەك کوێران دەستم راداشتووە و هاهامە- لە ساردییە ئاوەکەی- و ئەویش هەروا کەمێك بەولاوترەوە، دوور لە دەست وێڕاگەیشتنێی لە تك و تاسەوە چووە: مەسینەکەی بەلارییەوە بە فەرشەکەی هەڵپەساردەوە، دەگەڵەوەشدا وریابوو تەنانەت نەیدەهێشت یەك دڵۆپە ئاو چییە بە فەرشەکاندا



بڕژیێ! تورە دەبووم و ئەو لەپڕ دەنگی پێکەنینەکەی دەبڕی و هەڵدەستایەوە سەرپیێ و بە دەنگە تۆرانێکەوە دەیگوت: ((چبکەم، دەستم لەرزی... بەدەستەخۆم نەبوو، بە ئانقەستم وانەکردووە!)) وەکو منداڵان لچ و لێوی خۆی تێك دەنا، کەچی پێکەنینیشی دەچاو و روخساریدا شەپۆلی دەدا... و دووبارە وەك منداڵی بنیادەمان ئاوەکەی پێدا دەکردەوە و دەگەڵ پێداکردنەوێشیدا دووبارە هێندەی شەیتانیی دەکردەوە خەریك دەبوو شێت بم. بۆ ئەوەی گەمەکەش بەردەوام بیێ دەمگوتەوە پێیداکە... جارێکیان هەربەدەم ئەو ڕەفتارانەیەوە لوولەی مەسینەکەی راست دەپزووی پانتۆڵی بێجامەکەی کردم، لەجێی خۆم دەرپەڕیم؛ دارگوڵ، بەواتای باوەژنیێ، حیلکەحیلك، کە لەبەر پێکەنینیێ سەری بەرەو دواوە بردبۆوە هەڵات و لێم دوورکەوتەوە، باوەژنەکە لە دواوە ئاگای لە هەموو ئەو سەین و بەینانە بوو لە فلقەی پێکەنینێیدا. ئاورم گرت و شیڕاندم: ((ئیدی ئەو زمان درێژە سەگبابەی نەنێرن ئاوم دە دەستی کا؛ نامەویێ کەس ئاوم بەدەستی داکا؛ بۆ خۆم پێیدا دەکەم!)).

گوتی: ((ماشەڵڵا! ئاغا لە تارانێرا هاتۆتەوە... زمان درێژی سەگباب!)) و هەر بەڕاستی روخساری تێکچوو، من لەسەر قاوەڵتیە بەیانی بەتەواوی پەژێوان بوومەوە، بەڵام پۆزش هێنانەوە و داوای لێبوردن لە کارەکەر و خزمەتکاری ماڵیێ دەناوەمەدا باونەبوو.

ئەوەش بڵێم کە ڕەفتار و هەڵسوکەوتی هیچ بە ڕەفتار و هەڵسوکەوتی کارەکەران نەدەچوو کە دەگەڵ هاتنە ژوورێیاندا جاریێ لە پێش هەموو شتێکیدا لەبەر و دەرکە و تاق و تاقچانیان دەڕوانی و وەك دەڵێن لەپێشدایان سلاو لە تاقەکان دەکرد... بیری بەلای ئەو شتانەوە نەبوو؛ ئێمەش ئەومان بەچاوی کارەکەر سەیر نەدەکرد- بەواتای باوەژنیێ، کابانی راستییە ماڵیێ ئەوبوو: کە هەمووی وەکەڵ هێنابوون- و سەیرەکەشی لەوەدابوو کە هەردەو ماوەکەمەیدا هەرچی بێژە و وشە و شێوەزاری لادێیە بە تەواوی هەمووی دانابوو و لەبیرخۆی بردبوونەوە و ئەو چەندانەشی کە لەبیر نەچووبوونەوە هێندەی بەخۆشی و شیرینی بەکاردەهێنان هەرزوو دەچوونە دەدڵانەوە. هاتنیێ ئەوکچەی بۆ ماڵیێ ماڵەکەی سەر لەبەر گۆڕیبوو: نەك وەکو داگیرکەرێکی کە بە زۆرییە یاسا و بڕیاران فەرمانڕەواییە بکات و خەڵکی لە ترسی گیانی خۆیان مل بۆ فەرمانەکانی راکێشن. نا، جۆرێك بوو کە هەر دەتگوت ((شەنگەبی)) یەك شەوەیە و ئاوەدانی و خۆشەویستی دە حەسارە و وشك و برینگە سووتاوەکەی بەر ڕۆژیێ

تەخشان و پەخشان کردووە و جۆ و جوێباری دەبەرپێی خۆیدا هەڵبەستووە و مەل و باڵندەکانی لە خۆی وەکۆ کردوون. سێبەرەکەی بەتام و چێژدار و جێ خەوی خۆشبوو؛ دەنگی شنەشنی شەماڵی نێو بسکەکانی مرۆیان مەست دەکرد؛ ناڵە و جریوە و جووکەی مەلە وردیلەکانی نێوان لق و پۆپ و گەڵا و گوڵەکانی هەردەتگوت مۆسیقایە، و خودی شەنگەبیش شۆخ و شەنگ، بەردەوام دە هەڵچوون و داچووندا بوو، سەرپۆشی وا و وا بەخۆدا دەدا و لایدەبردەوە و بەناز سەری بادەدایەوە و بسکەکانی دادێنان. تەنیا باوەژنەکە نەبێ کە هەروا لەخۆوە بەچاوی هەوێ سەیری دەکرد دەنا هەموومان ئەو هەڵسوکەوتە منداڵانە و تەواو ژنانەی ویمان ستایش دەکرد و پێمان خۆشبوو- بابە لە هەمووان زیاتر، و منیش لەو زیاتر... هەرتەنیا ئەلفێکی ئەوکچەی بەس بوو کە کەشوهەوای ماڵێ بە تەواوی بگۆڕێ.

پێش ئەمە ماڵ جێی تێدا ژیانێ نەبوو؛ پێشکە و مێشوولە حەشریان دەکرد، بۆن بۆگەنیوی چۆمی هەراسانی بە خەڵکی نەهێشتبوو. بەڵام ئێستا هەر ئەوچۆم و ئاوە ڕەنگوبۆیەکی دیکەیان بەخۆوە گرتبوو؛ دەنگوئاوازی گریە و سەدا کاکە ڕەحمانی قەپاندار، کە کوێرببوو و شەو و ڕۆژگاری هەر خوێندنەوەی ئایاتی ناکامی و غەم و ناخۆشی بوو و ئەو سەرەوسەری دەرو کۆلانێی پڕکردبوو، ئێستا نە تەنها هەر ناکام و غەماوی و ناخۆش نەبوو بەڵکە هەر ببووە مۆسیقا و ساز و ئاوازێکی تا بلێی ئارام بەخش و پڕ هیواو ئومێد...

ماڵەکەش هەوای خۆی تێگەڕابۆوە: بۆنخۆش، پڕ ئاواز، سووکەڵە، سەمائاسا، و سادە وەك زەردەخەنە، و لە گوێیان خۆش وەك قاو و قیژی نەوەیەك دەپەردەی گوێی باپیرەدا، و جوان وەك ((گاگۆڵکە))ی منداڵێکی سەری بڵند کردبێتەوە و بەدووچاوی پڕ لە پاکییەوە بەرەو رووت پەلەی بێ و لەبەردەمت هەڵوەستێوتێتەوە رامێنێ، تا هەڵیگری و لە باوەشێی کەی.

ئەو ناوەی ماڵێ بەو ماڵانە دەچوو کە ژنی ماڵێ دوای بوونی ئەو هەموو کوڕە یەك بەدوای یەکاندا هاتبێ و خوا کچۆڵەیەکی رووخۆش و گەشی پێ بەخشیبن و کچە زمانی پژابێ و پێکەنینی بە لێوانەوە بێ. بابە، تەنانەت منداڵە بچکۆلەکان- و منیش- هەر خۆشەویستییەکی هەمان بوو هەمووومان بەوی بەخشیبوو و کەس نەیدەوێرا پەنجەی لێدا دەنا دنیایان خراپ دەکرد، و سەیریش ئەوەبوو- بەلای باوەژنەکەوە- چەندی بڕێژرابایە و بپێژرابایە ئیدی ئەوە خودا هەر زیاتری دەکرد و دەیباراند. ئەو حەکەدارە چییە مۆری ماری پێیە یا قوزە



کەمتیار! دووریش نەبوو، کێ چووزانێ؛ ڕەنگە قەرەجیش بووبێ، ئاخر ئەو لە دەوروبەری لای سەردەشتێوە هاتبوو. تەنانەت باوەژنەکە دەستە و دامانی سەید فەخرەدین ببوو تا ئەوی بۆ لەپێش چاوی بابەی ڕەش کاو ناردبووی ((نوشتە))ی بۆ بکا، کە ئەویش (سەید فەخرەدین) گوتبووی با نوشتەکەی دە ئاوێ هەڵکێشێ و ئاوەکەی بداتە بابەی و بیخواتەوە. مەرەکەبی نوشتەکەی دە ئاوەکەیدا دەتوێتەوە و ئەوێ ڕۆژێ ئەوەی لەکن خودای ناخۆشە باوەژنە لە بابەی دەبیسێ. ئەڵبەتە سەید فەخرەدین گوتبووی- هەر لە هەوەڵێوە گوتبووی- کە مەرەکەبی تەواو بووە و مەرەکەبیش کە توایەوە نوشتەکە بەتاڵ دەبێتەوە، بەڵام ئەو هەر پێی داگرتبوو کە دەبێ هەر بە مەرەکەبێی بۆ بنوسێ- بە مەرەکەبیش لەوەی چاتر دەرنایە. با بۆ جارێکی دیکە بێ... ئینشاڵڵا ئەودەمی بە مەرەکەبی چینی دەینوسێ و وای ڕەش دەکا کە بە هیممەت و بەرەکەتی ئەولیایان قولە زەنگی لە چاوەوی کافوری حەڵەبێ بێ... بەڵام نا، دیارە کە ((قوزە کەمتیاری پێیە!)) ئەو خۆگرژومۆن کردن و سەر و چاوتێکنانانەی باوەژنێ هەر دەتگوت وردە تۆز و خۆڵە کە بە دەریاچەیەکییەوە وەرکەن: ئەو کچەتیوە هێندەی جوانی و شۆڕ و جووڵە و چالاکی پێوەبوو تۆز و خۆڵ و گەرد و خاشاکی پێ نەدەوێرا. نازانم چۆنا و چۆنی باسکەم. نەمامی دار هەڵوژەت دیوە، کە تازە چرۆیان دەردەکا- سپی، بۆنخۆش، بالارێك، کە لەدەمی هەزاران غونچەوە گولاوێ دەپژێنێ؟ غونچەی سوورە گوڵێت دیوە کە چۆن بە پێکەنینەوە دەم دەکاتەوە و دڵۆپە شەونمێ لەجێی فرمێسکێ دادەنێ؟ نێرگزت دیوە کە چۆن لە ئاوێنەی جۆگەلە ئاوی بەردەمییەوە سەیری چاوەکانی خۆی دەکات و وا لە ئاوەکەی دەگەیەنێ کە سەیری وی دەکا؟ یا وە نەوشەت دیوە لەبن پەرژینی باغییەوە شەیتانانە تێت دەڕوانێ و هەر کە تۆش سەیرت کردەوە، لەجێی خۆیەوە دەپووکێتەوە؟ ئەمانە و دەیان گوڵی دیکە بەهەست و نەست و شۆڕ و تاسەوە بە دارەگوڵی وییەوە لکابوون و ((دارگوڵ))یان لێ دروست ببوو.

بابە، جاری وابوو بە ((دارەگوڵ))ی بانگ دەکرد، یانی کیژەگوڵ- و ئەم وشەیە کە لە بانگ کردنێدا بۆ کچۆڵەی خۆشەویستی ماڵێی بەکاردێنن. درەختی گوڵ بوو، خوشکی گوڵ بوو؛ نەمامی بالای تازە غونچەی کردبوو؛ هەوەڵین بەهاری بوو- و گوڵەکانی نیوە پشکوتوو و نیوە هەر غونچە- وای لەو ڕۆژەی کە هەموویان دەپشکوون... هەرچەندە، نا... نا! ئاوای ئێستای جوانترە: پشکوتوو و نەپشکوتوو؛ گەورە و بچووك، گەیو و نەگەیو، کچ و ژن- ئاوا جوانترە؛ ئاوا بەتامترە، تامی میوەیەکی وا لەبن ددانان بەجێ دەهێڵێ هەرگیز ئەو تامە لە زاران

نەبڕێ؛ و هەمیشە لەبیر و خەیاڵ و هەست و نەستاندا وەمێنێ: لێو گەزۆی شیرینە... گوڵەکان سەریان دەرێناوە، هەر بەلێوان دەتوێنەوە و نامێنن...

جموجۆڵی بە ئی ئەو ناوە ناچێ. بە جانەوەرێکی کێوی دەچێ کە هەر جارێك، دە تەرەکە بوونێیدا رێی دەشاری کەوتبێ، و نەزانێ شار چییە، و شار رێکوپێکی و سیستەمێکی تایبەت بەخۆی هەیە و نەزانێ کە لە شاریدا حەوانەوە و گوزەران نییە- چونکە هەموو پێستی خۆیان گۆڕیوە. لە کێوی، گیانلەبەر دوژمنەکەی خۆی دەناسێتەوە، ئاسك گورگی دەناسێتەوە، مەل و باڵندە واشە و باشووی دەناسنەوە... لەشاری، گورگەکانیش هەر مەڕن و رێویەکانیش هەر هەموویان دەست بەسینگەوە سڵاو لە کەڵەباب و مریشکان دەکەن، و پشیلەکان خڕ تۆبەکارن...

لە شاری بوو، بەڵام نەببووە شاری، لە کێوی نەبوو، بەڵام هەموو رواڵەتەکانی کێویانە بوو، چونکە خۆی بە شاری نەدەزانی. ئازادییە کێو و بەندەنانی هەر پاراست بوو. چەند ناخۆش و ناسازە کە ئەگەر بێی و ئەم جوانییە کێویلەی بە چەقوو و چەنگاڵ و مێز و چەند فەخفووری و پەشتەماڵی سەرکۆشی بگۆڕیەوە؛ و لەسەرمێزێکی دانێی و جووڵە و هەڵسوکەوت و رەفتاری بۆ دیاری کەی و ئازادی رەفتارە سروشتییەکەی لێ بستێنییەوە، ئەوە گوایە بەو نیازەی لە باغچەی ئاژەڵی ماڵێدا پێکەوە دەژین، و پێتوابێ کە ژیانێکی سروشتیانەی خودی خۆیت بۆ هێناوەتە دی... گیایەکی کێویلە و خۆڕسك بوو- کێوی بوو، چونکە سروشتی بوو؛ هەموو شتێکی کێوی سروشتییە... هەموو شتێکی سروستیش جوانە، هەر لەو کێڵگە دوورانەوە بگرە تا ئەو شوور و بێچوە ژیژکانە، یا تا ئەو بێچووە گورگانە، یا ئەو کێو و ئەو بیابانانە... هەموویان جوانن، چونکە سروشتین. هەر بەیەك سەرنج دیاربوو کە لەو ناوەی خۆیان دوورکەوتۆتەوە... وەك دە دنیایەکی دیکە دابێ، دنیایەکی دوور لە دەست پێڕاگەیشتنێ و دنیایەکی جوان. لە ژوورەکەمەوە دەنگی ئاوازەکەیم دەبیست؛ کە دەشهاتمە دەرێ هەر گوێم لێدەبوو. دەنگەکەی وردە وردە نزم دەبۆوە، بەڵام بە تەواوی نەدەمرد. دیاربوو بۆیەی دەگوت تا من گوێم لێبێ- وەك کەوی کۆساری- بەڵام نایەوێ بزانم کە بە ئاشکرا بۆمنیان دەڵێ. کەویش هەروایە؛ دەخوێنێ بەڵام بەناوی کەسەوە نا، بۆ هەموو کەوان دەخوێنێ. دڵخۆشی خۆمم دەدایەوە. منی دەگەڵ ئاوازەکانی خۆیدا بردبووە دنیای خۆیەوە، هەروەك هەمان کچانی دەریا.



ئەو کارانەی بە مەبەستی فرێودانێ من نەبوو- پێموا نییە. نا. پێدەکەنی هەر بۆ ئەوەی دەم بە پێکەنین و گەش بێ، و کاتێك کە پێدەکەنی- یەکپارچە دەبووە شۆڕ و روونی و پاکی و بێگەردی و روخساری دەبووە رووی منداڵێکی جوانکیلە و کە دەتریقاشەوە وەك تریقانەوەی منداڵێکی و زۆری نەدەخایاند کە هەموو دەنگی خۆمان و تریقانەوەکانمان تێکەڵ بەجۆش و خرۆشی تریقانەوەکانی وی دەکرد و ماڵ وەك جۆگەلەی بەهارێ پڕ دەبوو لە دەنگی لەرەی زەنگولاڵن کە وێك دەکەوتن و دووبارە وێك دەکەوتنەوە و رشتەی زنجیرەکەیان نەدەهێشت راوەستێ... پێدەکەنی، نا بۆ ئەوەی پێبکەنێ تا شتێکی دەستکەوێ؛ نا، نەخێر، هەرگیز باسی شتی وا لە گۆڕێدا نەبوو؛ ژیان بوو، سروشت بوو کە دەویدا پێدەکەنی. نەدەبوو پێنەکەنێ، پێکەنینەکەی نهێنییەك لە نهێنییە سروشتییەکانی بوونی وی بوو- هەروەك ئارەق کردنەوە و هەناسەدان، هەروەك چۆن ئارەقەی دەکردەوە، ئاواش پێدەکەنی، دەنا لەبەر خۆشیرین کردن و کۆڕ گەرم کردن و راکێشانی سەرنجی کەسانی دی نەبوو- من ئامادەم سوێندێ بخۆم کە دانیشتن و کۆڕ گەرم کردنی هەرنەدەزانی، خۆ ئەگەر پێشتگوتبایە و بۆ شت روون کردبایەوە هەر تێینەدەگەیی. پێکەنین و رەفتارەکانی شەپۆلی شادی روبارێکی بە توانای لاوەتی ئەوتۆ بوو، کە بەربەستکردنی زۆر دژوار بوو. لە سروشتی ویشدا نەبوو راوەستێ و لەجێی خۆی بچەقێ. هەروەك چۆن پەیکەر یا پەردەی نیگارکێشێك یا رۆمانێك دەرخستنی خولیای کەسی و دەزگای بوونی کەسێکن، هەر بەو جۆرەش ئەو پێکەنینانە دەرخستنی کەسیەتی و هونەری بوونی وی بوون: کە پێکەنینی دەهات نەیدەتوانی پێشی پێبگرێ و بەربەستی بکا، هەروەك مریشکێکی کە بیەوێ هێلکەی بکات و دەیکا- چونکە مەبەستەکەی سروشتییە- یاوەك رۆماننوسێکی کە دوای ماوەیەك تاوتوێکردن و نەخشە و سەرەتا و دەستپێکردن، نیازی تاودانێ قەڵەم هەڵگرتنێ دەخۆیدا هەستبکات... باسی بێدەنگییە تێن و تاوی نەمامە شلکەکانی گەورە بوونێ لەگۆڕێدا نەبوو؛ باس هەر باسی کرانەوە و گەشانەوەی چووزەرەکانی پێگەیشتنێ وی بوو کە وەك ئاوی سەرچاوەی گەرم سەراسەری رووپێوی بوونی وەجۆش هێنابوو و بەردەوام هەڵدەچوو. لەسەرخۆ بەڵام بەردەوام- دەگەڵ هەر قوڵپەیەکی نەك هەرخۆی کە دەکولا بەڵکە ئاوازە بێدەنگەکانی دیکەشی کە دە دەزگای مۆسیقای بووندا کە من تا ئەودەمی نەمناسیبوون، وەئاگا دێنانەوە و دەیخستنە هەلەکە سەما- بە وردە پێکەنینەکان دیاربوو. کە هێشتا زۆر لە زەمانێك دوورترە تا بڵێ: ((دەستت لە دەستی کەوە... ماندووبووم)) یادەم هەراشییە بکات، کە ((وازم لێ بێنە،

تاقەتم نییە... دوێنێ شەوێ هەر نەنوستووم!)) شارەزای ئەو جۆرە ئاوازە پەرت و بلاوانە نەبوو و پێموانییە تەنانەت شووکردنیش بتوانێ ئەو ئاهەنگی خۆشی و شادییانەی تێدا دامرکێنێتەوە و دەزگای مۆسیقای گیانی هەروا بێ هیچ لە گۆشەی عەمبارێکدا کەڵەکە بکات و تۆز و خۆڵی لێ بنیشێ!.

من دڵنیا بووم لەوەی کە دنیا و ژیانی دنیایەی بەرەنگاورەنگی دەدیت- یەك بەهەشتی ڕەنگین، دەشت و دەر سەرتاپا سەوز کە هەرگیز بەرەشییە چاوەگەشەکانی تێك نەدەچوون، بەهەشتی ئەو گوڵە رەنگاورەنگانەی کە رەنگدانەوەی باغچەکانی بوونی وی بوون. رێکردنی، وەك دارگوڵێکی سروشتی، جۆرە سەمایەك بوو. نەك وەك باوەژنەکە کە دەیگوت، هەر دەرواو لەخۆی هەڵدەدا، هەروەك بە ئاواز و لەسەر ریتمێك بڕوا- وەك ئاسك- و خۆبادانی دەگەڵ ئەو ئاوازی رۆینەشیدا، سمتەکانی چەپە و راستەیان دەکرد، شانی هەڵدەتەکاند و گۆزەی سەرشانیشی دەگەڵ هەر خۆرانانێکی ویدا ((قولێپەقولێپ)) هەستەکانی ناخی بە سەرشانەکانیدا دەڕشت تا ئاگری تێبەرنەبێ. بابە کراسێکی چیتی گوڵداری بۆ کڕیبوو: سەرپۆش و ژێرکراس و هەموو شتەکانی دیکەی هەر ئەو کراسە بوو. گوڵەکانی کراسە چیتەکەی هەموو بەلەشیەوە پێدەکەنین و گوڵەکان لەشیان ختووکە دەدا؛ گوڵەکان پێدەکەنین و لە هۆش و تك و تاسەوە چوونیان لەودیو گوڵەکانی کراسەکەوە دیاربوو. سینگ و بەرۆکی، گەردنی بەرز و ناوقەدی باریکی- کە بەواتای ژنانی دراوسێ هەروا شتێکی لە داوە دەزووی هەڵبواردبوو- دەنێو کراسەیدا جیلوەیەکیان دەفرۆشت کە دە ئاوازی هیچ مۆسیقا زانێکیدا نەبوو، و روخساری... خۆ هەر جارێکت روخساری دیبایە هەرگیزت خاوەنەکەی لەبیرنەدەچۆوە. نەمدەزانی ئەوە لە چییەوە بوو: لە قەرەباڵغییە خودی کچەوەیە، لە رەنگە شەرابییەکەی پێستییەوە، لە خرپنییە گۆنا و جوانییە چاڵەکانی لا روومەتیەوە، یا لە ئاڵی و خەتە شەیتانییەکانی لێویەوە یا لە حاڵەتی چاو و برۆیە کەمانییەکانیەوە کە جاروبارە شێوەی پڵنگێکی جوانیان پێدەبەخشی، یا لە حیلکەحیلکی پێکەنینەکەیەوە کە تاك تاكەی هەموو ئەوانە پشکووتنی چرۆ و گوڵ و هەڵاتنی غەمە ساردە زستانییەکان بوو؟ سەیرە کە سوورییە گوڵان وا ئازاریانە بچتە شەڕە جەنگی غەمێ و سوپای غەمەکان بشکێنێ! هیچ غەمێك هەرچەندەش گران و رەش و ئەستەم بایە، لە بەرامبەر هێرشی تریقانەوە و پێکەنینە مۆسیقاییە شادەکەی گەروویدا خۆی رانەدەگرت و دەشکا. گوڵی سەرەتای بەهارێش ئەو هێزەی تێدایە؛ گوڵ، گەوهەری سروشت، لە هەر



وەرزێکدا، دەگەڵ هەر خەندەیەکدا هەمیشە دەگەڵە خۆیدایە... نازو نووزی کچۆڵەیەکی جوانکیلە و شەیتانی و بزۆزییە کوڕێکی هەرزە و سەرەڕۆ دەویدا ئاوێتە و تێکەڵاو ببوون. چەندین جارانم هەوڵداوە شەیتانییە ئەو چاو و دەمولێوانە و ئەو حاڵەتی کوڕ- کچانە وێنە بگرم، بۆم نەلواوە، بەلاّم هەرجارێك کە بەرامبەر کامێرا رادەوەستا یا خەریکی خۆڕێکخستنێ دەبوو یا پۆزی لێدەدا، پەرت دەبوو. سەرەتا کە رادەوەستا دڵی وای لێدەدا تەنانەت سینگ و بەرۆکی دەکەوتە هەڵبەز و دابەز، رەنگی تێکدەچوو. کە ئاگای لێنەبوو وای بەسەر نەدەهات و ئەوانەی نەبوو، یا ئەگەر هەشیبایە لەبەرچاوی خەڵکی دیکە وانەبوو. هەموو شتەکانی بەرێکوپێکی و دەگەڵ ئەندامەکانی تری لەشیدا رێك دەهاتەوە، هەروەك سۆناتەیەکی جوان[1]، وەك غەزەلێکی شاد. هەرگیز نەدەکرا رستەیەك، هەرچەندە بێ بایەخیش بایە، لەو دەزگایە دەربێنی یا لێی زیادکەی ئاهەنگەکەی نەشاز نەبێ و لە ئاوازەکە دەرنەچێ- جوانترین رستەیەکی (سەکتە) لەخۆ نەدەگرت. ئەگەر برۆیەکانی کەمێ رێك و پێکتر یا نارێکوپێکتر بانایە، ئەگەر رەشێنەی چاوەکانی کەمێ گەورەتر یا وردتر بانایە، ئەگەر دەستەکانی کەمێك بچووکتر یا جوانتر و گەورەتر، ئەگەر لێوەکانی کەمێ ئەستوور یا تەنکتر بانایە لەوەی کە هەبوون... هەمووی تێکدەچوو. بەڕاستی وەستایەکەی چاکی دارشتبوو و رێژەی تێکڕای ئەندامەکانی بەوپەڕی وردەکارییەوە چاوەدێری کردبوو کە تێکڕایان وادانرابوون کە دەمانادا هەموو شتێکی دابین کردبوو، تەنانەت رەنگی پێست و حاڵەتی رەنگ و روو و جوولەی ئەندامەکانیشی هەموو پێکەوە هێندە لێك وەشابوونەوە ببوونە شتێکی ناوازە، چاو- و گوێ- و هەست- کاریگەریەکی وەك پارچە مۆسیقایەکی مامۆستا گەورەکانی مۆسیقا، ماوەیەك دوای تەواو بوونیشی دەهۆش و گۆشدا هەردەمایەوە، یا وەك عەتری ژنێکی جوان کە دەگەڵە خۆیدا بە ژوورێی وەردەکا، کاتێ کە دەشڕوا تا ماوەیەك هەست و خەیاڵی ئەو ژنە جوانە هەر دێنێتەوە بیر... بۆن و بەرامە و سروشت و کێو و دەشت و دەر و جەنگەڵ و تەپەی ماهوەر بوو هاتبووە شاری، وەك هەموو هەوراز و نشێو و بەرزی و نزمی و، تازەیی و سادەییەکان هاتبن و کاژیان هاویشتبێ و گوتبێتیان: ((ئەوە ئێمە، رووت و قووت و بێ رتووش!)) رەنگە هەر ئەوەش بووبێ یاریەدەری هەموو ئەو شتانەی کە دەیگوتن و دەیکردن لێی نەگیرێ. نازانم ئەو

(1) سۆناتە: وشەیەکی فەرەنسیە: پارچە مۆسیقایەکە بۆ ساز، کە لەسێ و جاری وایە لە چوار بەند بەشێوەی جیاواز پێکدێت. –لە فەرهەنگی عەمیدەوە-.

رازە چ بوو کە هەر توند و تیژیەك و هەر بزۆزییەکی لە عادەت بەدەریشی کە دەنواند لێی نەدەگیرا و لێی بەداوێوە نەدەکرا. من یا بابە، هەرچەندە نارەحەتیش باینایە، کەچی دەنگێکمان لێوە نەدەهات و هیچمان نەدەگوت... نەك هەر نەماندەگوت، پێشدەکەنین... منداڵەکانیش هەروەتر. دیسانەوە راست وەك سروشت... ئاخر خۆ ئەو مەبەستێکی خراپی نەبوو. راست وەك ئەوەی وایە کە چۆن رەشەبا و گەردەلوولێك لە کێویەوە هەڵکا یا رووبارێك هەستێ باغچەی ماڵەکەت راماڵێ یا پەرژینەکەی تێك بشکێنێ یا تەنانەت خۆشەویستێك ببات و کێوەکە بە نەفرەت کەی و لە رووبارەکە توڕەببی ئاوا... سروشت مەبەستی خراپ نییە- هەر سروشتی خۆی وایە. بەڵام باوەژنە وەك شتێکی ترشیان دابێتێ رووی خۆی تێکدەنا و سەری لە ئەقلی ئێمە، بەتایبەتی لە ئی بابە بادەدا.

شتێك دەدەنگی دارگولێدا هەبوو کە زۆر وەك قاو و قیژێ بارۆکەیەکی دەچوو کابانی ماڵێ گرتبێتی، تا لەسەرەخۆ بە لەپە دەستی، ئەویش بەدوو قامکان لە پشتەقونێی بدات و بەسەری ئەنگوستی هێلکەدانی بەسەرکاتەوە داخوا بەهێلکەیە یان نا، ئەوجا بەرهەڵدای کا- جا بزانە چ قاو وقیژێکی بەرپا دەکا: ((وای، وای! وامەکە! مردم، مردم)) ئای لە توخمێ ژنان، بەعالەمی ئاشکرا دیارە نازان دەکا، کەچی خۆی بەترساو و گەشکەدار پێشان دەدا. و بابان وێرانە، دەڵێی ئاگری دەماڵێ بەربووە! ئاگری قودرە تێت تێبەربێت چەتیوێ، گەرەکی وەسەرخۆ گێراوە، هەرهێندەی ماوە وەك مەجید ژنانی جلکی پیاوان دەبەرکا و بچێتە چاخانان و قاقایان بکێشێ- وەی لەو حیلکەحیلکەی دەستی داوەتێ- هی هی هی هی، هی هی هی هی!)) زۆر بەناز و نووزێکەوە لاسای دەکردەوە و وەکو وی دەکرد ((وەڵلاهی حەکەدار بووە، بیللاهی حەکەدار بووە؛ بە عالەمی ئاشکرا هاوار دەکا وەرن، وەرن هەیتم، ئەی چاکیشم هەیە! وەرن ئاورم تێبەربووە... کرمم کەوتۆتێ، کرمەکەم دەجوولێ- بە قیبلەی محەممەدی شتێکی بەزاری ئەو پیاوەیدا هەرکردووە! ئەرێ بەو تیشکی رۆژەی! چەتیوە لە حەوت ئاوانی داوە قوولە پێی تەڕنەبووە... ئەوانە وەر شەوێکن تا خۆڵەمێشێ نەبینن رەونەقێ پەیدا ناکەنەوە!...)) و چاو لێ سوورکردنەوە دوای چاو لێ سوورکردنەوە- و پرمەپرمی پێکەنینێ دارگولێ- لە دوایە کە زیاتر ئۆگری یەکتری بووین وبووینە هاودەمی یەك. دەیگوت: ((پێیوایە منیش لە توخم و رەچەڵەك و تۆرەمەی ویم. ئێمە خانزادەی خانانین!)) قسەکانی بەجۆرێك دەگەرووی خۆیدا دەسووراند و دەمو لێو و گەردنی بەجۆرێکی وا بادەدان و سەری بەشێوەیەکی وا بۆ دواوە



هەڵدەدایەوە و حاڵەتێکی تەشەر ئامێزی وای دەدایە چاوە جوانەکانی کە بەراستی دڵەنگێو و دڵگیر و دڵفڕێن بوو. ((بەو چاوە بچکۆلانەمانەوە چ شتێکی گەورە هەیە نەماندیبێ!)) و دوایە بەروویەکی ترش و تاڵ و هەمان چاوە جوان و شەیتانییەکانیەوە ((رۆژێکی دەبینی چەند بەجێ و رێ دایدێمێ و وەك دۆی کەشکان دەیهاوێمە بەرهەتاوێ تا بۆخۆی وشك بێتەوە! ژنەتیوە بە قوونێ خۆی دەڵێ دەگەڵم مەیە بۆنت لێدێ!)) ئەوەدەمی دەستە بچکۆلەکەی بۆ لووتی دەبرد، لووتی خۆی دەگرت و دەیگوت: ((پیف پیف، چ بۆ گەنێکی لێدێ!... خانزادەشە- هەی بە قوونێ بابیەوە!)).

دەمگوت: ((کچێ، بابە گوێی لێبێ هەردوو چاوەکانت دەردێنێ- بابی وی مامی بابەیە...)).

بەفیزێکەوە سەرێکی هەڵدەتەکاند و دەیگوت: ((باشە، با مامیشی بێ- خوای دەکرد مامی شای دەبوو... وەی خودایە، ئەو بابەیە چۆنی دەگەڵ ئەو زمان درێژە پاڵوو شلەدا هێناوە!)).

((سوست، سوست)) لێوم مووچ دەکردن و چاوم زەق دەکردنەوە، بەچاو خەندێکەوە.

((هەربینە رۆژێکی دیتت رووبەرووی بوومەوە... و لێی هەڵگەڕامەوە...)) پرمەپرمی پێکەنینێ... ((لەخۆی و ئەوکچەی خۆی، کە هەر راست دەڵێی مەسینەی بێ دەسکە... حەکەدارە!... لەو قسانە!)) وای لەو لێو و دەم و چاو بادانانەی. بەراستی هەموو کەسێك حەزی دەکرد پێی بڵێ حەکەدار...

دەچلەی هاوینێدا جارجارە بۆنی خۆشی بەهارێم دەکرد و سەرمەستییەکی خۆشم بە گیان و دڵ و دەروونیدا وەردەبوو: پڕ لە هیواو پڕ لە گومانی خۆش، کە دنیایەکی خۆش و رازاوەم تێڕا دەدیت و هەستم بە لەش سوکییە خۆم دەکرد. وردە وردە هەموو شتێکم بە جوان دەدیت: ئەو ژنانەی کە لەسەرکانییەڕا دەهاتنەوە خریان جوان بوون: زەرد و سوور و شین، هەروەك ریزە کاغەزێکی رەنگاورەنگ کە لە جەژناندا و دە رێ و رەسم و یاسا و رێسای مانگەکاندا بە داوێیانەوە دەکردن و بەشنەی شەماڵێ، هێور هێور، دەهاتن و دەچوون و ئەولاولایان بوو بەرو رووی خۆیان پێشان دەدا. سادەییەکەی، هەموو شتێکی سادە و خۆشی دە دەروونمدا ئازاد کردبوو، بەواتای یەك لە گەورە پیاوان بە ئەندازەیەك سادە بوو کە پیاو بەدڵ و بەگیان منەتبار بوو ویژدانی خۆی بەوی بسپێرێ و تکای لێبکات تا- چەند سەعاتێك- چەند رۆژێك- تەواوی

ماوەی ژیان- بۆی هەڵگرێ و لە زیزبوون و تووڕە بوونێی و لە توندوتیژییەی نەڕەنجێ و متمانەشی لە دەست نەدا، وەك منداڵێکی کە دەخیلەکەی لای دایکیەتی و بیانووان دەگرێ، جا دایکی دەیداتەوە یا نایداتەوە ئەوە گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە کە ئەو متمانەی خۆی لە دەست نادا. هەر کە بیانووەکەشی نیشتەوە توندوتیژی و داد و بڕۆیەکەشی نەما لە پەنای وەردەکەوێ؛ قاچێکیانی بەسینگی خۆیەوە دەنێ و ئەویدیش درێژ دەکات و سەردەکاتەوە سەرڕانی دایکی، قامکی دەزاری دەنێ و بەسەرنجێکی بەتاڵەوە بەبن میچی ژوورەکەوە پێدەکەنێ- بەڵێ هەر ئەو دایکەی، کە پێش تاوێك رقی لێی هەستابوو و داد و بڕۆی بوو لە دەستانی و هاواری لێدەچووە ئاسمانێ- ئەوا ئێستاش دووبارە وەك هەمیشە تاکە پشت و پەنا و تەکیەگاهی هەر ئەوە و بەس... جاری وابوو کە دەجێیدا بووم و دەهات، چاوەڕێی ئەوەی بووم بە منداڵییە خۆی، وەك دایك و باوك، هەروا سروشتیانە، لایەکی پەتووەکە هەڵدەداتەوەو لەسەرخۆ دەبن جێیەکەی خزێ و روخساری پاکی منداڵانەییم بەسەرشانی کات و بکەوێتە هەناسەدانێکی ئارام و پشتەلێوی ئارەقەی دەردەن...

بەلاّم دەگەڵ ئەو منداڵی و پاکییە منداڵەییەکەشیدا عیشوەگەرییە رەمەکییە ژنێکی تەواو عەییاری بەتەواوی ماناوە تێدا کۆببۆوە: ئەو لەش و لارەی کە بادەدا، ئەو چاوانەی کە دەیگێڕان، ئەو سەرنجانەی کە لە ناخی قووڵی چاوەکانیەوە هەڵدەقولاّن، ئەو حاڵەتە شەیتانیانە و ئەو دڕدۆنگییە شکۆدارەی کە بەڕوو و چاو و سەر و گەردنیەوەی دەلکاند، هەر ئەو رەفتارانە بوون، کە دەماری باوەژنەیان دەردێنا و وای لێدەکرد جاروبارە بە ژنانی دراوسێ و بەمنیش بڵێ کە تازەکاری لە کارترازاوە و بەقسەی وی ((تا تۆ کوتێکی پێوە دەدەی ئەو حەوتانت پێوە دەدا!))... ئەمە دارەگوڵی ژیان بوو: هەموو نیشانەکانی گوناه و چێژ و لەززەت و ژیان، کە دەگەڵ مردنێ ئاشنا نین، کاتێکیش کە پێی ئاشنا دەبێ لێی بێزارە. ئەوە پێکەنینە، شۆڕو تاسەیە، رەنگە، بەهارە، گەرمییە، قوڵپەقوڵپە، جۆش و خرۆشە...

مەلا حەسەن زەرد و رەنگ لەرووان بڕاوە، دۆڕاو و پەرتە؛ مێزەر چڵکنە، کەواو سەڵتە رزیوە، ئاوازی دەنگی هەمووی هەر نیشانەی ناکامی و غەم و حەسرەتە... مەرگە، کە بەوپەڕی فێڵ و ریاو تەڵەکەبازییەوە خەریکە بۆ بەربەستیە برسییەتیە ژیانێکی پڕوپووچ و لە پەنای خوداوە دزێویە جوان، و جوانییە ناشیرین دزێو دەکا... ئانتێنی (ئاریل) بوونم هەرچی شەپۆلەکانی



بوونی وی بوو وەریدەگرتن و بە تەواوی هێز و تواناوە دەیدایەوە دەزگا هەستیەکانم: شەپۆلەکان هەموو روویان لەمن بوو- من وام هەست دەکرد؛ دەزگا نێرەرەکانیش هەروایان دەگوت. و نیشانەکانی ئەو شەپۆلانەش، ئەگەر چی سادەبوون، لەباری هەست و مانادا تا بڵێی قورس بوون. سادەبوون، بە سادەییە خودی شەپۆلەکان، بەلاّم تیژبڕو بڕەڕ، ئەویش بەشێوەی شەپۆلە سۆزییەکان کە بە ناخ و گیاندا تێدەپەڕن- دەگەڵ ئەو جیاوازیەدا کە ئەوان دەیانتوانی بە ناخ و گیاندا تێپەڕن کەچی نەدەڕۆیشتن و دەمانەوە. هەموو دەهاتن و خۆیان بە دەزگای بوونی مندا دەدا- و هەروەك کۆترە دەستەمۆ و مەشق کراوەکان باڵیان لێکدەدا و دەچوونەوە هێلانەکانیان- ئەوانیش دەهاتنەوە نێو تاوەری دڵم.

ئەوەی کە منی ئاڵۆز و شێواندبوو هەر تەنیا جوانی و گەشە و وریاییەکەی وی نەبوو: راستی و رەوانی و راستگۆییەکەی بوو. ریا و درۆ و خۆ هەڵنانی دەمەزەبدا نەبوو: کە شتێکی نەویستبایە، نەیدەویست، هەروەك باوەژنەکە، ئەوەشی هیچ کاتێك نەدەشاردەوە- بەشێوەیەك، نەچەندان توند، بەرەو روو و بەئاشکرا دەیگوت؛ و رەنگە یەکێك لەو هۆیانەی پەیوەندی بابەی پێیەوە هەر ئەو رێ و راستییەی بێ. هەموو جارێ دەیگوت- دارگوڵێ دەڵێم- ((بە یەك هۆقە هەنگوینیشەوە ناخورێ)). — خانمی دەگوت. لە دۆستایەتییەیدا تەواو بێ نیاز بوو و قەت هیچی نەدەویست؛ ئەگەر یەکێك یا شتێکی خۆش ویستبایە، ئیدی ئەوە سەرو ماڵی ئی وی بوو: ناز و نووزی نەدەزانی، بێنەوبەرەی دەسروشتیدا نەبوو؛ سەرەڕای ئەوەش، گیانی وەك گیانی سەدەی منداڵێکی شیرەخۆرە بوو. دەگەڵ گەوراندا منداڵ و دەگەڵ منداڵاندا منداڵتر بوو.

پەیوەندیی نادیاری دڵ هەر دەگەڵ هەوەڵ سەرنجێوە سەقامگیر بوو، هەروەك پەیوەندی خوێن و مۆزمین، لە هەمان دەرزی هەوەڵێوە: بە هەمان دەرزی هەوەڵ سەرنجەوە، رژێمی دەزگای بوونمی، بە شێوەیەکی سادە و ساکار، کردە رژێمێکی دی! رژێمێك کە دەگەڵ رژێمی بوونی ویدا ئاوێتە بوو- هەر لە خۆوە- راست وەك ئاوێتەیەکی کیمیاوی- و کار و کاردانەوەی گەردیلەکانی، سەرتاپای گیانی گەرم کردمەوە و گەرمی گیانم دەگەڵ گەرمی بوونی ویدا ئاوێتە و تێکەلاّو بوو. هەروەك ماوەیەکی زۆر بێ بێهۆش بم و تازە وەئاگا هاتبمەوە، وەك ساتەکانی دوای نەشتەرگەری، کە دەودەمیدا مێشك لە تەوەری هۆش دەردەچێ، بەلاّم لەناو تەوەری

کێشی بیٚ ئاگاییدا هەر دەمێنێتەوە و دەرناچیٚ. کرمی ئاوریشم دە قۆزاخەکەی خۆیدا مت بووە، دەبیٚ هەستی ئەوە بکا کاتێك دیٚ کە هەڵدەستیٚ و زیندوو دەبێتەوە. راستییەکەی بۆ زیندوو دەبێتەوە؟ داخوا شەپۆلێکی لە لەشی دەدا؟ دەزانیٚ کە زیندوو دەبێتەوە؟...

زیندوو ببوومەوە... گێژبووم، بەلاٚم گێژییەکی خۆش، هەروەك نەخۆشێکی سۆرکاوی، دەمەدەمی چاکبوونەویٚ، دە سەرەتای دووەم مانگی بەهارێدا دەگەڵ هەستی سەرەتای وە ئاگا هاتنەویٚ نەخۆشێکی دڵی ژێر دەستی نۆژدارێکی نەشتەرگەر.

تا ئێستا، باسێك لە عیشقەوە نەهاتبووە گۆڕیٚ- هەل و دەرفەتێکی وا بۆ ئەو کارە نەڕەخسابوو- ئەوانە هەر تەنیا هەستی من بوون؛ بەلاٚم ئەو ساتانەی کە بێدەنگ بووین و بەرێکەوت ئەو پێنەدەکەنی یا نەدەگریا بەواتای باوەژنیٚ وەك مەیموونی کەرەموڵلاٚی لۆتی بیٚ نەقام سەمای نەدەکرد، کاتیٚ کە سەرم بەرزکردەوە و چاوم تێی هەڵەندەگوت دەمدیت تەماشام دەکات و هەرکە سەرنجەکانمان ئاوقای یەك دەبوون رەنگە شەڕابییەکەی روخساری هێندەی دی دەبوو، پێڵووی چاوەکان قورستر گەڕانی چاوەکان لەسەرەخۆتر.

لەبەرخۆمەوە دەمگوت (یا رەنگە ئێستاکە وابڵێم) شتێکی سروشتییە، لاو لەلاویٚ دەگەڕیٚ، من لەوی دەگەڕام، دوور نەبوو ئەویش لە من بگەڕیٚ. خەڵکی دی، بەلای منەوە لە سەیرکەرانێك بەولاوە زیاتر هیچی دی نەبوون؛ ئەوا ئەوپەڕی وێنەیەکی خۆیان، تارماییەکیان، لە بەسەرهاتی لاوەتییە خۆیانەوە دیتبایەوە. هەر هێندەیان بەس بوو، لێشیان زیادبوو، چیان دەویست لەوەی زیاتر. تازە لەوان تێپەریبوو؛ ژیان ئی ئێمە و مانان بوو. بەلاٚم... بەلاٚم ئادەمیزاد ژیانی خۆی لە راستیدا لە ژیانی کەسانی دیدا درێژەپێدەدا. جا ئەگەر وابیٚ ئەو ژیانە هەر قابیلی سەیرکردنێیە هەر قابیلیشە.

بۆیە هەقیان هەیە دانیشن و سەیرکەن بەلاٚم ئیدی هەقی ئەوەیان نییە بەربەستی ژیانی من بن لە بوونی ویدا، ئەویش کە ئێستا ژیان بە باغێکی تەڕو پاراو و دوور لە قاوقیژی دەرس و گرفتارییە بچووکەکانی ژیانی لاوانە دەبوونی ویدا بەگۆڕاو دەبینم و کەوتوومەتە سەیرکردنێی.

هەستمدەکرد دە نیشانەکانی یەکتری دەگەین- بەلاٚم ئەو بەتەواوی جیق و فیقەکانی باوەژنیٚ زۆر منداڵ بوو، پازدە شازدە ساڵ زیاتر نەبوو، هەرچەندە بەقسەی خۆی، بۆنی بەهارێی کردبوو



و ئەو حیلکەحیلکەی ئی بۆنی بەهاریٚ بوو- هەروەك جوانووە ماینیٚ کە لەپڕ لە گەرمەی غاردانێدا لەجێی خۆی بچەقیٚ و گەردنی هەڵێنیٚ و گوێی مووچ کا و بەلایەکیدا، بە دوای جووتەی خۆیدا لە دوور بڕوانیٚ و نوسکەیەکی نەرم و شل و خۆش تێهەڵکا: ((ئیهی هەهە!)) دەگەڵ ئەوانەدا هەروەکو هەمان جووانووە مایین منداڵێك بوو بەردەوام خەریکی یاری و زۆر بڵێییە بوو و من چۆن دڵنیابم لەوەی کە تێدەگا، یا ئەگەر تێدەگا ئەوە ئاوایە، یا ئایا ئەم یارییەشی هەروەك هەمان یارییەکانی دیکەی نین، یا ئەگەر یاریی نییە ئەدی راستی و راشکاوییەکەی چۆنە؟ لە کاتێکدا کە من کەوتبوومە نێو تەوەرەی بیٚ ئاگاییەوە، تاوێکیش لە بیروخەیاڵی وی نەدەکەوتم و هەروەك تاوانێکم کردبیٚ و لە هەر جووڵە و دەنگێك کە باس لە هەڵخەڵەتان و فریودانیٚ وی بکاتەوە دەترسام و سڵم دەکردەوە و ئازارم دەکێشا. بچووکترین سەرنجی باوەژنیٚ و سووکترین زەردەخەنەی بابەم لە سەد لاوە و بەسەد باراندا لێك دەدایەوە و بە هەمەجۆر تەرازووی ورد و درشتم دەکێشان و لە هەموو ئەو لێکدانەوە و کێشان و پێوانانەڕا کە ئەنجامەکەیم لەپێشدا سەلماند بوو، هەردە و دەمەشدا کە دڵخۆشییە خۆمم دەدایەوە کە ئینشاڵلاٚ گوربەیە، خۆمم لە ریزی دڵنیایی تێگەیشتنی بەرامبەرەکەم دادەنا، ئەویش لەولاوە- دارگوڵ- قاچەکانی لیٚ درێژ کردبوون و خوشکە چووکەکەمی لەسەرلاقەکانی خۆی درێژکردبوو و گۆرانی دەگوت و پێدەکەنی یەك لە دوویەکی خۆ بە قوربان و سەدەقە دەکرد و زۆر بە نەرم و نیانییەوە قامکی لە چەناگەی دەدا و مووچە مووچی بۆ دەکرد و بە پێکەنینی دێنا- و داوای لێدەکردین هاوبەشییە ئەو پێکەنینە هاوبەشییەی بکەین: ((هی هی هی هی!)) هەر راست وەك هەمان جوانووە ماینیٚ شەیتان. دەتۆ وەرە ئێستا ئەو لەش و لارە جوان و ئازاد و ئەو گەردنە بەرزە و ئەو قاقا و تریقانەوە خۆش و شادانە بشکێنە و بە عەرەبانچییەکی بەمێرد دە! حەیف نییە!؟...

شار و رەفتاری شاری بۆ وی حوکمی هەمان عەرەبانە یا بارگیری هەیە کە ئەسپی عەرەبانە و بارگیریان تێدا بەو حاڵ و رۆژەی گەیاندووە کە لەبەرچاومانە. باشە لە راستیدا چ پێویستە کە ئەو ئەم دنیا شاد و خۆش و ئازاد و کێویلکانەییەی خۆی جیٚ بێڵێت و بێتە ئەو دنیا بیٚ تروسکە و هیوا و بەرتەسك و پەرت و خامۆشەوە؟ ئەمە بیرێکی گێلانەیە. دەگەڵ هەموو ئەمانەدا کاتیٚ کە هەرهەمان ئەو خوو و خدەو هەرهەمان ئەو باوەژنە، و هەمان ئەو خانمەتی و کارەکەرییە نەیەڵیٚ بێتە ناو ئەو دنیا سارد و سڕەوە و لەمپەری لەریٚ دانیٚ، دنیای خۆی هەر

بە زیندان دەزانێ و بوون، و گیانی دە تاریکی و ئەنگوستەچاویەدا دەکەوێ، هەربۆیە هەست دەکات، هەرچییەك بێ هەر ژیانە، و راستییەکەشی هەروایە و ناتوانێ لێی رابکات و دووبارە بچتەوە کێوی. هەروەك جانەوەرێکی کە تازە لە کێویڕا هاتبێ و هێشتا تین و تاو و بەرتەنگییە قەفەزێی هەست نەکردبێ. رەنگی قەفەزی وی عەشق بوو. گێژبوو، گێژێکی شاد- لووت بەرز- نەیدەزانی، بەلاّم هەستی دەکرد کە شار و کۆمەلّگای شاری ژینگە و دەوروبەرێکی نامۆیە، هەرهێندە کەوتییە نێو تانوپۆیەوە ئیدی بەرهەلّدابوونت نییە- تا شار گەورەتر بێت تانوپۆی توند و تۆلّتر دەبێ. یا ئەم یا ئەو- ((ئەم)) بەهێزتر بوو. هەوای شاری لە کەللەی دابوو، راست وەك ئەو مندالّەی کە گولّی راستەقینەی سروشتی بە گولّی دەسکار دەگۆڕنەوە و شکلّ و شێوەی گولّ و گیانلەبەرانی دەستکردیان لە گولّ و گیانلەبەرانی کێوی لەلا باشترە، هەرچەند دلّیشی بۆ کێو و بەندەنان هەردەچوو. کام قەرەجێك هەیە کە هەلّمژینی هەوای ئازاد و هەوای دیتنێ کێو و بەندەن و دەشت و دەرانی لە کەللەی نەدا؟ بەلاّم هەر دەودەمەیدا هەستی دەکرد کە لێرەیە و لێرەشی رەگ و ریشە داکوتاوە و جێی ئایندەشی هەر ئێرەیە، و گەورەترین ئارەزووشی ئەوەیە کە هەر لێرە بێ، لێرە خۆی بەعەردی دادات، و جێیەکی بۆ خۆی پەیداکات. ئایندەی نەدەدیت، بەلاّم چاوی هەر لەمەبوو- و خوا بۆخۆی دەزانێ. رەنگیشە ئەو ئایندەیەش هەر من بم... رەنگە!... وەك مەستێکی دواکاتەکانی مەیخانەی بووم، کە بێ چەند و چوون ئەم و ئەوان ماچ دەکا و رێزی بۆ هەمووان هەیە و چوکە و خاکی بەرپێی هەمووانە. منیش دەگەلّ دنیا و مافیهای دنیایەدا پاك و بێگەرد بووم: پێکەنینم دە سەرنجەکاندا بوو و بێ ئارامیم دەچاواندا، و سرۆکیم دە لەشیدا، و ئاگرم دە گیانیدا. دەرێ و بان و کووچە و کۆلاّناندا هەر سەلاّوبوون بە چەپە و راستەیدا لە گەورە و چووکانم دەکردن و هەر زەردەخەنە و پێکەنین بوون دەمبەشینەوە، هەروەك چەند پێکێکم زیاد هەلّدابێ. بابەش، کەم و زۆر، هەروا بوو؛ و من بە پێچەوانەی سالاّنی پێشووتر، لەم سەروەختەی تەمەنەدا، دەو دەوروبەرەیدا، هەر نەرمی و پێکەنین بووم دەگەلّ باوەژنێ و خوشکەکانمدا. تۆپ و تەشەر و ئەمر و نەهی کردنی ((وا دامەنیشە، وادانیشە... برۆ ئەو دەست و دەموچاوە چەپەلاّنەت بشۆ ئەوجا وەرەوە)) لەو بابەتە شتانەم هەر نەبوو؛ لەو شتانە پچڕابووم. سووکییە سەمایەم دە پل و پاو گیان و لاق و لەتەران ئالاّ بوو- بەواتای باوەژنێ ببوومە ((کرمەکی))! سەیربوو ئەمانە هەمووی لەپای یەك نفووزی



یارییە دەرەوە! هەرکاتێ ئەو دیاربایە من نەدەمام؛ ئەوە من نەبووم کە تانە و تەشەرم نەداویشتن، منێیەك بوونی نەبوو ((من)) دەودا بوو.

ئەوە ئەو بوو پێدەکەنی و چووکەلّەی هەمووان بوو و بەو چووکەلّەییەی خۆیەوە ببووە گەورەی هەمووان. من جگە لە چاوە خەندەیەك و جووتە لێوێکی بەش و ئارەقەیەك کە بە هەنیا و روخسارمەوە دەنیشت چیدی نەبووم. ئەمە کاتێك بوو کە لە مالّ نەبام، یا لەوێ بام و ئەو چووبایە سەراوێ. ئەگەر رۆیبایە بەڕاکە ڕاکەوە خەیالّمم وە دوو دێخست، چاوەکانم لە کەناری پەنجەرەوە دەکردنە ئێشکچی، گوێم بەدەرکەوان. هەر کە دەنگی ترپەی پێی و ((قولّپە))ی گۆزەکەیم دەبیست- و ئەوەشم لەو دەمەیڕا دەبیست کە لەسەرکانییەڕا وەڕێ دەکەوتەوە، و کانییەکە لە پەنجەرەیڕا دیاربوو- ئیدی من گیانێکم دەهاتەوە بەرێ... تازە ئیدی گرینگ نەبوو کە لە ژوورێ بایە یان نا، هەمیشە دە خەیالّمدا بوو. کاتێکیش کە دەچوومە ناوجێی، تا ماوەیەکیم هەر بە خەیالّی وییەوە بەسەر دەبرد: لەپەوڕوو دەنوستم، یا لە عادەت بەدەر سەرچەفەکەم بەسەر دەموچاوی خۆمدا هەلّدەکێشا و ئەوم بە خەیالّ دێنایە بنێ؛ وەك ئەوەی بیرم سەد فرسەخم لێ دوور بێ یا ماوەیەکی زۆر بەسەر دیداری یەکتریماندا رابردبێ، بەهەموو هێزێکەوە تینم دەدایە خۆم: چاوم لەسەریەك دادەنان و روخساری ویم دێنایە پێش چاوی خۆم: برۆکەوانی و چەماوەیی، دەموچاوە خڕ و شەڕابییەکەی، چالّی لاروومەتەکانی کە هەرچەند جارێك پێکەنیبایە قوولّتر دەبوو و روومەتەکانی خڕو پڕو بەرجەستەتر نیشان دەدا؛ لێوە نەزۆر کورت و نەزۆر گۆشتنەکەی، چاوە رەشەکانی کە هەمیشە داییسان و جارجارەش پڕ دەبوون لە ئاو و دلّۆپە فرمێسکەکانی وەك رۆنی مشتومالّ کردنێ کە شوێنی تێدا گەڕانێ ئەو چاوانەیان مشتومالّ دەکرد و لەپەرژینی مژۆلّەکانیەوە تێدەپەڕین و بەسەر مانگەشەوی جوانی روومەتەکانیدا سەرە و خوار دەبوونەوە و لالێوە شەیتانییە سوێرەکانیان هێندەی دی سوێرتر دەکرد- هەمووم دەدیتن: پێستە رەنگ شەرابییەکەی، مەستییە چاوەکانی، بەناز هاویشتنە سەریەکی پێلّووە قورسەکانی کە جاری وابوو دەتگوت پەڕەی مزن و بەسەر هێلکۆلّەی چاویدا دەکەون، و ئەو پێکەنینانەی کە تەواوی لەش و لاری دەهەژاند و دلّی دە کرۆکی گیانی مندا وەپەلە دەکەوت، و دەنگە خۆش و پڕ هاژەکەی کە هەروەك چەهچەهەی سەدان بولبولان پڕبوو لە زیر و بەم، و سەرەنجام بالاّ جوانەکەی، کە وەك ئالاّیەکی بەدەم گەردەلوول و رەشەبای دەروونەوە هەراسان بێ، و تۆرانی جارجارەشی کە ئەویشی لەجێی خۆیدا هەر جوان و دلّەنگێو

بوو... هەمووم دەدیتن؛ و خۆمم وەك ئەڵقەی زنجیرەی دووکەڵێ یا ئەڵقەیەکی نادیدەی خەیاڵێك دەوییەوە دەپێچا و سەرتاپای بوونیم لە تاڵە باریك و ناسکەکانی خەیاڵێك وەردەپێچا کە لە تانوپۆی گیانم چنیبوو- ئەوجا لەسەرەخۆ، نەك وەك تەونی تەنکی جاڵجاڵۆکەی کە بە هەڵپەوە پەلاماری نێچیرەکەی بدات و قوتیدا، بەڵکە هەروەك کرمە ئاوریشمێك کە قۆراغەی بەدەوری خۆیدا دەتەنێ تا تێیدا مت ببێت و بنوێ، ئاوا قۆزاغەی بەدەوردا دەتەنم و لە ئارمووشی گیانمیەوە دەپێچم کە بەدەستی دڵ و گیانم بۆم تەنیوە تاتێیدا بنوێ، دەکاتێکدا کە خۆم پێشتر دە ئاوریشمی لەشی ویدا خەوتبووم.

ئەو ئیدی دارگوڵ نەبوو، وردە وردە ببووە ئایدییەئاڵی من و من خۆمم لە ئایدیەئاڵی خۆمەوە دەپێچاو دەخۆمدا نقوم دەبووم و دەخۆم رادەمام و ورد دەبوومەوە: کەماڵی خۆمم دیتبۆوە- ئەو کەماڵی من بوو و من بە کەماڵی خۆمم هەڵا دەگوت؛ عیشقم بە کەماڵی خۆمەوە دەکرد! بەشێوەی دووکەڵێکم لێهاتبوو- دووکەڵێکی پەرش و بڵاو و پەرِاکەندە، دووکەڵێکی وەك پارچە هەوران، دووکەڵێکی سووتاو کە بێ ئیختیار بەدەوری خۆیدا دەخولایەوە، هەروەك گێژە هەورێکی بەدەم باوە؛ و ئەوم دە شەوقی بڵێسەی سووتانی خۆمدا دەدیت- رەنگین، گۆرِاو- نادیار، پەرِاکەندە و کۆك... شەوێکی ئاوا دەو دنیایانەدا بووم، کە هەستی شتێکی ساردم لەبنە پێی خۆم کرد؛ تازە چاوەکانم بەو خەیالانەوە گەرم ببوون- دە زیندە خەودا بووم. بەو خەیاڵەی کە ئەوە یا مارە یا هەزار پێ- مار دەماڵێدا هەبوو و هەمووش دەمانزانی- بە پەشۆکاوییەوە سەرچەفەکەم بەلایەکیدا لادا، بەرەو سویچی کارەباوە چووم... دارگوڵ بوو، کە بەو شەوەی شەیتانییەکەی بزووتبوو و هاتبوو بنی پێی خوراندبووم! هیچ رانەوەستام؛ دەستم برد و گرتم. وەك هەمان (بارِۆکە)ی کە گوتم قاوقیژی لێ هەستا، بەڵام زۆر بەسپایی و لەسەرخۆ، و بەدەم داد و برِۆ و هاوار و ئێش و وێشی فیتە ئاساوە... گوایە قوڵی ئازاری پێگەیوە- قۆڵێك کە وەك ماسی سپی، سارد و پرِ و لووس و پووس، و راپسکێو.

((گوتم پەرداغە ئاوێکم بۆ بێنە! چییە خێرە بەوکاتی شەوە! ئەوە ئەو پێکەنینە هەر تەواو نەبوو!؟)) ئەوە بابە بوو، بە تورِەییەوە گوتی! ژوورەکەم بە دەرگایەکی دوو دەرییەوە دەچۆوە سەر ژوورەکەی وی، بە ئاگابوو، هەروا درەنگ دەنوست...



هەروەك سەربازێکی کە تەقەمەنی لێببرِێ و دوژمن بگاتە سەری و فەرمانی تەسلیم بوونی پێکردبێ، تێکرِابووین، دارگوڵە گوتەنی ((وەك پارچە پەلاسی تەرِ. دەك خوا بمکوژێ!)) و دووسێ پەنجەی بۆلای چەناگەوە و چاوانی پاك و بێگەرد و سەرسامانە... دەستەکان وەك دەستی بوو کە شووشەیەکی کۆك کراو کە کۆکەکەی تەواو ببێ بەولاولایدا بەربوونەوە و وەك ماسییە نێوداوێ لە پەلەپەل و هەوڵ و تەقەللاکەوت. دارگوڵ کە هەمیشە حاڵەتێکی زەردەخەنەی بەرِووانەوە بوو کە هەرتاوە ناتاوێك دەتگوت ئەها ئەوە بەرهەڵدا دەبێت و لافاوێك قاقا و پێکەنین بەرپا دەکا. بێ ئەوەی خۆی لێ ون ببێ گوتی: ((بۆ، چ بووە باپیرە؟ ئەوە گوێم لێیە، خۆ هەزار دەستم نین- ئاغا چکۆلەش داوای دەرزی و داوێی کردبوو)). لەپرِ پرِماندی.

دەرزی و داو! ئەویش بەو شەوەی! باشە ئەوەی لە چ کون و کەلەبەرێکی جانتاکە دەرێنا! و ئیدی پێکەنین بەری بەرهەڵدا بوو و روبارێك دەنگ و سەدای زنجیرە زەنگولان هاژەی کرد و کەوتە رِێ. رۆیشت و چوو ئاوی بۆ بابەی برد و بۆ شوێنە ونیەش هاتەوە ژوورەکەی من... بەرِواڵەت جۆگەلەی پێکەنینێ وشك ببوو، بەڵام دەگەڵ ئەوەشدا کە وشك ببوو و کاتێکیش وشك دەبوو کە سەرکۆنەکرابایە، کەچی زەردەیەکی هەر بەرِوویەوە دیاربوو کە نەتدەزانی ناوی بنێی چی و گوتی چەند دەبێ دانیشتۆتەوە، تازە هەرچی بوو و هەرچەندێکی بوو، بوو، بەهەرحاڵ بوو.

بەدەنگی کچە بارِێکی مەیخانەدار کە سەربکاتە سەر مشتەرییەکی پیر و کەنەفت، هەر بەهەمان غەمزە و نازەوە گوتی: ((ئاغا چکۆلە چیدیت نەدەویست؟)) بەدەنگێکی وا کە، بابە گوێی لێبێ، لووتی هەڵکرد.

بەدەنگێکی کە، بابە گوێی لێبێتەوە گوتمەوە: ((نا. بچۆ بنوو- منیش ئیدی دەبێ بنووم!)) و بە ناقایلییەوە لێك هەڵبرِاین.

لە راستیدا باوەژنە لەو کەین و بەینەی بێ ئاگا نەبوو، چونکە بەیانی کە لەسەر قاوەڵتیە دانیشتین بێ هیچ هۆکارێك گوتی: ((خۆ هەنگوین نییە قامکی لێدەن کەم کا، هەتا قامکێکی لێدەی دێتەوەجێی؛ زیاد دەکا کەم ناکا!... هەر هێندەی ماوە ئاوس بێت، و خۆی بەسەر یەکێك لەوەدا ساغ کاتەوە... ئاە، ئەوە من مردوو و ئێوە زیندوو. ئەودەمی بۆ خۆتان وەڵامی ئەو خەڵکەی بدەنەوە... ئێستا نەگەیوە سەرکانییە گوێت لەچی گوت چی گوتەی خەڵکە!)).

باس باسی چوونە سەراوێ نەبوو... سەیرێکی بابەم کرد، پرسە سەرنجێکی توندم دایە باوەژنێ.

سەرنجی بابەی کەوتە نێوانێ و لەدوو لایانەوەی ئانیشك لێك بلاو کردنـەوە و دوو سـەرنجی کـە لەسەر لێوی تێك بەربوونێی لێك هەڵبڕین. بابە تووڕە بوو، گوتی: ((جارێکی نەبوو ئەو منداڵە دانیشێت و یەك تکە زەهرەمار بخوات و تـۆ لێیگـەڕێی بـە ئاسـوودەیی بـە گەروویـدا بـچێتە خوارێ... خەڵکی گووی دەخۆن ناماقووڵیان دەکەن...!)).

دارگوڵ خوشکە چووکەکەمی لە تەك خۆیەوە دانابوو و ئەو نانەی کە بۆی دەشێرییەوە گوشیبوو و بە کەوچکە چایان دەیدایە و بۆ خۆشی ناوە ناوە، فوویەکی لە ژێرپیاڵەکە دەکرد و چـایەکەی خۆی دەخواردەوە. بەبیستنی قسەکانی بابەی فرمێسکی هاتنەخوارێ، بەدەنگێکی زۆر ناسك و کچانەوە- منداڵانەوە- گریا...

بابە گوتی: ((مەگری کچم، مەگری...!)) باوەژنە لە داخان لێوی بە پووکییـەوە نووسـان و بـە گۆتەی دارگوڵێ لایتەکەی هەڵبوون- بەددانە زێڕەکانی باوەژنێی دەگوتن لایت، بە سووکایەتی؛ و من سورهەڵگەڕام، و سەرم بەردایەوە- لەسەرلێوی تەقینەوێ بووم. دارگوڵ لە ترسێ وەی کـە لەسەر وی دەمەقاڵێیەك پەیدابێ قاپی شـیری منداڵەکـەی تاودایـە، دەسـتی دە کەلـەکێ نـاو منداڵەکەی، وەك بێچووە پشیلە، دەلاکەلەکێ خۆیەوە نا و لـە ژووریێ چـووە دەرێ. منداڵەکـە خووی بەو پڕپێدا کردنانەوە گرتبوو. چوونەدەرێی بە گۆتەی باوەژنێ یان بۆلای جوجکان بوو یـا بۆلای گوڵەکان، یا بۆ سەما و سوڕدان و دەخۆ هەڵدانێ!.

منداڵ بە کەلەکێوە دەهات و دەچوو و وەك منداڵی چووکەڵە لەبەردەمی مریشکە کورکێ لاقی هەڵدەکردن و لەسەر عەردی دادەنیشت. شتێکی دەدایە مریشکەکەی و مووچـێکی دەکـرد- و ئەوجا جوجکەکان هەی لەوەی راکا: خۆیان گێف دەکردەوە و باڵیان لێکدەدان، هەروەك منداڵی تازە پێگرتوو کە دایکیان لە کۆڵانێڕا بێتەوە و بەرەو پیرییـەوە بـچن، رایـان دەکـرد و خۆیـان دەکۆشێ داویشت، تا نەکەون. ئەویش زۆر لەسەرەخۆ هەروەك منداڵی خۆی دەیگرتنەوە و یەکە یەکانی بەسینگ و بەرۆك و روومەتی خۆیەوە دەنوساندن. هـەموو دەهـاتن؛ هـەر هەمووشـی دەگرتن و هەریەکەشی بەجۆرێك دەست پێدا دێنان و بە منداڵەکەی دەناساندن: ((سەیرێ چـەند جوانن، وەنییە!... خۆشت دەوێن؟...)).



چاوەکانی بەتەواوەتی دەکردنـەوە، بـە پێکەنینـەوە ((ئـەرێ- ئـەوانیش تۆیـان خـۆش دەوێ!)) و جوجکەکەش دەیگوت: ((جیك جیك جیك)). — ((دەزانی، ئەوە دەڵێ منیش شیلان خـانم خـۆش دەوێ!)) منداڵەکە دەستی درێژ دەکرد، کە جوجکەکە بگرێ. لە دارگوڵێوە فێرببوو رایاننەمووسێ و ئازاریان نەدا. زۆر بە نەرموشلی دەستی بە پەڕ و باڵی جوجکەکان دادێنا، و بە زمـانی منداڵانـەی خۆی دەیگوت: ((نازێ، نازێ!)) و دارگوڵیش دەگەڵی دەگوتەوە: ((نازێ، نازێ!)).

مریشکەکە هەروا لەجێی خۆیەوە زۆر خانمانـە راوەسـتابوو و سـەیری دارگـوڵ و جوجکـەکانی دەکرد و زۆری پێخۆش بوو کە دەیدیت جوجکەکانی بوونەتە جێی سەرنجی خاوەن مـاڵی و وەك دایکێکی کە ببینێ گەورەی گەڕەکێ دەست بەسـەری منداڵەکـەی دادێنـێ. بـۆ هەریـەك لـە جوجکەکان شتێکی پێبوو: قاوغە شـخارتێکی لەبـەر باغـەڵێ دەردێنـا کـە هەمیـشە چـەند مێشێکی تێدابوو. جوجکەکان هەریەکە و بەشی خۆیان دەبرد و دەڕۆیشتن.

جاری وابوو دەکۆشێ خۆی دەنان و بەکۆشی پڕ لەجیکەجیکەوە دەهاتەوە ژووریێ، دە حاڵێکدا کـە مریشکەکە بە سەرنجێکی زۆر ئارامەوە بەڕێی دەکرد. دەیزانی کە منداڵەکانی دە دەستێکی پـاك و دڵنیادان و دێنەوە، کێ دەڵێ مریشکەکە پێی وانەبووە ئەو کچە پەرستارە و دەیانباتە گەڕانێ.

جارجارە بۆ خۆشی هەر دەهاتە سەرێ و لەبەردەرکێ رادەوەستا و سـەرێکی خـوار دەکـردەوە و پێی خۆش بوو! هەر کە دەگەیشتەوە ژووریێ دەیگوت: ((ئەها ئاغا، سـەیرکە چـەند جـوانن؟)) جوجکەکان دەندووکە زەردەکانیان لێك کردبۆوە و جیکەجیکیان بوو. بابە دەرگـای پێکـەنینێی دەکردەوە، من بە شەوق و تاسەوە گەرم دادەهاتم، لایتەکەی باوەژنێ بـێ ئیختیـار پێـدەبوو، و منداڵەکان بەروخسارێکی گەشەوە چاویان دەکۆشیەوە دەبڕی و ئەو بەو حاڵەوە کۆشی بەردەدا و جوجکەکان جیکەجیك بەناو پیاڵە و ژێرپیاڵە و سەرسفرەی وەردەبوون و بە راکەڕاکەوە پەرت و بلاو دەبوونەوە: ئەوە ئێستا بابە نانی خواردبایە! وەك بڵێی کارەسـاتێك قەومابایـە، سـەماوەر بەسەر یەکێکیدا قلپ بووبایەوە کتوپڕ ژوورەکە دەبووە قەوغا: جوجکەکان دەکەوتنە نێو پیاڵـە و ژێرپیاڵانەوە، منداڵە بچکۆلەکە بە گاگۆڵکانەوە بەدوای جوجکەکانـدا دەخـزی، بابـە ئـەوق بەلام رووخۆش و خەندان، کشەکش جوجکەکانی لەسەر سفرەی دوور دەخستنەوە و باوەژنیش بە تووڕەبییەوە لە سەماوەرەکەی دەتەکاندنەوە، دە حاڵێکیدا کە دارگوڵ هەردوو دەستی بەدەمیەوە گرتبوون و سەری بەردابۆوە و خۆی رادەژاند. خۆ ئەگەر هەردوو دەسـتی بەدەمیـەوە نـەگرتبان

ئەوە لافاوی پێکەنینیٚ ژوورەکەی دەبرد. دەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو هەموو هەوڵ و تەقەللایەی دەدا، دیسانەوەش وردە کەنووی بە ئەندازەی پێویست و زیاد لە پێویستیش لەولاولای دەمولێویەوە هەر هەڵدەڕشت و ئێمەش وەك جوجکان کە دانیان بۆ هەڵدەی بەهیوای دەنکەکەنووان دەندووکمان زیاتر دەبۆوە و هەر کە دانەکە دەکەوت لێکترمان دەفڕاند و وەك جووجەلاٚن جیکەمان لیٚ هەڵدەستا... تا ئەوەی سەرەنجام دەچووە لایەکییەوە و مووچێکی دەکرد و کۆی دەکردنەوە... چەند جوانیان رادەکرد، و چەند جوانی لەسەرچەنگان مووچ بۆ دەکێشان، و بە چ چاوبادانێکی بەلای خۆیدا دێنانەوە!- جووجکەکانیش پێدەخەنین. خەندەت دەچاواندا دەدیتن، و دەتزانی کاتیٚ کە دەگەنە نێوکۆشی وەك بچنەوە بن باڵی دایکیان بەهەمان جووڵە و باڵەفڕکە سوك و جوانەکەیانەوە کە سەریان لەبن باڵی دایکیانەوە دەردێنا ئاواش دەکۆشی وییاندا دەندووکە زەردەکە لەلایەکی کۆشیەوە دەردێنا و دەیان جیکاند. باوەژن سەری بادەدا ((ئاخری کارێکی وا دەکا رۆژێکی مریشکەکە بە دەندووکیٚ چاوی منداڵەکەش دەرێنیٚ!)) ئەم، لێکدانەوەی وی لەو چیرۆکەی خۆشەویستییەوە بوو و ئەو پێکەنینەشی هەر بە زۆڵیەتی بوو.

ئەوە رەفتاری دەگەڵ جوجکان و ئەمەش هەڵسوکەوتی دەگەڵ گوڵ و گیا و گۆلاٚن! بابە زۆری حەز بە گوڵ و گیا و گۆلاٚن دەکرد و چەندین گوڵدانە جەعفەریی و رەیحانە و شەوبۆ و شا پەسەندی هەبوون: ئەوانەی هەموو لەسەرلێوی پەنجەرەی ژووری خۆی ریز دەکردن و دایدەنان؛ یا کاتیٚ کە دە دالاٚنەکێی بەرەوەدا دادەنیشت لە هەیوانێی ریز دەکردن. دارگوڵێش شەیدای گوڵ و گژ و گیابوو؛ خۆ بەخۆڕایی نەبوو کە دارگوڵ بوو! کاتیٚ کە بێکاربایە وەك منداڵاٚنی چیرۆك بۆ گوڵەکان دەگێڕایەوە؛ وەك هەر پارچە کچۆڵەیەکی تەنیا کە زیاتر پشت بە خەیاڵ و ئەندێشەکانی خۆی ببەستێت و دەگەڵ ئافەریدە پوخت و خاوێنەکانی خەیاڵدا بکەوێتە یاری و گفتوگۆوە و خۆی سەرقاڵ کات... هەقیشی بوو: دنیای خۆی ئاوەدانتر بوو، راستییەکەی نەمدەزانی چۆن لە کەللەی نادات و روو لەکێو و بەندەن و لێڕەواران ناکاتەوە و لەو جێیە تەنگەبەر و تەسك و تروسکەی هەڵنایەتەوە؟ ئێرە چی جوولاٚن و وەرە و بڕۆیە نەبوو... تازە دەزانم کە دڵداری دەردێکی گەورەیە و ئادەمیزاد و تەنانەت گیانلەبەر و گژ و گیاش پەل بەستوو دەکات. کیٚ دەڵیٚ ئەگەر ئەو دەردەی لەسەر لاچووبا دەستی دڵدارەکەی نەدەگرت و



دەگەڵە خۆی بەرەو کێو و لێڕەوارانی نەدەبردەوە و منداڵەکانیشی بە ئاوازی چیاییانە دەخە و نەدەکردن یا دەگەڵ نیگارکێشی خەیاڵدا کێو و لێڕەواری بۆ نەدەهێنانە نێو ماڵیٚ؟...

چۆکی لەبەردەمی دادەدان و دەیگوت: ((باشە، گویٚ دەگرن یانە نا؟... بەڵیٚ، هەبوو نەبوو... هەی بڵێم خودا چت لێبکا! خوایە خێر لەخۆت نەبینی!)) کاتیٚ ئەمانەی دەگوت کە پشیلە وەنیو رەیحانەکان کەوتبایە و پۆتەلاك و بسکیان ئاڵۆزبانایە، هەروەك دایکێك یا خوشکێکی گەورە، لە گوڵدانەکان نزیك دەبۆوە، و دەستێکی بەسەر و رووی گوڵەکان دادێنا: ((وای کچەکەم، خوا بمکوژیٚ، دایکت بمریٚ- ئەوە گەرماتە، ئەریٚ؟ تینووتە؟ وای، چۆنی هەڵدەمژیٚ! کۆرپەکەم زۆری تینوو بووە، دەك دایکت بمریٚ!... پەلەمەکە، دەتدەمیٚ، دەزانم تینووتە... دە بنت دەکەم... جارێکی دیشت ئاو دەدەمەوە!... ئەی وای سەیری ئەو کچە بەلاٚیەی- چۆنی بالاٚ کردووە! — ماشەڵلاٚ، ماشەڵلاٚ!... وای، قوڕم بەسەری- ئەوە بۆ سەرت دەنێو سەروقژی خوشکەکەت ناوە!)) و دەستی دەبرد و زۆر بەناسکی و دایکانەوە سەری گوڵەکەی لە لقەکەی دی دەکردەوە و گوڵدانەکانی دێنانەوە سێبەریٚ: ((وای، وای، هەرچاکە شێت نەبوون... ئەی کوێراییم دایە- هەر لەبیریشم نەبوو... مەگری کچم... کچۆڵەکەی دایە!... داییت بە قوربان بیٚ!)).

هێندەی بە نەرمییەوە لاخەکە راست دەکردەوە لە دیتنێی تێر نەبی. ماندوو نەدەبوو، ئەگەر وازت لێهێنابایە تا ئێوارێی دەدواندن و دەیدۆزین، وەك وەرزێریکی کە لەشی زەوییە بدۆزیٚ و پێشکە و مێشوولانی لێبگریٚ، هەر زینەت بوو تەماشای کەی)). واخ واخ واخ، دایکت بمریٚ... هەموو لەشی موو خواردوویەتی... دەك لێت شین نەبێتەوە... خوا کوێر و زەلیلت کا! وەی لەو نووسەکەی، هەر دەڵێی گەنەیە، بە لەشی کۆرپەکەمەوە نووساوە- و خوێنی دەمژیٚ... دەك بە زەهری مارت بیٚ، ژەقنەمووتیٚ خۆی خوایە!)) و گوڵەکان تێدەگەیشتن و دەیانناسییەوە، هەر کە چاویان پێی دەکەوت سەروبسکیان رادەتەکاند و سلاٚویان دەکردن ولاخەکانیش وەك کاریلە بزۆزە شەیتانەکان خۆیان هەڵداویشت- بەتایبەتی سەر لە بەیانی و ئێواران کە شنەبایەك هەبایە و کلۆقەندێکی کە جارجارە بۆ دەگوڵدانیٚ داویشتن لەسەرەخۆ دەیانمژی.

ئەزقەزا ئەگەرەکو لە گوڵبازییە ماندووبا لەبەر پەنجەرەی دادەنیشت و بەناوکە قەیسیان دەکەوتە هەڵماقۆیە (پێنج بەردووکیٚ)- و باوەژنە لەو رەفتارەی زۆر گرژبوو. ((پیشەتە، پیشەتە هەی باوان مردە! هەر کە ئەو مریشکە بێنەوایە ویستی یەك دەقیقە خۆ دەخۆڵیٚ وەردا

و تۆزە تاوێکی لێدا ناکەسە وەك نامەی بەدوادا بنێرن بەسەروچاوە گەڕو گولەکەیەوە پەیدا دەبێتەوە، ناکەس!)) و ناوکە قەیسی و وردە بەردی دەگوڵدانەکاندا هەڵدەگرتنەوە و بەپشیلەی دادەدان و مریشکەکەی پێ ئاگادار دەکردەوە.

لەشیر دۆشینێ- زیاتر، مەڕ و بزنەکانی دەدۆشین، و نەمدیوە بەلای مانگایانەوە بچێ، دەگەڵ مەڕ و بزنان زیاتر تێکەڵ بوو- هەر کە بەخۆ و ستلۆکەوە دەگەیشتە مەڕێکی یا بزنێکی ئەو بەستەزمانە زۆر بەخۆشییەوە پاشووی لێك بلاودەکردنەوە و پشتی کووڕ دەکردەوە تاجێی دەستی باشتر ببێتەوە بۆ دۆشینێ. جاری وابوو مەڕەکە خۆی داویشتە سەر دوو دەست و پاشوویکی و لاقێکی بلند دەکرد و خۆی لار دەکردەوە تاکارەکەی وی ئاسانتر بێت و هەر کە سەرپەنجەشی دەگەیشتە گوانی ئیدی ئەوە شیری بەرهەڵدا دەکرد. جاری وابوو هێشتا کارەکەی نیوەچڵ نەکردبوو بزنێك دەهاتەوە لای و وەك تکای لێبکا بیدۆشێ چاوی بەلای ویدا دەگێڕان و وەك دارگوڵ دەو زمانانە بگات- و تێشدەگەیی- بە ناقایلییەکەوە، وەك دایکێك بە کۆڕپەکەی بڵێ، دەیگوت: ((نا خانم گیان، جارێ نا... جارێ نا... پەلەمەکە، کەمێکی دیش بدە ئەوجا... مەترسە، دڵت هیچ نەکا، بای کۆڕپەکەت دێڵمەوە، بۆخۆم ئەقڵم پێدەشکێ!)) دەست و پەنجەکانی بەریتمێکی تایبەتییەوە، وەك سیحربازان یاری بە چەند تۆپێکان بکات و هەڵیاندا و بیانگرێتەوە، ئاوا و زۆر بەجوانی سەروخواری پێدەکردن و گوانەکانی دەگوشین و بەرهەڵدای دەکردنەوە. ئەوجا دەیگوت: ((باشە- زۆر باشە. ئەوەش بۆ بەرخۆلەکەمان... باشە؟ خۆ ئێستا قایلی؟)) بزنە رازی بوو، دەیزانی ئەقڵی پێدەشکێ، ستلۆکەی شیری دەبن تەژگەڵی خۆی دەنا و هەر کە کارەکەی تەواو دەبوو بە یەك دوو لوێچە خوێیانی میوانداری دەکرد- بزنەکە دەیزانی، ئەو هاتوچۆیە و چاوگێڕان و تەماشاکردنەشی هەر بۆ هێندێ بوو، کە نەکا لە بیربکات و نەیداتێ.

هەروا بەو جۆرە کە لە پەنجەرێڕا سەیرم دەکرد و ئەولەش و لارەیم لە نزیك بزنێك یا مەڕێکییەوە لەسەر چیچکانەوە دەدیت دەدڵی خۆمدا دەمگوت: تۆ بڵێی لەبیری ستلەشیری تۆشدا بێت؟ یا هەر تەنیا ستڵەشیری بزنێی دەبن داوێنی کراسیدا دەشارێتەوە؟.

شیرەکەی دەبرد و دە مەنجەڵەکەی بن تریانە گەورەکەی دەکرد و دەهاتەوە. کاتێ کە کار و بەرخیان بەرهەڵدا دەکردن دونگۆڵەی بەرخان هەروا تەکە تەکیان بوو دەهەوا دەچوون و کاریلەکانیش بە هەڵەداوان و هەڵبەز دابەز و جوتکە هاویشتنێوە دەهاتن، ئەو لەلایەکی



رادەوەستا: کاروبەرخ سەریان دەبن پاشووی داکەکانیان هەڵدەکرد؛ مەڕ یا بزنەکە دەسووڕانەوە و بۆنێکیان پێوە دەکردن، یا رادەوەستان یا ئەگەر بێچووەکەی نەبایە کە سەری تێهەڵکردووە زۆر بەڕقەوە لە بەری هەڵدەهات ئەودەمی کار یا بەرخەکە بەرەو لای مەڕ یا بزنێکی دییەوە دەچوو... بێچووەکان گوانەکانیان دەدیتنەوە و سەریان دەبن زگی داکیان دەکوتا؛ دەنگی موغ موغی شیری ناو گەروویان دەهاتە گوێ. جاری وادەبوو کاریلەیەك تەرە دەبوو یا بزنێك تێی هەڵدەدا، ئەودەمی دارگوڵ دەهات و بەچاوە جوان و برۆتێکنانە جوانەکەیەوە چاوی لە بزنەکە سووردەکردەوە و دەیگوت: ((تەریق نابییەوە زمان درێژەخان، تف لەو سەر و قەپۆزەت! ئەگەر یەکێکی دی وا لە بێچووی تۆ بکا پێت خۆشە!... تف لەو سەر و قەپۆزەت، بێ ئابڕوو!)) و کارە سپییە تەریوەکەی لە گوانی بزنەی تەنیشتییەوە دەکردەوە و دەیبردەوە بن زگی داکەکەی خۆی)). برۆ بە خوام سپاردی... ها ئافەرین!)). ئەوجا رادەوەستا و بەسەر و روویەکی خۆش و چاوە نەرمە پڕ لە خۆشەویستییەکانیەوە دە چوارپەلە باریك و ناسکەکانیان و دونگۆڵە و لەقە لەقێ کلکەکانیانەوە رادەما و گوێی بۆ موغەموغی گەروویان شل دەکرد. زۆربەی بزنە (توێشتیرزا)یەکان[2] دەدەمی مشتنێدا ختووکەی گوانانیان بەدەمی بێچووەکانیان دێت و پەلان داوێن. ئەودەمی دارگوڵ دەچووە کۆمەکێ بێچوو و داکەکەی، داکەکەی دەگرت، و دڵی دەدایەوە: ((عەیب نییە... رادێی... ئاخر ماشەڵڵا ئەوە ئیدی تازە خانمی!)) و دەستێکی بەپشتیدا دێنا. دوایە دایکەکە دڵی دەچووەسەر بێچووەکەی و بەزەیی پێدا دەهاتەوە، دەستێکیشی بەپشتی ویشدا دینا و دەیگوت: ((ئافەرین کۆرپەکەم؛ تۆش هێندە شەیتانیان مەکە... کەمێك هێواشتر، ئاخر دایەش گوانەکانی دێشن.... ئێ- ئافەرین!)) رادەوەستا تا مەڕ یا بزنەکە بەکاوەخۆ، بە ئارامییەوە لاقی، جاری وابوو تەنانەت بەسەر سەر بێچووەکەیدا رەتدەکرد و وەلادەکەوت و بێچووەکە هەر لەجێی خۆیەوە رادەوەستا و دەمولەوسی خۆی دەلستەوە... زمانی گولانی فێرە منیش کردبوو. ئێستا منیش دەنگی نەوایانم دەبیست؛ زمانی جوجکە و کارو بەرخانیش فێرببووم- ئێستا هەموو ببووینە ئاواڵ و تروسکەی خۆشەویستییەمان دەچاوی یەکتریدا دۆزیبۆوە. بە کۆمەکییەوی ماڵەوەشم هەر دۆزیبۆوە.

[2] توێشتیرزا: بەشێوە زمانی نێو سورچیان بەو بزنەی دەڵێن کە بۆ یەکەمجار دەزێ و کاریلەی دەبێت. بەلام بەمەڕی یەکەمجار زاو دەڵێن ((بەردیرزا)) کە بەرخی دەبێت —وەرگێر-.

ئێستا دەمزانی کە لەودیو ژووری دانیشتنیۆەش ژوورێکی دی هەیە کە بە دەرگایەکی تەلبەندی سەرتاسەری لە ژوورەکە جیا دەبێتەوە؛ یەکەمجار بوو دەرو دیوار و ژمارەی تاقەکانم دەدیتن، و دەمزانی کە لووت و لێوی باوەژنیٚ کورتیلەن، و چاوەکانی قوولڵ و لێك نزیکن و گوارەکانی سێ گۆن. ئەو منی بەئاگا هێنابۆوە و وریای کردبوومەوە. تا ئەوودەمی هەستم نەکردبوو و نەمدەزانی کێ بەکێیە و دنیا چ باسە. ئێستا دەمزانی کە خۆم بێ خۆمم و ئەگەر بمانەوێ دنیا ئێمەیە و دنیا جوانە و دەوروبەرمان هەمووی خۆشییە و خۆشی رژاوە و هەر یەکێکی دەوێ بجوولێ و خڕکاتەوە و وەمالێ و ئێستا خۆم بووم کە ئەو خۆشیانەم لە حەوایڕا دەقۆزتنەوە- دەگەڵ هەر هەناسێکیدا هەڵمدەمژین و لە زمانی هەر شنەی شەماڵێك و باڵی هەر ساتەوەختێکیمەوە دەگرتنەوە؛ و دەمدیت ئەوا دنیا بە کۆشێك گوڵەوە پێشوازیم دەکات و بەپیرمەوە دێ، و ئەولایەکی کۆشی گرتووە و مووچێ دەکێشێ و خۆشیش کە وەك جوجکەی تازە تروکاوە و باڵاٚن لێکدەدا و خۆی دەکۆشی ویدا مات دەکات، و هەر خۆشیە کە ئەو دەیماڵێتەوە و باقە باقە بەدەر و ژوور و هەواو رێی کانییە و سەرکانییەوەی وەردەکا. هەر هەناسێکی کە هەڵدەکێشا بەلای منەوە تروسکەیەکی شادی ئەوتۆبوو ئەو ناوەی رووناك دەکردەوە- و سەرتاپام ببووە رووناکی؛ و لەوە سەیرتر ئەوەبوو کە ئەو دیار نەبایە، نەك دنیام هەر بەتاریکی دەدیت، هەستی نەبوونێم دەکرد، دەگەڵ ئەوەشدا کە دەمزانی دنیا هەر ئەوەندە جێیە تەنگەبەرە نییە کە هەناسەی تێدا دەدەم، و زۆر لەوە هەراوترە، ومنیش هەر تاکە ئادەمیزادێکی دیکەی نێو ئادەمیانم؛ هەر دەوکاتەشدا دیسانەوە وامدەزانی کە من تاکە ئادەمیزادێکی دیکەم و ئەودنیا هەراوەی پێشدانم لێ تەنگتربۆتەوە! بەڵێ هەر کە ئەو دیار نەبایە هەرهەمان ئەو جیهانەم هەموو لەبیر دەچۆوە؛ لەبیریشم نەدەچۆوە، چونکە دەگەڵە وی رۆیبوو؛ ومن خۆم دەنێو بیابانێکی زۆر گەرم و هەراودا هەست دەکرد- بێ هۆش و گۆش!.

ئەوە چ ژیانێك بوو وا بەلای خۆیدا کێش کردبووم و لە هەموو ئەو جیهانەی دوور خستبوومەوە؟... پابەندی وی بووم؛ ئەگەر ئەو دیار نەبایە منیش نەبووم، بەلاٚم هەر ئەو دەرکەوتبایە ئیدی ئەوە منیش هەبووم، ئەو هەموو شتێك بوو- و هەموو شتێکیش بەوییەوە خۆش و جوان و خەندان بوو. من لە هەمووان خۆش و خەندانتر. ئایا ئەویش هەروا بوو؟. وەك بەردی بن گۆمیٚ دەگۆمی بوونی ویدا ون ببووم، ومن ئەم ((بە بەردبوونە))م دەگۆمی بوونی ویدا ئارەزوو بوو و زۆریشم پێخۆش بوو. بەلاٚم ئاسوودەشی نەبووم، من هەم دەناو گۆمێدا بووم



و هەم دەگەڵ گۆمێشمدا گێژ دەخوارد و ئاوی گۆمێم دەبەردی بوونی خۆمەوە دەسوی و بەردەش هەر بەرەو خوار و خوارترەوە دەچوو، و بلّقی دەدانەوە- گۆم پێدەکەنی و بەردیش دەرۆیی. بەلاٚم بەردەش هەروا بێکار نەبوو؛ ئەویش هەروا دەگەڵ رۆچوونیٚ خۆیدا ناخی گۆمەکەی ختووکە دەدا و ئەو قولپانەشی هەموو لەو ختووکەدانەوە بوو کە هەمیشە بەردەوام بوو...

چەند رۆژێك تێپەڕی. شەوێکی من و بابە بۆ شامیٚ بانگهێشت کرابووین... من وەك ئەو چەند رۆژانەی دوایییە نەمدەویست لە ماڵیٚ دوورکەومەوە و سەیرەکە ئەویش هەروەتر نەیدەویست. بە بابەی گوت: ((بابە، توخوا زوو وەرەوە؛ کە ئێوە لێرە نین ماڵەکە چۆڵ و هۆڵە...)).

ئایا مەبەستی من بووم؟ باوەژنە لە دواوە سەرێکی بەجۆرێکەوە بادا دەیگوت: ((دەك کوێربییەوە دنیایە، خۆ شەرم و شکۆنەماوە؛ کچە خەریکە سواری سەروکۆڵی پیاوان بێ! هەرهێندەی ماوە دەرپێیەکەی بەسەر سەری دادا و بە کۆلاٚنادا بسوڕێتەوە! ئاخر زەمانە بەخودای؛ سەیرکە دنیا چی بەسەرهاتووە کە کچە ((قەرەواش)) —کارەکەر- زۆریە لە ئاغای ماڵیٚ بکا زووبێتەوە تا دلّتەنگ نەبیٚ!)).

بابە گوتی: ((بە چاوان، کچەکەم، زوو دێینەوە؛ هەر بۆخۆشم ئەورۆ زۆر بێ وازم)). و پێکەنی. باوەژنە دەدلّدا گریا و دارگوڵ چاوە جوانەکانی بەلای ویدا سووڕاندن، هەروەك منداڵێکی کە، بابی دەستی لە پشتیٚ دابێت و پشتی گرتبیٚ و داکەکەی دڕدۆنگ کردبێت؛ و هەر کە سەرنجیان تێك ئالّقان پڕمەی پێکەنینێی دە ژێرپیاڵەکەی دەستییەوە کرد و چایە ساردەکەی هەموو بە سینگ و بەرۆکیٚ خۆیدا پژاند، ئێمە هەموو هەوت بووین و ئەو پیاڵەکەی لە دەست بەربۆوە- جا خوداو راستان بشکیٚ یا نەشکیٚ- و من دەگوڵی بەڕەکەوە رامام، و ئەویش بەسەری دوو قامکان، یەخەی کراسە تەڕەکەی گرت و لەخۆی دوورخستەوە و لایەکی سینگی وەدەرکەوت- ئەوە گوایە من سەیری گوڵی بەڕەی دەکەم! —و دەستیکرد بە فوو فووکردنیٚ، و باوەژنە گەشایەوە لەخۆشیان: ((باش بوو؛ بریا هەلّپڕوکابای!)) و ئەوکشتەکی پێکەنینێی پساند و باوەژنەش ناچاربوو دەگەڵەویدا دەستی بە پێکەنینێی کرد، ئاور گرتووە... حەکەدار، بە عالەمی ئاشکرا وەکەڵ هاتووە! راستیان گوتووە، ژن تا حیزتر بێت لەکن پیاوان خۆشەویسترە! دەك خوا ئەو ژیان و گوزەرانەی ببڕیٚ! — ئەوە قسەی باوەژنیٚ بوو...

ڕۆژئاوا ببوو، بەڵاّم هێشتا هەر ڕووناك بوو، كارەبا هەڵنەكرابوو. لە ماڵێ هاتبووینە دەرێ، دەچووینە ماڵێ سەرهەنگی سەرۆك پاسەوانی سنوور. گەیبووینە پردی شێخی كە، بابە ڕاوەستا و گوتی: ((ئەگەر دەتوانی بگەڕێوە، بچۆوە ماڵێ هێندێكم لە جگارەكانی خۆم بۆ لە پوورێت وەرگرە؛ ئەو جگارە خراپانە سینگم نارەحەت دەكەن. من دەچمەوە سەری خیابانێ، ڕاوێچكان دەكەم تا دێیەوە- درەنگ نییە، هێشتا ماویەتی)).

هاتمەوە، كەس لە حەساریێ نەبوو. دارگوڵ لە هەیوانێ بوو و خەریكی ستلّەشیران بوو سەرەوبەرەی دەكردن هەر كە دیتی گەڕامەوە ریتمی جووڵاّنەوێی گۆڕا- بە ئاشكرا هەڵچوونی پێوە دیاربوو. منیش بە دیتنێی دڵم كرایەوە، بەڵاّم هەلی تێڕامانێ ئەو شادییەی نەڕەخسا. هێشتا دوو هەنگاو لە دەركێ نەچووبوومە پێشێ كە ئەو مانگایەی دوێنێمان كڕیبوو لەپڕ وەك شێتان لەجێی خۆی دەرپەڕی و بەچاوی سوورەوە لەلای چاڵەكەیڕا تاوی دامێ و هێرشی بۆ هێنام... تەكانێكم دا... ترسام... بەدزە دزەوە ئەوە چاوێكیشم هەر لەوییە... و بەرەو لای دیوارییەوە چووم، خراپترین كارێك بوو كردبێتم: خۆم هاویشتبووە تەنگنایەوە و خۆم عاسێ كردبوو: هێندە بەس بوو پشتم بەدیوارییەوە دات و ئیشم ببینێ.

دارگوڵ زریكاندی: ((وای خانم... وای خانزاد... ئاغای كوشت!... وەحە وەحە!... ئاغا خۆ لە عەردی دە... خۆت لە عەردی دە!)).

مانگا هەر هێندەی مابوو بمگاتێ و شاخیم دە سینگ و پشتان كا، خۆم لە عەردیدا، هەردەو دەمیدا كە خۆم لە عەردیدا و ویستم خۆ لە شاخەكانی لادەم ڕاست كەوتمە نێوان هەردوو دەستەكانیەوە. مانگای تووڕە گەیبووە سەرسەرم. بێ ئیختیار هەردوو دەستم دەسەرمەوە وەرێنان. هەرچەندە نەمدەوێرا سەرم وەرسوڕێنم، نازانم چۆناوچۆن، بەڵاّم دارگوڵم دیت كە لەپلیكانەكانڕا هاتەخوارێ، و هەردوو دەستی بەڕووی مانگایەكەدا درێژكردبوون و ناو لەپی دەستەكانی تێكردبوو و دەستی كردبوو و بەتووڕەكردنێ مانگایەكەی و تەكاندنەوەی لە ئاغای بەرەو لای خۆی، و ئەوە خێراخێراش دەڵێ: ((گژ- گژ- گژ- گژ!)) ئەوە ئەو دەنگەبوو كە منداڵ مانگایان پێ تووڕە دەكردن، وەك ئەو مانگایەی كە پێیان تووره كردبوو. مانگا هەر ئەوەندە نێچیرێكی ئاسانتر و لە دەستان خۆشتری لەبەردەمی خۆیدا دیت وازی لە من هێنا و كەوتەسەر وی. دارگوڵ دەرپەڕی، بەڵاّم لە ترسان نەیتوانی هەموو پلیكانەكان ببڕێ و



وەسەركەوێ، و لە دوایین پلیكانەی سەرێ، مانگایە هەروا سەرەموویەكی مابوو بیگاتێ... دارگوڵ دەمە و ڕووخۆی بە عەردییەوە نووساند؛ سەری كەوتبووە سەرلێوی سواندەی هەیوانێ و نیوەی بەرەوەی لەشیشی لەسەر دوایین پلە و پلەی پێش داوییینێ بوو. وای، كە ترسناك بوو! نازانم چۆن، بەڵاّم منیش هەردەو دەمیدا هەستابوومەوە و بێ ئیختیار وەدووی مانگایەی كەوتبوومەوە و هەنگاوێكی لێ دوور نەبووم... گەیشتمێ، هیچ ڕانەوەستام و كلكی مانگایەم گرت كە لە تووڕەییان ڕەپ ببوو، بە هەموو هێزێكمەوە، یەك تەكان، ڕامكێشا. مانگایە ڕاچڵەكی، هەم لەو تەكانەی كە پێمدابوو و هەم لەوەی كە یەكێكی لە دواوە خۆیەوە دەدیت... سەرسمێكیدا، سمەكانی لەسەرتاشە بەردی سەر پلیكانەكان خزی و بەسەر تەنیشتێدا كەوت و پان ڕابوو- دەگەڵ كەوتنێیدا هەموو گوێمان لە قرچەی ئێسقانی لوولاك و شانەكانیەوە بوو...

دارگوڵ لەسەر پلیكانەی دوایە كەوتبوو؛ ڕامكرد، دە ئامێزێم وەرێنا و هەڵمگرتەوە. دیاربوو لە هۆش چووبوو. دەو دەمەیدا كارەبا هاتەوە. ڕەنگی زۆر تێكچووبوو، دڵە بچكۆلانەكەی بەسەر سینگمەوە وەك دڵی باڵندەیەكی بریندارى لێدەدا. باوەژن و خانزاد و خەجێ دە تەواوی ئەو ماوەیدا، بێ ئەوەی بیانبینم، دەنێو پەنجەرەی ژوورێدا بوون و هەر لە دوورەوە و ((وەحە، وەحە، و هات و هاوار و زریكەیان بووە. هەروا دارگوڵ بە ئامێزێوە، بە پلیكانەكانی نهۆمی سەرێمدا وەسەرخست؛ و لەسەر یەكەمین پلیكانەی وێم دانا و لە تەكیەوە دانیشتم و دەستم كردە دڵدانەوێی و دەست بەسەر داهێنانێی... ((دڵت قایم بێ- مووچ!... چ نەبووە — مووچ!... چت لێنەهاتووە- مووچ!)) و ئەو چاوی لێك ناون و لێوەكانی كردوونەوە، و بە تەواوی تەسلیمە، و من دەلەرزیم، هێندێكی لەبەروی، و نیوەكەی دیش هەر لەبەروی- لەتین و تاوی ئەو هەلەی ڕێك كەوتبوو. دەو وەرە و بڕۆیەیدا ئاگاداری باوەژنێ و خانزاد و خەجێ بوومەوە كە لە پشتەوەن. باوەژنە بە ڕوخسارێكی درۆزنانەی كەمێ ڕەنگ و ڕوو پەڕیوەوە، لەپشت سەرمەوە ڕاوەستا بوو و بەچاوی زیتەوە دەهەردوكمانەوە ڕامابوو بە پێچەوانەی ئەم جۆرە كاتەی جارانییەوە لێوی وێك هێنابوونەوە. ڕەنگ و ڕووی دارگوڵی دیبوو، و گەزارەی دەركێشا بوو؛ خانزاد دەست بەدەمەوە ڕاوەستابوو. حاڵەتی چاوەكانی- چاوی باوەژنێ- دڵ مژوولیەكی پێوە دیاربوو: چاكی پێش بینی كردبوو: كە دەمویست وەك بەفری زستانێ هەرچی كەند و كۆسپی گۆرستانێیە هەمووی كێوماڵ كەم، خوێنی خان و بەگلەرانیش تێكەڵ خوێنی كرمانج و

مسکێنان کەم، تا ڕۆژێك دەبێ هەرچی جیاوازی نێوان ئەو خوێنانەیە هیچی نامێنێ. خوا ئەو ڕۆژەی هەر نەهێنا! یاخوا بکا جارێ ئەو بباتەوە ئەوجا بێت.

بەپرکێشیەوە دەخانزادێمەوە خوڕی: ((ئەوە بۆ وا ڕاوەستاوی؟ چتە دەڵێی جندووکەت دیون وا لەجێی خۆت چەقیوی و دەسەروچاومەوە ڕاماوی! ئەدی ئەوە نابینی؟ ڕاکە، ڕاکە و کوڕەکەی کاکە و ڕەحمانی بانگ کە باسەری ببڕێ، با هەر نەبێ مردار نەبێتەوە!... پووری، ئەگەر زەحمەت نییە، تۆش پەرداغێك ئاوبێنە، یابیدە منداڵێکی بیهێنێ... هەوت بووە...)) خەجێم نەدیبوو.

مانگایەکە مردار نەبوو و دارگوڵێش وە ئاگا هاتەوە. دیاربوو گەردنی لە ماچەکان حەڵاڵ کردبووم، هەرچەندە هەموو گێلێك دەیزانی کە ماچەکان ماچی ئەمەك و پێزانینێ بوون و دووربوون لە ماچی ئەوین و حەز و ئارەزووێوە. گەڕامەوە لای بابە. توڕە دیاربوو؛ ناوچەوانی تێکنابوو و راوێچکەی دەکردن و بەپێچەوانەی جارانەوە هەنگاوەکانی خێراخێرا بوون. دیاربوون پێیوا بوو هەلم وەگیر کەوتووە و چوومەتەوە دلّدارییە! هەر کە ڕووداوەکەم بۆ گێڕایەوە نێوچەوانی گەش بۆوە.

لەدوای ئەمەوە هەر بەیادی ئەو بەسەرهاتەوە کەوتمە داوی ئەویندارییەوە، بیر و هۆشم گیران و خەیالّم باڵی گرت و دوای ئەمە یەکێك لە بەزمەکانی بابە بووە دانانێ دارگوڵ و پێ گێڕانەوەی شەڕی من و مانگالێ. ((باشە، دەی دادە گوڵ، ئاغا چووکەڵە چی کرد؟... مانگایەکە چۆنی داهاتێ؟... گوتت ئاغا چووکەڵە خۆی تەڕکردبوو، ها؟- من باوەڕ ناکەم، دەی بیگێڕەوە بزانم...)) و من بەوەی کە خۆم تەڕکردووە پەلم لە ئاسمانێ دەدا.

دارگوڵ، بەدانیشتنەوە، خێشەخێش، دەهاتە نێوەڕاستی ژوورێوە- دەم بە پێکەنین و جوان، هەرزەکارانە، پێش گێڕانەوەی ڕووداوەکە خۆی دەخستە سەر هەر چوارپەلان و دەیگوت: ((ئێستا، وەك من ئاغا چکۆڵەبم... با بلّێین خانمیش مانگایەکە بێ...)). باوەژنە شین هەڵدەگەڕاو دەیگوت: ((با بابەت مانگایەکە بێ- هەر هەویشە... چەتیوەی بێ ئابڕوو... زۆری پێ لێ هەڵێناوە... هەر ئەوەی ماوە لەبەرچاوی سەرداری ماڵێ ئەوەی ناکرێ پێمان بکا!... زمان درێژەی حەکەدار!)) و پاڵی دەدایەوە.



بابە زۆر بە خۆپارێزییەوە، پێدەکەنی و لە دامودەزگای تریاکەکەیەوە ڕادەما؛ منداڵەکان کە بەوپەڕی تاسە و ئارەزووەوە بەدوای گێڕانەوەی ڕووداوەکەوە بوون. لەپڕ تێك ڕادەبوون و مات دەبوون، دارگوڵ هەروا لەسەرچوار پەلانەوە لێوی وێك دێنانەوە... ((باشە خانم، من چبکەم، ئاغا دەڵێ... خۆ من لەخۆمەوە وام نەگوتووە... کەواتە بۆ نارەحەت دەبن... باشە، با وایدانێین ئێستا من مانگایەکە بم یا ئاغا چووکەڵە...)) ئەوجا ((جا بە من چی... من هەر نەمدیوە)) و زیز دەبوو و باوەژنە لەوەی دلّگیر و ناڕەحەت دەبوو کە، بابە جگە لەوەی کە خەمی مانگایەکەی نەبوو و گوێی نەدەدایە، ببووە مایەی گاڵتە و گەپ و قەشمەریانیش، هەربۆیە وەك پیرە قەلەمونێ لەبەر سەماوەرێ دادەنیشت و پیشی دەخواردەوە...

هەروەك گوتم مانگاکەیان تازە کڕیبوو و هەروەك کە ئەحمەد لەبیری مابوو کە خاوەنەکەی گوتبووی دەبێ شەوانە هەر بیبەستنەوە، چونکە جاری وایە لەسەری دەدا و مۆزێ دەکا، بەلاّم ئەحمەد وادەزانێ ئەو لە کەللە دانەی لەوانەیە وەدەرکەوتنی بێ لە حەسارێ، چونکە لە دەرکە داخستنێ حەسارێش دلّنیا دەبێ ئیدی هیچ گوێ ناداتێ... باوەژنە لە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی خۆیدا زۆر دەگەڵ دارگوڵێدا خراپ بوو. تەنانەت نەیدەهێشت ((سابونێ بۆنخۆش)) دەکاربێنێ. دوای ئەمەبوو کە یەکەمین داواکارییە سادەو ساکارییە منداڵانەی خۆی ئاشکرا کرد: بەدەنگێکی تا بلّێی سادە و منداڵانەوە زۆر بە سپایی و بەچرپەوە، وەك منداڵێکی بەدزی دایکییەوە داوای بووکەشووشەیەك یا شتێکی یاری لەمامی یا لە خاڵی بکات، شانەکانی نەوی کردن و سەری هێنایە بن گوێمەوە: ((ئاغا، توبی و خودا سابونێکی لۆکسم بۆ بکڕە، دەیکڕی؟ - باشە؟)) چووم و لەجیاتی یەکێ دووم بۆ کڕی، کە هەمیشە یەکێکی هەر دەبەر باغەڵێ کوڵەجەکەیدا بوو...

هەستم دەکرد- لەوانەبوو ئەوە هەر گومانی خۆشم بێ- هەستم دەکرد کە دەمارێکی نەفرین دەچاوی بابەیدا بەدی دەکەم... نەفرین لەمن. بۆ؟ تۆ بلّێی بابە هەر بەڕاستی دلّی بەدارگوڵێوە بێت و پێی وابێ ئەمن ڕێگریم، یاخود ڕەفتارەکانی ئێمە بیرەوەرییەکانی خۆی وەبیر دێنێتەوەو سەیر دەکا ئێستا پیربووە؟ دەزانم کە پیری هەموو شتێك لەبەرچاوان دێخێ، بەلاّم هۆی توڕە و تۆسنی و نارەحەتییە بابەم بۆ نەدەچۆوە سەریەك.

دەمزانی کە هەموو کەسێك چێژ لەشتی جوان وەردەگرێ، و هەموو کەسێکیش بوونی دیاردەیەکی ئاواجوان و لەو تەمەنەشدا بە بەهرەیەك دادەنێ. دەمزانی کە ئەو کەسە هەرچەندە غەمی دنیای لەسەرشان و کۆڵی کەڵەکە بن بە دیتنی زەردەخەنەیەکی ئەو جۆرە مرۆیانە و ئەو پاکی و بێگەردی و جوانییە باری سەرشانی سووك دەبێت... دەمگوت ئەدی یانی چی، بڵێی تەریق بێتەوە و شەرمێ بکا! نازانم تۆ بڵێی ئەویش دەدڵی خۆیدا نەڵێ کە ئەمە کارێکی نابەجێیە، هەست بە خراپە و نابەجێی کردنیش خۆی لەخۆیدا شتێکی چاکە! و ناشزانم داخوا ئەو ئەوکچەی بەئی خۆی دادەنا، هەر بۆخۆی هێنابوو یا بەلانی کەمەوە هەربۆیەی بوو کە کچۆڵەیەك دەماڵێدا بێ- بەلاّم خۆ ئەو هەمیشە کچۆڵەی هەن!- و ئێستا من هاتبم و دەستم وەبەر دەستی نابێ و بەزیندووەتییە چاوان ماڵم لێ زەوت کردبێ! دەمگوت ئەو ژنی هەیە- ئیدی نەیدەزانی کە ئەو دەزانێ ژنی هەیە یا نە نا- هەیەتی کە هەیەتی... مانای ئەو سەرنجانە تێنەدەگەیشتم بەلاّم هەستم بەلێڵ و پێڵیەیان دەکرد؛ دارگولێش هەروەتر لەچاوی خۆیەوە دەیدیت کە پیاوەکەی نایەوێ لەلاوەتی و جوانییە دابڕێ، دەیەوێ تاموچێژی لاوەتییە لە روخساری کچەیەوە بکات و ژنەکەی خۆی لەبەر هەورازی پیریەتییە و لەوەش پیرتر بەرهەڵدا بکات. ئەمانە هەموو دەبینم و تێیان ناگەم. تەنانەت بابە رۆژێکی بە باوەژنێی گوت من قەرەواشم بۆ خۆم راگرتووە و هێناومە! یانی هەموو لەجێی خۆتان راوەستن، نابێ کەس کاری بەسەر ئەم کارانەوە بێت. راستیشی دەکرد؛ تازە نەك قەرەواش، تەنانەت کچی ماڵێ- ئەوە کام باوکێك پێی خۆشە کچێکی هەڤدە هەژدە ساڵانەی دەماڵێدا هەبێ و لە دەستەخۆی بکاتەوە؟... و من تێنەدەگەیشتم؛ تازە چۆن تێبگەم؟ من دەکەش و هەوایەکیدا بووم کە رێی تێگەیشتنێم هەر نەبوو نەبوو، یا ئەگەر هەشبوایە بڕی نەدەکرد. دە هەرچییەکی گەیبام دەوەی نەدەگەیشتم- ئاخر من بابەم وەك خۆم دادەنا و هیچ جیاوازییەکمان دەنێوانێدا نەبوو، تەنیا ئەوە نەبێ کە هەر تەنیا بە هەقی خۆمم دەزانی...

قەڵەم و دەفتەرێکم بۆ کڕیبوو، تا فێرە خوێندەواریەی کەم، و ئەو قسەشم بەرێکەوت لەزاری دەرچووبوو؛ بەلاّم وەك بروسکەم لە چاویدا، هەرچەندە ئەوەم بە رۆشنبیری خۆم دەزانی: بەواتای بێگانان: ((خێر بە ئی خۆت لەخێر بە خەڵکی کردنێ زۆر چاکترە)) و بەواتای نێوە خۆشمان خێر بەخوێش نەك بەدەروێش: با هەر لەوێڕا دەست پێبکەین، لە ماڵێ و لە نزیکەوە- جیاوازی چییە، بە واتای بابە قەرەواشیش هەر بەشێکی ماڵێیە و ئەندامێکی خێزانە...



بیرو هۆشم لە کەلێن و کەلەبەری تاریکی بوونمەوە سەرەتاتکێ دەکات و ئەویش بەسەرنجێکی شەیتانانەوە دەڵێ: ((ئای هۆقەباز- خەریکی فێڵ و فەتەرانی!... دەتەوێ هەر لە ئێستاوە هەڵێی و هەنگاوێکی بەرەو ئایندە باوێی... بەڵێ، بابڕۆین و لاوەتییە بەجێ بێڵین. ئەگەر تاکۆتاییەکەی هەروا بێت، ئیدی ئەوە بەهەشت بە هەشتێکی هەراوە... و دیارە لەوەشت چاکتر دەوێ. بۆ ئەو هەموو کەف و کوڵ و هەڵچوونەش لە کەمایەسی دەدا؟ هێشتا وەك بابە و زۆرانی دیکەش دەڵێن ماویەتی پێبگا، هێشتا زۆری ماوە... بێگومان تۆش دەتەوێ زۆر لە ئێستا چاکتر بێ، هەربۆیەش لە ئێستاوە دەتەوێ فێرە خوێندەوارییەی کەی؟ ئاوا باشتر نییە؟ جا هەروا باشتر نییە بەو روخسار و ئاوێتەییەی خۆیەوە، هەر بەو پێکەنین و نیوە پێگەیشتنەی، هەمان سینگ و مەمکە فەریکەی و هەمان دەمودووە کێویانەییەکەییەوە- بە شارستانی وەمێنی، حەیف نییە بێنی بە خوێندەوارییە ئەو هەموو شتە جوانە سروشتیانە تێکدەی و بیانشێوێنی؟ خەریکی هەڵخەڵەتاندنێی؛ خۆت هەڵدەخەڵەتێنی- متمانەت بە سروشت نییە؛ متمانەت نییە بۆیە دەتەوێ سەرلەنوێ دایڕێژییەوە! نا، کاکە، نا- درۆ دەگەڵ خۆتدا دەکەی، متمانەت بە ئەوین و خۆشەویستیەکەت نییە. راستەو راست بڵێ دەمەوێ ژنەکەم خوێندەوار بێت، شارستانیانە بێت، نوکتەزان و نوکتەساز بێت، تا بتوانم دەنێو خەڵك و ئێرە و ئەوێیاندا پێشانی خەڵکی بدەم!...

باشە، با دەست پێبکەین... بەلاّم چۆن؟ لەبەر ئەو سەرنجانەی بابەی ناوێرم، بۆخۆم هەست بەو گۆڕانانەی دە رەفتارمدا پەیدابوون دەکەم. هەست دەکەم زۆر جاران کە دەگەڵ بابە و باوەژنێدا دەدوێم بێ ئیختیار سەرم بەلای دارگولێدا دەسوڕێنم و رەزامەندییەی لێدەخوازم- ئەویش لەسەر ئەژنۆیەکانی، چونکە ناوێرم چاوان زۆر هەڵێنم، بۆیە زیاتر دەگەڵ سەر ئەژنۆیەکانیدا دەدوێم: نەمدەوێرا پردی سەرنجەکانی ماچ بکەم و بەسەریدا بپەڕمەوە و بگەمە نێو ناخییەوە، توناو توون دەڕۆیشتم. بەخۆ و بەکۆڵە باری گیانمەوە لە دووی بووم و کەچی سەرنجەکانم تۆزیشیان نەدەشکاند؛ پێموابێ دەمویست بەسەرنجەکانی گیانم دیوارێکی بەدەوردا بکێشم کە لە خۆم زیاتر کەسی دی رێی تێنەکەوێ... بێ سەر بەرزکردنەوە... رەزامەندییەی لێدەخوازم هەروەك لە هەوەڵێوە رووی قسەکانم لەوی بووبێ. هەرچەندە رووی قسانم لە بابە و پوورێش بایە سەرنجەکانم هەر بەلای ویدا بوون و چاوێکم هەر دەویەوە بوو. لەراستیدا ئەوەیان تەواو بوو، چونکە من دڵم هەر لەلای ویبوو، قسەم دەگەڵە ویبوو، چونکە ئەوەی من لێیدەگەڕام لای

ویبوو، ئەو ئاوازەی کە بە ئاماژەیەك هەڵیدەپەڕاندم لەوییەوە هەستابوو: ئەگەر ئەو نەبایە قسەم دەگەڵ کەس نەبوو؛ ئیدی بێ ئەوەی بەخۆم بزانم رووی قسانم دەگەڵە ویبوو. بۆ خۆم ئاگام لێنەبوو، بەڵام ئەو تاڵە باریکانەی هەناوم کە وەڵامی وییان دەدایەوە دەکاردا بوون و کاری خۆیانیان دەکرد و من وەك منداڵێکی پارچەڵە کە بێ ئیختیار بۆ نوقلۆکەکی وەدوای داکی کەوێ، سەرم دەدوودەنا- و چەند رێك و پێکانە دەڕۆیشتم!- تا کاتێ کە وریا دەبوومەوە و دەهاتمەوە سەرەخۆ. کاتێکیش کە وەخۆ دەهاتمەوە خۆزگەم دەخواست ئەوان لەوێ نەبان و راستە و راست رووی دەمم دەوی کردبایە و رێیان دابایە چمان دەدڵێدایە رێ و راست بەقسان دەرمانبڕییان... بابە بە ئاشکرا دیاربوو، هەم ناراحەت و هەم خۆشحاڵە. لەوەی نارەحەت بوو کە دەگەڵ ئەو هەموو ئازادییەیدا کە هەمە- دەگەڵ ئەو هەموو ئازادییەی ئەو دابوویمێ- چۆنم وێراوە ئاوا لەکن وی وابێ پەروا بەلای کچۆڵەکێدا بشکێمەوە. خۆ ئەو ئازادییە هەر دەبنچینەدا ئازادییەك بوو کە دەیاسا و رێسای بنەماڵەکەوە هاتبوو: ئەوەشی دە یاساکەدا گونجاند بوو کە لە قەڵەمڕەوی ویدا، شتێك ((ئازادی)) هەرهەبێ، لەکاتێکدا کە دەیدیت ئەوە ئاوا بێ شەرم و شکۆ و بێ مۆڵەت ئەو ئازادییەی کە بەناوی منیەوە کڕیبوو و بۆ زاوایەتییە منی دە سندوقێ نابوو و ئەوا ئەمنیش بێ پەروا بێر و بەوێیدا دەدەم و لێی خەرج دەکەم- و دیارە وەك هەموو ئەو ئازادییە کڕاوانەی وەك ئەمە، هەقی ئەوەم نییە وابکەم، بەلای وییەوە ئەوەندەی کە دەشمزانی نەدەبوو هێندە پێ لەبەڕەی خۆم زیاتر راکێشم...

هەردەو دەمیشدا خۆشحاڵ بوو کە دەیدیت کوڕەکەی گەورە بووە و وەڵامی هەندێ بانگەوازان دەداتەوە، و لە راستیدا دەتوانێ پاشماوەی بەردەوامی حەز و ئارەزووەکانی ئایندەی ویبێ. دیسانەوە لەم لایەنەشەوە هەر ناڕەحەت بوو، چونکە دەیزانی کە ئەوە مانای ئەوەیە کە ئەو تازە تێپەڕی و رۆژانی وی بەسەرچوون و دەوری وی لەو جۆرە بابەتانەی ژیاندا نەماوە، یانی چی- هەروا زوو! ئەو خۆ قەرەواشی بۆ خۆی هێناوەتەوە ماڵێ بە چ هەقێك کەسێك بۆ خۆی گڕدات؟ بە چ هەقێك دەبێ پیربێ، بە چ هەقێك دەبێ لە کوڕەکەی جیابێتەوە و کوڕەکەی بە دوپەیسەری ویدا بچێت؟... پووڕێ بەدەست هەردووکمانەوە وەزاڵە هاتبوو: لە راستیدا بەدەست هەرسێکمانەوە: بابە چاوپۆشی لە ئەندازە بەدەر تێپەڕاند بوو؛ کچەکە هەر بۆخۆی روو هەڵماڵدراو بوو. هێندەی دیش ببوو. رۆژانی جل شوشتنێ لە رکێ وی لە پێش هەمواندا جلە چڵکنەکانی منی پاك دەکردنەوە! من سەرەنجام چوو بوومەوە سەر رێ و رەسمی ماڵە باوانی



دایکم! و ئەو وەك هەموو دەیانزانی کە کرمانج هەرچی دەگەڵی بکەیت و گیانی لە گیانی دەی هەر کرمانجە و رۆژێك ئابڕووی بنەماڵەی هەردەبا. لەوەش بەولاوە، نەیدەزانی کە ئەو کچە چەقاوەسووە چی پێیە وا هەمووی ئاوا شێت و شەیدا و گیرۆدە بوون، کە قسەی دەکرد وەك هەنگوینی لە زاری بباریێ! وەڵڵاهی هەنگوینیش بایە هێندە شیرین نەدەبوو؛ دوولینگەی بەسەرملاندا هێنابوونە خوارێ؛ هەر بەناو قەرەواشە، دەنا وەکی دی خانم و خاتوونی ماڵێیە! حەیف بۆ ئەو مانگایەی- چ شیرێکی دەدا، چ گوان و گواندێنێکی داچۆڕاوی هەبوو، پیاو هەر حەزی دەکرد تەماشایان کات! ئێستاش کەس وەك مرۆڤی سەیر ناکات. روو هەڵماڵدراو، بەشێوەیەکی وا چاو و برۆیان لێك بادەدەن و بە تیلەچاوان سەیری یەکتری دەکەن هەروەك فەڕوخ لیقا و ئەمیر ئەرسەلانی رۆمی بن! و هەروەکو ئاغا و ئەو (باوەژنەکە) دوو پشیلە بن و لە بن سۆبەی خۆیان کزکردبێ! هەمووی کەمتەرخەمی و گوناهی ئەو پیاوەیە... ئەگەر بۆ خۆی هەرزە نەبایە رێی نەدەدا کوڕەکەی بە بەرچاوی خۆیەوە سواری کچە ((قەرەواش))ێکی بێت!...

من لەوە سەرسام بووم کە ئەوە چۆنە وا چاوەکانیم هێندە بە دڵنیایی و متمانەوە دەچاوان دەبڕێ، نەك وەك چاوی هەر سەر فەرماندە یاچاوی داواکارێکی سەرسەخت یا رەمۆك. چاوێك کە بە مۆڵەت و بێ مۆڵەت چاوەڕێی هیچ ئاماژەیەك نین بۆ تێڕوانینێ. بەڵام رەمۆکن... چ قەیدیە رەمۆکن، رەمۆکییەکەیان تایبەتمەندیەکی وایان تێدایە؛ کە هەر راست وەك رەمۆکییە چاوی ژنێکی کە بیەوێ هەر بەنەرمە سەرنجێکی مێردەکەی سەرببڕێ. پێڵووە قورسەکانی کە جاری وابوو واتدەزانی ماسولکەکانی ئەو بارەی پێڵووانە ناتوانن و زۆر بە سستی و مەستییەوە کە تایبەتمەندی چاوەکانی ویبوون هەڵیدێنان و دەینوقاندنەوە و پەڕەیەکی لە جوانی و شۆخی و شەنگییە وەك پەڕەی کتێبێکی دێنا و لە بەرامبەر پەردەی چاوەکانمی رادەگرت. باوەژنە حاڵەتی ئەو چاوانەی زۆر بەبێ زەوقییەوە بە حاڵەتی چاوی دێڵە سەگێکی بەبا دەچواند! دەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو حاڵەتە و سەرنجانەی، دەتگوت دوو تروسکەی بێ تاو و ئاگراوی، بەڵام وەك مۆرفینێ نەرم و شلکن، لەپەردەی چاومەوە تێدەپەڕین و دەڕژانە خوێنمەوە و حاڵەتێکی سۆفیانەی بە ناخی ناخمدا وەردەکرد، کە تەسلیم بوونی تەواوەتی بوو.

بەو حاڵەتەوە، بێ هەست و خوست و بێ جووڵە و بێدەنگ و سەنگ دادەنیشتم. هیچم نەدەبیست... بەڵام نا، دەمبیست! دەنگی پێکەنینێکی دوورا و دوور کە بۆلای خۆی بانگ

دەکردم. هەروەك خەونێکی خۆشم دیبێ — ئەوم دەخەونێدا دیبێ- لە خەوێ رادەپەڕیم... رادەبووم، و دەنێوان خەو و بێدارییەدا چاوم بەڕووی ویدا هەڵدێنا، هەروەك منداڵێکی چاو بە زەردەخەنەی داکیدا هەڵبێنێ. روخساری دارگوڵێ لەبەر پێکەنینێ شێن هەڵگەڕابوو؛ قامکی وەبەر چەناگەی منداڵەکە نابوو و هەروا مووچە مووچی بوو، و پێکەنینەکەی تێکەڵ پێکەنینی منداڵەکە دەکرد... شێن ببۆوە و جوان بە چاڵە قووڵەکانی لا رووەمەتییەوە... باوەژنەکەش هەر پێدەکەنی! هەرچەندە پێکەنینەکەی نیوە چڵ و زۆر دیاریش نەبوو هەرجوان بوو. هەموو قاقا پێدەکەنین- بەلاَم چەند پاك و بێ گوناهانە! بابە کە پێکەنینێك تەواوی دەموچاوی داگرتبوو سەیری دەکردم- بەلاَم چۆن و چ شیرین! و من ناچار بە شەرمەوە، وەك منداڵێکی کە پێی هەلاَبلێن خەنیمەوە...

چەند رۆژێك بەسەر رووداوی مانگالەیدا تێپەڕیبوو کە باوەژنە بە پێچەوانەی جارانەوە، و ئێستا، بە گومانی من، بە دەنگێکی مانادارەوە، رایگەیاند کە دەچتە حەمامێ؛ خانزادی دەگەڵە خۆیدا دەبا تا هەر کە ئەو منداڵەکانی شوشتن خانزاد لە دەرێ وشکیان کاتەوەو جلیان دەبەرکاتەوەو ئاگای لێیان بێ؛ خەجێش دەچتەوە ماڵە براکەی؛ دارگوڵ لە ماڵێ دەمێنێتەوە؛ ئەگەر ویستی خۆشی بشوا، ئاوێ گەرم کات و ((لەسەر تەندوور))ێ، کاری خۆی بکا...

باشە، بابەش دەچووە دایەرەی! من و ئەحمەد دەماینەوە. ئەحمەدیش دەبایە بچتە گوندی: رۆن و مریشکمان نەمابوون... بەلاَم من- من بێ ئەقڵیم کرد و ناشیانە بە دەنگێکی بەرزەوە رامگەیاند کە منیش ئێشێکم هەیە و دەڕۆم- و هەر بۆ سەلماندنی پەلەییەشم دەستوبرد و خێرا قاوەڵتیەکەمم خوارد، و رۆیشتم... بەلاَم بچمە کوێ، چ جێم نەبوو بیچمێ. سەرێکم لە ماڵێ داپیرێ هەڵێنا. پێی سەیر بوو، گوتی: ((خێربێ، ئینشاڵلاَ!)) پێیوابوو دەگەڵ باوەژنێمدا هەرا بووە. گوتم خێرە ئینشاڵلاَ؛ بەیانی لە رۆژان زووتر لە خەوێ هەستاوم، و گوتم دوو سێ رۆژە داپیرم نەدیوە، دڵم توند ببوو، بۆیە هاتم، گوتی: ((وەی روو رەش))یانی بۆ خۆت کەری. تۆ بلێی بەو چاوە کزانەشیەوە تیشکی چاو و ئەو بێ ئارامییەی منی دیبێ.

گوتی: ((بەلاَم پێموایە وەك جۆرێك بێت وایت، دەڵێی زۆر بێ ئارامی- وەنا؟)).

بە دڵنیاییەوە گوتم: ((نەوەڵلاَ- ماوەیەك بوو نەمدیبووی گوتم باسەرێکت لێدەم)).



چایەکی بۆ تێکردم؛ چایەکەم خواردەوە؛ سەیرێکی کاتژمێرەکەمم کرد- سەیرە، ئەو هەموو رێیە بۆ ئەوەندەی خۆ پێنج دەقیقە نەدەبوو! تا چایەکەم خواردەوە پورە فریشتە پەیدا بوو؛ خوشکی داکیم بوو. هەر کە هات نقۆرچێکی لە رووەمەتێ دام و لە پوورەکانی دیکەی زیاتر سەرکردمە سەرێ.

بەدەم پێکەنینەوە گوتی: ((باشە ئینشاڵلاَ ئەوە کەینێ بەخێر؟)) و سەرنجێکی شەیتانانەی لە روخساری دام- سەرنجێك وەك بڵێ دەزانم.

گوتم: ((چی کەینێ بەخێر، پووری؟)).

((بیستوومە بەخێر دەڵێن ژنێ دێنی)) و بە وردیە تییە ژنانەوە تێیڕوانیم.

سوورهەڵگەڕام: ((کێ گوتی؟)).

((هەموو هەروا دەڵێن... هەر تەنیا ئێمەین ئاگامان لە هیچ نییە و خواجە حافیزی شیرازی... بە ناشکوری نەبێ، خۆ ئەتۆش بوویە کابرای جۆلاَ، کە سەرجلی دەسکاری خۆی دەبەرنەدەکرد و پێی رازی نەبوو. خۆ هەر نەبێ ئێمەش کەسوکاری کرمانجانین...)).

زۆر بە ناقایلییەوە گوتم: ((ئەو قسانە چن، پووری- گاڵتەی دەکەن- لە کێت بیستووە؟)).

((هەموو هەر وادەڵێن... لە کچێ کاکە و رەحمانی دراوسێتانیان بیستووە. ئەویش گوتوویەتی لە باوەژنەکەتی بیستووە)). کەللەم کاس بوو، بەلاَم کاسێکی وانا. ئەوە یەکەمین جاربوو کە ئەو بیرەم ئاوا بەو شێوەیە بەمێشکی دابێت. وەك ئەوەی بیرێکی خراپیش نەبێ. دەڵێن نیشانەی گێلییە تەواو ئەوەیە کە بنیادەم- ژن یا پیاو- هەروا لەخۆوە بێ ئەوەی قسەی بن زمانی یەکتر بزانن و زەماوەندێ بکەن... زمان؟ کام زمان؟ هەر شارەزای زمانی دڵ بی بەسە؛ ئەو زمانەی دی زمانە تووتییە و هیچی دی.

دارگوڵ بە دەیان زمان، زمانی ناز و نووز، زمانی رەمۆکی، زمانی هەستان و دانیشتن، زمانی سەروگەردن و بلندگۆیەکانی دەمولێو و چاو منی دەدواند، و من دە هەموانیش دەگەیشتم. دەبێ ئەویش دە زمانی مە هەر گەیشتبێ کە ئەو پەیوەندییە ئاوا پەیدا بووە. چ مانایەکی نییە من بمهەوێ هەرچی بڕیارێکی دڵی خۆمە بەوی بڵێم و فێری کەم و دڵی ویش ئاگای

لێنەبێ؟ و تازەش ئاگای چی، بۆ مەگەر دڵی وی بێ ئاگا بوو؟ دڵێك کە دە پانتاییە ئاسمانێیدا جێ نەدەبۆوە چۆن بێ ئاگا دەبێ؟ ئەوە هەر تەنیا دەربڕینێکە کە زمانی بڕیار و پەیوەندییەکان دەبارێکی سروشتیدا بەسەر دڵ و زماناندا دێن! لە کاتێکدا کە قوڵپەقوڵپی هەڵڕژانێ تاڤگەی پێکەنینەکان و بزاوتە باڵێیەکانی لەش و لار و دەستوپێی، هەموو ئەوەیان دەردەخست کە خوڕەی جۆگەلە و جوێباری بەڕێوەیە و نە تەنها هەر بەری نەگیراوە بەڵکە بە شۆڕ و تاسەوە ئازادە و سەربەست و چێژ لەو ئازارەش دەبینێ؛ و تازە منیش دەو سەروبەندەیدا بووم کە بەچمکی ئازادی و ژیان و سروشت ئاشنا دەبووم!.

((... ئەوە بۆوا دەبیرەوە چووی؟)).

راچڵەکیم ((دەبیرەوە چووم! نا، بیری چی، پووریێ؟ ئیدی خەڵکانێکی- دڵیان بەوەندەی خۆشە کە قسان بکەن؛ جا کەواتە لێیان گەڕێن بابڵێن...)).

((یانی هەروا لە خۆوە قسان دەکەن؟)).

((تازە لە خۆوە بێ یا بەڕاستی...)).

((نا، ئیدی، وانییە...!)) سەری هێنایە پێشێ، وەك کچە گۆرانی بێژان ((تو مەرگی پووریێ، راستییەکەی بڵێ- بەدەستی خۆت بمێژی ئەگەر راستییەکەی نەڵێی!)) و بە ئارامییەکەوە دەستی دەپەناگوێییەوە نا.

گوتم: ((ئێستا تۆ پێت خۆشە چ بڵێم؟ بڵێم ئا، یان نا؟)).

سەروچاوی پووریێ گرژبوو ((وایش، ماندووت کردم!... تو مەرگی بابەت ئەگەر نەیڵێی- خۆ دەزانم حەزی لێدەکەی)).

گوتم: (( لە کێ؟)).

بە شەیتانییەکەوە: ((هەر کامێکیانت کە زۆرتر خۆشدەوێ)).

گوتم: ((بەگیانی بابە، بە گیانی پووریێ، تائێستا قسەی لێنەکراوە؛ بەڵام ئیدی کە خەڵکی دڵیان وەجۆش و خرۆش هاتووە و زاریان راناوەستێ، دەبێ کارێکی هەر بکەم... باشە ئەوە کێیە؟)).



پووریێ دیسانەوە زیزییەکی پێوە دیاربوو، داپیرە تەقییەوە، گوتی: ((ئەوەی وا دەڵێ، گووی خوارد! ژنەتیوە دەیەوێ دەستە چەورەکەی بەسەری مەدا بێنێ)). ژن کە باوەژن بوو؛ مەبەستی دەستەچەورەکەش دیاربوو.

پووریێ نارەحەت بوو، گوتی: ((وای دایە، تۆش وردە وردە خەریکی لەخۆت دەچییە دەرێ- ئەوان وا دەڵێن، ئەتۆ بۆ دووبارەی دەکەیەوە؟)).

((چ دووبارە دەکەمەوە!)).

((ئاخر ئەوە تۆش خەریکی خان و خانبازییە دەکەی)).

داپیرە گوتی: ((تو هەقی ئەو قسانەی نەبیستراون! من باسی خان و خانزادەییەم هەر کردووشە؟)) و هەروەك پیرە مریشکێکی کە هەڵبەز و دابەز و باڵەفڕکەی جوجکان تەماشاکا، پێڵووە سیس و ژاکاوەکانی سەرچاوی زۆر لەسەرەخۆ بەسەرچاوە بێ تروسکەکانیدا بەردانەوە و قامکی ئاماژەی دەستە راستییێ بۆ لای پەڕەی لووتییەوە برد و گوتییەوە: ((نا، نا، توخودا بڵێ! تو گۆڕی ئەو دایکە جوانە مەرگەت، من باسی خان و خانزادەییەم هەر کردووە!)).

پوور بێ ئەوەی ئاوڕ لەو بداتەوە و بێ ئەوەی ناوی کەس ببا، گوتی: ((ئەوە کرمانج خراپ بوو بۆخۆی بۆ دەیهێنا؛ ئەگەر چاکە ئەو بۆ نەیهێنێ؟)) ئاماژەی بە بابە بوو.

((باشە خۆ من نەمگوتووە خراپە؛ من دەڵێم دووربێ لە گیانی هێشتا منداڵە، هێشتا زۆری ماوە، هێشتا خوێندنی تەواو نەکردووە- من ئەوەی دەڵێم؛ بۆ خۆشی هەرنایەوێ، جا ئەگەر تۆ بەزۆری بەملیەوەکەی ئەوە قسەیەکی دیکەیە!)).

گوتم: ((منداڵی کوێم دایە گەورە! رەنگە زۆریشم پێخۆش بێ...)).

پووریێ پێکەنی و دووبارە نقورچێکی دیکەی لە روومەتێ دامەوە: ((هەی کەران باوگاوی حیز! یەك تۆزقاڵیشی لە بابیەوە هەڵنەبواردووە! ئەوێ رۆژێشم لە ماڵێ خۆمان دیتی چۆنت کچە وەبەرچاوە حیزەکانت دابوو- زۆڵ!)) و پەنجەی ئاماژە و ناوەڕاستێی زۆر بەسپایی لەسەرچاوە حیزەکانم رۆنان، کچەی... دەگوت- مەستان خانم- بابە دەستەگوڵی خۆی لێدابوو- ((جوان بوو، وەنا؟)).

گوتم: ((جوان زۆرن، پووریێ، بەلاّم...)).

((بەلاّم چی؟)).

((بەلاّم هەروەك داپیره دەلّێ من هێشتا مندالّم، بۆی شیری خاوم لە دەوی دێ!)).

پووریێ تیلەچاوێکی جوان و شەیتانانەی تێگرتم و گوتی: ((ئاخریەکەی هەر نەتگوت... لە ئێستاوە زگمان بۆ پلاّوی شاییە هەلّگلۆفین یانە نا! یا ناکا هەروا بتەوێ بێ هەوالّ و باس و بەبێدەنگی و بەدزیەوە کچەی ببەی و برۆی؟ بەخودای دەتخنکێنم...!)).

داپیره گوتی: ((بیبڕەوە کچێ بەسە ئیدی، دانیشە دوو قسەی بەجێ بکە... چتان بەسەرەوەیە- قسە براون!)).

((دایە، باسی کەرەکەیە- قەسە لەوەی خۆشتر!... پووریێ گیان، ئەگەر سەلیقەییە پورایەتیە خۆتت لاپەسەندە ئەوە هیچ رامەوەستە- لەوەت جوانتر دەست ناکەوێ- لە تارانێش شتی وانییە، ئێستا کەمێك مندالّە، چاك دەبێ... ماشەلّلاّ ماشەلّلاّ، هەر دەلّێی دەنکە نوقلّە، هەر بیهاوێیە سەرزاری دەتوێتەوە- هەر دەلّێی تیشکەخۆرە. ئەگەر بە قسەی من دەکەی گوێ مەدە قسە و قسەلۆکی ئەموئەوان- کرمانجە، چووزانم، قەرەواشە... هەرچی هەیە؛ هەموو هەر بەندەی خودان؛ هەموو هەر خوا دروستی کردوون- هەرکەسێك هەرچی بلّێ زیادەیە)).

دەك ئافەرین پووریێ! ئەوە یەکەمین جاربوو ئەو بیرە ئازادەییانەی لێ ببینم. دایە گەورە بە هەموو مرۆڤایەتییە خۆیەوە حەزی دەکرد بەهەر نرخێك بووە لەبەرەی پیاو ماقوولاّن و گەورە پیاواندا بم، و کارێکی وا نەکەم ببمە جێی تانە و تەشەری ئەموئەو و نەچم کچە کرمانجێکی بێنم! بەلّگەشی هەر ئەوەبوو کە داکێ من رۆژێکی خۆشی دەومالّەیدا نەدیوە و داکی بمرێ قومە ئاوێکی خۆشیەی بە ئەوکێدا نەچۆتە خوارێ و خۆ ئەگەر کچێکی بێچارەی دیکەش بێتەوێ ئەوە چارەنووس و رۆژگاری لەوی خراپتر نەبێ چاتر نابێ، بۆیە واباشترە ئەگەر بەزەییم بەو کچەشدا نەیەتەوە با لە ئێستاوە بەزەییم بە خۆمدا بێتەوە.

بەلاّم پووریێ دەیگوت خۆ ئەو، یانی من، لێرە نابێ و دەو مالّەیدا نامێنێتەوە و لەوێ ژیان بەسەر نابات، ئەودەمی بەموبەوچی، خەلّکی چۆنا و چۆن دەژین و دەگەلّ کێدا دەژین. هەرپێیان خۆش نەبوو با قەت نەچنە مالّێیان؛ لەراستیدا ژن و مێردایەتی کاری دلّە؛ دلّیان



ئەوەی دەوێ، هەرکاتێ دلّیان ویستی و خوداوەند دلّی لێك بەستن ئیدی ئەموئەو بۆ دێن دەکەونە نێوانێ و دەبنە دڕکی مەم و زینان و نایەلّن دوو دلّ پێك بگەن... هەی ئافەرین پووریێ! پووریێ ماچی کردم، منیش پڕ بەدلّ ماچم کردەوە و ماوەیەك دەگەلّیدا دەستەویەخە بووم. پوور دەتەواوی ئەو ماوەیدا دلّی دەچاواندا دەخوێندمەوە و زۆر بەتێگەیشتنەوە دەگەلّ دلّمدا پێدەکەنی.

هەروا بەدەم گالّتەوە گوتم: ((باشە، تۆ رازیت، پووریێ؟)).

((دیارە کە رازیم پووریێ گیان! کچۆلّەیەکی ئاوا جوان، و بەو تەڕ و بڕییەوە، حەیف نییە لە دەستت چێ!... مەگەر وەك کابرای گۆزەگەرمان لێبێ لە گۆزەی شکاو نەبێ ئاوێ نەخۆینەوە... بڕۆ پووریێ گیان، بڕۆ هیچ رامەوەستە... دایەش رازییە)).

بەدەم گالّتەوە گوتم: ((باشە، ئێستاکە ئێوە پێتان خۆشە، ئەگەر هەر لەبەرخاتری ئێوەش بێ، دەبێ کارێکی هەر بکەم...)).

((بەلّێ، بە گیانی خۆت، ناکا منەتێش لەسەرەمە بکەی... دەپێشدا دەئەوکێتدا گیربووە... هەر لە چاوە حیزەکانت را دیارە!)).

((باشە. مادامەکی ئێستا ئاوای بۆ دەچی کەواتە هەر بۆ خۆشت بچۆ لە بابەی بخوازە...)).

((ئای بە چاوان! هەر ئەو رۆی پێدەلّێم...)).

((نا- جارێ نا پووریێ- گالّتەم کرد... ئێستا زووە)) بەڕاست یا بەدرۆ ((کاتێکی دیکە بۆخۆم پێت دەلّێمەوە)). نیو کاتژمێرم بەسەرهاتنێدا رادەبرد و چوومەوە مالّێ... دلّم هەرتەپە تەپی بوو، تەنکە ئارەقەیەکیشم کردبۆوە. بەروخسارێکی واوە کە گوایە بەشتێکی زۆر گرنگەوە سەرقالّ و خەریکم چوومەوە ژوورێ. لە دارگولّێ بەولاوە، کەسی دیکەی لێنەبوو، کە لە پاشخانی ژووری دانیشتنێ بە کۆکردنەوەی پیالّە و ژێرپیالّە و قۆری و سەماوەرێوە سەرقالّ بوو، بەشێوەیەکی زۆر لەسەر هەست.

چوومە ژوورەکەی خۆم؛ بێ ئیختیار چوومە بەردەمی ئاوێنەی- ژاکابووم. دەستێکم بەیەخەی چاکەتەکەمدا هێنا؛ هاتمە بەردەرکێ، و بانگم کرد: ((ئەوە کەس لە مالّ نییە؟)).

دارگوڵ هەر لە پاشخانێڕا گوتی: ((بەڵێ ئاغا، من لە ماڵێم...)) و کەمێك دواتر، ((خانم و منداڵەکان چوونە حەمامێ...)). وەك چاوەڕێی بێ... چەند ساتێك تێپەڕی. وەك گوێم لێنەبووبێ گوتم: ((کەس لە ماڵێ نییە؟)) دەمویست بۆخۆی بێت. هات، بەروخسارێکی رەمۆك و سڵەوە، و تەنانەت ئامادەی هەڵاتنێ، گوتم ((چ بووە؟)).

گوتی: ((شتی چۆن، بۆ هیچ هەیە؟)).

تا هێشتا هیچ قسەیەك دەربارەی خۆشەویستیمان لەنێوانێدا نەدرکابوو، یانی هەلێك نەڕەخسابوو، هەرچەندە لەو ماوە کورتەی مانەوەم دەماڵێدا تەنیابوونی وی ناچاری کردبووم: گوێدانە پێکەنینەکانی، گێڕانەوەی چیرۆك بۆ گوڵەکان، بەتێکەڵاوییەی دەگەڵ جوجکەکان کە سەیرکردنیان لەمن ببووە خوو. ئیرەییم بە جوجکە و بە گوڵەکان دەبرد و خۆزگەم پێدەخواستن بەتایبەتی کە باوەڕن بە عالەمی ئاشکرا دەیگوت کە ئەویش بە هاتنەوەی من ئاگری گرتووە؛ حەکەدارییەکەی هێندەی دیکە بووە، بەو دواییانەش هەستمدەکرد کە سەرنجمان تێك دەئاڵقێن رەنگی دەگۆڕێ، گەرم دادێت، و دەمارەشینەکانی گەردەنێی، رەش دادەگەڕێن و خێراخێرا هەڵداوێن، و چاوەکانی لێڵ و پێڵ دەبن.

گوتم: ((دەفتەر و قەڵەمەکەت لە کوێن؟... ئێستا دەستت بەتاڵە وەرە با یەکەم وانە دەست پێبکەین...)) دەشلەرزیم. بەترسێکەوە گوتی: ((نازانم لە کوێم داناون... راوەستە با سەیرێك بکەم... لە ژوورەکەی تۆن- لای من نین- ئەوەتانێن، دەنێو پەنجەرەکەیدان!)).

بەسەر سامییەکەوە بامدایەوە، هەرچەندە پێشتریش دەمزانی لەوێن. گوتم: ((کەواتە وەرە، ئێستاکە کات هەیە و منداڵەکانیش لێرە نین با هەوەڵ وانەی دەستپێبکەین!)).

هەر بەو ترس و دڵە راوکێیەوە دەنێو دەرکی ژوورێدا راوەستابوو، وەك زۆر بەوردی سەرقاڵی کون و کەلەبەری بەستەکانم بێت... هات؛ هەروا لەبەردەمی ژوورەکە دانیشتین- بە تەکیەکەوە و من سەرمەشقەکەم نووسیەوە: ((ئا. ئا. و. و)) ئەوجا ((ئاو. ئاو. ئاو))و دووبارەم دەکردەوە و دەمگوتنەوە و ئەویش ناشیانە بەلالێویکییەوە دەیگوتنەوە: ((ئا. ئا. و. و)) دەستە ناسکەکەیم گرت- تا شێوازی قەڵەم گرتنێی فێرکەم. و لووسییە قۆڵ و مەچەکی هەر دەتگوت لوسییە پشتی سپییە ماسییەیە... ساردبوو، گەرم داهات. دەمارە رەشە نزیکەکەی قولکی



ئانیشکێی رەنگی تێرتر هەڵگەڕا... پێکەوە سەرمان هەڵێنا؛ پێڵووی چاوەکانی زۆر بە نەرموشلکییەوە بەسەرچاوەکانیدا بەربوونەوە و پێکەنی، منیش هەر پێکەنیم و دڵم کەوتە پەلەپەلێ، هەروەك گوێمان لە دەنگی یەکتری بووبێ- وانەیەکی دی دەستی پێکردبوو...

ئێستا هەر تەنیا جوانی رووت نەبوو، و دووبارە جوانییەك بوو- پاك، بێگەرد، هەروەکو بەفری کۆساران، هەر راست وەك کچۆڵەییە خۆی پاك و بێگەرد. جوانیەکی بەرچاو... مۆزەخانەیەکی پڕ تابلۆی جوانی- پڕ لە هونەری خواوەندانە، و شاکاری خیلقەت... جوانییەکی بەرچاو و دیار- هەر لە بۆن بنێشتی دەمیەوە جوان تا بۆنی عەتری ئەو شیرەی بەیانیان دەیخواردەوە...

ئەوە تۆ هونەرمەندێکی بە پەرۆشی هونەری و هونەر شوناس- بەڵام تا بەلای تابلۆیەکییەوە رادەوەستی گوێت لە تکای تابلۆیەکی دییە بانگت دەکات و سەرنجت بەلای خۆیدا رادەکێشێ... کە چووی ئەو هەقەی دەدەیەی و لە بێ ئاگاییە خۆت تەریق دەبییەوە... جا لە بەرامبەر هەر یەکێکیانەوە. ئەمە یان ئەوە یا هەر هەموو تابلۆیەکان، لەکاتی لێوردبوونەوەیاندا شتی وردەکاری وا دەبینی کە هەر پێش ساتەوەختێك بەسەریاندا تێپەڕیوی و نەتدیون، یا ئەگەر دیبێشتن، وەك پێویست دڵت نەداونێ... بەڵام هێشتا، لەوەی کە دڵت نەداوەتێ ولێی تێنەپەڕیوی، هاواری دڵی تابلۆکەی تەنیشتیەوە دەبیسی و بە ناچاری دەبێ روو لەویان وەرگێڕی و لا لەمەیان بکەیتەوە... کە یەکسەر چاوت بە هونەری نایاب و نایابتری ئەوتۆ دەکەوێت کە هەر بە خەیاڵیشتدا نەهاتووە... بەڵام بۆ تۆ چاوەڕێی چ بوویت؟ -چاوەڕێی هەر شتێکی بووبی، بۆت دەردەکەوێ کە جوانییە شۆخ و شەنگ و جوانێکی، دە حاڵێکی پەشۆکاویدا لەوپەڕی بۆچوون و چاوەڕێییە تۆوەیە؛ بۆت دەردەکەوێ کە ژێیەکت هەژاندووە هەرگیز نابڕێتەوە، کاتێکت دۆزیوەتەوە کە دەمارەکانی هەرگیزاو هەرگیز بە کۆتا نایەن و تالێیدەیەوە زیاتری لێپەیدا دەبێت... و ئەو خۆی لادەدا و بەقسە دەیگوت: ((نا... نایەوێ... من زماندرێژێکی سەگبابم! تالێیە رۆژانی سەرەتای هاتنەوێمی لەبیرنەچوو بۆوە. خۆی کێشایە دواوە، بەڵام بەجۆرێکی وا و بە رێگایەکی ئەوتۆ کە هەر جوانان دەیزانن، هەر لەجێی خۆیەوە و بەزمانی جوان ناسییە، رووی قسەی لە گوێی دڵم کرد- و بێدەنگ هەر بە وتەی چاوان، و زمانی بێ گفتار دەست و دڵی بەرەو دۆزینەوەی جوانییەکی جوانتر راکێشام...)).

نەڕۆی هەڵمەیە، هێشتاش هەرماوە... بۆوا بەپەلە!؟)).

من هەڵاتوو نەبووم، گەڕیدە بووم... و دەمزانی کە گەڕیدە دۆزەرەوەیە... و دۆزینەوەکانم هەمیشە راستییە گومانەکانمی دەردەخست. گەڕیدە دۆزەرەوەیە ئەگەر ئاشوفتە و سەوداسەر بێ، یا بەتاسە و بە پەرۆشەوە بێ و تا بۆی دەکرێ دەروێشانە و زۆر و کەم گوێ نەداتە بەند و باوان و، دووبارە هەروەك چۆن تۆبەکار کوێرانە دەست و پەل دێرە و دەوێ دەکوتێ و لەراستیدا لە خۆی دەگەڕێ... ئاوا دەجوانییەکاندا ون ببووم، حەیران و سەرگەردان دەجوانییەکاندا پەلم دەکوتان و بیرەو بەوێدا بەدوای ونبووە نادیارەکەمدا دەگەڕام- و ئەو بەنەرمونیانی و تایبەتمەندییە جوانانەکەیەوە، کوێرانە بە چاوی کراوەی دڵ، خۆی دە مندا دەردەخست. وێنە و سەیرکەری وێنەکان پەیدەرپەی جێی خۆیان دەگۆڕی و جارجارە تاك تاك و جارجارەش هەردووکیان دەیەکتریدا ون دەبوون. پەرێشان بووم- پەرێشان بووین- و هەردووکمان دەماندیت... و ئەو پەرێشانە بە نۆبە تادەهات هەراو و هەراوتر دەبوو، و هەمیشەش هەر لە بارێکی دابوو، هەستمان دەکرد- پەلکێش کراوین، داواکاری شتێکی هەرگیز نەبوو بووین، داواکاری پەڕەوازەیی و هەر لە هەمان کاتدا خڕبوونەوێشی بووین- پەڕەوازەیی دەخۆماندا، و خڕبوونەوەشمان دەبوونی یەکتریدا. هەموو بوونی و هەموو جوانییەکانی گیانی، و هەموو پاکییە کچێنییەکانیم هەست پێدەکرد و ستایشتم دەکردن، و بەدوای پاکی زیاتر ناسکییە ناسکترەکاندا پەلە قاژەم بوو و دەست و پەلم بێرەوبەوێدا دەسوو، و کوێرانە بەدوای نەرمی و جوانییە گیانی و روناکاییە دڵیدا دەگەڕام. هەر هەستێك هەستێکی چاکتر و هەر گەڕان و سوڕانێکیش ئەنجامی چاکتری بەدواوە بوو و ئێمە هەروا ماندوو نەناسانە بە ناخی گیانی یەکتریدا دەچووینە خوارێ... و ئەو تەسلیم بوو، بەڵام من دیل بووم و ئەو وەك زنجیری دەست و پێی کۆیلایەتییە من بەمنەوە نوسابوو و منیش بەوەوە... لێوەکانی سپی ببوون، چاوەکانی سورببوونەوە، و وەك چەورکرابن هەروا بریسکەیان دەهات و تەڕ دیاربوون. زەردەخەنە و لەرزێکی بەسەرلێوانەوە مردبوو؛ پەڕەکانی لالووتی دەلەرزین؛ باریکاییە گۆشەکانی ئەولاولای دەمی زیاتر ببوون؛ جارجارە لێوە غەمبار و ماندووەکانی بەش دەبوونەوە و بەهیچ شێوەیەك وێك نەدەهاتنەوە؛ سینگ و بەرۆکی لە هەڵچوون و داچوونێدا بوو، و هەر ناوە ناوە سەرتاپای لەرز دایدەگرت، ئاڵۆز دەبوو و بەچاوی نوقاوەوە هەروەك بە تورەییەوە بە دوای شتێکدا بگەڕێ دەکەوتە پەلە قاژە. دوایە خاو دەبووەوە، ئەوجا هەوڵ و تەقەللای دەست و پێی پیادە دیلەکە- بە بەهێزیەوە- زیاتر و زیاتر دەبوو، و خەنینەوەی روخساری ویش راشکاوانەتر دەبوو...



سەیرە کە دەوەدابوو کە زیاتر هەر دەنگی ناڕەزایەتییە زنجیرەکەی بوو دەهاتە گوێ: ((نەکەی!... نەکەی!)) بە دەنگێکی لەسەرخۆ و بەچرپەوە و بێنەوا و تەنانەت کزەڵانەوە: ((نەکەی- توبی و خودا!)) زنجیر لەبەر هەوڵ و تەقەلا دانێی سوورسووربۆوە و داغ ببوو و ناڵەشی زیاتر تێکەڵ بە ماندووەتی و بێ هێزی و بێ تاقەتییە هەروەك نەخۆشێکی مۆتەکاوی و دلۆپە ئارەقەکانی کە بە هەنیاو سەرلێوەکانیەوە نیشتبۆوە... زیندانەوان هەروا بەڕەمەکی فێرببوو کە هەرگیز نابێ و ناتوانێ پشت بەقسە و کرداری زیندانییە ببەستێ و متمانەی پێبکا- زیندانی هەرکاتێ هەلی بۆ هەڵکەوێ- تەنانەت بە کوشتنێ زیندانەوانیشەوە بێ- هەرهەڵدێ: کەسانێکی کە تینووی حەز و ئارەزووەکانیانن، بەقسە ئامادەی هەموو لەخۆبووردن و فیداکارییەکین- کام سوێند هەیە نەیخۆن، و کام بەڵێن و پەیمان هەیە نەیدەن... دیسانەوە هەروەك زیندانییەکەی، کە بەڵێن و پەیمانەکانی ناو زیندانیی هەرگیز نابنە باوەڕنامەی ژیانی ئایندەی دەرەوەی زیندانیی: ئەمانەش هەر کە کەریان لە پردێ پەڕییەوە لەجۆش و خرۆش دەکەون و وادە و بەڵێن و پەیمانەکانیشیان لەبیر دەچنەوە- هەرچەندە بەدەر لە جۆش و خرۆش دەکەون و وادە و بەڵێن و پەیمانەکانیشیان لەبیر دەچنەوە- هەرچەندە بەدەر لەوانەش هەن- بەڵام بەدەربوون پەسەندی یاسا و رێسایی- و رێساش لەسەر ئەوە دەڕوا... ژنانیش زۆر و کەم ئاوان.

((ئەویش- دەوامەکە ئیدی!)) ئەمجارەیان زۆر بەڕاشکاوییەوە، تەنانەت تێکەڵ بە تورەیی و نێوچەوان تێکنانەوە- و لەپڕ خۆی رێك و پێك و خڕکردەوە، و کشایەوە...

روخساری ترسناك بوو... دەنگی دەرگابوو- ئەو گوێی لێببوو، من نا! لەپڕ رەنگی رووی پەڕی... دڵم وەترپە ترپ کەوت... رایکردە ژووری دانیشتنێ؛ دوای چەند ساتێك پەنجەرەکەی ژووری دانیشتنێی کردەوە و لەویڕا گوتی ((کێیەوە؟)). بابە بوو! دەرگایەکە باش داخرابوو... کە من هاتمەوە کرابۆوە... دەرگای دەرێ هەر دانەدەخرا. کتێبێکم لەسەر تاقچەکەی تاودایە، لەسەرزگ درێژبووم و دە دنیای خوێندنەوەیدا نقوم بووم! گوێم لە دەنگی پێی بابەیە، ترپەی دڵم تا دێ زیاتر دەبێ، دەنگەکە نزیك دەبێتەوە... بەپێچەوانەی جارانەوە بابە یەك سەڵەف دێتە ژووری؛ راست دەبمەوە، شەرمێون- دە روخسارمەوە رادەمێنێ، دەڵێ: ((بەتەنێی؟)).

دەڵێم ((بەڵێ، بۆ؟ بڕیار بوو کەس بێت؟)).

وەلامی نەدایەوە؛ بەلام دیتی کە تەنیانیم: پێلاو و قەڵەم و دەفتەری دارگوڵێ بە تەواوەتی ئەوەیان ئاشکرا دەکرد ئەوەی کە بەتەمابووە بێت هاتووە، و رۆیشتۆتەوە!.

گوتی: ((پێلاوەکانت دەپێکە- خۆ کارێکی وات نییە؟ -ها؟ دەی پێلاوەکانت دەپێکە، ئیشم پێتە)).

سەیرم پێ هات؛ قەت وانەبووە؛ ئیشی چی هەیە؟ ئەویش بەم دەموساتە!.

پێکەوە چووینە دایەرەکەی؛ بەدەرکەوانەکەی گوت تا نیو سەعاتی دی کەس نەیەتە ژوورێ. ئەوجا زۆر سادە و ئاشکرایانە گوتی: ((من دەزانم کە تۆ پەیوەندیت دەگەڵ ئەو کچەیدا پەیدا کردووە... باشە، لاوی بە دڵێکی روونەوە گوتم: ((وایە، دەزانم)).

بابە گوتی: ((نا، وانییە، کچێکی بێکەس و بێدەرە؛ ئەگەر ئابڕووەکەی لەدەستبدات ئەوە هەر یەکجاری بێنەواو بێچارەتر دەبێ. ئەوەی هەیەتی هەر ئەوەندە ئابڕووەیەتی و هیچی دی... هەموو سامانەکەی ئەوەندە ئابڕووەیە... مندالە، نابێ هەل لە مندالییەکەی ببیندرێ. مندالە بۆخۆی هیچ نازانێ؛ ئێمە کە دەزانین هەقی ئابڕوو بردنێیمان نییە؛ ئەگەر بێ ئابڕووبێ ریسوا دەبێ- و خواش هەڵناگرێ؛ و ئەویش ئەندامێکی ناو خێزانێ مەیە- مانای وەیە خوشکی تۆیە)).

گوتم: ((من هەرگیز نەمویستووە دەست درێژی لێبکەم و ئابڕووی بەرم...)).

((کارێکی چاك دەکەی- ناشبێ بیکەی. من دڵنیام کە نایکەی؛ دەزانم کە لەو جۆرەکارانەوە دووری... و ناتەوێ خراپەیەکی دی بخەیە سەرخراپە کۆمەلایەتییەکانی دی... کچۆڵەیەکی پاك و چاو و گوێ بەستراوە؛ ئێرە ماڵە ئومێد و ئاواتی وییە، نابێ نائومێد کرێ... تۆ گوێ لە قسەی ژنە پوورەکانت مەگرە... ئەو کچە دەو تەمەنەیدا چاکە و خراپەی لێك ناکاتەوە- ئەو شتە پڕو پووچانەی کەپوورت (مەبەستی باوەژنەکەیە) دەیانڵێ و ئەو خۆ هێنان و بردنەی دەیانکات و دەڵێ حەکەدارە و واو وایە، ئەمانە هەمووی قسە و تەسك بینییە ژنانەیە- دەنا منداڵێکی پاکە، هیچ نازانێ... پڕ دنیایەك پاکی و بێگەردییە و تۆ نابێ ئەو هەموو پاکی و بێگەردی و بێ خەوشییە پیس و لە کەدارکەی- خوا هەڵناگرێ. دیسانەوە تۆ نابێ بەسەر راستیدا بازدەی، تۆ دەبێ راستییەکان ببینی؛ راستیش ئەوەیە کە ئێوە هاو کوفی یەکتری نین؛ ئەوینی تۆ هەرچەندە گەرم و گوڕ و داغیش بێ سەرەنجام سارد دەبێتەوە و ئەوددەمی



راستییەکەی دەبینی- و دەزانی کە ئەمە عیشق و ئەوین نییە؛ ئەوە هەر تەنیا حەز و ئارەزووە)).

ئەوین نییە، ئارەزووە! لەوانەشە. ئەوینی مە لە چاوانماندایە؛ مەسەلە بەرنامە و بەرنامەرێژی نییە؛ هەرئەوەندە حەزمان چووە کچێك یا ژنێکی جوان ئیدی بەسە. ئیدی ئەوە نییە کە وەك فەرەنگیان ئەو ئەوینەی بێنین دەپرێسکەیەکییەوە پێچین و بەپەلە دەگەڵ وردە واڵە و جەنجالییەکانی ناو بیروهۆشمانی خەین و هەڵیگرین و کاتێکی دیکە بچینەوە سەری، یا هەر نەچینەوە سەر و سۆراغی و جاری وایە کاتێکی وا دەچینەوە سەر و سۆراغی کە تازەکار لەکار ترازاوە و کرمەکە لە قۆزاغە ئاوریشمییەکەی هاتۆتە دەرێ و فڕیوە. هەستی مرۆڤە سەرەتاییەکانی پێشوو هێشتاش هەر لە ناخی ئێمەدا، وەك بووە، هەرماوە- زۆرمان لێ وەدوور نەکەوتۆتەوە. دوورکەوتنەوە لە خراپییەکان لەوەی تێنەپەڕاندووە کە نەخشە و پلانی چاویان زیاتر کردووە؛ زیاتریش ئەم شێوە ژیانەمانیان لا پەسەندە کە: کێ دەڵێ تا سبەینێ دەمێنین- کێ دەزانێ سبەینێ چ دەبێ؟ کاتێ کە بۆ ژیانی سبەینێ بەرنامەیەك نییە، ئیدی ئەوە ئەوین و ئەویندارییش ئیشیان دیارە- ئەویش هەر بەشێکی ژیانە.

لەمانە بەولاوە، هەر لێرەوە، دە ژیانی مەدا کەس نازانێ، هێشتاش هەر نازانێ کە هاوسەریەتی بێ ئەوین و دڵداری بارێکی گرانە، یا هاوسەریەتی دەگەڵ ئەوین و خۆشەویستیدا هەڵناکەن. هەربۆیە، کێ دەڵێ هەر ئەو دیتن و تێك هەڵەنگوتنە سەرپێییانە کاریگەرتر و سروشتیانەتر نەبن؟ کێ دەڵێ تاقیکردنەوەی زیاتر و لەسەرەخۆیی زیاتر و وردبوونەوە و تێڕامانی زیاتر، رۆڵی زیاتر دەبینێ لە سەقامگیرییە ئەوین و دڵدارییەدا؟ کێ دەڵێ کاتێ کە من پەرێشان و شەیدای بولهەوەسی و هەڵسوکەوت و جرت و فرتە سروشتییەکانی کچێك دەبم- ئەو قورسی و سەنگینی و ویقاری منی بەلاوە پەسەندە؟ ئەمانە هەمووی شتگەلێکی ناسروشتین. دەوکارەیدا دەبێ شۆڕ و تاسەو حەزو ئارەزوو و لاوەتی هەبێ؛ پێویست ناکا ئادەمیزاد خۆی بە کۆك کردنێ خۆی و بەرامبەرەکەیەوە خەریك بکات و بێ بەدوای شتی پڕ و پووچدا چاو بگێڕێ و کاتی خۆی بەفیڕۆ بدا. لاو دەبێ هەمیشە پڕ کۆك بێت، بەشێوەیەك تەنیا یەك قورمیشی دیکەی بەس بێت تا هەرچی فەنەری دامودەزگای بوونی سۆز هەیە لەبەریەکی هەڵتەکێنێ.

بەچاوێکی پڕ لە پرسەوە سەیرێکیم کرد.

گوتی: ((وەك بتەوێ شتێکی بڵێی؟)).

گوتم: ((بەڵێ)).

گوتی: ((بڵێ)).

گوتم: ((بابە ئەزموونی خۆشت هەروا بوو؟)).

بابە تۆزێکی بیرکردەوە، و گوتی: ((نا، ئەزموونی من وا نەبوو)).

((ئەدی باشە...)).

((باشە، چی؟)).

((راستییەکەی هەر ئەوەبووە کە ئەزموونی خۆت دەریخستووە...)).

((نا، ئەوە نییە... تۆ لەبیرخۆتی دەبەیتەوە کە من لە ساڵێکی زیاتر دەگەڵ دایکتدا نەژیام و هەردەو تاکە ساڵەشدا کەمی نارەحەتی نەچێشت، تۆ ژنان ناناسی، تۆ خزم و کەس و کارە زۆر بلێیەکانت ناناسی. ئێستاش کە ئێستایە دەست دە دەستی داپیرەت نێی و بەقسەی وی بکەی...)).

((خۆ من نامەوێ لێرە بژیم...)).

جا ئەوە خراپتر! راستییەکانی ئەولای درتـرن- ئەوێ خوێندەواری دەوێ، شێوازی هەستان و دانیشتنی گەرەکە. تۆ بە چ سەواد و زانینێکەوە دەتەوێ کچۆڵەیەکی چاو و گوێ بەستراوە بەریە نێو خەڵکی- ئەویش ناو ئەو خەڵکانە، ناو ئەو گەلە گورگە دڕندانە... خودا هەڵناگرێ، گوناهە- و تائێستا خوێندنیشت تەواو نەکردووە- تۆ جارێ خوێندنەکەت تەواو کە- ئەوە کچە هەر لێرەیە- چ جێیەکی دیکەی نییە- دەبێ هەر بە چاوی خوشکایەتییەی تەماشاکەی، تا دوایە بزانین رۆژگار بە چ دەگا...)).

ئەمانە هەمووی راستییەکان بوون، بۆ خۆم دەمدیت، لەوانەیە لە بابەشم باشتر هەست پێکردبێ. بەڵام دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، مێشکم وەك کەرێکی کە لە دەرکێ تەویلەی



ناچتەوە ژووری و لەبەر دەرکێی جەنە گرتووە و زەق زەق دە ژووری تەویلەیەوە دەڕوانی و دەکشێتەوە، مێشکی منیش ئاوا لە رووبەڕووبوونەوەی راستییەکان سەرپێچی دەکات...

((ئەمانە هەر قسەی خۆڕایین؛ من خوێندەوارم!)) بێ ئاگایانە، دەگەڵ بە ژن و بالای دارگولێدا، خۆم دێنم و دەبەم و دەمەوەریە دەکەم. ((ئێمە خانزادەین! من باوکم ئوتول خانی قشپل فرۆش بووە! دەوەرە، کێ ئەو هەموو رێیەی پێ دەبڕەرێت))- دەگەڵ ئەو سەرەی کە بە تەشەرەوەی بادەدا و ئەوچاوە جوانانەی کە دەیگێڕان و ئەو داوێنەی کە دەڕۆیشتنێدا دەو دەیبرد و ئەو ئاوازی دەنگەیدا...

راستییەکەی ئەوەبوو کە ئەو ژنانەیان ئاوا بۆمە دروستکردبوو و چاوەڕوانی ئەوەی بوو کە منیش وەك کەسانی دیکە هەر ئەو رێیەی بگرم و بڕۆم.

ئاخر من نەدەبوو و نەدەکرا ژیانێکی بۆ خۆم و بە سەلیقەی خۆم دروست بکەم! قبووڵمە- من کە نەمەوێ ژیانێکی بە سەلیقەی خۆم پێکەوەنێم. ئەدی چیدی بنیاتنێم کە لە دارگولێ چاتربێت؟ ئەگەر ئەوم بە سەلیقەی خۆم دروستکردبایە دیسانەوە ئەوم هەر بەهەمان قەد و قەوارە و روخسار و هەڵس و کەوت و رەفتاری خۆیەوە دروستدەکردەوە. وەك چۆن ئێستا بە کوڵك و پێستەوە ئامادە و ساختە و پەرداختەیە ئاوا! ئەمە راستی ژیانە. بۆ دەبێ ئەوی رەتکەمەوە؟ راستییەکەی ئەمەیە کە ئەوی بێنم و هانی ئەوانی وەك ویش بدەم... بەڵام بە چ دەچێ، من دەبێ ئەو راستیانە ببینم و ئەوانەم بوێن کە کەسانی دی دروستی دەکەن... راستییەکی بەراوەژوو؛ گۆشتاوی ئاوی کەروێشکێ!.

بەڵام راستییەکەی ئەمەبوو، کە ئەو بەسەرهاتانە یارییەکیان وەڕێ خستبوو کە بەهۆیەوە جێ پێی راستییەکی دیکەی هێنابووە گۆڕێ کە گوێی لەو قسانە نەبوو و یارییەکەی وی یاسا و رێسایەکی دیکەی هەبوو کە پەروای چ یاسا و رێسایەکی دیاریکراوی نەبوو- رەنگە هیچ دەستوورێکی تایبەتی خۆشی هەر نەبووبێ، و بۆیە وا هێندە شیرین و بەرچاو بوو. یاری... یانی ئەمە- ئەمە یارییە- یاریی مندالانە و زۆر سروشتی... بابی وی فلانە، هێندەی هەیە؛ تۆ هێندە شیربابییە دەدەی، ئەو هێندە جیازەی دێنێ، فلانە زەوی لەسەر تاپۆ دەکەن، من جووتە ئەسپێکی دەدەم، ئەو سێ مانگایان دێنێ... بە واتای حاجییان هەر بە حیسابێکی سەرە پەنجان ئەوەندە ((قازانج)) دەکەین!...

ئەوە نەبووە یاری، ئەمە بووە بیرکاری، بووە حیسابگەری، بووە سات و سەودا... هەر گۆڕ بەگۆڕچێ یاریی وا!... نا، ئەم یارییە شتێکی دیکە بوو، لۆژیك و ڕێسایەکی دیکەی هەبوو: یاریی یاریی دووگیان بوو، لۆژیکەکەی، لۆژیکی گیان بوو، هەروەك لۆژیکی چیرۆکی منداڵان، کە بەگوێرەی ئەو چیرۆکانە، چ قەیدییە، کە پاڵەوانی داستانەکە ڕاپەڕێ و چنگ دەهەوران بگێڕێ و دێوێك لەپشت هەورە ڕەشەکانەوە بێنێتە دەرێ، نەك هەر بێ قەیدییە بەڵکە چیرۆکەکەش جوانتر و ناسکتر دەکات کە ئەوە دەگەڵ- لۆژێکی ژیانی حیسابگەریدا زۆر جیایە، یاریی دوو گیان بوو: گیانی وی جێی بەگیانی من تەنگ کردبوو؛ وەك منداڵێکی نازدار خۆی بەگیانمەوە نوساندبوو و بە سەرو کۆڵی گیانمدا دەچووە سەرێ؛ لەسەر هەردوو ئەژنۆیەکانی گیانم دادەنیشت، نقورچی لە ڕانی گیانم دەگرت، بە شەیتانییەوە لاسایی گیانمی دەکردەوە و گوێی گیانمی ڕادەکێشا، من بەگاڵتەوە، بە ڕاشکاوییەوە، بە دووچاوی پڕ لە خەندەوە، گازم لە قۆڵ، و پشتە دەستی و ڕوومەتەکانی دەگرت و وردە وردە تینم دەدایە لاشەویلکەکانم- و جێ ددانەکانم لەسەر پشتە دەستی پێشان دەدایەوە و ئەو پێدەکەنی- و منیش هەرپێدەکەنیم... نەخوێندەوار؛ بێ ڕێ و جێیە! قەیدی چییە؟ ئەوەی شەوێ شەڕاب دەخواتەوە، دەبێ تاڵیە سبەینێشی قبووڵ بێ. تەنیا کلاوّ ڕۆژنەی ئومێدم ئەو ڕستە قەیدییەی بابە بوو: ((ئەوەتا ئەوە لێرەیە، چ جێیەکی نییە؛ بابزانین ڕۆژگار چ دەکا)). ئەمە ئومێدێکی کەم نەبوو، هەرچەندە ئەوە دوو دڵییە ویشی پێشاندەدا- دوو دڵی بەرپەرچ دانەوێ.

ئا لەو قسانە: دایکم کرمانجە، من نابێ بەڵگە بەدەست قەوم و خوێشانییەوە- قەوم و خوێشی بابە- بدەم تا پێی پێبکەنن و بڵێن ((هەر لە سەرەتاوە دەمانزانی؛ باشە دەتویست چ بکەی؟ بچێ سەری کێومەرزی بێنێ!؟ پێشکەیە لە پیساییە زیاتر دەتەوێ بەدوای چدا بگەڕێ؟ هەڵدەستێ، باڵ دەگرێ، پێتوایە دەچتە ئاسمانێ... هەر... هەر هێندەت زانی چەرخێکی لێدەدا و بەسەر تۆپەڵە پیساییەکەوە دەنیشتەوە!)).

دەگەڵ ئەو هەموو قسانەشدا بیر و باوەڕم هێندە پتەو و بەهێزە کە هیچ گیروگرفتێك نایەتە پێشێ- هەروەك چۆن بێ زەحمەتییە خۆی دەگەڵ بارودۆخی ئێرە گونجاندووە. وەك بڵێی بەقسەی پێشینان ژنگەل تیرە و تایەفەی تایبەتییان نییە- تەنیا جوانیەکەیان تیرە و تایەفە و ڕووگەی



ئەوانە. کام ژنێکی جوانت دیوە کە هەر لە ئەزەلەوە کالاّی خانمەتییەیان بە بەردا نەبڕیبێ، و بۆ خانمەتییە دروستنەبووبێ و خانم نەبووبێ و خانمەتی نەکردبێ؟.

هەر چەندێك کاتی گەڕانەوێی تارانێم نزیك دەبۆوە ئەو خەیالاّنەم زیاتر دەبوون. ئێستا وام لێهاتبوو تا دەچووە سەراوێ و دەهاتەوە ئۆقرە و ئارامم لێهەڵدەگیرا: خووم بە دەنگی پێکەنین و شەیتانی و چاپووکییە جوولاّنەوەکانیەوە گرتبوو. هەر ڕۆیبایە، بێ ئەوەی ئاگام لێبایە کتوپڕ دەمزانی ماڵەکە چۆڵە و هەر لەخۆوە هەستی بێ ئارامییەم دەکرد و ئۆقرەم لێهەڵدەگیرا، وەك دەزیندانیێدابم. کە دڵنیا دەبووم دارگوڵ لەوێ نییە- لە پەنجەرەیڕا سەرێکم خوار دەکردەوە، جاری وابوو خۆم پێ ڕانەدەگیرا و بانگم دەکرد: ((ئەو کچۆڵەتان ناردۆتە کوێ؟)).

بە تووڕەییەکەوە وەك ئازارێکم هەبێ و لەو زیاتر بە کەسی دی چارەسەر نەکرێ- و کاتێ کە دەهاتەوە هەموو چارە سەرەکە دە یەك پەرداغ ئاو و چەند وردە خەندەیەکدا کۆ دەبۆوە!.

دوای بەسەرهاتی حەمامێ باوەژنە بە یەك سەرنج، هەرچی هەبوو و نەبوو هەمووی زانی- نازانم، ڕەنگە درێژییە باسەکەشی لە بابەیەوە بیستبێ. لەوە بەدواوە، وەك بەرێککەوتنێ هەردوولایان شێوە و چۆنیەتی سەرنج و ڕوانینەکانمان گۆڕان: من زۆر بە پارێزەوە و ئەو بە خۆتێهەڵقورتاندنەوە.

دارگوڵیش جاروبارە ڕەنگ و ڕووی خۆی دەگۆڕی و پەرێشانییە خۆی دەپێکەنین و تریقانەوەی منداڵەکاندا تێکەڵ دەکرد و لەو کارەشدا وەستابوو، من سەرم بەردەدایەوە و خۆم لە گێلیە دەدا. خانزادیش دیاربوو کارێکی تازەی پێ سپێردرابوو: ڕاسپێردرابوو کە ئێمە بە تەنیا جێ نەهێڵێ.

ئەلحوکمولیللا... کام ئەلحوکمولیللا! خۆ کچە هیچی بۆ حوکمی کەس نەهێشتبۆوە: جوولاّنەوەکانی، پێکەنینەکەی شەیتانییەکانی، لاسایی کردنەوە بە دزییەوەکانی باوەژنێی، کە جاروبارە بابەش دەیدیت و پێدەکەنی، زمان دەرێنانەکەی کاتی مەسینە و دەستشۆر بردنێی بۆ ژووری بابەی... ئەمانە هەموویان چنگیان لە ناخم گیر دەکرد و سەرتاپای بوونم لە ئارەزووی لەوێ بوونی ویدا دە ئاگری بێ ئارامییەدا هەڵدەقرچاو دەسووتا. هەستم دەکرد ئەو پارچە ((پێشبەرە))ی بن دەرزی مەکینەی دوورمانی بەردەم گیانم زیاتر و زیاتر بۆ بن سەڵتەی خۆی ڕادەکێشێ و بەدەرزی گیانی تا دێ توندترم بەخۆیەوە دەدروێ و بە ئاهەنگ و هەوهەوی

گۆرانییەوە دەڕوات و من دەگەڵە خۆیدا راپێچ دەکات و منیش بێ بەرگری بەرەو بن نووکی دەرزییەکەوە دەچم و بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە پێشوازی لە نووکی دەرزییەکەی روحی سەرپارچەکەی قوماشی دڵم دەکەم بۆ ئەوەی لووس و لێك و نەخشاو، هەر راستە وەك پارچەیەکی چنراو و دەستکاری وی لەبەر دەستی بێمەدەرێ- پارچەیەکی پێکەوە لکاوی جوان و پڕ نەخش و نیگار و بە دڵی خانمێ خەیات. بەلاّم نازانم دوایە سەرەنجامەکەی بەچی دەگات. هەر ئەوەندەی دەزانم کە بەڕاستی جوانە و هەستیش بە جوانییەکەی دەکەم... هەموو گیانم هەر هەستە. هەرکاتێ کە دەمدیت یا گوێم لە دەنگی دەبوو لەخۆوە بۆشاییەکم دەمێشکیدا پەیدادەبوو، هەروەك بڵێی ئەو بە کوڵك و پێستەوە هاتبێتە دەمێشکمەوە و چوار مەشقی دانیشتبێ و هەمووی هەر گرتبێتەوە و پاڵی لێدابێتەوە: جێی کەسی دیکە نەدەبۆوە. خۆ ئەگەر دەرگاش لەسەر پشت بایە ئەوە خانەخوێ نوستبوو و بەدەنگ لە دەرگادانێ کەسەوە نەدەچوو. کە ئەو لەماڵ بایە، هەموو شتێك هەبوو، ئەگەر خۆ ئەو لەوێ نەبایە، ماڵی مێشك و ناخی دەروون، هەروەك ماڵێکی کارتۆنی بەر بارانێ، هەر بەیەك رێژنەی هەڵدەقەنا و بەسەرمدا دەڕووخا و وێران دەبوو. ئەوەی کە دەیهێشتمەوە و رایدەگرتم تەنیا چیمەنتۆی بوونی وی بوو. ئەویش- هەستمدەکرد- بێجگە لە قوڵپەقوڵپ و جۆش و خرۆشی لاوەتی- دەیزانی کە چیمەنتۆکەیە، بەلاّم چیمەنتۆ بۆ دەمێکییە کە دامودەزگا و خانوو بەرەیەك لە گۆڕێدا بێ و بزانی بۆچییە... یانی دەو بێ ماڵ و حاڵی و بێ کاشانەگیەیدا ئەوەی هەبوو هەر تەنیا چیمەنتۆکە بوو؟- کە بارانی لاوەتییەی تێدا رێژنەی بوو و دەنا بێ ئەو رێژنەیە، وشك و برینگ و سارد و سڕ بوو؟... ئیدی من تازە، نەمابووم، ئەوەندەی هەشبووم چنگە گەچێکی وشك و برینگ بووم... بەلاّم بەو حاڵەشەوە، دەگەڵ ئەو هەموو جۆش و خرۆش و هەڵچوون و داچوونەشدا، بە پارێز بوو، هەروەك کاریلەیەکی بەڕەمەکییە خۆیەوە هەستبکات پلینگ خۆی بۆ لە بۆسەدابێ. دەیزانی پڵینگ هەیە، بەهێز و توانایە، بێ بەزەیی و بێ پەروایە؛ دەیزانی دەکاتی هێرشێیدا جوانە؛ دەستوبردییەکەی دەکاتی هەستان و هاتنەدەرێی دەکەمینێدا، و تووڕەییەکەی دەکاتی بەرگریەیدا- جوانە وەك جوانییە رەوکردنی ئاسکان، دەدەمی باز و بازرەقەیدا، و جوانە وەك خەت و خاڵی کەوێ- بەلاّم سامناك و ترسناکە! دەیزانی کە نووزە و بارەباڕی، وەك بارەباڕی کاریلەیەك، ختووکە و ئازاری پڵنگێ دەدا، و دەشیزانی کە هەر ئەو ئازار و ختووکانەشە وا لە پلینگی بکات رۆژێکی چنگ و نینۆکان لە گۆشتی نەرم و شلکی



ئەو کار مامزە شیرەخۆرەی گیرکات و پەراسووەکانی تێك قرمێنێ... دە دنیای خەونێکدا دەمرِوانی، هەرچەندە هەموو شتێکیشم دەدیت بەلاّم وەك راستییەك دەستم لە هیچ گیرنەدەبوو و نەمدەتوانی لە هیچ شتێك نزیك ببمەوە- شتگەلێکی هەست پێکراو و هەست پێنەکراو کە لەو ناوەدا تەنیا یەکێك یا شتێك، ناوەڕاست و چەق و سەنتەری دنیابێ، هەروەك زۆربەی زۆری خەونەکان... سەنتەری دنیای من دارگوڵ بوو. زەقاوزەق هەموو شتێکم دەدیت، و لەو زیاتر لە هەموو شتێکی دی بێ ئاگابووم، ئەو بەشێك بوو لە بوونم و لێشمەوە دووربوو، نازانم چۆن بوو... هەروەك کەسێکی بەزەبرێکی دەستێکی بپەڕێنن و ئەویش زەق زەق سەیریبکات، و سوڕ بزانێ ئیدی ئەوە بەشێکی لەش و بوونی وی نییە، کە سەردەمانێك بووە و ئەوەی ئێستای لەبیر چووبێتەوە کە هەیە و هەرتەنیا جێ دەستە بڕاوەکەی ببینێ و هیچی دی... تا هەروەك پەپوولەیەکی دەقۆزاخەکەیدا جینگلاّن بدا و خۆی نەبینێ، بەلاّم هەست بە قۆزاخەکەی خۆی بکا کە دەناویدا مت بووە، و هەموو بوونی وی دەخۆوە گرتووە و بەبێ وی متبوون مەحاڵە، بوون لە نەبوونەوە قەت نابێ؛ و جاری واش دەبێ کە دەو قۆزاخەیدا بەزیندووەتییە چاوان بمرێ و نەمێنێ، یا رۆژێ لە رۆژان بەشەویلاکەکانی قۆزاخەکە بدڕێت و بفڕێ- بەلاّم تازە بۆ کوێ؟ بۆ جێیەکی کە ئەمانی لێ نییە. جا ئەو ئەوەی دەگەڵ قۆزاخەکەی خۆیدا بکات هەقە هەرگیز ئەمانی نەبێ و نەحەسێتەوە... ئایا پەپوولە ئەوەی دەزانێ تا کەسێك بچێت و زیندووی کاتەوە؟... من ئەمەیانە نازانم...

بەو هەموو جوانییەشەوە تابڵێی سادەبوو... شتە سادەکان قووڵن، لەبەر قووڵیەیان سادە خۆ دەنوێنن- وەك پەپوولە، سروشت، وەك هەسارەکان، و سادە و ساکارەکانی دی، من جاری وابوو لەو قووڵییەی وی دەترسام- هەر لەبەروەی کە سادەبوو! هەروەك دە حەوزە ئاوێکی رامێنم، ئاوەکەی هێندە روون بێ نەزانم داخوا ئاوی تێدایە یان نا و هەروەك ماسییە بەدوای ئاوێدا دەگەڕام و وای تێ رادەمام کە زۆری نەدەما سەرەوبن تێبکەوم. تا کاتێ بەخۆ دەهاتمەوە و لێواری حەوز و ماسییەکانم دەدیتن کە شڵپەشڵپیان بوو دەوێدا و دەمدیت دەمم بەش بۆتەوە و گەرم داهاتووم؛ چاوەکانم لێڵ و پێڵن و چ نابینن؛ بێ وەی بزانم باوەژنەکە تەواوی ئەو ماوەیە چاوی دەمنەوە بڕیبوو و سەرەوبن منی بە پەتی سەرنج و تێڕوانینەکانیەوە هەڵواسیبوو؛ و دەنگی قوڵپەقوڵپی حەوزەکە بوو کە قوولاّییەکانی بۆ دەرخستبووم و بەخۆی هێنابوومەوە... و تا دەهات هەر گەرم دادەهاتم، و مانگی نێو حەوزە ئاوەکەش هەروا سوورهەڵدەگەڕا، و من

رەنگم سپی دەبوو و باوەژنە روخسارێکی مەتەلاوی بەخۆیەوە دەگرت، و رووی مانگیٚ دە حەوزەکەیدا زیاتر دە درەوشایەوە و ئارەقەی دەردەدا و بابە بەدەم پێکەنینێوە سەری بەردەدایەوە.

((لە کویٚ بووی؟)) هەروەك چۆن پێیەکی چەقاندبوو و لەسەر ئەژنۆیەکی دانیشتبوو و دەتەزبیحەکەیەوە رامابوو ئەو پرسیارەی کرد.

بە شلەژاوییەوە گوتم: ((چۆن؟ لە چ جێیان نەبووم)). چاوم دە دارگولێەوە بوو، کە شین و مۆر هەلگەڕابوو و نەرمە نەرمە پێدەکەنی و سەرەنجام دەتەقییەوە و هەردوو دەست بە دەمەوە شلان شلان بەدوای کارێکیدا دەچوو، بە چاوێکی سوورەوە کە پڕبوون لە مالئاوایی کردن لەو رێیەی کە بەخۆشبەزین و خۆبادان و بزووتن و چالاکییە پێیەکانی بەجێیی دەهێشت و سەرنجی منی بەدوای خۆیدا رادەکێشا و وردە پێکەنین و لاقرتێیەکانی وەك ئاوێکی بە ئاور داکراو، بەکزە کز، و هیسە هیسەوە، تا دەهات دوور دەکەوتنەوە، و پێلووەکانی باوەژنیٚ وەك پێلووی مریشکێکی سەر بڕاو سپی دەبوون و بەسەریەکدا دەکەوتنەوە و زاری لەکلیلەوە دەچوو- و من بە رۆیشتنێی ئۆقرەم لێهەلدەگیرا و لەپڕ مالەکە دەهاتەوە سەرباری پێشووی خۆی و مەقالەی گەرمی بابەی زۆریی دێنا و دەنگی ویزە ویزی سەماوەریٚ گوێی پڕ دەکرد و هەردەو دەمەشدا بۆشاییەکی گەورە دلی منی دادەگرت. هەر کە ئەو دەڕۆیی، هەموو شتەکان دەڕۆیشتن؛ بە واتای باوەژنیٚ هەر کە ئەو دەڕۆیی ئەو ناوە دەبووە ئاشی ئاو لێبڕاو: مالٚ دەحەسایەوە: ئاخر دەیزانی کە خەتی خوار لەبن سەری گای پیردایە- بەقسەی وی فیتنە نەدەما، زماندرێژە هەمووی رام کردبوون، لەمانگا بە کەلێش حەکەدارترە!... فیتنەی نەدەما و منیش وە ئاگا دەهاتمەوە...

چووبوومە کویٚ؟- ون ببووم، چووبوومە ئەوپەڕی دنیایە... چووبووم تا ئەوی ببینمەوە، هەرچەندە بە تەکیشمەوە بوو. زرپ و زیندوو و حازر و بزربوو و بەتەکمەوە، بەلام من، بیٚ ئاگایانە گێژ و وێژ و هەلوەدا. لەخۆم دەگەڕام، دەویدا و دەپێکەنینەکانیدا لەخۆم دەگەڕام کە پێخەفی من بوون ببوو و منیشی دەگەلە خۆیدا بردبووە جێیەکی کە من نەمدەزانی. بۆ خۆشی هەر نەیدەزانی کوێیە و بەردەوام پەیامی خەندە و جۆش و خرۆش و چەهچەهە و سێبەری سەرنج و دەنگی بانگ و تارمایی رەنگ و نەوای جۆراوجۆرو مووچە مووچی بیٚ ئەژمار بوو کە وەدووی منی ختسبوو و پێیان لەمن دەگەڕا، کەچی منیش هەروا بەتەکیەوە بووم. دەنگەکان



لە چوارگۆشەیەکی بیٚ بندا دەسووڕانەوە و خولیان دەدا؛ پەیامەکان لە چوارگۆشە بیٚ بنەکەوەڕا دەهاتن و خۆیان دە دار و دیواران دەکوتا و بەر سەرنجەکانم دەکەوتن و دە چوارگۆشەی بیٚ بنی مێشکمدا بلاو دەبوونەوە و تا ئەو پەڕی گیانمەوە دەچوون و لە کۆتایی گیانیشمدا، کە تێکەلاوی وی ببوو، بزردەبوون و نەدەمان، دەحالێکیشدا کە هەردووکیشمان بە تەك یەکەوە بووین و کرمی نەرمو نۆلی گیانیشمان لە قاوغەکانی خۆیان هاتبوونە دەریٚ و مالە رەق و تەقەکەی خۆیان بەجیٚ هێشتبوو و لێیاندابوو و رۆیشتبوون. تا ئەو رۆژەی ماندوو و مردوو و شەکەت دێنەوە و بەدزیەوە هەریەکەیان دە قاوغ و سەدەفی ئەویدیدا مالیٚ دادەنیٚ و جێی خۆی دەکاتەوە: رەنگە هەر بۆیەشیان مالەکەی خۆیان جیٚ هێشتبیٚ و رۆیشتبن، بەلکە ئیٚ دەگەڕانەوێدا هەلێك بڕەخسیٚ و هەریەکە بە پێچەوانەی مالی خۆیەوە بچێتە مالی ئەوەکەی دیبەوە، یا هەر رەنگە بە قەستیش وابکەن و بە بیانووی گێژی و شەکەتی و ماندوویەتییەوە مالە خۆیان لیٚ گۆڕاوە و هەر بەپیٚ و دانگی ئەو هەلسوکەوتە عیرفانەشیانەوە گەیبوونە ئەوەی کە، مالٚ لەهەر شوێن و جێگایەك بیٚ هەر مالە یارە و ئەوە ئەوانن کە خۆیان لیٚ ونبووە و هەریەکەیان روویان کردۆتە مالیٚ ئەویدی...

بابە گوتی: ((بەلیٚ، جەنابی برایم خان، ژیانیش شتێکی سەیرە... پیاو جاری وایە دەڕوا- بەلام بۆخۆشی نازانیٚ بۆ کویٚ؛ دوایەش با دەداتەوە و دەگەڕێتەوە، هەمدیس هەر نازانیٚ بۆ. پیاوێك ئەسپ هەلیگرتبوو؛ تیژ بەلای کانییە گوندیدا تێپەڕی، مندالێك بانگی کرد: ((هۆی، لالە حەمە، بۆ کویٚ وابەپەلە؟))- پیاوەش، کە هەروا یالی ئەسپەی گرتبوو و خۆی بەسەرملی ئەسپەیەوە نوساندبوو، بە ترس و لەرزێکەوە ئاوڕێکی دایەوە، ئەوە ئەسپەش هەردەخۆ دەنوسیٚ و دەڕوا گوتی: ((جا تازە لالەحەمە!؟)) ئیدی لالە حەمەیەك دە ئارادا نییە... بەلیٚ جەنابی برایم خان، جا تازە و لالەحەمە!)) زەردێکم هاتیٚ... و پێم سەیر بوو کە دەو سەرسامی و پەرتیەیدا دەمزانی کە ئەوە بۆ خۆمم، و ئەوەش بابەیە و ئەمەش ژوورەکەیە و ئێمە دانیشتووین و من واخەریکم پێدەکەنم و ئەو زەمزەمە خۆشە و ئەو ریزە خەندەیە و ئەو قولپە قولپە لەمنەوەیە کە ئاوا لە دوورەوە رەهابووە و خۆی دەگەیەنێتەوە پەردەی گوێم و گیانم وەلامی دەداتەوە. بەلام وەلامەکەی- وەلامی گیانم بۆ ئەم رووداوە- زۆر خاو و لەسەرەخۆ بوو: خاویەکی ئەوتۆ هەروەك دەچلەی هاوینێدا دلۆپە ئاوێکی بەسەر قیرتاوێداکەن، هەلی دەمژی و بلاوی دەکردەوە و دەری دەدایەوە: خاویەك هەموو گیانی داگرتبووم؛ یاری بە گیانم دەکرد؛

تەڕایی بوونی خۆی دەکردە گیانمەوە و گیانمی پاراو دەکردەوە و من ئەو دڵۆپە وردانەم هەڵدەمژی، تا لە کات و ساتی خۆیدا، بەنووزە و داد و هاوارەوە، تەنانەت بە پڕکێشییەوە، ئەو دڵۆپانە هەموو بهێنمەوە و بیاندەمەوە وی. سەرم لەوەی سوڕمابوو، کە داخوا بەو چاوە ڕەشانەوە چۆن ئەو دنیایەی ئاوا سەوز و ڕۆشنا دەدیت و چۆن ئەو هەموو ئاواز و زەمزەمەیەی ئەم دنیا وشکەی کە تا دوێنێ بیابانی بەرەهووت بوو بە چ هێزێکەوە دەریدەبڕی و ئەو هێزی بۆلای خۆ ڕاکێشانەی لە کوێڕا هێنابوو؟ دەتگوت خوا ئەوی بۆ ئەوە ڕەخساندووە تا لە بوونی خۆمانمان ئاگادار کاتەوە، تا لە خۆمان دابڕێین و دووبارە وەخۆ بێینەوە و تا هەبێ ئەوە هەبین و ئەگەر ئەویش نەما ئەوە بەرەو نەمان بچین و هەڵدێرێین.

جارجارە ئەویش ون دەبوو... ڕێیەکە ئاشکرابوو... بۆ وای لێهات؟ خۆ ئەو نەیدەویست وای لێبێ... خۆ ئەو نیازی سەفەر و گەریدەییە دنیایەی نەبوو. ئەو بۆیەی سازی خۆی وەدەنگ هێنابوو تا من دەخاوی و بێ هەستییەدا ڕۆبەرێت و بمخنکێنێ؛ ئەو بۆیەی ئەو سازە وە دەنگ هێنابوو بۆ ئەوەی دەنگی سازەکەی دەگەڵ نەوایە هاوکێشەکانی مندا دەتای یەك تەرازوودا هەڵکێشێ و هاوسەنگی بکات، تا دار و بەرد و ماڵ و هەرچی هەیە وە سەمای خا- و ئەوە ئاوا! هەر کە خۆی دەسەرنجەکانی مندا دەدیتەوە سووردەبۆوە، غەمناك و شەرمێون دادەنیشت و خۆی لەبیر دەچۆوە، هەرکە ئەو بەخۆیدا ڕۆدەچوو تای تەرازووی سۆزی ئێمە سووکتر دەبوو و ڕەحەوا دەکەوت، و ئێمە لە قولاییە هەرەبنەوەی هەستەکانەوە دەهاتینەوە دەرێ، هەروەك من و بابە و منداڵەکانیش هەموو وێکڕا هەستمان بە بێدەنگییە سازەکەی کردبێ و هەموو پێکەوە سەرنجەکانمان بەلای ویدا دەسوڕا و خوشکە چوکەڵەکەم کە لە نێوان هەردوو لاقەکانییەوە دانیشتبوو چنگی داویشتن و سەروپڕچی دەڕنیەوە زماندرێژە هەمووی کردبوونە ئاڵقە لە گوێی خۆی! ((ئەی بڵێم خودا چت لێبکا، بلیمەت!)) ئەوەش باوەژنە. کە ئەویش لەمە بەدەرنەبوو. سەدان جاری گرتبوو: ((ئەگەر دەتەوێ خۆشەویست بی، یا دووربە، یا کوێربە)) و ئێستا کە دووربوو ئاوا! بەڵێ، دەنگی سازەکە ئاشنابوو، خۆش بوو: سازی لاوەتی بوو کە لاوەتی لە کوێرەڕێ و بیابان و بەستەکانەوە، دێنایەوە نێو بەهاری یاد و بیرەوەرییەکان... لاوەتی جوانە، تەنانەت دەپیریەشدا هەرجوانە- ئای لاوەتی... یادت بەپیریش هەرجوانە، هەرچەندە دڵ گوشینیشە! جوانییەکەی دەو دڵ گوشینیەیدایە، دزێوی و ناشیرینی ئەو ئیعجازانەی نین، ئەوپەڕی هونەرەکەی هەر ئەوەیە کە دڵ ئازار دەدات و هیچی دی...



لە بەرامبەری دادەنیشت و زەق زەقی تەماشا دەکرد، بەهەستێکی شەرمێونانەوە، ڕەنگە بە هەستێکی پڕ ئازاریشەوە بووبێ. بابە تێوەرێخی داویشتێ و لەپڕ شەپۆلی لاوەتییەکە دوور ڕۆیشتبوو هەمدیس دەهاتەوە- هەروەك ئەو شەپۆڵەی سەر لە گابەردێکی دەدا- و کەفی دەکرد و هەڵدەچوو و زیخەڵێنی بێرە و بەوێدا وەردەکرد و پڕیشکی بەسەر هەمووواندا دەپژاند و هەموو بێ ئیختیار، ڕادەچڵەکاین و لە قاقای پێکەنینێمان دەدا. ئەم کارە لە یەکێك لەلاوترین ئەندامەکانی ماڵێوە سەری بەپشتی منداڵێکەوە بنێن، چاوی گرد دەکردنەوە و خۆی لە منداڵەکە دەکردە دێو- بەڵام چەند جوان! منداڵەکە خۆی وێك دێنایەوە، لەو ترسە خەیاڵییەوە، دەستی دەکرد بە قاقای پێکەنینێ و بەڕوخسارێکی ترساوەوە بەڵام شاد، لە ترسان و بەخۆشییەوە جووتەی داویشتن! و ئێمەش پێدەکەنین و باوەژنە بێ ئیختیار بەشێکی پێکەنینی منداڵەکەی بۆ لێوی خۆی دەبرد، بەڵام وەك پێکەنینەکە لێوەگەزەی پێوە بووبێ، زوو دەمولێوی وێك دێنانەوە. دارگوڵ پێدەکەنی، ڕەنگە هەرواش بێ هەست و بێ ناوەڕۆك پێکەنیبێ و ئەوەی لێی دیاربوو تەنیا هەستی سووربوونەوەی گۆنا ئاڵەکانی بوو- کە بۆ خۆشی بە ئاشکرا دەیدیتن- هەر بەوچاوە گەشانەوەی کە دەتگوت روونییە ئاوی جۆی تەنکاوی بەهارانن، پڕ لە رووناکی و پاکی و بێگەردی و ڕەنگ و نیوەڕەنگ و جووڵە، ڕەنگی تۆخ، تێکەڵی بێ ئارامی، و دوولێوی کەمێك کراوە، هەروەك بڵێی چاوەڕێی مۆری ماچێك بن تا هەردوو سەریان پێکەوە بنوسێنێتەوە... دەوەدەمە خامۆشی و بێدەنگیانەدا، جاری وابوو کە سەرم هەڵدەبڕی و چاوم دەگێڕا. هەر کە سەرنجمان تێك هەڵدەنگوت دەمدیت کتوپڕ چاوەکانی گیانێکیان وەبەر دەهاتەوە و تروسکەیان دەهات و پڕشنگیان داویشتن، و هەستم بەترپە ترپی لێدانی دڵی دەکرد؛ دەمارە باریکەڵە سوور هەڵگەڕاوەکانی سەرکوڵمە و لێدانی لەسەرەخۆی پەڕەی لووتیم دەدیت. بەخۆمم دەگوت، ئەوە چ کوڵمە و گۆنایەکە؟ ئایا ئەوە هەر بەڕەمەکییە ژنایەتییە خۆی وافێرە دەستووری شاری بووە و وەك هەرکچێکی دی لە بەرامبەر خوازیاری ئاوا خۆ قورس کات؟... نازانم. ڕاستە، مێشکم، هەست و نەستم، هەروا لەخۆیانەوە شتگەلێکیان تۆمار دەکرد بەڵام گیانم ئاگای لەو شتانە نەبوو... دەروونم خاڵی بوو دەگەڵ ئەو هەموو گەرمی و گوڕیەشدا زۆرم هەست بەنزیکییە وی دەکرد، ئەوە دووریەکەی زیاتریش، خۆ لەمپەر و بەربەرستەکانیش ئەوە هەر هیچ، هەر لێیان مەپرسە چەند زۆرن. دیارە ئەو قسەی بابەم قبووڵ نەبوو کە ((حەزو ئارەزووێکە، تێدەپەڕێ؛ ژیان نابێ لەسەربناغەی حەز و ئارەزووەوە هەڵچنرێ)). ڕاستە کچ و

کوڕی ئەودەمی ئەو هەموو پسان و گرێدانەوە و گەش و ڕەشبینی و حیساب و کیتابەی کچ و کوڕانی ئێستایان نەبوو. ئەو پێکەوە بوون و پێکەوە دانیشتنانەی ژن و پیاوان دەگۆڕێدا نەبوو؛ ناو ماڵێ مە کە ((بێشکەی ئازادی)) گەڕەکێ بوو ئاوابوو، ئەدی دەبێ ماڵەکانی دیکە چۆن بووبن... ئەوە بەلای خۆیەوە ئازادی وەرگرتبوو! هەربۆیەش بوو ماڵێ مە لە بەرامبەر بیروڕای گشتی گەڕەکێدا، زۆر پەسەند و شوێنێکی شایستەی نەبوو و دەوجۆرە شوێنانەشدا دیارە کە ئەوین و خۆشەویستی و دڵداری تێکەڵی حەز و ئارەزووەکان دەبن و وەك یەکیان حیساب بۆ دەکرێ. کام لاوێکی سروشتی و بێکار دە ژینگەیەکی وادا تووشی بگرە و بەردەو دەمە تەقێی فەلسەفیانە دەکات تا بیەوێ و بتوانێ بیسەلمێنێ کە حەز و ئارەزووەکان لە کوێوە سەرهەڵدەدەن، و لە چ قۆناغێکدا دەبنە ئارەزووی رووت و دەبێ چەند قۆناغان ببڕێ تا دەبێتە عیشق و ئەوین؟ ئەگەر لاوێکی ئاوا هەبێ ((ناسروشتییە)) و ئەگەر ((سروشتی))ش بێت ئەوە لێرەی جێ نابێتەوە. دەمە دەمە و چەقەچەقی فەلسەفیانەش، هەر لەو قسانەن! من بەڵێن دەدەم هەر ناوەکەی (ناوی فەلسەفە)ببیسن پێیان وایە ئەوەش هەرجۆرە ((برێشکە)) خواردنێکە. هەر کە وردیش بوویەوە دەزانی کە وایە- زگی تێروکاری نەکردەی دەوێ، هەر دانیشێ و ئەو برێشکانە یا ئەو چەقەچەقە فەلسەفیانە وەك شەوچەرەی زستانێ کاوێژکاتەوە. دەوجۆرە ژینگە و دەوروبەرانەدا عیشق دەکاری هەمان حەز و ئارەزوودایە و حەزو ئارەزووەکانیش هەر تەنیا هەوەسی رووتن. دەو جۆرە ژینگانەدا هەر کچێك بیەوێ زۆر بە ئاسانی دەتوانێ هەر بە تیلەی چاوێك دڵی هەر کوڕێك بۆلای خۆی راکێشێ و گیرۆدە و شێت و شبر و شەیدای خۆی کات. و هەر کوڕێکیش بە کەمترین زەردەخەنەیەکی هەر کچێك شەیدا و وەیلانی دەبێت. هەناسەی لاوەتی و جوانی پێکەوە نیوەی کارەکان مەیسەر دەکەن. رەنگە هەربۆیەش بێت کە وشەی لاوەتی و شۆخی دە زاراوەی خەڵکی ئێمەدا هەردووك بەیەك مانا بەکاردێن. هەربۆیەش بوو کە زیاتر چاوی دایك یا پوور یا مامۆژن لەجیاتی چاوی لاوەی دەگەڕاو یەکێکی دەدیتەوەو هەڵیدەبژارد و لاوەش ئەو هەڵبژاردنەی ئەوانی پەسەند دەکرد- ئیدی لاوەتی بوو، خۆ ئەگەر ئەو هەڵبژاردەیە زۆریش جوان نەبایە خۆ لاوبوو- و چ لەلاو و لاوەتییەش کە سەرنج راکێشان و پەلکێش کردنیش دەونێوەیدا بەشێك و کاریگەرییەکی تەواوی خۆیان هەیە؛ یا هەر بەقسە ئیدی حەز و ئارەزوو یا هەوەس ئەوانیش هەر بەشێکن لە عیشق و ئەوین و دڵداری یا- هەر عیشقێکی رووتن- ئەوینی بێ حەز و ئارەزوو لە



خۆشەویستییەکی سارد و سڕ بەولاوە چیترە؟ هەر بەناوەکەیڕا دیارە، هەوەسە، ویستە، تکایە، دەبێ هەریەك لەوانەش هەبن تا ئەو ئەڤینە گەرموگوڕتر هەمان کێشمەکێشە، و کێشمەکێشی بێ پەلەقاژە و مەشق کردنیش قەت نابێت، پەلەقاژە و هەوڵدانیش هێز و توانای گەرەکە، خۆ ماندووکردنیش گەرمی دەردەدا- و گەرمیش هەر هەمان ئەڤینە- هەمان هەوەسە- هەوەسێکی پوختە و لە کوورە دەرهاتوو.

نا، خۆ من نەمدەویست حەکیم باشییەکی زانا و دانا بە هاوسەرییە خۆم بێنم، لەگەڵی دانیشم و هەر ئەو ئامۆژگارییان بکات و من گوێی بۆ رادێرم و سوودمەندبم، یا من لێی زیاد کەم و ئەو بەهرەمەند بێت. نا، ئەو جۆرە شتانە دە راستییەکانی ژیان و سروشتی ئادەمیزاد دا رەگ و ریشەیەك و شوێنێکیان نییە. ئەوە بۆ کەسانێکی وەك سوڵتان مەحمود دەبێ دەگەڵ ئەیازیان دانیشن و گوڵ بڵێن و گوڵ ببیسن، و ((عیشق)) بکەن... ژیان یانی ئەم شتانە- شەیدا بوونێ قاقای خوڕەی جوێباران، وەدووکەوتنێ ئاوی روونی جۆگاوان، بەناو جۆ و جوێباران کەوتن و خەندە کۆکردنەوە و تەڕبوون و خۆتێوەردان- نەخۆش بوون- و تادەگاتە مردنێ!...

گرفتارییە گەورەم ئەوەیە، هێشتا سەربارم، هێشتا نانخۆرم؛ هێشتا قوتابیم. هێشتا چاوم هەر لە دەستی بابەیە و ئەوەی ئەو دەمداتێ هەر هێندەیە بای گوزەرانێکی مەمرە و مەژییە قوتابییەکی زانکۆی تارانێیە- ئەویش بەزەحمەت. بۆیە خۆ ئەگەر بشمەوێ لەخوو خدە و نەرێت و رەسمی ناوچەیی لادەم و بیخەمە پشت گوێ ئەدی گوزەرانی وی چۆن هەڵسوڕێنم. لەوەش بترازێ ئەدی- بەقسەی باوەژنێ- ئەو حیلکەحیلك و جرت و فرت و سەماو سوڕدانانەی خۆ هیچیان لە بارەوە نازانم و تێناگەم- تا هێشتا هەنگاوی پێویستم دە هەوەسێدا نەناوە... دەزانم زۆر سادەیە، دەزانم مێشکێکی بێگەردی هیچ لەسەر نەنوسراوی هەیە، دەزانم باوەڕی بە شتی پڕ و پووچ و خورافاتانە- بەڵام چ جۆرە خورافاتێك؟ خورافاتێك کە چیانشینان هەیانە: ئەوان هەر سروشت دەناسن و لەهێزە ناسروشتییەکان زۆر دەترسن و لێیان بە گومانن: ئێستاش بەسەرهاتێ ژنە دەستگرەوەکەی هەردە دڵیدایە و لێی جودا نەبۆتەوە. خودا و پێغەمبەریش دەناسێ، بەڵام چۆن ناسینێك؟ هەربای ئەوەندە بڵێت: ((خوا بکا، خوانەکا! بەخودا- بە پێغەمبەر!)) و چاوان وێك بێنێتەوە و روخسارێکی سامناك بەخۆوە بگرێ- ئیدی هیچی دی... لێی بپرسە، لەچی دەترسی، نازانێ لە چ دەترسێ. لەبیرمە شەوێکی مەلا برایم هاتبوو.

مەلا برایم پیرەمێردێکی ریاکار، زۆر بلّێ، رەنگ زەرد، زۆرخۆر، سەر و کەللە باریکەلّەی سوسماری. هەر راست دەتگوت پیرە سوسمارە. دەمە بێ ددانەکاو لەکەی، بەو سمێلّە ئوزبەگیانییەوە، بەردەوام دەجوولاّن؛ ئەگەر نەیخواردبایە دەکاویەوە: دەیگوت: ((ئەی ئەوەی لە نووری خودای کە وتییەوە))ی دەست پێدەکرد، هەر بۆ توێشووی رۆژی دواییت و دە دەمولەوسی خۆیدا دەیهێنا و دەیبرد و گەرووی پاك دەکردەوە و تینی تێدەکرد: ئەی ئەوەی لە نووری خودای کەوتییەوە، هەموو جیهانیش لە تۆ کەوتۆتەوە...)) چرا فانۆسی دەدایە دەست کورێژگەکەی و وە دووی پیرە فانۆسێ دەکەوت، بە واتای باوەژنێ وەك مەرێك وەدوای چنگێك ئالیك کەوێ. هەرچەندە ئەو ئالیکەش دووربایە بەهێزی خەیالّی دەیهێنایە پێشەوە پەنا فانۆسێ و دەیدەیتەوە.

خۆی بۆ شامێ بانگهێشت کردبوو. هەمیشە هەروا بوو. بەرەبەری جەژنی قوربانێ بوو؛ هاتبوو شتێکی پەیداکا، و هەربەدەم هاتنێشیەوە ئەرکی خۆی بەجێ بێنێ و باری خۆی سوك کاو ئەرکی سەرشانی، بابەی وەبیر بابەی بێنێتەوە: دەربارەی هەقوڵلاّ و هەقونناس، هاتبوو هەربەدەم وەرگرتنێ هەقوڵلاّیەوە هانیشی بدات قوربانییە بۆ کەسوکاری مردوو و زیندووەکانی خۆی بکات. خۆ ئەگەر جوانەگاش لە عەردیدا ئەوە چاکتر، هەرنەبایە ئەو هەم زیاتری دەبرد و هەم گۆشتی نەرمە و چاکتریش — ((حەوتوو))یانی قوربانییە حەوت کەسان.

گوتی کتێب دەفەرموێ رۆژی قیامەتێ هەر کە گەیشتییە پردی سیراتێ ئەو بەستەزمانە زیندوو دەبێتەوە و دێ لەبەردەمت و لەبەردەمی ئەو کەسانەی کە قوربانییەکەیان بۆکراوە دەکەوێ. هەر کە سواری بوون ئیدی ئەوە بە چوار نالّە بەسەرپردێدا، ئەو پردەی لە موو باریکترە و لە ئەلّماس تیژترە دەپەرێتەوە... دارگولّ چای هێنابوو، لە ژوورێ بوو. کشومات بەزاری بەشەوە دەیروانی چۆن؟ ئەوە چ پردێکە، ئەوە قەت نەبووە پرد؛ پرد یانی پرد، یانی خەلّکی بتوانێ بەسەریدا بڕوا- باشە بۆ وا؟ حەوت کەس چۆن سواری گایەکی دەبن؟ بەخۆ و بەو سمانەیەوە چۆن بەسەر پردێکی واباریکدا دەڕوا؟ بۆ ئەویش هەروەك ئەو گایەی مالّێ خۆمان نییە کە لەسەر ئەو پلیکانە پان و پۆڕانە بەربۆوە و مرد...!.

((راستی دەکرد؟)) زۆر مەزلوومانە.

((چی- کێ؟)).



((ئەو مەلایەی دوێنێ شەوێ هاتبووە لای بابەی)).

((چی راست دەکرد؟)).

((ئەدی نەیدەگوت حەوت کەس بەسەر پشتێوە بە چوار نالّی بەسەر ئەو پردەیدا دەڕوا- بۆ گاش بۆ سوارییە دەبێ؟- جا چۆن حەوت کەس؟)).

((ئیدی ئەو بۆیەی واگوتووە- تا خەلّکی قوربانییان بکەن!)).

((ئاخر دەیگوت کتێب وادەلّێ!)).

((لەخۆیەوە بەناوی کتێبێوە وا دەلّێ...)).

دەگەلّ هەموو ئەمانەشدا خەیالّی نارەحەت بوو؛ کتێبی چووبووە دەمێشکییەوە؛ کتێب هەروا لەخۆوە نەببووە کتێب؛ کتێب نوسراوە بوو؛ نوسراوە ئەفسون بوو... دیارە شتێك هەر هەبوو کەببووە کتێب، بێگومان شتێکی تێدا بوو...

من پێموایە ئەگەر بەویم گوتبا هەر ئاوا بێ مارەبڕین بڕۆین و پێکەوە سەرپێکەوە نێین و بژین چ قسێکی نەبوو. دیارە ئەودەمی نەمدەزانی، ئەزموونێکی وام نەبوو تا بزانم کە پیاو دەیەوێ هەموو دنیا و ژنەکەشی پێکەوە خۆش بووێ؛ کەچی ژن تەنیا دەیەوێ هەر تاکە یەك پیاوی هەبێ. ئەلّبەتە ئەوە بەو مانایە نییە کە ژن ناکەوێتە ژێر کاریگەری ژینگە و دەوروبەرەوە و لەمێردەکەی خۆی بەولاوە گوێ بەجیهان و شتەکانی دی نادا- ئەمە دوای شووکردنێ پەیدا دەبێ؛ دەپێش شووکردنێدا هەمیشە ژن لە پیاوان فیداکارترە، و مێردەکەی بۆ هەرجێیەکی بەرێ دەچێ: جاری وایە تەنانەت گوێ ناداتە چ مەرج و مەرجکارییەکی. ئەودەمی ئەوەم نەدەزانی بەلاّم هەستمپێدەکرد. بەلاّم ئاوا هەروەك گوتم گرفتارییەکە گرفتارییە بێدەسەلاّتییە بوو. سەرەڕای ئەوەش، دەبووایە هەندێ شتی پێویستی دیش هەبوون رەچاوکرابان. بابە هەردەبوو. دە ناوچەکەدا بژیەت، نەدەبایە ببێتە جێ نیشانەی تیر و توانج و تانە و تەشەری کەسوکار و تیرەو تایەفان... وەك بلّێی ئیشی خۆشم بە چاکی دیارنەبوو... دەمزانی کە هاوکوفی یەکتریش نین، بەلاّم هەر دەمویست- زۆریشم دەویست؛ دەگەلّ ئەو ویستنەشدا دەمهەویست چۆنم هەروابم و چ کەموکورتیم نەیەنە پێشێ و لە کەمیە نەدەم. ئێستاکە ورد دەبمەوە دەبینم ئەوم دەوێ؛ بێ ئەوەی لە بەرامبەر ویدا خۆم لە قەرەی هیچ فیداکاری و

قوربانییەکی گەورە بدەم: دەمویست ناو و ئابڕوو و ڕێز و سەنگینیم هەمموو لەجێی خۆ بن، و ئەویشم وەك فەرشێکی چاك یا شووشەواتێکی بە نرخ دەستکەوێ. نەمدەزانی، پیاوێکی ناتەواو بووم- ترسنۆك، لەخۆ نەبوردە. ئەودەمی نەمدەزانی- لاوەتی نەیدەهێشت. جاری وابوو لەخۆم بێزاربووم و نەفرەتم لەخۆم دەکرد. لەبەروەی نا کە هەست بەو ناتەواوی و ترسنۆکییەی بکەم و دە ئازاردابم؛ نا، ئاگام لەو شتانە هەر نەبوو تا هەستیان پێبکەم و ئازاریان پێوە بچێژم. کامە لاوەیە کە خۆی پێ تەواو و ئازا نەبێ؟ ئەگەر شانازییە لە لاوێکی بستێنیەوە چیدی بۆ دەمێنێتەوە. نا تەواویش جۆرێکە لە بێ غیرەتی- ترسنۆکی رووت، بێ غیرەتی. نەفرەتم لەوەی دەکرد کە جاری واهەبوو دەمدیت بەخۆ نازین و بەخۆ راپەرموونم شانازیم لەکەدار و رووشا و بریندار بووە. سەرنجم بالّی دەگرت و گیانم بە یەك دنیا تاسە و حەز و ئارەزووەوە دەکەوتە سەربالّی سەرنجم و بە ڕێنماییە سەرنجەکانی وی، بەدەم زەردەخەنە و تاسەوە بەرەولای وی دەچوو؛ کەچی بەو هەمموو تاسە و حەز و ئارەزووەوە، ئەو سارد و سڕ لووتی دەکرد بەولاوە، کە دەگەیشتمە لای دەرکێ پێڵوە قورسەکانی وەك دەروازەی دێوان دەهاتنەوە یەك و جووت دەبوونەوە و گیانم لەو دیوی دەرکێوە دەمایەوە و بێ گوێدان و زۆر بەسادەییەوە بالّی سەرنجمی تێك دەشکاند و گیانمی دەو هەراو زەنای شۆڕ و تاسە و حەز و ئارەزووەوە وەك هەلّۆی بریندار لەپەڕ پەرۆچکەی ئاسمانێوە دێنایەوە بەرپێی و دەکەوت. تا نەکەوتبایە بەسەرنجی تێکەڵ بە زەردەخەنەیەوە هەڵێنەدەگرتەوە و لەسەردەستی خۆی دانەدەنا، و هەڵێنەدەدایەوە و نەیدەفڕاندەوە- جاری وابوو ئەو کارەی هێندە تێکەڵ بەگوێ نەدانێ بوو کە هەروەك بێچووە کۆترێکی لاواز هەرچەند جارێکی کە هەڵیدەدایەوە ئاسمانێ دووبارە دەکەوتەوە- بالّی گیانم قورسایی غەمەکانمی نەدەتوانی لەسەر دیوار و لێواری پەنجەرەکانەوە دەمامەوە و نەمدەتوانی بفڕم- کزولاواز و غەمبار، بە بەرتیری سەرنجە پڕ تانە و تەشەرەکانی باوەژنێوە، کە هەریەکەیان لە نینۆکی سەد پشیلەی گەڕ تیژتر بوون. تینم دەدایەوە بەرخۆم: پیاو، باشە ئەو کچە لادێیە چییە وا تۆ خۆت بۆ سووك و ریسوا کردووە و ئەو هەمموو زەنگوڵە و گوڵێنگانەی بە کورتانێوە دەکەی و ئەو هەمموو دەردەی پێوە دەکێشی؟ سۆزم دەدایە خۆم کە ئیدی لەمەودوا هێندەی بەدەوروخولدا نەیەم و نەچم؛ خۆم خڕ دەکردەوە. ئەو جارەیان نەك وەك بێچووە کۆترۆکەکی بەڵکە وەك شەهێن و باز و هەڵۆیان- بە شانازی و راشکاوی و بیرکردنەوەیەکی تەواوەوە؛ کەچی بێ ئاگا لەو تانوپۆیانەی کە جۆلاّی خۆشەویستی بەدەوری



تەواوی گیانیدا تەنیبووم، هەروەك هەست بەتینی ئەو تاروپۆیانەی دەوری گیانم بکەم. تەنانەت جاری وابوو هەڵدەستام و لە مالێ دەردەپەڕیمە دەرێ. بەلاّم دوای کەمێك وەك دووبارە شتێك بۆلای خۆیم راکێشێتەوە سەرلەنوێ دەهاتمەوە نزیك دانەو داوەکەوە. چەشەکەم دەدیت؛ تالّەکانی داوەکەم نەدەدیتن- چونکە هێندە ناسك و باریك چنرابوون. پێکەنین و رۆین و هاتنەوە و هەلّسوکەوتەکان هەمموو ئەوەیان پێشان دەدا کە دووبارە هاتوومەوە و بە گرفتاریشەوە هاتوومەوە...

ئەلّقەیەکی بچکۆلانەم بۆ لەزێڕینگەرێکی جوو کڕی، کە هەر دەستوبرد بەداوێوەی کرد و دەملی کرد، هەولّی دەدا تابتوانێ نەهێلّێ ئەلّقە و داوەکەدەرکەون. بەلاّم من جێی ئەلّقەکەم دەزانی: دەمزانی کە ئاسوودەیە و پشتی و سەرپۆشی بەسەرەوەیە و جێیەکەی فێنکە و هەوای سارد و گەرمی لێنادا. ئەمە نیشانەی ئومێدبوو، هەرچەندە بۆ خۆشم شت بەدەستی خۆم بووم کەچی ئەو بەلّێنەی بابە، کە ((بابزانین رۆژگار چ دەکا)) ئارامییەکی دەدامێ و دلّی دەدامەوە- ئەو زیاتریش: ئەوئیدی دەستەگولّی نیشانکراوی خۆم بوو...

رۆژی گەڕانەوێی تارانێم هەرگیز لەبیر ناچێتەوە. سادە و بێ گوناە و پاك و بێگەرد، وەك کچۆلّە قوتابییەکی شەرمێونی مەکتەبێ لەلایەکیەوە راوەستابوو، رەنگی تێکچووبوو، کولّمەکانی رێ رێ- زەرد و سوور-ببوون، چاوەکانی سوورهەلّگەڕابوون. راوەستابوو و سەیری دەکرد. سەرنجی خالّی، دەستی بەیەخەیەوە گیربوو، ئەلّقەکەی دەدەستیدا دەگوشی. ئەوین و خۆشەویستی و پەیمان و وەفای دەگەلّ وەرێ دەخستم؟ هێز و تینی لەو ئەلّقەیەوە وەبەر خۆ دەنا؟ لەجیاتی منی دەگەلّ ئەلّقەکەیدا سۆز و پەیمان و بەلّێن دەبەستنەوە؟ پەیمانی خۆی بە ئەلّقەکەوە هەلّدەواسی؟ ئەو گوشینەی کە ئەلّقەکەی پێ دەگوشی دلّنیاییەکی تەواو تەواوبوو کە بەمنی دەدا؟ - پێموابێ هەمموو ئەمانە و زۆر شتگەلی هەستیاری دیکەش هەبوون، کە من ناتوانم ناویان لێ بنێم. گەڕامەوە سەیرێکم کرد- بەدزی، و سەرپێیانە، ئاخر مالّئاوایی لە قەرەواش و نۆکەران پێچەوانەی خوو و خدە و نەرێتی ناوچەکە بوو- جۆرە سووکایەتییەك بوو؛ بەجۆرێك لاوازی نەفس و بێ مایەیی لێك دەدرایەوە. ئەو دە دنیای خۆیدا بوو، هەروەك من نەبینێ، یا لە من بەولاوە هیچ شتێکی دی نەبینێ. دە حالّەتی زیندە خەونێکیدا بوو، وەك رێبوارێکی کە بەدەم رێوە کتوپڕ دەریایەکی گەورە لەسەر رێ و لەبەردەمی خۆیدا ببینێ- بێ

نان و ئاو، بێ توێشوو. دیاربوو گریاوە؛ بەلاّم چونکە زۆرجاران هەروا بۆ خۆی یا بەقسەی باوەژنێ دەگریا، کەس ئەو گریانەی نەدەبردەوە سەربناوانێکی دی، هەلێکی وەدەست هێنا (بابە و باوەژن بە ئەحمەدیان گوت کە جانتایەکە شتی شکانێی تێدایە، ئاگای لێبێ- ئەحمەد خەریك بوو جانتاکەی شەتەك دەدا) هەلی لەمە وەرگرت: ((دێیەوە؟)).

((زۆر دلّنیابە کە دێمەوە...!)).

ئارەقەی کردبوو؛ منیش هەروەتر؛ ئەو دەلەرزی، من گڕم گرتبوو- لێوان لێو لە غەم و پڕاوپڕ لە ئەڤین؛ غەم و ئەڤین؛ دوو ئاوێتەی دلّەڕاوکێ و هەلّچوون- بەرگەی ئەو دووریەی چۆن بگرم؟ هەرچەندە کە دەمزانی ئەوە هەر ئی منە، لێرەیە و تادێمەوە هەرلێرە دەبێ، یانی ناچارە هەر لێرەوەمێنێ، چ جێی دیکەی نییە، بچتە کوێ؟ جا بۆ بابە دەیهێشت!.

ئەوە لە تارانێم، دەخوێنم- چ خوێندنێك! ئیدی هەرچی بێ ئەوە دەخوێنم؛ زیاترم هەر روخساری وی دەنێو کتێبەکاندا دەخوێندەوە: هەر کە کتێبم لێك دەکردەوە رووی وی لەلایەکی وشەکانەوە وەك مانگی چواردەی پشت کێوێکی تاریك هەلّدەهات و وەدەر دەکەوت؛ پێدەکەنی، دەگریا، لاسایی دەکردەوە، مووچە مووچی بوو- و منیش ئەوە بالاّن لێکدەدەم و بەرەولای وی دەچم. سەیرە هەر نامەیەکیشم کە دەنووسی سەرەتاو لەپێش هەمووانم لەوی دەپرسی: ((دارگولّ چۆنە، ساغە، بەکەیفە، شادە؟ ئێستاش هەروەك جاران پێدەکەنێ؟ بێ ئاگا دەنووسم: ((ئەمانەتییە ئێوەو دارگولّ، مندالّە، مەهێلّن ئازاری دەن...)) هەروەك زۆر سروشتی بێت ئاگام لەوەی نییە کە بەگوێرەی خوو و خدەی مە، یەکەم راست نییە، دووەم- ئەگەر راستیش بێت و رێی ئەوەشم هەبێ- دەبوو لەپێشدا هەوالّی دایە گەورە (داپیرە) و پوور و مندالّەکان بپرسم و ئەوجا بێمە سەر هەوالّپرسینی نۆکەر و قەرەواشان... بەلاّم من دەمنووسی. بابە ئاگاداری دەکردەوە، بەلاّم بەشێوەیەکی راستەوخۆ و روون و ئاشکرا و یەکسەرە، نا- بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ: کە نامەکەی تەواو دەکرد، لە داپیرە و بەگوێرەی تەمەن و گەورەو بچووکییەوە تاپوور و مندالّەکان پێدا دەهات و هەوالّی وانی پێڕا دەگەیاندمەوە، ئەوجا دەهاتە سەر نۆکەر و قەرەواشان و زۆر بەکورتی ناوی دێنان و دەیبڕییەوە- ئاوای دەمن دەگەیاند کە شێوازێك هەیە، گەورە و گچکایەتی، و خوو و خدەیەك کە دەبێ رەبەرچاوبگیرێ، بەلاّم من ئەوانەم ناچنە دەگوێوە...



هاوینە، بەتاسە و خۆشییەکەوە خۆم ئامادەی دیدار دەکەمەوە، هەرمەپرسە، زۆر جیاوازتر لە سالاّنی پێشووتر. هەر بۆ ئەوەش کە بەلّگەیەك بەدەست کەسەوە نەدەم، هەستام دیارییم بۆ هەمووان کڕی، تا بتوانم شتێکیش بۆوی بەرمەوە. تاقیکردنەوەکانم تەواوببوون کە بروسکەیەکم لە بابەوە پێگەیشت: ((بەو زووانە دێم، درێژییەکەی دەپۆستەیدایە، یانی چی؟ - نارەحەت دەبم... چ بووە؟، چ روویداوە؟ نەخۆشە؟... ئێستا ئیدی هەموو بیروهۆشم بەلای وییەوەیە. نەکا خوانەخواستە سەکتەی لێدابێ! بە چ شێوەیەك ناتوانم هەوالّێکی راستی لێوە بزانم؛ بیست تا بیست و پێنج رۆژ رادەبرێ و هیچ شتێك بە پۆستەیدا نایە، یانی پۆستە ناگات. دلّم هەلّدەچێ، دەمەوێ ملی رێیە بگرم کە نامەکە دێت، دەنوسێ شەوێکی لەسەرجێی راکشاوە- لە ژوورەکانی خوارێ بوون، لایەکی پەنجەرەی سەرچالّێ کراوەتەوە- راکشاوە و هەروەك جاران پێش نوستنێ نزای کردوون و پاڕاوەتەوە کە هەستی بە قورساییەکی کردووە لەسەر سینگی و رەشاییەکیشی دیوە هەر بۆلای دەمیەوە هاتووە و کشاوەتەوە؛ کە وردبۆتەوە دیویەتی ئەوە مارێکە و لەسەر سینگی پەپۆکەی بەستووە و خێراخێرا سەرهەلّدێنێ و لەزارییەوە نزیك دەبێتەوە و دەکشێتەوە... مارە لە پەنجەرەی بەرەو خوار، وەك ئەو دەیبینێ، تەکانێکی دەداو دەچتە نێو چالّەکەوە؛ بۆ بەیانی سەید موختاری مارگر دەبا و ئەو دوومارانە دەگرێ کە یەکێکیان هەمان ئەو مارە بووە کە پەپۆکەی لەسەر سینگی بەستووە. ئیدی لەو رۆژەوە هەست بە ئازارێکی زۆر دەکات لەلای دلّ و سینگییەوە؛ پزیشکە جووەکە دەلّێ دوورنییە لە سەرەنجامی تەکانی مارەکەوە دلّی راچەنی بێ و ئازاری پێگەیشتبێ، واباشترە بچتە تارانێ و لەوێ خۆی چارەسەر بکات، ئەگەر هات و ئینشالّلاّ هیچ نەبوو ئەودەمی مادامەکی هەر هاتووە سەرێکیش لە ئەسفەهان و شیرازێ بدات و ئەوێش ببینن، چونکە شارەزاش نییە حەزدەکا منیشی دەگەلّدا بم تا تەنیا نەبێ...

دێت، خۆی دەپشکنێ، سوپاس بۆخوا چ نییە، بەلاّم دەگەلّ ئەوەشدا کۆمەلّێك داو دەرمان و پارێزان دەکار دەبا. دەچینە شیراز و ئەسفەهانێ و ماوەیەکمان پێدەچێ- و دێینەوە. هەموو پشووی هاوینەکەم دەگرێ. بەلاّم من دەزانم کە دارگولّ ماوە و لەوێشە و هەر لەوێش دەبێ- بابە دلّنیاییە دەدات. هەربۆیە زۆر بێ ئارام نیم. بەتایبەتی کە دە ((دلّنیاییەکەی)) بابەیدا هەست بە رازیبوونێکیش دەکەم...

سالّی ئاینده که دەچمەوە مالّێکی کوێرەوە بوو و کاول و وێران دەبینم- دارگولّ نەماوە، دیارە کە نەماوە! ئەگەر مابایە مالّەکەی دێنایە سەرخۆی... هەر دەگەلّ گەیشتنەوە مالّێمدا چاوانی لێدەگێڕم- چۆڵییە مالّێ زۆر بە توندی هەست پێدەکەم. بابە هەست بەبێ ئۆقرەییەم دەکات، خۆ گێل دەکات، قسان تێکەوە داوێ؛ باوەژنە دەزانێ، سوورهەڵدەگەڕێ، چاوان بەردەداتەوە؛ خانزاد دەزانێ، چاوان حیز دەکات. سەرەنجام لە توانامدا نامێنێ، دەپرسم ئەدی دارگولّ لە کوێیە؟ باوەژنە دوای چەند پێچ و پەنایەکان و روو هەڵماڵدراویە قەرەواش و سەرەڕۆیی کچەی و بەشێوەیەکی گشتی و گۆڕانی دەور و زەمانەی و نزیکبوونەوەی دنیا خراپ بوونێ و نەجابەتییە ئاغای ئەو هەموو ئارام و خۆڕاگرییە خۆی و ئاغای، ئاشکرای دەکا کە لەدوای لەمالّ نەبوونێ ئاغای رەدووی جحێڵۆکەکی پێ پەتی و رەش و رووت کەوتووە و رۆیوە!...

هەروەك تەشتێکم خۆڵ و دۆ بەسەرداکەن تێکڕا دەبم، هێندەی نامێنێ کە وەك کەری دەقوڕێدا چەقیو زگم بە عەردییەوە نووسێ و بە نەقیزانیش هەڵنەستمەوە.

چەتیوە گێلە! زماندرێژە! هەڵیخەڵەتاندم! تف لەسەروچاوت، تف لەو ئابڕووەت! ئاخر ئەوانە دەبینن بۆیە دەڵێن کرمانج روحیشی لەروحی دەی هەر کرمانجە!.

مالّێ کە لەو دوورەوە وا رووناك بوو لە نزیکەوە دەڵێی دەیجورە؛ دیوارەکان لاساییە دەکەنەوە؛ دەنگی جوجکەکان دڵە ئازارە- هەرچەندی دەکەم و دەکرێنم ناتوانم بچمەوە ژوورەکەی خۆم — چاوم بەرایی دیتنێی نادات. ئیدی هیچ شتێکی بە ئی خۆم نازانم، نەمالّ، نەژوور- هیچ شتێك- بوونەوەرێکی لادراوی لێدراوم. دەگەلّ ئەوەشدا کە ناوی دارگولّ ئازارم دەدات و دلّم دەگوشێ، گومانیشم لە راستییە قسەکانی باوەژنێ هەیە، دلّم دەڵێ ئەوەی ئەو دەیڵێ وانییە. دە روخسار و سەرنجەکانیدا دەماری بەدگوێیی و ناڕاستی و فێلّ دەبینم: زۆرجاران وەك گوناهێکی گەورەی کردبێ لەبەر سەماوەرێ پەرت دەبێت و دۆش دادەمێنێ و سەرنجەکانی وەك دوو میلی سورەوە بوو لە گولّی رایەخەکان دەچەقن؛ دەموچاوی درێژ دەبێتەوە- هەروەك قەپۆزە رێوییە... بابە چ نالّێ، هەر سەری بەردەداتەوە و سوورهەڵدەگەڕێ و پێك لەدوای پێك ئارەقێ هەڵدەدا- بەڕووالّەت لە خۆشیەهاتنەوێم، کەچی سالاّنی پێشتر کە دەهاتمەوە لە جارانی خۆی کەمتر دەخواردەوە؛ ئەودەمی دەیگوت کە بە هاتنەوێ من سەرمەست و سەرخۆشە! شەوێ دەچمە مالّێ داپیرەی- دوای نیوەڕۆیەکی درەنگ بوو کە گەیشتمەوە شاری...



دەمێنمەوە؛ مەحمودی پوورە فریشتەی دەنێرمەوە مالّێ تا بلّێ زۆر ماندووم و نایەمەوە. هەر لەوێ دەنووم، داپیرەش داپیرەی جاران نییە؛ دە روخساری ویشدا ریای دەبینم- دلّم بەویشەوە پاك نییە... لە سەرەتاوە چ قسەمان نەبوون بیانکەین- نە من، نەدارگولّ! قسە نەیدەتوانی هەستەکان دەرخا. ئەو هەموو رەنگ هێنان و بردن و لەرزین و هەناسە سواربوون و سەرەسوڕێ و چاوەلێلّ و پێلّ و گوێیە پڕ هاش و واشانە و ئەو مێشکە بەتالّ و خەیالّە رۆیشتوو و گەڕاوانەی پێ دەبەرپێ نانێن و بە دەوری خۆیاندا دەسوڕێنەوە و لەجێی خۆیان چەقیون... ئەوانە هەموو بە چ زمانێکی دەردەبڕدرێن و دەگوترێن و ئاشکرا دەکرێن؟.

منداڵەکەی کە هێنابوویەوە توندی بە سینگی خۆیەوە گوشی. ئایا دەیویست بلّێ کە ئێستا بەرپرسیارەتی ئەم بەشەی ژیانی بەملەوەیە- بەرپرسیارەتی بەشێکی ژیانی خۆی، بەرواڵەت منداڵەکە لەمپەرێك بوو کە ئەوی پێ لە جیهان دادەبڕی و جودای دەکردەوە، ئێستا ئیدی هەرخۆی نییە، هەرتەنیا بۆخۆی نەدەژیا- بۆ منداڵەکەشی دەژیا... بەلاّم هەر راست وەك ژنە رەبەنان (راهیبە) کە، سەری دەتراشن و جلی رەش دەبەر دەکەن، یا وەك دەروێشێکی کە سەروپرچی دێلێتەوە و کەشکۆلێ هەڵدەگرێ، یا وەك خوا پەرستێکی کەوا دەنوێنێ پشتی دەدنیایە کردووە و کاری بەکاری کەسەوە نییە و نەماوە و هەر دەودەمیشدا بە حەزە مادییەکانیەوە تاوێك لە دنیایە غافلّ نییە و تروسکەی خۆری ژیانێ شەوقی لە چاوەکانی بڕیوە و بەرەولای خۆیەوەی دەبا، ئەویش —دارگولّ- وەك بلّێی ئەو شەوقە دەبینێ- هەروەك پەڕەی گولّێ کە شەونمیان لێ بپژێ و گەشببنەوە و تەڕاییان تێبگەڕێتەوە و گولّەکان لێو بەخەندەوە بگەشێنەوە ئاوابوو...

بە توندی گوتم: ((تۆ کە خەتی کەست نەخوێندەوە و گوێت نەدەدایە هیچ کەسێك، ئەدی ئەوەچۆن بوو وا رۆیشتی، بۆ رۆیشتی و منت ئاوا بەو رۆژەگەیاند!؟...)) بۆخۆم ئاگام لێنەبوو، وەك ئەوەی سەرنجێکی قێزە و نانەم لە منداڵەکە گرتبێ.

بەدەنگی زۆرلێکراوێکەوە گوتی: ((ئەم بێچارەیە گوناهێکی نییە.. خوا ئەوەی کوێر و زەلیل کات بووە باعیسی بوونێی!...)) چاوەکانی داخستن. منداڵەکە کە هەروا کز و مات و بێدەنگ و دە و شانۆیەوە رامابوو لەبەرزییە دەنگ و توندییە سەرنجەکانم وەگریە هاتەوە. دارگولّ سەیرێکی منداڵەکەی کرد، کە بۆنی نەفرەتی لێدەهات، بەلاّم دەگەلّ ئەوەشدا هەربەخۆیەوە گوشی.

لەپڕ هەر بەهەمان حاڵەتی کچێتییە جارانییەوەی گوتی: ((یەك دەقیقە راوەستە، با ئەوەی ببەم و بیدەمە داپیرەم...)) و راست بۆوە، و بەڕاکە راکەوە رۆیشت، هەر بەهەمان لەنجەولار و نەرمییەوە؛ هەروەك شلکە شوترکێکی بەهاری... هێشتا ژنێکی وانەبوو بزانێ ماڵ و مێرد چییە و دەگەڵ مێردی لێك تێر بووبن- هەر بەشلکێ سەری بەمێردیان دابوو!... هاتەوە... چەند رۆژێك دوای هاتنی بابەی بۆ تارانێ، باوەژنە نامەیەکی پێ پێشاندەدا (بەدارگوڵ)یێ و دەڵێ ئەوە لەمن و بابەیرا هاتووە و نوسیومانە کە دەبێ- دارگوڵ- لە ماڵێ بڕوا- و هەردەبێ بڕوا. بەقسەی خۆی- دارگوڵ- قاقەزەکەی بەو دوو چاوانەی خۆی دیوە، یاخوا ئەگەر نەیدیوە خوا کوێری کا. سەید فەخرەددین خوێندبوویەوە؛ بۆخۆی قاقەزەی دیبوو، پوولە وێنەدارەکەشی هەردیبوو (هەردەو حاڵەیدا پێکەنینم بەو هەموو سادەییەی هاتێ...) ((باشە، ئەوە دیتیشت؛ چۆنت زانی کە ئەوە خەت و کاغەزی منە یا ئی مەیە؟ هەر کەمێك راوەستابای خۆ من نەمردبووم، خۆ رۆژێکی هەر دەهاتمەوە- لە ماڵێ دایە گەورەی مابایەوە...)).

((ئاخر دیتم- بۆ خۆم دیتم؛ چۆن بزانم کە دێیەوە- خۆزگە هەر ئەو رۆژە ئەژنۆم شکابایە و نەچووبامایە سەر کانییە- هەمووی خەتای ئەو پیرێژنە سەگە بەد فەسالە بوو)). پیرێژنێ فاڵچی و دەستگرەوەی دەگوت: ((هەموو ئەوانەی بەمن گوتبوو- تۆ گاڵتەت پێدەهات... گوتم خراپ دەبێ... بۆ خۆم دەمزانی...)) و فرمێسکی دادەباراند چ فرمێسکێك! ئەمجارەیان گریانەکەی هۆی تالاوی دەروونی بوو؛ و پاشماوە و سەرتوێی پێکەنینی نەبوو- گریانێکی بێ وێنەبوو. مێشکم بەتاڵ بوو؛ ئەوەی دەیگوت نەمدەبیست؛ گوێم هەر لەوەی بوو کە دەمبیست: لە قوولایی ناخی گیانی: لە لەرزینی لەشی، لەپرتە پرتی ئەو چاوانەی کە دەگەرماوی فرمێسکاندا خۆی دەشوشت، بە کۆلکەزێڕینەی روومەتەکانی کە لە هەردوولای بارانی فرمێسکەکانیەوە تاقی لێدابوو؛ لە کەوتن و هەستانەوەی سینگی.

ئەویان لەماڵێ دەرکردبوو؛ لەناچاریان چووبووە ماڵێ دایە گەورەی (داپیرە) دایە گەورە دەگەڵ پیرەمێردێکی کەردار دەینێرێتەوە لای داپیرە و باپیرەی خۆی لەو دەوروبەرانەی لای سەردەشتێ؛ باپیرەی مردبوو؛ و داپیرەشی ئەوی بە مێرد (شوو) دابوو...

ئۆە، هەموو پێکەوە دەستیان دەو پیلانە چەپەڵەیدا بوو، تەنانەت داپیرەش کە لە تەواوی ئەو ماوەیەدا وشەیەکی لەو بەسەرهاتەوە بەمن نەگوتبوو!...



خەڵکێکی سەیر، و رۆژگارێکی سەیرە! پیاو متمانە بەکێ بکا؟... تازە کاتێکی گوتم قەرزداریش بۆوە: ((های رۆڵە گوریس بەلایەکی نەدەگەیشتەوە نۆرەی دوولاییەیە؟ دوولاشی دەکەیەوە زیادە!)).

((هەر نەبایە بتگوتبایە- خۆ تۆ دەتزانی؛ ئەدی بۆ نەتگوت؟)).

((جا سوودی چ بوو رۆڵە؟ دەترسام لە کەللەت دات و هەراو زەنایەکی بنێیەوە... سودی چ بوو! کچەی بەستەزمان و بێ گوناە، منداڵ و هەرزەکار بوو؛ خوا قبووڵی نەدەکرد و هەڵینەدەگرت بکەوێتە دەم ئەم هەموو مار و ئەژدیهایانەوە و توشی ناخۆشیان بێت... دەزانم- تۆش هەر گوناهی... وەك منداڵانی، هەروەك هەوری بەهاریێ دەگریا... جا ئیدی بڵێم چی! دەیگوت هەر ئەوەندەم دەوێ تالاوێ بەزاری ئەوژنەی دابکا، دەنا ئەگەر نەیەوێ- بەتۆی دەگوت- من زۆری لێناکەم. دەیگوت تەنیا هەر ئەوەندەی دەوێ لووتی ئەو ژنەی بشکێنێ و هەرجارێکی دیکە ئاغا چوکەڵەی ببینێتەوە و بمرێ... ئیدی هیچی دیکەی لە خودای نەدەویست...)) و داپیرە هەموو ئەوانەی بەشێوە زمانێکی کوردی پەتیەوە دەگوتن و دەشگریا. ((ئامۆژگاریم کرد- دڵم دایەوە- دەستم بەسەریدا هێنا، دیتم زۆر گوناهە، دیتم سەرێك کە نەیەشێ پرێسکەی لێ نەپێچی چاکە؛ دایکە بێچارەکەت کەمی چێشت تا من بێم و بەدەستی خۆم کیژۆڵەیەکی بێگوناهی دیکە باوێمە نێو ئەو گورگ و سوارانەوە! نا، رۆڵەگیان، ئەوە چاتربوو؛ لە بەرژەوەندییە هەردوولاتان بوو؛ خوا بۆقی بۆچۆمی و نەهەنگی بۆ دەریای دروستکردووە... جێی ئەو منداڵە بەستەزمانەی ئەو ماڵە نەبوو. گوناە بوو...)).

((ئەدی گوناە نەبوو رۆژی بەو رۆژەی گەیی!؟)).

((بەرێ وەڵڵاێ، رۆڵە... تۆش هەر گوناهی...)).

((راستییەکەی من هەر تێناگەم... تۆ کە ئاگات لە چوونەوەکەشی بووە... کەچی ئەوەشت هەر بەمن نەگوتووە...)).

((نا، نەمگوتووە- دوو سێ رۆژ نابێ. هەر لە هەوەڵێشەوە بابت گوتی کە نەیلێم- بۆخۆشی هەر نارەحەت بوو... بەڵام دەیزانی تازە کارێکە کراوە و تێپەڕیوە، ئیدی بۆچی هێندەی دیشت نارەحەت کەین... بەڵێ، رۆڵە، دەزانم، دڵی پیاوان زوو لەجێ هەڵدەقەنێ و درەنگ دێتەوەجێ،

وەك دڵی ژنان نییە- دڵی ژنان هەر یەكێكە: زوو لەجێ هەڵدەقەنێ، بەڵام زووش دێتەوەجێ... ژن هەر دڵی هەیە؛ خودا لە دڵ زیاتر هیچی دیكەی نەداوەتێ- ئەو دڵەشی بۆیە داوەتێ تا هەموو دەمێ بكولێتەوە، هەردوولاتان جحێڵن، لەبیرتان دەچێتەوە...)).

وای، كە لەو زمانگێڕە ریاییانە بێزارم! دەزانێ كە ژن لە دڵێك زیاتر هیچی دیكەی نییە دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دێت و ئەو دڵەشی لێدەستێنێ و دەیخاتە ژێرپێیەوە و پێی لێدەخشێنێ و پانی دەكاتەوە...!

((گوناه بوو... تۆش هەر گوناهی!))... هەموو هەر درۆزن، ریاكار، هەموو بۆگەن! ئەو پوورە فریشتەیە، لەو قسانەی ئەو رۆژەی و دەمولێو وێك هێنانەوە و شێر و ریوییەكانی: ((كاری دڵە نەخشتەوگڵە!)).

خوا لە كۆڵتان كاتەوە!.

زۆرچاكە ئێستا دەبینین!.

و دارگوڵ بوو كە دیسانەوە دەیگوت خۆزگە ئەژنۆم شكابایە... ((ئەو ساڵە نەهاتییەوە، ساڵی دواتریش هەر نەهاتییەوە... هەر دانیشتم، هەر دڵخۆشییە خۆمم دەدایەوە دەمگوت ئەگەر ئەوە درۆبێ بە هەرشێوەیەك بێ هەواڵێكم هەر دەدەیەی! دانیشتم، دەدام بەخۆمدا گرت... نەهاتیەوە و نەهاتییەوە!)) و دووبارە گریان.

((لە تەواوی ئەو ماوەیەدا تەنانەت بۆ ساتێكیش دڵم بەلایەوە (لای مێردەكەی ئێستای) نەبووە... چووزانم... خوا لەخێرێت دەرنەكا... وای خودایە، چ بڵێم... خوا ئەو دوو چاوانەم كوێركا ئەگەر درۆبكەم- چ بكەم- نانمان نەبوو، دەمویست خۆم هەڵواسم و خۆم بخنكێنم... ئاخر نانمان نەبوو...)) وای، دەتگوت هەموو كێوەكانی دنیایەیان بەسەریدا داوم: ((نەهاتەوە، ئیدی نەمدەویست بێمەوە... چووزانم... هەستی هەندێ شتانم دەكرد، بەڵام دڵنیا نەبووم... سوێندیان دەخوارد كە تۆ بۆخۆت لێتداوە و رۆیوی... پاشان كە هاتمەوە دیتم كە، بابە كەم كەمە پیربووە... دایە گەورە (داپیر) پیر پیربووە... ئای خۆزگە زۆر زووتر هاتبامایەوە!...)).

((... ساڵێك تێپەڕی، زۆریان هێنا؛ نانمان نەبوو، باپیرم مردبوو؛ لە داپیرەی بەولاوە كەسی دیمان نەبوو، ئەویش پیربوو، چاوی نەیدەدیت... برایەكەی...)).



سەرم دنگە دنگی بوو؛ دەنگەكەیم لە كەللەیدا لوولی دەخواردەوە ((... بەمێردیاندام...)).

بەمێردیاندا... دابوویان- ئاوا! لێرە كچ بەمێردان لە كەر فرۆشتنێ سادە و ئاسانترە. وەختی كەر فرۆشتنێ هەرنەبێ خاوەنەكەی چەقە چەقێكی سەبارەت رێ و رەوتی تێوەرێخییەكانیەوە. لەبارەی كچێوە هەر راست بەپێچەوانەی ئەمەوەیە: خاوەن كچ تەنانەت دانیشتنی كاتی مارەكردنێی بەسەرشۆڕی و ملكەچییە خۆی دەزانێ. سات و سەودایە كە بە بریكار ئەنجام دەدات: كەسێك دەكاتە بریكاری خۆی تا لەجیاتی وی سەودایەكە ببڕێنێتەوە. بریكارەكەش هەر ئەو كارەی بەسەر شۆڕییە خۆی و مایەی شەرم دەزانێ و كاتێ كە لەسەر مارەبڕینێ دەست دەدەستی كڕیاری دەنێ سەری بەردەداتەوە، سوورهەڵدەگەڕێ و هەر بەوەندەی دەیبڕێنێتەوە كە بڵێ ((پێشكەش)) و پێچەوانەی فرۆشیاری كەرێ كە هەر ناڵێ خێریشی لێ ببینی... تەلاقدانی ژنێ تەنانەت لەوەش قێزەونترە: مێرد، ژنەكەی لەسەر یەك مەن گوو تالۆق دەكات! یانی هەركەسێك بیەوێ بەسەریەوە هەڵوەستێ دەبێ ئەوەندە گووەی بدات! و ئەویدی دەبێ ئەو مەنە گووەی وەرگرێ- چونكە مەرجی سەودایەكەیە. بەو شێوەیە ژنەكە دەبێ بە ئی ئەوەی گووەكەی داوە! یا جاری وایە لەسەریەك مەن كێچ یا ئەسپێ تالۆق دەكرێ، كە سەرەڕای سووكایەتییە تالۆقێكی لە توانا بەدەریشە: ئاوا هەم تەلاقیشی نادا هەم راشیدەگەیەنێ كە نرخی ژنێ لای وی بە قەدەرمەنە كێچێكی یا ئەسپێیەكییە! یا بەواتای خەڵكی ناوچەكە، جاری وایە لەسەر پارەی تالۆق دەكەن و دەڵێن لەسەر ئەوەندە گوژمە پارەی تالۆقە. خوازیارەكە پارەكەی بێنێ و ماڵی خۆی ببات!.

سوبحانەڵڵا، ئەمانە گونجانی نێوان ژن و مێردایەتییە ئەو كۆمەڵگایەی ئێمەیە! و هەموو گەورەو گچكە و بە عالەمی ئاشكرا دەیبینن...

دەردناكە! ئەو ریاییە، ئەم ریاییە- و هەموو ریاكان. راستییەكە ئەوەیە كە داپیرەی چاوی نابینێ، نانیان نییە، برایەكەشی هەر بۆ ئەوەی لە كۆڵ خۆی كاتەوە، ئەوی گرفتار دەكات...

هەستام- پەرێشان، ئاڵۆز، رەنگ و روو پێنەماو، و تێك قوپاو...

((رۆیشتی؟)) بە دەنگێكی وەك پاڕانەوێ. رەنگی تێكچوو، زەرد هەڵگەڕا، سپی بوو، لێوی لەرزی: ((هەر وازووا!)) پێڵووی چاوەكانی بە نازەوە داخستن- وەك تاوێ بردبێ، چاوی دە

ڕەشەوە هاتن، سەری سووڕا، تێکڕابوو، دەستی بەسینگییەوە نا، و سەری بۆ دواوە بردەوە- زاری هەر بەش بوو... خەریك بوو بکەوێ- گرتم، توند و لێی وریابووم و بەڵێنیشم دایە کە بێمەوە. دڵی زۆر بە توندی خۆی بە دیواری سینگییەوە هەڵداویشت ((دێمەوە... هەر نەمرم دێمەوە... ئێستا هەردەبێ بڕۆم، ناچارم، بەڵام دڵنیابە هەر دێمەوە- نارەحەت مەبە!)) شتگەلێکم لەو بابەتانەوە گوتن- ئەوا ئەویش خۆی بەسەرقۆڵمدا داوە و هەناسە بڕکێ بووە. هەستایە سەرپەنجەی پێی، خۆی بڵند کرد و بۆنێکی بە گەردنیێوە کردم. ماوەیەك هەروا مایەوە... بانگم کرد ((ئەحمەد- ئەسپەکان زین کەوە!)) ئەحمەد هێشتا چاوەڕێی نانی نیوەڕۆیە بوو. منیش تازەم وەبیر دەهاتەوە کە نانی نیوەڕۆیەم نەخواردووە! ئەحمەد بەرەو لای ئەسپەکانەوە چوو و دارگوڵ بەلای نان و هێلکانەوە... تەواوی ئەو دیارییانەی کە باوەژنە بۆ خوشك و خوشکەزایەکەی ناردبوون لە رقان هەموویم دایە دارگوڵێ، بەستەزمانە لە خۆشیان پێی وەعەردی نەدەکەوت...

کە گەیمە سەری بادانەوێ ئاوڕێکم دایەوە؛ دارگوڵم وەك تاکە گوڵێکی هاتە بەرچاوان کە لەو بەرە هووتەی هەیوانی چاخانەکەوە راوەستابوو و دەستەسڕی هەڵدەتەکاند... ماوەیەك بوو دە چاوەڕێی ئەو ساتانەدا وەستابوو. دەستم بۆ هەڵتەکاندەوە. دڵم دەیویست وەگەڕێم و هێندێکی دیکەشی دەگەڵدا دانیشم و خۆم باوێمە نێو دەریای چاوەکانیەوە و خۆم ون کەم... دڵم هەر خوێن بوو... گوتبووی سێ سبەی شەوێ مێردەکەی لە ماڵ نابێ... گوتبووم دێمەوە- بۆیەش رۆیشتم بێمەوە.

* * *



## (٢٧)

تەنانەت ئاسمانیش هێندە پاك و روون نییە کە دووکەڵی دڵمی تێدا بە بادەم؛ خۆر سەرەڕای سیل و ئیسقای خۆی تفی بەویدا کردووە. لێڕەوار وەك ئاشقە رووتەی زەبوون لە تاو سۆزی دڵی خۆی هەر هۆهۆیەتی؛ درەختەکان وەك دایکی کۆڕپە مردوو سەر و پۆتەلاکی خۆیان دەڕننەوە و من ریشاڵ ریشاڵی دڵم دەدەمە بەربای تا وەك ئەسپۆنێ، لە کۆڕی پرسەی خۆمدا لەسەرئاگری تاوەی دڵی کێویەوە دووکەڵی لێ هەستێ و بەسەر رووی پرسەدارییە خۆمیەوە وەرکا...

پرسەدارم... لە پرسەی دوومەرگدا دانیشتووم، دوو مەرگی یەك کارەسات! لەسەر پشتێ ئەسپی دانیشتووم و بەدوای مەرگی دارگوڵ و دڵدارەکەیەوەم بۆ سەرقەبران، دارگوڵێ دەبینم کە بە هەمان رۆینێ سەمای بالیە ئاسایەوە بە هەمان جولانەوەی نەرم و لەسەرخۆیەوە، دەستەسڕێ رادەوەشێنێ و خەریکی سەرقەبرانە: ئەویش پرسەدارە؛ و دوای تەرمی من و خۆی کەوتووە... لە هەموو جێیەکی شوێنەوارێی دەبینم- ئاخر ئەویش هەر لەم رێیەوە هاتووە- لەبەرخاتری من هاتووە: بۆیە هاتۆتەوە، بایەکی باڵی خۆی بدا، هەواڵێکی بزانێ، هەواڵی رۆژی ناشتنیی- ئەو هاتووە، من دەڕۆم تا دووبارە بێمەوە و هاوبەشییە لە رێ و رەسمی ناشتنێدا بکەم. گۆڕستانی دڵم کردۆتەوە؛ جێی هەموو مردووی دنیایەی تێدا دەبێتەوە... ئەوە باوەژنێش دەبینم- ئەویش هەر پرسەدارە- هەوێیەکەی مردووە. ئەویش دەبینم وا سەیری هەوێیەکەی دەکا، وەك گوڵە بێ- بە نەفرەتەوە، بێ بەزەییانە- تەنانەت جاری واشە کەڕووی لەوی نییە لەپشتەوە چەمبۆڵەی لێدەنێ- برۆ هەی ئاو و ئاوچی و نەیەوە!... بەپێچەوانەی ئەوەوە کە دەڵێن من و دارگوڵ چیرۆکی چارەنووسی خۆمان نەنووسی- ئیدیکە نووسیان؛ و چ چیرۆکێکی خۆشیان لەو چیرۆکە دزیوەوە هەڵێنجا و نووسیان! ئێستاش دەیانەوێ چیرۆکێکی

دیکەمان پێوە بلکێنن- لەوەی هەوەڵێ دزێوتر. ئاغا و خانم و هاوبەشەکان پێشەکییەکەیان نووسی، مایەوە ناوەڕۆکی چیرۆکەکە، هەموو ئومێدەوارن کە خۆش کام بێت! توخمە سەرەکییەکانی چیرۆکەکە لەبەر دەستدان: ((هەر لە خۆیانە، بێگانە نییە، بێکەس و کار نییە، خانەدانە، لەو کچانە نییە- پەرژین بێت- رەگەڵ هەتیوە جحێڵەکی شڕو وڕو پێپەتی کەوی...!)) بەڵێ ((توخمە سەرەکییەکەش کاکەیە...)) یەکەمین کەسی داستانەکە... بێ ئیختیار هەروەك دارگوڵێ بەلاساییەوە ئەو رستانە دەردەبڕم، و بێ ئیختیار دەڵێم: ((توخمی سەرەکی کاکەیە... مەرجە کاکەیەکتان پێشان بدەم نەبێتەوە، بە هەنگوینی بڵێن ژەهرەمار!)).

چەند پەڵە هەورێکی زۆر تەنك و بێ رەنگ، وەك مشتەکەفێکی سەر دەریای دوورا و دوور لە پانایيە ئاسمانێدا بەدەست بایەکیەوە کە لە عەردیەوە هەڵیکردبوو تێك لوول دەبوون. کاتێ کە لە بستوێڕا بەرەو دۆڵێ دا گەڕاین تاو بەلای خۆرئاوایەدا شکابۆوە: ئاسمان وەك کەسێکی نەخۆش و دزێو و سیسەڵە کە تازەیان ددان هەڵکێشا بن خوێناوێ زاری دەلەگەنی ددانسازییە سروشتیدا دەتفاندەوە و هەر چوار دەوری خۆرێ خوێناوی ببوو؛ خۆر بە تاقی ئاسمانێوە هەوق ببوو؛ مووی تیشکە باریکە چڵکنەکانی دەموچاوی لە ماندوویەتی و هەوڵ و تەقەلایە هەمووی وەك رمبان راست ببوونەوە؛ هەوا هێشتا هەر گەرم بوو و هەستت بە هەناسەی گەرمییەکەی دەکرد.

دەنێوان باریکە رێیەکی چڕی بە گوڵی گوڵە بە رۆژاندا کە لە هەردوو بەری رێیەکەیڕا کە وەك سواڵکەرە هیندیان راوەستابوون و سەریان بەردابۆوە تێپەڕین: چەپەرە شکاوی دەوری باغەکانی گوندی و تاوە و ستڵەشکاوی ناو زبڵ و زاڵی بە دەمەلاسکێوە بەخێرهاتنیان کردین؛ چەند سەگە بەرەڵڵایەکیش بە سەرنجە ژاکاوە نەخۆش ئاساکانیانەوە و بە دەنگێکی گڕی نەخۆشێکی سوزەنەکیەوە سلاویان کرد؛ چەند ژن و کچێکی کە لەسەر کانییەڕا دەهاتنەوە گۆزەکانیان دانان و چاویان بەرەولای مە وەرگێڕا تا بەسەرنجی تێکەڵ بە بێزاری و نەفرینەوە ئەم تازە هاتووەی کە وەك مەیموونەوانان بە جلوبەرگی ئەفەندیانەوە سواری ئەسپی بووە و دێتە ناو گوندی ببینن؛ چەند پیاوێك کە دەرماڵیان ئاودەدان یا تەماتەیان دەچاندن خۆیان هاویشتە سەربێڵەکانیان. هەوا گەرد و تۆزاوی بوو. گاڕان و بەرغەل دەهاتنەوە گوندی، بۆنی تۆز و خۆڵی تێکەڵ بە بۆنی قشپڵی هەوای پڕ کردبوو... لە ((سەرا))یە نزیك بووینەوە.



هەر کە لە ماڵێ نزیك دەبووینەوە سێ چوار کەسێك، بەسەرسامی و هەوتییەکەوە، لەپڕ لەجێی خۆیانەوە سەوز دەبوون و هەڵدەتۆقین و لە پێش ئەسپەکەوەیان غار دەدا- هەروەك تەواوی ئەوماوەیە خۆیان شاردبێتەوە تاکو ئەگەر یەکێك هات دەکەمینیەوە خەن. دەنێوان واندا سەروچاوی دیدەوانی سەرنجی رادەکێشان، کە پیاوێکی پشوو سواربوو، بەچاوی خوێن تیزاوەوە و بەروخسارێکی تاڵەوە... یەك لغاوی ئەسپی دەگرت، ئەویدی رکێف و ئەوانیدی کە بەرەو دووا رایان دەکرد و دەستیان بە سینگەوە دەنا بەرەوپێش غاریان دەدا و بە پەشۆکاوییەوە ئاوڕیان دەدایەوە و خۆیان لەسەرڕێیەکە کەنار دەگرت، هەر کە وەڕێ دەکەوتییەوە دووبارە لەپێشەوە، وەغار دەهاتنەوە و هەرکە راشدەوەستای دووبارە بە پەشۆکاوییەوە ئاوڕیان دەدایەوە، ئەوە فەرمانەکانی خاوەن ماڵیش لەولاوە بووەستێ: ((یەکێك بچێت هەواڵ بداتە خانمێ!... یەکێك بێ زینێ لە ئەسپان کاتەوە! یەك بێت ئەسپەکان بەرێتە نێو ولاغان!)).

ئێستا ئەوەی هەبوو و نەبوو هەموو هاتبوون، و ئەسپەکان میزیان دەکرد و وردە پڕیشکیشت وەسەروچاوان دەکەوت.

((ئاغا)) لەبەردەمی دەرکی لای خۆرهەلاتێوە بوو؛ دەگەڵ گەینە کن ویم، خانم و تەلاخانمیش لە پلیکانانڕا هاتنەخوارێ: مامۆژن هەر راست وەك پیرەمراوییەکی پەڕوپۆ وەریو و تاك جوجکە، بەدارە دارەوە، دەحاڵێکیدا کە لەنگەری بەشان و کەمەرییەوە دەگرت و جوجکەکەی وەك پارچە زێڕێکی، پڕ بۆن و بەرامەی وەنەوشە و مێخەك و سوورگوڵەوە، بەخۆ و ددانی زێڕی لایەکی زارییەوە و گەردنی بەرز و سینگ و بەرۆکی پووچاوە و کەمەری باریك و کراسی چیندار و درێژ و پڕ لۆ و لەرەلەریەوە... تێڕوانینی لەوە زیاتر ناجایەز بوو. مامۆژن دەستی دەملی وەرێنام و بە گوێرەی خدە و خووی باو، ئەولاولای ماچ کردم؟ منیش هەروەتر شانیم ماچ کردەوە: چڵك و چەوێڵی مێژوو و تریاکی بەسەر و روو و سەرپەنجەکانیەوە مەیی بۆوە: ((باوانەکەم، دوور لە گیانت ئەوە نەخۆش بوو وی؟)).

-نا، نەخۆش نەبووم. ((کەواتە لەبەرت مرم، ماندووی... دوور لە گیانت رەنگت بەرووانەوە نەماوە- چاکم نایەیە بەرچاوان)). خۆ نا، چاکم، چ نارەحەتییەکی تایبەتیم نییە. ((تەلا سەیری، ماشەڵلا ئامۆزا چۆنی هەڵداوە و چۆن بالایەکی کردووە...)) تەلا وەك دەبوو سەری

بەردابۆوە. بە تیلە چاوێکییەوە سەرنجی دە قەد و بالاّوە گرتم، و سەرنجەکەی هەروا سەرپێی کێشایەوە، هەر راست وەك سەربازێکی گوستاخ بەرامبەر گروبانێکی گێل.

چووینە دیوەخانیّ، لە پەنا چرِا تۆرِییەوە لەپێشەوە دانیشتین. مندالّەکان چۆنن، ولاّت لەچدایە، ئامۆزا چۆنە؟- هەموو چاك بوون- بەلاّم بۆ خۆت، دوور لە گیانت زۆر لاواز بوویت؛ دیارە دەرس و دەورت زۆرە- بەلّیّ، دەرس و دەورم زۆرە؛ هێندەش لاواز نەبوویمە؛ تومەز دەمێکە نەیدیوم، وای دێمە بەرچاوان... چایان هێنا، خواردمانەوە. ئێستا وردە وردە هەلی ئەوە هاتبوو زەمینەی خۆش کەم- ئاخر هەرچی بیّ خۆ من بۆ کچ دیتنیّ هاتبووم. دیاربوو کە باوەژن دەپێشدا رایسپاردووە و چاوەرِێن: بۆنی پلاّویّ دە و ناوەی گەرِابوو؛ سەماوەر پێکرابوو، دەستوپێوەندی سەرایە هەموو و هەریەکە لەجێی کاری خۆیان ئامادە بوون: دیدەوان لەلای خواریّ، سەرپێلاّوان، عەولکەریم لەپشت ((پەنجەرە))وە، کاکە سیامەندیش بەبیّ حالّییەوە راوەستابوو؛ قالە تیلەکۆییش لە دالاّنیّ و مالّ گەسك دراو و ئاورِشێن کراو بوو. بۆنی خۆلّیّ هێشتا دە ژوورێدا هەر دەهات، بیّ ئەوەی هیچی پێوە دیار بیّ.

وەك مامۆژن هەر لە دەوری مەقالّەی ئاوری تریاکیّ دانیشتبیّ لە ناوەرِاستی چین و لۆیەکانی کراسەکەیدا راست وەك پەیکەری (بودا)ی بیّ زەردەخەنە، و سیس، بەسەرو قژی خەناوییەوە کە تالّەسپییەکانی لە خەتی ناوەرِاستی سەریەوە سپی دیاربوون، پان ببۆوە؛ دەنگی مشەمشێی، دە نێوان قسانرِا دەهات. تەلاّ بەرامبەر من، بەدەموچاوێکی مەیلە و خرِەوە بەتەکییەوە دانیشتبوو، بەلاّم لاواز، بەخۆ و لووتێکی قەلّەمی، بەرانییەوە، و دووچاوە قوولّ و لەبن و زۆر هەستیارەکەیەوە کە جاری وابوو واتدەزانی نەرمەبایەکی لە هەنیەیەوە هەلّدەکات و ئاگری گیانی گەش دەکاتەوە و پەردەی چاوەکانی رادەتەکێنیّ. هەر ئەو نەرمە بایە رەنگی رووی لە سپییەوە سوورهەلّدەگێرِیّ و ئەو سوورهەلّگەرِانەشی دەکاتە گەرمی و لێوەکانی قەتماغەیان دەگرت، بەلاّم رەفتاری گونجاو بوون، جگە لە دەمارێکی ناسکی بیّ ئۆقرەییەی. دیاربوو لەو جۆرە بنەدارانە نەبوو هەر خواردنی دەبن کەی و گولّیّ بکا... بنەدار هەر تەنیا بە زۆر خواردنیّ وەسەرگولّ ناکەویّ، دەبیّ ئامادەگییە گولّ دەردانەکە هەردە خودی خۆیدا هەبیّ- و هەشبوو+: هەلّچوونێك، شۆرِێك، هەولّ و کۆشش و تەقەللایەکی دەویست تا تۆوەکە راتەکێنیّ و لە خەویّ هەستێنیّ- و بەرِووالّەت بێداریش ببۆوە و لەخەو راببوو؛ رازی رەنج کێشان، و



تەقینەوە، و پشکووتنیّ فێرببوو... ئەوم دەبارێکی سەیردا دیت: سەیر دەکەی کچێك پەنجەکانی دەخەنە گرتوون، داوێنی کراسی هەلّچۆرِاو و داچۆرِاوە، سەر ئەژنۆیەکانی چلّکن، ئەوە های و هویەتی و وەدووا کورِان دەکەویّ... و دوایە... کتوپرِ ئیدی ئەو مندالّەی جاران نییە؛ چاوەکانی جۆرێکی دیکەیان لێدیّ، شێوەی رێکردنی دەگۆرِیّ- بەبیّ ئەڤین هەلّناکا... ئەوەی دەچاوانرِا... دیارە... کەچی دەگەلّ ئەویندارەکەشی نایەتە رەدایە؛ شێوەی لووت و گۆشەی چەناگەی بە گەردنێوە و کشانیّ پێلّووەکانی هەموو هەروا دەلّێن؛ دەلّێن دەیەویّ دلّدارەکەی بە تیلەچاوێکی بە پەلێکی دادا... دەگەلّ ئەمانەشدا هەر مندالّیشە. ئەمە ((تەلاّ)) بوو.

هەر لە یەکەم دیداردا دیار بوو منی لە پەراوێزی ئاگاییە مێشکی خۆیەوە سەیر دەکات و دەزانیّ بۆیە هاتووم، بێمەتیّ و دەشزانیّ کە ئەو هاتنە ناوەوەی منی پێخۆش نییە. ئەو دەیزانی، کە دەبیّ منیش وردە وردە پەی بەوە ببەم کە یەکێکی دیکە خۆی لیّ خۆش کردووە و حەزناکا میوانێکی دیکەی لاوەکی لەولاوە بێت و جیّ بەویدی لێژکا. رەفتاری میوانەکەی دی بە پارێز و ئەدەب و سەنگین بوو. ئەو دەمارە سوورانەی کە سپیاتی و زەردییە کولّمەیان خەت خەت دەکرد و تەرِاییەك کە ئەو خەتانەی پێکەوە گرێدەدان دەری دەخست کە میوانی خاوەن مالّ حەز بە تێکەلّییە میوانی ناوەخت ناکا.

پرشنگی خۆشییە، کە بەردەوام، بە دزی و زیرەکانە لە چاویەوە، وەرِیّ دەکەوت و چاوی میوانی خانەخوێی ماچدەکرد دەریدەخست کە ئەم میوانە لەمێژە شارەزای ئەو پێشوازییە ناوەختەیە. هەرچەندە خۆی وا دەردەخا کە بەو میوان نەوازی و بەخێرهێنانانە راهاتووە بەلاّم سوربوونەوەی رەنگ و رووی و چاو و پێلّو و لێکنانی شەرمێونانەی ئەوەشی پێشاندەدا کە ئەگەر چی چاوەرِێی منەتی خاوەن مالّییە هەمیشە تاموچێژێکی لەو یەك نەواختییە بەردەوە دەکرد. ((مالّیاوا)) چێژی لەوەی دەکرد کە دەیدیت هێشتاش هەر بەرِێزە، هێشتاش تازەیە. دیاربوو کە حەزی لیّ نییە هێندەی بلاوێنێتەوە و لە کاوینەوەی ئەو یەك نەواختییەی خەیالّ بردنەوێی وە ئاگا بێنێتەوە- دەگەلّ هەموو ئەمانەشدا زۆر قایل بوو و ئەو قایل بوونەش بە ئەندازەیەك بوو کە ناوەخت و ناویستانە رێی دەریّ بخاتە سەر پشت و گەردنی هەلّقرِچێنیّ.

کاکە سیامەند، نۆکەری خان، نۆکەرانە راوەستاوە، کە جاروبارە بە فەرمووی خان دادەنیشێ. لاوێکە بالاّ بەرز، چاو و برۆ رەش، دەموچاو رەقەڵە. چەناگە درێژ و لوتێکی رێك، و زۆر وریا، و پاکوخاوێن. دەگەڵ ئەوەشدا کە تائێستا پێکەوەم نەدیتبوون دەگەڵ هەوەڵێن چاوپێکەوتنێدا هەستمکرد کە زمانی گەرمو گوڕیەیان ئاماژە و سەربادانە و هەستمکرد کە سیامەند زمانی جوولاّنەوەی چاو و برۆ و دەمولێوان باش دەزانێت، هەستمکرد کە تەلاّ خانم بەزیادەوە سود لەو نامە و پەیامانە دەبینێ. ئەو پەیامانە زۆربەیان فەرمان بوون، یا تکایەك کە بەرامبەرەکە دەپرێسکەی فەرمانی سەر سفرەی دەربڕینی دڵیەوە دەپێچان... کرمانج بوو، بەلاّم هیچ بە کرمانجان نەدەچوو- ئەمە قسەی مامۆژنێ بوو. هەر کە بۆنی ئەوین و پەیوەندییە نهێنییەکانم وەبەر لووتی دێن هەستم دەگەشێتەوە و گوڵ دەکات و سەرنجم بەدوای شتە کرچ و کاڵەکاندا بەرەو ناخی دەروونیان مل دەنێ- هەردەو دەمەیدا ئارەزوومەندی سەرنج و تێڕوانینێکی گەرمومیهرەبانم... ئیرەییە دەبەم!؟... خوازیارم!؟... بۆ خۆشم نازانم- گێژم.

قسەیەکمان نەبوو؛ مامۆژن هەر مشەمشی بوو، و جاروبارە لە کەلێن و کون و قوژبنی مێشکییەوە شتێکی وەبیر دەهاتەوە و پرسیارێکی لێرە و لەوێی دەکرد: ((نەسروڵلاّخان (ئاغای سلێمانی) ددانەکانی کێشاون؟)) نەخێر. مش- موش. ((دەڵێن نۆژدارێکی جوولەکە هاتووە کە بیلامانێ، بیلامانێ)) (مش) (( کە سەیری لیکی بنیادەمی دەکا)) (موش) ((دەزانێ کە بنیادەم چیەتی)) (مش) ((ئەوە راستە؟)) مش، موش! — نازانم... ((گوتیان ئامۆزا ئۆتۆڕپاسی کڕیوە... ((موش)) ((راستدەکەن؟)) (مش)- بەڵێ ((جا بۆچی کڕیوە؟)) (موش) ((ئۆتۆڕپاسی بۆ چ بوو)) (مش) ((یەك دوو دوکانی دروست کردبان چاتر بوو)) (مش، موش) — چ بڵێم. ((ماندووی؟)) (مش)- نەخێر. هێندەش ماندوو هەرنیم. مش، موش-. ئینجا دوای چارەکە سەعاتێك، داوای هێندێك خەنەم لە کیشوەرێ کردبوو لەبیری چۆتەوە بینێرێ؟)) مش، موش. سوورهەڵگەڕام (مش، موش) هەموویم تێکڕا دابوونە دارگوڵێ. مش، موش ((نا، هیچیان نەداوەتە من، لەوانەیە بە یەکێکی دیکەیدا بنێرێ)). مش، موش- مش، موش.

نانمان خوارد و نوستین... بەلاّم کوا خەو! هێشتا ئەو گێژی و پەرێشانییەی دیتنێ دارگوڵێ بەری نەدابووم. گێژبووم، تووڕە و بێ ئۆقرە و ئارام. روخساریم هەموو دەمێ لەبەرچاوان بوو. قەت جارێکی نەدەبوو سەیرێکی ئەم کچە ((تەلاّ)) بکەم و ئەوم لەبەرچاوان بەو روخسارە



پاکەی و ئەو فرمێسکە تاڵ و سوێر، و ئەو هەنیسکە مندالاّنەیەوە، هەڵنەتۆقێ... ئۆۆوە، ئەو لە کوێ و ئەمە لە کوێ! هەر کە ئەو روخسار و دەمولێو و چاوە نەرم و رەمۆکانەیم وەبیر دەهاتنەوە، هەردەتگوت دەخەونێکی خۆش دام و ئەو روخسارەم دەو خەونەیدا دیوە و ئەوەی کە دەشمدیت سەخت و زیرەك و پڕفیتنەبوو... نازانم، هەروەك ئەوەی بتەوێ کیژۆڵەیەکی پاکی مندالاّنە بە ژنێکی کارامە و توند و حیلەباز بەراورد و پێوانە بکەی... نا، واش نەبوو... چاوەکانی رێزێکیان تێدابوو، رەمۆکی و شەرمێونیشی هەرتێدابوو، بەلاّم من چ شوێنەوارێکی ئەو گەرموگوڕی و پاکییەم تێڕا نەدەدیت- رەنگە هەر حەزیشم نەکردبێ بیبینم- ئەویش هەر دیاربوو کە نەیویستبوو. بەلاّم چونکە بۆ پێش داوەرییە هاتبووم بۆیە پێموابوو وایە. ئەڵبەتە هیچ کەسێکیش، دوور و نزیك بە ئاماژە، یا بە ئاشکراو راست و رەوانی، شتێکی لەم بارەیەوە نەگوت- ئەویش جێی خۆی هەبوو: کچان لەبەردەمی لەخۆ گەورەترانی خێزانێدا رێی ئەو شتانەیان نییە، ئەویش کچە خان و خانەدان! بەلاّم من ئەمەم دەکرد، هەستم دەکرد کە مامۆژن زۆر بە تاسەوەیە پەیوەندییەك دروستببێت و بێتەگۆڕێ، تەنانەت گوتی: ((تەلاّ، قسان دەگەڵ ئامۆزای بکە- ئەوە بۆ قسان ناکەی... خۆ بێگانە نییە، کچی خۆم)). تەلاّ قسەکەی قۆستەوە. گوتی: ((ئامۆزا چ جیاوازییەکی دەگەڵ مستەفاخانیدا نییە بۆ من... ئەویش هەر یەکێکە وەك مستەفاخانی)). و بێدەنگ بۆوە. بەڕاست! ئەوە تێگەیشتم، کەر لەکوێ کەوتووە و کوندە لەکوێ دڕاوە. جا با ئەوجار بێین و پێشداوەرییەی لێبکەین...

هەر لە مندالّییەوە وا دەگەڵ ئەو چۆم و کێو و بەندەنانەدا تێکەلاّو ببوو و رەگ و ریشەیان واتێك ئالاّبوو کە هەرگیزا و هەرگیز لێك نەپچڕێنەوە و لێك نەترازێن- هەر لە مندالّییەوە چاوی بەڕووی ئەمانەدا هەڵێنابوو. وەك چیا بێدەنگ بوو و وەك رووبارێ پەرێشان. هەموو گیانی هەست و هەمووی هەر ئارامی بوو. جاری وابوو رووباری هەستەکان دەکەوتنە شەپۆلان و لێو و پەڕەکانی لووتی وەلەرزە دێنان و بریقەی ئاوێی دەچاواندا دەبریسکاندەوە؛ بەلاّم ئەو هەروا ئارام بوو، هەر ئەو رووبارەش پشتی بەکێویەوە بوو. بەلاّم دەگەڵ ئەوەشدا دوور نەبوو رۆژێکی هەڵستێ و بەربەستان رامالێ و سەرەو ژێربێتەوە- کێ چووزانێ؟ کێو، بە بێدەنگی گوێی بۆ نزاو گازەی رووبارێ هەڵدەخست، مشکەکان دە بن حەسیری بن میچیدا تەراتێنیان بوو، سیسرکە دەیانخوێند، سە گڕوێیەکان لە دوورەوە لەوبەری رووبارێوە جنێویان بە گورگان دەدا- و من خەیالّم هەر بەلای چاخانەکەوە بوو...

دەنگە غەماوییەکەی بلوێری شوانی لاپاڵی کێوی ئارامی و بێدەنگی شەوێی شەق دەکرد؛ و ناوە ناوە دەنگی سەگوەڕی سەی شوانانیش کە ئامادەییە خۆیان بەدەنگێکی بڵند وەك گوللەیەکی کوشندەی بێباك دەجێیەکی تەنگەبەردا هەروەك زەنگوڵەی نێرییە پێش مێگەلی- جارجارە توند و جارجارە هێواش- بە جانەوەرانی دەوروبەر رادەگەیاند کە دەگەڵ دەنگی بلوێر و حەپەی سەیاندا هەواڵی جووڵە و مۆڵبوونی مێگەلیان دەدا.

مۆسیقایەکی گونجاوە- مۆسیقای ئەوینێکی راونراو، بە حەپەی سەگڕوێیان، و شادییە سەگانی سەر لاشەی دوو شووری لاو- دوو شووری پەرێشان، دە بەهاری تەمەن و ئەوپەڕی پەرێشانییەدا...

... لەوە غەماوی تر چ شتێکی دیت دەدنیایەدا دیوە!.

... من خەیاڵم ناردبۆوە چاخانەکە...

... شتێکی سەیرە: تووڕە دەبیّ، یەك و دووان دەدڵی خۆتدا دەکەی، خۆت دێنییە ریزی وی ناکریّ- نا و هەزار جار نا. ئەو لە کویّ و تۆ لە کویّ... نە ئاوکوفییەك، نە خزمایەتییەك، نەوێکچوونێك، نا- هیچ، هیچ شتێك. بەلاّم دوایە... یەك تێك هەڵەنگوتن بەسە کە ئەو هەموو تاڵە دەزووانە، گشتەکانە پەڕە کاتەوە و ئاگری سەرنجێك، یەك سەر هەڵێنان و گەردن دەرخستنێك، یەك لەرەی سینگ و مەمك، و یەك خۆبادان، ئەو خەرمانە پەڕەکراوەیە ئاور تێبەردات- و تا وەئاگا دێیەوە سووتاوی و تێچووی و بوویتە خۆڵەمێش!... لەپڕ بەخۆت دەزانی کە بەدرێژایی تەمەنت شێت و شەیدا و ئاشقی ئەو لەش و لار و روخسار و قەد و بالاّیە بوویت- لەپڕیش نا، بەڵکە سەری هەزارەمین جارە بەخۆت دەزانی؛ یانی هەر هەمان سەرنج و لەنجەولارە ئەو هێڵە نادیارانەی کە لۆژیکی ساردی حیسابگەری لێڵ و پێڵ کردوون و بەسەرچوونیّ زەمانەی لەبیر بردوویەوە بەرجەستەی دەکاتەوە و وێنەکە تەواو دەرەخسیّ، و تا تۆچاو لێك دەنێی و هەڵیان دێنییەوە وێنەکە رەخساوە و تەواوە بەلاّم ئەوە تۆی کە لێك هەڵوەشاوی... و سەگەل دەمو قەپۆزیان دەلێسنەوە...

مانگ، سارد و سڕ و لالوتانە تێم دەڕوانیّ؛ چاوی وەك چاوی پشیلەی سارد و سپی... پیاو سەری سوڕ دەمێنیّ- ئاخر خۆ ئەویش شەیدای رۆژێیە... بەلاّم ئاشق و ئەئاوا سارد! باشە،



ئاشقی، ئاشق بە؛ کەس هەقی نییە، بەلاّم سەرنجەکانت دەگەڵ ئیدیدا کەمێك نەرمونیان و میهرەبانترکە- ئەوە لە خوو و خدەی ئاشقایەتییە بەدوورە... ئاە... ئەوە وەسفی حاڵی منە: باشە، ئاشق و شەیدای دارگوڵێی باشە، قەیناکا، بە نەرمونیانییەکیشەوە چاوێکی بەوەشدا بخشێنە و ئاورێکی لێبدەوە- خۆ کفر نابیّ... ((ئاە، تۆش لێرە بووی!)) دارگوڵە، زەردێکم دێتیّ، بەلاّم دەترسم- دەترسم گوێی لێبووبیّ؛ لەوانەیە هەر ئێستا بڕۆیان تێك نێت و فرمێسکی بێنەخواریّ و دەگەڵ چای ناو ژێر پیاڵەکەیدا تێکەڵ بن...

با، بەردەوام شنەیەکی لە کێوێڕا دێنیّ؛ داروبار شەماڵیّ دەباوەش دەگرن و فێنکی دەکەنەوە و بۆنی خۆیانی پێوەر دەکەن و رەوانەی دەکەنەوە؛ دەنگی سەگەلی بەر مەڕی لەکێوییەوە خۆی بەداو و تەژگەلێیەوە هەڵدەواسیّ و دێت: ((-ئێمە والێرەین- بەلاّم من لێرەنیم... من چوومەتەوە چاخانەکە... دەی، ئەوەش تەلاّخانم! دیارە کە ئاوری لە چاوان دەباریّ و یار بە کونجی تاریکی ئاگردانی دڵی شارەزایە و خۆی داوەتە بەر بڵێسەی ئەو ئاگرە. لاوەتی. پڕیەتی لە دڵ وریایی و سادەیی و شەرمێونی و لەروودامانی لاوەتی، بەلاّم ئەوین نا- بەلای منەوە هەر نا- من لەجێی براکەی بووم. ئەو دەخەونێکی دیکە دایە، خەونێکی خۆش، کە خەونی من نییە. ئەو بەهەشتی خۆی لەجێیەکی دیکە دۆزیوەتەوە... چایخانەکەی وی جێیەکی دیکەیە.

رۆژێك دەڕوا؛ حالّم چاکترە- گێژنیم- بە تەواوی مێشکمەوە بەلای دارگوڵێوەم... شەوە؛ دانیشتووین... ئەمشەو چاتر دەبینم؛ مامۆژن و تەلاّ هەردووك لێرەن. ئێستا باشتر سەرنج دەدەم و وردتر دەڕووانم- ماندوو نیم. شتێکی وەك کچۆڵەیەکی تازە پێگەیشتوو یا وەك تازە بووکێکی یەك ساڵە... تەڕو تەمیز، وەك هەموو ژنە جحێڵەکی کە هێشتا خەونە خۆشەکانی لاوەتییەیان جیّ نەهێشتووە و هەمیشە هەرلاون، هێشتا نەکەوتوونەتە سەروچاو تێکنان و گرژ و مۆنی خاوبوونەوە و باوێشکدان و داد و بڕۆ- ئەوەی دەیبینین هەر لاوەتی و جوانییە، جا هەرچی بیّ. هێشتا پەڕپوت نەبوون، هێشتا لەبەر بەروباوەش و گەوزاندن و هەڵپشاوتنیّ رەنگیان زۆر نەگۆڕاوە و تێك نەچوون- سککەیەکن تازە لێدراون؛ هەروا دەبریسکێنەوە. حاڵەتی چاوەکانی وەك حاڵەتی چاوی منداڵێك بەلاّم بزۆز+. بە تەك دایکییەوە دانیشتووە؛ روخساری وا پێشان نادا کە بە تەواوی تەسلیم بێت، هەرچی برا یا دایك بیانەویّ پێی بکەن و بەسەریدا بسەپێنن، بەو حاڵەشەوە سەرکێشییەکی تایبەتیشی لە روخسار و رەفتاریدا

دەرناكەویٚ و دیارنییە- شەرم ئیٚ، نەرم و نیانی و گەورەیی ئیٚ، بەلاٚم دڕی پیٚوە دیار نییە. لیٚو تیٚکنانی وا پیٚشاندەدا کە ئەویش بۆخۆی خواست و مەبەستیٚکی خۆی هەیە. خەتی نیٚوان دوو لیٚوەکانی پەیوەندی ئەو لیٚوانە دەردەخات کە پیٚکەوە چەند جوانن؛ دەمی تۆزیٚك گەورەیە؛ لیٚوەکانی تەنکن؛ پیٚستی لەشی لەبنەوە بەسەر شینیدا دەڕوانیٚ، هەروەك پارچەیەکی سپیت بەسەر شتیٚکی شیندا هەلٚکیٚشا بیٚ- ملوانکە ئەشرەفییەکەی ملی هەروا هات و چۆی بوو. لووتیٚکی ناسك و کورتیلە و جوان؛ روخساری وردیلە نییە بەلاٚم وا دیٚتە بەرچاو. لووتی لەلای کەرویٚشکەی لووتیەوە، داکەوتووە و ئەو چالٚییەی لیٚبۆتە نەخش. ددانەکانی دەگەلٚ روخساریٚدا ریٚك و پیٚك و ورد و گونجاون. سینگ و بەرۆکی بەگویٚرەی بەژن و بالاٚی هیٚندە خڕو خۆلٚ نییە- زۆریان هەلٚنەداوە. گوێیەکانی تابلٚیی بچکۆلەن، و چاوەکانی کالٚ و کەمیٚك بەقولٚدا چوو لیٚك نزیکن؛ تەنکە رەنگیٚکی زەردی سپی باوی بەسەر دەموچاویدا کشاوە کە لە دلاٚن ناخۆش نییە؛ زۆر لەرەنگی زەردییە پارچە زیٚڕیٚکییەوە دەچیٚ. رەنگی قژی مەیلە و قاوەییەکی کالٚە؛ پەرچەمی، راست دەگەلٚ خەتی سەریدا، بەشیٚوەی مۆدی رۆژ بڕیوە و لەپیٚشەوەی کردۆتە قردیٚلە. شیٚوەی دەموچاوی بە مانای وشە جوان نییە، بەلاٚم هەموو شتەکانی پیٚکەوە دەگەلٚ یەکدا گونجاون: هەریەکەیان کە خۆی بە تەك ئەویدییەوە دەبینیٚ خۆشحالٚ دیٚتە بەرچاوان، و ئەو خۆشحالٚیەشیان ویٚکڕا دلٚخۆشکەرن.

((ئامۆزا تا ئیٚستا گویٚت لە دەنگی کاکە سیامەندی بووە؟ دەنگیٚکی یەکجار زۆر خۆشی هەیە... ((لاس و خەزالٚ))ت گویٚ لیٚبووە؟)) ئەوە مستەفاخان بلٚیٚ.

رادەچەنم، دەلٚیٚم: ((نا، گویٚم لیٚنەبووە...)) و تەماشەیەکی سیامەندی دەکەم. ((قەتت لەوەی خۆشتر نەبیستووە... ئەولکەریم، قەنداغیٚکی بۆ کاکە سیامەندی بیٚنە... دایە خانمیش ئیجازە دەفەرموون)). سیامەند بیٚ مەیلییە پیٚشان دەدا، دیارە چاوەڕیٚی فەرمانیٚکی دیکەیە. ئەمجارەیان پیٚداگرتن و سووربوون و داوا بە زمانیٚ چاوان لە تەلاٚخانیٚوەیە. دیارە کە دیموکراسیەتی خان گەیوەتە ویش. سەرنجی تەلاٚیە بە ئاشکرا دیارە گەرم و تینووە؛ سەرنجی سیامەندیش هەروەتر، تابلٚیی دوو دلٚ- ئیٚستاش بۆ ماوەی ترسی کرمانجەتییەی هەر دە دەمارو کەلیٚن و کون و کەلەبەری ناخیدا هەرماوە. هەردووکیان لەسەر چاوەیەکی دەگەڕیٚن کە من نایبینم: ئەم لە دەموچاوی ئەودا و ئەو لە کەلیٚنی درزی کراسەکەیەوە کە دلٚیٚکی پڕ شەپۆلٚی دەبندایە لیٚدەدات و



ئەو هەستی بەو لیٚدانەی دەکرد و دەیزانی کە پیٚشوازییە سەرنجەکانی وییە هەنگاوی لیٚدانی ئەو دلٚەیان واخیٚراتر و بە پەلە پەلتر کردووە- خوێنیٚکیش کە لەبن پیٚستی سەروچاو و لاملی سیامەندییەوە بلاٚو دەبۆوە لەوەی دەدوا کە ئەویش کەژووی هەستی بەچلٚەداری گیانییەوە کردۆتە جۆلانە و خەریکی پالاٚنە و لەبەر ئەو هەموو پالٚنانەی گەرم داهاتووە...

دایە خانم بەزمانی مش و موشەوە رازی دەبیٚ، تەلاٚ بە زمانی سەرنج هەر پیٚ دادەگریٚ، سیامەند فەرمان بەردارە؛ لەسەر ئەژنۆیان دانیشتووە جیٚی خۆی لەسەر هەردوو پاژنان خۆش دەکا، قەنداغەکەی دەخواتەوە، گەرووی ساف دەکا، و دەست بەگیٚڕانەویٚ دەکا:

ئەحمەد ئاغای بالٚەکیان کوڕی نەبوو؛ مەحمود ئاغا برای بوو؛ ئەویش منداڵی نەبوون. ژنی ئەحمەد ئاغای ناوی ((شەمیٚ)) بوو؛ دە سالٚی ریٚك بوو ئەحمەد ئاغا داواکاری بوو و ئەو — شەمیٚ- رازی نەدەبوو. سەرەنجام ئەحمەد ئاغا هەر هیٚنای، بەلاٚم دەگەلٚی نەنووست و سەرجیٚی نەکرد. چونکە بەلٚیٚنی دابوو تا ئەو ژنە بەدەستی خۆی دۆخینی نەکاتەوە ئامبازی نەبیٚ و دەگەلٚی نەنویٚت... چوارسالٚ بەسەر ئەو رووداوەیدا تیٚپەڕی، و ژنە هەروا هەر کچ بوو... شیٚریٚك دەو دەڤەرەیدا بوو پیاوی دەخوارد. ئەحمەد ئاغا گوتی: ((ئەمن دەچم یا دەیکوژم یانە ئەو من تیٚکدەشکیٚنیٚ)). چوو؛ دەگەلٚ شیٚرەی تیٚك دەئالٚیٚن، و شیٚرەی دەکوژیٚ، بەلاٚم لەبەر ماندووەتییە و خویٚن لەبەر رۆینیٚ بەسەر کەلاکی شیٚرەیدا بەلادا دیٚت و خەوی لیٚدەکەویٚ. کە هەر نایەتەوە خەلٚکی خیٚلٚە هەرکیان هەموو دلٚە خورپەیان دیٚتیٚ و دەستدەکەن بە داد و فیغان و شیوەن و لەخۆدانیٚ، بە خەیالٚی وەی کە تازە شیٚر ئەحمەد ئاغای تیٚکشکاندووە...

شەمیٚ گوتی: ((ئەمن دەچم، یا تۆلٚەی ئەحمەد ئاغای دەکەمەوە یا ئەمنیش دەکوژریٚم)). دەستی دایە خەنجەریٚ و بەدوای پەیسەری شیٚرەی کەوت، کاتیٚك گەیشتیٚ دیتی ئەوا شیٚرەکە کەوتووە و ئەحمەد ئاغاشی لەسەرپشتیٚ راکشاوە. دەدلٚی خۆیدا گوتی کە دیارە هەردەبیٚ شیٚرەکە ئەوەی تیٚکشکاندبیٚ! بەلاٚم کە سەیری کرد، نا، ئەحمەد ئاغا شیٚرەکەی کوشتووە و لەبەر زۆر خویٚن لەبەرچوونیٚ و ماندوو و شەکەتییە ئەویش لە هۆش چووە. دەدلٚی خۆیدا گوتی: ئیٚستاکە ئاگای لە خۆی نییە و گیانی لە هەموو شتیٚك بیٚ ئاگایە واچاکە بە تاقیکەمەوە و بزانم داخوا پیاوە یان نا کە سەرجیٚیە من ناکات!... کەوتە دۆخین کردنەویٚی... هەردەو

دەمەیدا ئەحمەد ئاغا چاوی هەڵێنان. ئەوەی بە هەل زانی و هەر لەسەرپشتی شێرێ دەگەڵی تێکەڵ بوو- و لاسی باڵەکی لەسەرپشتێ شێری وەزگی داکێی کەوت...

مەحمود ئاغای برای ئەحمەد ئاغاش خوا کچێکی دایە، ناویان لێنا خانزاد. ئەو دووانەیان هەردووك لێك مارەکردن... ئەحمەد ئاغا مرد... شەش ساڵ بەسەر ئەم بەسەرهاتەدا رابرد. پیاوێکی باڵەکی کە دەچێتە ناو عیلی ((مامودینان)) و ((خەزاڵێ)) کچێ مەلا نەبییە دەبینێ، هەر کە دەگاتەوە نێوعێلی باڵەکیان یەکسەر دەچێتە کن لاسی و دەڵێ: ((ئەی لاس، ئەوە بۆ وادانیشتووی، عومرت بەزایەچووە...)) و دەست دەکاتە باسی جوانییە کچێ مەلا نەبی و ئەوەی دەیلێ نایلێتەوە، لاسیش بەدوای پەیسەری کچەیدا، عێل و ماڵ و حاڵ و کاشانەی خۆی بەجێ دێلی... و دەچێتە ماڵێ مەلا نەبی و لەوێ دەبێتە قلیاندار... لاس دەڵێ:

((یای خەزاڵ، نەگفتت گفتە و نەوادەت وادە و نەدینت دینە.
((هەزاران نەحلەت لەو داکە پیرە و لەو برا کورتە بنە و لەو بابە ریش خماوییەت!
((خۆ من لەبەرخاتری دەتۆ دەچوومەوە دەکوێستانی سەربڵند و دەگەورە،
((چەپکێکم گوڵە سۆسەن و لالە و نەسرین دەچنینەوە،
((و دەسکم دەکردن و بە قەیتانێ ئاوریشمی سەردوکانانم دەبەستن،
((کاروانێك لە کاروانی گەنم کڕینێرا دەهاتەوە،
((ئەمن ئەو گولاّنەم بەوی کاروانەیدا دە بۆتۆ دەهەناردنەوە،
((نازانم داخوا ئەوان گولاّنەت پێگەیون یانە نا؟)).

خەزاڵ دەڵێ:

((ئەو گولاّنە هیچیان گوڵی سەر لوتکەی کێوی سەهەندێ و قوللەی قەزەنێ و دۆڵێ زەرزان و کێوێ تەشویلە و بەرزاییە بەران و گوڵی سەرکانییە خودای نەبوون)).

لاس دەڵێ:

((یای خەزاڵ ئەتو نازانی، چۆم هەستابوون و پردیان هەموو راماڵیبوون،
((ئەمنیش مەلەوانێکی وانەبووم بە گژقوولاّییە ئاوی رووبار و چۆمیدا بچم.
((وەك بلێی، کیژوکاڵ و کوڕانی وەك هەمزاغای لە من و تۆ دەست رۆیشتوتربن،
((ئەوان دەپێش من و تۆدا سەری ئەوان گولاّنەیان هەموو پساندبوون.



((خوا ماڵێ عێلە ساتی کاول و وێران کا کە مێگەل و کار و بەرخان ئاوا بەردەدەن،
((تاسەری ئەوان گولاّنە هەموو ئاوا بپسێنن.
((دەستی لاسی باڵەکیان کورت بوو، بە هەموو کوێستانان رانەدەگەیی)).

خەزاڵ دەڵێ:

((لاسە شۆڕ، دڵت بە تەواوی پەرێشان کردووم،
((هەندێك لەوان گولاّنە بە بەر پشتێندێ خۆوەکە،
((و وەرە بە بەردەرکێ مەدا تێپەڕە!
((هێندێك دەڵێن خودا دەستی لەپشتێدا، هێندێکیش دەڵێن خودایە لێی پیرۆز بێت،
((لاسی باڵەکیان لاوێکی گەلەك شۆخ و جوانە!)).

لاس دەڵێ:

((هەر لە ماڵێ مەلایان تا ماڵێ سۆفیان،
((لە ماڵێ سۆفیانڕا تا ماڵێ مەلا نەبییە،
((دەڵێم ببمە گەڕیدە و رۆم و هیندوستانێ لێکدەم،
((ئای خۆزییە درەختێك بامایە لەوان دە درەختی دار قەیسیان،
((دەیاندامە دەست وەستایەکی دارتاشی و بە مشارانیان دادەهێنام،
((و دەیاندامە بەردەمی تەشوێ و رەندان،
((دوایە بەتاکە یەك پەڕە تاوسیان دەڕازاندمەوە و بەڕەنگێکی سپی وەك توکی قووی رەنگیان دەکردم،
((ئەوەدەمی دەیانهاویشتمە نێو چلەی کەوانێکی هیندی،
((و بەرەو لوتکەی کێوی قەزەن و لوتکەی کێوی قەندیلی مامە ئاکۆیانیان هەڵدەدام،
((و بەمنیان دەکوشتنەوە بزنە کێوی و داکێ کەڵەنێریانە.
((نووکەکەم لە بڵندایییە و پەڕەکەشم لە نزماییە دەخوارێ دەکەوت،
((لەسەر رێیە شوان و گاوان و شەنگەبێریان،
((هەڵیان دەگرتمەوە و دەیانبردمەوە سەرکانی و سەرچاوە و ئاوان،

((له خۆشییه من، مێگەلیان بەرهەڵدا دەکردن،

((و دەهاتنەوە سەر دە بەردی دەم کانیی و ئاوان،

((سەرێکیان دەبن خورجێنی مەشکەی و نێوەندیشم دە زالکی مەشکێ،

((بەملی خۆیانەوە هەڵدەواسی و سەرەکەی دیشم دەکەوتە نێوان

((هەردوو نێوشانی بێرییە بەڕەنگێکی وا کە لەچك و سەروپرچ و بسکیانم دەسەروڕووی هەڵسوابا.

((ئەودەمی چەند حەوتوێکان دەنێو خەڵکی و کوێخای دەعێل و عێلەساتێدا دەبووە بگۆ و مگۆ لەسەرە من.

((دوایە یەك لەوان کیژە بێری دە زۆر موسوڵمان ئەمنی لەو عێلەی دەدزیەوە،

((و بەرەسمی دیارییە بۆیای خەزاڵێ مەلا نەبییانی دەبردم،

((یای خەزالیش بەدەستی پیرۆزی خۆی وەری دەگرتم و دەیناردمە کن زێڕینگەری،

((زێڕینگەر سەرێکی لە زێڕی و نێوەڕاستم لە ئەشرەفی و سەرەکەی دیکەشی

((لە دوڕ و گەوهەری دەگرتم و دەیڕازاندمەوە.

((ئەوجا، ئەمنی وەك دیارییەکی لەسەر هەردوو دەستان دێنایەوە کن یای خەزاڵێ مەلا نەبییانە،

((یای خەزاڵیش سەرێکی لەسەرچاڵی گەردەنێ و سەرەکەی دیشمی،

((داویشتمەوە سەرسینگ و نێوان هەردوو مەمکانی،

((ئارەقەی لەش و لاری مەست و شەیدایان دەکردم، و ئەویش بەچمکی دەسماڵیی باوەشێن دەکردم،

((و کەم کەمە دەنێوان مووی سەروپرچانیدا فەرامۆش دەبووم

((هەر دەمێکیشم لێ وەڕەز دەبوو دەیهاویشتمەوە نێو سندوقێکی،

((رەنگ کراو؛ رۆژانە بە نوقڵ و نەباتێی پەروەردە دەکردم و شەوانەش،

((دەبوومە تەتەری نێوان سینگ و مەمکان،

((ئەو دەمیش لەوێم لێ وەڕەز دەبێ بابمنێرێتە کن وەستایەکی دەست ڕەنگین،

((و خەڕەکێکم بۆ موو رستنێ لێ دروستبکاتەوە و حەوت ساڵی تەواوم،

((ریسی ((رانك و چۆغە))ی لاوان پێ بڕێسێ،



((کە لەوێشم لێ وەڕەز بوو با کەنیزەکان ئەمن لە خەزاڵێ بخوازنەوە و بۆ خۆیانم لێ داوایە لێبکەن،

((و ئەو دەڵێ، ئەوە تیرێکی یەکجار جوان و سەرسوڕمێنە، بە کەسی رەوا نابینم، نەکو،

((ئازارێی بدەن و ئەمن رۆژی قیامەتێ لە،

((شەرمەزاریانی دەرنەچم،

((دەمێکی لەوێش لەمن ماندوو دەبێتەوە بابمهاوێتەوە بن پانییە پانی بەرزێ سیمداری،

((و لەت و پەتم کاتەوە و بمهاوێتەوە دەوروبەرێ سەرکانی و ئاوان،

((و ئەمن لەوێ شین دەبمەوە و دەبمە یەك پەڵە شۆڕەبی،

((و رێبوارانی عێلی زراری و سورچیانم بەبندا دێن و دەچن و رادەبرن،

((و یای خەزاڵێ مەلا نەبییانیش هەموو ساڵێ لەدەمە دەمی پایز و بەهاراندا،

((دێت و لەبن سێبەرێم دادەنیشی..

خەزاڵ دەڵێ:

((دڵم لە غەم و ئێش و دەردان ئۆقرە و ئارامێ ناگرێ،

((ئاورێکم دە دەروونێ، و یەکی دیکەم دە دەروونخانێ بەربووە،

((ئاورێك نە بەبای و نە بە بارانێ دانامرێتەوە،

((هاوارێکی دە خولاێ دەبەستم و یەکی دیکە دە پێغەمبەری ئاخیری زەمانێ،

((لاسە، ئەمن ئەو بسکانەم بۆ تۆ هێشتوونەوە، کە لەبەر جوانییە هەردەڵێی ئاورێشمێ سەردوکانانن،

((ئەو هەنیەم بۆ تۆ وارێك خستووە، هەزار و حەوت سەت فریشتەی دە دەستە و نەزەرێ دایە،

((هەر دەڵێی مانگی تابانە و رووناکییە خۆی دەداتەوە لە زەمین و زەمانانە،

((ئەو بڕۆیانەم بۆ تۆ داناون؛ ئەتو دەبێ کیشوەری هیندۆستانێیان لە بەهای

((وەسمەی وان بدەی و دانیشی دە وەسمەیاندەی،

((ئەو چاوانەم بۆ تۆ هێشتوونەوە کە هەردەڵێی ئەستێرەی گەلاوێژێن، لەسەر وڵاتی هەو شاری، و مەحاڵی تورك نشینان هەڵاتووە و هەر ئاشقێکی بیانبینێ رۆژی قیامەتێ لە گوناهان بەرییە،

((ئەو کوڵمانەم بۆ تۆ هەڵگرتوون، کە هەر دەڵێی چرایەکی دەرباری سوڵتانی ئەستەمبووڵێن.

تا میرزایەکی کارامە لەبەر شەوق و رووناکییە وێڕا قەڵەمێ بەڕووی قاقەزێدا بێنێ و دەستخەت و فەرمانان بۆ چوار دەوڵەتان بەڕێکات.
((ئەو لووتەم بۆ تۆ هەڵناوە، کە مەگەر هەر ئەیازی دانا مانایەی بزانێ و لێکی داتەوە.
((ئەو لێوانەم بۆ تۆ پەروەردە کردوون، هیچ بازرگانێك مەگەر کلوری دنیایەی هەبێ، دەنا ناتوانێ بێتە مەزاتێ و نرخیان لەسەردانێ.
((ئەو ددانانەم بۆ تۆ واریز ریز داناون؛ کە هەریەکەکیان گەوهەرێکە و بەها و نرخی هەریەکێکیان بە تەواوی شارەکانی کشمیر و ئێرانێ لە کڕین نایەت.
((ئەو چەناگەم بەڕەنگی چڵەزێڕی بۆ تۆ رازاندۆتەوە، دڵم نایە بیدەمە دەست هەموو وەستایەکی، دەبێ وەستایەکی کارامە و دەست و پەنجە رەنگین بێت، تا وردە وردە، و نەرم نەرمۆکە، کاری تێدا دەڕازاندنەوێیدا، مقاڵ مقاڵ خەریك و ئازارێێ نەدا.
((ئەو گەردنەم بۆ تۆ رەبەرچاو گرتووە، دەڵێی گولاوْدانە،
چەندخۆش دەبو لاس و خەزاڵ ئەو گولاوەیان لێك بپژاندبانایە،
و لاس بڵێ: یای خەزاڵ، ئەو شووشەی گولاوەم بۆ لەسەر تاقێ دانێ و بۆم هەڵگرە!
((ئەو تەختی سینگەم بۆ تۆ وایان راخستووە و جووتە لیمۆیەکی کاڵیان لەسەرە؛
پەشتەماڵێکی ئاوریشمی دەست چنیان بەسەردا هەڵکێشراوە،
و کلیلەشیان دەرزیلەی هەشتەر خانییە،
((چەند دانە خاڵێکم بەسینگییەوەن کە،
بەبێ مامۆستا و رێنماش دەیانخوێنمەوە: ئەلف و میمن، خەتی یەزدانن.
((ئەم بەژن و بالایەم بۆ تۆ پێگەیاندووە، هەر دەڵێی شتڵەرەیحانەی یەکساڵەیە و ئادەمیان بەشەوێیان ئاو داوە و بەگزنگی بەر بەیانیەیان شەونم بەسەر پەلکاندا باریوە.
((نەرمیە ئەو رانانەم بۆ تۆ هێشتوونەوە، وەچەمێ و بۆ ماچ و خۆ تێوەردانێیان سەروێکە.
((لاسە شۆڕ، و عەمرێ من، وەرە باکەس نەزانێ ماچێکت دەمێ.
((گۆزینگێ پێیەکانم سێوی بە لکێوەن، ئەوانە بە سپاردە و باغەوانییە بە تۆ دەسپێرم کە هەر لە ئێوارێوە تا بەرەبەری سبەینێیان ئێشکەلێبگری،



((و لەسبەینێوەشڕا دووبارە تا دەمەدەمی ئێوارە درەنگانێکیان ئێشك لێبگرییەوە، تا ئەودەمەی کە مەلا بانگی ئەڵلاهو ئەکبەرێ دەدات و سۆفیان کەلیمەی شەهادەتێیان بەزار و زمانان دادێت.
((وەرە، لاسی من، تا دوو ماچانت دەمێ: یەکێکیان لە باتی زەکاتێ،
ئەویدیش لەجیاتی کەلیمەی شادە و ئیمانێ)).
لاس دەڵێ:
((یای خەزاڵ، چبکەم ئەتۆ لە دیوی نێو ماڵێ و ئەمنیش لە دیوی پیاوان،
((دڵم تا بڵێی پڕە و دەروونم پەرێشانە،
((تۆ خانەخوێی و من بێگانە،
((ئەگەر راستدەکەی و ئەوان ماچانەم دەدەیەی،
قیسپی دەوری چیغێت دەرکێشە و قەدەم رەنجەکە و فەرموو دە وەرە...)).
دەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر کۆلای ئەو بەیتانە بووم لە ئەحواڵی تەلاْ و سیامەندیش غافڵ هەر نەبووم. ئیدی لەوەی دڵنیابووم کە چێژیان لە دانیشتنی لای یەکتری وەردەگرت و هەردووکیشیان ئەوەیان دەزانی و ئەو دووانە چاکیان یەکتر دەناسی. جا ئەو دووانە یان دەیانزانی، یا نەیاندەزانی کە لەراستیدا ئەو بەیتانە گفتوگۆیەکی نێوان خودی ئەو دووانە خۆیانن.

گفتوگۆی کام داستانێك لەوەی ئاشکرا و روونترە؟ کام پەرێشانی و دڵبراوییەك هێندە وا بە پاکی و بێگەردی و جوانی وەسفکراوە؟ وەسفی حاڵی هەردووکان: ئەم بێگانە و ئەو خانەخوێ؛ ئەم قلیاندار و ئەو کچە خان و خانەدان. کێ دەڵێ کە هەر ئەو قلیاندارەش ماڵ و حاڵ و کاشانەی خۆی بەو مەبەستەوە بەجێ نەهێشتووە و بەو نیازەوە نەهاتووە؟ دەگەڵ ئەوانەشدا هەردووکیان لادێ زادەن، ئەوینەکەشیان ئەوینێکی لادێییانەیە لەلادێوە هەڵقولاوە، لەلادێ زادەیەکی خانەدان و خانزاد و لەلادێ زادەیەکی کرمانجی بێ خان و مانەوە، کە وەك قەرەجان هەمیشە ماڵ بە کۆڵەوەیە. ئەوینی سادە و ساکاری لادێیانە لەو ئەوینانە نییە پێویستی بەپێشەکی و تەنتەنە و بەنبەنەی رۆمانتیکیانە بێ، عاشق بێت و دەمانگێ هەڵڕوانێ و سکالای ئێش و ئازار و دەردەکان و غەمی دەروونی خۆی بۆ وی هەڵڕێژێ یا سۆز و سوتانی ناخی دەروونی بەشێوەی بێ ئارامییە چاوی و زمانی سەرنجەکانیەوە بێرو بەوێدا بنێرێ. خۆ ئەگەر بشیانویستبایە نەیاندەزانی، چونکە، نە زمانی ئەوەو نەڕێی ئەوەشیان هەبوو. دەوجۆرە

ئەوینانەدا ئەو پێشەکی و داد و برۆ و غەم و بیر و خەیالانە هەر دەکولەکەی تەڕیشدانین. ئەوینیشیان هەروەك هەموو شتەکانی دیکەی جێ لە دایکبوونیان سادە و ساکارە جێ لە دایکبوونیان لادێیە، کە پشتی بەکێویەوەیە و داوێنیشی چۆم و رووبارە، و لافاو کە هەڵدەستێ لوس و لێك بەرەو خوار دەبێتەوەو هەموو شتێکی دەشواتەوەو دەگەڵ خۆی رادەماڵێ و لوولی دەداتە نێو خۆی و هەڵیدەلوشێ. ئەوینی ئەمانەش ئاوایە- ئازادە و بێ پەروا.

لەسەرهێنان و بردن و گەردن بادانی سیامەندیڕا دیاربوو کە چاوی لەدوو کێیە و رووی قسانی دەگەڵ کێیە، تەلا سەری بەردابۆوە و یاری بەگوڵی رایەخەکە دەکرد، بەلام روخسار و سووربونەوە و بڵێسەی چاوەکانی و چۆنیەتییە رەنگی دەموچاوی و لەرەی بێ هەستی هەناسەی، هەموو هەر ئەوەیان پێشاندەدا کە دەنگەکان دەکەنە هەوێنی وێنەکان و بەسۆزەوە تیکەڵیان دەکەن و دەیانهاوێنە بەر و باوەشی یەکتریەوە و بەجۆرێکی دیکەیان بەکار دێننەوە. دەموچاوی سیامەندی، جاروبارە وەك گوڵی گوڵە بەرۆژەی بێ ئیختیار بەلای ویدا دەسوڕا و بەسەرنجێکی پەرێشانەوە لەجیاتی وی و لەلایەن وییەوە دیاریی پێشاندەدا: دەستی بۆ سینگی خۆی دەبرد: ((من ئەو سینگ و مەمکانەم بۆ تۆ راخستوون...)) جوولەی پەنجەکانی تەلایە لەسەر گوڵی رایەخەکە خێراتر دەبوو؛ روخساری وەك گوڵێکی ناسك دەگەڵ وشەکاندا دەگۆڕا: گەرم دادەهات، سورتر دەبۆوە و هەرکاتێ کە وای لێدەهات نەخشەی وێنەکردنیی لەسەرگوڵی رایەخەکە ئاڵۆز دەبوو و لێی تێکدەچوو. ئەوەش بێدەنگییە تێك گەیشتنێ هاوبەش، نەبوو: شەپۆل و هەڵچوون بوو، تۆفان بوو، کەفوکوڵ بوو، پاشاوی شۆڕێك بوو کە لە بازنەی هات و هاوارێکەوە سەری هەڵدابوو.

واپێدەچوو کە پاڵەوانەکە، هەروەك پاڵەوانی ئەفسانان بە کەوش و دار عەسای ئاسنینەوە کێو و بەندەنی بەزاندبن و هاتبێتەوە تا بەیەك شمشێری ئەژدیهای لەت و پەت کات و شازادە خانمێ بۆخۆی بەرێ. ئەژدیها بەڕووالەت مستەفاخان، کە هەروەك باوە دەبوو دە ئەشکەوتێدا لەسەر گەنجینەی پەپۆکەی ببەستێ؛ بەلام ئەویش دەگەڵ پاڵەوانیدا زۆر لالووت نەبوو، ئەویش هەر تا ئەوەندەی کە زەبری شمشێریی نەگەیوەتێ و هەستی بە ئازارەکەی نەکردووە. لەوانەشە بتوانین بڵێین کە ئەو ئەژدیهایە شابانووی ماڵێ بوو کە تریاك هیچی وای لێ نەهێشتبۆوە- وەك بڵێی



پەریی چاودێری پاڵەوانی، پێش ئەوەی پاڵەوان وەڕێ کەوتبێ، هاتبێ و دەرمانی بێهۆشیەی دەجامی شابانووێ کردبێ.

تەلا هەرکاتێك کە لە نەخشەی گوڵی سەر رایەخەکە ماندوو دەبوو خەریکی ئەنگوستیلە و دراوەکانی لێواری کوڵەجەکەی دەبوو و خۆی بەوانەوە دەخافلاند. هەرکاتێ کە سەری دەسوڕاند بە رووناکاییە چرایەکەی، گوارەکانی چەندین جاریان چاو دادەگرتن و لا ڕوومەتەکەی دیکەشی لە (رقان) دەتاریکییەدا ون دەکرد: نا ((من ئەوانە لە تۆ قبوولْ ناکەم، نە گوڵەکانی سەرلوتکەی سەهەندێ، نەگوڵەکانی... سەرکانییە خودای هیچیان لەو چەپکە گوڵانەی تۆ نەبوون...)) هەر لە ئێستاوە بیانووان دەبینییەوە!... زەنگ لێدەر، پەرت و پەرێشان، دەنگی لە زەنگی هەڵستاندبوو. دەنگی ئەو زەنگوڵانەی دە دەروونیدا وەهاوار و دەنگ هاتبوون گێژیان کردبوو؛ بێ ئارام بوو. من گوێم لەو دەنگانە نەبوو. بەلام هەستم پێدەکردن. خۆ بەلاوەنانێ ماسوولکەکانی دەموچاوی تەلایە بوون کە دەنگەکەیان دەخنکاند و زەنگەکەیان دەگرت، و بیلبیلەکانیش بوون کە ئەو هەستانەیان دەردەخست و سیامەندبوو کە لە ترسێ هەڵخلیسکان و بەلادا رۆیشتنێ ئارەقەی دەردابوو و حاڵەتێکی جەزبەی دە دنیایەکی دیدا بەسەرنجی چاوەکانی دابوو، کە زۆر لەم دنیایە دوور نەبوو، دەترسا سەیری ئەو دنیایەی بکات و تەنانەت بەتاکە سەرنجێکی چاوەکانی هەموو شتێکی لە دەست بچێت، و هەڵخلیسکێ و بکەوێتە نێو خەرەندی جوداییی و کۆتاییی بێت و ببڕێتەوە. ئاوازێکی وەك پاڕانەوێی بە گوتنەکەی دەدا: ((یای خەزاڵ، چۆم و رووبارەکان هەستابوون، پردەکان هەموو رووخابوون ئەمنیش مەلەوان نەبووم کە دە قوولاییە و دەنێرینەی رووبارەکاندا مەلەی بکەم... جا کەواتە، دەڵێم باسەری خۆم هەڵگرم و ببمە گەڕیدە بە ولاتی رۆم و هیندستانێدا...

نا، نابێ نائومێد بی؛ دڵی یاریش ئاسوودە نییە: بە ئاوازێکی غەمناك و زەردەخەنەیەکی پەرێشانەوە لەباتی یارێ وەلام دەداتەوە: ((دڵم لەبەر وان غەم و کەسەران ناسرەوێ؛ ئاورێکم دە دەرروونی، و یەکی دیکانەم دە دەروونخانێ بەربووە- ئاورێکی کە نە بەبای و نە بەبارانێ دانامرێتەوە...)).

هیچ گومانێك دەوەیدا نەبوو کە دەناو یەکتریدا دەژیان و هیچ کامێکیشیان بۆخۆی بەتەنێ و سەربەخۆ نەدەژیا. بەهەر سەرو لێو بادانێکەوە، سەرنجەکانی تەلایە چەندین جاریان خۆ لە

لێوارى جۆگەلەى وشەكان هەڵدەسوى و جۆگەلەكەش بەڕێنماییە سیامەندى خۆى لە سەرنجەكانى وییەوە دەپێچاو دەچووە قولاییە گیانییەوە و وەك بۆنى پەلكە گوڵێ كە پێكەوە تێك دالێن و دەبنە یەك ئاواى دڵ لە ئاسمانێكى بۆنخۆشدا، و بەدڵنیاییەكى ئارام بەخشەوە داوەت دەكرد. تەماشەیەكى تەلایەم كرد؛ چاوم لێبوو هەناسێكى قوڵى هەڵكێشا، دوایەش هەر بەهەمان حاڵەتى ژنانەوە، كە وەك بڵێى هەموو هەر پەیڕەوى یەك شت دەكەن، دەستێكى بە قژیدا هێنا. دەگەڵ ئەوەشدا كە ئەو سەیرى منى نەدەكرد هەستم كرد كە وەك هەر ژنێكى هەستیارى دیكە چاوخشاندنەكەمى بەسەر هەموو لەشى خۆیدا هەستكرد.

خەزاڵ بیانووان دەگرێ؛ هەروا بەهانەیە و دەیانبینێتەوە؛ یەك لەو بیانووانەى ئەوەیە لاسى بەدواى گوڵێكى دەگمەنیدا دەنێرێتە هەندەرانێكى دوور. ڕێگران ڕێى پێدەگرن؛ بریندارى دەكەن- تیرێكى وە رانى دەكەوێ. بەلاّم ئەو بەڵێن و پەیمانێ دەگەڵە خۆیدا دەبەستێ كە دەبێ ئەو تیرەى بەدەستى خەزاڵێ لەڕانى بێتەدەرێ. زۆر بەشەپرزەییەوە دێتەوە ماڵێ. خەزاڵ هەوڵدەدا تیرەكەى بێنتەوە دەرێ، بەلاّم تاقەتى پێناشكێ؛ بانگى حەكیمى دەكا، بەلاّم هەر بێسوود دەبێ و لاس بەوتیرەى دەچێ و دەمرێ...

خانزاد و خەزاڵ خۆڵێ وەسەرى دەكەن.

لاسى هەڵدەگرن و دەیبەنە گۆرستانێ.

و دەیشارنەوە، و دێنەوە.

خانزادە خان بەدڵشكاوییەوە دەچتەوە نێو خێڵى باڵەكیان

بەلاّم خەزاڵ هەر لەوێ دەمێنێتەوە.

بە تەواوبوونى بەیتەكەى تاوە بێدەنگییەكى قورس بەسەر ژوورەكەیدا دەكشێ؛ سیامەند دەستێكى بەنێو چەوانیدا هێنا، مستەفاخان هاتەوە سەرخۆ و بەدەنگێكى ئافەریناوییەوە گوتى: ((دەم خۆش!)) و سیامەندیش گوتییەوە: ((سەرخۆش!)) منیش هەروا لەوپەڕى واق وریدا هەرئەوەم دووپات كردەوە...



بەڵێ ئەوەش ئاوێنەى نەتەوایەتى، بۆ بەسەركردنەوەى رابردووى خود، بۆ بەسەركردنەوەى ئەوین و دڵدارییە پێشینانى بە بڵندابیە كێوى و گەورەییە ژیانێ، دووپات كردنەوەى تاسەى گەیشتن بەسەر بڵندییە، بەسەر بڵندى و سادەییەوە... ئەوەتا هەر ئەو دووانە، كەوەكانى ناو ئەو كێو و بەندەنەى دەكەنە شایەدى بەڵێن و پەیمانى خۆیان و لەبن ئەو دار و درەخت و پەنا ئەو تاشە بەردانەى ئەو كێوەوە دەژین... واباوبوو، چۆن درەخت نیشانەى سروشت و ملكەچى فەرمانى وییە كێویش نیشانەى خۆڕاگرى و بەردەوامى ژیان بوو... و ئەوەتا ئێستا بابە دەڵێ كە ئەو بەیتانە پیاوێكى رەش و رووت و پنداوى دایناوە و رێكى خستووە یا لەبەرى كردووە! من تەواو دڵنیام و لەو باوەڕەشدام ئەگەر كەسێكى وا هیچ دەستێكى دەوكارەى وەردابایە ئەودێڕە جوان و پڕجۆش و خرۆش و ئەو هەموو دیاردە جوانانەى ژیانى هەموو تێك دەداو خراپى دەكرد و لەناوى دەبرد- كە دیارە ئەو جۆرە كەسانەش هەر شایستەى مەرگ و نەمانن.

بەلاى ئەوجێیەمدا روانى كە تەلاّو دایكى لێ دانیشتبوون. دایكەكە وەك كۆنە سەماوەرى شكاو هەر وزە وزى بوو، بەڕوخسارێكى سەیرەوە خەو بردبوویەوە و خەونى خۆشى دەدیتن، بەلاّم... تەلاّ لەوێ نەمابوو- رۆیبوو!... بێ ئیختیار لەوێ نەبوونیم هەستپێكرد- تا ئەو لەوێ بوو ئاسوودە بووم. ناكا هەستم بە كەمایەسییە كردبێ؟ ئاخر خۆ ئەویان بۆ من دانابوو! ژوورەكە بۆنى وى لێدەهات: بۆنى سملّى وشك، وەنەوشە و مێخەك بەند؛ گوڵى رایەخەكە شوێنەوارى جێ پەنجەكانى وى پێوە بوو- بەلاّم ئەو بۆخۆى دیارنەبوو...

باشە، ئەوەشمان ئەوە... كێو وەك داپیران فووى لە بن میچى ئاسمانێ دەكرد و بەو فووە فووەى خۆى لەشى دەقالّبى پەیامەكانى لاس و خەزاڵ و رواژاى دەموچاوى سیامەند و خەزاڵێى دەدایە دەم باوە و من ئەمانەم هەموو بەبێ رێنمایى و مامۆستا دەخوێندنەوە. چ هەستێكى قووڵ و رەگاژۆ! بە ئەستوورى و گەورەیى و سەختى رەگى دار بەرووەكانى كێوى... پڕ گیا و گۆڵ بەلاّم سادە و لار و خوار بەلاّم خۆڕاگر، سەوز بەلاّم تاریك و تێر... و مانگ، ساردبوو. كێو، قۆرى مانگى بە پیاڵە و ژێرپیاڵەى حەوت برایانەوە (حەوتەوانە) لەسەر سینییە ئاسمانێ ریزكردبوون و سینییەكەشى لەبەردەمى پەروەردگارى ((سروشت)) راگرتبوو و ((سروشت)) چاى دەخواردەوە... و خەڵكى دە پرخەى خەوى خۆشدا نوستبوون و سەى نێومەڕى حەپەى دەهات... شوانیش هەر نوستبوو؛ بەلاّم سیسركەكان بە ئاگابوون و نەنوستبوون، تەراتێن و

خرتەخرتی مشکانیش هەروا بەتاو و تین بوو، و پشیلە، تورە... و منیش لاس بووم و چووبوومە سەر بلندایییە کێوی تا چەپکە گوڵێکی لەوان گوڵە دەست لێنەدراوانە بۆ خەزاڵێ خۆم بچنم... درەختەکان لەو بەرەوبەران بەریزیەکەوە وەك کۆلانۆکەی ریزیان بەستبوو و مەیلە و تاریکیان دەنواند و دە تاریکییە ئەنگوستەچاویدا ون دەبوون؛ کە دەگەیشتنە سەرلوتکەی کێوی رەنگیان دەکرایەوە و خۆیان لە ئەستێران هەڵدەسوی و سارد و فێنك دەبوونەوە. ئەستێرەکان بەشی زۆری رێی شەورۆییە خۆیانیان بڕیبوو و من هەروا بەردەوام دەگەڵیاندا دەڕۆیشتم و گوڵم دەچنیەوە... هەموو جێیەك ئارام بوو، سروشت دەوپەڕی حەسانەوێدا بوو، رووبار وەك زەردەخەنە و قاقایان کە هەرگیز کۆتاییان نایە بەردەوام بەخوڕە خوڕەوە ملی رێی خۆی گرتبوو و گشتەکی ئەو پێکەنینانەی کە کۆتاییان نەبوو بەدوای خۆیدا رادەکێشا؛ منداڵێك لە دوورەوە دەگریا- منداڵەکەی دارگوڵ بوو!؟... و من هەروا بە ئاگا بووم و نەنووستبووم، دەخەوێشدا، هەر بەسەرهاتێ لاس و خەزاڵ و لاس و خەزاڵەکانی دییەوە خەریك بووم و بیرم لێدەکردنەوە...

کاتێ کە چاوم هەڵێنا تەتەری کازیوەی گەیبووە بەردەرکی قولەزەنگی شەوێ لەترسی هەرەشەی رۆژێ خەریکی پێچانەوەی پڕ و پرێسکە و خەیمە و خەرگای بوو. کێو بەپێشوازییە رۆژێوە سەری دەتەشتی ئاسمانێدا بە کەفی بەرەبەیانێ دەشوشت؛ پرپیشکی لەشی بە دامێنی ئاسمانێدا دەپژاند و کەڵەبابی لەخەو رادەکردن و بۆ هەڵگرتنەوەی دەنکە ستێرانی بانگهێشت دەکردن. کەڵەباب باڵیان لێکدەدان و بە باوەشێنی باڵیان شنەی شەماڵێکیان بەرووی پەنجەرەیدا دەدا. ئیدی خەوم لێنەکەوتەوە... کەوتمەوە کاوینەوەی بیر و خەیالان...

بیستبوومان، دەیانگوت کە ناو و ناوبانگ و سەر و سامان و ئاوازە و شتگەلێکی لەو بابەتانەن کە کچۆلان شەیدا دەکەن...

ئەگەر ئەوە راست بێ ئەدی ئەمە چییە؟ خۆ سیامەند چ ناو و ناوبانگ و سەر و سامانێکی نییە- ئەدی ئەمەیان چۆنە!... نا ئیدی، ئەمە وانییە... ئەو قسانە دە ئەوین و عیشق و دڵدارییەدا نین و بناوانیان تێك ناکاتەوە: لۆژێکی ئەوین و عیشق و دڵدارییە لۆژێکی باوی قبووڵ نییە: کوا تا یەکێك یەکێك دەناسێ؛ لە تەواوی دنیایەدا دووکەس پەیدا نابن کە دە هەموو شتێکیدا وەك یەك بن. رەنگە سەرەنجامیش هەقی بابە بێت، سروشتیشە وابێ، و کاتێ



تۆ دەم و دە ئازادی و ئازادییە ژنێ وەردەی و دواییش هیچ کاتێك لەماڵەوە نەبی، سروشتییە دوو لاو کە بەردەوام لە پەنا یەکەوەن وەك دوو جۆگەلەی لاپاڵێك سەرەنجام رۆژێك هەردێ لێك نزیك ببنەوە و تێکەڵاوی یەك ببن. پێشینان گوتوویانە کچ و کوڕ ئاگر و لۆکەن، لە تەك یەکەوە بن گڕ دەگرن- جا وەرە تۆ بێیت و بە باوەشێنێ ((دیموکراسییە))شی باوەشێن کەی!...

بە هەنگاونانەوە بەرەو لای رووبارێوە چووم- گوتم پێم خۆشە بە تەنێ بم، دەمەوێ بچم رەوکەی ئەسپان ببینم- ئەوەم هەر بە مستەفاخانی گوت. رەوکە لەوبەری چۆمییەوە بوو. تاوێك لای پردە دارینەکەوە خۆم گنخاند. مێشکم هێشتا لە بەسەرهاتێ دوێنێ شەوێ ساف نەببۆوە... ئاوەکە بە توندی خۆی بەگاشە بەرداندا دەدا و دەهات، و هەر کە دەگەییە بن پردەکە، وەك بیربکاتەوە، بۆ تێپەڕبوونێ بن پردەکەی هێواشی دەکردەوە. لەو لاترەوە ماسیی خۆرکەیەك دەتەنکاوێدا لەسەر جەگەنێکی هەڵنیشتبوو، دیاربوو وەنەوزی دەدا. ئاوەکە دەگەییە بن پردەکە، بەشێکی کە شەکەت و ماندوو و مردوو دیاربوو لە گێژەنێوە خۆی دەدایەوە قەراغێ، تا تاوێکی وەحەسێ. ئەمانە توخمی ماندوو و بێ نەخشە و بڕیاربوون، وەك ئەوانەی وەك من، کە هەر تۆزێك بە دەوری خۆیاندا سوڕانەوە، گێژانە، چاوەڕێن شەپۆلێك بێت و پاڵێکیان پێوەنێ و دەگەڵ خۆیان بێنێتەوە. ئەوانی دیکە وەك سیامەند و تەلابوون کە هەروا، خێرایانە، رێچکەی ژیان دەگرنەبەر. ماسیی خۆرکەکە وەنەوز دەیبردەوە... و من کە بەدەوری خۆمدا دەسوڕامەوە سەیرم دەکرد و بێ ئاگا چاوم لە شەپۆلێکییەوە بوو کە بێت و لەو سەرگەردانی و بێ نەخشە و بڕیارییەم رزگارکات. ئەوەتا شەپۆلەکە هاتبوو؛ پاڵنانەکە هەبوو- ئەدی بۆ هەڵنەدەقەنام و نەدەڕۆیشتم؟... رۆیشتم، بەلام هەروا چەند هەنگاوێك بەرەو خوارتر دیسانەوە هەمان گێژی و سەردەرنەکردنە و هەمان سەرگەردانی. هەرگیز نەمدەویست تا دنیا دنیایە هەروا بەدەوری خۆمدا بسوڕێمەوە؛ یەکێکم دەویست کە لە دەوری بگەڕێم، و لە دەورم بگەڕێ. دەمزانی کە گەیشتوومەتە تەمەنێکی ناچارم دۆست و ئاشنا و رۆشنایەکم هەبێ، بەلام وەی کە نەکا، بیرێك، کەسێك، ئەوینێك کۆت و بەندم کات و تا هەتایە یەك رێچکە بگرم یا لە یەك نوختەدا بەدەوری خۆمدا بسوڕێمەوە، دەترسام... بەلام بە رامان و وردبوونەوەیەکی زیاتر زانیم جێی ترس و دڵەڕاوکێ نییە: ئەمە تەنیا سووڕانەوەیەکی سادە نییە بەدەوری تەوەرێکدا؛ ئەمە سوڕانەوەیەکی پڕ پێچ و لوولە؛ سوڕانەوەیەکە بەرەو کامڵ بوون؛ هەر سووڕانەوەیەك و کەمێك هەورازتر- ئێستا بیرێك، یا کەسێك چ جیاوازییەکی نییە... ئەدی چاوەڕێی چ بووم؟ ماسیی

خۆرکەکە لەپڕ لەوە نەوزدانیٚ بۆوە و گوڕی لە ئاویٚ بەستەوە و دوای ساتێك ماسی بە دندوکێوە لە ئاویٚ هاتەوە دەریٚ؛ کەمنی دیت، بەڕەنگی پەڕ و باڵە شینکاوییەکەیەوە بەرە و خۆر لە شەققەی باڵیدا، بەرسینگی دەبریسکایەوە و خۆری بۆ ببووە ئاوێنە و ئەویش بە پەڕو باڵ راوەشاندنیێوە دەنکە مرواریی روناکی بەڕووی ویدا دەپژاند. چەند باڵێکی لێکدان خۆری لە خۆی تەکاندەوە و دوو دڵی لە منیش- منیش دەبو وەکو وی خۆم لە خەو کردبایە. ئیدی تازە تێپەڕی درەنگە؛ تازە دەبیٚ بە چاوێکی کراوەوە برۆم. لەپردەکە پەڕیمەوە و بەرەولای رەوکەیەوە چووم. رەوکە دە دۆڵێکی ناچەندان دوور بلاٚوببۆوە- هەندێك بەپێوە، هەندێك پاڵ کەوتوو، بەشێکیش دە لەوەڕێدا، راوەستا و پاڵ کەوتووەکان، دەتگوت گوێیان بۆ چیرۆکی جەنگەڵ راداشتووە کە بۆیان دەگێڕێتەوە. بۆیە جارجارەیان بۆ پەسەندییە گێڕانەوەکە سەر بۆ پێش و پاشەوە هەڵدەتەکاند. پیرە ئەسپی رەوکەی لە تەك جوانووە ماینێکی کوێتەوە پاڵ کەوتبوو و سەری بە کەفەڵی کردبوو بە ددانە پیر و زەرد هەڵگەڕاو و پڕ تین و تاوەکەیەوە بن کلکی دەخوراند- ئەی فێڵزان- و جوانووە ماینیٚ تاین کە تەواوی لەشی بەو خوراندن و نەوازشە ئەسپارد بوو کلکی بۆ بلّند دەکرد و جارجارەش بە نازەوە گوێیەکانی بۆ دەلەقاند و چاوی سیس دەکردن- هەروا راست وەك دارگوڵیٚ: ((وەیش، دەمەکە!)) لەبان درەختێکەوە، قەلەرەشێك، وەك بلّێی ئەرکی خۆی بیٚ، ((قاڕ))ێکی کرد و بەباڵ لێکدان و قاڕەقاڕەوە هەستا... ئا! ئەوە باوەژنەکە بوو!... ئەسپەکە حیلەیەکی بەسەر ڕەوکەکەدا کێشا و گەردنی کێل کرد و هەردوو گوێی بەرەو لای منەوە مووچ کردن؛ ئەسپەکان هەموو گویٚ قولاٚغ بوونەوە. جوانووە ماینەکە بەبیٚ مەیلییەوە راستبۆوە، خۆی راوەشاند، خۆی لێك کێشایەوە- پیرە ئەسپیش هەروەتر... دورا و دورم سیامەند بەدی کرد... و بەولاوەتریش، دەنا و دارەکاندا، پەیکەرێکی وەك سوێسنەی کە دەنێو مێرگێکیدا رابری، بیٚ ئەوەی هەر لەڕووی لوتفیشەوە بیٚ سەرێك بەراست و چەپەیدا وەرگێڕیٚ، بەلای بنکەدارەکاندا دووردەکەوتەوە... دڵنیای کە ئەوبوو؟... چی دەکرد لێرە؟... ئەمە چ پرسیارێکە... خۆ ئەوە ئیش و کارەکەیت زرپ و زیندوو وا لەبەرچاوانە. دیاربوو قیسپی دەوری چیغێی دەرکێشا بوو و هاتبوو تا وادە و بەڵێنی خۆی بەجیٚ بێنیٚ...

لە دیوی نێو ماڵێوەڕا هاتمەوە. نیوەڕۆ هەڵکشیبوو. بانگم کرد، وەك کەسی لێنە بوو‌بیٚ و نەبێت، قەیدی چییە، خۆ من بێگانە نیم، دەریٚ و ژووریی پێناویٚ، دەمەویٚ بچمە کن مامۆژنیٚ. لە پلیکانەکانی حەساریٚ تێپەریم، چوومە نهۆمی سەریٚ. نەخشەی خانووەکە



هەروەك نەخشەی ماڵیٚ مەیە. بیٚ ئیختیار کەوتمەوە بیری دار گوڵیٚ و بەسەرهاتی مانگایەکەوە... لە ((ژێرخان))ێیان چێشت لێدەنا؛ بۆنی سوورەوە کردنیٚ ئەو ناوەی داگرتبوو. تەلاٚ دیاربوو هەوڕی دەشوشتن و لەبن لێوانیشەوە، بەدەنگێکی ناسك، لەبەرخۆیەوە نارەناری بوو، گوتنەکە، بەگوێیان ئاشنابوو: ((لاسەگیان، من ئەو چاوانەم بۆ تۆ رشتوون، کە هەر دەڵێی ئەستێرەی گەلاوێژن... و ئەو ددانانەم بۆ تۆ ریزکردوون، کە هەر یەکێکیان گەوهەرێکە...)). کەمنی دیت سوورهەڵگەڕا، سەری بەردایەوە و چووە ئەو سەری ژووریٚ... دارەڕای بن میچەکە مۆریانە تێیدا بوو، هەمووی ریٚ ریٚ کردبوو، دیوارەکان قەڵشتیان بردبوو، دە قەڵشتی دیواری حەسارێوە مالوێچەیەکی باریکەلاٚنە، خۆی هەڵواسیبوو و هاتبووە سەرلێوی دیواری و رێی رۆینێی لیٚ گیرابوو...

ئەو بەیتانەی بەتایبەتی بۆیە گوتبوون تا من گوێم لێبیٚ؟ خۆ هاتنم لە حەسارێڕا دیاربوو و داینابوو کە دەبیٚ چۆنم ئاو دەدەستی کا؟ یانی دەیزانی کە ئەوم لەکویٚ دیوە؟- دیارە، دیتبووی بۆیە رۆیبوو...!.

هەر لە خۆوە گەرم داهاتبووم. یانی چی؟ خۆ من هیچم نەگوتبوو- داوای هیچم نەکردبوو. ئەڵبەتە نەیدەتوانی رازی نەبیٚ. ئەوپەڕی، ئەوەی لە دەستی هاتبایە هەر ئەوە بوو بچیٚ و خۆ بەچۆمی دادا. یا دوای ماوەیەك بچێتە ماڵی قازی یا ئیمامێك یا شێخێك و لەوێی داڵدە بدەن و دانیشیٚ- بەم جۆرە من دەگەڵ سیامەندیدا دەبوومە دوژمن. و ئەو سەرشۆڕی و ملکەچی و کەمایەسیەش لەویٚ راوەستیٚ کە ئەو بچێتە ماڵە ئیمامێکی شاری و لەویٚ وەمێنیٚ و بلّیٚ ئەوەم دەویٚ و ئەوەم ناویٚ! نا، هیچ کاتیٚ کاری واناکەم... ئافرەتێکە دڵ براو... راست نییە- ئەودیوی وەزعەکەی خۆمە... نا ئەمە راست نییە- تازە ئیدی هەرگیز لە شەرمەزارییە دارگوڵیٚ نایەمە دەریٚ.

ئەمە، ئەڵبەتە سەرەنجامی تێڕامان و وردبوونەوە بوو، دەنا ئەوەی هەوەڵێم هەر بیانوو بوو. ئەو رۆژەش مامەوە، بەلاٚم دیسانەوە هەر لەویٚ نەبووم. دانیشتنەکە هەروەك خۆی و شێوەی دانیشتنیش هەر هەمان: من لەسەرەوە، مستەفاخان لە خوار دەستی منەوە، مامۆژن لە بەرامبەرەوە و تەلاٚ لەخوار دەستی وییەوە، سیامەند لە باریٚ بەرەوەی ژووریٚ، بەپێوە یا لەسەر ئەژنۆیان دانیشتبوو. شتەکانی دیش زۆر و کەم هەروەك دوێنیٚ شەویٚ بوو، جگە لەوەی کە

سیامەند نەیدەگوت، مستەفاخان هەروا بەردەوام قاو و قیژی بوو یا لووتی بەدەنگێکی ترسناکەوە دەیگرت؛ مامۆژن مشەمشەکەی جارانی هەروەك خۆی بەڕێوەبوو، تەلاَ سەری بەردابۆوە و دەگولّی رایەخەکەوە رامابوو، یا بە پەنجە نەخشەی نادیاری دیکەی وێنەدەکرد، یا زۆر بە ناسکییەوە بەلایەکی سەرپۆشەکەی خۆی باوەشێن دەکرد. سیامەند راستەوخۆ چاوی لە دەمی من و ئاغاوە بوو، و سۆفی ئەولکەریمیش وەك زیندانییەکی کە چاوپێکەوتنی هەبێ لە پشت پەنجەرێوە ریشی پان کردبۆوە و پێکەنینی روخسارە پانکەلّەکەی دەگەلّە وی لوول دابوو. ((دیدەوان))ی لێنەبوو بۆ ئیشێکی چووبوو.

بەو حالّەوە خۆشبەختانە یا بەد بەختانە رووداوێك هەمووی داچلّەکاندین- رووداوێکی ناخۆش، بە حیسابی سەرگەرمییە تەماشاچیان، وەك هەمیشە دەنگی سەگوەڕی سەگڕوێی گوندی لە دەوروبەری مالّێ تا دەهات تاوی دەستاند. مستەفاخان بە سیامەندی گوت ((با یەکێك بچێ بزانێ ئەو هەراو هوریایە چییە؟)) سیامەند کە راوەستابوو سەیرێکی سۆفی ئەولکەریمی کرد؛ بەلالووتییەکەوە وەلاَمی سەرنجەکەی دایەوە... لە پلیکانەکانەوە دەنگی تەپەی چەند پێیەك هات؛ مامۆژن بێداربۆوەو چاوە خەوالّووەکانی بەهەر چوارلادا گێڕان؛ سیامەند راپەڕی و رۆیی، و هاتەوە، و دووکەس بەدواوە: یەکەمیان کەلاکێك بە کۆلّێوە و ئەویدیش ((بێچوو))یێك بە باوەشێوە. کەلاك بە کۆلّەکە کەلاکەکەی لە بارێ بەرەوەی ژوورێ دانایە عەردی، و گوتی: ((سەری خان سەلامەت!)) بەلاَم ئێمە هەر چاومان لەویدی و بێچووەکە بوو.

وەشەکێك و تولّەکەی بوو- پێدەچوو تولّەیەکی چەند رۆژە بێ. کاتی هێنانەوەی ڕەوکەی بە ((سێلك))یێان کوشتبوو. مندالّەکەی بێچووەکەی بە باوەشێوە بوو و زەردەخەنەیەکی پاك و سادە و خۆشی بەدەموچاوە ئارەقاویە لەبەر هەتاو سوتاوەکەیەوە بوو زۆر بەسپایی و خۆشەویستییەوە بێچووەکەی دانایە عەردی. تولّەی تاین هەرکە گەیشتە عەردی یەکسەر بەرەو دایکەکەیەوە چوو و پڕیدایە گوانەکانی... هەمووومان تاساین؛ مامۆژن تێکڕابوو: ((دەك نەمێنم خوایە! وەی دایکت بمرێ!... مەیەلّن... مەیەلّن!)).

کوڕێژگەکە رایکرد بیگرێتەوە، تولّە دەرپەڕی؛ بەسەرنجێکی ئەو دووچاوە زیتەلّە جوانانەیەوە یەکسەر هەموو لایەکی ئەو ناوەی تاقیکردەوە و چووە بن چمکی کراسی تەلاَوە و خۆی مات کرد. چاوەکانی تەلاَ پڕ لە فرمێسك بوون. پێش ئەوەی مامۆژن بیەوێ شتێکی بلّێ تەلاَ لە



باوەشێی کردبوو و رۆیشتبوو. هەروا لەچاو تروکانێکیدا بەخۆ و بە جامە شیرێکییەوە هاتەوە، تولّەکەی لە پەنای خۆیەوە داناو جامە شیرەکەی خستە بەردەمی و تولّەکە زۆر بە هەلّپەوە دەستی بە شیر خواردنەوێ کرد. بەلاَم چۆن! بەو زمانە سوورە بچکۆلە و ئەو دەمولێوە بچکۆلانەیەوە: لوپ، لوپ، لوپ.

مامۆژن گوتی: ((ئەو کەلاکەی لابەن، گوناهە- بێچووی بەستەزمان!)) ئیدی ئەو خاو و خلیچکی و مشەمشەی نەمابوو. پیاوەکە کەلاکەکەی تاودایە. مستەفاخان گوتی: ((کەولّی کەن، بەلاَم ئاگاو لێبێ پێستەکەی بریندار نەکەن- لەلای سەریەوە بیگروون. دوایەش وەرنەوە بەخشیشەکەتان وەرگرن)). پیاوەکە لاشەکەی برد و رۆیی. تولّەکەش ئەوە هەروا خەریکە.

کە گیانلەبەرێکی جوانە! من تا هێشتا گیانلەبەری واجوانم نەدیوە: وەشەك بوو، پێستێکی زەردباو بەسەر سپیایەتیەدا، خالّ خالّی قاوەیی و گەورە، چاو زیت، سەر و کەللەیەکی جوان، گوێ گچکە، و سمێلّ سوور؛ دەموقەپۆزێکی رێك و کلکێکی گولّێنگەیی- و چنگ و نینۆك بەهێز و توانا. بیستبووم کە زۆر زوو مالّی دەبێ و لەسەردەمی پێشوودا لە جیاتی تاژییەیان بەکارهێناوە بۆ راوێ. پێستەکەیان بۆ جوانییە بە دیوارییەوە هەلّدەواسی یا دەیانکردە سەرزینی ولاَغی.

تولّەکە شیرەکەی خواردەوە و دەمولەوسی خۆی لستەوە. دوایەش لەسەر پاشووان هەلّتوتەکا، هەر راست وەك ئەو سەگانەی سەر دەسك و قەوانی گرامافۆنێ. ماوەیەك بەو چاوە زیتەلّە و جوانانەیەوە دە سەرو رووی تەلاَیەی هەلّڕوانی، ئەوجا هەردوو دەستی هاویشتنە سەر کولّەجەکەی و بە چاوێکی پڕ لە خەندەوە داوای گەمانی لێکرد. تەلاَ لەپێشدا کەوایەکەی کەمێك کێشایەوە دوایە، بەلاَم بەهاندانی مستەفاخانی دەگەلّی کەوتە گەمان: سەری دەنێو هەردوو لەپە دەستی خۆی گرت؛ تولّەکەش گوێی خۆی لێ خپ کردن و بەخۆشەویستییەکەوە کە لە چاوانییەوە دیاربوو خۆی بەناز دەکرد.

تەلاَ دەستێکی بەسەر و پشتیدا هێنا، و تولّەکە بە سینگ و بەرۆکی هەلّگەڕا؛ دوایە خزیەوە خوارێ، هەروەك سەروپشتی بە ئانیشکییەوە دابێتەوە و بە هەرچوار پەلان لەلایەکی دیکەی سینگ و بەرۆکییەوە کەوتەوە گەمان. تەلاَ دەموچاوی دەمستێ گرتبوو؛ تولّەکە نەرمەی دەستی بەلایەکی ددانی گرتبوو- هەروا بە گالّتەوە- دە حالّێکیدا کە تەلاَ وەك کەسێکی کە دەگەلّ

منداڵێکی تازە دگان هاتوودا گەمان بکات دەمولێوی تێك دەناوچاوی پێکەوە دەنان و سەر و رووی گرژ دەکرد و بەدەنگێکی ناسکەوە دەیگوت: ((وەیش وەیش وەیش!... وای لەو ددانە تیژانە! وای، خۆ دەستم کون بوو!...)) و توڵەکە خۆی بەناز دەکردەوە جاری وابوو ختووکەی دەدا، و ئەویش بەهەرچوار پەلان بەدەست و سینگ و بەرۆکیدا هەڵدەگەڕا، هەروەك منداڵێکی دوای تێربوونێ کە دەگەڵ دایکیدا گەمان بکات...

چەندە بە دارگوڵێ دەچوو... دارگوڵێش هەروابوو: ئەویش جاری وابوو ئاواخۆی رێك دێنا کە بەگاڵتەوە دەیەوێ دەستی خەڵکی بگەزێ...

دەودەمەیدا پشیلێك لە پەنجەرەیڕا هاتە ژوورێ- تەلاێ هەروەك دایکێکی کە بە منداڵەکەی بڵێ، زۆر لەسەرخۆ، گوتی: ((ئاگرە!...)) و هەر لەوکاتەوە ئەو ناوە بەسەربێچووە (وەشەك)یدا دابڕا- ((ئاگرە، سەیرکە!)) و بە پەنجە ئاماژەی بۆ پشیلەکە کرد. ئاگرە بەچاوە زیتەکانییەوە، بەبێ هیچ مەبەستێك، سەرنجی بەلای جێ پەنجەکەی ویدا سوڕاند- و پشیلەکەی دیت. هەر کە چاوی پێیکەوت لە کۆشی تەلاێیە هاتەخوارێ و بە گەردنێکی بڵند و ئاواڵێکی گەمانی دۆزیبێتەوە. بەرەولای پشیلەکەوە هەڕەشەیان لێکردبێ جلەکانی نەدڕێنێ و ئەو جەخت هەڕەشانە لەگوێ بگرێت، کەچی حەز و ئارەزووی یاری کردنی بەسەردا زاڵ بووبێ. وەك جارجارەش چاوێك بەجلەکانیدا بخشێنێ: ((وەی وەی، سەیرکە چەند جوانە!)) هەر بەو چاوە پڕ خەندانەوە، ئەوجا بەدەم گەمە و گاڵتانەوە و هەر بە هەمان پارێزیشەوە، بۆ ئەوەی بن زمانی بەرامبەرەکەی تاقیکاتەوە و بزانێ خولق و خووی چۆنە، چنگوڕکەکانی لێ بردە پێشێ- ویستی لەشی تاقیکاتەوە. پشیلەکە کشایە دواوە و خۆی کووڕ کردەوە، و دەموقەپۆزێکی ترش و تاڵی بەخۆوە گرت. بەلاێم ئەو هەر حەزی لە گەمان بوو و چووە پێشتر. پشیلەکە پیفێکی کرد و دوور کەوتەوە. ئاگرە چەند هەنگاوێکی بەدواکەوت، دوایەش کە پشیلەکە دەتاریکییەدا ونبوو بە ملکەچییەوە هاتەوە. دەهاتنەوێیدا وەك شتێکی تازەی دیبێتەوە: چرایەکەی دیت، بەرەولایەوە چوو. تەلاێ دەستەوەستان بوو: ((ئای، خۆ ئەوە خەریکە خۆ دەسوتێنێ!)) سیامەند رایکرد و چرایەکەی هەڵگرت. ئاگرە چرایەکەی تا لێوی تاقەکەی سەیرکرد، ئەوسا بێ ئەوەی سەیری کەسێك یا شتێك یا تەنانەت سەرنجێك بدات هاتەوە کۆشی تەلاێیە و کەوتەوە گەمەو گاڵتان: سەری دەبن قۆڵی دەناو دەیهێنایەوە دەرێ و چاو شارکێی دەکرد: مامۆژن دەستێکی بە بن زگە سپییەکەیدا هێنا و



زۆر بە دڵنەواییەوە لاواندییەوە. وەشەکەکە سەری بڵند کردەوە، و تێیڕاما، هەروەك منداڵێکی دەستی بێگانێکی دە کۆشی داکیدا بەرکەوێ و وابزانێ دایکیەتی. ماوەیەك هەروا تێیڕاما؛ مامۆژن گوتی: ((ئای شەیتان! ئای شەیتان!)) و زگی هەڵپشاوت. وەشەکەکە سەری بردەوە بن قۆڵی تەلاێیە، بەلاێم کتوپڕ شێوەیەکی راشکاوانەی دی بەخۆوە گرت و لە کۆشێی دەرپەڕی. بەڕوخسار و حاڵەتێکی وەك گوێ بۆ شتێك هەڵخا، دەلێواری حەسیری ژێر رایەخەکەوە راما. هەروا بەو وردی و چاوەڕێیەوە چووە پێشێ، یەك دوو چڕنووکی هاویشتن... و راوەستایەوە سیسرکە بوو.

بە توندی چەپۆکێکی بە عەردی دادا- ((ئای سەگباب!))...

پێستی وەشەکە داکانەکەیان کە گروابوو هێناو لەسەر فەرشەکەیان فڕێدا. هەر کە هێنایان ئاگرە راستبۆوە، و دەگەڵ دانانێیدا گەییە سەرێ، دەستی بەخۆ تێهەلسوینێ کرد. ژنەکان دووبارە تێکچوونەوە- هەموومان دڵگران بووین.

مامۆژن گوتی: ((دەك بمرم خوایە... منداڵی بەستەزمان! سیامەند لایبە... گوناهە؛ تەلاێبیگرە!)) پێستەیان هەڵگرت و بردیانەوە. بێچووەکە تا بەر دەرکێی پێستەکە بەڕێ کرد؛ دەنگێکی لە ئەوکێڕا وەدەرنا هەر راست دەتگوت بەرسیچکەیە (نزگرە)- لەوانەشە گریان بووبێ. تەلاێ گرتیەوە و دەکۆشێ خۆی نایەوە- یەك لەو دووانەی کە وەشەکەکەیان کوشتبوو لەسەر پلیکانەکانڕا گەڕایەوە- بەخشیشەکەی وەرگرتبوو. مستەفاخان گوتی: ((ها، چییە؟)).

لاوەکەی لاشەکەی هێنابووەوە بەدوو دڵیەوە گوتی: ((ئاغا، بە کاکە سیامەندیشم گوتووە... گۆشتەکەی زۆر چەور و نەرمە حەیفە فرێیدەینە بەرسەیان... لەوانەیە بخورێ... هەروا لە دالاێنییە- چی لێبکەین؟)) مستەفاخان بیرێکی کردەوە... دایکی گوتی: ((تا ئێستا نەمبیستووە خورابێ- دەگەڵ ئەوەشدا، قەیدی نییە؛ یەکێکی بنێرن لە مەلا عەزیزی بپرسێ)).

مستەفاخان گوتی: ((بیرێکی خراپ نییە... بۆخۆت بچۆ لە مەلا عەزیزی بپرسە...)).

پیاوەکە خەریك بوو بڕوا، کە گوتییەوە: ((یان نا، بڵێ با تا ئێرە بێ- بڵێ ئاغا گوتی هەروا بەسەرپێیەکەوە تا ئێرە بێت)).

تا مەلا عەزیز هات تەلاێ هەستا و بێچووەکەی بە باوەشێوە و چۆوە نێومالێ و دووبارە هاتەوە.

کوڵەجەیەکی مەخمەری زەردباوی لەبەر کردبوو کە کەمتاکورتێك لە پێستی پڵینگی دەچوو، بێچووە وەشەك زۆری ئەو کوڵەجە لێ خۆش دەهات: بەردەوام سەر و سینگ و لاملی خۆی دەو کوڵەجەیەوە هەڵدەسوی. قەیتانێکی سوور و زەنگوڵەیەکی زیوی بچکۆلانەشی دەگەڵ خۆی هێنابوو یەکێك لە زەنگوڵەکانی خرخاڵەکەی خۆی بوو. قەیتانەکەی لە ئەڵقەی زەنگوڵەکەی خست و هێنای بە ملیەوە کرد، تا هەموو کات و ساتێك بزانێ لە کوێیە، چونکە خۆ هەمیشە ناتوانێ هەر بە باوەشێیەوە بێ. بێچووە وەشەك سەرەتا سەیری پێهات لە دەنگەکەی دەگەڕا. دوایە خۆی ڕاوەشاند و وەك منداڵان ((پێکەنی))- ئێمەش هەموومان پێکەنین. مامۆژن گوتی: ((ئێستا کە هەر واشت کرد دەسماڵەکەشت بەرەو بەلاشەی دایکەکەیدا بێنە تابۆنی وی لە تۆ بکا، یەك دوو ڕۆژان نابا خووت پێوە دەگرێ)) تەلاّ، ئاگرەی کە، ڕانەدەوەستا دایە دەست سیامەندی و بۆخۆی بەدوای پەیسەری کەلاکێدا چووە دالانێ. هاتەوە و یاری و گەمە و گاڵتە دەستی پێکردەوە...

مەلا عەزیز هات. گوتی کە کەلاکەکەی دیوە، گیانلەبەرێکە چنگورکی هەن، هۆی بەرگرییەی هەیە. کتێب دەفەرمووێ هەر گیانلەبەرێکی هۆی بەرگرییەی هەبێ گۆشتی حەلاڵ نییە و ناشخورێ... بەڕاست! کتێبی وی و هەموو کتێبەکانی وەك ئێوی هەر گۆشتی گیانلەبەری بەستەزمانی بێ بەرگریان حەلاڵ کردووە. ڕاستیشە هەر بۆ ئەوەی نەخورێی دەبێ چنگوڕکت هەبن- ئەگەر بتەوێ نەخورێی نەشتبن دەبێ قەرزکەی.

زەنگوڵەش سەرقاڵییەك بوو... بێچووەکە دەگەڵ هەر جوولانەوەیەکی، سەری بۆ پاش و پێش و ئەولاولایانەوە دەبرد و جاری وابوو بەدوای دەنگەکەیدا، ئاوڕی بۆ دواوە دەدایەوە. هەر دەگەڵ تامی یەکەمین کلۆقەندی ڕام بوو... نوستبوو و پەلەکانی دەحەوا بڕیبوون و سەری وەڕانی تەلاّخانمێ کردبوو: هەموو کاتێك پێتوابوو هاکا وەك منداڵی شیرەخۆرە پەنجەگەورەی پێی خۆی دەگرێ و دەزاری دەنێ... سەیربوو، هەموو جوولانەوەیەکی بە ئی دارگوڵێ دەچوو- من دە تەواوی ئەو ماوەیەدا هەر خەریکی هەڵکردنەوێ جووڵە و هەڵس و کەوتەکانی بووم- و ئێستا لەپڕ پەیم بەو وێکچوونانە برد: هەمان گاڵتەبازی، هەمان سەربزێوی و هەمان چوونە دەدلانەوە... ئاخر ئەویش هەر سڵ بوو- سڵ بە مانا سروشتییەکەی، هەروەك منداڵی بەنازو نووزو خودشیرین و بێ گوێدانە ساڵ و تەمەن... ئەها...



ڕاستبۆوە... و هەنگاوێك بەولاوەترەوە پشتی خۆی کووڕ کردەوە، و هەڵ میزت. ((تف لەو سەرو رووەت، بێ ئابڕوو!)) ئەوە تەلاّبوو ((ئەوە تەریق نابییەوە!)) و بێچووەکە پێکەنی- هەر ڕاست وەك دارگوڵێ. هات و خۆی دە کوڵەجە و سینگ و بەرۆکی هەڵسووەوە. هەروەك نەبای دیبێ و نەباران و نەکارێکی خراپی کردبێ، یا خراپەیەکی دە سروشتیدا هەبێ. کەسیش ئەوەی لێ دە دڵی نەگرت. ئەویش هەرخۆی دەلا کەلەکە و سینگ و سەروکۆڵی خەڵکییەوە دەسوی و قامکێ شادەی بەلا ددانێوە دەگرت، بەلاّم نەیدەگەزی. وای لەو چاوە سامناکانە، جوان، قوڵ، ماڵی، بلێسەدار و تاریك، نەرم و ڕەق! سەیر دەکەی ورگۆکەی چۆن هەڵدەستێ و دەنیشێتەوە، چ هەناسە سوارێکە! ئەوەش هەر کچە- کچە کێوییەك. من هەموو کاتێ چاوەڕێی ئەوەم وەك دارگوڵێ ئەویش لاسای ڕەعنا خانمێ بکاتەوە یا لە پڕمەی پێکەنینێدا. پێیەکانی لێك کێشاونەوە و خۆ دەگەوزێنێ. لەپڕ بەدوای نەخشەیەکی خەیاڵیدا سەر و سینگی دەردەپەڕێنێ، هەروەك دارگوڵێ، کە وەختی فوو لە چا کردنێ بپڕمێنێ و سەر و سینگی خۆی ڕەپێش کاتە پێشێ تا چایەکە نەیسوتێنێ. ئەها، لەپڕ بەوچاوە شەیتانییە پڕ لە پێکەنینانەوە و بەو پاوپلە پیسانەیەوە، هەڵدەتووتەکی و سەری بۆ پێشەوە دەبات و دەچاوی تەلاّیە زەق دەبێتەوە: ((چیرۆکێکم بۆ وەگێڕە- توخوا، توخوا!)) — ((ئاغا توخودا سابوونێکی لۆکسم بۆ بکڕە- دەیکڕی!))، کلکە گوڵێنگەییەکەی تەپ تەپ بە فەرشەکەیدا دەدا... ئەها، گرژبوو چاوەکانی هێندەی دی ترسناکتر بوون. نازانم باوەژن چی گوت کە من نەمبیست. تەلاّ بە نووکی پەنجەی زەنگوڵەکەی وە دەنگ دێنا و ((دارگوڵ)) بێ ئیختیار سەرنجی دە کوڵەجە خاڵخاڵەکەیەوە دەدا، و تیلەچاوان دەنێڕێ...

❊ ❊ ❊

## (٢٨)

شەوێ چاك نوستم، خەونم دیت: تەلاَ دەكۆشی سیامەندیدا خۆی كروشمە كردبوو و وەك منداڵێكی كە یاری بە سینگ و بەرۆكی دایكی بكات دەباوەشێیدا راكشابوو و گەمەی بە چەناگەی دەكرد و منداڵانە دەچاویەوە رادەما و سیامەندیش دەستی بە سەروپشتیدا دێنا... تەلاَ ئاوڕی دایەوە و سەیرێكی كردم- نازانم چی بە گوێیدا چرپاند بوو... هەروەك لەو سەیركردنەم نارازی بووبێ. شەوێ چاك نوستم؛ دەنگی حەپەی سەیان و قروسكە قروسكی لە ترسان و پێ لێهەڵبڕینیانم بەشێوەیەكی نادیار و ئاڵۆزەوە دەبیست: زستانان كە گەلەگورگ روو لە شار و لادێیان دەكەن سەگەل ئاوا دەقروسكێنن و خۆ پەنا دەدەن و خۆ دەشارنەوە. پێیانوایە ئەوە نێرە وەشەكە و بەو نیوەشەوە بۆنی كەلاكێی كردووە و هاتووە. تەلاَ خانمیش دەیگوت كە هەر راست دەودەمیدا تولەكەش وەجووڵە جووڵ كەوتووە و لەجێی هاتۆتە دەرێ. سەگێكی دیش خنكێنراوە... منیش هەروا بێ ئۆقرە و ئارام بووم، دارگوڵ هاتبوو و خێراخێرا سەرەتاتكێی بوو و ئاماژەی دەكردن. ئامۆزا گوتی: ((ئەوە چییە ئامۆزا، دەڵێی بیرت زۆر جەنجاڵە، خێربێ!)) ئەمە مستەفا خان بوو كە بەدڵنیاییەوە پێكەنینی بەخێربوونێی بە پانایی دەموچاویدا بلاَوبۆوە. تازەمان نانی نیوەڕۆیە خواردبوو- ((دەگەڵ خۆت دەدوای)).

بێ گوێدانە قسەی وی وەك بابەتێكی زۆر گرینگم وەبیرهاتبێتەوە گوتم: ((ئەمڕۆ چەند شەممەیە؟)).

مستەفاخان گوتی: ((پێموایە پێنج شەممەیە، بۆ چتە؟)).

سەروسیمایەكی سەرسوڕماوی و پەشۆكاوم بەخۆوە گرت و رووم لە كاك سیامەندی كرد: ((پێموانییە!)).

((بەڵێ، ئاغا... پێنج شەممەیە)).



((سەیرە!)).

((بۆ چبووە؟)).

((یەكێك هاتووە... بەیانی سەعات (١٠)دە، هەردەبێ ببینم...)).

ئەو یەكە هەر لە تارانێوەڕا دەهات. مستەفاخان بە خەیاڵی ئەوەوە كە سێهەمی شەهریوەر لەپێشە خۆشحاڵ بوو، هەربۆیەش نارەحەت بوو دەترسا شەوێ نەگەمەوە، یا درەنگ بگەمەوە، هەرچەندە ئەگەر یەكسەریش رۆیبامایە شەوێ هەر دەگەیشتمەوە...

بە پەلە پڕوزەوە سەیرێكی سەعاتەكەمم كرد؛ سەعات یەكی دوای نیوەڕۆیە بوو: نا، پێموابێ بگەمەوە...)) بە ئەحمەدم گوت زووتر ئەسپەكان لەڕەوكەی بێنێتەوە. مستەفاخان هەستاو چووە ژوورەكەی دایكی، منیش تاوێك دوای وی چووم. مامۆژن یەكجار نارەحەت بوو: بۆ مەگەر چبووە، ئەوە قەت نەبووە سەردان، نازانم چ ناوێكی لێنێم، بڵێم بۆ ئاوردووی هاتووی، باشە خەڵكی دەڵێن چی؛ وەڵلاَ نایەڵێ- كابرای تارانێ سەری بە گۆڕێ بابی؛ ئەو هێشتا منی چاك نەدیوە، هێشتا...

بەلاَم مستەفاخان دەپێشدا وەبەرگوێی هەلاَویشتبوو... تەلاَش هات. دە سەروسیمایدا خوێندمەوە كە لەبەروەی رووم نەداوەتێ نارەحەت بوو. باشە راستیش بوو، هەرچی بێ هەر ژنە، دەیویست ئەگەر رووشی نەدەمێ هەرواى پێشاندەم كە لەلام گرینگە و دەخەیاڵمدایە. ئاگرەی بەخۆ و بە زەنگوڵەوە بەدواوە بوو... وای لەو چاوانە... منیش وا خەریكم بەدوای ئاگرەی خۆمدا دەچم...

بەلێواری چۆمیدا دەڕۆیشتین، گژ و گیای لێواری چۆمی بە شەیتانییە شنەبایەكی نەرم كە هەر تاوە نا تاوێك شتێكی بەبن گوێیدا دەچرپاندن و بەخشەخشەوە دڵداریان دەگەڵ یەكتردا دەكرد و خۆیان دێناو دەبرد و یەكتریان گڕ دەدا و دوایەش بەفیتەیی و دوو زمانییە هەمان نەرمە باوە لێك دەترازانەوە و لێكتر جودادەبوونەوە و پشتیان تێك دەكردەوە... گوڵێلكە دەو سەوزە گیایەیدا رووابوون و ئاوەكە بەنارە نارەوە بەرەو خوار دەبۆوە و مەل و باڵندەكان پێدەكەنین و دار كونكەرەش بە نووكی دەندووكێی لە دەركەی ماڵێ درەختێی دەدا و كێو سێبەرێكی خۆشی بەسەر لێڕەواریدا هەڵكێشابوو و دارستان بای باڵی خۆی دەدا و خەریكی حەسانەوێ بوو...

ئاسمان وردە وردە پەڵە پەمۆی هەوری کراوەی سوورباوی بەرەولای خۆراوایە رادەماڵی و دەوروبەری رۆژێی سوور هەڵدەگێڕا و بۆ مانگێی ئاریشت دەکرد و من تەواوی لەشم دەماچی ئەو دەمولێوە سورباوەدا سووربببوو- وەك رەنگی روخساری دارگوڵێ. دەنێو دۆڵێکیدا کە هەر تا دەهات تەنگتر دەبۆوە و ئێمەی زیاتر بەخۆوە دەگوشی. بەرەو مەبەست هەنگاوم دەنا و دەرۆیشتم- سەرو دڵ جەنجاڵ و خۆشحاڵ... هەر بەرەو تاریکی بوو؛ دووکەڵێکی مۆر ئەو دەشت و دەر و شیو و دۆڵ و لاپاڵەی داپۆشیبوو، شەماڵێکی فێنك ئەو دووکەڵەی تێکەوە دەپێچا و کەشتی خۆری بەرەو پشت کێوانەوە داژوا و خۆر بە هەردوو دەستان بە لوتکەی کێوییەوە نوسابوو- و کێو وەك گەورانێکی کە منداڵیان بە کۆڵیەوە بێ پێدەکەنی. گوتم ((ئیدی دەست لەوی هەڵناگرم)). با، قسەکانمی گەیاندە گوێی داروباری لێواری چۆمی، ئاوپێکەنی، خۆر چاوی سورکردەوە، و دارو باریش سەریان بادا...

دارودرەخت هەریەکەیان قەبارەیەکی نادیاریان بەخۆوە گرتبوو، هەر راست وەك گیانلەبەران و وادەهاتنە بەرچاوان وەك لەجێی خۆیان بجوولێن... تا دەهات قەبارەی درەختەکان لەبەرچاوان ون دەبوو و بێدەنگییەکی سامناك باڵی بەسەر لێرەواریدا کێشا. هەرتاوە ناتاوێك فڕکەی باڵی باڵندەیەك کە دیار نەبوو چییە، ئەو بێدەنگییەی دەشڵەقاند، دووبارە بێدەنگییەکی قورستر دەکەوتەوە، تا دەهات دەنگی پێی سمی ئەسپەکان دەرێیەدا زیاتر دەبوو...

دەگەڵ هەوەڵین ئەستێرەی شەوێدا گەیشتینەوە چاخانەکە: هەر کە گەیشتینەوە ئەستێرەکان لەسەربانییەوە سەریان خوارکردەوە و دارگوڵ کە لەپێش واندا هاتبووە هەیوانێ لەپێش مانگێوە گۆشەی کێشا و وەدەرکەوت.

دۆڵەکان سەریان وێك هێنابوونەوە و گوێیان بۆ نزاوگازە و پاڕانەوەی ئاوێ هەڵخستبوو، لە ترسێ وەی نەکا ئەویش دوا بەدوای گزنگی خۆرێ ون بێت و بڕوات و نەمێنێ. دارگوڵیش گوێی هەڵخستبوو، لە ترسێ وەی نەکا ئەو ئایندەیەی ویی من نەبم، یا ئەگەر بشبم هەروا رێبوارێکی سەرپێی بم... دەپازدە هەنگاوێك لەوی بەولاترەوە دابەزیم...

دەستی هەڵتەکاند. ((ئەسپەکان لە کوێ ببەستینەوە)) دەمەویست ئەو دەمەی دەگەینە یەك ئەحمەد لەوێ نەبێ.



((لەپشت چاخانێوە- تەویلە لەوێیە... هەر لەجێی جاران!)).

ئەحمەد هەر لەوێڕا ئەسپەکەی بردن. بەرەولای منەوە خزی- ئەستێرەکان لەسەرکێویەوە چاویان لێك داگرتن؛ و ئێمە واقمان وڕما- دڵی دارگوڵێ وەك بێچووە چۆلەکەیەکی کاتی فڕینێ کە لەسەردارێکی یا لەسەر گوێسەبانێکیەوە بەربووبێتەوە، ئاوای لێدەدا. هەروەك سەد ساڵ بێ یەکتریمان نەدیتبێ. ئەستێرەکان چووزانن- ئەستێرە دە چ دەگا؛ خۆ گوڵ نییە هەر بەوڕەی گەرما و شنەبایەکی سارد بژاکێ و سیس ببێ و بڕزێ... ئەستێرە ساردن، هەر ساردیشە کە دە باوەش و ئامێز لێکدانێ ناگا.

پێکەوە هاتینە هەیوانێ. هەر بە هەمان ئاوازەی یا دەوەرییەکانی پێشووەوە گوتی: ((ئاغا چوکەڵە، ماندووی؟)).

((نا، خانمە بچکۆلانەکە، کە تۆ ببینم، کێوێکیش هەڵکەنم ماندووەتیم دەحەسێتەوە)).

لەسەرجێ نوستنێکی کە لە هەیوانێی راخستبوو دانیشتین؛ جاجمێکی بە تەنافێدا دابوو و جێ نوستنەکەی لە ئەگەری رابردنێ رێبواران داپۆشیبوو. لە تەکمەوە دانیشت.

((یانی هێندەت خۆش دەوێم!)).

گوتم: ((بۆ خۆت دەزانی- نازانی!)) و دەچاوانیەوە رامام.

وەك منداڵان گوتی: ((باشە چەند؟)) و چاوە پێکەنیناوییەکانی بەدەم چاوەڕوانییەوە وێك هێنانەوە.

لێدانی دەماری لاملیم دەدیت. لەسەر ئەژنۆیان دانیشتبوو.

وەك منداڵان هەردوو چاوەکانم زەق کردنەوە و دەستەکانیم گوشین، و گوتم: ((هێــ - نـدە!)) و هەردووکمان پێکەنین.

خۆی بوو، بەو پێکەنین و سەماو بۆنە سروشتی و دەستکارانەوەی، کە هەروەك گوڵێکی بەبۆنی بەهارێ سەر لەخاك بێنێتەدەرێ و ماوەیەك بپشکوێ و دوایە لە پاڵ کێوی بخزێ و تاشێکی بێنێ و پەلك و پاڵەکانی وەبن دات و ماوەیەك بیژاکێنێ و ئێستاش ئەو بەردە بە هەر هۆیەکی دییەوە- بە بوومەلەرزە و خزینێکی دییەوە- ئەو بەردە لاچێت و ئەو گوڵە بە ئارەزووی دڵی

خۆی، و بەمێشکێکی ئاسودەوە خۆی بداتەوە بەر روناکی و شنەی شەماڵێکی فێنك و گەشە بکاتەوە. ئەمە وەسفی حاڵی هەردووکمان بوو: ساڵێك چاوەڕوانی و ساڵێك نائومێدی لەپڕ بە یەك شنە شەماڵی، ئومێدی ژیانەوە و چالاکی، رووت، هەروا لەخۆوە بەدەمی پڕ لە زەردەخەنەوە و باوەشی کردبۆوە. ئێستا رابوردوو و ئاینده له گۆڕێ نەبوون- ئایندە، ئێستا و ئێستاش ئاینده بوو... هەروەك منداڵێکی کە شان و باهوو و تەنیشتێکی گەرم و بەهێزی گەرەکە کە خۆی پێوە بلکێنێ و خۆی لێ پەنادا و وردە وردە پێ هەڵگەڕێ، ئاواخۆی دەلەشم و سەری لەبن قۆڵ و شانم هەڵدەسوی و بەدووچاوی پاك و بێگەردی گوڵەستێرەیەکی ناو گۆماوێکییەوە تەماشای دەکردم، و سەرنجەکانی دە تاڤگەی گیانمدا دەشوشتەوە و منیش وەك هەر گەورەیەکی کە دەگەڵ منداڵێکیدا یاری بکات تەسلیمی هەڵس و کەوت و جووڵە و سەرنج و حەز و داوایەکانی وی بووم. لێگەڕێ با هەرچی دەیەوێ بیکا، شەیتانییان بکات، سەرم کاتەسەرێ، تەنانەت بەدەم گەمانیشەوە باختووکەشم بدات، نقورچم لێبگرێ- ئیدی منداڵە. دەیویست دڵنیا بێ کە ئەوە خەون نییە. ئەوەی دەیبینێ گەورەیە و راستە و خەون و خەیاڵ نییە.

دەستیم گرت- گەرم گەرم بوو. هەر هەمان کراسەچیتە گوڵدارەکەی لەبەردابوو. وەك ئەوەی بزانێ یا نەزانێ وەبیر منی بێنێتەوە کە هەر هەوە و نەگۆڕاوە و گوڵەکان چۆن بوون هەروان، گوڵەکان هەروا پێدەکەنن، هەروەك دابڕانێك نەکەوتبێتە نێوانێوە و هەروەك هەمیشە پێبکەنن و من نەیانبینم و ئێستا کتوپڕ لەخەو راپەڕیبم و ببینم کە پێدەکەنن! و خودی خاوەن گوڵیش، هەروەك دارگوڵێکی دوای رێژنە بارانی بەهارێ تەڕ و تازەبوو، هەمیشە بەهاربوو و بریسکەی دەدایەوە. هەروەك جاران بوو. بەکامی دڵ خۆی تەسلیم کردبوو- تەسلیم بەلاّم گەرموگوڕ، تاڤگەی سەرکێشی و هەموو گەردیلەکانی بوونیان رەونەق دەدا و هەموو پسان و لێك دابڕان و جوداییەکانی نێوانێیان پڕ دەکردەوە و هەردوولا پەنجەرەی بوونی خۆی بەڕوومدا کردبۆوە، پرچەکانی بۆن سابونی لۆکسیان لێدەهات و شانەی خۆیشی دابووە دەست بای و ئەوی بۆ داهێنانێ سەر و پرچی درەختانی دۆڵێ هەناردبوو و با دەباوەشی دۆڵێدا پرچی درەختەکانی دادێنا و دەستی پێدادێنان و منیش بە شانەی ساردوسڕی پەنجەکانم لاساییەویم دەکردەوە. ئێستا ئیدی دووبارە ئاگری پێك گەیشتنەوەی شەیتانییە منداڵانە دەگەڵ خۆشی و شادییەدا دەستیان دەدەستی یەك نابۆوە و ئاگریان دە هەموو گیانی بەردابۆوە و رەنگی بە تەواوی سورهەڵگەڕابۆوە...



هەندێ ژن له ماچان دەگەڕێن تاچێژی ئەو ماچانە بەجێیەکی ناو مێشك و گیانی خۆیان بسپێرن: چاوان لەسەریەك دادەنێن و ماچەکە بە کوڵك و پێستەوە هەڵدەمژن تا دە گیانی خۆیانیدا- لەجێیەکی دیاریکراوی ئەو گیانەیدا هەڵگرن و بەرامبەرەکەش بێ وەلاّم دەهێڵنەوە- سەرەتای یەکتر ناسینێمان ئاوابوو. دوای ماوەیەك لەو قۆناغە تێپەڕی و کە بە یەکجاری سەقامگیر بوو ئیدی ئەوە هەر مۆری سوورکراوە بوو بە پەراوێزی بڕوانامەی بەڵێن و پەیمانانییەوە دەناو دەیویست دە دەفتەرێکی دیکەشیدا وە نووسین- راستیان گوتووە، ژن خۆشەویستییە ناکات یا ئەگەر کردی ئەوە خۆشەویستییەکەی سروشتێکی بۆن و بەرامەی دایکانەی پێوەیە. ئەو حەزی لێیە ببتە دایك. سەرەتای دەست پێکردنی دایکایەتییەی دە خۆشەویستییەدا دەبینێتەوە- و هەر لەبەر هێندێشە وا هێندە گەرم و ناسك و نەرم و نیانە. پیاو وانییە، زۆرکاتان هەست و نەست و کردارەکانی دەگەڵ هەست و نەست و کرداری گۆڵە سەیەکیدا وەك یەکە. تۆی خۆی دەوەشێنێت و دەڕوا، بێ ئەوەی ئاوڕ لە تۆوەکە بداتەوە، بێ ئەوەی گوێ بداتەوە خاوەن زەوییەکە. ئەوە هەر ژنەکەیە کە دەیگرێ، چاوەدێری دەکات، بەخێوی دەکات، پێی دەگەیەنێ- بەری ئەوینی خۆی گەورە دەکات.

گوتم: ((خۆ ئەو سابونانەی دامییەی بۆنی خورما و زەیتونیان لێدەهات کەچی تۆ بۆنی سابونی لۆکست لێدێ...!)) بەشەرمەوە پێکەنی: ((ئەوانەی ئەودەمین بۆت کڕیبووم هەرماون- لەبیرتە؟...)) و هەناسێکی هەڵکێشا.

ئەی بەستەزمان!.

دەنگی ئەحمەدی هات: ((ئاغا، خۆ ئیشێکت بە من نییە؟)).

((نا، نانەکەت بخۆ... دوایە بچۆ بنوو، ماندووی... ئالیکت داوەتە ئەسپەکان؟)).

((بەڵێ ئاغا)).

دارگوڵ هەستا و بەلای نانی ئێوارێوە چوو. چرایەکی هێنا... نانی هێنا- ماسی سوورکردبۆوە. دەیزانی حەزم لە ماسیی سوورەوە کراوە.

((کچێ ئەوە ماسیت لە کوێڕا هێناوە!)).

((له چۆمیم گرتوون)).

((بۆ خۆت؟...)).

((بەڵێ، بۆ خۆم؛ بۆ بۆخۆم چمە؟)) و هاڕژنێ پێکەنینێی بەرەڵڵا کرد. ((... ئاخر دەمزانی دێیەوە...)).

هەروا لەو خوارەوە کە دەگاتە تەنکاوێ بەری ئاوەکەم گرت، ژار ماسیم تێدا کوتا... یەك سەبەتۆکەم گرت، هەریەکی ئەهێندە گەورە!)) و وەك منداڵاَن هەردوو دەستی پانکردنەوە، بای دنیایەك خۆشەویستی و چاوەکانی وێك هێنابوونەوە، وەك گۆی خڕی زەوی کە جێی تەواوی خۆشەویستی دنیایەی تێدا دەبۆوە...

جێی ئەحمەدی لەلای سەرەوەی بانی ڕاخستبوو. ئەحمەدی نادرە سەربانی و پەیژەکەی لێکردەوە. چۆوە ژوورەکەی خۆیان؛ زۆری پێچوو، دوو دڵ مام، ناکا نەیەتەوە... دیارە هەرچووە منداڵەکەی بنوێنێ... حەکایەتێکی سەیرە! ئێستا ئەوە من لەلایەکییەوە پابەندی ئایدۆلۆژیەکیشم و دەمەوێ کۆمەڵگای بگۆڕم و دەگەڵ گەندەڵییە کۆمەڵاَیەتییەکان دەستەویەخە بیمەوە- و ئێستاش ئەوە ئاوا... بەلاَم ئەمە خراپەکاری نییە- ئەمە شتێکی سروشتییە، و خۆ ئایدۆلۆژیاش ئاینزا (مەزهەب) نییە؛ بۆ مەزهەبیش بەو هەموو هێز و توانا خۆپارێزییەی لە خراپان هێزی ڕووبەڕووبوونەوەی دەگەڵ هەستە سروشتییەکاندا هەیە؟ و هەروەك ئەوە خودی مەزهەبەکە بێ: ئەو ژنی شەرعی من بوو، هەموو دەیانزانی- هەر لە مریشك و جوجکانەوە بگرە تا بابە و ژنێ بابەی و گوڵ و مەڕ و بزنەکانیش؛ و هەمووشیان ئاگاداری ئەوین و مەرج و بەڵێن و پەیمانەکانمان بووینە- و لە ڕۆژی قیامەتێدا هەموو ئەرکی گەواهییەیان کەوتۆتە ئەستۆ... زۆری پێچوو... بەدوو دڵیەوە چووم تابەدزیەوە لە پەنجەرەیڕا سەیرێکی دیوی ژوورێ بکەم و ئەگەر هەلێکیش هەڵکەوت ئەوە ئاماژێکی بکەمێ. هێشتا نەگەیبوومە لای پەنجەرەکەوە کە دەنگە دەنگێك و دەمە قاڵییەکم هاتەگوێ...

داپیرەکەی لە قوژبنێکییەوە دانیشتبوو و زۆر بەنا بەدڵیەوە دەیخوارد. پاروێکی گەورەی دە زارە بێ پووك و ددانەکانی نابوو و هەرجارە بەلایەکیدا دەهێنا و دەیبرد؛ و هەرجارەی یەکێك لە



گوپە سیسەکانی هەڵدەدامسا. هەر ڕاست وەك دەبدەبە (میزەڵدان)یەکی ناشیرین و مڵچەمڵچەکەشی ژوورەکەی پڕ کردبوو. دارگوڵ سەرقاڵی لانکەکە بوو.

کەش و هەوای ژوورەکە تۆفانی بوو؛ یەك دەنکە ڕووناکی چییە دە نێوچەوانی پیرێژنێدا نەبوو. دارگوڵ پشت بە پەنجەرێوە دانیشتبوو و منداڵەکەی شیر دەدا. ((... کارێکی وامەکە چی ئابڕوویە بیرێژم... خودا لەو سەرەوە دەزانێ، زۆری لەسەربڕۆی پەتێ بە پەیژەکەوە هەڵدەواسم و خۆم و هەمووان دەحەسێنمەوە... من هەرگیز نەمویستووە و ئێستاش هەر نامەوێ- چ قسەت ما؟)).

((ئێستا منداڵت لێیەتی!)).

دارگوڵ بە توندییەوە گوتی: ((باشە، ئەوە هەمبوو- چدەبێ؟)).

((چ وەلاَمی خوا و پێغەمبەران دەدەیەوە؟)).

((جا بۆ من وەلاَمی خوا و پێغەمبەران بدەمەوە... ئێوە بیدەنەوە... ئێوە کەی پرسێکتان بەمن کرد؟...

خۆتان پێواتان و هەر بۆخۆشتان بڕیتان... خۆ من گوتم کە ((دەزگیران))ی ویم نەنە، کارێکی وامەکە پێی لێ هەڵبڕم و ئابڕوو ڕێژییە بکەم...)).

((ئەو عەنتیکەیە ئەگەر بیویستبایە گوڵت لەسەریدا هەر ئەودەمی لێیدەدا و نیشانەی دەکردی...)) پاڕووەکەی دەچاڵە تاریکەکەی زارییەوە ڕۆهێشت و هەروا بەدەم هاش و هوش و پف و مفەوە: ((دەیزانی دەگەڵ کێ دەستەویەخەیە... چیدیکەی لەسەربڕوا دەیکاتە پەڕۆی بێ نوێژییە!)).

((لا ئیلاهە ئیللا ڵلاَ! نە نە، گوتم هێندەی تێ مەنووسێ، دەپسێ... دوایەش پەشیمان دەبییەوە.

کارێکی وامەکە ئەوەی بەزارمدا بێت بیلێم... بەخودای یەك وشەی دیکە بلێی سەری خۆم هەڵدەگرم و ڕوو لەکێو و بیابانان دەکەم- دەڕۆم دەچمە عێراقێ...)).

مانەوەم لەوەی زیاتر بە چاك نەزانی، گەڕامەوە. زۆرم بەسەر گەڕانەوێدا نەچوو بوو كە پەیدابۆوە- پتت لیێدابایە دەتەقی-

گوتم چییە، دەڵێی زۆر تووڕە و ناڕەحەتی... دەگەڵ داپیرەتان دەمەقاڵێ بوو؟- هەروەك زۆریشی حەز بەمن نەیە؟)).

شانی هەڵتەكاند. ((گوێ مەدەیە... دیارە كە حەزی پێت نییە... باپێی نەبی- ئەوە داغ بەدڵی سەهۆڵەوە دەنێ! من ئیدی ئێستا خۆ منداڵۆكەیەك نیم؛ بۆخۆم دەزانم چبكەم باشە... ئەوەی ئەوان دەبووبیكەن كردیان- ئیدی هیچ نەماوە... گوێت لەو قسانە نەبێ...)).

وازمان لەو قسانە هێنا و هاتینەوە سەرقسەكانی خۆمان.

ساڵەها و سەدەها سەرگەردانی دەگێژاوی باو بۆرانێكی سەرمەدیدا سەرەنجام بەكۆتا هاتبوو و دوو هێزی دژ بەیەك، بەلاّم یەك ئاراستە، لە كۆتاییدا گەیبوونەوە یەك و چەخماخە لێیدابۆوە. ئەوە پەسەندیەك بوو، راگەیاندنی دۆزینەوەی سەردەمێكی تازەی رێیەكان بوو، بۆ خۆپاریزی و گەیشتن بە نوختە گەلێكی كە ئەوپەڕی سەرگەردانی و نائومێدی و ناكامییەكی بێ كۆتا بوو؛ سەرەتای هەلاّیسانی بڵێسەیەكی وا كە هێندە بەرز بێتەوە كۆتایی بە رێپێوانەكان بێنێ و بوون لە نەبوونێ رزگار كاتەوە و دەتەوەرێكیدا و دەتاكە بوونێكی ئاوێتەییدا بەرهەڵدا كات، و سوتەمەنییە دەچرای ژیان كاتەوە و بڵێسەكە خۆشتر و بەرز و دیارتركاتەوە. ئەمە پەسەندییەكی دوو لایەنەی بوونێك و سەرەتای كۆتاییەكان و درێژەییەكی سەرەتا زۆرەكان بوو و هەمدیس دەست پێكردنەوەی ناسینەوەی بوون و پەسەندییە وی و جەختلێكردنەوەی وی بوو و دەست پێكردنەوەیەكی دیكەی سەرگەردانییەكانی دی، كە سەرەنجام هەر دۆزینەوەیەك و نوختەیەكی نوێیە لە رێچكەی بووندا. ئێستا هەموو شتێكمان دۆزیبۆوە: خود و خودەكانی دیكەشمان؛ و بەرێوەبوون تا ئەو دووبوونە لێك ترازاوە، بەلاّم هەمیشە یەك و یەك گرتووە دە خودەكانی دیدا بشارینەوە؛ بسوتێین و زیندووكەینەوە؛ هەر بەو چەورییەی دیواری مۆمەكە، بڵێسەكە گەشتر راگرین و بڵێسەكانی تریش هەروەتر: ئەوە رێچكەی سروشتیی رۆینێ بوو دەرێچكە و رێی نا سادەییە رۆیشتنێدا- و ئەوە رووی دیوەكەی تری بەسەرهاتەكە بوو: خۆمان دە خودەكانی دیكەدا دیتبۆوە، كە ئیدی ئەو خودانە نەبوون كە ونمان كردبوون. ئای كە دۆزینەوەی دوای ونكردنێ خۆشە. ئەوەش دە حاڵێكیدا كە سوڕ دەمانزانی ون نەبووین، دەگەڵ



هەموو ئەمانەشدا هەروا چرا بەدەستەوە و بەرێی روناكدا كە تاریكییەكی ئەنگوستەچاو بوو بەدوای ونبووەكاندا چاومان وێك دێنانەوە، بەلاّم بەپێچەوانەی ونبووەكان هەراسان نەبووین و پێكەنینمان بەسەرگەردانییە خۆمان دەهات و قاقا و پڕمەی پێكەنینەكانمان تەتەرێك نەبوون بەرەو كۆتایی بچن و سارد و سڕ و پەشۆكاو و بێ هەواڵ و قولاّغی ونبووەكان، بگەڕێنەوە: بە سەماوە دەگەڕانەوە، دەگەڵ بوونێكیان خۆ لێك دەدا كە هەر خودی خۆمان بووین، ئەوجا بە گێژییە مە و بەلاڕێدا رۆینێ خۆیان پێدەكەنین- كە دەشیاندیت هێندە لێك نزیك بوون و هێندەش دوور رۆیشتوون تا دە یەك بووندا پێكەوە پێبكەنن، و پێكەنینیان بەخۆیان دەهات!..

بولێڵی بەیانی تازە دەهات دەنگوت. هەردەگەڵ كازیوەمدا چاوی خەوێ هەڵێنان. پیرەمانگ بە حەسرەتەوە سەیری لاوەتییە مەی دەكرد و بەداخەوە هەناسەی هەڵدەكێشان و تەمی هەناسەكەشی بەشێوەی تۆزێكی زەرد بەسەرچاوی جەنگەڵی دادەدایەوە؛ دەنگی نارەناری رووبارێ دەهات، نەرمە بایەكی فێنك لە جەنگەڵێڕا دەهات... و من لە گەرمان حەجمینم نەبوو- هەناسەم گیرابوو، هەردەتگوت مۆتەكەم بەسەر سینگییەوەیە. رابووم، مۆتەكە نەبوو، بەخت بوو- كە نوستبوو، زەردەخەنەیەكی تەنكی بەسەر لێوانەوەبوو، وەك خەونێ ببینێ- سەرلێوەكانی وردە ئارەقەیان دەردابوو، لاروومەتێكی لەبەر تریفەی مانگەشەوێوە دیاربوو. هەروەك منداڵێكی كە بەدەم یاری بەسینگ و بەرۆكی دایكییەوە پێڵووەكانی قورس بووبن و بەسەر سینگیدا پێكەوە خەو بردبێتیەوە، نەرمە پرخۆكەكی لێوە دەهات... بە نەرمەی سەرەپەنجان سەرلێوەكانیم سڕینەوە، نەمهێشت زەردەخەنەكەی سەرلێوەكانی بشێوێ و دایكانە دەستێكم بەسەر و روویدا هێنا. نەمویست هەڵیستێنم، بەلاّم هەر هەستا، چاوە جوانەكانی گێڕان و پێكەنی- هەروەك هەمیشە كە دەخەو و بێدارییەدا پێدەكەنی، پێڵووەكانی هێنان و بردن و بەزەردەخەنەوە گوتی: ((وای خودا مەرگ، ئەوە نوستبووم! ئەوە بۆ هێشتت؟)).

گوتم: ((كارێكی خراپت نەكردووە...)) و دەستیم گرت و رامكێشا... سەری بڵند كردەوە. (با)تەم و مژی مانگێی لە دۆڵێ رامالّی و چوو بەسەر و رووی ئەستێرەكانیەوە وەركرد و ئەستێرەكان كەوتنە چاوتروكاندنێ.

دارگوڵ گوتی: ((سەیركە، سەیركە... هەردەڵێی هێندەی نەماوە بەربێتەوە!)).

مانگ سەرسامانە چەناگەی دە لوتكەی كێوییەوە چەقاندبوو!...)).

((ئاە!)) هەر بەو روخسارە پاك و سەرسامیەیەوە.

((بەڵێ، ئەوە من خەریکم ختووکەی بدەم...)) ختووکەشمدا.

بەنازەوە ((ئێ ئێ، تێگەیشتم!)).

((ئەویش نازانێ بکەوێتە کوێوە... ئاگای لێ نییە کە هاوچەشنەکەی لەو وریاتر بووە و جێیەکەی گرداوە)).

پێکەنی. ((راستییەکەی... دەمەویست شتێکت لێ بپرسم- دەترسم پێت ناخۆش بێت و نارەحەت ببی...)).

روخساری راشکاوانەتر بووەوە.

((دەمەویست ئەوەت لێ بپرسم... بابە هیچ...)) و دوو دڵ مام.

((هیچ- چی؟)).

((بابە ئەو جۆرە گومانەی دەگەڵدا دەکردی- گیانەکەم!)).

بەروخسارێکی زۆر دڵنیاییانەوە سەیرێکی کردم. هەروەك روخساری لەبەر روناکاییە رۆژێدا ببینم ئاوا ((نا... بۆچی... سەرەتا ویستی لێم نزیك بێتەوە، بەڵام من هەموو شتێکم دە دەستی نا...)).

((نا!)).

((ئەڵبەتە نەوا... گاڵتەی دەکرد... دوایەش بووینە باب و کچ- تێگەیشتی؟)).

و من تێگەیشتم. ئیدی هیچی دیم نەپرسی- دەمزانی، بابە چاوی تێوەیەتی و نەیدەویست کەس سەری بکاتەسەرێ. دەرکەوت کە بە بابەی گوتووە منی خۆشدەوێ و بابەش ئامۆژگاری کردووە و پێی گوتووە، یا هەوڵیداوە تێیبگەیەنێ کە ئەو کێیە و من کێم و جێی وی لەکوێ و ئی من لە کوێیە، ئەوە ئێستا دەزانم ئەو چەند رۆژانەی کەوا پەشۆکابوو و بێجگە لە قسەی پیرێژنێ دەستگرەوەش، ئەوە بووە کە نارەحەتی کردووە، و بەمنیشی نەگوتووە چونکە زانیویەتی کە من نارەحەت دەبم و لەوانەیە دەگەڵ بابەیدا یەك و دووێکی بکەم.

سەپیدە وەك نەیلوفەرێ لەبن کەلێنی شەوێوە هاتبووە دەرێ و دەگۆلاوی ئاسمانێیدا مەلە دەکرد. لکەبەرزەکانی دار هەرمێیەکان هەریەکە مشتێ ئەستێرەی دەبن باڵی خۆیدا شاردبوونەوە و ئاسمان وەك مریشکی ماڵەخۆمان گوستاخانە راوەستابوو و دەیڕوانی، و هێندەی نەمابوو کە هەر



هاکا درەختەکان ئەستێرەکان بەرهەڵداکەن و بەسەرجێیەکەمانیان وەرکەن. کەڵەبابی چاخانەی لەتاو هەرزنی جامی ئاسمانێ بێ سرەوتانە هات و هاواری بوو، و من ئەستێرەم لە چاوەکانی دارگولێوە دەچنینەوە و پیرەمانگیش وەك هەموو پیرێژنانی دی سەرسام و واق وڕماوی ئەوەی بوو کە ئەوە ئاخرزەمانە!.

گوتی: ((دەزانی، من تەنیا یەك ئارەزووم هەیە، ئیدی هیچی دیم لە خودای ناوێ)).

((باشە، دەی خانمە بچکۆلانەکە، ئەو تاکە ئارەزووە چییە!)).

((ئاغا چووکەلانەکە، حەزم لێیە تاکە یەك منداڵم لە تۆ ببێ...)) پێکەنیم ((مەترسە، هەر بۆ خۆشم وەك گولێی بەخێو دەکەم و پێیدەگەیەنم، هیچیشم لە تۆ ناوێ...)).

((ئیدی لەو بارەیەشەوە ئاسودە و دڵنیابم!؟)).

((بەڵێ!)).

ئەو پێدەکەنی- من دە دڵی خۆمدا بیرم لە هەڵگرتنێی دەکردەوە. ((باشە، سوپاس بۆخوا هەر لە ئێستاوە وابزانە کە ئەو خۆزگە و حەز و ئارەزووەت هاتۆتەدی! هیچ نیگەرانی ئەوەی مەبە، نەك هەر منداڵێك دەیان دروست دەکەین، یەك لە یەکێ جوانتر- بەڵام ئەگەر هەموو بە تۆ بچن ئەودەمی شەڕمان دەبێ، ها!)) دووبارە پێکەنییەوە.

بەیان دەگەڵ دەنگی مەل و باڵندە و تاکە کەڵەبابی وێ ئەنگووت و دارگوڵ دە هاتوچوون و جموجۆڵێدا بوو: هەمیشە دەگەڵ کەڕی بەیانیان هەڵدەستا و هەر دەگەڵ هەستانێشیدا ئیدی ئەوە زەردەخەنە وەك جووجەڵەی پتەپت بۆکراو بەسەرلێوەکانیدا هەروا باڵەفڕە و بازەبازیان بوو: بەهار هێشتا مابووی.

((پت پت پت پت!)) هەروەك جاران مریشك و جوجەڵەکان هاتن، و بە پێچەوانەی جارانیشەوە- تاو هەڵکشی بوو و جێ و بانی خەو بینینێی کۆکردبۆوە، بەڵام خەونەکەی من هەروەك خۆی بوو- خڕی.

منیش لەجێی هاتمەدەرێ و بەشە خەندەی خۆمم وەرگرت.

لە هەیوانێ دانیشتبووین؛ بە ئەحمەدیم گوت ئەسپەکان بەرێتە دەم چۆمی و بیانبەستێتەوە.

دارگوڵ منداڵ بە باوەشێوە دانیشتبوو. بەڵام نەمدەزانی جۆری تەماشاکردنێ ئەو منداڵەم چۆنا و چۆن بوو- ئەوە هیچ کە ڕکاوی نەبوو- گوتی: ((ئەم بێنەوایە گوناهێکی نییە... خودا سەبەبکاری کوێر و زەلیل کا... بۆ من حەزم لەوەبوو!)) و دەستێکی بەسەری منداڵەدا هێنا ((خودا سەبەبکاری کوێر و زەلیل کا... دانیشتم، چاوەڕێ...)) دەستی منداڵەکەم گرت، منداڵەکە باوەشی کردەوە. وەرمگرت: ((ئافەرین، کچی چاك!)).

بەهەرحاڵ نیوێکی هەردەتگوت خۆیەتی. دارگوڵ وەك مریشکێ جوجکەلەبەر، بەسەرنجێکی پڕ میهرەبانییەوە تەماشاچی بوو.

گوتم: ((ئەرێ خۆ تۆ ناوی ئەم کچە خانومانەت پێنەگوتم!)).

((وەی... خانومانی چی! خۆ ئەوە هەر کەسێك ببینێ دەزانێ کچ نییە... کوڕە!)).

((نا، بابە!)).

((بەڵێ!)) هەروا بە هەمان چاوەگرد و سەرسام و جوانەکانیەوە.

((ناوی چییە؟)).

هەمان سەرنجە شەیتانییە کچانەکەی جارانی هاتنەوە دەچاوی و گوتی: ((ئەگەر زانیت!)) و دوای چەند ساتێك ((ئیبراهیم... بابەی ماچ کە!)).

ناوی منی لە کوڕەکەی نابوو! ناڕەحەت بووم- نەك لەو کارەی، بەڵکە لە زۆر خۆشەویستیان- و لەو لەمپەرانەی کە هاتبوونە سەر ڕێیە.

دەمەویست بارودۆخی خۆم و مەبەستی خۆمی بۆ روون کەمەوە، بەڵام دوو دڵ بووم. هەروا بە مەزەندە زانی نارەحەتم. گوتی: ((بیر لە چی دەکەیتەوە... دەڵێی نارەحەتی، وەنا؟)).

گوتم: ((بەڵێ، مەزەندەکەت راستە... بەڵێ نارەحەتم... تۆ هەر بۆخۆت دەزانی چەندم خۆشدەوێی...)) چاوەکانی گردکردنەوە. گوتی: ((یەك دەقیقە راوەستە)). منداڵەکەی تاودایە و بەڕاکە ڕاکەوە ڕۆیشت و بەسەما و خۆبادانەوە هاتەوە. لە تەکمەوە دانیشت، وردیلە وردیلە! وەك منداڵێکی بچکۆلانەی کە بیەوێ گوێ لە چیرۆکێکی خۆش و بەتام و دەهەمان کاتیشدا ترسناك رابگرێ. لەسەر ئەژنۆیان دانیشت و بە دووچاوی پڕ لە ترس و گومانەوە دەزارمەوە راما.



گوتم: ((تۆ بۆخۆت دەزانی کە دەبێ بچمەوە تارانێ، ئێستا هیچی وای بۆ سەروەختی گەڕانەوێم نەماوە- پایزێ دادەمەزرێم، مووچەی وەردەگرم... دەبێ هەربچمەوە، رەنگە جارێکی دی هەر نەشیەمەوە... بەڵام...)) سەیرێکی کردم؛ رەنگی لە رووان بڕابوو، لێوەکانی دەلەرزین، بەڵام هیچی نەدەگوت. رەنگە پێی وابووبێ ئەوە رێیە بەجێهێشتنێی خۆش دەکەم و دەڕۆم، ئیدی ناگەڕێمەوە. بەڵام من خۆم دەمزانی وەك دەڵێن رێبوارێك نەبووم دوای چەند سەعات شەکەتی و ماندوویەتی رێ و تینوو و چاوەڕێی قومە ئاوێکی سارد لادەمە سەر کانی و ئاوێکی روون و پاك و بێگەرد و دوایەش کە بەجێم هێشت بەردانی تێهاوێم، یا پیس و لیخنی کەم؛ نە ئەو کەسەشم کە بێم هەر چوار دەوری بە وشکە کەڵەکێ هەڵچنم و لەبارە سروشتییەکەی خۆی بگۆڕم- دەیزانی کە بە کوڵك و پێستەوە خۆشمدەوێ، بێ پەرژین و بێ شوورە بەند و بێ وشکە کەڵەك، بێ لێڵ و پێڵی: خۆ ئەگەر لێلیش بایە دەبوومە ((ئاو روونکەرەوە))ی و روونم دەکردەوە.

((لە مەبەستەکەم دەگەی؟)).

گوتی: ((تێدەگەم- دەزانم کە هەر دێیەوە)). ئەوەی بە دەنگێکی پچڕپچڕەوە گوت. نارەحەت بووم ((دەزانم... هەر دێیەوە!)) و هەناسێکی هەڵکێشا.

گوتم: ((دەڵێی نارەحەت بووی؟)).

((نا، نارەحەت نیم...)) و زەردەخەنەیەکی سارد و سڕ و بێ رەنگ و رووی هێنایە سەرلێوان: ((دەمزانی، هەر لە هەوەڵێوە دەمزانی... خۆزگە ملم شکابایە...)).
((بۆ؟...)).

دیسانەوە بیری بەلای هەمان پیرێژنیٚ فالٚچیدا چوو بۆوە. گوتم: ((ئەمن دەمویست ڕێیە خۆشکەم، کەچی هیچ چاکەیەکم لیٚ ناوەشێتەوە... ئەوە چت لیٚ بەسەرهاتووە!؟...)).

((نازانم، سەرم دەگێژەوە دیٚ... دلٚم تێکەلٚ دیٚ... بۆ خۆشم نازانم... ئێستا چاك دەبم...)) و خۆی هاویشتمە سەرشانی.

دەستم دە کەمەری وەرێنا: ((زانیت کە راستم کرد و چاکی بۆ چووم!؟)).

گوتی: ((نا، نا- وابیرمەکەوە!... ئەگەر تۆم بە کەسێکی خراپ دانابایە هێندەم خۆش نەدەویستی...)).

((باشە، کەواتە ئەو گرژییەت لابە...)) زەردەیەکی هێنایە سەرلێوان، بەلاٚم زەردەخەنەیەکی کالٚ و بیٚ ڕەنگ و روو و بەزۆری ((ئێستا چاکە؟)).

((بەلٚیٚ، چاك بۆوە... بەلاٚم هێندە نییە کە من دەمەویٚ... بەلٚیٚ، گوتم دەبیٚ بچمەوە تارانیٚ، و بۆ ئەوەی لەوە شت زیاتر نارەحەت نەکەم- بە کورت و کرمانجی، تۆش دەبیٚ دەگەلٚمندا بێیت... هەر لە هەوەلٚی پایزێوە دادەمەزرێم... مووچەی وەردەگرم...)).

بەسەرسامییەوە گوتی: ((دەبیٚ چبکەم؟)).

((دەبیٚ ڕەگەلٚم کەوی- ببیە هاوسەرم... تۆ لەراستیدا هەر ژنی شەرعی منی...)) هەوت بوو... گەرم داهات، سوورهەلٚگەڕا. بەچاوێکی سامناکەوە بەلاٚم شاد سەیرێکی کردمەوە و خۆی دەباوەشیٚ هاویشتم. ((بە ئوتومبێلیٚ؟)).

((ئەدی... ناتەویٚ... لە ئوتومبێلیٚ دەترسی؟...)).

((نا، تا لەگەلٚ تۆ بم لە هیچ ناترسم... کە تۆم لیٚ دووربی تەنانەت لە جووجەلٚەیەکیش دەترسێم؛ سلٚ لە سێبەری خۆم دەکەمەوە...)).

((ئەدی بۆ وا نارەحەتی؟)).

((نارەحەت نیم- گێژم... بۆخۆشم تێماوم... نازانم... نازانم چ بکەم!...)).

گوتم: ((تۆ وایدانیٚ ژنی شەرعی و سروشتی منی... تۆیان بەزۆری نەداوەتە ئەو پیاوە، مەگەر نا؟)).



گوتی: ((بەریٚ وەلٚلاٚ، بۆ نا!... لەو دەمیەوە کە لەکنیم تەنانەت سیٚ جارانی دەگەلٚدا نەنووستووم... ئۆف!)).

بەسەرهاتەکەم بەلای شۆخییەدا شکاندەوە؛ گوتم: ((ناکا لەوەی بترسی، کە نازانی چێشتیٚ لێنێی! ئەوە نەبوو ئەو ((یارۆیەت)) دەیگوت تۆ تەنانەت هێلکە و رۆنێکت پیٚ دروست ناکرێت...)).

((بە بابییەوە گوی خوارد! بۆوەی ژەهرە مارێکیش نازانم دروستکەم؛ هەموو شتێکی دەزانم- چاکیشی دەزانم... ئەو ماسییەی دوێنیٚ شەوێت خوارد، ناخۆش بوو؟)) بە روخسارێکی رەنجاوەوە ((هێلکە و رۆنێش نازانیٚ!)) و وەك وی لە خۆی کرد- بەو جوانییەیەوە- هەردەتگوت راست هەمان کچەکەی جارانە.

((باشە؟)).

((چ باشە)).

((وەلاٚم... هەرچەندە وەلاٚمیشی ناویٚ، و هەردەبیٚ بێی... بەلاٚم من چونکە ئیدی دەبیٚ وردە وردە بڕۆم... دەبیٚ قەرار و بڕیەمان دیاربیٚ- یانی هەرچۆنێك بیٚ هەردەبیٚ بێی... ئەگەر بۆ ئەوسەری دنیاش بووە، تێگەیشتی؟)).

لاویش بوونەوەرێکی سەیرە؛ جاری وایە دە رکێدا لە دڕندەی دڕندەترە و جاری واشە وەك دایکیٚ نەرمونیانە، من ئێستا وەك دایکێکی بووم کە هەرگیز نەمدەویست ئەو مندالٚەی بەدەم چارەنووسی خۆیەوە بەرهەلٚداکەم.

((من لە خودام دەویٚ... بەلاٚم...)).

((بەلاٚم چی؟ ئیدی تەواو... ئەمڕۆ چییە؟...)).

((ئێستا پەلەی مەکە، پیاوەکە ئەوڕۆش لێرەنییە)).

((زۆرچاکە... ئەوە ئێستا کچێکی چاکی! ئیدی تازە لاقان راست راکێشم، وەنا؟)).

((بەلٚیٚ... من تەنیا دەبیری تۆدام... لەلایەکەوە ئەم مندالٚە، لەلایەکی دییەوە نەنکمە (داپیر)...

خوا هەڵدەگرێ دەو تەمەنەیدا بەو حاڵ باڵەیەوە، ئە ئاواى بە تەماى خوداى بەجێ بێڵم؟ خوا هەڵناگرێ... تۆ بۆخۆت بڕیار بدە- خوا هەڵدەگرێ هەر ئاواى بەجێ بێڵم؟)).

((باشە، ئەویش بێنە. خۆ تۆ یەکێکت هەردەوێ لەو سەرى ئاگاى لە منداڵەکەت بێت. بەهەرحاڵ هێندەمان وەخت بەدەستەوە نەماوە؛ نابێ کەس قولاغى ئەو کارەمان بزانێ و بۆنێکى بکا، دەنا دیسانەوە ریسەکەمان لێدەبێتەوە خورى... ناسنامەکەت لە کوێیە؟)).

((ناسنامە!؟)) چاوى گرد کردنەوە ((ناسنامە چییە؟)).

((ناسنامە چییە... چووزانم... هەمان ئەو دەفتەرۆکەى کە مەئمور دێت... لەبیرتە کە خوشکەکەم لە دایك بوو بابەچوو دەفتەرۆکەکى بۆ وەرگرت؟- لە بیرتە یان نا، تۆ ئەودەمى نەهاتبووى)).
ناسنامەکەى خۆمم دەرێنا و پیشانمدا.

گوتى: ((ئا، تێگەیشتم- نفوس؟...)).

((بەڵێ، ئەو نفوسە... کوا لە کوێیە؟)).

((بۆ چییە... کارت پێیەتى؟... فڕێمداوە، بە کەڵکى چ دێت)) و پێکەنینێکى منداڵانەى بەدوادا کرد.

سەرەتا راچڵەکیم؛ دوایە کە کەمێکم بیرکردەوە سەیرم کرد کارێکى خراپیشى نەکردووە؛ یەك پەڕەى بێ مانا بە کەڵکى چى دێت... تا بزانێ چییە و چ نییە؟ ئەوانەى کە دەیانناسى دەیانزانى کە ئەوە دارگوڵە و ئەوانەى کە دەیاندیت هەر لە دوورەوە تێدەگەیشتن و بەبێ ناسنامەش دەیانزانى کە ئەوە لە بنەماڵەى گژ و گیا و گوڵ و کێو و بەندەنێیە... ناسنامە بۆ خەڵکى شارى باشە شەکرى پێ وەرگرن... بەکەڵکى چى وى دێت. چ خێرێکى لێ وەگیر کەوتووە- تا بێنێ دە سیمییەوە پێچێ و لەسەرتاقێى دانێ؟ منیش بامایە تا دەستم دێنا فڕێمدەدا ((وەڵلا!)) هەمان غونچەى لێو و هەمان هێڵى روخسار و هەمان ساردییە ماسولکەکانى قۆڵى، کە ساف و لووس و گۆشتن و سپى و سۆڵ و بێگەرد بوون ناو لەپیان پڕ دەکردن و دە لا ئەنگوستانیشرا دەهاتنەوە دەرێ- کەچى بێ ناسنامە.

گوتم: بەڕاستى کچێکى کەمتەرخەم و سەیرى... ئاخر من دەمەویست بەو ناسنامەیەت داواى تەلاقێت بۆ بکەم- تەلاقەکەت وەرگرمەوە)).



((وەرگرتنەوەى ناوێ- باشە ئەگەر هەر ئاوا بێ عەیبى چییە؟ هەروا بەم شێوەیە تا ئەوپەڕى دنیایەت دەگەڵ دێم؛ ئەدى بابە نەیگوت کێو و دار و بار و بەردیش هەر گەواهیە دەدەن؟... نا، دێم)).

چاوم وێك هێنانەوە و گوتم: ((بە ئوتومبێلێ؟)) بەلاَم دارگوڵ چوو بووە ژێرى.

((دیسانەوە چوویتەوە ژێرى... بیر لەچى دەکەیتەوە؟)).

((لەم پیرێژنە. تۆ بەچاکى دەزانى ئەم شتانەى دەگەڵدا باس بکەم؟)).

گوتم: ((تۆ بۆ خۆت دەزانى... خۆت باشترى دەناسى، بەهەر شێوەیەك بێت لە چوار پێنج رۆژمان زیاتر دەرفەت نەماوە. ئەمڕۆ هەینییە. واپێدەچێ مێردەکەت پێنج شەممە و هەینییەکان لەماڵ نەبێت... هەینى دادێت چۆنە؟)).

گوتى: ((باشە، من قسەم نییە... تا ئەودەمى کارێکى هەردەکەم. هات هات نەهات هیچ- دەچێتەوە لاى برایەکەى...)).

((هێندێکیشى پارە بۆ بەجێ دەهێڵین...)) هەر ئەودەمى هێندێکم پارەدایە لەکنى بێ تا ئەگەر هاتوشتێکیشى پێویست بوو ئامادەى کات، هەرچەندە هیچیشى نەدەویست. بڕیار وابوو ئەحمەد شەوى پێنج شەممە لێرە بێ و بەجۆرێك وەڕێ کەون دەگەڵ نیوەڕۆیە لەسەرجادەى بن... ئێستاکە بڕیارى هەڵگرتنێم دابوو ترسێکم تێگەڕا؛ ئەویش هەر پەشۆکا بوو. لەوشتانە دەترسا کە من لە بارەى تارانێوەم پێ گوتبوو: لە خانووى گەورەى بەبەرد دروستکراو! لە بەرد و خشت... چەند نهۆم... ئۆى، بەڕاستى ترسناك بوو! ئەدى دەبێ خەڵکەکەى چۆن بژین جا ژیان دەگەڵ بەردوخشتان دەچتە سەرێ... بێ دار، بێ درەخت!... کە ترسناکە... چاوەکانى لە ترسان گرمۆڵە کردبوون و روخسارێکى ترسناك، بەلاَم شادى بەخۆوە گرتبوو- بەلاَم من- هەرچەند جارێکى کە دوو دڵیەکى نادیار چنگى دە هەناوى دەنام ئەو هەموو خەون و پێك گەیشتنانەى پێشووى لە رەونەق و درەوشانەوە دەخست- هەرچەندە ویستەکانى دڵ و دەروون هەروا کەف و کوڵیان بوو و رووبارى شادى هێشتا دەناخمدا قولپى دەدا... و هەر دەجوولاَمەوە ئیدى ئەوە پڕمەى پێکەنینەکەیم دەهاتەوە گوێ و خەونەکان دەرۆیشتن و دووبارە دەهاتنەوە و دەشت و گوڵ و سەبزە زار و تاڤگەکانیان دەگەڵ خۆدا دێنایەوە. دەنگى هاژە هاژى تاڤگەم دەگوێیدا هاشەى بوو، گوێم دەزرینگایەوە، دارگوڵ لەبەرەوەى تاڤگەى دانیشتبوو و چاوەڕێى دەکردم، وردیلە وردیلە، پاك و بێگەرد، و جوان بەخۆ و بەچاوە شەیتانییە زیتەڵەکانیەوە و بەو هەموو

لاوەتی و ئەو دەنکە مروارییانەیەوە کە تاڤگەی پێکەنینەکەی بەسەر پێڵووەکانی وەرکردبوون... خۆی بوو، ئیدی تاریك و روونییە پێکەنینەکەی دیار نەبوو، هانکە هانکی هەناسەم زەنگی زەنگوڵەی خەندەکانی رەونەق دابوونەوە و ئەویش بەداغی لێوەکانی پەناگوێ و سەرسینگمی بەنیشانەی ((بیرەوەری))یەوە داغ دەکردن، تا ئەم جارە هەرگیز لە بیری نەکەمەوە، کە چاوەڕێتە... بەلاّم هەمدیس دوو دڵی...

ناکا لەبەروەی کە نەخوێندەوارە نارەحەت بی؟ بۆ تۆ ئەوت بە خاتری خوێندەواریەوە خۆشدەویست؟ یا رەنگە ئێستا کە دەزانی و دڵنیایی کەماڵی خۆتە و تازە ئەوت دەتاقیٚ ناوە دڵت ئاسوودەیە؟... یان ناکا ویستبێتت شتێك بیٚ کە ئێستا نییە؟... پێت شەرمە دەگەڵ ئاشنا و رۆشنا و ئاواڵەکانتدا تێکەڵ بێت؟- دڵم دەیگوت نا؛ من حەزم لەو شتانە نییە کە دەیانڵێی، و قەتیشم حەز لێنەبووە؛ من ئەوم دەویست، هەرخودی خۆی، هەر راست بەو روخسارو بەوحاڵ و جووڵە و رەفتار و هەڵسوکەوتەیەوە.

ئەودەمی نەمدەزانی — رەنگە ئەوە هەر دەرهاویشتەی ئەوانە بێت- کە دە ژیانی دوایەی لەمەوپاشدا وێستگەێیکی دیکەش سەرهەڵدەدەن و پەیدا دەبن؛ بەلاّم من ئەم روخسارەم بەهەمان ئاواز و بەهەمان جموجۆڵی، لەش و بەهەمان کەف و کوڵی گیانیەوە خۆشدەویست. ئەوشتەی کە خۆم دەمەویست لێی دروستکەم هێشتا نەمدیبۆوە و نەمدەزانی و تا ئەوجێیەش کە سەرنج و هەستەکانم رێیان دەدا پەیم پێنە دەبرد. بەلای منەوە ئەو لەم لایەنەوە و بەو کایە و مایەی ئێستایەوە هەرچی هەبوو زیندوو و گیاندار و گیانبەخش بوو. بە جلوبەرگی مۆدە و قسەی خوێندەوارانەوە لەوانەبوو شتێکی سەیری لێدەرچووبایە، شتێکی وەك هەندیٚ لە رۆشنبیرانی ئەم سەردەمە کە بەسەر و کەللەیەکی رۆشنبیرانەوە گوایە لاساییە (رۆژئاواییانە) ریشیٚ دەهێڵنەوە و نەعلی بەسەرپێوە دەکەن... تا وەخۆهاتمەوە بووە شەو بەدەنگ ئەو ((مووچ))ەی دارگوڵێوە چووم کە منی پیٚ بانگ کردەوە ژووریٚ... سەرەنجام، ئاسمان چرای نوستنێی هەڵکرد و وردە وردە تارای رەشی شەویٚ باڵی بەسەر کێو و دۆڵ و لاپاڵ و لێڕەوارانـدا هەڵکێشا. بەرەبەری بەیانی بوو. کێو هەروا دەبیر و خەیالاّنەوە چووبوو؛ بای خستبوو، دارستان خۆی دەخوراند و رووبار وەك منداڵێکی دایکی کردبێتە خەو و بۆ خۆی بەئاگا بێت، سەرگوزەشتەی بۆخۆی دەگێڕایەوە و منیش گوێم بۆ ئەو سەرگوزەشتە شیرین و خۆشە هەڵخستبوو...

هەمیشە چێژ لەو دەنگەی وەردەگرم؛ دەنگەکەی خۆشترین بیرەوەرییەکانم دێنێتەوە یاد و شیرینتر دەگەڵ شیرینترینـدا تێکەڵ دەکات و هەر بۆخۆشی بەهەمان جووڵەکانی جارانییەوە، وەك رابەری ئۆرکێستراییەك. بەچاو و برۆ و دەمولێو بادانێوە، رستەگەلێکی مۆسیقا لێرە و لەوێی کەناری گیانمدا کۆدەکاتەوە و ئەوانە دەپارچە مۆسیقایەکی هارمۆنیك و خۆشدا، لێدەدا و گیانم بەو ئاوازی مۆسیقایە باڵ دەگریٚ. بەلاّم بەپێچەوانەی مۆسیقا ژەنەکە، کاتیٚ کە پارچە مۆسیقایەکە تەواو دەبیٚ نایەم لە هارمۆنی و هەماواییە توخمەکانی گیانی خۆم و چۆنیەتی ژەنینی پارچە مۆسیقایەکەوە رامێنم و لێی وردببمەوە و خۆم بەکاریگەرییە مەستانەییەکەی بسپێرم. هەروەك پارچە مۆسیقایەکە ناتەواو بیٚ ئارامم لێهەڵدەگیریٚ و بۆ بیستنی پاشماوەکەی هەروا بیٚ ئارام و سرەوتم، چونکە تەواوی گیانم دەگەڵ ئامێری مۆسیقایەکەیدا تێکەڵە، دەگەڵ هەموو توخمێکی دیکەی دەرەکی دەوروبەردا ناکۆکم و هەر راست وەك جاران، کاتیٚ کە ئەو پڕمە پڕم پێدەکەنی و باوەژن لە رکان پیاڵە و ژێرپیاڵەی پێکدادەدان و بابەی لەوەنەوز دەکرد و منێکی کە بەوی هاتبوومەوە سەرخۆ خۆی لیٚ نەبان دەکردم، و خۆی بێرو بەوێدا دەدا... ئەودەمی بابە سەرنجێکی وای دەگرتە باوەژنیٚ پێتوابوو کە هەرچی گەرمییە سەماوەرێیە هێناویەتی و بەدەموچاویدا کردووە، و ئەوە دارگوڵێش هەروا خەریکی مۆسیقای خۆیەتی و لەپڕمەی پێکەنینیٚ دەدا- و من چاوەڕێی ئەو پڕمەی پێکەنینە بووم تا هەیوانی چاخانیٚ بەکێو و لێڕەوارەوە بکاتە بە هەشتێك کە گیانی وی بوو... جۆرێکی وابوو وەك بەیەك جووڵەی کتوپڕ کەوتبینەوە ناوەندی سەرەتای دروستبوونێمانەوە، لەرێی سارد و سۆڵەی ژیانەوە بەرەو داستانی کۆن و بیٚ ئاکامی خۆمان هاتبووینەوە و دە بازنەیەکی نەرم و نورانیدا، گێژ و وێژ و شەیدا، بەدەوری یەکتریدا دەخولاینەوە... نە دەنگێك، نەکۆت و بەندێك، نەگوشارێك، دوور لە هەموو شتێك، بە پەلە تێدەپەڕین و دەڕۆیشتین و جیهانیش ئارام و بیٚ هەست و خوست بوو و کێو بەپێوە چەقیبوو و ئێمەش دەو بێدەنگی و خامۆشی و ئارامییەیدا، ژاوە ژاوی سروود، و نارەناری ستایش و سرتەی ئەویندارانەیمان دەبیست و پەلەی زیاترمان دەکرد و بەرەو ناکۆتاییەوە دەچووین- ئەو هەروەك خۆی کچ بوو و دولبەر و دڵبەر، و من هەروا شەیدا و خوازیار- هەرچی هەبوو دڵپەسەند بوو و منیش خوازیاری بووم. پاکی و کچێنییەکەی بەشێکی سروشتیی وی بوون و من بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەوەی تێپەڕیبوو بیٚ ئۆقرەو ئارام بووم و ئەو بەگوناهی بیٚ گوناهییەوە لە من بیٚ ئارامتر. درەوشانەوەی لەش و جوانییە گیانیم دەدیت- و دەبیست، جا باشە دەکرا نەیبینم؟ هەموو گیانم چاو و لووت و گویٚ بوو. کانییەکە لەوەی روونتر بوو کە دەهاتە بەرچاوان. پێم وابیٚ ئەستێرەکانیش ئێمەیان دەدیت کە بەنێویاندا دەڕۆیشتین- دەیاندیت و دەشیانبیست و هەرئەوەش بوو کە بە هەزاران چاو هەموو گەردیلەیەکی لەشیان لە چەند هەنگاوێکی ئەولاترەوەی مانگەوە لەبن تارای تەمومژێوە کە دەردەکەوت سەیر

دەکرد- دەیانەویست بەگەرمییە وی خۆ گەرم کەنەوە- ئاخر ئەو گەرمی و رووناکییە دنیایەکی دیکەبوون کە ئەو دەگیانی خۆیدا کۆی کردبوونەوە و بەندی کردبوون و ئەوە ئێستا شەپۆل شەپۆل ئازاد دەبوون... و هەموو دەیاندیت و هەستیان پێدەکرد... من دە تەواوی ژیاندا هێندەی ئەو دوو شەوەی نەژیاوم. ئەو دوو شەوەم لە ژیانی دەربێننەوە هیچم بۆ نامێنێتەوە. بێ چاوی و جوانترین و پاکترین ئەوینێك بووە کە بوومە. نە مەکە و لاچۆیەك، نە تورە بوونێك. نە چەپۆکێك، ... هیچ شتێك لەوان دڵ شکانانەی کە دە ئەوین و ئەویندارییە دان- هیچ کامێکیانم لەوانە نە بە وێك کەوتن و نە بە خەیاڵ هەستنەکردووە. ئەو زۆر بە ئەدەبانەی دەگەڵەمندا رەفتار دەکرد و منیش هەروەتر زۆر بە ئەدەبانەم دەگەڵە ویدا رەفتار دەکرد- نەوەك ئەوەی کە کەسێك دەگەڵ خزمەتکارەکەیدا رەفتار بکات. نا، هەروەك یەك هاوشێوە؛ هەرچەندە ئەوەش چ مانایەکی نییە، چونکە مرۆڤ کاتێ کە ئەویندارە، کاتێ هێزە ناسك و نەرمونیانەکانی دەزگای بوونەوەریەی ئازاد دەبن ملکەچ و خاکەساری هەمووانە، ئیدی دڵدارەکەی جێی خۆی هەیە... بە ئەدەبی ئەویندارێکی پابەندەوە رەفتارم دەگەڵدا دەکرد؛ رەفتارێکی خۆش، دۆستانە، خاکەسارانە. هیچ کەسی لە خۆی جوانتر نەبوو، جا چ لە خواردنێ یا دەنوستنێ، یا دەدەمی پێکەنینێدا- دە هەموو شتێکیدا... بەلاّم بە قسەی خەڵکی مە کەوتۆتە نێو گندۆران؟ لەسەر درەختێکی دەم جۆیە، کوندێکی سەرگەردان، دەیخوێند. دارگوڵ لە پڕێکەوە لەو ئاسمانەیڕا هاتەوە سەرزەوی؛ بە ترسێکەوە گوێی هەڵخست: ((ها، چ بوو؟)) و دەستەوەستان ما. رەنگە هێشتا هەردەنێو پەنجەی قسەکانی ژنە فاڵچیەکەدا بێت. بێ سەرپۆش لەجێی دەرپەڕی و بە پێخواستی رایکردە سەر رێیە؛ داهاتەوە، هەر راست وەك یەکەم رۆژی چاوپێك کەوتنێمان- ئەو دە حەسارێدا و من دە پەنجەرەیدا... خڕکە بەردێکی هەڵگرتەوە و بە جوان چاکییەوە هەروەك کچە ژومناستیکییەکی گۆڕەپانی بەریکانێ، بە ئاهەنگی پیانۆی سروشتییەوە، بەرەو لای کوندەیەوە هاویشت. مانگ کە ئاگای لەو بەسەرهاتە بوو تووڵێکی سپی شیر رەنگی بەسەر رووی خۆیدادا؛ گا بەردی لوتکەی کێوی برۆی تێکنان... دارستان کەوتە هەناسە هەڵکێشانێ، ئەستێرەکان چاویان زەق کردنەوە، کوندەکە لە شەققەی بالاّنی دا و دوورکەوتەوە، کەڵەباب هەواڵی دایەشیو و دۆلاّن، ئەویش بەڕاکە ڕاکەوە هاتەوە، منیش باوەشم بۆ منداڵە ترساوەکەم کردەوە...

لەوەی زیاتر هیچ شتێك ئارامییە مەی نەشێواند؛ بەلاّم ئەم شێواویەش شتێکی کەم نەبوو- هەروەك ئەو دایکە حەوا بێت و کوند پەیامی هێنابێ، پەیامێکی شووم کە: ((لە بەهەشتێ وەدەرکەوەو برۆ!))... پیاوەکەی هاتەوە... هاتەوە و دووبارە گەڕایەوە سەرکارەکەی... کێلگەیەك لەو نزیکانەوە



هەبوو. پێنج شەممە و جومعان بەرۆژ دەچووە وێ. پیاوێکی مەیانە ساڵ بوو، رەش داگەڕاو و دەموچاو چرچ و لۆچاوی و لەبەرتاو سووتاو و گرژ... لەراستیدا ماندووی ژیان، کە ئەو هەموو نیشانانەی دە سەر و روویدا وەدەرخستبوون. هەر لە یەکەم ساتەوە هەرچی چرچ و لۆچ و خەت و خوار و خێچی و جوانی و کرێتییە دەموچاوی هەیە، هەموویم دەمێشکیدا چەسپی. دەبوو واخۆ نیشاندەم کە رێبوارێکم و چام خواردۆتەوە و خەریکم دەڕۆم، هەرچەندە ئێستاش چاخانەکە بەشێوەیەکی فەرمی نەکرابۆوە- پیاوەکە زووتر هاتبوو، ئەوانیدی دوو سێ رۆژ زیاتر نەبوو هاتبوون... رۆیشتم.

ئەسپەکە دەڕۆیی و من دڵم بەلای ئەوەوە بوو؛ جگە لە ئێستا، دە هەفتەی ئایندەمەوە دەڕوانی، ئێستا ئەو ئەوە نزیکە واناخم دەهاڕێ، دڵم رادەکێشێ و تادێ تینی زیاتری تێدەکا... گەڕامەوە. راوەستابوو، هەوت و سەرسام... رایکردە پێشێم- دابەزیم. بە ئەحمەدم گوت ئەسپەکان جڵەوکێش کات من بەپێیان دەیگەمێ. دەستم راداشت و دەستیم گرت و چاوم دەچاویەوە بڕی و هەناسەیەکم هەڵکێشا... ((پێنج شەممە ئەحمەدی دەنێرم...)).

ئەحمەدم بەدەست هەڵتەکاندنێوە بانگ کردەوە. ناتوانم روخساری دارگوڵێ باس بکەم. ساتەکانی لێك دابڕانێ هەمیشە دەردناکن؛ بەلاّم ئەمەیان دەردناکترینیان بوو. وەبیرم دێ جارێکی هەروا دەسەفەرێکیدا لە هەیوانی چاخانێکی دانیشتبووم؛ مریشکێك و چەند جووجەڵەیەك لە پێش هەیوانێ پێپڕکەیان دەکرد؛ لۆرییەکی گەورەی قورس هات و بەناو جوجەڵەکاندا تێپەڕی، تا لەبەر هەیوانەکە راوەستێ. بای تایەکانی یەکێك لە جوجکەکانی وەبن تایەیەکیەوەدا. جوجکەکە پان و پڵیش بۆوە: تایەکەی بەسەردا رۆیشت؛ جوجکەکە سەرێکی بەرز کردەوە، هەردوو چاوەکانی دەرپەڕاندن و بەسیمایەکی سەراپا سەرسامییەوە، هەروەك بیەوێ ئەوەندە تەمەنەی ماویەتی تەواوی دنیایە هەموو پێکەوە دەمێشکی خۆیدا تۆمار کات و ئەوجا بمرێ. هەروەك دوو نوختەی سوورپێڵووی چاوەکانی بەسەریەکدا دابن و ملی لاربۆوە. حاڵەتی چاوەکانی دارگوڵێش دەدەمی دوورکەوتنەوێمدا؛ وێنەیەکی لەم جۆرەی بەبیرداهێنامەوە... بۆ هەینی دەهات!... سەرگەردان و دەستەوەستان مابوومەوە؛ نەمدەزانی چ دەخۆم و چۆن بیردەکەمەوە گێژ و وێژ بووم؛ هەر ئەوەندەم دەزانی کە پەتی چارەنووسم تا دێ لەملی قایم و توندتر دەبێ و جاڵجاڵۆکەی چارەنووسم تادێ زیاتر لە تەونە نادیارەکەی خۆیەوە دەپێچێ... و من بە مێشکێکی پەرتەوە هەمیشە چاوەڕێی دوایین تاڵی ئەو تەونەم... دەستەو ئەژنۆ دانیشتووم و چاوەڕێم. دیسانەوە هەروەك هەوەڵین رۆژەکانی یەکتر دیتنێمان، گێژ و وێژ و مێشك بەتاڵم؛ وەلاّمی پێچەوانەی پرسیارەکان دەدەمەوە و هەر لەخۆوە گەرم دادێم و ئارەقەی دەکەمەوە، و

سەرقاڵی و گرفتارییەگەرانەوێ تارانێم دەکەمە بیانووی هەموو ئەمانە. بابەش هەرگێژ بووە: ناکا پێی وابێ خوازبێنییە تەلاَیەم کردبێت و ڕەتیان کردبێتەوە- بەلاَم خۆ ڕێ و ڕەسمیش نییە جحێلۆکە بۆخۆ بچنە خوازبێنییە بۆخۆیان!... دەڵێی تووشی نەخۆشییە دەروونییە بووم...

هەستی تەنیاییەکی سەیرم دەکرد! وەك سەد ساڵ بێ دەگەڵە ویدا ژیابم، خۆمم لە ماڵێ بە غەریب و بێگانە دەهاتە بەرچاوان- تەنیا، و تەنیای تەنیا. ماڵەکە چۆڵ بوو، لێواو لێو بێدەنگی، هەر ڕاست بەپێچەوانەی دڵمەوە کە بەتاڵ و پڕ لە شەپۆل و گێژەن و بێ ئارامی بوو، و بەردەوامیش مستی لە چوار دیواری ژوورەکەی دەدا و خەریك بوو دەرگایەکەی لەرێسمە دەبرد. ساتەوەختەکانی شەوێ وەك مۆتەکە خۆیان بە سینگمەوە مات دەکرد و خەویان لێ دەزڕاندم. ئەو سات و دەقیقانە هەروەك لەشکری مێرووان دەگۆڕستانی بوونمدا بە کۆڵەبارێکی پارچەکانی گیانمەوە دەهاتن و دەچوون و منی مردووش، هەروا رووتتر و قورس و سەنگینتر لە جاران دەمامەوە و ئارەقەم دەکردەوە... بەردەوام چاوم دە پەنجەرێوە بوو و سانییە ژمێریم دەکرد کە داخواکەی ئەم تاریکییە دەڕەوێتەوە و کازیوە دەردەکەوێ. خەوم ئاڵۆز و پەرت و پەرێشان بوو. جاری وا بەو خەیاڵەوە کە ئەوە لە تەکمەوە نوستووە لە خەوێ رادەچڵەکیم؛ لەپێشدا گوێم لە دەنگی ببوو و دیتبووم و دەمزانی کە لەسەر سینەم دەگەوزێ: ((تۆش گوناهت نەبوو؛ تۆ پێتوابوو من هەمیشە لێرەم، هەرکاتێ بتەوێ ئی تۆم- هەروا بە موفت و خۆڕاییی!)) و خەندە.

((بەداخەوەم؛ بۆ خۆشت دەزانی- منیشیان هەڵخەڵەتاند...)).

((داخەکەت پەیوەندی بەخۆتەوەیە... ئەدی من دەونێوەیدا چی؟)).

((بۆ من و تۆشی هەیە؟)) و بە قەڵەمی ماچان ((من)) و ((تۆ))مان لەسەر روومەتی یەکتر دەنووسی. ((ئەگەر پێتوایە من کەمتەرخەم و گوناهبارم ئەوە بمبەخشە...)) و ئەویش کە منی دە نێوان دوو لێوەکانیدا بوو بە ماچێکی دووروودرێژی خۆم بەخۆم بەخشی... چاوەکانیشی لەسەریەك دانابوون یانی باشە، ئەوە چاوپۆشیم لە گوناهەکەت کرد. بەلاَم من پێنەزانانە بەخشندەگییەکەی ویم ڕەت کردەوە و دامەوە: ئەویش بە گەورەییە خۆی کە نەك هەر ناڕەحەت نەبوو خۆشحاڵیش بوو؛ پێکەنی، هەروەك گەورەترین و بەرێزترین شتێکی ئەم دنیایەی لەلا دانابم و پێی سپاردبم و دوای سالاَنێکی دووروودرێژ بەبێ دەسکاری وێمدابێتەوە- ساغ و سەلیم، وەکو خۆی، بێ دەسکاری.



رووم بەرەو ئایندە و بیریشم لە دوێنێی دەڕوانییەوە و خود راستیی خۆم، بە هەموو بیر و هۆشمەوە وەك جووجەڵەی دەستەمۆ، بە باڵەفڕکەوە بەرەو هەیوانی چاخانەکەوە راکە راکەمان بوو تا ڕۆژانەکەی خۆمان وەرگرین...

بابە بە پەلە هاتەوە، گوتی ژوورەکەی من و ژوورەکەی خۆی ئامادەکەن و قەرەوێلاَنی لێدانێن- منداڵەکان بچنە خوارێ. کە سەرسامییە منی دیت گوتی کە دوو کەس لە خزمان — کاندیدای هەڵبژاردنێ- هاتوون و چەند ڕۆژێکان لێرە دەبن و هەمدیس گوتییەوە: ((ئەم چەند ڕۆژانەی کە لێرە دەمێننەوە هەولدە هەر لێرە بی، لەڕووی ئەمانە دادەمێنم؛ من بۆ خۆم ئیداریم، ناتوانم لە دوایانەوە بڕۆم، تۆ هەولدە ئەو چەند ڕۆژانە کە لێرەن هەر لێرە بی...)) و من سێ سبەی دەبوو دەگەڵ دارگوڵێدا وەڕێ کەوتبام! هێندێکم منە من کرد، بابە نارەحەت بوو، بە خەیاڵی وەی کە من کاری حیزبیم هەیە بە دەموچاوێکی سوورهەڵگەڕاوەوە گوتی: ((خۆ کفر نابێ، یەك دوو ڕۆژان لەجیاتی کارەکانی هاوڕێ ستالینی بەکارەکانی مە، رابگە- ئێمەش هەقێکمان هەیە، براله!)).

ئەلحوکمولیللا... پێنج شەممە هات ئەحمەدم نەنارد هەینی هات میوان هەر مانەوە و من بەو خەیاڵەوە کە دە هەردەمو سەعاتێکیدا ڕەنگە بڕۆن و یەخەمان بەردەن چاوەڕوان مام، هەرچەندە ئەحمەدیش بێکار نەبوو. دەبوو ئەسپەکانمان ناڵ و ئەو جۆرەشتانە کردبان، چونکە جەنابی میوانان سەردانێ ئەرباب و کاربەدەستان و گەورە پیاوانی ناوچەکەیان دەکرد و گەورە پیاوانی ناوچەکەش هەموو لە گوندان بوون و بۆ چوونە گوندانیش لە ئەسپان زیاتر هیچی دی نەبوو پێ بچن... ئەسپەکانیش هەردوو سێیەك بوون. بەڵێ پێنج شەممە تێپەڕییەوە و هەینی هاتەوە و میوانەکان هەروا ماونەوە. بەیانی ڕۆژی یەك شەممە یا دووشەممە بوو، لەسەرجادەی بووم، لە دوورەوە لەبەر دوکانێ سۆفی عەزیزی پینەدۆز روخسارێکی وەك مێردەکەی دارگوڵێم دیت. بەدیتنی وی دڵم داخورپا- نەمزانی بۆ. بێ ئیختیار بەلایەوە چووم. چوومە دوکانێ ئەکبەراغای کە هاوسێی دوکانێ سۆفی عەزیزی بوو، چاك و چۆنیم دەگەڵ ئەکبەراغایدا کرد و لە حوسێنی کوڕیم پرسی. ئەوجا هەر کە پیاوە لادێییەکەی لای کردەوە، هەروەك بەرێکەوت بێ، سەیرێکیم کرد- خۆی بوو، بە تەنکە ریشێکەوە و لە جارانیش گرژتر. سلاَوی کرد؛ هەواڵی منداڵەکانیم پرسی. گوتی: ((لە سایەی سەری ئێوەوە)).
گوتم: ((دارگوڵ چۆنە؟ زەحمەتیشماندا؟)).
پیاوەکە چاوەکانی بەردانەوە و بەروخسارێکی زۆر غەماوییەوە گوتی: ((قەزا و بەلاَی ئێوەی برد!)).
((گوتت...؟)).

((بەڵێ، ژانی کرد، قەزاو بەلاّی ئێوەی برد!)).

زۆر بەسادەییەوە!... بەپێچەوانەی شوێنانی دیکەی جیهانەوە کە مردنیان لا گەورەترین و سەرسوڕهێنەرترین پەدیدەی ژیانە، کەچی ئەوەتا لێرە ساف و سادە باوەڕیان وایە کە مردنیش- هەر بەشێکی دیکەی ژیانە، هەموو رۆژێی دەبینن؛ جا هەر رۆژەی بەهۆیەکەوە کە چ جیاوازییەکی دەگەڵ هۆی رۆژەکانی پێشووتردا نییە: هەژاری، نەخۆشی، رووبەڕوو بوونەوە دەگەڵ ((دەوڵەت))ێ، لە داردانی دەوڵەتێ، هەرای ژن و مێردان، هەرا لەسەر نۆرە ئاوێ... و دەگەڵ ئەوەشدا کە مەرگ زیاتر بەشێوەی چاوەڕوان نەکراو دەردەکەوت و ئەو هەموو هەوڵ و تەقەللا و کۆششەش بەهیچ دەچوو کە لێی غافڵگیر نەدەبووین تا نەقەومێ کەچی هەر دەقەوما و مەرگ هەر دەهات... بەڵێ، ژانی کرد، و قەزاو بەلاّی ئێوەی برد- هەر ئەوەندە و هیچی دی!.

ئاوازێکی سادەو ئارامی قسەکە نە دەگەڵ گەورەییە رووداوەکەی و نە دەگەڵ توندییە ئەو تەکانەی گیانمی وەلەرزە ئێخست، نە بە قەدراییە سەر و سەکوت و چڵمنیە خودی ئەویش- دەگەڵ هیچیاندا نەدەهاتەوە. هەروەك کێوی ئارباباییان بە کەللەی دادابم کتوپڕ فرمێسکم هیچی تێدا نەما و وەك بڵێی بە پەمپێکی هەرچی تەڕاییە لەشم هەیە مژیبێتیان لەجێی خۆم وشکەوە بووم و رەق هەلاّتم؛ سەرم دەگێژەوە هات، ناودەمم بووە ژەهرەمار... بێ ئیختیار خۆم هاویشتە سەر لاتەختەکەی بۆیاغی ئەکبەراغای...

نازانم چەند لەوێ بووم، هەر هێندەی دەزانم کە شەلاّڵی ئارەقەی ببووم، و ئەکبەراغا ئاوی هێنابوو و زوو زوو دەیگوت: ((حاڵتان باشتر بوو؟)).

هەر کە توانای رۆینێم دە خۆمدا هەستکرد لەپێشدا چوومە سۆراغێ دایە گەورەی: زانیبووی و بەچاوە کوێرەکانیەوە فرمێسکی دادەباراندن. هەرچی تاڵ و سوێری و غەم و کەسەرێکی دەدڵمدا بوو هەموویم بەوی رشت، هاتمەوە ماڵێ- راستییەکەی نازانم چم گوت و چم کرد، هەر ئەوەندەی دەزانم کە باوەژن وەك پەیکەری پیاوێکی کارتۆنی، بەڕوویەکی سیسەوە، راوەستابوو و لەجێی خۆی نەدەجوولاّ و منداڵەکانیش پڕ بە ماڵێ دەگریان و دەیان زریکاند- تا سەرەنجام لە دەنگی پێیەکی سەرپلیکانەکانەوە بەخۆهاتمەوە- میوان بوو... بەگۆڕی بابی میوانییەوە! رۆیشتم. مێشك بەتاڵ- بەتاڵ لە هەموو شتێك و بێ هیچ پێشەکی و خۆ سازدانێك. بەڕێیەکیدا بەرەو ژوورچووم، تا بەرامبەر باغی میرزا رەشیدی لە هیچ جێیەکی رانەوەستام. لەوێ لەسەر بەردێکی دانیشتم- لە بێ تاقەتیان- لەسەر رێی لۆرییە باری،



ئەگەر هەبێ، ئەگەر بێت. دڵم تێکەڵ دەهات خەریك بوو دەڕشامەوە، یەك دوو ئۆقم کردن؛ سەرم دەسووڕا؛ شتێك لە ناوەوە لە پشتە سەری دەدام؛ دەماری لاجانگەکانم بە پەلە لێیاندەدا و دەنگەکەیان دە گوێمدا دەزرینگایەوە؛ کەللەم پڕ لە ژاوە ژاوی بەتاڵ بوو، وەك دە ئاشیدابم. تا ئەودەمی بەشێوەی نادیار نەبووبێ بیرم لە دارگوڵێ نەکردۆتەوە... چۆن بووە؟ ئەوە کوتکیش هەروا پشتە سەرم دەکوتێ، و مێشك کۆکردنەوەش کارێکی دژوار بوو.

هەر کە دەمویست بیرکەمەوە مێشکم بەتاڵ دەبۆوە. مێشکم وشك هەلاّتبوو- هەر دەتگوت بیابانی بەڕەهووتێیە. چۆن بووە؟ خۆی کوشتووە تا من ئازاد بم، چونکە گوتبووم ئەگەر نەیەت ئیدی من هەرگیز ژن ناهێنم؟- زۆری رێ تێدەچێ ئەوەبێ. داپیرەی لەخشتەی بردبوو؟ -دوورنییە- هەرچی دەربارەی خورافاتی بڵێی لێیدەوەشێتەوە؛ هەرچەندە دڵم فەتوای ئەوەی نادات. دیارە بەرو بوخچۆکەی خڕکردۆتەوە و مێردەکەی پێی زانیوە؟ یا ناکا دیارییەکانی تەلاّ و دایکێ تەلاّی لای وی دیبێ و گومانی لێکردبێ! —ئەوەش هەر دوورنییە... یا وای- ئیدی ئەمەشیان هەر کوشندەیە، ریسواییە، ئیدی ئەو ریسواییە بەهیچ شتێك ناشۆرێتەوە- دیارە چونکە چوومەتەوە لای، دە دڵی خۆیدا وای بەخەیاڵدا هاتووە کە هەروا بەرێکەوت ئەو شەوە لامداوەتە ماڵێ وان و ئیدی کە رۆیوم و نەگەڕاومەتەوە ئەو پێیوابووە لەبیر خۆمم بردۆتەوە و گوێم نەداوەتێ.

سەرم دەنێو هەردوو دەستەکانم گرتبوو و بێ ئیختیار فرمێسکم هەڵدەڕشتن... لەپڕ بیرێکی دڵخۆشکەرانە لەنێوان مێشکە بەتاڵە کەمەوە سەری هەڵدا: ناکا مێردەکەی بیەوێ بەو شێوەیە بە هێڕەم بەرێ! دیارە بۆنی شتێکی کردووە و بۆ بەهێڕەچوونێم هاتووە ئەو هەواڵەی هەڵبەستووە! بەلاّم نا... ئەو هیچ ئاگای لە من نەبوو، ئەو نەهاتبوو من ببینێ، ئەوە من بووم سۆراغم لەوی کرد. سەرەڕای ئەوەش، گریانی پیرێژنێ راستییە قسەکەی دەردەخا- تەنکە ریشەکەی خۆشی هەر نیشانە بوو.

هەردەبێ یارۆ قولاّغێکی زانیبێ و بۆنێکی کردبێ و هەرایان بووە و دارگوڵ بەدەم شەڕ و هەرا و زەناوە بە هەمان سادە و ساکاری و گوستاخییە خۆیەوە هەموو شتێکی گوتووە و پیاوەکەشی غیرەتی بزوتووە و خۆی بە قوربانی ئەو کارەی کردووە... بێ شەڕەفی... بێ ناموسانە!

* * *

## (٢٩)

کوڕی سلێماناغای چووبووە گوندی مستەفاخانی و هاتبۆوە، لەبەر میواندارییە کاندیدایانی هەڵبژاردنێ سەرپێی نەبێ نەیتوانیبوو ببیینم و دەگەڵی دانیشم و دوو قسانی دەگەڵدا بکەم. کاندیداییەکان دووسێ ڕۆژی خۆشیان لە ماڵێ سلێماناغای بەتریاك و ئارەق خواردنەوێوە بەسەربرد و چوونەوە. سێ کەس بوون، هەرسێکیان پێك ناکۆك، هەرسێك خزمی یەك- و هەرسێك هاوسەفەر. هەرسێکیان بە لۆرییەك و بەسێ ((تاك)) زمان، بەهەرچی هۆیەکەوە بوو، هاتن و قسەیان بۆ خەڵکی کرد و لەباتی وانیش دەگەڵ ((تاران))ێ دووان: گوتیان کە خەڵکەکە هەموو سەریان دەڕێی ئەعالی حەزرەتدایە، هەموو شەیدا و کە لەلای نیشتمانن و هێندەیان وڵات خۆشدەوێ خەریکە هەروا بەخاوی و بەکاڵ و نەکولێوی بیخۆن، ئای کە بەتامە، بەڵام ئەوەندەشیان هەیە، کە پێیان بێ ئەدەبییە دەست درێژکەن و ئەو پارووە چەور و نەرم و بەتامە لەدەست لەخۆ گەورەتران بفرێنن و بۆ خۆیانی بخۆن، پارووی چەور و نەرم و بەتام خوا هەر بۆ گەورە و سەروەری ماڵ و خانەدانانی داناوە- نۆشی گیانی وی بێ! گوتیان ئەو خەڵکە ئەو کەسانەشیان خۆشدەوێن بەتایبەتی ئەو چەند هاوشاریانە کە بە سواری لۆرییە ئەو هەموو زەحمەتەیان کێشاوە و هاتوون. لۆرییەکەشیان هەر خۆشدەوێ، خۆ ئەگەر بێت و هاو شاریانی بەڕێز لەڕووی خۆشەویستییەوە دەنگیان بدەنێ ئەوە مانای وایە دەنگیان بە لۆرییەکەش هەرداوە، خۆ ئەگەر وابێ ئیدی ئەوە قیرتاوکردنی تاکە شەقامەکەی شاری مسۆگەرە.

زۆریشیان بە ئاووهەوای شاریدا هەڵدا: ئاوەکەی دەپرسی، هەر سەیرە، نازانن چی تێدایە، هەر کە پەرداغێکی دەخۆنەوە وەك کێوێکیان هەڵکەندبێ هێندە برسی دەبن مەپرسە و هەر کە نانیشیان خوارد و پەرداغێکی دیکەیان ئاو بەسەردا کردەوە سەرلەنوێ برسی دەبنەوە و هەر دەڵێی قەت هیچیان نەخواردووە... بەڵام هەوای شاری- وەی وەی، لەو هەوایەی، لەو خەوەی ناو ئەو هەوایەی! بەڕاستی ئەوەی گوتوویەتی کە ((بەیانیی سەردەشت، ئێوارەی بانە، دەگەڵ نوستنی دەشتی رازیانە)) گوڵی لەدەمی باریوە. لێرەش دەشتی رازیانەی لێیە.

خۆشەویستان، دیاربوو بۆگەنی زەلکاوی پێش ماڵێ سلێماناغایان بەپێچەوانەوە لە قەڵەم دابوو... بەکورتی، هەرکامێکیانت دەگرت لەو سێیانە، ئیدی ئەوە باسی ئەو دووەکەی دیکەی دەکرد و بەشاخ



و باڵیدا هەڵدەدان و لێوەشاوەیی و دەست ڕۆیشتوویی و کارزانی وانی دەردەخست و پێشینەی پڕشنگداری بنەماڵەکەیانی لە خزمەتکردن بەوڵات، دیارە بە والا حەزرەتی هومایونی ستایش دەکرد. بەڵام خۆشی... خۆشی ئەوەبوو کە ((چاکییەك))ی دیشی بێجگە لەوانەی ئاواڵەکانی هەبوو کە ڕەنگە دەگەڵ زەوق و سەلیقەی هەندێکان ڕێك نەکەوێ و نەیەتەوە- یانی ئەگەر خودا نەخواستە ئەو هەندە کەسانە لەنێو هاوشاریاندا هەبن، هەرچەندە کە ئەو دڵنیاشەنین- بەڵێ، دەگەڵ سەلیقەی هەندێکان نەیەتەوە، و تەنانەت بە عەیبیش دابنرێ؛ بەڵام چ باك، عەیبێکە سەدچاکە دێنێ، لە هەر لایەکەوە سەیریکەی جوانە، ئەویش ئەوەیە کە شێت و شەیدا و کۆلا و وەیلانی خانەدانی سەڵتەنەتییە... زۆریان سوپاسی میوان نەوازییە خەڵکی شارەکەی کرد و زۆریشیان بە جوانییە شارەکەیدا هەڵدا و ئەو گوێدرێژ و ولاغانەشی کە بە بارە دارەوە لەسەرچەقی ڕێیە ڕاوەستابوون، بێ ئەوەی هیچ گوێ بدەنە زەوقی جواناسییە ئاغایان تەرسیان هەڵڕشتن و کەوتنە هوڕای زەڕینێ.

کوڕانی شاری هەردەو سەروەختەیدا شەونامەی کاریکاتۆرییان بڵاوکردنەوە، کە تێیاندا میوانەکان سوپاسی میوان نەوازییە قەرەواشی ماڵی سلێماناغایان تێداکردبوو. لە یەکێك لەو کاریکاتۆرانەدا کاندیدایەك هۆقە و ماشەی تریاك بەدەستە، دووکەڵی تریاکێی بە سەروچاوی قەرەواشێدا کردبوو، کە سینییە چایان لەپێش دەگێڕێ؛ دووەکەی دی بە سەلامەتییە سەری وی تەختە نەرد (تاوڵە)یان دەکرد و تێی ڕامابوون. ئاغای سلێمانی قۆپچەی پانتۆڵەکەی کراوە بوو و دەچاوەڕوانیەدا وەستابوو.

ئەوە ئاماژەی مەسەلەکەی مەلای مەشهوور بوو، کە دەڵێن دوو ژن ئامبازی یەك دەبن، شەرتێ دەکەن هەرچی وەبن کەوت گانێکی بداتە مەلای. مەلاش هەر دەستبەجێ دەست دەباو دۆخینێ دەکاتەوە؛ گوتیان ((ئەوە بۆ هەر لەئێستاوە مەلا؟)). ئەویش دەڵێ ئاخری یەك وەعەردی هەردەکەوێ!)) بۆ ویش (بۆ ئاغای سلێمانی) هەروابوو؛ هەریەکێکیان هەڵبژێرابانایە، ئەو سەرۆکایەتییە ئیدارەکەی خۆی هەر مسۆگەر بوو.

ئێوارەی ڕۆژی دوای ڕۆینێ کاندیدایان چوومە ماڵێ سلێماناغای، تا هەم کاریگەرییە کاریکاتۆرەکان دەڕووی سلێماناغایدا ببینم و هەم سەرێکیشی لە کوڕەکەی دەم- دەمێك بوو وام نەدیبوو لێی تێربم، جگە لەوەش بابەگیان دەیگوت تەندروستیی تێکچووە و حاڵی باش نییە... دەمزانی بەتەمای چوونە گوندییە بەڵام پێش ڕۆینێی نەمدیبوو و نەمدەزانی بۆ چ دەچێ.

چووم سلێماناغا بەتەنێ بوو؛ کەش و هەوای ماڵێ سارد و سڕبوو؛ نۆکەر و قەرەواش و خودی سلێماناغاش هەر دڵ و دەماغێکی وایان نەبوو- هەرچەندە هەر بە گەرمییە جارانەوە پێشوازی کردم. هەردوای کەمێك بەسەرسامییەکەوە دەو لاولام رووانی. سەرنجەکەی قۆزتمەوە.

گوتی: ((دیارە چاو لە هاورێیەکەت دەگێڕی؟)).

گوتم: ((بەڵێ- ئەوە دیار نین؟)).

گوتی: ((چۆتەوە... پێرێ چۆوە- بۆ تۆش ئاگات لێ نییە؟)).

بەسەرسامیەوە گوتم: ((نەخێر!)).

گوتی: ((دە فەرموو، ئەوە تۆش ئاگات لێ نییە! بەڵێ، چۆوە- خواحافیزی بێ!)).

قسەکەی واپێدەچوو ئەویش ئاگای لێنەبێ، بەڵام زۆرم خۆ تێوە ژەند.

ئاوازی قسەکانی بۆنی تۆرانێی لێدەهات. دڵگیربوو، هەروەك مامۆستایەکی کە شەیتانییە قوتابییەکی بەپێچەوانەی حەزی خۆیەوە ناچاری کردووە لێیدا، تادوایە نارەحەت بێت و بەو نارەحەتیەیرا بۆی دەرکەوێ کە هۆی شەیتانییە قوتابییەکەی مامۆستایەکە بووە لەگەڵی پێوەچووە و دەمی خۆی دەگەڵدا سپی کردۆتەوە...

ئیدی، ئەوە دنیایە؛ دەورو بەرەکە خۆی وایە، دەوروبەرەکە ئازادییە هەڵناگرێ؛ دەبوو ((مامۆستا)) هەر لە هەوەڵێوە، چەند جارێکان، بەپێی پێویست، چەند شوترکێکانی پێشاندا- دە ئەسپ بارهێنانێشدا هەروایە: ئەگەر رێك و پێك بوو و بەباشی رەفتار کرد و هەموو فەرمانەکانی بەچاکی بەجێ هێنان ئەوە کلۆقەندێك یا دوو سێ دەنکە کشمیشانی دەزاری داوێی، خۆ ئەگەر ئەو ئازادییەی قۆستەوە و ویستی سەرپێچییە بکات یەك دوو قامچیانی حەواڵەی بن تەنگەی دەکەی- سیاسەت مەرهەم و درێوشە و شل و توندییە... بەڵام من پەرت بووم، پێموابوو کاروباری حیزبی بۆتە هۆی وازوو و بەپەلە- بێ خوداحافیزی- گەڕانەوێی و ئاغا چونکە میوانی هەیە، و ((کاری تایبەتی بەسەرکاری گشتیدا رەبەرچاو گرتووە))، نارەحەتییەکەی لەوەیە کە ئەوی بە تەنیا بەجێهێشتووە.

گوتی: ((کەسێ کە بە چاکی دە ئازادییە نەگا هەر لەخۆی نا لە خەڵکی دیش دەدوێ و باسی ئیدیش دەکات. بەڕاستی پیاو سەیری پێدێ؛ قسەو کرداریان یەك ناگرنەوە)). —منی لەو قسەی بردە دەرێ-



مەبەستی حیزبییەکان بوو: ((کە لە گەڵیان دەکەوییە قسان دەبینی بەقسەی خۆیان هەرچی دیاردەکانی دەوروبەر و پەیوەندییەکانی ئەو دیاردانەیە هەمووان رەبەرچاو دەگرن. بەڵێ، دەبێ هەر دیاردەیەك دەگەڵ پەیوەندی دیاردەکانی دیدا لە ژینگە و دەوروبەری خۆیدا رەبەرچاو بگیرێ. بەڵام کە نۆرە دەگاتە سەر خۆیان هەموو شتێکیان لەبیر دەچێتەوە. ئەودەمی ئیدی خۆیان لەسەرووی دیاردەکانەوە دەبینن و ئێمە ون دەبین. من نازانم ئەم دیاردەیە چ جانەوەرێکە... دەڵێم حەزرەتی ئاغا، تۆ لێرە دەو ژینگە و دەوروبەرەدا دەژیت؛ ژینگەی تۆ هەمان ئەو ژیانەی بنەماڵەیە و دەگەڵ ئەو خەڵکەیدا؛ تۆ هەمان دیاردەی کە بۆ خۆت دەڵێی، خەڵکەکەش هەروەتر، منیش هەروا. ئێستا چ کەسێك و کام کتێبێك گوتوویانە کە من و تۆ و ئەوانەی وەك ئێمە لە کەسانی دی جیاوازین؟... ئەو ئاغایانەی کە پێیوایە لە ولاتی فەرەنگیانە دەگەڵ کرمانجی دانیشتووە و پێکان لێك دەدەن، وردە گەمە و سوعبەتان دەگەڵ نۆکەر و خزمەتکاراندا دەکەن؛ پێیان وایە مارەیی و سیغە و گرێبەندییە ژن و مێردایەتییە چ مانایەکی نییە...ها، ژن و مێردایەتی هەر قسە نییە: گێل و وێلە نازانێ کە ئەو ژینگە بەو جۆرە بیروبۆچوونانەوە ئەم قسانە چی بۆدەکا. ئەمە دژایەتییە خوو و خدەو رەوشتی رەگ و ریشە داکوتاوی ئێرەیە، کرمانجیش بەوانە قایل نین. چونکە ئەوان دەگەڵ ئەو نەزمەی راهاتوون. ئێستا بێن و لەبەر دڵی ئاغای هەرچی خوو و خدەی خۆیانە تێیهەڵدەن... پففف!)) و سەرێکی راوەشاند؛ زۆر بە پەشۆکاویەوە.

((ئەوجا وەرە ئەوە خوێندەوارە ئاوا... ئاغا تازە دەیەوێ بناغەیەکی دی داڕێژێ...)) هەر بە گاڵتە و لاقرتێ و توڕەییەوە: ((بەڵێ، ئیدی ئاگایان لەوەی نییە کە خۆشیان و کەسانی دیش هەر هەمان دیاردەن، و بەندە بۆخۆم پێی لێدەنێم- بەڵام بەداخەوە درەنگم زانی. کەمترین زیانی ئەم جۆرە ئازادییە بێجگە لە هەر شتێکی دیکە ئەوەیە کە پیاو لە شوکری خواردنێ ئەو ئازادییەی ژێوان دەکاتەوە. وا لە پیاوی دەکا پشتی دەستی خۆی داغ کات کە ئیدی جارێکی دی هەڵەی وانەکاتەوە کە منداڵەکەی بنێرێتە خوێندنێ. یا بێت و لەگەڵی دانیشێ و وەك منداڵی خەڵکی دوو قسانی دەگەڵ بکات و بیدوێنێ. دەینێرییە بەر خوێندنێ تا ببتەچی؟ تا شەونامان بنووسێت و وێنان دروستکات و بەدیوارانیانەوەدا؟)) سووربوومەوە؛ بۆ شوێنە ونییە گوتم: ((ئاغا، تۆ دڵنیای کە ئەو نووسیوویەتی؟ ئەوە لەوی ناوەشێتەوە، من دڵنیام کە ئیشی وی نییە)).

((دەزانم، بەڵام فەرقی چییە؛ کاری هاوڕێیەکانیەتی؛ ئاخر بە ناخێری گیانی ئەو سەرقافڵەچی کاروانی فەرهەنگی ئەم شارەیە... تازە ئیدی گرینگ نییە؛ بەزاراوە و دەمو دووی خۆیان دیاردە هەردەبێ

دەنێو ژینگەدا رەبەرچاو بگیرێ. بەندە ئەگەر پەیرەویم لە فەلسەفەی وان کردبایە ئێستا موحتاجی نانی شەوێ بووم... ئەو شەونامانەش لە چاوەڕوانییە بەولاوەتر هیچی دییان لێوە بەدی ناکرێ و هیچی دییان لە دەست نایە... و لەو سەریش هەر کرمانجەکە تووشی دەردەسەرییە دەبێ؛ چونکە هەرچۆنێك بێت خۆ والا حەزرەت ناتوانن هەم ((شا))ش بن و هەم ((ستالین))یش، دەبێ هەر یەکێك لەو دووانە بن، و ئەوانیش تائێرە سەڵتەنەتیان قبووڵە و هەر بەشایەتیە رازین. رەنگە رۆژێکیش بێت چاوێك بەم بیرۆکەیەی خۆیاندا بخشێننەوە- ئەوەیان مەسەلەیەکی دیکەیە؛ ئێستا بارودۆخەکە ئەمەیە کە هەیە. ئەوانیش ئەگەر رۆژێك ویستیان هەردوو رۆڵ دەو زەمینەدا پێکەوە (شایەتی و ستالینی) ببینن ئەوە زیان لەخۆشیان و لە کەسانی دیش دەدەن... بەهەرحاڵ جارێ ئەوان دەچنەوە لە ژینگە و دەوروبەرەکەی خۆیانەوە دیاردەکان تاوتوێ دەکەن و بەقسەی چەرچییەکانی لای خۆمان دەچن خێری لێ ببینن- با ببینن، خۆ ئیرەییەیان پێ نابەین، ئێمە حەسود نین!)).

کوڕی سلێماناغای رۆیشت و من ئیدی تا چەندساڵێکان- ڕێڕەویش- هەر نەمدیتەوە و ئیدی هەر هەواڵیشی نەما- نە نامەیەك، نە هەواڵێك- هیچ. هەر جارێکی کە چووبامایە، سلێماناغا هەروا زۆر بێ کەیف و دەماغانە و بەنا بەدڵیەکی شاراوەوە یادێکی دەکردەوە.

سەرەتا کەم کەمە دەربارەی رۆیشتنێشی قسە و قسەلۆك کەوتنە سەر زار و زمانان. یەك دەیگوت چووە جیاز و ناومالّی ژن هێنان و جلوبەرگی بووکێ بکڕێت و بێتەوە. بووکی ئەو قسانەش تەلاخانم بوو، کە کوڕی سلێماناغای لەپێشدا بەناوی ((دیدەنی))یەی چوو بووە وێ و دیبووی و پەسەندی کردبوو. دایکم ئەوەیانی لە پوورە فاتمێ بیستبوو. رەنگە هەر ئەو ئاماژانەش کە سلێماناغا بە مستەفاخان و بە هەڵسوکەوتی ژیانی بنەماڵەکەی دەکرد بۆ وەی بووبێ. هەقی ئەوەم دادەی کە نارەزا بێ (کوڕی سلێماناغای دەڵێم) چونکە خۆم هەر لەو سەعاتەیڕا کە گەیشتمە دێی لە کوڕەکەی مستەفاخانیم گوێ لێبوو کە گوتی کاکە سیامەند ختووکەی پوورە تەلایەی داوە... خۆزگە ئەوەم پێدەگوت. لەبەر خزمایەتییەیان چاوپۆشیم لێکرد، ئێستا ژێوانم- کارێکی نابەجێم کرد. راستە ئەو نەپیرسیبوو، بەلام ((هاوڕێیەتی)) ئەو رێیەی پێدەدام کە دەست دە تایبەتمەندترین کاروباری ژیانییەوە وەردەم و بۆچوونم هەبێ- و کەچی من ئەرکی خۆمم بەجێ نەهێنابوو!.

دوای ماوەیەك ریوایەتێکی دی بەرپابوو، کە دەیگوت حەزی لە قەرەواشەکەی پێشوویان کردووە و گفتی هێنانێی داوەتێ و باوەژنەکەی کەویستوویەتی خوارزاکەی خۆی بۆ بێنێ لە کاتی لەماڵ نەبوونێ



وی و ئاغای، هەستاوە کچەکەی لە ماڵێ دەرکردووە- ئەوەش پێدەچوو لەوانەبێ، چونکە زۆرجارانی دەقساندا دەگەڵ بابی ئاماژە بەو کچەی کردبوو کە نیشانەی دڵبەندییەی بوو پێیەوە... هەر بەدەم ئەم ریوایەتە شەوە دەیانگوت، کاتێ کە بۆ دیدەنییە چۆتە گوندی ماڵێ مستەفاخانی ئەو کچەی کە مێردی بە یەکێکی دی کردووە لەرێیە دیویەتییەوە و دووبارە وادە و بەڵێنی هەڵگرتن و هێنانێی پێداوەتەوە و گفتی لەویش وەرگرتووە کە حاشای بۆ لە مێردەکەی بکات و قەرار و بڕیەیان وابووە کە بەسەروەختییەوە بچێتەوە کەچی سلێماناغا میوانی هاتوون و ئەو نەیهێشتووە دە وادەی خۆیدا بڕواو کچەش چیدیکەی خۆ پێ رانەگیراوە و خۆی کوشتووە و ئەویش دەگەڵ باوەژنەکەیدا لێیان بۆتە هەرایەکی قورس و هەستاوە لێیداوە و رۆیوە.

سەرچاوەی ئەو ریوایەتەیان لە خانزادی دەگێڕایەوە بەلام دایکم لەسەرکانییە نزیك ماڵە خۆمانەوە خانزادی دیبوو و ئەو سوێند و قورئانی خواردبوو کە لە زاری نەهاتۆتە دەرێ و ئاگای لە مەحمودی بێ زەواد نییە. ئیدی ئەو رۆیبوو و قسە و قسەلۆکیش هەروا بەردەوام ئەو ماڵە و ماڵ و ئەو زارە و زاری بوو و دەگەڵ هەر هاتوچونێکیشیدا وەك گلۆڵە بەفری شاخی تا لەسەرێڕا بە خلۆرکە دەگەیشتە داوێنێ هێندەی دیکەی وای پێوە دەنووسا و قەبارەکەی وا گەورە دەبوو، دەبووە نیوە کێوێك.

وێنەی دوایی ریوایەتەکە دەیگوت گوایە چۆتە خوازبێنییە خوشکێ مستەفاخانی و ئەورازی نەبووە، بۆیە کە هاتۆتەوە راست لێیداوە و رۆیوە، تا جارێکی دی نە پەیوەندییان پێکەوە بمێنێتەوە و نەبیانبینێتەوە. هەر بەگوێرەی ئەو ئاماژە و پلارانەی سلێماناغاش دەیهاویشتنە مستەفاخان و خاوخێزانی، ئەمە زۆر لە گوینتر بوو.

رووداوەکەی دوایی راستییە ئەو قسە و قسەلۆکانەی سەلماند: هەروا کتوپڕ تا ئاوڕمان دایەوە و چاومان هەڵێنا و دیتمان بەڵێ، تەلا خانم دەگەڵ سیامەندی هاتوونە شاری و ماڵێ قازی، و ڕەدووی کەوتووە! سەیر بوو، هەرچەندە بەلای منەوەش سەیرێکی وانەبوو: ئەو هەموو وێك کەوتن و لێك نزیکی و پێك راهاتنانە لەوەی بەولاوە چیدی لێ شین دەبێتەوە؟ ئەم جۆرە کارانە رەنگە زۆر بەدەگمەنیش بپسێ و پیاو خۆی بەدەست خۆی نەمێنێ و جڵەوی لە دەستی بەرهەڵدا بێ و ئەوەی نایەوێ رووبدات... ئەوەتا ئێستا هەموو شتەکان گەیون و ئەوەی نەدەبووا ببێ بووە و تەلاخانم لە ماڵێ قازی دانیشتووە! مستەفاخان دەگەڵ ئەو هەموو فیشالانەی کە بەدەم ئازادییەوەی دەکرد هەر هێندەت زانی کەوتۆتەوە ناو ئەڵقەی خوو و رەوشت و خدەو نەرێت و کەلتووری زیندوو و مردووی پێشینانەوە: ئەو سوننەتانە،

هەر لەسەردەمی باو و باپیرانەوە بگرە بەولاتریشەوە، تا سەردەمی ئەوڕۆی ئەو هەرچی و پەرچیانە، هەموو سەریان بلّند کردۆتەوە و دەنێوە خۆیان گرتۆتەوە و هەروەك چۆن دە خەوێکی ئاڵۆزدا نوستووەکە خۆی دەنێو جندووکە و رمووزنە و دێو و درنجی سەیردا ببینێتەوە و هەریەکە لەو بوونەوەرە سەیرانە لە هەر چوارلاوە دەمی تێژەنن و بۆی بێن و خۆی لیّ خێل و خوارکەن: رمووزنە چاویان دەرپەڕاندن و خۆیان خێل و خوارکرد بەهەڕەشە و گاڵتە پێکردنەوە کلکیان باداو وردە وردە ئەڵقەکەیان تەنگتر کردەوە و ئەویش هەروەك خەودیتووێك، بەسەر ڕوو و لەشی شەلاڵی ئارەقەوە لە خەویّ راپەڕی، بەلاّم بەپێچەوانەی ئەو کەسانەوە کە لەو جۆرە خەوانە رادەپەڕن و هەست بە ئاسوودەیی و خۆشییەکی دەکەن، ئەو نارەحەت بوو. دیتی کە هەر چەندێکی خەیاڵی لێدەکاتەوە هەر ئازاد نییە، یانی ئەو ئازادە تەلاّ ئازاد نییە، چونکە تەلاّ ژنە، ژنیش هەر ژنە، و ئەو پیاوە و پیاویش راگری سوننەت و کەلّتووری بنەماڵە و خێزانە، خێزانیش چاوی لەوییە، و ئەو ئەو هەقە دەداتە خاوخێزان تا چاویان لەوییەوە بێت و ئەسپی خانەوادە هەمیشە زین و لغاو بەسەرەوە و ئامادەیە کە تائەوپەڕی دنیایە وەدووی پەیسەری عاشقانی هەلاّتووی لادەر لەو سوننەتانە بکەویّ و توانای عەشیرەتیش کەم نییە. چ شتێك لەوەی چاکتر کە مرۆڤ پابەندی ئەو سوننەتانە بێت- کە رۆژ بە رۆژ خەریکە بناغە و بنچینەیان دەرزێت و لێك هەڵدەوەشێت- جەختی لەسەرکردەوە و رایگەیاند کە ریّ و رەسمی عەشیرەتی هەر ریّ و رەسمی عەشیرەتییە و هەردەبیّ و هەردەمێنیّ و دەبیّ پەیڕەویشی لێبکریّ! سەیرەکەش لەوەدا بوو ئەوانەی کە بەیەك گەیشتنی ئەو دوو دلّدارەیان لەناوەوەی دلّیانەوە حەز دەکرد و پێیان خۆش بوو کەچی لە دەمارگیرییە عەشیرەتییەدا، شەندە لەمەندەی کەمتر نەبوو. چونکە ئەگەر بێت و هەر کچێك ئاوا بەمجۆرە قەشمەری و گاڵتە و گەمە بە بنەماڵە و گەورەی بنەماڵەی بکات، ئیدی ئەوە خاو و خێزان و بنەماڵە ئەها- پفف!.

مستەفاخان بە پەلە چووە سەفەریّ و دەربارەی ئەو جموجۆلاّنەی کە لە دەورەی دەسووڕانەوە تەلگرافێکی بۆ ((دەولّەت))یّ کرد و ((خزمەتەکان))ی خۆی هەموو تێدا نووسی و کەم لوتفییە ((مەقامات))یی تێدا یادداشت کرد، یەك دوو رۆژان چاوەڕیّ بوو بەلاّم دەولّەت وەك پەتای مەرگی گرتبیّ، چ وەلاّمێکی مەرحەمەت نەفەرموو، کە زانی هیچی لە دەولّەتی دەستگیرنابیّ هاتەوە. هاتەوە نێو ئەوانەی کە جموجۆلّیان دەرهەق دەکرد و ئێستا ئەرکی غیرەت و پیاوەتییە ((عەشیرەتی)) ئەوانەی کردۆتە پالّپشت و پارێزەری وی.



یەکەم رۆژی هاتنەوێی دیتم لەسەرجادەی، لەبن درەختێکی، دەگەلّ دوو نۆکەراندا کە وەك باوە، لەپشتییەوە، قیت و قنج، راوەستابوون و دیاربوو پەرت و پەرێشان و بیّ حالّ بوون و جگەرەیان بەجگەرەیەوە دەکێشا. سەرو ڕووی ئی وەی نەبوو لێی نزیك ببیەوە و چاك و چۆنییەی دەگەلّدا بکەی: لەبەردەمی دەفتەری پادگانیّ راوەستابوو. واپێدەچوو دیوارێکی ئەستووری بە چوار دەوری خۆیدا هەلّچنیبیّ و دەخەوێکی قوولّدا بە خەون دەنێو ئەو چوار دیوارەیدا فەرمانڕەواییە بکات. دنیای دەرەوەی نەدەدیت. وەك بلّێی بۆ بیبینیّ؟ ببینیّ لە پەنا دیوارییەوە راوەستاوە... هەرچەندە نا- نەیدیبوو؛ هەر لە هەوەلّێوە دەگەلّ ئەو دیوارەیدا هاتبووە دنیایە: ئەوەی هەیبوو هەر ئەو وتە و بێژە و وشانە بوون کە لە قەرەواش و نۆکەر و دایکی بیستبوون- ئەوانیش کە هەرگیز راستییان تێڕانایە. دیارە مرۆڤ خەلّکی ((جیهان))ێکە کە تێیدا دەژی و بەشێکە لەو خەلّکانەی کە دەگەلّیاندا دەژیەت، یانی خەلّکی ((سەرا)) و بەشێك لە خەلّکی ((سەرا)) بەتێکڕای هەموو دیاردەکانی ((سەرا))وە. ئێستا ئەتۆ پێتوایە بەو رووداوە درزێکی بکەوێتە دیواری مێشکییەوە کە دنیای تێڕا ببینیّ؟ من پێموانییە. بەشێوەی ناسادە دەتوانی بچییە سەری ئاریشە و کێشە سادە و ساکارەکانەوە. بەلاّم بەشێوەی سادە و ساکارەوە هەرگیز ناکریّ گرێیەکی لە ئاریشە و کێشە ناسادە و ساکارەکان بکەیەوە. ئەم رووداوە ئەگەر شتێکی پێبکریّ هەر ئەوەیە کە لە ئەستوورایيە ئەو دیوارەی زیاد دەکات و ئەو لە دنیا دوورتر دەخاتەوە. مێشکی ئەو جۆرە کەسانە شتێکی تەواو یەکپارچەیە، لە کاتێکا کە شرۆڤەکردنی تەنگ و چەلّەمەکان و هەلّکردن و تێك گەیشتن دەگەلّ دنیایەدا پێویستی بەمێشك ورد کردنەویّ هەیە. کەسێکی گونجاو- و هەر لە ناوەکەیڕا دیارە کە پیاوی گونجانێیە- دەبیّ لە جێیەکی هێندێك لە پارچەی گیانی خۆی ببەخشیّ تا لە جێیەکی دی لە پارچەی گیانی کەسانی دی وەرگرێتەوە؛ بەقسەی خەلّکی مەبایە هەمیشە و لە هەموو جێیەکی هەر یەك گەز و یەك ربە نەبیّ. گیان و مێشکی یەکپارچە، بە واتای مە، سەری لەبەردی دەدا و بیّ ئەوەی هیچی لە باتیان وەرگرێتەوە ورد و هاڕ دەبێت... ئەم شتانەم هەموو دوایە زانی...

بەلاّم هەر لەپیر و پێشینیانەوە هاتووە کە بەسەرچوونیّ زەمانەی پشتیوان و یاریەدەر و دەرمانی فەرامۆشی و بیرچوونەوەی بووە بۆ چارەسەرییە ئێش و دەرد و کۆڤانان.

ئەو کاتەی کە کوتەك دێت ئەگەر هەروا بە هەمان شێوەی هەوەلّیّ بەردەوام بێت پیاوی لەبن دێنیّ. بەلاّم هاودەردی و بەسەرچوونیّ زەمانەی ئەو ئازارانە ورد و پارچە پارچە دەکەن و دەگەلّە خۆیانی دەبەن: خزم و کەس بەشێکی ئەو ناخۆشی و ئازار و کۆڤانانە بۆ خۆ دەبەن- بەلانی کەمەوە هەر بۆ

ئەوەی دەریخەن کە هاودەردن، هەر راست وەك دانیشتنی پرسەی- و ئەوجا تێپەڕینی زەمانەی دێت و تەمەنی شەرمەزاری و ریسوایی و سوکایەتییە کەم و کاڵ دەکاتەوە. ئەوە دەبیینم دەبن درەختێکی سەرجادەیدا- نزیك نوسینگەی مەرزەوانی- راوەستاوە، بەڵام چۆن، هەروەك خانان، لینگی لێك بلاوکردوونەوە و تەزبیحێ بادەدا، دوو نۆ کەریشی لە دوواوە، کە بەشێکن لە دروستبوون و بوونی وی، شل و شۆق راوەستاون و دووکەڵێ جگەرەی بەبا دەکەن. ئامۆزا و نەوە مامەکانیش هەر کە سفرە راخرا ئیدی ئەوە دەستە دەستە لەبەر دەرکی ماڵە قازی و ئیدارەی پۆلیس رادەوەستن؟ دووکەڵێ بەبا دەکەن، و ئیدی ئەوە بە هاودەردیەوە گوڵ دەبێژن و گوڵ دەژنەون، و هەر بەهەوای هاو دەردیەشەوە، قاقا پێدەکەنن و جاری واشە هەر بۆ جەخت کردنەوێ پێکەنینەکەش دەست بەرانی خۆیاندا دەدەن و خۆ خواردەکەنەوە و راست دەبنەوەو بە قاقاوە سەر بۆ پشتەوە دەبەنەوە، دیسانەوەش هەر بۆ هاودەردییە و خۆ نواندنێوە، تا لەبەردەمی خەڵکی شار و بازاڕیدا واخۆ دەرخەن کە پێیان وانەبێ عەشیرەت لەو دارانەیە بە هەموو بایەکی دەلەرێ. سیامەندی نابینم، هەر وەدەرناکەوێ- لە ترسان. سەرەنجام: واسیتە و ئەملاولاو هێندێکیش بەر و بەرتیل و سمێڵ چەورکردن و هەڕەشە و گوڕەشە تەلا خانمی وەرگرتەوە و دەگەڵ دایکیدا ناردیەوە گوندی؛ تەنانەت واسیتەکەشی هەر بەڕوو خۆشییەوە بوو. من بۆ خۆم تەلا خانم نەدیت و نازانم دووچاری چ ببوو- بەڵام دەمدیت کە ژنان یەکجار زۆر بەتاسەی دیتنێیەوە بوون- دەیانهەویست ئەگەر هەروا بە تیلە چاوێکیش بێت هەر ببیینن، هەرچەندە کە ناویشیان دێنا رووی خۆشیان تێکدەنا. یەك دوو رۆژان لە ماڵێ سلێماناغای بوو- بەڵام ئەو چەند رۆژانە من نەچوومە وێ- راستیش نەبوو بچم. بەڵام وەك بیستم نەخۆش بوو و تەنانەت گەییە سەر لێوی مردنێ، و بیستیشم کە مستەفاخان هیچ درێغییەکی دە چارەسەرکردنێیدا نەکردووە، و تەنانەت بەراسپاردنێ داکی ناردی پزیشکیش هات. و دیسانەوە هەر بیستمەوە کە تەلاخانم لەو ماوەیەدا هەر هاواری سەرێشەیەکی زۆر توندیەتی و هەمیشە دەستی هەر بەنێو چاوانێوەیەتی و دەناڵێنێ. بەرەو دوا مستەفاخان زۆرکەم، یا هەر بەدەگمەن دەهاتە شاری ئەگەر هاتباشایە ئەوە نەدەهاتە بازاڕی، ئەگەر بشهاتبایەتە بازاڕی وەك جاران لەسەر دوکانان دانەدەنیشت... دە دانیشتنێ پێکهاتنەوەی ماڵێ قازیشدا رووی دەگەڵ سیامەندیدا هەرخۆش ببوو و گوتبووی باوەك جاران هەر وەك برایەکی بێتەوە ماڵێ و لەوێ خزمەتێ بکا. بەڵام سیامەند هەر لەوێ رۆژێوە ونبوو و ئیدی شوێنەوارێکی نەما- دەنگ وابوو کە چۆتە عێراقێ...



کەم کەمە قسەیەکی دی کەوتە سەرزاران: مستەفاخان تەلاخانمی کوشتووە! مستەفاخانیان بانگکرد. هات. دەرکەوت کە تەلاخانم بۆ تەبدیل هەواو چارەسەرییە نەخۆشییە و سەردانێ شەخسێکی پیرۆز ناردوویەتییە ماڵێ داك برایەکەی لە عێراقێ. هەموو نیشانەکان راستییە ئەو قسەیەیان دەسەلماند. هەمدیس هێندێکی دییان لێ کێشایەوە و بەرهەڵدایان کردەوە...

زستان هات، و دایکوتا؛ نەدەڕۆیی و نەدەڕۆیی، هەروەك قەت نەڕوا وابوو. گرانی بوو؛ خەڵکی ئازربایجانێ لەبەر نەبوونی و نەداری و بێ نانییە، دەستە دەستە، ژن و منداڵ و پیر و لاو، بەپێخواستی و بەپێیان، رووت و رەجاڵ و بێنەوا بۆ دەرۆزەی دەهاتنە دیوی عێراقێ لەرێیە دەبەین دەچوون، یا نیوەگیان دەگەیشتنە شاری. شاریش دەست کورت بوو بەڵام دەگەڵ ئەو دەست کورتییەی خۆشیدا ئەوەی هەیان بوو دەگەڵیان دەکردنە نیوە. لە مزگەوتان دەنوستن لە ماڵانیشیان دەست پان دەکردەوە و دەرۆزەیان دەکرد. سەرەنجام دەوڵەت ((کۆمیسیۆن))ێکی نارد. ژن و منداڵ رۆژێ چەند سەعاتێکیان بەڕیز لەبەر دەرکێ پەخشداری رادەوەستان بە تەمای ئەوەی کە دەوڵەت هیمەتێکی بکات و نان و جلوبەرگێکیان داتێ. سەرەنجام، گا گووی کرد و مەنجەڵی پیاوەتییە دەوڵەتی وەجۆش هات و کۆمیسیۆن بڕیارێکی تایبەتیدا کە هەر نەفەرێك سەر و یەك تمەنی ئەو سککە بەنرخەی کیشوەری شاهەنشایی بدرێتی! ((دەك خودا بیبڕێ دەگەڵ خۆی و یارمەتییەی! دەك خودا بیبڕێ ئەو دەوڵەتەی!)). ئەمە نزاو پاڕانەوەی خەڵکی ناوچەکە بوو.

هەموو جێیەك سۆز و سەرما و سۆڵە بوو و نەتدەتوانی سەیری روخساری ئەو پیرێژن و ژن و پیاو و منداڵە بەستەزمانانە کەی و لەتاوان لەرزت نەیەتێ... ئەوە دەو نێوەشدا چاپەمەنی حیزبی هەروا دێت. جیهان بە چوار ناڵەکی بەرەو پێش دەچوو و ئێمەش بەوەمان دڵخۆشییە خۆمان دەدایەوە کە نەوتی رۆمانیا هێندەی نەماوە سەر وەدەرنێ و پۆڵەنداش پیشەسازی خۆی دەستپێکردووە و هاوڕێ زێنەبی میر عەلی شێرۆییف، لە کۆڵخۆزی ژدانێڤی کۆماری خەڵکی ئۆزبێگستان، دووجار بۆتە قارەمانی لۆکە چنینەوێ و ئەوە ئێستا خۆی بۆ جاری سێهەم ئامادە دەکات. خەڵکی بێنەوا لە برسان و لەسەرمان هەڵدەلەرزن و پۆل پۆل دەمرن و تادێ هەر زیاد دەکەن. کەچی بەداخەوە حیزب چاوی نابینێ تا ئەوانە تۆمار کات و دە چاپەمەنییەکانیدا بیانخاتەڕوو. بەڵام ئێمە- من و حیزب. بەسەرهاتی مە هەر راست وەك ئەوینی کچ و کوڕێکییە کە هەردووکیان ئاشکراو بەڕوونی دەزانن کە یەکتریان خۆشدەوێ و دە دنیای راز و نهێنیاندا هیچ شتێکیان لێك شاراوە نییە: خەڵك و خواش دەزانن: دڵدار دەزانێ و زۆرجاران بەکەمترین جووڵەیەك و پێك گەیشتن و وێك کەوتنێکی هەڵدەچێ و

سادەترین وتەیەك دایدە خورپێنیێ؛ دڵدادەش وەك هەموو کاتێك هەر پەرێشان و ئاڵۆزە؛ هەر لە هەوەڵێوە وابووە، ئێستا زیاتریش، پەسەندییە ئەو سەرسامی و سەرسوڕمانەش بوونی دڵدارەکە، کە هەروا بەردەوام نازو نوزان دەکات و تەزووی پێدادێ. بەڵام- بەڵام هەر کە داوای شتێکی لێکرا ئیدی ئەوە کچە وەك هەمیشە خۆی گێل دەکات و چاوەکانی بێر و بەوێدا تێك بادەدا و بەنازەوە گەردەنێ دەسووڕێنێ و تەنانەت رەنگێکیش دێنێ و رەنگێکیش دەبا و بێ ئەوەی تەماشای وی کا بە ترس و لەرزێکی زۆرەوە دەڵێ: ((وەی، ئاگام لە خۆم نەبوو، فرسەتت لێدیتم!)) لە حاڵێکیشدا هەر کەمێ پێشتر بە نەرمە گوشینێکی تۆزێك زیادەوە خۆی شل کردووە- چاکیشی خۆ شل کردووە. ئەمجارەیان نۆرەی کوڕەیە رەنگێکی بێنێ و یەکێ بەرێ و دەستەوەستان بێ. ئەوە چۆن ئەو هەموو ماوەیە نەیتوانی بەرامبەرەکەی تێگەینێ؟ ئاخر خۆ، بەخۆوە گوشینی تەنانەت لە ئەندازە بەدەریش باوبوو... تەنانەت جارجارە ماچی سەرپێیشی بەدوادا هاتووە- یانی ئێستاش هەر نەیزانیوە و ئاگای هەرلێنەبووە! ئێستا حیزب ببووە ئەو کچە خاتوونە. هەر کە من ویستم ئەوین و دڵدارییە خۆمی بۆ ئاشکرا کەم ئەو هاواری ((وەی)) کچێنییەی لێ هەستا و رەنگی هێنا و برد... ئاگای لە هیچ نەبوو و هیچی هەر نەدەزانی!...

بەهەرحاڵ، بڕیار بوو کە ئەگەر باشبم، موئەدەب بم، دەگەڵ خراپان هەڵس و کەوت نەکەم، گوێ رایەڵ بم و خولی تاقیکردنەوە بەنمرەیەکی باشەوە ببڕم، بە فەرمی مارەبڕیە بکەین. بۆیە چوومەوە تا چاك بم و موئەدەب بم و گوێ رایەڵ بم- و هەموو شتێك- و شەونامە لێدان لەجێی دیاریکراو و بەهیچ کەس و هیچ شتێکیشەوە نەلکێم... بناغەی کار حیزبە، ئەوەی دی هیچ- ماڵ، خاو و خێزان... بۆچوونە ناو حیزبیش ((بڕوانامەی دایك و باب))انی وەرگرتبوو: هەموویان لە خوو و رەوشت و کردار و رەفتاری ((فرزەند))یەی رازی بوون، شایستەیی تەواو هەبوو، تەنانەت لە روویەکەوە نەبێ کە ئەویش کەم روویی و شەرمێونی بوو؛ کە ئەویش گفتی شەرەفی دابوو نەیهێڵێ و جێ پەسەندی تەواوی وان بێ. دەو حاڵەیدا کە ((ئەو)) خەریکی نەهێشتنی ئەو کەمایەسییە بوو رووداوێکی دیکە شارۆچکەکەی هەژاندین: شەو درەنگانێك دەنگی گوللەیەك هەمووانی لە خەوێ راپەڕاند. هاوین هاتبۆوە خەڵکی لەسەربانان دەنوستن. هەموو لەجێی هاتنەدەرێ و رژانە کۆڵانێ: ئەوانەی کە بەدەنگی تەقەکەی هەستابوونەوە، ئەوانەیان هەستاندن کە وەئاگا نەهاتبوون. شار پڕ بوو لە ژاوە ژاو. یەکێك چووبوو کوڕە گەورەکەی قازی لە باوەشێ ژن و منداڵەکانیدا لەسەربانی، کوشتبوو و بۆی دەرچووبوو! گوللەکەی لە تەختی سینگی دابوو و بە پەیژەیدا هاتبووە خوارێ و غەیب ببوو. کێ بوو- کەس



نەیدەزانی؛ چوو بووە کوێ؟ -خوا دەیزانی. بۆکێ چوو بوو؟ -خۆی داپێچا بوو؛ بالا مام ناوەندی بووە... سێ کەس بوون. دوویان لە خوارێ ئێشکیان گرتووە- ئەوەی کە چۆتە سەرێ بە مستەفاخانی چووە! سوبحانەڵلا! جا مستەفاخان بۆ؟ - چونکە رکی لە کوڕی قازی بوو و لێوی لێ دەکرۆشت: دەو دەمەیدا کە مستەفاخان خەریك بوو بە هەرچی واسیتەیەکە تەلا خانمێ بێنێتەوە سەر رێیە و هێندەشی نامێنێ کارەکەی بە ئەنجام بگەیەنێ، کوڕی قازی لێ راست دەبێتەوە و بەوی و بە تەلا خانمێ دەڵێ کە بە شەرعی خودا و پێغەمبەران، چونکە کچە بالقە و تەواوە رەوایە هەر کەسێکی بۆ خۆی بیەوێ خۆی دە قەبەڵ کا و مێردی پێبکا. ئەوەش هەیە کە سوننەتە پرسی دایك و بابانیش بکرێت و رایان لەسەر بێت، ئەویش هەر بۆ پرسێ. ئەگەر رەزامەندییان دا ئەوە باشتر... دەوبێنە و بەرەو گفتوگۆیانەشدا کە ژن و ژاڵی خێزانی خۆیان تەنانەت دایکیشی رێی نەبوو بەشێوەیەکی تایبەتی بچێتە لای و شەرمی بشکێنێ و دڵی بداتەوە؛ کارێکی وایکردبوو هەمیشە یەك دوو کەسی خۆیانی هەر لەکن بێ، هەروەك بڕیاری تەواوی دابێ بۆ لووت شکانێ مستەفاخانی هەردەبێ مێردی بەو نۆکەرەی بکات و ئابڕووی ئەو بنەماڵەیەی ببات. هەربۆیە پێدەچێ لە مستەفاخانی بەولاوە کەسی دیکە نەبووبێ...!.

دیتن و بیستنێ پوور ئامین و پوور ئامانێش هەر ئەو بۆچوونەیان وەراست دەگێڕا. پوورامین بۆ پوورامانێی گێڕابۆوە کە شەوێ کاتێ ئاغازادە- کوڕی قازی- دەچێتە سەربانی لامپایەکە هەر لەخۆوە کەوتووە و ئاغا زادەش بۆ ئەوەی بەڕەکە ئاگری نەگرێ پێی لە فتیلەی لامپاکە خشاندووە تابیکوژێنێتەوە، بەڵام نەك هەر نەکوژاوەتەوە بەڵکە بە گوێزی سەرە لامپایەکەوە سوڕێکی داوە و بە قودرەتێ خودای دوو هەنگاو بەولاوە ترەوە وەك بۆقێ بازێکی داوە و چۆتە سەرپشتی هەردوو پێیەکانی: هەر ئێوارەی ئەو شەوەش کە لە کانییەڕا، گۆزە بەشانەوە، هاتۆتەوە ماڵێ سەلامی لە کوڕی قازی- کردووە، بەڵام کوڕی قازی هەروەك بە ئادەمیشی دانەنێ، وەڵامی سەلامەکەی نەداوەتەوە و هەر دەگەڵە خۆی گوتووە، هەروەك دەمێشکی خۆیدا دەگەڵ یەکێکی دیکەی، یەك و دوو بێت! و کاتێکیش ویستوویەتی بچێتە سەربانی- یانی کوڕی قازی- بە قودرەتێ خودای، بزنێکی رەش کە جاران دەتگوت جیوەی تێکراوە و یەك دەقیقەش نەدەسرەوت و دانەدەساتا ئەوێ شەوێ بەقودرەتێ خودای دەچێ لەسەر پلیکانەکان وەردەکەوێ و وەك بەرازی دەغەزرێ، کوڕی قازی هەرچییەکی دەکا و دەکرێنێ و نووکە شەقانی دە پشتی دەکوتێ و ((یخە یخە))ی لێدەکا لەجێی خۆی ناجووڵێ! پوورامان چەند قونچکە جگەرەیەکیش لەبەردەمی ماڵێ قازی دەبینێتەوە کە قونچکە جگەرەی کوردی نەبوون و لەوانەی مستەفاخانی بوون کە جگەرەی عێراقین دەیانکێشێ. جگە لەوەش ئەو قونچکانە، قونچك

نەبوون، دیاربوو ئەوەی کێشاونی خانەدان بووە چونکە نیوە جگەرە زیاتر بوون. بەڵێ، هەموو گەواهی و بۆچوون و جرت و فرتەکان دەستیان دەدەستی یەك نا و مەقاماتیان هاندا دەست پێشخەرییە بکات و هەنگاو هەڵێنێ... لە دووی مستەفاخانیان نارد.

ژاندارمەری دەستووری وەرگرت بە کەلەپچەکراوی بیهێننە شاری، هەرنەبێ لەبەر دڵی قازی، کە سوێندی گەورەی خواردبوو ئەگەر بێت و کەمترین کەمتەرخەمییەکی دەسزادانێ تاوانباریدا ببینێ روو لە فەلەستینێ کا- هەر بۆ سەرنەوییە پاشای ئیسلامیێ!.

پۆلیس لە پاسگای وەدەرکەوتن و چوون مستەفاخانیان هێنایە پاسگای. بەڵام رەییسی پاسگای بەچاکی نەزانی کە بەکەلەپچەکراوی بەنێو دێیدا و بە بەردەمی ئەو هەموو ئامۆزا و بن ئامۆزایانەیدا بەرن، بڕیاریدا هەر بۆخۆی و بەبێ چەك بیهێنێتە شاری، خۆ ئەگەر پێویستیشی کرد ئەوە لەدەم چۆمی کەلەپچەی کات و دەگەڵ رۆژئاوایەیدا کە سەرجادە چۆڵە بیباتە دەفتەری گرووبانی و لەوێی تەسلیم کات- تا نەشیش بسووتێ و نەکەباب. بەڵام هەر بۆ خۆپارێزییە نارنجۆکێکی دەگیرفانێ نا، تا ئەگەر دنیایە بیری هەڵاتنێشی بەمێشکیدا هات بەو نارنجۆکەی پێشی لێبگرێ... بەهەرحاڵ، مستەفاخان بەو خەیاڵەی کە بەرامبەرەکەی چەکدار نییە هەڵات ئیستیوار تێیڕا خوڕی و هۆشیاری دایە بەڵام ئەو گوێی نەدایە ئەو قسانە، ئیستیوار زامنی نارنجۆکێی راکێشا و هەڵیدا و بێ ئەوەی بیر لە سەرەنجامی کارەکەی بکاتەوە بەرەو پاسگایە هەڵاتەوە. مستەفاخانیش کە پێی نەختێك بریندارببوو ئەویش هەڵات ماوەی هەفتێکی لەناو خزمان لەو دێی بۆ ئەو دێی گوزەراند. دوای ماوەیەکی قولاغی لە عێراقێ پەیدابۆوە.

گوتیان قاچێکی کەمێك شەلینی لێپەیدا بووە و هەر لەو دەمیەوە بووە مستەفاخانە شەلە... دەنگۆی کوشتنێ تەلاخانمێ لە نوێ داکەوتەوە. ساڵێکی رەبەق بوو ئاسەواری نەبوو، ئێستاکە مستەفاخان رۆیبوو، خزم و کەسوکار بەزمانی چاو و برۆ و دەمولێو بادان و سەرنجی بێدەنگ و مانادار و تەنانەت بە ئاشکراش دەیانگوت کە بەڵێ، کوژراوە؛ هەردەبوو بکوژرێ- هەقی خۆی بوو. کاتێ ئەم دەنگۆیە وەڕاست گەڕا، دایکم وەك هەر دایکێکی دی قلْپ بۆوە: ((خودا رەحمێ بەدڵی دایکە بێنەوایەکەی کا!)) و ئەو هەورەی کە دەمێك دڵی دەخۆیەوە پێچابوو هاتەوە سەر دەموچاوی و چەند دڵۆپە فرمێسکێکی دیکەی بەیادی دایکێکی بێنەوای دییەوە کە دووچاری هەمان حاڵی وی بووە هەڵوەراندن. بەڵام بەداخەوە کە بابەگیان جگە لەوەی کە هەر نارەحەتیش نەبوو خۆشحاڵیش بوو،



منیش هەروەتر، راستییەکەی هیچ دڵگیر نەبووم، هەرچەندە ئەو کارانەشم پێخۆش نییە و سڵیان لێدەکەمەوە- دەیانگوت گۆشا و گۆشی سەربڕیوە! ئەڵبەتە ئەوەم بەزمانی پێناخۆشبوونێ رادەگەیاند و هەر بەراستیش ناخۆش بوو، بەڵام ئەو کاریگەرییەی کە دەبوو هەیبێ من هەستم پێنەدەکرد.

بابەگیان پێیوابوو کە بنیادەمی هەموو جێیەکی وەك یەك وان- یانی کە جیاوازی کچە پینەدۆز و خانەدانێکی نییە... بەڵێ، دەبێ دیاردە هەر لە ژینگەی خۆی و پەیوەندییەکانی دەگەڵ هەموو دیاردەکانی دیکەی ژینگەدا رەبەرچاو بگیرێ)). رەنگە مستەفاخانیش گوناهێکی نەبێ، ئەویش بۆخۆی فەلسەفەیەکی هەبوو، کە فەلسەفەی ژینگە و دەوروبەربوو ئەویش هەر دەستکاری نێو ژینگەی خۆی بوو. دیارە واچاکتر بوو کە کارەکە رێچکەی سروشتی وەرگرتبایە و هەردوو دڵدار پێك گەیشتبان و ئەویش بە پشتیوانییە ئەو فەلسەفە هاوردە دەرەکییە خۆی بنواندبایە و خۆی تەقلیدی ئەو فەلسەفەیە کردبایە، ئەگەر باوەڕی پێیەتی. بەڵام دە ژینگە و دەوروبەرێکی وادا، ئەو چاوەڕوانیانە لەو جۆرە فەلسەفە هاوردانە ناکرێ. ئەدی ئەو هەموو هەستی خانەدانی و قەوم و تیرە و تایەفەییە چ لێبکا؟ ئەدی چ لە رابردووی بنەماڵەی بکا؟... بەهەرحاڵ ژیان و پێشینەی ژیانی رابردوو گەلێك پابەندبوونی بۆ هێنایە کایەوە- بێگومان ئەگەر ئەو چاوەڕوانی و بۆچوونانە نەبن. بەگفتی یەك لە نوسەران ئەگەر رابردوو ئێمە ژێربار نەکات، ئەدی ئەودەمی ئەرك مانای چی؟ ئەودەمی هەر کەسە و بەپێی ئارەزووەکانی خۆی دەجولێتەوە و کار دەکات- کە ئەوەش ژیان لەبەریەك دەبات و هەڵیدەتەکێنێ. ئەودەمی، ئەو هەموو پابەندی و چاوەڕوانی و بۆچوونانە بە ناچاری دەگەڵ رووداوەکاندا لێك دەدەن و ئەودەمی دەبێ یەکێك ئەویدی بهاڕێ: هەروەك هەمیشە، کە هەست و نەستەکان دەگەڵ واقیعدا پێکدادێن؛ یا دەبێ هەستەکان دەواقیعیەتێکی بەهێز و بەتواناتردا دەرکەون و ئەو واقیعیەتییەی بشکێنن، یا واقیعیەتەکە هەستەکان ملکەچ کات و نەیەڵێ دەرکەون و خۆ بنوێنن. ئەگەر ئەمانە نەمان ئەودەمی زەردەخەنە و سوور هەڵگەڕان و شێواوی و پەشۆکاوییەك بەسە تا دوو دڵ بگەنە یەك و پێك شاد بن. کارەکەی وی- ئی مستەفاخانی- نیازێك بوو، کاری خوشکەکەشی نیازێکی دی: نیاز و مەبەستی خوشکەکە ئازادی بوو، ئازادی لە هەڵبژاردنێ هاوسەری نیازی ویش هەر ئازادی بوو، ئازادی لە قسە و جنێو و سەرزەنشتی قەوم و خوێشان، ئازادی لەو لەکەی نەنگی و شوورەییەی کە لە دایکبووی سوننەت و پێشینان و سڕکەری سوننەتەکان بوو.

هەرچی بێ، بەڕاستی رۆیوە و کۆمەڵێکی لەخۆوە خڕکردوونەوە و یاغی بووە- بۆتە دار دەستی خاوەن زەوییان: هەر هێندە بەسە فلاڵن ئامۆزا یا بن ئامۆزا وەڵام بدات کە فلاڵنە کرمانجە بێ ئەدەبی لەڕوودا

کردووە یا داهات و بەراتی دەدەم و کاتی خۆیدا نەداوەتیێ! تەنانەت بیستمەوە کە ماڵە کرمانجێکیان ئاگر تێبەرداوە و ماڵ و بووك و ئاژەڵیان یەك دەرنەچووە و هەموویان سوتاون... بەقسەی سلێماناغای ئەوانە هەمووی هەڵەی پیت و فەڕی ئازادییەن. بەلانی کەمەوە زیانی ئەم ((ئازادیخوازی))یە ئەوەبوو کە بۆ ئیدی زیانبەخش بوو. ئەگەر ئەویە کە ئەو کچۆڵە بێگوناهەی ((هەڵنەدابایە)) و بەو قسە پڕ و پووچانە ئەو کوڕ و کچەیان لە خشتە نەبردبانایە ئەو ئاریشە و بەسەرهاتانە روویان نەدەدا و نەدەقەومان. کچەی بێچارە گوناهی چییە پێیوابوو ئەگەر ئەو ئازادییە شتێکی پێنەکرێ ئاغا وای رانەدەگەیاند و ئاوای بانگەشە بۆنەدەکرد چ پێویست بەوە بوو؟ ئیدی نەیدەزانی کە ئەو ئازادییە بۆ وی و بۆچینی وان نییە و ئاکامەکەی ئاوای لێدێ- هەرچەندە بۆ تاك و تەرا و یەك دوو هاوڕێیەك و تەنانەت سەد کەسانێکیش ئاریشەیەك نەبێت...

ئەمانە ئەو دەیگوتن و من دەمەویست تێبگەم و بزانم و شتێکی لێ هەڵکرێنم، تا ئەندازەیەکیش کەوتبوومە سەر رێی تێگەیشتنێ. بەلاّم کە ئەو و ئەوانەی وەك وی لایەنی راستییان دەگرت بێ ئیختیار بەرگریەك دەناخی مندا پەیدا دەبوو کە هەزار و یەك بەڵگەی بەکلکێوە بوو، بۆ ئەوەی هەرچی ئەو و ئەوانی وەك وی دەیانگوت بەر پەرچ بدەینەوەو رەتکرێنەوە.

* * *



(٣٠)

چەند ساڵێکە نەچوومەتەوە شارەکەی خۆمان، هیچ هەواڵێکیشی نازانم. ئێستا لە جیاتیان ژنم هێناوە و لە شەقامی ئەمیرییە دەژیم.

لە دایەرەی دەهاتمەوە: هەروا لەخۆوە گوێم لە خوڕە خوڕی جۆگاوێك زرنگایەوە کە بە تەوژم تێدەپەڕی و قوڕ و لیتە و چیلکە و چەوێڵ و قوتووی بەتاڵ و گەسکەشکاو توێکڵە کاڵەك و شووتی دەگەڵە خۆیدا رادەماڵی و دەڕۆیشت. بیرم دەکردەوە خوڕە خوڕی ئاوەکە بڕابوو و من ئاگام لێنەمابوو. ئوتومبێلێك بە خێرایی تێپەڕی. هەرچی قوڕ و چلپاو بوو بەسەر و ڕوو و جلەکانیدا پژاندم لەو شارە چکۆڵەی خۆمانەوە هاتمەوە سەر شەقامەکەی پێیدا دەڕۆیشتم: هێندێك توێکڵە کاڵەك و شووتی بەری ئاوەکەیان گرتبوو و جۆگەلەکە راوەستابوو. ماوەیەك هەروا دە پشتی ئوتومبێلەکەمەوە هەڵڕوانی و هەرچی ناگوترێ حەواڵەی سندوقەکەی دواوەیم کرد، هەروەك کەسێکی پایسکل یا مۆتۆر سوارێك بەدەم رۆینێوە جنێو و قسەی ناسکی پێدابێ و تێی تەقاندبێ و ئەویش کە دوورا و دوور دەستی نایگاتێ و لە داخان خەریکە شەق بەرێ کە نەیتوانیوە جنێو و قسە ناسکەکانی پێ بلێتەوە کەوتۆتە کاوینەوەی جنێوان. سەیرێکی شاقەلی پانتۆڵ و چاکەتەکەمم کردبێ ئیختیار قاچم داتەکاند و بەدەم پێکەنینەوە پاشماوەی ئەو جنێوانەی مابوونەوە بیاندەم لەبەر پێی خۆمم تفاندنەوە. شاگرد نانەوایەکەی کە لەبەردەمی دوکانێ خۆی وێك هێنا بۆوە گەوزێکی داو هێندێ شتی هەتەر مەتەری گوتن- بە روویەکی ترش و تاڵەوە و بە خێرایی هاتەوە نێو دنیایەکەی خۆیەوە، هەروەك یەکێك دە خەوێدا قۆڵی راکێشابێ و هەڵیستاندبێ. بەرەو لای سەوزە فرۆشەکەی نزیکمانەوە چووم و شەپکە دارێکم لێوەرگرت، و دەبن هەنگڵێم نا و چووم هەرچی ئەو زبڵ و زاڵەیە هەمووم لادا... تا من راست بوومەوە جۆگەکە دەستی بەسروودەکەی خۆی کردبۆوە. ماوەیەك هەروا بەدوای ئاوەکە و تێکەوەگلانی زبڵ و زاڵ و لادانی ئەو پەلك و پاڵە ورد و درشتانەوە بووم، هەر راست وەك ئەو کاتەی کە دەگوندیدا بەلای پردەکەوە راوەستابووم. ئەوجا گەڕامەوە و چووم شەپکە دارەکەم بدەمەوە سەوزە فرۆشی.

((سەلاّو!...)).

((سە-لاو!...)) لەجێی خۆم وشك بووم. ((...چۆنت ماڵێ مە دیتەوە!؟)) و ئەوجا ماچ و مووچ، و سەرسوڕمان و واق وڕمان: ((چۆنت ماڵێ مە دیتەوە!؟)).

((لە کوێم دیوەتەوە. ئێستاش هەر پێی نازانم... ڕێکەوتێکی سەیرە! خۆزگە هەموو دەمێ ئاوا مەخسودم حاسڵ دەبوو- هەروا تاوێکە دەبیر و خەیاڵی ئێوەدا بووم... سوبحانەڵلا!)).

ئەوە حوسێن بوو، کوڕی مامە مەشەدی- مەشەدی ئەکبەراغا. ڕاوەستا بوو و سەیری دەکردم، گومانی هەبوو داخوا ئەوە من بووم یا یەکی دی. کە سەرم بڵندکرد، هەروا ڕاوەستابوو و بەسەرسامییەوە سەیری دەکردم.

((باشە، دەی، نەتگوت، چۆنت ئەو ڕێیە هەڵە کردووە؟ کەی هاتووی؟)).

دیاربوو بەکاروباری حیزبییەوە هاتبووە تارانێ و وێنەی گرتبوو و ئێستاش هاتبووە لای وێنەگرەکە وێنەکەی وەرگرێتەوە: ماڵەکەی مەش بەسەر دوکانی وێنە گرەکەیەوە بوو، سەری چوار ڕیانی گومرگێ.

((ڕێکەوتێکی سەیرە! ئەوەی بیرم لێ نەدەکردەوە و بە خەیاڵمدا نەدەهات- ڕێکەوت بەدوای ڕێکەوتدا!)).

((ئەمنیش هەروا تاوێك لەمەوپێش لەولای بووم. دە خەیاڵی ئێوەدا بووم، تووشی تۆ بووم... دیارە هەردووکمان دڵمان پاکە!)) و پێکەنین.

کەوتینە قسان، نە من لە بابەم پرسی و نە ئەویش بەلایدا چوو و هیچی گوت. بەگرژیم هاتە بەرچاوی... بەلاّم هەموو بەو گەرمایەی وەزاڵە هاتبوون...

گوتی: ((یەك دەقیقە ڕاوەستە تا وێنەکان لای ئەو وێنەگرەی بێنمەوە، ئەگەر لەوێش بێ- هەر ئێستا دێمەوە...)).

گوتم: ((کەواتە ڕێیەکەمان یەکە، ماڵێ مەش لەسەر دوکانێ وێنەگرەکەیە. نیوەڕۆژێش پێکەوە دەخۆین، با ماڵەکەش پێ بزانی و دەگەڵ خێزانیشم یەکتر دەناسن)).

حوسێن ئەو پێشنیارەی زۆر بەلاوە خۆش نەبوو. دیاربوو کە کاری ((حیزبی)) هەیە، کە بەلای ئەو جۆرە خاوەن باوەڕانەوە قسەی حیزب ئیلهامی خوایە و سەروبنی کارەکەش هەر ئەوەندە بوو چەند پارچە کاغەزێکان بێنێ و بۆ ڕێپێوانی سبەینێ دروشمانی لەسەر بنووسێ.



گوتم: ((ئەوە ئاسانە: قەڵەمی نووك پانم هەیە، چەند پەڕە کاغەزێکان و کەمێك کە تیرەش لەو دوکاندارەی تەنیشتمانەوە دەکڕین و هەردووکمان پێکەوە دادەنیشین و بەنیو سەعاتی تەواوی دەکەین، بەدەم نوسینێشەوە قسەی خۆشمان دەکەین- ئاخر ئەوە ماوەیەکە یەکتریمان نەدیوە)).

زۆرم حەز دەکرد هەواڵ و دەنگوباسی وڵاتی بزانم و لەلا بەلای ویشەوە سووسەیەکی لەبابەیەوە بزانم، هەرچەندە واشم پێشان دەدا کە بەیەکجاری لێی دابڕاوم، ئەو دڵ ئێشانەشم بەمل ((دەرەبەگایەتی))یەدا دێنا. بەلاّم، باشە تەبیعەت دەرمانی نییە- بەتاسەوە بووم. بەهەر چۆنێك بوو پێم لێداگرت و بردمەوە- و دانیشتین- هەر کە نانەکەمان خوارد بۆ ئەوەی دڵنیای کەمەوە چەند پارچە کاغەز و مقەببایەکم هێنا و دەگەڵ خێزانەکەمدا بڕیمانن و کاغەزەکانمان بە کە تیرەی لەمقەببای دان و لەبەر هەتاوێم دانان تا وشك ببنەوە، دروشمیش هەمان دروشمە دەستوورییەکان بوون: ((ئەرلینگۆ بەرلینگۆی ئازاد کەن!))(١) لە کاتێکدا ئەوەی کە داوای بەردان و ئازاد کردنیمان دەکرد نەماندەزانی کێیە و چ کارەیە و خەڵکی کوێیە و بۆ گیراوە و بۆ دەبێ لەنێو ئەو هەموو گیراوانەی دنیایەدا هەر ئەو ئازاد کرێ و ئیدی نا. ئەڵبەتە وامان خۆ پێشان نەدەدا کە نازانین، حەزیشمان لە پرسینێ نەبوو، پرسین مانای دواکەوتن بوو لە کاروانێ، لەکاتێکدا کە ئێمە پێشڕەو و سەرقافڵەچی کاروانێ بووین حوسێن ئێستا زۆر کارابوو ((کادیر)) بوو و هەر بەو کادیر بوونەشیەوە لووتی دە هەموو شتێکیەوە و دەمی دەقسانەوە وەردەدا، هەرچەندە لە حاندی من هەروەك جاران بوو، بەلاّم دەگەڵ ئەمانەشدا ناراستەوخۆ پرسیارەکەی هێنایە گۆڕێ:

((هاوڕێ، ئێوە بە درێژی هیچ دەربارەی ژیان و تێکۆشانی ئەرلینگۆ بەرلینگۆ دەزانن؟ من لە چ جێیانم نەخوێندۆتەوە؛ کتێبێك، سیپارەیەك لەم بارەیەوە دەست دەکەوێ؟)).

گوتم: ((نەء ئەمنیش لە چ جێیانم نەدیوە. ئەمنیش زۆرم پێخۆش بوو بزانم... هەروەك یەکێك لە هاوڕێیان دەیگوت گوایە لە هاوڕێیانی ئەسپانیایە، گوایە سەرۆکی پارتیزانەکان بووە و بەم دواییانە گیراوە و دەیانەوێ لە سێدارەی دەن- خۆ ((پارتیزانەکانی لوانت))ت خوێندۆتەوە؟)).

گوتی: ((جا ئێستا جیاوازی چییە... بزانین یا نەزانین، هەرچی هەبێ، ئیدی ئەوە گیانی هاوڕێیەکە و دەخەتەردایە، ئیدی هیچ پێویست ناکا هەر بیشیناسین)).

(١) ئەنریکۆ برلینگوێر: ڕابەری لە دەست چووی حیزبی کۆمۆنیستی ئیتالیا.

حوسێن بەوەی قایل بوو، بەلاّم نەمن و نە ئەو هیچ کامێکمان لە خۆمانمان نەپرسی- رەنگە هیچ هاورێیەکی دیش هەر لەخۆی نەپرسیبێ- کە هەیاران بۆ ئەو هەموو زیندانییانەی خۆمان هاورێ نین و بۆ ئەدی ئەوانیش ژیانیان دە خەتەردا نەبوو، بۆ ئەوانیش ماڵ و منداڵ و خێزانیان نەبوو کە هەردەبوو تەنیا بۆ هاورێ ((ئەرلینگۆ بەرلینگۆ)) دروشمان بنوسین و خۆپێشاندان و رێپێوانێ بکەین؟ لەولاوە زۆر خێزان نانی شەوێیان نەبوو کەچی هەر تەنیا رێپێوان و خۆپێشاندانێکی سی هەزار کەسی- کە جاری واشبوو دەبووە سەد هەزار کەسی- کە دەبووایە هەرکەسەی یەك تمەنی بۆ دروشم نوسین و کاغەز و پلاکارتان بدات. لەوانەشە پرسیاری ئەمە کرابێ، یا رەنگە زۆری دیکانەی وەك من و حوسێنی بێ قسە و گفتوگۆ و هەروا لەخۆوە گەیشتبنە ئەو سەرەنجامەی کە ((یەك گرتنی کرێکارانی جیهان)) وا پێویست بکات کە ((ئەرلینگۆ بەرلینگۆ)) لە هاورێ سەمەد عەلی داداش ئوغلیزادەی مەرەندی لەپێشتر بێ. چونکە لەوانەیە ناوی هاورێ ((ئەرلینگۆ بەرلینگۆ)) بۆ دروشمدانێ لەسەر زمانان خۆشتر بێت بۆیە ئەویان کردۆتە سەردەستە و نوماینده و هەڵبژاردەی تێکرای هەر هەموو زیندانییەکان؛ ((ئەرلینگۆ- بەرلینگۆ بەرەڵلا کەن!)) هەوە، کێش و سەرواداره، کەچی ناوی ((سەمەد- عەلی- داداش- ئۆغڵی...)) دەگەڵ هیچ بڕگەیەکیدا نایەتەوە و دەزاراندا وەرناسورێ، لەسەرزاریش خۆش نییە، جا کەواتە با هەر دە زیندانێدا بێ چاکترە. دەتۆ وەرە و توبی و ئەو خودایەی سەیری ناوەکە کە... سەمەد عەلی! دەگەڵ ناوی بنەماڵەی: داداش ئۆغڵی زادەی مەرەندی! توخودا ئەوەش بووە ناو، نە بەڕێکی بڕگە دەکرێ، نە لەسەرزاری خۆش دێت، نە بەگوێیان خۆشە! جا تۆ هەر زار و زمانت بادە و وەك ئوستاد دەیهەمی دەستت راوەشێنە، تا سەروایەکەی رێك خەی... کەچی هەر رێك نایەتەوە...

نێوە رۆژەمان خوارد و دەستمان بە قسەو باسان کردن: لەبارەی نەوت و موسەددیق و دەربارەی ئەوەی کە موسەددیق سەر بە ئەمەریکایە و کەچی ئەمەریکا هەر گوێشی ناداتێ و پشتی تێدەکات و دەربارەی رێککەوتنی نێوان ئەو و دەربار، کە حیزب زۆر چاکی ئەوە دەزانی و دەربارەی یەکیەتی شۆرەوی و شۆڕش زۆر دواین. کاریکاتێرێك کە وێنەی موسەددیقی بە خۆو دار عەسایەکەوە وەك سواڵکەران لەسەر پلیکانەکانی بەر دەرگای کۆشکی سپی خۆی بەسەر دار عەسایەکەیدا دابوو، پێشان دەدا، زۆر شت و زۆر لایەنمان تاو توکردن- زۆریش پێکەنین- راستییەکەشی ((تاکەی هەر چاوەڕوانی)) پیاوی چاك، رێیەکی بۆ خۆت وەبینە- تاکەی؟ دەکاتێکیدا کە دڵنیابووین کە هەرگیزا و هەرگیز نایەتەوە سەر رێیە- ئەو ئەشرافزادانەی تا شەوانە چەند کچۆڵەیەکی ناسك و نازدار نەیانشێلن خەویان لێناکەوێ، دەتەوێ چ رێیەکی ببیننەوە و پێیدا بڕۆن؟ ئیدی تازە موسەددیق و سەڵتەنەیە!



من و خێزانم زۆر پێکەنین، بەلاّم وەك ئەوەی حوسێن حەوسەڵە و تاقەتی نەبێ. پرسیم داخوا هیچ تێگیراوییەکی هەیە، گوتی نا هیچ تێگیراوییەکی نەهاتۆتە پێشێ، زۆرم پەلە دەگەڵ کرد و زۆریشم پێ لێداگرت، بێسوود بوو.

گوتی: ((نە بە گیانی ئێوە...)) و بێ هەوا گوتییەوە: ((بەلاّم راستییەکەی پیاو شاخی دەردەکا!)).

((باشە دەی، تۆ لە یەکێکی وەك موسەددیقی، چاوەڕێی چی!)).

گوتی: ((نا، مەسەلەکە موسەددیق نییە- خۆزیا هەموو وەك وی بان...)).

دەدڵی خۆمدا گوتم: ((سەیرە! ئاخری و ئۆخری چۆوە سەر قسەی بابەی... دەمزانی کە قسەکانی بابەی کاری خۆیان هەردەکەن! بەچاو پرسێکەوە سەیرێکیم کرد. غەماوی بوو، نەك تووڕە.

((چۆن؟ ئێستاش بەلای تۆوە موسەددیق هەر بەڕاستی نیشتمانییە!؟)).

((نا، هاورێ، مەسەلەکە موسەددیق نییە، ئیدی ئەو ماڵەکەی دیارە!)).

گوتم: ((ئەدی چی؟ لە دەست هاورێیانی بەرپرست شاخ لێ رواوە؟)).

گوتی: ((نا... ئیدی هەڵە هەردەبن، بەلاّم شاخ دەرکردن نا...)) و لەبنەوەڕا سەیرێکی ژنەکەی کردم.

ژنەکەم تێیگەیی، و هەستا.

گوتم: ((رازیەش بێگانە نییە- ئەویش هاوبیری خۆمانە)).

ژنەکەم گوتی: ((باشە لەوانەیە شتێك هەبێ وا پێویست بکا من نەزانم. منیش هەر هێندێکم ئیش لە ئاشپەزخانەی هەیە)).

حوسێن دەنگی لێوە نەهات و بەو بێدەنگییەشی گومانی ژنەکەمی وەراست گێڕا. کاتێ کە ئەورۆیی.

گوتم: ((دەی باشە؟)).

گوتی: ((وەڵلا چ بڵێم- هەر نەگوتنی چاکترە- لەوەی زیاتر کە پیاوی نارەحەت کا هیچی دیکەی لێ شین نابێتەوە)).

گوتم: ((باشە، دەگەڵ ئەمانەشدا....

گوتی: ((خۆ ئەو ناپیاوەت لەبیرە... ئەو دەیووسەی شارەکەمان؟)).

((جا ئەویٚ ناپیاوی زۆر بوون= کامەیان، ئەبولفەتح خان یا بەواتای بابەی ئاغای سوسماری؟.

ئەمە یەکەمین جاریشم بوو بابەم بەزاریدا بیٚتەوە.

((نا ئەو ناپیاوە گەووادە کە... کەلایی رەجەب)).

((کەلایی رەجەب! ئەوە چۆنە ئەوت وەبیر هاتۆتەوە؟ بیستوومە دەڵێن ئێستا لە تەجریشێی خۆ بە عەردیدا داوە، بەڵام چۆن زۆر لە جاران بەولاوەتر)).

((نا... بەپێچەوانەتەوە بیستووە... یا رەنگە گۆڕبیبیشیەتی- بەڵێ، هیچ دوور نییە، هەردەبێ گۆڕبیبیشیەتی- ئەمەیان بەسوودتر دەزانێ، من ئەوە ئێستا لەلای وییەوە دێمەوە)). و زەردەخەنەیەکی توڕەییانەی بەلێوی داهات.

بەسەرسامییەوە گوتم: ((نا... لە دەروازە قەزوینەوە[٢]! بەڵێ تۆش! —چاومان روون- هەرگیز پێموانەبوو تۆش ئەهلی ئەو کارانە بێت!)) ئەوانەم هەموو بەگاڵتە و بۆ گاڵتەی گوتن.

((خۆزیا وابایە... ئەو پیاوە ئێستا بۆتە گوربەی تۆبەکار. کە هەرگیز ئەوەم بەبیردا نەدەهات وای لێبێ- پیاو لە حەژمەتان شاخی دەردەکا!)) و دوای ئەوەی ئەو تاڵەمووەی سەرنێوچەوانی لە حەژمەتان ویستیان بینە شاخ و بۆیان نەکرا، باسی ئەوەی کرد کە لە نزیك دایەرەی تووتنێ لەسەری شەقامەکەوە. لەبەردەمی موغازەی کۆنە فرۆشان بەگوێرەی بڕیارێك چاوەڕێی یەکێك لە هاوڕێیان بووە؛ دەدەمی چاوەڕوانییەدا بێگومان سەیری دەر و دیوار و موغازەکان دەکا لەپڕ سەر و سەکوتێکی دەبینێ وەك بیناسێ وایە. بەڵام وەك واتەی ئەم سەردەمە بڕوا بەچاوی خۆی ناکا، بەتایبەتی کە تەنکە ریشێکیشی بەرداوەتەوە و کڵاوێکی لەسەری ناوە و لەبن چوارچێوەی ((ئیننا فەتەحنا))یەکدا تەزبیحاتی کردووە و لێوی جوڵاندووە. کە وردبۆتەوە دیویەتی هەڵەی نەکردووە و خۆیەتی؛ دووبارە دوو دڵ بۆتەوە. سەرەنجام قیروسیای لێدەکا و دەچێتە ژووری موغازەکەیەوە، هەروا قەزا و قەدەر ناو و نیشانی ماڵێکی پرسیوە و شاگردەکە تۆزێك رادەمێنێ و سەرەنجام لە حاجیاغای پرسیوە و حاجیاغاش بێ ئەوەی زیکر و تەزبیحاتەکەی راگرێ بە بێدەنگ وەڵامی نەرێی نەزانینێ دەداتەوە و ئەویش لە

[٢] دەروازە قەزوین: ناوی ئەو گەڕەکەیە کە لە شاری رەزاییە (ورمێ)دا زۆربەی ژنی لەشفرۆش لەوێ نیشتەجێ بوون و کاری لەشفرۆشییان دەکرد...



شاگردەکە دەپرسێتەوە کە داخوا ئێرە موغازەی حاجی رەجەباغا نییە؟ شاگردەکە دەڵێ بۆ نا، هەر ئەو ئاغایە حاجی رەجەباغا خۆیەتی و دەستی بۆ رادەدێرێ، بەڵام هیچ خانووێکی ئەوتۆی وا دەو کۆڵانەیدا نییە- حاجی رەجەباغاش هەر بەو سەروچاوە پان و پۆڕ و هەڵ پنماوە و دووکەڵی تریاك لێدراوەی و بەو چاوە نامەردانەیەوە قسەی شاگردەکەی تەئیید دەکاتەوە، حوسێن وەڕەز دەبێ و تاك تاکەی هەموو نیشانەکان یەك بەیەك دەڵێ و حاجیاغا تووڕە دەبێ و بەدەم لاحەولەوەلاوە بەسەرسامی و تووڕەیی و گرێی نێوچەوانییەوە گوتوویە: ((فەرموو ئاغا- فەرموو- خوا بتداتێ!)) و بانگی کردووە ((هۆی کوڕە)) و حوسێنی بەو روخسارە گوناهو چاوە شەرمێون و سلاٌنەوە، لە موغازەی وەدەرنا!.

گوتم: ((هەر باشە، چاك نییە لە کەناری شارییەوەی خۆ بە عەردیدا داوە و بەرەی لێ راخستووە. دیارە هێشتاش هەر لە بازنەی بەکێشکردنی جارانەوە دوور نەکەوتۆتەوە...)).

((وڵاتێکی سەیرە! دیانەتێکی سەیرە! جا... چاك نەبوو چووە مەککەش! کەس نازانێ ئەم وڵاتە کەی چاك دەبێ!... باوەڕت بێ، هەندێ کات —چتان لێوەشێرم- بە تەواوی نائومێد دەبم... جار هەیە وا ئاگری دەگرم پێم خۆشە دۆ و دۆشاوی تێکەڵ کەم و ئەو زەوی و ئاسمانەی وا بە سەریەکدا کاول کەم ئاداری بەسەرپادارییەوە نەهێڵم... جاری وایە قسەکانی ئاغام وەبیردێنەوە- لەبیرتە کە؟)).

((کامەیان... ئاخر خۆ قسەکانی وی هەر یەك و دوو نەبوون؟)).

((کە دەیگوت نابێ لاوان تووشی بەسەرهاتان بن و بکەون؛ دەبێ زوویان پێڕابگەین و سوودیان لێوەرگرین، چونکە لاو هەر بەو خێراییەی کە گڕ دەگرێ هەر بەو خێراییەش لە کەف و کوڵ دەکەوێ، جا بۆیە دەبێ سوود لەو کەف و کوڵە وەرگیرێ- لەلایەکەوە هاوڕێیان دەبینم بە قسان، واپێشان دەدەن کە گوایە هەروا یەك دوو هەفتە یا یەك دوو مانگی دیکە نابا حوکمەتێ دەگرینە دەست، لەلایەکی دیکەی کاردا جۆرێکە کە تەنیا هەردەبێ خۆپێشاندان و رێپێوانان وەڕێ خەین و کوشتە و برینداران بدەین و بچینە زیندانێ. باوەڕکە جاری وایە وابیر دەکەمەوە کە ئەم وڵاتە نەفرەتی لێکراوە و هیچ کاتێ چاك نابێ. لەجیاتی ئەوەی رۆژ بەرۆژ و سەعات بە سەعات بارودۆخەکە چاك ببێ کەچی هەر خراپتر دەبێ. لەودەمی مەپرسە. ئەوکاتەی کە تۆ لەوێ بووی دەگەڵ ئێستادا هەرگیز بەراورد ناکرێ. تەنیا یەك شتمان کەم بوو ئەویش لە سایەی سەری دامودەزگای ئەمنییەتەوە. دیارە کە ئێوە ئاگاتان لێ نییە، هەروا چەند رۆژێك لەمەو پێش فەرماندەی پادگان چەند کەسێکی لە هاوڕێیان، هەروا لەبەر دەرکی ماڵێ مە- نزیکی گۆڕی غەریبان- قامچی ئاژن کرد- ئەویش بە چ تاوانێکی ئەوانەیان

گرتبوو، هەموو تاوانەکەیان ئەوەبوو گوایە نارەزاییان پێشانداوە و دەو نارەزایەتییەشدا لەبارەی دەستوورەوە قسە کراوە. سەرۆکی تەلگرافخانەی لەجیاتی ئەوەی بچێت تەلگرافەکە بنێرێت چووە تەلگرافەکەی لەبەردەمی سەرهەنگی داناوە- ئەویش گوایە بە گوێرەی دەستوور ئەمەی کردووە!... لەدواییشدا تەلگرافەکەشی هەر نەکردووە. ئەوجا هاورێیان وەڕێ کەوتوون- کە رەحیمی و بەهرام نەژاد بوون- بچنە سەقز و لەوێ تەلگرافەکە بۆ تارانێ لێدەن. جەناب سەرهەنگ دەنێرێ لەرێیە بە لاپاڵی شاخییەوە بیانهێننەوە و لەژێر چاوەدێریان داناون و ئەوجا لەبەردەمی خەڵکی بازاڕیان قامچی ئاژۆ کردوون. ((ئێرە ناوچەیەکی سەربازییە — هەر کەسێك راستبۆوە ناماقووڵییەکی بکا نابێ... من کارم بەسەر قانون مانونانەوە نییە!)) کەس نازانێ ئەم ناوچە سەربازییە ئی کام دەوڵەتە تا خەڵکی بتوانن هەڵەی تێدا بکەن... بەهەرحاڵ ئێمە دەگەڵ نەفەرەکاندا بەسەرهات و رووداوەکەمان بەدوور و درێژی بۆ رۆژنامەکانی خۆمان نووسی و ناردمان، بەڵام نەمزانی لەبەرچی هاورێیان بە بەرژەوەندییان نەزانی شتێکی بنوسن، و نەشیان نوسی. دیارە دیسانەوە شتی گرینگتر هەبووە جێی ئەمەی گرتۆتەوە بۆیە ئەم شتانە جێیان نەبۆتەوە... بەڵێ، هاورێ، ئەوە ئێرە ئاوا، ئەوەش ئەوروپا، ئەگەر لەوێش هەق و حیسابێك هەبایە ئیدی من و تۆش ئێستا دانەدەنیشتین دروشمان بنوسین، یا رێپێوانێ رێك خەین و داوای بەردانی یەکێکی دیار و ناسراوی وەك ((ئەرلینگۆ بەرلینگۆ)) بکەین. من تێناگەم ئەو سازمانە نێو دەوڵەتییە چ کارەیە و چ شەکرێکی دەخوا. وەك ئەوەی بڵێی ئاغا راستی دەکرد. سازمانی نێو دەوڵەتی کوێ؟ کام نەتەوەکان؟ بەقسەی وی دەبایە ناویان نابایە سازمانی دەوڵەتان. چەند دەوڵەتێك لێك خڕ بوونەتەوە، بەگەز و ربەی خۆیان نەبێ ناپێون، هێشتا ولاتێکی وەك چین بەو هەموو حەشیمەتەیەوە بە فەرمی نەناسراوە جەنابی ئێلسڤادۆر ئەو هەموو خەڵکەی بەو گەورەییەوە چاو لێ پۆشیوە و بەهیچی دەزانێ- بۆ خۆشی دەڵێ حوکمەتەکەی حوکمەتێکی سەپاو و زۆرە ملێیە و دوولینگەی بە ملی خەڵکیدا شۆڕ کردوونەوە- و خۆی سەپاندووە، و بەزۆرییە سەرە نێزەی سواری میللەتی بووە! بەڵام کە نۆرە دێتە سەرکیشوەری خۆمان و ئەوەی وەك مە ئیدی ئەوە حوکمەت هەر بە نوقڵ و نەبات و شیرنایەتییەوە بەرەوپیری خەڵکییەوە دێ، و خۆ ئەگەر بڵێی حوکمەتی زۆرە ملێیە و تەنگاوی هەیە، ئەودەمی بەگوێرەی مادەی فلانە بلاوکراوەوە هەقی دەست تێوەردانی کاروباری ناوخۆی ولاتانی نییە! ئەودەمی بەسەرهاتەکە دەبێتە کارێکی ناوخۆیی و سازمانی نێو دەوڵەتی هیچی لە دەست نایە... بە قسەی ئاغای، چۆخ موبارەك! نەتەوەکان دەبنە دەوڵەتان و دەوڵەتانیش دەبنە نمایندە و نوێنەری نەتەوان- و دەست تێوەردان نەبووە و نابێ! خەڵکی بێنەوا ئەوجا بابچنە ئاسمانان و



لەوێ بۆ خۆتان بژین. کە گەیشتنە ئەوێش لەوێش هەر رێی ژیانێیان نییە، چونکە ئەودەمی لەوێش سەروکەللەی ئاغایان پەیدا دەبێت و هەمان تاس و هەمان حەمامی سەر عەردی چونکە ئاسمانەکانیش هەر ئی دەوڵەتانن!)).

((بەڵام ئاواڵی خۆشەویستم با ئەوەی لەبیر نەکەین کە ئەو شتانە هەموو پەسەندی ئەو شتانە دەکەن کە ئێمە دەیانڵێین. ئەمانە هەموو نیشانەی ئەو بێ یاسا و ریساییانەیە کە ئێمە و مانان پەنجەیان لەسەر دادەنێین و بۆ بە ئاکام گەیشتنیان تێدەکۆشین. ئەو شتانە نەك هەرنابێ ساردمان کەنەوە بەڵکە دەبێ هاندەر و بزوێنەرێکی تازەش بن. هێز و تین و تاو و گیانمان وەبەر نێنەوە. ئەگەر ئەو بێ یاسا و رێساییانە نەبن تێکۆشان چ مانایەکی دەبوو؟)).

حوسێن ئیدی لەم بارەیەوە هیچی نەگوت: دیاربوو کە هەست و هۆشی هەردوو پێکەوە نین. منیش زۆرم پێ دانەگرت. لە مستەفاخانیم پرسی:

گوتی: ((هەروایە کە خۆت دەزانی، هەروا خەریکی یاغییەتییە خۆیەتی)).

((یاغی!... ئاگام لەوەی هەر نییە، ئەوە لە تۆ دەبیەم)).

((یانی ئاگات لە بەسەرهاتێ تەلاّخانمێ و ئەو ئاریشانەش هەر نییە!؟)).

((نا- تەلاّخانم، بۆ مەگەر چ بووە؟)).

حوسێن بەسەرهاتەکەی بە دوورودرێژی گێڕایەوە: هەر لە هاتنێ تەلاّخانمێوە بۆ شاری و مانەوەی لە ماڵێ قازی و کەف و کوڵ و هەڵچوون و داچوونێ ئامۆزا و بن ئامۆزایان و خۆبادان و هەڵسوڕانێ خزم و کەسانەوە تا دەگاتە تایەفە و فەرماندەی پادگانێ و سەرۆکی ژاندارمەری ئەو دەنگۆی مردنێ تەلاّخانمێ و هۆی سەرهەڵدانی ئەو قسە و قسەڵۆك و راستییەکانی هەموو هەر گێڕانەوە. بەسەرهاتی کوشتنێ کوڕی قازی و هەلاتنێ مستەفاخانیشی هەر باس کرد.

ئەمانەم هەموو بەلاوە تازەبوون. هەر دەتگوت ئەفسانەن، هەر راست وەك هەموو ئەو بەسەرهاتانەی لای خۆمان، کە دەڵێی ئەفسانەن. دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا من ئەم کارەی مستەفاخانم، کە داوای ئەو هەموو ئازادیخوازییەی دەکرد بەدوور دەزانی. من لە قسەکانی حوسێنیم ئەوە هەڵێنجا کە دۆست و خزم و کەسوکار، منیشیان بە گوناهباری مەرگی تەلاّخانێ لە قەڵەم دابێت. دەیگوت لە بابەشی بیستووە کە گوتوویەتی ئەو چوونەی من بۆ گوندی کارێکی هەڵە بووە، ئەگەر نەچووبام ئەو هەڵەیە

رووی نەدەدا، خۆ ئەگەر رووشی دابایە، بەو شێوە و بەو نزیکانە نەدەبوو، هەرچۆنێك بووە خودی بابەش دەیزانی کەمن دەو نێوەیدا چ گوناهێکم نەبووە و سوربوون و پێداگرتنی بابە و باوەژنیٚ بوون، ئەوەیان لیٚ شین بۆتەوە. دەگەڵ ئەمانەشدا هەر، پێی منیشی تێوەرچوو بوو! لە سەر و بەسەرهاتەکەی وادیار بووە کە باوەژن بەسەرهاتەکەی لەلای خۆیەوە بە کۆتا هێناوە و بڕاندوویەتییەوە، ئەو دوو وردبوونەوە و لووت تێوە ژەنینە بیٚ مەبەست و سەرپێیانەی منیش دیارە بوونەتە هۆی نیگەرانی ئەو و سیامەندی- و کارەکەی پێشتر خستووە ئەڵڵاهو ئەکبەر- رۆژگارێکی سەیرە- دەور و بەرێك- و خەڵکێکی سەیرن! ئەوە دارگوڵ، ئەوە تەلاٚ- کچەی بەستەزمان و بێچارە... ولاٚتێکی سەیرە! و ئەوەتا خانێکی ئازادیخواز بۆتە دار دەستی، دەستی خاوەن زەوی و زاران، و لەبەر خاتری وان کرمانجی دەکوشتن و ماڵی ئاگردەدان و دەیسوتاندن! حوسێن لە کۆتاییە قسەکانیدا هاتەوە سەرقسەکانی بابەی دەربارەی بەخراپ دە ئازادی گەیشتنیٚ و گاریگەرییە ئەو خراپییەی لەسەر دەوروبەر و ژینگەی، هەموو لەبیرمابوون، هەروەك دوێنێی بیستبن.

زۆری نەمابوو بۆ خۆرئاوابوونیٚ کە هەستا و ماڵئاوایی کرد. ئێستا خەیاڵی ئاسوودە بوو، کارەکەی بە تەواوەتی سووك ببوو. چەند شەپکەدارێکی دەویستن کەلای دارتاشی گەڕەکیٚ بیانهێنیٚ و پلاکارتەکانی لێدات و بۆ ئازادییە ((ئەرلینگۆ بەرلینگۆ))ی هەنگاوێکی کاریگەرانە باویٚ. هەستا و ماڵئاوایی کرد و رۆیی. دە تەواوی ئەو ماوەیدا کە هەروا سەرزارەکی دەنێو قساندا ناوی بابەی هاتبا، دەنا بە هیچ جۆرێکم نە لێپرسیوەو نە سەرو سۆراغێکم کردووە- نەك هەر حاڵ و باڵی وی، ئی هیچ کەسێکی، ئەمە جگە لە دایك و بابی خۆی. هێشتا دڵم هەر پڕبوو، بە جۆرێکی وا جێی هەواڵ و دەنگوباسی پرسینێی تێدا نەمابۆوە. هێشتا دەرگای دالاٚنەکەم دانەخستبۆوە کە بەپەلە پروزەوە هاتەوە، پێموابوو شتێکی لەبیرچووە.

گوتم: ((شتێکت بەجێهیشتووە؟)).

((نا... لەبیرم چوو لە حاڵ و ئەحواڵی ئاغای بپرسم، گوتم با بگەڕێمەوە هەواڵێکی بزانم- داخوا چۆنە؟)).

پێم سەیربوو: ((تۆ بۆخۆت دەزانی کە ماوەیەکی زۆرە هیچ پەیوەندییەکمان پێکەوە نییە؛ ئەوە چ بوو واگەڕایتەوە... خێرە هێندەی دە خەمێی، ئەوە لە کەنگێوە هێندە پێکەوە رێکن؟)).

گوتی: ((باشە، بەڵیٚ... بەلاٚم...)) و دوو دڵ بوو.



گوتم: ((بەلاٚم چی؟-)) کتوپڕ دڵم خورپەی کرد و تێکچووم. ((بۆ هیچ بووە!)).

حوسێن کە پەشۆکاوییە منی وادیت گوتی: ((نا، هیچ نەبووە، نارەحەت مەبە- من پێموابوو ئاگاداری)).

((من ئاگام لە هیچ نییە...)) و بەترسێکەوە سەیرێکیم کرد ((... بڵیٚ- هەرچی هەیە بیڵیٚ- خۆ هەردەبیٚ بزانم!)).

((نا، شتێکی وانییە... پێریٚ هێناویانەتە ئێرە- وەك دیارە بۆ نەشتەرگەرییەیان هێناوە...)).

((بابە؟ نەشتەرگەری!)).

ژنەکەم دەو دەمەیدا کە لە ژووریٚ هاتبووە دەریٚ بە پەشۆکاوییەوە لە پشتەوەم راوەستابوو- هەروەك هەموو ژنێکی دەو سات و کاتانەدا هاواری کرد: ((کیٚ؟ بابە؟ دەك بمرم!)) هەرچەندە تا ئێستا بابەشی هەر نەدیبوو.

گوتم: ((بەڵیٚ... مەیکە بە هەرا، لێگەڕیٚ بزانم چ بووە. دەی. جا ئێستا بردوویانەتە کام نەخۆشانە؟)).

((نازانم من ئەم هەواڵەم لە میرزا سادقی بیست...)) میرزا سادق، بەرپرسی دارایی دایەرەکەی خۆی بوو، کە لە زۆربەی سەفەرەکانی دەگەڵیدا بوو و بەکارەکان رادەگەیی. ((من دوێنیٚ لە ناسر خەسرەویم دیت)).

((ئەدی نەتپرسی؟)).

((نا، نەمپرسی. هەر هەواڵیم پرسی. گوتی سوپاس بۆخوا باشە، بەلاٚم ئەگەر راستییەکەت دەویٚ نەخۆشخانەکەم نەپرسی)).

((نەتزانی نەشتەرگەری چی؟... چونکە ئەوەندەی من بزانم نەخۆشییەکی تایبەتی وای نەبوو)).

... ئیدی هەرچۆنێك بوو، دوای ماوەیەك تێڕامان و وردبوونەوە، ئەوەم بەخەیاڵدا هات کە بچمە ماڵیٚ ئاواڵە نمایندەکەی ئەنجوومەنێی، لەوی بپرسم. دەگەڵ ژنەکەمدا پێکەوە رۆیشتین. دەرکەوت کە لە نەخۆشخانەی ((میهرە)) کە لە ماڵەکەی خۆمانەوە نزیك بوو. هەر لەوێڕا چووینە نەخۆشخانەی. بڕیار بوو بەیانی نەشتەرگەریی بکەن... لە پشکنینەکەی دیاریکرابوو کە ((فتق))یەتی و دە شەو درەنگانێکی شەوێدا کە کارەبا کوژاوەتەوە، کە لە پلیکانەکانی حەساریٚ هاتۆتە خواریٚ، خزیوە و کەوتووە و پێستی زگی بەشێوەیەکی ترسناك بلۆقی کردووە و دەرپەڕیوە. زۆریش بە ئازار بووە.

هەر ئەو شەوە یەك دوو هاوڕێ پزیشکم هێنانە سەری و تا ئەوان دڵنیایان نەکردمەوە کە نەشتەرگەرییەکەی هیچ مەترسییەکی نییە، دڵم دانەکەوت و ئاسوودە نەبووم- پەنا بەخوا!.

نەشتەرگەرییەکە، سەرکەوتووانە بوو، کە وەهۆش هاتەوە ژنەکەمی لەلامایەوە و منیش چوومە تەلگرافخانە و سەلامەتییە ویم بە ماڵێ و منداڵەکان ڕاگەیاند. کاتێ کە هاتمەوە ئەو بەتەواوەتی وەهۆش هاتبۆوە. پێم گوت چوومەتە کوێ، زۆری پێخۆش بوو، گوتی: ((بەپێچەوانەی هەمیشەتەوە، ئەمجارەیان کارێکی زۆر ڕێك و پێك و چاکت کردووە)). پێکەنی ((پێموانەبوو- نیگەران بوون، کارێکی چاکت کردووە. خراپ نییە، ئاشتیش بووینەوە!)) ئەمە یەکەمین جاربوو ئاماژە بەڕابردوو دەکرا ((... کوڕینە، ئێمە تازە پیربووین، هەروا وەك پیاوان هێندەمان سەرمەکەنە سەرێ و بەرسینگەمان لێ مەگرن... ژێوان دەبنەوە!)) چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسك و ڕووی وەرگێڕا- تەریق بوومەوە... پێکەنی.

((ئێمە لە حیزب نادڵسۆزتر نین، ئێمەش هەروەك خزم و کەسێکی حیزبی دوور سەیرکەن... ئێمەش هەروەك یەك لە هاوڕێ حیزبییەکان دانێن... ئاخر خۆ ئێمەش لەبەر دڵی ئێوە کەمان کتێبی حیزبی نەخوێندۆتەوە)) هەردووکمان پێکەنین.

حەوتوویێکی لە نەخۆشخانەی مایەوە. دوایە هێنامانەوە ماڵێ. حەوتوویێکیش لە ماڵێ مە مایەوە.

دە تەواوی ئەو ماوەیدا چ لە نەخۆشخانە و چ لە ماڵێ ژنەکەم بە بابە بابەوە بەدەور و خولیدا دەهات و لەبەردەستی هەڵدەسوڕا، دەیگوت ئەگەر پەنجا کچی وەك وی هەبایە هەرگیز پیر نەدەبوو- کوڕیش بووە شت!.

ئێستا یەکجار زۆر چاکە، ئارەقەکەشی دەست پێکردۆتەوە. پارەی ئارەق و مەزە و شڕو شاڵاتەکانی بۆخۆی دەدان، ئێمە پێمان هەڵنەدەسووڕا. بەپێکەنینەوە دەیگوت نارەحەت نەبین، پارەی قەرەوێڵە و جێ و بان و ژوورەکەش هەر دەداتەوە. هەر لە سەرەتاوە دەگەڵ ژنەکەم پێکەوە زۆر ڕێك بوون و بابە هەرچییەکی بگوتبایە ژنەکەم لایەنی وی دەگرت و ئەویش هەرکارێکی کە ژنەکەم بیکردبایە لایەنی دەگرتەوە. دەیگوت قایل نابێ، ئاهەنگمان نەگێڕاوە، ئەو شاییەکەی نەدیوە- قایل نابێ، ئەو ((دادەگوڵە))ی کچی خۆی (هەر لەخۆوە تێکڕابووم) ئاوا لێناگەڕێ، دەبێ زەماوەندێ بکەینەوە، خۆ ئەو پلاوی بووکێی نەخواردووە. نا، ئەوە حەلێی نییە؛ ئەو حەزی لە شاییەیە، ئاوا نابێ- حەڵی نییە. دادە گوڵێ دەبەینەوە و شایی و لۆغانێکی بۆ ساز دەکەینەوە ئەو سەری دیار نەبێ. بابڕۆین. ئۆتۆمبێلێکی یەکسەری تایبەتیمان گرت و لێماندا ڕۆیشتین. شەوێ دەڕێیەدا نوستین و بۆ سبەی بەیانی کەوتینەوە ڕێ



و دوای نیوەڕۆ درەنگانێك گەیشتینەوە. شایی و لۆغانمان دابەست- بە سەلامەتییە ئاغای، بووك گواستنەوەمان نوێ کردەوە! ئەو و پوری (باوەژن) دیارییان دایە بووکێ و بووك تابلێی خۆشحاڵ بوو. زۆر لەو سەفەرەی ڕازی بوو و دەیگوت ئەگەر دەیزانی بابێکی ئاوای هەیە هەر بۆخۆی بەتەنێ ملی ڕێیەی دەگرت و ئاوڕی لە کەس نەدەدایەوە و گوێی نەدەدایە قسەی کەس و دەهاتەوە. پیاو بابێکی ئە ئاوای هەبێ غەمی چیەتی! بابەش هەر دەیگوت سوپاس و شوکرانە بۆ خودای، بە خۆڕاییان نەگوتووە خێر دەوەیدایە خێرێ بداتەوە... خودایە زۆر شوکر، دادە گوڵ بەڕاستی دادە گوڵە... و هەرکاتێ ئەم وشەیەی بەسەرزاریدا دەهات من بەتوندی دڵم دەگوشرا و دەکەوتمەوە بیری دادە گوڵێکی دیکەوە کە لەژێر بارەگڵێکیدا چاوی تا هەتایەی لێك نابوو...

دەونێوەیدا قسە بێرە و بەوێدا و بەهەموو لایەکیدا وەربوو: هەروەك باوە، دەربارەی سیاسەت، دەربارەی ئەوین و دڵداری؛ دەربارەی خەڵکی- لە هەموو بابەت و شتێکییەوە، بێگومان دەربارەی مستەفاخانیش. دەمدیت کە پووری بەو قسانە زۆر گرژ و نارەحەتە، هەقیشی بوو. بەڵام هەر قسە بوو قسەی رادەکێشان، دەنا چ قسەیەك بە ئەنقەست نەدەهێنرایە گۆڕێ: پێم کارێکی زۆر سووکانە بوو هەروا بە ئانقەست بمەوێ نارەحەتی کەم، چونکە مەسەلەکە مەسەلەی مەرگی لەوانەیە دوولاو بێت و لەوەش بەولاوە زۆر کارێکی نامرۆڤانە بوو کە بمهەوێ بە شادی و خۆشحاڵی مەرگی وانەوە ئازاری وی بدەم. لەڕاستیشدا نەك هەر بە مەرگیان شاد و دڵخۆش نەبووم بگرە یەکجار زۆریش بە داخ و کە سەریانەوە بووم. ئەوانەم بە قوربانییە نەزانین و ستەم و دەمارگیرییە کۆمەڵ و بنەماڵەی دەزانی، بنەماڵەیەك کە خۆی لە کەسانی دی بە زیاتر دەگرت و خۆی پێ لە کەسانی دی جیاوازتر بوو. جگە لە هەموو ئەمانەش هەر بەدڵ نەمدەویست ئازاری بدەمەوە. ئیدی ئێستا بە واتای بابە ((گەورە)) بووم و چاك و خراپی لێك دەکەمەوە و دەزانم کە ئەویش بەلانی خۆیەوە کەمتاکورتە زەحمەتێکی پێوە کێشاوم و ئەم وردە حیسابانەش مایەی ئەو بەرچاو تەنگیانەن کە ئەو دەوروبەرە بچکۆلەیە سەپاندوویەتی.

گوتم: ((بابە، ئەدی ئەو کوڕە تیوە چۆن، بەلای ئێوەوە ئەویشیان هەر کوشتووە؟)).

((پێموا نییە؛ هەر ئەودەمی هەڵات و چووە عێراقێ... پێموابێ هەر لەو دەور و بەرانە بێت... هەردەبێ لەو دەوربەرانەش بێت)).

کەوتمەوە یادی بەسەرهاتێکی ئەئاوا. دوای بیستی مانگی شەهریوەر بوو، ماوەیەك ون بووین، و بەماڵەوە چووینە ئەو دەوروبەرەی لای سەردەشتێ... چوینە ماڵی خزمێکی. من شەو و ڕۆژ لەبەر ڕەوکەی ئەسپان

بووم... سی دانەبوون، هەمووی ئی خۆمان و ئی ماڵە ئامۆزایەکان بوون-، بەلاّم چ ژیانێکی سادە و ساکار و بێگەرد بوو! شەوانە شوانەکان دەهاتنەوە و ئاگریان دەکردەوە و یەك دوو مەڕیان دەدۆشین و سەتڵە شیریان وە پاڵ ئاگریەوە دەنا. هەر کە شیرەکەمان دەخواردەوە دادەنیشتن و دە بلوێرانیانەوە دەتوراند. ئەسپەکان سەریان دە دوو رووناکاییە ئاگرەکەیەوە دەنا و دەهاتن و دەورەیان لێدەداین: بەو چاوە گەورانەیانەوە دە ئاگرەکەی رادەمان و وەك بڵێی دەبیر و خەیالاّنەوە چووبن، گوێیان بۆ دەنگی بلوێریێ شل دەکرد. مەڕەکان لەولاترەوە هەر دەلەوەڕان، بەلاّم ئەسپەکان تا روناکاییە ئاگری مابایە ئەوە هەر دەگەڵەمەدا بوون. ئەو دەمانەی کە زۆر نزیك دەکەوتنەوە چەند خڕکە بەردێکمان ریێ دەهالاّندنیێ. هەر کە ئەمە بەردەکەمان داویشتنیێ ((سەرە))ی ئەسپەکان کە پێش رەوکەیە بە عالەمی ئاشکرا چاوەکانی زەق دەبوونەوە و پڕمەیەکی لە تفنکانڕا دەهاتیێ و بەدوو گوێی مووچ و هەردوو چاوەکانیەوە رووی دە لای راست دەکرد و هەموو پێکەوە دەردەپەڕین و بەغار دەڕۆیشتن. بەلاّم زۆری نەدەبرد، یەك یەك و دوو دوو، و بە پارێزەوە، نەرم نەرمە، هەمدیس دەهاتنەوە و وردە وردە بازنەکەیان تەنگتر دەکردەوە و تا سنووری جاری پێشوویان دەهاتنەوە و بە تەك یەکەوە، رادەوەستانەوە، کە ئاورەکە دادەمردەوە ئەوانیش لێك بلاّو دەبوونەوە، بەلاّم زۆریش لەجیێ ئاگرەکەی وەدوور نەدەکەوتنەوە. بەیانییەکیان تازەم چاو لە خەویێ هەڵێنابوو کە پیاوێکی لادێیی، هەوساری جوانووە ماینێك بەدەستەوە پەیدابوو. جوانووە ماینەی هێنابوو ((چاك))ی بکات. دەیزانی کە من هیچی لیێ ناستێنم و کارەکەی بەخۆڕایی بۆ رایی دەکەم بۆیە لەو رێیە دوورەیڕا هاتبوو. جوانووە ئەسپێکی زۆر ژیکەڵە و غوردمان هەبوو، تازە پشتمان گرتبوو، بە واتای ئەورۆ تازەمان ((گرتبوو)) و تا ئەو جێیەی کە من دەمزانی ئەوە یەکەم ئەزموونی پەڕینی ئەو جوانووە ئەسپەی بوو کە لە جوانووە ماینێکی بێت.

چووم جوانووەکەی بێنم. هەر کە منی دیت گوێی مووچ کردن، هەوساری بەدەستییەوە نەدیتم، بۆیە زۆر بە زیتەڵەییەکی تێکەڵ بە خۆشەویستی و چاوەڕوانییەوە سەیرێکی کردم. چەند کلۆخوێیەکم لە بەرکیێ خۆم دەرینا، بە چوار ناڵییەوە هات و یالەکەشی هەروا بە خۆشییەوە شەنەوبا دەکردن.

کلۆ خوێیەکەم لەبەردەمی راگرت، ئەوی خوارد، دەستێکم بەشان و ملیدا هێنا، یالێم گرت و بەسوارییەوە هاتمەوە لای کابرای لادێیی. جوانووی تاین هەر کە جوانووە ماینەکەی دیت گەردەنی کێل کرد و لەخۆشیان لە حیلەیدا- حیلانێکی پڕ ئارەزوو- و بە هەڵبەز و دابەزێکەوە چووە پێشیێ و خۆی خڕ کردبۆوە. کابرای لادێیی هەروا بۆ پارێزییە سەری هەوساری جوانووە ماینەکەی دە مەچەکی خۆی ئالاّند. بەلاّم بەپێچەوانەی بۆچوون و چاوەڕوانییە وی جوانووە ماین لەجێی خۆی نەبزووت بەنازەوە گوێی خەپاندن



و چاوی دەبریسکانەوە. ئەو جێیەی لیێی راوەستابوو کەمۆکەك لێژ بوو. هەر کە دابەزیم و جوانووە ئەسپەم بەرهەڵدا کرد، جوانووە ماینەکە پاشووەکانی کەمێك لێك بلاّوکردن و خۆی توند و ئامادەکرد. جوانووە ئەسپ دەستەوەستان بوو.

بەپێچەوانەی ئەسپە ئەزموونیدەکان کە بە چوارناڵییەکی نەرم و شلەوە بەدەوری یاردا دێن و دەچن و زۆر شۆخانە سەر و گەردەنیێ هەڵدێنن و سەریان رادەوەشێنن، ئەوجا لە دواوە وەك گوڕیێ ببەستنەوە، هەموو لەشی تێکڕا گرژ ببوو و بەردەوام- نەرمەحیلە-ی بوو. جوانووە ماینەی تاینیش دە چاوەڕوانییەدا دەلەرزی- لە رەی سمت و کەفەڵی بە ئاشکرا هەستی پێدەکرا. جوانووەکە بیێ ئەوەی گوڕیێ ببەستێتەوە هەروا لەجێوە هەردوو دەستی هاویشتنە سەر کەفەڵیێ جوانووە ماینەیی و کوتکی لیێ ئاودیو کرد. بەلاّم زۆر بەهێواشی و لەسەرخۆوە و بەدەم نەرمە حیلەیەکی پچڕ پچڕ و وردیلانە و گرژەوە. جوانووە ماینەش بە لەرزە لەرزەوە هەر کەفەڵی دێنانە پێشیێ و خۆی پێوە دەنووساند... دوای چەند دەقیقێکان ریچکەی باریکە خوێنێکی بەلابەلای زێیدا تکە تك کەوتە سەرعەردی. مەلا حەسەن گوتبووی کە خوداوەندی عالەمیان ((پەردە))ی کچێنییەی هەرداوەتە موسوڵمانان و بەس!.

ساڵێکی تەواو بەسەر ئەم رووداوەدا چووبوو کە جوانووە ئەسپەکە ونبوو. هەموو جێیەکمان لێکرد هەرچی شوێنەوار و قولاّغ بیێ نەیبوو. لە بیرمە ئەوکاتیش بابە لەتەك پەنجەرەوە دانیشتبوو و دەیخواردەوە. گوتی: ((ئەو جوانووە یەکەمین جاری لەکویێ جووت بووە!)) گوتم بۆ. گوتی: ((چۆتەوە هەمان جیێ)). هەمان جیێ! تا ئەویێ یەك دوو رۆژ رێیە! هەردەبیێ قاچاغچی دزیبێتیان... نابیێ ئەو هەموو رێیە چووبیێ- ئەویش بەو سارد و سەرمایە! —ناوەڕاستی پاییزیێ بوو. بابە گوتی: ((هەردەبیێ چووبێتەوە ویێ!)) یەکمان نارد- لەویێ بوو! ئەوەی ناردبوومان دەیگوت تاك و تەنیا دە هەمان ئەو کوێستانەی بۆمان دیاری کردبوو دەلەوەڕا... خودا رەحمی کردبوو کە وەبەر چنگی گورگان نەکەوتبوو...

((پێموابیێ هەر لەو دەور و بەرانە بێت... هەر دەبیێ لەو دەروبەرانە بێت...)).

چتان لیێ بشارمەوە منیش دەمویست ((هەر لەو دەوروبەرانە))بم، منیش دەمویست لەجێی زاوایەتییەم نزیك بم، دەمویست هەر لە نزیك گۆڕی لاوەتییە بە با چوومدابم: لە نزیك چاخانەیەکی کە نیوەی تەمەنی لاوەتیمی دە خەوێکی ئاڵۆز و بلۆز و ترسناکی مێژووی ئەو جێیەدا ناشتبوو. نیوەکەی دیش سوننەتی بەئاگا و بیێ ئاگای دەوروبەرەکە رزاندی. نیوەی؟- نا، هەر هەموو لاوەتییەکەم لەویێ نێژرابوو. ئەدی ئەوە نییە هەردوو نیوەکە پێکەوە بەندن و لێك جیانابنەوە، هەر راست وەك ئەو ژن و مێردانەی سەردەمانی

پێشووی کۆن کە پێکەوەیان دەگەڵ گۆزە ئاوێك و نردووە نانێکی دە گۆڕ دەنان و پێکەوە سەریان دەنایەوە.

منیش دەمویست بچمە دەگۆڕەکەی خۆمەوە، لای ئەوەی دیکەم، کە دەبن گڵێدا دەگۆڕ دابوو- بەبێ نان و ئاو. نا... نان و ئاو هەر بۆ هێندێیە کە هەلێك هەڵکەوێ لایەکەی دی لێی روون بێت کە بەبێ ئەو نیوەی دی ناتوانێ بژیەت، تا بزانێ کە بەبێ جووتی دڵپەسەند ژیان مەرگێکی لەسەرەخۆیە، مەرگێك کە هەموو دەمێی هەر مەرگە- وەك ئەوان هەندە ((جووت))انەی کە بە زیندووەتییە چاوان یەکتری دەکوژن و مردنێ لە ژیان دروست دەکەن- تا تێبگا کە هەرکاتێ مەرگ یەکێکیانی بردەوە ئەوەی دیش تێبگەیەنێ کە دەییاتەوە، کەچی من دەمزانی کە ئەو ((جووتە)) نە تەنیا دڵ پەسەند، بەڵکە بەرجەستەی ((جووت))ێکی تەواو بوو و بەرۆیشتنێ وی ((جووت))ەکە یەکپارچە لە بەین چوو؛ دەمزانی کە ئەو ژنەی ئێستامە بەو تایبەتمەندیانەی نزیك لەو شتانەی ئەو کچە پاکە بەستەزمانەوە هەڵبژاردووە، ئەوە نیوەی کارەکەم لە دەستداوە، تێگەیوم کە بەخۆشی و ناخۆشی هەر مردووم... نا، پێویستمان بە توێشووی ناو گۆڕنییە- هەرکاتێ ئەو کچە بەستەزمانەم بیردێتەوە- کە بەدیتنی هەر جوجەڵە و گوڵێك وەبیرم دێتەوە- هەرکاتێ کە، بابە ژنەکەم بەنێوی دادەگوڵەوە بانگ دەکا ئاگرم تێبەر دەبێت، سووردەبمەوە و دەبرژێم. هەر یادێکی خەتی روخساری، هەڵسوکەوتی، پێکەنینەکانی، سادە و ساکارییەکەی... رەنجێك و ئێش و ئازارێکن بارتەقای هەزاران جار مەرگ... و من هەموو رۆژ و سەعاتێك هەر مردنە و تاقیدەکەمەوە.

وەك هەمیشە، و وەك هەموو خەڵکی، بیرێکی دیکە بۆ ئەنجامدانی کارێکی دیکە دروست دەکەم. دەڵێم: ((بابە، ئەگەر گازاندەیەکت نەبێ پێم خۆشە سەرێکی لە مامۆژنێ هەڵێنمەوە- داخوا پێت چاکە یا نە نا؟)).

بابە ئەو پێشنیارەی پێخۆش بوو: ((بەڵێ، دیارە- کارێکی زۆر بەجێیە... بێچارە بە تەنێیە، خۆشحاڵ دەبێ... بێنەوایە، ئەویش پیری ئاخر شەڕ بوو)).

پووریش هەر یەکجار زۆر خۆشحاڵ بوو.

❊ ❊ ❊



## (٣١)

چاخانەکە هەمان چاخانە بوو، هەویش نەبوو: هەر بۆخۆی وێرانە بوو هێندەی دیش کاولتربوو- مریشکێك بەرەو ئەولایەی هەیوانێوە کە جێی هەردووکمانی لێ راختبوو دەچوو، مریشکێکی دی ملی هەڵێنابوو و هەر کە منی دیت دەستی کردە گارەگار و قدقدۆیە، کورتانێك پاڵی وە دیواریەوە دابوو، ژنێکی سەروپرچ ئاڵۆز و دەموچاو سیس و چرچ و لۆچاوی لەسەر جۆیە کۆخەڵێسی بە زیخ و چەوێ ناوە مەنجەڵێکی دەسووەوە. خشتەکانی کۆخەڵێسەکەی هەموو گرژ و مۆن و تووڕە بوون، روخساری هەموو جێیەك غەماوی و دڵتەنگی پێوە بوو و شوێنەکە- هەروەك ئەو هەموو کاولی و وێرانی و شەپرێوییە گوناهی من بێ- بە زمانی هەر درز و کەلەبەرێکییەوە بە روخسارێکی ترش و تاڵ و مرچ و مۆنەوە تانە و تەشەریان لەمن دەدا، هەروەك ئەو خانووە کۆنینەی پێشینانی زوو کە لەبەر سستی و لێنەهاتوویی و هێرشی بێگانان رۆژیان رەش دەبێت و دەبێتە عاجباتی... هیچ شتێك بۆنی ئاشنایییەی لێنە دەهات. نیشانەی دۆستایەتییە بەهیچەوە دیار نەبوو. خۆڵی مردووانیان بەسەر هەموو جێیەکیدا کردبوو... هەموو جێیەکی ئەو شوێنەی مردبوو- تەنانەت بەردی سەر لوتکەی کێویش کە شوێن جێ پێی مانگ بوو، ئەویش نێوچەوانی تێك نابوو- ئاخر مانگیش مردبوو. هەروەك دارگوڵ گیانی شوێنەکە بووبێ و تۆرابێ و هەموو شتەکانی جێ هێشتبێ و رۆیشتبێت، شوێنەکە بێ دایك مابۆوە. نیشانەی هەتیوییە بە هەموو جێیەکییەوە دیاربوو: نە دەنگی تریقانەوەی پێکەنینێك، نە دەنگی ((پت پت پت))ێکی نە ترپەی پێیەك- هەر راست وەك مردواوی ژێرزەمینێکی چۆڵ کە دەنگی پێی رێبواران بداتەوە، ئاوا چۆڵ و بەتاڵ بوو، هەر دەق وەك مێشکی ناو کاسەی سەری من کە هەر دنگەی دەهات، هیچی وەرنەدەگرت، هەرچییەکت دەکرد- دەهاتی و دەچووی یا هەر شتێکت دەگوت یا تەنانەت ئەگەر پێشکەنیبای- تەنیا وەڵامێکی کە دەیدایەوە هەر تەنیا ((نەماوە)) بوو و بەس.

چایەچییەکە پیرە مێردێکی نەخۆش و کە لەلا بوو... خۆزگە مێردە چڵمنەکەی بایە، خۆ هەرنەبایە دەمتوانی مەرگی وی بەدوور و درێژی لێ بپرسم، خۆزیا هەر منداڵەکەی بایە خۆ هەر نەبایە بەدیتنێکی ویم نیوە فەرامۆشییەکی داکی دەهات!.

ماوەیەکم خۆ گنخاند؛ پیرەمێردە چای هێنا. چایەکەم وەرگرت، بەڵام نەمخواردەوە. تا ئەو بۆ کارێکی چووە دەرێ چایەکەم رشت. ئەم کونجە کۆڵیتە کە رۆژێك لە رۆژان درەوشاوەترین جێی هەموو دنیایە بوو چی لێ بەسەرهاتبوو! یانی ئەوە هەر ئەو جێیە خۆش و پڕ شادی و روناکییەیە کە من بۆ ساتێکیشم دڵ لێ بەرنەدەبۆوە و ئەوا ئێستاش دەگەڵ هەر پێدا روانینێکیدا دڵم دەگوشرێ! و نەگبەتی لەسەرو ڕووی مریشك و جوجکەکانیەوە دەبارێت و دیتنی چایەکەی دڵان لە ژێڵڵا دێنێ.

هەروا بەدەم قسانەوە لە پیرەمێردەم پرسی کە ئەگەر قەزاو قەدەر دوور مردووێکیان هەبوو لە کوێی دەنێژن- دەمویست گۆڕەکەی ببینمەوە و بچمە سەردانی. پیرەمێردە بەدەست ئاماژەی کردێ و دەستی بۆ لای بیشەڵێنی کەناری ڕێیە، بۆ ئەو شوێنەی کە ڕێیەکە پێچی لێدەکردەوە و چاخانەکەی لێوە ون دەبوو راداشت. چاوی وێك هێنانەوە، برۆیە سپییەکانی دەگەڵ پێڵووە سیسەکانیدا هێنا بەر نێوچەوانێ و گوتی: ((هۆو وێ، ئاغا... ئەو ((شەخسە))ی کەناری ڕێیە... ئەگەر یەکێك بەڵا دوور، فەرمانی خودای بەجێ هێنا لەوێی بە خاکی دەسپێرن)).

خۆشبەختانە ئەمجارەیان ئەو سوارەی کە لەگەڵم بوو یەکێك بوو لە کوڕە جحێڵەکانی گوندی. گوتم ئەسپەکان هەروا راکێشێ تا من دەیگەمێ، ئیدی بۆ خۆم دەنا و گۆڕەکان و دەنێو چەند پیرە داربەڕووێکی کە کەسایەتییە ئەو شەخسەی لە بڕینێی پاراستبوون وەیلان بووم: هەمووی وێرانە، هەموو کۆن... دەنا و واندا گۆڕێك سەرنجی راکێشام، کە بە گوێرەی گۆڕەکانی دیکە تازەتر دیاربوو... تازە! چوارساڵ بەسەر ئەم رووداوەدا چووە!... بەڵام دەی، دەردەکە تازەبوو، گۆڕی دەردانیش هەردەبێ تازە بێت. هەروەك داکێ ئەو قاچاغچییەی کە دەیانگوت هەر کە چاوی بە گۆڕی کوڕەکەی کەوت ناسییەوە بێ ئەوەی لەپێشداش دیبیەتی هەروەك شتێکیش بەمن بڵێ کە ئەو گۆڕە گۆڕی وییە. درەختێك بە تەك گۆڕەکەوە بوو. لە بن درەختەکە دانیشتم و دەگۆڕەکەیەوە رامام... خەڵکانێك ناشتبوویان و بەخاکیان سپاردبوو و ئێستاش من هاتبووم و داوای ئەسپاردەکەی خۆمم دەکردەوە! خۆزیا من بمناشتبایە، ئەوە ئەرکی من بوو، ئاخر خۆ مردنەکەی ((دەسکار))ی خۆم بوو... تازە جیاوازی چی بوو؟ ناشتن هەر ناشتنە، تەنیا ئەوەندە هەیە ئەگەر من بمناشتبایە ئەوەندە هەقەم بەخۆم دەدا کە وەك دایکان گلەیی و گازاندەم لەگڵ و خۆڵی گۆڕەکەی هەبێ ئازاری نەدەن. یا چاوەڕێی ئەوەی بم بە نەرمونیانی لە ئامێزی بگرێ و دەگەڵیدا رووخۆش بێ. ئەگەر خۆم کردبایە خاوەنی بەلانی کەمەوە ئەوەندە هەقەم هەبوو...



سەیری گۆڕەکەی دەکەم... جێی باوەڕێ نییە- ئەو لەش و لارە و ئەو هەموو کەف و کوڵ و حەز و تاسە و ئەو هەموو جموجووڵە و ئەو هەموو شۆخی و شەنگی و ئەو هەموو گوڵی جوانییە، ئەو دارە گوڵە قەشەنگە و بن ئەو خاك وخۆڵ و گڵە و لەناو ئەو زیندەوەر و مار و مێروانەدا! سەرنج و لێوە غونچەکراو و ئەو گنجە جوانەی لا لووتی دەبن ئەو چەند بستە پەردە خاکەی کە هەموو جارێ ئەژداد و ئابادی باوەژنێی پێ دەردێنا- ئێستا ئەوەتا لەو دیو هەزاران کێوی خاکەوەی دەبینم، و هەست دەکەم- تەواوی ئەو لەش و لارەی بەو هەموو تەڕو ناسکی و سفت و سۆڵییەوە و بەو چاو و برۆ و زەردەی سەر غونچەی لێو و دەمیەوە، دەگەڵ ئەو هەموو چاو و گەردن گێڕان و هێنان و بردنەیدا- و سەرتاپای دارەگوڵەکەی- هەمووی هەست دەکەم، هەمووی دە ئامێز دەگرم- باوەش گوڵ- هەردەو دەمەشدا کە بە دوای پاشماوەکەیدا دەگەڕێم، دەست دێرە و دەوێ دەکوتم و لێرەو لەوێی دەگێڕم. هێندە خۆش و جوانە پێم خۆشە تا دنیا دنیایە ئەو هەستە تەواو نەبێ و کۆتایی نەیەت و هەمیشە جێیەکی بەتاڵ بۆ خۆشییان دەکەلێنێکی گیانمدا دێڵمەوە... هەموو ئەو شتانەی دە ئامێز دەگرم و وردە وردە و یەکسەرە بە کوڵك و پێستەوەی دەخەمە نێو دڵمەوە، کە بەڕاستی بەرین و هەراو و گەورەیە و هەرگیز پڕ نابێتەوە و جێی هەموو شتێکی تێدا دەبێتەوە. ئەو دەمەی ئەوی دە باوەش دەگرم پەلەی زیاترمە...

سەرنجم چۆتەوە ئەودیوی رابوردووەکان، لە هەموو شتەکانی دەگەڕێ، لە سادە و ساکاری و لە گیانی و لە هەموو شتە زیادەکانی بوونی، تا هەموو ئەو شتانە لەکاو لە تاریکەکەی بیرەوەرییەکانەوە بێنێتەوە تەك گیانم و لەوێیان جێ کاتەوە و دایان نێت، دەپرسم: ((چۆن بوو؟)) قاقا پێدەکەنێ، ئەوجا برۆیان تێك دەنێ: ((هێشتا دێگەڵەی نەدیوە چەندماڵە...)) باوەژنی دەگوت.

دەڵێم: ((عەیبە کچێ! عەیبە! تۆ کچی، ئەو قسانە چن!)).

دەڵێ: ((جا با کچیش بم... باشە! بەگۆڕی بابیەوە... من بابم خان بووە! بەگۆڕی بابتەوە!)) وای چ لاسایی کردنەوەیەکی جوان! ((دنیا ئاو بیبا ئاغا خەو دەیباتەوە!)).

چ ژێر چەنەیەکی چکۆلانە! ئەوە نەقڵی قسەی باوەژنێیە ((چ بڵێم وەڵڵا!)) دەڵێم: ((ئاخر ئەتۆش زۆر پێ لێ هەڵدەبڕی... باشە چ دەبێ دەتۆش کەمێکی گولێنگان بە پاڵوێ وەکە...)) بەهەمان تاڵ و شیرینییەوە دەڵێ: ((بەڕیشی بابیەوە! ئاخر هەروام خۆ شلکرد بۆیە حاڵم واخۆشە. دەبێ رۆژێکی وای لەدەمی دەمەوە هەردوو چاوی بکەونە دە ئاودەستی دەمیەوە!)).

نارەحەت دەبم، دەڵێم: ((کچێ نەکەی کەرایەتییەکی بکەی و هەموو شتێکمان لە کیس دەی!..)).

هاواری باوەژنیٚ تا ئاسمانیٚ بەرزە: ((ئەی خاکی هەموو دنیایەت بەسەری، بیٚ باوان! دیسانەوە هیٚندە ئاوەی دەسەماوەرەکەی نەکردەوە ئا تەشخانەکەی نەسووتیٚ... دەك ملت شکیٚ بابان ویٚرانیٚ!)).

لەپڕ بەدەستە ناسك و بچکۆلانەکەی، وەك هەر بە گاڵتەوە رووی خۆی بڕنیٚتەوە و چـنگوڕکان لەرووەمـەتی خۆی بگریٚ: ((ئیٚستا چ قوڕیٚکی بەسەری خۆمدا کەم!)) و بەدەم پیٚکەنینەوە لیٚوەکانی دەگـەزیٚ هـەروەك شارەزای هیچ کاریٚکی نەبیٚ بەتەواوی، دەڵیٚی دنیا کۆمیدیایەکی سەر گەرم کردنیٚ و خۆ پیٚوە خافلاٚندنیٚیە و ئەویش دەو کۆمیدیایەیدا هەم ئەکتەرە و هەم تەماشا چی...

((وا هاتم، خانم... بەڵیٚ- ئەوە هاتم!)) و لەبن لیٚوانەوە پیٚدەکەنیٚ: ((هیس هیس)) بە یەك دووپڕمـەوە... دەست بەدەمەوە و پشت راست، دەترسیٚ پیٚکەنینەکە زۆریە بیٚنیٚ و دەرپەڕیٚ.

دەترسم هەرایەك بقەومیٚ دەڵیٚم: ((پووریٚ من گوتبووم دەستەسڕەکەم بۆ بشوا- من ناردبووم...))

هەوا هیٚڵەی بوو و شەپۆلی دەدان، دەتگوت لە گەرمان جینگڵیٚ دەدا، و من و دارگوڵ لە پـشت سـیٚبەری ئەو کاولانەی کە جوانیمانی لەبنـدا نیٚـژراوە دانیـشتووین. قـەلیٚك بـە باڵـە فڕکانـەوە دیٚـت، لـەولاترەوە لەسەرداریٚکی دەنیشیٚتەوە، دارگوڵ گلیٚنەی چاوەکانی بەرەو لای وی دەسوڕیٚنیٚ و قـسانی دەگەڵـدا دەکـا: ((ئاغا قەلە، شیلان خان چایەکەی خواردۆتەوە، نەشگریاوە... کە دەست و دەموچاویشی بشۆم هەرناگری، ماشەڵلاٚ هەر خاتوونیٚکە بۆخۆی- وەك بیٚچووەکانی تۆ نییە! دەی شیلان خانم بڵیٚ، بڵیٚ هۆی نازیٚ نازیٚ!)) و شیلان لە دوورەوە دەگەڵ دارگوڵیٚ، دەستە خەپە بچکۆلەکانی هەڵدەتەکیٚنیٚ و دەڵیٚ: ((هۆی نازیٚ، نازیٚ، نازیٚ!)) و من لە پەنجەرەی ئەولای کاولەیـەوە چـاوم لیٚیـە، و دەزانم کـە منـیش بـەرەو کاکـە قەلەکـەی دەگەڵەوان ئەوا دەستان هەڵدەتەکیٚنم! قەلەکە بەدوو چاوە زیتەکانییەوە سەیری وی دەکـا- و لـە شـەققەی باڵاٚن دەداتەوە و دەڕوا تا بچیٚ هەواڵ بداتە بیٚچووەکانی...

لە تەکمەوە دانیشتووە، لە تارانیٚ دەترسیٚ- بەلاٚم ترسانیٚکی پڕ لە تاسـە... ((وای! ئەوانـەیان بۆچـییە و چیان لیٚدەکەن!)) خانوو و بەرە گەورە و زەبەللاحەکانی دەگوت: ((وەکو مە سەراو و کانییان هەیە؟)).

((هەموو شتیٚکیان هەیە)).

باری سەرنجەکانی دەگۆڕیٚ، هەر راست وەك باری بزنە کویٚشتیریٚ تازە زاوی لیٚدیٚ، کاتیٚ کە کاریلەکەی لـە دوورە خۆیەوە بە باوەشی کەیبانووی ماڵیٚوە سـەیر دەکـات- نـەرم و شـل و شـاد و شـەنگوڵ و هـەردەو دەمیشدا غەمناك؛ دایکانە و کیژانە و بەتاسەوە تەماشا دەکات...



مامۆژن- ئەگەر بتوانی بڵیٚی- لە هەموو کاتیٚکی داوەشاو و شل و شەپڕیٚوتر بوو. هەر راست بە پەیکـەرە مۆمیٚکی ناشیرین و بەد رەنگ دەچوو کە پەیکەرسـازەکەی لەبـەر گـەرمای کـوورەی ئاگرەکـەی لـەبیری چووبیٚتەوە و بەجیٚی هیٚشتبیٚ. نەیدەتوانی سەروخواریٚ بە پلیکانانـدا بکات، دیارە منیش چـاوەڕیٚی ئـەوەم لیٚنەدەکرد؛ هەر کە منی دیت باوەشی کردەوە و هەولیٚدا چەند دلۆپە فرمیٚـسکیٚکان لـەو بوونـە وشـکەی خۆیەوە هەلڕیٚژیٚ، بەلاٚم بیٚسوود بوو. من لـەجیاتی ویـم لافـاوی گریـانیٚ بەرهەڵـدا کـرد: بـۆ تـەنیایی و بیٚکەسییە دارگوڵیٚ دەگریام؛ بۆ تەنیاییە کاتی مردنیٚـی و بـۆ بیٚکەسـییە ئازارەکـانی، بـۆ سـووکایەتییە دەرکردنیٚی لە ماڵیٚ... بۆ تەلاٚ خانمیٚش هـەر گریـام- بـۆ سـووکایەتییە هیٚنانـەویٚی... بـۆ سـیامەندیش هەروەتر- بۆ سووکایەتییە هەلاٚتنیٚی. بەڵیٚ، بۆ دارگوڵیٚ دەگریام، تا ئەودەمەی لەسەر گۆڕەکەی بووم خۆی و پیٚکەنینەکەی دەرفەتیان نەدەدام بگریم، ئیٚستا کە ئەو دیارنییە دەتوانم پڕ بەدڵ هەرچـی تـاڵ و سـویٚری دەروونم هەیە هەڵیڕیٚژم.

مامۆژن شەرمی لە من نەدەکرد. ئەو تریاکی خۆی دەکیٚشا و منیش خلٚتە و خـاڵی دەروونـی خـۆمم بـە فرمیٚسکان پاك دەکردەوە- تاویٚك دانیشتم، دوایە چوومە دیوەخانیٚ- چۆن بوو هەروا بوو، دیاربوو کەمیٚك شیٚواو و ئالۆز و پیس و پەلۆختر. سەرکارە پیرەم بەخۆ و خیسەخیسی سـینگی و فیسەفیـسی لووتییـەوە دەگەڵدا بوو، چاپەزی لیٚنەبوو، کچە قەرەواشە کە چای هیٚنا. مشووری خواردنەوەشیان خوارد بوو... ئیٚستا ئیدی پیاوبووم، ژن و ماڵم هەبوو، هەرچەندە بە مامۆژنیٚشم نەگوت. سەرکار گـوتی بیـستوویەتی کـە ژنم هیٚناوە، بەلاٚم بە خانمیٚی نەگوتووە، پیٚویستیشی نەکردووە پیٚـی بڵـیٚ. ئـەوە راسـپاردەیەك بـوو بـۆ مـن. راستیشی دەکرد- ئاخر ئەمانە راویٚژکار و رازگری ماڵیٚش بوون- راستی دەکرد، چ پیٚویست بوو برینەکانی سەرلەنویٚ بکولیٚنمەوە، ئەو گریانەشی کە دیبووی دیاربوو هەمووی بەشتیٚکی دیکە لیٚك دابۆوە.

گوتم: ((ئەوە بۆ هەر پەرداغیٚکت داناوە- خۆ خواردنەوە بە تەنیٚ ناخوریٚتەوە!)).

هەستا و چوو پەرداغیٚکی دیکەشی هیٚنا. بـە زۆری و بـە بیـانووی ئـەوەی کـە بـۆ سـینگەکەی باشـە- لەکاتیٚکدا کە ژەهریٚکی کوشندە بوو بۆی- یەك دوو پیٚکم پیٚ هەڵدا... مەبەستم هـەبوو. رەنگـی گـەش بۆوە و چاوەکانی سوورتربوونەوە. وردە وردە ئاماژەم بەو قسە و قسەلۆکانەی سەرزاران کرد. سەرکار سەری بەردایەوە و بەروخساریٚکی نهیٚنی پاریٚزەوە گوتی: ((وەڵلاٚ ئاغـا چـتان عەرزکـەم. زاری خـەڵکی نـاگیریٚ، خەڵکی بیٚ ئیش و کار زۆرن، هەموو شتیٚکی دەڵیٚن)).

گوتم: ((ئەوە راستە. بەڵام تا شتێکیش نەبێ شتێك ناگوترێ)). دەو نێوەیدا دووبارە پەرداغەکانم پڕکردنەوە. سەرکار دیاربوو پێی ناخۆش نییە، ئەوەندە دەبێ و نابێیەشی هەر بۆ هێندێ بوو تا ئەگەر هاتو خانم پێیزانی، ئەو سوێندێ بخوا و سوێندەکەشی لێنەکەوێ کە پێیان خواردۆتەوە. بۆیە دەستی بەسینگییەوە نا و داوای لێبوردنی کرد، یانی تا چاو لە نەخواردنەوێی بپۆشم. من پێم داگرت و ئەو گوتی: ((ئەلحوکمولیللا کاتێ ئاغا زۆرییە بکا ئیدی نۆکەر دەسەلاتی نامێنێ)). و پێکەکەی هەڵدا... و ئیدی هەروا یەك بەدوای یەکدا پێکی هەڵدان و نەیپساندەوە.

گوتم: ((سەرکار، هەروا کە تۆ پابەند و رازگری ئەم ماڵ و بنەماڵەیەی- کە ئەمەش دیارە نیشانەی پیاوەتی و بە ئەمەکی و هەق شوناسییە- منیش ئەوە دیارە بەڵگەی ناوێ کە لە تۆ زیاتر بەو ماڵەوە پەیوەندی دارم، چونکە هەر چۆنێك بێت ئامۆزام و ئابڕووی ئەم بنەماڵەیە بە ئابڕووی خۆم دەزانم، خۆ ئەگەر ئەمنیش وانەزانم ئەوە خەڵکی هەروای دەزانن و بمانەوێ و نەمانەوێ ئەو رووداوە و بەسەرهاتانە هەر بە ئی ئێمە دادەنێن- جا هەر لەتۆوە بگرە کە خزمەتکاری ماڵێی تا دەگاتە ئامۆزا و بن ئامۆزایانی وەك من. ئیدی هەرچۆنێکی من دەمەوێ ئەوەی لە دەمی تۆوە ببیەم کە هەم لە ئاغا و هەم لە من لە هەردووکمان نزیکی)).

(وای پێشان دەدا کە لەپێشدا لە کن بابەی نۆکەر بووە، ئەو دەمەی کە من منداڵ بووم، سەدجاری لە کۆڵ و قەلاندۆشکان کردووم و میزم بەشان و کۆڵیدا کردووە- و کە دیارە ئەمە هەقێکی بۆ وی و ئەرکێکی بۆ من دروستکردبوو) ((دەزانم، هەقتە، تۆ خزمەتکاری ئەم بنەماڵەیەی و دەبێ راز و نیاز و نهێنییەکانی وەك راز و نیاز و نهێنییەکانی ماڵە خۆت دانێی و بیپارێزی، و هەرواش بووە. بەلام ئاگاشت لێیە کە پەیوەندییەکانی من و مستەفاخانی جگە لە پەیوەندییە ئامۆزایەتییەش، پەیوەندییەکی دیکە بوو، ئەوەش هەر دەزانی کە ئەگەر ئەو بۆخۆی لێرەبایە ئەو زەحمەتەم نەدەدایە بەر تۆ. حەزم لێ نییە لە مامۆژنێ بپرسم، راست نییە برینەکانی بکولێنمەوە. ئیدی هەر چۆنێکە پێم خۆشە لە دەمی تۆوەی ببیسم، و دەنا پیاو ناچار دەبێ یەکێکی بنێرێ و لە هەر جێیەکی هەیە بیدۆزییەوە...)) سەرم گەرم بوو، و قسەکانم شێوەی فەرمانیان پێوە دیاربوو.

گوتی: ((بەچاوان، ئاغا، عەرزی دەکەم- هەروا تۆزێك راوەستن، عەرزی دەکەم)).



گوتم: ((ئەوەش دەزانی کە هەروا چەند رۆژێکی دیکەیە و ئیدی من دەگەڕێمەوە تارانێ و دڵنیاشت دەکەمەوە کە ئەو شتانەی دەیانڵێیت لە من و لە خۆت و لەو ژوورەی دەرناچێ. بەقسەی لای خۆمان مەگەر گۆڕ لێم ببیسێ)).

پێکێکی دیشم بۆ تێکردەوە، پەرداغەکەی هەڵگرت و بە داوای لێبوردنەوە یەکسەرە هەڵیدا و گوتی: ((بەچاوان ئاغا، ئێستاکە ئێوە دەفەرموون، سەرم دە ڕێدایە)). کەوچکە ماستێکی خوارد، ماوەیەکی لەسەر پاژنان خۆی هێنا و برد، چاوێکی بەرەو لای دەرێوە گێڕا، کەمێکی بیرکردەوە ئەوجا گوتی: ((تازەکە هەر دەفەرموون با لە هەوەڵێوە پێدابێم- کە هەر لە سەرەتاوە ئەو رووداوە چۆن قەوما)).

گوتم: ((بەڵێ، بێگومان)).

((بەڵێ عەرزی بە حزوور بێت...)) گەرووی ساف کرد ((عەرزی بەحزوور، کۆتاییە بەهارێ- یا ئەگەر هەڵەم نەکردبێ- ناوەڕاستی یەکەم مانگی هاوینێ بوو. هێشتا بەرێزتان نەچوبوونەوە تارانێ... یا رەنگە گەڕاشبووبنەوە، ئەگەر لەبیرم مابێ ئەودەمی رۆژێکی هاتمە خزمەت ئاغای: قسەی پارەیەکی بوو دەیانەویست بە یەکێکیدا بینێرنە بانکی سنەی و لەوێڕا بینێرن... بەڵێ، عەرزی بە حزور ناوەڕاستی یا کۆتایی مانگی هاوینێ بوو. ئەوێساڵێ رەنگە پێیان راگەیاندبن، بەراز زۆربوو. مەرەزە نەمابوو نەیانشێلابێ. ئاغا داوای لە ((ئەمنییە))ی کرد و مۆڵەتی دوو تفەنگانی وەرگرت... ئەڵبەتە بۆ خۆشمان تفەنگمان هەبوون، بەلام هەروەك بۆ خۆتان ئاگادارن بە چاك نەدەزانرا وەدەریانخەین- ئەوانەی کە مۆڵەتیشمان بۆ وەرگرتن هەر ئی خۆمان بوون- مۆڵەتمان لەوان وەرگرت. بەڵێ پاسی دوو تفەنگانمان وەرگرت و ئاغا دوو سێ کوڕە جحێڵەی گوندی بە چەند سەگێکی گورگ خنکێنەوە کردنە مەئموری راوە بەرازی. دوای نیوەڕۆیەکیان، هەروەك ئێستا، کە بۆ خۆیان تەشریفیان لێرە نییە، بەرەبەری نوێژی عەسرێ، یا شایەد و زووتریش بوو کە دەنگی تەق و تۆق و حەپەی سەیان بڵند بوو. خانمێ گەورە راکشابوو، لەو هەراو زەنایەی وە ئاگا هاتەوە و فەرموویان ((سەرکار)) بزانە ئەو هەراو هۆریا و زەنایە چییە، مێشکم چوو!)) ئەولکەریم و سیامەند لەوێ نەبوون. کە چووم هەراو هوریایەکە هەروا لە پەنا گۆڕستانەکەی سەر رێیەوە بوو... کە نزیك کەوتمەوە دیتم ئەوە خەڵکی دێی بە ورد و درشتەوە، بە ژن و پیاو و منداڵ و پیر و جوانەوە خڕبوونەتەوە و هەرایە. تا دوایە روون بۆوە کە راوچییەکان ورچێکیان بریندار کردووە و بەرەو ناو گوندیان هەڵبڕیوە. جەنابعالی لە بەندەی چاتر دەزانن کە تفەنگی ساچمە دەروەستی ورچێ نایە و پێی ناکوژرێ، تەنانەت هەر زۆر بەزەحمەتیش پێستەکەی دەڕووشێنێ- ئەویش ئەو ورچە، کە بە تەواوی مانا

لەندە هۆرێکە. عەیب نەبێ لەسەر پاشووان دانیشتبوو- هەر راست وەك جوانەگایەکی، دێز، کولکن، باوەڕ بفەرموو هەر تیسکێکی ئەها ئەها، هێندە درێژ!)) (چاوی زەق کردنەوە و بەنووکی قامکێ لەسەر دەستیڕا هەتا ناو چاڵی جومگەی قۆڵی راستی ئاماژە کردی) بەڵێ، قەپۆز رەش و کەللە ئەهە هێندە!)) دەستەکانی بە هەردوو لایاندا لێك بلاۆکردن، بەقەدراییە دوو باوەشان.

((عەیب نەبێ، بۆ سەگ دەیوێرا لێی وە نزیك کەوێ! هەر لە تەماشا کردنێی دەڕەوینەوە، رووی لە هەر لایەکی کردبایە، بێ ئەدەبیشە، کلکیان دەگەلۆزێ دەنا و وەك قەرەواشی کەوگیر لەسەری دراو بێرە و بەوێدا هەڵدەهاتن. راوچییەکان لە دوورییە حەوت هەشت هەنگاوانەوە، راست و چەپیان لێگرتبوو و سەگەکانیش لە دەوروبەریەوە و حەشیمەتەکەش لە بەرامبەریەوە راوەستا بوون... ئاغا باوەڕ بفەرموون شت لەوەی سەیرتر و خۆشتر هەر نەبوو. هەر کە راوچییەکان تفەنگەکانیان هەڵدێنانەوە و لوولەکانیان رادەداشتێ ئەو گیانلەبەرە بەستەزمانە وەك مرۆڤێکی خاوەن هەست و داك مردە دەستی کرد بە هات و هاوارێ... خۆڵی خڕ دەکردەوە و بەهەردوو دەستان وەسەری خۆی دەکرد، و دەیهۆڕاند و دەپاڕایەوە- چ پاڕانەوەیەك ئاغا، موسوڵمان نەیبینێ، و گاور نەیبیسێ دوایەش ئاغا، بەگیانی تۆ نا بە گیانی هەر سێ منداڵەکانم، کە هەرسێکیان قوربانی تۆزی پێڵاوی ئاغای دەکەم، وەك مرۆڤێکی زۆر بە هەست خۆی دەکرد بە مردوو- چاوەکانی لێك دەنان و لە هۆش دەچوو. ئەگەر بتدیتبایە دەتگوت ئەوە نەك هەر ئێستا سەدساڵە مردووە!)).

سەرکار بەداوای لێبوردنەوە پێکێکی دیکەی بۆ خۆی تێکردەوە و عەرزی کرد: ((جەنابعالی، ئێوەش نافەرموون پێکێکی دی تێکەنەوە؟- دەبوورن عەیب نەبێ- ئێوە بۆخۆتان ئەو گوستاخییەتان بە ئێمە فەرمووە)).

گوتم: ((با، بۆ منیش تێکەوە)).

پێکەکەی بە داوای لێبوردنەوە لە ئاغای بەسەریەوە نا و پارچە نانێکی بە کوتە گۆشتێکی مریشکییەوە ئاوقا کرد و درێژەی دایەوە داستانەکە: ((بەڵێ... نەك ئێستا سەدساڵە مردووە. عەیب نەبێ، بەجۆرێکی واوە چووبوومە ناو هەرایەکەوە ئاگام لێبڕابوو کە خانمێ گەورە هەر هەشە و منی ناردووە تابێم و بزانم چ باسە و جا بچمەوە و هەواڵەکەی بۆ بەرمەوە... بەڵێ، خۆی دەکرد بە مردوو. بەلاّم هەر کە لوولەی تفەنگەکان دەهاتنەوە خوارێ، سەگەکان بەپشتیوانییە راوچییەکان هێرشیان دەکردێ کتوپڕ زیندوو دەبۆوە و لەسەر پاشووان دادەنیشتەوە، و گوێی قوت دەکردنەوە، و بەراست و چەپەیدا دەڕوانی، و چاوی زیت



دەکردنەوە و دەیگرماند- و سەگەکان هەڵدەهاتنەوە. سەری موبارەکتان نەیەشێنم، جحێڵی گوندیش تاوێکیان سەر دەکردە سەرێ: بەو بێڵ و بەرچیغانەی کە دەگەڵە خۆیان هێنابوون، وەك تفەنگێ نیشانەیان پێ لێدەگرت و دەیانکردە قریوە. بەلاّم ئاغا، بەسەری ئێوە نا، بەگیانی هەر سێ منداڵەکانم، کە بە قوربانی سەری یەك تاڵە مووی سەری ئاغای بن، هەروەك مرۆڤێکی زۆر ئاقڵ و بە هەست و نەست و تەواو، لوولەی تفەنگێ و کلکە بێڵ و بەرچیغی زۆر چاك لێك دەکردنەوە، تا ئەوکاتەی کە جحێڵەکان بیانویستبایە پێکەوە هێرشی بکەنێ، ئەودەمی دووبارە هەر بەهەمان دەستوور رووداوەکە دووبارە دەبۆوە: دەپاڕایەوە، خۆڵی وەسەری خۆی دەکردەوە، ئەو بەستەزمانە بەو گیانلەبەرییە خۆیەوە دەگریا و لە هۆش خۆی دەچوو. دەونێوەیدا تفەنگچییەکان دەرفەتیان دێنا و تفەنگەکانیان دادەگرتنەوە. ئەوەشت درۆ عەرز ناکەم، هەر کە سمارتە (سمپارە)یان لە جێ تەرەقەی تفەنگەکان دەدا، ئەو گیانلەبەرە زۆر بە غەمبارییەوە ئاوڕی دەدایەوە و دەپاڕایەوە، هەروەك هەستێ بکا بۆ ئەوکارەی دەکەن. بەڵێ، ئاغا، ئاغام ئاغا بێ هەردەو سەر و بەندەیدا سەرم سوڕاند، دیتم، بەلاّم چ ببینم، ئەوا خانم و تەلاّ خانمیش لە پێشەوەی حەشیمەتەکەی راوەستاون و خەریکی تەماشا کردنێ ئەو بەزمەن! ئەودەمیم زانییەوە کە بەخێری ناگیانم هاتبووم هەواڵ و باسان ببەمەوە! بە کورتییەکەی... سەرتان نەیەشێنم، جحێڵێکمان هەبوو ناوی مستەفای دەروێش رەسووی بوو، ماشەڵلاّی لێبێ بە بەرزی دارچنارێك- ئەگەر رێك کەوت، و ئیجازەتان لەسەربوو، دەڵێم بێتە خزمەتتان بۆ خۆتان بیبینن... ماشەڵلاّ پەیکەرێکە!... بەڵێ، عەرزی بەحزور، هاتە پێشێ و مۆڵەتی لە خانمێ خواست کە بچێ دەگەڵ ورچەیدا پەنجەی لێکدا و زۆرەبانییەی دەگەڵدا بگرێ و ملی دەبەر ملی نێت...)).

بیرو بۆچوونێکی سەیرە! هەروەك دەسەردەمی هەزار ساڵ پێش ئێستادا بژیت، هەروەك ژیان هەزار ساڵ پێش ئێستا چۆن بووبێ و لەجێی خۆی نەجوولابێ! هێشتاش ئەو پیر و کۆنە ساڵە بە تەمەنانە هەر ماون کە بەکەسەرەوە دەڵێن: ((ئای رۆژگار! پیاو و پیاوەتیش تێپەڕی و نەماوە- ئمم!- ئێستا دێن و خۆ دەپشت بەردێکیەوە دەگرن و لە دوورییە دووسەد هەنگاوانەوە سێرە لەو گیانلەبەرە بەستەزمانەی دەگرن و دەیکوژن! تەنانەت کە تەقەکەشیان کرد تا ماوەیەکی زۆریش ناوێرن هەر سەیری لاشەکەشی کەن! ئەوە بەوەی دەڵێن راو- بەوەش دەڵێن پیاوەتێ! پێستەکەی دەگروون و دەرکە و دەرکانی دەگێڕن و دەستخۆشانەی پێوەردەگرن! راست دەکەی، پیاوی، وەرە پێشێ و وەك پیاوان، ملی دەبەر ملی نێ، تا ئەودەمی فێر ببی و بزانی راو یانی چی!)).

له راستیشدا دژواره پیاو هەروا لووت و بزووت بچته پێشیٚ- جا ورچه هەرچییەك و هەرچۆنێك بێت- ملی لەبەر ملی ورچیٚ نێت، دەنا هەروا له دوورەوەش هات و هاوار و قاو و قیژیش کارێکی پیاوانه نییه.

((... خانم سەیرێکی ورچه و سەیرێکی مستەفای کرد. دوو دڵ بوو. فەرموویان. ((کوڕه، سەقەتت دەکا!)) مستەفا عەرزی کرد: ((نا خانم، کیٚ دەڵیٚ ئەمن سەقەتی ناکەم!)) حەشیمەتەکه هەموو پێکەنین- ئەوەشتان عەرزکەم که هەر لەویٚ کۆمەڵه جحێڵەیەکی دیش که مەرەزەیان لەویٚ نزیك بوو ئەوانیش خڕببوونەوه و هاتبوون... تەلاٚ خانم لەسەر خانمیٚ رانەوەستا، گوتی: ((بڕۆ، بابزانین چۆنی سەقەت دەکەی!...)) بەنده چۆن لەلای جەنابتانەوه دانیشتووم ئاواش لەویٚ راوەستابووم و ئاگام لەو گفتوگۆیەی بوو- هەروەك دوێنیٚ بیٚ، ئێستاش رووداوەکەم لەبەرچاوانه... بەڵیٚ، ئاغام ئاغا بیٚ خەڵکەکەش هانیاندا. مستەفا کەمەری راست کردەوه و قۆڵی هەڵماڵی و بەسەری که لانگوچکیٚ (سۆرانی) سەردەستەکەی له قۆڵی شەتەکدا. غیرەتی دەویٚ، ورچەش هەروا لەسەر پاشوان قیت دانیشتووه و وەك مرۆڤێکی وریا گوێی قوت کردوونەوه، هەروەك کەسێکی چاوەڕێی راوێژ و ئامۆژگارییەکی بێت. بەڵیٚ، مستەفا هەروا چەند هەنگاوێکان چووه پێشیٚ و راوەستا و رووی دەمی ده ورچەی کرد و گوتی: ((پیرۆز[1]. خۆت بگره وا هاتم!)) ئاغا باوەڕتان بیٚ ئەگەر بەچاوی خۆم نەدیتبایه، پیاوی وەك بەڕێزتان نالێم، دەنا هەر کەسێکی دی هەزار سوێند و ئایەتی بۆ خواردبام باوەڕم نەدەکرد. ورچه وەك بیست ساڵ مەشقی پاڵەوانیەتییەی کردبیٚ دەستی هەڵێنانەوه و هۆڕاندی. به کورتییەکەی ئاغا سەرتان نەیەشێنم، هەر که مستەفا چووه پێشیٚ ورچه هەستایه سەرجووت پاشووان- و تێك ئالاٚن- هەر راست وەك دوو پاڵەوانان. بەلاٚم تا مستەفا خۆی خڕ کردەوه ورچه پێڵەپانییەکی لێدا و خستی، و لەسەر سینگی دانیشت. تا ئێمه وەخۆ کەوتین ورچه ئەژنۆی به سینگییەوه نا و به هەردوو دەستان دەستی مستەفای گرت و وەك چیلکه دارێکی به ئەژنۆیان بشکێنیٚ ئاوای دەستی مستەفای ((قرچ)) شکاند و دوایەش دەستەکەی دیکەی هەروا بەو جۆره قرچ قرچ تێك قرماند. ئەوجار ویستی لاقەکانیشی هەر بەدەردی دەستەکانی بەریٚ. کوڕه جحێڵه دەرفەتیان نەداو پێی وەربوون...

[1] لادێیەکان: بەزۆری دەحەکایەتاندا ورچی نێر یا میٚ بەو ناوەوه (پیرۆز) ناو دێنن و بانگی دەکەن و تێوەی دەخوڕن.



((ئەڵلاٚهو ئەکبەر! ورچه وەك عەرزم کردن که هێرشی خەڵکەکەی دیت وەك پێشان دەستی کردەوه بەخۆڵ وەسەر خۆکردنەوه و هاوار و پاڕانەویٚ. چەند هەنگاوێکان کشیەوه، و دووباره خۆی کردەوه به مردوو. ئیدی هیچ گوێی نەدایه سەگەکان و سەگەکانیش وازیان لەو هێنا)).

سەرکار هەڵوێستەیەکی کرد، مۆڵەتی داگیرسانی جگەرەیەکی خواست. جگەرەیەکم دایه جگەرەکەی وەرگرت و دەستی ماچ کردم و ئاوری دا. یەك دوو چەسپی له جگەرەکەیدا. ویستم پێکەکەی بۆ تێکەمەوه گوتی: ((ئەگەر بفەرمووی، با بۆ تاوێکی دیکه بیٚ)).

((باشه، دوایه تێدەکەینەوه)).

((بەڵیٚ، عەرزی بەحزوور بیٚ، که لەشی مستەفایان دەحاڵی حەلوەلایەدا واوەهێنایەوه! خانم کوڕه جحێڵەیەکی بانگ کرد، دەیویست به تفەنگچییەکان بڵیٚ کاری ورچەی یەك لاکەنەوەو ببڕێتەوه. بەلاٚم جحێلاٚن نەیانهێشت... بۆ خۆتان چاك دەزانن دەوەختی خۆ نواندنیٚ و خۆ هەڵشەنگاندنێدا جحێڵ گوێیان لەو شتانه نییه. ئەمجارەیان خەسرەوی کوڕی عەزه شوانی هاته پێشیٚ. چووه پێشیٚ و مۆڵەتی له خانمیٚ وەرگرت. خانم هەمدیس دوو دڵ ما- دیاره ناڕەحەتیش بوو، چونکه دیاربوو رەنگیان له رووان بڕابوو و هەر راست وەك گەچی دیواری سپی هەڵگەڕابوون- بەتایبەتیش که ئاغا له ماڵ نەبوو. بەلاٚم تەلاٚخانم وانەبوو، هەروا گوڵی له رووان دەباری- کیژ و کاڵی شل و مل و هەرزەرکار و تازه پێگەیوی لیٚ زۆربوون... و مستەفا و ئەو خەسرەوەش هەریەکه و دەنکێکیان لەویٚ بوو، لەراستیدا وەك دەڵێن ئەو خۆنواندنه- زۆر داوای لێبوردن دەکەم، ئەوه خۆتان فەرمووتان دەنا بەنده هەرگیز رێم بەخۆم نەدەدا)). به ئاماژەی سەرگوتم قەیناکا با بڵێت و رانەوەستیٚ ((بەڵیٚ، ئەم زۆرانبازی و ململانێیەش وەك دەڵێن ململانێی راکێشانی دڵی یاربوو، ئەو خەسرەوەی که عەرزم کردن لاوێکی قۆچاغ بوو... شوان و شوانزادەش بوو، کوڕی کێو و بەندەنان بوو، له مستەفای کەمتر نەبوو. دیاره هێندەی وی چاپوك و چوست و چالاك و بەزیبك و زاکون نەبوو بەلاٚم زۆر لەوی رەسەنتر بوو. ئەمجارەش تەلاٚخانم دەرفەتی بڕی و گوتی: ((دەبڕۆ، بزانم تۆ چ دەکەی!)) خەسرەویش چوو، هەر که له ورچەی نزیك بۆوه دەستی بڵند کرد و گوتی: ((پیرۆز خۆت بگره واهاتم!)) پیرۆزیش هەروەك جاری هەوەڵیٚ دەستی بڵند کردەوه و هەستایه سەر پاشووان. سەرتان نەیەشێنم- تێك ئالاٚن. ئەمجارەیان، هێنان و بردن ماوەیەکی کێشا: کوڕه شوان هەردوو لاقی والێك بلاٚوکردبوونەوه هیچ دەرفەتێکی پێڵه پانیانی نەهێشتبوونەوه بەلاٚم دیاربوو که ورچه دەیویست دەستەکانی بادات و سینگی له خۆی نزیك کاتەوه و تێکی بشکێنیٚ. کوڕەکان له دوورەوه دەیانقولاندیٚ و

ئاگاداریان دەكردەوە: ((نەهێڵی راتكێشێتە بەرەخۆی، وەرەوە دوایە... پێڵە پانییەكی لێدە!)) دیارە خەسرەویش زۆری هەوڵدا بەڵام سەرنەكەوت، و ئاخری ئەو دڕندەیە رایكێشایە پێشە خۆی و تا كوڕە جحێڵەكان پێیڕاگەیشتن وەك جاری پێشوو ((قرچە قرچ)) هەردوو باسكی تێك قرماند... و هەروەك هەوەڵ جارێ تا كوڕەكان گەیشتنێ ئەو چەند هەنگاوێكان بەولاترەوە چوو و لەسەر پاشوێ هەڵتووتەكا و چاوی لەسەریەك دانانەوە و خۆی كردەوە بەمردوو... هەرچۆنێك بوو جحێڵەكان چوون و كەلەشی ئەوەشیان هێنایەوە. تا ئێرە بوونە دوو...

((خانم تابلێی نارەحەت بوو، زۆر بەتوڕەیی و ناقایلییەوە بە یەكێك لە كوڕە جحێڵەكانی گوت بچێ بە تفەنگچییەكان بڵێ، ئەوە چاوەڕێی چین! هێشتا قسەكەی تەواو نەكردبوو كە سیامەند- هەمان ئەو سیامەندەی كەلای جەنابتان دیارە- هاتە پێشێ. دیارە من نازانم، هەرگیزیش ئەو رێیە بەخۆم نادەم بڵێم داخوا لەبنەوە دەگەڵ تەلاّ خانمێدا كاكە و برالەیەكیان هەیە یان نا- بەندە ناس خوایە، خوا هەر بۆخۆی دەزانێ- بەندە هیچم بە چاوی خۆم نەدیبوو بەڵام، دەی، هەروا كە دەزانن و ئاگادارن لاوێكی بالاّبەرز و تێكسمڕاو و بەخۆوە بوو، دەنگێكی پیاوانەی گڕی هەبوو و هەروەك بەڕێزیشتان تێبینیتان فەرموو لاوێكی زۆر بەڕەفتار بوو... بە منداڵە كرمانجان نەدەچوو... كێ دەڵێ، رەنگە هەر كرمانجیش نەبووبێ، چونكە خەڵكی دەوروبەر و لای خۆمان نەبوو، خەڵكی دەوروبەری لای ((ئالان))ێ بوو... بەڵێ، سیامەند هاتە پێشێ و لەبەردەمی خانمێ و تەلاّخانمێدا ئیكلامی كێشا و مۆڵەتی خواست- خانم زۆری پێناخۆش و نارەحەت بوو، تەلاّ خانمیش هەر رەنگی پێنەمابوو. بەڵام خانم دەگەڵ ئەوەشدا كە زۆر نارەحەت بوو هەر كە سیامەندی دیت زۆر لەسەرخۆ فەرمووی: ((ئەوە تۆش دەتەوێ بچی!؟ زۆر چاكە، بڕۆ بابزانین تۆ چ دەكەی!)).

سەركار بەلچكی مێزەرەكەی مل و لاملی خۆی سڕیەوە و دوای تۆزێك ورگ و گیپاڵ هەڵتەكاندنێ، بەدەم درێژەی داستانەكەوە گوتی: ((بەڵێ، سیامەند زەردەخەنەیەكی كرد و ئیكلامی كێشا و بەرەو لای ورچەیەوەچوو... ورچە گوێی قوتكردنەوە... داوای لێبوردن دەكەم، ئێستا ئیدی بەسەرهاتەكە هاتە گۆڕێ دەنا بەندە رێم بەخۆم نەدەدا. بێ ئیختیار ئاوڕێكم دایەوە و سەیرێكی روخساری تەلاّ خانمێم كرد، رەنگی ببووە زەردەچێوە- وەك بڵێین بۆ دڵۆپە خوێنێكی دەو دەموچاوەیدا دیاربوو، بەندە بێ ئەدەبی نەبێ دەڵێم نەخێر، تەنانەت بە قەدراییە یەك سەرە دەرزیشی خوێن و سوورایی تێدا نەمابوو. ئاڵقەی گەردن بەندەكەی دە مستێ گرتبوو، پشووی سوار ببوو، دەی باشە، بەڵێ، لەلایەكیەوە هەقی بوو، چونكە هەرچۆنێك بێ راستییەكەی سیامەند كوڕی ئەو ماڵە بوو بەڵێ... سیامەند چووە پێشێ- زۆر بەسەنگینی و



لەسەرەخۆییەوە- هەروەك هەمیشەی خۆی. چەند هەنگاوێك لەولا ترەوەی دڕندەكەوە راوەستا و دەستی هەڵێنا: ((پیرۆز، جا ئەگەر پیاوی بۆم راوەستە، ئەوە من هاتم!)) پیرۆز ئەمجارەشیان بەدەست بڵند كردنێی ئامادەگییە خۆی راگەیاندەوە و لەسەر پاشووان راوەستایەوە. بەڵێ، تێك ئالاّن. بۆ خۆتان كاكە سیامەندتان دیبوو. لاوێكی خۆ هەڵنەكێش و خاكەڕا بوو، دەگەڵ ئەوەشدا تا بڵێی چوست و چاپووك بوو، زۆرترین سەرو سەودای هەردەگەڵ جوانووە چەموشاندا بوو- هەر ئەوبوو پشتی پێدەگرتن... ئاغا ماندوو بوون؟ ئەگەر دەزانن سەرم ئێشاندوون ئەوە بفەرموون با پاشماوەی داستانەكە بۆ كاتێكی دی لێگەڕێین، ئێستا تاوێك وەحەسێن...)).

((نا، نا- بەهیچ شێوەیەك. زۆر سەرنج راكێشە؛ حەزم لێیە هەرگوێم لێبێ)). پەرداغەكانم پڕ كردنەوە، و هەڵماندان.

سەركار دەستێكی بەدەمولەوسیدا هێنا، گەرووی ساف كردەوە و دە درێژەی داستانەكەیدا گوتی: ((بەڵێ، تێك ئالاّن- چ تێك ئالاّنێك! كەس دڵی پێنەمابوو... بەندە خۆمتان عەرز دەكەم، هەقم بەسەر كەسی دییەوە نییە، ئەوان هەرخوا بۆخۆی دەزانێ- بەڵام ئەوەندەی دەزانم كە هەموو خۆشیان دەویست و ناخۆشەوییان نەدەویست. تەلاّ خانمیش ئەوە هەروەك عەرزم كردن ئەڵقەی گەردانەكەی دە مستێ گرتبوو و زۆر بەبێ ئارامی و نیگەرانییەوە سەیری ئەو بێنە و بەرەو بگرە و بەردەی دەكرد. بە كورتییەكەی ئاغام ئاغابێ هێشتا چەند دەقیقەیەك نەچوو بوو كە سیامەند هوویەكی كێشا و ورچەی لە زەوی بڵند كرد و ورچە بەسەر پشتێدا تەپەی لە عەردییەوە هێنا. بەندە پێموابێ هەر ئەو دەمی و هەر بەو تەكانەی كاری لە كارترازا- چونكە بەندە دروست چاوەدێری زۆرانەكەیان بووم، هەر كە پشتی وە عەردی كەوت، بێ ئەدەبیشە، لینگی قوچ بوونەوە. بەڵام هەردەو دەمەیدا كە ورچە خەریك بوو پشتی وەعەردی كەوێ سیامەندیش وەك كەسێكی ئەنگواو كتوپڕ شانی كێشایە دواوە... بەڵێ با ئەوەش عەرزكەم. ئەوەم دوایە لە ((حەمەلاو))ی بیست- راوچییەكی لێوەشاوەیە... عەرزی دەكرد بۆ گرتنێ ورچی چاكترین رێ ئەوەیە كە پیاو خۆ بكا بە مردوو و كاتێ ورچە دێ بۆنی پێوەكا تابزانێ مردووە یا زیندوو لەپڕ لە بناگوێی بشیرێنی. عەرزی دەكرد وا رادەچلەكێ كە تا چەند ساتەوەختێكان هەر لە هۆش دەچێ... دیارە دەبێ هەر دەو دەمیشدا چەند كوڕە جحێڵێك لەوێ ئامادەبن تا جەواڵێكی بەسەری رۆكەن و گوریس پێچی كەن... پێموابێ سیامەند ئەوەی دەزانی، كە لەپڕ لەبن گوێی ورچەی شیراند... پێموابوو هەر ئەوەش بوو ورچەی لە عەردی كردەوە...)).

سەیرە هەر راست وەك كودەتای... دەبێ خۆت بكەیە مردوو و ئەوجا لەپڕ لەبن گوێی حوكمەتی نارەتەی لێدەی و هەر كە لە هۆش چوو گوریس پێچی كەی...

((بەڵێ... ئاغام ئاغا ورچە هەردەو دەمەیدا كە سیامەند شانی دادەچەكێنێ پڕی دەداتێ و قەپێكی لێدەگرێ- دیارە ئەوەم دوایە زانی... بەڵێ ئاغام ئاغا، سیامەند لەسەر سینگی ورچەی دانیشت و هەردوو ئەژنۆی لەسەرداdan و بەدەستێكی قرت قرتۆكە (خن خنۆكە)ی گرت و دەستەكەی دیشی بۆ بەر پشتێندێ برد و خەنجەری راكێشا و تا كوڕە جحێڵەی پێڕا گەیشتن ورچەی گۆشتاو گۆشت سەربڕی، و هێشتا سەرەكەی هەر خوێنی لێ دەچۆڕا بڵندی كرد و وەك سەردارێكی پیرۆزمەند و سەركەوتوو، دەنێو تەلا خانمێیدا ئیكلام كێشا و سەری ورچەی خستە بەر پێیانیان- و قۆڵی خانمێی ماچكرد، خانمیش نێوچەوانی ماچكردەوە. تەلا خانمیش دەستی برد لەو لیرانەی بەلێوی كوڵەجەكەیوە درویبوون چنگێكی لێكردنەوە- راستییەكەی نازانم چەند دانەبوون- و دانییە وی، بەنیشانەی دەست خۆشییە...)) سەركار هەناسێكی قووڵی هەڵكێشا، كە دیارە لەبەر حاڵی سینگی لە یەك دوو سانتیمەتران زیاتر لە چاڵی بەر گەردەنێیڕا نەچووە خوارتر و تۆزێكی خۆ جووڵاند. دەكاتی گێڕانەوەی داستانەكەیدا هێندەی دەست راتەكاند بوون و هێندەشی خۆ هێنابوو و بردبوو و هێندەی دەموچاو و روخسار و چاو و برۆ بێر و بەوێدا هەڵسوڕاندبوو سەرتاپای شەلاڵی ئارەقەی ببوو، چاوەكانی سوورهەڵگەڕابوون و خوێنیان تێزا بوو، جێ دەنكی ئاوڵەكانی دەموچاوی هەموو رەش دیاربوون. بەسەر دەستەی كراسەكەی ئارەقەی دەموچاوی و لاملی سڕینەوە، ئەوجا دەستی بۆ قوتووی جگەرەكەی برد، لە جگەرە پێچراوەكانی خۆمم فەرمووده كرد و پێكم بۆ هەردوولامان تێكردەوە.

گوتم: ((با جارێ جگەرەكانمان بكێشین، پێكەكانمان هەڵدەین- تۆش هەناسێكی تازە كەوەو پشوێكی بدەوە)).

گوتی: ((سوپاس، خوا دەست بە تەمەن و پایە بەرزیتانەوە گرێ)).

جگەرەكانمان كێشان. پێكەكانمان هەڵدان، هەر كە چاوی بە چاوی چاوەڕوانییەم كەوتەوە، دەستی بە داستانەكەی كردەوە و گوتی: ((بەڵێ، هەروا كە عەرزم كردن، بەلای منەوە داستانەكە ئا ئەلێرەوە دەستی پێكرد. رەنگە لەوەو پێشیش شتێك هەبووبێ، بەلام ئەم رووداوە ئاگرەكەی زیاتر خۆشكرد- بەلای بەڕێزیشتانەوە هەروا نییە؟)).



گوتم: ((بۆ نا... هەرواشە، چەند ساڵێك لەمەوپێش كە هاتم شتێكم هەستكرد: هەستم كرد كە پەیوەندییەك دەنێوانێدا هەیە... ئەرێ بەڕاست ئەو بەسەرهاتەی كە گێڕاتەوە پێش ئەوە بوو یان دوای ئەوە؟)).

((مەبەستی فەرمایشتەكەتان ئەمەیە كە پێش تەشریف هێنانتان بۆ ئێرەیە؟)).

((بەڵێ، ئەو جارەی كە بۆ دواجار هاتم)).

((بەڵێ... دوای وی بوو... بەڵێ، وەك بڵێی دوای وی بوو...)) چەناگەی دەنێوان هەردوو پەنجەی گەورە و قامكێ شادەیەوە گرت، چاوەكانی وێك هێنانەوە و لۆچێكی هاویشتە نێو چەوانییەوە، بەلام پێدەچوو بۆی نەچنەوە سەریەك. گوتییەوە: ((بەڵێ، پێدەچێ دوای ئەمە بووبێ... ئەگەر درۆم عەرز نەكردبن چاكی ناچمەوە سەرێ، چاكم لەبیر نەماوە...)).

دووبارە لەسەر پاژنە پێیانەوە كەمێك جووڵایەوە. گوتم: ((چاك دانیشە!)) نەیسەلماند، هەر بەو جۆرە دانیشتەوە. دوای تاوێك بەروخسارێكی وەك پاڕانەوێوە بەلام گەش سەیرێكی راستییەكەی، بەندە بۆخۆشم لێرە بەدواوەم زۆر متمانە بەڕاستییە مەسەلەكان نییە...)).

گوتم: ((باشە، منیش هەر چاوەڕێی نیم هەرچی هەیە نەدیتە و نەبیستەم بۆ بگێڕییەوە)).

گوتی: ((دەك خوا دەوامی تەمەن و سەرفیرزایەتان دات... پێتان خۆشە بەسەرهاتێكی كە دوای ئەو رووداوەی قەوما بۆتان وەگێڕم؟)).

((بەڵێ)).

((بەڵێ، دوای ئەو رووداوە- یانی ماوەیەك دوای ئەوەی كە بەڕێزتان تەشریفتان برد و گەڕانەوە، هەروەك كە ئاگاداری تەلا خانم و سیامەند خۆیان هاویشتە ماڵێ قازی و لەوێ گیربوون. دواییەكەشی ئەوە بەڕێزتان بۆ خۆتان ئاگاتان لێیە. دوایەش ئاغا تەلا خانمیان هێنایەوە ماڵێ. ماوەیەكی پێچو- خۆ ئەگەر دەو ماوەیەشدا كەسێك عەرزی كردبن كە لە گوڵێ كاڵتریان بە تەلاخانمێ گوتبێ ئەوە راست بزانە كە درۆیان عەرز كردوون- تەنانەت كە نەخۆشیش بوو ناردیانە دوای حەكیمی و هەرچی پێویست بوو كردیان...)).

((دەزانم... دوایە؟)).

((دوایە، رۆژێکیان منیان بانگکرد- ئاغای عەرز دەکەم... فەرموویان ((دەمەوێ تەلاَی بنێرمە ئەودیوی عێراقێ، سەر ((چاك))ی، بەڵکە ئەوە خوایە سەر ئێشەکەی لە کۆڵ ببێتەوە. ئامادە بە دەگەڵی بچی)). ئامادەبووم... ئاغا تو سەری ئاغا ئەو شتانەی پێتانی دەڵێم با هەر لای خۆتان و لەنێوان خۆماندا بێت و نەچێتە دەرێ چونکە بۆخۆتان باش دەزانن کە مەرجی خزمەتکارییە ئەوە نییە هەرچی نهێنییەکی نێو ماڵێیە بچێ دەکۆشێ خەڵکی کات)).

گوتم: ((خراپ کارییەکانی تۆ هەر ئەوەیە کە شتێکت هەر لەبیر دەچێتەوە- ئەوەت لەبیر دەچێتەوە کە ئەو بنەماڵەیە، بنەماڵەی منن، راستییەکەی وایە، وەك رووداوێك بەبێ ئاگادارییە من روویدا بێت و ئێستاکە هاتوومەوە تۆ دەتەوێ بۆم بگێڕییەوە)).

گوتی: ((هەرواشە کە دەفەرموون- خوا سێبەری ئێوەمان لەسەری کەم نەکا. بەڵێ، ئامادەبووم، ئەسپم زین کردن: ئەسپی ئاغا و ئەسپێکیش بۆ تەلاَ خانمێ. بڕیار وابوو ئاغامان تا بەشێکی رێیە دەگەڵدا بێت و ئەوجا لەوێشڕا من جڵەوکێشی ئەسپی تەلاَ خانمێ بم و هەروەك جەنابتان شارەزان و وەك باوە دەگەڵە خۆی بەرم. بەڵێ دەگەڵ ئاغایدا کەوتینە رێیە، لە داوێنێ لێڕەواری... تو سەری خۆتان ناکرێ لەوەم لێگەڕێی نەیگێڕمەوە؟...

((قسەی سەیر دەکەی!... هەموو دەزانن- خۆ ئەوە نهێنییەکی شاراوە نییە. ئیدی هەرچۆنێك بێ، خۆ ئەگەر خەڵکەکە درێژییەکەشی نەزانن ئەنجامەکەی دەزانن)).

((بەڵێ، هەرواشە- بەڕێزتان راست دەکەن. بەڵێ... گەیبووینە داوێنی لێڕەواری ((دارساوێن))ی کە ئاغا فەرموویان: ((تەلاَ، دابەزە... سەرکار، سواری ئەسپەکەی تەلاَی دەبی و دەچییە لای کەریم بەگی- ئەوە کە تۆ دەڕۆی منیش هەر حەزم لێیە دەگەڵە تۆدا سەرێکی لە هەباساغای هەڵێنم... دەچی بە کەریم بەگی دەڵێی ئەویش دەستوبرد وەڕێ کەوێ و لە ((کانییە رەش))ێمان بگاتێ، هەر کە راسپاردەکەت گەیاندێ، تەقڵەکوت دەگەڕێیەوە... چاوەڕێتم)). سەیرم کرد، وەی- وەی! ئەو رێیەی کە ئاغا دەفەرمووێ کاری سەعاتێك و دوو سەعاتان نییە. هەر بۆئەوەی بن زمانیشی تێبگەم گوتم: ((ئاغا، تا ئەودەمی، ئێوە هەروا بە پێیان تەشریف دێنن!)) گوتیان: ((باشە ئیدی وردە وردە و لەسەرخۆ دێم تا تۆ دەگەڕێیەوە... تۆ بەغار دەچی و دێیەوە... زۆر خۆمەوە خرێنە)) و چاوێکیشی لێداگرتم، یانی بڕۆ، لە خۆڕا قسان مەکە. تێگەیشتم کە پیلانێکی دەبن سەریدایە، بەلاَم تەلاَ خانمێ بەستەزمان کە چارۆگەی بەسەریەوە بوو ئاگای لەو چاو داگرتنە نەبوو. من رکێفم لێدا و رۆیشتم...)).



هەڵوێستەیەکی کرد و لە گوڵی قاڵییەکەوە راما. گوتم: ((باشە؟)).

((وەڵڵاَ ئاغا... دوایە... دوایە سەلامەتییەوە... بەندە کە هاتمەوە خانمێ گەورە هێندە گریابوو کە هەرچاوێکی لەبەر گریانێ هێندەی یەك هەڵووژەی لێهاتبوو. بە کورتییەکەی، چ عەرزکەم، دەو ناوەیدا بەندە لەبەرچاوان کەوتم. هەتا ئێستاش کە ئێستایە خانم چاوی بە من هەڵنایەتەوە، دەحاڵێکیشدا خودا بۆخۆی لەو سەرەوە ئاگادارە- بەسەری موبارەکتان- هەرچی ئاگا و خەبەرە لەو رووداوە و بەسەرهاتەمدا نەبووە...)) دووبارە هەڵوەستەیەکی کردەوە، حەزی نەدەکرد ئەم بەشەیان باس بکات و بیگێڕێتەوە. پێم داگرت.

گوتی: ((ئەلحوکمولیللا، کە هەر سووری لەسەرگێڕانەوێی، چارە چییە، تازە کە عەرزم کردن، هەموویتان هەر عەرز دەکەم- بەلاَم ئاغا، من ئەم شتانەم هەر بیستوون، بۆ خۆم نەمدیتوون. ئەگەر دەونێوەیدا بابەتێك بە پێچەوانەوە راست نەبوو گوناهی بەندە نییە. نەکەن بفەرموون پێتان وابێ زانیومە و بەدرۆوەم عەرز کردوون)).

((دەزانم...)).

((بەڵێ... گوتیان- بیستم- لە نۆکەر و قەرەواشانەوە کە... بە کورتییەکەی، ئاغا سەری تەلاَ خانمێ لەسەر سینییەکی دەبات و لەپێش خانمێ گەورەی، و گوتیان... بەندە بیستم، راست و درۆیەکەی خوا دەیزانێ... فەرموویان: ((فەرموو، ئەوەش کچەکەت، کە ئابڕووی بنەماڵەیەکی برد!)).

هەروا لەخۆوە دەستم بۆلای نێوچەوانێوە چوو، تیرەقەی پشتێم بروسکاندی و روخسارم تێکچوو — چاوەکانم نوقاندن... چ دیمەنێکی بە ئازارە! چ دڕندایەتییەکە! ئەوە ئێمە لە کوێین، بەرەو کوێوە دەچین... هەر دەڵێی ئەفسانەیە! روخساری تەلاَیەم هێنایە پێش چاوان، بەو دوو چاوەکاڵ و پاکانەیەوە و بەو دەموچاوە تەڕە و ئەو قامکە ناسك و بێ ئارامانەی کە بەسەر گوڵی قاڵیەکەیدا دێنانەوە...

((بەندە دەمزانی کە ناراحەت دەبن، هەربۆیەش بوو کە نەمدەویست عەرزتانی کەم، بەلاَم ئەوە هەر بۆ خۆتان بوون پێتان داگرت.

((دەی باشە... نارەحەتە، بەلاَم کارێکە و تازە قەوماوە- دوایە؟)).

((دوایە.. دوعای سەرتان... نەمزانی لە کوێیان ناشتبوو، هیچ کەسێك هیچی نەدەزانی تا...)).

((تا چی؟)).

((ئاغا، ماشەڵلاّ کە تۆش گیری! تازە خۆ ئەوەندەشم هەر دەگێڕایەوە. ئاغا، ماشەڵلاّ بە قودرەتیّ خوای ئاغا، پیاو سەری لەکاری خوای سوڕدەمێنیّ... ئاغا، پیاو ئەگەر گاوری حەوت دینان بیّ موسوڵمان دەبیّ)).

((چۆن؟)).

سەرکار بە ژارە خەندەیەکی بیر و باوەڕ پێوە دیارەوە گوتی: ((بەڵیّ... ئیدی پێموانییە جەنابعالی ئەمەیان بزانن. بەڵیّ ماوەیەك رابرد. هەروەك پیّ دەحەسێن سیامەند هەلاّت. ماوەیەك رابرد)) بۆ جەختی درێژییە ماوەکەی چاوی وێك هێنانەوە و سەری لە خوارێڕا بۆ سەرەوە هەڵێنایەوە، یانی کە ماوەیەك! ((ئاغاش دەو ماوەیەیدا، هەروەك لەسەر ڕوو و روخسارییەوە دیاربوو و بەندە هەر لە منداڵییەوە چاکم دەناسین و شارەزایان بووم، لە دڵی دەرنەدەچوو، خۆی مات کردبوو و لە هەلێك دەگەڕا.

ڕۆژێکیان لە خەڵکی گوندیم بیست کە ئەویان (سیامەند) لەو دەور و بەرانە دیوە. کام دەوروبەر؟- هەر ئەودەم چۆم و کەنار دێیە. سوبحانەڵلاّ! دەدڵی خۆمدا گوتم: ((عەجەب لاوێکی بیّ مێشکە، ئەجەلی هاتووە، بەدوای مەرگی خۆیدا دەگەڕیّ!)).

((ڕاستیان کردبوو- هاتبوو، تەنانەت تابەردەمی ئەم پلیکانانەش هاتبوو: فیتووی لێدابوو، گۆرانی گوتبوو، دەگەڵ شوانان دوابوو. دیسانەوە لە کەللەی دابۆوە! ئاغا فەرموویان، هەرچۆنێك بووە و بەهەر نرخێکی بووە، بیگرن. چەند شەوێکان ئەولکەریم و یەك دووێکان لە کرمانجە باشەکان دەورەی گوندی گەڕان- بەلاّم هەموو جاریّ بەدەستی بەتاڵ هاتنەوە...

((شەوێکی دانیشتبووین، ئاغاش لەویّ بوو، دوای نوێژی خەوتنان بوو، هەروەك ئێستاکە لە خزمەتتان دانیشتووین، دەنگی تەقێکی هات. گوێمان هەڵخست- نا، هیچی دی بەدوادا نەهات: لە تەقەی گوللەیەکی زیاتر نەبوو، لە دەنگەکەشی را دیاربوو کە تەقەی دەمانچەیە. فەرموویان بچمە دەریّ بزانم چییە. چووم. یەك دوو کەسی گوندی لە ماڵیّ هاتبوونە دەریّ. دەنگەکە لە گۆڕستانێوەڕا هاتبوو. چووینە گۆڕستانەکەش. هەموویمان پشکنی... هیچی لێنەبوو، تاریکانی شەویّ بوو، چاوچاوی نەدەدیت... خەریکی گەڕانەویّ بووین کە یەکێك لە کرمانجەکان کە لە پێشەوە بوو کتوپڕ راوەستا و پاشە و پاش کشیەوە. گوتم: ((چیە؟)) گوتی: ((وەك مردوو بیّ!)) گوتم: ((کام مردوو؟)) گوتی: ((وەك مردووێك



لێرەکەوتبیّ!...)) داهاتینەوە، بەرێکەوت هیچ کاممان شخارتەمان پێنەبوو. یەکێکم ناردەوە فانۆسی هێنا... بەڵیّ سیامەند بوو گوللەکەی راست لە لاجانگیّ خۆی دابوو- دەمانچەکەی لەویّ لە تەنیشتێوە کەوتبوو- لەو حەوت تیرە بەلچیکیانە بوو... گیرفانەکانی گەڕام- سیّ لیرە و دوو ئەشرەفی دەگیرفانێکیاندا بوو، ئەوانەی هەموو دە دەستەسڕێکی گوڵداری لێوار چنراوەوە پێچابوون- پێموابیّ هەر ئەوانە بوون کە عەرزم کردن... ئەوانەی کە ئەو ڕۆژە تەلاّ خانم دابوونیە...

((کرمانجەکانم هەر لەویّ بەجێهێشتن، پێم گوتن کە لەویّ نەبزوون، بۆ خۆم هاتمەوەو بەسەرهاتەکەم عەرزی ئاغای کرد. فەرموویان ((مەیکەنە هەرا. پاچ و پێمەڕە و خاکەنازان بەرن و هەر لەو جێیەی کە لێی کەوتووە بیشارنەوە)). ((جێیەکی دیکەی پیّ پیس نەکەن)). بۆ خۆیان نەهاتن. فەرموویان ((وا پێشاندەن کە بەمنتان هەر نەگوتووە، وابکەن کە من هەر نەشمزانیوە)).

((بەڵیّ... پاچ و خاکە نازمان بردن و هەر بەو یەك دوو کرمانجەی کە بەلای تەرمەکەوە بوون گۆڕەکەمان هەڵکەند- هەر راست لەو جێیەش کە لێی کەوتبوو. بەلاّم هێشتا یەك دوو بستمان هەڵنەکەند بوو کە- پەنا بەخوا- کەللە سەرێك لەبن عەردی وەدەرکەوت!... وەی، ئاغا، دوژمنیشتان نەیبینیّ، سەری تەلاّ خانمیّ بوو!...)).

ماوەیەك بێدەنگی باڵی بەسەر ئەو ناوەدا کێشا، کە هەردەو دەمیدا دووبارە دەستم چووبۆوە بەر هەنیام.

((بەڵیّ، ئەومان لەویّ هەر بەجلەوە شاردەوە، بە تەك هەمان سەرەوە... کرمانجەکان لەپێشدا تۆزێکیان خۆ هێناو برد کە گوایە ئەوە کارێکی شەرعی نییە و ئەوە فلاّنە، ئاواو وا. گوتم ئۆباڵتان بە ملی من. یەك دوو هەنگاو رووەو قیبلە رۆیشتم و راوەستام و گوتم خوایە سۆز دەدەم کە رۆژی قیامەتیّ من بۆخۆم وەلاّمی ئەم کارە بدەمەوە!... هەرچەندە ئەوەشی نەدەویست چونکە خوا بۆخۆی وای قەڵەم لەوکارەی دابوو و ئاوا بەو شێوەیەی پێك گەیاندبوون- وانییە ئاغا؟)).

گوتم با.

((بەڵیّ، ئەوەش قودرەتی خوای! کورتییەکەی، سەری موبارەکتان لەوەی زیاتر نەیەشێنم... کرمانجەکانم سوێنددان کە ئەو بەسەرهاتەی تەنانەت بە کەمترین ئاماژەیەکیش هەتا لەلای ژنەکانیشیان نەدرکێنن... ئێستا لەوانەیە بفەرموون باشە چۆنی زانیوە واهاتووە و لەو جێیە خۆی کوشتووە؟ بەندە راست و رەوان نازانم، بەلاّم هەروای بۆ دەچم لەپێشدا بۆنێکی ئەوەم کردبوو کە سەری تەلاّ خانمێیان لە کویّ شاردۆتەوە.

پێموابێ ئاغا. بە خانمێی گوتبوو- ئیدی دایکە، ناکرێ پێی نەگوترێ... بەڵێ، ئاغا شوێنەکەی پێ نیشان دابوو، دیارە جەختیشی لەسەر شوێنەکەی کردبوو- خۆ ئەگەر جەختیشی نەکردبایە چونکە دەستی ئاغای دەکارەکەدا بوو هیچیان هەر نەدەدرکاند. بەڵام دەمدیت هەرچەندە کە زۆر کەمیش لە ماڵێ وەدەردەکەوتن- بۆ خۆتان ئاگاتان لێیانە- هەفتەی جارێك دەیانگوت خەفە بوون دە ژوورێدا دەبا بەرەورایەخان بەرن و لە بن هۆ و دار بەرووانەیان راخەن و چایەکی لێ لێنێن، ئەوێ جێیەکی خۆش و بەر والاَیە و هەر کە دەچنە وێ دڵیان دەکرێتەوە. بەڵێ دەچوونە وێندەرێ و لەوێ دادەنیشتن و زۆرجاران هەروا دوای نیو سەعاتێکان ژن و ژاڵەکانیان دەناردنەوە ماڵێ و بۆخۆیان بە تەنێ دەمانەوە- ئێستاش جاروبارە هەردەچن و لەوێ دادەنیشن و بەناخی خۆیاندا شۆڕ دەبنەوە... رەنگە- یان بەندە هەر دەدڵی خۆمدا وای بۆ دەچم- رەنگە دوای ئەوەی کە ژن و ژاڵەکانیان ناردبێتەوە دانیشتبن و لەسەر سەری تەلاَ خانمێ خوالێخۆشبوو گریابێتن و رەنگە لە یەکێك لەو رۆژانە سیامەند لەو دەوروبەرانە بوو بێت و شوێنەکەی دۆزیبێتەوە... بەهەرحاڵ، ئێستا خانم بێ ئەوەی بزانێ لەسەر هەردووکیان دەگرین!... با ئەوەش هەر بڵێم؛ ئاغا، بە قودرەتێ ئەو خوایەی، لە سەرینگانیوەیانەوە دار سێوێکی لا سوورە شین بووە، کە رەنگی سێوەکانی لەبەر سوریە هەردەڵێی خوێنی لووتییە! ناوکە سێو کەوتووە و بە قودرەتێ خودای شین بووە!...

((بەهەرحاڵ، هەروەك بۆ خۆمان دامان نابوو و چاوەڕێبووین مەسەلەکە چووە دەرێ و کەوتە سەرزاران و بلاَوبۆوە- چونکە ئاغا، کرمانج ئەگەر گیانیشی لە گیانی دەی هەر کرمانجە و جێی متمانە و پشت پێبەستنێ نییە- هیچ کاتێکی دەگەڵ پیاویدا راست و رەوان نین، لەبنەوەڕا کاری خۆیان هەردەکەن هەرچەندە خوا بۆخۆشی دەزانێ. ئیدی بەهەرحاڵ مەسەلەکە بلاَوبۆوە. ئەمنییە هاتن، ویستیان گۆڕەکە لێدەنەوە، بەلاَم خۆشبەختانە مەلای گوندی دە وتە و فەرمایشتانییەوە پێچان، تا ئاغا خۆی گەیاندە ئیستیوار شەرەفی و بن زمانی تاقیکردەوە. پیاوێکی خراپ نەبوو- مەبەستم ئیستیوار شەرەفییە- پیاوێکی بەدەستەوە بوو، هەر پارەت دابایە ئیدی هەر کارێکی بتکردبایە قەیدی نەبوو. دوای رووداوی هەلاَتنەکەی ئاغای کە ڕوویدا شتێکیان لێوەگیر کەوتبوو. لەراستیشدا دیاربوو هەڵکەندنەوە و لێدانەوەی ئەو گۆڕەش هەر پیلانێکی خودی (شەرەفی) خۆی بوو، رەنگە هەروا لە خۆشییەوە وایگوتبێ دەناخۆ ئەو جێی گۆڕەکەی نەدەزانی- هەر بەڕاستیش پێی نەدەزانی دەنا خۆ ئەگەر پێیزانیبایە هەروا بە ئاسانی دەستبەردار نەدەبوو. بەهەرحاڵ، وەخێر گەڕا، ئاغا دەو بەسەرهاتەیدا زۆر زەرەرمەندبوو. —پێموابێ دووسەد تمەنی دایە بەشی ئەمنییەی، ئەوەشم لەبیر نەچێ کە کێشەی لێدانی ئەمنییە و هەموو ئەو کێشانەی دیکەی کە بۆخۆتان دەیانزانن ئیدارەی ئەمنییە هەمیشە لە هەلێك دەگەڕا و بیانووی دەدیتنەوە



تا رك و کینەی خۆی پێ وەمرێنێتەوە و تۆڵەی خۆی بکاتەوە، دیسانەوە خودا لە بابی ئیستیوار شەرەفی خۆشبێت کە زۆری پێ دانەگرت)).

دوایین پێکمان هەڵدا، لەپڕ بەدیتنی پێستی (وەشەك)ێکی کە بەلای پەنجەرەکەیانەوە راخستبوو بێچووە وەشەکەکەم وەبیرهاتەوە. گوتم: ((ئەرێ بەراست ئەو بێچووە وەشەکە چی لێهات؟ ناوی ئاگرە بوو- وەنا؟ هێشتاش هەر ماوە؟)).

((نەخێر ئاغا، لێیداو رۆیی)).

((پاشی چەندی؟)).

((ئاغا، نزیکەی دوو سێ مانگان مایەوە- زۆر خۆشەویست بوو، ئاغا. هەموو دەمێ بەدوای تەلاَ خانمێ بەستەزمانەوە بوو. لە هەرجێیەکی بایە دەنگی زەنگوڵەکەی ملی دەهات. ئاغا بەو دوو سێ مانگانە هێندەی داکی لێهاتبوو- داکی یادی بەخێر؟)).

((بەڵێ، دەی)).

((بەڵێ، ئاغا. ئەوە تەختی دەموچاوی بوو- هێندە پان!)) هەردوو دەستی وەك کاتی دابەستنی نوێژێ لێك بلاَوکردن. ((ئاغا، گیانلەبەری هێندە جوان نەبوو، پیاو لە تەماشا کردنێی تێرنەدەبوو، باوەڕ بفەرموون پیاو حەزی دەکرد چەند سەعاتان هەر دانیشێ و تێیڕامێنێ.

تەلاَ خانمێ خوالێخۆشبوو خوویەکی سەیری پێوەگرتبوو. ئەویش هەروەتر، لێی نەدەبۆوە- وەك منداڵان هەمیشە سەری لە لەش و لاری هەڵدەسوی و گەنجەفە و گەمە و یاری دەکردن. باوەڕ بفەرموون، هەر کە ئەوی دەدیت، و سەیری دەکرد، خۆشەویستی لە چاوەکانیەوە دەباری.

بەیانییەکی کە هەستاین سەیرمان کرد کە بەڵێ، جێیەکە تەڕە و بێچووەکە نییە... جا وەرە لێرەو لەوێ بگەڕێ، نییە و نییە، وەك زەوی قلێشابێتەوە و قووتی دابێ. دەرکی حەسارێ، دەرکی ژوورێ- هەموو جێیەك- داخرابوو. لە ژووری تەلاَ خانمێدا دەنووست. پێدەچوو نێرە وەشەك هاتبێ، لایەکی پەنجەرەی کرابۆوە و هەر کە ئەویش بۆنی دەکا بە پەنجەرەی سەر حەسارێدا ئاودیو دەبێ- و رۆیی! دیاربوو بەوێدا هەلاَتووە، چونکە لاولاوەکان هەموو هەڵکەندرابوون. بەداخەوە یەکێك لەسەی شوانان لەبەر مەڕی دایدێتێ و دەیدڕێ. تاریك و روونان وەئاگا هاتین... هەر ئەو ئاگرە بوو، لە زەنگوڵەکەی ملی را دیاربوو. دیاربوو چونکە ماڵی بوو، هیچ بەرگریەك و چەنگەچڕەیەکی وای نەکردبوو... خوا دەزانێ... پێستەکەی وا شڕو وڕ

ببوو بەکەڵکی هیچ شتێکی نەدەهاتەوە... ونجڕ ونجڕیان کردبوو. تەلاَ خانمێ بەستەزمان، زۆر گریا- ئەو بەسەرهاتەی بە گەشبینی و بەڕەشبینییەوە گرێ دەدا... بەڵێ، ئەوەش دەربارەی بێچووە وەشەکی!)).

بە کۆتایی هاتنی داستانەکە گفتوگۆیە کە ساردبۆوە، شتەکانی کۆکردەوە و جێیەکانی راخست: جێیەکەی خۆی لە خوار ژوورێوە راخست زۆری پێنەچوو پرخەی لێ هەستا. بێدەنگی ماڵەکەی داگرت. لە پرخە پرخی ئەو و دەنگی سەگوەڕی بەردەوامی سەی شوانان یا ترپەی پێیەکی دووراو دووری ژێرخانێ، یا شوڕە شوڕی بەردەوامی ئاوی چۆمی و تەراتێنێ مشکان و جیڕەجیڕی سیسرکان بەولاوە هیچ دەنگێکی دی نەدەهاتە گوێ... یانی چ دەنگێکی دیکە نەبوو تابێتە گوێ. رشتەی بیرەوەرییەکانی کە دەگەڵ گێڕانەوەی داستانەکەدا سەریان هەڵدابۆوە و دەگەڵ رێچکەی خەوەکەی تێکەڵ ببوون. دەگەڵ هەر هەناسێکیدا قسەی تێکەڵ و پێکەڵی دەکردن و دەیبزڕکاند: ((تەلاَخانم... سیامەند...)). ((عەرزبێ)) و ئەوجا ناڵە و نرکە و دووبارە ((ورچ- بە قودرەتێ خودای... ئاغا، دارسێوێکی سێوە لا سوورە...)) و مینگەمینگ- هەروەك شتێکی بجوێ...

* * *

خەوم لێنەدەکەوت، هاتمە دالآنەکێ. دەمویست خۆم لە ئێستای خۆم بدزمەوە. بەلاَم ئێستاکەمم هەر لەبەردەمی قوت دەبۆوە. هەموو ساتەکانم ببوونە ئێستا، هەموو ساتەکانم وەك زیندانێ هەست پێدەکەم. زۆرم پێخۆش بوو هەموو شتێکم لەبیرچووبایەوە- بەلاَم ناتوانم. لەلایەکەوە ئێ دەمتوانی، چوون پێشینەی هەبوو، هەر بەڕاستی دەمتوانی. بەلاَم فەرامۆشی و لەبیرچوونەوە دەبێ بۆ خۆی بێت، پێشتریش هاتبوو، بۆ خۆم ئەوەم دیبوو- تاقیمکردبۆوە. ئەگەر بیرچوونەوە نەبوایە ئەو هەموو دەغەڵی و خۆشیانەمان لە بن سمێڵێوە نەدەهێنانە دەرێ، ئەگەر فەرامۆشکار نەباینایە، لێرە نەدەبووین- دەگەڵ هەمووانمە. بەکۆن و نوێوە: لێیاندا و کوشتیان و سوتاندیان و رۆیشتن. ئەدی دوایە؟ -دوایە، هیچ، لەبیرچۆوە. لە منداڵەکانیانمان ((بەندەی خودا)) دروستکردن، کە گوایە هەروا بەرێکەوت بوونەتە بەندەی خودا و گوایە ئازاری تەنانەت مێروولەیەکیشیان نەداوە! بەگی گەورەمان دروستکرد کە ماشەڵلاَ ماشەڵلاَ شیعر دۆست و ئەدەب پەروەربوو و بێجگە لە هەواڵی سەرزەوی ئاگای لە تەواوی حاڵ و باڵ و هەواڵی ئاسمان و مانگ و ئەستێرانیش بوو- خشتەیەکی بۆ ئێمە نەخشەکێشا کە دەوێدا دانیشین و هەر نێرگەلە (قلیان)ی تێکەین و دەبن میچی ئاسمانێوەی بەبا کەین...



ئەوەش هەر لەبیر دەبەینەوە- خۆ لە قەلاَتی بە کەللە سەران خراپترنییە- دڕندە و تۆقێنەر و ئازار دەران دەبەخشین، و دووبارە دێینەوە، بەقسەی کابرای شاعیر، بە گولاَوی وەنەوشەو و نێرگزان، دەگەڵ ئازار دەراندا لەرێی گەیشتن بەپێشکەوتن پەیمان دەبەستین و مۆری رەزامەندی بە ئازار و ئەشکەنجەی مرۆڤەوە دەنێینەوە! دەبێ لەبیریش بچێتەوە- دەزانن کە لەبیری دەبەیەوە. دەزانن کە ئەوەش بەسەردەچێ. جا سوودی چییە کە تۆ لە بیری نەبەیتەوە و کەسانی دی لەبیری بەرنەوە. ئەودەم دەبنە دوورگەیەك کە تەنانەت لە دووریشەوە یەکتر نابینن و سەیری یەکتری ناکەن. ئاخر با تۆ هەرچەندێك دەڕابردوودا بژیت کەسانی دی دە ئێستادا دەژین. رابردوو ئەودەمەی خۆشە و باشە کە بەقسەی فەڕەنگیان وەك رستە مۆسیقایەك دەگەڵ ئێستادا بێتە ناوێ و مانا و مەبەستێکی تازە بەسەردەمی ئێستا بدا. دەنا ئەگەر بێت و هەروا خۆ تێهەڵکێش بکات ئەوە ((ئاوازەکە)) خراپ و کاول و وێران دەکا.

کوڕەکان (زیندانییەکان) هەموو دە راڕەوەکەیدا نوستوون، وەك وێنەی ئەو فلیمانەی ئۆردوگا سوتاوەکانی سوورپێستەکان دەچن- ریزی سەد کەس بە تەنیشت یەکەوە، وەك کۆمەڵە تەرمێك، پاڵ کەوتوون- تەرمی بەهۆش و گۆش و زیت و وریا، کە لە سۆنگەی یا دەستی ئەنقەستی ((رابەر))ەوە بەو رۆژە گەیشتوون! لە هەر هەنگاوێکا چەند کەسێکت دەکەونە بەرپێی- بێ هیچ هێڵ و نیشانەیەکی تایبەتمەند بەسیما و سەرو رووەوە- نادیار، دوور لە ژینگە و دەوروبەر، وەك روخساری مردووان، سیس و ژاکاو و چرچ، خاڵی لە هەست و نەست و سۆز و هەندێ جار گرژ و مرچ و مۆن، وەك روخساری بەسێدارەوە کراوان کە ئازاری ساتەکانی گیانەلایان پێوە مابێ. بەلاَم هەر کە وەڕێ کەوتی، ئەوە هەر لاشەیەو دەلاق و لەتەرتەوە دە ئاڵێ- لە کوێ؟ بۆ نابینی، بۆ هەستی پێناکەی؟ بۆ نابینی کە من لاشەیەکم، بۆ تێناگەی کە من لاشەیەك نەبووم؟ تۆ ئەگەر بتویستبایە، من ئەگەر بمویستبایە، نەدەبووینە لاشە، نەدەبوومە لاشە، تۆ ئەگەر سەرنجت لە چەنەدان کەوتنی ئەوانەی دەدەمی گیانەلادابوون بدابایە هەرگیز نەتدەویست بمری، نەدەمردی- بەم شێوەیە نەدەمردی.

کۆمەڵە گۆڕێك، گۆڕی سەر ئاوالاَی پیاوانی ئازاو بە جەرگ، پیاوانێك کە دەیانتوانی ئازاو چەلەنگ بن و نەمرن... ئێستا لە ترسان مردوون- مردووی بەهۆش و گۆش و بەهەست- و بێهۆش... ئای کە ئەوە ترسناکە!.

پیری و لاوەتی هەردووکیان دەڕوواندا تێکەڵ یەك بوون- بەشێوەیەکی زۆر دزێوەوە نە، وەك گەلاَیەکی وشك بە تەك گەلاَیەکی سەوزی تەڕ و تازەوە- نا، هەردووکیان تێکدا، نەك پێکەوە، هەویرێك لە ساردی و

سرِی و سیسییە زستانێ و لە سەوزی و شیرنییە بەهارێ! کورِەکان هەر بە جوانی پیربوون، باس باسی دوو ساڵ و دە ساڵ نییە، لێرە ئێمە هەڵدان و گەورەبوونێ بەساڵ ناژمێرین، دەقیقە بە دەقیقە گەورە دەبین- دەقیقەکان جێی ساڵەکانیان گرتۆتەوە. وەك ئەوەی تەمەن هەمیشە هەر بەساڵ حسێب نەکرێ. ساڵ یەکەیەکی درێژەی کاتە، کەچی تەمەنی ئادەمیزاد پانی و قووڵی و رەهەند و زۆر شتی دیکەشی هەیە و تێدایە- و ئیدی بۆ حسێب کردن و پێوانەی سیس بوونی گیان هیچ پێوەر و یەکەیەکی پێوانە لە ئارادا نییە، مەتر پێو ناکرێ. هەر سەعاتێك لەو تەمەنەی بوومانە و هەمانە چەندین و چەندین ساڵە... چوون بەدوای ژیانێکی بەخۆڕایی بەسەرچوو و هیچە دەو تەمەنە رابوردووەدا، ئێمەیان فێرە ژیانێك نەکرد تا لە پێناویدا بمرین... مشتێك قسە و قسەلۆك.. و دوایەش تەسلیم و دوایەش، قۆچی قوربانی- کە سەرەنجامەکەی ئا ئەم سووکایەتیەییە...

بیر و مێشکمان گۆڕستانە، گۆڕستانی بیرەوەرییەکان، سووکایەتییەکان، و تەسلیم بوونەکان... کە هەمووی هەر مەرگ و تاڵی و سوێرییە- و ئێستا پەیمان دەدەن کە راپەڕین خەریکە سەرپێ دەکەوێ دەك خوا بیبڕێ، هەر کە راپەڕین بەرپابوو و سەرپێکەوت وەك وا دیاری کرابێ، هاوڕێیان دێن و وەك ئەرکیان ئەوەبێ، دێن و راپەڕینەکە لە پەل و پۆ دەخەنەوە و دەیخەنەوە... لەجیاتی ئەوەی کە راپەڕین بەرپا بۆتەوە، بێن شایی و لۆغان بکەن، چییە بابە، وەڵڵا بەرێوەبەری گشتی گۆڕاوە! و دەبێ لە جاران تۆکمەتر دەورەی لێدەن- و وەك پەپوولەی بسووتێن... پەپوولە باڵ نەخشینەکان بسووتێن تا سیسرکە بۆگەنیوەکان بمێننەوە و بژین!.

دیسانەوە هەر شەو چاکترە: هەرچۆنێك بێت شەوانە دەخەوی، بەشێوەیەك هەردەنووی، یان خۆت دەکەی بە نووستوو، ئیدی بەهەرحاڵ بەگوێرەی عادەتی هەڵدان و گەورەبوونێ ئەو گەورە بوون و هەڵدانەی رادەگری. رۆژەکان ترسناکن- ئاخر رۆژەکان وەك عادەتە، هەردەبێ بژیەیت- بەلاّم چۆن؟ بەم هەموو سوکایەتییەوە، بەو هەموو ملکەچی و سەرشۆڕییەوە، چۆن!؟.

بەهەر پێوەرێکی کە دەیگونجێنی بەهار هاتبۆوە، وەرزی بوو، زستان دەبوو هەربڕوا- بەلاّم نەڕۆیی.

پەڕەسێلکەیەك نەهاتەوە تا ئەو بڕوات. شارەکەی من پەڕەسێلکەی نەبوو- خۆ نەشدەکرا پەڕەسێلکەی لە دەرەوەڕا بێنی- ویستیان بەلاّم نەبوو- پەڕەسێلکە دەبێ بۆخۆی بێت، بۆخۆی بۆنی بەهارێ بکات و خەڵکیش بهێڵن لەنێو ماڵەکانیاندا هێلانان بکەن... پەڕەسێلکە نەهاتنەوە، خۆ بە کوندە بەبۆیانیش بەهار نایەتەوە. کوند هاتن و هێلانە پەڕەسێلکەکانیان داگیرکرد و پیاو ماقوولانیش دەنێو ماڵەکانیاندا



پێشوازییان لێکردن و دان و ئاویان بۆ رۆکردن- و بەهاریش تووڕە بوو و لە نیوەی رێیەڕا گەڕایەوە، هەر راست وەك ئەو پیاوەی کە دەچێتە سەفەرێ و کارەکەی زۆری پێدەچێ و کە دەگاتەوە ماڵێ پیاوێکی بێگانەی ملەستوور لە ماڵێدا دەبینێ- ئەو پیاوە مێردی ژنەکەیەتی. رێ و رێ دەگەڕێتەوە، دڵشکاو و شێواو، نارەحەت و غەمبار و تووڕە بەلاّم تێماو. ئەوەی ئێستاش دەناخ و هەست و نەست و بوونی ئێمەیدا هێلانە کردووە، ئەقڵ و تووڕەیی نین کە دوو هاودەم و هاوڕێی سەرکەوتنێن تێمان و نائومێدین- دوو یاری بە ئەمەکی دۆڕان و بەزینێ...

((ئەمە چۆناو چۆنە، هەروا بەدەست بەستراوییەوە دەتان نێرنە قەسابخانان؟ ئەوە بۆ واخاو خلیچك بوونەتەوە؟ خۆ هێندە شارەزابوون دەنگێکتان لێبێ؟ کەواتە جیاوازی نێوان سەی بەر مەڕی و سەی ناو سالۆنان چییە؟... و ئێوەش بوونەتە ئەو سەگە سالۆنیانەی کە تا خاوەنەکانیان دیارە ئەوە هەر واقە واقیانە و مێشکی خەڵکی دەبەن، بەلاّم وەی بەو دەمانەی کە خاوەنەکانیان دیارنین!.. ئێوەشیان هەر بۆ ناو سالۆنان پەروەردە کردووە و پێگەیاندووە.

ئەمە قسەی بابەیە، راستی دەکرد. دەگەڵ ماڵە ئێرانییەکی خوو فەرەنگیدا بوومە ئاشنا. خانم سەگێکی هەبوو، کە هەمیشە دەکۆشێیدا کرووشمە بوو و هەرچیەکی کە بۆخۆی نەیخواردبا بۆ ((ژوولی)) رادەداشت. بەلاّم هەر بۆئەوەی پێشانیدا کە ژوولی چەندی پێوە پابەندە بەدەنگێکی پڕ ناز و نووز و خۆ تەسك کردنەوەی ژنانەنەوە کە لەسەرجێی خەوێ بە گوێی سەگەکەی دەگوت:

Jolie ce monsieur m'en veu- u- t!

((ئەو پیاوە رکی لەمن دەبێتەوە- وە!)) کۆتایی رستەکەی زۆر بەناز و نوز و چاو داگرتنەوە، دەردەبڕی، ژوولی هەر کە ئەو ئاوازە رەنجوریەی دەبیست بەرەو لای ئەو پیاوەی کە گوایا خانمێ بەهیچ نازانێ زیت دەبۆوە و بە روخسارێکی تووڕە و تۆسنەوە دەی واقاند: ((وق، وق، وق- وق، وق!)) بۆ خۆمان دەمانزانی، هەموو هەر دەیانزانی. هەموو دەیانگوت کە گیرانمان لە هەڵەکان و هەڵەی لێپرسینەوەکانەوەیە. بەڵێ ((دەبوو بمانزانیبایە، و هەستی خەتەر و تەلەزگەکانمان بکردبایە)). ئەمە قسەی ئەو بنەمالانەیە کە دەیانکەن. ((دەبوو خۆمان لە خەتەر و تەلەزگان دووربگرتبایە- وەك ئەوانیدی. بەلاّم ئەوانیدی نەیاندەزانی کە ئەمە هەڵەی تاکەکەسی نەبووە، کەسێك کە دە حیزبدایە ئیدی کەس نییە، هەرچەندە ئەو کۆبوونەوەی کە دەشیانگوت کۆبوونەوەیەکی زۆرەملێ و تۆ بزیانە نەبوو، کۆبوونەوەیەکی سادەی تایبەت بوو...

شته سەیرەکانی زیندانیٚ تا دەهات کەم کەمە شوێنەواریان وەدەر دێخستن... هەموو شتێك گۆڕاوە... ریسوایی گەورە ماوەیەکە دەستی پێکردووە. ئێستا ئیدی بەشێوەیەکی وامان دەگەڵدا دەجوولێنەوە کە هەروەك ئەوەی شتێکین و دەنا هەر مرۆڤیش نین، شتێکی پیس، شتێکی گلاۆ هیچ و پووچ. ئێستا ئەوە خەریکن هەر بە سووکایەتی پێکردنیٚ، دەمانسرنەوە لە پێشاندا ئەشکەنجە و ئازاردان بوو- ئێستا سووکایەتی پێکردنە، ئێستا هەر گیانە وەبەر هێرشان دراوە، ئێستا ئەوە بەقسەی ئەو رۆشنبیرە فەرانسەوییەی، تەمایانە پشتگوێمان خەن و بە نەبوومان دانێن. ئێستا ئیدی بە پێچەوانەی جارانەوە کە دەچووینە دادگایە، سینەمان پڕ ناکەین لە هەواو بەسەری بەرز و گەردنی کێلەوە بەڕێیەدا ناڕۆین... ئەودەمیش رەنگە هەر ویستبێتمان بەنیوە سەر و گەردنێکەوە ((منی)) ئامادە دەدادگایدا تۆزێك زیاتر هەڵکشێین و دیارتر بین- ئاخر لەوێش هەر خۆمان نەوی دەکرد، خوار، زەبوون، بیٚ هەواو ئومێد. هەڵخەڵەتاو بە بەڵگەوە. هەرچەندە کەسانێکیش هەبوون بەبیٚ خۆ نەوی کردن و هەر بەسەری بەرز و گەردنی راستەوە مردن، هەرواش بە ئازایەتی و ورە و پیاوەتی خۆیانەوە سەریان نایەوە. ئێستاش ئێمە هەر کاتیٚ کە بەڕێیەدا دەڕۆین خۆ کوور دەکەینەوە و تا بتوانین خۆمان چوکەڵەتر پێشاندەدەین نەکا وەك ملهوڕێکی بزۆز دەرکەوین و خودانە خواستە ((دام و دەزگا)) لە شوێنێکەوە چاوی تێوە بێت و ((برۆ))یان تێك نێت و پێی وابیٚ کە خەریکین لاسایی مرۆڤی ئازاد و سەربەست دەکەینەوە و شانسی ناوەکانمان لە چوونە نێو لیستی گیراوە حوکم سووك کراوەکان لیٚ بسەندرێتەوە- خێزان و هاوڕێکانیش لە دەرێڕا رادەسپێرن، هەرچی سووکترە چاکترە، ئازایەتی باوی نەماوە، سەربڵندی بازاڕی کە سادە و کڕیاری نییە، ئێستا ئیدی بۆ سەرنەویٚ کردنیٚ سەربەرزەکان و شۆڕتر کردنەوەی سەرە شۆڕەکان، بۆخۆمان کەوتووینە گیانی یەکترەوە- دامو دەزگا هەروەك هەمیشە لاوەکان هەر بەلاوەکان دەکوژیٚ و گەورەکانیش ئەنجومەنی پرسە و خەتمی بەوێنە هەڵواسینەوەی بەدووورودرێژی بۆ دەگێڕن... سەیری روخسارە خەمۆکییەکانی کوڕەکان دەکەم و قسەکانی بابەم وەبیر دێنەوە: ((هەی پیاو ئەو هەموو ئەفسەرانەتان دەنێو سوپایدا هەبوو، باشە دەتانویست بەوانەشەوە کە لە دەربارێدا هەتانبوون- خۆ هەتانبوون، وەنا؟)).

دەڵێم: ((بەڵیٚ)).

((دەتانتوانی بەوان دوا بڕیارێك لەسەرمێزی شای دابنێن و هەڕەشەی ئەوەی لێبکەین کە ئەگەر بێت و دڵۆپەخوێنێك لە لووتی هەر کەسێکەوە بێت دەتکوژین- ئەوەش بزانە کە نەیاندەکوشت- هەمووی ئازاد و بەرهەڵدا دەکردن و تەنانەت یەکێکیشی لەو گیراو و بەندکراوانە دە زیندانێدا نەدەهێشتنەوە- خەڵکی گیانی خۆیان خۆشدەویٚ. ئێوە ئەم وڵاٚت و مەملەکەتەتان نەناسیوە.



پیاوی ئەم وڵاٚتە، بە دەردی ژن دەڵێن لە ((قوڵتە))ی گۆزەی دەترسن. روو لە هەر کەسێکی نێی باوەڕ ناکا، گاڵتەت پێدەکەن- ئەم هەموو ئەفسەرانە، ئەو هەموو لاو و جحێلانە- هەردەڵێی ئەفسانەیە! بەڕووتدا هەڵدەشاخێن و دەڵێن، نا براله وانییە، هێشتا گەرمە تەریقەتی، قورساییە راستییەکان وەك خۆی هەست پێناکەی. لەراستیدا ئەرکی رابەرەکانتان ئەوەبوو کە بەهەر جۆرێك و شێوەیەکی گونجاوە هەموو ئەو هێز و گوڕ و تینانە کۆبکەنەوە و ئەو لافاوی هەڵچوون و خرۆشانە لەراستە رێی خۆی لاڕیٚ کەن و بەلایەکی دیکەیدا بەرن و هەر بە دەستووری ئەربابان هەموو ئەو هێز و توانایانە دەبەستیٚ کەن و لە نێوی بەرن؟ ئەدی ئەگەر وانییە بۆ وای لێهات؟ -من دەزانم، تۆ نازانی، سی ساڵ یا چل ساڵی دیکە هەر ئەو هێزو توانایانەیە و دەشتە...)).

وەلاٚمێکم نییە. ئەو بە ئەزموونی خۆی دەزانیٚ کە هەر بەیەکبوون و پاڵ وێکدانی سەرکەوتن وەدەست دیٚ و حیزب لە هەموو جێیەکی هەر ناکۆکی دەنایەوە: ئەوە لێدانی رێکخراوەکان، لێدانی موسەدیق، تاوانبارکردنی راپەڕینی نەوت، لێدانی ئەموئەو...)) کام سەرکەوتن؟ سەرکەوتن بەڕابەرایەتی موسەدیق- هەرگیز)) ئەو دەیزانی کە بەبیٚ ئامانج ملمان لێناوە- دەیزانی کە بچووکترین و کەمترین کارێکمان بەگوێرەی راسپاردە و فەرمانە، دەیگوت دەزگایەك بتوانیٚ لە دەرکردنی ئەندامێك و لابردنی یەکێکی دی و دانان و دامەزراندنی کەسێکی دی دەستی بڕوا چۆن ناتوانیٚ دەست بخاتە ناو ئەو سەرپێچییە گرینگانەی رووداوەکانی نەوت و هەموو ئاریشە و کێشەکانی دیکە و چۆن ناتوانیٚ تێیاندا بالاٚ دەستیش بێت...

بەلاٚم ئێمەش گوناهێکمان نەبوو. دۆستەکانمان کەسانێکی گەورە و رێزدار بوون، هەر لەبەر ئەو رێزەش کە لێمان دەگرن- یانی ئەو کۆمەڵە دۆستانەی کە ئەوانیش هەر دە حیزبدا بوون بەلاٚم حیزب ئەوان نەبوون، چونکە دوایە لەوەی گەیشتین کە حیزب لەراستیدا چەند کەسانێك بوون کە هەر تەنیا فەرمانیان دەردەکردن... ئەدی، هەربۆیە بوو کە هەموو لە هەموو لە ژن و ماڵ و مندالٚ و خاو و خێزانی خۆمان دابڕابووین و چاومان بڕیبووە ئەوپەڕی ئەوقیانووسەکان و شتێکیش کە ناوی ((حیزب)) بوو، کە هیچ کەس رەنگ و روو و روخسارە نادیارەکەی نەدەدیت... کە چاومان کردەوە لەو ئەوقیانووسە نادیارە کەم تروسکەی هیوایە تێپەڕیوین، لێخوڕاوین. ژانێکی گران و سەختە. یانی ئیدی هیچت بۆ نەماوەتەوە و دەستت لەبنی هەنبانەی هاتۆتە دەریٚ... جاران دۆستایەتی و برایەتی دەچاوەکانڕا دیاربوون و دەبریسکانەوە، کەچی ئێستا هەمووی هەر رك و کینە و نەفرەتە، خۆ ئەگەر نەفرەتیش نەبێت دۆستایەتی و خۆشەویستی و گەرمییە میهرەبانییان تێدانییە.

حیزب رۆیی، بەقسەی پێشینان بووە ئاگری دوای کاروانی. جاری وایە بەشەپۆلێکی کورت دەنگی بانگێکی نادیاری پەڕاکەندە، هەروەك نووزەی قوولاێی بیابانێك، پڕیشکێکی کز و لاواز لەو ئاگرە خامۆشەیەوە هەڵدەستێ، ئەو پڕیشکە لە ئاوردووی خۆیەوە دەردەپەڕێت و تۆز و خۆڵ و وردە خۆڵەمێشەکەی بەدەموچاوی من و حوسێن و حوسێنەکانی دیکەدا وەردەکات- و ئیدی ئاه، پوفف! ئەوە خۆڵەمێشەکەیەتی بەهەر چوار دەوری وڵات و مەملەکەتیدا کراوە: لە هەر زیندانێکی نوێنەرێك، و دەهەر کەلاوەکدا دانیشتوانێك، و دە هەر ئوستانێکی (پارێزگا) بێ سەر و سامانێك هەن- و دیارە لە زۆر جێیانیش خوا پێداو و دەست ڕۆیشتوو و لە وڵاتە ئەوروپاییەکانیشدا ((چالاکانێك)) هەن- و دیارە لە زۆرینەی گۆڕستانەکانیشدا جا بەواسیتە و بێ واسیتە کۆڕگەلێك هەن وەك گۆڕی: دارگوڵ: و تەلاێ، و هەزاران گوڵ و تەلاێیەکانی دی... و لێرەش لەم گۆڕستانی غەریبانەشدا ئێمە...

وەك راستیان فەرموو بێ: ((ئێوە وەك باریکە ئاوێکین لە درزی بن تاشە بەردانەوە بێنەدەرێ و خۆتان بە لافاوێکی پڕتین و تەوژم و بەهێز بزانن. چونکە بە ئاستەنگ دێنە دەرێ، پێتانوایە دەبێ هەرچی پانتاییە زەوی هەیە داگیری کەن- بەلاّم ئاگاتان لێ نییە کە هەر کە گەیشتنە سەرزەوی وشك دەکەن... دیارە جاری واشە هەروەك فلیم دەرکردنێ کە دووربینی کامێراکە بەرامبەر خۆتان رادەگرن و باق و بریقێکتان لێوە دەردەکەوێ- و هیچی دی!)) ئەمە قسەی هاوڕێیان نەبوو، هاوڕێیان وایان لە خۆیان و لە خەڵکی گەیاندبوو کە هەر بەڕاستی لافاوێکی تووڕە و هەڵچوو و بێ بەستێن. ئەوەش قسەی ناحەزان بوو.

((تروسکایەکتان دیوە بەلاّم هێندە بەئاگا نین دووری و نزیکییە ئەو رووناکییەی دەستنیشان کەن. ئەمە قسەی بابەیە. راستی دەکرد، هەرچەندە ئەو بەگاڵتەوە دەیویست بڵێ: ((بۆنی کەبابتان کردووە نازانن کەرێ داغ دەکەن)). بەلاّم مەبەستەکەی راست راست بوو. دەو ژینگە و دەوروبەرە تاریك و نوتەکەیدا تروسکاییەکی روناکییەمان بەدی کردبوو کە بە هەڵپەوە ئێمەی بەرەو لای خۆی رادەکێشا.

نازانین نە هەوایەکە هێندە تاریك بوو نەمێشکی مە هێندە پاك و بێگەرد بوو کە پێمان وابوو لە چەند هەنگاوێکانمان زیاتر لێوە دوور نییە و هەروا تاوێکی دی دەیگەینێ.

بەلاّم هەم هەوا تاریك و هەم مێشك و بیری مەش پاك بوو، و هەم تروسکاییەکە کز- رێ شاندەرەکەشمان هەر هانی دەداین و ئەو بۆچوونەی لەلا بەهێزتر دەکردین و ئەو تروسکاییەی نزیك پێشاندەدا. دەنا هەر ئەودەمی چ بەقسە و چ بەکردار پێی رادەگەیاندین کە هێندە بەسە تەکانێکی بدەینە بەرە خۆمان و بگەینێ- هەروا یەك تەکان بەسە- ها، دەی، گیانەکەمی! و ئەو تەکانەی وی هەر رێپێوان و هەواڵگرییەك



بوو... و نەگەیشتینێ. لاوەتی و بێ ئەزموونییە کاروانی و نەشارەزاییە چۆنیەتی تروسکە و روناکییە و نەبوونی رابەر و جلەوکێشێکی راستگۆ، کارەکەی خراپکرد... نەگەیشتینێ... هەرچەند رووناکی و تروسکاییەکە هەروەکو خۆی بوو... ئەوە راستییەکە و هیچ پەیوەندییەکی بە بەرەو ژوورترەوە نەبوو، ئەو رووناکی بوو، و هەر رووناکیشە، ئەوانە هەر خۆیان بوون و ئێستاش هەر بۆخۆیانن و بە کەسانێکی دییەوە پەیوەند و وابەستەن... و ئێمەش هەروا دەتاریکییەدا پەلە قاژەمانە... و ژیانیش هەروا دەڕوات و سەرەنجام ئێمە بە بەسەرهاتە زیندووەکانەوە گرێ دەداتەوە، جا با دۆستەکان چەندی دەتوانن لە هەندەران پەیکەری شەهیدان داڕێژن و وێنان چاپ بکەن و جاروبارە شیعرانیش بڵێن...

بەڵێ پاپۆڕی هیوا و ئاوات و ئومێدان تەقیەوەو پارچە پارچە و هەپڕوون بە هەپڕوون بوو و هەر پارچەی بەلایەکیدا پەرت و بلاّوبۆوە و هەریەکە خۆی بە پارچێکیەوە گرتەوە و کەوتە جیهانێکی دیکەوەی جیا لەم جیهانە. ئیدی ئەوە نەماوە هەر کە تێگیراویەك پەیدابوو و سەری هەڵدا لە دوور و نزیکەوە چەند کەسانێك خۆ بکوتن و بێن خۆ بکەنەوە دەمڕاست و دەست بەسینگەوە عەرزی خزمەت بکەن. نانی رۆژانەیانت دەگەڵدا لەت کەن، و بتکەنە هاوبەشی ئاسودەی نێو خاو و خێزانی خۆیان و دۆستانە بەدەمتەوە بحلیکێنەوە. حلیکانەوە دەگەڵ ئاواتەکان چوون. ئەگەر هیواو ئاواتێکیش بە ئایندەوە مابێ، ئەویش هەر دیار نییە، هیچ شتێك دوور و نزیك دیار نییە. خۆ ئەگەر خەیاڵ پلاّویەکیش هەبێ، ئەوە هەر تاکە کەسییە و هیچ لایەنێکی هاوبەشی دەگەڵ خەیاڵ پلاوی رێچکەی ئایندەی نادیاری تۆدا نییە... پێکتری و لێك بێگانە بوون بۆتە نەفرەت، نەفرەت. کەم کەمە بەرەو لای رك و کینە و دڕدۆنگیەوە دەچێ- لە هەندێ جێیان لەوەش تێپەڕیوە... بەلاّم خودی حیزب، و ئەو مانایەی کە هەیەتی، و لەو جێیەی کە هەیە، هێشتاش هەر لەسەر ئەو باوەڕەیە کە نەڕوخاوە و هیچ شکستێك لە ئارادا نەبووە — راستیش دەکا- و هەموو شت وەك خۆیەتی- ئیدی چی دەوێ! نا، بابە نا نە هەڵەیەك، نەشکستێك... ئەو هەموو شتێکی لە بەراییەوە پێشبینی کردبوو. زۆر جارانی گوتبوو- بەڵێ، هێڵەکە راستبووە... ئەوەشی هەر بەمانایەکی راست گوتووە، گوتبووی، ئەوە وەك رەوە باڵندێکی کە بەدەم فڕینێوە جیقنەی بکەن، ئەویش لێرە و لەوێ و بە کۆمەڵ کۆمەڵ و تاك و تەرا، ئەوەشیان هەر بۆیە کردووە تاخۆیان بۆ گوڕێکی دیکەی فڕینێ ئامادەکەنەوەو وەك گوتم جێ پێیان خۆش کەنەوە!.

ئەوڕۆ چەند نامەیەکی حوسێنی هاتن، لەسەر داوایەکی بێ ئەندازەی ((عەمو مەشەدی))- نووسیبووی بابەگیان زۆری پێداگرتووە کە هەر دەبێ بنووسم ((عەمو مەشەدی)) داوام لێدەکا رێی حوسێنی بدەم ژنێ بخوازێ- بووك، روناکی پورە خاتوونێیە.

خۆشحاڵ بووم- هەر بەڕاستی زۆر خۆشحاڵ بووم... زۆر زۆر پیرۆزە! باسی ویم لە حوسێنی بیستبوو- هەروا چاردە پازدە ساڵانێك دەبێ- ((تف لەو سەرو چاوەت من ئەوە تازە ماندوو و مردوو لە کێویڕا دێمەوە، کەچی تۆی بێ ئابڕوو هەروا دەبن جێیدای!)) چاوەکانی وێك دێنێتەوە- چاوم لێیە کە زەردەخەنە دەچاوەکانیدا هەروا شەپۆلان دەدا، بەهەڕەشەوە قامکی لەچاوی زولەیخایە دەباتە پێشێ و دەڵێ: ((کوێڕایی ئەو چاوە بێ ئابڕوویانەت دایێ! شەیتان دەڵێ بەو قامکانەمیان دەرێنم... وای دا وەرە، بابزانم، هەنیات ئارەقەی دەرداوە!)) ترس و لەرزی ئەنقەستییەشی دەروخساریدا دەبینم ((وەی خاکی دنیایەم، ئەوە بۆ وا تێکچووی و رەنگت لە رووان براوە!...)) هەروەك دایکێکی زۆر میهرەبان لێوەکانی وێك دێنێتەوە ((نا، کچە جوانەکەی خۆمە... نەگرییەی کیژۆڵەی دایە!)) پوورە خاتوون شێرە ژنە- تۆ پێتوایە دەستێك هێندە بە تاسەی کارو ئیشەوە بێت، خراپەی لێ بووەشێتەوە؟ زۆرم حەز دەکرد روخساری ئەو و پوورە گوڵبەهاری دەدەمی بێگومان ئەو رۆژە پشتی پوورە گوڵبەهاریش راست دەبێتەوە... ئەو گرمۆڵەبوونەوەی ئەو رۆژەی سەردانی زیندانیی هەرگیز لەیاد ناکەم: هەردەتگوت مشتێك چڵ و چێوی پێست و ئیسقانە، دەگەڵ ئەو هەموو بەسەرهات و چەرمە سەری و دەردە سەریانەی بەسەریدا هاتبوون، کەچی هەرگیز بەکەسانی نێو داستان و ئەفسانان نەدەچوو... دەگەڵ ئەو هەموو دەرد و ئازار و ئەشکەنجە و ماندوو بوونانەی کە یەك لایەنە بە کۆڵێی دادابوون و بەرگەی گرتبوون کەچی هەرگیز خەرمانەی تریفەیەکی بەپشتی سەریەوە و وەك شاژنان تاجی بەلاتیلاکی سەریەوە و وەك بانوان دەست و پەیوەند و یاسا و لێ بەدەورو بەرەوە نەبوو و نە لوتیشی دە هەوابوو و نە لەش و لارێکی رەعنا- هیچ، تەنیا پیرێژنێکی شل و شەپرێوی تێك قرماو، لەڕو لاواز و بێ تووك پاڵی بەو مێردەیەوە دابوو کە لەخۆی چاکتر و توند و تۆڵتر نەبوو.

دە دالانەکێدا راوێچکەمە، دە سینەمای بیر و مێشکمدا دانیشتووم، جگەرەی بەبا دەکەم و سەیری فلیمی بیرەوەرییەکانم دەکەم... فلیمی یادەوەرییەکانم. ئا، ئەوە پوورە خورشیدە- خێرا خێرا لیفکەی دەکێشێ، دەستی سۆزانییەی گرتووە، دەستێکی بێ تین و توانا و سارد و سڕو بێ بەرگری، بە لاتەنیشتێدا بەردەبێتەوە، هەر راست وەك منداڵێکی ماندوو دەپرخەی خەوی شیرندا کە دەخەوێیدا جلوبەرگ لێ دادەماڵن... ئاه سلاو! ئەوەش ئەو لاوە تەن و مەندە- عەجەب دلاوەرێك، ماشەڵڵا، هەزار ماشەڵڵا! بەڕاستی ئەمیری لەشکری تۆقاند- رەنگە ساتان (دەرپێ)ی پێ زەردکردبێ!.

ئەوەش مامە مەشەدی... دەگەڵ بابیدا، کە بە فەرمانی یاساکانی مەشرووتەی چووە زیندانێ، دەوێدا مرد... چ سرودێکی دەگوت- چ شاییەکی دەکرد!... تومەز ژیانی پێخۆش بوو و حەزی لێدەکرد. خۆزگە بەوانە- ئەو پیاوانەی کە ئێمە نەماندیتوون- ئای رۆژگار!.



مامە مەشەدی بەپشتە کووڕەکەیەوە لەودیوی میلە ئاسنەکانەوە راوەستاوە، لەبەر دڵی حوسێنی دەخنێتەوە و پێدەکەنێ، بەڵام خەنینەوەیەکی ئەوتۆ کە ناچێتە نێو چاو و دڵانەوە، هەر راست وەك خەنینەوەی یەکێکی کە لە پشت سەری یەکێکی دییەوە پێبکەنێ... لە دوو دەستی لە چەند لاوەوە پێچراو و روخسارێکی تێك و پێك قوپا و کە رەنج و ئەشکەنجەی رۆژگار هەمووی، تەنانەت ئەو بەشە رووتاوەوەی کە شوێنەکانی بوونەتە دێراو دێراو لەوە بەولاوە رۆژگار هیچی دیکەی بۆ نەهێشتۆتەوە. کێڵگەی لەشی هەمووی تێکڕا شۆ دراوەتەوە و بۆتە دێراو، چ بکا کێڵگەی مێژوو شۆرەزار بوو... دەنێو کێڵگەی شۆرەزاری مێژوودا دانەی ساغ دەرزێ...

ئیدی هەرگیز ناوی **محەممەد** عەلی و عالیەی بەناوی خۆیانەوە نەدەهێنا، ئەگەر ناویشی هێنابان وەك هەر شتێکی ئازیز و خۆشەویستی دیکەی کە دەشکێن و نامانهەوێ سەیری بکەین، یا وەك شتێکی کە، ون دەبێ و نامانەوێ سەیری جێگاکەی کەینەوە، دەیگوت ((رەحمەتییەکان)).

وەی وەی، ئەوەش دارگوڵەکەی خۆم! وەك ((ئادەم))ی نێو داستانان بووبم و چووبمە بای باڵی خۆدانێ و تا هاتبمەوە خودا ((حەوا))ی بۆ دروستکردبم... لە خۆشیان دەست و پێی خۆم لێ ونبوو ون. بابە ئەو کیژۆڵەیەی لە کوێڕا هێناوە؟- ئەو ئاور تێبەر بووە کاری کوێیە؟... چەند جوان، حەساری دەماڵێ! لەپڕ هەر کە دەبیینم خشەخشی گەسکەکەیم لێدەبێتە خۆشترین دەنگی مۆسیقا، دەگەڵ هەر جووڵە و بزاوتێکیدا، وەك پەنجە بەسەر ژێیەکانی گیان و بوونمدا بێنێ، خۆشترین ئاوازیان لێ هەڵدەستێنی... پێم خۆشە بۆ من بێ- بیخوازم- هێشتاش هەروام- ئاخر پێم خۆشە نیوەچڵ نەبم. هەموو هەوڵ و تەقەللای مرۆڤ بۆوەیە ئادەمیزاد تەواو بێت و پێبگات دەنا ئەو هەموو تراژیدیایە بۆچییە؟ ئەو هەموو حەز و ئەوین و دڵدارییە ناکامە خوێناویانە بۆ؟- بۆ ئەوەی کە ژن یا پیاو نیوەکەی دیکەی خۆی وەبینێ، بگاتە نیوەکەی دووەمی خۆی و خۆی تەواو کات. ئەوجا؟- ئەوجا هیچ، بەقسەی خۆمان، دوعای سەرت... هەروا بژیەت و رێچکە و رێی خۆی بپێوێ و بڕوات و جێیەکەی خۆی بۆ یەکێکی دی بەجێ بێڵێ و بیداتە یەکێکی دی- ئا بەم جۆرە!.

شەمەندەفەر دەڕوا و ئەوە منیش بە حەسرەتەوە سەیر دەکەم، کە ئیدی ناگەڕێتەوە، ئەوەی جارێکی دیش دێت و رادەبرێتەوە ئەوە ئەو شەمەندەفەرەی هەوەڵێ نییە- شەمەندەفەرێکی دیکەیە، تازە جێی تۆ و ئەوانەی دابەزیون دەوێدا نەماوە، و دووبارەشی ئەو شەمەندەفەرەی دیکەی کە دێت هەر شەمەندەفەری تۆ نییە- تۆ تازە دابەزیوی- دە ژیاندا لە جارێکی بەولاوە زیاتر هەقی بلیت کڕینێت نییە... تازە هەردەبێ

ئاوا راوەستی و رابردن و تێپەڕینی شەمەندەفەرەکان سەیر کەیت... ئەوەی دەناو شەمەندەفەرەکەیدا لە دوورەوە بەدەم ڕێوەی کاتی تێپەڕینێی دەبینی روخسارە تاریکەکانە کە دە تارماییەکی دوورە دەستدا ون دەبن و دەسڕێنەوە و ئەو دەنگانەی لێشیانەوە دێت هات و هاوارێکی نادیار و بێ مانان و ئەوانەی دەسرۆکانیش هەڵدەتەکێنن پێت دەڵێن کە ئەوەی رۆیی، رۆیی و رابردوو رابردووە و هەروەك ژاوە ژاوێکی دوور و دووکەڵە هەورێکی چڕ، کە وردە وردە بلاّو و تەنك دەبێتەوە و ئیدی نامێنێ... ئەوەش هێشتا کە تێنەپەڕیوە... ئاهەه، ئەوە راوەستا، کاکە سیامەندی دابەزاند...!

کاکە سیامەند بەدەم زەردەخەنەی سەرلێوانەوە دێتە پێشێ- لەسەرخۆ و ئارام و سەنگین. نارەحەت دەبم، نازانم بۆ- لەبەروەی ئاگای لە سووکایەتییەمە؟ -نا، رەنگە هەروا لەبەروەی ئەمەك و وەفای رابردوو و ئەوینی وی بە جەفای خۆم پێشوازی دەکەمەوە...

دووکەڵەکەی لا دەدەم تا چاکتری ببینم... پاسەوانەکەی سەربانی، تەنیشت تاوەری پاسەوانییە دەنگی لێ هەڵیناوە: ((گلەییم لەڕووی جوانی- تۆیە... ئەی مانگی -ئاس- مانی)). ئەوەش مۆسیقای فلیمێکە... تەلاّ دانیشتووە، گەمان دەگەڵ گوڵەکانی رایەخەکە دەکات، سەری بەرداوەتەوە. ئارامم لێ هەڵدەگیرێ، دەڵێم: ((نا، ئیدی- ویژدان شتێکی چاکە، تۆ ئیدی بۆت نییە بلێی من ئەو گولاّنەم لە تۆ قبوول نییە!)) چاوەکانی پڕشنگان دەدەن، رەنگان دێنن و دەبەن و بەدەنگێکی نەرم و ناسك و نازی کچانەوە دەڵێ: ((نا، من- هیچ کاتێك نالێم... ئەودەمیش ئەوەم دەزانی... باشە گوڵ لەوە جوانتر و بەنرختر!؟)) ... ئەدی ئەوانە کێن!... ئا، هاوڕێیانی سەروو- تازە لەڕێوە دەگەنێ، تۆزاوی، دەست و پل گەچاوی و هەریەکە پەیکەر و وێنەیەکی نیو قەدی دروستکراوی شەهیدان بەدەستەوە، جا هەر لەوردە بۆرژوازی و لیبراڵ و جاسووسی سیاوە، بگرە دەگەڵ ناو و تۆمار و حیساب و کیتابی سەردەمانی رەنج و هەلاّتن و کۆچ و سالاّنی زیندانێ کە پێیان وابوو هەموویان ریزکردوون و هەڵیانگرتوون، کە بەڵێ ئەوە ئێمەین و ئەوانە- ئەوانە بوون کە گوتیان بابژی... و ئەوەتا ئەوان مردوون و ئێمە زیندووین و ماوین... دەڵێین: ((ئاه- ئێمە مردوو ئێوە زیندوو!)).

لەوە بەولاوە لە خۆشییە چاوپکەتنەوێ چ قسەی دیم نینە. هاوڕێیان ماندوون، بەلاّم شادن، رێك، دە سەروەختی خەرمانێدا گەیشتن. کۆمەڵە لاشەیەکی دیش بەپێشوازییەوە هاتن- گۆڕستانی غەریبان هەروا جمەی دێت لە حەشیمەتی خەڵکی غەریبە و غەوارە و لاوەکی و دوورە زێدان و شەپۆلان دەدات... گوڵیان هێناون، لە گوڵەکانی زیندانێ، کە هەر دەڵێی بنەدرکی مردوون. ژمارەیەك چاویان دە دەستی هاوڕێیانەوە



بڕیوە، دەڵێن چاوەڕێی شتێکی. دەڵێن: ((کوا؟ هێناوتانە؟)) هاوڕێیان دەڵێن: ((چی- چی؟)) لاشەکان دەڵێن: ((پاکی و ئابڕووی ژن و نەنگییە کچەکانمان، کە شان بەشانی سوکایەتییەمە بوون و هەر بە پاکیش سات و سەوداتان پێکردن)).

هاوڕێیان پێدەکەنن: ((... هاوڕێ... کەی وەختی ئەم قسانەیە، ئێستا شۆڕشە، کاری سەرەکی ترمان لە پێشە... ئەوانە لێگەڕێن بۆ دوایە...)) و پێدەکەنین، و ئێمەش پێدەکەنین، و چاڵی ئاودەستێ بلّقی دایەوە و ڕاڕەوە کە پڕ بوو لە بۆگەنیو- دەبایە یەکێك بچێت و دەنکە شخارتێکی لێدا، تا هەوای دەمی ئاودەستەکە کلّپە بکات و بسووتێ... بێزم لە بۆگەنیوێ دەبێتەوە، دەمولووتم هەڵدەقرچێنم، کوڕەکان دەخەوێدا دەمولووتیان هەڵدەقرچێنن، و هاوڕێیانیش هەروەك بە حوسێنی پێبکەنن، کە دەو بگرە و بەردە و وەرە و بڕۆیەیدا ژنی هێناوەو بەرژەوەندی تایبەتی خۆی خستۆتە پێش بەرژەوەندی رێکخستنەوەو ژیانی خۆی دەست پێکردووە!... ژیان!؟... ژیانی من و حوسێن و حوسێنەکانی دیش... دەو ولاّتەیدا کە بە شارستانی پێنج هەزار ساڵە بەناوبانگە و هەر رۆژەی جەژنی یادی هەزار ساڵەی کەسێکی تێدا دەگرن ئەم شتانە هەر هیچ نین.

بێگانە دەرەکییەکان دەڵێن داد و یەکسانی بە شەلەشەل دەڕۆن بەلاّم هەر دەگەنەجێ. ئێمە لێرە دەڵێین داد و یەکسانی زوو دەگەنەجێ بەلاّم کە دەگەنێ ئیدی نەدادە و نە یەکسانی، هەموو شتێکی لەبیر دەچێتەوە: لە رژێمی ستەمکاریدا یەکێکی دیکە ناوەکان دەگۆڕێ: ئەوانەی کە ئازار و نائومێدێ و تاڵی و سوێریان دیوە ئەشکەنجە دەردێن. دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەڵێین باشە، داد و یەکسانی دەگەڵ شۆڕشدا جیاوازن، ئاخریەکەی رۆژێك شۆڕش هەر دەقەومێ و ئەو زیندانانە هەموو دەبنە باغ و باغچەی ساوایان و نەخۆشخانە و دانیشگا...

هەردەو ڕاڕەوەیدا دەنێو ئەو هەموو لاشە زیندووە دوورە نیشتمان و زێدانەدا دانیشتم و وەلاّمی نامەی حوسێنم نوسییەوە. لەناخی دڵەوە پیرۆز بابیم لە مامە مەشەدی و پوورە گوڵبەهار و پوورە خاتوون و روناك کرد، هەروەك جاران ئومێدی دوارۆژێکی خۆش و بەختەوەریترم بۆ خواستن و بەڵێنم دا کە تارایەکی تەنکی برنجۆکی جوانی بۆ بووکە خانێ بچنم و بۆی بنێرم.

ئیدی ئێستا فێری ئەوەی بووین کە لە کارەکانماندا لەجیاتی مێشك دەست بەکاربێنین...

* * *